چاپی نوێ بەزیادکردنی بەرگی پێنجەم

# بانکی زانیاری

بۆ ئەوەی هەمیشە زانیاریەکانت هەمە رەنگ و فراوان بن





وەرگێرانی : مستەفا سەعید عەلی

بەرگی یەکەم و دووەم و سێیەم
چواردم و پێنجەم

- محمود برهوم
- نقولا ناصر
- محمد خروب

# بانکی زانیاری

بەرگی یەکەم و دووەمو سێیەم

وەرگێڕانی: مستەفا سەعید عەلی

چاپی سێیەم ٢٠٠٩
سلێمانی



**ناسنامەی کتێب:**

**ناوی کتێب: بانکی زانیاری**

**ناوی نوسەران: محمود برهوم، نقولا ناصر، محمد خرٶب.**

**ناوی وەرگێڕ: مستەفا سەعیدعەلی**

**چاپ: سێ**

**سلێمانی - ٢٠٠٩**

**کۆمپیوتەر: سەیوان جەمال**

**تیراژ: ١٠٠٠**

**ژمارەی سپاردن:٣١١ ساڵی ٢٠٠٦**

**چاپخانە: چوارچرا**

## پێشەکی

لەنێوەندو چوار چێوەی ڕوناك بیری جیهانیدا ,کەچاومان, بەهەندێ شاكاروو, سەرچاوەو نوسین دەكەوێ. هەر ئەوسا؛ زۆر چاك ئەوەمان لا ڕون دەبێتەوەو دەزانین كەكتێب خانەو نامەخانەی كوردیمان چەند كەساس و هەژارە. بۆ نمونە كاتێ بەتێڕوانینێكی وردەوە ,لەسەر بردەی وڵاتان و ژیاریو شارستانی گەلان دەڕوانی , بۆت دەردەكەوێت كەئەوان چەند لەڕوی هەنگاو نان و, پێشكەوتنی بەردەوام و, بایەخدانیان,بەباری ڕوناك بیریو حەقو حیساب كردن بۆ ڕەوشوو بارودۆخی خۆیان.تاچ ڕادەیەك, لەپێشەوەن و, چۆن بەدرێژایی مێژوو, نەخشەو پیلانی تایبەتیان, بۆ پاراستنی ناس نامەو كلتورو, ئەو ڕوداوانەدا ڕشتووەكەبەباش و خراپییەوە بەجوان و ناشیرینەوە , وایان تۆماركردووە كەتا ئاستێكی باش بیپارێزن و, لەئایندەو لەداهاتودا,چۆن نەوەكانی دواتر سود لە ئەزموونو تەجرووبە دەوڵەمەندەكان وەر بگرن, بەجۆرێ , ئەمڕۆ دەبینیو وڵات ێپێشكەوتوی ئەوتۆ بەرچاو دەكەوێت, كەنەخشە, سەر بردە, ژیان نامەی ناودارانی جیهان, ئەنسكلۆپیدیا, فەرهەنگ و كەتا لۆگی جۆر بەجۆر نەماوە لەنامەخانەو كتێب خانەكانی دوونیادا لەڕێگای پلانی وردوو, هەوڵی ڕوناك بیران و دەزگاكانی چاپ كردنی خۆیانەوە هەر لەزانكۆ, پەیمانگاكان,ناوەندە ڕوناك بیریو ستراتیجی یەكانیانەوە وەریان نەگێڕابێتە سەر زمانی دایك و چەندین جاروو تەنانەت سالانەش چاپیان نەكردبێتەوە جگە لەوەش لەگەڵیاندا بۆهەندێكیان گەلێ پەراوێزوو زانیاری تازەو نوێیان نەخستبێتە سەر.لەم بارەیەشەوە بۆخۆت وەك خوێنەرێكی كورد, وەك ڕوناك بیرێكی كورد سەرنج بدە, سەرنج لەكاری ڕوناك بیران ونامەخانەو ناوەندە دیكۆمێنتێكانی وڵاتێكی دراوسێی وەك ئێران كەوەك هەڵكەوتەی جوگرافی چەند لەوڵاتی ئێمەو واری ئێمەوە دوورنیە. بەڵام دەبینی لەبواری ( پراكتیك ) داو, بەتایبەتی, لەپرۆسەی وەر گێڕاندا چ هەنگاوێكی گەورەو چ قۆناغێكی گەورەو گرنگیان بڕیوەو, لەم ڕێ ڕەوەشەوە چەند زیرەكانە وەرگێڕو ڕوناكبیرانی بیری ئەم وڵاتە توانیویانە مامەڵە بكەن و چۆن توانیویانە بەسەلیقەیەكی وردەوە دەستی خوێنەرو, ڕوناك بیری ( فارسی ) زمانی خۆیان بگرن و لەهەمان كاتدا دەروازەی ڕوناك بیریو پێش كەوتنی گەلانیان لەبەردەمدا

بكەنەوە. هەروەها چۆن ئاشنايان بكەن بەدونياو ئاسۆى فراوان و بەسەليقەيەك كەنەهێڵن لەرەوتى رۆژگاروو كاروانى بەرەو پێش چوون دابېڕێن.

بە بۆچونى من :- ئەم هەنگاوە دەوڵەمەندەشى كە براى روناك بير( مستەفا سەعيد ) لەم بوارەدا ناويەتى بەوەرگێڕان و بەكوردى كردنى ئەم چەند بەرگە ناوازەيە واتە( بانكى زانيارى ) كەبۆ خۆى ئەنجام دان و رايى كردنى كارێكى روناك بيرى لەم بابەتە مەگەر هەر لەعۆدەى ( دەزگايەكى چاپ و بلاوكردنەوە ) يفەرمى دابێ كەبتوانێ لەرێگاى ليژنەيەكى وەرگێرانى تايبەتەوە ئەنجامى بداو لەهەمان كاتدا دەبێ دەسگرۆىو توانايەكى مادى باشى لە پشتەوەبێ.

لەكاتێكدا مامۆستا مستەفا ئەمەى كردووەو, بەكورديەكى جوان و,تاڕادەيەك پاراو دەيەوێ بيگەيەنێتە دەستى خوێنەروو,بيخاتە نامەخانەى كوردييەوە. دەبێ ئێمەش لەناخى دڵەوە هيواى سەركەوتن و لەش ساغى بۆ بخوازين وبڵێين: بەو ئومێدەى كەبتوانينبەسەليقەو بەو پشوو درێژيەى خۆيەوە دەيان بەرهەمى بەپێزى ترمان بۆ وەرگێڕێتە سەر زمانى كوردى. هاوكات بەئەمانەتى زانستى و بەچاپێكى جوان ودوور لەهەڵەو پەڵەوە بيا نخاتە كتێبخانەى كورديەوە.

احمد باوەر / كەلار

٢٠٠٦

## كەی بەنج لەنەشتەرگەریدا بەکارهێنرا؟

**لەرێگەی نەشتەرگەرییەوە**

**دەستی پزیشك گەیشتە بەشە نەخۆشەکانی هەناوی مرۆڤ**

لەو کاتەوەی کە نەشتەرگەریی بووەتە بەشێك لەزانستی پزیشکی چەندین مەودای جۆراوجۆر بەکارهێنراوە بۆ کەمکردنەوەی ئازاری نەخۆشەکە، وەك: گژوگیا و رۆن و دەرمان، بەڵام هیچیان سەرکەوتنی تەواوی بەدەست نەهێناوە.

لەبەرئەوە نەشتەرگەریی کێشەیەکی زۆری بۆ نەخۆش هەبوو، بۆیە هەندێکجار لەئەنجامی ئازاری زۆردا نەخۆشەکە یان دەمرد، یان توشی کۆست دەبوو.. دوای دۆزینەوەی بێهۆشکەرێکی هاوچەرخ بواری پزیشکی پێشکەوتنێکی بێ وێنەی بەخۆیەوە بینی، ئایا دەزانن کەی یەکەمجار بەنج بەکارهێنراوە؟

بێهۆشکەر ماددەیەکە دەبێتە هۆی نەهێشتنی هەست لەلاشەدا، دۆزینەوەشی کارێکی هەژێنەر بوو.

کیمیاگەری بەریتانی هێنمەری داڤی ساڵی ١٧٩٩ هەندێك گازی پێکەنین هێنەر (ترشی نەتری) هەڵمژی، سەیری کرد دەبێتە هۆی بێهۆش بون، داڤی ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوەی لەساڵی ١٨٤٤ دا بڵاوکردەوە.

هۆراس ویلز لەویلایەتە یەگرتوەکانی ئەمەریکا یەکەم نەشتەرگەریی دانی کرد بەبەکارهێنانی ترشی نەتری وەك بەنج دوو ساڵ پێش ئەوە، واتە لەساڵی ١٨٤٢ دا، یەکەم نەشتەرگەریی بێ ئازار کرا لەسەر دەستی کرۆ فۆرد لۆنگ بەبەکارهێنانی ئەتیر وەکو بەنج.

ساڵی ١٨٤٧ دا وترا کە کلۆرۆ فۆرم وەك بێهۆشکەر هەمان کاریگەری هەیە، لەکۆتایدا پزیشکەکان رێگەیەکیان دۆزییەوە بۆ زاڵبون بەسەر نەشتەرگەریدا، بەوەی بەنجەکەیان ماوەیەکی زۆر نەخۆشەکە بێهۆش دەکات بێ ئەوەی پزیشکەکان پەلەبکەن لەئەنجامدانی نەشتەرگەریەکەدا.

لەم سەردەمەی خۆشماندا چەندین جۆر بێهۆشکەری نوێ دروست کراوە، بەکارهێنانیشی بە دوو جۆرە:

*- شوێنی "مەوزعی".

## ٨ بانكی زانیاری

*- گشتی.

شوێنی بەکاردەهێنرێت بۆ بەنجکردنی بەشێکی تایبەتی لەش، کە دەبێتە هۆی نەگواستنەوەی لێدانە کارەباییەکان لەخانەکانی دەماردا.. یەکەم ماددە لەم بێهۆش کەرەدا بەکارهێنرا ماددەی کوکایین بوو، بەڵام ساڵی ١٩٠٥ دا، بێهۆشکەرێکی لەمە بەهێزتر دۆزرایەوە کە پێی دەوترێت پرۆکایین.

بەنجی گشتیش وادەکات، لاشە هەستی لای خۆی نەمێنێت، ئەویش بەبەکارهێنانی ترشی نەتری لەگەڵ ئەتیری کلۆرۆ فۆرمدا، لەماوەی چەند چرکەیەکدا ئیشی خۆی دەکات، بەڵام دوای نەمانی کاریگەری چارەسەرەکە، کەسە بەنجکراوەکە دێتەوە سەر هۆشی خۆی.

## کێ پێڵاوی داهێنا؟

**فەرەنسییەکان کەسێتی خەڵکی لەپێڵاوەکانیاندا دەخوێننەوە**

مرۆڤی سەرەتایی ناچاربوو بۆ گەیشتن بەئەشکەوتەکەی رێگە بەردینەکان بەپێ ببڕێ، ئینجا بۆ پاراستنی قاچیان راهاتبون بەپارچە پێستەیەك یان توێکڵی دار قاچیان داپۆشن، ئەمە یەکەمین جۆری پێڵاو بووە کە مرۆڤ ناسیویەتی.

میسرییە کۆنەکان یەکەم گەلی پێشکەوتوو بون کە پێڵاویان دروستکرد، کە لەدروستکردنیدا پارچە پێستەو داری تاشراویان بەکارهێناوەو بەستویانەتە پێیانەوە.. هەندێکجار نوکی پێڵاوەکانیان هەڵگەڕاوە بووە بۆ سەرەوە، تاپەنجەکانی پێیان پارێزراو بێت.

لەوڵاتە ساردەکاندا خەڵکی جۆرێکیتر پێڵاویان داهێنا، کە بریتی بوو لەتورەکەیەکی لەگژوگیا ئاخنراو، دەیانبەستە دەوری هەردو قاچیانەوە.

بەڵام پێڵاوی جۆری نوێ کە ئێستا دەبینرێت لەکاتی جەنگی خاچپەرستاندا دروستکرا، لەبەرئەوەی خاچپەرستان دەچون بۆ شەڕێکی درێژخایەن، پێویستیان بەپێڵاوێکی تەمەن درێژ بوو کە پێکانیان بپارێزێت، هەر بۆیە جۆرێك پێڵاویان دروستکرد کە تەمەنی زۆر بێت.

بەتێپەڕبونی ڕۆژگار شێوازی پێڵاوی زۆر جوان لەوڵاتانی ئیتالیاو فەرەنساو بەریتانیا بەدیارکەوت کە لەباشترین چەرم دروست دەکرا.

پێڵاو هەمیشە لەسەر مۆدێل دروست دەکرێت، بۆ نمونە خەڵکی لەسەدەی شانزەیەمدا پێڵاوی لوت پانیان لەلا باشتر بوو بۆ پاراستنی پەنجەکانیان، کەچی لەسەدەی هەڤدەیەمدا پاژنە بەرز بوو بەمۆدێل.. لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیادا مرۆڤ توانی لەپلاستیك‌و قوماش‌و چەرم جۆرەها پێڵاو دروستبکات.

## کۆمەڵەکانی ماڤیا بەنهێنییەکانی خۆیان هەمیشە فێڵیان لەیاسا کردوە

ماڤیا مانای کۆمەڵەی تاوانبارانە، بۆ یەکەمجار لەسەدەی سیازدەهەمدا لەشاری سەقلیەی ئیتالیا دروست بون‌و، ئەندامانی ئەم کۆمەڵە گوێ نادەنە هیچ یاسایەکی حکومەتی.. یاسای تایبەت بەخۆیان هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان.

ئەم کۆمەڵە تاوانبارە سەرەتا دژی کارە نامرۆڤایەتییەکانی ئاغاو دەرەبەگەکان دروست بون، سەرەتا لەتەنیا ئیتالیا کاریان دەکرد، تا وردە وردە بەهێز بون‌و هەموو سەر زەوییان گرتەوە.

حکومەتی ئیتالیا زۆر هەوڵی دا ئەم ڕێکخراوە لەناوبباتو نەیانهێڵێت، بەڵام بۆی نەکرا، بەپێچەوانەوە ماڤیا بەدرێژای سەدان ساڵە گەشەی سەندوەو بەرێگە نهێنییەکەی خۆیان هەمیشە فێڵیان لەیاسا کردوە.

ئەو دەمەی ماڤیا دروست بوو زۆربەی کارمەندانی دەوڵەت گەندەڵ بون‌و ماڤیا بەدوژمنی هەژارانی دەزانین‌و هەوڵی دەدا تۆڵە لەو کارمەندانە بکاتەوە دوای ڕوخانی حکومەتی "بۆربونی ناوچەیی"..

ساڵی ١٨٦٠ حکومەتی ئیتالیا توانی بەسەرکەوتویی سەقلیە لەماڤیا پاك بکاتەوە، بەڵام ماڤیا لەو کاتەدا ریشەی لەناو کۆمەڵگای دورگەکەدا، داکوتا بوو بەجۆرێك ئەستەم بوو لەناوببرێت، سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەم ڕژێمی فاشی مۆسێلینی خەریك بوو ماڤیا لەناوببات، بەڵام دوای بیست‌و پێنج ساڵ

دەركەوت ئەم ڕێكخراوە بەتەواوی لەناو ناچێت.

پاكسازی كشتوكاڵی دوای جەنگی جیهانی دووەم لەگوندەكان و شاری سەقلیەو ڕۆژئاوا تائەندازەیەك ماڤیای بێهێزكرد، بەپێچەوانەوە ماڤیا لەشارە پیشەسازیەكاندا بەتەواوی بەهێز بوو، لەو ساڵانەی دوایدا زۆر هەوڵدرا بۆ دورخستنەوەی هەندێك لەسەركردە سەرەكیەكانی ماڤیا بۆ دورگە بچوكەكانی دەوروبەر.

لەهەردوو سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا، چەند كۆمەڵێك لەسەقلیەوە چون بۆ ئەمەریكاو، چەندین ئەندامی ماڤیاشیان لەگەڵ خۆیاندا برد.

هەندێك لەدەسەڵاتدارانی ئەمەریكا دەڵێن: ماڤیا واگەشەی كردوە بووە بەبەهێزترین گروپی تاوان لەویلایەتە یەگرتوەكاندا.

تەنیا لەنیویۆرك پێنج گروپی ماڤیا هەبون ئیشیان دەكرد كە هەر گروپێك پێكهاتبوو لەسەرۆك و جێگرو جێگرێكی ترو بۆ خوارەوە، ئەم گروپانە ئیشی نایاساییان زۆر دەكرد وەك بێ ڕەوشتی و قومارو ئیشكردن لەماددە هۆشبەرەكان.

بەهاتنی ساڵانی حەفتاكان ژمارەی تاوانەكانی ماڤیا كەم بوەوە، بەهۆی كەمبونەوەی سەرۆكەكانیانەوە، بەڵام كاریگەری ماڤیا لەسەر ژیانی خەڵكی ئەمەریكا تائەمڕۆش هەر ماوە.

## نوسینگەی لێكۆڵینەوەی فیدراڵی

**F.B.I نوسینگەیەك لەوەزارەتی داد،**

**فەرمانگەیەكی خۆشەویستی حكومەت.**

نوسینگەی لێكۆڵینەوەی فیدراڵی خۆشەویسترین فەرمانگەیە لای حكومەتی یەككگرتوی ئەمەریكا، ساڵی ١٩٠٨ دامەزراوە، وەكو نوسینگەیەك لەناو وەزارەتی دادی ئەمەریكا.

ساڵی ١٩٢٤ F.B.I بەشی پێناسەكانی دامەزراند كە لەنوسینگەكەی خۆیەوە دەستی پێكردو، ئەم بەشە "٨١٠١٨٨" تۆماری هەیە كە زیاتر لە "١٠٠" ملیۆن پەنجە مۆر لەخۆدەگرێت.. بارەگای F.B.I لەواشنتۆنی پایتەخدایەو "٥٢"

نوسینگەشی لەسەرانسەری ویلایەتە یەگرتوەکاندا هەیە.

ئیشی F.B.I پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریە بۆ ئەو دەزگایانەی یاسا جێبەجێ دەکەن، وەك پۆلیسی ویلایەتەکان و شارەوانییەکان و هەرێمەکان دەتوانێت ئەو کەسانەی پەنجە مۆریان لایانە، ئەگەر تاوانێك ئەنجام بدەن لەماوەی تەنیا پێنج خولەکدا بەپەنجە مۆرەکەی دەست نیشانیان دەکەن و، وێنەیەکیش لەو تۆمارە تاوانکارییە دەنێرێن بۆ دەزگاکانی جێبەجێکردنی یاسا لەماوەی ٣٦ کاتژمێردا، دوای وەرگرتنی فۆرمەکە لەواشنتۆن.

هەروەها تاقیگەکانی نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی خزمەتگوزاری پێش کەش بەهەموو ئەو دەزگایانە دەکات، ئەو تاقیگانەش تازەترین ئامێری تێدایەو، رۆژانە ئەو زانایانە ئیشی تێدا دەکەن، تاقیکردنەوە لەسەر دیکۆمنیتەکان و خوێن و قژو خۆڵ و ^یتریشر دەکەن و، ئەو پسپۆرانە گەواهی خۆیان لەسەر ئەو بەڵگانە دەدەن لەبەردەم دادگا کە بەدەستیان هێناوە.

مانگی حوزەیرانی ١٩٣٩ سەرۆکی ئەمەریکا نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی هەڵبژارد، تا ببێتە دەزگایەکی بەرپرس لەلێکۆڵینەوە لەکردوەکانی سیخوڕیی، تێکدان و هیتریش لەبابەتەکانی ئاسایشی نەتەوەیی.

## یەکەم تیمی ئاگرکوژێنەوە

**تاوەری بازرگانی جیهانی پاش ئەوەی**

**بەهۆی کردوەی تیرۆرستییەوە ئاگری تێبەربووە**

لەکۆندا پیاوانی ئاگرکوژێنەوە بەو شێوە یاساییەی ئەمڕۆ نەبون، ئەگەر ماڵێك ئاگری بگرتایە هەموو کەسێك دەبووە پیاوی ئاگرکوژێنەوە، خەڵکیش تیمێکیان دروست دەکرد بەمەنجەڵ و سەتڵەوە بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکەو. بەڕیز دەوەستان لەماڵە ئاگرگرتوەکەوە تاسەر روبارێك یان ئاوێك، سەتڵە ئاوەکەیان دەدایە دەستی یەکتر تادەگەیشتە دەستی ئەوانەی لەسەر ئاگرەگە بوون.

ساڵی ١٦٦٦ ئاگرێك لەلەندەن کەوتەوە ١٣ هەزار بینایە تیایدا ئاگری تێبەربوو، لەوانە کاتا درائییەی سانت پۆڵ، دوای ئەو روداوە ئینگلیزەکان پەمپی دەستیان دروست کرد تا پیاوانی ئاگرکوژێنەوە لەرێگەی لولەکەیەوە ئاگری پێ بکوژێنەوە.

هاولآتيانيش پەيمانياندا هاوكارى پياوانى ئاگركوژێنەوە بكەن و لەهەركوێيەك ئاگرێك كەوتەوە، واز لەكارى خۆيان بهێنن و خۆبەخشانە بڕۆن بۆ كوژانەوەى ئاگرەكە.

لەشارى لەندەن پياوێكى تايبەت دانرا بۆ ئامرازى ئاگاداركردنەوەبە ناقوس لێدان يان بانگەوازكردن و ئاگاداركردنەوەى هاولآتيان لەكاتى ئاگركەوتنەوەداو ئامادەكردنى پێويستييەكانى ئاگركوژاندنەوە.

هەروەها كۆمپانياكانى بيمە "تأمين" كردن تيمى تايبەتى ئاگركوژاندنەوەيان پێكهێنا بۆ كوژاندنەوەى ئەو بينايانەى كە بيمەكرابون، بەلآم بەدەگمەن يارمەتى ئەو لايەنانەى دەدا كە بيمە نەكرابون.

سالْى ١٨٣٥ شارى نيويۆرك يەكەم تيمێكى چوار كەسى ئاگركوژێنەوەى پێكهێنا، موچەى سالآنەى هەريەكەيان بڕى ٢٥٠ دۆلار بوو.. ئەمانە بەپۆليسى ئاگركوژێنەوە ناسرابون و، يەكەم بنكەى ئاگركوژێنەوەش سالْى ١٨٥٥ لەشارى نيويۆرك دروستكرا.

ئەمڕۆ لەويلايەتە يەكگرتوەكاندا هەزار فەرمانگەى ئاگركوژێنەوە هەيە كە تيايدا كەسانى ئاگركوژێنەوەى پسپۆڕ كاردەكەن، لەگەلْ زياتر لەپانزە هەزار فەرمانگەى تريش كە كەسانى خۆبەخش بەنيوە دەوامى تيادەكەن.

هەروەها لەويلايەتە يەكگرتوەكان زياتر لەهەشت سەد هەزار پياوى ئاگركوژێنەوەى پسپۆڕ هەيە، لەگەلْ هەشت سەد هەزار پياوى ئاگركوژێنەوەى خۆبەخشدا.

## كەى بۆ يەكەمجار ئاوێنە بەكارهێنرا؟

**لەرووە ساف و لوسەكەى ئاوێنەدا**

**جوانى و ناشرينيەكانى روالَەت ببينە**

ئايا رێكەوتوە، لەگۆماوێكى وەستاودا وێنەى ئاسمان و دارەكانت چاو پێ كەوتبێت؟

لەڕستيدا ئەو چاوپێكەوتنە بريتييە لەسەيركردن لەئاوێنەدا، ئاوێنە بريتييە لەرويەكى ساف و لوس كە وێنەو تيشك تيايدا ئاوەژودەبێتەوە.

زۆر گرنگە روی ئاوێنە ساف‌و لوس بێت، بۆ نمونە ئەگەر بایەكی لەسەرخۆ بەسەر ئەو گۆمە ئاوەدا هەڵبكات، ئەوا تیشكەكە ئاوەژودەكاتەوە بەڵام هیچ وێنەیەكی تێدا نابینیت.

لەكۆندا ئاوێنە لەكانزای زاخاودراو دروستكراوە، ئاوێنەی تازەش لەپارچەیەك شوشەی زاخاودراو دروست دەكرێت بەلێدانی چینێك زیو لەپشتەكەی، بەڵام شوشە بەتەنیا خۆی، ئاوێنە نییەو، ئەو روەی كەتیشك‌و وێنەكان ئاوەژو دەكاتەوە زیوەكەیە، تەنیا ئیشی شوشەكەش پاراستنی زیوەكەیە لەكڕان‌و پیس بون.

ناتوانین دەستنیشانی بكەین مرۆڤی كۆن كەی بیرۆكەی ئاوێنەی دۆزیوەتەوە، بەڵام دەبێت ئەویش هەر وەك ئێمە سەیری گۆمە ئاوێكی كردبێت‌و وێنەی خۆی تیادا بەدی كردبێت یان دەشێت بەرێكەوت تێبینی كردبێت، كە روی كانزایەكی زاخاودراو وێنەكان ئاوەژودەكاتەوە، یان دەشێت كانزایەكی بڕیبێت‌و بەچەندین شێواز زاخاوی دابێت بۆ ئەوەی ئاوێنەی لێدروست بكات.

سەرەتای شارستانییەت لەیونان‌و میسرو رۆمای كۆن مرۆڤ وەك شتێكی بەسود ئاوێنەی قبوڵكرد، تەنانەت خەڵكی ئەو سەردەمە ئاوێنەی بچوكیان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرت كە لەزێڕو زیز برۆنز دروست كرابو.

ئاوێنە لەكۆندا خەڵكی ئەفسوناوی كردبوو، چونكە نەیاندەزانی چۆن ئیش دەكات بۆیە بڕوایان وابو هێزێكی ئەفسوناوی تێدایە، بەڵكو گومانیشیان وابوو ئەو وێنەیەی كە تیایدا دەیبینن گیانیانە، لەمەوە بوو پڕو پوچی لەسەر شكاندنی ئاوێنە دروست بوو، ئەگەر كەسێك بڕوای وابوایە شكاندنی ئاوێنە ئازاری گیانی دەدات.

خەڵكی شاری ڤینیسیا یەكەم كەسانێك بون فێربون، چۆن ئاوێنە لەسەر شوشە دروستبكەن، كە رویەكی بۆیاخكرابێت بەچینێك جیوە یان توتیا.

نزیك ساڵی ١٣٠٠ خەڵكی ئەم شارە دەستیان كرد بەدروستكردنی ئاوێنە بەرێژەیەكی زۆر كە لەماوەیەكی كورتدا جێگەی ئاوێنەی كانزای گرتەوە كە هەزاران ساڵ بوو بەكاردەهێنرا.

## سەرچاوەی شەکر

**شەکر، گیایەکە وەك هەنگوین وایە بەبێ یارمەتی مێش هەنگ.**

جۆرەکانی شەکر زۆرن، لەزۆر شتی زیندوداو لەسەوزەو گیانلەبەرانیشدا وەکویەك هەیە، بەڵام کاتێك خەڵکی باسی شەکر دەکەن مەبەستیان سکرۆزە، واتە قامیش و چەوەندەری شەکر.

لەوانەیە خەڵکی لەنێوان خۆیاندا بەجەنگ هاتبن لەسەر ئەو روەکە شیرینانەی کە پێش هەزاران ساڵ لەدەشتاییەکانی گینیای تازە رواوە.

لەگەڵ پێشکەوتنی رۆشنبیری مرۆڤدا ئەو قامیشە شەکرانە لەگەڵ کەلوپەلی تردا ئاڵوگۆڕ دەکران، لەمەوە بەکارهێنانی بڵاوبوەوەو بەم رێگەیەو بازرگانەکانی شەکر، شەکریان گەیاندە دورگەکانی باشوری باسیفیكو ئەندەنوسیاو ئاسیاو فلیپین.

دەشێت خەڵکی هیندستان لەسەدەکانی پێش مێژودا قامیشی شەکریان ناسیبێت، ئێمە دەزانین قامیشی شەکر ٤٠٠ ساڵ پێش زاین لەهیندستاندا بەکارهێنراوە.

بەڵام یەکەمین کەسانێك کەوا لەئەوروپا قامیشی شەکریان چاوپێکەوتبێت، ئەو جەنگاوەرانە بوون ساڵی ٣٢٥ پێش زایین لەگەڵ ئەسکەندەری گەورەدا چون بۆ هیندستان.. یەکێك لەجەنگاوەرەکان بەم جۆرە باس لەقامیشی شەکر دەکات:

گیایەکە وەك هەنگوین وایە بەبێ یارمەتی مێش هەنگ.

لەنێوان ساڵانی (٥٠٠) بۆ (٧٠٠) زایینی، قامیشی شەکرو دروستکردنی شەکر لەهیندستانەوە گوازرایەوە بۆ ئێران، کاتێکیش موسڵمانەکان گەیشتنە وڵاتانی شام و میسرو ناوچەکانی دەریای سپی ناوەڕاست بەکارهێنانی شەکریان بردە ئەو وڵاتانەوەو، ساڵی ١٧٥١ موژدەبەخشەکانی ئایینی مەسیحی لەهایتی و نیوئورولیانزەوە هاتن بۆ ئەمەریکا، قامیشی شەکریان لەگەڵ خۆیاندا هێنایە ئەمەریکاوە.

ساڵی ١٧٩٥ لەویلایەتی لویزینای ئەمەریکا دەستکرا بەبەرهەم هێنانی شەکر.

## لەکەیەوە مرۆڤ سەری دەتاشێت؟

**رۆژێك پیاوان لەبری ژنانی ئێستا قژیان دەهێشتەوە.**

کەس ناتوانێت دەست نیشانی یەکەم کەس بکات، بیرۆکەی سەرتاشین یان داهێنانی هێنابێتە گۆڕێ، ئێمە دەزانین هەزاران ساڵ لەمەو پێش، شانە هاوەڵی ژن بووە، وەك چۆن ژن قژی پەلکە کردوە لەدێر زەمانەوە، بەڵام نەریتی قژ درێژکردنی ژنان و کورتکردنەوەی لەلای پیاوان شتێکی تازەیە.

پیاوان لەچاخەکانی ناوەڕاستدا قژیان درێژ دەکردو دەیان کردە پەلکەو بەپەتێك دەیانبەست، ئەگەر قژیشیان درێژ نەبوایە ئەوا قژێکی درێژیان دەکڕی و لەسەریان دەنا.. هنری هەشتەم- پادشای بەریتانیا مۆدێلی قژ کورتکردنەوەی پیاوانی داهێنا، فەرمانی دا دەبێت پیاوان قژ کورتبکەنەوە، بەڵام قبوڵی کرد ریش و سمێڵیان درێژ بکەن.. کەچی کاتێك جێمسی یەکەم بوو بەپادشا جارێکیتر مۆدی قژ درێژکردنی پیاوان گەڕایەوە.

لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا خەڵکی بەریتانیا بوون بەدوو بەشەوە سەبارەت بەقژ، بەشێکیان وایان بەباش دەزانی قژیان کورت بێت و ریش درێژکەن، بەشێکیان پێیان باش بوو قژ درێژبکەن و ریش کورتبکەنەوە، تا لەئاکامدا لەدەوروبەری ساڵی ١٨٠٠ مۆدی قژ کورتکردنەوە لای پیاوان بەتەواوی جێگیر بوو.

ئافرەتان هەمیشە مەیلیان لەقژ درێژ کردن هەبووە، بەڵام مۆدی قژ کورتکردنەوە لەلای پیاوان ئەفراندنێك بوو لەکۆشکی لویسی چواردەهەمدا سەری هەڵدا.

ئەمڕۆ ئافرەتان بۆیە قژ کورتدەکەنەوە، نەك لەبەرئەوەی مۆدە، بەڵکو لەبەرئەوەیە، کەسوکەو پێویستی بەبەکارهێنانی ماشەو قژ گیرەو شانەو داهێنان نییە.

ئەمڕۆ ئارایشتگاو بایەخدان بەقژ پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە، لەکاتێکدا ساڵی ١٤٦١ بۆیەکەمجار داننرا بەپیشەی سەرتاشیندا وەك پیشەیەك، ئەویش لەسەردەمی لویسی چواردەهەمدا بو لەفەڕەنسا.

## چەتاڵی چێشت چۆن پەیدا بوو؟

**ئەمە بەچەتاڵ دەیخوات وایلێهاتوە**

**ئەگەر بەدەست بوایە چی دەبوو؟!**

رەنگە یەکەم کەس کە پێش هەزاران ساڵ لەسەر زەویدا ژیاوە، جۆرێك لەچەتاڵی سەرەتایی بەکارهێنابێت لەنانخواردندا، بەڵام بەکارهێنانی رۆژانە بۆ چەتاڵ پێشکەوتنێکی تازەیە لەمێژوی مرۆڤایەتیدا.

مرۆڤی سەرەتایی دارێکی دوو لقیان وەك جۆرێك لەچەتاڵی سروشتی بۆ گۆشت گرتن بەکارهێناوە، هەندێك لەسەرچاوەکان بڕوایان وایە چەتاڵ لەگەڵ تیردا پەیدا بووە، لەسەرەتاشدا جۆرێك بووە لەداری ددان پاککردنەوەو بۆ پاکردنەوەی ددان لەپاشماوەی خواردنەکان بەکارهێنراوە.

ئەو چەتاڵەی ئەمڕۆ بەرچاومان دەکەوێت، سەرەتا بۆ مەبەستی چێشت لێنانو گۆشت گرتن لەکاتی کولاندندا بەکارهێنراوە، کە بریتی بووە لەچەتاڵێکی درێژی دوو لق لەئاسن یان ئێسك یان دارێکی زۆر رەق، بەڵام بەکارهێنانی چەتاڵ لەنانخواردندا ماوەیەکی زۆری ویستوە تاوەکو ئاسایی بوەتەوە، تەنانەت پێش سێسەد ساڵ چەتاڵی چێشت خواردن لەئەوروپا شتێکی زۆر سەیرو سەرسوڕهێنەر بووە، بەجۆرێك هەموو فەرەنسییەکان تا سەدەی حەڤدەهەم بەدەست نانیان خواردوە.

ئێمە دەربارەی کۆشکی لویسی چواردەهەمو دیوەخانو سفرەو خوانی دەزانین کە چەند گرنگ بووە، بەڵام لەو کۆشکە مەزنەدا هیچ کەس چەتاڵی بەکارنەهێناوە.

کاتێك هەندێك لەخەڵکی چەتاڵیان بۆ یەکەمجار لەنانخواردندا بەکارهێنا، خەڵکی تر هەبون گاڵتەیان پێ دەکردن، کاتێك خانمێکی دەوڵەمەندی شاری ڤینیسیای ئیتالیا داوایکرد لەزێڕ چەتاڵێکی بۆ دروست بکەن لەسەدەی یازدەهەمدا ئاوا لەسەریان نوسی: لەجیاتی ئەوەی وەك خەڵکانی تر بەدەست نان بخوات، چێشتەکەی دەکاتە پارچەی بچوك بچوکەوەو بەهۆی چەتاڵێکی دوو لقەوە دەیخوات.

دوای ئەو مێژووە بەپێنج سەد ساڵ، واتە لەسەدەی شانزەهەمدا لەڤینیسیادا

ئەوانەی لەنان خواردندا چەتاڵیان بەکاردەهێنا بە"شاز" ناو دەبران و بەمجۆرە لەسەریان دەنوسین:

(لەڤینیسیا سەرەڕای چەقۆو کەوچکێك بەهەموو کەسێك چەتاڵێك دەدرێت بۆ گرتنی گۆشتەکەی تاپێی ببڕێت، چونکە وادەزانن گرتنی گۆشت بەدەست رەوشتێکی جوان نییە لەسەر خوان).

دوای سەدەی حەڤدەهەم رەوشتی سەر خوان پێش کەوت و لەسەرانسەری ئیتالیادا چەتاڵی لەزیو دروست کراو، پەیدابو، لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا خەڵکی لەرۆژئاوادا چەتاڵیان قبوڵ کرد، تەنانەت زۆر بەپێویستیان دەزانی لەماڵەکانیاندا هەبێت، لەبەرئەوە بەنیشانەی شارستانییەتیان دەزانی.

## کەی بۆ یەکەمجار سابون دروست کرا؟

**سەرەتا سابون داهێنانێك بووە بۆ چەورکردنی قژ بەکاردێت**

وادەزانن شتێکی بەسودو پێویستی وەك سابون، یەکێك بێت لەداهێنانە هەرە کۆنەکانی مرۆڤ؟.. بەپێچەوانەوە سابون شتێکی تازەیە لەمێژوی مرۆڤایەتییداو مێژوی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا.

خەڵکی لەکۆندا راهاتبون لەشیان بەزەیتی زەیتون چەور بکەن، هەروەها بەشلەمەنی و خۆڵەمێش و جۆرەها روەکی تر خۆیان پاکدەکردەوە، لەسەردەمی بلینی کە نوسەرێکی رۆمانییەو لەسەدەی یەکەمی زاینیدا ژیاوە، ئاماژەی بۆ دوو جۆر سابون کردوە، نەرم و رەق، نوسەر بەمشێوە باسی دەکات: داهێنانێکە بۆ چەورکردنی قژ بەکاردێت. بلینی داهێنانەکە بۆ کەسێك دەگەڕێنێتەوە بەناوی جۆلس.

لەپاشماوەکانی شاری بۆمبێ پاشماوەی کارگەیەکی دروستکردنی سابون دۆزرایەوە کە زۆر لەکارگەکانی سابونی ئەمڕۆ دەچێت و، سەرەڕای ئەوەی زۆربەی زۆری ئەو سابونانەی کە تا پێش سەد ساڵ بەکار دەهێنرا، لەماڵەکاندا دروست دەکران.

سابون بەکوڵاندن و سورکردنەوەی رۆن و زەیت دروست دەبێت، سەرەتا رۆنەکە دەکوڵێندرێت، پاشان لەدەفری گەورەدا سوردەکرێتەوە، ئەم کردارە پێی دەوترێت

بەسابونكردن، واتە گۆڕینی ماددە کولاوەکان بۆ سابون.. پێش تەواوبونی ئەم کردارە بەماوەیەکی کەم خوێ بۆ تێکەڵە کولاوەکە زیاد دەکرێت، ئەوەش وادەکات سابونەکە تالێواری دەفرەکە هەڵبچێت.

تێکەڵە خوێیەکە کە ماددەی گلیسیرینو پیسی هەندێك برژاوی تری تێدایە، لەبنی دەفرەکەدا بن دەنیێتەوەو پاشان رادەکێشرێتو، ئەم کردارە پێنج تا شەش جار دوبارە دەکرێتەوە، هەموو جارێکیش ئاو بۆ تێکەڵەکە زیاد دەکرێت لەگەڵ ماددەیەکی تفتدا تا دواین پارچە لەرۆنەکە دەگۆڕێت بۆ سابون، هەنگاوی دووەم شڵەقاندنی سابونەکەیە بۆ ئەوەی بگوڕێت بۆ پارچەیەکی نەرم لەکاتی زیادکردنی ئەو ماددانەی کە رەنگو بۆن دەدەنە سابونەکە.. دوای ئەوە سابونە تواوەکە ئامادەیە بۆ ئەوەی بەهەر قاڵبێك دەویسترێت دروست بکرێت.

## دەنگەوەرەی پزیشکی کەی داهێنرا؟

دەنگەوەرە"سماعە"ی پزیشکی ئەو ئامێرەیە کە پزیشکەکان لەرێگەیەوە دەتوانن، زۆر لەدەنگەکانی ناوەوەی لەشی مرۆڤ ببیستن، وەك ئەو دەنگانەی لەدڵو هەردوو سییەکانو ناوسکەوە دەردەچێت.. زۆرجاریش پزیشك دەتوانێت لەرێگەی ئەو ئامێرەوە زانیاری زۆر بەسودی دەست بکەوێت.

دەنگەوەرەی پزیشکی ساڵی ١٨١٦ لەلایەن پزیشکی فەرەنسی رێنییە تیۆڤیل هیا سینتی لانك-ەوە داهێنرا، کە بریتی بوو لەلولەکێکی ناوبەتاڵو درێژییەکەی ٣٥ سانتیمەتر دەبو، سەرێکی دەخستە سەر سینگی نەخۆشەکەو سەرەکەی تریشی دەخستە گوێچەیەوەو گوێی لەدەنگەکانی ناوەوەی لەشی مرۆڤ دەگرت.

رێنییە لەم داهێنانەیدا توانی بگاتە چەند ئەنجامێکی باش، ساڵی ١٨١٩ بۆچونەکانی لەمەر ئەو داهێنانە لەدوتوێی کتێبێکدا بڵاوکردەوە بەناوی (delauscal tation mediate) زۆری پێنەچوو بەکارهێنانی دەنگەوەرەی پزیشکی بڵاوبوەوەو، گۆڕانکاری زۆری تێدا کرا تا گەیشتە ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین، دەگمەنە پزیشکێك هەبێت بەکاری نەهێنێت.

## باخچەی ساوایان

باخچەی ساوایان سیستەمێكی فێركردنی منداڵانە لەنێوان تەمەنی ٤ بۆ ٦ساڵ ئەم سیستەمە مەبەستی پەرەپێدانی توانای منداڵە بۆ گوزارشتكردن لەخۆیو تێكەڵاوی كردن لەگەڵ كەسانی تردا لەرێگەی یاریو جموجوڵو داهێنانەكانەوە.

باخچەی ساوایان سەدەی نۆزدەهەم لەئەنجامی هەوڵی ڕۆبەرت ئۆینی بەریتانیو جێ ئاچ بستالۆزی سویدیو فریدریك فرۆیبلی ئەڵمانیو ماریا مۆنتسوری ئیتالی هاتە دامەزراندنو، لەبەریتانیا شۆڕشی پیشەسازی هۆی دروستكردنی باخچەی ساوایان بوو، بەپێی یاسای منداڵان بۆیان نەبوو ئیش بكەن، لەكاتێكدا ئەندامانی تری خێزان بۆ ماوەیەكی درێژ لەكارگەكاندا ئیشیان دەكردو منداڵەكانیان لەیەكەم باخچەی ساوایان لەشاری نیولاناریكی سكوتلاند بەجێدەهێشت، ئەم باخچەیە ساڵی ١٨١٦ لەلایەن ڕۆبەرت ئۆین بۆ منداڵانی كرێكارانی كارگەكەیو ئیشی ئەم قوتابخانەیە گەشەدان بوو بەئەقڵی منداڵان لەرێگەی زیاتر ئازادی دان بەو منداڵانە، بەرنامەكانی دواتری باخچەی ساوایان بریتی بوو لەمەشقی پەروەردەی ڕەوشتی.ساڵی ١٨٣٦ كۆمەڵەی قوتابخانەكانی نیشتمانو ولاتانی ژێردەستە دامەزرا بۆ مەشقپێكردنی مامۆستایان لەسەر رێگەی ئەو پرۆگرامەی كە بستالۆزی پەرەی پێدا.

ساڵی ١٨٣٧ فرۆیبل لەبلا نكنبارگی ئەڵمانیا قوتابخانەیەكی كردەوە بۆ مەشقپێكردنی منداڵان لەرووی دەروونییەوە، بەهۆی یاریكردنەوەو ناویشی لێنا كیندر گارتن، واتە باخچەی ساوایان.. فرۆیبل هەوڵیدا بارودۆخێكی وابخولقێنێت بۆ منداڵان كە بەئازادی تیایدا گەشە بكەن، وەك چۆن درەختێك لەباخچەكەیدا گەشە دەكات.

ئەم سیستەمە زاڵبوو بەسەر مێشكی باوكانو دایكانو پاش بیستو پێنج ساڵ لەمردنی فرۆیبل قوتابخانەی هاوچەشنی قوتابخانەكەی لەشارە گەورەكانی نەمساو بەلجیكاو كەنەداو ئەڵمانیاو هۆڵەنداو هەنگاریاو ژاپۆنو سویسراو ویلایەتە یەكگرتووەكانو بەریتانیا دامەزرا.. ساڵەكانی دواتر ولاتانی تری جیهان ئەو سیستەمەیان پەیرەوكرد.

## جگەرە کێشان چۆن بڵاوبوە وە؟

**جگەرە مرۆڤەکانی تێپەڕاندوە،**

**واخەریکە بەرۆکی تابلۆکانیش دەگرێت**

توتن یەکێکە لەدیاریەکانی دونیای نویٚ بۆ دونیای کۆن، خەڵکی ئەورووپا هەزاران ساڵ ژیان بیٚ ئەوەی جگەرە کێش بن، تاسەر ئەنجام لەئەمەریکا دۆزرایەوە، هیندییەکانی هەردوو ئەمەریکای باکورو باشور یەکەمین کەس بوون کە توتنیان چاندوەو، هیندییەکانی ئەمەریکای باکور لەزۆربەی ئاهەنگەکانیدا توتنیان بەکار دەهێنا، تەنانەت زۆرێك لەهیندییە سورەکان باوەڕیان وابو کە توتن تایبەتمەندی باشی هەیە.

لەراستیدا بەکارهێنانی سەرەکی توتن دوای چونە ناو ئەورووپاوە بۆ مەبەستی پزیشکی بووەو، بەگەشتنی توتن بەئەورووپا چاندنی لەزۆربەی ناوچەکانی جیهاندا دەستی پێکرد، توتن ساڵی ١٥٥٦ چووە فەرەنسا، پورتوگال ساڵی ١٥٥٨، ئیسپانیا ١٥٥٩، بەریتانیا ١٥٦٥، ساڵی ١٦١٢ گەیشتە شاری جیمس تاونی ویلایەتی ڤێرجینای ئەمەریکاوە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە هەموو لەسەرەتاوە کاتێك توتن دەگەیشتە وڵاتەکانیان بڕیاری جگەرە کێشانیان نەدا، تورکەکان سزای مەرگیان دا بەسەر هەموو کەسێکدا کە جگەرە بکێشێت، قەیسەری روسیاش فەرمانی بڕینو دارکاری کردنو دورخستنەوەی جگەرەکێشانی دا بۆ سیبریا.

ئەمڕۆ هەڵبەت لەهەموو گۆشەو قوشبنێکی دونیادا جگەرە دەکێشرێت، ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا بەپلەی یەکەم دێت لەبەرهەم هێنانی توتندا، زۆربەشی لەبەشی رۆژهەڵاتیدا دەچێنرێت.

جۆرەکانی توتن بۆ مەبەستی جۆراو جۆر بەکاردێت، چەندین جۆری تێکەڵ دەکەن بۆ دەست خستنی جۆرێکی تایبەتی بۆن خۆش.. زۆربەی جگەرەکان لەتوتنی زەردی رەنگ لیمۆیی دروست دەکرێن، کە لەهەردوو ویلایەتی ڤێرجینیاو کارولینا بەرهەم دەهێنرێتو لەگەڵ جۆرەکانی تردا بەتایبەت تورکی تێکەڵ دەکرێت.

توتنی بارلی "ئەمریکی گەلاناسك" لەهەردوو ویلایەتی کۆنتاکی وتنیسی دا بلاوە کە بۆ توتنی سەبیل "قلیان"و جادین بەکاردیّت، بەلام جگەرە لەجۆرەکانی تر دروست دەکریّت.

## نەریتی تایفەگەری کۆمەلایەتی لەهیندستان

لەهیندستان یاسایەك هەیە خەلکی هیندستان دەکاتە چەند چینیّکی کۆمەلایەتی جیاوازەوە، یان چەند چینیّکی داخراوەوە، چینی داخراو ئەو چینەیە، کە ئەو کەسە تیّدا لەدایك دەبیّتو، لەسەرەوە بۆ خوارەوە بەم جۆرەیە:

١- بەرهەمانی: چینی ئاینین لای هیندۆسەکان.

٢- کشتاری: چینی جەنگاوەرانو دەسەلاتدارانی دونیایین.

٣- فایسی: چینی بازرگانو پیشەوەرانە.

٤- سۆدرا: خزمەت کارەکانن.

٥- بآنشاما: بیّزراوەکانن، لەراستیدا ئەمانە سەر بەهیچ چینیّك نین بۆیە ناوی بیّزراوەکانیان لیّنراوە.

هاولاتییەکی هیندستانی لەهەر چینیّك لەدایك بیّت ناتوانیّت چینەکەی خۆی بگۆڕیّتو سەرکەویّت بۆ چینیّکی بالاتر، هەرچەندە خویّندەوارو دەولەمەندیش بیّت، هیندستان یاساو ریّسای زۆری هەیە سەبارەت بەجۆری ئەو پەیوەندییەی کەئەندامی چینیّك لەگەل ئەندامانی چینەکانی تردا دەبەستیّتەوە.

لەبەرئەوە نەریتی تایفەگەری کۆمەلایەتی لەهیندستاندا، زۆر بەرەقی لەگەل کۆمەلگای هیندستانی دا مامەلەدەکات، کەواتە نەریتی تایفەگەری کۆمەلایەتی لەهیندستان چۆن دروست بوو؟

بیردۆزەیەك هەیە دەلیّت: کاتیّك ئارییەکان هیندو ئەروپییەکان گەیشتنە هیندستان لەسالی ١٥٠٠ پیّش زایندا ئەو نەریتەیان دروستکرد، لەبەرئەوەی ئارییەکان بالا بەرزو سورو سپیو لوت باریكو قژ رەش بون، ژیانیان بەگویّرەی چینایەتی کۆمەلایەتی پۆلیّن کرا بوو، ئەو نەریتە تایفەگەرییە وایکردبو هەرچەندە کەمینەبن، بەلام دەسەلاتدارین.

لەگەل ئەوەی دەستوری هیندستانی جیاوازیی چینایەتی قەدەغەکردوە، کەچی

نەریتی تایفەگەری هێشتا لەگۆڕێدایە، بڕواش وایە بۆ ماوەیەکی زۆریش بەردەوام بێت، لەبەرئەوەی لەهەزاران ساڵەوە ئەو نەریتە لەهیندستاندا هەیەو، وەك جۆرێك لەدەزگای ئاینی لێهاتوە.

## چنین کەی پەیدا بو؟

چنین یان ڕستن هۆنینەوەی دەزوەکانە لەگەڵ یەکتردا بۆ دروست کردنی پارچە پەڕۆیەك، بنەماکانی چنین بەدرێژای مێژو نەگۆڕاوە، تەنیا ئەوەندە نەبێت کارگەی رستنی هاوچەرخ، ئیشەکە خێراتر ئەنجام دەدات وەك چۆن میللەتانی کۆن بەدەست بەشێنەیی ئەنجامیان داوە.

مرۆڤی ئەشکەوت، کەنزیکەی سی هەزار ساڵ پێش ئێستا ژیاوە زانیویەتی چۆن چنین بکات، بۆ ئەو مەبەستەش بەلَمو پوش‌و پەلاش‌و قامیشی بۆ چنینی سەبەتە بەکار هێناوە، لەلایەن مرۆڤی پێش مێژووشەوە تۆڕ بەکار هێنراوە بۆ ڕاوی ماسی و باڵندە.

ئەوەی کەمرۆڤ پەی پێ نەبردبێت لەکۆندا ڕستن بووە، بەدەزووی باریك دەیانتوانی قوماشی نەرم دروست بکەن، وادیارە بیرۆکەی ڕستنی جل‌وبەرگ لەچەند شوێنێکی دیاری کراودا دروست بووبێت پاشان بەجیهاندا بلاوبوبێتەوە.

کۆنترین جل‌وبەرگی ڕێسراو کەمێژو باسی کردبێت لەولاتی عیراقدا بووە، لەدەوروبەری پێنج هەزار ساڵ پێش زایندا، لەمیسریش لەدەوروبەری چوار هەزار ساڵ پێش زاین، لەناوەڕاستی ئوروباش لەدەوروبەری ٢٥٠٠ ساڵی پێش زاین، لەچینیش ١٢٠٠ی پێش زاین، لەپیرۆو ئەمەریکای باشوریش نزیکەی ١٥٠٠ ساڵی پێش زاین، ڕستن‌و چنین بەگوێرەی هەر ناوچەیەك، کەکەرەستەکانی تیا دەست کەوتوە پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیووە.

دوای بەماڵی کردنی ئاژەلان لەدەوروبەری ساڵی ١٦٠٠ پێش زاین داخوری لەچنین دا بەکار هێنرا.

بۆیەکەمین جاریش بوو هیندیەکان لۆکەیان لەڕستندا بەکار هێناو پاشان لەرێگەی ئاسیاوە گەیشتە ئەوروپا.

دەزوی ئاوریشم بۆیەکەمین جار چینیەکان بەکاریان هێنا.

لەبەرئەوەی مرۆڤ حەزی لەجلی ڕەنگاو ڕەنگە بۆ یەکەمین جار خەڵکی کۆنی پیرۆ ڕێگەیەکیان دۆزیەوە، کەزیاتر لە "١٥٠" ڕەنگیان دەست دەکەوت کەبەکاریان دەهێنا بۆ بۆیاخ کردنی قوماشی جلو بەرگەکانیان.

## مس چۆن دەردەهێنرێت؟

مس یەکێکە لەبڵاوترینو بەسوترینی کانزاکان، بەدو جۆر لەسروشتدا هەیە:

مسی سروشتی "خودی کانزاکە" یان مسی تێکەڵ لەگەڵ توخمی تردا، زیاتر لە١٦٠ کانزای خاوی ناسراو هەیە کەمسی تێکەڵە.

نیوەی مسی جیهان لەماددەیەکی کانزایی زەرددایە، پێی دەوترێت "بیرێتی مس" ئەم خاوە تێکەڵاوەش لەمسو ئاسنو گۆگردێك پێك دێت، کە ٣٤،٥٪ی مسە.

یەکەمین هەنگاو بۆ پاکردنەوەی مس بەهۆی هاڕینەوە دەبێت، بۆ ئەوەی ببێتە هاڕاوەیەکی نەرم.

دوای ئەوە هاڕاوە خاوەکە لەدەفری تایبەتو گەورەدا دەشۆردرێت، ئەم دەفرانە پڕ دەکرێت لەئاو لەگەڵ چینێك لەماددەی ڕۆنی، دوای ئەو هەوایەك بەپاڵە پەستۆوە دەنێدرێت بۆ بنی دەفرەکە، هەواو ڕۆنەکە کەفێکی ئەستور لەسەر ڕوی ئاوەکە دروست دەکەنو وردیلەکانی کانزاکە دەلکێنێتە کەفەکەوە قۆناخی دوەم کانزاکە سور دەکرێتەوە تا گۆگردەکەی بسوتێت، دوای لابردنی گۆگردەکە، ئەو کانزایەی ماوەتەوە دەتوێنرێتەوەو بەڕێگەی کیمیاوی چارەسەر دەکرێت، تابتوانرێت ئاسنەکەی لێ دەربهێنرێت، دوای ئەوە ماددە خاوەکە دەنێدرێت بۆ دەفرێکی ترو ئەو هەوا بەهێزەی، کەڕەوانە دەکرێت بۆ ناوی کانزا تواوەکە، هەرچی پیسیو تری تێدایە هەمو دەسوتێنێت.

ئەمجا مسەکە وەکو کانزایەك بریقەدار دێتە بەرهەم بەپاکژی نزیکەی ٩٨٪، بەڵام پێش بەکارهێنانی لەکارگەدا دەبێت جارێکیتر ئەو مسە پاڵاوتە بکرێتەوە.

ئەم پاڵاوتە کردنەش بەهۆی کارەباوە دەبێت، دواین بەدەست هاتەی کانزاکەش ڕێژەی پاکژیەکەی ٩٩،٩٩٪ دەبێت.

ڕەنگە مس یەکێك بوبێت لەکانزا سەرەتاییەکان کەمرۆڤ بەکاری هێنابێت، چونکە وەکو کانزایەکی پاکژ لەسروشتدا دەست دەکەوێت.

## كەی بۆ یەکەمجار کانزا بەکار هێنرا؟

پێش شەش هەزار ساڵ، مرۆڤ لەچاخێکدا دەژیا کەئێستا پێی دەوترێت چاخی بەردین، لەبەر ئەوەی مرۆڤ زۆربەی کەرەستەو چەکەکانی لەبەرد دروستدەکرد، چونکە هێشتا بەکار هێنانی کانزا فێر نەببوو.

دەشێت مس‌و زێڕ یەکەمین دو کانزا بوبن مرۆڤ بەکاری هێنابێت، لەبەرئەوەی ئەو دو کانزایە لەسروشتدا بەشێوە خاوەکەی‌و بەشێوە پاکژو بێ تێکەڵاویەکەشی هەیە.

مرۆڤی سەرەتا پارچە مس‌و زێڕی دۆزیوەتەوە کوتاویەتی‌و شێوازی جۆراوجۆری لێ دروست کردوە، بێ ئەوەی پێویستی بەتواندنەوەی بوبێت.

ئێمە بەتەواوەتی نازانین لەچ مێژویەکدا مرۆڤ چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو دو کانزایەی دۆزیوەتەوە.

بەڵام دەزانین پێنج هەزار ساڵ پێش زاین مس بەکار هێنراوەو زێڕیش هەزار ساڵ دوای مس.

بەداهاتنی هەزارەی سێیەمی پێش زاین خەڵکی فێری هەندێك کاری گرنگ بون سەبارەت بەبەکارهێنانی کانزاکان، چۆن لەوکاتەوە مرۆڤ زیو قورقوشمی دۆزیەوە، مرۆڤ بۆ یەکەمین جار فێر بون چۆن کانزاکان لەشێوازی جۆراوجۆری بەسوددا، دروست بکات.

وەکو قاپ‌و قاچاخ‌و کەرەستەو چەکسازیدا، لەگەڵ دەست کردنی مرۆڤ بەبەکارهێنانی کانزاکان، کرداری نەرم کردنەوەی دۆزیەوە (گەرم کردن‌و ئەمجا ساردکردنەوە)و تواندنەوەو دارشتن‌و بەقالب کردن فێر بو، لەهەمان کتدا فێر بو مس لەدۆخە خاوەکەی دەربهێنێت کەزیاتر لەدۆخە پاکژیەکەی زیاتر بو.

دوای ئەمانە مرۆڤ توتیای دۆزیەوەو فێر بو چۆن لەگەڵ مسدا تێکەڵی بکات بۆ دروس کردنی برۆنز.

لەدەوروبەری ساڵی ٣٥٠٠ بۆ ١٢٠٠ پێش زاین برۆنز گرنگترین مەواد بو کە مرۆڤ کەرەستەو چەکی لێ دروست دەکرد.

ئەو ماوەیەش پێی دەوترێت سەردەمی برۆنزی.

بەهاتنی ساڵی ١٢٠٠ پێش زاین لەسەرانسەری جیهاندا مرۆڤ فێر بو چۆن ئاسن نەرم بکاتەوە، ئیتر ئاسن جێگەی برۆنزی گرتەوە لەبەکارهێنانیدا ئەمەش سەرەتای چاخی ئاسنین بو.

کاتێك سەردەمی رۆمانی دەستی پێکرد مرۆڤ حەوت کانزای دۆزیبووە کە بریتی بون لەزێر، مس، زیو، قورقوشم، توتیا، ئاسن، جیوە.

## ژیان لەسەر مەریخ

زانایان ئەمرۆ هەڵدەستن بەهەمو جۆرەکانی تاقیکردنەوە، تابزانن ئایا ژیان لەشوێنەکانی تری بونەوەردا هەیە؟

یەکێك لەو شوێنانەی کەزانایان بڕوایان وابو بەجۆرێك لەجۆرەکان ژیان لەسەریدا هەیە مەریخ بو.

بۆچی مەریخیان هەڵبژارد؟

مەریخ بەجۆرێك لەجمگەی زەوی دادەنرێت، تیرەکەی نزیکەی نیوەی تیرەی زەویە لەکەمتر لەدوساڵدا بەدەوری خۆردا سوڕێك دەخوات، بەڵام ڕۆژی مەریخ هێندەی ڕۆژی زەویە.

لەماوەی چاودێری کردنی مەریخدا، ئەستێرە ناسان هەندێك شتیان دیت، ئەوەی پیشان دەدا کەجۆرێك لەجۆرەکانی ژیان لەسەر مەریخدا هەبێت.

یەکەم شت کەتێبینیان کرد، ئەوە بو مەریخیش وەکو زەوی وەرزی هەیە، کاتێك وەرزەکان دەگۆڕێت گۆڕانکاریش لەسەر ڕوی مەریخدا ڕو دودات.

ناوچە تاریکەکانی لەبەهارو هاویندا بەهێزتر دەبن‌و ڕەنگە سەوزەکانیش دەگۆڕێت بۆ ڕەنگی شین‌و زەرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەڕوەکەکان ژیانیان تێدایە، ئەستێرە ناسان باوەڕیان وایە بڕێکی کەم لەهەڵمی ئاو لەکەشی مەریخدا هەیە، ئەشێ ئەمەش بەسود بێت بۆ پاڵپشتی ژیان.

لەساڵی ١٨٨٧دا ئەستێرە ناسی ئیتالی "جیوفانی شیا باریلی" وتی: چەند نیشانەیەکی دیوە لەسەر مەریخ، بریتیبوە لەکەناڵی ئاو، پرسیاری ئەوەی کرد ئایا دەشێت دانیشتوانی سەر مەریخ ئەو کەناڵانەیان دروست کردبێت بۆ گواستنەوەی ئاو لەناوچە جەمسەریەکانەوە بۆ ناوچە بژاپۆنیەکان؟

لەساڵی١٩٧٦دا هەردو کەشتی ئاسمانی ئەمریکی لەسەر مەریخ نیشتنەوەو زۆر گەڕان لەزەویەکانی دەوروبەری بۆ ئەوەی نیشانەیەکی ژیان لەوێدا بدۆزنەوەو بەهۆی بێتەلەکانیانەوە بیگەیەننە زەوی.

تاقی کردنەوەکان دەریان خست کەلەگڵەکەدا میکرۆب هەیەو گڵی سەر مەریخیش وەکو گڵی سەر زەوی نیە.

ئەگەر ژیانیش هەبێت لەسەر مەریخدا، ژیانێکی زۆر سادەو ساکارە.

## رێگای کاکێش چییە؟

رەنگە هیچ شتێك لەئاسماندا نەبێت، لەرێگەی کاکێش ئاڵۆزترو جوانتر بێت، کەوەکو هێڵێکی زێڕین، لەم سەری ئاسمانەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ئەو سەری ئاسمان.

لەسەردەمی کۆندا کاتێك خەڵکی سەیری ئەو دیمەنەیان دەکرد، توشی سەر سوڕمان و واق و ڕمان دەبون، بەلاّم ئەوەی دەیانبینی نەیاندەزانی چییە، بۆیە هەمو جۆرە تەفسیرێکی نامۆو جوانیان بۆی دەکرد.

لەسەرەتای هاتنی ئاینی مەسیحیەتدا،خەڵکی بڕوایان وابو، ڕێگەیەکە فریشتەکان لێیەوە سەردەکەون بۆ ئاسمان، باوەڕێکی تریشیان وابو دەلاقەیەکە لەبەهەشتەوە بۆ ئەوەی ئێمە لەسەر زەویەوە بتوانین سەیرێکی خۆشیە ئاسمانیەکان و ئەوەی لەپشتیانەوەیە بکەین.

زانینی ڕاستیەکانی ئەمڕۆش لەسەر رێگەی کاکێشان ئەو واق وڕمانانە لابات لەڕاستیدا ڕاستیەکان سەر سوڕهێنەرە، وەکو هەر بیرۆکەیەکی خەیاڵی.

ئەومەجەڕەی ئێمە وەك کاتژمێرێکی بازنەیی وایە، ئەگەر توانیت لەسەری ڕاوەستی و لەسەرەوە سەیری بکەیت، وەکو کاتژمێرێکی دەستی گەورە وایە، بەلاّم ئێمە لەناو مەجەڕەکەداین، کاتێك سەیری سەرەوە دەکەین، ئەوا سەیری کەنارەکەی دەکەین لەناوەڕاستی کاتژمێرەکەوە، بۆیە ئەو کەنارەی وەکو بازنەیەك دەبینین بەچوار دەورمانداو ملیۆنەها ئەستێرەی تێدایە کەلەشێوەی ڕێگەی کاکێشدا دەیبینین.

ئایا دەزانیت سێ هەزار ملیۆن ئەستێرە لەو مەجەڕەیەدا هەیە.

ئەگەر بتەوێت تەسەوری قەبارەکەی بکەیت، دەبێت بزانیت، تیشکی خۆر پێویستی بەهەشت خولەك هەیە تادەگاتە سەر زەوی، بەڵام ئەو تیشکە لەچەقی مەجەرەکەوە تابگاتە خۆر پێویستی بە٢٧هەزار ساڵ هەیە.

مەجەرەکە لەشێوەی خولەك ژمێردا بەدەوری چەقەکەیدا دەسورێتەوەو پێویستیشی بە نزیکەی دوسەد ملیۆن ساڵ هەیە تاسورێك بخوات.

## درەوشاوەترین ئەستێرە کامەیە؟

ئایا رۆژێك لەرۆژان سەیری ئاسمانت کردوە تابزانیت، کام ئەستێرە درەوشاوەترە؟

ئایا دەزانیت ژمارەی ئەو ئەستێرانەی کەدەتوانیت بیانبینیت هێندە زۆرن لەژمارە نایەن.

زۆرترین ژمارە کەبتوانیت بەبێ بەکارهێنانی وردبین ببینیت نزیکەی شەش هەزار ئەستێرەیە.

لەسەردەمی ئەستێرە ناسانی یونانیدا، دوهەزار ساڵ پێش ئێستا، ئەستێرەکان کرابونە دوبەشەوە بەگوێرەی درەوشاوەییان.

پێش داهێنانی وردبین تەنیا شەش گروپ ئەستێرە هەبون ئەوانیش بەگوێرەی درەوشاوەییان پۆلین کرابون.

ئەستێرەکانی پلەی یەکەم زۆر درەوشاوە بون لەکاتێکدا ئەستێرەکانی پلە شەشەم کەمترین درەوشاوەییان هەبو ئەستێرەکانی ژێر پلە شەشەم نەدەتوانرا بەبێ بەکارهێنانی تلسکۆب ببینرێت.

بەڵام ئەمرۆ بەهۆی ئەو ئامێرە پێشکەوتوانەی گەردون بینیەوە دەتوانرێت ئەستێرەکانی پلە بیست و یەکەمیش ببینرێت.

ئەستێرەکان لەهەر پلەیەکدابن بەدو جارو نیو لەو ئەستێرەی کەلەسەرویەوەتی بێ هێزترن.

بیست و دو ئەستێرە هەیە کەلە هەمو ئەستێرەکان درەوشاوەترن، لەناو ئەوانیشدا درەوشاوەترین ئەستێرە "ئەلشعری ئەلیمانیە"یە. بەهەزار جار لەلاوازترین ئەستێرە درەوشاوەترە کەبەچاو دەبینرێت.

لەپلەی یەکەمدا بیست و دو ئەستێرە هەیەو لەپلەی بیستەمیشدا نزیکەی هەزار ملیۆن ئەستێرە هەیە.

## قاوه چۆن دۆزرا یەوە؟

وەکو شتەکانی تر، دۆزینەوەی قاوەش پڕیەتی لەئەفسانە، هیچ کەس بەتەواوی نازانێت یەکەمین کەس کێ بوە یەکەمین فنجانە قاوەی نۆش کردوە.

بەڵام ئەفسانەیەك هەیە دەڵێت: پێش هەزار ساڵ پیاوێکی حەبەشی "ئەسیوپیای" ئێستا ڕوەکێکی دەشتی بینی دەسوتێتو بۆنێکی خۆشی لێدەردەچێت.

ئەویش هەندێك لەدانەکانی خوارد، تامی خۆش بو بەلایەوە، بۆیە شەرابێکی لێ دروست کردو بەوجۆرەش قاوە دۆزرایەوە.

ئێمە دەزانین حەبەشیەکان لەڕۆژ هەڵاتی ئەفریقیادا یەکەم کەس بونە قاوەیان دۆزیوە تەوە.

تاسەدەی پانزەهەم حەبەشە تەنیا شوێنێك بوە لەجیهاندا، کەداری قاوەی لێ ڕواوە.

پاشان گوازرایەوە بۆ نیمچە دورگەی عەرەبیو بەدرێژای ٢٠٠ساڵ دوای ئەوە، هەمو خەڵکی قاوەی یەمەنیان دەخواردەوە.

لەسەدەی حەڤدەهەمدا هۆڵەندیەکان دەستیان دایە کشتکردنی قاوەو بەچەند وڵاتێکی ئیستیوائیشدا بڵاویان کردەوە.

بەریتانیەکان داری قاوەیان لەجامایکاوە بردە وڵاتی خۆیانو لەوێشەوە بۆ ئەمریکای ناوەندو باشور، تا زۆری پێ نەچو قاوە جەماوەرێکی زۆری پەیدا کرد لەهەردو ئەمریکاو ئەوروپادا.

داری قاوە لەناوچە ئیستیوائیەکاندا گەشە دەکات، باشتر وایە لەزەویەکی تۆزێك بەرزدا بچێنرێت، چونکە ئاوی بەباشی دەردەچێت، ئەم جۆرە گڵو کەشو هەوایەش لەبناری تەپۆلکەکانی بەرازیلدا هەیە، لەبەر ئەو هۆیەیە بەرازیل سێ لەسەر چواری قاوەی جیهان بەرهەم دەهێنێت.

گەورەترین کێڵگەی بەرهەم هێنانی قاوەی جیهان لەبەرازیلدایە، هەندێك لەو کێڵگانە ملیۆنەها داری قاوەی تیایە کەچەندین میل زەوی داگیر کردوە.

هەروەها ئەم وڵاتانەش قاوەی زۆر بەرهەم دەهێنن "ڤنزوەیلا، کۆڵومبیا،

گواتيمالا، مەكسيكو جاواو هيتر".

داری قاوه بەرەكەی كەلە گیلاسی بچوك دەچێت لەتۆوێك دروست دەبێت دەبێت بخرێتە ناو خۆڵەوە.

بەرەكەشی لەسەر بێشەڵانێكی چڕ كەگەڵاكانی دەبریسكێتەوە گەشە دەكات، بەرهەمەكەشی یان یەك لەپ یان دو لەپەیە.

لەدونیادا زیاتر لەبیستوپێنج جۆر داری قاوه هەیە لەناوچە مەداریەكاندا، بەڵام تەنیا دو جۆری لەكاتی برژاندندا بەرەكەی تامێكی تایبەتی دەدات.

## یاری شەترنج چۆن پەیدا بو؟

رەنگە یاریەك نەبێت بەدرێژای سەدان ساڵە هێندەی شەترنج شتی لەسەر نوسرا بێت، ئەم یاریە بەیاری "پاشایان"یش ناو دەبرێت، چونكە بەشای یاریەكان دادەنرێت.

دەشێت شەترنج كۆنترین یاری بێت مرۆڤ دایهێنابێت، هەندێكیش دەڵێن تەمەنی لەدەوروبەری پێنج هەزار ساڵدایە.

ئێمە دەزانین وشەی شەترنج لەشەش رەنگەوە هاتوە، واتا" شا، وەزیر، فیل، ئەسپ، قەڵا، سەرباز" هەندێكیش دەڵێن لەوشەی"شاه مرد"ەوە هاتوە.

بەڵام ئایا بنەرەتی شەترنج فارسیە؟

هیچ كەس ناتوانێت بەدڵنیاییەوە ئەو پرسیارە وەڵام بداتەوە.

رایەك هەیە دەڵێت ئەسڵی ئەم یاریە لەنێو بوزیەكانی هیندستاندا دروست بوە.

چۆن بوزیەكان باوەڕیان وایە جەنگو كوشتنی مرۆڤەكان لەنێوانی خۆیاندا بەهەر هۆیەك بێت تاوانە، لەبەر ئەوە بوە شەترنجیان داهێناوە وەكو جێ گرتنەوەیەكی جەنگ.

زۆر لەسەرچاوەكان باوەڕیان وایە شەترنج لەهیندستانەوە پەیدا بوەو لەوێوە بڵاوبۆتەوە بۆ وڵاتانی فارسو عەرەبو ئەوروپای رۆژئاوا.

پارچەكانی شەترنجیش بەدرێژای مێژو گۆڕانكاری زۆری تیا كراوە، لەكۆندا دەتوانرا شا بەدیل بگیرێت، بەڵام ئەوە ئەمڕۆ لەیاری شەترنجدا شتێكی موستەحیلە.

هێنانی "قەڵا" بۆ ناو یاری شەترنج بیرۆکەیەکی تازەیەو تەمەنی نزیکەی چوارسەد ساڵە.

بەڵام مێژووی وەزیر لەهەمووی زیاتر سەرنج ڕاکێشترە، ماوەیەکی زۆر ڕابوردو ئەم پارچەیە ناوێکی هەبو مانای "وەزیر" یان "ژەنەڕاڵ"ی دەدا.

ئێستا ئەگەر وەزیر بکوژرێت یاری چی هەست دەکات کەبەهێزترین پارچەی دۆڕاندوە.

بەڵام لەسەردەمی کۆندا وەزیر دەیتوانی تەنیا یەك چوار گۆشەی لابەلا بجوڵێتەوە، لەبەرئەوە لاوازترین پارچەکانی شەترنج بو.

ئەو هێزەی ئەمڕۆ وەزیر هەیەتی لەشەترنجدا تەمەنی نزیکەی "٥٠٠" ساڵە.

بەڵام سەربازەکان وادیارە بەبێ گۆڕان سەدان ساڵەو، وەکو خۆیان ماونەتەوە.

وشەی "رخ"یش لەوشەی "رخ–rukh"ی هیندییەوە وەرگیراوە کە بەواتای سەرباز دێت.

ماوەتەوە بڵێین ئەمڕۆ لەسەرانسەری جیهاندا بەیاریچی‌و بینەرەوە ملیۆنەها کەس سەرگەرمی ئەم یاریەن.

## ئاگر چۆن بەئاو دەکوژێتەوە؟

پێش ئەوەی باسی چۆنیەتی کوژاندنەوەی ئاگر بکەین، بابزانین داگیرسانی ئاگرێگ، یان کەوتنەوەی ئاگرێك پێویستی بەچی هەیە؟

سێ شت پێویستە تا ئاگرێك بکرێتەوە یان بکەوێتەوە، یەکەمیان سوتەمەنیە وەکو دارو‌و کاغەزو ئسپرتۆ.

دوەمیان، ئۆکسجینە، سوتەمەنیەکە لەگەڵ ئۆکسجینەکە بەخێرای یەکدەگرن کاتێك دارەکە یان کاغەزەکە دەسوتێت، ئەوا سوتەمەنیەکە زۆر بەخێرای لەگەڵ ئەو ئۆکسجینەی لەهەوادا هەیە یەکدەگرن.

شتی سێیەم کەپێویستە گەرمایە، پارچە کاغەزێك یان دارێك لەبەر هەوادا بێت هەرگیز لەخۆیەوە گڕ ناگرێت، بۆیە دەبێت شقارتەیەك یان ئاگرێگ بەکاربێنین تاکاغەزەکە ئاگر بگرێت.

کاتێك کاغەزەکە بەشێوەیەکی تەواو گەرم دەبێت ئۆکسجینەکە بەتەواوی لەگەڵیا

تێکەڵ دەبێت و دوای ئەوە کاغەزەکە گڕ دەگرێت.

سێ ڕێگەی سەرەکی هەیە کەدەتوانرێت بەهۆیەوە ئاگر بکوژێنرێتەوە، کەلەهەر یەکێکیاندا دەبێت یەکێك لەو یارمەتی دەرانە کەپێویستی ئاگرە لاببەین.

ڕێگەی یەکەم: لابردنی هەندێك سوتەمەنی.

ڕێگەی دوەمیش: قەدەغەکردنی ئۆکسجینە، لەئاگرەکە، ئەگەر ئۆکسجین نەما ئەوا ئاگرەکە خۆی دەکوژێتەوە.

ناشێت ئاگر لەدوەم ئۆکسیدی کاربۆندا بگرێت، بۆیە لەکاتی کوژاندنەوەی ئاگردا دەبینین پیاوانی ئاگر کوژێنەوە، بۆ کوژاندنەوەی ئاگرێگ چینێك دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەکەنە سەر ئاگرەکەدا، بەوەش ئۆکسجینی لێ دەبڕن.

ڕێگەی سێیەمیش: بۆ کوژاندنەوەی ئاگرێگ لابردنی گەرمایە لەسەر ئاگرەکە، بۆیە ئاو دەرژێننە سەر ئاگردا، چونکە ئاوەکە گەرماکە دەمژێت و پلەی گەرمای نزم دەبێتەوە، کاتێك پلەی گەرماش دادەبەزێت، سوتەمەنیەکە لەسوتان دەوەستێت هەندێك ئاگر هەیە بەئاو ناکوژێتەوە، وەکو ئەو ئاگرانەی کەڕۆن و پیویان لەگەڵدایە.

هەرچەند ئاویان بەسەردا بکەیت دەکەونە سەر ئاوەکەو ئاگرەکە وەکو خۆی بەبەردەوامی دەمێنێتەوە.

## کێ ئوسترالیای دۆزیەوە؟

ئوستراليا گەورەترین دورگەیە لەجیهاندا، لەهەمان کاتیشدا بچوکترینی کیشوەرەکانە، ڕوبەرەکەی "٧٦٨٧٠٠٠" کیلۆمەتری دوجایە.

تاچەرخی ناوەڕاست، دەنگو باسێك هەبو دەربارەی کیشوەرێکی گەورە لەنیو گۆی باشوردا.

بەڵام کەس نەیبینی بو، خەڵکی پرسیاریان دەکرد دەربارەی و ئایا کەسی تیا نیشتە جێ بوە.

بەو سەرزەمینەیان دەوت "تیرا ئوسترالیس ئەنگۆ گنیتا" واتە سەرزەمینی باشوری نەناسراو.

لەئەوروپیەکان هۆڵندیەکان یەکەمین کەس بون سەردانی ئوسترالیایان کرد، ئەو

كاتەی دۆزیانەوە کەخەریکی هاتو چۆ بون لەنێوان ئوسترالیاو دورگەی "جاوە" کەموستەعمەریەکی هولەندی بوۆ لەباشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

کەشتیەکان واڕاهاتبون کەلەهۆڵەنداوە دەچون بۆ جاوە، دەبوایە بەسەر دیوی باشوری ئەفریقیادا، لە"راس رجا الصالح"ەوە، سوڕیان بخواردایەو ئینجا بەزەریای هیندستانیدا لەگەڵ بای ڕۆژئاوادا بسوڕانایە.

زۆر لەکەشتیەوانەکان ماوەیەکی زۆر دوریان دەبڕی بەرەو ڕۆژهەڵات، پێش ئەوەی بەلای باکوردا بسوڕێنەوە بەرەو جاوە، تاوای لێدەهات خۆیان لەبەردەمی لێوارەکانی ڕۆژئاوای ئوسترالیادا دەدیتەوە.

دوای ئەوەی ناوی هۆڵەندای نوێیان نایە بەشی ڕۆژئاوای ئەم کیشوەرەوە.

لەساڵی ١٦٤٢دا هۆڵەندیەکان کاپتن "ئابیل تاسمان" یان نارد بۆ دۆزینەوەی بەشی ڕۆژهەڵاتی کیشوەرەکە، کاپتن دورگەیەکی دۆزیەوە کەئێستا بە"تاسمانیا" ناسراوەو هەروەها دوای ئەوەش نیوزلەندەو لێوارەکانی باکوری ئوسترالیای دۆزیەوە.

لەساڵی ١٧٧٠دا کاپتنی ئینگلیزی جمیس کوك لێوارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئوسترالیای دۆزیەوەو ناوی"نیوساوس ویلز"ی لێناو، سەردانی کەنداوی "بۆتان"ی کرد لەنزیك ئەو شوێنەی ئێستا شاری سیدنییە.

لەساڵی ١٧٨٨دا یەکەمین موستەعمەرەی بەریتانی دامەزێنراو کەدوای ئەوە بو بەشاری سیدنی.

## کەی بۆ یەکەمجار نان دروستکرا؟

هەمو وڵاتێكو هەموو ناوچەیەك لەجیهاندا، خواردنی تایبەتی خۆیان هەیە، بەڵام تەنیا خواردنێك کەهەمو دانیشتوانی سەر زەوی وەك یەك بیخۆن نانە.

هۆیەکەشی ئەوەیە کەمرۆۂ لەدێر زەمانەوە بەهای خۆراکی گەنمیان زانیوە.مرۆۂ لەسەرەتادا گەنمی بەوشکی کردۆتە دەمیەوەو کرۆشتویەتی، دوای ئەوە فێر بوە لەنێوان دوبەرداشدا بیهاڕێت، وەکو میسریەکان پێش سێ هەزار ساڵ لەزاین کردویانە.

ئەمجا ئاویان کردۆتە ئاردەکەوە بۆ ئەوەی هەویریان دەست بکەوێت، دوای

ئەوە لەتەنوردا کردویانەتە نان، بەلاّم نانێکی زۆر قورس، چونکە خومرەی تێدا نەبوە تانەرمو سوکی بکاتەوە.

گەلانی لێواری ڕۆژهەلاّتی دەریای سپی ناوەڕاست، وەکو عیبرانیەکان لەجیاتی خومرە هەویر ترشیان بەکار هێناوە.

دانیشتوانی سەر زەوی نان لەزۆر مەوادی جۆراوجۆر دروست دەکەن وەك پاقلە، نۆك، لۆبیا، فاصۆلیا، پەتاتە، برنجو بەرو هیتریش.

## چۆن دابو نەریتی ماچ کردن پەیدابو؟

**نەریتێك تەنانەت منداڵەکانیش**

**حەزی پێدەکەن، بەلاّم بەمجۆرە نا**



هەمومان دەزانین ماچکردن جۆرێکە لەگوزارشتکردن لەخۆشەویستی، بەلاّم ماوەیەکی زۆریش پێش ئەوە نەریتێك بوە بۆ گوزارشت کردن لەخۆشەویستیو ڕێزو مەزن ڕاگرتن لەزۆر ناوچەی جیهاندا.

زۆر لەخێڵە ئەفریقیەکان ئەو زەویەیان ماچ دەکرد کەسەرۆك خێڵەکانیان بەسەریدا ڕێیان دەکرد، دەست ماچ کردنیش هەر لەکۆنەوە نیشانەی ڕێزگرتنو خۆشەویستی بوە.

ڕۆمانیەکانیش دەمو چاویان ماچ دەکرد وەکو شێوازێك لەشێوازەکانی ڕێزگرتن، بەلاّم یەکێك لەئیمپراتۆرەکانی ڕۆمان ڕوخسەتی دایە دارو دەستەکەی لێوی ماچ بکەن، ئەوانەش کەمێك پلەو پایەیان کەمتر بو دەبوایە دەستیان ماچ کردایە، ئەوانەش زۆر لەخوارەوە بون قاچیان ماچ دەکرد.

ئەشێت ماچ کردن وەکو تەعبیرێك بۆ خۆشەویستی لەسەردەمی یەکەمین مرۆڤەوە دەستی پێ کردبێت، کاتێك دایکێك نازی داوەتە منداڵەکەی، وەکو ئەمڕۆ دەیبینین لەگەڵ منداڵەکانیان دەیکەن، بەلاّم کۆمەڵگا ئەوەی قبوڵ کرد وەکو

خۆشەویستیەك تەنانەت لەناو گەورەكانیشدا.

بەڵگە هەیە كۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئەو نەریتەی لەسەدەی شانزەهەمی زاینی دا قبوڵ كردبێت.

فەرەنسا یەكەمین وڵات بوە ماچ كردنی وەكو نەریتێك وەرگرتوە كەتەعبیر لەخۆشەویستی و غەزەل بكات، كاتێك سەماكردن بو بەكارێكی میللی هەمو سەماكان بەماچكردن كۆتای دەهات.

لەفەرەنساوە ماچكردن بەخێراییەكی زۆر بەهەمو وڵاتانی ئەوروپادا بڵاوبوەوە، روسیاش حەزی كرد ئەو نەریتەی فەرەنسا لاسای بكاتەوە، بۆیە لەناو چینە بەرزەكانی كۆمەڵگای ڕوسیادا بڵاوبوەوە، ئەگەر قەیسەر ماچی هەركەسێكی بكردایە ئەوە گەورەترین ڕێزو شەرەف بو لەقەیسەرەوە بۆ ئەو كەسە.

بەتێپەربونی ڕۆژگار ماچ كردن و بەبەشێك لەنەریتی خۆشەویستی، لەگەڵ پێشكەوتنی ژن هێناندا ماچ كردن لەڕۆژئاوادا گۆڕا بۆ بەشێك لەژن هێنان.

ئەوەی ئەمڕۆ بڵاوە، ماچ كردن تەعبیرە لەخۆشەویستی و سۆز، بەڵام لەزۆر شوێنی دونیادا بەشێكە لەئاهەنگە سەرەكیەكان، كەمەبەست تیایدا تەعبیرە بۆ ڕێزو خۆشەویستی.

## یەكەمین كەمانچە؟

پێش خستنی كەمانچە سەدانساڵی خایاندوە، مێژوی لەهیندستانەوە دەست پێ دەكات.

ئەشێت قەوسەكەی لەوێوە داهێنرابێت بۆ ژەنینی ئامێرێكی ژێ دار.

لەچەرخی ناوەڕاستدا، لەئورپادا ئامێرە ژێدارە جۆراوجۆرەكان بەهۆی قەوسی كەمانچەوە ژەنراون.

لەو ئامێرانە ئامێری "ڤایل" كەلەسەدەی دەهەمی زاینی یەوە چوە ئەوروپاوە، ئامێری ڤایل، هەروەكو كەمانچە بو لەسەرشان دادەنرا، بەڵام دوای ئەوە ئەم ئامێرە بەكارتێكردنی ئامێری ڕوبابە گۆڕرا.

ئەو شێوە جوانەی ئێستای كەمانچە لەنێوان ساڵانی "١٥٥٠"و "١٦٠٠"ی زاینیدا بەخۆیەوە بینی، ئەستەمە دیاری كردن و ناسینی ئەو كەسە كەكێ بوە بۆ

يەكەمين جار ئامێرى كەمانچەى دروست كردووە.

بەلام سەركەوتوترين ئامێرى كەمانچە لەنێوان سەدەكانى حەڤدەهەمو هەژدەهەمدا دروست كرا، لەئيتاليادا خێزانى زۆر بەناوبانگ هەبون لەدروست كردنى كەمانچەدا هەر خێزانێكيش نهێنى تايبەتيان بەخۆيان هەبو لەدروست كرنيدا كەكوڕان لەباوكەكانيانەوە وەريان دەگرت.

خێزانى "ئەماتى" لەشارى كريمۆيا كەمانچەيەكيان دروست كرد كەدەنگەكەى تامو چێژێكى تايبەتى هەبو.

بۆ ماوەيەكى زۆر، بيرو ڕا وابو كەس لەدونيادا نيە، كەمانچە لەوان باشتر دروست بكات.

بەلام لينكۆلۆ ئەماتى قوتابيەكى بليمەتى هەبو ناوى" ئەنتۆنيۆ ستراديفاى" بو نازناوى ماملۆستاى مامۆستايانى لێنرا، ئەم بليمەتە قەبارەى كەمانچەى گەورە كردەوەو بەمەش ئامێرى كەمانچە هێزو ئاوازى گەورەتر بوەوە.

دەلێن ئەنتۆنيۆ "١١١٦" ئامێرى كەمانچەى بەدەستى خۆى دروست كردوە، كەتائێستاش "٥٤٠" ئامێرى لەدونيادا ماوە، كەهەريەكەى پارەيەكى زۆرى تێچوەو لەهەمان كاتيشدا بەكارێكى هونەرى مەزن دادەنرێت.

دەلێن بليمەترين كەمانچەژەنيش تا ئەمڕۆ لەسەر ڕوى زەويدا نيكۆلۆ بوە كەلەنێوان سالانى ١٧٨٤و ١٨٤٠دا ژياوە.

## بۆچى پێويستمان بەئۆكسجين هەيە؟

دەشێت گياندەران بتوانن بۆ ماوەى چەند هەفتەيەك بەبێ خواردن بژين، هەروەها چەند ڕۆژێكيش بەبێ ئاو، بەلام بەبێ ئۆكسجين لەچەند خولەكێك زياتر ناژين.

ئۆكسجين زۆرينەى توخمە شيميايييەكانە لەسەر زەويدا، لەهەمو شوێنێكى دەوروبەرماندا هەيەو يەك لەسەر پێنجى هەوا پێك دێنێت "زۆربەى ترى هەوا نايترۆجينە"، ئوكسجين لەگەڵ توخمەكانى تردا يەكتر دەگرن، لەزيندەوەرانيشدا لەگەڵ هايدرۆجين و كاربۆن و مەوادەكانى تردا يەكتر دەگرن.

لەمرۆڤيشدا دولەسەر سێى كێشى مرۆڤ پێك دەهێنێت.

لەپلەی گەرمای ئاسایدا ئۆکسجین لەگەڵ توخمەکانی تردا زۆر بەشێنەی یەکدەگرێت، کاتێك ئۆکسجین لەگەڵ توخمەکانی تردا یەکدەگرێت مەوادی نوێ دروست دەبێت پێی دەوترێت ئۆکسید، کردارەکەش پێی دەوترێت کرداری یەککگرتنی بەئۆکسید بون.

بەئۆکسید بون لەزیندەوەراندا لەهەمو کاتێکدا دەبێت، خواردن سوتەمەنیی خرۆکە زیندوەکانە، کاتێك خواردنەکە تەئەکسود دەکات، وزە دروست دەبێت ئەو وزەیەش بەکار دەهێنرێت بۆ جوڵاندنی لاشەو دروست کردنی مەوادی تازە لەلەشدا، تەئەکسودی لەسەر خۆش لەزیندەوانی زیندودا پێی دەوترێت" هەناسەدانی ناوخۆی".

مرۆۋ لەرێگەی سیەکانیەوە هەناسە دەدات و لەوێوە ئۆکسجین دەچێت بۆ سوری خوێن ئەمجا پەخش دەبێت بەهەمو لەشدا.

لەبەر ئەوە پێویستمان هەیە بەئۆکسجین بۆ دروست کردنی وزە تالەش بتوانێت ئیش بکات.

ئەو کەسانەی کێشەی هەناسەدانیان هەیە دەخرێنە ژێر ئۆکسجینەوە، ئەو هەوایەش نەخۆشەکە دەیمژێت رێژەی ٤٠ بۆ ٦٠ لەسەدی ئۆکسجینە بۆیە نەخۆشەکە وزەیەکی کەم بەکار دەهێنێت بۆ دەست خستنی ئەو ئۆکسجینەی کەپێویستیەتی.

لەگەڵ ئەوەی بەردەوام ئۆکسجین بەکار دەبرێت، بەڵام رێژەکەی هەرگیز کەم ناکات، چونکە روەکەکان لەکاتی دروست کردنی خۆراکیاندا ئۆکسجین دەردەدەن، ئەمەش یارمەتی پاراستنی رێژەی ئۆکسجین دەکات لەسروشتدا.



## بۆچی پێدەکەنین؟

ئایا یەکێك لەئێوە نوکتەیەکی وتوەو سەیری کردبێت بەرامبەرەکەی پێ

ناکەنێت؟

ئایا دەزانیت هەندێك کەس هەرگیز پێ ناکەنن؟ هەندێکی تریش هەمیشە دەمیان بەپێکەنینە، ئێمە بۆیە پێدەکەنین تاگوزارشت لەهەستی خۆمان بکەین، ئەو هەستەشمان یان تەنیا خۆشیە یان کات کوشتنە یان میزاجێکی جوانە.

پێکەنین هەرگیز بەهۆی کردارێکی میکانیکیەوە دروست نابێت،تەنیا یەك هۆی میکانیکی هەیە بۆ پێکەنینەویش ختوکە دانە، ختوکەش لەکردارێکی پێچەوانەی زیاتر بۆ بەشێکی لەشی مرۆڤ بۆ جۆرێکی دیاری کراو لەوروژاندن هیچی ترنیەو بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بەو پێکەنینەوە نیە کەدەیکەین.

مرۆڤ کاتێك پێ دەکەنێت گوزارشتێکی خوڕەس لەهەستیەوە دەکات کەلەبینینێك یان خەیاڵ کردنێك یان بیرکردنەوەیەك، یان شتێکی ترەوە سەرچاوەی گرتوە، ئەو شتەش دەبێت پێکەنینمان تیا دروست بکات.

• بۆچی کاردانەوە پێکەنینمان تیا دروست دەکات؟

ئەو پرسیارە بەجێ دێڵین بۆ زانایانی دەرون ناسی، ئەوانەی لێکۆڵینەوە لەسەر رەوشتی مرۆڤ دەکەن.

هەرچەند زانایان بەکۆمەڵێك بیردۆزەوە لەسەر ئەو بابەتە هاتنە دەرێ، بەڵام هێشتا هیچ کامیان وەڵامێکی تێروتەسەلی ئەو پرسیارەیان نەداوەتەوە.

هەندێك دەڵێن پێکەنین کردارێکی (کۆمەڵایەتی)یە کەسێك بەتەنیا سەیری تەلەفزیۆن بکاتو شتێکی پێکەنین هێنەر ببینێت بەدەنگی بەرز پێ دەکەنێت، بەڵام ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك هاورێی دا بێت ئەوە هەمویان پێکەوە بەدەنگی بەرز پێ دەکەنن بانمونەیەکی تر وەرگرین.

کۆمەڵێك خەڵك پێکەوە دانیشتوانو باسو خواست دەکەنو پێ دەکەنن، تەنیا یەکێکیان نەبێت گوێیان لێدەگرێتو پێ ناکەنێت، دەزانن بۆچی؟ لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا نامۆیە.

چەندین شتی تریش هەیە وامان لێدەکات پێ بکەنین، وەکو کەسێك لەپێش چاوماندا بخلیسکێت یان بکەوێت، ئێمە پێ دەکەنین لەبەرئەوەی وادەزانین لەوکاتەدا ئێمە لەئەو باشترین، بۆیە دڵخۆش دەبینو بەپێکەنین گوزارشت لەو

هەستەمان دەکەین.

تەنانەت پێکەنینەکانیش بەگوێرەی هۆیەکەی دەگۆڕێت، گاڵتەوگەپ جۆرێك پێکەنین دروست دەکات، گاڵتە جاریش جۆرێکیترو کۆمیدیاش جۆری سێیەم.

دەشێت ئێمە بۆ شکاندنی کەسێك پێ بکەنین، بۆیە دەبینین پێکەنین گوزارشت لەهەستەکانمان دەکات.

## یەکەم شانۆی جیهان

بۆ تەماشاکردنی شانۆکاران، بینەران سڵیان

لەگەرمای هاوین و سەرمای زستان نەدەکردەوە

بیرۆکەی شانۆ خۆی لەئاینەکانەوە دروست بوە، ئەو پێشکەوتنەش ئەمڕۆ لەشانۆدا دەیبینین بەرهەمی سەدان ساڵە.

چینییەکان لەسەرەتاوە جۆرێك سەمایان دەکردلەپەرستگاکانیاندا لەشانۆگەری دەچو. دوای ئەوە شوێنی تایبەت بەکارهێنرا بۆ نواندن کەبریتی بو لەتەنیا سەکۆیەکی سەرواڵا بەبێ پەردەو ڕوناکی.

یونانیەکان لەسەردەمی کۆندا جۆرێك لەشانۆیان پێش خست کەناوی جۆری دراماکە "نو" بو، جۆرێکیتریش لەدرامای میللی یان پێش خست بەناوی "کابوکی" کەتیایدا نواندن لەسەر سەکۆیەکی سەرگێراو دەکرا وەك پەرستگاکان.

لەهیندستانی کۆندا نواندنی شانۆیەکان لەسەر سەکۆیەکی بەرز دەکرا، کەتایبەت بۆ نواندن دروست کرابو پەردەیەکیشیان لەپشتەوەی دادەنا.

بەڵام یۆنانییە کۆنەکانی وڵاتی گریك جۆرێکی زۆر مەزنیان لەدراما پەرەپێدا، کەبینەران لەبناری گردێك دادەنیشتن و شانۆ کارانیش، لەناو بازنەیەکدا شانۆ نامەکەیان پێش کەش دەکرد، هەروەها لەتەنیشت شانۆکەوە خانویەك هەبو پێ یان دەوت "سکین" کەبۆ خۆگۆڕینی شانۆکاران بەکاریان دەهێنا.

لەچاخەکانی ناوەڕاستدا کەنیسە ڕەخنەی توندی لەهەمو جۆرەکانی دراما گرت، بەڵام دوای ئەوە شانۆی ئاینی بو بەبەشێکی گرنگ لەژیانی کەنیسە.

کاهینەکان چاخی ناوەڕاست بەشێك لەچیرۆکەکانی ناو ئینجیلیان کردە دراما، وەکو بەشێك لەنەریتە ئاینیەکان.

لەبەریتانیاداو لەسەردەمی ئەلیزابیسی یەکەمدا شانۆ هەنگاوێکی زۆر گەورەی بۆ پێشەوە نا.

لەساڵی ١٥٧٦دا شانۆکاری بەناوبانگ "جمیس بوریج" یەکەمین خانەی شانۆی دروست کرد بەناوی "شانۆ" لەسەر شێوەی ئەو شانۆیانە دروست کرا کە لەگۆڕەپانی هوتێلەکاندا دروست دەکراو،شانۆییەکانی شەکسپیری تیادا پێشکەش کرا.

هەروەها رادپول بلاکفریا کە تیایدا بینەران لەبەرامبەر لاشانو دەوروبەرو سەرەوەی شانۆیەکەدا دادەنیشتن، بۆیە سەرەتای شانۆی هاوچەرخ لەو شانۆییە ئینگلیزیانەوە دروست بو.

## چینی ئۆزۆن

مرۆڤ وردە وردە هەست بەوە دەکات، ئەوەی کەڕۆژانە ئەنجامی دەدات لەکاری رۆژانەیدا دەشێت کار بکاتە سەر کەش‌و هەواو ئاو ئەو خواردنەی کەدەیخوات‌و ئەو هەوایەی کەهەڵی دەمژێت‌و هتد.

وائێستا هەندێك دو دڵی لەشتی تریش هەیە کەلەهەوادا بڵاوی دەکەینەوە، دەشێت کاریگەری زیانبەخشی هەبێت لەسەر چینی ئۆزۆن.

کەواتە چینی ئۆزۆن چییەو بۆچی گرنگە؟

زەوی بەبەرگێکی زۆر ئەستور لەهەوا دەورە دراوە، ئەویش بەرگە گازە ئەو بەرگەش یەکێکە لەوشتانەی کەوا دەکات زەوی هەسارەیەك بێت بۆ ژیان ئەو بەرگەش هەر ئەو هەوایەیە کەهەناسەی پێ دەدەین، لەوتیشکە مەترسی دارەی کەخۆر بۆمانی دەنێرێت دەمانپارێزێت، هەروەها زەویش لەگەرمای لەڕادەبەدەرو سەرمای ڕادەبەدەریش دەپارێزێت.

ئەو بەرگە گازە بەچەندین ڕێگەی تریش خزمەتمان دەکات، بەرگەگاز دەکرێتە دو چینەوە کەهەریەکەیان لەوی تریان جیاوازە.

چینی خوارەوە بەرزیەکەی ١٦ کیلۆمەترەو پێی دەوترێت" ترۆپۆسفێر" زۆربەی کەش‌و هەوای ئێمە لەم چینەدایە.

چینی دوەم بەرزیەکەی لەنێوان ١٦ بۆ ٤٨ کیلۆ مەتردایەو پێی دەوترێت "ستراتۆسفیر".

چینی ئۆزۆن دەکەوێتە ناوچەی نێوان ١٩و ٣٥ کیلۆ مەترەوە لەناوەڕاستی ستراتوسفیردا.

ئەم چینی ئۆزۆنە جۆرێکە لەجۆرەکانی ئۆکسجین، لەوناوچەیەدا بانیە، هەواش تیادانیە، هەر ئەوەش وادەکات هەوا گەرم بێت.

هەر ئەو گازەیە زۆربەی تیشکی سەروی وەنەوشەیی کەخۆر بۆمانی دەنێرێت دەمژێت، کەئەنجامەکەی پێچراوەیەکە لەهەوای گەرم، بەلآم لەوە گرنگتر ئەوەیە ئۆزۆن ڕێگری دەکات لەگەیشتنی زۆربەی تیشکی سەرو بنەوشەیی بۆ سەر زەوی ڕێژەیەکی کەم لەو تیشکە بۆ ئێمە سود بەخشە، بەلآم ئەگەر ڕێژەکەی زۆربێت، ڕەنگە بەزیندویەتی بمانبرژێنێت.

بۆیە بۆمان دەرکەوت نابێت شتێك بلاوبکەینەوە لەهەوادا کاری خراپ بکاتە سەر چینی ئۆزۆن.

## کەی خەڵوز بەکارهێنرا؟

مرۆڤ لەدێر زەمانەوە خەڵوزی بەکارهێناوە، ڕەنگە چینییەکان یەکەم کەس بوبون بەکاریان هێنابێت.

ئێستا چەند بەڵگە نامەیەك لەبەر دەستدایە، دەری دەخات کەچینیەکان لەپێش نزیکەی سێ هەزار ساڵدا، خەڵوزیان بەکارهێناوە لەتواندنەوەی مس و ئاسندا.

لەتەوراتدا ناوی خەڵوز هاتوە، ئەرستۆی فەیلەسوفی یونانیش کەلەنێوان ساڵانی ٣٨٤و ٣٢٢ پێش زایندا ژیاوە، لەنوسینەکانیدا باسی خەڵوزی کردوە.

کاتێك ڕۆمانیەکان بەریتانیایان داگیر کرد لەدەوروبەری ساڵی پەنجای پێش زایندا لەوکاتەدا خەڵوز بەکارهێنراوە، پاشماوەکەشی لەناو قوللە ڕۆمانیەکانی بەریتانیادا دۆزرایەوە.

ڕاستیەکی سەرنجراکێش و گرنگ سەبارەت بەکانگایەکی خەڵوز بەیاد دێنینەوە.

بەڵگەکان دەری دەخەن لەهەرێمی لیمبۆرگی هۆڵەندادا لەساڵی ١١١٣ زاینی دا خەڵوز دەرهێنراوە، تانیوەی سەدەی بیستەم لەکانە خەڵوز دەرهێنراوە کەئێستا

بەکانی دومانیالْ دەناسرێت.

لەناوەڕاستی سەدەی سیازدەهەمدا ژنان‌و منداڵان بەدرێژای لێوارەکانی بەریتانیادا جۆرێك خەڵوزیان دەردەهێنا کەبەخەڵوزی دەریا ناسرابو، هەر لەوکاتەشدا چەندین کانی خەڵوز لەبەریتانیادا هەبو، چونکە ئاسنگەرەکان بۆ گەرم کردنی ئاسن لەپێش کوتاندا پێویستیان بەخەڵوز هەبو، هەروەها خاوەنی دوکانە بچوکەکانیش بەخەڵوز دوکانەکانیان گەرم دەکردەوە، هەژارەکانیش خەڵوزیان لەدار پیْ باشتر بو، لەبەر ئەوەی هەرزانتر بۆیان دەکەوت.

بەڵام دەوڵەمەندەکان هەرچی پەیوەندی بەخەڵوزەوە بوایە بەکاریان نەدەهێناو نەدەچونە ئەو ماڵانەش کەخەڵوزی تیا بسوتایەو ئەو خواردنانەشیان نەدەخوارد بەئاگری خەڵوز لێبنرایە، چونکە بڕوایان وابو دوکەڵی خەڵوز خواردن ژاهراوی دەکات، ماڵەکان لەبەر ئەوەی دوکەڵْ کێشیان نەبوو و دوکەڵەکەی نەدەچوە دەرەوە، لەبەر ئەوە بو نەچونە ئەو ماڵانەی خەڵوزی لیْ بسوتایە.

دوای داهێنانی بزوێنەری هەڵمی کەگواستنەوەی خەڵوزی لەکانەکانەوە ئاسان کرد.

بەکارهێنانی خەڵوزی فراوانتر کرد، تالەئەنجامدا لەنێوان هەمو مرۆڤەکانی سەرزەویدا بڵاوبوەوە.

## دەنگدان چۆن دەستی پیْ کرد؟

مافی دەنگدان لەهەڵبژاردنە سیاسیەکاندا پێی دەوترێت "مافی دەنگدان" کەبریتیە لەدەنگ دانە ئەو پاڵێورانە بۆ شوێنە گشتیەکان خۆیان کاندید کردوە، لەسەر یاسا گشتیەکان کەدەخرێتە بەردەستی گەل بۆ ئەوەی دەنگی لەسەر بدات.

لەمێژوی مرۆڤایەتیدا باو وابوە ئەو کەس‌و کۆمەڵانە دەنگ بدەن کەئیمتیازێکیان هەبوە، بەڵام مافی دەنگدان بەیەکسانی لەئەمڕۆشدا شتێکی دەگمەنە، بۆیە ئەمەش وای کردوە کەدیموکراسیەت هەمیشە ناتەواو بێت.

بۆیە هەمیشەو هەمو کاتێك کۆت‌و بەند لەسەر دەنگدان هەبوە، کەهەندێك لەو کۆت‌و بەندانە ڕاست بوەو هەندێکیشی خراپ.

لەشوێنی جیاوازداو کاتی جیاوازدا، ئەم کۆتو بەندانە پەیوەندیان بەلەدایك بونو تەمەن ڕەگەزو ئاینو نەژادو بارودۆخی زانستیو پلەوپایەی کۆمەلآیەتی وئابوریەوە هەبوە.

لەسەرەتای دیموکراسیەت "حوکمی گەل"دا، لەهەردو یونانو ڕۆمانی کۆندا شێوەیەکی سەرەتای لەدەنگداندا هەبوە، بۆ نمونە: لەکۆبونەوە گشتیەکاندا لەئەسینا کاتێك لەسەر بابەتێك دەنگ دەدرا، خەڵکی دەستیان بەرز دەکردەوە.

بەلآم ئەگەر بابەتەکە پەیوەندی بەکەسێکەوە بوایە، وەکو لادانی کەسێك کەشیاو نەبوایە لەو جێگەیەدا، ئەوە دەنگ دانەکە بەنهێنی دەبو.

تەنیا هاولآتیانیش مافی دەنگدانیان هەبو، دەنگدان کۆیلەو بیانیەکانی نەدەگرتەوە.

لەکۆتای سەدەکانی ناوەڕاستدا، هاولآتیانی ئازاد لەشارە گەورەکاندا دەیانتوانی سەرۆکی شارەوانیەکان هەڵبژێرن، بەلآم مەرجی زۆر سەخت دانرابو بۆ ئەو دەنگدانە، ئەوە بو دەبوایە ئەو کەسەی دەنگ دەدات خاوەن موڵك بوایە.

لەسەردەمی ڕێنیسا نسیشدا کەئوروستوکرانیەت حوکمی دەرکرد، گەل مافی دەنگدانی نەبو.

بۆیەکەمین جار دوای دروست بونی چینی بازرگان لەئەوروپادا، بازنەی دەنگدان گەورە کرایەوەو مەرجی خاوەن موڵکی لەشوێنی مەرجی تایبەتی لەدایك بون دانرا لەدەنگداندا.

تەنانەت هەردو شۆڕشی ئەمەرکیو فەڕەنسیش نەیانتوانی ئەو بیرۆکەیە لەناو خەڵکدا لاببەن، کەچینێکی تایبەتی دەتوانێت مافی دەنگدانی هەبێت.

هەمو هاولآتیەکی بەریتانی ١٨ساڵی تێپەڕاندبێ، مافی دەنگدانی هەیە، ئەگەر کەم عەقڵ یان شاز یان تاوانبار نەبێت.

تاساڵی ١٨٣٢ چینێکی کەم نەبێت لەخەڵکی بەریتانیا، کەسی تر مافی دەنگدانی نەبوە تاساڵی ١٩١٨ ژنانی بەریتانیا مافی دەنگدانیان نەبوە، تەنیا ئەو ژنانە نەبێت کەتەمەنیان لەسەروی سی ساڵەوە بوە.

بەلآم لەساڵی ١٩٢٨دا مافی دەنگدانی گشتی جیٚ بەجیٚ کرا.

لەساڵی ١٨٣٢دا "یاسای چاکسازی" دەرکرا، کەمافی دەنگدانی دەدایە هەمو کەسێکی نێر، ئەگەر زەویەکی هەبوایە بەبەهای ١٠ جونەیە.

"یاسای چاکسازی" دوەم لەساڵی ١٨٦٧دا مافی دەنگدانی دایە زۆربەی پیشەوەران‌و کرێکاران، بەڵام جوتیاران نەیانتوانی تاساڵی ١٨٨٤ مافی دەنگدان بەدەست بهێنن.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ژمارەیەکی زۆر هەبون پێیانیان دەوت "دەرەبەگی پاڵێوەر" بۆ خاوەن زەوی هەبو ئەندامێك دەست نیشان بکات بۆ پارلەمان.

پێش ساڵی ١٨٣٢، ڕێژەیەکی کەم هەبو لەئەندامانی پارلەمان کەبەشێوەیەکی یاسایی لەلایەن دەنگدەرانەوە، هەڵبژێر درابون.

ئێستا دەبێت هەرکاندیدێك "٥٠٠" جونەیهی ئەستەرلینی بارمتە بکات ئەگەر ٥٪ی دەنگدەرانی بەدەست نەهێنا.

تاساڵی ١٩٤٩ هەرکەسێك لەبازنەیەکی هەڵبژاردندا بژیایەو نوسینگەکەی لەبازنەیەکی تری هەڵبژاردندا بوایە مافی دو دەنگدانی هەبو.

## داهێنەری مەکینەی بەرگدروو؟

دەڵێن پیاوێکی دۆزەرەوە، جارێکیان خۆی لەشوێنێکی زۆر دوری جیهاندا بینیەوە، کاتێك چاوپێکەوتنی لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیەدا دەکرد، باوەڕی نەدەکرد هیچ ڕویەکی شارستانی تیایاندا ببینێت، بەڵام کوت‌و بڕێکی زۆر گەورە بو کاتێك لەکوخی سەرکردەکەیاندا ئامێری بەرگ دورینی بینی.

چونکە ئەو خێڵە توانیوبیان لەنزیکترین ناوچەی شارستانی لێیانەوە، ئامێرێکی بەرگ دورینیان دەست کەوێت.

بەرگ دورین بۆ مرۆڤ زۆر گرنگە، بەمەرجێك دەبێت ئامێرێکی بۆ دابهێنرێت، بەڵام مێژوی داهێنانی ئامێری بەرگ دورین مێژویەکی زۆر تراجیدیە.

"تۆماس سنیت"ی ئینگلیزی یەکەمین ئامێری بەرگ دورینی داهێناو لەساڵی ١٧٩٠دا دەستا وێردی داهێنانی لەسەری وەرگرت.

مەواسەفەتەکانی ئەم ئامێرە زۆر لەم ئامێرە تازانەی ئەمڕۆ دەچو، مەبەست

لەدروست کردنیشی تاڕادەیەکی زۆر ئیش کردن بو لەسەر چەرم، بەڵام ئەم ئامێرە هەرگیز بەکار نەهێنراو داهێنەرەکەشی هیچ قازانجێکی لێوە دەست نەکەوت.

لەساڵی ١٨٣٠دا بەرگ دورێکی فەڕەنسی هەژار کەناوی "بارلیمی تیمۆنیر" بو ئامێرێکی بەرگ دورینی داهێنا کەزۆر لەئامێرەکانی ئەمڕۆ دەچو، لەفەڕەنسادا بەکار هێنرا، بەڵام کۆمەڵێکی توڕە لەکرێکاران کەدەترسان بەهۆی ئەو ئامێرەوە زیانیان لێ بکەوێت، هەستان کارگەو ئامێریان تێك شکاندو تیمۆنیریش بەهەژاری سەری نایەوە.

هەر لەوکاتانەدا پیاوێکی نیوێۆرکی بەناوی وولتەر هۆنت بوو، ئامێرێکی بەرگ دورینی داهێنا کەدەرزیەکی چەماوەی لەسەر بو، ئەو دەرزیەش تەقەڵی درومانەکەی لەقوماشێکەوە دەبردە ئەو دیواو، لەودیویشەوە دەزویەکی تر دەیگرت، بۆ ئەوەی ببێتە دوتەقەڵو پێکەوە بەیەکدا بچن.

بەڵام هونت نەیتوانی بۆ ئەم داهێنانەی، دەستا وێردی داهێنان وەربگرێت.

بۆیە شەرەفی دەستا وێردی داهێنانی یەکەمین ئامێری بەرگ دروین درایە "ئەلیاس هاو" لەساڵی ١٨٥١یشدا "ئیسحاق سینجەر" دەستا وێردی داهێنانی ئەمریکای بۆ ئەو ئامێرە بەرگدروەی تایبەت بەخۆی وەرگرت.

لەئەنجامی وەرگرتنی ئەو دەستا وێرد وەرگرتنەدا ناکۆکی کەوتە نێوان سینجەرو هاوەوە، بۆ ئەوەی کامیان شایانترن، بەڵام هاو لەدادگادا بردیەوەو بەوەش قازانجێکی زۆری دەست کەوت.

ئەڵبەت ئەمڕۆ هەزاران جۆر لەئامێری بەرگدروین هەیە، هەیانە تایبەتە بەدورینی "چەرم، کڵاو، لێفە، پێڵاو، قۆپچە"وە.

## کێ یەکەم کۆلارەی باڵدایەوە؟

مێژوی کۆلارە زۆر کۆنە، بەجۆرێك هیچ کەس نازانێت یەکەمجار کێ دایهێناوە، هەندێك دەڵێن: یەکێك لەگریکەکان دایهێناوە بەناوی ئەرخیتاس، لەسەدەی چوارەمی پێش زایندا، بەڵام کۆلارە پێش ئەو مێژوەش بەشێوەیەکی زۆر لەوڵاتانی رۆژهەڵاتدا ناسراو بوە.

لەچیندا کۆلارە هەمیشە بەشێکی گرنگ بوە لەئاهەنگە زۆرەکانیان کەلەڕۆژی

نۆهەمی مانگی ئەیلول دا جۆرەها کۆلارە هەڵدەدرا بۆ ئاسمان، کەهەندێکیان لەشێوەی ماسیو هەندێکی تریان لەشێوەی بۆق‌و باڵندە دابون، ئەم ئاهەنگە تەنیا تایبەت نەبو بەمنداڵان بەڵکو پیاوانیش بەشداریان تیادا دەکرد.

ئەوانەی "جەنگی کۆلارە" یان دەکرد پارچە شوشەیەکیان دەبەستە کۆلارەکەیانەوە بۆ ئەوەی دەزوی کۆلارەکانی تر ببڕێت.

لەوڵاتانی ڕۆژئاوادا کۆلارە بۆ مەبەستی جدی تر بەکار دەهێنرا، لەساڵی ١٧٥٢دا بنجامین فرانگلین کۆلارەیەکی لەئاوریشم دروست کراوی باڵدایەوە، لەکاتی زریانێکی هەورە تریشقەدا، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت هەورە تریشقەو کارەبا یەك شتن.

پێش ئەوەش گەرمی پێویان، دەبەستە کۆلارەوەو هەڵیان دەدا بۆ ئەوەی پلەی گەرمای هەور بزانن.

لەکۆتای سەدەی نۆزدەهەم دا، زۆربەی فەرمانگە کەش ناسیەکان کۆلارەی بەکار دەهێنا، کەئامێرێکی گەرمی پێوی پێوە لکابو بۆ زانینی پلەی گەرماو خێرای باو پلەی شێ لەجەودا، هەندێك لەو کۆلارانە تابەرزی چوار میل بەرز دەبونەوە، بۆ گەیشتنە ئەو شوێنە بەرزانە چەند کۆلارەیەك بەیەکەوە دەبەسترانەوەو هەڵدەدران.

دەزوی ئەو کۆلارانەش لەتەلی پیانۆ دروست دەکران، کەزۆر سوك بو کێشی هەرمیلێکی تەنیا ٧کیلۆ بو، دەزوەکانیش هێندە بەهێز بون کەدەیانتوانی "١١٠" کیلۆ بەرز کەنەوە بێ ئەوەی بپچڕێن.

پێش داهێنانی فڕۆکە کۆلارە بۆ مەبەستی سەربازیش بەکار دەهێنرا، بۆ نمونە کۆلارەیەك دروست کرا ١١ مەتر درێژ بو پیاوێکی "٣٠" مەتر بەرز کردەوە لەهەوادا، دەکرا ئەو کۆلارانە لەکاتی جەنگ‌و هەڵکردنی بادا بەکار بهێنرایە، کەناچاری باڵۆنەکانی دوژمنی بکردایە بنیشنەوە.

زۆربەی کۆلارەکان لەشێوەی سێگۆشەدا دروست دەکران، بەڵام ئەوەی لەشێوەی سندوقدا دروست دەکرێت، بریتیە لەسندوقێکی بەتاڵ‌و لەدو سەرەوە کراوەیەو لاکانیشی داپۆشراوە، دەتوانرێت کۆلارە بەجۆرەها شێوە دروست بکرێت، لەشێوەی پەپولەو بەلەمو ئاسکدا.

## كێ ئۆتۆمبێلی داهێنا؟

بەپێچەوانەی زۆر داهێنانە گەورەكانی ترەوە، هیچ كەسێك ناتوانێت فەزڵی داهێنانی ئۆتۆمبیل بۆ خۆی قورخ بكات.

ئەو پێشكەوتنەی ئەمڕۆ لەجیهانی ئۆتۆمبیل دا دەیبینین، ئەنجامی بەشداری كردنی بیرۆكەی زۆر كەسی مەزنە بەدرێژای دەیان ساڵ.

لەلایەنە زانستیەكەیەوە لەساڵی ١٧٦٩ كەسێكی فەرەنسی بەناوی "نیكۆلاس كوگنوت" یەكەم كەس بو گالیسكەیەكی دروست كردو مەكینەیەكی خستە سەری‌و خۆی بۆ خۆی ئیشی دەكرد، گالیسكەكەش بریتی بو لەگالیسكەیەكی زۆر قورس كەبەسێ تایەو مەكینەیەكی هەڵم‌و گەرمكەرێكی زۆر گەورەوە ئیشی دەكرد، لەكاتژمێرێكیشدا دەیتوانی تەنیا سێ میل ببڕێت، هەر پانزە میل جارێكیش دەبوایە ئەنزینی تێ بكردایە.

لەساڵی ١٧٨٩دا "ئۆلیڤەر ئیڤانس"ی ئەمریكی توانی یەكەمین دەستا وێردی داهێنان بەدەست بێنێت بۆ ئەو گالیسكەیەی كەدروستی كرد بو بریتی بو لەگالیسكەیەكی چوار تایەیی، لەدواوە تایەیەكی هەبو سەوڵی لێدەدا، بەجۆرێك كەدەیتوانی لەئاو وشكانیشدا ڕێ بكات، قورسیەكەشی ١٩ تەن بو.

تاهەشتا ساڵ دوای ئەوە خەڵكی تر هەبون خەریكی تاقی كردنەوە بون بۆ پێش خستنی گالیسكە، بەڵام زۆر سەركەوتو نەبون، تالەهەشتاكانی سەدەی نۆزدەهەمدا دو داهێنان كرا، كەئەنجامەكەی ئەم ئۆتۆمبیلانەی لێ كەوتەوە ئەمڕۆ دەیبینین، یەكێكیان داهێنانی مەكینەیەك بو لەناوەوە دەسوتا، دوەمیشیان تایەی پڕ لەهەوای پەستاو بو.

یەكەمین ئۆتۆمبیل كەبەبەنزین ئیشی كردبێت لەساڵی ١٨٨٧ دابو پیاوێكی ئەڵمانی دروستی كرد بەناوی گوتلیپ دیلەر.

لەویلایەتە یەكگرتوەكانیشدا هەردو برا "فرانك‌و شارلز یوریا" توانیان یەكەمین ئۆتۆمبیل دروست بكەن كەبەپرتۆڵ ئیش بكات لەساڵی ١٨٩٢یان ١٨٩٣دابو، پێیان دەوت "گالیسكەی ئەسپی بێ ئەسپ". لەراستیدا هەرچەند دوای ئەوە ئۆتۆمبیل لەویلایەتە یەكگرتوەكاندا دروست كرا دوای ئۆتۆمبێلەكەی هەردو برا، گۆڕانكاریەكی ئەو تۆی بەسەردا نەهێنرا لەهەندێك شتی سادە نەبێت.

گرنگی دان بەئۆتۆمبیل دروست نەبو تاوەکو خێرا نەکرایەوە، هەرزو دەرکەوت بۆ ئەوانەی ئۆتۆمبیل دروست دەکەن، ئەو پچمە سەرەتاییانەی ئۆتۆمبیل شیاو نییە وردە وردە گۆڕان کاریو پێش خستنی تیاکرا تاگەیشتە ئەمڕۆ.

مەکینەکەشی لەژێر کورسیەکانەوە گوازرایەوە بۆ بەشی پێشەوەیو تایە لاوازە پاسکیلیەکانیشی گۆڕدرا بۆ تایەی بەهێز، شوێنی شۆفێریش جوانتر کرایەوەو لەکۆتایدا ئاسن لەجێگەی تەختە دار بەکار هێنرا لەدروست کردنی ئۆتۆمبیلدا بۆ ئەوەی لاشەکەی بەهێز بێت.

دوای ئەمانە هەمو ئۆتۆمبیلی نویێ بو بەواقعێك.

## کێ داو دەرمانی داهێنا؟

زۆربەمان دەرمان دەناسین، بەڵام زۆر کەمن ئەوانەی لەم بوارەدا زانیاریان هەیە.

ئەو دەرمانانەی بەکار دەهێنرێت بۆ چارەسەر یان خۆپاراستن لەنەخۆشی یان چاککردنی تەندروستی نەخۆشەکان پێی دەوترێت "دەرمانی ئامادەکراو" کەواتە زانستی دەرمانی ئامادەکراو، زانستی بەکارهێنانی دەرمانەکانە.

دروست کردنی داو دەرمان، هونەرێکی هێندە کۆنە تەنانەت نازانرێت کەی دەستی پێکردوە، بەڵام یەکەمین دەرمان لەسەر دەستی جادو گەرەکان دروست کراوە، چۆن خەڵکی بڕوایان وابوە گۆڕینی ڕوەکێك بۆ دەرمان پێویستی بەجادو هەیە.

دوای ئەوە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بو بەزانستێکی تایبەتی، ئامادەکردنی شروبێکی گیراوە لەڕوەك کارێکی ئاسان بو.

پزیشکە یونانیو ڕۆمانیە کۆنەکان ڕاهاتبون لەسەر دروست کردنی داو دەرمان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان. عەرەبەکانیش لەهونەری دەرمان دروست کردندا دەستێکی باڵایان هەبو، لەگەڵ هاتنی سەدەی دەهەمدا نەخۆشیە مرۆڤایەتیەکانو زانستی توێکاری نوسرابون، هەمویان وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبیو هەروەها لەدۆزینەوەکانی فارسیش سەبارەت بەچارەسەکردنی بەڕوەك زۆر شتیان وەرگرت.

لەسەدەی سیازدەهەمدا، عەرەبەکان دەرمانیان دەنارده ئەوروپا، بەڵام

بەرنامەیان لەدروست کردنی دەرماندا زۆر ئاڵۆز بو زۆربەی دەرمانەکانیان لەزیاتر لە٤٠ ماددەی جۆراوجۆر ئامادە دەکرد.

ئامادەکردنی دەرمان تاسەدەی هەژدەهەم بەم شێوەیە مایەوە، بەڵام لەوە بەدواوە زانایان هەوڵیان دا گرنگی زیاتر بەپێکهاتەی دەرمان بدەن، وەکو چۆن گرنگیان بەدەرئەنجامەکەی دەدا لەسەر مرۆڤ، بۆیە دەستیان دایە تاقیکردنەوەی ئەو دەرمانانە لەسەر ئاژەلان.

لەسەدەی نۆزدەهەمدا زانستی دەرمان پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیو ئیتر دەرمان بەهۆی کۆمپانیاکانەوە دروست دەکرا نەوەك تاکە کەسەکان.

## کێ ناوی لۆس ئەنجلۆسی ناوە؟

لۆس ئەنجلۆس سێیەم شاری ئەمریکایە لەژمارەی دانیشتواندا گەورەترین شاری ئەمریکاشە لەڕوی ڕوبەرەوە کە ٩،٤٥٩ میلی دوجایە.

لەسەرەتادا بەخەیاڵی هیچ کەسێکدا نەدەهات لوس ئەنجلوس ببێتە ئەو شارە گەورەیەی ئەمڕۆ دەیبینین.

یەکەمین سپی پێست کەچوبێتە شوێنی ئەو شارە کاپتن "گاسپارەی بورتولا" بو لەگەڵ گروپێك لەدۆزەرەوان و دەستیەك تەبشیری ئیسپانیدا.

ئەم کۆمەڵە لەڕۆژی دوی ئابی ١٧٦٩ چادرەکانیان لەنزیکی هەردو دیوی ڕوبارەکە هەڵدا.

کاپتن ناوی "ئیل ریودی نوسترا سینورا لاریناد‌ی لوس ئەنجلوس دی بورکنیکولای بەو شوێنە وەنا واتە "ڕوباری گەورەمان پادشای فریشتەکانی بورکنیکۆلا".

دوای دو ساڵ فرانسیسکۆکیەکان دەستەی سان گابریل یان تیا دروست کرد لەدوری ١٤کیلۆمەتر بەرەو باکوری ڕۆژهەلات.

لەئەیلولی ١٧٨١ دا فەرمان ڕەوای کالیفۆرنیای ئسپانی "فلیپ دی نیفی" بەڕەسمی لۆس ئەنجبۆسی دروست کرد.

بەهاوکاری کاهینەکان لەدەستەی سان گابریلْ، دی نیفی فەرمان ڕەوا "١١" پیاو "١١" ژن و "٢٢" منداڵی تیا نیشتەجێ کردو ناوی "ئیل بوییبلودی نوسترا

سینورا لاریناد‌ی لوس ئەنجلوس"ی لێنا واتە "شاری گەورەی پادشای فریشتەکان".

لوس ئەنجلوس گرنگیەکی ئەوتۆی نەبو تاکالیفۆرینا نەبوە بەشێك لەویلایەتە یەکگرتوەکان لەساڵی ١٨٤٨دا.

دوای جەنگی مەکسیك ژمارەی دانیشتوانی گەیشتە ١٥٠٠ کەس، دوای ئەوە دەست کرا بەکشتوکاڵی پرتەقاڵ‌و توت فەرەنگی‌و لیمۆو گوێزو تریێ‌و " ئەنفۆکاتۆ داری پارێزەر: ڕوەکێکی ئەمریکی بەرداره بەرەکەی لەهەڵوژە دەچێت" تیایدا.

هێلی ئاسنی سارزن باسیڤیك لەساڵی ١٨٧٦دا گەیشتە لوس ئەنجلوس‌و لەساڵی ١٨٩٠دا نەوتی تیا دۆزرایەوە بەهۆیەوە شارەکە دەستی بەگەشە کردن کرد.

## کێ چرای داهێنا؟

پێش ئەوەی مرۆڤ ئاگر بدۆزێتەوە، خۆر تەنیا سەرچاوەی گەرمی‌و ڕوناکی بوە بۆی.

لەبەرئەوەی نەیتوانیوە تەحەکوم بەخۆرەوە بکات بۆیە بەتەواوی پەککەوتە بوە لەهەڵس‌و کەوت کردندا لەگەڵ سەرماو تاریکیدا.

دوای ئەوە مرۆڤ ئاگری دۆزیەوە، سەیری کرد هەندێك لەمەوادەکان بەشێوەیەکی باشتر لەوانی تر دەسوتێت.

بەتێپەڕ بونی ڕۆژگار مرۆڤ دەستی کرد بەهەڵبژاردنی ئەو مەوادانەی کەڕوناکی زیاتر دەدەن، تاوای لێهات تەلاشەی داریان بەدیواردا هەڵدەواسی‌و وەکو چرا بەکاریان دەهێنا، گریێ داری سنەوبەریشیان وەکو مەشخەڵ بەکار دەهێنا.

پیوی ئاژەڵیشیان دەکردە ناو بەردێکی قوپاوەوەو قەوزەشیان وەکو فتیلە بۆ بەکار دەهێنا، بەو جۆرە چرای ڕۆنی پەیدا بو.

ئەمانە هەمو کەی ڕوی داوە؟ ناتوانین بەڕێکوپێکی ئەو وەڵامە بدەینەوە، لەبەر ئەوە هەمو ئەمانە پێش مێژوی نوسراوی مرۆڤایەتی بوە.

لەنیو ئەنگلاندیشدا لەدەوروبەری ساڵی ١٨٢٠دا ڕۆنی بەرازو نەهەنگیان بەکار

هێناوه بۆ گراندن.

لەڕاستیدا لەو سەردەمەدا هەمو جۆرەکانی چەوری دەست کەوتن‌و گراندنیان زۆر ئاسان بوە.

ڕێژەیەکی زۆر داری زەیتون هەیە لەحەوزی دەریای سپی ناوەڕاستدا، کەخەڵکی ناوچەکە ڕۆنەکەیان بۆ گراندنی چراکانیان بەکار هێناوە.

چینی‌و ژاپۆنیەکانیش سودیان لەجۆرەها " مەکسەرات" وەرگرتوە بۆ نەوت کردنی چراکانیان.

ڕەنگە ئەگەر نەوت نەدۆزرایەتەوە تائێستاش "ڕۆنی فولی سودانیمان" بەکار بهێنایە بۆ گراندنی چراکانمان.

لەساڵی ١٨٢٩دا نەوت دۆزرایەوە، بەکوڵاندنی ئەو "زەیت"ە لەدەفرێکی فراواندا ماددەیەکی سوکی بێ ڕەنگمان دەست دەکەوێت پێی دەڵەین "کیرۆسین" کەئەمڕۆ لەهەمو دونیادا بەکار دەهێنرێت، لەسەرەتادا بەکیرۆسینیان دەوت "زەیتی خەڵوز" چونکە خەڵکی بڕوایان وابو ئەم مادده تازەیە پەیوەندی بەخەڵوزەوە هەیە.

## یەکەمجار برنج لەکوێ چێنرا؟

برنج یەکێکە لەخواردنە زۆر گرنگەکان‌و خوشترین خواردنیشە، لای هەمو دانیشتوانی سەر زەوی.

ئایا دەزانیت چینیەکان، کاتێك چاك‌و چۆنیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد لەجیاتی ئەوەی بڵێن تەندروستیت چۆنە؟ دەیانگوت: ئەمڕۆ برنجت خواردوە؟

لەبەر ئەوەی برنج هێندە لایان گرنگ بوە.

نیوەی دانیشتوانی سەر زەوی بەشێوەیەکی گشتی لەسەر برنج دەژین، لەهەندێك لەوڵاتانی ئاسیادا، ساڵانە هەر نەفەرێك لەنێوان دو بۆ چوار پاوەند برنج دەخوات کەس نازانێت یەکەمجار لەکوێدا کشتوکاڵی برنج کراوە، بەڵام لەوە دەچێت لەباشوری هیندستاندا بوبێت، ئێمە بەدڵنیاییەوە دەزانین پێش هەزاران ساڵ لەو ناوچەیەدا کشتوکاڵی برنج کراوە، هەر لەوێشەوە پێش پێنج هەزار ساڵ بڵاوبوەتەوە، بۆ ڕۆژ هەڵاتی چین، دوای ئەوە گوێزراوەتەوە بۆ وڵاتی ئێران‌و

میسر

نەسەدەی حەڤدەهەم دا برنج چۆتە ئەمریکای باکورەوە، لەگەڵ ئەوەی خەڵکی ئەمریکای باشور ڕێژەیەکی کەم برنج دەخۆن، بەڵام گەنمیان پێ باشترە.

لەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا، هەریەك کەس ساڵانە لەدو کیلۆ زیاتر برنج ناخوات لەهەندێك لەوڵاتاندا ڤیتامین‌و مەوادی کانزایی بۆ برنجی توێك گیراوە زیاد دەکەن لەکاتێکدا برنج خۆی دەوڵەمەندە بەزۆربەی ڤیتامینەکان.

برنج بەزۆر ڕێگە بەکار دەهێنرێت وەکو چێشت.

ئاردە برنجیش بەکار دەهێنرێت لەدروست کردنی، کەتیرەو نیشاستەو پۆدرەی دەموچاودا.

لەژاپۆن‌و چین‌و هیندستانیشدا، لەبرنج، مەی‌و بادە دروست دەکەن.

## یەکەم هەڵبژاردن لەکوێدا کرا؟

وشەی هەڵبژاردن بەزمانی ئینگلیزی لەبنەڕەتدا لەلاتینی یەوە وەرگیراوە کەبەمانای "دەست نیشان کردن" دێت.

ئەویش بۆ هەستی خەڵکی دەگەڕێتەوە، کەهەزاران ساڵ پێش ئێستا مافی هەڵبژاردنی سەرکردەکانیان هەبو.

یەهودو یونانیە کۆنەکان لەپێناو ئەو مافەدا خەباتی زۆریان کردوە، پاشاکانی ئیسرائیلیش لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێدران، وەکو چۆن ژەنراڵەکانی سوپای یونانی بەهەمانشێوە.

نەریتی هەڵبژاردنی سەرکردە دەریاییەکان بۆ بەریتانیا، لەسەر دەستی داگیرکەرانی ئەنگلۆ ساکسون دا دروست بو، پێش نزیکەی ١٥٠٠ ساڵ، بۆیە دوای ئەوە دەنگدان بۆ لێپرسراوانی ناوچەیی بویە بەشێك لەهزری ئینگلیزەکان‌و پاش ئەوانیش ئەمریکیەکان.

بەڵام هەمیشە هەڵبژاردن کێشەی گەورەی تیا دروست بوە، کەلەم ڕستەیەدا دەرکەوتوە "کێ مافی دەنگدانی هەیە؟"

سەردەمێك تەنیا خاوەن موڵکەکان بۆیان هەبو دەنگ بدەن لەسەردەمێکی تردا بەگوێرەی، گەورەی خانوی ئەو کەسە بوە.

زۆر درەنگ ڕێگە درا بەئافرەتان دەنگ بدەن، ئەم خەڵاتەی ژنانیش پاش جەنگی یەکەمی جیهانی جێ بەجێ کرا.

ئەوانەی بانگهێشتیان دەکرد، بۆ ئەوەی ژنان مافی دەنگدانیان هەبێت، هەمو هەلێکیان دەقۆستەوە بۆ ئەوەی ئەو دۆزە لەخەڵکی بگەیەنن، بەڵام زۆربەی جار توشی کێشەو دەردە سەری ئەهاتن.

کۆت کردنی دەنگدان هێشتا لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێت، لەم دواییانەدا بو دەنگدان لەبیست ساڵانیەوە دابەزێنرا بۆ هەژدەساڵ.

## کێ ترافیك لایتی داهێنا؟




ئایا دەزانیت پێش سەردەمی ئۆتۆمبێلیش هاتوچۆ هەرکێشەی هەبوە؟.. رەنگە یولیۆس قەیسەر یەکەم لێپرسراوی حوکمی بوبێت، یاسای دانابێت بۆ زاڵ بون بەسەر کێشەی هاتو چۆدا، بەدەکردنی بڕیارێك کەقەدەغەی دەکرد ژنان ئەسپ و گالیسکە لێبخوڕن.

دوای پەیدابونی ئۆتۆمبیل، پیاوانی هاتوچۆ بەپێ بەسەر جادەکاندا، دەگەڕان و هاتو چۆیان بەدەست رێکدەخست.

دوای ئەوە بۆ رێکخستنی هاتوچۆ لایتیان بەکارهێنا، بەڵام ترافیك لایتی ئوتوماتیکی لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمدا داهێنرا. بەڵام ئەو نیشانە ڕوناکیە کێشەی زۆر گەورەو بێ چارەسەریان لەشوێن خۆیان بەجێ هێشت، لەبەر ئەوەی هاتوچۆ لەخاڵێکی یەکتر بڕدا، دەگۆڕا لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر لەماوەی ڕۆژدا.

لەساڵی ١٩٢٧ دو پیاو دەستا وێردی داهێنانیان بۆ ئامێرێکی ئوتوماتیکی رێکخستنی هاتوچۆ تۆمار کرد، بەمەش هەندێك لەکێشەی هاتوچۆ، چارەسەر کرا لەخاڵێکی یەکتر بڕو لەکاتێکی دیاری کراودا.

یەکێك لەو نیشانە ڕوناکیانە، "هاری هوف" لەزانکۆی بیلْ دای هێنا، بۆ یەکەمین جار لەنیوهاڤن کونیکتیکوت لەنیسانی ١٩٢٨دا بەکار هێنرا.

ئەم ئامێرە لەسەر شۆستەی جادەکان دایان دەناو کاتێك ئۆتومبیلێك بەلایدا تێپەڕیایە، ئاشکراکەرەکە، هێمایەکی دەنارد بۆ ئەو سندوقەی کەلەسەر ستونی ڕوناکیەکە بو، ئەو تیشکەش وای دەکرد ڕوناکیەکە بگۆڕێت بۆ ڕەنگی سەوز لەبەردەم ئۆتۆمبێلە نزیك بوەکاندا.

ئەم نیشانەیە دوا چاکسازیە لەترافیك لایتداو تائێستاش بەشێوەیەکی بەربڵاو لەجیهاندا بەکار دەهێنرێت.

لەساڵی ١٩٢٨یشدا، "شارلز ئادلەر" نیشانەیەکی تری ڕوناکی داهێنا، کەتیایدا مایکرۆفۆنێکی بەکارهێنا بۆ گورجوگۆڵ کردنی سندوقی سەرستونی ڕوناکیەکە.

کاتێك شۆفیری ئوتومبیلێك هۆرن لێدەدات لەکاتی دەرکەوتنی ڕەنگی سوردا.

ئەوا مایکرۆفۆنەکە دەنگێك دەنێرێت بۆ سندوقەکە وادەکات کەڕەنگەك بگۆڕێت.

ئەمڕۆ لەدونیادا، چەندین جۆری ئامێری چاودێری هاتوچۆ هەیە، کەدەنگ تیایدا بەکار دەهێنرێت بۆ گۆڕینی روناکییەکان.

## کێ کەرێی دۆزیەوە؟

کەرێ کۆنترین خواردن بوە کەمرۆڤ ناسیویەتی، لەسەرتاسەری جیهانیشدا دەخورێت.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لەسەردەمی کۆندا لەزۆر ناوچەکانی جیهاندا وەکو خواردن بەکار هێنراوە.

هیندستانۆسەکان لەپەرستگاکانیاندا کەرێیان وەکو قوربانی بەکار هێناوە، گریكو ڕۆمانەکانیش کەرێیان هێناوەو باوەشیان وابوە دوکەڵی کەرێی سوتاو بۆ چاو ئێشە باشە، هەروەها ڕۆمانیەکان کەرێیان وەکو هەتوان بۆ ردەمو چاو قژ بەکار هێناوە.

لەئیسپانیادا سێسەد ساڵ پێش ئێستا کەرێ تەنیا لەدوکانی دەرمان فرۆشیدا بەرچاو دەکەوت، مرۆڤە سەرەتاییەکان ئەوانەی کەرێیان خواردوە زۆر کەم بونە، بەتازەیش هەرگیز نەیان خواردوەو، بەڕاوی "شلی" هەڵیان گرتوە، هەندێك خەڵکیش وەکو شتێکی بەنرخو تایبەت زیاد لەسەدساڵ هەڵیان گرتوە.

ڕەنگە پیشەسازی کەرێ وەکو خۆراك لەوڵاتانی ئەسکەندە ناڤیاوە چوبێتە

ئەوروپاوە، بەلآم کەرێ ئەمڕۆ خواردنێکی زۆر گرنگە لەسەرانسەری جیهاندا.

کەرێ سەرچاوەیەکی خۆراکی زۆر باشە بۆ وزەو بەئاسانیو خێراش هەرس دەکرێت.

هەروەها تایبەتمەندی مانەوەشی باشە، واتە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵدەدا دەمێنێتەوە، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ وزەی تەواوی هەبێت لەئیش کردندا لەماوەی نێوان ژەمەکاندا.

پیشەسازی کەرێ لەگەڵ مانگادا دەست پێ دەکات، دوای دۆشینی، کەرێکە لەشیرەکە جودا دەکرێتەوەو لەپلەی گەرمای ئاسایدا دادەنرێت، تاترش دەبێت، ترش بونی کەرێ تامێکی دەداتێ و کەرێ و چەوری گرتنەکەشی ئاسان دەبێت.

دوای ئەوە بەکوشتنی هەرچی بەکتریاو ترشیە تیایدا پاك دەبێتەوە.

کرداری چەوری کردنەکەش بەکۆکردنەوەی خرۆکە ڕۆنیەکەی ناو شیرەکە دەبێت تابتوانین چەوری شیرەکەی لێ دەرکەین.

ئەو چەوری گرتنەش بەشێکی بەتاڵ کردنی ڕۆنەکەیە لەکەرێکە، ئەمجا کەرێکە لەگەڵ ئاودا تێکەڵ دەکرێت لەکردارێکدا بۆ دەرهێنانی چەوریەکە.

پاشان ئاوەکە وشك دەکرێتەوە، دوای ئەوە کەرێکە دروست دەکرێت بەپاڵەپەستۆی دو لولەك بۆ ئەوەی نەرم بێتەوەو یەك تامو ڕەنگ بدات، بەجۆرێك کەئامادەدەبێت بۆ بەرگ تێگرتنو ناردنە بازاڕ.

## پزیشکی چۆن دەستی پێکرد؟

پزیشگەری واتە چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان، هەمو دەزانین جۆرەها ڕێگە چارە هەیە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان.

ئەگەر یەکێك لەئەندامانی خێزانەکەتان نەخۆش کەوت، دەتوانن بیبەنە لای پزیشكو ئەویش هەرچی لەتوانایدا هەبێت بەکاری دێنێت بۆ چارەسەکردنی نەحۆشەکە بەشێوەیەکی زانستی، یان دەتوانن لەجیاتی چارەسەر بەڕێگەی پزیشکی کوردەواری یان دوعاو نوشتەوە چارەسەر بکرێت، کەئەمەش ڕێگەیەکی زانستی نیە.

مێژوی پزیشکی دەگەڕێتەوە بۆ پێش زاین، واتە پێش ئەوەی پزیشگەری ببێتە

زانست پزیشگەری میللەتەكانی سەرەتای بریتی بو لەهەمو جۆرە تەفسیرێكی نامۆ بۆ نەخۆشیەكان‌و لەچارەسەركردنیشدا پشتیان بەجادو دەبەست، واتە بەشێوەیەكی نازانستی چارەسەری نەخۆشیەكانیان دەكرد، پێش ئەوەی پزیشگەری پێتە زانستێكی سەربەخۆ میللەتانی سەرەتایی گەرم كردن‌و ساركردنەوەو كەڵەشاخ‌و شێلان یان لەگەڵ نەخۆشەكاندا بەكار دەهێنا، بەڵام پزیشگەری میسری زۆر بەناوبانگ بو بەشێوەیەكی سەرەكیش پشتیان بەجادو دەبەست لەگەڵ ئەوەشدا هەمو جۆرە هەتوان‌و دەرمانێكیان بەكار دەهێنا، لەو دەرمانانەی كەپزیشگەری كۆنی میسری بەكاری هێناوە، هەنگوین، خوێ، بەڵمە برنج، مێشك، جگەر، دڵ.

خوێنی جۆراو جۆری ئاژەڵەكان، هەندێك جار، چارەسەرەكان سەركەوتو دەبون‌و هەندێك جاریش بەپێچەوانەوە.

زانستی پزیشكی لەسەردەمی گریكەكاندا دەستی پێ كرد، پێش زیاتر لەدو هەزار ساڵ پیاوێك بەناوی "ئەبو قرات" كۆمەڵێك كتێبی پزیشكی نوسی، بەناوی "كۆمەڵەی ئەبو قرات" ئەو كۆمەڵە كتێبە سەرەتای زانستی پزیشكی بو.

"ئەبو قرات" خۆی لەجادو دورخستەوەو بۆ یەكەمین جار بو زانستی پزیشكی پشت بەتێ بینیە وردەكانی نەخۆشەكان ببەستێت‌و سەبارەت بەزانیاری لەسەر نەخۆشەكان.

"كۆمەڵەی ئەبو قرات" بریتی بو لەتۆمارێك لەسەر بارو دۆخی نەخۆشەكە كەچی لێی ڕوی داوە، بۆ یەكەمین جار بوبێ پشت بەستن بەجادو لەسەر بنەمایەكی زانستی چارەسەری دایە نەخۆشەكان، بەمجۆرەش پزیشگەری نوێ لەدایك بو.

## یەكەم قوللە لەجیهاندا؟

بیرۆكەی دروست كردنی قەڵا، پەیوەندی بەبەرەنگاری كردنەوە هەیە، لەكۆندا قەڵا و شورا، بارەگاو شوێنی فەرمان ڕەوایان‌و دەرەبەگەكان بوە.

كۆشكی پاشاكانی كۆنی میسر بەقوللەو مەتەرێز دەور دراو بوە، لەیونانی كۆنیشدا سەركردەكان كۆشكەكانیان قایم دەكرد.

بەڵام ئەو قەڵایانەی کەئەمڕۆ دەیانبینین لەچەرخەکانی ناوەڕاستداو لەئەوروپای ناوەڕاستدا لەنێوان ساڵانی ١٠٠٠ بۆ ١٥٠٠ی زاینیدا دروست کراون.

هۆی پەیدابونیشی ڕژێمە دەرەبەگەکان بون، هەر دەوڵەمەندێك دەستی دەگرتە سەر ناوچەیەکداو بۆ خۆی قورخی دەکرد، زۆر جار بەوەشەوە نەدەوەستان‌و هێرشیان دەکردە سەردراوسێکانیان بۆ ئەوەی داگیریان بکەن‌و خۆیان بەهێز تر بکەن، بێگومان بەپێچەوانەشەوە خۆشیان هەروەها توشی داگیرکردن دەهاتن جابۆیە ناچار بون ماڵەکانیان زۆر قایم بکەن، بۆ خۆپاراستن ئەو شتەیان دروست کرد کەئەمڕۆ پێی دەڵێن "قوللە".

لەبەرئەوەی هاوشێوەی یەکتر بون، ئیتر لەفەڕەنسا بوایە یان ئەڵمانیا یان ئسپانیا یان بەریتانیا.

یەکەم قولله دروست کراوە "قوللەی لەندن"ە ولیەمی رزگار کەر لەساڵی ١٠٧٨دا دروستی کردوە، کەبریتی بو لەچەند نهۆم‌و دو دیواریشی بەدەوردا کێشراوەو، پەنجەرەکانیشی بچوك بونەو پەیژەکانیشی پێچاوپێچ چوەتە سەرەوەو، ئاغاو دارو دەستەکەی لەناویدا ژیاون. یەکێکیتر لەقەڵا سەرەتاییەکان قەڵای "هیدنگ هام"ە لەئیسکس لەساڵی ١١٣٠دا دروست کراوە بەپانی شەش مەترو لەگۆشەکانیشیەوە لەشەش مەتر پانتر بوە.

لەناوەڕاستیشدا هۆڵێکی بەرزی هەبوە بەبەرزی دونهۆم، کەبۆ مەبەستی بەرەنگاری دروست کرابو، کەمی‌و بچوکی پەنجەرەکانیشی پاراستنێکی باش بوە.

دوای ئەوە قەڵاکان فراوانتر کران بەتایبەت لەناوەوە، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی تیایدا دەژین ڕوبەرێکی زیاتریان بەدەستەوە بێت‌و بەخۆشی تیایدا ژیان ببەنە سەر.

## ئایس کریم

پێش پەنجا ساڵ، خەڵکی تەنیا لەهاویندا ئایسکرێمیان دەخوارد، بەڵام ئێستا بەدرێژای ساڵ دەیخۆن.

پەیدابونی ئایسکرێم لەڕۆژهەڵاتەوە بوە، پێش ئەوەی منالانی ڕۆژئاوا تامی بکەن، مارکۆ پۆلۆ کەخەڵکی ڕۆژهەڵاتی بینی دەیخۆن، بیرۆکەکەی بردەوە بۆ

ئیتالیا، لەوێشەوە برایە فەرەنساو دەوڵەمەندەکان پێشوازیەکی گەرمیان لێکردو هەوڵیان دا، چۆنیەتی دروست کردنی بەنهێنی لای خۆیان بمێنێتەوەو خەڵکە ئاساییەکە پێی نەزانێت، بەڵام بەپێچەوانەوە ئایس کرێم زۆر بەخێرای لەناو هەمو خەڵکی وڵاتاندا بڵاو بوەوە.

یەکەم کارگەی دروست کردنی ئایس کرێم لەساڵی ١٨٥١ دا، لەشاری بالیتمۆری ویلایەتی ماریلاندی ئەمریکادا دامەزرا، بەڵام پێشکەوتنی راستەقینەی پێشە سازی ئایس کرێم لەساڵی ١٩٠٠دابو دوای دروست کردنی یەخچاڵ.

مەوادە سەرەکیەکانی دروست کردنی ئایس کرێم، بریتییە لەقەیماخ و شیرو شەکرو هەندێك جاریش هێلکە.

ڤانیلاو شوکولات و میوەو تام و ڕەنگ بۆ زیادکردنی تام و چێژەکەیەتی.

ئەمەش ئەو ڕێژانەیە کەلە دروست کردنی ئایس کرێم دا بەکار دێت:٨٠-٨٥٪ قەیماخ و بەرهەمە شیریەکان، ١٥٪ شەکر، ٠،٥- ١،٥٪ ئەم مەوادانە کەتامی ئایس کرێمەکە خۆش دەکەن یەك لەسەدیش مەوادی نەرم کەرەوەیە.

مەبەست لەزیادکردنی مەوادی نەرم کەرەوە ئەوەیە ئایس کرێمەکە نەیبەستێت بۆ ئەو مەبەستەش جەلاتینی چێشت بەکار دەهێنرێت.

ئایس کرێم پرۆتین و کالیسیۆم و ڤیتامینەکانی " ا-ب" تێدایە.

## مێژوی شارستانیەت

کاتێکی زۆری خایاند تامرۆڤ گەیشتە ئەوەی ئەمرۆ پێی دەڵێن "شارستانیەت"، مرۆڤ لەسەرەتادا ژیانێکی دڕندانەی دەبردە سەر، کەزۆر لەژیانی ئاژەڵان دەچو.

دوای ئەوە بو بەرێکخراوێکی خێزانی، فێر بون چۆن ئاگر بکاتەوە، دوای ئەوەش فێر بو ئەو کەرەستانەی ڕاوی پێ دەکات دروستی بکات، لەئەنجامی ئەوانەدا مەنجەڵی چێشتی دروست کردو خێزان گەورە بوەوەو بوبە عەشیرەت و توانی بگوێزێتەوە بۆ شوێنی تازە.

قۆناخی دوەم کەپێی دەوترێت " بەربەریەت" مرۆڤ فێر بو کشت و کاڵ بکات و ئاژەڵانیش ماڵی بکات، دوای ئەوەش فێری تواندنەوەی کانزاکانی وەکو مس و ئاسن بو بۆ ئەوەی چەکی باشتری لێ دروست بکات.

پاشان ماڵو خانوی دروست کردو، کاتێك مرۆڤ نوسینی داهێنا بەوێنە کێشان، ئەوە نیشانەی کۆتای هاتنی قۆناغی " بەربەریەت"و سەرەتایی شارستانیەت بو.

بۆیە داهێنانی نوسین بەسەرەتای شارستانیەت دادەنرێت، چونکە مرۆڤ توانی مێژووی ڕابوردوی خۆی بنوسێتەوە، بەم ڕێگەیەش مرۆڤەکان توانیان سود لەئەزمونەکانی یەکتر وەرگرن.

کاتێك مرۆڤ گەیشتە ئەو قۆناغە لەبوارەکانی تریشدا پێشکەوت.

کۆنترین شارستانیەت وەکو زانراوە لەمێژودا شارستانیەتی میسریەکانو بابلیەکانە میسریە کۆنەکان پێش چوار هەزارو پێنجسەد ساڵ، جۆرێك نوسینیان ناسیوە، هەروەها ڕژێمی حوکم ڕانیان هەبوە، تێگەیشتنێکی باشیشیان بۆ بیرکاری هەبوە وەکو دەبینین چۆن لەدروست کردنی ئیهراماتەکاندا بەکاریان هێناوە، زانیویانە ئامێرە جیا جیا کان بەکار بێنن.

هەروەها لەدورگەی گریکیشدا شارستانیەت پێش نزیکەی چوار هەزار ساڵ هەبوە.

سۆمەریەکانیش کەلە میزۆ پۆتامیادا ژیاون شارستانیەتێکیان هەبوە مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چوار یان پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا.

## چەند سەری ساڵی تازە هەیە؟

ئاهەنگگێران بەبۆنەی جەژنی سەری ساڵی تازەوە، کۆنترینو خۆشترین ئاهەنگ گێران بوە لەهەمو جیهاندا.

یونانیەکان لەسەردەمی گریکەکاندا سەری ساڵی تازەیان لەگەڵ مانگی تازەدا دەست پیێ دەکرد دوای ٢١ی حوزەیران.

پێش سەردەمی یۆلیۆس قەیسەریش سەری ساڵی ڕۆمانیەکان لەیەکی ئازاردا دەست پیێ دەکرد.

چینیەکان لەسەری ساڵدا دو ڕۆژ ئاهەنگ دەگێڕن، لەڕۆژی یەکەمی کانونی دوەمو ئەو ڕۆژەکەی تریشی بەگوێرەی ڕۆژ ژمێری مانگی چینی دەست نیشان دەکرێت، ڕۆژی دوەمیشی لەنێوان ٢١ی کانونی دوەمو ١٩ی شوباتدایە.

ئەندونیسیاش لەساڵێکدا دو ئاهەنگی هەیە، یەکەمیان لەیەکی کانونی دوەمو ئەوی تریشیان بەگوێرەی ڕۆژ ژمێری کۆچی ئیسلامییە.

کەنیسەی ئارسۆزیکی روسیش بۆ سەری ساڵی تازە بەگوێرەی ڕۆژژمێری

یۆلیۆسی ئاهەنگ دەگێڕێت ئەو ڕۆژ ژمێرەی یولیۆس قیصر بۆ ڕۆما داینا لەساڵی ٤٦ پێش زایندا کەڕۆژەکانی ساڵی ٣٦٥ ڕۆژەو ساڵی چوارەمیش ٣٦٦ ڕۆژە" ئەو ئاهەنگەش لەچواردەی کانونی دوەمدایە.

یەهودیەکانیش جەژنی سەری ساڵیان " ڕۆش هاشانا" لەڕۆژێکدایە کەشەوو ڕۆژ یەکسان دەبن، لەکۆتای ئەیلول یان سەرەتای تشرینی یەکەمدایە.

لەڤێتنام دا ئاهەنگی سەری ساڵی تازەیان لەمانگی شوباتدایە، لەئێرانیشدا لە ٢١ی ئازاردایە.

هەمو تیرەیەکی ئاینیش لەهیندستاندا ڕۆژێکی دیاری کراوی خۆیان هەیە بۆ سەری ساڵی تازە.

بۆ نمونە موسوڵمانەکان بەگوێرەی ڕۆژ ژمێری کۆچی ئیسلامیەوە، هیندستانۆسەکان لەمانگی نیسان یان ئایاردایە، موسڵمانەکان ئاهەنگی سەری ساڵیان لە ١ی موحەرەمدایە، کەیەکەمین ڕۆژی سەری ساڵی کۆچی.

کوریەکانیش سەری ساڵی تازەیان سێ ڕۆژی یەکەمە لەمانگی کانونی دووەمدا.

## کەی نەتەوە یەکگرتوەکان دامەزرا؟

یەکەمین پلان بۆ دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتوەکان، لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا داڕێژرا، لەماوەی جەنگی جیهانی دوەمدا.

لەکۆنفراسی وەزیرانی دەرەوەدا، کەلەساڵی ١٩٤٣دا لەمۆسکۆ بەسترا، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا " کوردێڵ هێڵ" توانی یەکێتی شۆڤێتی پێشو ڕازی بکات، لەگەڵ بەریتانیاو کۆماری چیندا بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نێو نەتەوەیی بۆ پارێزگاری کردنی ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی.

بەمەرجێك ڕێکخراوەکە، کراوە بێت لەبەردەم هەمو ئەو وڵاتانەی حەزیان لەئاشتیە.

ساڵی ١٩٤٤ کۆنگرەی دومبارتۆن ئۆکس بەسترا لەواشنتۆن بەئامادە بونی نوێنەرانی هەریەك لەیەکێتی سۆڤێت، بەریتانیا، کۆماری چین و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، لەم کۆنگرەیەدا لەسەر خاڵە سەرەکیەکان ڕێکەوتن بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوەکە، بەڵام هێشتا ڕێگاکە لەبەردەمیاندا زۆری مابو.

لەیالّتای یەكێتی سۆڤێت، هەریەك لەویلایەتە یەكگرتوەكان‌و بەریتانیاو یەكێتی سۆڤێت رێكەوتن لەسەر بەستنی كۆنگرەیەك لەسان فرانسیسكۆ بۆ دانانی بەرنامەكانی رێكخراوی تازە، بەئامادەبونی هەمو ولاّتانی هاوپەیمانان لەجەنگی جیهانی دوەمدا، لەدژی هێزەكانی شكست خواردوی " محوەر" كەئەلّمانیا بەسەرۆكایەتی هیتلەر سەركردایەتی دەكرد.

بڕیار درا پرۆگرامی رێكەوتنەكانی رێكخراوەكە، لەو كۆنگرەیەدا كەنیاز بو بیەسترێت دابنرێت.

كۆنگرەی نەتەوە یەكگرتوەكان لەسەر رێكخراوی نیو دەولّەتی لەسان فرانسیسكۆ لەنێوان ٢٥ نیسان‌و ٢٦ حوزەیرانی سالّی ١٩٤٥دا بەستراو ٤٦ ولاّت تیایدا بەشداری كرد.

نەتەوە یەكگرتوەكان تەنیا رێكخراوێك نیە بۆ پاراستنی ئاشتی، بەلّكو هاوكاری دەكات لەهەردو بواری ئابوری‌و كۆمەلاّیەتی‌و بەدوادا چونی مافەكانی مرۆڤو یارمەتی دان بۆ پێش خستنی لایەنی ئابوری‌و سیاسی.

## كێ ژمارە سفری داهێنا؟

دۆزینەوەی ژمارە سفر كاریگەریەكی گەورەی هەبو لەسەر مێژوی مرۆڤایەتی، لەبەر ئەوە وای كرد، پێشكەوتنی بیركاری كارێكی شیاو بێت.

لەگەلّ ئەوەی كە نازانرێت كێ ژمارە سفری دۆزیوەتەوە، بەلاّم كەس لاری لەوە نییە، لەسەدەكانی دووەم یان سێیەمی زاینی هیندییەكان دایان هێناوە.

لەسەرەتای شارستانیەتیدا مرۆڤ هەولّی داوە بەچەندین رێگەی جۆراو جۆر ژمارەكان بنوسێت، بۆ ئەم مەبەستە بو یونانیەكان پیتە هیجائیەكانی خۆیانیان نوسی، میسریەكانیش وێنەو هێمای تایبەتیان بەكار هێنا لەكاتێكدا رۆمانیەكان سیستەمێكی زۆر ئالّۆزیان بەكار هێنا لەنوسینی ژمارەكاندا، بۆ نمونە (X) یان بۆ ژمارە (١٠)و (٢) یان بۆ ژمارە (١٠٠)و (M) یان بۆ ژمارە (١٠٠٠) بەكار هێناوە، وەكو چۆن (I) یان بۆ ژمارە (١)و (V )یان بۆ ژمارە (٥)و (L) یان بۆ ژمارە (٥٠)و یان بۆ ژمارە (٥٠٠) بەكار دەهێنا، ئەگەر بیان نوسایە ژمارە (٤) وایان دەنوسی (iv) بیشیان ویستایە ژمارە "١٦٤٨" بنوسن بەمجۆرە دەیان نوسی "MDcxLV١١١" ئەمەش كارێكی زۆر سەخت‌و ئالّۆز بو، پێش لەدایك بونی مەسیح "علیە لسلام" هیندستانۆسەكان

لەهیندستاندا، سیستەمێکی ژمارەی زۆر لەمە باشتریان بەکار هێنا، بەڵام ژمارە سفری تێدا نەبو، دوای ئەوە ژمارە سفر داهێنرا.

ئەم سیستەمەی هیندستانیەکان لەدەوروبەری ساڵی ٩٠٠ی زاینی لەڕێگەی بازرگانە عەرەبەکانەوە گەیشتە ئەوروپا، بۆیە تائێستاش پێی دەڵێن سیستەمی هیندستانی-عەرەبی.

داهێنانی ژمارە سفر بو بەخاڵی وەرچەرخان، لەپەرەسەندنی ڕۆشنبیریو شارستانیەتدا، ئەگەر ژمارە سفر نەبوایە، ئەو هەمو پێشکەوتنە لەزانستو پیشەسازیو بازرگانی هاوچەرخدا نەدەبو.

## تەوقەکردن

لەم سەردەمەدا تەوقەکردن لەگەڵ یەکتردا، مومارەسەیەکی بەربڵاوە لەنێوان هەمو خەڵکیدا.

کاتێك خەڵکی بەیەکدەگەن تەوقە لەگەڵ یەکتردا دەکەن، لەکاتێکدا زۆربەیان نازانن ئەم نەریتە جۆنو لەکەیەوە پەیدا بوە.

لەسەردەمەکانی کۆندا خەڵکی "دەست"یان بەنیشانەی هێز داناوە، لەبەرئەوەی بۆ لەناودانی دوژمنو ئاژەڵانو دروست کردنی چەك بەکاریان هێناوە.

لەنەبونی زمانێکی پێشکەوتودا خەڵکی لەگەڵ یەکتردا تەوقەیان دەکرد، وەکو ئاماژەیەك بۆ هاوڕێیەتیو نیەت پاکی.

هەروەها لەئاینە کۆنەکانیشدا دەست بەنیشانەی هێز دانراوە، یونانیەکان کاتێك نوێژیان دەکرد، دەستیان بۆ ئاسمان بەرز ئەکردەوە.

هەرکاتێك کەسێك هەردو دەستی لەناویەك بنایەو سڵاوی پێ بکردایە بۆ کەسێکی تر، ئەوە نیشانەی ڕێزلێنانو گەورەیی بوە.

تائێستاش ئەم نەریتە لەوڵاتی هیندستانو هەندێك وڵاتانی تری ئاسیادا باوە، دەست ماچکردنی کەسێکی گەورەو بەتەمەنیش نیشانەی ڕێز گرتن بوە.

بەڵام ئەم نەریتە خەریکە وردە وردە لەناو دەچێت، بەهۆی ئەو هەست بەکەمی کردنە کەکابرای ماچ کەر دەیکات.

تەوقەکردن لای یونانیەکانەوە پەیدا بوە، یونانیەکانیش بۆ تەعبیرکردن لەڕێزو

دۆستایەتی دەستی ڕاستیان بەرز کردۆتەوە.

ئەو داب و نەریتە، وابڵاو بوەوە تابو بەباو لەناو هەمو خەڵکیدا، ئێمە ئەمڕۆ کەسێکمان ناسی و ویستماندەستی لەگەڵدا بدەین، دەستی ڕاستی بۆ درێژ دەکەین.

دەڵێن سەرۆکی ئەمەریکا تیۆدۆر ڕۆزەڤلت "١٨٥٨-١٩١٩" لەیەکی کانونی دوەمی ساڵی ١٩٠٧دا تەوقەی لەگەڵ ٨٥١٣کەسدا کردوە، لەواشنتۆن، بەمەش ڕیکۆردی جیهانی شکاند.

تەوقەکردن تائەمڕۆش بەرەمزی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی دادەنرێت.

## یۆرانیۆم چییە؟

یۆرانیۆم کانزایەکە تایبەدمەندیەکانی، نهێنی زۆر لەخۆ دەگرن، یۆرانیۆم بو، کلیلی دەرگاکانی هێزی ئەتۆمی دایە دەستی مرۆڤەوە کەبیکاتەوە.

تیشکی سروشتی یۆرانیۆمە، لەزۆر بواری پزیشکی، کشت و کاڵی، پیشەسازی زیندەوەر زانیدا بەکار دەهێنرێت.

پارچەیەکی ئەستوری کورتی لەیۆرانیۆمی پالفتە لەپارچەیەك زیو یان پۆڵا دەچێت.

بەڵام بەگوێرەی قەبارەکەی زۆر قورسترەو کێشی "٠،٣" مەتری سێجا لەیۆرانیۆم لەنیو تەن قورسترە.

یۆرانیۆم قورسترین توخمی سروشتە، یۆرانیۆم دوتایبەدمەندی نائاسایی هەیە، یەکەمیان ئەوەیە کەتیشکدەرە، بەواتا گەردیلەکانی بەهێواشی شی دەبێتەوەو وزەیەك دەردەکات لەشێوەی تیشکدا.

دوەمیشیان ئەوەیە کەگەردیلەکانی توانای لەت بونیان هەیە، بەواتا دەتوانرێت ئەو گەردیلەیە والێبکرێت بتەقێتەوە بۆ دولەت و ڕێژەیەکی زۆر لەوزە دروست بکات.

توانای لەت بونی یۆرانیۆم بنەمای هەمو کارگەو وزە ئەتۆمی و چەکە ئەتۆمیەکانە، یۆرانیۆم لەڕوی کیمیاویەوە زۆر چالاکەو پارچەیەك یۆرانیۆم بەخستنە بەر هەوا زۆر بەخێرای ڕەنگەکەی دەگۆڕێت، بۆ ڕەنگێکی ڕەش.

کەبریتییە لەتێکەڵەیەکی دروست بوو لەئەنجامی یەکگرتنی یۆرانیۆم لەگەڵ ئۆکسجینی ناو هەوادا.

هەروەها یۆرانیۆم لەگەڵ توخمەکانی تریشدا یەکدەگرن‌و تێکەڵەی زۆر گرنگ دروست دەکەن.

یۆرانیۆم بەرێژەیەکی زۆر کەم لەسروشتدا دەست دەکەوێت‌و هەرگیز بەپاکیش لەسروشتدا دەست ناکەوێت، کرداری دەرهێنانیشی لەدۆخە خاوەکەی زۆر زۆر ئاڵۆزو درێژە، دەتوانرێت لەتەنێك مەوادی خاودا تەنیا چەند کیلۆگرامێك یۆرانیۆممان دەست بکەوێت.

لەپێشدا ماددە خاوەکە ورد دەکرێت‌و لەپێژنگ دەدرێت، بۆ ئەوەی لەخەوش پاك بکرێتەوە، دوای ئەوە ماددە خاوەکە چەند جارێکیتر زۆر خاوێن دەکرێتەوە، تائەنجام ماددەیەکمان دەست دەکەوێت، لەقوڕی بریقەدار دەچێت‌و پێی دەوترێت "کێکی زەرد" لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت چەند جارێکیتر خاوێن بکرێتەوە تایۆرانیۆمێکی زۆر خاوێنمان دەست بکەوێت.

وزەی یەك کیلۆگرام لەیۆرانیۆم بەئەندازەی وزەی سێ ملیۆن گرام لەخەڵوزە، لەکارگە ئۆتۆمیەکاندا، گەردیلە لەت بوەکانی یۆرانیۆم رێژەیەکی هێندە زۆر لەگەرما دەردەدەن لەگەڵ پێشکەوتنی تەفاعولی یەك لەدوای یەکدا، دەشێت ئەو گەرمایە بەکار بهێنرێت بۆ بەگەرخستنی بزوێنەری تۆربایینێ کەلەلای خۆیەوە مولیدەیەکی کارەبایی بەگەڕ دەخات.

## بۆچی لەدیوی چەپەوە سواری ئەسپ دەبین؟

ئەسپسواری وەرزشێکی بەربڵاوە لەهەمو وڵاتانی جیهاندا، ئەوەی جێی سەرنجە، خەڵکی هەمیشە لەلای چەپەوە سواری ئەسپ دەبن، ئایا دەزانن لەبەر چی؟

نەریتی سوار بونی ئەسپ لەدیوی چەپەوە، دەگەڕێتەوە بۆ چەندین سەدە لەمەو پێش، باسێکی زۆر خۆش هەیە سەبارەت بەدروست بونی ئەو داب‌و نەریتە بابزانین:

پێش سەدان ساڵە، ئەسپ لەجەنگدا بەکار دەهێنرا، لەو جەنگانەشدا شمشێر

چەکی سەرەکی بوە، پیاوە دەست ڕاستەکانیش شمشێرەکانیان دەکردە لای چەپیانەوە بۆ ئەوەی بتوانن بەدەستی ڕاستیان خێرا دەری بێنن لەبەر ئەوەی ئەسپ سوار شمشێرەکەی دەکردە لای چەپیدا، بۆیە بەئاسانی دەیتوانی قاچی ڕاستی بەرز بکاتەوە لەکاتی سواربونی ئەسپەکەیدا، بەو جۆرە شمشێرەکەی نەدەبوە ڕێگر لەکاتی سواربوندا، بۆیە ئەسپ سواران لەدیوی چەپەوە سواری ئەسپەکانیان دەبون.

هەرچەند ئەسپ سوارانی ئەم سەردەمەی خۆمان، شمشێر هەڵ ناگرن، بەڵام داب و نەریتی سواربونی ئەسپ لەلای چەپەوە تائەمڕۆش بەردەوامەو تەنانەت ئەو کەسانەش مەشق دەکەن لەسەر ئەسپ سواری، دەبێت بەدیوی چەپدا مەشقی سواربونی ئەسپ بکەن.

## یارییەکانی ئۆڵۆمپی

یارییەکانی ئۆڵۆمپی بەناوبانگترین پێش برکێی وەرزشی نیودەوڵەتیە، کەهەر چوار ساڵ جارێك ڕێکدەخرێت.

ئەم پێشبڕکێیە بەیاری ڕاکردن بۆ ماوەی "٢١٠" یاردە لەساڵی ٧٧٦ پ.ز دا دەستی پێکرد، لەشاری ئۆڵۆمپیای یونانی کۆندا، لەسەر شەرەفی زەیوسی گەورە خواوەندی گریك.

بۆیە ناوی یاریەکەش لەناوی شاری ئۆڵۆمپیاوە وەرگیراوە، ئیمپراتۆر تیۆدۆری یەکەم لەساڵی ٣٩٤ زاینی دا، بەشداری یاریەکانی ئۆڵۆمپی کردو بەهۆی گەڕنی بازی "غش"ێکەوە کەبۆی کرا پلەی یەکەمی بەدەست هێنا.

"پیەردۆ کۆپارتین"ی فەرەنسی لەساڵی ١٨٩٦دا جارێکیتر یاریەکانی ئۆڵۆمپی لەشاری ئەسینای یۆناندا زیندو کردەوە، دوای ئەوە هەر چوار ساڵ جارێك تائێستا لەشارە جیا جیا کاندا ڕێك دەخرێت.

بەڵام لەساڵانی ١٩١٦و ١٩٤٠و ١٩٤٤دا بەهۆی هەردو جەنگی جیهانی یەکەم و دوەمەوە ئەنجام نەدرا.

لەساڵی ١٨٩٤دا لیژنەی ئۆڵۆمپی نیودەوڵەتی دامەزرا، هەمو ئەو وڵاتانەش کەبەشداری یاریەکانی ئۆڵۆمپی دەکەن لیژنەی ئۆڵۆمپی نیشتمانیان هەیە.

لەساڵی ١٩٢٤دا یاریەکانی ئۆڵۆمپی زستانە لەفەرەنسادا دەستی پێکرد، تەمەنێکی دیاری کراو نیە بۆ بەشداری کردن لەم یاریانەدا، تەنیا مەرجیش بۆ بەشداری کردن، ئەوەیە یاری چیە بەشدار بوەکە دەبێت "محترف" بێت. یاریەکان لەهاویندا پانزە ڕۆژو لەزستاندا ئەو پەڕی دەڕۆژ دەخایەنێت، براوەکانی یەکەمو دوەمو سێیەم خەلاتی زێڕو زیو برۆنز وەردەگرن پێشپڕکێکانو یاریەکانی ئۆڵۆمپی ئەمانەن:

بۆ پیاوان:

١- تیروەشاندن. ٢- یاریە وەرزشیەکان. ٣- یاری سەبەتە.

٤- مستە کۆڵە "ملاكمە". ٥- پێشبڕکێی سەوڵلێدانی بەلەم.

٦- پێشبڕکێی پایسکل سواری. ٧- چونە ژێر ئاو. ٨- ئەسپ سواری.

٩- موبارزە. ١٠- تۆپی پێ. ١١- جومباز. ١٢- تۆپی دەست.

١٣- هولی. ١٤- جۆدۆ. ١٥- پێنج یاریە تازەکە "بەشداربوان لەپێنج پێشبڕکێی جۆراو جۆردا بەشداری دەکەن". ١٦- ئاگر وەشاندن. ١٧- زۆران گرتن.

١٨- پێشپڕکێی کەشتیرانی.

## بۆ ژنان

١- تیروەشاندن. ٢- یاریە وەرزشیەکان. ٣- تۆپی سەبەتە.

٤- لێخورینی بەلەم بەسەوڵ. ٥- چونە ژێر ئاو. ٦- ئەسپ سواری.

٧_ موبارەزە. ٨- جومباز. ٩- یاری دەست. ١٠- هوکی. ١١- لوغی.

١٢- ئاگر وەشاندن. ١٣- لەشجوانی. ١٤- خلیسکان. ١٥- مەلەوانی.

١٦- تۆپی دەست. ١٧- پێشبڕکێی کەشتی ڕانی.

## یارییە وەرزشیەکان چۆن دەستی پێ کرد؟

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمەکانی کۆن دەبینین یاریە وەرزشیەکان، لەگەڵ ئاینەکاندا دەستی پێ کردوە. خەڵکی کۆن خواوەندەکانیان بەجۆرە سەمایەکی تایبەت پەرستوە، ئەو سەمایەش لاسایی کردنەوەی کرداری جەنگیو ڕاو بوە.

دوای ئەوەش، ئەو سەمایانە بۆ چێژ لێوەرگرتن کراوەو هەروەها بوە بەجۆرێك لەیاری وەرزشی.

میسریەکان پێش چوار هەزار ساڵ، جۆرێك لەیاری وەرزشی تایبەت بەخۆیانیان هەبوە، بەلاَم ئەم یاریە وەرزشیانەی ئەمڕۆ دەیزانین، لەیونانیەکانەوە دەستی پێکردوە.

یەکەم یاری ئۆڵۆمپی کەلەیوناندا کرا، لەساڵی ٧٧٦پێش زایندا بو، یونانیەکان منداڵەکانیان لەسەر یاریەکانی ڕاکردن، بازدان، زۆران بازی، ڕادەهێناو دەشبوایە پیاوان تانیوەی تەمەنیان تێدەپەڕاند یاری وەرزشیان بکردایە.

نمونەی بەرزی یونان لەوەرزشدا ئەوە بو دەیانگوت" عەقڵی ساخ لەلەشی ساغدایە".

یونانییەکان ڤیستیڤاڵی هونەری زۆریان ڕێکدەخست، بەلاَم کۆنترینو گرنگترینیان یاریەکانی ئۆڵۆمپی بو، مافی کێ بەرکێو بەشداری کردنیش تەنیا بۆ ئەو گەنجانە بو بەبنەچەك یونانی بونو دەشبوایە لەدەمانگ زیاتر مەشقیان بکردایە.

یاریەکانی ئۆڵۆمپی لەسەرەتادا، تەنیا یاریەکانی ڕاکردنو بازدان بوە، بەلاَم دوای ئەوە زۆران بازیو مشتەکۆڵەو وەشاندنی گۆو پێشبڕکێو گالیسکە (ئەوانەی ئەسپ ڕایدەکێشان) بۆی زیاد کرا.

## هۆ سەرەکییەکانی جەنگی دوەمی جیهانی

جەنگی جیهانی دوەم، لەساڵی ١٩٣٩بۆ ١٩٤٥ درێژەی کێشا لەنێوان ولاَتانی میحوەر کەبریتی بون لەئەڵمانیاو ئیتالیاو ژاپۆنو ڕۆمانیاو ولاَتانی "هاوپەیمانان" کەبریتی بون لەبەریتانیاو فەرەنساو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤێتی پێشو هۆڵەنداو بەلجیکاو دانیمارکو نەرویجو هیتریش کەبریتی بون لە٣٠ ولاَت ئایا هۆیەکانی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دوەم دەزانن؟

ڕێکەوتن نامەی ڤێرسای کەلەکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا "١٩١٤- ١٩١٨" مۆرکرا، تائەندازەیەکی زۆر ناعادیلانە بو، بوە هۆی سەرەکی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دوەم.

ئەوەی لەگەڵ ولاَتانی دۆڕاوی جەنگی جیهانی یەکەمدا دەکرا وەکو ئەڵمانیاو

ئەمساو هەنگاریا "مەجەر"و تورکیا، گیانی تۆڵە سەندنەوەی لای ئەڵمانیاو هاوپەیمانانی دروست کرد.

ئەو سیاسەتە دوژمنكاریانەی کەئەڵمانیاو ئیتالیاو ژاپۆن پیادەیان دەکردو بێ دەسەڵاتی لەبەرامبەریاندا، تاڕادەیەکی زۆر هۆیەك بو بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دوەم.

سیاسەتی ڕازیبونی ڕۆژئاوا لەبەرامبەر، هێزە فاشیستەکانی وەکو ئەڵمانیاو ئیتالیا وای کرد، ئەو وڵاتانە هێرش بکەنە سەر خاكو ئاوی وڵاتانی ترو داگیری بکەن.

گۆشەگیری ئەمریکاش لەسیاسەتەکانی ئەوروپا، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی، لەهۆیەکانی هەڵگیرساندنی جەنگی دوەمی جیهانی بو، ئەو گۆشە گیریەی ئەمریکا هانی فەڕەنسای دا ئەڵمانیا داماو بکات.

ئەڵمانیا لەساڵی ١٩٣٩ هێرشی کردە سەر پۆڵەندا، ئەمەش وای کرد بەریتانیاو فەرەنسا دەست لەسیاسەتی ڕازیکردن هەڵگرنو لە٣ئەیلولی ١٩٣٩دا جەنگی دژی ئەڵمانیا ڕابگەیەنن، هەر زۆر زوش وڵاتانی تر خزانە ناو جەنگەکەوە کەشێوەی جەنگی جیهانی دوەمی بەخۆیەوە گرت.

جەنگی جیهانی دوەم لەساڵی ١٩٤٥دا کۆتای هات، کاتێك هێزەکانی هاوپەیمانان لەهەر چوار لاوە گەمارۆی هێزەکانی ئەڵمانیایان داو ئەڵمانیەکان نەیانتوانی هیچ بەرەنگاریەك لەخۆیان بکەن.

هیتلەر لە"٢ئایاری ١٩٤٥"دا خۆکوژی کرد، لەحەوتی ئایاردا، ئەڵمانیا بێ مەرج خۆی دا بەدەستەوەو شەڕ لەگۆڕەبانی ئوروپیدا کۆتایی هات، بەڵام لەبەرەی ئاسیادا تاسێ مانگ دوای ئەوە جەنگ هەر بەردەوام بو.

تالەشەشو نۆی ئابی ١٩٤٥دا، بۆمبی ئۆتۆمی درایە سەر هەردو شاری هیرۆشیماو ناکازاکی ژاپۆنی داو، ژاپۆنیش ناچار خۆی دا بەدەستەوەو بەوجۆرە جەنگی جیهانی دووەم کۆتای هات.

## هۆ سەرەکییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی

جەنگی یەکەمی جیهانی، ئەو جەنگە بو لەساڵی ١٩١٤ هەڵگیرساو لەساڵی

١٩١٨ كۆتایی هات.

یەكێك بو لەڕوداوەكانی سەدەی بیستەم كەهەمو دونیای هەژاندو كاریگەریەكی قوڵی كردە سەر ڕێڕەوی مێژوی دوای خۆی.

بۆیەش ناونرا جەنگی جیهانی، چونكە زۆربەی وڵاتە گەورەكانی ئەو سەردەمە تیایدا بەشداریان كرد.

لەم جەنگەدا بەریتانیاو فەرەنساو ڕوسیا كەپێیان دەوترا "هاوپەیمانان" بەرەیەكی جەنگەكە بونو بەرەكەی تریشی بریتی بون لەئەڵمانیاو نەمساو بوڵگاریا كەبەوڵاتانی "میحوەر" ناسراو بون.

هەردو بەرە بۆ ماوەی چوار ساڵ جەنگێكی خوێناویان كردو لەئەنجامیشدا وڵاتانی هاوپەیمانان سەركەوتن.

جیاوازیو تایبەتمەندی جەنگی یەكەمی جیهانی لەگەڵ جەنگەكانی پێش خۆیدا لەوەدا بو، كەلە هەرسێ بەرەی زەمینیو دەریاییو ئاسمانیدا شەڕ دەكراو بەریتانیاش بۆ یەكەمین جار بو كەچەكێكی سەربازی زۆر گرنگی تیا بەكار هێنا كە" تانك" بو.

لەساڵی ١٨٧٠دا، لەجەنگی بروسیا– فەرەنسادا، فەرەنسا دو هەرێمی زۆر گرنگی بەقازانجی بروسیا لەدەست دا، كەئەوانیش هەرێمی "ئەلزاسو لۆرین" بو.

بۆیە ئەمە وای كرد فەرەنسا ڕقی لەئەڵمانیا بێتەوەو لەبچوكترین هەل دەگەڕا كەتۆڵەی خۆی بكاتەوە.

كێبەركێی وڵاتانی داگیركەری ئەوروپادا كەبەشوێن موستەعمەراتدا دەگەڕان زیاتر یارمەتی ئاڵۆز بونی دۆخەكەی چەكی زۆر بەهێز لای وڵاتانی گەورەی جیهاندا ئەوەش خاڵێكی تری ئاگر خۆش كردنەكە بو، لەگەڵ زیادە ڕەوی كردنی هەندێك لەوڵاتانی بەهێز، هەمو ئەمانە هۆكار بون بۆ ڕودانی جەنگی یەكەمی جیهانی، بەڵام هۆی سەرەكی ڕودانی جەنگەكە كوژرانی "ئۆرشیدۆق فردیناند"ی میری نەمسا بو لەلایەن كەسێكی سربییەوە لە٢٨ حوزەیرانی ١٩١٤دا.

نەمساش تاوانی ڕاستەوخۆی ئەو كارەی خستە سەر سربیاو ئاگادارێكی بۆ سربیا نارد، بەدەست تێوەردانی ڕوسیا، سربیا ئەو مەرجانەی ڕەدكردەوە

كەنەمسا بۆى دانا بو. لەئەنجامى وەلآم نەدانەوەى سربيادا، لە٢٨تەموزى سالّى ١٩١٤ نەمسا جەنگى دژى سربيا ڕاگەیاندو هێندە ناكۆكيەكە، گەورە بوەوە تاسەرى لەجەنگى يەكەمى جيهانيەوە دەرچو، كەزۆربەى ولآتە گەورەكانى ئەوروپا تيايدا بەشداريان كرد.

## يەكەمجار زێڕ لەكويدادەرهێنرا؟

زێڕ كانزايەكى بەنرخ و دەگمەنە، ڕەنگە وابزانين زۆر نەبێ مرۆڤ ئەم كانزايەى دۆزيبێتەوە، بەلآم بەپێچەوانەوە، زێڕ لەوكانزا سەرەتاييانەيە كەمرۆڤ ناسيويەتى. ئێمە نازانين كەى مرۆڤ بۆ يەكەمجار زێڕى دۆزيوەتەوەو حەزى لێكردوە، ئەلّبەت ئەوەش پێش نوسينەوەى مێژوى مرۆڤايەتى بوە بەماوەيەكى زۆر.

لەبەرئەوەى زێڕ بەشێوەيەكى پاك لەسروشتدا هەيە، واتە "لەگەلّ كانزاكانى تردا تێكەلّ نيە" يەكەمين كانزايە كەمرۆڤ ناسيبێتى، ئەو بەلّگە نامانەى دەست كەوتون سەبارەت بەدەرهێنانى زێڕ لەكانەكاندا، لەميسريە كۆنەكانى پێش پێنج هەزار سالّ جێماوە، بەلّگە نوسراويش هەيە كەئاشوريەكان پێش نزيكەى ژوار هەزار سالّە دراوسێكانيان داگير كردوە، بۆ ئەوەى زێڕيان دەست بكەوێت.

هەروەها پاشاكانى گريك و ڕۆم زێڕيان زۆر خۆش ويستوەو، ڕێژەيەكى زۆريش لەزێڕيان لاى خۆيان پاراستوە، بەدزينى لەولآتانەى داگيريان كردوەو لەو كۆيلانەى لەكانە زێڕەكاندا كاريان كردوە.

بۆيە دەبينين، دەرهێنانى زێڕ لەكانەكاندا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاكانى خودى مرۆڤ كەئيسپانيەكان گەيشتنە مەكسيك سەيريان كرد "ئەزتەكەكان" ڕێژەيەكى زۆر زێڕيان لادايە، هەروەها خێلّەكانى ئێنكاى كۆنيش ڕێژەيەكى زۆر زێڕيان كۆكردبوەوە، پێش ئەوەى پياوانى سپى بێست بگەنە پيرۆو ئەفريقاى باشور بەسەدان سالّ.

دۆزينەوەى زێڕ، لەهەرچى شوێنێكى ئەم دونيايەدا بوبێت، هەميشە پالّى بەسەركەشانەوە ناوە بەشوێنيدا بگەڕێن.

لەسالّى ١٨٤٨ پياوێك بەناوى "جۆن سوّتەر" خەريكى دروست كردنى خانويەك بو لەويلايەتى كاليفۆرنياى ئەمريكا، پياوێكيش بەناوى "جميس

مارشاڵ"كه یارمەتی جۆنی دەدا لەكاتی ئیش كردنی لەكەنار جۆگەیەك بەتەنیشت ماڵی جۆندا دەچو هەندێك كانزای زەردی چاوپێكەوت لەناو قوڕو لیتەی جۆگەكە، دوای تاقیكردنەوە دەركەوت ئەو شتە زەردانە زێڕن.

دوای ئەم دۆزینەوەیە زۆر بەخێرای لەساڵی ١٨٤٩دا لێشاوی گەڕان بەدوای زێڕدا دەستی پێكرد، كەزۆری خەڵكی ڕاكێشا بۆ ئەوەی بچن بۆ ویلایەتی كالیفۆرنیا لەوێدا نیشتە جێبن و دەست بكەن بەبوژاندنەوەی لێوارەكانی ئەمریكا لەسەر زەریای ئارام.

## ئەدیسۆنی داهێنەر خۆی، خۆی فێركرد

تۆماس ئەدیسۆن، یەكێكە لەداهێنەرە مەزنەكانی مێژوی مرۆڤایەتی، ئەدیسۆنی داهێنەرو بلیمەت و زانا، خۆی، خۆی فێركرد، لەژیانیدا زیاتر لەهەزار داهێنانی كردوە، كە گرنگترینیان كارەبایە.

ئەدیسۆن هیچ پشتێنەیەكی بیردۆزەی یان ماتماتیكی نەبوە، بەڵكو زۆربەی سەركەوتنەكانی لەڕێگەی چاككردن و تەواوكردن و بیرۆكەو داهێنانەوە بوە، بەشێوەی تاقی كردنەوەو هەڵە.

تۆماس لەشاری میلانی ویلایەتی ئۆهایۆی ئەمریكا، لە ١١ شوباتی ساڵی ١٨٤٧لەدایك بوە.

هەر لەسەرەتاوە منالێكی سەیر بوە، لەقوتابخانەدا زۆر تەمەڵ بوە، بەڵام دوای دەركردنی لەقوتابخانە كتێبی زانستی زۆر دەخوێنێتەوە، لەتەمەنی دەساڵیدا تاقیگەیەكی كیمیاوی لەماڵی خۆیاندا دروست كرد،

بۆ ئەوەی پارەی دەست بكەوێت دەستی دایە رۆژنامەو شیرینی فرۆشتن لەناو شەمەنەفەردا، بەڵام ئەو بڕە پارەیەی دەستی دەكەوت پێویستیەكانی جێ بەجێ نەدەكرد، لەبەر ئەوە چاپخانەیەكی كڕیو ڕۆژنامەیەكی هەفتانەی لەناو شەمەنەفەردا چاپ و بڵاو دەكردەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا تاقیگەیەكی كیمیاوی لەیەكێك لەفارگۆنەكانی تەنیشت چاپخانەكەیدا كردەوە.

ڕۆژێكیان تاقیگەكەی ئاگری گرت، ئەمەش لێپرسراوانی هێڵی ئاسنی توڕەكردو

هەرچى كەلوپەلى زانستى هەبو هەمويان فڕێ دايە دەرەوە، جارێكيتريش، لەڕوداوێكى شەمەنەفەردا، بەراكێشانى گوێچكەى ڕزگاركرا، كەبوە هۆى كەڕ بونى هەتا هەتايى.

لەسالّى ١٨٦٢دا ئەديسۆن لەڕوداوێكى شەمەنەفەردا، منداڵێكى ڕزگار كرد، بەلاّم باوكى منداڵەكە، هيچ پولێكى نەبو پاداشتى ئەديسۆنى پىّ بداتەوە، بۆيە بەڵێنى دايە، فێرى بروسكە ناردنى بكات، هەرواش بو ئەديسۆن لەسەر تەلەگراف فێرى بروسكە ناردن بو.

لەسالّى ١٨٦٨دا توانى يەكەم دەستا وێردى داهێنان بەدەست بێنێت لەتەلەگرافدا، لەهەمان ساڵدا بو توانى ئامێرى تۆماركردنى دەنگ (مسجل) دروست بكات، هەروەها گۆڕانكارى زۆر چاكيشى لەئامێرى چاپدا كرد.

لەسالّى ١٨٧٨دا دواى تاقيكردنەوەيەكى زۆر ئەديسۆن توانى گلۆپى كارەبايى دروست بكات، كەلەسەرى سالّى ١٨٧٩دا هەمو جادەكانى ميلان بەو لامپانە ڕوناك كرانەوەو، ڕۆژنامە نوسانى جيهانيش بۆ بينينى ئەم ڕوداوە گرنگە هاتنە ئەم شارە.

لەسالّى ١٨٨٧دا ئەديسۆن گواستيەوە بۆ تاقيگەيەكى گەورەتر لەويست ئورانج، بۆ ڕێزگرتن لەو زانياريەيان لەدروست كردنى كارەباو دابەشكردنيدا بەدەستيان هێنا بو، لەگەڵ "تەسەلا"ى هاوڕێى پێشوى، لەسالّى ١٩١٢ خەلاّتى نوێڵى درايە، بەلاّم "تەسەلا" قبوڵى نەكرد ناوى لەگەڵ ئەديسۆندا بێت، بۆيە هيچ كاميان خەلاّتەكەيان وەرنەگرت.

ئەديسۆن هەمو ژيانى بۆ داهێنانى زانستى تەرخان كردبو، بيرۆكەكانيشى هەميشە لەسەريدا هەڵدە قولاّ، تاڕۆژى مردنى لە ١٨تشرينى يەكەمى سالّى ١٩٣١ دا.

لەسالّى ١٩٦٠دا ناوى خرايە ڕيزى ناودارانى ئەمريكاوە، وەكو ئەندامێك لە "سەنتەرى ناوداران"دا.

## كاراتىّ

كاراتىّ ڕێگەيەكى سەربازيە بۆ جەنگين بەبىّ چەك، بەبەكارهێنانى مشت يان لێدان يان ڕێگەگرتن لەبەرامبەر، بەهەردو دەست يان هەردو قاچ.

ئەوەى هونەرى كاراتىّ بزانێت دەتوانێت، بىّ ئەوەى هيچ چەكێك بەكار بهێنێت ڕەقيبى خۆى ببەزێنێت، پسپۆڕى كاراتىّ دەتوانێت بەتەنيا هێرشى بەرامبەرەكەى بدۆڕێنێت.

جۆدۆ هونەرى بەرگرى لەخۆكردنە، بەلاّم كاراتىّ هونەرى هێرش بردنە.

"کاراتیێ" وشەیەکی ژاپۆنیە بەواتای (دوو دەستی بەتاڵ) کاراتیێ دەبێت هێز بخەیتە سەر لەش لەخاڵی لێداندا، بەکاریگەریەکی زۆر خێرا بۆ لێدانەکە، خاڵەکانی لێدان بریتیە لەهەردو دەست، پاژنەی پێ، باسك، ئانیشك، جوموشك.

بەمەش کاراتیێ دەتوانێت دار یان چیمەنتۆ بشکێنێت بەدەستی یان قاچی ئەگەر چەند ئینجێکیش ئەستور بێت، بەلآم کاتو تەکنیكو ورە بەرزیو وەکو توانای لاشەیی گرنگە.

لێدانە دەستیەکانو مشتەکان لەکاراتێدا لەماوەیەکی یەك ئینجیدا دەوەستێت، هەمو گێمێکی کاراتیش تەنیا سێ خولەکە.

ئەگەر یاری چی نەیتوانی هێرشی تەواو ببات ئەوا دادوەر لەسەر بنەمای جوڵەو شێوە هونەریەکەیو بەرەنگاری لەخۆ کردن بریاری خۆی دەدات.

بەدرێژای چەندین سەدە ئاسیاییەکان توانیان هونەری کاراتیێ پەرە پێبدەن، بەلآم یاسا ژاپۆنیەکانی لەسەدەی حەڤدەهەمی زاینیدا لەئۆکیناوا دانرا، لەبیستەکانی سەدەی بیستەمدا ئەم یاریە چوە ژاپۆنەوەو، ئەمڕۆ وابلآوبۆتەوە، سەرانسەری جیهانی گرتۆتەوە.

## کاکاو لەکوێدا دەچێنرێت؟

کاکاو لەئەمریکای ناوەندو باشوردا پەیدا بوە، بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٩١٣دا تۆوەکەی لەغانادا کشت کرا، تاساڵی ١٩١٣ غانا یەکەمین وڵات بوە لەبەرهەم هێنانی کاکاودا.

کاکاو ڕوەکێکی هەمیشە سەوزەو لەساڵێکدا دوجار بەردەداتو دارەکەشی تانزیکەی حەوت مەتر بەرز دەبێت، گوڵەکانی لەشێوەی ئەستێرەدایەو ڕەنگەکەشی مێخەکیو زەردە، دوای ماوەیەك گوڵەکان بەردەدەنو درێژی کاکاوەکە ٦بۆ ١٠ئینجەو ئەستوریەکەشی لەنێوان ٢بۆ ٤ئینجدایە.

ناوچە ئیستوائیەکان گونجاوترین شوێنە بۆ گەشەکردنی داری کاکاو، چونکە کاکاو بەردەوام پێویستی بەشێ هەیە، لەهەندێك وڵاتیشدا بەئاودان پێدەگات ئەو ناوچانەی کەرێژەی بارین تیایدا لەنێوان ٥٠بۆ ١٠٠ ملیمەترە گونجاوترین شوێنە بۆ داری کاکاو.

بەشێوەیەکی گشتی دو وەرز هەیە بۆ چنینەوەی بەروبومی کاکاو، یەکەمیان لەتشرینی یەکەم تائازارە، دوەمیشیان لەئایار تائابە، کاتێك داری کاکاو تەمەنی دەگاتە پێنج ساڵ ئەمجا بەر دەدات، کۆکردنەوەی بەرەکەشی لەلفەدارە کانەوە، بەهۆی چەقۆیەکی زۆر تیژەوە دەبێت.

زیاتر کچانو ژنان خەریکی کۆکردنەوەو چنینەوەی دانەکانی کاکاو دەبنو دەیخەنە سەبەتەوەو دەیبەنە شوێنێك ناوەکەی دەردەهێننو لەسندوقێکی کونکوندا دای دەنێن، بەم کردارەش پاك دەبێتەوە لەهەرچی پیسیە.

دوای ئەوە دانەکانی لەسەر قوماشێك هەڵدەخرێت لەبەر تیشکی ڕۆژدا، تابەتەواوی وشك دەبێتەوە.

لەودانە کاکاوانە هەویرێك دەکرێت، لەو هەویرە هاڕاوەی کاکاو دروست دەکرێت، کاکاو لەگەڵ زۆر لەخواردنەکاندا بەکاردێت، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی لەشوکولاتەدا بەکاردێت.

کەرێی کاکاو، لەگرتنەوەی چەوری لەدانەکان، دروست دەکرێت، دەبێت بوترێت کاکاو لەدروست کردنی هەندێك مەوادی پزیشکیشدا بەکاردێت.

## بۆچی شیر لەکاتی کولاندندا هەڵدەچێت؟

کاتێك شیر دەکوڵێنرێت هەڵدەچێت، ئایا دەزانیت هۆی چیە؟

بەپێچەوانەی ئاوەوە، شیر ماددەیەکی ساکارنیە، بەڵکو ماددەیەکی کەتیرەییەو مەوادی زۆری تیایە کەگرنگترینیان پرۆتینو شەکرو ڕۆنە.

لەکاتی کولاندنی شیردا پرۆتیناتو چەوریەکە، بەشێنەیی لەیەکتر جودا دەبنەوە لەبەرئەوەی چەوریەکە لەشیرەکە سوکترە لەسەرەوە توێژاڵێك دروست دەکات پێی دەوترێت قەیماخ.

لەکاتی کولاندنی شیرەکەدا هەندێك لەئاوەکە دەبێتە هەڵم، لەبەر ئەوەی چینی سەرەوەی شیرەو بەچەوری داپۆشراوە، هەڵمی ئاوەکە لەژێریدا کۆدەبێتەوە.

لەگەڵ زۆر کولاندنیدا هەڵمەکە دەکشێتو کەفێکی زۆر لەسەرەوە دروست دەکات لەکۆتایدا هەڵمە پەستاوەکە چینە قەیماخەکە پاڵ دەنێت بۆ سەرەوەو کاتێك هەڵمەکە دەردەچێت، بەشێك لەقەیماخو شیرەکە هەڵدەچێت.

زۆر ئاسانە نەيەڵێت شيرەكە هەڵبچێت، ئەوەی لەسەرتە بيكەيت كردنەوەی ڕێگەيەكە بۆ دەرچونی هەڵمی ئاوەكە، ئەو كردارەش زۆر ئاسانە، بەدانانی كەوچكێكی درێژ لەو مەنجەڵەدا، كەشيرەكەی تێدا دەكوڵێت، ئەمەش وادەكات هەڵمەكە لەژێر توێژە قەيماغەكەدا نەپەستێت و شيرەكەش هەڵنەچێت.

## بۆچی پێويستيمان بەپاسپۆرت هەيە؟

پاسپۆرت، ئەو بەڵگە نامە ڕەسميەيە كەمرۆڤ دەتوانێت لەوڵاتێكەوە پێی بچێت بۆ وڵاتێكی تر، لەسەرانسەری جيهانيشدا لەدێر زەمانەوە بەكار هێنراوە.

وشەی "پاسپۆرت" وشەيەكی ئينگليزيە مانای "پەڕينەوە لەبەندەر" دەدات، چونكە كاتی خۆی ڕێگەی ئاسمانی و زەمينی و وەكو ئێستا نەبوەو تاكە ڕێگەيەك كەزۆر باوبوە ڕێگەی دەريايی بوە.

لەگەڵ ئەوەدا پاسپۆرت ڕێگەی ئەوەمان دەداتێ، لەوڵاتەكەی خۆمانەوە بچينە وڵاتێكی تر، بەڵام دەبێت ڤيزە "چونە ژورەوە"وەربگرێت لەباڵوێز خانەی ئەو وڵاتەی بۆی دەچين، بەبێ وەرگرتنی ڤيزە هيچ كەس ناتوانێت بەڕەسمی بچێتە وڵاتێكی ترەوە.

پاسپۆرت بريتيە لەناميلكەيەكی بچوك، كەزانياری تەواوی لەسەر خاوەنەكەی تێدايە وەكو ناوی خۆی و باوكی و بنەماڵەكەی و پيشەكەی و ساڵ و شوێنی لەدايك بون و ژمارەی تەلەفون لەگەڵ وێنەيەكی هەڵگرەكەيدا، كەدەبێت لەلايەن كاربەدەستانی وڵاتەكەوە سەلمێنرابێت "تصديق" كرابێت.

لەناوی پاسپۆرتەكەدا ناوی ئەو وڵاتانەش دەنوسرێت كەڕێگە دراوە بچێت بۆی، لەوڵاتانی بيانيدا مرۆڤ تەنيا بەپاسپۆرتەكەی دەناسرێت، بۆيە لەسەر ئەو بنەمايە دەبێت بپارێزرێت.

## دانانی كتێبخانە

كتێبخانە پێش هەشت هەزار ساڵە هەر بوە، دانيشتوانی وڵاتی نێوانی دوزێ "عێراق" لەو سەردەمەدا، لەسەر تابلۆی قوڕين نوسيويانە، بەدارێك كەشێوەی مێخكدا بوەبەناوی ACUNEUS، هەر لەبەر ئەوەش بوە نوسينەكانيان بەنوسينی مێخی ناسراوە.

دوای نوسين لەسەر تابلۆكان، لەفڕندا سور دەكرايەوە، لەوەش ناياب تر،

دەخرایە ناو دو بەرگی لەقوڕ دروست کراوەوە، بۆ ئەوەی پارێزراو بێت.، هەزاران تابلۆ لەو تابلۆیانە لەکۆشك و پەرستگاکاندا دۆزرانەوە.

ئەو تابلۆیانەش بەیەکەم کتێبخانەی ڕاستەقینە دادەنرێت کەمرۆڤ ناسیبێتی، لەمیسری کۆندا کتێبخانە، لەپەرستگاکان و لەژێر چاودێری پیاوانی ئاینیدا بوە.

بەناوبانگترین کتێبخانەی ئەو سەردەمەش کتێبخانەی ئەسکەندەریە بوە، کەنزیکەی سێسەد ساڵ پێش زاین دروست کراوەو بریتی بوە لە٧٠٠هەزار لەتۆماری کاغەزێك کەلەقامیش دروست کرا بو.

ئەم کتێبخانەیە بەتەواوی دێباجەو پۆلێن کرا بو لەژێر ١٢٠ناونیشاندا، ڕۆمانیەکان یەکەم کەس بون بیریان لەدروست کردنی کتێبخانەی گشتی کردەوە.

یۆلیۆس قەیسەر پلانی سیستەمی کتێبخانە گشتیەکانی داناو دوای ئەوە کتێبخانەی گشتی بو بەدەزگایەکی ڕۆمانی.

دەوڵەمەندەکانی ڕۆماش بەشوێن پێی یولیوس قەیسەردا ڕۆیشتن و گرنگیەکی تایبەتیان بەکتێب و کتێبخانەدا، بۆ گەلەکەیان تاوای لێهات لەسەدەی چواردەهەمدا ٢٨ کتێبخانەی گشتی لەڕۆمادا هەبو.

لەسەرەتای هاتنی مەسیحیەتدا، کتێبخانە، بو بەبەشێك لەکەنیسەو دەیرەکان و ڕاهیبەکانیش هەرچی کتێبێکیان دەخوێندەوە، دەشیان نوسیەوە.

زۆربەی ئەو کتێبە کۆنانەی ئێستا هەن، دەگەڕێتەوە بۆ نوسینی ئەو ڕاهیبانە، کاتێك لەکۆتای سەردەمە تاریکەکاندا، کاتا درائیە گەورەکان دروست کران، شوێنێکی تایبەتی بۆ کتێبخانە تیایاندا دروست کرا.

زانکۆکانی پاریس و هاید لبێرگ و فلۆرەنساش ژمارەیەکی زۆر کتێبیان هەبو کەبە "تەل" پێکەوە بەسترابونەوە بۆ ئەوەی پارێزراوبن، چونکە دروست کردن و چاپکردنی زۆر گران دەکەوت.

ساڵی ١٤٠٠ زاینی زانکۆی ئۆکسفۆرد، دەستی بەرێکخستنی کتێبخانەکەی کرد کەناوی "بودلیان" بو، ئەمڕۆ بەگەورەترین کتێبخانەی زانکۆیی دادەنرێت لەجیهاندا.

سەرکردەکانی ئینگلیز لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، پشتگیری جەماوەریان

کرد، بۆ کردنەوەی کتێبخانەی گشتی.

لەساڵی ١٨٥٠دا پارلەمانی بەریتانی، یاسایەکی دەرکرد کەڕێگەی دەدا بەدروست کردنی کتێبخانەی گشتی، ئیتر ئەو جۆرە کتێبخانەیە هەر زۆر بەخێرایی گەشەی سەندو هەمو شوێنێکی دونیای گرتەوە بۆیە ئەو کتێبخانەیە گشتیانەی ئەمڕۆ باوە لەجیهاندا تەمەنیان لەسەدساڵ زیاتر نیە.

## یەکەمین قوتابخانە



قوتابخانە ئەو شوێنەیە کەخەڵکی تێیدا کۆدەبنەوە بۆ فێربون، بەزۆریش منداڵان، تێبینی دەکەن لەم پێناسەیەدا دوخاڵی گرنگ هەیە، یەکەمیان بونی شوێنێکی دیاری کراو دوەمیان بونی زیاتر لەیەك منداڵ بۆ فێربون.

قوتابخانەی نوێ گەشە سەندوی قوتابخانەکانی گریكو ڕۆمانی کۆنە، لەیۆنانی کۆندا منداڵان بەتەنیا لای مامۆستاکانیان خوێندویانەو فێربون لەپۆلدا نەبوە.

وتاریێژو فەیلەسوفەکانی گریك، ئەوانەی منداڵنیان فێری خوێندنو نوسین کردوە بەسەر ماڵەکاندا گەڕاون بۆ ئەوەی منداڵەکانیان فێری خوێندن بکەن، دوای ئەوە شوێنێکی تایبەتیان دروست کرد، بۆ ئەوەی منداڵان، ڕوی تێ بکەنو فێری خوێندنو نوسین بن کەلەقوتابخانەی ئەمڕۆ دەچو.

"ئیفلاتون"ی فەیلەسوفی ئەغریقی یەکەم کەس بوە پرۆگرامێکی ڕێكو پێکی خوێندنی بۆ قوتابیەکانی داناوە کەسێ یان چوار ساڵی خایاندوە، لەشوێنێکی تایبەتیدا ناوی لێناوە "ئەکادیمیا"

لەبنەڕەتدا قوتابخانە شوێنێك بووە بۆ مەشق پێ کردنی میلیشیاکان یان ڕێکخستنی نمایشە سەربازیەکان، دوای ئەوەش ئەرستۆ قوتابخانەیەکی دروست

کرد، نەقوتابخانەکەی ئیفلاتون و نەقوتابخانەکەی ئەرستۆ لەقوتابخانە تازەکانی ئەمڕۆ نەدەچوون، بەشێوەیەکی سەرەکی شوێنی گفتوگۆو کۆڕو سیمینار بون.

لەساڵی ٢٥٠دا سەیریان کرد زمان بابەتێکە دەبێت هەمو قوتابیەك فێری ببێت، بۆیە قوتابخانەی ڕێزمان دروست کرا، لەوەوەیە ئینگلیزی زمانەکان بەخوێندنگا ناوەندەکانیان دەڵێن "گرامەر"، دوای ئەوە ڕۆمانیەکان، ئەوانەی موعجیب بون بەئەغریقیەکانەوە، قوتابخانەی تازەیان دروست کرد کەلەقوتابخانەکانی ئەمڕۆ دەچون.

دەبو قوتابیەکان بەیانیان، پێش ڕۆژ دەرچون لەخەو ڕابن و بچنە قوتابخانە بۆ ئەوەی زۆرترین ڕێزمان و زمانی بێگانە فێربن لەگەڵ ڕەوشتی جواندا، ئەو قوتابیانەی فێر نەبونایە، سزایان ئەوە بو بەدار لەژێر پێیان دەدرا.

## بۆچی هەست بەسورانەوەی زەوی ناکەین؟



خەڵکی تاچەند سەد ساڵێك پێش ئێستا، بڕوایان وابو زەوی وەستاوەو خۆرو مانگ و ئەستێرەکان بەدەوریدا دەسوڕێنەوە.

هۆی ئەو باوەڕەش زۆر ئاسانە چون هیچ کەسێك هەست بەجوڵانەوەی زەوی ناکات.

ئەگەر زەوی دەسوڕێتەوە بۆچی شتەکان لەجێی خۆیاندان ناترازێن لەوانە ئاوی زەریاکان؟

بەڵام ئەمڕۆ دەزانین بەردەوام زەوی لەدو جوڵەدایە: یەکەمیان بەدەوری خۆرداو دوەمیشیان بەدەوری خۆیدا، هۆی هەست نەکردنیشمان بەجوڵانەوەی زەوی، ئەو هێزە ڕاکێشانەیە کەهەمو شتێك لەسەر زەوی ڕادەکێشێت بۆ ژێرەوە، لەوانەش ئاوی زەریاکان.

ئێمە دەزانین زۆر شت هەیە پێمان دەڵێن زەوی دەسوڕێتەوە، لەوانە ڕودانی شەو ڕۆژ، ئەگەر زەوی نەسوڕایەتەوە، ئەو بەشەی بەدیوی خۆردا دەکەوێت

هەمیشە ڕۆژ دەبو دیوەکەی تریش کەپشتی لەخۆر بو هەمیشە شەو تاریکە دەبو.

بەلام بەسوڕانی زەوی بەدەوری خۆردا هەموو خالێك لەسەر ڕوی زەوی دەگۆڕێت بەرەو لای ڕوناکیو ئەمجا تاریکی هەر بیستو چوار کاتژمێر جارێك.

سوڕانەوەیەکی گرنگی زەوی کە" هەستی پیّ ناکەین"، بەلام کاردەکاتە سەر ژیانمان، سوڕانەوەی ئەستێرەی زەویە بەدەوری خۆردا، ئەو سوڕانەوەیەش دەبێتە هۆی گۆڕانو ڕودانی وەرزەکان.

ئێوەش دەزانن، لەگەلْ هەر وەرزێکی تازەدا چەند ژیانمان دەگۆڕێت، ئەو سوڕانەوەی زەویش بەدەوری خۆردا، کەنزیکەی ٣٦٥ڕۆژو چارەکە ڕۆژێك دەخایەنێت پێی دەوترێت سالْ، بەوەش مێژوی تەمەنمان پێوانە دەکەین، هۆی گۆڕانی وەرزەکان، خوار بونەوە یان لادانی محیوەری زەویە، ئەو میحوەرە لەهێڵی ستونی ٢٣ پلەو نیودا لادەدات.

هەردوو جەمسەرەکەش نیوسالْ بەلای خۆردا خوار دەبنەوەو شەش مانگەکەی تریش لێی دور دەکەونەوە.

بەوجۆرەش بەشی باکوری زەوی، بۆ ماوەی شەش مانگ زۆرێك لەتیشکی ڕۆژو گەرما وەردەگرێت، بەوەش دەلێن "هاوین" لەکاتێکدا لایەکەی تری، کەمترین تیشکی خۆر وەردەگرێتو دونیا تیایدا سارد دەبێتەوە، بەوەش دەوترێت "زستان".

## گەورەترین بومەلەرزە



ئەگەر توێکلّی زەوی ڕەق نەبوایە، ئەوا هەمیشە زەوی لەجولانو بەرزبونەوەو دابەزیندا دەبو.

لەگەلْ ئەوەشدا هەندێك شوێن لەبەردەکانی توێکلّی زەویدا هەیە، باش یەکتریان نەگرتوەو لەو شوێنانەدا خالّی لاواز هەیە، بەدرێژای خالّە لاوازو شکانەکە فشاندنێکی زۆر

گەورەو بەهێز دروست دەبێت، کەزەوی لەرزەی لێ دەکەوێتەوە.

لەڕوی قەبارەوە دو وەسف هەیە بۆ زەوی لەرزە:

یەکەمیان: هێزی خودی بومە لەرزەکەیەو دووەمیشیان: ئەو زیانەی لێی دەکەوێتەوە.هەرچەند کوشتنی مرۆڤو وێران بونی مومتەلەکات، لەپێوەرە هونەریەکان زیاتر کار لەخەڵکی دەکات، بەلاَم "بومەلەرزەی گەورە" ئەوەیە کەزۆرترین خەڵك لەناو بدات.

لەساڵی ١٩٠٦ بومەلەرزەیەکی گەورە دای لەسان فرانیسکۆ لەئەمریکای باکور، دوای بومەلەرزەکەش ئاگرێکی گەورە کەوتەوە، سەد هەزار کەسی کوشت، بڕی زیانە مادیەکانی بومەلەرزەکەش لەوسەردەمەدا بە٤٢٥ملیۆن دۆلاری ئەمریکی مەزەندەکرا.

لەساڵی ١٧٥٥ بومەلەرزەیەك شاری لشبۆنەی پورتوگاڵی وێران کردو کەمتر لە٣٠ هەزار کەسیشی کوشت، لەساڵی ١٩٠٨دا بومەلەرزەیەك لەکالابریاو سەقەلیەدا ڕوی دا ٧٥هەزار کەسی کوشت.

لەساڵی ١٩١٥دا بومەلەرزەیەك لەناوەڕاستی ئیتالیادا ڕوی دا، سەدان لادێو شاری وێران کردو سی هەزار کوشتاریشی لێکەوتەوە.

دو بومەلەرزەی زۆر گەورە بوە هۆی زیێنێکی زۆر گەورە، لەتۆکیۆی ژاپۆنو هەرێمی کانسۆی چیندا.

بومەلەرزەکەی تۆکیۆی ژاپۆن، لەساڵی ١٩٢٣دا ڕوی داو زیاتر لە ١٠٠ هەزار کەسی کوشتو شارەکەشی وێران کردو یۆکۆهاماشی لەگەڵ خۆیدا ڕوخاند.

بومەلەرزەکەی کانسۆی چینیش لەساڵی ١٩٢٠دا ڕوی داو ڕوبەری ٣٠٠ میلی چوار گۆشەی گرتەوەو نزیکەی ٢٠٠ هەزار کوشتاری لەشوێن خۆی بەجێ هێشت.

دەشێت بومەلەرزەی زۆر گەورە ببێت، بەلاَم زۆر بەکەمی ڕودەدات، بۆ نمونە لەساڵی ١٨١١و ١٨١٢دا لەنزیك شاری "نیومەدرید"ی ویلایەتی مەیزوری ئەمریکا بومەلەرزەیەك، ڕویدا خەڵکی لەدوری ٤٠٠ میلەوە هەستیان بەلەرزەکەی کرد کەزیاتر لە ١٨٧٣ لەرزینەوە دەبو، بەلاَم لەبەر ئەوەی چڕی دانیشتوان لەو

ناوچانەدا كەم بو، بۆیە زیانێكی ئەو تۆی لێ نەكەوتەوە.

بەڵگە نامەكانی بومەلەرزەی جیهان ئاماژە بەبومەلەرزەیەك دەكەن كەلەساڵی ٢٠ ئایاری ٥٢٦زدا داویەتی لەشاری ئەنتاكیای سوریاو چارەكە ملیۆنێك خەڵكی كوشتوە.

## یەكەم رۆژنامە لەكوێ چاپكرا؟



بۆ ئەوەی بزانین یەكەم رۆژنامە لەدونیادا لەكوێ چاپكراوە، دەبێت بچین بۆ وڵاتی چینی هەزارو سێسەد ساڵی پێش ئێستا.

لەوكاتەدا حكومەتی چینی رۆژنامەیەكی چاپ دەكرد بەناوی "تشینخ باو" واتە "هەواڵەكانی پایتەخت" بەم رێگەیە حكومەت توانی خەڵكەكەی لەگۆڕانكاریە گرنگەكان ئاگادار بكاتەوە.

هەروەها رۆژنامەیەكی حكومی لەرۆمای كۆندا دەردەچوو بەناو خەڵكدا بڵاو دەكرایەوە، بەناوی "ئەكتا دیۆرنا" واتە "رووداوەكانی رۆژانە" ئەو دو رۆژنامەیە یەكەمین دو رۆژنامە بونە كەمێژوی مرۆڤایەتی تۆماری كردبێت، بەهاتنی سەدەی شانزەهەمخەڵكی بەرێژەیەكی باش رۆژنامەیان دەكری.

لەشاری بندقیە "ئیتالیای ئێستا" حكومەت رۆژنامەیەكی دەردەكرد، بەناوی "نوێزی سكریتی" واتە "هەواڵە نوسراوەكان" خەڵكیش بەیەك غازێت دەیان كڕی تالەسەدەی هەژدەهەمدا كار گەیشتە ئەوە رۆژنامە بەرێكوپێكی دەردەچو.

رۆژنامەی ئەو سەردەمەش تەنیا بریتی نەبو لەهەواڵ بەڵكو بۆ چونیشی تێدا بو، لەو رۆژنامانە، لەلەندەن ساڵی ١٦٦٣ دەردەچو بەناوی "زی ئینتیلبنسر"، بەڵام زۆربەی رۆژنامەكانی ئەو سەردەمە حەفتانە دەردەچون، لەبەر ئەوەی گواستنەوەو گەیاندنو بەرهەم هێنان زۆر خاو بو. یەكەمین رۆژنامەی ئەمریكیش

ناوی "بوبلیك ئوکیزنسیز" بو لەساڵی ١٦٩٠دا لەشاری بوستنی ویلایەتی ماسەت شوست دەردەچو، بەڵام هەرزو لەلایەن دەسەڵات دارانی ویلایەتەکەوە داخرا.

بنجامین فرانکلین لەساڵی ١٧٢٩ تاساڵی ١٧٥٢ ڕۆژنامەی "بنسلیڤانیا غازیت"ی بەڕێوە برد، لەساڵی ١٧٥٢دا لەموستە عمەراتەکانی بەریتانیادا لەئەمریکا تەنیا دو ڕۆژنامە دەردەچو، بەڵام لەماوەی شۆرشی ئەمریکادا گەیشتە ٣٧ ڕۆژنامە.

ئەشێت ڕۆژنامەی "تایمز"ی لەندەنی بڵاوترین و بەتەمەنترین ڕۆژنامەبێت کەلەساڵی ١٧٨٥تائێستا بەبەردەوامی دەردەچێت.

## ئایا هەسارەکانی تریش وەکو خۆر دەسوڕێنەوە؟

زەوی بەدو ڕێگە دەسوڕێتەوە، جارێکیان بەدەوری خۆرداو بەئاراستەیەکی جێگیردا کەپێی دەوترێت "مەدار" ئەو کاتەی زەوی پێویستیەتی بۆ تەواوکردنی ئەو مەدارە پێی دەوترێت "ساڵ".

هەروەها زەوی بەدەوری میحوەری خۆیشیدا دەخولێتەوە، ئەو کاتەش پێویستیەتی بۆ تەواوکردنی ئەو خولە پێی دەوترێت "ڕۆژ".

ئەستێرەکانی تریش بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، وەکو چۆن بەدەوری خۆیاندا دەسوڕێنەوە، بەڵام بەخێرایەکی جیاواز تر لەخێرای زەوی، زەوی بەدەورە خۆردا دەسوڕێتەوە بەماوەیەك، کەنزیکەی ١٥٠ ملیۆن کیلۆمەترەو پێویستی بەنزیکەی ٣٦٥ ڕۆژ هەیە تائەو خوڵە تەواو بکات، هەروەها پێویستیشی بە٢٤کات ژمێر هەیە تاخولێك بەدەوری خۆیدا بخوات.

ئێستاش وەرن بابچینە دونیای هەسارەکانی ترەوە:

دوری عوتارید لەخۆرەوە نزیکەی ٥٨ ملیۆن کیلۆمەترەو پێویستی بە٨٨ ڕۆژ هەیە تاخولێك بەدەوری خۆردا تەواو بکات، باوەڕ وایە کەعوتارید بەدەوری خۆیدا ٥٨ یان ٥٩ ساڵ جارێك خولێك دەخوات. هەسارەی زوهرەیش نزیکەی ١٠٨ ملیۆن کیلۆمەتر، لەخۆرەوە دورەو پێویستی بە ٢٢٥ ڕۆژ هەیە تاخولێك بەدەوری خۆردا بخوات، باوەڕی زانایان وایە هەسارەی زوهرە پێویستی بە٢٤٣ ڕۆژ هەیە

تاخولێك بەدەوری خۆیدا بخوات.

هەسارەی مەریخیش نزیکەی ۲۲۸ ملیۆن کیلۆمەترە لەخۆرەوە دورەو پێویستی بەنزیکەی ٦٨٧ ڕۆژ هەیە تاخولێك بەدەوری خۆردا بخوات، بەڵام سوڕانەوەی بەدەوری خۆیدا بەرامبەر خێرای زەویە.

موشتەری هەسارەیەکە نزیکەی ۷۸۰ ملیۆن کیلۆمەتر لەخۆرەوە دورە، خولێکی بەدەوری خۆردا نزیکەی ۱۱،۹ ساڵ دەخایەنێت، بەڵام پێویستی بەکەمتر لە ۱۰ کاتژمێر هەیە تاخولێك بەدەوری خۆیدا بخوات.

هەسارەی "زوحەل"یش لەخۆرەوە ١٤٢٦ ملیۆن کیلۆمەتر دورەو پێویستی بەنزیکەی ۲۹،٥ ساڵ هەی تاخولێك بەدەوری خۆردا بخوات، لەکاتێکدا پێویستی تەنیا بە۱۰ کات ژمێر هەیە، تاخولێك بەدەوری خۆیدا بخوات.

"ئۆررانۆس"یش ۲۸۷۰ ملیۆن کیلۆمەتر، لەخۆرەوە دورەو خولێکی ٨٤ ساڵ دەخایەنێت.

"نیتۆن" ٤٤٩٣ ملیۆن کیلۆمەتر لەخۆرەوە دورەو خولەکەش بەنزیکەی ١٦٥ ساڵ تەواو دەکات.

## ڕێکردن بەدەم خەوەوە؟

هەندێك کەس هەن شەو لەناو جێگای نوستندا ڕادەپەڕن و خۆیان دەگۆڕن و دەست بەڕۆشتن دەکەن، لەکاتێکدا بێدارن و هێشتا خەوتون و ئاگایان نیە لەو کاتەدا چی دەکەن.

ئایا دەزانن بۆچی ئەو حاڵەتە ڕودەدات؟

بۆ ئەوەی لەو حاڵەتە تێبگەین دەبێت بزانین خەو چییە.

بەپشت بەستن بەڕاستیە زانستیەکان کەدەڵێن: لەمێشکی مرۆڤدا شوێنێك هەیە پێی دەوترێت " خاڵی نوستن" ئەو خاڵە کۆنترۆڵی چالاکیەکانی خەو و ڕۆشتن دەکات.

کاتێك لەڕۆژدا بێدارین و زۆربەی ئەندامانی لەشمان ئیش دەکەن، بۆیە لەشمان ترشی لوبنیك و کالسیۆم و مەوادی تر بەرهەم دەهێنێت و ئەو مەوادانەش لەگەڵ خوێندا تێکەڵ دەبن.

کاتێك خوێن ئەو کالیسیۆمە دەگوێزێتەوە بۆ "خاڵی نوستن" خاڵی نوستن گورج دەبێتەوەو مرۆڤ بەرەو خەو دەبات.

خاڵی نوستن لەلەشدا دوکار ئەنجام دەدات:

یەکەمیان: بەشێك لەمێشك دادەخات، بۆیە لەکاتی خەوتندا هەست بەهیچ شتێك ناکەین، دەتوانین بەو حاڵەتە بڵەین خەوتنی مێشك.

دوەم: هەندێك دەماری دیاری کراو لەمێشکی مرۆڤدا دادەخات بەمەش ئەندامە ناوخۆییەکان‌و دەست‌و قاچمان لەکار دەکەوێت‌و خەو دەمان باتەوە.

لەهەندێك کەسدا ڕودەدات، مێشکیان خەوتوە، بەڵام لاشەیان هێشتا بەئاگایە، ئەمجۆرە کەسانە کۆئەندامی "عصبی" یان بەشێوەیەکی سروشتی ئیش ناکات، بۆیە توشی ئەو حاڵەتە دەبن‌و لەجێگەی خۆیان ڕاست دەبنەوەو بەدەمی خەوەوە دەڕۆن.

## بۆچی ژیان لەسەر مانگ نیە؟

دوای ئەوەی مرۆڤ گەیشتە سەر مانگ، زۆر شتی لەبارەوە فێر بو، بەڵام تەنیا شتێك، کەپێش ئەوەی بگاتە سەرمانگ‌و دەیزانی ئەوە بو، کەلەسەر مانگدا ژیان نیە.

مانگ بەپێچەوانەی زەوی، هیچ توێکڵێکی گازی نیە، ئایا زانایانی گەردون ناسی چۆن ئەوەیان زانی؟

لەبەر ئەوە مانگ هیچ شەفەقێکی نیە.

تاریکی وردە وردە باڵ دەکێشێت بەسەر زەویدا، لەبەر ئەوە هەوای سەر زەوی تیشکی خۆر ئاوەژو دەکاتەوە، تەنانەت دوای خۆرئاوا بونیش، بەڵام سەر ڕوی مانگ لەکتو پڕێکدا ڕوناك دەبێت‌و لەپڕێکی تردا دەبێتە شەو، نەبونی توێکڵێکی گازی، واتە هیچ شتێك نیە مانگ لەهیچ تیشکێك لەتیشکەکانی خۆر بپارێزێت.

خۆر گەرماو ڕوناکی دەنێرێت بۆ سەر زەوی‌و سەرزەویش بشت بەگەرماو ڕوناکی خۆر دەبەستێت، لەهەمان کاتدا جۆرەها تیشکی مەترسیدارمان بۆ دەنێرێت، بەڵام بەرگە گازی زەوی لەزۆربەی ئەو تیشکە مەترسی دارانە دەمانپارێزێت، بەڵام لەسەر ڕوی مانگ هیچ بەرگە گازێك نیە بەرگری ئەو تیشکانە بکات، لەبەر ئەوە هەرچی تیشکی خۆر هەیە دەداتە سەر ڕوی مانگدا.

وەکو وتمان: لەبەر ئەوەی هیچ بەرگە گازێك نیە لەسەر ڕوی مانگ، جادەبێت ڕوی مانگ یان زۆر گەرم بێت یان زۆر سارد بێت.

لەگەڵ سوڕانەوەی مانگدا ئەو دیوەی کەخۆر ڕوناکی دەکاتەوە، زۆر گەرم بێت، بەجۆرێك پلەی گەرما تیایدا دەگاتە زیاتر لە١٥٠ پلەی سەدی کەلەپلەی کوڵاندنی ئاو بەرز ترە.

ڕۆژی مانگی گەرمیش دوحەفتە دەخایەنێت، کاتێکیش دەبێتە شەو هەمان شت دو حەفتە دەخایەنێت، بەجۆرێك پلەی گەرما لەشەودا، دەگاتە ١٢٥ پلەی سەدی ژێر سفر کەدوجا لەپلەی گەرمای جەمسەری باشوری زەوی ساردترە.

## ڕاستکردنەوە لەدەستوری ئەمریکادا

ویلایەتە یەکگرتوەکان یەکێکە لەو وڵاتانەی کەدەستورێکی نوسراوی هەیە، ئەو دەستورەش لەگەڵ پێداویستیەکانی خەڵکی ئەمریکادا دروست بوە.

بەیەکێك لەم دو ڕێگایە ڕاست کردنەوە دەبێت:

ئەگەر دو لەسەر سێی کۆنگرس دەنگ بدەن لەسەر ڕاست کردنەوەکە،

ڕێگای دوەم بدرێتە ویلایەتەکان بۆ ئەوەی لەڕێگەی ئەنجومەنی یاسادانەکانیانەوە یان کۆنگرە تایبەتیەکانیانەوە سەیری بکەن ڕەزامەندی لەسەر بدەن.

کۆنگرە ئازادە بڕیار لەسەر کام لەم دو ڕێگەیە دەدات.

ئەگەر دوو لەسەر سێی ویلایەتەکان ئیمزا لەسەر هەر ڕاست کردنەوەیەك بکەن، ئەوا دەکەوێتە بواری جێ بەجێ کردنەوەو وەزیری دەرەوەش ئەوە ڕادەگەیەنێت ڕاستکردنەوەی یەکەم، لیستی مافەکانی زۆر گرنگ بو چون لەدەستوردا تەواو نەکرا بو.

بەواتایەکی تر بەشێك بو لەدانانی دەستور، ڕاستکردنەوەی یازدەو دوازدەش بەهەمانشێوە ڕاستکرایەوە، ماوەیەکی دورو درێژ هیچ ڕاستکردنەوەیەك لەدەستوری ئەمریکیدا نەکرا.

ڕاستکردنەوەی سیازدەهەم: کۆیلایەتی نەهێشت، بەڵام ڕاستکردنەوەی چواردەهەم مافەکانی هاوڵاتیانی پاراست، پانزەهەمیش مافی دەنگدانی یەکسان کرد بەچاوپۆشین لەڕەنگ و نەژاد.

ڕاستکردنەوەی شانزەهەمیش: ڕێگەی دابەکۆنگرس بەکۆکردنەوەی باجی

دەرامەت.

ڕاستكردنەوەی حەڤدەهەمیش: مافی هەڵبژاردنی پیرانی "سیناتۆرەكان" دایە خەڵكی لەبری ئەنجومەنی یاسادانانی ویلایەتەكان.

ڕاستكردنەوەی هەژدەهەمیش: خواردنەوەی مەشروباتی ئالكولی قەدەغە كرد، بەڵام بەڕاستكردنەوەی بیستویەكەم لەساڵی ١٩٣٣دا پوچەڵ كرایەوە.

ڕاستكردنەوەی نۆزدەهەم: مافی دەنگدانی دا بەژن.

ڕاستكردنەوەی بیستەم: مەرجەكانی كاری سەرۆكو جێگیری سەرۆكو كۆنگرسی گۆڕی.

ڕاستكردنەوەی بیستو دوەم: ماوەی فەرمان ڕەوایی سەرۆكی بۆ دو ماوەی لەشوێن یەكی دیاری كرد.

ڕاستكردنەوەی بیستو سێیەم: مافی دەنگدانی دا بەهەرێمی كۆڵۆمبیا.

ڕاستكردنەوەی بیستو چوارەم: باجی سەرانەی قەدەغە كرد "باجێك بو دەخرایە سەر هەر كەسێكی پێگەیشتو".

ڕاستكردنەوەی بیستو پێنجەم: لابردنی سەرۆك كۆمار، ئەگەر شایستەیی تیا نەما.

ڕاستكردنەوەی بیستو شەشەم: مافی دەنگدانی دا بەهەر كەسێك بگاتە تەمەنی هەژدە ساڵ.

## كێشی زەوی چەندە؟

چون گۆی زەوی لەهەوادا هەڵواسراوە، بۆیە كێشەكەی، وەكو كێشی تەنێك نیە لەسەر تەرازویەك دانرابێت، ئێمە كاتێك باسی كێشی زەوی دەكەین مەبەستمان كێشی ئەو ماددەیەیە كەلێی دروست بوەو پێی دەوترێت "بارستای زەوی"

بارستای زەوی نزیكەی ٦٦٠٠ تریلیۆن تەنە، بۆ ئەوەی زیاتر بۆتان ڕون بێتەوە ئەم ژمارە بەمجۆرە دەنوسرێت "٦،٦٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠".

ئایا زانایان چۆن زانیان كێشی زەوی ئەوەندەیە؟

بۆ ئەوەی زانایان كێشی زەوی بزانن، مەبدەئێكیان بەكار هێنا لەسەر ئەو ڕاستیەی هەردو تەن یەكتر ڕابكێشن، بەكورتی یاسای ڕاكێشان دەڵێت: هەردو

تەن یەکتر ڕابکێشن بەهێزێك کەپشت بەقەبارەکەیان‌و دوری نێوانیان ببەستێت یەکتر ڕادەکێشن.

هەرچەندە هەردو تەنەکە لەڕوی قەبارەوە گەورەترین، ئەوا هێزی ڕاکێشانیان بۆ یەکتر زیاتر دەبێت، هەرچەندە دوری نێوانیان زیاتربێت، ئەوا ئەو هێزە کەم دەبێتەوە.

بۆ پێوانی کێشی زەوی ئەم تاقی کردنەوەیە دەکەین:

کێشێك لەهەوادا هەڵدەواسین بەسیمێك یان دەزویەك، زۆر بەوردی شوێنی کێشەکە دەپێوین، ئەمجا تەنێك لەقورقوشم لەکێشە هەڵواسراوەکە نزیك دەکەینەوە، دەبینین ڕاکێشانێك لەنێوان کێشەکەو قورقوشمەکەدا ڕو دەدات.

ڕاکێشانەکە تۆزێك کێشەکە لەهێڵی خۆی دور دەخاتەوە کە "٠،٠٠٠٠٢" میللمەترە، ئەمەش ئەو بیرۆکە وردەمان دەداتێ کەپێویستە لەکرداری کێشانەدا.

دوای ئەم تاقی کردنەوەیەو پێوانەیە زانایان دەتوانن بیرکاری بەکار بێنن بۆ مەزەنەکردنی کێشی زەوی.، چونکە پێوانەی هێزی ڕاکێشانی زەوییان لەسەر کێشەکە کردو پێوانەی هێزی ڕاکێشانی تەنێك لەقورقوشمیان لەسەر کێشە هەڵواسراوەکە کرد.

دەتوانن دوای ئەوە حیسابی جیاوازیەکە، یان "جیاوازیە ڕێژەییەکە" بکەن، کەبارستای زەوییان دەداتێ.

کەواتە ئەو بارستاییە لەچی پێك دێت؟

یەکەمجار توێکڵێك هەیە لەبەردی ڕەق کەپێی دەوترێت پێستی زەوی، دوای ئەوە چینێکی تر دێت پێی دەوترێت بەرگ، کەلەبەردی زۆر ڕەق پێك دێتو تاقوڵای ١٨٠٠میل درێژ دەبێتەوە.

دوای ئەوە دەگەینە ناخی زەوی یان چەقی زەوی کەقوڵترین خاڵەو نیوە تیرەکەشی نزیکەی ٢١٠٠ میلە، ئەو ماددەیەش کەلەناو ناخی زەویدایە، شلەیە، بەهۆی ئەو گەرما زۆرەی کەلەچەقی زەویدایە.

## ئایا هەسارەکانی تر دەسوڕێنەوە؟

یەکە یەکە باسی هەسارەکانی تر دەکەین، بابزانین چی لەگەڵ هەریەکەیاندا ڕودەدات؟

سوڕانەوەی عەتارد بەدەوری خۆردا تاتەواو دەبێت ٨٨ ڕۆژ دەخایەنێت، بەڵام زانایان ئەمڕۆ لەو بڕوایەدان، هەر سوڕێکی ٥٨یا ٥٩ ڕۆژ دەخایەنێت.

بەواتا عوتارد ڕۆژێکی خۆری هەیە "ماوەیەك لەشەو ڕۆژ"کە درێژیەکەی نزیکەی ١٨٠ ڕۆژی زەمینییە.

زوهرە هەسارەیەکە، تازە دۆزراوەتەوە، ئەستێرەی زوهرە خولەکەی خۆی بە٢٤٣ ڕۆژ جارێك تەواو دەکات.

خێرای سوڕانەوەی مەریخیش نزیکەی هەمان حێرای سوڕانەوەی زەویە، بەدەوری خۆردا، لەبەر ئەوە مەریخیش وەکو زەوی لەسەر میحوەرەکەی خوارە بۆیە ئەویش وەرزەکانی ساڵ تیایدا دروست دەبێت.

موشتەری لەبەر ئەوەی لەهەمو ئەستێرەکان گەورەترە، بۆیە خێرای سوڕخواردنی زۆر گەورەیە، هەر سوڕ خواردنێکێشی تەنیا ١کاتژمێرو ١٤ خولەك دەخایەنێت بەدەوری میحوەری خۆیدا.

ئۆرانۆسیش بەڕێگەیەکی زۆر نامۆ دەسوڕێتەوە، چون لەڕوی کرداریەوە بەلایەکیەوە هەڵزناوە.

هەردو نبتۆن و پلۆتۆش، دورترین هەسارەن لەزەویەوەو بەگوێرەی هەسارەکانی تر کەمترین شتیان لەبارەوە دەزانین.

نبتۆن خولانەوەی بەدەوری میحوەری خۆیدا ١٨،٥ کاتژمێر دەخایەنێت، بەڵام سوڕانەوەی بەدەوری خۆردا نزیکەی ١٦٥ساڵ دەخایەنێت.

سوڕانەوەی پلۆتۆش بەدەوری خۆردا ٢٤٩ ساڵی زەمینی دەخایەنێت.

## دامەزرێنەری ئەمریکا

جۆرج واشنتۆن بەدامەزرێنەری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دادەنرێتو هەمو ئەمریکیەکانیش بەباوکی ڕۆحی خۆیانی دادەنێن.

جۆرج واشنتۆن نەپیاوێکی بلیمەتو نەخوێندەوارێکی چاكو نەخاوەن زمانێکی پاراو نەنوسینی باش بوە، بەڵام سیفەتێکی لەهەمو ئەمانە گرنگتری تیا بوە، ئەویش خاوەنی کەسایەتیەکی بەهێزو مەبدەئێکی پتەو بوە.

زۆر سور بوە لەجێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکانەی پێی سپێدراوە، بۆیە

ئەمریکیەکان کردیانە سەرکردەی خۆیان‌و دوای مردنیشی ئەم وتەیان دەوت "لەجەنگدا یەکەم بو، لەئاشتیدا یەکەم بو، لەدڵی هەمو هاوڵاتیانیشدا یەکەم دەبێت" جۆرج واشنتۆن کەشتیوانێکی دەریایی بو، کەگەیشتە تەمەنی ١٢ساڵ باوکی کۆچی دوای کرد.

باپیرەی بەخێوی کرد، هەرچەندە هێندە زەوی دایە پێی بژێت، بەڵام نەیتوانی خوێندن تەواو بکات، لەکۆمەڵگای ڕۆژئاوای ئەو سەردەمەشدا، فێربونی ئەسپ سەاری‌و کشت‌و کاڵ‌و بەڕێوەبردنی خانوبەرە "عقارات" زۆر لەخوێندن‌و فێر بون گرنگتر بو.

جۆرجیش هێندە بیرکاری فێر بو بەسی بێت بۆ جێ بەجێ کردنی ئیشەکانی ڕۆژانەی.

جۆرج لەشێکی بەهێزو بتەوی هەبو، چونکە هەر بەمنداڵی مەشقی لەسەر ئەسپ سواری‌و تیر وەشاندن کردبو.

بەپلەی موقەدەم دامەزرا لەهێزی میلیشیای ویلایەتی ڤێرجینیادا، بەکارێکی سەربازی ڕەوانەی جەنگ کرا لەدژی فەرەنسیەکان، کاتێك خەریکی دروست کردنی قوللە بون لەسەر ڕوباری "شێو".

کاتێك ژەنراڵ "باردۆك" کرایە سەرکردەی سەربازی ئەو بەرەی واشنتۆن جۆرج کرایە جێگیری.

بۆ بەدبەختی یان خۆش بەختی جۆرج ژەنراڵ باردۆك کوژراو واشنتۆنیش لەو شەڕەدا ئازایەتیەکی بێ وێنەی نواند لەدژی فەرەنسیەکان‌و ئەوە وای کرد بکرێتە فەرماندەی گشتی هێزەکانی جۆرجیا، لەکاتێکدا تەمەنی ٢٣ ساڵ بو.

لەساڵی ١٧٥٩دا واشنتۆن کچە بێوە ژنێکی گەنجی مارە کرد بەناوی "مارسا کۆستیس" مارسا ١٥هەزار دۆنم زەوی هەبو، بەخستنە سەر یەکی هەردو سامانەکانیان جۆرج بو بەیەکێك لەهەرە دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا.

جۆرج‌و مارسا ژیانێکی زۆر درێژو بەختەوەریان بردە سەر، بەڵام تەنیا کێشەیەك کەڕو بەڕویان دەبوەوە، ئەوە بو منداڵیان نەدەبو، بەڵام مارسا لەپیاوەکەی تری دو منداڵی هەبو.

بەدرێژای پێنج ساڵ جۆرج واشنتۆن ژیانی بەکاروباری کشتو کاڵیەوە بردە سەر لە "ماونت فێرنون" لەو ماوەیەشدا ئەندامی پارلەمانی ڤێر جینیا بو.

واشنتۆن ئامادە بو هەمو شتێکی بکاتە قوربانی لەپێناو دۆزی ئەمریکادا، لەساڵی ١٧٧٤دا بەنوێنەرایەتی ڤێرجینیا نێررا بۆ کۆنگرەی یەکەمی کیشوەری کەلەویلایەتی فلادلیفیادا بەسترا.

لەکۆنگرەی دوەمیشدا کەلەساڵی ١٧٧٥دا بەسترا جۆرج جلو بەرگی سەربازی میلیشیای لەبەر کرد بو، وەکو هێمایەك بۆ ئامادەبون بۆ جەنگ لەدژی بەریتانیەکان، چونکە لەو کاتەدا جەنگ دەستی پێ کردبو سیازدە موستەعمەرە ئامادەبون لەو کۆنگرەیەدا بۆ دیاری کردنی سەرکردەیەکی گشتی.

هەر لەو کۆنگرەیەدا بەکۆی دەنگ جۆرج واشنتۆن بەسەرکردەی سوپا هەڵبژێدرا، جەنگ چەند ساڵێکی خایاند، تالەساڵی ١٧٨١ دا بەریتانیەکان خۆیان دابەدەستەوەو ئەمەش گەورەترین سەرکەوتن بوو بۆ جۆرج واشنتۆن.

لەکۆتایی ساڵی ١٧٨٣دا سوپا ئازاد کران، جۆرج واشنتۆنیش، دەستی لەکاری سەرکردایەتی هەڵگرتو گەڕایەوە بۆ ماونت فێرنون، بەو هیوایەی داهاتوی ژیانی لەوێدا تەواو بکات، بەڵام کۆماری تازە دروست بو جارێکیتر پێویستی پێی بوەوە.

لەساڵی ١٧٨٩بەکۆی دەنگ بەیەکەمین سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەککگرتوەکان هەڵبژێردرا، لەمانگی نیسانی هەمان ساڵدا لەهۆڵی فیدراڵی سوێندی یاسایی خوارد، لەو دەمەدا بو حکومەت گوێزرایەوە بۆ فلادلیفیاو دەساڵی ڕەبەق حکومەت لەوێدا مایەوە، تاشاری واشنتۆنی پایتەخت دروست کرا.

دو قۆناغ "هەشت ساڵ" سەرۆك کۆمار بو، بەڵام تازەکردنەوەی بۆ خولی سێیەم قبوڵ نەکردو "جۆن ئادەمز" لەشوێنی دانیشت.

لەیەکێك لەڕۆژە ساردەکانی ساڵی ١٧٩٩دا توشی سەرماو سۆڵەیەکی زۆر بو لەئەنجامیدا نەخۆش کەوتو لەرۆژی ١٤ کانونی یەکەمی ئەو ساڵەدا لەتەمەنی ٦٧ساڵیدا، کۆچی دوایی کردو لەماونت فیرنون بەخاك سپێردرا.

## ماڵیکردنی ئاژەڵان

شارستانیەتی مرۆۋ پەیوەندی زۆر بەتینی هەیە لەگەڵ سەرکەوتنی مرۆۋ

بەدەستەمۆ كردنى ئاژەڵە جۆراوجۆرەكانەوە.

پێش ئەوەى مرۆڤ لەچاخى بەردا دەژیاو، ناچار بو ماوەیەكى زۆر بەدارستانەكاندا بگەڕێت و ڕاوبكات بۆ ئەوەى خواردنى دەست بكەوێت.

لەگەڵ ئەوەى مرۆڤ فێربو چۆن هەندێك لەئاژەڵان دەستەمۆ بكات و سود لەگۆشت و شیرو هێلكەو پێستەكەى وەربگرێت، ئیتر توانى بەهەمیشەى سەقام گیربێت و زەوى دەوروبەرى خۆى بكێڵێت.

هیچ كەس نازانێت مرۆڤ كەى ئاژەڵانى دەستەمۆ كردوە، یان كام ئاژەڵ بۆ یەكەمین جار دەستەمۆ كراوە.

ئەشێت باڵندە یەكەمین گیانلەبەر بوبێت كەمرۆڤ بەخێوى كردبێت، چونكە بەئاسانى توانراوە پێچوەكانى بگرێت لەنێوان داران و لەسەر زەویدا، كەدەیانگرت دەیانبرد بۆ كوخەكەى یان ئەشكەوتەكەى و بەخێوى دەكردو سودى لەهێلكەكەى وەردەگرت پێش ئەوەى سەرى ببڕێت.

بێگومان دەستەمۆ كردنى باڵندەكان ئاسانتر بوە، لەماسى و گیانلەبەرە مەمكدارەكانى تر، لەبیردۆزەیەكدا كەداروین بەشدارى تێدا كردوە دەڵێت: هەمو باڵندە ماڵیەكان لەباڵندەیەكن كەناوى "گالۆس بانكیفا"یە، ئەم باڵندەیە لەباكورى هیندستانو پۆرماو مالیزیادا دەژى، بەڵام داروین، نەیتوانى بیردۆزەكەى بسەلمێنێت.

وێنەو نوسینەكانى سەربەردو ئەشكەوتەكانى پێش مێژو دەرى دەخەن كەسەگ یەكەم ئاژەڵى مەمكدار بوە، مرۆڤ ماڵى كردوەو بۆ ڕاو بەكارى هێناوە.

دواى سەگ مرۆڤ ئاژەڵەكانى ترى وەك بەرازو حوشترو كەروگاى ماڵى كرد، لەسەرەتادا لەئاسیاى ناوەڕاستدا ماڵى كردنى ئاژەڵان دەستى پێ كرد، دواى ئەمانەش ئەسپ ماڵى كرا، فیلیش پێش چەندین سەدەیە بۆ ئیش كردن بەكار هێنراوە.

باوەڕ وایە كەپشیلە پێش ٣٦٠٠ساڵ لەمیسردا ماڵى كرابێت، ئامانجى سەرەكى ماڵى كردنى گیانلەبەران دەست خستنى خواردن بوە، بۆ نمونە سەگ، لەراوكردندا یارمەتى مرۆڤى داوەو ئاژەڵانى تریش شیرو گۆشتیان داوەتێ.

ئەوەی جێی ڕامانە لەم چەند سەدەیە کەمەی ڕابردودا مرۆڤ ڕێژەیەکی زۆر کەم گیانلەبەری ماڵی ڕاگیر کردوە، بەڵکو زیاتر گرنگی بەئامێر داوە وەك لەئاژەڵ.

## ژمارەی ١٣ی شوم

بیرۆکەی ئەوەی کە ژمارە ١٣ ژمارەیەکی شومە، تەنیا بریتیە لەپڕوپوچیو هیچی تر، زۆربەی پڕوپوچییەکان لەسەر بنەمای شتەکان لەسروشتدا دروستکراوە، وەکو جادو جنۆکەو ڕەنگەکانو ڕوداوەکانو هیتریش، بەڵام هیچ پڕوپوچییەك هێندەی ژمارەی ١٣یان نیە کەخەڵکی بڕوایان وایە ژمارەیەکی شومە.

زۆر لەئوتێلەکان لەجیهاندا نهۆمی ژمارە ١٣نیە بەڵکو لەنهۆمی ١٢وە باز دەدەن بۆ ژمارە ١٤، هەروەها هەندێك لەئوتێلەکان ژمارە ١٣ لەسەر هیچ کام لەژورەکانی نانوسێت، واتە ژوری ژمارە ١٣ تیانیە.

هەندێك کەسیش خۆ پارێزی دەکەن لەبانگهێشت کردنی سیازدە کەس بۆ سەر خوانی نان خواردن.

ئەوەی کەنامۆیە تەفسیرێکی قبوڵ کراو نیە بۆ بنەمای ئەم پڕوپوچیە کەلە سەر ژمارە ١٣ دروست کراوە، بەڵکو بۆچونی جیاجیا هەیە لەسەری، هەندێك لەپسپۆڕان دەڵێن: لەوەتەی مرۆڤ فێری ژماردن بوە، سیازدە ژمارەیەکی مەکروە بوە لایدا، بەبەکارهێنانی هەردە پەنجەکانی دەستیو هەردو پێیو دەگەیشتە ژمارە ١٢و دوای ئەوە ژمارە ١٣ نادیار بوەو ئەمەش بۆ مرۆڤ ترسێکی دروست کردوە.

لای مەسیحیەکان پڕوپوچی ژمارە ١٣ دەگەڕێتەوە بۆ "دوازەمی ئێوارە" کەتیایدا مەسیح علیە السلامو دوانزە هاوڕێکەی کۆبونەوەو بەهەمویانەوە بونە سیازدەکەس.

هەندێکی تر بڕوایان وایە پڕوپوچی ژمارە ١٣ دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆکی ئاهەنگی "ڤالهارا" لەئەفسانەکانی ئەسکەندە ناڤیادا، کەتیایدا دوانزە خواوەند بانگهێشت کران، خواوەندی "لوکس"یش کەخواوەندی ئازاردانو ناکۆکی بو خۆی کردە میوانو بون بە١٣ کەسو لەئەنجامدا "بۆڵدەر" کەخۆشەویسترین خواوەندەکان بو لەو ئاهەنگەدا کوژرا، بەڵام لەهەموی نامۆتر ئەوەیە کەژمارە ١٣ لای چینیو

میسریە کۆنەکان، بەخت هێنەر بوە.

تێبینی:

ڤالهارا: ئارامگای شەهیدان، کەرۆژی نەمریەو تیایدا پێشوازی لەگیانی شەهیدان دەکرێت لەئەفسانەکانی ئەسکەندەناڤیادا.

## بۆچی قورقێنە دەدەین؟

زۆربەی خەڵکی دوای نان خواردن قورقێنە دەدەن، هەندێکی تریش هەن دەتوانن هەر کاتێك بیانەوێت قورقێنە بدەن.

ئایا دەزانن بۆچی قورقێنە دەدەین؟

هەرکاتێك خواردن دەخۆین نەختێك هەوا لەگەڵ خواردنەکەدا دەچێتە خوارەوە، ئەو دەرگایەی لەسەروی گەدەوەیەو خواردنەکەی لێوە دەچێتە ژورەوە تۆزێك دەئاوسێت.

بۆ ئەوەی نەهێڵین "عصارات"ی بەهێزی گەدە بێتە دەرەوە، هەروەها داخراویشی وامان لێدەکات دوای ژەمێکی نان خواردن، راستەوخۆ بەپێوە بوەستین، هەمیشە تۆزێك هەوا لەگەدەدا هەیە کەلەکاتی هەرس کردنی خواردنەکەدا تۆزێك غازات دروست دەکات.

کاتێك ئاوێکی گازدار دەخۆین تلۆقەیەك لەدوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەچێتە گەدەوە، ئەگەر گازاتو هەوا لەگەدەدا کۆبونەوە، مێشك هێمایەك وەردەگرێت کەدەبێت کارێك ئەنجام بدات، لەئەنجامی ئەوەدا ڕیخۆڵە دەرگاکە دەئاوسێنێت بۆیە ئێمەش قورقێنە دەدەین.

دەنگی قورقێنەش لەئەنجامی لەرینەوەی ئەو هەواو گازانەیە کەلەبۆری دەرەوەی گەدەدان.

بەوشێوەیە قورقێنە بریتیە لەئالیەتێك بۆ دەرکردنی ئەو گازانەی لەگەدەدا کۆبونەتەوە، هەروەها فرمانێکی پێچەوانەیە کەئێمە بیری لێ ناکەینەوە.

لەهەندێك ناوچەکانی دونیادا قورقێنە بەشتێکی ناشیرین سەیر دەکرێت، لەهەندێك ناوچەی تریشدا قورقێنەی دوای نان خواردن، نیشانەی ئەوەیە کەچێشت لێنەرەکە چێشتەکەی زۆر بەتامو لەزەت بوە.

## کێ دانه شخارتەی داهێنا؟

ئارەزوی مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت ئاگرێك بکاتەوەو خۆی پێ گەرم بکاتەوەو چێشتەکەی پێ لێنێت گەیاندە ئەوەی جۆرەها "چەرخ" دابهێنێت.

مرۆڤی ئەشکەوت بەردی چەخماخی لەیەك دەدا بۆ داگیرسانی ئاگرێك ڕۆمانیەکانیش هەمان شت بۆ کردنەوەی ئاگرێك گۆگردیان بەکار دەهێنا.

لەچەرخەکانی ناوەڕاستدا، پریشکی قاوچە خماخ بەکار دەهێنرا، بۆ گراندنی هەرماددەیەك قابیل بەسوتان بوایە، وەکو پەڕۆی دڕاو قەوزەی وشكو ئەو مەوادانەی کەبەئاسانی دەسوتێن.

دروست کردنی دانە شخارتەی نوێش لەدوای دۆزینەوەی فۆسفۆر زۆر ئاسانتر بو، چونکە فۆسفۆر ماددەیەکە، لەپلەی گەرمای زۆر نزمیشدا گڕ دەگرێت.

لەساڵی ١٦٨١ دا "ڕۆبەرت بۆیل"ی بەریتانی، پارچە دارێکی خستە ناو تێکەڵەیەك لەگۆگۆردو فۆسفۆرەوە، بەڵام پارچە دارەکە هێندە بەخێرای دەسوتا وای کرد، داهێنانەکەی بۆیل زۆر کرداریو سەرکەوتو نەبێت.

یەکەمین دانەشخارتە دروست کرا، لەبەریتانیادا بو لەسەر دەستی بازرگانێکی دەرمان فرۆش، بەناوی "جۆن هۆکەر" لەداگیرساندندا دەبوایە بخرایەتە نێوان دو کاغەزی بەڕوەك داپۆشراو.

لەساڵی ١٨٣٣ لەنەمساو ئەڵمانیا دانەشخارتەیەك دروست کرا، کەژەنرا بوە فۆسفۆرداو بەڕێگەی لێك خشاندن دادەگیرسا، بەڵام کێشەکە لێرەدا بو فۆسفۆری ڕەشو سپی زۆر مەترسی داربو بۆ سەر ئەو کرێکارانەی کەدانەشخارتەیان دروست دەکرد بۆیە لەساڵی ١٩٠٦ بەڕێکەوتن نامەیەکی نێو دەوڵەتی ئیش کردن لەم دو جۆرە فۆسفۆرە قەدەغە کرا.

لەکۆتایدا فۆسفۆری سور دۆزرایەوە کەژەهراوی نیە، لەم فۆسفۆرە دانە شخارتە دروست کرا، کەسەلامەتی لەهەمو جۆرەکانی تری فۆسفۆر زیاترە.

یەکەم دانە شخارتەی لەو جۆرەش لەساڵی ١٨٤٤ لەوڵاتی سویددا دروست کرا.

## شێوەکانی مانگ

مانگ بەدەوری زەویدا دەسوڕێتەوە لەمەدارێکدا کەنزیکەی مانگێك دەخایەنێت، هەروەها بۆ سوڕ خواردنێك بەدەوری خۆیشیدا پێویستی بە ٢٧ ڕۆژو ٧ کاتژمێرو

٤٣ خولەك هەیە.

لەبەر ئەوەی مەداری بەدەوری زەویداو سوڕانەوەی بەدەوری خۆیدا، هەمان کات دەخایەنێت، بۆیە مانگ بەهەمان ڕو، ڕوبەڕوی زەوی دەبێتەوە.

مانگ خۆی تیشکی نیەو ڕوناکیەکەی لەخۆرەوە وەردەگرێت، کاتێك مانگ بەدەوری زەویدا دەسوڕێتەوە خۆر چەند بەشێکی ڕوناك دەکاتەوە، هەندێك جار دەبینین هەمو ڕوی مانگ درەوشاوەیەو لەکاتێکی تردا نیوەی.

سوڕی قۆناغەکان بەمانگێکی تازە دەست پێ دەکات.

کاتێك مانگ دەکەوێتە نێوان زەوی‌و خۆرەوە، مانگی تازە نابینرێت، ئەمجا ئەودیوی مانگ کەڕوی لەزەویە تیشکی خۆر دەبەخشێت، بەشەڕوناکەکەش وەکو دەمە داسێك بەدیار دەکەوێت، ئەو شێوەی مانگیش بێی دەوترێت "هیلال" یان مانگی یەك شەوە.

شەو لەدوای شەو گەورەتر دەبێت تادەبێتە نیوە بازنەیەك‌و پێی دەوترێت "چارەکی یەکەم"، کاتێك خۆر هەمو سەرمانگ ڕوناك دەکاتەوە پێی دەڵێن "مانگی تەواو" ئەمجا وردە وردە دەتوێتەوەو ڕوناکی کەم دەکات تادەگاتە "چارەکی کۆتای" خولەکەشی بەهیلالێك کۆتایی دێت‌و سەر لەنوێ مانگێکی تازە دەست پێ دەکاتەوە.

خولێکی نوێ لەمانگێکی نوێوەوە بۆ مانگێکی تر زیاتر لە ٢٩،٥ ڕۆژ دەخایەنێت.

## ڕۆما بۆچی ڕوخا؟

بەدرێژای چوار هەزار ساڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆما فەرمان ڕەوای زۆربەی ناوچەکانی ئەوروپاو ئەو سەر زەمینەی دەکرد، کەکەوتبوە دەوروبەری دەریای سپی ناوەڕاستەوە.

بنکەی سەرەکی ئەم ئیمپراتۆریەتە لەئیتالیادا بو، بەڵام فەرمان ڕەوای زۆربەی وڵاتی ناسراویان دەکرد وەکو ئینگلتەراو فەرەنساو بەلجیکاو هۆڵەنداو ئسپانیاو پورتوگال‌و سویسراو نەمساو تورکیاو فەلەستین‌و سوریاو سعودیەو لیبیاو میسرو تونس‌و جەزائیرو مەغریب.

ڕوتەڵەبونی ئەم ئیمپراتۆرە مەزنە لەڕۆژئاوادا بەشێوەیەکی تەدریجی لەنێوان

ساڵەكانى ٤٠٠و ٤٣٠زاينيدا، هۆيەكەى ئەوە بو چەندين كۆمەڵ ڕێگەى خۆيانيان دەبڕى بۆ ناوچەرگەى ئيمپراتۆرەكە لەفەرەنساو ئيسپانياو باكورى ئەفريقيا دا جێگير دەبون.

ئەم كۆمەڵانەش وردە وردە سەربەخۆى خۆيانيان، لەڕۆمانيا ڕادەگەياند، بەهاتنى ساڵى ٥٠٠ زاينى، هەمو بەشەكانى ڕۆژئاواى ئيمپراتۆريەتەكە، كەبريتى بو، لەئيتالياو ئەفريقياو فەرەنساو ئيسپانيا، چونە ژێر فەرمان ڕەواى پادشا جەرمانيەكانەوە، كەسەربەخۆيى خۆيانيان لەڕۆما ڕاگەياند.

ئيمپراتۆرى ڕۆمانى ديو ڤليانوس "٢٤٥-٣١٣ زاينى" لەساڵى ٢٨٦دا ئيمپراتۆريەتەكەى كردە دو بەشەوە.

دواى ڕوخانى بەشى ڕۆژئاواى ئيمپراتۆريەتەكە، بەشى ڕۆژهەڵاتى هێشتا بەهێز بو.

بنكەى دەسەڵاتيش شارى بنيزنتيەى كۆن بو كەناونرا قستنتينيەو ئێستا پێى دەوترێت ئەستەمبوڵ.

بەدرێژاى نزيكەى هەزار ساڵ ئەم شارە پايتەختى ئيمپراتۆريەتى ڕۆمانى بو لەڕۆژهەڵاتداو سەرەكى ترين شارى جيهانيش بو.

لەساڵى ١٤٥٣دا كاتێك توركەكان قستنتينيەيان داگيركرد، ئەم ئيمپراتۆريەتە ڕوخا.

## كێ يەكەم گاسنى داهێنا؟

گاسن داهێنانێكى زۆر كۆنە، كەس نازانێت كێ يەكەمين گاسنى دروست كردوە، تەمەنى كۆنترين گاسنيش كەدۆزراوەتەوە نزيكەى پێنج هەزر ساڵە.

مەبەستى سەرەكى دروست كردنى گاسنەكان، هەڵگەڕاندنەوەى خۆڵە، لەسەرتادا، گاسن بريتى بوە لەدارێك يان ڕيشەى دارێكى لق دار كەمرۆڤ ڕايكێشاوە، دواى ئەوە فێر بوە ئاژەڵ لەڕاكێشانيدا بەكار بهێنێت.

ئەو دارە لقدارەى وردە وردە گۆڕيوەو لەبەشى ژێرەوەيدا، نوكێكى تيژى بۆ دروست كردوە، كەپێى دەڵێن "لوتى گاسن" كەزۆر لەقورسايىو ماندو بونى مرۆڤى سوك كردۆتەوە.

ئەمجا لەبەشى ژێرەوەيدا دولاى كەوانەيى بۆ زياد كردوە، بۆ ئەوەى لەكاتى زەوى هەڵگەڕانەوەدا خۆڵەكە باشتر شى بكاتەوە، ئەو دولايەش پێى دەوترێت "ديچەر".

لوتى گاسنەكەو ديچەرەكە هەردوك پێكەوە پێى دەوترێت "بنكەى گاسن" بەكارهێنانى كانزا لەدروست كردنى لوتى گاسندا، زياتر بەهێزى كرد، لەسەدەى

هەژدەهەمدا، بەریتانیەکان لەئاسنی سەخت نوکی گاسنیان دروست کرد لەساڵی ١٧٩٧دا، داهێنەری ئەمریکی "شارلز نیوبۆڵد" یەکەمین دەستا وێردی داهێنانی بۆ گاسنێك تۆمار کرد کەلەئاسنی ڕەق دروستی کرد بو.

گاسنی تازەش لەئاسنی قاڵب کراو یان پۆڵا دروست دەکرێت، بەگوێرەی جۆری ئەو خۆڵەی کەتیایدا بەکار دەهێنرێت.

لەخۆڵی ڕەق و وشکدا، گاسنی بازنەیی بەکار دەهێنرێت لەجیاتی گاسنی دیچەر، چونکە نوکەکەی زۆر تیژەو تایبەتمەندیەکی تریشی ئەوەیە لەبەرد گیر نابێت تالەئیشی بخات یان بیشکێنێت بەپێچەوانەی دیچەرەوە کەزۆر جار، یان گیرەکات یان دەشکێت یان کول دەبێت.

## فیل بۆچی لمۆزی بەکار دەهێنێت؟

پێش هەزاران ساڵە، لەسەر زەویدا گیانلەبەری زۆر گەورەو دڕندە هەبونە، کەئێستا بە "ماموس" ناو دەبرێن، لەبەر ئەوەی نەیانتوانی بەرگەی سەختی ڕۆژگار بگرن بۆیە یەك لەدوای یەك لەناوچون.

لەجۆرەکانی ئەو دڕندانە تەنیا دو نەوە ماوەتەوە ئەوانیش فیلی ئاسیایی و فیلی ئیفریقیە.

فیل گەورەترین گیانلەبەری دەشتیە، سەرەڕای گەورەیی زۆر ڕۆح سوك و زیرەك و خۆش و بەئارامە.

جگە لەسەگ، فیل لەهەمو گیانلەبەرانی تر ئاسانتر ڕادەهێنرێت، فیل خاوەنی لاشەیەکی هێندە گەورەیە هەندێك جار دەگاتە پێنج تەن، هەر لەبەر ئەوەشە قاچەکانی کورتەو لەپایەی وەستاو دەچێت، چونکە قورسی زۆری لەسەرە.

هەردو کەڵبە عاجیەکەی، لەلای سەرەوە لەڕاستیدا دانیەتی، کەبۆ هەڵکەندنی ڕەگی ئەو دارانە بەکاری دەهێنێت دەیانخوات، هەروەها چەکێکیشە بەرەنگاری لەخۆی پێ دەکات، تەنیا فیلی نێرەی هیندستانی کەڵبەی هەیە.

لمۆز لەفیلدا ئەندامێکی زۆر سەیرە، چونکە ناتوانێت بەبێ لمۆز بژێت و جوانترین ئەندامی لەسیشیەتی، لەجوانیدا هیچ شتێك پێی ناگات تەنیا دەستەکانی مرۆڤ نەبێت.

لمۆز لەفیلدا تەواوكەری لوتو لێوەكانی سەرەوەیەتی، فیلیش لمۆزی وەكو دەستو مەچەكو لوتو لێو بەكار دەهێنێت.

لمۆزی فیل ڕێژەیەكی زۆر ماسولكەی تێدایە، كەدەگاتە ٤٠ هەزار ماسولكە، ئەوەش وای لێكردوە لمۆزی بەهێزو جیڕ بێت، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە فیل دەتوانێت لمۆزی وەكو چەكێكی كارا بەكار بهێنێت.

سەری لمۆزیشی جۆرێك چەنجەی پێوەیە كەزۆر هەستیارەو تەنانەت دەتوانێت دەرزیشی پێ هەڵگرێت.

هەروەها لمۆزیشی وەك دەست بەكار دەهێنێت بۆ كۆكردنەوەی خۆراكی خۆی، ئاویش لەڕێگەی ئەو كەناڵەوە دەخواتەوە كەلەناو لمۆزیدایە، دوای ئەوەی لمۆزی لول دەكات بەرەو ناوەوە، ئاوەكە دەرچێنێتە قوڕگیەوە.

هەروەها فیل دەتوانێت لەڕێگەی لمۆزیەوە، ئاو هەڵمژێتو وەكو دوش بیڕژێنێتە پشتی خۆیدا.

دەبێ بوترێت فیل زۆر حەزی لەئاوەو هەر كاتێك، هەلی بۆ بڕەخسێت خۆی دەشوات، سەرەڕای ئەوەی زۆر قورسە بەڵام مەلەوانێكی باشە.

زۆر جاریش دایكانەكانیان، لەكاتی مەلەكردندا بەچكە شیر خۆرەكانیان دەخەنە سەر پشتیان، سەردەمانێك خەڵكی بڕوایان وابو فیل، سەدان ساڵ دەژیت، بەڵام بەدەگمەن تیاندا هەڵدەكەوێت لەنەوەد ساڵ زیاتر بژیت.

## كێ پێنوسی داری داهێنا؟

وشەی لاتینی "Penicillns" مانای كلیلی بچوك دەدات، بەواتای فلچەی نەرمیش بەكار هێنراوە.

وشەی Pencil لەزمانی ئینگلیزیدا مانای فلچەی نەرمی نوك باریك دەدات، بەڵام ئەو وشەی "Pencil" كەئەمڕۆ لەزمانی ئینگلیزیدا بەكاردێت مانای شتێكی جیاواز تر دەدات.

ئەم پێنوسە دارانەی كەئێمە ئەمڕۆ بەكاری دێنین تەمەنی كەمتر لە٢٠٠ساڵە پێش نزیكەی ٥٠٠ساڵە قورقوشمی ڕەش "گرافیت" لەكانەكانی كەمبرلاندی بەریتانیادا دۆزرایەوە.

دەڵێن لەو سەردەمەدا جۆرێك لەپێنوسی داری زۆر سەرەتایی دروست کراو، بنەماڵەی بەناوبانگی "فابر" لەنۆرمبۆرگی ئەڵمانیادا لەساڵی ۱۷٦۰دا گرافیکی هاڕاوەیان، لەدروست کردنی جۆرێك لەپێنوسی داردا بەکار هێنا، بەڵام زۆر سەرکەوتو نەبون. لەساڵی ۱۷۹٥دا پیاوێك بەناوی ئێن.جی. کۆنتی جۆرێك پێنوسی داری دروست کرد لەشێوەی پەنجەو قامیشدا، بەتێکەڵ کردنی گرافیتی گیراوە لەگەڵ گلە سورەدا، کەبو بەبنەمای دروست کردنی پێنوسی داربەم شێوەیەی ئێستا.

پێنوسی دار ماددەی "قورقوشم"ی تێدانیە، بەڵکو ماددەیەکی کانزایی تێدایە بەناوی "گرافیت" یان "قورقوشمی ڕەش".

گرافیت وەکو قورقوشم وایە، کاتێك دەیهێنیتە سەر کاغەزێکدا شوێنە وارێك بەجێ دەهێڵێت، بەو هۆیەوە ناویان ناوە "قورقوشمی ڕەش" بۆ دروست کردنی پێنوسی دار گرافیت لەگەڵ گڵە سورەو ئاودا تێکەڵ دەکرێت، هەرچەند ڕێژەی گلە سورەکە زیاتر بێت پێنوسەکە ڕەقتر دەبێت بەپێچەوانەشەوە هەرچەند ڕێژەی گرافیتەکە زیاتربێت پێنوسەکە زیاتر نەرم دەبێت.

دوای ئەوە تێکەڵەکە وەك هەویری لێ دەکات، بەناوی قاڵبێکی باریکدا ڕەوانە دەکرێت و لەو دیوەوە لەشێوەی پەتێکی باریکی لوسدا دەردەچێت.

لێی دەگەڕێن تاراست دەبێتەوە، لەدرێژیەکی دیاری کراودا پارچە پارچە دەکرێت و وشك دەکرێتەوەو ئەمجا دەخرێتە فڕنەوە بۆ سورکردنەوە.

لەو ماوەیەشدا لاشەی پێنوسەکە ئامادە دەکرێت، کەلەداری ئەرزی سور یان سنەوبەر دروست کراوە، دوای ئەوەی قورقوشمە ڕەشەکەمان خستە ناو دارەکەوە، بەهێلم هەردولای پێکەوە دەلکێنرێت، بەهەڕەیەك کەلەشێوەی لولەکدایە دارەکە دەبڕرێتەوە، لەولاشەوە ئامێرێکی تر دیوی دەرەوەی پێنوسەکە لوس دەکات.

لەم سەردەمەدا "۳٥۰" جۆر پێنوسی دار هەیە، کەهەریەکەو بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەکاردێت.

پێنوسی دار سەرەڕای ڕەنگی ڕەش ۷۲ ڕەنگی تری هەیە، هەیە لەسەر شوشە دەنوسێت و یەکێکیتر لەسەر قوماش و پلاستیك و کاسێتی فلیمی سینەماو، هەروەها پێنوسی دار هەیە کەئەندازیاران بەکاری دەهێنن، لەکاری بیناسازیدا، لەسەر بیناکان پێی دەنوسن بەجۆرێك کەبۆ چەندین ساڵ ئاو هەوا هیچ کارێکی لێناکات و نوسینەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

## بۆچی قژی مرۆڤ سپی دەبێت؟

کاتێك مرۆڤ دەچێتە تەمەنەوە، موەکانی دەست بەسپی بون دەکەن، تەنانەت هەندێك جار لەتەمەنی لاویشدا ئەو قژ سپی بونە ڕودەدات.

ئایا هۆی ئەو گۆڕانکاریە دەزانن؟

هۆی زۆر هەیە کەدەبێتە مایەی قژ سپی بون، بەڵام ئەوەی لەهەمو باوترە گەورەبونی تەمەنە.

قژ ڕەنگەکانی لە "ڤیتامین"ەوە وەردەگرێت، بونی "ڤیتامین" بەرپرسی ڕەنگی قژە، ڤیتامین ڕەنگێکی قاوەیی یان ڕەشە لەخانەکانی ڕەگی قژدایە، هەرچەند مرۆڤ بچێتە تەمەنەوە، ئەو ڕەنگە کەمتر دەبێتەوە.

لەتەمەنی گەنجیدا هەندێك کەس بەهۆی کاریگەری پشتاوپشتەوە قژیان سپی دەبێت، بەتایبەت لەتەمەنی ٢٠ساڵیدا، دەتوانن بۆ زانینی هۆیەکەی پرسیار لەباو باپیرانیان بکەن.

بەدخۆراکیش هۆیەکە بۆ قژ سپی بون بەگەنجی، هەروەها دڵەڕاوکێ و سەدمەو خەمۆکی هۆن بۆ خاوبەرهەم هێنانی ڤیتامین لەلەشدا کەدەبێتە هۆی قژ سپی بون.

هەروەها نەخۆشی قورس دەشێت یەکێکیتر لەو هۆیانە بێت، سەرەڕای ئەمانە هەمو، هێشتا زانایان نەیانتوانیوە، بەشێوەیەکی تەواو بگەنە تەفسیری ئەو گۆڕانە کەلەڤیتامیندا ڕو دەدات.

## کەناڵی سویس چۆن دروست کرا؟

بەدرێژای چەندین ساڵ هەستێکی بەهێز هەبو بۆ درینی کەناڵێك کەدەریای سپی ببەستێتە دەریای سورەوە.

هەندێك دەڵێن یەکەمین هەوڵ بۆ ئەو مەبەستە لەساڵی ٢٠٠٠پێش زایندا لەسەردەمی فیرعەونیەکاندا بوە، لەدێر زەمانەوە، چەندین پلان بۆ ئەو مەبەستە دانراوە، بەڵام نەتوانراوە بەکردار ئەنجام بدرێت.

کاتێك بازرگانی لەنێوان ئەوروپای ڕۆژئاواو هەندو ڕۆژهەڵاتی دوردا گەشەی سەند بیرۆکەکەش هێزی بەرەو پێش چونی بەخۆیەوە دیت، بۆ چونەکان وابو

دروست کردنی کەناڵێك لەنێوان هەردو دەریای سپیو سوردا ماوەی نێوان بەریتانیاو هەند زیاتر لەچوار هەزار میل کورتر دەکاتەوە. بەریتانیەکان زۆر سوربون لەسەر جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە، چونکە بازرگانیان زۆر بەخێرای گەشەی دەسەند، بەڵام فەرەنسیەکان یەکەم کەس بون کاریان کرد بۆ ئەوەی ئەو پرۆکەیە بخەنە قالبی جێبەجیٚ کردنەوە.

لێپرسراوی یەکەم بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی کەناڵی سویس دیپلوماتی فەرەنسی "فێردیناد دی لیسبس" بو کەتوانی حکومەتی میسری ڕازی بکات ئەنجام دانی ئەو پرۆژەیە بەو بسپێرێت.

ئەو برە پارەیەی کەپرۆژەکەی تەواو دەکرد لیبس توانی لەوڵاتانی ئەوروپا وەری بگرێت، دوای ئەوە چەندین نەخشەو پلانی جۆربەجۆری لەخەڵکی جیا جیاوە وەرگرت لەسەر کەناڵەکە، بەڵام ئەو پلانەی کەئەندازیاری ئیتالی "لویجی نێجریللی" پێش کەشی کرد قبولٚ کرا.

لەرۆژی ۲۵ نیسانی ۱۸۵۹ دەست کرا بەئیش کردنی لەکەناڵەکەداو لەنیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەهەمدا کرایەوە لەبەردەم کەشتی ڕانیدا.

"دی لیبس" بۆ ئەو سەرکەوتنە لەساڵی ۱۸۷٥دا لەلایەن شاژنی بەریتانیا ڤیکتۆریاوە خەڵات کرا.

سەرۆك وەزیرانیش دیزرائیلی هەمو بەشەکانی کۆمپانیاکەی کڕی، بەمەش بەریتانیا بو بەخاوەنی گەورەترین بەش لەکۆمپانیای کەناڵی سویس دا.

ڕیٚ درایە ئەو کۆمپانیایە بۆ ماوەی ۹۹ ساڵ ئەو کەناڵەی بەدەستەوە بێت لەساڵی ۱۹٥٦ داو لەبڕیارێکی کوتو بڕدا سەرۆك جمال عبد الناصر خۆماڵی کردنی کەناڵەکەی ڕاگەیاند.

ئەو بڕیارەی میسریش بەریتانیو فەرەنسیەکان قبوڵیان نەکردو لەئەنجامدا دەست درێژی سیٚ قۆڵی ئیسرائیل، بەریتانیا، فەرەنسا، بۆ سەر میسری لیٚ کەوتەوە.

درینی کەناڵی سویس ماوەی ۱۰ ساڵی خایاندو ۲٥ هەزار کرێکاری میسریو هەزار کرێکاری بیانی لەم پرۆژەدا مەزنەدا کاریان کردوە، لەکاتی تدشین کردنی

پرۆژەکەدا، لە ١٧ تشرینی دووەمی ١٨٦٩دا ئستولێکی گەورە کە ٢٠ پاپۆڕی بەسەرەوە بۆ لەبەندەری پۆر سعیدەوە کەوتە ڕێ بەرەو ناو کەناڵەکە، درێژی کەناڵی سویس ١٠٧ میلەو پانیەکەشی لەنێوان ٢٣٥و ٤٢١ پێدایە، لەسەر ڕوی کەناڵەکەوە.

لەبنیشەوە لەنێوان ١٥١و ٣٣٧ پێ دایە، قوڵی ئاوەکەشی لەنێوان ٣٧و ٤٢ پێدایە، تەنیا ئەو کەشتیانە دەتوانن بەکەناڵی سویس دا بپەڕنەوە، کەپێویستیان بەکەمتر لە ٣٥ پێ لەئاوی قوڵ هەیە.

کەناڵی سویس ڕێگەیەکی ئاوی لەنێوان ئەوروپاو هەندو وڵاتانی ڕۆژئاوای زەریای ئارامدا دەستەبەر دەکات.

بەهۆی دەست درێژی ئیسرائیل بۆ سەر میسرو سوریاو ئوردن لەحوزەیرانی ١٩٦٧دا، کەناڵی سویس داخرا ئائەنجام لەحوزەیرانی ١٩٧٥دا جارێکیتر کرایەوە.

## ئەهرامەکانی میسر بۆچی دروستکران؟

میسریە کۆنەکان بیرو بڕوایان وابو، کەپادشاکانیان لەبنەماڵەی خواوەندەکانو لەخەڵکی ئاسایی بەدەرو بەرزترنو دەبێت بپەرسترێن، بۆیە باوەڕیان وابو پادشاکانیان دوای مردنیان دەچنە ڕیزی خواوەندەکانەوە لەو دونیادا.

لەئەنجامی ئەم بیروباوەڕەدا دابو نەریتی زۆر پەیدا بو، پادشا تالەژیاندا بو گۆڕێکی زۆر گەورەی بۆ خۆی ئامادە دەکرد، بۆ ئەوەی دوای مردنی تیایدا بنێژرێت، نمونەی ئەم گۆڕانەش بە "اهرامات" ناسرا، کەشێوەیەکی سێگۆشەی هەیە.

دروست کردنیشی پێویستی بەرێژەیەکی زۆر لەبەرد هەبو، بەڵام ئەو ژورەی کەپادشا تیایدا دەشاردرایەوە لەژێر هەرەمەکەدا دروست دەکرا.

ئێستا لەمیسردا نزیکەی حەفتا هەرەم هەیە کەبەناوبانگترینیان سێ هەرەمەکەی جزیرەی نزیکی قاهیرەیە، گەورەترین ئەو سێ هەرەمەش هەرەمی خۆفۆیە، کەبەیەکێك لەحەوت سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان دادەنرێت. پسپۆران مەزەندەیان کردوە، کەلەنێوان ساڵانی ٢٦٩٠و ٢٥٦٠ پێش زایندا دروست کرابێت، بۆ

شوێنی ناشتنی پادشاو شازادەکان، کەلەگەڵیاندا سامانە زۆرەکەشیان خراوەتە گۆڕەکانیانەوە.

میسریە کۆنەکان پێویستیان بەکاتێکی زۆر هەبو تاهونەری دروست کردنی ئیهراماتەکانیان پەرەپێدا، چونکە بەردەکانیان، لەکانە بەردەکانی دیوی رۆژهەڵاتی نیلەوە دەهێناو، هەرەمەکەشیان لەسەر بنکەیەکی چوارگۆشە دروست دەکرد.

دروست کردنیشی پێویستی بەژمارەیەکی زۆر لەبەندەو کۆیلە هەبو، تائەو بەردە گەورانە ببەنە سەرەوە، بەرد بڕەکانو وەستاکانیش پێویستیان بەهەڕەیەك هەبو دەبوایە نوپیّ درێژ بوایە.

"دزانی گۆڕ" کەلەسەردەمی فیرعەونیەکاندا پەیدا بوون، دەستیان کرد بەدزینی هەرچی زێڕو زیوی ناو گۆڕەکان کەلە ئیهراماتەکاندا نێژرا بو.

لەبەر ئەوە بیریان کردەوە، شوێنی گۆڕەکە بەشێوەیەکی وا ئاڵۆز دروست بکرێت، کەدزان نەتوانن کەنزەکان بدۆزنەوە، بیرۆکەکەش ئەوە بو مردەوەکانیان لەچەقی هەرەمەکەدا دەناشتو بەمەش کێشەکە چارەسەر کرا، بۆیە دەبینین هەرەمەکان تائەمڕۆش زێڕو زیوی خۆیانیان پاراستوە.

سیّ هەرەمی بەناوبانگی میسر ئەمانەن هەرەمی خۆفۆ "٤٨١" پیّ هەرەمی خەفرەع "٤٧١" پیّو هەرەمی مونەقیع "٢١٥" پیّ بەرزن، بەرزترینیان هەرەمی خۆفۆیە کەپانی "٧٥٦" پێیەو ڕوبەرەکەشی جێگەی ١٣دۆنم زەویی داگیر کردوە، قورسیەکەشی بە ٥،٥٠٠،٠٠٠ تەن مەزەندە دەکرێت، ژمارەی ئەو پارچە بەردانەش کەتیایدا بەکار هێنراوە ٢،٣٠٠،٠٠٠ پارچە بەردە.

ئەو کرێکارانەش کەتیایدا ئیشیان کردوە هەرسیّ مانگ جارێك ئاڵوگۆڕ کراون بەکرێکاری تازە، دروست کردنەکەشی نزیکەی سی ساڵی خایاندوە.

لەدیوارەکانی ناوەوەی ئیهراماتەکاندا هەندێك ڕێنومای نوسراوە، بۆ ڕێبیشاندانی گیانی مردوان، کەئاگاداریان دەکاتەوە لەو مەترسیانەی توشیان دەبێت لەماوەی ڕۆیشتنیاندا بۆ ئەو دونیا.

## پەنجە مۆر

تەنانەت مرۆڤی پێش مێژوش زانیویەتی پەنجەکان هێڵیان هەیەو، هێڵەکانیش لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە.

هەندێك تابلۆی چینی کۆن هەیە، پەنجە مۆری لەسەرە بۆ جیاکردنەوەی دانەری کتێبەکان، بۆیە دەتوانین بڵێین پێش دو هەزار ساڵ لە ئێستا، پەنجە مۆر بەکارهێنراوە بۆ جیاوازی کردن لەنێوان مرۆڤەکاندا.

یەکەم هاوکاری کردن بۆ زانستی پەنجە مۆر، لەساڵی ١٦٨٦دا بو لەلایەن زانای توێکاری ئیتالی "مارسیلۆ مالبیخی" مالبیخی لەژێر وردبیندا سەیری کرد، هێڵەکان لەشێوەی ئەڵقەو لەولەبدان، یەکەم بەکارهێنانی پەنجە مۆر، بۆ جیاوازی کردنی زیندانیان لەئەوروپادا، لەساڵی ١٨٥٨دا کرا.

دوای چەندین ساڵ لەوە یەکەمین توێژینەوە بڵاو کرایەوە لەسەر پەنجە مۆر، کەئەشێت وەکو زانستێك بەکاربهێنرێت، ئەویش بەبەکارهێنانی فلیمێکی تەنك بو، لەمەرەکەبی چاپخانە، کەتائێستا هەر ئەوە بەکار دەهێنرێت.

لەهەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا "فرانسیس گالنتۆن" کەزانایەکی ئینگلیزی بو، هەستا بەدانانی سیستەمی پۆلین کردنی پەنجەکان.

دوای چەندین ساڵێکیش ئەم سیستەمە لەلایەن "ئەدوارد هنری" کەمفەوەزێکی پۆلیس بو، لەلەندەن، ئاسانکرایەوە، تاوای لێهات، پەنجە مۆر لەهەمو جیهاندا بۆ جیاکردنەوەو ناسینەوەو بەدوادا چونی تاوانباراندا بەکار بهێنرێت.

## سیستەمی مەتری

کاتێك زانست دەستی بەپێشکەوتن کرد، بەر لەسەدەها ساڵ، زانایان ڕوبەڕوی گەلێك کێشە دەبونەوە، بەتایبەت لەگەڵ پێوانەدا، چونکە پێوانەکان لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕا، تەنانەت لەناو خودی وڵاتێکیشدا جیاوازی هەبو.

لەبەر ئەوە زانایان لەسەدەی هەژدەهەمدا، کۆششیان کرد بۆ گەیشتنە یاسایەکی مەعقول بۆ پێوانە، کەلەسەرانسەری جیهاندا قبوڵ بکرێت.

یاسایەکی لەوجۆرە لەساڵی ١٧٩٦دا لەفەرەنسا دا داهێنرا، هۆی تریش هەبون

کەفەرەنسیەکان دەست بدەنە کارێکی لەوجۆرە، چونکە لەو کاتەدا لەناو تەنگو چەڵەمەی شۆڕشدا بونو سەرکردەکانیان، دەیانویست ڕابردوی خراپی خۆیان لەبیری خەڵکی ببەنەوە، بۆیە حەزیان کرد سیستەمی نویێ بۆ پێوانە دابنێن.

سەرەتا لەدرێژیەوە دەستیان پێ کردو بڕیاریان دا "مەتر" بکەنە پێوانە، وشەی "مەتر"یش وشەیەکی لاتینییەو مانای "پێوانە" دەدات، لەبەر ئەوەیە سیستەمی پێوانە بەهەمو کێشەکانیەوە پێی دەوترێت سیستەمی مەتری.

سەرەتا هەوڵیان دا مەتر بەشێك بێت ٤٠ ملیۆن بەش لەچێوەی زەوی، بەڵام بۆیان دەرکەوت حیساباتی دەوری چێوەی زەوی هەڵەیە، بۆیە مەتریان دانا نێوانی دو نیشانە بێت، لەسەر شوێنێك "قصیب"ێکی لەپلاتین دروست کراو، لەگەڵ ئەوەی سیستەمی مەتری زو لەبەر دەکرێتو بەکارهێنانیشی ئاسانە، بەڵام خەڵکی نەیان ویست پەیڕەوی لەم سیستەمە بکەن، تالەساڵی ١٨٤٠دا حکومەتی فەرەنسا ناچار بو خەڵکی ناچار بکات ئەم سیستەمە بەکاربێنن، یان توشی سزا دەبن.

تاوای لێهات وڵاتانی تریش سیستەمی مەتریان بەکار هێناو، ئێستا لەهەمو جیهاندا کاری پێ دەکرێت.

## بۆچی هەندێك کەس چەپەن؟

"چەپە" بەو کەسانە دەڵێن کە لەجیاتی دەستی ڕاستیان، دەستی چەپیان بەکار دەهێنن، هەندێك جار باوکانو دایکان، کەدەبینن منداڵێکیان، بەدەستی چەپ نان دەخوات یان دەنوسێت پێی بێزار دەبنو هەوڵ دەدەن، بەزۆر وا لەمنداڵەکەیان بکەن بیکەنە ڕاستە.

بەڵام ئەشێت کەسێکی چەپە بگۆڕێتو بتوانێت لەجیاتی دەستی چەپی دەستی ڕاستی بەکاربێنێت؟

زۆربەی سەرچاوەکان وەڵامی ئەو پرسیارە بە "نە" دەدەنەوە.

نزیکەی ٤٪ی خەڵکی دەستی چەپیان بەکار دێنن، زۆر لەبلیمەتەکانی مێژوش چەپە بونە، لیناردۆ داڤنشیو مایکل ئانجیلۆ کەدو هونەرمەندی شێوەکارو پەیکەر تاشی بلیمەتی جیهان بونە، هەردوکیان دەستیان چەپە بوە.

ئێمە لەکۆمەڵگایەکی "دەست ڕاست"دا دەژین، واتا زۆربەی خەڵکی دەستی

ڕاست بەكاردێنن لەكاروبارى ڕۆژانەياندا، تەنانەت كليلى دەرگاكانو دەرنەفيسو ئۆتۆمبيلو ئاميرەكانى موزيكو قۆپچەى جلو بەرگەكانيشمان، لەبەكارهێناندا هەموى لەگەڵ دەست ڕاستەكاندا دەگونجێت.

بۆيە سەرەتا دەست چەپەكان تۆزێك بەزەحمەت دەتوانن ئەو شتانە بەكاربێنن، بەڵام لەكۆتايدا هەر بەسەريدا زاڵ دەبن.

هيچ تەفسيرێك نيە مرۆڤ ڕازى بكات بۆچى زۆرينەى خەڵكى دەستيان ڕاستەو برێكى كەميشيان "چەپەن"

يەكێك لەبيردۆزەكان دەڵێت: لەشى مرۆڤ وەكو يەك نيە، واتە لاى ڕاستى وەكو لاى چەپى نيە، لاى ڕاست تۆزێك جياوازى هەيە، لەگەڵ لاى چەپدا، هەردو قاچى مرۆڤيش لەهێزدا وەكو يەك نين، هەردو دەستيشى تۆزێك جياوازيان هەيە، ئەم جياوازيە لەهەمو ئەندامەكانى ترى لەشى مرۆڤدا دەبينرێت، بەڵام كاتێك دەگەينە مێشك هەروەها بۆمان دەردەكەوێت لاى ڕاستو چەپى مێشكيش نيوەى ڕاستى لەشى پڕ دەكاتەوە.

ئەو دەمارانەى لەمێشكەوە دێن، لاى مل يەكتر دەبڕن بۆ ئەوەى بچن بۆ ديوەكەى تر، نيوەى ڕاستى مێشك، نيوەى چەپى لەش پڕ دەكاتەوەو نيوەى چەپى مێشكيش نيوەى ڕاستى لەش پڕ دەكاتەوە.

لەبەر ئەوەى نيوەى لاى چەپى مێشك زاڵترە، بۆيە لاى ڕاستى لاشە چالاكترەو باشتر تواناى ئيش كردنى هەيە.

وەكو ئەگەرێك، ئێمە بەهۆى نيوەى چەپى مێشكەوە دەنوسينو قسە دەكەينو دەخوێنينەوە، ئەوەش وادەكات زۆربەمان دەستى ڕاست بەكار بێنين، بەڵام بەنيسبەتى چەپەكانەوە، ئەوا كردارەكە پێچەوانەيە.



لەبەر ئەوەى نيوەى لاى ڕاستى مێشك زاڵە ئەوا لاى چەپ بەشێوەيەكى چالاك ئيش دەكات.

## ئەفسانە "ميسۆلۆجيا" چييە؟

مرۆڤ هەميشە پرسيارى كردوەو تائێستاش بەردەوام پرسيار دەكات، بۆچى دونيا وايە؟

مرۆڤ هەوڵی داوە بۆ خۆی تەفسیری ئەوە بکات، ئەو شتانەی ڕو دەدەن بۆچی ڕو دەدەن، ئێمە ئەمڕۆ تەفسیراتی زانستیمان هەیە بۆ ئەو شتانەی لەگەردونندا ڕودەدەن، بەڵام لەسەردەمەکانی کۆندا مرۆڤەکان ناچار بونە، تەفسیراتی تایبەتی بۆ ئەو ڕوداوانە بدۆزنەوە.

باتەنیا بیر لەو شتە نامۆیانە بکەینەوە کەمرۆڤ نەیتوانیوە لێی تێ بگات، وەکو: بۆچی ڕۆژ هەڵدێتو ئاوا دەبێت بەو شێوە ڕێکوپێکە؟ بۆچی وەرزی جیاواز هەیە؟ ئەستێرە چیە؟ بۆچی دەجوڵێتەوە؟

هەمو ئەو ڕوداوانە، کەکاریگەری بوە لەسەر ژیانی مرۆڤ، ناچاری کردوە بیری لێ بکاتەوە بۆچی ئەو شتانە ڕودەدەنو ناتوانرێت پێش بینی بکرێت؟ بۆچی مرۆڤ خەو دەبینێ؟.. مرۆڤ لەکوێوە هاتوەو دوای مردن بۆ کوێ دەچێت؟ چۆن دونیاو هەرچی تێدایە دروست بو؟

مرۆڤە سەرەتاییەکان ئەم پرسیارانەیان کردوەو هەوڵیان داوە، وەڵامی بدەنەوە، هەر خێڵێکو هەر ناوچەیەك بەجۆرێك ئەوانەیان تەفسیر کردوە، ئەو باسە خەیاڵیانەی تەفسیر کراوە پێی دەوترێت "ئەفسانە"، هەر گەلێکیش ئەفسانەی تایبەتی خۆی هەیە.

مرۆڤە سەرەتاییەکان هەوڵیان داوە، سروشتێکی مرۆڤایەتی بدەنە ئەفسانەکانیان یان سروشتێکی خودی بخەنە سەر. واتە بیری دەکردەوە، ئەوانەی لەدەورو بەریدان وەکو ئەو مرۆڤنو بیر دەکەنەوەو هەندێکیشیان هێزی زۆریان هەیە، هەمو ئەو شتانە بون ئاژەڵانو ڕوەكو ئەستێرەکانو خۆرو مانگیان کردە خواوەند، چونکە هێزی سیحریان تێدا بو.

مرۆڤانی کۆن بڕوایان وابو ئەو خواوەندانە هەندێکیان باشنو پرسێتیو مردن بەمرۆڤ دەگەیەنن، مرۆڤی سەرەتا بڕوای وابوە هەمو ئەو شتانەو خواوەندەکان گیانلەبەرانێکی زیرەکنو دەتوانرێت هاواری پێ بکرێتو پەنای بۆ ببرێت.

لەبەر ئەوەی خۆر عەقلی هەیە، بۆیە دەتوانرێت لێی بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی تیشکەکەی بنێرێتە سەر زەوی تاوەکو ڕوەکەکان سەوز بن.

بۆیە نوێژیان بۆ خواوەندی باران کردوە، بۆ ئەوەی باران ببارێت.

هەمو ئەم شتانە بون بونە هۆی ئەوەی نەریتو ئاهەنگی ئاینی پەیدا ببێت، هەر خواوەندێكو ڕێگەیەکی تایبەتی خۆی هەبو بۆ پاڕانەوە لێی.

مرۆۆ وای دەزانی ئەگەر بەشێوەیەکی هەڵە پاڕایەوە لەخواوەندێك، ئەوا توڕە دەبێتو زیانی پێ دەگەیەنێت، مەبەستیش لەو نەریتو ئاهەنگە ئاینیانە پاراستنی پەیوەندی باش بو، لەنێوان مرۆۆو خواوەندەکاندا.

بەو جۆرە خەڵکی باوەڕیان وابو ئەگەر باشبن لەگەڵ خواوەندە کانیاندا ژیانێکی بەختەوەر دەبەنە سەر.

## کێ ئاوەڕۆی داهێنا؟

سیستەمی ڕاکێشانی بۆریەك کەپێی دەوترێت "زێراب" دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی چوار هەزار ساڵ لەمەو پێش.

زانایانی شوێنەوار کاتێك خەریکی گەڕان بون بەدوای شوێنەواردا، لەدورگەی کریت، لەدەریای سپی ناوەڕاست، کۆشکێکیان دۆزیەوە تەمەنی چوار هەزار ساڵ بو سیستەمی بۆری ئاوو زێرابی تێدا بو.

سیستەمی ئاوەکەی بریتی بو لەجۆگەیەکی بەردین کەئاو پیایدا دەچو بۆ ئاوی تانکی و حەمامو دەست شۆریەکان.

لەبارەی زێرابەکەشیەوە لەڕێگەی بۆریەکەوە دەڕۆیشتو کەلە تراکۆتا "قوڕی سورەوە کراو" دروست کرا بو.

ئەوەی جێی سەر سوڕمانە، ئەو بۆریە لەگڵ دروستٔ کراوانە بەجۆرێك دروست کرابون کەدەتوانرا بەئاسانی لەیەکتریان ببەستی، سەرێکی بۆریەکە بەشێوەیەك دروست کرا بو، سەری بۆریەکەی تری دەخوارد، بۆریەکانیش بەقوڕ جێگیر دەکران.

ڕۆمانیەکانیش یەکەم کەس بون بوریان لەقورقوشم دروست کرد، ئەو پیشەوەرانەش خەریکی دانانی ئەو بوریانە بون پێیان دەوترا "بلومباریوس" واتە کرێکارانی قورقوشم.

لەگەڵ ئەوەدا تائێستاش قورقوشم لەهەندێك لەجۆرەکانی بۆریداو بەکار دەهێنرێت، بەڵام مەوادی تریش وەکو ئاسن، مس، مسی زەرد، چیمەنتۆ، پلستیك

لەدروست كردنی بوریدا بەكار دەهێنرێت.

## ئایا لەسەر ئەستێرەكانی تر ژیان هەیە؟

دڵنیابن لەنەبونی هیچ جۆرێك لەجۆرەكانی ژیان، لەسەر هەر ئەستێرەیەك لەئەستێرەكانی تر، ئەمەش یەكێكە لەو بابەتانەی كەگەردون گەڕان دەیانەوێت بیزانن، بەڵام دەزانن تەنانەت ئەگەر ژیانیش هەبێت، دەبێت كەش‌و هەوایەكی تایبەتی هەبێت‌و پلەی گەرمای گونجاو بێت.

بەجۆرێك هەمو گیانلەبەرەكان لەسنوری پلەی گەرمای خۆیدا بمێنێتەوە، هەروەها مەرجێكی تریش پێویستە ئەویش بونی ئاوە، چونكە گیانلەبەران بەردەوام پێویستیان بەئاو هەیە.

هەروەها ڕوناكی شتێكی بنەڕەتیە بۆ ڕوەكە سەوزەكان، وەكو چۆن هەندێك مەوادی كانزای بنەڕەتیە.

گیانلەبەرانیش پێویستیان بەسەرچاوەی خۆراك هەیە، چۆن ناتوانن لەشوێنێكدا بژین خۆراكی تیادا نەبێت.

ئایا هەمو ئەو كەش‌و هەوا پێویستە بۆ ژیان لەسەر هیچ ئەستێرەیەكی ترهەیە؟

باباسی كەش‌و هەوای دوان لەئەستێرەكانی تر بكەین. ئەستێرەی زوهرە نزیكترین ئەستێرەیە لەزویەوە بەقەبارەش هەر هێندەی زەویە لەكۆندا باوەڕیان وابو زەوی‌و زوهرە دوانەن، بەڵام ئەستێرەی زوهرە بەهەورێكی پەنگ خواردو لەترشی كبرتییكی بەهێز دەور دراوە.

وەكو چۆن كەش‌و هەواكەشی لەدوەم ئۆكسیدی كاربۆنی خنكێنەر دروست بوە.

پاڵە پەستۆش تیایدا زۆر بەرزە، هەروەها پلەی گەرماش تیایدا ٤٦٠ پلەی سەدیە كەهیچ گیانلەبەرێك لەبەرامبەریدا ناتوانێت خۆی بگرێت، بەڵام كەش‌و هەوای مەریخ بەشێوەیەكی سەرەكی لەدوەم ئۆكسیدی كاربۆن دروست بوە.

پلەی گەرمای سەر ڕوی مەریخیش -٢٩ پلەی سەدیە، هەندێك جاریش نزم دەبێتەوە بۆ -٨٥ پلەی سەدی، ڕێژەیەكی زۆر كەم لەئاو لەسەر ئەم ئەستێرەیە هەیە، ئەویش بەبەردەوامی بەستویەتی.

لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت كەهەردو ئەستێرەی ناوبراو، كەش‌و هەوایەكیان

هەیە بۆ ژیان دەست نادات.

تائێستاش هیچ جۆرە ژیانێکیان لەسەر ڕوی هیچ ئەستێرەیەکی تر نەدۆزیوەتەوە، لەزەوی زیاتر.




## یەکەکانی پێوانە چۆن پێش کەوتن؟

پێش ئەوەی یەکەکانی پێوانە دابنرێت، مرۆڤ شتێکی بەهۆی شتێکی ترەوە دەپێوا، یەکێك لەو شتە هەرە بەرچاوانەی کەمرۆڤ لەشتەکانی تر زیاتر پێوانەی پێ دەکرد، لەشی خودی خۆی بو.

ئەگەر بیویستایە پێوانەی نێوان ماڵی خۆیانو دراوسێکەیان بکات، ئەوە بەپێ پێوانەی دەکرد.

باڵو دەستو پەنجەکان، زۆر بەسود بونە بۆ پێوانە کردنی شتەکان، ئەم شتانەش وەکو یەکەیەکی پێوانە بەکار هێنراون.

- ماوەی نێوان لوتو پەنجەکانی یەکێك لەدەستەکان بەکراوەیی.
- ماوەی نێوان سەری پەنجەکان بۆ ئانیشك.
- ماوەی نێوان سەری پەنجەی گەورە بۆ سەری پەنجەی بچووك.

بەڵام کێشەکە لەوەدا بوە، پێوانەکان لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر گۆڕاوە، دەستو پێی پیاوێك لەدەستو پێی پیاوێکی تر درێژ تر بوە، بۆیە بەپێویست زانرا یەکەی پێوانەی ستاندارد دابنرێت.

لەچاخەکانی ناوەڕاستدا، سەندیکای بازرگانی چاودێری ئەو پێوانانەی دەکرد کەبەکار دەهێنرا.

دوای ئەوە حکومەتەکان پێوەریان بۆ هەمو جۆرەکانی پێوانەی دانا.

ئێستا ڕێکەوتنێکی نیو دەوڵەتی هەیە بۆ هەمو پێوانە، پێوەریەکان، چەندین دەوڵەت ڕێکەوتون لەبەکارهێنانی هەمان یەکەی پێوانەدا، وەکو چۆن لەزۆر وڵاتدا فەرمانگەی تایبەت هەیە کەبەرپرسە لەسەر پێوەرەکان.

لەساڵی ١٧٩١ دا یاسای میتری لەفەڕەنسادا، بەکارهێنرا، کەلە زۆر وڵاتانی وەکو ئەمریکا، کەنەدا، ئوستورالیا، نیوزلەندە، بەریتانیاو چەندین وڵاتانی تری جیهاندا کاری پێ دەکرێت.

## یەکەم پزیشك

پێش ئەوەی مرۆڤ ببێتە شارنشین، بۆ ئەوەی ئازارو نارەحەتیەکانی کەم کاتەوە، بەجۆرەها شێوە ممارەسەی پزیشکی کردوە، لەشارستانیە کۆنەکانیشدا پزیشك هەر هەبوە.

بابلیەکان کتێبی زۆر بەنرخیان لەبواری پزیشکیدا، لەشوێن بەجێ ماوە، کەپزیشکانی ئەمرۆش سودی لێ وەردەگرن.

میسریە کۆنەکان باوەڕیان وابو، نەخۆشی لەئەنجامی گیانە شەرانیەکانەوە دروست دەبێت.

چارەسەرەکانیشیان بریتی بو لەحەپو مەرهەم، کەدەرمانی وەکو ڕۆنی گەرچەكو ئەمنوی لەخۆ دەگرت، هەروەها نەشتەرگەریی دیوی دەرەوەی لەشیشیان بەیارمەتی ئەو دەرمانانە کردوە.

لەسەردەمی زۆر کۆندا "پزیشکەکان" بەو جۆرە بون، بەڵام لەدەوروبەری ساڵی ٤٦٠ پێش زاینیدا پیاوێك لەیوناندا لەدایك بو بەناوی "ئەبو قرات" کەگۆڕانکاری زۆر گەورەی لەبواری پزیشکیدا کرد، تاناو نرا "باوکی پزیشکی".

ئەوەی ئەبو قرات کردی رزگار کردنی پزیشکی بو لەجادوگەریو فێڵ بازی.

هەرچەند ئەبو قرات ئەو زانستەی نەبو کەئەمڕۆ پزیشکی پشتی بێ دەبەستێت، بەڵام پرۆگرامو بۆ چونەکانی دەتوانین بەزانستی ناو ببەین.

ئەبو قرات دەیزانی دەبێت پزیشك، زۆر بەوردی چاودێری نەخۆشەکەی بکاتو هەڵسو کەوتیشی لەگەڵیدا نەرمو نیان بێتو هەوڵ بدات، بۆ چارەسەری سروشتی هانی بدات.

ئەبو قرات نەخۆشی زۆری دەست نیشان کردوەو باسی کردوە، ئەو راستیە پزیشکیانەی کەپێش دو هەزار ساڵە ئەبو قرات لەسەری نوسیوە، ئەمرۆش نرخو بەهای خۆی هەیەو سودی لێ وەردەگرێت.

## هەنگەکان چۆن لەیەکتر تیَ دەگەن؟

کاتێك هەنگێك، گوڵێکی شیلە دار دەدۆزێتەوە، چۆن هاوڕێکانی ئاگادار دەکاتەوە؟

چۆن جۆری گوڵەکەو دوریەکەی و ئاراستەکەیان پیَ رادەگەیەنێت؟

ئەو ڕێگەیەی کەهەنگەکە زانیاریەکانی پیَ ڕادەگەیەنێت زۆرترین سەر سوڕهێنەرەکانی سروشتە.

دەبێت بزانین زمانی هەنگ غەریزەیەکە تیایداو وەرگیراو نیە، کاتێك هەنگ دەگاتە تەمەنێکی دیاری کراو ئوتوماتیکیەن فێری ئەو زمانە دەبێت.

زمانی هەنگ زمانی سەماکردن و بۆنەکانە، کاتێك هەنگێك هەلاَلیەك یان شیلەیەك دەدۆزێتەوە، دەگەڕێتەوە شارەکەی خۆی و دەست دەکات بەسەما کردن لەئەلقەی بازنەیی تەسکدا.

بەسەماکەی هەنگەکانی تر دەوروژێنێت و پێیان دەڵێت شیلە یان هەلاَڵە "لقاح"یەکی دۆزیوەتەوە.

هاوڕێکانیشی بەبۆنەکەدا دەزانن چی دۆزیوەتەوەو دەبێت چی بکەن، ئەگەر سەمای هەنگەکە گەڕاوەکە گورج و گۆڵ بو، ئەوە مانای وایە ڕێژەیەکی زۆر خۆراکی دۆزیوەتەوەو ژمارەی ئەو هەنگانەش، دەوروژێن بۆ ئەوەی لەگەڵیدا دەرچن زیاتر دەبن.

بەوەش هەنگی گەڕاوە توانی چەند نامەیەك بەهاوڕێکانی بگەیەنێت، چۆن سەماکە دەڵێت شیلەو هەلاَڵەکە بۆ هەموانە، بۆنی خودی هەنگەکەش جۆری گوڵەکە دیاری دەکات.

هەموو ئەمانە بەسەر ئەو گولاَنەدا جێبەجیَ دەبێت، کەتەنیا ماوەی سەد یاردە لەشارەکەیانەوە دورە.

هەنگێك ئەگەر گوڵێك لەدوری سەد یاردە زیاتر بدۆزێتەوە، ئەوا دەگەڕێتەوە شارەکەی خۆی و سەماکەی بەجۆرێکیتر دەکات.

لەجیاتی خول خواردنەوە لەئەڵقەیەکی بچوکدا، لەم حاڵەتەدا شێوەیەك دروست دەکات لەژمارە هەشتی ئینگلیزی دەچێت و هەردو ئەڵقەی ژمارەکەش بەهێڵێکی

ڕاست پێکەوە دەبەستێت، لەکاتێکدا سکی‌و کلکی بەلاکەی تردا دەجولێنێتەوە جگە لەمانە، سەمای کلکی بەهەنگەکانی تر دەڵێت: دوریەکەی چەندەو بەچ لایەکدا بفڕن.

ژمارەی نوشتتاننەوەکانی لەخولەکێکدا دوریەکەی دیاری دەکات، هەرچەندە شوێنەکە دورترین ژمارەی ئەو شێوەی ٨ی دروستی دەکات کەمتر دەبێتەوە بۆ نمونە: ئەگەر ژمارەی نوشتانەوەکانی ١١ نوشتانەوە بێت لەخولەکێکدا ئەوا دوریەکەی ٢٧٠٠ مەترە، بەلام ئەو هێڵە ڕاستەی کەلەنێوان دو ئەلقەکەدا دروستی دەکات زۆر بەوردی ئاراستەی ئەو شوێنە دیاری دەکات کەگوڵەکانی لێیە.

هەنگ بەگوێرەی شوێنی خۆر لەئاسماندا ئەو هێڵە دروست دەکات، بەجۆرێك کەهەنگەکانی تر بتوانن لەگۆشەی ڕاستەوە یەکسەر بۆی دەرچن.

## چ ناوچەیەك زۆرترین بارانی لێدەبارێت؟

هۆکاری زۆر هەن تەحەکوم بەڕێژەی باران‌و بەفر بارینەوە دەکەن لەهەر ناوچەیەکدا، لەوانەیە پلەی گەرما، بەرزی شوێنەکە لەسەر ڕوی دەریاوە، شوێنی زنجیرە چیاکان‌و هتد.

دەشێت چیای وایالیاڵ لەهاوای ئەو شوێنە بێ کەزۆرترین بارانی لێدەبارێت لەجیهاندا.

ڕێژەی باران بارین تیایدا دەگاتە ١،١٩٧ سانتیمەتر لەساڵێکدا، دەشێت دوەم شوێنیش کەزۆرترین بارانی لێ ببارێت تشیرا بونجی بێت لەهیندستاندا، کەڕێژەی ساڵانەی باران بارینی لەنێوان ١،٠٧٩ بۆ ١،١٤٣ سانتیمەترە، جارێکیشیان لەماوەی پێنج ڕۆژدا ٣٨١ سەنتیمەتر بارانی لێ باری، لەساڵی ١٨٦١یشدا ڕێژەی باران بارینی گەیشتە ٢٣٠٠ سەنتیمەتر.

ئەم شارانەش ڕێژەی باران بارین تیایاندا بەم شێوانەیە لەندەن نزیکەی ٦١ سەنتیمەتر لەساڵێکدا، ئەدنبەرە نزیکەی ٦٨ سەنتیمەترە، کاردیف ٧٦ نیوێۆرك نزیکەی ١٠١، ئۆتاوای کەنەدا نزیکەی ٧٦، مەدریدی ئیسپانیا ٤٣و پاریسی فەرەنسا ٥٥ سەنتیمەتر، خۆتان بەراوردی ئەو ڕێژانە بکەن لەگەڵ ١١٩٧ سەنتیمەتری باران بارین لەتشیرا بونجی هیندستاندا.

زۆرترین ناوچەی جیهانیش کەوشكو بیٚ باران بێت، ناوچەی "ئەریكا"یە لەولاٰتی شیلی لەئەمریكای باشور، کەرێژەی باران بارین تیایدا ٠.٥٪ سەنتیمەتر تێناپەڕێت.

زۆرترین شوێنی ئەمریکاش لەوشکیو بیٚ بارانیدا، ناوچەی گرنیلاند ڕانشە لەدۆلّی مردن، کەرێژەی باران بارین تیایدا لە ٣،٧٥ سەنتیمەتر کەمترە.

بەگشتی لەسەر هەندێك ناوچەی گەورە، لەسەر ڕوی زەوی بەدرێژای سالّ باران دەبارێت.

بۆ نمونە: ناوچە نزیکەکانی هێلّی ئیستیوا ١٥٢ سەنتیمەتر بارانیان لێدەبارێت، بگرە زیاتریش هێلّی ئیستیوا هەوای دابەزیوی باکور، لەگەلّ هەوای هەلّچوی باشوردا لەیەك دەدەن.

هەروەها لەناوچەی ئیستیوادا جولّەیەکی بەرزبونەوەی بای گەرم هەیە بۆ سەرەوە کەلەگەلّ خۆیدا هەلّمو ئاوی هەلّگرتوە، کاتێك هەوای بەرز بوەکە دەگاتە بەرزاییەکی لەخۆ سارتر، بەرێژەیەکی زۆر چڕ دەبێتەوەو دەبێتە هەلّمو لەشێوەی باراندا دەبارێت.

ڕێژەیەکی زۆر باران، لەدیوی لای باوە لەزنجیرە چیاکاندا دەبارێت، بەلاٰم دیوەکەی تری کەبانایگرێت، بارانی کەمتر لیٚ دەبارێت.

زنجیرە چیای کاسکید لەویلایەتی کالیفۆرنیا باشترین نمونەی ئەوەیە.

## خورافات چۆن دروست دەبێت؟

خورافات لەسەرەتای دروستبونی شارستانیەتەوە هەر هەبوە، ئێستاش لەسەرانسەری جیهاندا، ملیۆنەها کەس، باوەڕیان بەخورافات هەیەو ئامادەنین وازی لێبێنن.

هەرگیز ناتوانرێت تەفسیری ئەوە بکرێت خورافات چۆن دەست پیٚ دەکات، ئەشێت لەسروشتدا دیاردەیەکی تایبەتی مرۆڤ بترسێنێت، یان سەرسامی بکات، یان ڕوداوێك ڕوبدات حەزبکەن تەحەکومی پێوە بکەن.

بۆیە هەر زو باوەڕ دەکەن بەتەفسیرێك کەدەبێتە هۆی ڕودانی ئەو شتانە، یان باوەڕیان وایە ئەگەر شتێك بکەن ئەوا دەتوانن ئەو شتەی حەزی لێدەکەن بۆیان

بێته دی.

"خورافه" واته قه‌ناعه‌ت کردن، به‌زۆری له‌کاتی ترساندا ڕوده‌دات‌و نه‌یاره له‌گه‌ڵ عه‌قڵ‌و مه‌نتیقداو ناشتوانرێت به‌تاقیکردنه‌وه بسه‌لمێندرێت.

بۆ نمونه: ته‌نه ئاسمانیه‌کان، به‌درێژای ڕۆژگار خه‌ڵکیان سه‌رسام کرد بو، ترسی له‌دڵیاندا دروست کرد بو، بۆیه جۆره‌ها ئه‌فسانه له‌سه‌ر ئه‌و ته‌نه ئاسمانیانه دروست بو.

"نه‌یزه‌ك" پرش هاوێژه‌کان به‌رده‌وام بۆ مرۆڤ نهێنیه‌کی ئاڵۆز بوه، تاخورافاتی مرۆڤ گه‌یشته ئه‌وه، که‌وتنه خواره‌وه‌ی نه‌یزه‌کێك، ئاماژه‌یه بۆ جه‌نگ‌و ده‌ردێکی چاوه‌ڕوان نه‌کراو.

مانگیش ئاڵۆزیه‌کی تایبه‌تی خۆی هه‌بو، خه‌ڵکی بڕوایان گه‌یشته ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر که‌سێك زۆر سه‌یری مانگ بکات، ئه‌وه مانگ به‌بروسکه‌یه‌ك، ده‌یکوژێت.

مرۆڤی سه‌ره‌تایی له‌به‌ر ئه‌وه‌ی نه‌یتوانیوه، له‌ڕه‌وشتی ئاژه‌ڵان تێ بگات، بۆیه خورافاتی له‌سه‌ر ئه‌ویش دروست کرد.

پشیله‌ی ڕه‌ش ئه‌گه‌ر بێته ڕێگه‌ی که‌سێك، ئه‌وا هه‌ڵه‌یه‌کی گه‌وره ده‌کات، ئه‌گه‌ر بایه‌قوش "بوم" خوێندی ئه‌وا ئاماژه‌یه بۆ مردنی که‌سێك له‌ماوه‌یه‌کی نزیکدا.. تاد.

ئه‌و ده‌ریاوانانه‌ی له‌گه‌ڵ هێزی سروشتدا، زۆران بازیان ده‌کرد، هه‌میشه خورافاتی زۆریان لادروست ده‌بو.

بۆ نمونه: له‌به‌ر ئه‌وه‌ی باوزریان مه‌ترسی له‌گه‌ڵدا بوه، بۆیه، خورافاتی زۆریان له‌سه‌ر دروست کردوه، زۆربه‌ی ده‌ریاوانه‌کان بڕوایان وابو هاژه هاژی بازریانی مه‌ترسیدار، دروست ده‌کات.

ته‌نانه‌ت له‌ئێستاشدا له‌کاتی به‌کارهێنانی پاپۆڕێکی تازه‌دا بۆیه‌که‌مجار شوشه‌یه‌ك مه‌ی ده‌شکێنن، که‌هۆیه‌که‌ی ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ خورافاتی کۆن، چونکه خواوه‌ندی ده‌ریا "نبتۆن" مه‌ییان بۆ کردۆته قوربانی.

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خه‌ڵکی مامه‌ڵه‌ی زۆر له‌گه‌ڵ ژماره‌کاندا ده‌که‌ن، خورافاتیشیان له‌سه‌ر ئه‌وانیش دروست کردوه‌و هه‌ندێك ژماره‌یان به‌نه‌حس‌و خراپ‌و

هەندێكیشیان بەبەخت هێنەر دەزانن.

## جل‌و بەرگی مرۆڤ چۆن پێشكەوت؟

بەردەوام مرۆڤ حەزی لەخۆ قۆز كردن كردوە، بۆیە یەكەمجار كەمرۆڤ پێستی ئاژەڵانی لەبەر كردوە، بەردو ملوانكەو مورویی لەمل كردوە.

هەرچیشی دەست كەوتبێت لەبەری باڵندەو گەڵای دار، كردویەتە جل‌و بەرگ بۆ خۆی، ئەشێت جل‌و بەرگ سیفەتێكی سیحراوی بوبێت لای مرۆڤە سەرەتاییەكان‌و بەلەبەركردنی گیانە شەرانیەكانی لەخۆی دور خستبێتەوە. لەچەرخی بەفرین دا خەڵكی بۆ ئەوەی گەرمیان بێتەوە ناچار بون پێستی ئاژەڵان لەبەر بكەن، سەرەتا پێستی ئاژەڵانیان، خۆشە دەكردو ئەمجا بەیەكەوەی دەدوراندو لەبەری دەكرد.

بەرە بەرە مرۆڤ فێر بو چۆن پێستە نەرم بكاتەوە، نزیكەی چوار یان پێنج هەزار ساڵیشە دەرزی داهێنراوە، كەبو بەئامێری سەرەكی لەدروست كردنی جل‌و بەرگدا.

دوای ئەوە مرۆڤ فێر بو، لەخوری مو بڕێسێت‌و بیكاتە دەزو، میسریە كۆنەكان لەكەتان‌و لۆكە قوماشی سوكیان دروست كردوە، میللەتانی كۆنیش لەخوری جل‌و بەرگیان دروست كردوە.

لەشوێنە ساردەكانیشدا جل‌وبەرگ بەشێوەیەك دروست كراوە، كەهەمو لەشی مرۆڤی داپۆشیوە، تالەسەرمای سروشت پارێزراوبێت.

جل‌و بەرگی ناوچە ساردەكانیش تەسك بوە بۆ ئەوەی بلكێتە لاشەوە، لەوەوە بو پانتۆڵ‌و پاڵتۆ داهێنرا.

لەبەر پێشكەوتنی هۆكانی هات‌و چۆ لەنێوان مرۆڤەكاندا، لەناوچە جیاجیاكانی جیهاندا "مۆدیل" پەیدا بو لەناوچەیەكەوە دەگوازرایەوە بۆ ناوچەیەكی تر، لەهەمان كاتدا جل‌و بەرگی چینەكانی مرۆڤیش جیاوازیان تێكەوت، كەتا ئەمڕۆش بەئاشكرا دەبینرێت.

## قوللەی بیزای خوار

ئەگەر قوللەی بینزالەئیتالیا خواریش نەبوایە، بەڕاستی هەرجێی سەر سوڕمان بو، ئەم قوللەیە لەبەردی سپی دروست كراوەو ئەستوری دیوارەكەی چوار مەترە.

لەهەشت نهۆم پێك دێت‌و بەرزیەكەشی ٥٤،٥ مەترە، واتە بەبەرزی بینایەكی ١٥نهۆمی، پەیژەیەكی تیایە تادەتگەیەنێتە لوتكەكەی ٣٠٠ پلە بەرزە.

لەلوتكەى ئەم قوللەيەوە ديمەنێكى جوانى شارو دەريا دەبينرێت، تادورى ٩،٥ كيلۆمەترە.

لەلوتكەكەيەوە، قوللەكە ٥ مەتر لەهێڵى ئاسۆيى بنى قوللەكەوە دور دەكەوێتەوە بەواتايەكى تر: ئەگەر بەردێك لەلوتكەيەكەوە بخەينە خوارەوە، لەدورى پێنج مەتر لەبنەواى قوللەكە، بەئەرز دەكەوێت.

چى واى كردوە ئەم قوللەيە خواربێت؟

هيچ كەس وەڵامى ئەم پرسيارە نازانێت، دەبوايە لەكاتى دروست كردنيدا ڕاست بوەستايە، بەڵام لەبەر ئەوەى ژێرى لم ڕێژ كراوە، ئەمەش تەنيا تەفسيرێكە بۆ خوار بونەوەى، دواى دروست كردنى سێ نهۆمى دەستى بەخوار بونەوە كردوە، بەڵام ئامادە نەبون پلانەكە بگۆڕن و بەشێوەيەكى سادە درێژە درا بەتەواو كردنى مەبەست لەدروست كردنى قوللەى بيزا ئەوە بو زەنگى كەنيسەكەى دراوسێى لەوێوە لێبدرێت، لەساڵى ١١٧٤ دەست كرايە دروست كردنى و لەساڵى ١٣٥٠ تەواو كرا.

لەسێسەد ساڵى دوايدا ٤٠سم خوار بوەتەوە، هەندێك لەئەندازياران دەڵێن دەبێت ناوى ئەو قوللەيە بنرێت "قوللەى ڕوخاو" چون بڕوايان وايە ڕۆژێك لەڕۆژان هەر دەڕوخێت.

## وشەى يەكتربڕ كەى داهێنرا؟

مەتەڵى وشەيەكتربڕەكان شتێكى تازەيە، بەڵام زۆريش تازە نييە.

لەسەردەمى كۆندا شتێك هەبوە، پێيان وتوە "چوار گۆشەى پێژەيى"، بريتى بوە لەچوارگۆشەيەك، چەند وشەيەكى وەك يەك درێژو ڕێكى لەخۆ گرتوە.

بەجۆرێك بەهەردو ديوى ستونى و ئاسۆيدا وەك يەك خوێندراوەتەوە، وشەى يەكتر بڕ بريتيە لەڕيزێك چوارگۆشەى ڕەش و سپى، وشە جۆراوجۆرەكانى بەشێوەى ئاسۆيى و ستونى بەيەكدا دەچن، پێناسەيەكيش وەكو كليل دەدرێتە خوێنەر بۆ دۆزينەوەى وشەكان.

بەو جۆرە مەتەڵى وشە يەكتر بڕەكان هەندێك زانيارى زيادە دەداتە مرۆڤ، بۆ يەكەمين جار مەتەڵى وشە يەكتر بڕەكان لەلايەن پياوێكەوە دانرا بەناوى "ئارترۆين" و لەپاشكۆى حەفتە نامەى "نيۆيۆرك وۆرلد"دا لەڕۆژى ٢١ كانونى يەكەمى ١٩١٣دا بڵاو كرايەوە.

بۆ ماوەیەکیش بو بەگۆشەیەکی تایبەت، لەو حەفتە نامەیەداو پاشان گەلێك چاکسازی تیایدا کرا.

لەساڵی ١٩٢٤دا یەکەمین کتێبی وشە یەکتر برەکان لەئەمریکادا بڵاوکرایەوە، پێش چاپکردنی ئەو کتێبە، مەتەڵی وشە یەکتر برەکان شتێکی باو نەبو، بەڵام دوای چاپکردنی ئەو کتێبە، مەتەڵی وشە یەکتر برەکان، بو بەخودی سەری خەڵکی و ئەمریکا و دوای ئەوەش هەمو جیهان.

دوای ئەوە ڕۆژنامەکانی تریش وەکو هیدڵدو تریبیوّن کەلە نیویۆرك دەردەچون، شوێن پێی ڕۆژنامەی "وۆرڵد" یان هەڵگرت.

هێندەی پێ نەچو زۆربەی ڕۆژنامەکان، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك مەتەڵی وشە یەکتر بڕەکانیان بڵاو کردەوە.

بەریتانیەکان لەساڵی ١٩٢٥دا، دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی مەتەڵی یەکتر بڕ، سەرەتا لەئەمریکاوە ئەو جۆرە کتێبانەیان دەهێنا، بەڵام بەریتانیەکان جۆرێك لەمەتەڵی یەکتر بڕیان پەرە پێدا کەلەوانەی پێشو جیاواز تر بو.

## کێ نۆتە مۆسیقیەکانی داهێنا؟

بۆ ماوەیەکی زۆر مۆسیقا بەبێ نوسین مایەوە، تەنیا دەماودەم ئاوازەکانیان لەیەکترەوە وەردەگرت، ئەم کردارەش گۆڕانکاری زۆری بەسەر ئاوازەکەدا دەهێنا.

بۆیە پێویستی وای کرد، مۆسیقا بنوسرێتەوە بەو جۆرە بوترێتەوە کەنوسراوەتەوە، ئەو ڕێگەیەش کەدانرا بۆ نوسینەوەی مۆسیقا پێی دەوترێت "نۆتە: واتە نیشانەکانی مۆسیقا".

سیستەمی نوسینی نۆتە مۆسیقیەکان، کەئەمڕۆ لەدونیادا بەکار دەهێنرێت، ئەنجامی چەندین سەدەیە لەهەوڵ و کۆشش و پێشکەوتن.

لەنزیکەی کۆتایی سەدەی نۆهەمەوە تاسەرەتای سەدەی هەژدەم، ئەم پێشکەوتن و هەوڵانە لەناو کەنیسەو دەیرەکانی کەنیسەی کاسۆلیکی دا درا، چونکە زۆربەی نوێژەکانی ناو کەنیسە بەئاوازەوە دەوتراو دەماو دەم لەیەکتریان وەردەگرت، ئەمەش بۆ خۆی کێشەی گەورەی دروست دەکرد لەگۆڕانی ئاوازەکاندا، بۆیە لەکۆتایی سەدەی نۆهەمدا، دەست کرا بەدانانی خاڵ و هێڵ لەسەر وشەکان لەکتێبی نوێژدا.

ئەو نیشانانەش ئەو ئاراستەیەی دیاری دەکرد، کەدەبوایە ئاوازەکەی لەسەر بوترایە،

بەڵام خوێندنەوەی هێشتا زۆر ئاڵۆزو نادیار بو.

لەساڵی ١٩٠٠دا خوێندنەوەی مۆسیقا، ئاسانتر بو، هێماکان لەسەر ماوەیەکی دیاری کراو دەنوسرا، لەسەر هێڵێکی سوری ئاسۆیی بۆ ئەوەی بەرزو نزمی تۆنەکە دیار بدات.

دوای ئەوە ماددەیەك داهێنرا لەسەر دەستی ڕاهیبێك بەناوی "گۆدۆ دایرزۆ" کەبریتی بو لەچوار هێڵ، بەڵام نۆتەکە دەبوایە درێژی هەر تۆنێکی دیاری بکردایە.

لەسەدەکانی سیازدەو چواردەدا نوسینی مۆسیقا شێوەی تازەتری بەخۆیەوە بینی و لق و پۆ بۆ هەندێك لەتۆنەکان زیاد کرا بەگوێرەی درێژیەکەی.

تالەسەدەی حەڤدەهەمدا نۆتەی مۆسیقا ئەو شێوەیەی بەخۆوە گرت کەئەمڕۆ دەیبینین.

## کەی واشنتۆن بوو بەپایتەخت؟

دوای شۆڕشی ئەمریکا، ویلایەتە یەکگرتوەکان پێویستی بەپایتەختێك هەبو، هەڵبژاردنی شوێنەکەشی لەئەنجامی تەبایی و لەیەك گەیشتنەوە بو.

زۆر لەناوچەو شارەکانی ئەمریکا دەیانەویست، شەرەفی بون بەپایتەختی وڵاتیان پێ ببڕێت.

دوا بڕیار گەیشتە ئەوە، دەبێت شارێکی نوێ دروست بکرێت، کۆنگرێسیش لەساڵی ١٧٩٠دا ڕەزامەندی خۆی لەسەر یاسایەك دەر بڕی، بەدیاری کردنی شوێنی شاری نوێ، بەو مەرجەی نزیك بێت لەڕوباری "بۆتۆماك"ەوەو ڕوبەرەکەشی لەدەمیلی چوار گۆشە زیاتر نەبێت "٢٥،٩کم٢"، زەویەکەش ناوبنرێت هەرێمی کۆلۆمبیا، لەسەر ناوی کریستۆڤەر کۆلۆمپس، شاری نوێش ناو بنرێت واشنتۆن، بەناوی یەکەمین سەرۆکی وڵاتەوە.

لەساڵی ١٧٩١ دا جۆرج واشنتۆن ئەوشوێنەی دیاری کرد، کەئێستا شارەکەی لەسەر دروست کراوەو بڕوای وابو شوێنێکی باشە لەبەر ئەوەی ڕوباری "بۆتۆماك" قوڵەو کەشتیەکان دەتوانن بەئاسانی تیایدا هاتو چۆ بکەن.

هەردو ویلایەتی میریلاندو ڤیرجینیا، زەوییان دایە حکومەتی فیدراڵی " یەکگرتو" میریلاند نزیکەی ١٦٥ کیلۆ مەتری دوجاو، ڤیرجینیاش نزیکەی ٩٣ کیلۆمەتری دوجا زەوییان دا بەحکومەت.

لەساڵی ١٨٤٦ لەسەر داوای ویلایەتی ڤیرجینیا، ئەو برە زەویەی دابوی بەحکومەت بۆی گەڕێنرایەوە.

سەرۆك واشنتۆن ئەندازیارێکی فەرەنسی زۆر زیرەکی دەست نیشان کرد، کەناوی "میجۆر بییەر لانڤانت" بو بۆ دانانی نەخشەی شاری نویێ.

لانڤانتیش زۆر بەجوانی نەخشەکەی داڕشتو جادەی پانو بەرینو لەلاجادەکانیشدا دارو درەختو بینای حکومی زۆر جوانو شوێنی پەیکەر بۆ پیاوانی گەورەی ئەمریکا دیاری کرد.

لەساڵی ١٨٠٠دا ماڵی سەرۆك لەتەواو بوندا بو کەبینانای " کاپیتۆڵ" دروست کرا لەسەر گردێكو ناوی لێ نرا "کاپیتۆل هیل" بۆ ئەوەی کۆنگرسی ئەمریکی تیایدا کۆبونەوەکانی خۆی بکات.

لەساڵی ١٨٠٠دا سەرۆك جۆن ئادەمزو ئەندامانی حکومەتەکەی، گواستیانەوە بۆ شاری فیدڕاڵی نویێ "واشنتن دی. سی" واتە "واشنتۆنی هەرێمی کۆلۆمبیا".

## ڕۆژانی هەفتە چۆن ناوەکانیان وەرگرت؟

سەردەمانێك هەبوە لەمێژوی مرۆڤایەتیدا، ڕۆژەکانی حەفتە هیچ ناوێکیان نەبوە، هۆیەکەشی زۆر ئاسانو دیارە، لەبەر ئەوەی تائەو کاتە شتێك نەبوە ناوی "هەفتە"بێت.

لەوکاتەدا ژماردنی ڕۆژەکان بەمانگ بوە، لەبەر ئەوەی ڕۆژەکانی مانگیش هێندە زۆر بوە، زەحمەت بوە بتوانرێت هەریەکەو ناوێکی سەربەخۆی لێ بنرێت، بەڵام کاتێك خەڵکی دەستیان دایە دروست کردنی شار، ویستیان ڕۆژێکی تایبەتیان هەبێت بۆ بازرگانی "بازاڕ".

ئەو ڕۆژەی بازرگانیەش هەندێك جار هەر دە ڕۆژ یان حەوت ڕۆژ یاپێنج ڕۆژ جارێك دیاری دەکرا.

بابلییەکان بڕیاریان دا ڕۆژی بازاڕیان، سەری هەمو حەوت ڕۆژێك بێت، لەو ڕۆژەشدا دەستیان لەکار هەڵدەگرتو خەریکی کڕینو فرۆشتنو بازرگانیو ئاهەنگی ئاینی دەبون.

یەهودیەکانیش چاویان لەبابلیەکان کرد، بەڵام ڕۆژی حەوتەمیان تایبەت کرد بۆ

مەبەستی ئاینیو بەس، بەو جۆرە دروست بو، کەناوبڕێك بو لەنێوان ڕۆژانی بازاڕ یان ڕۆژانی بازرگانیدا.

یەهودیەکان هەر ڕۆژێك لەڕۆژەکانی حەفتە ناوێکی تایبەتیان بۆ دانا، بەڵام لەڕاستیدا ئەو ناوانە، ژمارەیەك بو کەلە دوای ڕۆژی شەمەیانەوە دەهات بۆ نمونە چوارشەمە چوارەم ڕۆژ بو لەدوای شەمەوە.

کاتێك میسریەکانیش هەفتەیان کردە حەوت ڕۆژەوە، ناوی پێنج ئەستێرەو مانگو خۆریان لێنا.

ڕۆمانیەکانیش بۆ ڕۆژانی هەفتەیان ناوە میسریەکانیان بەکار هێنا، کەیەکێکیان ڕۆژی مانگو یەکێکیتر خۆرو سێیەم مەریخو چوارەم عوتارو پێنجەم موشتەریو شەشەم زوحەلو حەوتەم زوهرە بو.

ڕۆژ ئاواییەکانیش ڕۆژانی حەفتەیان لەئەنگلۆ- ساکسۆنەوە، وەرگرت، کەناوی خواوەندەکانیان نابوە ڕۆژانی حەفتەوە، وەکو ناوی ڕۆژانی حەفتە لای ڕۆمانیەکان.

ڕۆژی خۆر بو بەسەندای Sundayو ڕۆژی مانگیش بو بەموندای Mondayو ڕۆژی مەریخیش ڕۆژی Tiw کەخواوەندی جەنگ بوە لایانداو ئێستا گۆڕاوە بۆ Tuesday ڕۆژی چوارەمیش لەجیاتی عوتارد ناوی خواوەندی Woden یان لێنا، کەئەمڕۆ بوەتە ویدنیزدای Wednesday.

بەڵام ڕۆژی ڕۆمانی بۆ موشتەری ئەنگلۆ- ساکسون ناوی خواوەندی هەورە تریشقە "سور" یان لێنا کەگۆڕا بۆ سێرزدای، دوای ئەوەش فرایدای کەناوی ژنەکەی "ئۆدین"ی خواوەندیانەو کەناوی فریگ بوە.

ڕۆژی زوحەلیش لەزمانی ڕۆمانیەوە وەرگیراوە، کەئەمڕۆ بوەتە سەتردای.

لەسەردەمی کۆندا ڕۆژی تازە لەڕۆژ هەڵاتنەوە بوە تاڕۆژ ئاوا بون، بەڵام ڕۆمانیەکان ڕۆژیان لەنیوەی شەوەوە دەست پێکرد تانیوەی شەوێکی تر، ئەم یاسایە تائێستاش زۆربەی وڵاتانی جیهان کاری پێ دەکەن.

## تەماشاکردنی تەلەفزیۆن لەتاریکیدا؟

لەکاتی سەیرکردنی تەلەفزیۆندا هەندێك کەس دەرگاو پەنجەرەکان، دادەخەن‌و گڵۆپی ژورەکانیش دەکوژێننەوە، وادەزانن بەتاریك کردنی ژورەکە وێنەکان ڕونتر دەبینن لەکاتێکدا ئەمە شتێکی ڕاست نیە.

چاوی مرۆڤ بەبینینی تیشکی سپی بەباشترین شێوە ئیش دەکات‌و بەجوانترین شێوەش دەبینێت، لەبەر ئەوە ڕوناکیەکی کەم، زۆر پێویستە لەکاتی سەیرکردنی تەلەفزیۆندا، لەبەر ئەوەی هەندێك لەتیشکەکە پێچەوانە دەبێتەوەو، وێنەکە تێك دەدات.

لەروی پزیشکیەوە، سەیرکردنی تەلەفزیۆن، لەژوری تاریکدا، دو زیانی زۆر سەرەکی هەیە.

یەکەمیان: ئەو تیشکەی لەتەلەفزیۆنەکەوە دەردەچێت، بۆ چاو پاش نیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە کاری خۆشی دەکاتە سەر تۆڕی چاو.

دوەمیان: چاو توشی ماندوو بوون دەکات لەبەر ئەوەی تیشکی شاشەکە لەژورێکی تاریکدا، زیاتر ڕون دەبێتەوە.

بۆیە ئامۆژگاریمان ئەوەیە لەژوری تاریکدا سەیری تەلەفزیۆن نەکەن.

## ئەو زمانەی زۆرترین وشە لەخۆدەگرێت؟

زمان لەبنەڕەتدا هۆیەکە بۆ لەیەکگەیشتن بەهۆی وشەکانەوە، خەڵکی سەر زەوی بەنزیکەی پێنج هەزار زمانی جۆراوجۆر قسە دەکەن، تەنها لەهیندستاندا ژمارەی زمان‌و دیالێکتەکان "٨٤٥" زمان‌و دیالێکتە کە "١٥"ی لەدەستوری هەنددا بەڕەسمی دانی پیانراوە.

هەمو زمانێك کۆمەڵێك پیتی ئەبجەدی خۆی هەیە، کەبەپێی یاسایەکی دیاری کراو بەخستنە سەریەکی ئەو پیتانە وشەکانمان بۆ دروست دەبێت.

ئایا دەزانن چ زمانێك لەجیهاندا زۆرترین وشە لەخۆ دەگرێت؟

بێگومان زمانی ئینگلیزیە کە "٧٩٠" هەزار وشە لەخۆ دەگرێت، "٤٩٠" هەزاری وشەی ئاساییەو "٣٠٠" هەزاریشی زاراوەی هونەریە.

زانایانی زمان دەڵێن زیاتر لە ٤٠٠ ملیۆن کەس لەسەرانسەری جیهاندا، بەزمانی ئینگلیزی قسە دەکەن، بەڵام ئەو زمانەی کەزۆرترین کەس قسەی پێ دەکەن زمانی "ماندەرین"ە.

پێشی دەوترێت زمانی چینی باکور، کەنزیکەی "٦٧٥" ملیۆن کەس قسەی پێ دەکەن، وشەیەکیش کەلەزمانی ئینگلیزیدا، زۆرترین واتا بدات وشەی "set"ە کە "٥٨" مانای هەیە وەکو ناو "١٢٦" مانای هەیەو وەکو فرمان "١٠" ماناشی هەیە وەکو ڕێزمان.

## فیل

فیل گەورەترین گیانداری سەر زەوییە، لەهەمان کاتدا گیاندارێکی ئێسك سوكو بێ وەیە، هەر لەبەر ئەوەشە، بەبەراورد لەگەڵ گیاندارانی تردا دەتوانرێت بەئاسانی دەستە مۆ بکرێتو مەشقی پێ بکرێت.

ئەشێت کێشی فیل هەندێك جار بگاتە ٥ تەن، چوار قاچی ئەستورو کورتی هەیە، وای کردوە کەپارسەنگی لاشەی ڕابگرێت، هەروەها دو دانی لەعاج دروست کراوی هەیە، کەلەلای کەلاوەی سەرویەوە هاتونەتە دەرەوەو وەکو چەکێك بۆ بەرگری لەخۆکردن بەکاری دەهێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا دانی تر لەدەمیدا هەیە بۆ جوینی خواردنەکەی.

فیل بەکۆمەڵ دەژین، هەر کۆمەڵێکیشیان لەنێوان ١٠ بۆ ١٥ فیل دەبن، فیلەکان هەندێکیان ڕەنگیان سپیەو هەندێکی تریشیان خۆڵەمێشیو بەرەو ڕەشە.

دو جۆر فیل هەیە: ئاساییو ئەفریقیایی.

لمۆزی فیل ئەندامێکی زۆر گرنگەو ناتوانێت بێ لمۆز بژیت، وەکو هەردو دەستە لەمرۆڤدا، لمۆز تەواوکەری لوتو لێوی سەرەوەی فیلە، کەواتە لمۆزی ڕۆڵی هەردو دەستو لوتو هەردو لێویش دەبینێت.

لەناو لمۆزدا نزیکەی ٤٠ هەزار ماسولکە هەیە، هەر بەو هۆیەشەوە کەلمۆز زۆر بەهێزو لەهەمان کاتیشدا نەرمە.

بەجۆرێك کەدەتوانێت داری زۆر گەورەی پێ هەڵبگرێت، بەڵام لێواری لمۆز لەپەنجە دەچێتو هێندەش هەستیارە کەدەتوانێت دەرزی پێ هەڵبگرێت.

بەهۆی لمۆزەوە فیل دەتوانێت خواردن‌و خواردنەوە بخوات‌و خۆی بشوات‌و ئاو بەخۆیدا بکات، بۆیە دەبینین لمۆز بۆ فیل چەند گرنگە.

تەمەنی فیل دەگاتە ٩٠سال‌و گیاندارێکی بەسودەو لەدارستانەکاندا، داری زۆر گەورەیان پێ دەگوێزرێتەوە، وەکو چۆن بەیاری سێرك سەرگەرممان دەکات.

## سێ گۆشەی بەرمۆدا

سێگۆشەی بەرمۆدا یان "سێگۆشەی شەیتان" ناوچەیەکی ئاڵۆزە لەباکوری زەریای ئەتلەسی.

تائێستا لەم ناوچەیەدا زیاتر لەپەنجا کەشتی‌و بیست فرۆکە پەنهان بونە لەماوەی دو سەد ساڵی ڕابردودا.

ئەم ناوچەیە لەهەرسێ لاوە هاو سنورە، لەگەڵ فلۆریداو پۆرتۆریکۆو بەرمۆدادا، سێگۆشەکەش دەکەوێتە نێوان هەردو هێڵی پانی ٢٥و ٤٠ی باکورو هەردو هێڵی درێژی ٨٥،٥٥ی ڕۆژئاوا.

ڕوبەرەکەی ٣،٩٠٠،٠٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیەو هەر کەشتیەك کەدەگاتە ئەم ناوچەیە یەکسەر پەخشی ناردنی نامەکانی بەڕادیۆ، لەکار دەکەوێت‌و خۆیشی بەشێوەیەکی ئاڵۆز ون دەبێت.

نوقوم بونی ژێر ئاوی ئەتۆمی ئەمریکی "سکوربیۆن" واتە دویشك لەمانگی مایسی ١٩٦٨دا، بەناو بانگترین ڕوداوی نوقم بون بوە لەم سێگۆشەیەدا.

لەکانونی یەکەمی ١٩٤٥دا پێنج فڕۆکەی هاوێژەر کەخەریکی مەشقی ڕۆتینی خۆیان بون لەو سێگۆشەیەدا نوقم بون.

هەروەها دەستیەك کەبۆ ڕزگارکردنی ئەو فڕۆکانە بەهانایانەوە چون، هەروەها تائێستاش لەو ناوچەیەدا زیاتر لەهەزار کەس گیانیان لەدەست داوە.

سەرەڕای ئەوەی تائێستا هەوڵی زۆر دراوە، بەڵام کەس نەیتوانیوە نهێنی سەر سوڕهێنەری سێگۆشەی بەرمۆدا بدۆزێتەوە.

زانایان بڕوایان وایە تەوژمی هەوا تیژەکان کەڕو لەخوار دەچن، ئەو کەشتی‌و فڕۆکانەیان ڕاکێشا بێت، هەندێکی تریش دەڵێن بونی ماوە "مجال"ێکی موگناتیسی زۆر بەهێز لەم ناوچەیەدا پەخشی ناردنی ڕادیۆکان لەکار دەخات.

ئەنجام ئەمەيە، تائێستا هیچ کەسێك نەیتوانیوە تەفسیرێکی وا بۆ نهێنییەکانی ئەم سێگۆشەیە بکات کەخەڵکی قایل بکات.

## کیشوەرەکان چۆن دروست بون؟

گۆی زەوی دەکرێتە دوو بەشی زۆر گەورەو کە بریتین لەئاو وشکانی، بەشە ئاویەکەی پێی دەوترێت "زەریاکان" بەشە وشکانەکەشی پێی دەوترێت "کیشوەرەکان" جیهان بریتیە لەحەوت کیشوەر کەئەمانەن ئەوروپا، ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمریکای باشور، ئەمریکای باکور، ئوسترالیاو کیشوەری جەمسەری باشوری "ئەنتار کیتا".

ئایا دەزانن ئەو کیشوەرانە چۆن دروست بون؟

یەکەم کەس کەبیردۆزی لەسەر بنەمای کیشوەرەکان دانا، ئەلفرێد وێنگلنەر بو لەساڵی ١٩١٢داو بیردۆزەکەی بەراماڵینی کیشوەریی ناسراوە.

بەپێی ئەو بیردۆزەیە ڕۆژێك لەڕۆژان، ئەو حەوت کیشوەرە پێکەوە پەیوەست بونەو هەمویان کیشوەرێکی زۆر مەزنیان پێك هێناوە کەگۆی زەوی بوە.

بیردۆزەکە دەڵێت: یەکەمین پارچە وشکانی پێش " ٢٥٠" ملیۆن ساڵ بەدەر کەوتوە، بەناوی "بانجیا" لەکۆتای چاخی کاربۆنیدا.

دوای نزیکەی ٦٥ ملیۆن ساڵ ئەو پارچە زەویە، بو بەدو بەشی زۆر گەورەوە بەبەشێکیان وتوە "لاوراسیا" و بەبەشەکەی تریش "گوندوانالانغ".

ئەم دو پارچەیەش دەستیان کرد بەلەیەکتر دور کەوتنەوە لەلاوراسیا کیشوەرەکانی ئەمریکای باکورو ئەوروپای ئاسیای ئێستا دروست بون، لە "گوندوانالاند"یش کیشوەرەکانی ئەمریکای باشورو ئەفریقیاو ئوسترالیاو ئەنتار کتیکا دروست بو.

لێکۆڵینەوە لەسەر پاشماوەی ڕوەك و خشۆکە لەناوچوەکان، لەکیشوەری جەمسەری باشوردا، زانایانی گەیاندۆتە ئەو باوەڕە پشتگیری لەبیردۆزەی "ڕاماڵینی کیشوەری" بکەن.

ئەو گەڕان و لێکۆڵینەوانە زانایانی بردۆتە سەر ئەو بیرۆکەیە کەئەنتارکتیکا کیشوەرێکی گەرم بوە پێش ئەوەی ڕابماڵێت بۆ ئەو شێوەیەی ئێستای لەدەورو

بەری جەمسەری باشوردا.

لێکۆڵەرە هاو چەرخەکانیش ئەوەیان دۆزیەوە، کەکیشوەرەکان بەردەوام لەدۆخی ڕاماڵیندان.

### نەژادەکان چۆن دروست بون؟

سەرچاوە زانستیەکان، لەسەر بنەمای ئەو بەڵگانەی دەستیان کەوتوە، بڕوایان وایە، مرۆڤەکان لەیەك شوێندا پەیدا بونو هەمو نەژادەکانیش یەك باوکیان هیە.

باوکی هاوبەشی مرۆڤیش وەکو هەندێك لەزانایان دەڵێن: زۆر لەمرۆڤی ئێستا چوەو بۆ یەکەمین جاریش لەئاسیادا دەرکەوتوە.

هەندێك لەزانایانی تریش دەڵێن مرۆڤ بۆ یەکەمین جار لەچەند جێگەیەکەوەو لەسەردەمی جیاجیادا پەیدا بوە.

پێش نزیکەی ٥٠٠ هەزار ساڵ، لەڕۆژئاوای ئاسیادا، باپیری مرۆڤ لەکۆمەڵی بچوك بچوکدا ژیاون، یەکەمین جیاوازیش لەنێوان مرۆڤەکاندا، لەم کۆمەڵە بچوکانەوە پەیدا بوە، جیاوازیەکەش لەشێوەی سەرو چاو لاشەدا بوە.

دوای ئەوە ئەو کۆمەڵانە گەڕاون بەشوێنو جێگەی تازەدا تالێی نیشتە جێ بن.

پێش نزیکەی ٣٠٠ هەزار ساڵ، کۆمەڵێك کۆچیان کردوە بۆ باشوری ڕۆژهەلات، بەرەو ئەندونسییا و چین.

دوای ئەوە کۆچکردنی مرۆڤ بەرەو ناوچەکانی تری جیهان دەستی پێ کرد، هەر کۆمەڵەو بۆ خۆی سەربەخۆ گەشەیان کردو دوای ئەوە جارێکیتر یەکتریان دیتەوەو تێکەڵی یەکتر بونەوە.

زانایانی هاوچەرخ دەڵێن مرۆڤەکان لەسێ نەژادی گەورە پێك دین کەبریتین لە "قەوقاسیەکان" شێوەیان لەوانە دەچێت، کەلەچیاکانی قەوقاسدا ژیاونو ڕۆشنبیرە سەرەتاییەکان بڕوایان وایە نەژادی سپی لەمانەن.

"مەغول" لەوانە دەچن کەلە مەنغۆلیای ئاسیادا ژیاون، "زنجیەکان" لەوانە دەچن کەلەدارستانەکانی ئەفریقیادا ژیاون.

ڕۆشنبیرانی کۆن مرۆڤیان لەسەر بنەمای ڕەنگ بۆ پێنج کۆمەڵ پۆلێن کردوە، بەڵام ئەمڕۆ ئەو بۆلێن کردنە ڕەواجێکی نیە، لەبەر ئەوە ڕەنگی دەمو چاو بەڵگە

نیە بۆ ئەوەی ئەو کەسە سەر بەچ نەژادێکە.

هەروەها بەشتی تریشەوە ناتوانرێت بخرێتە سەر نەژادێك وەکو شێوەی سەرو شێوەی لوتو جۆری خوێن.

بەڵگە بۆ ئینتیمای مرۆڤەکان بۆ ڕەگەزێك، دەبێت تایبەدمەندیەکانی لەشی مرۆڤ لەبەر چاو بگیرێت، لەبەر ئەوە جنسی مرۆڤ، بەسادەیی کۆمەڵێك خەڵکن تایبەدمەندی لەشیی هاوبەشیان هەیە، کەلەپاپیریانەوە بۆیان بەجیٚ ماوە، بەوەش لەکۆمەڵانی تر جودایان دەکاتەوە.

### بۆچی ملی زەڕافە درێژە؟

هەر لەکۆنەوە زەڕافە مایەی گرنگی پێدانی مرۆڤ بوە، میسریە کۆنەکانو گریکەکان بڕوایان وابوە، زەڕافە پێکهاتەیەکە لەشێرو حوشتر بۆیە پێیان وتوە "شێر حوشتر"، زاڕافە درێژترینی گیانلەبەرانە، بەڵام زانایان تائێستا نەیان توانیوە تەفسیری ئەوە بکەن، چۆن بەو جۆرە ملی درێژ بوە.

زانای زیندەوەر ناسی بەناوبانگی فەرەنسی "جین بابتیست دۆلامارك" بیردۆزەیەکی دانا سەبارەت بەدرێژ بونی ملی زەڕافە کەتیایدا دەیگوت: ملی زەڕافە لەسەر دەمانێکدا زۆر لەئێستا کورتتر بوە، بەڵام بەهۆی ڕاکێشانیەوە بۆ لقی داران، وادرێژ بوە، بەڵام زۆربەی زانایان ئام بیردۆزەی دۆلامارکیان پیٚ قبوڵ نەبو.

ئەوەی کەنامۆیە، لەشی زەڕافە لەلەشی ئەسپێکی ئاسایی گەورەتر نیە، بەهۆی قاچەکانیو ملیەوە درێژیەکەی دەگاتە شەش مەتر. ملی زەڕافە لەحەوت بڕبڕە پێك هاتوە، وەکو ملی مرۆڤ، بەڵام بڕبڕەکانی زۆر درێژن بۆیە ملی زەڕافە وشکە، ئەگەر بیەوێت لەکانیەك ئاو بخوات، دەبێت قاچەکانی لەیەك دور بخاتەوە، تابتوانێت دەمی بگاتە سەر زەوی.

زاڕافە لەڕوەك زیاتر هیچی تر ناخواتو شێوەو لەشی زۆر گونجاون بۆ دەست خستنی خۆراکی خۆی، بۆیە بەرزیەکەی وا یارمەتی دەدات بەئاسانی بگاتە گەڵای دارە بەرزەکان.

درێژی زمانی زەڕافە بەگشتی ٤٦سم، زۆر بەلێهاتویی بەکاری دەهێنێت،

بەجۆرێك دەتوانێت بچوكترین گەڵا، لەگەڵا دڕكاویەكانیش بخوات، بێ ئەوەی زمانی بریندار بێت.

هەروەها لێویكی بەرزی هەیە یارمەتی دەدات لەیەك كاتدا چەند گەڵایەك پێكەوە لێ بكاتەوە بەچەند ڕێگە زەڕافە دەتوانێت لەمەترسی خۆی بپارێزێت.

یەكەم: لەكاتی خواردندا، دەتوانێت بەگوێرەی شوێنەكەی ڕەنگی خۆی بگۆڕێت، هەروەها دو گوێی زۆر سوكی هەیە كەدەتوانێت نزمترین دەنگ ببیستێت.

سەرەڕای ئەوەی هەردو هەستی بۆن كردن‌و بینینی زۆر تیژن، دەشتوانێت لەیەك كاتژمێردا ٣٠ میل زیاتر ببڕێت، واتە پێشبڕكێی خێراترین ئەسپی پێ دەكرێت.

كاتێكیش توشی شەڕو هێرش دەبێتەوە، دەتوانێت بەباشی بجەنگێت‌و هەردو قاچی دواوەی بۆ جوتە وەشاندن‌و سەریشی وەكو كوتەكێكی قورس بەكار بهێنێت تەنانەت شێرەكانیش هەمیشە بەوریایی‌و لەدواوە هێرش دەكەن سەر زەڕافە.

### پەیكەری ئازادی ئەمریكی.... فەرەنسی

پەیكەری ئازادی بەبۆنەی ئاهەنگی لەدایك بونی ولایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكاو بۆ یادی دۆستایەتی گەلی ئەمریكاو گەلی كۆماری فەرەنسا دروست كرا.

پەیكەرەكە، لەدورگەی "بادلۆ" كەئێستا بەناوی "دورگەی ئازادی" دەناسرێت، لەدەروازەی بەندەری نیویۆركە.

پەیكەرەكەش لەسەر ئارەزوی پەیكەر تاشی فەرەنسی فردریك بارسۆڵدی لەو شوێنەدا دانراوە.

بیرۆكەی پرۆژەی پەیكەرەكەش، لەلایەك مێژونوسی بەناوبانگی فەرەنسی "ئەدوارد دێ لاپۆلی"وە دروست بو، دوای جەنگی ناوخۆی ئەمریكا، لەسەر بودجەی گەلی فەرەنساش دروست كرا، بەلام ئەو بنچینەیەی كەلەسەری دانراوە، كەبینایەكی ١٥٠ پێییە لەسەر بودجەی گەلی ئەمریكا بوە.

پەیكەرەكە لەمس دروست كراوەو بەرزیەكەی ١٥٢ پێیەو قورسیەكەشی ٢٢٥

هەزار كيلۆيەو لەساڵى ١٨٨٥ لەفەرەنساوە ڕەوانەى نيۆيۆرك كراو لەڕۆژى ٢٨ تشرينى يەكەمى ساڵى ١٨٨٦دا پێش كەشى گرۆڤر كليفلاندى سەرۆكى ئەمريكا كرا.

بەرزى پەيكەرەكە لەبنەوە تالوتكەى مەشخەڵەكە ٣٠٥ پێيەو بريتييە لەژنێك بەدەستى ڕاستى مەشخەڵێكى بەرز كردۆتەوەو تابلۆيەكيش بەدەستى چەپيەوەيەتى بەروارى ١٤ تەموزى ١٧٧٦ لەسەر نوسراوە، كەڕۆژى ڕزگار بونى ئەمريكايە.

دەبێت بۆ سەركەوتن بەئاسان سوار "مصعد" سەركەوين، تابگەيتە تەلارەكەو دواى ئەوە بەپاچينەيەكى پێچاو پێچدا سەركەويت تادەگەيتە تاجى پەيكەرەكە.

لەسەرەتادا بەڕێوبردنى پەيكەرەكە سەر بەبەڕێوبەرايەتى قوللەكانى بەندەرەكان بو، چونكە مەشخەڵە ڕوناكەكە يارمەتى كەشتيوانى دەدا، بەڵام لەساڵى ١٩٠١ دا بەڕێوبەرايەتى پەيكەرەكە، كەوتە سەر وەزارەتى جەنگ.

لەساڵى ١٩٢٤ يشدا پەيكەرەكە بەنەسبێكى نيشتمانى ڕاگەيەنرا، لەساڵى ١٩٥٦دا ناوى دورگەى "يادلۆ" گۆڕا بۆ "دورگەى ئازادى".

### كەنغەر بۆچى گيرفانى هەيە؟

ئەو گيانلەبەرانەى كە"گيرفان"يان "تورەكە" يان هەيەو كەنغەريش يەكێكە لەوانە، پێيان دەوترێت "بەرگدارەكان". كەنغەريش بەرگێكى هەيە لەنێوان هەردو قاچى دواوەيدا، كەبريتييە لەماڵێكى بچوك و خۆش و گەرم، باشترين شوێنيشە كەبێچوەكەى تيايدا بەخێو بكات، چون بەخورى داپۆشراوەو ئەمەش وادەكات شوێنى بێچوەكەى گەرمو پارێزراو بێت لەهەر مەترسيەك و هۆيەكيشە بۆ گواستنەوەى جگەر گۆشەكەى.

هۆى دروست كردنى ئەو گيرفانە لەكەنغەرو ئاژەڵانى ترى بەرگداردا ئەوەيە، بێچوەكانيان كەلەدايك دەبن زۆر لاوازو بێ دەسەڵاتن، بەتايبەتى بێچوى كەنغەر كەگيانلەبەرێكى بچوكى ڕەنگ شينى سولەقەتەيەو درێژيەكەى لەسێ ميللى مەتر زياتر نيەو ڕەق وەستاوەو وەكو بڵێيت گيانى تێدا نەبێت.

بيهێنە پێش چاوى خۆتان، بۆ گياندارێكى وابچوك و لاوازو بێ دەسەڵات، چى

ڕودەدات ئەگەر یەکسەر شوێنێکی واگەرمو پارێزگاری دەست نەکەوێت.

بەدرێژای شەش مانگ کەنغەری دایك، بێچوەکەی دەخاتە ئەو گیرفانەوە تابیێتە ماڵێك بۆیو تیایدا گەورە ببێت، تادەبێتە هێندەی توتکەیەکی بچوك.

گەرمو خۆشی شوێنەکە وادەکات بێچوەکان بەئاسانی بەجێی نەهێڵنو تەنانەت دوای فێر بونی ڕۆیشتنو ڕاکردنیش هەر لەو شوێنەدا دەمێننەوە.

لەکاتی مەترسیشدا دایکانەکان، بەقەپ بێچوەکانیان هەڵدەگرنو لەکاتی ڕاکردندا بێچوەکان لەدەمیان بەر دەبنەوەو دەکەونە گیرفانیانەوە.

لەجیهاندا "١٢٠" جۆر کەنغەر هەیە، کەبەرزی بچوکترینیان لە ٠،٦ لەمەتردا تێ ناپەڕێتو ناوی "الولب"ە، بەڵام گەورەترینیان کەنغەری سور یان خۆڵە مێشیە کەبەرزیەکەی ١،٨ مەتر دەبێت، کەنغەر لەپێشەوە دو دەستی کورتی هەیەو دەستەکانی چرنوکیان هەیە، هەردو قاچی دواوەشی زۆر درێژەو لەناوەڕاستی پێشیشیەوە پەنجەیەکی پانی گەورە هەیە.

بەیارمەتی قاچە بەهێزەکانی دەتوانێت لە ٣بۆ ٤ مەتر بازبدات، کەنغەر ماندویەتی خۆی لەسەر کلکە درێژەکەی دەردەکات، لەڕۆیشتنیشدا زۆر زۆر خێرایە.

هەستی بیستنیشی زۆر باشە، بەجۆرێك دەتوانێت لەدوریەکی زۆرەوە گوێی لەدەنگی دوژمنەکەی بێت.

### کلکدار چییە؟

سەردەمێك هەبوە، دەرکەوتنی کلك دارەکان ترسو بیمی خستبوە دڵی خەڵکەوە، چونکە خەڵکی بڕوایان وابوە دەرکەوتنی کلك دارەکان ئاگرێکە، نەخۆشیو شەڕو مردنی بەدواوەیە.

هەرچەندە ئەمڕۆ بیرو بۆچنی باشمان لەسەر کلك دارەکان هەیە، بەڵام هێشتا هەمو شتێکیان لەبارەوە نازانین.

کاتێك کلك دارێك دەردەکەوێت، ئێمە بەگرێکی بچکۆلەی دەزانین لەکاتێکدا ڕەنگە تیرەکەی هەزاران میل بێت.

ئەو گرەش "سەر" یان "ناوك"ی کلك دارەکەیە، زانایان بڕوایان وایە کلك

دارەکان لەتەنێکی ڕەق تێکەڵ لەگەڵ گازەکاندا پێك هاتبن، کەتائێستاش سەرچاوەی ئەو مادده لوغزێکین ئاشکرا نەبونە.

کاتێك کلك دارێك لەخۆر نزیك دەبێتەوەو دەکەوێتە ژێر کاریگەریەوە، کلکێکی لەشوێن بەدیار دەکەوێت کەبریتیە لەگازێکی زۆر ناسك، کەتێکەڵە لەگەڵ وردیلەکانداو پێکەوە ماددەیەك دروست دەکەن، کەلەناوکی کلکدارەکەوە دەردەچێت.

توخمێکی سێیەم هەیە بەدەوری ناوکی کلك دارەکەدا پێی دەوترێت "پەرچەمی کلك دار" کەبریتیە لەهەورێکی گڕ گرتو تیرەکەی هەندێك جار دەگاتە ١٥٠ هەزار میل و بەڵکو هەندێك جار لەوەش زیاترە.

کلك دارەکان، لەشێوەو قەبارەدا جیاوازن، هەندێکیان پان و کورتن، هەندێکی تریشیان باریك و درێژن، درێژی هەندێکیان دەگاتە پێنج ملیۆن میل و درێژی هەندێکی تریشیان دەگاتە سەد ملیۆن میل، هەندێك لەکلك دارەکانیش کلکیان نیە.

کلك دار کاتێك کلکەکەی گەورەتر دەبێت خێراتر دەبێتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە لەخۆر نزیك دەبێتەوە، کلك دار یەکەمجار سەری لەخۆر نزیك دەبێتەوەو کاتێکیش لەخۆر دور دەکەوێتەوە یەکەمجار کلکی دور دەکەوێتەوە.

لەبەر ئەوە پاڵە پەستۆی تیشکی ڕۆژ گەردیلەی زۆر بچوك دەدات لەسەری کلك دارەکە، بۆ ئەوەی لەخۆی دوری بخاتەوە، لەبەر ئەوەیە کاتێك کلك دارەکە لەخۆر دور دەکەوێتەوە، یەکەمجار کلکی دور دەکەوێتەوە، لەکاتی دورکەوتنەوەشیدا لەخۆر خێراییەکەی کەم دەبێتەوەو ئەمجا وردە وردە لەبەر چاو دیار نامێنێت، ڕەنگە ئەو دیاردەیە چەند ساڵێك بخایەنێت.

بەڵام زۆربەیان لەئەنجامدا هەر دەکەونەوە خوارەوە، کلك دارەکان گەشت لەدوای گەشت بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، بەڵام بۆیەك سوڕ خواردن بەدەوری خۆردا پێویستیان بەکاتێکی زۆر دورو درێژ هەیە.

بۆ نمونە کلك داری "هالی" پێویستی بە٧٥ ساڵ هەیە تایەك جار بەدەوری خۆردا سوڕێك بخوات.

ئەستێرە ناسان تائێستا نزیکەی هەزار کلك داریان تۆمار کردوە، بەڵام دەبێت هێشتا سەدو هەزار کلك دار لەم سیستە مەخۆریەی ئێمەدا هەبێت، کەتائێستا بەدیار نەکەوتبن و نەبینرابن.

### ئاو چۆن دەگۆڕێت بۆ بەستەڵەك؟

ئەگەر سەرنجت دابێت لەگۆماوێك یان دەریایەك یان ڕوبارێك لەدۆخی بەستندا، دەبینین چینێك لەبەستەڵەك، بەسەر ئاوەکەوە دروست دەبێت.

ئایا دەزانیت ئەگەر هەمو ڕوبارو گۆماو دەریاکان لەبنەوە تاسەرەوە بیبەستایە، ئەوا زۆر شتی گرنگ لەژیانی ئێمەدا جۆرێکیتر دەبو.

ئەو ڕوداوە نەك هەر دەبوە هۆی گۆڕانی ئاو هەوا، بەڵکو هەرچی ئەو زیندەوەرانەش لەئاودا دەژیان لەناو دەچون.

کەواتە چۆن ئاوی گۆماوێك دەگوڕێت بۆ بەستەڵەك؟

کاتێك هەوا لەسەر گۆماوێك سارد دەبێتەوە، چینی سەرەوەی ئاوەکەش سارد دەبێتەوە، ئەم ساردیەش وادەکات ئاوی ساردی سەرەوە لەئاوی گەرمی ژێرەوە قورستر بێت.

ئەمجا ئاوە ساردەکەی سەرەوە دادەبەزێت بۆ خوارەوەو ئاوە گەرمەکەی ژێرەوە سەردەکەوێت بۆ سەرەوە.

ئەم کردارە بەردەوام دەبێت تاهەمو ئاوی ناو گۆماوەکە، دەگاتە پلەی گەرمای ٤ی سەدی، بەڵام بەردەوام پلەی گەرما هەر بەرەو دابەزین دەچێت، کاتێك چینی سەرەوەی ئاوەکە، لەچوار پلەی سەدی ساردتر دەبێتەوە ئەوا لەسەرەوە دەمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی هەر ئاوێك بگاتە ژێری ٤ پلە سوکتر دەبێتەوە.

ئێستا کاتی ئەوە هاتوە چینی سەرەوە لەئاوەکە دەست بەبەستن بکات، کاتێك پلەی گەرما لەخاڵی بەستندا دەبێتە سفری سەدی یان لەژێری سفرەوە کریستاڵە وردەکان دەست بەیەکگرتن دەکەن.

هەر کریستاڵێکیش شەش تیشك یان خاڵی هەیە، کاتێك یەکدەگرن بەستەڵەك دروست دەکەن، بەو جۆرە پلێتێك لەبەستەڵەك لەسەر ڕوی ئاوەکە بەدیار دەکەوێت.

هەندێك جار بەستەڵەكەكە پاكو بێگەردەو هەندێك جاریش تەڵخە، هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەر كاتێك، هەر دڵۆپێكی ئاو دەیبەستێت بڵقێكی ورد لەهەوا لێیەوە دەردەچێتو بەدەوری كریستاڵەكەوە دەنوسێت.

هەرچەندە ژمارەی كریستاڵەكان زیاد بكات، ئەوە بڵقەكە لەناوەوە دەمێنێتەوە بۆیە بەستەڵەكەكە تەڵخ دیار دەدات.

بەڵام كاتێك ئاوی ژێر بەستەڵەكەكە ڕێدەكات، ئەوا بڵقە هەوا بچوكەكان هەمویان لەشوێنێكدا كۆ دەبنەوە، بۆیە بەستەڵەكەكە بەڕونی دیار دەدات.

كاتێك ئاو دەیبەستێت قەوارەكەی نۆ بەرامبەر دەكشێت، هەر لەبەر ئەوەشە لیتر ئاو دەیان لیتر بەفری ڕەقت دەداتیٚو لەزستانیشدا زۆرجار بۆری ئاو ڕادێتەری ئۆتۆمبیلەكان كەئاوەكەی ناویان دەیبەستێت، دەتەقن.

### كێ یەكەم كاتژمێری دروست كرد؟

كاتژمێر ئامێرێكە بۆ زانینی كات، مرۆڤ پێش داهێنانی كات ژمێر ڕێگەی تری هەبوە بۆ زانینی كاتەكان.

ڕۆژ هەڵاتنو ڕۆژ ئاوا بون یەكەمین پێوەر بوە، كەمرۆڤ بەكاری هێناوە بۆ زانینی كات.

هەروەها درێژ بونەوەو كورت بونەوەی سێبەری دارو بەرد یرۆكەیەكی گشتی دا بەمرۆڤ لەسەر زانینی كاتەكان لەڕۆژدا، لەشەویشدا جوڵانەوەی ئەستێرەكان بەتایبەت كە ئەستێرەی زیاتر لەئاسمان بەدەر دەكەون.

میسریەكان شەویان دابەش كرد بۆ ١٢ یەكەی كاتی، كەلەگەڵ هەڵاتنی دوانزە ئەستێرەدا دەبو، هەروەها ڕۆژیشیان دابەش كرد بۆ ١٢ یەكەی كاتی، كەتا ئێستاش لەسەر ئەو بنەمای كات ژمێریە میسریە، شەو ڕۆژ دابەش كراوە بۆ ٢٤ كاتژمێر.

میسریە كۆنەكان هەروەها كات ژمێری سێبەریان دروست كرد، كەبریتی بو لەپارچە تەختە دارێك "عقرب"ێكی لەسەر بو كاتی دەكردە ١٢ بەشەوە، ئەوەش یەكەمین كاتژمێر بوە، كەمرۆڤ دروستی كردوە.

دوەمیلە جۆرێكیتری كاتژمێر بوو كەمرۆڤ دروستیكرد، لەئاگرو ئاو بو، مۆمێكی

دادەگیرساند کەلەلایەکیەوە بەهێڵ دیاریکرابوو، لەگەڵ سوتانی هەر هێڵێکدا کاتێکی پیشان دەدا، دەخرایە سەر کونێکی بچوك لەبنی قاپێکدا لەسەر ئاوێك، هەرچەندە مۆمەکە بسوتایە، قاپەکە ئاوی زیاتری تێ دەهات، کاتێك مۆمەکە بەتەواوی دەسوتا، قاپەکەش پڕی ئاو دەبو کێشی قورستر دەبو دەکەوتە ناو ئاوەکەی ژێریەوە.

پێش دو هەزار ساڵ مرۆڤ جۆرێکیتری لەکاتژمێر دروست کرد، ئەویش کاتژمێری شوشە بو، کەبریتی بو لەدو پەرداخی شوشە بەسەریەکەوە، ئەوەی سەرەوەیان کونێکی بچوکی تیا بو، پڕ دەکرا لەلم و دەخرایە سەر پەرداخی یەکەم، هەر کاتژمێرێك جارێك پەرداخی سەرەوە بەتاڵ دەبو بەو جۆرە پێوانەی کاتیان دەکرد.

لەنزیکەی ساڵی ١٤٠ پێش زاین ئەغریق و ڕۆمانەکان بازنەیەکی دان داریان بەکار هێنا بۆ باشکردنی کات ژمێری ئاو.

بەڵام ئەو کاتژمێرە ڕاستەقینەیەی ئەمڕۆ لەهەمو شوێنێکدا بەرچاومان دەکەوێت تەنیا چوار سەد ساڵ پێش ئێستا داهێنراوە.

### چەقۆو کەوچك و چەتاڵ

ئەو سەردەمە بێنە پێش چاوی خۆتان، کەنە چەقۆو نەچەتاڵ و نەکەوچك نەبوە، ئایا یەکەمجار مرۆڤ کام لەم سیانەی بەکار هێناوە.

"مەنتیق" دەڵێت کەوچك بۆ؟

لەبەرئەوەی توانیویەتی بەدەست خواردنەکەی پارە بکات، بۆیە چەقۆ نەبوە، توانیویەتی بەپەنجەکانی خواردنەکەی بگرێت، کەواتە چەتاڵیش نەبوە، بەڵام مرۆڤ پێویستی بەکەوچك بوە، تاشلەی پێ بخوات، بەتایبەتی شلە مەنیە گەرمەکان.

لەبەر ئەوە یەکەمجار مرۆڤ کەوچکی دروست کردوە، هەندێك کەرەستە دۆزرایەوە کەهی سەردەمی چاخی بەردە لەکەوچکی ئێستا دەچن.

میسریە کۆنەکان لەدارو بەرد و عاج کەوچکیان دروست کردوە، ئەغریقیەکانیش لەبرۆنزو زیو.

کاتێك مرۆڤ چەقۆو چەتاڵی بەکار هێنا لەسەر سفرە، هەنگاوێکی گەورەی بڕی لەئادابی نان خواردندا، بەڵام ئەم پێشکەوتنەش شتێکی تازەیە لەمێژوی مرۆڤایەتیدا.

تاپێش سێسەد ساڵ، چەقۆو چەتاڵ، لەڕۆژ ئاوادا بید عەبو، هەمو خەڵکی بەدەست نانیان دەخواردو لەفەرەنساشدا تاسەدەی حەڤدەهەم.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەچەقۆو چەتاڵ پێش ئەوە نەبوە، مرۆڤی سەرەتایی جۆرێك لەچەتاڵی بەکار هێناوە، بەڵام هیچی لەچەتاڵی ئەمڕۆ نەچووە.

بریتی بوە لەچڵە دارێکی لق و پۆدار، ئەوەی زانراوە چەتاڵی سەرەتایی زۆر درێژ بوەو تەنیا دولقی بوەو زیاتر بۆ گۆشت سور کردنەوە بەکار هێنراوە. چەتاڵ لەسەدەی یازدەهەمدا بۆ خواردن بەکار هێنراوە، بەڵام ئەوانەی بەکاریان هێناوە خەڵکێکی دیاری کراو بونە، بەڵام چەقۆ لەکۆنەوە هەر بوەو بریتی بوە لەبەردێکی تیژ، کەبۆ بڕینی شتەکان بەکاریان هێناوە.

ئەو چەقۆیەی ئەمڕۆ دەیبینین تاپێشی سێسەد ساڵە شتێکی دەگمەن بوە، دوای سەدەی حەڤدەهەم چەقۆ چوە بەریتانیاوەو، هەر زو بەکار هێنانی بڵاو بوەوە، بەڵام ئەو کاتەش هەژارەکان نەیان دەتوانی بیکڕن بۆیە زۆربەی خەڵکی لەو سەردەمەشدا هەر بەدەست نانیان دەخوارد.

### شاخە سەهۆڵ چۆن دروست دەبێت؟

شتێکی بەڵگە نەویستە کەشاخی بەفرین شتێکی جوان و سەرنج ڕاکێشە، بەڵام لەهەمان کاتدا مەترسیەکی زۆری هەیە بۆ سەر کەشتیەکان، لەکاتێکدا ئەگەر ئەو شاخانە ببنە ڕێڕەوی ئاوی کەشتیوانی.

لەشەوی ١٤ نیسانی ١٩١٢دا، گەورەترین کارەساتی دەریایی ڕویدا کاتێك کەشتی "تایتانیك" دای لەشاخێکی بەفراوی و ١٥١٣ کەس تیایدا گیانیان لەدەست دا.

شاخی بەفراوی بریتیە لەبەستەڵەکێك یان ڕوبارێکی بەفراوی، کاتێك ڕوبارە بەفراویەکان دەکەونە ڕێ، بەشێکیان جیا دەبنەوەو لەڕێگەی شیوەکانەوە دەگەنە ڕوبارەکان و لەوێدا ڕوبارە بەفرەکە هەڵدەوەشێت و سەهۆڵە شاخێك دروست دەکات.

هەندێك لەڕوبارە بەفراویەکان ناگەنە ڕوبارەکان، بەڵکو لەشیوێکی قوڵدا دەوەستن،

كەپێی دەوترێت "ڕوبارە كۆڵان".

هەندێك جاریش بەشێكی شاخە بەفراویەكان بەهۆی شەپۆلەكانەوە دەتوێنەوە، كەبەشێكی زۆر لەبەفر دروست دەكەن لەژێر ئاوداو ئەو بەشە زۆرە بەفرەش شیتەڵ دەبێت و ماوەی جارێك، بەشێكی دەكەوێتە سەر ئاو لەشێوەی شاخێكی بەفراویدا.

شاخە بەفراویەكان، لەڕوی قەبارەوە وەك یەك نین و هەندێكیان بەرزیەكەی لەنێوان ٥بۆ ١٠ مەتردایە.

بەلاّم زۆربەی ئەوانە بەشاخی بەفراوی دادەنرێن كەلە ١٠٠ مەتر بەرزترن.

دەریاوانان دەڵێن: شاخی بەفراوی وایان بینیوە كەلە ١٠٠٠ مەتر بەرزتر بوە، ئەگەر شاخە بەفرێك ٤٥ مەتری لەسەر ڕوی ئاوەوە بەرزتر بێت ئەوا ٣٠٠ مەتری لەژێر ئاودایە، لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی شاخە بەفراویەكان قورساییان لە ١٨٠ ملیۆن تەن زیاترە

## شەپۆلە هەڵچوەكان

لەڕۆژی ١٨٨٣\٨\١٧دا تەقینەوەیەكی گركانی زۆر گەورە، لەدورگەی كراكاتۆی ئیست ئاندیز دا ڕوی دا.

لەئەنجامی ئەم تەقینەوەیەدا، شەپۆلەكان زیاتر لە ٣٢ متر بەرز بونەوەو سەدان گوندی كاول كرد، بەخێراییەكی وابەناو زەویەكاندا ڕۆیشت، تاگەیشتە ١١٠٠ كیلۆ مەتر لەكاتژمێرێكدا، لەدوری هەزاران میلەوە، لەلێوارەكانی ئوستترالیاو كالیفۆرنیادا خەڵكی هەستیان پێ كرد.

لەساڵی ١٩٤٦یشدا، بومە لەرزەیەك لەبنی زەریایەكی نزیكی دورگەكانی "ئەلۆتیا" ڕویدا، شەپۆلێكی واگەورەی دروست كرد، لەماوەی كەمتر لەپێنج كاتژمێردا ٣٠٠٠ كیلۆ مەتری بڕی‌و دای لەهاوای‌و چەندین خانو پردی لەڕیشەوە دەرهێناو زیاتر لە١٧٠ هەزار كەسیشی خنكاند.

هەردو ئەو شەپۆلە پێی دەوترێت "شەپۆلی هەڵچو" تەواو جیاوازە لەگەڵ شەپۆلە ئاساییەكانی دەریا، یان ئەو شەپۆلانەی كەلەكەنارەكان دەیانبینین هەروەها هیچ پەیوەندیەكی بەباو هەڵچونەوە نیە.

زانایان ناوێكی تایبەتیان هەیە بۆ ئەو شەپۆلە هەڵچوانەو ژاپۆنیەكانیش پێی دەڵێن "سۆنامی" كەلەئەنجامی بومە لەرزەی بنی زەریاوە ڕودەدات.

ئەو بومە لەرزەیەی کەلەبنی زەریاکاندا ڕودەدات صدمەیەك دروست دەکات وەکو چۆن دەنگی بەرز لەهەوادا دەچێت لافاوەکانی ئەویش بەو جۆرە بەناوی زەریاکەدا دەچێت.

ئەگەر ڕێکەوت کەشتیەك لەو شوێنەدا بو، ئەوا دەنگی لافاوەکە دەدات لەکەشتیەکە وەکو چۆن بدات لەبەردێك.

کاتێك بنی زەریاکە دەخلیسکێتو هەرەس دەکات، ئەو جوڵەو صدمەو تێکچونە دروست دەبێت کەدەبێتە هۆی ڕودانی شەپۆلە هەڵچوەکان.

**ئۆرکسترا چۆن پێشکەوت؟**

ئۆرکسترا، کۆمەڵێکی زۆرن لەمیوزیك زان، کەتیپێکی میوزیکی نمونەیینو لەنێوان ٧٥ بۆ ١٠٠ ژەنیارنو جۆرەها ئامێری مۆسیقی دەژەنن.

دەبێت لەنیوە زیاتریان ئامێری ژێدار بژەنن کەبەبنەمای هەر تیمێکی ئۆرکسترا دادەنرێت.

ژەنیارەکانی تریش دەچنە سەر ئامێرەکانی فو ومسیەکانو لێدەرەکان، بەم جۆرە ئۆرکسترایە دەوترێت ئۆرکسترای سەمفۆنی، ئۆرکسترایەکیش ئەگەر لە ١٥ بۆ ٣٠ ژەنیار لەخۆ بگرێت، پێی دەوترێت ئۆرکسترای هۆڵەکان، لەبەر ئەوەی ژمارەی ژەنیارەکانی کەمنو دەتوانن لەهۆڵێکی بچوکدا بەرنامەی خۆیان پێشکەش بکەن.

ئۆرکسترای ژێداریش تەنیا لەژەنیارانی ئامێرە ژێدارەکان پێك دێت لەئۆرکسترای سەمفۆنیدا.

ئۆرکسترای سەمفۆنی هاوچەرخیش بەدرێژای سەدان ساڵ، تاقی کردنەوەو گۆڕان کاریو پێشکەوتنی زۆری بەسەردا هێنراوە، ئاواز دانەرو میوزیك دانەکانیش ڕۆڵی گەورەو گرنگیان لەپێشکەوتنی دا بینیوە.

یەکەم پێشەوای مەزن لەئاواز دانانی ئۆرکسترادا، "کلیۆدۆ مۆنیفێردی" ئیتاڵی بو کەلەنێوان ساڵانی ١٥٦٧و ١٦٤٣دا ژیاوە.

لەهەمان کاتدا یەکەمین ئاواز دانەری مەزنی ئۆپێراش بوە.

مۆنیڤێردی لەیەکێك لەکارەکانیا ٣٥ ژەنیاری کەمانچەو گیتارو ئۆرگو بوقو

شمشاڵی بەکار هێنا، کاتێك لەسەدەی حەڤدەهەمدا کەمانچە بەتەواوی جوانترین شێوەی خۆی وەرگرت، ئامێرە ژێدارەکان بون بەئامێری سەرەکی لەئۆرکسترادا.

ئاواز دانەری گەورەی فەرەنسی "ڕامۆ" ١٦٨٣-١٧٦٤ یەکەم کەس بو کەئامێری کلارنێتی لەئۆرکسترادا بەکار هێنا، دوای ئەوەش بوق بەشێوەیەکی ڕێكو پێك لەئۆرکسترادا بەکار هێنرا.

تیپە تورکیەکانیش کەبەئەورروپادا دەگەڕان، چەند ئامێرێکی لێدەری ڕۆژ هەڵاتیان وەکو دەهۆڵو سێ گۆشەو سەنجو هیتریشیان لەئۆرکسترادا بەکار هێنا.

### بۆچی هەندێك کەس جگەرە دەکێشن؟

ملیۆنەها کەس دەزانن جگەرەکێشان، چەند زیان بەخشو کوشندەیە، لەگەڵ ئەوەشدا سورن لەسەر کێشانیو بگرە بەردەوام خەڵکی تازەش هەن فێری جگەرە کێشان دەبن.

پسپۆڕانی بوارە جیاجیاکان دەڵێن: دەست پێ کردنی جگەرە کێشانو فێر بونی، دو شتن خەڵکی لێی تێ ناگەن، بەڵام دەتوانرێت ئاملژە بۆ چەند لایەنێکی تری بکرێت.

وەکو ئەو لایەنەی پەیوەندی هەیە، بەدەست پێ کردنی مرۆڤەوە بەجگەرە کێشان، یان ئەو لایەنەی کەفێری دەبێتو ناتوانێت وازی لێ بێنێت، کەئەمەش بۆ خۆی هەر واکارێکی ئاسان نیە مرۆڤ پەی بەفەلسەفەی ببات.

بۆ نمونە: ئێمە دەزانین ئەوانەی فێری جگەرە کێشان دەبن، چاو لەجگەرە کێشەکانی دەورو بەریان دەکەنو لاساییان دەکەنەوە.

ئایا دەزانن ٣٨٪ی پیاوانی سەروی ١٦ساڵو ١٣٪ی ژنانی سەروی ١٦ساڵ لەبەریتانیادا لەساڵی ١٩٨٢دا جگەرە کێش بونە؟

منداڵان واهەست دەکەن جگەرە کێشان، گەورەیان دەکاتو دەیانکاتە پیاو، منداڵانی تریش هەڵیان دەنێن بۆ جگەرە کێشان، چونکە سەیری باوکیان دەکەن جگەرە دەکێشن ئەوانیشس فێر دەبن.

کاریگەری جگەرە کێشان ئەوەی وادەکات وازی لێ نەهێنیت، ئەو ماددە نیکۆتینە بەهێزەیە کەتیایدایەو کار دەکاتە سەر دڵو کۆئەندامی هەرس.

كێشانى جگەرەيەك يان دو جگەرە، لێدانى دڵو فشارى خوێن زياد دەكات،بەڵام بەپێچەوانەوە "جيهازى عصبى" هێمن دەكاتەوە.

خەڵكيش بەهەر بيانويەك بێت خۆيان ڕازى دەكەن كەپێويستيان بەو نيكۆتينە كاريگەرە هەيە بۆ هێمن كردنەوەى جيهازى عصبى يان، بۆيە خوى پێوە دەگرنو بەردەوام لەكاتێكى ديارى كراودا جگەرە دەكێشن تاوايان لێدێت وردە وردە لەسەرى ڕادێنو ئيتر ناتوانن وازى لێ بێنن.

لەبەر ئەوەى هۆيەكانى جگەرە كێشان ئاڵۆزو جۆراو جۆرە، بۆيە هيچ ڕێگايەكى ديارى كراو نيە بۆ وازهێنان لەجگەرە كێشان، تەنيا يەك ڕێگا نەبێت ئەويش ئيرادەيەكى بەهێزە، ئەوانەش واجگەرە ناكێشن بەڕاستى كەسايەتيەكى بەهێزيان هەيە، بەمەرجێك بتوانن تاسەر، لەسەرى بەردەوام بن.

### كێ گرينلاندى دۆزيەوە؟

گرينلاند لەزمانى ئينگليزيدا واتە "سەر زەمينى سەوز" تەنيا شوێنێكيش لەجيهاندا سەوز نەبێت تەنيا "گرينلاندە".

زۆربەى سەر زەمينى گرينلاند بەچينێك بەفر داپۆشراوە كەئەستوريەكەى لەسێ هەزار مەتر زياترە، جگە لەچەند چڵە دارێكو ئەو گيانلەبەرانەى زۆر بەرگەى سەرما دەگرن، هيچ شتێكى تر ناتوانێت لەم شوێنەدا بژيت، لەبەر ئەوەى زستانەكەى زۆر ساردەو هاوينيشى كورتو سارديشە.

ئەو ڕوەى گرينلاند كەبەفر داينەپۆشيوە بەرداويەو بەشێوەيەكى پەراكەندەو لێرەو لەوێ قەوزە بەرچاو دەكەوێتو پارچەيەكى كەميشى گڵى ساغەو تيايدا ڕوەكو وردە ڕوەك ڕواوە.

كەواتە بۆچى ناوى سەر زەمينى سەوزيان لەو شوێنە ناسەوزە ناوە؟

تەنيا بۆ ئەوەى سەرنجى خەڵكى ڕابكێشرێت بۆيە ئەو ناوە خۆشەيان لێناوە.

لەساڵى ٩٨٢زاينى دا پياوێكى ئيسلاندى بەناوى "ئەريك تۆر ڤالدسۆن" لەئەنجامى تاوانى كوشتنێكدا، دور خرايەوە بۆ باشورى ڕۆژئاواى گرينلاندو، سێ ساڵ لەوێدا مايەوە.

لەماوەى دور خرانەوەيدا ئەريك گەلێك گەڕاو ناوچەكانى ڕۆژئاواى ئيسلاندا

کەدەریاوانە ئیسلاندیەکان باسیان کرد بو هەموی دۆزیەوە.

دوای تەواو بونی ماوەی دور خستنەوەی و گەڕانەوەی بۆ ئیسلاندا، باسی دۆزینەوەکانی خۆی کرد بۆ خەڵکی و خەڵکی هەڵنا کەکۆچ بکەن بۆ ئەو شوێنە لەبەر ئەوە ناوێکی سەرنج ڕاکێشی لێنا، کەئەویش گرینلاند بو. ژمارەی دانیشتوانی گرینلاند ئەمڕۆ کەنزیکەی شەست هەزار کەسێك دەبن، ئەم ژمارەیەش بەگوێرەی ڕوبەری گرینلاند ژمارەیەکی هەر زۆر کەمە، زۆربەشیان لەو ناوچانەدا دەژین کەبەفر داینە پۆشیوە، لەبەشی لێواری ڕۆژ ئاوای دورگەکەدا.

لەبەشی ڕۆژ هەڵاتیشی نزیکەی ٣٥٠٠کەسێك و لەبەشی باکوریشی تەنیا ١٠٠٠ کەسێك دەژین.

## ژمارەی ئاینەکانی جیهان

شەش خاڵی هاوبەش هەیە، لەنێوان زۆربەی ئاینەکانی جیهاندا کەبەم خاڵانە کورتیان دەکەینەوە:

- باوەڕ بون بەهێزێك کەلەمرۆڤ گەورەترە.
- مەزن ڕاگرتنی ئەو هێزە گەورەیەو لێ ترسانی و نوێژکردن بۆی و قوربانی دان لەپێناویدا.
- بونی داب و نەریتی ئاینی لەپەرستندا.
- بونی شوێنی پیرۆز، کەپەیوەندیان بەباوەڕو پەرستن و مێژوی پەرستنی ئاینیەوە هەیە.
- بونی هیوایەك لای مرۆڤ ئەگەر پابەند بو بەبیرو باوەڕێکی ئاینیەوە، لەدوای مردنی ژیانێکی ئاسودە تری دەست دەکەوێت.
- ڕەوشتێکی جوان و ڕاست بەگوێرەی ڕێنومایەکانی ئاین و باوەڕ بون بەوەی هەرکەس وابێت و شوێن کەوتوی ئەو ڕێگەیە بێت ڕەزامەندی خوای دەست دەکەوێت لەدوا ڕۆژدا.

بەڵام ئاینە سەرەتاییەکان کەمرۆڤ جنۆکەو گیانلەبەر دارو بەردیان پەرستوە، ئەوە بەشیرك و دوا کەوتوی دادەنرێت.

زۆر لەنەتەوە کۆنەکان ئاینەکانیان لەناو چون و فەوتاون وەکو میسریە

كۆنەكانو بابلیەكانو ئاشوریەكانو ئەغریقو ڕۆمانو نەتەوەكانی ئەسكەندەناڤی كۆنو.... هتر.

ئەمڕۆش گەلێك ئاینی زیندو هەیە لەدونیادا، كەگرنگترینیان سێ ئاینی یەكتا پەرستی: یەهودیو مەسیحیو ئیسلامە.

هەروەها هیندستانۆسیو بوزیو كۆنفۆ شیۆسیو تاوی شنتۆییو زەردەشتیش هەیە، كەژمارەی شوێن كەوتوانیان بەنزیكەی سێ ملیارد كەسێك مەزەندە دەكرێن.

شوێن كەوتوانی مەسیحیەت زیاتر لەیەك ملیارد كەسنو كەمتر لەملیاردێكیش باوەڕیان بەئاینی ئیسلام هێناوە، هیندستانۆسیش نیو ملیاردێك شوێن كەوتوی هەیە.

بوزیش نزیكەی چارەكە ملیاردێك، كۆنفۆشیش ١٥٨ ملیۆن، شنتۆش ٣٢ ملیۆنو تاویش ٢٠ ملیۆنو یەهودیش نزیكەی ١٧ ملیۆن.

مەسیحیەكان لەسەرانسەری جیهاندا هەن، بەڵام قورساییان لەئەوروپادایە، بەهەردو بەری ڕۆژ هەڵاتو ڕۆژ ئاوادا، هەروەها لەهەردو كیشوەری ئەمریكاو ئوستترالیاشدا دەبینرێن.

موسوڵمانەكانیش لەجیهاندا بڵاو بونەتەوە، بەڵام بەزۆری لەئاسیاو ئەفریقیادا گردن.

هیندستانۆسەكان لەهیندستاندان، بوزیەكانیش لەچینو ژاپۆنو هەردو كۆریادان، كۆنفۆشیش لەڕۆژهەڵاتی ئاسیاداو زەردەشتیەكانیش لەئێراندان.

تاویش یەكێكە لەسێ ئاینە سەرەكیەكەی وڵاتی چین شەنتۆش ئاینی میللی ژاپۆنە، كەگیانی پاڵەوانانو ئیمپراتۆرەكانو هێزی سروشت دەپەرستن، یەهودیەكانیش بەزۆری لەئەمریكاو ئیسرائیلدان.

### كێ ئەنسۆلینی دۆزیەوە؟

ئەنسۆلین بۆ چارەسەری شەكرە بەكار دێت، كاتێك مرۆڤ توشی ئەو نەخۆشیە دەبێت تێكچون لەلاشەیدا دروست دەبێت، ئەو ئەنسۆلینە بەرگری دەكاتو لەبەكار هێنانی نیشاستەو شەكر بۆ بەرهەم هێنانی وزە.

لەلەشی مرۆڤدا غودەیەکی گەورە هەیە ناوی پەنکریاسە، ماددەیەك دروست دەکات پێی دەڵێن ئەنسۆلین، کەلەش پێویستی پێیەتی بۆ سوتاندنی نیشاستەو شەکر لەلەشدا.

ئەو لاشانەی کەتوشی شەکرە دەبن یان ڕێژەیەکی تەواو لەئەنسۆلین دروست ناکەن یان ئەو ئەنسۆلینەی دروستی دەکات، بەکاری ناهێنێت.

ئەگەر نەخۆشی شەکرە بەبێ چارەسەر بمێنێتەوە ئەوا نەخۆشەکە، هەست بەتینویەتیەکی زۆر دەکات‌و کێشی کەم دەبێتەوەو لاواز دەبێت، دەشێت ئەنجامی نەخۆشیەکە بێ هۆشی‌و مردن بێت.

دوای ئەوەی کەئەنسۆلین دروست کرا، ئەبێت ئەو موزاعە فاتانە لەئێستادا لەهیچ کەسێکدا ڕو نەدات، ئەگەر نەخشی بەشەکرە توشبو ڕۆژانە ئەو ئەنسۆلینە دەست کردە وەر بگرێت.

نەخۆش دەتوانێت بەهۆی لێدانی ئەنسۆلین بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ژیانێکی ئاسایی بژیت، زانایان لەکۆندا زانیویانە کەئەنسۆلینی دەست کرد چارە سەرە بۆ توش بوانی نەخۆشی شەکرە، بەڵام کێشەیان ئەوە بو نەیان دەزانی چۆن ئەو ئەنسۆلینە لەلاشەی گیاندارێکی ساخ دەربهێنن.

پزیشك‌و زانای کەنەدی "فرەدریك گرانت بانتینگ" لەدایك بوی ساڵی ١٨٩١، لەئێوارەی یەکێك لەڕۆژەکاندا، کەخەریکی ئامادە کردنی وانەیەك بو لەسەر پەنکریاس، کوت‌و پڕ هەستی کرد کەدەتوانێت ئەو ئەنسۆلینە لەلاشەی گیاندارێك دەربهێنێت.

بۆیە چو بۆ زانکۆی تۆرنتۆو دوای لەبەڕێوبەری، تاقیگە گەورەکەی زانکۆ کرد، یارمەتی بدات بۆ ئەنجامدانی بیرۆکەکەی.

بەڕێوبەریش کەناوی "پرۆفیسۆر جۆن هاکلۆد" بو، ڕێگەی دا بۆ ماوەی چەند حەفتەیەك هەرچی کەل‌و پەلی تاقیگەکەیە بەکار بهێنێت.

لەمانگی ئاياری ١٩٢١ دا بەیارمەتی پزیشکێکی گەنج بەناوی "شارلز بێست" فەردەریك دەستی بەتاقی کردنەوەکانی کرد.

هەردوکیان شەو ڕۆژ بێ پسان ئیشیان کرد، تالەماوەی چەند حەفتەیەکدا توانیان یەکەمین ئەنسۆلین لەپەنکریاسی سەگێك دەربهێنن.

لەمانگی کانونی دوەمی ١٩٢٢دا، دوای تاقی کردنەوەیەکی زۆر، توانیان ئەو ئەنسۆلینە دەرهێنراوە، بدەن لەمنداڵێك کەتوشی نەخۆشی شەکرە هاتبوو خەریك بو

دەمرد، بەلێدانی ئەنسۆلینەکە هەر زو تەندروستی باش بو، نەخۆشەکانی تریش کەئەو دەرزیەیان لێدەدرا چاك دەبونەوە، بەوەش هەنگاوێکی گرنگ لەجیهانی پزیشکیدا نرا.

### سەربازان بۆ سەلاو دەگرنەوە؟

سەلاو چییە؟ نیشانەی ڕێز لێنانە، لەکەسێکی پلە بەرزتر، بەلام لەڕوە ڕەسمیەکەیەوە وای لێکرا لەهەر کاتێکدا بەشێوەیەك سەلاو بکرێت.

سەلاو بەهەمو جۆرەکانیەوە، لەهەمو سەردەمەکانی مێژودا هەبوە، بەلام شێوازی سەلاو کردنەکان جیاواز بوە.

لەهەندێك شوێندا سەلاوکردن بەخۆ نوشتاننەوەوە بوە، لەهەندێك کاتیشدا ئەژنۆیان خستۆتە سەر زەوی‌و لەم سەردەمەی خۆمانیشدا دەست بەرز دەکرێتەوە.

سەلاوی سەربازی کەسەربازان دەیگرنەوە، بەبەرز کردنەوەی دەستی ڕاستیان بۆلای توێلیان یان کەناری کلاوەکانیان، داهێنانێکی نوێیە لەمێژودا.

تاپێش سەدەی هەژدەهەم کلاو لەسەر داگرتن سەلاوی سەربازی بوە.

لەڕاستیدا هێشتا زۆر لەخەلکانی شارستانی هەر ئەو سەلاوە دەکەن وەکو هێمایەکی ڕێز لێنان.

دەشێت ئەم دابونەریتەش بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی کەئەسپ سوارەکان پێشەوەی کلاوەکانیان بەرز دەکردەوە، یان سەریان ڕوت دەکرد لەبەرامبەر گەورەکانیاندا.

دەست بەرز کردنەوە لەجیاتی کلاو لەسەر داگرتن لەسلاو کردندا، بەهۆی چەند ڕوداوێکی پراکتیکی یەوە بوە، زۆر جار ئەو کرێکارو پیشەوەرانەی ئیشیان دەکرد ناچار دەبون بۆ سلاوکردن، کلاوەکانیان لەسەر دابگرن، ئەمەش وای دەکرد دەستە پیسەکانیان، کلاوەکانیان پیس بکات.

لەبەر ئەوە لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا سەلاوکردن لەکلاو داگرتنەوە گۆڕدرا بۆ دەست بەرز کردنەوە.

ئەو ئەفسەرو سەربازانەی کەشمشێریان لەشاندایە، ئەگەر سواربن یان پیادە، بەبەرزکردنەوەی شمشێرەکانیان بۆلای دەم‌و ئەمجا بۆلای ڕاست‌و دواجار بۆ

خوارەوە سەلاو دەکەن.

مێژوی ئەم جۆرە سلاوەش دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی ناوەڕاست، کاتێك سوارەکان بەنەریتێکی ئاینی، مشتی شمشێرەکانیان دەگرت و نوکەکانیان بۆ سەرەوە بەرز دەکردەوە، وەکو هێمایەك بۆ خاچ، ئەم کردەوەیەش لەو کاتەدا جۆرێك بوە لەسوێند خواردن.

## یەکەمین ئامێری جل شتن

یەکەمین ئامێری جل شتن لەسالی ١٨٥٨داو لەلایەن "هامیلتۆن سمیسە"وە دروست کرا، لەشاری بیتسبورگی ویلایەتی بنسلیڤانیای ئەمریکا، ئامێرەکە بەهۆی سوڕدانی هەندڵێکەوە کەبەدەست بادەدرا، سوڕی دەخواردو جلەکانی لەناوەوە دەشوشت.

بەلام ئەم ئامێری جل شۆرە زۆر سەرکەوتو نەبو، چونکە بەزۆری جل و بەرگەکان تیایدا یان لەسەریەك کەڵەك دەبون، یان دەدڕان.

بەم جۆرە خەڵکی چاوەڕوانیان کرد تالەساڵی ١٩٠٧دا، یەکەمین ئامێری جل شۆری ئوتوماتیکی دروست کرا، تاگەیشتە ساڵی ١٩١٢ هەمو ئامێرە جل شۆرەکان بەکارەبا دەخرانە گەڕ.

حەوزی ئامێری جل شۆرەکان لەسەرەتادا لەتەختە دار دروست دەکران، دوای ئەوە وردە گۆڕان بۆ مس و پۆلاو ئەلەمنیۆم و توتیا.

لەساڵی ١٩٦١ دا سەرجەم حەوزی ئامێرە جل شۆرەکان گۆڕان بۆ پلاسکۆ، لەبەر ئەوە پلاسکۆ بەرگریەکی بەهێزی هەیە لەبەرامبەر تایت و پلەی گەرمادا.

یەکەمین ئامێری جل شوشتن کەبە دو دیودا جلەکانی سوڕ دابێت لەساڵی ١٩٢٢دا دروست کرا، بەلام ئامێرێکی جل شتن کەئوتوماتیك ئیشی کردبێت و لەهیچ ڕویەکەوە ناتەواوی نەبوبێت لەساڵی ١٩٣٧دا دروست کراوە.

یەکەمین جاریش بەشی وشك کردنەوە لەناو ئامێری جل شوشتن دا لەساڵی ١٩٥٣دا دروست کراوە.

## ناپليۆن كێ بوو؟

پياوانى مێژوو، كەسيان وەكو ناپليۆن شوێن پەنجەيان بەسەر مێژوى جيهانەوە بەجێ نەهێشتووە، ناپليۆن لە١٥ ئابى ١٧٦٩، لەئەجاكسيوى دورگەى كۆرسيكا لەدايك بوە، لەمنداڵيدا خۆى دەشوبهاندە ئەو پياوە كۆنانەى هێزو ئەوانەى شتى لەسەر خوێندبونەوەو ناوبانگيان هەبو، بەتايبەتى كاتێك لەتەمەنى شازدە ساڵيدا ئەكاديمياى سەربازى پاريسى تەواو كرد.

كەگەيشتە تەمەنى ٢٤ساڵى كرايە سەر لەشكر، بۆ سەندنەوەى شارى تۆڵون لەدەستى بەريتانيەكان، دواى سەركەوتنى لەو جەنگەدا، سەركردايەتى سوپاى فەرەنساى كرد بۆ سەركەوتن بەسەر نەمسادا، دواى ئەوە ناپليۆن بو بەحاكمى گشتى فەرەنساو دەستى دايە چاكسازى لەهەمو دەزگاكانى دەوڵەتدا.

لەساڵى ١٨٠٤ ناپليۆن خۆى بەئيمپراتۆر لەسەر فەرەنسا ڕاگەياند، لەدەساڵى يەكەمى ئيمپراتۆريەتەكەى فەرەنسا لەشەرێكى نيمچە بەردەوامدا بو، لەگەڵ ئەوەشدا توانى بەسەركەوتنەكانى ئەوروپاو ئيسپانيا داگير بكاتو بەرەو سنورەكانى ڕوسياش پێش ڕەوى بكات.

لەساڵى ١٨١٢دا ناپليۆن بڕيارى دا ڕوسيا داگير بكات، بەسوپايەك كەلەشەش سەد هەزار سەرباز زياتر دەبو، لەگەڵ ئەوەى سوپاكە گەيشتبونە مۆسكۆ، بەڵام لەبەر بێ تواناييو نەگەيشتنى كۆمەكو ماندوبونو سەرماو سۆڵە، ناچار بون پاشە كشە بكەن.

لەڕێگەى گەڕانەوە دا هەمو سوپاكە فەوتانو تەنيا نزيكەى ١٠٠هەزار كەسێكيان بەسەلامەت گەيشتنەوە وڵات.

دواى ئەوە ناپليۆن چەند شكستێكى ترى هێنا، ناچار لەسەر كورسى حوكم دابەزىو دور خرايەوە بۆ دورگەى "ئيلبا"، بەڵام لەتاراوگەكەى هەڵاتو گەڕايەوە فەرەنساو سوپايەكى نوێى كۆكردەوەو كەوتە جەنگين، بەڵام ئەمجارەش لەجەنگى "واتەرلۆ" دا شكستى هێنا لەبەرامبەر سوپاىو لينگتۆنو بلۆتشردا، لەساڵى ١٨١٥. لەم شكستە دا ناپليۆن ناچار خۆى دايە دەستى بەريتانياوەو ئەوانيش وەكو زيندانيەك ناردیانە دورگەى "سانت هيلينا"و لەوێدا مايەوە تاڕۆژى مردنى

له ٥ئایاری ١٨٢١ دا.

ناپلیۆن سەرکردایەتی فەرەنسای کرد بۆ مەزنی و هێزێکی نوێ، بەڵام دەشبێ بوترێت هۆی سەرەکی بو لەدروست کردنی ئازارو مەینەتی و وێران کردنی ژیانی نەتەوەکەیدا.

جلی ڕەش لەپرسەدا!

خەڵکی لەوڵاتی چین و ژاپۆندا، لەمەراسیمی پرسەدا سەرتاپا جلی سپی دەپۆشن، لەهەندێك لەشوێنەکانی ئەفریقاشدا بومیەکان لەکاتی پرسەدا جلی سور لەبەر دەکەن.

ئێمەش کەلەپرسەدا جلی ڕەش لەبەر دەکەین، دەگەڕێتەوە بۆ داب و نەریتی ئێمە، ئەوەش باشترین ڕێگەیە، کەبتوانێت غەم و پەژارەی خۆمانی پێ دەربڕین، کاتێك کەسێك دەبینین لەپرسەیەکدا جلی ڕەشی لەبەر کردوە، یەکسەر بەغەمبارو دڵ تەنگ دێتە پێش چاومان.

بۆیە شتێکی سروشتیە کەئێمە جلی ڕەش پۆشین تایبەت بەپرسە بزانین، ئایا تائێستا بیرتان لەوە کردۆتەوەو پرسیوتانە بۆچی لەپرسەدا جلی ڕەش لەبەر دەکرێت؟

ئەڵبەت جلی ڕەش پۆشین نیشانەی خۆشەویستی و ڕێز گرتنە لەکەسێك کەکۆچی دوایی کردوە، بەڵام لێکۆڵەرەوان لەکاتی لێکۆڵینەوە دەربارەی فەلسەفەی ئەم جل و بەرگە گەیشتنە چەند وەڵامێکی سەیرو سەرنج ڕاکێش.

کاتێك لەپرسەدا جلی ڕەش دەپۆشین لەگەڵ جل و بەرگی ڕۆژانەماندا جیاوازی هەیە، بەواتایەکی تر، لەبەرکردنی جلی ڕەش جۆرێکە لەقیافەت و خۆگۆڕین.

پێشنیانی ئێمە بڕوایان وابوە، دەبێت لەپرسەدا قیافەتی خۆت بگۆڕیت، ئەگەر خۆت نەگۆڕیت، ئەوا گیانی مردوەکە دەگەڕێتەوەو پەیدات دەکات و دەت دۆزێتەوەو لەگەڵ خۆیدا توش دەبات و دەتمرێنێت. "ئەلبەت ئەم بۆ چونە ئەمڕۆ کاری پێ ناکرێت، هەرچەندە لەهەندێك شوێنی دونیادا هەر ماوە".

لەنێوان هۆزە گەڕۆکەکاندا، لەکاتی مردنی پیاوێکدا ژنەکەی و خزمەکانی جلەکانیان دەگۆڕن و هەندێك جاریش لاشەیان بەگوڵ دادەپۆشن یان لەژێر

گژوگیاو پەردەو چادردا خۆیان حەشار دەدەن.

بەڵام دەشێت لەبەرکردنی جلو بەرگی ڕەش لەکاتی پرسەدا بەپلەی یەکەم بگەڕێتەوە بۆ هەمان ترس‌و واهیمە لەگیانی مردوان.

### یەکەمین هێزی پۆلیس؟

سەرەتای پەیدابونی پۆلیس دەگەڕیچتەوە بۆ مێژوی خودی مرۆڤایەتی، کاتێك سەرۆك هۆزێك یان سەرکردەی کۆمەڵێك لەچەرخی سەرەتایی دا، کەپشتی بەجەنگاوەرانی دەبەست بۆ پارێزگاری ئاسایش‌و ڕێساکانی ڕەوشت ئەوە بۆ خۆی جۆرێك بوە لەهێزی پۆلیس.

فیرعەونیەکانی میسریش سەربازەکانیان وەکو پۆلیس بەکار هێناوە.

لەسەردەمی پێغەمبەر عیسا سلاوی خوای لێبێت، قەیسەری ڕۆمانی "ئاگۆستۆس" هێزێکی پۆلیسی لەشاری ڕۆمادا دروست کرد، کەبۆ ماوەی سێسەدو پەنجا ساڵ دوای خۆی بەردەوام بو، بەڵام ئیش‌و کاری ئەم هێزە، تەنیا جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی قەیسەر بو هیچی تر.

لەنێوان ساڵانی ٧٠٠و ٨٠٠ی دوای زایندا، بیرۆکەیەکی نوێ سەبارەت بەڕۆڵی هێزی پۆلیس دروست بو، لەجیاتی ئەوەی پۆلیس هێزێك بێت بەدەستی پادشاوە لەدژی گەلەکەی، وای لێکرا هێزە پۆلیس دەزگایەك بێت، بۆ جێبەجێ کردنی یاساو پاراستنی گەل، هەر ئەم بیرۆکەیەش بو هێزی پۆلیسی لەبەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتوەکاندا پێش خست.

ئینگلیزەکان سیستەمی "چاودێری"و "پاسەوانیان" دامەزراند، "چاودێرەکان ئێشکگری شەوان بون"و پاسەوانەکانیش هی ڕۆژ.

ئینگلیزەکان ئەم یاسایەیان بردە ویلایەتە یەکگرتوەکانەوەو، ئێشکگری شەوانەیان دەدایە ئەو پۆلیسانەی، لەش ساغ بون‌و تەمەنیان لەشازدە ساڵ زیاتر بو.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ئەم یاسایە لەزۆربەی شارەکانی بەریتانیاو ئەمریکادا پەیڕەو کرا.

## کام وڵات یەکەمجار ئاڵای بەرزکردەوە؟



لەگەڵ ئەوەدا لەدێر زەمانەوە ئاڵا هەبووە، بەڵام تەنیا لەجەنگەکاندا بەکار هێنراوە بۆ ئەوەی نیشانەیەك بێت بۆ شوێنی سەرکردەکان.

بیرۆکەی ئەوەی کەهەر وڵاتێك ئاڵایەکی تایبەت بەخۆی هەبێت، بیرۆکەیەکی تازەیە، یەکەمین ئاڵای لەپەڕۆ دروست کراویش لەداهێنانی ڕۆمانیەکان بوە، کەبریتی بوە لەئاڵایەکی چوار گۆشە بەنوکی نەیزەیەکەوە.

کاتێك ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئاڵایەکی تایبەت بەخۆی دروست کرد، زۆربەی وڵاتانی ئەمریکا لەکاتی جەنگدا ئاڵای پاشاکانیان بەرز دەکردەوە.

فەرەنسیەکانیش هێشتا ئاڵای سێ ڕەنگی بنەماڵەی بوربونیان هەڵدەدا، ئاڵای نیشتمانی بەریتانیاش ئاڵاکەی سانت جۆرج بو، بەڵام ئاڵای یەکگرتوی بەریتانیا لەڕۆژی یەکی کانونی دوەمی ساڵی ١٨٠١ دا ڕاگەیەنرا.

ڕەنگە کۆنترین دو ئاڵای نیشتمانی ئاڵای دانیمارك ١٢١٩و ئاڵای سویسرا ١٣٣٩ بوبێت، دوای ئەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکان ئاڵایەکی تایبەت بەخۆی هەڵبژارد، زۆر لەوڵاتانی تری جیهان چاویان لێکرد، دوای شۆڕشی فەرەنساش ئاڵایەکی سێڕەنگ هەڵبژێردرا، بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی فەرەنسا بکات.

بەڵام ئاڵایەك بەڕەنگەکانی سەوزو سپیو سور بۆ یەکەمین جار ئیتالیەکان لەساڵی ١٨٠٥دا هەڵیان بژارد.

## تاج محل بۆچی بیناکرا؟

لەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەمی زاینیدا ئیمپراتۆری مەغۆلی شاه جیهان، فەرمان ڕەوایی هیندستانی دەکرد.

لەساڵی ١٦٢١ دا ئیمپراتۆر شازادەیەکی ناسكو جوانو زیرەکی کردە هاوسەریو خۆی بەناوی "ئەرجومەند بانو" شاه جیهان بێ ئەندازە خێزانەکەی

خۆش دەویست و نازناوی "ممتاز محل"ی لێنا.

یەکێك لەئەفسانەکان دەڵێت: گوایە ئەو بینایەی "تاج" ئەرجومەند لەخەودا بینیویەتی و بۆ شاە جیهان گێڕاوەتەوەو حەزی کردوە یادگارێکی لەو شێوەیەی بۆ دروست کات، وەکو نیشانەیەك بۆ خۆشەویستی نێوانیان.

لەساڵی ١٦٣١ ممتاز لەشاری بورهانپور بەسەر منداڵەوە کۆچی دوایی کرد، دوای مردنی ئیمپراتۆر دڵشکاو بو بەجۆریك بیری کردەوە واز لەکورسیەکەی بێنێت.

بەڵام لەکۆتایدا پاشگەز بوەوەو بڕیاری دا بۆ نەمری ئەو خۆشەویستیە بینایەکی وای بۆ دروست بکات لەجیهاندا تاك بێت.

بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستەکەی ئیمپراتۆر بانگێشتی هەندێك لەباشترین هونەرمەندان و بیناسازانی کرد لەهیندو ئێران و ئاسیای ناوەندو عێراق و تورکیاوە.

دوای ئەوە نەخشە سازی تەواوی بۆ کرا، لەساڵی ١٦٣٢ دەست کرا بەبینا کردنی تاج محل، کەنزیکەی بیست ساڵی خایاندو زیاتر لەبیست هەزار کرێکار ئیشیان تێدا کردو بڕی ٤٠ملیۆن ڕوپیەی ئەو سەردەمەی تێچو.

شێوەی بینای تاج محل لاکێشەییەو درێژیەکەی ٥٨٠ مەترەو پانیەکەشی ٣٠٤ مەترە، لەبنەوە لەسەر قوللەی مەڕمەڕ دروست کراوە بەپانتایی ٩٤ مەتری دوجا، بەرزیەکەشی حەوت مەترە.

لەهەر چوار گۆشەکەیەوە چوار منارەی لێیە بۆ بانگ دان، بەرزی تاجەکەشی ٦٠مەترە، شێوەی تاجەکە هەشت گۆشەیەو بەمەڕ مەڕی سپی هەڵکۆڵراوەو نەخشێنراوە، دوانزە جۆر بەردی بەنرخیشی تیایە کەلەشێوەی گوڵ دروست کراون، هەروەها بەچەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز نەخشێنراوە.

کەرەستەی بیناکە لەزۆر شوێنی جیهانەوە هێنراون وەکو دورگەی عەرەب و میسرو تبت و ناوچە جۆراو جۆرەکانی هیندستان.

گۆڕی هەردو ئەرجومەندو شاە جیهان دەکەونە بەشی ژێرەوەی بیناکەوەو بەبەردی گران بەها هەڵواسراون.

### درۆی نیسان

هەندێك دابونەریت هەن، كە مرۆڤەكان لەدێر زەمانەوە لەسەری دەچن، هۆی دروست بونی ئەو داب‌و نەریتانەش تاڕادەیەكی زۆر تائێستا نەزانراوە.

ڕۆژی یەكی نیسان ڕۆژێكە، كەلەم ڕوەوە گرنگیەكی تایبەتی هەیەو بەڕۆژی "درۆی سپی" دەناسرێت لەسەرانسەری جیهاندا.

لەم ڕۆژەدا خەڵكی بەنوكتەو میوانداری كردنی درۆو فێڵ لەیەكتر كردن‌و یەكتر گۆڵ دان ڕۆژ دەبەنە سەر.

ئایا دەزانیت بۆچی یەكی نیسان ڕۆژی درۆی نیسانە؟

مێژوی ئەم درۆیە دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی ١٥٦٤، لەبەر ئەوەی لەسەرانسەری ئەوروپادا، ڕۆژ ژمێرێك هەبو یەكی نیسانی بەسەری ساڵ دادەنا، بۆیە خەڵكی لەو ڕۆژەدا جەژنیان دەگێڕا.

لەساڵی ١٥٦٤ شارلزی دەیەم پادشای فەرەنسا فەرمانی دا، كەڕۆژی یەكەمی كانونی دوەم بكرێتە سەری ساڵ، هەندێك خەڵكی ڕكن ئەوەیان ڕەد كردەوەو لەسەر ئاهەنگ گێڕانی خۆیان لەیەكی نیساندا بەردەوام بون، بۆیە بونە قوربانی گاڵتەو نوكتەو فێڵ لێكردنی هاوڕێ‌و دراوسێكانیان.

هاوڕێ‌و دراوسێكانیان دیاری درۆینەیان بۆ دەناردن‌و بانگهێشتی ئاهەنگێك یان دەكردن كەبونی نەبو، بەمجۆرە ئەو ڕۆژە بو بەڕۆژی درۆی سپی.

### هیمۆگلۆبین چیە؟

زۆربەی خانەكان لەخوێندا تەنۆكەی سور یان خڕۆكەن، ملیۆنەها ملیۆن خانەی سور بەردەوام بەناو دەمارەكانی خوێندا هات‌و چۆ دەكەن.

ئەو خڕۆكە سورانە پڕۆتینێكی تیایە پێی دەڵێن "هیمۆگلۆبین" هیمۆگلۆبینیش ماددەی ئاسنی تێدایە.

خوێنی مرۆڤ بۆیە سورە، لەئەنجامی یەكگرتنی هیمۆگلۆبین‌و ئۆكسجینەوەیە، بەڵام هیمۆگلۆبین فەرمانی زۆر لەوە گرنگتری لەسەرە كەسوری بداتە ڕەنگی خوێن، هیمۆگلۆبین توانای هەیە بەشێوەیەكی وەها لەگەڵ ئۆكسجیندا یەك

بگرێت و ئەوەش وادەكات خڕۆكە سورەكان ئۆكسجين بدەنە خانەكانى لەش.

ئۆكسجين بەشێكە لەو هەوايەى هەڵى دەمژين و دەچێتە سيەكانەوە، لەبەر ئەوەى خڕۆكە سورەكانيش لەڕێگەى سيەكانەوە بەناو خوێندا دەچن، لەماوەى چونى خڕۆكە سورەكان بەناو دەمارەكانى لەشدا هيمۆگلۆبينەكە ئۆكسجينەكە وەردەگرێت و دەيداتە خانەكانى لەش.

كاتێك ئۆكسجين بەناو خانەكانى لەشدا ڕێدەكات، هيمۆگلۆبين دوەم ئۆكسدى كاربۆن لەخانەكان وەردەگرێت.

ئەم گازە پاشماوەيەش كاتێك دروست دەبێت، كەخانەكان خۆراك دەسوتێنن و خڕۆكە سورەكان دەگەڕێنەوە بۆ سيەكان و دوەم ئۆكسيدى كاربۆنيان لەگەڵ خۆياندا هەڵگرتوە.

ئاليرەدا كردارى ئاڵوگۆڕ دروست دەبێت، چونكە لەش لەدوەم ئۆكسيدى كاربۆن ڕزگار دەبێت و ئۆكسجين وەردەگرێت.

دواى ئەوە خڕۆكە سورەكان بەڕێگەى خۆياندا دەگەڕێنەوەو ئۆكسجين بۆ خانەكانى سەرانسەرى لەش دەبەن.

هۆى ئەوەيە، ئەو خۆراكانەى كەماددەى ئاسنيان تێدايە زۆر گرنگن بۆ لەش، چونكە ئاسن بەرهەمى خانەكانى خڕۆكە سورەكان زياد دەكات و ڕێژەى هيمۆگلۆبينيش لەخانەكاندا زياتر دەبێت.

### تاڤگەكانى نياگارا

تاڤگەكانى نياگارا، دەكەوێتە سەر ڕوبارى نياگارا، لەدورى ٢٥كيلۆمەترى باكورى ڕۆژئاواى بوڤالۆى نيۆ يۆركەوە.

ڕوبارى نياگارا لەدەرياى "ئيرى" يەوە سەرچاوەى دەگرێت، بەچوار دەرياى مەزندا تێدەپەڕێت تادەرياى ئۆنتاريۆ، لەنيوەى ڕێگەكەيدا كە ٥٨ كيلۆمەتر دەبێت زۆر بەخێرايى بەسەر بەردێكى زۆر بەرزدا دەچێت، كەتاڤگەكانى نياگارا پێك دەهێنێت.

تاڤگەكانى نياگارا لەدو تاڤگە پێك دێت كەتاڤگەى كەنەدى و تاڤگەى ئەمريكى يە، نزيكەى ٩٤ لەسەدى تاڤگەى نياگارا، واتە ٣١٧ مليۆن ليتر ئاو لەخولەكێكدا

لەتاڤگەی کەنەدیەوە، دێتە خوارەوە.

جیلۆجیەکان تاڤگەکانی نیاگارا بە "گەنج" دەزانن‌و دەڵێن تەمەنی دروست بونی لەنێوان دەبۆ پانزە هەزار ساڵدایە.

لەچاخی بەفریندا، ڕوبارە بەفراویەکان هەمو ئەو شوێنانەی ئێستا پێی دەڵێن ناوچەی نیاگارا داپۆشیبو.

لەگەڵ توانەوەی بەفرەکاندا دەریای "ئیری" دروست بو، ئاوەکەش بەرەو باکور بەڕێکەوت‌و بو بەڕوبار.

کاتێك بەرەو باکور بەڕێکەوت، بەناو بەردێکدا ڕۆیشت کەبەچینێکی سەخت لەبەردی قسلْ داپۆشرا بو، بەوەش تاڤگەکانی نیاگارا دروست بو.

یەکەمین بابەت لەسەر تاڤگەکانی نیاگارا، لەساڵی ١٦٩٧و لەسەر دەستی دۆزەرەوەی فەرەنسی لویس هینیبین دا نوسراو بڵاو کرایەوە.

لەساڵی ١٦٧٨دا لویس لەکاتی گەراندا ئەو جیهانە تازەیەی دۆزیەوە کەئێستا پێی دەڵێن تاڤگەکانی نیاگارا.

### کێ یەکەم ئینسکلۆپیدیای دانا؟

ئێمە بۆ دەست خستنی هەر زانیاریەك دەگەڕێینەوە بۆ فەرهەنگ‌و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت چاوەڕوانی ئەوە دەکەین لەو فەرهەنگەدا هەموو جۆرە زانیاریەك دەست بکەوێت.

وشەی دائیرە تولمە عاریف وشەیەکی یونانی کۆنە بەواتای "دائیە تولمە عاریفی تەواو" دێت.

بۆ یەکەمجار تۆماس ئیلیۆت لەساڵی ١٥٣٨ یەکەمین دائیرە تولمە عاریفی نوسی‌و بەوە پێناسەی کرد کە "کتێبێکە هەموو زانست‌و لێکۆڵینەوەیەکی لیبرالی لەخۆ دەگرێت"، ئەمڕۆ دائیرە تولمە عاریف بەپێی پیتی ئەبجەدی ڕێکدەخرێت، بۆ ئەوەی گەڕان بەدوای بابەتەکانیدا ئاسان بێت.

بەڵام لەسەرەتادا هەرچۆنێك دانەر ئارەزوی لێبوایە وای دادەنا، دائیرە تولمە عارفێك کەزۆرترین بابەتی لەخۆ گرتبێت، ئەو دائیە تولمە عاریفە بو کەپلینی ڕۆمانی لەسەدەی یەکەمی زاینی دایناو بریتی بو لە ٣٧ بەرگ‌و ٢٠هەزار ماددەی

لەخۆ دەگرت، کەلە ٤٥٠ سەرچاوەوە وەری گرتبو.

ئەم کتێبەش شتێکی دانسقە بو تاسالّی ١٥٣٦ تەنیا ٤٣ دانەی لیّ چاپکرا.

بەلاّم گەورەترین دائیرە تولمە عاریف دائیرە تولمە عاریفی سێیەمی چینی یە، کەئیمپراتۆری چین لەسالّی ١٧٢١ دا فەرمانی دا کۆبکرێتەوەو بنوسرێتەوە، کەبریتیە لە "٥٠٢٠" بەرگ.

کەشیشێکی مەسیحی بەریتانی بەناوی "هوجۆن هاریس" بۆ یەکەمین جار دائیرە تولمە عاریفی بەگوێرەی پیتە ئەبجەدیەکان داناو لەسالّی ١٧٠٤ دا بلاّوی کردەوەو ناوی لێنا "فەرهەنگی ئینگلیزی جیهانی بۆ هونەرو زانستەکان".

### کەی سرودی نیشتمانی پەیدا بو؟

سرودی نیشتمانی ئەو گۆرانیە نیشتمانیەیە، کەلەبۆنە نیشتمانیەکاندا، دەگوترێت یان دەژەنرێت، بۆ رێزگرتن لەو ولاّتە.

سرودو گۆرانیە نیشتمانیەکان گەل لەهیواو نمونە بەرزەکان یەك دەخات، بنەمای زۆر لەسرودە نیشتمانیەکان نەناسراوە، زۆرجار کەسێك هۆنراوەیەکی بۆ گۆرانیەکی میللی داناوەو دوای کراوەتە سرودێکی نیشتمانی.

زۆر دەگمەن بوە هۆنراوەیەکی تایبەتی بۆ سرودی نیشتمانی نوسرابێت وەکو سرودی نیشتمانی ئەلّمانیاکە "فرنتز جۆزیف هایدن" لەبنەرِتدا بۆ نەمسا داینا.

چەندین سرودی نیشتمانی هەن بەئاوازی کۆن وتراوە، بەلاّم بەهۆنراوەی نویّ، تەنانەت جەنگاوەرەکان بۆ بەرزکردنەوەی گیانی جەنگین و حەماسەتیان، لەکاتی جەنگ و بەرەنگار بونەوەدا وتویانە.

هەریەك لەدانیمارك و روسیا سویسراو هەمو ولاّتە ئینگلیزی زمانەکان، سرودە نیشتمانیەکەیان لەبەریتانیاوە وەرگرتوە "خوا شازادەمان بۆ بپارێزێت" ئەمریکاش سرودی "ئەمریکا" بەهەمان ئاواز دەلّێن.

سرودی "خوا شازادەمان بپارێزێت" بۆ یەکەمین جار لەسالّی ١٦١٩دا، وەکو پارچە مۆسیقایەك بلاّو کرایەوە، لەلایەن میوزیك زانی ئینگلیزی "جۆن پۆل"، لە ٢٨ ئەیلولی ١٧٤٥ کرایە سرودی نیشتمانی بەریتانیا.

سرودی نیشتمانی ئەمریکاش لەکاتی جەنگی ناوخۆ لەسالّی ١٨١٢دا نوسرا.

پارێزەرێكی ئەمریكی خەڵكی بەلتیمۆر بەناوی "فەرەنسیس سكوت كی" لەسەر كەشتیەكە بەدرێژایی شەو چاودێری ئەو هێرشەی دەكرد كەكرایە سەر قەڵای "فورت ماكهنری"و بەیانی كاتێك سەیری كرد، هێشتا ئاڵای ئەمریكا، بەسەر قەڵاكەوە دەشەكێتەوە.

سۆزی جوڵاو، وشەكانی سرودی نیشتمانی لەسەر ئەو پاكەتەی بەدەستیەوە بو نوسیو لەسەر ئاوازی سرودی نیشتمانی بەریتانیا كەلەمێشكیدا بو وتی.

بەڵام سرودی نیشتمانی فەرەنسا "مارسیلیزێ" لەبنەڕەتدا گۆرانیەكی جەنگی بو لەشۆڕشی فەرەنسا "١٧٨٩-١٨١٥" دەوترا.

ئاوازو وشەكانیشی هی ئەفسەرێكی فەرەنسی بو بەناوی "جۆزیف ڕۆجێ دۆلیس" بەڕەسمیش لەتەموزی ١٧٩٥دا، بەسرودی نیشتمانی فەرەنسا ڕاگەیەنرا.

### بازاڕی بازرگانی چۆن دروست بو؟

لەكۆندا خەڵكی دەشتەكی بونو بازاڕیان نەبو، لەبەر ئەوەی كۆمەڵگای بچوكی جوتیاران لەیەكەوە دور بون، ئەو كاڵایانەش بەرهەمیان دەهێنا، بەشی خۆیانی نەدەكرد، چ جای كڕینو فرۆشتن.

دوای ئەوە مرۆڤایەتی پێشكەوت، خەڵكی لەبۆنە ئاینیەكاندا كۆ دەبونەوەو بازرگانەكانیش چاوەڕێی ئەو بۆنانەیان دەكرد، تاكاڵاكانیان تیایدا بفرۆشن، بەم جۆرە لەسەردەمی كۆندا بازاڕ دروست بو.

لەڕاستیدا وشەی "ڤێر"ی ئینگلیزی كەبەواتای پیشانگای بازرگانی دێت، لەوشەی "فێریا"ی لاتینیەوە وەرگیراوە كەمانای "ڕۆژی جەژن" یان "پشو" دەدات.

میسریە كۆنەكان بازاڕی كڕینو فرۆشتنیان لەو كاتەدا دەبو، كەلەسەر گۆڕی مردوەكانیان كۆ دەبونەوە بۆ ئەنجام دانی نەریتێكی ئاینی.

یونانیەكانیش لەكاتی ئاهەنگ گێڕانی خواوەندەكانیاندا بازرگانیان دەكرد، پێش هاتنی ئیسلامیش عەرەبەكان دەهاتنە مەككە كەمەڵبەندێكی ئاینیو بازرگانی بو، حەفتەیەكیان لەپەرستنی بتەكاندا دەبردە سەرو پاشان لەشاردا

دەمانەوە بۆ بازرگانی کردن.

ئەو مەڵبەندە بازرگانیانەش لەهیندستانو چین‌و ئێران‌و لەنێوان ئەزتەکەکانی مەکسیکیشدا هەیە، بازاڕی بازرگانی لەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیشدا پەیوەند بوە بەئاهەنگ گێڕانی بەرو بومەوە.

جوتیارەکان لەو کاتەدا بەرو بومی خۆیانیان بردۆتە بازاڕو بەجل‌و بەرگ‌و پیتاکی تر گۆڕ یویانەتەوە.

لەسەردەمی کۆنیشدا کردنەوەی بازاڕی بازرگانی مافی شارێکی تایبەتی بوە، پادشاو دەرەبەگەکان، ئەو مافەیان داوە بەگەورەی ئەو شارە.

ئەو بازرگانەش، هەچ کاڵایەکی بردبێتە ئەو شارەوە بۆ فرۆشتن، بڕێك پارەی داوە بەگەورەی ئەو شارە، لەبەرامبەر ئەوەدا مۆڵەتی چونە ناوەوەی بدات.

بازاڕی جاران یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەبوە، کەگرنگترینیان فێڵ نەکردن‌و پاراستنی ئەمانەت بوە.

لەبەر ئەوەی لەشارستانیەتە کۆنەکاندا، بازاڕیان بەشوێنێکی پیرۆز زانیوە، بۆیە کاتێك لەبازاڕدا بەیەك گەیشتون جەنگ‌و شەڕو شۆڕیان وەستاندوە.

ئەو بازاڕانەی کۆنیش ڕۆڵی گرنگیان بینیوە، لەپێشخستنی بازرگانیدا، هەر ئەوەش وای کرد بازرگانی لەنێوان ڕۆژهەڵات‌و باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا دروست ببێت.

### تەباشیر

لەملیۆنەها ژوری پۆلدا، لەسەرانسەری جیهاندا، هەزاران منداڵ لەبەردەم تەختە ڕەشەکاندا دەوەستن بۆ ئەوەی بەتەباشیر بنوسن.

هەروەها مامۆستاکانیشیان ناتوانن بەبێ یارمەتی تەباشیر هیچ کارێك ئەنجام بدەن.

ئایا دەزانیت تەباشیر لەبنەڕەتدا گیانلەبەر بوە؟

لەکۆندا ئاوی زەریاکان بەجۆرەها ڕوەکی وردەو گیانلەبەر سەردا پۆشراو بوە، لەوانە گیانلەبەری یەك خانە کەپێی دەوترێت "کون کون" گیانلەبەرێکی دەریایی لاکون کونەو کونەکانی لەقسڵ پێکهاتوە.

کاتێك ئەو گیانلەبەرە دەمرێت کونە ناسکەکانی دادەبەزێت بۆ بنی زەریاو بەتێپەڕ بونی ڕۆژگار چینێکی ئەستور لەو کونانە دروست دەبێت، ئەمەش بەملیۆنەها ساڵ، ئەو چینە وردە وردە دەبێتە بەردێکی قسڵی نەرم کەپێی دەوترێت "تەباشیر".

چەندین گۆڕانکاری لەسەر ڕوی زەویدا ڕویدا، کەبوە هۆی وشك بونەوەی بەشێك لەو زەویانەی کەلەژێر ئاو دابون، وەکو وشکبونەوەی ناوچەی تەنیشتی کەناڵی ئینگلیزی، کەلەبنی دەریاکەوە چین چین تەباشیر کەوتە سەرەوە.

ئەمجا ئاوەکە بەشە وردەکەی پاڵاوت و لێشاوێکی لەتەباشیر لەشوێن خۆی بەجێ هێشت دوناوچەی کەناڵەکە زۆر بەناوبانگ بون، لێشاوە تەباشیریەکەی لای دۆڤەر لەبەشە ئینگلیزیەکەوە لەگەڵ لای دیبی لەدیوی فەرەنسی کەناڵەکەوە.

لەشوێنەکانی تری دونیاشدا گردۆڵکەی تەباشیری هەیە کەڕۆژێك لەڕۆژان ئەو ناوچانە لەژێر ئاودا بونە، بەڵام باشترین تەباشیری سروشتی لەبەریتانیادایە.

مرۆڤ سەدان ساڵە تەباشیر بەکار دێنێت، تەباشیری تەختە ڕەشیش دەبێت لەگەڵ مەوادی تردا تێکەڵ بکرێت بۆ ئەوەی ورد نەبێت.

باشترین تەباشیریش بۆ تەختە ڕەش ئەو تەباشیرەیە کە ٩٥٪ تەباشیرە.

لەڕێگەی زیادکردنی ڕەنگەکانەوە، دەتوانین هەر تەباشیرێك کەحەزمان لێیە بەهەر ڕەنگێك دەستمان بکەوێت.

کاتێك تەباشیرین دەهاڕین و دەیشۆین و پاکی دەکەینەوە پێی دەوترێت "خاکە تەباشیری سپی" دەتوانین لەدروست کردنی بەرهەمی تردا بەکاری بێنین وەکو: کرێم، هەویر، دەرمان، کاغەز، هەویری دان و هیتریش.

### شێر، پادشای دارستان

لەسەرانسەری جیهاندا شێر بەهێمای هێز دادەنرێت، زۆر جار گوێمان لێدەبێت کەباسی پیاوێکی بەهێز دەکرێت دەڵێن: دڵی وەك دڵی شێرە.

زۆرجاریش وێنەی شێر لەسەر ئەو خەڵاتانە دەنەخشێنرێت کەدەدرێتە یاریچیە براوەکان، واباوە کەشێر بەهێزترین گیانلەبەری دارستانەو دەتوانێت هەمو گیانلەبەرەکانی تر ببەزێنێت بەڵام هەمو جارێك ئەوە ڕاست نیە.

بۆیە بەشێر دەڵێن پادشای دارستان، چونکە لەپشتەوە هێرش دەکات سەر گیاندارانی لەخۆی گەورەتر وەکو زەڕافەو گامێشی دەشتی بەخێراییەکی زۆر خێراو بەچڕونك‌و کەڵبە بەهێزەکانی نێچیرەکەی لەت‌و پەت دەکات.

لەبەر خێرایی‌و بەهێزیەکەشیەتی کەپێی دەوترێت "پادشای دارستان".

پێش نزیکەی ٢٠٠٠ ساڵ لەسەرانسەری ئەوروپادا شێر هەبوە، بەلام بەرەبەرە لەناو براون، ئێستا لەدارستانە چڕەکانی ئەفریقیاو باکوری ڕۆژئاوای هیندستاندا نەبێت، لەشوێنەکانی تری دونیا بەدەگمەن نەبێت شێر بەرچاو ناکەوێت.

شێر گیانلەبەرێکی گۆشت خۆرەو سەر بەخێزانی پشیلەیە، درێژی نزیکەی سێ مەترەو کێشیشی لەنێوان ١٨٠ بۆ ٢٢٥ کیلۆدایە، مێ یەکەشی لەنێرەکەی بچوکترەو کوڵکیشی بەسەرەوە نیە.

هەمیشە شێری مێ یە نێچیرەکە دەگرێت‌و دەیکوژێت‌و بێچوەکانیشی کەلەگەڵیدان لەدایکیانەوە فێری ئەو پیشەیە دەبن.

شێر بەنەڕەکەی زۆر بەناو بانگە، بەلام بەپێچەوانەی پشیلە، هەرگیز ناتوانێت بچێتە سەر دارێك، شێر لەکۆمەڵێکی خێزانیدا دەژین، هەمیشە لەسێ بۆ چوار کەمتریان پێکەوە نابینی، شێران بەڕۆژ پشو دەدەن‌و بەشەو ڕاوی خۆیان دەکەن.

شێر ئەگەر وازی لێ بێنیت هەرگیز هێرش ناکاتە سەر مرۆڤ، بەلام ئەگەر بینی کەسێك ئەزیەتی‌دەکات، ئەوا هێندەی تر دڕندە دەبێت.

هەندێك لەشێران کەچێژی گۆشتی مرۆڤ دەکەن، دەبنە گۆشتی مرۆڤ خۆرو دەگوێزنەوە بۆ دارستانەکانی نزیك گوندەکان، هەرکاتێکیش هەلیان دەست کەوێت هێرش دەکەن سەر مرۆڤ‌و مەڕو مالات.

### چی شەپۆل دروست دەکات؟

ئەگەر لەسەر دەریایەك دابنیشت‌و کەش‌و هەوای دونیا پاك بێت، ئەوا شەپۆلی زۆر بچوك دەبینیت لەسەر ئاوەکەدا دروست دەبێت، بەلام ئەگەر دونیا زریانی لەگەڵدا بو ئەوا دەبینیت شەپۆلەکان تیژتردەبنەوە، کەواتە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەشەپۆلی ئاو با دروستی دەکات.

وابێ شەپۆل بریتیە لەڕێگەیەك کەجۆرێك لەجۆرەکانی وزە تیایدا دەجوڵێتەوە

لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

دەبێت شەپۆلەکە بەوزەیەك یان هێزێك دەست پێ بکات و "با"ش ئەو هێزە یان وزەیەیە لەناو ئاوەکەدا.

کاتێك سەیری شەپۆلەکان دەکەین وادەزانیت ئاوەکە بەرەو پێشەوە دەڕوات، بەڵام ئەگەر پارچە دارێك بخەیتە سەر ئاوەکە، ئەوسا دەزانیت ئاوەکە بۆ پێشەوە نایەت، وەکو لەشەپۆلەکاندا دێتە پێش چاو.

بەڵکو پارچە دارەکە لەشوێنی خۆیدا ئەمدیوو ئەو دیو دەکات "هەڵدەگەڕێتەوە" لەگەڵ شەپۆلەکانی ئاوەکەدا.

کەواتە ئەو جۆرە جوڵەیە چییە کەلەشەپۆلدا ڕو دەدات؟

شەپۆلی ئاو بریتیە لەوردیلەی ئاوی بەرز بوەوەو دابەزیو، جوڵەکان بەرەو کەناری ئاوەکە دێن، بەڵام وردیلەکانی ئاو لەگەڵیدا نایەن.

نمونەی ئەوەش: ئەگەر پەتێك سوڕ دەیت دەتوانێت جۆرێك لەشەپۆل بەدوری پەتەکەدا دروست دەکات، بەبەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی پەتەکە.

### ئاوی سوێری دەریا

ڕۆژانە ئێمە توشی ڕاستی تازەتر دەبینەوە سەبارەت بەگۆی زەوی، ئەو ڕاستیانەش دەمانخەنە بیرکردنەوەو ناشتوانین هیچ وەڵامێکی بۆ دابنێین بۆ نمونە ڕاستی بونی ئەو ڕێژە خوێ زۆرە لەدەریاو زەریاکاندا.

ئێمە نازانین ئەو خوێ یە چۆن گەیشتوەتە ناوی ئەو دەریاو زەریایانە.

ئێمە دەزانین خوێ لەئاودا دەتوێتەوە، لەبەر ئەوەیە دەگاتە زەریاکان لەگەڵ ئاوی باراندا، هەروەها لەسەر زەویش دەتوێتەوەو بەبەردەوامی دەچێتە ڕوبارەکانەوە.

بەڵام دەشێت ئەوە تەنیا هۆیەك بێت بۆ بونی ئەو هەموو خوێیە زۆرە لەناو دەریاکاندا؟

ئەگەر ڕوبارەکان وشك بکەن، ئەو خوێیەی لەبنیدا دەمێنێتەوە، بەسە بۆ دروست کردنی دیوارێك بەبەرزی ٢٨١،٥ کیلۆمەترو بەئەستوری ١٥٦٤ مەتر چڕی خوێ لەدەریاکاندا لەنێوان ٣٪ بۆ ٣،٥٪ ە.

بەڵام دەریا داخراوەکان وەکو دەریای سورو سپی ناوەڕاست ڕێژەی خوێ

لەئاوەكەيدا زياترە لەدەريا كراوەكان.

دەرياى مردوو كە روبەرەكەى نزيكەى ٥٣١ كيلۆ مەترى دوجا دادەپۆشێت دەوروبەرى ١،٥٢٣،٠٠٠،٠٠٠ تەن خوێى تێدايە.

ليترێك ئاوى دەريا نزيكەى ٣٠ گرام خوێى تێدايە.

### شاخەكان چۆن دروست بون؟

لەبەر ئەوەى شاخ زۆر گەورەو سەركەشە، مرۆڤ وادەزانێت، هەروا دەمێنێتەوەو ناگۆڕێت، بەڵام جيلۆجيەكانو ئەو زانايانەى لێكۆڵينەوە لەسەر شاخەكان دەكەن، دەيسەلمێنن كەشاخەكان بەردەوام لەگۆڕاندان.

شاخەكان بەهۆى گۆڕانكارييەكى ديارى كراوەوە دروست بونە، بۆيە هەميشە توشى گۆڕانو لەناو چون دەبنەوە، چونكە بەردەكان بەهۆى باران بارينو بەفرو ئاوەوە دەخورمێنەوەو لەشاخەكان جودا دەبنەوە بەجۆرێك زۆرجار لوتكەى شاخەكان دەگورێت بۆ دەشتايى يان تەپۆلكەيەكى تەخت.

جيلۆجيەكان لەرِوى پێك هاتەوەو ئەو گۆڕانكاريە بەهێزەى پێشى مليۆنەها ساڵە رِويداوە شاخەكان دەكەنە چوار بەشەوە.

شاخە پێچاوپێچەكان: لەچينى بەردين پێك هاتوە لەئەنجامى پاڵە پەستۆيەكى زۆر بەهێز كەگوشيويەتىو گۆڕويەتى بۆ پيچى گەورە گەورە، ئەمجۆرە شاخەش دەتوانێت لەزۆر شوێنى دونيادا ببينين، وەكو شاخى "ئەبالاش"ى لەئەمريكاو "ئەلب" لەئەوروپا.

بەڵام شاخەكانى شێوە گومەت، چينە بەرديەكان گومەتيان دروست كردوەو زۆرجاريش گەرمى گڕكانە تواوەكان كەلەژێر زەويەوە دەردەچێت، لەئەنجامى پاڵە پەستۆيەكى بەهێزدا واى كردوە، ئەو چينە بەردانە ببنەوە نمونەى ئەو شێوە شاخەش تەپۆڵكە رِەشەكان لەداكۆتاى باشور لەئەمريكا.

شاخە شێوە قاڵبيەكانيش لەئەنجامى درز بردنى چينەكانى زەويدا دروست بوە، لەبەر ئەوەى بەشێكى گەورە لەزەوى قاڵبێكى بەردى گەورەيە، ئەم قالبە كاتێك لەكاتەكان لەشوێنى خۆيدا جولاوەيان بەرز بۆتەوە بۆيە ئەو جۆرە شاخەى لێ دروست بوە، نمونەى ئەو جۆرە شاخەش زنجيرە چياى "سيرانيڤادا" يەلە

کالیفۆرنیا کەبریتیە لەقاڵبە شاخێك بەدرێژی ٤٠٠ میل‌و بەپانی ٨٠میل.

شاخە گڕکانیەکان لەئەنجامی ئاگرو هاوڕێژراوی گڕکان‌و خۆڵە مێش‌و پاشماوەی کانزاکان کەلەناوسکی زەویەوە، دەردەچێت، دروست دەبێت، لەنێوانی شاخە گڕکانیە بەناو بانگەکاندا شاخی ڕانیەو شاستاو هود لەویلایەتە یەکگرتوەکان‌و فیوجیاما لەژاپۆن‌و فیسو خمۆس لەئیتالیا.

زۆر چیاش هەن بەزیاتر لەڕێگەك لەو ڕێگایانەی باسمان کرد دروست بونە، وەکو شاخی ڕۆکی، کەلەئەنجامی پێچاو پێچ‌و درز بردن‌و گومەت بون‌و تەنانەت گڕکامیشەوە دروست بوە.

### پرژە ئاگرەکان چین؟

بەدرێژای هەزاران ساڵە، خەڵکی وا ڕاهاتوە سەیری داچۆڕانی ئەستێرەکان "پرژە ئاگر" بکات‌و پرسیار لەسەر چاوەکەشی بکات، خەڵکی کۆن بڕوایان وابوە پرژە ئاگر لەجیهانێکی ترەوە دێت.

بەڵام ئێستا دەرکەوتوە، ئەوانە ئەستێرە نین بەڵکو پرژە ئاگر " النیازك "ن کەبریتیە لەتەنێکی ڕەقی بچوك‌و بەئاسماندا دەگەڕێت وەکو چۆن بەکەشی زەویدا دەگەڕێن.

کاتێك پرژە ئاگر دەگاتە کەشی زەوی، ئێمە دەتوانین بەچاو ببینین، چونکە کلکێکی گڕدار لەشوێن خۆی بەجێ دەهێڵێ، لەئەنجامی لێك خشاندنێك لەنێوان ئەو هەوادا، گەرمایەك دروست دەبێت.

ئەوەی جێی سەر سوڕمانە، زۆربەی پرژە ئاگرەکان هێندەی سەری دەمبوسێك گەورەن، هەشیانە چەند تەنێك دەبێت.

زانایان بڕوایان وایە لەشەو ڕۆژێکدا هەزاران پرژە ئاگر، دەکەونە سەر زەوی، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی زەوی ئاوە بۆیە دەکەونە زەریاو دەریاکانەوە.

پرژە ئاگرەکان لەئاسماندا وادێنە پێش چاو تەنیان‌و بەهەمو لایەکدا دەجوڵێنەوە، بەڵام هەزارانیان بەیەکەوە کاتێك زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە لەو کۆمەڵە ئاگر پرژێنە نزیك دەبێتەوە، ئەوانیش کاتێك دەبینرێن کەلەچینەکانی سەرەوەی کەش دەخشێت.

کەواتە پرژە ئاگرەکان لەکوێوە دێن؟

ئەستێرە ناسان لایان وایە ئەو کۆمەڵانەی پرژە ئاگرەکان، پەلاشەی بڵاوە کردوی کلك دارەکانە.

کاتێك کلکدارێك دەتەقێتەوە، ملیۆنەها پەڵاشە بەگەردوندا بڵاو دەکاتەوەو بەشێوەی کۆمەڵە دەست بەسوڕانەوە دەکەن لەمەدارو ڕێڕەوی ڕێكو پێکدا.

لەناو ئەو کۆمەڵانەدا هەیە، ڕێگەی زەوی بە٣٣ ساڵ دەبڕێت.

کاتێك پارچەیەك لەپرژە ئاگر دەگاتە زەوی پێی دەوترێت "بەردی پرژە ئاگر" بۆیەش دەکەوێتە سەر زەوی، چونکە زەوی بۆ خۆی ڕایدەکێشێت.

لەسەردەمی ڕۆماندا لەساڵی ٤٦٧ پێش زاین، بەردێکی پرژە ئاگر کەوتە سەر زەوی، کەوتنە خوارەوەی بەڕوداوێکی گرنگ لەقەڵەم دراو، تەنانەت مێژو نوسانی ڕۆمانیش لەمێژودا باسیان کردوە.

### لەکەیەوە ئافرەتان قژ دادەهێنن؟

لەسەرەتای مێژوی مرۆڤایەتیەوە، پیاوان و ژنان قژیان داهێناوە.

ئافرەتان هەر لەزۆر کۆنەوە، جۆرەها شانەیان بەکار هێناوە، کەلەئێسكو دارو برۆنز دروستیان کردوە.

مرۆڤی سەرەتایی هەمیشە گرنگی بەقژی داوەو، هەندێك جار بەڕەنگەکانی ڕەشو سپیو سور، ڕەنگی کردوە.

لەزائیری ڕۆژئاوای ئەفریقیا، خەڵکی ڕۆنی سەگی ئاوییان، بەکار هێناوە بۆ خاوێن کردنەوەی قژیان، لەکاتێکدا زۆر لەخێڵەکانی تر، قوڕیان بۆ لوس کردنی قژی سەریان بەکار هێناوە.

لەسەردەمی گریکەکاندا ژنان دەمبوسی درێژی قژیان بەکار هێناوە، کەزۆر بەوردی نەخشێنراو دروست کراوە، لەبۆنەکانیشدا قژیان بەچەپکە گوڵ ڕازاندۆتەوە، هەروەها شریتیشیان بەکار هێناوە، بەڵام شێوەی داهێنانی قژی ژنان، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بەپێی دابو نەریتی ئەو شوێنە گۆڕاوە.

قژ لول کردن لەسەردەمی کۆندا، لەئێستا سەرنج ڕاکێشەر تر بوە.

وێنەو پەیکەرەکان، ئەوە پیشان دەدەن کەژنان بەلول کردنو پێچران قژی

خۆیانیان پەلکە کردوە بەسەر هەردو برۆو لاجانگدا.
پیاوانیش قژو ڕیشیشیان پەلکە کردوە.
لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانیەتدا داهێنانی قژەکان جۆراو جۆر تربون، لەهەندێك شوێندا قژ دادەهێنراو لەهەندێك شوێنی تردا قژ لول دەکرا.
بەلاّم مۆدیلی قژ کورت کردنەوە لای پیاوان و درێژ کردنی لای ژنان، شتێکی تازەیە لەمێژودا، کەدەگەڕێتەوە بۆ چاخەکانی ناوەڕاست.

### گەورەترین تاڤگەکانی جیهان کامەن؟

تاڤگەکانی "ئێنجل" لەبەرزاییەکانی گویانای فنزوەیلا، بەبەرزترین تاڤگەی جیهان دەژمێدرێت و بەرزیەکەی "٩٨٠" مەترە، درێژترین تاڤگەشە لەهاتنە خوارەوەی ئاودا بەبێ بەربەست کە "٨٠٧" مەترە.

ناوەکەشی لەناوی "جمیس ئینجل"ی ئەمریکیەوە وەرگیراوە، کەلەساڵی ١٩٣٥دا دۆزییەوە.
درێژترین تاڤگەکانی ئاسیاش تاڤگەکانی "گارسوبا"یە لەهیندستاندا، ئەم تاڤگانە زۆر گەورەن و لەچوار لاوە ئاوەکەی لەبەرزی ٢٥٢ مەترەوە دێتە خوارەوە.
بەلاّم تاڤگەیەك، کەزۆرترین ڕێژەی ئاوی لێ بێتە خوارەوە تاڤگەکانی "گۆیرا"یە لەسنوری نێوان بەرازیل و پاراگوای، لەچرکەیەکدا زیاتر لە ٣٠٩،١٣ مەتری سێجا ئاوی لێ دێتە خوارەوە، بریتیە لە ١٨ تاڤگەو بەرزیەکەشی تەنیا ٦٠ مەترە.
بەرزترین تاڤگەش کەتەنیا یەك ڕێژگەی هەیە لەجیهاندا تاڤگەکانی "ریبۆنە" لەباخچەی یوسمایتی نیشتمانی لەویلایەتی کالنیفۆرنیای ئەمریکا، کەبریتیە لەڕێژگەیەکی ئاوی تەسك، کەلەبەرزی ٤٩٠ مەترەوە دێتە خوارەوەو دەڕژێتە ڕوباری میرسیدەوە.
دوەم بەرزترینی تاڤگەکانی جیهان لەباشوری ئەفریقیادایە، ئەویش تاڤگەکانی "تۆگیلا" یە کەلەبەرزی ٨٥٣ مەترەوە، بەپێنج پلە دێتە خوارەوە.
تاڤگەکانی بەناوبانگی "نیاگارا" دەکەوێتە سەر ڕوباری نیاگارا لەدوری نزیکەی ١٦ میل لەباکوری ڕۆژئاوای بۆڤالۆوە لەویلایەتی نیۆیۆرك، کەلەدو ڕێژگەی زۆر

گەورەی ئاوی پێك هاتوە.

کەبریتیە لەرێژگەی "هۆرسشۆ" یان رێژگەی کەنەدی- ئەمریکی.

هێڵی سنوری نێو دەوڵەتی نێوان، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو کەنەدا، بەناوراستی تاڤگەکانی هورسشۆدا تێدەپەرێت.

نزیکەی ٩٤٪ی نیاگارا یان نزیکەی ٣٧،٨٥٤،٠٤٠ لیتر ئاو لەخولەکێکدا، لەتاڤگەکانی هورسشۆوە هەڵدەقوڵێت.

### بارەگای کۆنگرێسی ئەمریکی

بینای کاپیتۆڵ لەواشنتۆنی پیتەخت، ئەو بارەگایە کەکۆنگرسی ئەمریکی تیایدا کۆدەبێتەوە بۆ گفت و گۆو بریاردان لەسەر یاساو پرۆژەکان.

هەروەها ئەو شوێنەیە کەئاهەنگی دانانی سەرۆکەکانی ئەمریکای تیا دەگێردرێت، جۆرج واشنتۆن لەساڵی ١٧٩٣دا، بەردی بناغەی ئەم بینایەی داناوە.

بەشی سەرەکی ئەم بینایە لەبەردی ویلایەتی ڤێرجینیا دروست کراوە، لەنێوان ساڵانی ١٧٩٣و ١٨٢٧دا، دوای ئەوە دو بەشی تری بۆ زیاد کرا، کەتایبەتن بەئەنجومەنی نوێنەران و پیرانەوە، لەمەر مەری سپیی ویلایەتی ماست شوسیت، لەنێوان ساڵانی ١٨٥١و ١٨٦٥دا.

لەکاپیتۆڵ دا، قوببەیەکی ئاسنین هەیە، بەرزیەکەی ٨٦ مەترەو "پەیکەری ئازادی" لەسەر دانراوە، کەپەیکەر تاشی ئەمریکی "تۆماس کروفورد" لەماوەی جەنگی ناوخۆی ئەمریکادا دروستی کردو، لەساڵی ١٨٢٦دا دانرا.

ئیبراهام لەنکۆلنی سەرۆکی ئەمریکا ئامادەی دانانی ئەو پەیکەرە بو، ٣٥ تۆپی سلاوکردنیش تەقێنرا.

لەبنکەی قوببەکەوە ٣٦ ستون هەیە کە هەر یەکەیان هێمایە بۆ یەکێك لەویلایەتەکانی ئەمریکا لەو سەردەمەدا.

چەند جارێك کاپیتۆڵ نۆژەن کراوەتەوە، بەریتانیەکان لەجەنگی ساڵی ١٨٢١ دا وێرانیان کردو ئاگریان تێ بەرداو بەشی زۆری بیناکە زیانی گەورەی لێکەوت.

تادواین جار لەساڵی ١٩٦١ دا، بەشی خۆرهەڵاتی کاپیتۆڵ جارێکیتر نۆژەن

كرایەوە، لەسەر پلیكانەكانی بەشی خۆرهەڵاتی كاپیتۆڵ سەرۆكەكانی ئەمریكا لەڕۆژی دانانیاندا، سوێندی یاسای دەخۆن.

دادگای باڵای ئەمریكاو كتێبخانەی كۆنگریس كەگەورەترین كتێبخانەیە لەجیهاندا دەكەونە نزیك بارەگای كاپیتاڵەوە.

### كێ تۆپی یاریكردنی داهێنا؟

كەس نازانێت یەكەم كەس كێ بوە بەتۆپ یاری كردوە، بەڵام ئەوەی زانراوە خەڵكی پێش مێژو بەپۆپ یارییان كردوە.

هەمو شارستانیەتەكانیش هەریەكەو بەجۆرێك یارییان بەتۆپ كردوە.

نەتەوە كۆنەكان لەپێستە تۆپیان دروست كردوەو پەڕیان تێ ئاخنیوە، دوای ئەوە گریكو ڕۆمانەكان بیرۆكەی هەوا تێكردنیان بۆ زیاد كردوەو بەتۆپێكی لەپێست دروست كراوی هەوا تێكراو یارییان كردوە، كەپێیان وتوە "ڤولیس"و بەدەست یارییان پێ كردوە.

تۆپی لەوە گەورەتریشیان دروست كردوەو یارییان پێ كردوە.

هەر وڵاتێك بەگوێرەی ئەو كەرەستانەی لەبەردەستیاندا بوە، تۆپیان دروست كردوە، بۆ نمونە: هیندیە سورەكانی ئەمریكای باكور، كەڕاوچی بونە، لەپێستی ئاسك تۆپەكانیان دروست دەكرد، لەكاتێكدا منداڵانی ژاپۆنی بەتۆپی لەقوماش دروست كراوی بەبەن پێچراو یارییان دەكرد.

دەڵێن كۆلۆمپس هیندیەكانی ئەمریكای ناوەڕاستی دیت، بەتۆپی ڕەقی ڕەنگ ڕەشی لەكەتیرە دروست كراوی ڕوەكی یارییان دەكرد، نمونەی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ ئەوروپاو، بەوەش بیرۆكەی تۆپی لاستیك چوە ئەوروپاوە.

زۆرێك لەو یاریانەی ئێستا دەكرێن، لەنەریتی ئاهەنگی ئاینیو سیحرەوە، پەیدا بوە، بەساڵا چوان زۆر بەگرنگیەوە یاریان بەتۆپ كردوە، ئەو یاریانەش زۆرجار باسی بیروباوەڕی كۆنی لەسەر جەنگو خواوەندو شەیتانو ژیانو مردن كردوە.

میسریە كۆنەكان یەكەمین نەتەوەی كۆن بونە، وەكو ئاهەنگ یارییان بەتۆپ كردوە.

لەهەمو وەرزێکی بەهاردا دو دەستەی زۆر گەورە دروست دەبون، هەر یەکەو دەبونە نوێنەری یەکێك لەخواوەندەکانیان‌و بەگۆیەکی لەدار دروست کراو و گۆچانێکی چەماوە، یارییان دەکرد.

ئامانج لەم یاریەش گۆڵ کردن بو لەتیپی بەرامبەر، هەر تیپێکیش سەرکەوتنی بەدەست بهێنایە، ئەوە سەرکەوتن بو بۆ ئەو خواوەندەی کەئەو تیپە نوێنەرایەتی دەکرد.

### پەیکەرتاشی کەی دروست بو؟

دەشێت پەیکەر تاشی کۆنترینی هونەرەکان بێت، پێش ئەوەی مرۆڤ وێنە بکێشێت‌و نەخشەی ماڵ دروست بکات، پەیکەری تاشیوە.

ژمارەیەکی کەم نەبێت، پەیکەرەکان لەنەهامەتی ڕۆژگار رزگاریان نەبوە، تائێستاش نازانرێت پێش هەزار ساڵ پەیکەر تاشی چۆن بوە.

ئەو کەسانەی تائەمڕۆش لەکۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا دەژین، جۆرێك پەیکەر تاشن کەزۆر لەپەیکەرەکانی پێش مێژو دەچێت.

مرۆڤی سەرەتایی پەیکەرەکانی لەئاهەنگە ئاینیەکاندا بەکارهێناوە، مەبەست لەپەیکەری پێش زانییش ئەوە نەبوە کەجوان بێت، بەڵکو پەیکەری ژنان‌و پیاوان‌و ئاژەڵانی تاشیوە، بۆ ڕێزگرتن لەهێزەکانی سروشت، کەپەرستویەتی، وەکو گیانە خێرو شەڕەکان.

هەروەها شارستانیەتی مرۆڤی سەرەتایی پەیکەر تاشی وەکو تەعبیرێك بۆ بیرو باوەڕەکانی خۆی بەکار هێناوە.

میسریەکان باوەڕیان وابوە، دوای مردن زیندو بونەوە هەیە، بۆیە پەیکەریان بەقەبارەی سروشتی یان گەورەتر بۆ پادشاو پیاو ماقوڵان‌و خواوەندەکانیان دروست دەکردو دەیان خستە گۆڕەکانیانەوە، چونکە باوەڕیان وابو گیانی مردوان جارێکیتر دەگەڕێتەوە بۆ ناو پەیکەرەکان.

مەزنترین ماوە لەمێژوی هونەری پەیکەر تاشیدا لەگەڵ شارستانی ئەغریقدا لەدەوروبەری ساڵی ٦٠٠ پێش زاین، دەستی پێ کردوە.

پەیکەر تاشی بەنیسبەت گریکەکانەوە گرنگترین شێوەی تەعبیر کردن بوە،

گریکەکان لەشی مرۆڤیان کرد بوە بابەتی سەرەکی هونەرەکەیانو دەگەڕان بەشوێن باشترین ڕێگەدا بۆ جوان تاشینی شێوەی مرۆڤ.

لەماوەی هەزار ساڵی یەکەم لەمێژوی ئاینی مەسیحیدا، خەڵکی ڕێژەیەکی کەم نەبێت پەیکەریان نەتاشیوە.

بەڵام لەسێ سەدەی دوای ئەوەدا، هەندێك لەجوانترین کەنیسەکانی مەسیحی دروست کران کەتیایدا هونەرمەندانو داهێنانی زۆر مەزنیان تیادا کرد لەهونەری پەیکەر تاشیدا، بۆ ئەم کەنیسانە.

لەماوەی سەردەمی ڕێنیسانسیشدا لەئەوروپا، گرنگی شێوەی مرۆڤ جارێکیتر گەڕایەوەو پەیکەرتاشان جوانترین داهێنانیان کرد، کەبەمەزنترین سامانی هونەری پەیکەر تاشی دادەنرێت لەجیهاندا.

## جەنگیزخان کێ بوو؟

جەنگیزخان دەڵێت: "لەوە خۆشتر نیە مرۆڤ دوژمنەکەی بشکێنێتو تارومariyan کاتو لەسەروەتو سامانیان بێ بەشیان بکات، ببینێت خۆشەویستەکانیان نوقمی فرمێسکنو ژنو کچەکانیشیان بخاتە باوەشی خۆیەوە".

کەواتە بابزانین جەنگیزخان کێ بوە؟

جەنگیزخان لەقەبیڵێکی مەغۆلیەو مانای "ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرەکان" دەدات.

ناوی ڕاستەقینەی جەنگیزخان "تیمۆجین"ەو لەدەهەی شەستەکانی سەدەی دوانزەهەمدا لەدایك بوە، کاتێك لەساڵی ١٢٢٧دا مردوە، حوکمی زۆربەی ناوچەکانی نێوان دەریای ژاپۆنو دەریای قەزوێنی کردوە.

دوای زنجیرەیەك لەشەڕی بەردەوام توانی ئیمپراتۆریەتێك دروست کات، کەنزیکەی دو لەسەر سێی جیهانی ئەوکاتە لەخۆ بگرێت.

شارستانیەتی مەغۆلی کەسەردەمانێك جەنگیزخان حوکمی دەکرد، ڕۆشنبیریەکی بەرزو کەلەپورێکی هونەری دەوڵەمەندی هەبو، کەتەمەنی خۆی لەشەش هەزار ساڵێك دەدا.

کۆمەڵگای مەغۆلی کۆمەڵگایەکی کشتو کاڵی بون، لەنزیکەی ساڵی ١٥٠٠ پێش زاین کەکەشو هەوای مەنغۆلیا ساردترو وشکتر بو، کۆمەڵگای مەنغۆلی گۆڕا بۆ

کۆمەڵگایەکی ئاژەڵداری.

کەجەنگیزخان لەدایك بو، هۆزەکانی مەغۆل هەمیشە لەنێوانی خۆیاندا خەریکی شەڕکردن بون، کاتێك گەیشتە تەمەنی ٩ ساڵ تەتەرەکان، باوکی کەسەرۆکی یەکێك لەهۆزەکان بو، لەڕێگەی ژەهرەوە کوشت.

دوای مردنی باوکی هۆزەکەی وازیان لەبنەماڵەکەیان هێناو ئەمانیش لەبەر هەژاریو کەمدەستی ناچار بون لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیدا کوللەو ڕسق بخۆن.

بەڵام تیمۆجین کاتێك گەیشتە تەمەنی ١٨ ساڵی شوێنی باوکی گرتەوە لەسەرکردایەتی هۆزەکەیدا، وردە وردە هۆزەکانی تریش بەژن خواستنو زنجیرەیەك شەڕکردن هاوپەیمانیان لەگەڵدا بەست.

لەساڵی ١٢٠٦دا سەرکردەی هۆزەکانی مەغۆل کردیانە گەورەی خۆیانو لەقەبی ئیمپراتۆری هەمو ئیمپراتۆرەکانیان پێ بەخشی، واتە جەنگیزخان ئەو لەقەبەی کەبو بەناوێکی مێژوی بۆی.

ئیمپراتۆریەتی تازە پەیوەندیەکانی ناو هۆزی گۆڕی، کۆمەڵگای مەغۆل گۆڕا بۆ کۆمەڵگایەکی دەرەبەگایەتی، سوپایەکی یەکجار تۆکمەی دروست کرد، بەهەمو پێداویستیەکانییەوە.

لەسوارەو جەنگاوەرەکان، ئەسپ سوارەکان، دەبوایە تائێوارە لەئەسپەکانیان دانەبەزنو لەکاتی نیوەڕۆشدا دەمارێکیان لەملی ئەسپەکەیان، بقرتاندایەو خوێنەکەیان بخواردایە. لەجیاتی نان خواردن بۆ ئەوەی ناچار نەبێت بۆ نان خواردن دابەزێتو خاو بێتەوە.

سوپاکەی جەنگیزخان پێش ئەوەی هێرشیان بکردایەتە سەر هەرشارێك ئەو ئەندازیارانەیان لەوڵاتی چینو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بەکرێ دەگرت، کەدەیانزانی مەنجەنیقو ئامێرەکانی تری جەنگی بەکار بهێنێت.

کەشارێکیان دەگرت پاشان لێی دەهاتنە دەرەوەو، تەنیا چەند سەربازێکی کەمیان تیا دەهێشتەوە، ئەگەر بهاتایەو خەڵکی شارەکە کەسێکیان لەو سەربازانە بکوشتایە دوبارە سوپاکە هێرشیان دەکردەوە بۆ شارەکەو داگیریان دەکردەوە.

هەرچی دانیشتوانەکەی بوایە دەیانکوشت، ئەوانەشیان نەدەکوشت بەدیلیان

دەبردن وەکو قەڵغانی مرۆیی "دروع البشرية" بەکاریان دەهێنان بۆ گرتنی شارێکی تر.

جەنگیزخان پیاوێکی زۆر ژیرو زیرەك بوە، ئەگەر بیتوانیایە لەڕێگەی دیپلۆماسیەوە دوژمنەکەی ببەزێنێت هەرگیز جەنگی لەگەڵدا نەکردوە.

ئەگەر بڕیاری شەڕیشی بدایە، پێش ئەوە سیخوڕی دەنارد بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمنەکەی‌و هەروەها دەستەیەکی تریشی دەنارد بۆ تێك دان‌و ئاژاوەنانەوە لەناو سەربازگەی دوژمندا، دوای ئەوە بەئاسانی هەڵمەتی خۆی دەکردو دوژمنی شپرزە دەکردو تێکی دەشکاند.

**مرۆڤ کەی قوڵایی دەریاکانی دۆزیەوە؟**

دەشێت یەکەمجار مرۆڤ بەمەبەستی پەیداکردنی خۆراك چوبێتە بنی دەریاوە، خەڵکی پێش سەدان هەزار ساڵە زانیویانە چۆن ماسی، لەئاودا ڕاوبکەن.

ماسی گرانی سەرەتایی ئەوانەی کەلێوارەکانی دەریاکانی ئەفریقیادا ژیاون، دەچونە ناوی دەریاکانەوە بۆ ئەوەی ماسیەکان بەدەست بگرن.

ئەو چونە ناو ئاوەش ڕێنومای مرۆڤی کرد بۆ فێر بونی مەلەوانی، ئەمجا مەلەوانەکان فێربون چۆن پینگ بخۆنەوە، لەسەرەتادا چونە بن ئاو لەلێواری دەریاکاندا بوە، پاشان وردە وردە مەلەوانەکان فێر بون بچن‌و قوڵای دەریاکان بدۆزنەوە.

لەچونە ژێر ئاودا مەلەوانەکان جۆرەها شتی بەسودو گرنگیان دۆزیەوەو لەگەڵ خۆیاندا هێنایانەوە بۆ وشکانی، لەوانە گوێ ماسی وەکو خۆراك‌و مەرجان‌و سەدەفی ڕەنگاو ڕەنگ، کەجۆرەها ملوانکەیان بۆ خۆ ڕازاندنەوەو فرۆشتن لێ دروست کرد.

ئێمە دەزانین هیندیەکانی دانیشتوی ئەمریکا، پێشی چوار هەزار ساڵە چونەتە بنی ئاوەکانی بەرامبەر لێوارەکانی پیرۆ بۆ دەست خستنی جۆرێك لەگوێچکە ماسی، کەنایابترین خۆراك بوە لایاندا، لەهەمان کاتیشدا پێشی هەزاران ساڵە، لەبەشەکەی تری جیهانەوە، دانیشتوانی کەنداوی فارس بۆ دەرهێنانی گوێچکە ماسی چونەتە قوڵای کەنداوەوە، بەڵام نەك بۆ مەبەستی خواردنی بەڵکو بۆ گەڕان

بەدوای ئەو مروارییانەی، لەناو گوێچکە ماسیەکاندا دروست دەبون.

تابیکەن بەخشڵو بۆ خۆڕازاندنەوەو فرۆشتن سودی لێ وەربگرن، بەپیاوانی یۆنانیو تورکی کۆن دەڵێن "باپیرانی ژێر ئاو گەڕی هاوچەرخ" چون یەکەمجار ئەوان بون بەدوای ئەسفەنجدا گەڕان لەدەریای ئیجەدا، پێشی دو هەزار ساڵ، ئەوەی کەفێری بون تائەمڕۆش بۆ ئێمە بەسودە.

ئەوەشیان دۆزیەوە کەدەتوانن، لەگەڵ خۆیاندا هەوا ببەن بۆ بنی دەریاکان، تابتوانن ماوەیەکی زۆرتر لەژێر ئاودا بمێننەوە، ئەو تورەکەیەش کەهەواکەیان تێ دەکردو لەگەڵ خۆیاندا دەیان بردە، بنی دەریاکانەوە، پێیان دەوت "میزەڵانی ئاوی"، کە لەپێستی ئاژەڵ یان بەراز دروست دەکراو بەڕۆن چەور دەکرا بۆ ئەوەی تەڕنەبێت.

تەنیا یەك کونیشی تێدا بو کەژێر ئاو گەڕەکە لەکاتی پێویست دا سودی لێ وەردەگرت.

**موشەك بۆ یەکەمجار کەی بەکارهێنرا؟**

ئێمە وادەزانین لەچەرخی موشەکدا دەژینو دروست کردنی موشەك شتێکی تازەو هاوچەرخە.

بەڵام بیرۆکەی مووشەك زۆر کۆنە، چینیەکان پێش زیاتر لەهەشت سەد ساڵ دایان هێناو بۆ یاریەکانی ئاگر بازی بەکاریان دەهێنا، دوای ئەوە هیندیەکان دروستیان کردو پاش ئەوانیش عەرەبەکان، یەکەمین تۆماری نوسراو لەسەر مووشەك لەئەورووپای ڕۆژئاوادا لەساڵی ١٢٥٦ زاینیدا بووە.

یەکەمین بەکارهێنانی موشەك لەجەنگدا لەوردە دار دەچوو، دەیانگرتە ماڵان تائاگری بدات، لەساڵی ١٨٠٢دا ئەفسەرێکی بەریتانی ڕاپۆرتێکی خوێندەوە کەچۆن سەربازەکانی بەریتانیا لەهیندا بەموشەك هێرشیان کراوەتە سەر، بیری کردەوە ئەو چەکە لەسوپای بەریتانیادا بەکار بهێنێت، بۆیە بیرۆکەکەی تاقی کردەوەو بەخێرایی سەرکەوتنی بەدەست هێناو لەسوپای بەریتانیادا موشەکەکەی بەکار هێناو دوای ئەوەش سوپای ئەمریکاو ئورووپیەکان بەکاریان هێنا.

لەئەوروپادا بۆ یەکەمجار لەجەنگی "لایبزك"دا موشەك بەکار هێنرا ئەو جەنگەی ناپلیۆن تیایدا شکا، بەریتانیەکانیش لەدژی ئەمریکیەکان بۆ یەکەمجار لەبۆردومان کردنی قوڵلەی "فورت ماکهانری" لەبەندەری بەلتیمۆردا موشەکیان بەکار هێنا.

بەو بۆنەوەیە ئێستا لەسرودی نیشتمانی ئەمریکادا دەستەواژەی "چەخماخەی موشەکی سوور" هەیە!

لەسەدەی نۆزدەهەمدا کاتێك تۆپ دروست کرا، جێگەی موشەکی گرتەوەو موشەکیش لەجەنگدا گرنگیەکی ئەو تۆی نەما، تاجارێکیتر لەجەنگی جیهانی دوەمدا موشەکی بەناوبانگی ٢-Fی ئەڵمانی بەکار هێنرا.

### چی وادەکات پارە نرخی هەبێت؟

پێش هەزاران ساڵ پارە نەبووە، مرۆڤەکان سیستەمی گۆڕینەوە یان بەکار هێناوە، ئەگەر شتێکی بکڕیایە دەبوایە شتێکی تری لەباتی بدایە، ئەگەر هیچی نەبوایە بیگۆڕێتەوە بەئەو شتەی پێویستی بوو، ئەوا ئەو شتەی دەیویست دەستی نەدەکەوت.

بەتێپەڕ بوونی ڕۆژگار مرۆڤ هەندێك شتی دیاری کراوی وەکو پارە بەکار هێنا، وەکو مانگا، توتن، دانەوێڵە، پێستەو خوێو خوریو هتر....

لەکۆتایدا ئەم هەموو شتە جۆراو جۆرانە گۆڕان بۆ پارچەیەك کانزا، بەتایبەتی بەپارچەیەك کەلەزێڕو زیو دروست کرا بوو.

دوای ئەوە سکە لێدراو کێشو نرخی دیاری کرا، کەبەرامبەر بوو لەگەڵ ڕێژەیەکی دیاری کراو لەشتە جۆراو جۆرەکان، بۆ نموونە چەند پارچەیەك لەو پارەیە مانگایەك یان بیست کیلۆ توتنی دەکرد.

ئەمڕۆ دوو جۆر پارە هەیە لەجیهاندا، پارەی کاغەزو پارەی ئاسن، کەحکوومەتەکان چاپو بڵاوی دەکەنەوەو خەڵکیش وەری دەگرنو بەکاری دەهێنن.

کەواتە چی وا دەکات پارە بەهای هەبێت؟ وەسودی چیە بۆ ئێمە؟

پارە چوار کرداری گرنگ بۆ ئێمە ئەنجام دەدات:

- یەکەم: ئاسان کردنی گۆڕینەوەو بازرگانی:

گریمان یەکێك ویستی پایسکیلێك بکڕێت‌و ئامادده بوو لەپێناویا بۆ باخەوانێك ئیش بکات، بەڵام باخەوانەکە پایسکلی نەبوو بیداتە کرێکارەکەی‌و لەبریدا پارەی دایە، تابچێت لەبازاڕ بیداتە پایسکل، کەواتە پارە وادەکات کارەکە بگۆڕێت بەهەرچی شتێك دەتەوێت.

- دووەم: پێوەرە بۆ نرخ:

دەتوانرێت بۆ هەموو شتێك بەکار بهێنرێت وەکو پێوەرێکی بەنرخ، کەسێك لەوانەیە ئامادده بێت لای باخەوانێك بەکاتژمێری یەك دینار ئیش بکات، نرخی پایسکێکیش پەنجا دینار بێت، ئێستا کابرا دەتوانێت بیرۆکەیەك لای خۆی دروست کات بۆ کڕینی پایسکلێك.

- سێیەم :خراپ نابێت:

مرۆڤ ناتوانێت بەرهەمی تەماتەکەی هەڵگرێت، چونکە هەر زوو خراپ دەبێت، بەڵام ئەگەر فرۆشتی دەتوانێت پارەکەی هەڵگرێت‌و لەداهاتودا سودی لێوەر بگرێت.

- چوارەم: دەتوانرێت وەکو قست بەکار بهێنرێت:

بۆ نموونە: ئەو کەسە پایسکلە کەدەکڕێت دەتوانێت دەدیناری بدات‌و پاشان بەرەبەرە پارەکەی تری بدات، بەڵام ئەوە لەهێلکەو تەماتەو خۆراکیەکانی تردا نابێت.

### قوڵترین زەریا

تائێستاش زەریاکان نهێنیەکی زۆر گەورەن بۆ مرۆڤ، چونکە نازانرێت تەمەنیان چەندەو وادەردەکەوێت لەسەرەتای دروست بونی زەویدا، زەریاکان هیچ بونێکیان نەبووبێت.

مرۆڤ بۆ ئەوەی دەچێتە بنی زەریاکانەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات تازیاتری لەسەر بزانێت.

لەبنی زەریاکاندا چینێك قوڕی شل هەیە کەبنی زەریاکانی داپۆشیوە، تاقوڵای ٣٦٠٠ مەتر، کەلە هەیکەلی گیانلەبەرە بچوکەکان پێك هاتووە، بەڵام زەوی ناوچە قوڵەکانی زەریاکان تائێستا شتێکی ئاڵۆزە، چونکە قوڵی ئاوەکەی لەشەش کیلۆ مەتر زیاترەو

بەقوڕێك داپۆشراوە، ڕەنگەكەی لەڕەنگی ئاسن دەچێت و پێی دەوترێت قوڕە سوورە. كەلە هەیكەلی گیانلەبەران و توێكڵی ڕوەكە بچوكەكان و خۆڵە مێشە بوركانیەكان پێك هاتووە.

قوڵی زەریا بەو شێوەیە دەپێورێت، كەدەنگ ڕەوانەی بنەكەی دەكەن و لەبنیشەوە دێتەوە بۆ سەرەوە، قوڵیەكەشی بەدیاری كردنی ئەو كاتە دەكرێت كەشەپۆلە دەنگیەكە پێویستیەتی تادەچێتە بن و دێتە سەرەوە، بەدابەش كردنی كاتەكە بەسەر دوودا.

بەم حیسابە بیرۆكەی باشمان وەرگرت لەسەر ڕێژەی قوڵی هەموو جۆرە زەریاكان و لەقوڵترین خاڵ لەهەر زەریایەكدا، قوڵترین زەریا زەریای "باسیفیكی"یەكە ٤٢٨١مەتر قوڵە، بەپلەی دوەم زەریای هیندی دێت، كە ٣٩٢٦ مەتر قوڵە تەنكترین دەریاش دەریای باڵتیكە كەتەنیا ٥٥ مەتر قوڵە.

قوڵترین خاڵ لەزەریای باسیفیكی دا "١٠٧٩٠" مەترە دوای ئەوەش خاڵێك دێت لەزەریای ئەتڵەسی لەبەرامبەر پۆرتۆریكۆ، كەقوڵیەكەی دەگاتە ٩٢١٩ مەتر.

### گەورەیی گەردوون

زۆر ئاستەمە عەقڵی مرۆڤ وێنەی ڕاستەقینەی قەبارەی گەردون لەمێشكی خۆیدا بكێشێت، چونكە ئێمە قەبارەكەی نازانین، كەواتە بۆشمان وێنە ناكێشرێت.

ئەگەر لەگۆی زەویەوە دەست پێ بكەین و لێی دەرچوینە دەرەوە، ئەو كاتە سەختی و ئاستەمی زانینی قەبارەی گەردونمان بۆ دەردەكەوێت.

زەوی بەشێكە لە سیستەمی كۆمەڵەی خۆر، بەڵام بەشێكی زۆر بچوك، كۆمەڵەی خۆر پێك هاتووە لەخۆر و ئەو هەسارانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، لەگەڵ ئەستێرەو پرشە ئاگرەكانیشدا "النیازك".

ئەم كۆمەڵەی خۆرەش بەشێكی زۆر بچوكە لەسیستەمەی كەپێی دەڵێن ڕاكێشكە كەلە ملیۆنەها ئەستێرە پێك هاتووە، ڕەنگە سەدان هەزاریان لەم خۆرەی خۆمان گەورەتربن یان سیستەمێكی خۆری تایبەت بەخۆیانیان هەبێت.

ئەو ئەستێرانەی كە لەڕاكێشكەی خۆماندا دەیبینین پێی دەڵێن "ڕێی كاكێشان" هەمویان خۆرن و هەموشیان زۆر زۆر لێمانەوە دورن و تەنانەت نێوانیشیان بەساڵی تیشكی پێوانە دەكرێت نەك بەمیل.

تیشك لەساڵێكدا نزیكەی "٦٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠" میل دەبڕێت، نزیكترین

**ئەستێرەش لەزەویەوە کە "زەڵمان"ە، بیستو پێنج هەزار ملیۆن میل لەزەویەوە، بەڵام ئێمە هێشتا باس لەڕاکێشکەی خۆمان دەکەین کەپانتاییەکەی نزیکەی ١٠٠ هەزار ساڵی تیشکیە، واتە ١٠٠ هەزار لێکدانی "٦٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠" میل. هەروەها ئەم ڕاکێشکەیەی ئێمە بەشێکی بچکۆلەیە لەسیستەمی گەورەتر، کەڕەنگە ملیۆنەها مەجەرەی تر لەپشتی ڕێگای کاکێشانەوە هەبێت.**

**بۆیە بەمجۆرە هەرگیز ناوانرێت بیرۆکەیەك بخەینە مێشکی خۆمانەوە سەبارەت بەقەبارەی گەردوون، چونکە زانایان لایان وایە، بوونەوەر زۆر گەورەیەو بەردەوامیش لەگەورە بونەوەدایە.**

### بۆچی خۆر لەئاوابوندا سور دەنوێنێت

**دەبێت سەرەتا بیهێنینە یادی خۆمان کەتیشکی ڕۆژ تێکەڵەیەکە لەتیشکی ڕەنگەکان، زۆر سروشتیە کە ئەو تێکەڵە تیشکە، لەبەرچاوی ئێمەدا سپی بنوێنێت.**

**بەڵام کەش و هەوا، کەگەردیلەکانی هەواو تۆزو هەڵمی ئاوو پیسیەکانی ترە، بۆیە کاتێك تیشك بەناویاندا تێدەپەڕێت، ئەو تەنە وردانە ڕەنگی جۆراو جۆر دروست دەکەن.**

**بەمجۆرەش کەش ڕەنگی وەنەوشەیی و شین و سەوز لەڕەنگەکانی سورو زەرد زیاتر پیشان دەدات، کاتێکیش خۆر ئاوا دەبێت وامان لێدەکات هەردوو ڕەنگی سورو زەرد لەڕەنگەکانی تر زیاتر ببینین، بەمجۆرەش خۆرئاوا بوون سوور دەبێت، بەو بۆنەیەوە بڵاو بوونەوەی تیشك دەبێتە هۆی شینی ئاسمان، چونکە هەردوو ڕەنگی شین و وەنەوشەیی، شەپۆلەکانیان کورتەو لەشەپۆلەکانی تیشکی سوور دەبەرامبەر بڵاو تر دەبنەوە.**

**ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەتیشکی سوور ڕاستەوخۆ دێتە کەش و هەوامانەوە، لەکاتێکدا شەپۆلە شینەکان ڕاستەوخۆ نایەنە ناو کەش و هەواوە شبەڵکو بەهۆی ئاوو هەواو گەردیلەکانی تۆزەوە تیایدا بڵاو دەبێتەوە، ئەو تیشکە پرش و بڵاوەیە وادەکات ئاسمان بەشینی ببینین.**

### زەوی لەچی پێك دێت؟

مرۆڤ لەگەڵ ئەوەی خەریکی دۆزینەوەیە، لەسەر مانگ و هەسارەکانی تر، بەڵام هێشتا نازانێت زەوی لەچی پێك هاتووە.

بەوەڵامێکی ئاسان دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کەزەوی گۆیەکی گەورەیەو بەشی زۆرینەی بەردەو لەچینەکانی ژێرەوەیشیدا بەردی تواوە هەیە.

بەڵام سەرپۆشی سەرەوەی لەبەردی ڕەق پێکهاتووە، چونکە ناو جەرگەی زەویش ڕەقە لەبەر ئەوە دەبینین بەردەکان توشی پاڵە پەستۆیەکی زۆر دەبن، بەرگی دەرەوەی زەوی توێکڵێکی بەردیە قەبارەی لەنێوان دە بۆ سی میل دایە، هەندێك جار بەوتوێکڵە دەوترێت وشکانی و بەشە بەرزەکانیشی "کیشوەرەکان"ە، بەشە نەویەکانیشی بریتیە لەئاوی زەریاو دەریاکان، کەهەموو ئاوەکان لەزەریاکانەوە تاڕووبارەکان دەگرێتەوە.

کەپێی دەوترێت "زەریا ئاویەکان یان بەرگی ئاوی زەوی".

مرۆڤ تائێستا نەیتوانیوە جگە لەبەشی توێکڵی بەردی کەدیوی دەرەوەی زەوی دروست دەکات زیاتر لێکۆڵینەوە بکات، بۆیە ئاستەمە بزانرێت چی لەزۆر قوڵایی ناو جەرگەی زەویدا هەیە، بەڵام هەڵکەندنی بیری قوڵ و گەڕان بەشوێن کانزاکاندا دەریان خستوە، هەرچەندە زیاتر شۆڕ ببنەوە بۆ قوڵای زەوی، پلەی گەرما بەرز تر دەبێتەوە، تەنیا لەقوڵای دوو میلەوە لەژێر زەوی، پلەی گەرماکەی بەسە بۆ کوڵاندنی ئاو.

بەڵام زانایان توانیان لەکاتی لێکۆڵینەوە لەسەر بوومەلەرزە، لەژێر زەویش بزانن، ئەوان دەڵێن: پلەی گەرما لەژێر زەویدا بەخێرایی زیاد ناکات، وەکو لەتوێکڵدا زیاد دەکات، بۆیە بڕوایان وایە پلەی گەرما لەکرۆك یان چەقی زەویدا لە ٥٥٠٠ پلەی سەدی زیاتر نیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم گەرمایە زۆر بەرزەو لەپلەی گەرمای ١٢٠٠دا بەرد دەتوێتەوە.

### بۆچی نرخی زێڕ گرانە؟

سێ شت وادەکات هەمیشە نرخی زێڕ بەگرانی بمێنێتەوە، یەکەمیان جوانیەکەی،

دوەمیان سودەکەی، سێیەمیان کەمیەکەی، ڕەنگە ئەگەر ئاسنیش لەسروشتدا وەکو زێڕ کەمبوایە، ئەویش لەنرخی زێڕدا بوایە.

زێڕ کانزایەکی زەردی نەرمە، لەتوخمە کیمیاویەکانی تر قورسترە، "٢٠٠" سم سێجا لەزێڕ زیاترە لە"٥٤٠" کیلۆ گرام دەکێشێت، لەکانزاکانی تر خۆشتر ئیشی تێدا دەکرێت، بەئاسانی دەکوترێت و زاخاو دەدرێت، دەتوانرێت لەیەك گرام زێڕدا ڕووبەرێکی دوو مەتری دروست بکرێت.

بەپێچەوانەی زۆربەی کانزاکانی ترەوە چەند بخرێتە بەرهەوا درەو شاوەیی خۆی لەدەست نادات "وەکو چۆن لەزیودا ڕوو دەدات"، بۆ هەتا هەتایە بەجوانی و درەوشاوەیی دەمێنێتەوە، ڕەنگە هەر ئەمەش وای کردبێت کەمرۆڤی کۆن زۆر بەنرخیان داناوە.

زێڕ کەمترین کانزایە کەکالیکردنی کیمیاوی دەکات، لەگەڵ ژمارەیەکی کەم دانەبێت لەترشەکان کارلێکردن ناکات.

بەفراوانترین بەکار هێنانی زێڕ ئەوە بووە وەکو دراو بەکار هێنراوە، لەهەمان کاتدا پارە لەئاسنیش دروست کراوە، بەڵام پارەی ئاسن نرخەکەی جێگەی گومان بووە، بەڵام هیچ گومانێك لەبەهای دراوی زێڕدا نەبووە.

بەهاتنی ساڵی ١٩١٤ زێڕ بوو بەپێوەرێك بۆ هەموو دراوە جیهانیەکان، وەکو دینارو ڕیاڵ و دەرهەم و دۆلاری ئەمریکی و فەرەنکی فەرەنسی و مارکی ئەڵمانی و ڕۆپڵی ڕوسی و ڕوپیەی هیندی و یەنی یابانی و....هتر.

هەموو ئەم دراوانە نرخێکی دیاری کراویان هەبوو بەزێڕو دەتوانرا لەهەر کاتێکدا بەزێڕ بگۆڕدرێنەوە، ئەم سیستەمەش لەیاساکانی دراودا بەیاسای زێڕ ناسرا بوو، هەرچەند ئەم یاسایە ئەمڕۆ ئیشی پێ ناکرێت، بەڵام هێشتا زێڕ گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لەبازرگانی جیهانیداو وەکو یەدەکێك بەکار دەهێنرێت بۆ پشتگیری بازرگانی نێو دەوڵەتی وڵاتانی جیهان.

زێڕ لەزۆر بواری جیاجیا بەکار دەهێنرێت، زێڕ نگەرەکان نزیکەی ١٠٪ی لەکاری زێڕنگەریدا بەکار دەهێنن، لەپیشە سازی ددان یشدا بەکار دەهێنرێت، لەگەڵ چەند جۆرێکی دیاری کراوی گەیەنەرە کارەباییەکاندا، چونکە گەیەنەرێکی زۆر

باشه.

کانه زێڕەکانی باشوری ئەفریقیا لەنیوەی زیاتری زێڕی دونیا بەرهەم دەهێنن دەوڵەمەنترین کانە زێڕی جیهانیش لەساڵی ١٨٨٦دا لەباشوری ئەفریقیا دۆزرایەوە.

**تەم چییە؟**

تەم هەورێکە بەسەر زەویەوە، هیچ جیاوازیەکی بنەڕەتی نیە لەنێوان تەمو هەورێك لەئاسماندا.

کاتێك هەور لەسەر ڕوی زەوی یان دەریا نزیك دەبێتەوە پێی دەوترێت "تەم" ڕونترینی تەمەکان ئەوانەن کەلەشەو یان بەرەبەیاندا دەیانبینین، لەسەر زەوی یان گۆماوەکان، لەئەنجامی تەوژمی هەوایەکی سارد کەدەدات لەڕوبەرێکی گەرم لەسەر زەوی یان ئاو.

زۆرترین تەم لەوەرزی پایزدا ڕوو دەدات، لەبەر ئەوە هەوا لەڕۆژدا زۆر بەخێرایی سارد دەبێتەوە لەسەر وشکانی و ئاودا، لەدوای دەرکەوتنی تاریکی شەو چینێکی ناسك لەتەم لەنزیك وشکانی و ناوچە نزمەکاندا دروست دەکات، کاتێك بەشەو زەوی سارد تر دەبێت، هەوا خاوەکە زیاتر دەبێت، لەکاتێکدا ئەو هەوا ساردە لەگەڵ هەوای شێدارو هەوای گەرمی سەرەوەی خۆیدا لەیەك دەدەن، تەم دروست دەبێت.

وەکو ڕێسایەکی گشتی تەمی سەر شارەکان لەتەمی دەشتەکان ئەستور ترن، هۆکەشی ئەوەیە هەوای شارەکان پڕ تەپو تۆزو دور ژەنگنو لەگەڵ گەردیلەی ناسکی و ناو ئاودا تێکەڵ دەبنو ئەو چینە ئەستورە دروست دەکەن.

لەبەرامبەر لێوارەکانی "نیوفاونلاند" کەبەتەماوی ترین ناوچەی جیهان دەژمێردرێت، تەمەکەی لەئەنجامی ئەوەوەیە، هەوای گەرمو شێدار بەسەر ئاوە ساردەکەیدا دەچێت کە لەناوچەی جەمسەری باکورەوە هەڵدەقوڵێت، ساردی ئاوەکەی دەبێتە هۆی چڕکردنەوەی شێی هەواکەو گۆڕینی بۆ دڵۆپەی بچوك بچوك، ئەو دڵۆپانە هێندە گەورە نین کەببنە باران، بەڵکو لەهەوادا وەکو تەمێك دەمێننەوە.

**هۆی چیه تەم لەهەور چڕتره؟**

لەبەر ئەوەیە دڵۆپەً لەتەمدا بچوکترە، لەبەر ئەوەی ئەو ژمارە زۆر لەدڵۆپە تیشکی زۆر وەردەگرن، وەکو لەدڵۆپە گەورەکان، بۆیە تەم چڕتر دێتە بەرچاو.

**کێ پێنوسی مەرەکەبی داهێنا؟**

هونەری نوسین گرنگترین هاوکار بووه، لەپێش خستنی شارستانیەتی مرۆڤدا، بۆیە لەو ڕێگەیەوه بوو مرۆڤ توانی رابردوو کردارو بۆ چونەکانی خۆی تۆمار بکات.



بەڵام پێش ئەوەی ئەم پێنوسە تازانە دروست بکرێت کەئێستا بەکاری دەهێنین، کەرەستەی زۆر هەبووه بۆ نوسین.

بۆ نموونە مرۆڤی سەرەتایی بەردی تیژی بەکار هێناوه بۆ نوسین و کێشانی وێنەکانی لەسەر دیواری ئەشکەوتەکان، بەڵکو پەنجەی ژەندۆتە شلەی ڕووەك یان خوێنی ئاژەڵانداو وەکو پێنوس بەکاری هێناوه، دوای ئەوه بوه خۆڵو تەباشیری بەکار هێناوه، چینیەکانیش نوسینەکانیان بەفڵچەیەکی نەرم نووسیوه کە لەموی حوشتر دروستیان دەکرد.

ڕەنگە میسریەکان یەکەم کەس بووبن، پێنوسی ڕاستەقینەیان دروست کردبێت، ئەویش بەگرێدانی پارچەیەك مس کەلەنووکی پێنوسی بۆڵاینی ئەم سەردەمە چووه، بەقەدی ڕوەکێکی ناو کلۆرەوه.

بەڵام یونانیەکان یەکەم کەس بونە پێش چوار هەزار ساڵە پیتەکانیان، بەبەکارهێنانی پێنوسێك کە لەکانزا یان ئێسك یان عاج دروستیان کردووه، نوسیوه.

لەسەر تابلۆیەك پێیان دەنوسی کە بەمۆم سەرپۆش کرا بوو، دوای ئەوه پێنوسی نێشدار دروست کرا، ئەویش بەقڵیشاندنی نوکی قامیشێکی کلۆر، کەدەژەنرایە جۆرێك مەرەکەبداو لەسەر کاغەزی "بردی" بەکار دەهێنرا.

کاتێك لەچەرخی ناوەڕاستدا کاغەز دروست کرا، مرۆڤ فێر بوو "پێنوس" لەپەڕی قازو کە لەشێرو مراوی دروست بکات.

سەری پەڕەکەی پاندە کردەوەو دەیقڵیشاند، بۆ ئەوەی لەقڵیشەکەوە مەرەکەب بڕژێتە سەر کاغەزەکە.

وشەی پێنوس "Pen" لەزمانی ئینگلیزیدا لەوشەی "Pena"ی لاتینی یەوە وەرگیراوە کەمانای "پەڕ" دەدات.

لەگەڵ ئەوەی پێنوسی پەڕ تەمەنێکی درێژی نەکرد، بەڵام بۆ ماوەی هەزار ساڵێك مرۆڤ لەنوسینەوەدا بەکاری هێنا.

ئەو پێنوسە مەرەکەبانەی ئەمڕۆ بەکار دەهێنرێت، لەهەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا دروست کرا.

"نێشن" یان نووکی پێنوسی مەرەکەبەکە، لەزێڕی چواردە عەیار دروست دەکرێتو بەماددەی ئیریدوسمین یان ئیریدیوم دادەپۆشرێت، ئەو مەوادە نەرمو ڕەقانە وادەکات کەئەو پێنوسە لەکاتی نوسیندا کڕ دروست نەکات.

پێنوسی مەرەکەب لەناوەوە لەلوولەکێکی لاستیك یان پلاسکۆ دروست کراوە بۆ ئەوەی مەرەکەبەکەی تێ بکرێت.



بەڵام پێوسی ووشك "جاف" لەداهێنانەکانی سەدەی بیستەمە، نووکی پێنوسکە بریتیە لەساچمەیەکی بچوکی لەپۆڵا دروست کراو کەتیرەکەی میلیمەترێکەو لەکاتی نوسیندا، لەسەر پەڕە کاغەزەکە ساچمەکە بادەخواتو بەو جۆرە مەرەکەبە ووشکەکە بۆ خۆی ڕادەکێشێت، لەناو لاشەی پێنوسەکەدا.

## ئەرستۆ کێیە؟

ئەرستۆ گرنگترین پیاوانی یونانی کۆنو مەزنترین فەیلەسوفی جیهان بووە.

ئەرستۆ بۆ ماوەی بیست ساڵ قوتابی ئیفلاتۆنی فەیلەسوف بوەو،

دواى مردنى ئيفلاتۆن، ئەرستۆ درێژەى بەڕێبازى خوێندنو قوتابخانەى ماموّستاكەى دا.

لەڕوى كرداريەوە گرنگى دەدا بەهەوو كێشەيەك كەڕوو بەڕووى مرۆڤ دەبوەوە وەكو: عەقلّ چۆن ئيش دەكات؟ چۆن دەتوانێت فێربن چاكو خراپ لێك جودا بكەينەوە؟ باشترين جۆرى حوكم كامەيە؟

ئەرستۆ هەولّى دەدا وەلّامى پرسيارەكانى لەجيهانەكەى دەوروبەرى خۆيەوە وەربگرێت، چونكە بڕواى وابو هەموو ڕوداوێك تەفسيرێكى مەنيقى خۆى هەيەو يەكەمين كەسيش بوو لەدونيادا بەتێبينىو لێكۆلّينەوە ئەنجامى دەست كەوت.

ئەرستۆ قوتابخانەيەكى تايبەت بەخۆى كردەوەو ناوى نا "ليسيۆم" واتە "هۆلّێك بۆ وتارو گفتو گۆى گشتى"، هەموو مرۆڤەكانى هەلّدەنا بۆ گەڕان بەدواى پێگەى خۆى لەدونيادا، لەڕێگەى فێربونى چۆنيەتى بردنە سەرى ژيانێكى خۆشو بەسود، بڕواى هێنا بە "بنكەى زێڕين" كەپەسەندكردنى مام ناوەنديەتە لەنێوان دوو لێك نەچوودا.

دەلّێن ئەرستۆ نزيكەى ٤٠٠ كتێبى نوسيوە لەبابەتەكانى گەردون ناسىو فيزياو شيعرو زيندەوەرزانىو وتاربێژىو زانيارى ئاژەلّانو مەنتيقو ڕامياريو حوكمو ڕەوشتدا.

خەلّكى سەدان سالّە لەسەرانسەرى جيهاندا كتێبەكانى ئەرستۆ دەخوێننەوە، هيچ كەسێكيش تائێستا وەكو ئەرستۆ كاريگەرى نەبوە لەسەر مێشكى خەلّكى زانايانى هاوچەرخ ڕاستى تێبينيەكانى ئەرستۆيان سەلماندوە كەپێش زياتر لەدوو هەزار سالّە نوسيويەتى، كەدەلّێت "ڕاستى بنەماى هەموو زانستێكە".

### گوێ سمين لەكەيەوە پەيدا بووە؟

مێژوى گوێ سمين دەگەڕێتەوە بۆ پێش مێژوو، هينديە ڕۆژهەلّاتىو فارسو ميسرىو عەرەبو يەهوديەكان گوێوارەيان لەگوێ كردووە.

گوێوارە لەسەردەمى ئەترۆريەكاندا كەولّاتێكى كۆن بووە لەڕۆژئاواى ئيتاليا.

لەخشلّو زێڕ لەشێوەى گولّو ميوەو گولّدانو مانگو تاوسو قازدا گوێوارەيان دروست كردووە.

يۆنانيەكان لەژێر گوێوارەيان دروست دەكردو ديانكردە گوێى خواوەندەكانيان، پياوەكانيشيان تادەگەيشتنە تەمەنى هەژدە سالّى گوێوارەيان لەگوێ دەكرد.

ڕۆمانيەكانيش لەگوێوارە لەگوێكردندا چاوكەريان لەيۆنانيەكان دەكردو ئافرەتەكانيشيان گوێوارەى گران بەهايان لەگوێ دەكرد لەگەلّ زێڕو خشلّى تردا.

پياوانى ڕۆمان بۆ لەگوێ كردنى گوێوارە گوێيان كون دەكردو ئەم كارەش بەجۆرێك بەناو خەلّكيدا بلاّو بوەوە، تالەسەدەى سێيەمى پاش زاين، ئيمپراتۆرێكى ڕۆمانى فەرمانى قەدەغەكردنى گوێوارە لەگوێ كردنى پياوانى دەركرد. لەسەدەكانى ناوەڕاستدا پياوان گوێوارەيان دەكردە گوێى چەپيان، لەئەنجامى ئەوەدا قژ داهێنانى ژنانو پياوانيش گۆڕدرا. كاتێكى تر كەباوى قژ درێژ كردن هاتەوە، نەريتى گوێوارە لەگوێ كردن نەما، بەلاّم لەسەدەكانى پانزەهەمو شانزەهەمدا جارێكيتر باوى هاتەوە.

هەرچەندە لەم سەردەمەى خۆماندا، گوێوارە لەگوێ كردن لاى پياوان شتێكى باو نيە، بەلاّم چەند كۆمەلّێكى تايبەت هەن تائێستاش گوێوارە لەگوێ دەكەن وەكو قەرەجەكانو دەرياوانەكانو هەندێك لەپياوان لەئيتالياو ئيسپانيادا.

سەردەمێك پزيشكان دەيانگوت گوێ كون كردن سوودى زۆرە، بەلاّم ئەمڕۆ ئەو باوەڕەش لاى ئەوان نەماوە، كەگوێ كون كردن يارمەتى گوێ بدات!

### با لەكوێوە دێت؟

بۆ هەلّكردنى با دوو بۆچوون هەيە، كە لەكوێوە دێت، يەكەميان پەيوەندى بەناوچەكەمانەوە هەيەو ئەوى تريشيان بەجيهانو ئەو باتيژە كەبەسەريدا هەلّدەكات.

باى ناوچەيى بۆيە هەلّدەكات، چونكە ئەو ناوچە بچوكە تۆ لێى دەژيت، پالّە پەستۆكانى جياوازن، ئەگەر لەكەنار دەريايەك بژيت ئەوا ڕۆژانە نموونەى ئەو بايە دەبينيت.

لەڕۆژدا كەزەوى گەرم دەبێت، هەواكە بەرز دەبێتەوە بۆ سەرەوەو هەواى ساردى سەر دەرياكان دێتە شوێنى، لەشەويشدا كاتێك زەويەكە لەئاوەكە سارتر دەبێت، ئەوا هەوا گەرمەكەى سەر ئاوەكە بەرز دەبێتەوەو بەو جۆرە نەسيمى سەر زەوى

دەچێتە شوێن هەوا گەرمە بەرز بووەکە.

ئەو حاڵەتەی بەسەر ناوچەکەتدا جێ بەجێ دەبێت، تاڕادەیەکی زۆر بەسەر گۆی زەویشدا بەهەمانشێوە جێ بەجێ دەبێت.

گەرمترین شوێنی سەر ڕوی زەوی دەکەوێتە دەوروبەری هێڵی ئیستیواوە، چونکە پشتێنەیەك لەهەوای گەرم هەیە لەم ناوچەیەدا کەهەمیشە بەرز دەبێتەوە، ئەو پشتێنە هەوا گەرمەش دەچێت بۆ هەردوو باڵی باکورو باشورو لەبەرزاییەکی دیاری کراودا دەوەستێت، ئەو بەرزاییانە پێی دەوترێت "بەرز بوونەوە ئەسپیەکان"، ئەم هەوایە بەسەر ڕوی زەویدا دەکشێت بەرەو هێڵی ئیستیواو هەردوو جەمسەری باکورو باشوور.

ئەگەر زەوی نەسوڕایەتەوە، ئەوا ئەو بایە باکوری‌و باشوریە دروست نەدەبوو، بەڵام سوڕانەوەی زەوی وادەکات، بای نیوەی گوێ باکوری زەمین بچێت بەرەو لای ڕاست‌و نیوەی باشوری زەمینیش بچێت بەرەو لای چەپ.

## کەی نەوت وەك سوتەمەنی بەکارهێنرا؟

نەوتی خاو پێی دەوترێت "پترۆڵ" ئەو بەردانەی پترۆڵی تێدایە، لەشوێنێکی زۆر قوڵی ژێر زەویدان‌و بەڕێگەی چونە ژێرەوە دەتوانین بەنەوت بگەین.

لەهەندێك شوێندا، لەڕێگەی درزی زەویەوە نەوت دێتە دەرەوە بۆ سەر زەوی بۆیە مرۆڤ بەئاسانی دەتوانێت شوێنی کانگا نەوتیەکان دیاری بکات، لەکۆنیشدا زۆربەی دەڵاندەنە نەوتیەکان لای گەلان ناسراو بوەو بۆ چراو گڕاندن سودیان لێ وەرگرتووە.

مێژوی فیعلی نەوت لەسەدەی نۆزدەهەمدا دەستی پێکرد، چونکە شۆڕشی پیشەسازی وای کرد، خەڵکی پێویستیان بەنەوتی خاوێنتر ببێت بۆ بەگڕ خستنی کارگەکانیان لەزۆربەی ناوچەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکاندا، نەوت نزیکە لەسەر ڕوی زەویەوەو لەکۆنیشدا زۆرجار وەکو دەرمان بەکار هێنراوە.

یەکەم کەس بیری کردەوە نەوت لەژێر زەوی دەربێنێت پارێزەرێکی نیۆیۆرکی بوو بەناوی "جۆرج بیشل"، بیشل نموونەیەك لەنەوتی خاوی بنسللیڤینیای نارد بۆ زانایەك لەزانکۆی "L" کەناوی "بنجامین سیلیمان" بوو.

پاش تاقیکردنەوە سیلیمان ڕایگەیاند: دەتوانرێت گەلێك بەرهەمی تری بەسوود لەنەوت دەربهێنرێت وەکو: گاز، مۆمی پارافین، بەنزین، ڕۆن‌و هیتریش، ڕاپۆرتەکەی سیلیمان وای کرد، بازرگانان بگەنە ئەو بڕوایە کەنەوت دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبون.

بیشل، پیاوێکی بەکرێ گرت بەناوی "ئۆدین دریك" بۆ هەڵکەندنی بیرە نەوتێك لەنزیکی "تیتۆسڤیل" لە٢٧ ئابی ١٨٥٩دا نەوت دۆزرایەوەو دەرهێنرا.

هەواڵەکەش زۆر بەخێرایی بڵاو بوەوە، خەڵکی ڕویان کردە ئەو شوێنە بۆ کڕین یان بەکرێ گرتنی ئەو شوێنانەی نەوتی تێدایە.

گەرمی نەوت بڵاو بوەوەو شوێنەکانی تری ویلایەتە یەکگرتوەکان‌و کەنەداو ئەورووپای گرتەوە، دوای ئەوە بەکارهێنانی تازەتر بۆ نەوت دۆزرایەوە، وەکو بەکارهێنانی سووتەمەنی، بەوەش داواکاری لەسەر نەوت زیادی کرد، تائێستاش بەکارهێنان‌و گەڕان بەدوای نەوتدا لەسەرانسەری جیهاندا بەردەوامە.

### چاخی بەفری کەی کۆتایی هات؟

زۆرێك لەخەڵك وادەزانن چاخی بەفرین لەدێر زەمانەوە ڕابوردووە، بەڵام زەوی ناسان دەڵێن: وائێستا دەگەینە کۆتایی چاخی بەفر.

لەبەر ئەوەی ئەو خەڵکانەی تائێستا لە "گرینلاند"دا دەژین هێشتا لەچاخی بەفردان، نزیکەی بیستوپێنج هەزار ساڵ لەئێستا ئەوانەی لەئەمریکای ناوەڕاست‌و باکوردا دەژیان بەدرێژایی ڕۆژەکانی ساڵ لەناو بەفردا بون، چونکە دیوارێك لەبەفر لەم کەنار بۆ ئەو کەنار تاباکور بەبێ کۆتایی درێژ دەبوەوە.

ئەوە دواین چاخی بەفر بوو کاتێك هەریەك لەکەنداوو ژمارەیەك لەویلایەتەکانی ئەمریکاو زۆربەی باکوری ڕۆژئاوا، بەبەفر داپۆشرا بوو کەئەستوریەکەی لەهەزار مەتر زیاتر دەبوو.

ئەمە وای کردووە کەکەش‌و هەوا زۆر سارد بێت‌و پلەی گەرما لەباکوری ویلایەتە یەکگرتوەکاندا پێنج پلە بێت، لەهاوینیشدا دونیا فێنك‌و خۆش بووە، ئەمەش وای کردووە ئەو بەفرە لەوەرزی هاویندا نەتوێتەوەو لەزستاندا جارێکیتر بەفری بەسەردا ببارێت.

**چاخى بەفرين لەچوار كاتدا ڕوى داوە؟**

بڕوا وايە ماوەى يەكەم چاخى بەفرين، لەئەمريكاى باكوردا، پێش دوو مليۆن ساڵ بووە.

دووەميشيان: پێش لە ١٢٥٠٠٠٠ ساڵ بووە، سێيەميشيان پێش لەيەك مليۆن ساڵو چوارەميشيان بەر لەسەد هەزار ساڵ بووە.

لەدواين چاخى بەفريندا، بەفرەكان لەهەموو شوێنەكاندا وەكو يەك نەدەتوانەوە، بۆ نموونە:

ئەو بەفرەى، كەگەيشتە ويسكۆنسينى ئەمريكا پێش چل هەزار ساڵ دەستى بەتوانەوە كرد، بەڵام ئەو بەفرەى نيوئەنگلاندى داپۆشى بوو پێش لەبيستو هەشت هەزار ساڵ تواوەتەوە.

ئەوروپاو ئەڵمانياش حەڤدە هەزار ساڵ بەر لەئێستا لەژێر بەفر دەرچون، لەكاتێكدا سويد لەژێريدا مايەوە تاپێش سيانزە هەزار ساڵ بەر لەئێستا.

**بۆچى لقى دار زەيتون هێماى ئاشتييە؟**

دارى زەيتون دارێكى مام ناوەندىو هەميشە سەوزە، بەرگەى بێ ئاوى دەگرێتو درێژييەكەى لەنێوان سێ بۆ دوانزە مەترداية، بەرەكەشى بەلاى هەموو خەڵكى جيهانەوە خواردنێكى باشە، بەرى زەيتون دەكرێتە ڕۆنو لەزۆر پيشەسازيەكاندا بەكاردێت كەگرنگترينيان پيشەسازى سابوونە.

مێژوى زەيتون مێژويەكى دێرينەو شارستانيەتە كۆنەكان، لەدەرياى ناوەڕاستدا چاندويانەو پاشان بەدونيادا بڵاو بۆتەوە.

لەسەردەمى دۆزينەوە جوگرافيەكاندا، گەيشتۆتە هەردوو ئەمريكاو بەتايبەت ويلايەتى كاليفۆرنياو باشورى ئەفريقياو ئوستراليا.

لەبەر قازانجە زۆرەكانى خەڵكى كۆن زەيتونيان بەپيرۆز زانيوەو كردويانەتە هێماى ئاشتى تاپێش سەرەتاى سەردەمى مەسيحيەت.

دەڵێن يەكەمين ڕوەك كەنوح پێخەمبەر "عليه السلام" بينيويەتى لقى دار زەيتون بووە، بەنوكى ئەو كۆترە سپيەوە كە لەكەشتيەكەيەوە باڵى دايەوە، دواى لافاوەكە.

بەمەش زانی کەلافاوەکە نیشتۆتەوەو زەوی خەریکە وشك دەبێتەوە، بەوەش ترس و دڵەڕاوکیٚ لەناویاندا ڕەویەوەو ترسی خنکانیان نەما، ئیتر دڵنیا بون کەدەتوانن بەئاسایو ئاشتی بژین، بۆیە لەو ڕۆژەوە بەدواوە خەڵکی لقی زەیتونیان کردە هێمای دۆستایەتی و خۆشەویستی و کۆتری سپیش بوو بەهێمای ئاشتی.

### کەی چاویلکە داهێنرا؟

ئەگەر سەیرێکی دەوروبەری خۆمان بکەین دەبینین خەڵکێکی زۆر چاویلکە لەچاو دەکەن.

تاوای لێهاتووە هێندە بەلامانەوە ئاساییە، زۆر زەحمەتە خەیاڵمان بۆ سەردەمێك بچێت کەچاویلکەی تێدا نەبووبێت!

لەڕاستیدا نازانرێت چ کاتێك چاویلکە داهێنراوە، بەڵام لەساڵی ١٢٦٦ زاینیدا ڕاهیبێکی ئینگلیزی کەخەریکی تاقی کردنەوەی سەیر سەیر بوو ڕێگەیەکی دۆزیەوە کەپیتەکان گەورەترو ئاسانتر بکاتەوە لەکاتی خوێندنەوەدا، کەبریتی بوو لەپارچە شوشەیەك کەدەیخستە سەر کتێبێك لەکاتی خوێندنەوەدا! ئەڵبەت ئەم کارەی یارمەتی گەورە کردنەوەی پیتەکانی نەدەدا، بەڵام هەر هەنگاوێکی باش بوو.

یەکەم بەڵگە بۆ ئەوەی کەسێك چاویلکەی لەچاو کردبێت بریتیە لەتابلۆی کاردیناڵێك کە لەساڵی "١٣٥٢"دا لەئیتالیا وێنە کێشراوە، کەتیایدا کاردیناڵەکە، لەو تابلۆیەدا چاویلکەیەکی لەسەر چاوی داناوە.

کاتێك کتێبی چاپکراو بڵاوبوەوە، چاویلکە بۆ زۆر لەخەڵکی بوو بەشتێکی پێویست و بەکارهێنانیشی بڵاوبوەوە.

لەسەدەی شازدەهەمدا چاویلکە بەڕێژەیەکی زۆر لەباکوری ئیتالیاو باشوری ئەڵمانیادا دروست دەکرا.

لەساڵی ١٧٨٤ بینجامین فرانکلینی ئەمریکی چاویلکەی جوت تیشکۆیی دروست کرد، کەبریتی بوو، لەدوو جۆری جیاواز لەگەردبین لەجوتی هەمان چاویلکەدا.

چاو لەشێوەیدا، لەگۆیەکی نەختێك هەڵتۆقیو دەچێت لەپێشەوەیدا، لەچەقی هەڵتۆقیوە کەشدا، بیلبیلەی چاوەکە ڕێگە دەدات بەتیشك بچێتە ژورەوە بۆ بەشی

تاريكى چاو، تيشكەكەش لەبيلبيلەوە تێدەپەڕێت بۆ گەردبينى چاو.
کەتیشك چڕ دەکاتەوەو لەبەشى دواوەى چاودا وێنە دروست دەكات، کەتۆڕێك لەخانەى هەستيار هەيە بۆ تيشك پێى دەڵێن "الشبكيه".
چاوى هەندێك کەس تۆزێك لەدرێژى ئاسايى درێژ ترە، لەپێشەوە بۆ دواوە، لەكاتێكدا هەندێك کەس چاويان كورتترە، بەجۆرێك كەگەردبينى چاو ناتوانێت تيشكەكە، بەشێوەيەكى ڕون بچێتە سەر تۆڕەكە، بۆيە چاويلكە گەردبينێكى زياترە داداتە چاو.
ئەو گەردبينە زيادەيە، گەردبينە ڕاستەقينەكە كەچاومان دروستى دەكات ڕاست دەكاتەوە، بەشێوەيەك كەوێنەى سەر تۆڕەكە ڕونتر دەكاتەوە، بەوەش دەتوانين بەشێوەيەكى باشتر ببينين.

### مرۆڤ چۆن فێرى نوسين بوو؟

هيچ کەس نازانێت كەىو لەكوێ نوسين پەيدا بووە، بەڵام شتێك دەزانين دەربارەى پێشكەوتنى لەسەردەمەكانى كۆندا.
مرۆڤ سەرەتا بەوێنە دەستى بەنوسين كردووە، وەكو تۆمارێك بۆ ڕووداوەكانو جەنگەكانو ژيانى خێڵەكى خۆى.
وێنەكێشانيش وەكو نامە بەكارهێنراوە، بۆ نموونە وێنەى خۆرێك يان دوو خۆرى لەنزيك يەك بكردايە، ئەوە واتاى دوو ڕۆژى دەگەياند، وێنەى ئەو جۆرە هێمايەش پێى وتراوە نوسينى وێنەيى.
كاتێك شارستانيەت پيشكەوت، دەستو برد كرا لەئاسان كردنەوەى نوسنى وێنەيى، ميسريەكان هێڵێكى شەپۆلاويان بەكار دەهێنا كەواتاى شوێنێكى ئاوى دەدا.
چينيەكانيش گوێيەكيان لەنێوان دوو دەرگادا بەكار بهێنايە واتاى "ببيسە"ى دەدا.
نموونەى ئەم ئامارژانەش پێى دەوترا ئيديۆم يان ئيديۆگرافيا واتا نوسين بەهێما كەنوسينى هيرۆ گلۆفىو چينى ئەم نوسينەيە.
ميسريەكان سيستەمێكيان لەئامارژە بەكار دەهێنا پێيان دەوت هيرۆگلۆفى،

کەلەبنەڕەتدا وێنەیان هێما بوو، بەڵام بەتێپەڕبونی سەدەکان سیستەمێکی دەنگیشیان داهێنا ئەم جۆرە نوسینەش بریتی بوو لەئاماژەی دەنگی، نەك وێنەو بیرۆکە.

لەگەڵ زیاتر پێشکەوتنی شارستانیەتو گەشەکردنیدا، مرۆڤ پێویستی زیاتر بەئاماژەکان بوو، بۆیە ڕێگەی حنجەی ووشەکان پەرە پێدا بەپێی دەنگەکە.

نموونەی ئەوەش لەزمانی ئینگلیزیدا وشەی "بیلیڤ" واتا وێنەی هەنگێكو گەڵای دارێك، نموونەی ئەم ئاماژانەش پێی دەوترێت "فۆنۆگرام" واتە پیتێکی خاوەن نرخێکی دەنگی، هەروەها پێشی دەوترێت نوسینی برگەیی، لەبەر ئەوەی برگەی دەنگی تیادا بەکار دەهێنرێت.

قۆناخی دوای ئەوە لەپێشکەوتنی نوسیندا، بیرۆکەی بەکارهێنانی ئەلفبای جودا دروست بوو، میسریەکانو بابلیەکان دەیانزانی چۆن، بەبەکارهێنانی یاسای ئەلفبا بەڕێگەی ئەبجەدی بنوسن.

لەڕێگەی بابلیەکانەوە یونانی ولاتینینیش وەرگیرا، کەئەمڕۆ لەلایەن زۆربەی خەڵکی دەرەوەی ئاسیاوە بەکار دەهێنرێت.

### جیاوازی وەرزەکان

لەدێر زەمانەوە مرۆڤ بەشوێنی هۆی گۆڕانی وەرزەکاندا گەڕاوە، هاوین گەرمەو زستان سارد، وەکو چۆن لەبەهاردا ڕۆژ بەرەو درێژ بون دەچێت، لەبەرامبەریدا، شەوی زستانیش درێژ دەبێت.

ئێمە دەزانین زەوی لەکاتێکدا بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، لەهەمان کاتدا بەدەوری خۆریشدا دەسوڕێتەوە.

ئەگەر میحوەری زەوی- هێڵی نێوان جەمسەری باکور بۆ جەمسەری باشور- لەگۆشەکانەوە، ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئاراستەی زەویدا، بەدەوری خۆردا بوایە، ئەوا هەرگیز وەرزی جیاوازمان نەدەدیتو هەموو ڕۆژەکانیساڵیش وەکو یەك درێژ دەبوون!

بەڵام میحوەری زەوی خوارەو هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە، بۆ هەندێك هێزی کاریگەر لەسەر ڕوی زەویدا، کەیەکێکیان ڕاکێشانی خۆرەو ئەوی تریان ڕاکێشانی مانگەو

هێزی سێیەمیشیان سوڕانەوەی زەویە بەدەوری خۆیدا، هەموو ئەمانە وادەکەن زەوی بەدەوری خۆردا بەشێوەیەکی خوار بسوڕێتەوە، بۆیە بەدرێژای ساڵ زەوی لەسوڕ خواردندایەو میحوەری زەویش هەمیشە بەلای ئەستێرەی جەمسەردا دەڕوانێت.

ئەمەش مانای ئەوەیە لەماوەی بەشێك لەساڵەکاندا، خوار دەبێتەوە بەرەو خۆرو لەبەشەکەی تری ساڵەکەدا لێی دوور دەکەوێتەوە.

لەئەنجامی ئەم خوار بوونەوەیە، تیشکی خۆر ڕاستەوخۆ دەکەوێتە سەر زەوی لەباکوری هێڵی ئیستیواو هەندێك جاری تریش لەسەر هێڵی ئیستیواو، هەندێك جاریش لەباشوری هێڵی ئیستیوا.

بەو جۆرە جیاوازانەی کەتیشکی خۆر دەکەوێتە سەر زەوی دەبێتە هۆی جیاوازی وەرزەکان لەشوێنە جیاجیاکانی دونیادا.

کاتێك نیوەی گۆی باکور، ڕوو بەڕووی خۆر دەبێتەوە، ئەو وڵاتانەی دەکەونە باکوری هێڵی ئیستیواوە وەرزی هاوین دەبینن، لەوڵاتانی باشوری هێڵی ئیستیواش دەبێتە زستان.

کورتترین ڕۆژی ساڵ پێی دەوترێت "کودەتای زستانە"و درێژترینیشی پێی دەوترێت "کودەتای هاوینە".

لەساڵێکدا لەسەرانسەری جیهاندا دوو ڕۆژ، شەو ڕۆژ تیایدا یەکسان دەبن، ئەو دوو ڕۆژەش دەکەونە، بەهارو پایزەوە لەنێوان هەردوو کودەتاکەدا.

یەکێکیان هاوشانی پایزەیە کەدەکەوێتە ٢٣ ئەیلوولەوەو ئەوی تریشیان هاوشانی بەهارەیە، کەدەکەوێتە ٢١ ئازارەوە.

### زیندانەکان چۆن پەیدا بوون؟

کاتێك بیر لەزیندان دەکەینەوە، بیر لەشوێنی ئەو کەسانە دەکەینەوە، کەپێچەوانەی یاسا دەجوڵێنەوە، زیندان بەم شێوەیەی ئەمڕۆ، سیستەمێکی تازەیە لەمێژوی زیندانەکاندا.

لەسەردەمەکانی کۆندا، دەوڵەمەندەکان و کەسایەتیە گرنگەکان دەگیران و دەخرانە زیندانەوە بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوە، یان سەرانە وەرگرتن لێیان.

هیچ کات زیندان، وەکو سزایەك یان چاکردنی نەیارانی یاسا بەکار نەهێنراوە، تاوەکو سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم.

زیندانەکان سەدەی نۆزدەهەم شوێنێك بووە، کەتاوانباران تیایدا ڕاگیراون تاکاتی دادگای کردنیان، دوای دادگایی یەکسەر سزاکەیان بەسەردا جێ بەجێ کراوە.

وەکو لەسێدارەدان یان کوتەك کاری یان غەرامە کردن‌و دوای ئەوە زیندانی نەکراوە کاربەدەستان وردە وردە گەیشتنە ئەو باوەڕە، ئەو هەڵس‌و کەوتە سەختە لەگەڵ تاوانباراندا ڕێگرنیە بۆ ڕونەدانی تاوان.

بۆیە لەئەنجامی ئەو بیر کردنەوەیەدا زیندان کرایە بەدیلی سزایی مردن‌و جەستەیی.

لەدەوروبەری ساڵی ١٥٥٠دا ئینگلیزو هەندێك لەوڵاتە ئورووپیەکان شوێنێکیان دروست کرد ناویان لێنا "خانەی کار" یان "خانەی چاکسازی" کەتیایدا، بێ نەوایان‌و هەڵاتوان لەخێزانەکانیان‌و سواڵکەران‌و قەرزاران‌و تاوانبارانیان تیادا زیندانی دەکرد. خانەی چاکسازی هێندە سەلامەت نەبوو، کەزیندانیان تیایدا هەڵنەیەن، بۆیە بیرکرایەوە، زیندانەکان بەجۆرێك دروست بکرێت، هۆیەکانی ئاسایشی زۆرتری تێدا بێت، بۆ هەڵنەهاتنی زیندانیان.

زۆربەی زیندانەکان شیاوی ئەوە نەبوون مرۆڤ تیاندا بژێت، چونکە زۆر پیس‌و پۆخڵ‌و بێ ڕوناکی‌و سارد بوون، هەروەها خواردنیشی زۆر پیس‌و مامەڵەکردنیش لەگەڵ زیندانەکاندا زۆر دڵ ڕەقانە بوو.

کۆمەڵێکی زۆر زیندانی پێکەوە دەخرانە ژورێکەوە بێ لەبەرچاو گرتنی تەمەن‌و جۆری تاوانەکانیان، لەگەڵ نەبوونی هیچ بەرنامەیەکی کارو چاکسازی لەزیندانەکاندا، بۆیە زیندانیەکان ڕۆژانەیان بەتەمەڵی‌و بێ کاری‌و سستی دەگوزەراند.

لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا خەڵکی دەستیان دایە وروژاندنی چاککردنی بارودۆخی زیندانەکان، بەگرتنە بەری ڕێگەی باشتر بۆ گرنگی دان بەزیندانیان.

بەتێپەڕ بوونی ڕۆژگار زیندانەکان گۆڕانکاری گەورەیان بەسەردا هات، ئەمڕۆ خەڵکێکی زۆر هەن بڕوایان وایە زیندانەکان دەبێت یارمەتی دەرین بۆ گۆڕینی

زیندانیان بەرەو چاکە، ئێستا جۆرەها بەرنامە هەیە کەبڕێکی زۆر پارەی تێدەچێت بۆ مەشق و یارمەتی دانی زیندانیان لەڕوی دەرونیو پزیشکیو سەر گەرم کردنو فێرکردنیانەوە.

چای لەکوێدا پەیدا بوو؟

شتێکی خۆشە بیر بکەینەوە لەهەندێك شلەمەنی، کەتائێستاش بەردەوام دەخورێت لەکاتێکدا خەڵکی پێش چوار هەزار ساڵیش خواردویانە، یەکێك لەو شلەمەنیانەش چایە.

چینیەکان چوار هەزار ساڵ هەستیان بەکاریگەری چای کردوەو خواردویانە، بەڵام دونیای رۆژئاوا ماوەیەکی زۆر دورو درێژ چاوەڕێیان کرد تاچوە ناویانەوە، پێش سێسەد ساڵێك لەمەو بەر.

لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا بوو ئەوروپاو ئەمریکای باکوری بەچای خواردن ڕاهاتن، لەئەنجامی ئەوەدا بازرگانی چای لەگەڵ چیندا گەشەی سەندو کەشتی زۆر خێرا دروست کرا ناویان لێنا "کەشتی چای" بۆ گواستنەوەی گەڵای چای بۆن خۆش لەچینەوە بۆ ئەمریکای باکورو ئەوروپا.

بەریتانیەکانیش داری چای دەشتیان لەئوسامی هینددا دۆزیەوە، زانایانی ڕوەك بڕوایان وایە، چینیەکانیش داری چاییان لەهیندەوە هێنابێتو لەوڵاتی خۆیاندا کشتیان کردبێت، بەریتانیەکانیش ئەو چایەیان کەلەهیندەوە دەبرد بۆ وڵاتی خۆیان، سەیریان کرد لەگەڵ چاییە چینیەکەدا هەمان تامو بۆن دەدات.

لەسەرەتادا کێڵگەی چای زۆر گەورە لەهینددا دروست کرا، پاشانیش لەسیلان "سریلانکای" ئێستا، بەجۆرێك کشتو کاڵی چای بوو بەپیشەی سەرەکی لەم وڵاتەداو تاساڵی ١٩٤٠ بوو بەیەکەمین وڵات لەناردنە دەرەوەی چایداو، بەوەش پێش وڵاتی چین کەوت، هەروەها چا لەجاواو سۆمەترەو فۆرمۆزەدا کشت دەکرێت.

ڕوەکی چای دوو جۆری سەرەکی هەیە:

جۆرە چینیەکەی بەگشتی تەنیا مەترێك بەرز دەبێت، بەڵام جۆرە هیندیەکەی ئەگەر بهێڵن شەش مەتر بەرز دەبێت.

**ئایا دەزانن بەریتانیەکان لەهەموو گەلانی تری سەر زەوی زیاتر چای دەخۆن؟**
ئینگلیزیەکی ئاسایی سالانە چوار کیلۆ چای دەخوات، لەکاتێکدا ئەمریکیەك سالانە نزیکەی ٠،٥ لەکیلۆیەك چای دەخوات.

### ئەشکەوتەکان چۆن دروست بوون؟

ئەشکەوت لەگەڵ مێژوی مرۆڤدا بوەتە شتێکی لەیەك جیا نەکراوە، ئێمە دەزانین ئەشکەوت تاکاتێکی درەنگ لە "چاخی بەردینی کۆن" ئەو شوێنە بووە، کەمرۆڤەکان لەزستاندا تیا ژیاون، دوای ئەوە مرۆڤ لەئەشکەوتەکان هاتنە دەرەوەو مالی تازەیان بۆ خۆیان دروست کرد، ئەمجا کەوتنە بیرکردنەوە لەزۆر شتی ئەشکەوت.
یونانیەکان گومانیان وابوو کەئەشکەوتەکان پەرستگەی خواکانیانە: زەیوس "گەورەترین خواوەندی یونان" خوای دارستانو لەوەڕگەو شوانکارەیی "دیونیسوس" "خوای بادەومەی" پلۆتۆ "خوای مردوانو دۆزەخ".
ڕۆمانیەکانیش بڕوایان وابوو ئەشکەوت مالی پەریانە، بەلام فارسە کۆنەکانو نەژادەکانی تر ئەشکەوتیان پەیوەست کرد بووە پەرستنی "مترا" وە "خوای ڕوناکیو پارێزەری ڕاستیو دوژمنی تاریکی".
لەم سەردەمەدا ئەشکەوتی گەورەو زۆر جوان هەیە لەسەرانسەری جیهاندا کەبۆتە مایەی ڕاکێشانی گەشتیاران.
ئەشکەوت شوێنێکی قوپاوو هلۆلە لەدیوی بەردینی تەپۆلکەو بەردەوە.
ئەشکەوتەکان بەچەندین ڕێگەی جیاواز دروست دەبن، بەلام دروست بوونی زۆربەیان بەهۆی لێدانی شەپۆلی بەردەوامی ئاوی دەریاکانەوەیە لەبەردەکان.
هەندێك جار لەژێر زەویشدا ئەشکەوت هەیە، ئەو ئەشکەوتانە جۆگەی کۆنی ئاو بونە لەژێر زەویدا، لەئەنجامی وەرینی خۆڵو بەردی ژێردا دروست بووە.
هەندێکی تر لەئەنجامی ئەو گۆڕانکاریانە دروست دەبن کەگڕکانە گەرمەکانو بەردەکانی سەرەوە دروستی دەکەن.
هەندێك لەئەشکەوتەکان لەسەرەوەیانەوە "کون" هەیە، ئەو کونانەش لەئەنجامی ئەو ئاوەوە دروست بوونە، کە لەسەری وەستاوەو پاشان دابەزیوە.

هەر دلۆپەيەك ئاو، كەلەبن ميچى ئەشكەوتەكەوە دەيگاتێ شتێك لەماددەى قسلْ يان مەوادى ترى كانزايى تێدايە، كاتێك ئاوەكە دەبێتە هەلْم بەشێك لەو مەوادانە دەمێننەوەو بەرەبەرە گۆمەمكێكى قسلْ دروست دەبێت، بەلاّم ئەو ئاوەى كە لەگۆمەمكەكانەوە دەتكێتە سەر زەوى ستونێك دروست دەكات پێى دەلْێن ستونى خوارەوە.

## دوەم ئۆكسيدى كاربۆن چيە؟

دووەم ئۆكسيدى كاربۆن ئاوێتەيەكە، لەشێوەى گازدا، دەشێت ببێتە ماددەيەكى رەق ئەگەر بەشێوەيەكى ووشك سارد بكرێتەوە.

رێژەيەكى زۆر كەم دوەم ئۆكسيدى كاربۆن لەهەوادا هەيە كەنزيكەى ٢٥٦٠ ليتر لەهەوا يەك ليتر دوەم ئۆكسيدى كاربۆنى تێدايە.

زۆربەى ئەو دوەم ئۆكسيدى كاربۆنە كاتێك دەچێتە ناو هەواوە، ڕيشالْى ڕوەكەكان و ئاژەلْەكان دەخورمێنێتەوە، دەيان كاتە ماددەيەكى كاربۆنى.

ئەو سوتەمەنيەى لەكاربۆن دروست دەبێت وەكو دارو خەلْوز، لەكاتى سوتاندا رێژەيەكى زۆر لەدوەم ئۆكسيدى كاربۆن دەردەدەن.

مرۆڤ بۆ ئەوەى بژێت پێويستى بەرێژەيەكى كەم لەدوەم ئۆكسيدى كاربۆن هەيە، چون تەحەكوم بەرێژەى لێدانى دلْەوە دەكات، وەكو چۆن تەحەكوم بەفەرمانەكانى ترى لاشەوە دەكات، بەلاّم مژينى رێژەيەكى زۆر لەدوەم ئۆكسيدى كاربۆن دەشێت زيانى هەبێت يان ببێتە هۆى خنكان.

مرۆڤ كاتێك هەناسە دەدات، ئۆكسجين لەهەوادا وەردەگرێت لەرێگەى خوێنەوە لەگەلْ خۆراكدا يەكدەگرن و ئۆكسجينەكە دەگۆرێت بۆ دوەم ئۆكسيدى كاربۆن.

دوەم ئۆكسيدى كاربۆنەكەش دەگەرێتەوە بۆ هەردوو سىو لەوێوە لەرێگەى هەناسە دەردانەوە دێتە دەرەوە.

لەبەرامبەردا ڕوەك بۆ ئەوەى بژێت، دوەم ئۆكسيدى كاربۆن هەلْدەمژێت، ڕوەكە سەوزەكان لەرێگەى گەلاّكانيانەوە دوەم ئۆكسيدى كاربۆن وەردەگرن و لەگەلْ ئاودا يەكدەگرن و بەهاوكارى تيشكى ڕۆژ.

دوەم ئۆكسيدى كاربۆن و ئاوەكە دەگۆرێت بۆ نيشاستەو خۆراكى ترى ڕوەكەكە.

**دوای ئەمانە هەموو ڕوەکەکە وەکو پاشماوەیەك ئۆکسجین دەردەدات، بەمجۆرە ڕوەکەکان دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەخۆن‌و ئۆکسجین دەردەدەن، لەکاتێکدا گیانلەبەران ئۆکسجین هەڵدەمژن‌و دوەم ئۆکسدی کاربۆن دەردەدەن.**

**ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بونی پارسەنگێك بۆ ڕێژەکانی ئۆکسجین‌و دوەم ئۆکسیدی کاربۆن لەهەوادا.**

**دوەم ئۆکسیدی کاربۆن، بەکارهێنانی بازرگانیشی زۆرە، کەگرنگترینیان لەخواردنەوە گازیەکاندایە.**

## هەڵگرتنی خۆراك لە قوتودا

پاراستنی خۆراك، زانستی چارەسەرکردن و پاراستنی خۆراکە بۆ مانەوەی تام و ڕەنگ و پێکهاتە خۆراکیەکانی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو.

ئەم جۆرە چارەسەرە خۆراك دەپارێزێت، لە بەکتریای زیان بەخش. کە خۆراك بە هۆی گۆڕانکارە کیمیاویەکانەوە لە ئەنجامی گەشەسەندنی زیندەوەرە زۆر بچوکەکانەوە وەکو بەکتریا و هەوێن و کەڕو خراپ دەبێت.

لەبەر ئەوەی بەکتریا لە هەموو خۆراکێکدا گەشە دەکات. بۆیە بەرپرسە لە خراپ بونی خواردنەکە و کەڕوش تامی خواردنەکە دەگۆڕێت. بەکتریاش خواردنەکە ترش دەکات و هەوێنەکەش دەبێتە هۆی ترشاندنی و گۆڕانکاری کیمیاویش دەبێتە هۆی بۆگەن بوونی.

زۆر ڕێگە گیرایە بەر بۆ پاراستنی خۆراك کە گرنگترینیان بۆقوتوکردنە. لە ڕێگاکانی تریش، هەڵگرتنی لە شوێنی سارددا، بەستاندن، وشك کردنەوە، خوێ پێوەکردن. بەڵام لێرەدا تەنها باسی بەقوتوکردن دەکەین.

بەقوتوکردن یان چارەسەرکردن بە گەرمی، هۆیەکە بۆ پاراستنی خۆراك لە خراپ بوون، بەهۆی کوڵاندن و بەقوتوکردنەوە.

دوای لێکۆڵینەوەیەکی دور و درێژ، بەقوتوکردن لە ساڵی ١٨٠٩ دا داهێنرا. لە لایەن زانای فەرەنسی (نیکۆلاس ئەلبێرت) ەوە.

لەسەر داوای حکومەتەکەی بۆ گەیشتنە ڕێگەچارەیەك بۆ پاراستنی خۆراکی سوپای فەرەنسا.

ڕێگەی ئەلبێرت بریتی یە لە دانانی خۆراك لە دەفرێکەی داخراودا و کوڵاندنی تا پلەیەکی گەرمی دیاری کراو و هێشتنەوەی گەرماکە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو. دوای ئەوە خۆراکەکە هەر لە دەفرە داخراوەکەدا دەمێنێتەوە، تا کاتی بەکارهێنانی.

پێش پەنجا ساڵ لویس پاستۆر توانی تەفسیری خراپ نەبونی ئەو خۆراکە بەو ڕێگەیە بزانێت. ئەویش بەوەی کە گەرماکە، میکرۆبەکان دەکوژێت و داخستنەکەش نایەڵێت جارێکی تر میکرۆب بچێتە ناو قوتوە سەر داخراوەکەوە.

بەقوتوكردنی بازرگانی نوێ، پشت بە ڕێگەی ((ئەلبێرت)) دەبەستێت. دوای پاك كردنەوەی بە پاڵە پەستۆی هەوایەكی زۆر بەهێز خواردنەكە چارەسەر دەكرێت بەهەر ڕێگەیەك گونجاو بێت وەكو لەت كردن، خوساندن، ئاوگرتن، شڵەقاندن. دوای ئەوە خواردنەكە دەكرێتە قوتووەوە. بەهوی ئامێرێكی ئوتوماتیكی زۆر خێراو هەرچی هەواو گازە تیایدا دەردەهێنرێت و سەری قوتوەكە زۆر بە مەحكەمی دادەخرێت و دوای ئەوە خۆراكە بەقوتوكراوەكە تا ١٠٠ پلەی سەدی یان بەگوێرەی جۆری خواردنەكە گەرم دەكرێت. پاشان قوتوەكان بە ئاو سارد دەكرێنەوە.

ئەمڕۆ بەقوتوكردن باشترین ڕێگەیە بۆ پاراستنی گۆشت و ماسی و میوەكان و هەموو جۆرەكانی خۆراك.

## هێڵی ئیستیوای... گەرم

ئەگەر سەیرێكی نەخشە یان گۆی زەوی بكەیت. هێڵی ئیستیوا وا بەدەردەكەوێت، بەشێوەیەك كە ئاستەمە بڕوا بكەیت هێڵێكی خەیاڵیە.

هێڵی ئیستیوا لە هێڵێكی خەیاڵی زیاتر هیچی تر نیە و، دەتوانیت چەند جارێك پێیدا تێپەڕ بیت بێ ئەوەی بزانیت پێیدا تێپەڕ بویتە!

وشەی هێڵی ئیستیوا لە وشەی ((ئەكوێتر)) ی لاتینی یەوە هاتوە كە بە مانای ((یەكسانی نێوان دوو شت)) دا دێت. ئەمەش ئیشی هێڵی ئیستیوایەكە زەوی دەكاتە دوو بەشەوە. باكور و باشور. ئەو هێڵە خەیاڵیانەی بە دەوری زەویدان بە تەریبی هێڵی ئیستیوا پێیان دەوترێت ((هێڵەكانی پانی)). هێڵی ئیستیواش خاڵی سفرە و هێڵەكانی سەر و ژێریشی هێڵەكانی پانی دەپێوێت بۆ دیاری كردنی خاڵەكانی لەسەر ڕوی زەویدا.

وەكو دەزانین لەسەر نەخشە زەوی دابەشكراوەتە سەر ناوچەكاندا ئەگەر لەسەرەوە یان باكورەوە دەست پێ بكەین. لە ناوچەی جەمسەری باكورەوە دەست پێ دەكات و دوای ئەوە ناوچەی ئیستیوا و پاشان ناوچەی جەمسەری باشور.

ناوچەی ئیستیوا درێژ دەبێتەوە تا پشت هێڵی بە ٢٣,٥ پلەی اكو بۆ ٢٣,٥ پلەی باشور. لەم ناوچەیەدا تیشكی خۆر بە شێوەیەكی ستونی دەوەستێت، لە بەر ئەوە

ئەم ناوچەیە بە هەمیشەیی گەرمە.

بۆچی؟

لەبەر ئەوەی میحوەری زەوی لە کاتی سوڕانەوەیدا بە دەوری خۆردا خوار دەبێتەوە بۆیە هێڵی ئیستیواش بەو ئاراستەیە بە ڕێژەی ٢٣,٥ پلە خوار دەبێتەوە.

لە ئەنجامی ئەم خواربونەوەیەدایە لە کاتێکدا زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە تیشکەکەی ڕاستەوخۆ دەکەوێتە سەر زەوی. لە باکوری هێڵی ئیستیوا و هەندێك جاریش ڕاستەوخۆ لەسەر هێڵی ئیستیوا و باشوری هێڵی ئیستیوادا دەوەستێت. بەلآم خۆر ئەگەر دورتر لە ٢٣،٥ پلە لە هێڵی ئیستیواوە بێت ناتوانێت بە شێوەیەکی ستونی بوەستێت. ئەمەش هۆیەکەیەتی کە هێلی ئیستیوا تاکە شوێنێت بێت لەسەر ڕوی زەویدا خۆر بە شێوەیەکی ستونی بکەوێتە سەری و، لە ئەنجامی ئەوەشدا هەمیشە لە نزیکی هێڵی ئیستیوا دونیا گەرم بێت.

## کۆشکی سپی

کۆشکی سپی بارەگای ڕەسمی نیشتەجێ بونی سەرۆکی وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکایە. کە دەکەوێتە واشنتۆنی پایتەختەوە. کاتێك دروست کرا نە ڕەنگی سپی بو نە ناویشی کۆشکی سپی بوو.

ئەندازیاری تەلارسازی ئیرلەندی ((جیمس هۆبان)) نەخشەی کۆشکی سپی داناوە و بەردی بناغەشی لە ١٣ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٧٩٢ دانراوە و لە ساڵی ١٨٠٠ دا تەواو کرا و لەو مێژوەوە بو بە بارەگای ڕەسمی نیشتەجێ بونی سەرۆکی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا.

لە بنەڕەتدا کۆشکەکە لە بەردێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی دروست کرابوو، بەلآم لە ماوەی جەنگدا و لە ڕۆژی ٢٤ ئابی ١٨١٤ هێزەکانی بەریتانیا ئاگریان تێ بەردا و سوتاندیان، تەنها چەند شوێنێکی بچوکی نەبێت، هەموو بیناکە وێران و کاول بو.

بە پێ ی ڕێنومایییەکانی هۆبان جارێکی تر دەست کرایەوە بە نوژەن کردنەوەی کۆشکی سپی و لە ساڵی ١٨١٧ تەواو کرا.

بۆ نەهێشتنی شوێنەواری ئاگر و دوکەڵ دیوارەکانی بیناکە بە ڕەنگی سپی بۆیاخ

كرا، ئيتر لەوەوە ناونرا كۆشكى سپى. بەلاّم ئەم ناوە نەبوە ناوێكى ڕەسمى بيناكە تا لە ساڵى ١٩٠٢ دا سەرۆك ڕوزەڤلت بە فەرمانێكى ڕەسمى ناوى كۆشكەكەى نا ((كۆشكى سپى)).

كۆشكى سپى بريتى يە لە ٤ نهۆم و ١٠٠ ژور، هەر ژوورێكى بە رەنگێكى جياواز لەوانى تر بۆياخ كراوە. بۆ نموونە ژورى ڕەنگ شينى شێوە هێلكەيى. ژورى پێشوازى كردنى ميوانەكانى سەرۆك و خانميەتى.؟ سەرۆك و خێزانەكەشى لە نهۆمى دوەم دادەنيشن. لە ژورێكدا كە بە ڕەنگێكى پەمەيى كاڵ بۆياخ كراوە.

## بوكە شوشە لە كويدا پەيدا بوو؟

بۆ وەلاّمى پرسيارى سەرەوە دەتوانين بڵێين : لە هەموو شوێنێك. بوكەشوشە كۆنترين داهێنانى مرۆڤ بووە لاى گەلە وەحشى و پێشكەوتوەكانيش هەبووە. ئێمە دەزانين بوكە شوشە لە شارستانيەتەكانى كۆنى مسر و يونان و ڕۆماندا هەبوە. دەشێت خودى مندالاّن پۆلينى يەكەمين بوكە شوشەيان كردبێت لە مەوادە سروشتيەكان وەكو دار و بەرد. بەلاّم بوكە شوشە لاى زۆربەى گەلان، لەوە زياتر بوە كە تەنها بۆ يارى بەكار هێنرابێت.

بۆ نمونە: بوكە شوشەى مندالاّن لاى هينديەكانى ئەمريكا لەسەر شێوەى خواوەندەكانيان بوە لە دار دروستيان كردوە وەكو بەشێك لە نەريتە ئايينيەكان دراوەتە مندالاّن.

لە ياباندا جۆرێكى سەرەتاييان لە بوكڵەى مندالاّن دروست كرد لە لقى تاشراوى دار چنار توێكڵ و ڕيشكەكەشيان دەكردە قژى و جلەكانيشيان لە گەلاّ دروست دەكرد. بوكە شوشەيەكيشيان هەبو بە ناوى ((قۆچى قوربانى)) خواردنيان دەوايە و جليان لە بەر دەكرد و وەكو گيانلەبەرێكى زيندو مامەڵەيان لەگەڵدا دەكرد. ئەم بوكە شوشەيە دەدرايە دايكان بۆ ئەوەى گيانە شەڕانيەكان لە منداڵەكانيان پێ دور بخەنەوە.

بوكەى شوشەى بلاويش لە ئەفريقيادا هەندێك جار بۆ مەبەستى جادو بەكاريان هێناوە لەبرى يارى كردن. هەروەها لە كۆندا لە ئورووپا بوكە شوشە پەيوەندى بە داب و نەريتى ئاينى يەوە هەبووە.

## بۆچی هەست بە برسێتی دەکەین؟

لای زۆربەی خەڵکی باوەڕ وایە. کاتێك گەدە بەتاڵ بێت هەست بە برسێتی دەکەین. بەڵام ئەمە شتێکی ڕاست نیە. چونکە برسێتی پەیوەندی بە گەدەی بەتاڵەوە نیە. کەسێك دەشێت گەدەی بەتاڵ بێت بەڵام هەست بە برسێتی نەکات. یان منداڵێك کە لە دایك دەبێت تا چەند ڕۆژێك هەست بە برسێتی ناکات.

کەواتە بۆچی هەست بە برسێتی دەکەین؟

کاتێك خوێن مەوادی خۆراکی تێدا نامێنێت. لەش لە ڕێگەی دەمارەکانەوە نامەیەك دەنێرێت بۆ مێشك، کەمبونەوەی مەوادی خۆراکیش لە خوێندا لە ئەنجامی بەکاربردنی وزەدا دەبێت لە ئیشی ڕۆژانەدا، بەڵام مرۆڤی ناساغ لەبەر ئەوەی ماندو نابێت ڕێژەیەکی کەم نەبێت وزە بەکار نابات، بۆیە دەبینین بۆ چەند ڕۆژێك هەست بە برسێتی ناکات.

کاتێك کەمبونەوە لە مەوادی خۆراکیدا لە خوێندا ڕودەدات، نامەیەك دەچێت بۆ ((چەقی برسێتی)) لە مێشکدا، ئەم چەقە وەکو دامرکێنەرەوەیەکی جموجوڵەکانی گەدە و ڕیخۆڵەکان ئیش دەکات. کاتێکیش لە خوێندا مادەی خۆراکی تەواو هەبوو، چەقی برسێتی جموجوڵەکانی گەدە و ریخۆڵەکان ڕادەوەستێنێت. لەبەر ئەوەیە کاتێك گەدە برسی دەبێت دەست بە ((قوڕە قوڕ)) دەکات و کاتێکیش مرۆڤ برسی ی دەبێت داوای خواردنێکی دیاری کراو ناکات و هەرچی خواردنێکی لەبەردەست دانێیت دەیخوات.

توخمە سەرەکیەکانی خۆراکیش بریتی یە لە:

پرۆتینات، کاربۆهیدرات (شەکر و نیشاستە)، چەوریەکان، مەوادی کانزایی و ڤیتامینەکان. هەر توخمێك لەمانە ڕۆڵی دیاری کراوی خۆی هەیە کە پێ ی هەڵدەستێت.

پرۆتینەکان تێکەڵەیەکی نایترۆجینین، کار دەکەن بۆ گەشەسەندنی لاشە و چاکسازی ماسوڵکەکان و ڕیشاڵەکان. کاربۆهیدرات و چەوری و وزە دەدەنە لەش، لە کاتێکدا مەوادە کانزاییەکان کار لەسەر ئێسك و ریشاڵەکان دەکەن. ڤیتامینەکانیش لاشە لە هەندێك نەخۆشی دەپارێزن. ئاویش توخمی سەرەکیە بۆ

خانەکانی لەشی مرۆڤ. چونکە مەوادی خۆراکی و ئۆکسجین دەگوێزێتەوە بۆ ئەندامە جۆراوجۆرەکانی لاشە.

ئەگەر هەر ناتەواویەك لە هەر مەوادێکی خۆراکیدا دروست ببێت، نەخۆش دەکەوین لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کەمبونی مەوادی خۆراکی لە خوێندا هۆی سەرەکی برسی بوونە.

## کێ ژێر دەریایی (الغَواصة) ی داهێنا؟

حەزی مرۆڤ بۆ گەشت کردن لە ژێر ئاودا، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر کۆن بەڵام یەکەمین کەشتی کە نەخشە کێشرا بۆ ئەوەی بە ژێر ئاودا بڕوات، بە گوێرەی تۆمارەکانی بەردەست دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٥٧٨.

لەو ساڵەدا زانای ماتماتیك دانی بەریتانی ((ولیەم بۆرن)) کتێبێکی بڵاو کردەوە و تیایدا، وێنەی بەلەمێکی تەواو داخراوی کێشابوو. کە دەشیا لە ژێر ئاودا بجوڵێتەوە. نەخشەکەش بریتی بو لە بچمێکی دار کە بە پێستە ڕوپۆش کرابو بە جۆرێك ئاو لێ ی نەدەچوە ژورەوە. بە پاڵە پەستۆ خستنە سەر هەردو دیوی و بچوك کردنەوەی بەهۆی مەلزەمەیەکی دەستیەوە دەتوانرا بنێررێتە ژێر ئاوەوە.

بەڵام بۆرن ئەو کەشتیەی هەرگیز دروست نەکرد و تەنها وێنەیەك بو. تا پیاوێکی تر لە ساڵی ١٦٠٥ دا کەشتیەکی هاوشێوەی ئەوەی دروست کرد.

فەزڵی دروست کردنی یەکەمین ژێر ئاوی دەگەڕێتەوە بۆ داهێنەری هۆڵەندی ((کورنیلیۆس ڤان درێبڵ)) کە فیعلەن سەرکەوت لە ئاژونی ژێر دەریاییەکەیدا لە ڕوباری تایمز لە قوڵی ٣ بۆ ٤ مەترەوە.

بەرگی دەرەوەی کەشتیەکەی درێبڵ یش لە قایشی بە پیو چەورکراو دروست کرابوو و لە هەردوو لاوە سەوڵی هەبو کە ئەوانیش بە پێستە ڕوپۆش کرابون لە ساڵی ١٦٢٠ دا ئەم کەشتیە دروست کرا.

دوای ئەو بەرواره گرنگی دان بە دروست کردنی ژێر ئاوی زۆر بو. بە جۆرێك تەنها لە بەریتانیادا، لە ساڵی ١٧٢٧ دا نزیکەی چواردە بەرائەتی داهێنان درایە جۆرەکانی ژێر ئاوی.

ژێر ئاویەکان وەکو چەکێکی هێرش بەر بۆ یەکەمین جار لە سەردەمی

شۆڕشەکانی ئەمریکادا بەکارهێنرا. پیاوێك بەناوی ((دیڤید بۆشناڵ)) ژێر ئاویەکی یەك کەسی دروست کرد. کە بەهۆی هەندڵێکی دەستیەوە ئیشی دەکرد و ناوی ((کیسەڵ)) ی لێنا.

کیسەڵ هەوڵی دا کەشتی جەنگی بەریتانی نوقوم کات، بە دانانی بۆمبێك لە ژێریداتەقیەوە لە بەندەری نیویۆرك بۆیە، سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵام کەشتیە بەریتانیەکە ناچار بوو لەو شوێنە دوور بکەوێتەوە.

## بۆچی ڕومەت چرچ و لۆچ دەبێت؟

ڕومەت گەورەترین ئەندامی لەشی مرۆڤە. کە گەورەترین ئەرك هەڵدەگرێت. لەبەر ئەوە دەبێت لەبەرامبەر نەهامەتیەکانی ڕۆژگاردا خۆڕاگری بکات.

بە تێپەڕ بونی ساڵ وردە وردە لاوازی ڕوی تێدەکات و جوانی خۆی لەدەست دەدات. لە ئەنجامی ئەوەشدا ڕومەت دەست بە چرچولۆچ بون دەکات. نیشانەکانیشی لەسەر دەموچاو و مل و هەردوو دەست بەدەردەکەوێت.

چەند هۆیەك هەیە دەبێتە هۆی چرچ و لۆچ بون. منداڵێك کە لەدایك دەبێت ڕومەتی لە لاشەی گەورەترە. بەڵام لە ماوەی شەش مانگدا ڕومەت و دەموچاوی، بە شێوەیەکی گونجاو وەك یەکیان لێدێت. ئەو کەسانەی تەندروستیەکی ئاساییان هەیە. تا تەمەنی چل، پەنجا ساڵی چرچی لە دەموچاویاندا دەر ناکەوێت. بەڵام ڕومەتی مرۆڤێکی سەروی پەنجا ساڵ خاو دەبێتەوە و چرچولۆچی تیایدا بەدەردەکەوێت.

لە تەمەنی لاویدا کچان (مێ یەکان) هۆرمۆنێك دەرژێنن بە ناوی ((ئاسترۆجین)) کە جوانی ڕومەتیان دەپارێزێت. هەروەها لەم تەمەنەدا پرۆتینی ((مەرنین)) بە ڕێژەیەکی تەواو لە لەشیاندا هەیە کە نەرمی ڕومەت دەپارێزێت

بەڵام مرۆڤ کە گەیشتە پەنجا ساڵ ئەم هۆرمۆنەی کەم دەبێتەوە و، ڕومەتیش دەست بە خاو بونەوە دەکات. لە دوای تەمەنی شەست ساڵیش ((مەرنین)) دەست بە ڕاوەستان دەکات لە لاشەدا. کە دەبێتە هۆی لەدەست دانی نەرمی ڕومەت. لە تەمەنی حەفتاشدا بە ڕێژەیەکی بەرچاو چالاکیەکانی ڕژێنی عارەق دا دەبەزێت لە لەشدا و چرچولۆچەکان زیاتر بەدەردەکەون.

تیشکی سەروی وەنەوشەیی خۆریش زیانی زۆری لەم بارەوە هەیە، کە دەبێتە هۆی وشك کردنەوەی ئەو چەوریانەی لە ڕومەتدا هەیە، کە چرچولۆچی لێ دەکەوێتەوە. لەبەر ئەوە چرچولۆچی لای ئەو کەسانە زیاتر دەبێت کە ماوەیەکی زۆرتر لە ژێر تیشکی خۆردا دەبن.

## بۆچی مێروەکان بە دەوری ڕوناکیدا دەخولێنەوە؟

هەموومان دەزانین مێروەکان بە دەوری ڕوناکیدا دەخولێنەوە، بەڵام زۆربەمان نازانین لەبەر چی؟

ئەوەی جێ ی سەرنجە تەنها نێرەکانن لە ڕوناکیەکە نزیك دەبنەوە، ئەمجاش نەك لە هەموو ڕوناکیەك.

هەر لە سەردەمی ئەرستۆوە ئەم بابەتە جێ ی گرنگی پێدانی زۆر لە لێکۆڵەرەوەکان بوە. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا S.W. Furst لە زانکۆی بنسلڤانیای ئەمریکا هەستا بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەم بابەتە. ئەم لێکۆڵینەوە بەنرخە وای کرد لە J.Itsh. Fabr تەفسیرێکی گونجاو بۆ ئەو ڕاستیە بدۆزێتەوە. Fabr بیردۆزەیەکی خستە ڕو کە دەڵێت: لە ڕوناکیەوە هەندێك جۆری تیشکی دیاری کراو دەردەچێت کە دەبێتە هۆی ڕاکێشانی مێروەکان. ئەم بابەتە بە تاقیکردنەوەش سەلمێنرا. بە زنجیرە گورزەیەکی ورد لە تیشکەکانی ژێری سوری. کە سەرچاوەی تیشکەکە دەینێرێت و هێزی ڕاکێشان بەرهەم دەهێنێت. ئەم تاقیکردنەوەیەش لەسەر پەپولە ئەنجام درا.

ڕژێنێك هەیە لە لای سکی پەپولەدا، کە هەندێك وردیلەی خانەیی دەرژێنێت. ئەو وردیلانەش پێ ی دەوترێت ((بۆنی جنسی)). کە مادەیەکی کیمیاویە و هەندێك تیشکی ژێر سوری دەرژێنێت کە بە هەوادا بلاو دەبێتەوە. نێرینەی پەپولەکانیش کە تا بەرزاییەکی دیاری کراو دەفڕن ئەو تیشکانە وەردەگرن و بەرەو لای مێینەکان دەفرن، بۆیە هەندێك لە نێرەکان دەچن بۆ لای تیشکەکە گوایە مێینەکان لەوێدان، بەو جۆرە گەڕان بەدوای مێینەکاندا، نیرەکان بەرەولای ڕوناکیەکە ڕاپێچ دەکات.

تیشکی گلۆپەکانیش ڕێژەیەکی تەواو لەو جۆرە تیشکانە دەر دەدەن، بەوەش

زۆرترین مێرو بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت. لێکۆڵینەوە جۆراوجۆرەکان دەریان خستوە کە بۆنە جنسیەکان وەکو یەك نین. لەبەر ئەوە هەموو مێروەکان بەرەو تیشکەکە ڕاکێش نابن.

بە هەمان شێوە ئەگەر تیشکە جۆراوجۆرەکان، تیشکی ژێری سوریان بەرهەم هێنا ئەوا مێروەکان بەرەو لایان دەچن.

## خێلی

خێلی عەیبێکی جەستەییە بەوەی کە هەردوو چاو ناتوانن بەیەك ئاراستەدا سەیر بکەن. کەسانی توشبو بەم عەیبە دەشێت خێلی ناوخۆییان هەبێت واتە هەردوو چاویان لە یەك بڕوانن. یان خێلی سەروییان هەبێت. (سەیری سەرەوە بکەن) یان ژێرەوەیی (سەیری خوارەوە بکەن).

خێلی زۆربەی جار لە ئەنجامی جۆرێك لە شازی دێت لە خانە دەماریەکاندا. لە ڕاستیدا جوڵانەوەی گلێنەی چاو. پشت بە کرداری شەش ماسوڵکە دەبەستێت. چواریان ڕاست و دوانیان خوارە. ئەگەر دەمارەکانی ئەو شەش ماسوڵکەیەی چاو توشی هەر عەیبێك بێن. ئەوا چاو توشی خێلی دەبێت.

نزیك بینی لای منداڵان دەبێتە هۆی خێلی سەرەوەیی و دووربینیش دەبێتە هۆی خێلی ناوەوەیی. ئەمڕۆ زانستی پزیشکی بە جۆرێك پێش کەوتوە کە دەتوانرێت چارەسەری ئەم عەیبە بکرێت. بەڵام دەبێت زۆر خێرا هەنگاوی بۆ بنرێت. ئەویش بە دانانی چاویلکەیەکی تایبەت لەسەر چاو. کە شوشەیەکی پێوەیە و هیچی لێوە نابینرێت و دەخرێنە سەر چاوە ساغەکە و چاوەکەی تریشی وا دەکات چاوە توشبوەکە خراپتر نەبێت.

دەشێت مەشقی چاو یارمەتی دەرێك بێت بۆ بەهێز کردنی ماسوڵکەکانی چاو و چارەسەری خێلی.

بەڵام هەندێك کات نەشتەرگەری پزیشکی پێویستە بۆ بەهێزکردنی ماسوڵکەی چاوە نەخۆشەکە یان لاوازکردنی چاوە زۆر بەهێزەکە. ئەوەش بەداپۆشینی چاوە ساغەکە بۆ ماوەیەك پێش لە نەشتەرگەریەکە. لەبەر ئەوەی نەخۆش چاوە نەخۆشەکەی بەکار بهێنێت، ئەوەی لەوەو پێش نەیدەتوانی بەکاری بهێنێت.

## زێڕ

لەو ڕۆژەوەی مرۆڤ هاتۆتە سەر زەوی، نرخی زێڕی بە گران نرخاندووە، چونکە زێڕ یەکەمین کانزا بوە کە مرۆڤ ناسیویەتی.

یەکێك لەو هۆیانەی کە مرۆڤی سەرەتایی ڕاکێشاوە بۆ لای زێڕ، ئەوە بوە توانراوە بە شێوە سروشتیەکەی دەست بکەوێت. واتە توانراوە زێڕ لە قاڵبی بچوکدا بدۆزرێتەوە کە پێ ی وتراوە ((مرواری)). کە لەگەڵ بەرد و کانزاکانی تردا تێکەڵ نەبووە.

لەبەر ئەوەی زێڕ ڕەنگێکی زەردی درەوشاوەیی هەیە، بۆیە مرۆڤی کۆن حەزی کردوە وەکو خشل بەکاری بێنێت!

نرخی زێڕ لەوەدا بەرز بوەوە کاتێك مرۆڤەکان زانیان ئاسانترینی کانزایە کە ئیشی تێدا بکرێت. بە جۆرێك نەرمە چەندە بیچەمێنیتەوە ناشکێت. ئەمەش مانای ئەوەیە مرۆڤ چۆنی ویستوە بەو شێوەیە شتی لێ دروست کردووە.

زێڕ ڕۆژێك لە ڕۆژان وەکو تەوقە بۆ قژ بەستن بەکار هێنراوە، لەمەشەوە بیرۆکەی تاجەگوڵینەی زێڕین دروست بوو. دەتوانریت بە ڕێژەیەکی دیاری کراو زێڕ لە زەویدا دەر بهێنرێت. بۆیە ئەو کەسانەی زێڕیان دەست نەدەکەوت، ناچار بەشتی تر دەیانکڕی ئەمەش وای کرد زێڕ ببێتە هۆیەك بۆ ئاڵ و گۆڕ کردن. لەبەر ئەوەی مەوادەکانی تر شایانی لە ناوچون بون و زێڕیش بە پێچەوانەوە. بۆیە بوو بە هۆی پاشەکەوت کردن و هەروەها پێوەرێك بۆ نرخ.

دوای چەندین سەدە مرۆڤ لە زێڕ دراوی دروست کرد. وەکو باشترین ڕێگە بۆ ئاڵ و گۆڕکردن و نیشانەیەکیش بۆ سەنگ پاکی ئەو کانزایە. پۆرسیەکانیش بەمەبەستی ئاسایش و سەلامەتی ئەو دراوانەیان لای خۆیان هەڵیان دەگرت و بەڵێن نامەیەکیان دەدایە ئەو کەسانەی کە زێڕەکانیان لێوەردەگرتن تا لە کاتی داوا کردنیدا بۆیانی بگە ڕیننەوە. لەو دیدەوە بو حکومەتەکان دەستیان دایە دەرکردنی دراوی کاغەز. دەبێت بوترێت نیوەی زێڕی جیهان لە کۆگاکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادایە.

## ژەهری مار

مارە ژەهراویەکان، ژەهرەکەیان بەکار دەهێنن بۆ کوشتنی دوژمن و نێچیرەکانیان. کاتێك ئەو مارانە دەدەنە کەسێکەوە لە ڕێگەی دانە کونەکانیانەوە ژەهرەکانیان لە لاشەی ئەو کەسانەدا بەتاڵ دەکەن.

هەر چەندە ڕێژەی ژەهرەکەی زیاتر بێت، کاریگەری کوشتنی زۆرترە. بەڵام ژەهری مار تا تێکەڵی خوێن نەبێت کاریگەری نابێت. ژەهرەکەش پێویستی بە هەندێك کات هەیە تا دەگاتە دەمارەکانی خوێن.

ژەهری ماری کۆپراو کریت، کار دەکاتە سەر مێشك و بڕبڕەی پشت. کاتێك مارەکە بە کەسێکەوە دەدات، شوێنەکەی توشی ئازار و خوران دەبێت و دەئاوسێت و هەندێك جاریش خوێنی لێ دێت. قوربانیەکەش هەست بە وەنەوز دەکات و تواناى بەسەر ماسولکەکاندا نامێنێت. لە ماوەیەکی کورتدا توشی هەناسە سواری و کەف چەراندن دەبێت ئەمجا دەمرێت.

ئەوانەی مار پێیانەوە دەدات دەشێ لە ماوەی یەك تا دوانزە کاتژمێردا بمرن.

ژەهری : ماری پیس ((فایبر)) کار لە دڵ و سوڕی خوێنی قوربانیەکە دەکات. ئاوسانێکی زۆر لە شوێنی گەستنەکەدا دروست دەبێت لەگەڵ هەست کردن بە ئازارێکی زۆر. دوای ئەوە ئاوسانەکە سەرانسەری لەشی دەگرێتەوە بە ئاستەم دەتوانێت هەناسە بدات و ئەمجا دەست بە ڕشانەوە دەکات و لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا، دڵی لە لێدان دەکەوێت و دەمرێت.

کاتێك کەسێك مار پێوەی دەدات، دەبێت زۆر خێرا بگەیەنرێتە نەخۆشخانە، چونکە ئەمڕۆ دەرمانی دژە ژەهری مار هەیە و دەتوانرێت گیانی قوربانیەکەی پێ ڕزگار بکرێت. ئەگەر نەخۆشخانەش دوور بوو دەتوانرێت فریاکەوتنی سەرەتایی بۆ بکرێت کە بە دوور ڕێگەی بنەرەتی دەبێت:

یەکەم: بەستنی شوێنەکە بە پارچە قوماشێکی ئەستور بە جۆرێك کە نەهێڵێت ژەهرەکە بچێت بۆ لاشە.

دوەم: توێکردنی شوێنەکە بە چەقۆیەکی تیژ و گوشینی تا خوێنەکەی لێ دێتە دەرەوە.

ئەگەر کەسی فریاکەوت دەمی زام نەبوو، دەتوانێت خوێنەکە بمژێت، بەوەش ژەهر لە لاشەی مار پێوە دراوەکە کەم دەکاتەوە. فریاکەوت دەتوانێت ژەهرەکە بمژێت و یەکسەر بیتفێتەوە، ئەم کردارەش هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێت. چونکە ژەهر تا نەچێتە ناو خوێنەوە هیچ مەترسیەکی نابێت.

دوای فریاکەوتنە سەرەتاییەکانیش دەبێت مار پێوەدراو بگەیەنرێتە نزیکترین نەخۆشخانە. ئەو کەسانەش مارە بێ ژەهرەکان پێیانەوە دەدەن پێویستیان بە چارەسەر نیە و هەر ئەوەندە شوێنەکە بە گیراوەیەکی پاکژ کەر پاك بکرێتەوە و بە پارچە قوماشێك بپێچرێت.

## کام گیانلەبەر درێژترین تەمەن دەکات؟

هەندێك گیانلەبەران تەمەنێکی زۆر درێژ دەکەن. لە کاتێکدا هەندێك گیانلەبەری تر هەن لە چەند ساڵێك بەولاوە ناژین. بەلأم قسە وباسی زۆر هەیە لەسەر تەمەنی هەندێك لە گیان لەبەران کە هیچیان لە راستیەوە نزیك نین.

لە نێوان گیانلەبەرە مەمکدارەکاندا فیل بە بەتەمەنترین گیانلەبەر دادەنرێت و وا باسدەکرێت لە ١٥٠ ساڵ بۆ ٢٠٠ ساڵ دەژێت. بەلأم تا ئێستا هیچ بەڵگەکەیەك لە بەردەستدا نیە ئەوە بسەلمێنێت. بە گوێرەی بەڵگەنامەیەك کە دەستی زانایان کەوتوە بەتەمەنترین فیل شەست ساڵ ژیاوە. زۆر ئەسپیش هەن زیاتر لە پەنجا ساڵ دەژین.

ئامارێك دەربارەی ئەوپەڕی تەمەن، بۆ هەندێك لە گیاندارانی تری مەمکدار کە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| گامێشی دەریا | ٤١ ساڵ دەژێت. |
| کەرکەدەن | ٤٠ ساڵ دەژێت. |
| ورچ | ٣٤ ساڵ دەژێت. |
| مەیمون | ٢٠ ساڵ دەژێت. |
| پشیلە | ٢٣ ساڵ دەژێت. |
| سەگ | ٢٢ ساڵ دەژێت. |

لە نێوان پەلەوەرانیشدا سەرگەڕ و توتی زۆرترین تەمەن دەکەن، هەندێك لە توتی

٥٤ سالّ و هەندێك سەرگەڕ ٥٥ سالّ دەژین. سەقاكوژی سپیش ٥١ سالّ.
لە پەلەوەرە بچوکەكانیش ریشۆلّە ١٧ سالّ، كەناری ٢٢ سالّ، كاردنیالّ (بالّندەیەكی ئەمریكی دەنگ خۆشە) ٣٠ سالّ. سورەماسی ٢٥ سالّ. ماسی سەلور ٦٠ سالّ، ماسی ئەنقلیسی ئەمریكی ٥٠ سالّ. كیسەلّ لەو گیانلەبەرانەیە كە زۆرترین تەمەن دەكات. دەلّێن كیسەلّێك هەبووە بە ناوی ((مۆردیشیۆس)) ١٥٢ سالّ تەمەنی كردووە.

## بۆق

گیاندارێكە هەم لە ئاودا و، هە لە وشكانیدا دەژی، بەلاّم چەندین بۆق هەن كە مالّی تایبەت بە خۆیان دروست دەكەن و زۆربەی تەمەنیان لە مالاّنێكدا دەبەنە سەر كە لەسەر داران و شوێنی دوردایە. مالّەكانیان لە گژ و گیا و گەلاّی داران دروست دەكەن و هێلكەكانیان تیادا دەنێن و بێچوەكانیان تیا گەورە دەكەن.
بۆقی قوڕاو مالّەكەی لەسەر داران دروست دەكات و پاش دانانی هێلكەكان مێیەكان دەچنە ناو ئاوەوە و لەوێدا مالّێكی تری بچكۆلە، لە قوڕ بۆ خۆیان دروست دەكەن. كەتیرەكەی نزیكەی ٣٠ سانتیمەترە و بەشی سەرەوەی لە سەروی ئاوەكەوەیە.
بەلاّم بۆقەكانی ئەمریكای باشور لە ناو خۆلّێكی شێداردا چالّێك دەكەنن، لەسەر یەكێك لە سەكۆكانی گۆمە ئاوەكە و زۆربەی ژیانیان تیایدا دەبەنە سەر مێیەكانیش هێلكەكانیان هەر لەوێدا دادەنێن و دوای ماوەیەكی كەم دەبنە بێچو. كاتێك باران دەبارێت، مالّەكەی پڕی لە ئاو دەبێت و بۆقەكە دەست بە جموجولّ دەكات لە گۆماوەكدا.
بەلاّم بۆقی ئەفریقیایی مێینەكان بە لق یان گەلاّی دارێكدا هەلّ دەزنێن و جۆرێك مادەی كەفاوی دەرژێنن و هێلكەكەی تێدەخەن. كاتێك بێچوەكان لە هێلكەكە دێنە دەرەوە باراناو پالّیان پێوە دەنێت بۆ ناوی گۆماوەكان.
جۆرێك بۆقیش لە یابان هەن، مالّەكانیان لە قەدپالّی گۆماوەكان دروست دەكەن و مێیەكان هێلكەكانیان تیایدا دادەنێن و، دوای ماوەیەكی كەم بێچوەكان لە هێلكەكان دەردەچن.

زۆر لە جۆرەکانی تری بۆقیش ماڵەکانیان لەسەر دار و ڕوەکەکان دروست دەکەن و تیایدا دەژین.

## دەنگدانەوە

ئەمڕۆ هەر پرسیارێك لەسەر سروشت بە بیرماندا بێت، چاوەڕێ دەکەین بە ئاسانی وەڵامەکەیمان دەست کەوێت. بەڵام لە کۆندا خەڵکی بۆ تەفسیری شتەکان ئەفسانەیان دروست دەکرد. ئەو تەفسیرەی یونانیە کۆنەکان. بۆ تەفسیری دەنگ دروستیان کردبوو زۆر ورووژێنەرە، ئایا دەتەوێت بیزانیت؟

دەڵێن لە زۆر کۆندا ئافرەتێکی زۆر جوان هەبوو بە ناوی ((ئیکۆ)) ((دەنگدانەوە)). تەنها عەیبی ئەم کچە جوانە ئەوە بوە قسەی زۆردەکرد –تا دەگاتە ئەوەی ((هیرا)) ی خواوەندی سزای دەدات بەوەی تا قسەی لەگەڵدا نەکەن، قسە نەکات تەنها ئەو وشانە بڵێتەوە کە دەیبیستێت.

ڕۆژێك لە ڕۆژان ((ئیکۆ)) کوڕێکی جوان دەبینێت بە ناوی ((نارسیوّس)) و دەکەوێتە داوی خۆشەویستیەوە. بەڵام نارسیوّس ئەوی خۆش ناوێت. بەمجۆرە ئێکۆ توشی غەمباری و دڵتەنگی دێت و هێندە غەم دەخوات تا تەواو لەناو دەچێت و لە دەنگەکەی زیاتر هیچی تر نامێنێتەوە، ئەو دەنگدانەوەش کە دەیبیستین وتنەوەی قسەکانی ئەوە.

بەڵام ئەو ئەفسانەیە تەفسیری دەنگدانەوە ناکات. گەر دەتەوێت بزانیت هۆی دەنگدانەوە چی یە، دەبێت شتێك لەسەر دەنگ بزانیت.

خێرایی دەنگ لە هەوادا دەگاتە ٣٣٥ مەتر لە چرکەیەکدا. ئەو شەپۆلە دەنگیەش بە هەموولایەکدا بڵاو دەبێتەوە. وەکو بڵاوبونەوەی تیشك لە گڵۆپێکەوە.

کاتێك شەپۆلە دەنگیەکان دەدەن لە بەربەستێك یان ڕێگرێك. دەنگەکان دەگەڕێنە دواوە. یان پێچەوانە دەبنەوە. وەکو چۆن تیشك پێچەوانە دەبێتەوە.

کاتێك شەپۆلە دەنگیەکان بەو شێوەیە پێچەوانە دەبنەوە. ئێمە وەکو دەنگدانەوە دەیبیستین، کەواتە دەنگدانەوە دەنگێکە پێچەوانە دروستی دەکات.

هەموو ڕێگر و بەربەستێك ناتوانێت دەنگدانەوە دروست بکات. هەندێك مەواد لە جیاتی ئەوەی دەنگەکە بگەڕێنێتەوە دەیمژێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت هەر

دەنگێکە نەگەڕێتە دواوە دەنگدانەوە دروست نابێت.
هەندێك ڕوی لوس هەن وەکو دیوار و شاخ و ماڵی چۆڵ دەنگ دەدەنەوە. هەروەها هەوریش دەنگ پێچەوانە دەکاتەوە. کاتێك گوێ بیستی هەورە تریشقەیەك دەبین چەندجارێکیش بەدوای یەکدا دەنگدەداتەوە. ئەوە هەور دروستی دەکات.

## بۆچی شاخە بەفرینە دروست دەبێت؟

ئەو قەبارە بەفرە مەزنەی کە لە چاخی بەفرینی ئەمریکای باکوردا دەستی پێ کرد، پێ ی دەوترا ((شاخی بەفرینی قسڵی)). لە ناوەڕاستەوە ئەستوریەکەی گەیشتە نزیکەی ٤٥٠٠ مەتر، ڕەنگە ئەوە یەکەمجار شاخی بەفرینی دروست کردبێت. ئەو قەبارە مەزنەی بەفر بەلای کەمەوە تا ئێستا چوار جار تواوەتەوە لە ماوەی چاخی بەفریدا.
ئەو چاخە بەفریانە کە لە شوێنەکانی تری دونیادا دروست بون. تا ئێستا هەلی ئەوەی بۆ نەرەخساوە بتوێتەوە.
دورگەی گرینلاندی پان و بەرین تا ئێستا بە شاخێکی بەفری قسڵی داپۆشراوە. جگە لە شوێنێکی تەسکی دەورەکەی نەبێت، لە ناوەوە لە هەندێك شوێندا بەرزی شاخە بەفریەکە دەگاتە زیاتر لە ٣٠٠٠ مەتر. هەروەها کیشوەری –ئەنتارکتیکا– کە کیشوەرێکی چۆڵە و دەکەوێتە دەوروبەری جەمسەری باشورەوە.
شاخێکی بەفری داپپۆشیوە، لە هەندێك شوێن دا بەرزیەکەی دەگاتە ٤٠٠٠ مەتر. هۆی بونی شاخە سەهۆڵ لە هەندێك ناوچەدا ئەوەیە کە لە چاخی بەفرینەوە تا ئێستا هەلێکی وای بۆ نەرەخساوە بتوێتەوە. بەڵام زۆربەی ئەو شاخە سەهۆڵانەی ئێستا هەن لە نزیکانێکدا دروست بوونە. ئەو شاخە بەفرینانە لە جۆری شیوی بەفریندا لە شیوێکی پانی بەربلاودا وەکو پەیژە دەست پێ دەکات و بەفرەکە دەبارێتە سەر ئەو ناوچەیەدا یان لوتکەی سەر شیوەکان دەخزێن. ئەو بەفرە لە ماوەی وەرزی هاویندا ناتوێتەوە و بەڵکو ساڵ لە دوای ساڵ قوڵتر دەبێت لە ئەنجامی ئەو فشارە زۆرەی لە سەریەتی. سەر لە نوێ دەیبەستێتەوە، هەرچی هەوا هەیە لە ژێریدا دێتە دەرەوە و ئەمەش وا دەکات بگۆڕێت بۆ بەفرێکی زۆر ڕەق.

ئەو فشارە زۆرەش بەفرەکە کەم دەکاتەوە و پاڵی دەنێت تا دەست دەکات بە کشانێکی لەسەر خۆ بۆ ناو شیوەکە. ئەو زمانە جوڵاوە لە بەفر پێ ی دەوترێت ((شیوی بەفرین)).
لە شاخەکانی ئەلبی ئوروپادا نزیکەی ١٢٠٠ شاخی بەفرین هەیە. هەروەها لە زۆر شوێنی تری ئوروپا و باشوری ئاسیادا.
بەڵام لە ئەلاسکادا دەها هەزار لەو شاخە بەفریانە هەیە کە درێژی هەندێکیان لە نێوان ٢٥ بۆ ٥٠ میل دایە.

## خەڵوز

خەڵوز لە سەردەمانێکی جیاوازدا و بە درێژایی مێژوی زەوی دروست بوە. گەورەترین ماوەش بۆ دروست بونی خەڵوز پێش ٢٥٠ ملیۆن ساڵ لە ئێستا دەستی پێ کردوە و ٣٥ ملیۆن سالیش بەردەوام بوە. زۆرترین خەڵوزەکانی تریش لە ماوەی نێوان یەك ملیۆن ساڵ بۆ سەد ملیۆن ساڵە دروست بوونە.
بە درێژایی ئەو ماوە درێژانە چی ڕویدا و خەڵوز چۆن دروست بو؟ خەڵوز لە چینە بلاْوەکانی زەویدا هەیە کە چەندین میل درێژ دەبێتەوە. ئەستوریەکەشی لە سێ مەتر زیاترە. کە لە نێو چینە بەردیەکانی تردا شاردراوەتەوە. خەڵوز بریتی یە لە پاشماوەی دار و ڕوەکە کۆنەکانی دارستانە بەربلاْوە زۆنگاویە گەرم و شێدارەکانی پێش سەدان ملیۆن ساڵ.
لەو زۆنگاوانەدا داری گەورە و خێرا گەشەیان کرد و سەوز بونە و بە تێپەڕ بونی ڕۆژگار دارەکان مردون و کەوتونەتە ئاوی زۆنگاوە هێمنەکانەوە. کە لە بۆگەن کردن و خەڵەفان پاراستویەتی. بەکتریا بەشێکی لەو دارانە گۆڕیوە بۆ گازات و چوەتە ئاسماندا و تێکەڵەیەکی ڕەشی لێ بەجێ ماوە کە زۆربەی کاربۆنە و دوای ئەوە بو ە بە خەڵوز. بە تێپەڕبونی سالأنێکی درێژ لە کەوتنی ئەو دارانە بەسەر یەکدا، چەند مەترێك ئەستور بوە و لە ئەنجامی دابەزینی سەر ڕوی زەوی وای کردوە چەند چینی قوڕ و لم سەر ڕوی ئەو ڕوەکانە داپۆشێت.
بە تێپەڕبونی ڕۆژگار ئەو پاڵە پەستۆ زیادەی کە قوڕ و لم لەسەر ئەو ڕوەکانە دروستیان کرد وای کرد زۆربەی ئاوەکەی بچکێت و لە دوای خۆی قەبارەیەکی

تورت بەجێ بهێڵێت. كە لەگەڵ زەمانەدا ڕەق بوو و بو بە خەڵوز. ئەم كردارەش لە چەند شوێنێكدا چەندین جار دوبارە بۆتەوە.

كاتێك چینە نیشتوەكان لەسەر یەك كۆبونەوە، وای لێهات لەسەر ڕوی ئاوەكە نزیك ببنەوە و بەمەش زۆنگاوی تازە دروست بو.

جارێكی تر چینێك لە مادەی ڕوەكی دروست بوو و چوە ژێر زەویەوە و بەمجۆرەش چینەكانی خەڵوز دروست بو.

گۆڕان لە دارەوە بۆ خەڵوز هەزاران ساڵ دەخایەنێت.

## بۆچی ئەمریكا بەناوی كریستۆف كۆلۆمبسەوە ناو نەنرا؟

دەبێت لە دولاوە سەیری ئەم بابەتە بكەین. یەكەمیان ناونەنانی ئەمریكا بە ناوی كۆلۆمپسەوە، دوەم ناونانی بەناوی كەسێكی ترەوە.

كۆلۆمپس مەبەستی لە گەشتەكەی ئەوە بو ڕێگەیەك بدۆزێتەوە كە بەرەو ڕۆژ ئاوای ئاسیا بچێت. بەڵام لە ڕاستیدا كۆلۆمپس سان سلڤادۆر و كوبای دۆزیەوە، ئەمەش مانای ئەوە نیە لە نرخی دوزینەوەكەی و ئازایەتیە مەزنەكەی كۆلۆمپس كەم كەینەوە. بەڵام چونی كۆلۆمپس بە ئاراستەیەكی تردا هەندێك كێشەی دروست كرد.

چونكە سامانە سروشتیەكانی هندی نەدۆزیەوە، بۆیە هەندێك گومان لەسەر گەشتەكەی دروست بو. فەرمان ڕەوایانی ئسپانیا و پورتوگال پرسیاری ئەو سەرزەمینەیان دەكرد كە كۆلۆمپس دۆزیبویەوە. هەروەها ئەو پرسیارەشان دەكرد ئەو سەرزەمینە چەندی هی ئیسپانیا و چەندی هی پورتوگالە.

دوای ئەوە فەرمان ڕەوایانی ئسپانا و پورتوگال، دەریاوانێكی ئیتالیان بە ناوی ((ئەمیریكۆ فیسبۆ فسبۆتشی)) ١٤٥٤-١٥١٢ ڕەوانە كرد بۆ دۆزینەوە و بۆ ئەوەی ڕاستیەكان بدۆزێتەوە گەیشتە لێوارەكانی دونیای نوێ. ئەمریكۆ لە ڕاپۆرتەكەیدا باسی دو گەشتی دەریایی خۆی دەكات لە لێوارەكانی ئەوەی ئەمڕۆ بە ئەمریكای باشور دەناسرێت كردویەتی. كە وەسفی زەویەكەی دەكات دەڵێت: ((ئەوەی تێ بینیمان كرد ئەو سەرزەمینە كیشوەرێكە بۆ خۆی)).

بە واتایەكی تر ئەمیریكۆ وتی: ((ئەو سەرزەمینە بەشێك نیە لە ئاسیا و بۆ خۆی

کیشوەرێکی تازەیە)).

لە ساڵی ١٥٠٧ جوگراف ناسێك بەناوی ((مارتن والد سیموڵەر)) نەخشەیەکی بلاوکردەوە، کە کیشوەری تازەی تیادا پیشان دەدا و لەگەڵ بلاوکراوەیەکدا کە پێشنیاری ئەوەی کردبو، ئەو کیشوەرە تازەیە بە ناوی دوزەرەکەیەوە ((ئەمیریکوسەوە)) ناو بنرێت و ناوی بنرێت ((ئەمریکا)).

خەڵکیش هەر زوو ئەم بۆچونەیان قبوڵ کرد و بەکاریان هێنا بۆ ئەمریکای باکور. چونکە ((سیموڵەر)) هەستی دەکرد ((ئەمیریکۆ)) بونی ئەم کیشوەرە تازەیەی سەلماند.

## ئاسن بۆچی ژەنگ دەگرێت؟

ئەگەر پارچە ئاسنێك لە شوێنێکی شێداردا دا بنرێت بۆ ماوەی چەند ڕوژێك چینێك ژەنگی لەسەر دروست دەبێت.

ژەنگ چی یە؟ بۆچی لەسەر ئاسن دروست دەبێت؟

ژەنگ ئۆکسیدی سورە لە ئەنجامی تێکەڵ بونی ئۆکسجین لەگەڵ ئاودا لەسەر ئاسن دروست دەبێت. واتە کاتێك شێ لە هەوادا بێت، چونکە ئەگەر ئاو نەبێت ئۆکسجینەکە ناتوێتەوە و ژەنگ دروست نابێت.

کاتێك دڵۆپە بارانێك دەکەوێتە سەر ئاسنێکی ساف، دڵۆپەکە تا ماوەیەك بە پاکی دەمێنێتەوە، بەلام ئاسن و ئۆکسجینەکە یەکدەگرن و ئۆکسیدی سور یان ژەنگ لە شوێنی خاڵەکەدا دروست دەکەن. شوێنی دڵۆپەکەش سور دەبێتەوە و ژەنگەکە لە ئاوەکەدا دەمێنێتەوە، کاتێك دڵۆپەکە دەبێتە هەڵم تەنها ژەنگەکە دەمێنێتەوە و توێژاڵێکی سور لە هەمان شوێنی دڵۆپەکەدا لەسەر ئاسنەکە دروست دەبێت.

کاتێك ژەنگەکە دروست دەبێت، تەنانەت لەهەوای وشکیشدا بلاودەبێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو خاڵە ژەنگاویە یارمەتی هەرچی شێ یە دەدات بۆ چڕ بونەوە بۆیە هەرچی شێ هەیە بۆ خۆی ڕادەکێشێت. لەبەر ئەوەیە ڕێگەگرتن لە ژەنگ ئاسانترە لە بلاوبونەوەی کاتێك دروست دەبێت.

زۆر جار وا پێویست دەکات مەوادە ئاسنی و پۆلاییەکان بۆ ماوەیەکی درێژ و هەڵبگیرێت، چی بکرێت تا ئەو مەوادانە ژەنگ لێیان نەدات؟

دەبێت ئەو مەوادانە بە ڕوپۆشێکی تایبەتی یان بە فیلمێکی پلاستیکی داپۆشرێن.

بەڵام چی بکرێت کاتێك کەشتیە جەنگیەکان بەکار ناهێنرێن، ژەنگ لێیان نەدات؟ بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە هەندێك ئامێری لابردنی شێ بەکاردەهێنرێت کە هەڵدەستن بە دەرهێنانی هەوای شێداری ناو پێکهاتەی کەشتیەکە و دانانی هەوای وشك لە شوێنیدا، لەو دۆخەدا ژەنگەکە ناتوانێت خۆی دروست کات.

## ئاوچۆن لە کانیەوە هەڵدەقولێت؟

هەرچی ئەو ئاوانەی لە کانیەوە هەڵدەقوڵێن لە بنەڕەتدا سەرچاوەکەیان بارانە. کە باران دەبارێن ئەو ئاوە خۆڵ دەیمژێت و لە نێوان درز و بەردەکانەوە ڕۆ دەچێ.

لەگەڵ ئەوەدا زۆرێك لە ئاوی باران لە نزیکی سەر زەوی دەمێنێتەوە، دەبێتە هەڵم یان ڕوەکەکان بەهۆی ڕەگەکانیانەوە دەیانمژن. یان بەهۆی کرداری ڕاکێشانەوە دادەبەزێتە خوارەوە بۆ شوێنە قوڵەکان، ئەوەندەی درزی بەردەکان ڕێگەی بدەن لە ژێر زەویدا.

بەڵام لە قولایی جۆراوجۆر لە هەموو شوێنێك ((ناوچەیەك هەیە هەموو درزی بەردەکان پڕیەتی لە ئاو)) کە پێ ی دەوترێت ((ناوچەی ئاوی ژێر زەوی)) بەڵام بەشی سەرەوەی ئەو ئاوانە پێ ی دەوترێت ((پشتێنەی ئاوی)).

ئەگەر درزی سروشتی هەبێت لە ژێر پشتێنەی ئاوی لە زەویدا، کانی دروست دەبێت بۆیە دەبینین زۆربەی کانیەکان لە دوڵ و شیو و شوێنە نزمەکاندان. ئاوی ژێر زەویەکە بە شێوەی کانیەك بە نێو درزی بەردەکاندا دەڕوات، بە تەنیشت یان بنی ئەو شوێنە نزمانەدا.

کانیەك دژی ڕاکێشان نابنەوە بۆیە هەمیشە بەرەو خوار دەچن لەو ئاستە ئاویەی کە لە سەرەوەیەتی. هەندێك لە کانیەکان لە ناوچە ئاویەکاندا یەك دەگرنەوە و بە درێژایی ساڵ وشك ناکەن و پێیان دوترێت کانی ((هەمیشەیی)).

هەندێك سەرچاوەی تر هەن لە ژێر پشتێنەی ئاویەوە هەڵدەقوڵێن، ئەم کانیانە تەنها لە وەرزی زستناندا ئاویان هەیە، ئەو کاتانەی کە پشتێنە ئاویەکە ئاوی هەیە ئەم جۆرە سەرچاوانەش پێیان دەوترێت ((کانی ناهەمیشەیی)).

لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو کانیانە بەنێو بەردەکانی ژێر زەویدا دەڕۆن دەبینین هەموو ئەو ئاوانە بە زۆری مەوادی کانزاییان تێدایە وەکو گۆگرد و قیر. ئەو سەرچاوانەی کە ڕێژەیەکی نائاسایی ئاوی سروشتیان تێدا بێت پێیان دەوترێت ((سەرچاوە کانزاییەکان)).

لە هەندێك شوێندا بە تایبەت لە ناوچە بورکانیەکاندا، ئاوی سەرچاوەکان پەیوەندیەکی زۆریان بە بەردە گەرمەکانی ژێر زەویەوە هەیە. ئەو جۆرە سەرچاوانەش پێیان دەوترێت ((سەرچاوە گەرمەکان)).

بەڵام بیری ئیرتیوازی جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ سەرچاوەدا. لە بیری ئیرتیوازیدا ئاو دەچێتە خوارەوە تا دەگاتە، چینێك لەبەردی ڕۆچو یان لمێك لە نێوان دوچین لە بەردی سەختدا، لە دەووبەری ئەو ئاوەدا پاڵە پەستۆیەك دروست دەبێت، کاتێك کونێك هەڵدەکەنین بۆ گەیشتنە ئاو دەبینین بە ڕێژەیەکی زۆر ئاو دێتە دەرەوە، بۆیە لە کاتی بیرکەندندا دەبێت لە شوێنێکی نزمتر لەو شوێنە بکنرێت کە ئاوی لێ دەچێتە ناوزەویەوە.

## کەی ((بیگ بن)) بینا کرا.

((بیگ بن)) بورجی ئەو کاتژمێرەیە کە بە دەنگەکەی بەناوبانگە و ١٣ تەن قورسە. ((ئەدمۆنت پکیت)) بارۆنی یەکەمی ((گریم سورب)) نەخشەسازی بۆ ئەو کاتژمێرە کرد لە ناو ئەو بورجەدا. کە دەکەوێتە دیوی ڕۆژهەڵاتی پارلەمانی بەریتانیاوە لە ویستمنستەری لەندەن.

لەسەرەتادا تەنها بە زەنگی کاتژمێرەکەدەوترا بیگ بن، بەڵام دوای ئەوە هەمان ناو لە کاتژمێرەکەش نرا.

یەکەم لێدانی زەنگی بیگ بن لە ٣١ ئایار ١٨٥٩ دا بو. زۆرترین کاتیش کە ئەو کاتژمێرە لە کار کەوتبێت و لێ ی نەدابێت ١٣ ڕۆژ بوە، کە لە نیوەڕۆی ڕۆژی ٣١ئایار، بۆ ٢٧ نیسانی ساڵی ١٩٧٧.

B.B.C ئەو دەنگە قوڵ و خۆشەی بیگ بن ی بە هەموو جیهاندا بڵاو کردەوە. بۆ ئەوەی بگەیتە بیگ بن دەبێت بە پەیژەیەکی پێچاوپێچدا سەرکەویت کە ژمارەی پلیکانەکانی ٣٧٤ دانەیە. بەرزی هەر ژمارەیەکی کە بە ژمارەی ڕۆمانی لەسەر

ڕوی کاتژمێرەکەیە دوو پێ یە و. درێژی بەندوڵەکەشی ٣ پێ یە. کاتێك سەرەتا بیگ بن لەو شوێنەدا دانرا، هەر حەفتەیەك جارێك دوو پیاو دەچونە سەرەوە بۆ کوك کردنی. بەلأم ئەمڕۆ ئەم کاتژمێرە بە کارەبا ئیش دەکات.
لە تایبەتمەندیەکانیئەم کاتژمێرە ئەوەیە لە سەرەتاوە تا ئێستا بە هەمان هێزی خۆی ماوەتەوە.

## بۆچی شیر بە منداڵ دەدەین؟

شیر مادەیەکی خۆراکی زۆر بەسودە کە مەمکدارەکان دەیدەنە بێچوەکانیان. چونکە زۆربەی مەوادە خۆراکیەکانی پێویستی گەشە سەندنی تێدایە. بەوە سەرچاوەی سەرەکی خۆراکە بۆ منداڵانی تازە لە دایك بو. شیری هەموو مەمکدارەکان لەوانە ژنیش زۆر پێویستە بۆ منداڵانی نەوزاد لەبەر ئەوەی بە ئاسانی هەرس دەبێت و خۆراکێکی نمونەییشە بۆ کۆرپە.
شیر لە (غودە) لویەکی تایبەتیەوە بەرهەم دێت کە پێ ی دەوترێت ((لوی مەمکی)). زۆر لە مێینە مەمکدارەکانی گۆی مەمکیان هەیە کە بێچوەکانیان دەتوانن شیری لێوە بمژن. ئەو گۆ مەمکانەش بە زنجیرەیەکی بوری ناسك پەیوەستن بە لوە مەمکیەکانەوە. لەگەڵ ئەوەی شیری هەمو مەمکدارەکان لە توخمی چون یەك پێك هاتون، بەلأم ڕێژەکانیان جیاوازە. ئاو ٨٠ بو ٩٠٪ ی شیر پێك دەهێنێت. پرۆتین و کاربۆهیدرات (مادەیەکە لە کاربۆن هیدرۆجین و ئۆکسجین و شەکر و نیشاستەیە) پێك دێت تێدایە. لەگەڵ چەوری و ڤیتامین و مەوادە کانزاییەکانی تردا.
ئەم توخمانەش زۆر پێویستن بۆ گەشەسەند و چاککردنی ئێسکان و ریشاڵەکان، هەروەها پێویستە بۆ کاری ئاسانی ڕژێنی ((الصحاو)) کە هۆرمۆنی گەشەسەندن دەرژێنێت. پرۆتینات ((کە زۆربەی جۆبنین و کازین و زولالە)) هەموو ترشیە ئەمینیە پێویستەکان دەستەبەر دەکات کە پێویستە بۆ گەشەسەندن و لەش ساغی، کاربۆهیدرات ((کە زۆربەی لاکتۆز و شەکری ماستە)) سەرچاوەیەکی چاکە بۆ وزە و یارمەتی لەش دەدات بۆ مژینی کالسیۆم و فۆسفۆر.
ڕۆنیش، شیر لە گەدەی منداڵدا دەگۆڕێت بۆ مەیوێکی نەرم، بەمەش کرداری

هەرس کردن زۆر ئاسان دەبێت، بە پێچەوانەی ئەو تێکچونانەی زۆر جار مەوادە چەورەکان دروستی دەکەن. هەروەها شیر فیتامینەکانی A و B و C و D و E و K و ترشی نیکۆتینی دەداتە لەش. ئەم ڤیتامینانەش لەگەڵ مەوادە کانزاییەکاندا (کالسیۆم و فۆسفۆر) بە شێوەیەکی سەرەکی پێویستین بۆ دروست کردنی ڕیشاڵەکان لەگەڵ ماسولکەیەکی ساغدا.

ئەگەر دایك ژەمێکی دەوڵەمەند بە مەوادی خۆراکی پێویست بخوات، ئەوا بێچوەکەی هەرچی پێویستیەتی لە شیرەکەیدا دەستی دەکەوێت. ئەویش لاشەیەکی بەهێز لای منداڵدا دروست دەکات کە یارمەتی بەرەنگار بونەوەی نەخۆشیەکانی دەدات. کاتێك منداڵ لەدایك دەبێت سێ تا چوار کاتژمێر جارێك پێویستی بە خواردن دەبێت لە ڕۆژێکدا نزیکەی ٦٠٠ میلیگرام شیر بەکار دەبات. کاتێك شەش حەفتە تێدەپەڕێنێت دەتوانێت یەك شەو بەبێ شیر هەڵبکات. ئەگەر منداڵ شیری دایکی نەخوارد دەبێت شیری مانگا یان شیری وشکی بدرێتێ. بەڵام ئەم ڕێگەیە مەترسی زۆرە ئەگەر شوشەکە بە شێوەیەکی دروست نەشۆردرێ و پاك نەکرێتەوە دەشێت پەکتریای زۆر لەخۆ بگرێت. هەندێك لە دایکان بڕوایان وایە شیر زۆردانە منداڵ یارمەتی منداڵەکە دەدات بۆ خەوتن و گەشەسەندن. بەڵام ئەمە ڕاستی نیە چونکە خۆراکی خەست زۆر لە سۆدیۆمی تێدایە، بۆ ئەوەی لێ ی ڕزگار بێت هەردو گورچیلەی منداڵەکە زۆر بەهێز ئیش دەکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی وشك بونەوە دیسان مەترسیەکی تریش هەیە، هەندێك جار وا دەزانیت شیر زۆردانە منداڵەکە دەبێتە هۆی خێرا گەشە کردنی. بەڵام لە جیاتی دروست بونی ئێسقانێکی بەهێز و ماسولکەیەکی زیاتر، ڕێژەیەکی زۆر لە چەوری پەسیسە دەکات، ئەمەش نیشانەی ناتەندروستیە.

لە زۆر وڵاتاندا شیری کەر و بزن و گامێش و ئاسك و گوێلك و سەگ و ئەسپ دەدەنە منداڵ.

لە نیوەی دوەمی ساڵی یەکەمدا منداڵ کەمە کەمە خۆراکیشی دەدرێتێ.

## مێروله چی دەخوات؟

سەر لوتکەی چیا بەرزەکان تەنیا شوێنێکە، کە مێرولەی لێ نیە. لەم ڕاستیەوە

دەتوانن بیهێننە پێش چاوی خۆتان، بونی هەزاران جۆری جیاواز لە مێرووڵە، چۆن دەژین و هەر جۆرێکیان چی دەخۆن؟

جۆرێکیان نموونەی مێرولەی دروێنەرە، کە هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی بەری هەندێك ڕوەك لە ناوچەیەکی دیاری کراودا و دەیگوێزێتەوە بۆ شارەکەی و لەوێدا جیای دەکاتەوە و وەکو خواردن هەڵی دەگرێت.

جۆرێکی تریان ئەسپێ ی ڕوەکەکان بەخێو دەکەن، ئەم جۆرە مێرولانە شیلەی ڕوەك دەمژن و لە ڕێگەی لێکدانی باڵەکانیانەوە ئەم شیلە کە وەکو هەنگوین شیرینە، دیرژێننە سەر مێروڵەکانی تردا و ئەوانیش دەیخۆن.

جۆرێکی تر لە مێر هەن کەڕو بەخێو دەکەن و لەسەر کەڕو نەبێت لەسەر هیچی تر ناژێن، ئەمجۆرە مێرولەیە هەویرێك دروست دەکات بۆ ئەوەی کەڕوەکە تیا بەخێو کات.

هەندێك مێرولە هەن پێیان دەوترێت ((هاڕەر)) بە تایبەت ئیش کەرەکانیان، سەرێکی گەورەیان پێوەیە کە ماسولکەکانی زۆر بەهێزن بۆ بزواندنی کەلاەکانی تا بتوانێت کرداری هاڕین بەباشی ئەنجام بدات. ئەم جۆرە مێرولەیە هەڵدەستێت بە هاڕینی ئەو گەنمانەی مێرولە ئیش کەرەکان دەیهێننەوە. دوای تەواوبونی وەرزی دروێنە مێرولەی هاڕەر دەکوژن و لەت و پەتی دەکەن. لە بەر ئەوەی مێرولەکانی تر نایانەوێت لە دەمێك زیاترەوە بخۆن.

جۆرێکی ترلە مێرولە هەن کە بریتین لە کۆگایەکی زیندوی خۆراك، کاتێك مێرولەیەکی کارەکەر شیلەی گوڵێك دەهێنێتەوە، مێرولەی تایبەت هەن لە دەمی وەری دەگرن و قوتی دەدەن، کاتێك وەرزی زستان دێت مێرولەکانی تر دەچن بو لای ئەو مێرولەیە و لە دەمی دەخۆن. هێندەیان لە دەمدایە بەسە بۆ خۆراکی شارەکە تا وەرزی داهاتوو.

## شەونم چی یە؟

شەونم دیاردەیەکی سروشتی زۆر ئاڵۆزە و هەر لە دێر زەمانەوە تەفسیری زۆر خراپی بۆ کراوە و کتێبی زۆریش لەسەر ئەم بابەتە نوسراوە!

لەسەردەمی ئەرستۆدا پێش دو هەزار ساڵ، بڕوا وابو کە شەونم ((وەکو باران

دەباریت، لە کاتێکدا شەونم ناباریت،

بۆ ئەوەی بزانین شەونم چی یە، دەبێت شتێك لەسەر هەوای دەور و بەرمان بزانین.
هەوا ڕێژەیەکی دیاری کراو شێ ی تێدایە، هەوای گەرم لە هەوای سارد زیاتر دەتوانێت هەڵم و ئاو کۆ بکاتەوە. کاتێك ئەو هەوایە دەدات لە ڕویەکی سارد، هەندێك چڕ دەبێتەوە و ئەو شێ یەش کە تێیدایە لە شێوەی دڵۆپەی بچوکدا لەسەر ئەو ڕوبەرە جێگیر دەبێت.

ئەمەیە شەونم:

دەبێت پلەی گەرمای ڕوبەرە ساردەکە دابەزێت بۆ نزمتر لە پلەیەکی دیاری کراو، تاوەکو شەونم دروست ببێت. ئەو پلەیەش پێ ی دەوترێت ((خاڵی شەونم)) واتە ئەو گەرمایە کە هەڵم تیایدا چڕ دەبێتەوە. ئەگەر ئاوت کردە پەرداخێك یان دەفرێکی کانزاییەوە. ئەوا شەونمەکە لە ڕوەکەی کۆ نابێتەوە بەڵام ئەگەر پارچە سەهۆڵێك بکرێتە ئاوەکەوە، کە ساردی ئاوەکە گەیشتە پلەیەکی دیاری کراو ئەوساکە شەونم دروست دەبێت.

ئەی شەونم لە سروشتدا چۆن دروست دەبێت؟

یەکەمجار دەبێت هەوایەکی گەرمی پڕ لە شێ هەبێت، دەبێت هەواکە بدات لە ڕویەکی سارد، شەونم لەسەر زەوی و شۆستەکان دروست نابێت چونکە خۆر لێ ی دەدات. بەڵام شەونم لەسەر ئەو ڕوەك و گیایانە دروست دەبێت کە سارد دەبنەوە.

کەواتە ئەو شەونمەی لەسەر ڕوەك دەیبینین پێ ی دەڵێن شەونم؟ نەخێر، لەگەڵ ئەوەی بەیانیان ڕێژەیەیی بچوك لە شێ لەسەر ڕوەکەکان دەبینین بەڵام شەونم نیە و هەموی لە خودی شەونمەکەوە و لە کونی گەڵاکانەوە دەردەچێت، کە بە بەردەوامی کردای ئاودانە و ڕوەکەکە دەیکات بۆ ئاودانی گەڵاکانی، کردارەکەش لە ڕۆژدا دەست پێ دەکات بۆ ئەوەی گەڵاکان بتوانن لە بەرامبەر گەرمی خۆردا خۆڕاگری بکە ن وئەم کردارەش تا شەو بەردەوام دەبێت.

لە هەندێك شوێنی دونیادا، شەونم بە جۆرێکی وا زۆر کۆ دەبێتەوە، کە لە چاڵێکدا کۆدەکرێتەوە و ئاوەکەی بۆ ئاودانی ئاژەڵان بەکار دەهێنرێت.

## ئیشی پەنکریاس چی یە؟

پەنکریاس ئەندامێکی زۆر گرنگە لە لەشی مرۆڤ و زۆربەی گیاندارە بڕبڕە دارەکاندا.

بە شێوەیەکی پان دەکەوێتە پشتی گەدەوە و لە بوتڵێك دەچێت کە بەلادا کەوتبێت. پەنکریاسی مرۆڤ رژێنێکی سەفرای ژەهریە، درێژیەکەی لە نێوان ١٥ و ٢٠ سانتیمەتردایە و پانیەکەشی لە نێوان ٣,٥ و ٢,٥ سانتیمەتردایە.

ئایا دەزانن کاری پەنکریاس لەلەشدا چی یە؟

پەنکریاس لینجاوێکی هەرس کەری بەهێز بەرهەم دەهێنێت لە ڕیخۆڵەدا، بو شیتەڵ کردنی خواردنەکان. هەروەها هۆرمۆنی ئەنسولین و کلوکوجین بەرهەم دەهێنێت.

ڕۆژانە پەنکریاس ١٢٠٠ بۆ ١٥٠٠ میلیگرام لینجاو بەرهەم دەهێنێت کە ئەنزیمات (هەوێنی کیمیاوی) و خویٚ ی تێدایە و یارمەتی هەرس کردنی پروتینات و نیشاستە و شەکر و چەوری دەدات. کاتێك خواردن دەخوێن نوکی زمان هەواڵ دەنێرێت بۆ مێشك و ئەویش فەرمان بە پەنکریاس دەکات تا لینجاوی خۆی بڕژێت، کە دەوڵەمەندە بە بیکاربۆناتی صوٚدیوٚم و یارمەتی ترشی دور دەخاتەوە.

لینجاوی پەنکریاس پێنج جۆر هەوێنی کیمیاویی تێدایە کە سیانیان زۆر سەرەکین و یارمەتی پروٚتینات دەدەن و دوانەکەی تریشی یارمەتی هەرس کردنی هایدرۆ کاربۆنات و چەوری دەدەن. کە ئەوانیش هەوێنی لیبازی چەوری و هەوێنی میلیزی نیشاستەن، لەگەڵ تریبن دا کە هەوێنی سەرەکی پروٚتیناتە.

جگە لە ئیشی هەرس کردن، پەنکریاس هۆرمۆنی ئەنسوٚلین، بەرهەم دەهێنێت لەگەڵ نیشاستەی ئاژەڵیدا لە کۆمەڵێك خانەوە کە پێیان دەوترێت ((دورگەکانی لانگرهانز)). کە کلیکوٚجینەکە نیشاستەکە دەگۆڕێت بۆ کلۆکوز کە دەبێتە هۆی پاراستنی ڕێژەی شەکر لە خوێندا. ئەم هۆرموٚنەش گلوکوٚزەکە دەگۆڕێت بۆ نیشاستەی ئاژەڵی لە جگەردا.

ئەو دو هۆرموٚنەش پێکەوە کاردەکەن بۆ تەحەکوم کردن بە پێداویستیەکانی لاشەوە لە وزە.

به كورتى پەنكرياس ڕۆڵێكى كاريگەر دەبينێت لە ئيش كردنى لاشەى مرۆڤدا.

## فرمێسك

كاتێك مرۆڤ دەگريت فرمێسك لە چاوى دێت، ئايا دەزانيت ئەوە بۆچى ڕو دەدات؟ كاتێك چاومان دەقوچێن بە هاوكارى ماسولكەكان پێلوەكان دادەخرێن. جولانەوەى پێلوەكان هێندە خێرايە، كە كار لە بينين ناكات. لە چاودا لوى فرمێسكى هەيە كە دەكەوێتە گۆشەى دەرەوەى چاوەوە. هەروەها كەناليش هەيە كە فرمێسكەكان دەبەن بۆ هەردو پێلوى سەرەوە و لە وێيشەوە فرمێسكەكان بەهۆى كەنالەكانى ترەوە لە چاو دێنە دەرێ.

هەر جارێك كە چاو دەتروكێنين، شلەيەك لە كونى كەنالەكانى فرمێسكەوە دەردەچێت وا دەكات كە چاو بەردەوام نەرم بێت و لە وشك بونەوە پارێزراو بێت.

تەنانەت هەندێك جار لە كاتى پێكەنيندا فرمێسك لە چاومان دێت، چون لە كاتى پێكەنيندا ماسولكەكان پاڵە پەستۆ لەسەر لوە فرمێسكيەكان دروست دەكەن بۆيە فرمێسك لێيەوە دێتە دەرەوە.

كاتێك پياز دەئەجنين، فرمێسك لە چاومان دێت. لەبەر ئەوەى پياز مادەيەى تيژ دەردەدات، كاتێك ئەو مادەيە دەگاتە چاو، چاو فرمێسك دەرژێنيت بۆ ئەوەى توشى ئاوسان نەبێت، فرمێسكەكەش مادە ئاوساوەكە پاك دەكاتەوە. هەروەها ئەمە لەسەر دوكەليش جێ بەجێ دەبێت.

هەندێك هەواڵى ناخۆشيش فرمێسك لە چاومان دەردێنێت لە ئەنجامى كردارێكى لا ئيراديدا.

## مار چۆن بەبێ قاچ دەڕوات؟

ڕەنگە لەسەر زەويدا گياندارێكى تر نەبێت هێندەى مار مرۆڤى سەرسام كردبێت! لە ڕاستيدا زياتر لە دوو هەزار جۆرى مار هەيە لە هەموو جيهاندا. جگە لە هەردوو ناوچە جەمسەريەكە نەبێت. مار لەسەر زەوى، ژێر زەوى، لە ناو ئاو، لەسەر داراندا دەژێت.

كاتێك مارێك دەبينين ڕێدەكات چاومان بەيەك ماسولكە و ئێسقان ناكەوێت كە

بجوڵێتەوە. هەر چەندە مار پێ ی نیە لەگەڵ ئەوەشدا بەسەر دار و بەرددا دەڕواو هەروەها دەشچێتە کونەوە!

لەسەر سکی مار پولەکەی پان هەیە. کە بۆ پێشەوە دەجوڵێنەوە بە جۆرێك وا دەکەن کە هەریەکەیان ئەوەی تەنیشتی پاڵ بنێت بۆ دواوە. بە پێچەوانەی ئاراستەی مارەکەوە. بەمجۆرە مار بۆ پێشەوە دەجوڵێتەوە.

ئەوەی کە جێ ی سەرسوڕمانە لە ڕۆیشتنی ماردا. چۆن ئەو پولەکانەی دروست کرد تا بجوڵێتەوە. لە ماردا ژمارەیەك پەراسوو هەیە. بۆ نمونە: لە ماری ژەهراوی ئەفریقی دا ١٤٥ جوت پەراسوو هەیە! هەر پەراسویەکیش پەیوەندی بە بەشێك لە بڕبڕەی پشتی مارەکەوە. هەر بڕبڕەیەکیش پەیوەندی بەوەی تەنیشتیەوە هەیە، ئەمەش وای کردوە بڕبڕەی پشتی زۆر نەرم بێت. هەردوولای هەر جوتێك لە پەراسوو پەیوەندن بە پولەکەکانی سەرسکیەوە بەهۆی ماسوڵکەیە، بە جۆرێك مارەکە دەتوانێت، هەر پولەکەیەك بە جودا لە سەرسکی خۆی بجوڵێنێتەوە! لەبەر ئەوە قاچەکانی مار پەراسوەکانیەتی و پێشی پولەکەکانیەتی.

کاتێك مار بیەوێت خۆی خێراتر بکاتەوە، لاشەی وەکو پیتی S ی ئینگلیزی لێدەکات. ئەو چەوتانەوەش پرتاف دانە دژی هەرچیەك بێتە پێشی و بەمجۆرەش مار زۆر بە خێرایی بەرەو پێشەوە دەچێت.

بۆچونێك هەیە کە مار لەسەرتادا قاچی ڕاستەقینەی هەبووە، بەڵام لە کاتی گەشەسەندنیدا لەسەردەمەکانی کۆندا لە دەستی داوە!

## ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بۆچی ڕوخا؟

بە درێژایی زیاتر لە ٤٠٠ ساڵ ئیمراتۆریەتی ڕۆمان دەسەڵاتی هەبو بەسەر زۆربەی ئوروپا و هەمو ئەو وڵاتانەی کەوتبونە دەوروبەری دەریا سپی ناوەڕاستەوە. ڕۆمانیەکان لە ئیتالیای پایتەختیانەوە حوکمی وڵاتانی وەکو بەریتانیا، فەرەنسا، بەلجیکا - هوڵەندا، ئسپانیا، پورتوگال، سویسرا، نەمسا، هەنگاریا، ئەڵمانیا، ڕۆمانیا، بولگاریا، یونان، تورکیا، فەلەستین، سوریا، نیمچە دورگەی عەرەب و میسر و تونس و جەزائیر و مەغریبیان دەکرد.

ئەم ئیمپراتۆریەتە مەزنە گۆڕانکاری گەورەی لە ژیانی ڕۆمانیا دروست کرد. ئەو

ده‌مه کۆمه‌ڵگای ڕۆمانی بۆ چوار چین دابه‌ش بوبون، چینی یه‌که‌م ده‌وڵه‌مه‌نده‌کان که خاوه‌نی زه‌وی و زاره‌کان و پله‌یه‌کی زۆر به‌رز بون، دوه‌میان چینی بازرگانه‌کان بون، چینی سیّ یه‌م جوتیارانی بچوك و دانیشتوانی شاره‌کان بون، چینی چواره‌میش ئه‌و کۆیلانه بون که خزمه‌تی کاری ئاغاکانیان ده‌کرد.

کۆیله‌کان به شێوه‌یه‌کی سه‌ره‌کی له کشت و کاڵ و کاره پیشه‌ییه‌کاندا ئیشیان ده‌کرد. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی قازانجی ئه‌و به‌رهه‌می ده‌یان هێنا ده‌ستی ئه‌وان نه ده‌که‌وت بۆیه هه‌رگیز به دڵسۆزی ئیشیان نه‌ده‌کرد، هیچ هێزێکیش نه‌بو دژی ویستی خۆیان به زۆر ئیشیان پیّ بکات.

هاتنی ئاینی مه‌سیحیه‌ت، ڕۆڵێکی گرنگی بینی له لاواز کردنی ئیمپراتۆریه‌تی ڕۆمانیدا مه‌سیحیه‌ت به بانگهێشت کردنی بۆ یه‌کسانی و خۆشه‌ویستی چه‌وساوه‌کانی ڕۆمای هه‌مو بۆ لای خۆی ڕاکێشا و له‌سه‌ده‌ی چواره‌می زاینی دا قوسته‌نتینی یه‌که‌می پادشای ڕۆما ناچاربو داواکاری مه‌سیحیه‌کان قبوڵ بکات و مۆڵه‌تی دا که‌نیسه‌یه‌ك دروست بکرێت و خه‌ڵکی به ئاشرکا تیایدا مه‌راسیمه ئایینه‌کان جیّ به جیّ بکه‌ن.

به‌ڵام جه‌نگاوه‌ره باکوریه‌کان بون دواین زه‌بری پشت شکێنیان ئاراسته‌ی ئیمپراتۆریه‌تی ڕۆما کرد. که بریتی بون له خێڵه شوانکاره‌کانی مانی و فه‌ره‌نسی و ڕۆژ ئاواییه‌کان و مه‌نداڵه‌کان.

ماوه‌یه‌کی دور و درێژ بو ئه‌م هۆزانه به‌رده‌وام هێرشیان ده‌برده سه‌رسه‌نگه‌رکانی پێشه‌وه‌ی ڕۆمانیه‌کان و تا له ئه‌نجامدا له ساڵی ٤٧٦ ی زاینیدا هێرشیان برده‌سه‌ر ڕۆما و داگیریان کرد.

((ئاودوگار)) توانی ئه‌و ئیمپراتۆریه‌ته له‌ناو به‌رێت که فه‌رمان ڕه‌وایی ڕۆژ ئاوای ده‌کرد و خۆی به پادشای ئه‌و سه‌رزه‌مینه ڕاگه‌یاند و دوای ئه‌وه ئیتر شارستانیه‌تی ڕۆمانی توایه‌وه.

## هه‌وره‌گرمه‌ی دوای تریشقه

ده‌بێت تریشقه و هه‌وره‌گرمه یه‌که‌م شتی سروشتی بوبن مرۆڤیان ترساندبێت کاتێك بلاّچه‌ی هه‌وره‌تریشقه و گرمه‌ی هه‌وری بینیوه و بیستوه، بڕوای وا بوه که

خواوەند لێیان تورە بوە و ئەمە ڕێگەیەكە بۆ سزادانی مرۆڤ.
ئێمە كە دەمانەوێت تریشقە و هەورە گرمە بزانین دەبێت بگەڕێینەوە بۆ زانینی دروست لەسەر كارەبا.
ئێمە دەزانین شتەكان بارگەكانیان (+ یان −) دەبێت، بارگەی موجەبیش توانای ڕاكێشانی بارگە سالبەكانی زۆر بەهێزە. كاتێك بارگەكان زیاد دەكەن ئەو ڕاكێشانە بەهێزتر دەبێت، هەرچەندە بەرهەڵستی هەبێت بۆ ئەوەی ئەو دو جۆرە بارگەیە بە دوری بمێننەوە. وەكو هەوا و شوشە و هەر مادەیەكی تری جیاكەرەوە.
بەڵام بارگەكان ئەو بەربەستانە دەڕوخێنن و بەتاڵ كردن لە بارگەكاندا ڕوو دەدات بۆ كەمكردنەوەی ناكۆكی وا دەكات هەردوو تەنەكە لە كارەبادا یەكسان بن كاتێك هەورە تریشقە ڕودەدات كە هەورێك دڵۆپە و شێ ی زۆری تێدا بێت بارگەكانی پێچەوانەی هەورێكی تریان بارگەكانی زەوی بێت.
كاتێك پاڵە پەستۆی كارەبایی لە نێوان هەردوو هەورەكەدا بەرز دەبێتەوە دەگاتە ڕادەیەك بەربەستی نێوانیان دەشكێنن و بەو جۆرە هەروە بلاّچە ڕودەدات بەتاڵ كردنی بارگەش ئەو ڕێچەكەیە دەگرێتە بەر كە كەمترین بەربەستی لێ یە بۆیە دەبینین هەورە تریشقە بە شێوازێكی پێچاو پێچ دروست دەبێت.
توانای هەوا بۆ گەیاندنی كارەبا كە بە گوێرەی پلەی گەرما و چڕی و شێ دەگۆڕێت. هەوای وشك جیاكەرەوەیەكی باشە. بەڵام هەوای شێدار گەیەنەرێكی باشە بۆ كارەبا، لەبەر ئەوە زۆربەی جار كە باران دەبارێت هەورە تریشقە دەوەستێت هەوای شێداریش گەیەنرێك باش پێك دەهێنێت، كە دەشێت بارگە كارەباییەكان بە شێنەیی تیایدا بپەڕنەوە.
ئەی دەربارەی هەورە گرمە چی؟
كاتێك بارگەیەكی كارەبایی بەتاڵ دەبێت وا دكات لە هەواكەی دەوروبەری بە خێرایی بكشێت و ئەمجا كرژ بێتەوە! ڕەوتەكانی هەواش لەگەڵ ڕودانی ئەو كشان و كرژ بونەوەیەدا دەجوڵێتەوە. بۆیە پێكدادانی زۆر توند لە نێوان ئەو ڕەوتە هەواییانەدا ڕودەدات و ئێمەش وەكو هەورە گرمە دەیبیستین.

كه دژه شەپۆله تیشكیەكان له هەورێكەوه بۆ هەورێكی تر دەلەرێنەوه، دەبێته هۆی لەرینەوەی هەورەگرمه. چونكه تیشك ١٦٨٢٨٤ میل (٢٩٩٧٩٥) كیلۆمەتر له چركەیەكدا دەبڕێت. بەلاّم دەنگ (٣٣٥) مەتر له چركەیەكدا دەبڕێت بۆیه بلاّچه پێش هەورەگرمه دەبینین.

## كێ یەكەم دانی تاقمی دروست كرد؟

دیمەنی مرۆڤ جوان نانوێنێت ئەگەر هەندێك له دانەكانی ناتەواو بن. هەروەها له دەست دانی هەندێك دان به شێوەیەكی مەترسیدار كاریگەری لەسەر خواردن و جوین دەبێت. لەبەر ئەوه مرۆڤ هەر له دێر زەمانەوه بڕیاری دا، دانه سروشتیەكانی ئەگەر بەهەر هۆیەكەوه لەناوچون دانی دەستكردی له شوێندا دروست كاتەوه.

دانانی دانی دەستكرد له شوێنی دانی سروشتیدا له پیشەسازی داندا پێ ی دەوترێت (نەشتەرگەری پینەكردن یان چاككردن) یان (تاقم).

كاتێك مرۆڤ دانێك یان چەند دانێكی لەدەست دەدات. به پرد یان به تاقمی دانی دەستكرد دروستی دەكاتەوه. له پردی دەستكردا دانی سروشتی له دولای چاڵەكەدا كه له ئەنجامی لەدەست دانی، دانی سروشتیدا دادەنرێت له حاڵەتی كاتیدانانی تاقمێك له دانی دەستكرد پشت دەداته لێو و ئەندامەكانی تری دەم له ژێر لێودا.

ڕەنگه سەرتان سوڕ بمێنێت ئەگەر بزانن پردەكانی دانه دەستكردەكان مرۆڤ پێش له سێ هەزار ساڵ له زێڕ دروستی كردووه.

بەلاّم تاقمی تەواو بۆ ئەوانەی هیچ ددانێكیان نیه و دروست دەكرێت، تەمەنی تەنها سێ سەد ساڵه. یەكەم كێشه كه هاته ڕێگەی دروست كردنی پرد و تاقمی ددان ئەوه بوو چۆن له شوێنی دروستی خۆیدا دابنرێت له ناو دەمدا. ئەو مادەیه چی بێت كه له دروست كردنیدا بەكار ببرێت.

بەلاّم پزیشكی نوێ و سەردەم ئەو دوو كێشەیەی چارەسەر كرد و تا ئەندازەیەك ئەوانەی دانی تاقم بەكار دێنن خواردنی پێ بخۆن وەكو كەسێك ی ئاسایی هەروەها بەكارهێنانی له دەمدا سوك و ئاسانه.

بەڵام لەبارەی خودی دانی دەستکردەوە چی؟
لەسەرەتادا دانی دەستکرد لە ئێسك و عاج و دانی گامێشی دەریا دروست دەکرا و هەندێك جار پردەکە و تەواوی تاقمەکە لە هەمان مادە دروست دەکران. هەر پارچەیەکیش بە جودا لە دەمدا جێگیر دەکرا. دوای ئەوە دانی سروشتی و دانی گیانلەبەرە جۆراوجۆرەکان بەکارهێنران، بە تایبەت دانی ئاژەڵان کە لەسەر بنکەیەکی زێر یان عاج دادەنران.
لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم، ددان لە پۆرسەلان دروست دەکرا، کە دانەکە بە تەنیا لە زێڕ یان پلاتین بوو. ئەو مەوادانەی لە پیشەسازی داندا بەکار دەهێنرا هەر ئەو مەوادانە بوو لە پیشەسازی پورسەلان دا بەکار دەهێنرا، کە مادەیەکی نیوە شەفاف زۆر بەهێزە.
پێش نزیکەی سەد ساڵێکە دەست کرا بە نەخشەدانانی، دانی دەستکرد بە جۆرێك کە لەگەڵ شێوازی دەموچاودا بگونجێت. بەڵام ئەمڕۆ دانی دەستکرد هێندە لە دانی سروشتی دەچێت، ڕەنگە بە ئاسانی لێك جودا نەکرێنەوە.

## لە کەیەوە خەڵکی گۆشت دەکولینن؟

مرۆڤ سەرەتاییەکان چێشتیان نەکولاندوە، هەرچیەکیان دەست کەوتوە لە سروشتدا بەکاڵی خواردویانە. چونکە مرۆڤ هیچ ڕێگەیەکی چێشت لێنانی لە بەردەستدا نەبوە و، نەیشی زانیوە چۆن ئاگر بکاتەوە. کاتێکیش مرۆڤ فێربو ئاگر بکاتەوە بۆ خۆگەرم کردنەوە و دورخستنەوەی ئاژەڵە دڕندەکان لە خۆی بەکاری هێناوە.
ڕەنگە دۆزینەوەی چێشت لێنان بە ڕێکەوت بوبێت، هەندێك لەو ئاژەڵانەی مرۆڤ کوشتبونی لای ئاگرێکدا فڕێ ی دابێت یان پارچە گۆشتێك لە دەستی بەر بووبێتەوە. کەوتبێتە سەر ئاگرێك، کە سەیری کردوە ڕەنگەکەی گۆڕاوە و بۆنێکی خۆشی لێوە دەرچوە. تامیشی خۆش بوە. بۆیە لەوەوە مرۆڤ بۆی دەرکەوت دەتوانێت لە ڕێگەی ئاگرەوە چێشتێکی خۆشی دەست کەوێت.
یەکێك لە شێوە سەرەکیەکانی چێشت لێنان دانانی گۆشت بو لەسەر بەردێك لە دەوری ئاگرێکدا، چاڵی دەوری بەردەکە و سکڵی خەڵوزەکە یەکەمین فڕن بوە لای

مرۆڤی سەرەتایی. دوای ئەوە فڕن لەسەر زەوی دروست کرا. لەگەڵ کونێك لە تیایدا بو بۆ دوڵەڵ کێشان و ئامێرێك بۆ ڕێکخستنی هەواکێشاندا. لەگەڵ بەردێك کە دەنرایە کونەکەیە بۆ مانەوەی گەرمای ناو فڕنەکە. دوای ئەوە مرۆڤ فێربوو چۆن چێشتەکەی بکوڵێنێت لە کونێکدا کە بە پێستە دەور درابێت، پێستەکەش پڕ دەکرا لە ئاو و گەرم دەکرا تا پلەی کوڵاندن بە هۆی بەردی زۆر گەرمەوە.

دوای ئەوە ئاوکوڵێن دروست کرا، و وەکو مەنجەڵ بۆ چێشت لێنان بەکار دەهێنرا بەو جۆرە مرۆڤەکان لە سەردەمە سەرەتاییەکاندا، پێش هەزاران ساڵ دوو جۆری سەرەکی چێشت لێنانی داهێنا.

سور کردنەوە لە گەرمای وشکدا یان کوڵاندن، یان بەکارهێنانی هەڵم لە گەرمای شێداردا.

## کام ماسیە هێلکەکانی لە دەمیدا هەڵدەگرێت؟

جۆرێکی سەیر لە ماسی هەیە کە پێ ی دەوترێت ((سەلور)) هێلەکەکەی لە دەمیدا دەهێڵێتەوە ئەمجۆرە ماسیە لە زەریای ئەتڵەسیدا دەژیت لە بەرامبەر لێوارەکانی روژهەلاتی ئەمریکادا.

لە هەموو سەیرتر ئەوەیە نێرەکانی ئەم جۆرە ماسیە بەو ئەرکە هەڵدەستێت نەك مێینەکانی. دوای دانانی هێلکەکان لە لایەن مێینەوەو گیرسانی نێرەکە دەیخاتە دەمیەوە. کە ژمارەیان پەنجا هێلکە دەبێت و هەریەکەی ئەوەندەی تۆپی بلیاردێك دەبێت.

ئەو هێلکانەی ماوەی یەك مانگیان دەوێت تا هەڵدێن و بە درێژایی ئەو ماوەیەش ئەو ماسیە بە ڕۆژو دەبێت و هیچ شتێك ناخوات. تەنها ئەو خواردنە دەخوات کە لە پێشدا لە لەشیدا پەسیسەی کردووە!

تەنها ڕۆڵی نێرینە بەوەوە ناوەستێت و دەبێت وەکو دایکێك دوو حەفتە دوای هەڵهێنانی هێلکەکان، بێچوە بچوکەکان لە دەمی خۆیدا بهێڵێتەوە و لە مەترسی خواردن و لەناوچون بیان پارێزێت.

حەوت جۆر ماسی هەیە کە پێیان دەوترێت ماسی ((سەلور)) و لە ڕۆژهەلاتی و ناوەڕاستی ئەمریکای باکوردا دەژین. هەندێکیان پێیان دەڵێن ماسی ڕاقود و

ماسی سەلوری شین كێشیان لە ٤٥ كیلۆ زیاتر دەبێت. ئەو ماسیانە لە بنی دەریا و ڕوبارەكاندا دەژین و لە جوڵاندا سستن و چوار سمێڵیان هەیە لە لای دەمیانەوە كە لە سمێڵی پشیلە دەچێت و یارمەتیان دەدات بۆ ڕێگە دۆزینەوە و پەیداكردنی خۆراك ئەم جۆرە ماسیانە پێشیان دەڵێن ((ماسی پشیلە)).

ماسی سلوری كارەبایی لە دەریا و ڕوبارەكانی ئەفریقیای ئیستیوائیدا دەژێت و ئەشێت درێژیەكەی بگاتە چوار پێ. لە ڕێگەی صەدمەی كارەباییشەوە نێچیرەكەی دەگرێت.

جۆرێكی تر لە ماسی سەلور هەیە پێ ی دەوترێت ((وێلز)) ئەم جۆرە لەشیان زۆر گەورەیە و لەو دەریایانەدا دەژێت كەبنەكەیان قوڕاویە لە ناوەڕاستی ئوروپادا. درێژی ئەمجۆرە ماسیە دەگاتە نۆ پێو دەڵێن گوایە گەورەترین ماسیە كە لە ئاوە سازگارەكاندا دەژی.

## كێ یەكەمین باخچەی ئاژەڵانی دروست كرد؟

باخچەی ئاژەڵان ئەو شوێنەیە كە ئاژەڵانی تیادا ڕاگیر دەكرێت و پیشانی خەڵكی دەدەن.

بۆچی گیانلەبەرە دڕندەكان لە باخچەی ئاژەڵاندا ڕاگیر دەكەین؟

گرنگترین هۆ ئەوەی كە هەموومان گرنگی بە ئاژەڵان دەدەین. هۆیەكی تریشی ئەوە زانایان دەتوانن زۆر شتی گرنگ سەبارەت بە ئاژەڵانی زیندو فێر بن تەنانەت مرۆڤە ئاساییەكانیش دەتوانن زۆر شت لەسەر خودی ئاژەڵان فێر بن لە ماوەی چاودێری كردنیانەوە، وەكو خواردن و گەشە سەندن و هتد.

لەبەر ئەوە باخچەی ئاژەڵان جۆرێكە لە قوتابخانە، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێت ناوی یەكەمین باخچەی ئاژەڵانیان نا ((باخچەی زیرەكی)). ئەم باخچەیە لە دەور و بەری ساڵی ١١٥٠ پێش زایندا یەكێك لە ئیمپراتۆرەكانی چین دروستی كرد.

كە جۆرەها ئاسك و باڵندە و ماسی ی تێدا ڕاگیر كرد. كە زۆر لە باخچەی ئاژەڵانی ئەم سەردەمە دەچو، لەگەڵ جیاوازیەكی سەرەكیدا ئەوەبو كە تەنها ئیمپراتۆر و دارو دەستەكەی دەیابینی و لەبەردەم جەماوەردا داخرابو. لە كۆندا تەنها پادشایان و دەوڵەمەندان بەیانتوانی باخچەی ئاژەڵان دروست بكەن، لەبەر ئەوەی

دروست كردنى پارەيەكى زۆرى تێدەچوو. يەكەمين باخچەى ئاژەڵان كە لەبەردەم خەڵكيدا لە پاريس و لە ساڵى ١٧٩٣ دا كرايەوە. ئەويش باخچەى گولاَن ((Jardin des Plantes)) بو كە ئاژەڵان و مۆزەخانە و باخچەى گولاَنيشى لەخۆ دەگرت. دوەم باخچەى گەورەى ئاژەڵان لە ساڵى ١٨٢٩ دا لە باخچەى ((ريجنتس پارك)) ى لەندەندا كرايەوە دواى ئەوە باخچەى ئاژەڵانى بەرلينى بەدواداهات لە ساڵى ١٨٤٤، كە دواى ئەوە بو بە يەكێك لە باشترين و جوانترين باخچەى ئاژەڵان لە جيهاندا.

لە وڵاتە يەككگرتوەكانى ئەمريكاشدا يەكەمين باخچەى ئاژەڵان لە ويلايەتى فلادلفيادا كرايەوە لە ساڵى ١٨٧٤، ساڵێك دواى ئەوەش ١٨٧٥ باخچەى ئاژەڵانى ويلايەتى سنسيناتى.

## يارى مشتەكوڵە (الملاكمە)

زۆرێك لە خەڵك هەن دەڵێن دەبێت يارى مشتەكوڵە لابرێت، لە مێژوى مشتە كوڵەشدا زۆرجار قەدەغە كراوە. زۆر كەس تا ئێستاش هەست بەوە دەكەن كە وەرزشێكى زۆر دڵرەقانەيە و يان بە واتايەكى تر يارييەيكى دڕندانەيە.

هەستى ئەوانە بێنە پێش چاوى خۆت ئەگەر ئەو كەسانە ياريە يەكەمەكانى مشتەكوڵەيان ببينيايە كە لە يونانى كۆندا دەكرا، زۆر لەو ياسايانەى كە ئەو كاتە هەبون زۆر لەو ياسايانە دەچێت كە ئەمڕۆ ئيشى پێ دەكرێت. بەڵام جياوازيەكى زۆر گەورە دەبينرێت، لە برى ئەو دەست كێشانەى ئەمڕۆ لەدەست دەكرێت يارى چيە كۆنەكان دەست كێشێكى چەرميان لەدەست دەكرد كە بە قورقوشم و ئاسن ئاخنرابوو. دەشيا زۆر كوشندە بايە!

دواى ڕوخانى ئيمپراتۆريەتى ڕۆمانى، مشتەكوڵە بزر بوو. بە ديار نەكەوتەوە تا دواى زيندوكردنەوەى لە ئوروپادا لە سەرەتاى سەدەى هەژدەهەمدا. دواى ئەوە بە درێژايى سەد ساڵ هەر زۆر زوو گۆڕا بۆ وەرزشێكى بەناوبانگ.

پاش هاتنەوەى بۆ ناو دونياى وەرزش ياريەكان بەدەستى ڕوت دەكرا و هەندێكيشى جارى وا هەبوو چەند كاتژمێرێك درێژەى دەكێشا. تا واى لێدەهات يەكێك لە يارى چيەكان پەكى دەكەوت و تەنانەت نەيدەتوانى هەستێتەوە سەرپێ.

زۆر ئاساییە ئەم شێوە دڕندانەیە لە یاری مشتەكۆڵە، جەماوەری وروژاندبێت، دژی ئەم یاریە. بۆیە دەبوایە شتێك بكرایە بۆ ڕزگار كردنی یاری مشتەكۆڵە. بۆیە دەست كێشی لە لەباد ئاخنراو بەكار هێنرا و دوای ئەوە وردە وردە سیمایەكی مرۆیی زیاد كرا بۆ یاسا كۆنەكانی ئەم یاریە.

لە كۆتایی ساڵی ١٨٦٧ دا پێشكەوتنێكی گرنگ ڕویدا لەم یاریەدا، كە مشتە كۆڵەی لای جەماوەر خۆشەویست كرد. لەو ساڵەدا بو ((ماركیزكۆ ینزبەری)) كۆمەڵێك یاسای دانا كە بوە هۆی چاكسازی زۆر لەو یاریەدا.

بۆ نمونە: ماوەی هەر گێمێك بەوە دیاری كرا كە تەنها سێ خولەك بێت. ماوەی نێوان دوو گێمیش تەنها یەك خولەك بێت. ئەم یاسایانە لە هەموو جیهاندا پەیڕەو كران و ئێستاش هەر ئەو یاسایانەن تەحەكوم بە یاری مشتە كۆڵەوە دەكەن و لەسەر ئەو بنەمایانە یاری دەكرێت.

تا سەدەی بیستەم یاری مشتەكۆڵە لە دەرەوەی بەریتانیا و وڵاتە یەكگرتوەكاندا زۆر كەم بو بەڵام دوای ئەوە بە هەموو جیهاندا بڵاو بوەوە.

## قوللەی ئیڤڵ

قوللەی ئیڤڵ لە پاریسدا گۆڕانكاریەكی گرنگ بو لە مێژوی بیناسازیدا، لە ساڵی ١٨٨٩ دا حكومەتی فەرەنسا پێشانگایەكی لەیادی سەد ساڵەی شۆڕشی فەرەنسا دا ڕێكخست و بڕیاری دا بینایەكی هەیكەلی لە یادی شۆڕشدا وەكو یادگارێك دروست بكات.

بۆ ئەو مەبەستەش ئەندازیاری بەناوبانگی ڕێگاوبان ((ئەلكسەندەر گۆستاڤ ئیڤڵ)) دەست نیشان كرا. بەو جۆرە ئیڤڵ قوللەیەكی بەرز و گەورەی نەخشە كێشا بە بەرزی ٣٠٠ مەتر (٩٨٤ پێ) لە ئاسنی موشەیەكی سەر والأ و ناوی خۆی لێنا.

بەرزی ئیڤڵ دوو ئەوەندەی قوببەی كەنیسەی قەدیس بوترس (باسیلیكا) یە لە ڕۆما. یان دوو هێندەی بەرزی قوچەكی جیزەی گەورەیە. ماوەی بیناكردنەكەی زۆر كەمی خایاند كە تەنها دوو ساڵ و دوو مانگ و دوو ڕۆژ بوو و لە ڕۆژی ٣١ ئازاری ١٨٨٩ دا تەواو كرا، بە كرێكارێكی كەمەوە.

بەڵام زۆر سود لە پێشكەوتنی زانستی وەرگیرا لە چەماندنەوەی ئاسنەكاندا و ئەم

قوللەیە بە سەرەتای شۆڕشێك دادەنرێت لە دونیای ئەندازیاری شارستانی و نەخشە سازی بینادا. بنكەی قوللەكە ڕوبەری هەشت هەزار مەتری چوارگۆشە زەوی داگیر كردوە و، چوار كەوانەی نیمچە بازنەیی هەیە لەگەڵ بڵنەكی سەركەوتن و دابەزیندا و ١٧٩٢ پلیكانەشی هەیە. كێشی شی نزیكەی حەوت هەزار تەنە. مرۆڤ دەتوانێت لە لوتكەی قوللەكەوە تا دوری ٧٥ كیلۆمەتر ببینێت.
ئەمەش یەكەم خاڵی ڕاكێشەرە بۆ ئەوانەی سەردانی ئەم قوللەیە دەكەن. تا ساڵی ١٩٣٠ كە بینای ((كرایزلر)) لە نیویۆرك تەواو كرا، قوللەی ئیڤل بەرزترین بینا بو لە جیهاندا.
لە ساڵی ١٩١٩ پەخشێكی ئیزگەیی لەسەر لوتكەی قوللەكە دانرا كە ٢٠,٧٠ مەتری تری، بەرزتری كردەوە. دوای ئەوە بۆ ناردنی پەخشی ئیزگەیی و تەلەفزیۆنی بەكار هێنرا.

## چۆن ڕێژەی باران بارین دەپێوین؟

ئەو ئامێرەی لە پێوانەی ڕێژەی باران بارینددا بەكار دەهێنرێت پێ ی دەوترێت ((باران پێو)). لە هەموو وڵاتاندا فەرمانگەكانی كەش ناسی باران پێو بەكار دێنن بۆ زانینی ڕێژەی باران بارین لەناوچە جیاجیاكاندا، ڕێژەی باران بارینیش بە ئینج یان میللی مەتر دەپێورێت. ئەمڕۆ چەندین جۆر باران پێو بەكاردەهێنرێت پێوەری ئاسایی بارانیش لە شوشەیەكی پلە پلە پێك دێت كە لە ناو لولەكێكی ئاسندا دادەنرێت.
كونی شوشەكەی سەرەوە بە ڕەحەتیەكەوە پەیوەست دەكرێت، سەری ڕەحەتیەكە دە ئەوەندەی تیرەی شوشەكە گەورەترە و ئەم ئامێرە ئاساییە لە شوێنێكی سەر والآدا، دادەنرێت دور لە دار و بینا و... هتد.
باران لە ڕەحەتیەكەوە دەچێتە ناو شوشەكەوە و كارمەندانی كەس ناسیش هەر ٢٤ كاتژمێر جارێك ئەو ئاوەی لە شوشەكەدا كۆبۆتەوە دەیپێون.
ئەگەر شوشەی پلەپلە (مدرجە) دەست نەكەوت. ئەوا دارێك بەكار دەهێنرێت بۆ پێوانەی ئەو ڕێژە بارانەی باریوە. فەرمانگەی كەش ناسی ڕێژەكانی باران بارین لە ناوچە جیاجیاكاندا كۆ دەكاتەوە بە درێژایی ساڵ و ئەمجا حیسابی ڕێژە یان

ڕێژە مام ناوەندیەکەی دەکات. ئەمرۆ بۆ تۆمار کردنی ڕێژەی باران بارین ئامێری ئوتوماتیکی دروست کراوە.

هەر شوێنێك ڕێژەی باران بارینی لە (٢٥٤) میللمەتر (١٠ ئینج) کەمتر بێت لە ساڵێکدا پێ ی دەوترێت بیابان. ئەگەر باران بارین لە نێوان ٢٥٤ و ٥٠٨ میللمەتردا بو (١٠–٢٠) ئینج لە ساڵدا ئەوا دەبێتە هۆی شین بونی زەوی. بەلام بۆ مەبەستی کشت و کاڵی دەبێت ساڵانە لە ٥٠٨ میللمەتر (٢٠) ئینج زیاتر باران ببارێت.

## شیر چۆن دەگۆڕێت بۆ ماست؟

شیر تەنیا خۆراکێکە هەموو توخمە بنەڕەتیەکانی تێدا بێت. کە بریتی یە لە تێکەڵەیەك لە ئاو و ڕۆن و پرۆتین و شەکر و خوی نا ئەندامیەکان.

مانگا سەرچاوەی سەرەکی شیرە لە جیهاندا. بەلام لە هەندێك ولاتداله گامێش و مەڕ و بزن و ئاسك و حوشتر دەستی دەخەن. نیوەی ئەو شیرەی هندیەکان بەکاری دەبەن لە گامێشەوە دەستیان دەکەوێت.

کاتێك کەمێك ماسی مەییو (هەوێن) دەکرێتە ناو شیرەوە لە هاویندا لە ماوەی چوار کاتژمێردا دەبێتە ماست و لە زستانیشدا لەماوەی دوانزە کاتژمێردا. ئایا دەزانیت شیر چۆن دەگۆڕێت بۆ ماست؟

شیر پرۆتینێکی تیایە پێ ی دەوترێت کازین، ئەو پرۆتینەیە ڕەنگی سپی دەدات شیر. نرخە خۆراکیەکەشی زۆر بەرزە. لەبەر ئەوەی هەموو ترشە ئەمینیەکانی تێدایە کە لەش پێویستی پێ یەتی.

ماستیش لە ئەنجامی کارلێکی کیمیاوی لە نێوان پەکتریای ترشیە ماستەکە و کازین دا دەبێت. کاتێك هەوێن دەکەینە ناو شیرەکەوە، پەکتریای ترشی کەلە ماستەکەدایە دەبێتە هۆی مەیینی کازینەکە. بەو جۆرە شیرەکە دەگۆڕێت بۆ ماست. مرۆڤ لە دێر زەمانەوە ماستی بەکار هێناوە و، بۆ نەخۆشیەکانی گەدە زۆر بە سودە و یارمەتی کۆئەندامی هەرس دەدات کە بە شێوەیەکی باش ئیشی خۆی بکات.

لە کۆندا ماست وەکو دەرمان فرۆشراوە. چونکە ئەو پەکتریایەی تێیدایە

ریخۆڵەكان پاك دەكاتەوە. پسپۆڕان دەڵێن خواردنی ماست بە شێوەیەكی ڕێك و پێك بەرگری لە نەخۆشیەكانی گەدە دەكات.

خەڵكی بە چەندین ڕێگەی جیاواز ماست بەكار دەهێنن، هی وا هەن خوێ ی تێدەكەن و دەیخۆن، هەشە شەكری تێدەكات.

لە هەرێمی بەنگاڵی هنددا پێش ئەوەی شیرەكە بكەنە ماست، شەكری تێدەكەن و دوای ئەوە دەیكەنە ماست بۆ ئەوەی ماستێكی شیرین بفرۆشن.

## گڕكان

هیچ گڕكانێك لە نزیكی نیویۆرك و لەندەن و پاریس ڕوی نەداوە، ئەگەری ڕودانیشی نیە لە داهاتودا. بەلام شوێنی تر هەیە لە جیهاندا كە گڕكانی یەك لە دوای یەك تیایدا ڕو دەدات. ئەمریكای ناوەندی لە سەر زەریای باسیفیكی، یەكێكە لە ناوچە گڕكانیەكانی جیهان. زیاتر لە دوو لەسەر سێ ی گڕكانە بەهێزەكان، لە دەوروبەری زەریای باسیفیكی دا ڕوو دەدات. بە ئاسانی هۆكەشی ئەوەیە توێكڵی زەوی لەو شوێنانەدا زۆر بێ هێزە (لاوازە). بە بەراورد لەگەڵ توێكڵی زەوی لە ناوچەكانی تری دونیادا. لەبەر ئەوەی گڕكان ناتوانێت زەوی بدڕێت و لێ ی بێتە دەرەوە ئەگەر توێكڵی زەویەكە لاواز نەبێت!

گڕكان چۆن پەیدا دەبێت؟

ناخی زەوی زۆر گەرمە هەرچەندە دابەزین بۆ ژێری زەوی، پلەی گەرما بەرزتر دەبێتەوە لە قولایی نزیكە ٣١ كیلۆمەتردا پلەی گەرما دەگاتە ١٠٠٠ بۆ ١١٠٠ پلەی سەدی ئەمەش بەسە بۆ تواندنەوەی بەردەكان لەو شوێنەدا. كاتێك بەردەكان دەتوێنەوە دەكشێن و پێویستیان بە پانتاییەكی زیاتر هەیە.

لە هەندێك شوێنی دونیادا زنجیرە چیای تازە دروست بوونە. (ئێمە باسی هەزاران ساڵ پێش دەكەین) لە نزیك و ژێری ئەم زنجیرە شاخە تازانەدا. جۆرێك لە خاڵی لاواز لە توێكڵی سەختی زەویدا هەیە. بۆیە بەردەكان دەتوێنەوە و بەردە تواوەكانیش بە درزی زەویدا بەرز دەبنەوە.

كاتێك پەستان لە مەنگاوی بەردە تواوەكاندا لە هێزی میچی توێكڵەكەی سەرەوەی گەورەتر بو، ئەوا بۆ سەرەوە دەتەقێتەوە و، وەكو گڕكانێك و

هەڵچونەکەی بەردەوام دەبێت تا گازەکانی تەواو دەبێت.
ئەو مەوادانەی لە گڕکانەکە دەردەچن بە زۆری گازن و بەشێکی زۆریشی بەردە تواوەکەیە کە پێ ی دەڵێن قەقنەس. گەردیلە ڕەقەکانیش کە وەکو پشکۆ و خۆڵەمێش دیارن بە ئاسماندا دەچن.
شۆڕشی گڕکان بریتی یە لە تەقینەوەیەکی گازی بەڵام هەندێك قەقنەسی گڕکانی. دەبێتە زۆر وردەك و ئەوە وا دەکات، ئەوەی لە گڕکانەکە دەردەچێت وەکو دوکەڵی ڕەش دیار بێت.

## شێ چی یە؟

ئەگەر پەرداخێك ئاوی بەفراوت لەسەر مێزێك دانا بۆ ماوەیەك. دەبینین شێ ((لە شێوەی شەونم)) دا لە دیوی دەرەوەی پەرداخەکە دا دروست دەبێت. کەواتە ئەو شێ یە لە کوێوە دێت؟
بێگومان لە هەواوە دێت. لە راستیدا هەمیشە لە هەوادا شێ هەیە لە شێوەی هەڵمدا. لەو دۆخەی پەرداخە ئاوەدا هەڵمەکە لەسەر پەرداخەکە چڕ دەبێتەوە و بە تەواوی دیار دەدات و بەچاو دەبینرێت. بەڵام هەڵم لە هەوادا نابینرێت. ووشەی ((شێ)) واتە بونی هەڵمی ئاو لە هەوادا. ئەو هەڵمە لە هەموو شوێنێکدا هەیە تەنانەت لەسەر بیابانە گەورەکانیش. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت شێ لە هەموو شوێنێکدا هەیە. بەڵام لە هەموو شوێنێکدا وەك یەك نیە.
چەند ڕێگەیەکمان هەیە بۆ تەعبیر کردن لە شێ کە دیار ترینیان ((شێ ی ڕەها)) و ((شێ ی ڕێژەیی یە)).
شێ ی ڕەها واتە ئەو ڕێژە هەڵمەی ئاو کە لە هەر یەکە یەکی قەبارەدا هەیە لە هەوادا. لە هەر پێ یەکی سێ جای هەوادا گەردیلەیەکی زۆر هەیە. بەڵام بۆ مەبەستی پراکتیکی، ئەوە مانای وا نیە زۆرە.
ئەگەر دەتەوێت بزانیت هەست بە ئاسوودەیی دەکەیت یان نە؟ ئەوا ((چوا گەردیلە لە هەر پێ یەکی سێ جا)) دا ئاگادارمان دەکاتەوە کە هەوا شێدار یان ووشك دەبێت. هەر چەند شێ لەلەشدا زیاتر هەڵم بکات، هێندە هەستی بە ئاسوودەیی زیاتر دەکەین.

ئەو هەڵم کردنەش پشت بە پلەی گەرما دەبەستێت، ئەگەر ڕێژەی شێ ١٠٠٪ بێت. واتە هەوا بە تەواوی تێرە لە هەڵمی ئاو. هەر چەندە پلەی گەرما بەرز بێتەوە ئەوا هەوا دەتوانێت ڕێژەیەکی زیاتر لە هەڵمی ئاو وەر بگرێت.

لەبەر ئەوە لە ڕۆژێکی گەرمادا. ئەگەر شێ بە ڕێژەی ٩٠٪ بێت، واتە بونی ڕێژەیەکی زۆری شێ لە هەوادا. ئەوەش وامان لێدەکات زۆر تەنگژە بین.

## بومەلەرزە

تەنها ناوچەیەك کە زۆرترین بومەلەرزە لێ ی بدات یابانە. بە درێژایی ڕۆژەکانی ساڵ، بومەلەرزە تیایدا ڕوو دەدات، بەڵام هێندە سوکە هیچ زیانێکی لێ ناکەوێتەوە. هەروەها شوێنێکی تریش کە بومەلەرزەی زۆر بەخۆیەوە ببینێت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە.

تەفسیری ئەوەش بەوە دەکرێت کە توێکڵێکی زەوی لە هەموو شوێنێکدا وەکو یەك نیە. لە هەندێك شوێندا توێکڵی زەوی بە شێوەیەکی چەسپاو جێگیر نەبووە.

لەهەر شوێنێکی زەویدا شکاوی هەبوو، ئەوا قەبارەیەکی بەردی گەورە، بە هێزێکی بەهێز لە بەردێکی تری گەورە دەخشێت و وزەی ئەو لێك خشانەش دەگۆڕێت بۆ لەرینەوە و لەرزاندنەوەی بەردەکان. لە کاتێکدا ئەو لەرینەوە و لەرزینە هەزاران میل دەبڕێت. هەمیشە بومەلەرزە لە نزیك هێڵی (شکاو) ەکەوە بەهێز ترە و ئەو گۆڕانکاریانەی دوای بومەلەرزەکە ڕودەدات، لەسەر ڕوی زەوی بە درێژایی هێڵی شکاوەکە ڕون و ئاشکرایە.

ئەو بەشەی کە لە کاتی لەرزینەوەکەدا هەستی پێ دەکرێت بە شێوەیەکی بەهێزتر لە شوێنەکانی تر پێ ی دەوترێت ((سەنتەری سەروی بومەلەرزە))). ئەگەر ئەو سەنتەرە لە نزیك شارێکدا بێت، ئەوا بێگومان وێرانکاری زیاتری لێدەکەوێتەوە. خەڵکیش بەهۆی ڕوخانی خان و بەرەو ئاگر کەوتنەوە وە کە ڕودەدات گیانیان لە دەست دەدەن. ناوچە بومە لەرییەکان و گڕکانیەکان، هەمیشە لەو شوێنانەدا ڕوو دەدەن کە توێکڵی زەوی تیایدا جێگیر نەبووە.

## ئەو گیانلەبەرەی خۆی هەڵدەگەرێنێتەوە

خێزانێك لە شیردەرەکان هەن پێیان دەوترێت، گیاندارە تەمەڵەکان، کە لە سەردارەکانی جەنگەڵە ئیستیوائیەکانی ئەمریکای ناوەڕاست و باشوردا دەژین. ئەندامانی ئەم خێزانە ژیانی خۆیان بە جۆرێکی هەڵگەڕاوەیی دەبەنە سەر.

ئەم ئاژەڵە تەمەڵە بەو شێوە هەڵگەڕاوەییە دەنون و، لە کاتی خەوتنیشدا ماسوڵکەکانی توند دەکات و ئەمەش بە ئەنقەسد دەکات و دەتوانێت بۆ ماوەیەکی درێژ بەمجۆرە بنوێت هەروەها بەو شێوە سەیرە دەخوات و زاوزێ دەکا و بەچکەی دەبێت.

ئەم ئاژەڵە دوو سیفەتی نامۆی تێدایە کە لە ئاژەڵانی تردا نیە. یەکەمیان: دەتوانێت سەری یەك سوڕی تەواو بابدات بۆ قەرەبو کردنەوەی سوڕانی لەشی، دووەمیشیان لە موەکەیدایە کە بە پێچەوانەی ئاراستەی موی زۆربەی گیانلەبەرانی ترەوەیە. ئەم ئاژەڵە تەمەڵە کلکی نیە و لوتی پانە و ددانەکانی لە ددانی بەراز دەچێت.

بە دەگمەن ئەم ئاژەڵە دەبینرێت بە داپۆشینی لەشی بە قەوزە ئارامی بۆ خۆی دەستی بەر دەکات. خواردنیشی بە زۆری لەسەر گەڵا و لقی دارانە، دو جۆریشیان هەیە جۆرێکیان دو پەنجەی پێیان هەیە و جۆرێکیشیان سێ پەنجە.

## یەکەم باڵندە لەسەر زەویدا

دەڵێن یەکەم باڵندە کە پێش ١٤٠ ملیۆن ساڵە لەسەر زەویدا ژیاوە. ناوی ((باڵندەی یەکەم)) بووە. لە خشۆکەکانە و پەرەی سەندوە و ددان و کلك و ئێسقانی زۆر بوە و، سەریشی لەسەر ملێکی درێژ و باریك و زۆر نەرم بوە.

ئەم باڵندەیە لە جیاتی پولەکە لەشی بە پەڕ داپۆشراوە. هەر لەبەر ئەو هۆیەش پێیان وتووە باڵندەکان، جیاواز بوە لە خشۆکەکان.

باڵندەکانی ((باڵندەی یەکەم)) لە باڵندەی ئێستا چونە. بەڵام بە پێچەوانەی باڵندەکانی ئەمڕۆ نەیانتوانیوە بە تەواوی بفرن، چونکە نەبوە بە شێوەیەکی گونجاو لەشەی باڵ بدەن.

دوو قوتابخانه لەسەر بنەچەیەكی فڕین و گەشەسەندنی ئەجۆرە گیاندارانە هەن.
كە یەكێكیان دەڵێت: یەكەم گیانلەبەر كە باڵی گردوٚتەوە ئەو خشۆكانە بونە كە لەسەر داراندا ژیاون. كە لە لقێكەوە بۆ لقێكی تر باڵیان گردوٚتەوە یان لە دارێكەوە بۆ دارێكی تر فڕیون لە ترسی دوژمندا یان بە مەبەستی پەیداكردنی خۆراكدا بووە.
بەو جۆرە باڵ دروست بوە وەكو ئامێرێكی یارمەتی دەر بۆ فڕین یان ئاسنكردنی نیشتنەوە وەكو ئەوەی ئەمڕۆ لە باڵندەكاندا دەیبینین.
بەلاّم بۆ چونەكەی تر دەڵێت: خشۆكە یەكەمەكان لەسەر زەویدا ژیاون و لەشێكی سوكیان بوە و بە مەبەستی خۆ پاراستنیان بە خێرایی بەستووە.
بە گەشەسەندنی كلك و باڵیان كە لە پەڕ بوە یارمەتی داون مەترسی لەسەریان و بوە بەهۆی ئەوەی بتوانن بفڕن.

## كێ بڵندەك ((مصعد)) ی داهێنا؟

بڵندەك (ئاسان سوار)) ئوتۆمبێلێكە بە شێوەیەكی ستونی دەجوڵێتەوە و كەل و پەل و خەڵكی هەڵدەگرێت لە نێوان نهۆمەكانی ساختمانە چەند نهۆمیەكاندا.
زۆربەی ئاسان سوارەكان بەهۆی بزوێنەری كارەباییەوە ئیش دەكەن. بە هاوكاری كێشێك لە بەرامبەر هاوسەنگیدا. لە ڕێگەی یاسای بەكرە و تەلەوە.
ئایا دەزانیت ئاسان سوار كەی داهێنراوە؟
داهێنانی ئاسان سوار لە سەر دەستی یەك پیاو و لەیەك ڕۆژدا نەبووە. پێشخستنی لە ئەنجامی هەوڵێكی زۆری چەندین كەسەوە بووە.
كرداری بەرزكردنەوەی قورسی بەهۆی ئامێرێكی میكانیكیەوە لە دروستی كردنی بینایەكدا بەلانی كەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕۆمانیەكان. ئەندازیاری بیناسازی ڕۆمانی ((ڤیترۆس پۆلیۆ)) لە سەدەی یەكەمی زاینی دا. وەسفی بەرزكردنەوەی سەكۆكانی كردوە بە بەكارهێنانی بەكرە بە هاوكاری دەست یان گیانلەبەران یان وزەی ئاو. لە ساڵی ١٨٠٠ زاینیشدا لە بەریتانیادا وزەی هەڵمی بەكار هێنرا بۆ وەگەڕخستنی ئەم ئامێرە.
لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ئاسان سواری هایدرۆلیكی دروست كرا. بەلاّم

تەنها بۆ سەرخستنى كەل و پەل بەكاردەهێنرا. چونكە زۆر جێ ى متمانە نەبوو لە سەرخستنى خەڵكيدا.

لە ساڵى ١٨٥٣ ((ئەليشا گريڤن)) ئاميرى سەلامەتى بەكار هێنا و بەوەش يەكەم ئاسان سوارى خەڵك هەڵگر لە دايك بوو. بۆ يەكەمجاريش لە ساڵى ١٨٥٧ دا لە نيۆيۆرك بەكار هێنرا. كە بە هەڵم ئيشى دەكرد و لە يەك خولەكدا پێنج نهۆمى دەبرى.

لە سى ساڵى دواى ئەوەدا گەلێك چاكسازى لە ئاسان سواردا كرا. بەڵام گەورەترين پێشكەوتن لە ئاسان سوارى دواى ساڵى ١٨٩٩ دا كرا.

دواى ئەوە جوانكارى زۆر كرا لە شێوەى بڵندەكدا. پاش سەركەوتنە سەر كێشەى سەلامەتى و خێرايى و بەرزكردنەوەدا. بير لە لايەنە ئابوريەكەى كرايەوە. بە گوێرەى پێويستى بيناكان ئاسان سوارى زۆر پێشكەوتوو دروست كران كە خێراييەكەى بەرز كرايەوە بۆ ٣٦٥ مەتر لە چركەيەكدا. لە دەهەى پەنجاكاندا ئاسان سوارى ئوتوماتيكى دروست كرا.

ئاسان سوارە نوێيەكان بە شێوەى جۆراوجۆر و بە مەبەستى جۆراوجۆر دروست دەكرێن. سەرەڕاى بەكارهێنانى لە كردارى بەرزگردنەوەى كەل و پەل و خەڵكدا. لە كەشتى و بەربەست و تەقاندنەوەى موشەكيشدا بەكار دەهێنرێت. وەكو چۆن لە دروست كردنى بينادا بەكارى دەهێنن. ئەمڕۆ تەواوى بڵندەگەكان بە كارەبا ئيش دەكەن.

## ئاوڵە

ئاوڵە نەخۆشيەكى بەر بڵاوە لە ناو منداڵاندا. بەزۆرى منداڵانى تەمەن ٢ بۆ ٦ ساڵ توشى دەبن. بە دەگمەن كەسێكى گەورە توشى ئەم نەخۆشيە دەبێت.

توش بون بە ئاوڵە لە ڕێگەى ڤايرۆسەوە دەبێت. لەبەر ئەوەى ڤايرۆسەكە بەهۆى شىێ و هەواوە دەگوێزرێتەوە، دەشێت ئەم نەخۆشيە زۆر بە ئاسانى بڵاو ببێتەوە كاتێك منداڵێك توشى ئاوڵە دێت، پەڵەيەكى سورى بچوك لەسەر لاشەى بەديار دەكەوێت. كە وەكو زيپكە يان تلۆقە ديارە و پڕيەتى لە ئاو.

ئەم نەخۆشيە هيچ نيشانەيەكى پێش خۆى نيە. جگە لەوە نەبێت لە پێش ٢٤

کاتژمێردا کەسی توشبو تایەکی زۆر سوکی لێ دێت. لە ماوەی سێ ڕۆژدا زیپکەکان بە دیار دەکەون و دوای سی وش کاتژمێر لە دەرکەوتنی یەکەم زیپکە. تەواو سور دەبێتەوە و لە دوای سێ ڕۆژی تر بەرەم کەمبونەوە دەچێت.

زیپکەکان تەنها لە لەشدا بەدەر ناکەون بەڵکو دەموچاو و هەردوو دەستی و لەناو دەمیشدا دروستی دەبن.

کاتێك زیپکەکان پڕ لە ئاودەبن، نەخۆشیەکە ئاسانتر بلأو دەبێتەوە. لەبەر ئەوەی ڤایرۆسەکان لەناو ئاوەکەدان. کاتێك زیپکەکان دەخورێندرێن دەتەقن و ڤایرۆسەکان دێنە دەرەوە و دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵانی تریش توش بن.

کاتێك منداڵ توشی ئەم نەخۆشیە دەبێت، هەست ناکات کە نەخۆشە. ئاستەمە پلەی گەرمای لەشی لە ٣٩ پلەی سەدی بچێتە سەرەوە. بەڵام نەخۆشەکە هەست بە ماندو بون دەکات و هیچی پێ ناخورێت.

ئاوڵە زۆر درێژە ناکێشێت و دوای چوار یان پێنج ڕۆژ زیپکەکان وشك دەبنەوە و لە شوێنەکانیاندا توێژاڵێکی بچوك دروست دەبێت. دەبێت ئەو توێژاڵانە نەخورێندرێن بۆ ئەوەی کێم نەکەن.

دەگمەنە مرۆڤ لە ژیانیدا لە یەکجار زیاتر توشی ئاوڵە ببێت، لەبەر ئەوەی بە یەکجار توشبونی ئەم نەخۆشیە بەرگری لە دژی پەیدا دەبێت.

## کەی یەکەمین سەرژمێری دانیشتوان لە بەریتانیادا کرا؟

هەر لە کۆنەوە حکومەتەکان ئاماری ڕەسمیان بۆ دانیشتوانی وڵاتەکانیان کردووە. وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش. یەکەم وڵات بو لە سەردەمی نوێ دا سەرژمێری دانیشتوانی کردە بەندێك لە دەستوری وڵاتەکەی.

لە سەدەی یازدەهەم دا ((ولیم الفاتح)) فەمانی دا بە ڕوپێو کردنی تەواوی سەرزەمینی بەریتانیا. تا ئێستا ئەو ڕوپێو کردنە ماوە لە تۆمارێکدا کە پێی دەوترێت ((پەرتوکی ڕۆژی حیساب)).

لە ساڵی ١٨٠١ وە هەر دەساڵ جارێك لە بەریتانیا سەرژمێرێك دەکرێت. ئەگەر لەو ڕۆژە سەیرێکی ژمارەکان بکەین بە ئاشکرا گۆڕانکاریەکانمان بەر چاو دەکەوێت.

بۆ نموونه له ساڵی ١٨٠١ دا ژمارەی دانیشتوانی بەریتانیا ١١,٩٩٤٠٠٠ کەس بوه بەڵام ئێستا له ٥٦ ملیۆن کەس زیاتره.

سەر ژمێری گەڵێك زانیاری تری لەگەڵدا کۆ دەکرێتەوه، وەك لەوەی تەنها زانینی ژمارەی دانیشتوان بێت. وەکو ئەگەر ئەو کەسه، سەڵتەیان خێزانداره، جۆری ئەو ماڵەی تێیدا دەژی و پلەی زانستی و پیشەی و چەندین زانیایی تری جۆراوجۆر. ئەو زانیاریانەش گەلێك گرنگن بۆ وەرگرتنی بڕیار له زۆر بواردا. بۆ نموونه دەشێت یارمەتی دروست کردنی، چەند قوتابخانه و دامەزراندنی چەند مامۆستا که پێویسته له داهاتودا بدات. هەروەها دەشێت ڕێنومایی بکات دەربارەی هەر یاسەیەك که دەبێت بۆ پەککەوتوان دەربکرێت.

هەروەها دەشێت ڕابەرمان بێت له کاریگەری ئەو گۆڕانکاریانەدا که لەسەر بازاڕی کار و چەندین لایەنی تردا دروست دەبێت.

هەروەها چەندین سەرژمێری تری دانیشتوان هەیه که له کاته جیاوازەکانی تردا دەکرێت. که پەیوەندی به کشت و کاڵ و پیشەسازی و پیشەسازیه کانزاییەکان و بازرگانی و فەرمانگەکانی دەوڵەت و ئاو و ئاوەڕۆوه هەیه.

## کێ دۆزییەوه کاغەز چۆن دروست دەکرێت؟

ئەگەر پارچە کاغەزێك بکەینه دو لەتەوه دوشت دەبینین. یەکەمیان ئەوەیه به لایەکدا ئاسانتره له لاکەی تر دەدڕێت. دوەمیشیان له شوێنی درینەکه ڕوشاڵێك دروست دەبێت.

تێبینی یەکەم ئەوە دەردەخات که ئەو پارچە کاغەزه بەهۆی ئامێرێکەوه دروست کراوه ئەگەر نا له هەموو لایەکەوه وەکو یەك دەدرا. تێبینی دوەمیش ئەوه دەردەخات که کاغەزەکه بریتی یه له ڕیشاڵێك له درزی زۆر باریك که بەیەکەوه بادراوه. ئەو دەزوانەش بریتین له گەردیلەی ورد له مادەی سیلیلۆز که ڕوەك دروستی دەکات. مرۆڤ پێش کاغەز مادەیەکی دروست کردوه بۆ ئەوەی لەسەری بنو سێت مسریه کۆنەکان پێش چوار هەزار ساڵ لقی داریان توێك گردوۆتەوه و ڕێکیان خستوه و به پێچەوانەوه لەسەر یەکیان داناوه و شتێکی قورسیان خستۆ سەری بۆ ئەوەی باش یەکبگرێت و پاش ئەوەی وشك بۆتەوه، بۆ به پارچه

کاغەزێك و لەسەریان نوسیوە. بەڵام کاغەز نەبوە.

کاغەزی ڕاستەقینە پێش نزیکەی ١٠٥ ساڵ لەسەر دەستی پیاوێکی چینی بەناوی ((سای لۆن)) دروست کرا. کە توانی لە توێکڵی ناوەوە و لفکەی داری توبیدۆزێتەوە چینیەکان توێکڵی داریان لە ئاودەنا بۆ ئەوەی ڕیشاڵەکانی لە لیفەکەی جیا بکەنەوە. دوای ئەوە تێکەڵە سابونیەکەیان دەڕژاندە سینیەکەوە کە بنەکەی بە توێکڵی حەیزەرانی ناسك داپۆشرابو.

دوای ئەوە ئاوەکەیان لێدەبڕی و ئەمجا پارچە قوماشێکیان دەخستە سەر ڕوە نەرمەکەی بۆ ئەوەی ئاوەکەی بمژێت و وشك ببێتەوە. دوای ئەوە بیر کرایەوە چاکسازی لە کاغەزدا بکرێت.

دوای ڕۆیشتنی بازرگانەکان بەرەو ڕۆژ ئاوا و گەیشتنیان بە شاری سەمەرقەند. نهێنی پیشەکەیان وەرگرت و گواستیانەوە بۆ ئیسپانیا، لەوێیشەوە هونەری دروست کردنی کاغەز بە ئوروپادا بلاو بوەوە لەوانە بەریتانیا.

بە تێپەڕ بونی ڕۆژگار هەموو ڕێگەکان و ئامێرەکانی چاکسازی پیشەسازی کاغەز دۆزرانەوە. بۆ نموونە لە هەمویان گرنگتر ئەو ئامێرە بو کە لە ساڵی ١٧٩٨ دا لە فەرەنسا دا دروست کرا. کە دەیتوانی لەفەیەك لە کاغەز بەدەم یەکەوە دروست بکات.

## ئەو توخمانەی لاشەی مرۆڤی لێ پێك دێت

لاشەی مرۆڤ ئامێرێکی زۆر قەشەنگە، کە شەو و ڕۆژ بێ وەستان ئیش دەکات. لەش لەو خۆراکانە وزە وەردەگرێت کە دیخۆین. یەك لەسەر چواری ئەو خواردنانەی کە دەیخۆین لاشە بەکاری دەبات بۆ چالاکیە جۆراوجۆرەکان وەکو یاری و جموجوڵی گشتی. چارەکی دوەمیشی بەکار دەبات بۆ پارێزگاری کردن لە ژیان. واتە پارێز گاری کردن لە پلەی گەرمای لەش و دروست کردنی ریشاڵەکان و چاکسازی و هەروەها بۆ ئەوەی ئەندامە ناوخۆییەکانی لەشی کاری گشتی خۆیان ئەنجام بدەن.

بەڵام نیوەی دوەمی ئەو خواردنەوەی کە دەیخۆین لاشە لە ڕێگەی دەریچەوە فرێ ی دەداتە دەرەوە. بۆیە ئەو خواردنەی کە دەیخۆین تەنها نیوەی بەکار دەبەین. بە

زاراوەی میکانیکی توانایی تەنها ٥٠٪ ـە.

توخمە سەرەکیەکان کە لاشەی مرۆڤ پێك دەهێنن ئەمانەن : ئاو و هەوا ٩٥٪ توخمەکانی تریش بە رێژەی ٥٪، شیکاریەکی کیمیاوی کەلەسەر لاشەی مرۆڤێکی (٦٨) کیلۆ گرامی ئەنجام درا دەری خست کە:

-بە شێوەیەکی تەقریبی- کە لە (٢٤,٢٤) کیلۆگرام ئۆکسجین و ((١٢,٢٥) کیلۆ گرام هیدرۆجین و (٦,٨) کیلۆگرام نایترۆجین و (٢,٠٤) کیلۆگرام کالیسیۆم و (١,٠٩) کیلۆگرام فۆسفۆر و (٦٨٠) گرام صۆدیۆم و (٢٠٤) گرام کلۆرین و (٢٠٤) گرام گۆگرد و (١٧٠,١) گرام مەنگەنیز و (٣٤) گرام ئاسن و (٣٣٧,٥) گرام توخمەکانی تر پێك دێت. ئەم هەموو توخمانە یەك دەگرن بۆ ئەوەی شانەکان و ریشاڵەکانی لەشی مرۆڤ پێك بهێنن.

کاربۆن و هایدرۆجین یەکدەگرن بۆ دانی کاربۆهیدرات و شەکر و چەوری بە لەش. هایدورۆجین و نایترۆجین و کاربۆن ئۆکسجین، لە شێوەی پرۆتین دادەمێننەوە بەڵام کالیسیۆم و فۆسفۆر بڕبڕەی پشتی ئێسقانەکانی لەشن.

ئاسن پێك هێنەری سەرەکی خانەکانی خرۆکە سورەکانە. صۆدیۆم و کلۆرین رێژەیان لە لەشدا وەکو یەکە. بەو جۆرە ئەو هەموو توخمانە یەکدەگرن لە گروپی جیاوازدا و لەشی مرۆڤیش پێویستی بەم توخمانە هەیە، بۆ ئەوەی کارەکانی خۆی بە شێوەیەکی ڕاست ئەنجام بدات.

## کێ گەرمی پێو ((ترمۆ مەتر))ی داهێنا؟

گەرمی پێو ئەو ئامێرەیە کە پلەی گەرمای پێ دەپێورێت. وشەی پیرمۆە Thermo بە واتای ((گەرما)) و وشەی ((مەتر)) Meter بە واتای پێوان دێت پیرمۆمەتر بە واتای گەرمی پێو دێت. مەرجی یەکەمی هەر گەرمی پێوێك ئەوەیە هەمان پلەی گەرما بپێوێك کە لە کەشدا هەیە.

دوای ئەوەی ئەو مەرجەی لە مێشکی خۆیدا دانا زانایەکی ئیتالی بە ناوی ((گالیلۆ)) لە ساڵی ١٥٩٢ دا دەستی دایە تاقیکردنەوە. واتە ((دوای سەد ساڵ لە دۆزینەوەی ئەمریکا لە لایەن کۆلۆمبسەوە)).

گالیلۆ جۆرێك لە گەرمی پێوی دروست کرد بە ناوی ((دۆزەرەرەوی گەرمای

کەش)) thermoskulo. کە بریتی بو لە لولەکێکی شوشە کە لە سەر یەکیەوە عەمبارێکی بەتاڵی لێبو، لە ناو لولەکەکەشدا هەوا هەبوو. گالیلۆ لولەکە و عەمبارە کلۆرەکەی گەرم دەکرد بۆ ئەوەی هەواکە تیایدا بکشێت. سەرە کراوەکەشی دەسختە شلەیەکی وەکو ئاوەوە.

کاتێك هەواکە سارد دەبێتەوە قەبارەکەی دەچێتە یەك و شلەی ناو لولەکەکە بەرز دەبێتەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا دەشیا چاودێری گۆڕانکاریەکانی پلەی گەرما بکرایە لە بەرز بونەوە و دابەزینی ئاستی شلەکەی ناو لولەکەکەدا. بەو جۆرە گەرمی پێومان دەست کەوت. بەڵام ئەوە دەرکەوت کێشەکانی ئەم ئامێرە ئەوەیە، زۆر زوو پاڵە پەستۆی هەوا کاریگەری لەسەر دروست دەکات. بۆیە زۆر بە وردی ئیشی خۆی نەدەکرد.

ئەو جۆرە گەرمی پێوەی ئەمڕۆ بەکاری دەهێنن شلەکە دەکێشێنێت و دەیانباتە یەك بۆ پێوانی پلەی گەرماکە. شلە گیر خواردوەکەی ناو شوشەکەش کە زۆر مەحکەم داخراوە لە لولەکێکی ناسکی بینراودایە.

بەرز بونەوەی پلەی گەرما دەبێتە هۆی کشانی شلەکە لەناو لولەکەکەدا و دابەزینی پلەی گەرماش وا دەکات شلەکە لەناو لولەکەکەدا دابەزێت. پلەی گەرماش بەو ژمارانە دەزانین کە لەسەر لولەکەکە نوسراوە.

ئەمجۆرە گەرمی پێوە ((تۆسکانی فێردنیاندی دوەم)) لە دەوروبەری ساڵی ١٦٥٤ دا بۆ یەکەم جار بەکاری هێنا.

کێ پیانۆی داهێنا؟

ئایا دەزانن جگە لە ئۆرگن پیانۆ ئاڵۆزترین ئامێری مۆسیقایە. لە راستیدا ناوی تەواوی پیانۆ ((پیانۆ فۆرتی)) یە Pianoforte کە مانای ((ناسك و بەهێز)) دەدات و هێمایە بۆ ئەو ئاوازە جۆراوجۆرانەی ئەم ئامێرە دەتوانێت دەری بکات.

ئەم ئامێرە ئاڵۆزە، سەرەتا ئامێرێکی زۆر سادە بوە و ناوی ((مۆنۆکۆرد)) واتە ((تەك ژێ)) بوە. کە بریتی بوە لە سندوقێکی تەك ژێ. کە ماوەکانی پەیژەی مۆسیقای لەسەر دیاری کرابوو و بریتی بو لە هەردوو ئامێری قانون و سەنتور کە ژەنیار بەهۆی پەڕێکەوە دەیژەند.

له دەوروبەری ساڵی ١٠٠٠ ی زاینی دا ((گوێدۆ داریزۆ)) پردێکی جوڵاوی بۆ ئامێری ((مۆنۆکۆرد)) داهێنا و چەندین کلیل و ژێ ی بۆ زیاد کرد. ئەم ئامێرە بە شێوەیەکی گشتی تا سەدەی شانزەهەم بەکار هێنرا.
لەو ئامێرە زۆر دەنگ خۆشانەی کە لە مۆنۆکۆردەوە پێش خرا ئامێری ((کلافیکۆرد)) بو کە دەنگەکانی لە ئەنجامی لەرینەوەی ژێکانەوە دروست دەبوو بە پەنجە خستنە سەر کلیلەکانی سەرەوە. ژەنیاری ئەم ئامێرە دەیتوانی تەحەکوم بە بەرزکردنەوە و نزم کردنەوەی دەنگەکانەوە بکات. لەو ئامێرانەی پەیوەنیان بە کلافیکۆردەوە بوە ئامێری ((سبنت)) بوە، کە شێوەکەی لاکێشەیی بوە و هەشتا یەکەی دەنگی لەسەر بوە و ژەنیار ژێکانی بە پەنجەی یان پەرێك ژەنیوە.
له ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا ئامێری پیانۆی قیسارەیی ((هاربسیکۆرد)) ناوبانگی دەردکرد، کە لە هەردوو ئامێرەکەی تر گەورەتر بوو دو بۆردی کلیلی هەبوو. بەڵام شێوەکەی لە پیانۆیەکی گەورە دەچوو ژەنیارەکەشی بە پەڕێکی باریك لەسەر ژێکانی کاری دەکرد. لە دوایدا ((بارتۆلۆمیۆ کریستۆ فۆری)) لە ساڵی ١٧٠٩ دا چەکوشی خستە ناو ئامێری پیانۆوە و پیانۆی گۆڕی بۆ ئامێرێکی موزیکی جودا لە ئامێرە ژێدارە پێشوەکان.
لە ئەنجامدا گۆڕانکاری باشتر لە کاری چەکوشەکاندا کرا بۆ هەتا هەتایە. بتهۆڤنیش یەکەمین موزیك دانەر بو وای کرد پیانۆ بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکار بهێنرێت.

## گێژاو چی یە؟

کاتێك بیر لە گێژاو دەکەینەوە قەبارەیەکی ئاوی زۆرمان دێتە پێش چاو بە سوڕانەوەیەکی خێرا. دەشێت مرۆڤ و کەشتیەکان لوش بدات و لەناویان ببات.
لەگەڵ ئەوەی زۆر جار گێژاو مەترسیدارە، بەڵام خەڵك ڕاناکێشێت و هیچ ڕەوتێکی ڕاکێشەی بۆ خوارەوە نیە!
دەشێت گێژاوێکی بچکۆلەت لە جۆگەلەیەکدا بینیبێت، ئەمە کاتێك ڕو دەدات کە ئاو لەگەڵ بەرزیەکدا لەیەك بدەن.

کاتێك ئاوەکە بە دەوری بەرزیەکەدا دەسوڕێتەوە، لە دەوری ئەڵقەکە کۆ دەبێتەوە و ڕو دەکاتە کونێك لە ناوەڕاستدا بە ((هێزی بەرهەڵستکار))ناسرا. کەواتە چی گێژاوی گەورە دروست دەکات؟ ئەوەی کە مەترسیدارە بۆ مرۆڤ و کەشتیەکان. کاتێك شەپۆلی ئاوەکە بە خێرایی دێت و دەدات لە دورگەکان، ڕەوتیە دەریاییەکان بە شێوەی گێژاو دەست بە جوڵە دەکەن. ئەمەش لە شوێنە تەسکەکان و لە نێوان دورگەکان و لێواری وشکەکانیەکاندا دروست دەبێت.

کاتێك ڕێڕەوە ئاویەکە زۆر تەسك بێت، هەڵکشانە زۆر قوڵەکە تیایدا فیشقە دەکات و ئاوە گێژاوەکە هەندێك جار دەگۆڕێت بۆ فیشقەی (لولبی) ئەو کاتە ڕەوتی ئاوەکە بەرەو خوار دەبێت. بەڵام ئەمە هەرگیز لە زەریایەکی کراوەدا ڕو نادات.

گێژاو لە زۆر شوێنی جیهاندا ڕو دەدات بەڵام سێگێژاوە بەناوبانگەکەی جیهان ئەمانەن. مایلستۆرم و شاریبدیس و گێژاوی دابەزیوی تاڤگەی نیاگارا.

گێژاوی مایلستۆرم دەکەوێتە بەرامبەر لێوارەکانی نەرویژەوە، بەڵام گێژای شاریبدیس دەکەوێتە کەناڵێکی تەسکی نێوان ئیتالیا و صقلیەوە.

## بۆچی ئاژەڵان ناتوانن قسە بکەن؟

زۆربەی ئاژەڵان بە شێوەیەکی زۆر باش دەتوانن پەیوەندی لە نێوان خۆیاندا بکەن. بەڵام هیچ کامیان ناتوانن قسە بکەن وەکو مرۆڤ، بە واتا ئاژەڵان ناتوانن هیچ وشەیەك بدرکێنن!

باڵندەکان بە دەنگێك کە دەری دەبڕن باڵندەکانی تر تێدەگەیەنن، ئاژەڵانیش بۆن و جوڵە و دەنگ بەکار دەهێنن بۆ پەیوەندی بەیەکتر کردنەوە. هەر بەوەش دەتوانن تەعبیر لە توڕەبون و دڵخۆشی و ترسی خۆیان بکەن. لەبەر ئەوەی قسەکردنی مرۆڤ کردارێکی زۆر ئاڵۆزە بۆ دەربڕینی یەك تەنیا وشە دەبێت چەندین ئەندام بەکاربێنین، بۆیە ئاژەڵان ناتوانن ئەو کردارە ئەنجام بدەن. چونکە ئاژەڵان ناتوانن بۆ دەربڕینی وشەیەك هەریەك لە دەم و قوڕگ و لوت و لێو و ددان و چەناگە و ژێر زمان و مەلاژو لەیەك کاتدا بەکار بهێنن.

هۆیەکی تریشی ئەوەیە کە ڕەنگە لە هەموی گرنگتر بێت، کە ئاژەڵان ناتوانن قسە بکەن ووشەکان هێمایە بۆ لەش و کردار و هەستی و بیر بۆچون، نمونەی ئەوەش

((وشەی باڵندە)) هێمایە بۆ لەشی باڵندەیەکی زیندوو، وشەی تریش هەیە وەسفی ڕەنگ و شێوە و فڕین و چڕینی دەکات.
بەو جۆرە بەکارهێنانی وشەکان واتە بەکارهێنانی هێماکان، کە بە جۆرێکی تایبەت ڕێك دەخرێت بۆ گەیاندنی مەبەستێکی دیاری کرا. ئەمەش پێویستی بە زیرەکی و ژیری هەیە کە ئاژەڵان نیانە، بەمجۆرەش ناتوانن وەکو مرۆڤ قسە بکەن.

## مەمکدارەکان

مەمکدارەکان بەو گیانلەبەرانە دەوترێت کە شیر بە بێچوەکانیان دەدەن.
سەرجەمی ئەو گیانلەبەرانە لە ڕێگەی سیەکانیاوە هەناسە دەدەن و هەروەها لە گیاندارە خوێن گەرمەکانن و لاشەیان بە موو داپۆشراوە. ڕەنگە توشی سەرسوڕمان بین کاتێك بزانین هەندێك لە مەمکدارەکان هێندە لەیەکەوە دورن بەڵام لەیەك خێزانن بۆ نمونە مانگا و گوێلکی دەریا و شەمشەمە کوێرە. هیچ گروپێك کۆیان ناکاتەوە، لە هەمان کاتدا لە گروپی مەمکدارەکانن. هەروەها مرۆڤیش لە هەمان گروپە.
مەمکدارەکان زۆر سەیرن هەندێکیان لە وشکانیدا دەژین و هەندێکیان لە سەر دار و بەشێکیان لە ناو خۆڵدا و، هەندێك مەمك داریش هەن لە ئاودا دەژین.
هەندێکیان گۆشت خۆر و هەندێکی تریان ڕوەك خۆر و هەندێکی تریشیان گۆشت و ڕوەك خۆرن پێکەوە.
غوریلا و شەمپانزی و مەیمونی گەورە، خاوەن سروشتێکی تایبەت بە خۆیانن بەڵام مانگا و بەراز و حوشتر و ئەسپ و کەرکەدەن و فیل و کەروێشك و مشك و سموِرە مەمکدارن لە جۆرێکی تر و زۆربەی کاتیان لە وشکانیدا بەسەر دەبەن.
((ئاتۆم)) ((کە گیاندارێکی ئاویە لە ماسی دەچێت)) و دۆڵفین و نەهەنگ مەمکداری ئاوین. مەمکداریشمان هەیە باڵ دەگرێتەوە وەکو ((شەمشەمە کوێرە)).
کەنغەریش مەمکدارێکی زۆر سەیرە، تورەکەیەکی پێوەیە لە پێشەوەی سکیدا بۆ ئەوەی بێچوەکە پێ هەڵبگرێت.
گیاندارێکی تریش هەیە بە ناوی ((پلاتیپۆس)) کە گیاندارێکی هێلکە کەرە و لە گیاندارەکانی ئوسترالیایە و دەنوکی وەکو دەنوکی مراویە. ئەوەی سەیرە لەم

گیاندارەدا، شیر بە بەچکەکەی دەدات و وەکو باڵندەش هێلکە دەکات.
گیانداری ((بانخۆڵ)) گیاندارێکی مێروولە خۆرە و وەکو ماسی لاشەی بە پولەکە داپۆشراوە و ددانیشی نیە.
شێر و گورگ و پڵنگ و ورچ و پشیلە لە گیاندارە مەمکدارەکانن. نزیکەی ٤٠٠٠ جۆر گیانداری مەمکدار هەیە، کە ناتوانین باسی هەموویان بکەین، بەڵام باسی گرنگترینیانمان کرد.

## بزن مژە

جۆرێك لە بزن هەیە زمانی لە لەشی درێژ ترە. ئەوەی سەیرە درێژی لاشەی ٤٥ سەنتیمەترە، بەڵام درێژی زمانی ١,٢٥ مەترە!
ئەمجۆرە سەیرەی بزن مژە لە جەنگەڵە چڕەکانی ئەفریقیا و مەدەغەشقەر و نێڵجیی هەتددا هەیە. زمانی بزن مژە زۆر باریکە و کاتێك دەیباتە ناو دەمیەوە کلافەی دەکات و لە دەرهێنانیشدا بۆ گرتنی نێچیرەکەی بەکاری دەهێنێت. بە یارمەتی مادەیەکی لینج کە دەیرژێنێت بۆ ئەوەی کرمو مێروولەکانی پێوە بلکێن.
ئەم جۆرەی بزن مژە زۆر تەمەڵ و تەوەزلە و چەندین ڕۆژ لەسەر یەك لەسەر دارێك دەوەستێت و تەنها زمانی بەملا و بەولادا دەسوڕێنێت بۆ ئەوەی نێچیرێکی پێ بگرێت.
ئەمجۆرەی بزن مژە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ بزن مژەکانی تردا نیە و بە ئاسانیش دەتوانێت ڕەنگی خۆی بگۆڕێت.

## ترسناکترین باڵندە لە جیهاندا

((شەبنم)) باڵندەیەکە لە شێوەی وشتر مرخ بەڵام نەختێك بچوکترە. ترسناکترین باڵندەشە لە جیهاندا. سەری تا قاچەکانی ڕنوکێکی خەنجەر ئاسای پێوەیە، وەکو چەکێك بەکاری دێنێت و دەتوانێت سکی مرۆڤی پێ بدڕێت. بۆیە زۆر بە ئاسانی مرۆڤ و گیانلەبەر دەکوژێت.
شەنبم لە غینیای تازە و باکوری ئوستورالیادا هەیە، بە دەگمەن بەرچاوی مرۆڤ دەکەوێت، ئەم باڵندەیە ناتوانێت بفڕێت بەڵام ڕاکردنی زۆر خێرایە، بەهۆی

هەردوو قاچە بەهێزەکەیەوە. کە دەتوانێت لەناو جەنگەڵە چرەکاندا لە کات ژمێرێکدا نزیکەی ٣٠ میل ببڕێت. بەرزیەکەی دەگاتە شەش پێ و کێشی شی ٩٠ کیلۆیە. کاتێك تەنگاو بکرێت لە هەوادا باز دەدات و جوتەیەکی ترسناك دەوەشێنێت.

سەری ئێسقانی پێوەیە و کلاوێکی گەورە بەسەرە شینە بێ توکەکەیەوەتی بۆ ئەوەی بیپارێزێت. لاشەی بە پەڕێکی زبر داپۆشراوە.

بە پێچەوانەی باڵندەکانی ترەوە نێرەکەی هێلکە دەخاتە ژێر خۆی و، مێینەکەش لە سێ تا شەش هێلکە دەکات. ڕەنگی هێلکەکانیشی سەوزە و درێژیەکەشی ١٣ سانتیمەترە.

بە پەنجا ڕۆژ هێلکەکانی هەڵ دەهێنێت، لە لانەیەکدا کە بە گەڵای دار لەسەر زەوی دروستی دەکات.

زانایانی باخچەی ئاژەڵان دەڵێن، شەبنم لە ڕابوردودا توانای فڕینی بوە، بەڵام لەماوەی گەشە سەندنیدا لە فڕین کەوتووە.

## کێ فڕۆکەی داهێنا؟

هەندێك جار داهێنانێك بە (بیرۆکە) دەست پێ دەکات. بەڵام بیرۆکەی فڕۆکە یەکێك لە خەونە هەرە دێرینەکانی مرۆڤ بووە و هەر لە کۆنەوە بیرۆکەی فڕین لە بیری مرۆڤدا زرینگاوەتەوە.

یەکێك لە ئەفسانە ڕۆژ ئاواییە هەرە بەناو بانگەکان، باسی کەسێك دەکات بە ناوی ((ئیکارۆس)) کە بە مۆم باڵێکی بەخۆیەوە لکاندوە و پێ ی فڕیوە! کاتێك زۆر بەرز بۆتەوە و نزیکی خۆر کەوتۆتەوە. مۆمەکە تواوەتەوە و ((ئیکارۆس)) یش کەوتۆتە خوارەوە مردوە!

لە مێژوی عەرەبیشدا باسێکی لەو شێوەیە هەیە، کە باسی عەباسی کوڕی فەرناسی دەکات! لیۆناردۆ دا ڤینشی سەرەڕای ئەوەی وێنەکەش بووە داهێنەریش بوە و وێنەی فڕۆکەیەکی کێشاوە. بیرۆکەی فرۆکە پێشی سەدان ساڵ لە ئێستا بە بیری زۆرلە هونەرمەندان و زانایانی تریشدا هاتووە.

فڕۆکە سەرەتاییەکان بە بێ سوتەمەنی فڕیون، یان لە کاغەز دروست کراون، یان بە

با فڕیون. لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا تاقیکردنەوەی زۆر کرا بۆ فڕۆکە بەڵام کەسێك نەبوو بتوانێت ئامێرێك دروست بکات، لە هەوا قورستر بێت و هێزێکی خۆیی تێدا بێت.

یەکەم کەسێك دروست کردنی ئامێرێکی وای خستە ڕوو پرۆفیسۆر ((صموئیل لانگلی)) بو. کە سکرتێری دەزگای ((سمیشونیان انیستتیوشن ئوف واشنگن دی سی)) بو و دوو ئامێری دروست کرد، پانی هەریەکەیان ٣،٥ مەتر و درێژییان ٤،٥ مەتر و وزەشیان لە بزوێنەرێکی هەڵمی بەهێزی ١،٥ ئەسپ وەردەگرت.

ئەو دوو ئامێرە لە ساڵی ١٨٩٦ دا توانیان بە ئاسماندا بفڕن. لە ١٧ تشرینی یەکەمی ١٩٠٣ دا کاتێك تاقیکردنەوەی فڕینێکی تەواو دەکرا بۆ فڕۆکەکەی لانکی لە ئاسماندا تەقیەوە و هەلا هەلا بوو.

لە ٧ کانونی یەکەمی هەمان ساڵدا ((اورفیل وویلبور ڕایت)) یەکەم گەشتی فڕینیان بە ئامێرێکی پاڵپێوەنەری ئوتوماتیکی کە لە هەوا قورستر بوو دەست پێ کرد بە دوو قوڵی لە کیتی هوکی ویلایەتی کارۆلینای باکور.

گەشتی یەکەمیان کە سی مەتر بو بە دوانزە خولەك و گەشتی دوەمیان کە سێسەدو شەست مەتر بو بە پەنجا و نۆ خولەك بڕییان. بەمجۆرە فڕۆکە لە دایك بوو!

## هۆیەکانی جەنگی ڤێتنام چی بوون؟

هۆیەکانی جەنگی ڤێتنام دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی داگیرکەری فەرەنسی کە لە پەیمان نامەی تینتسین ی ئایاری ١٨٨٥ دا مۆر کرا.

لە ساڵی ١٩٤٦ وە وشەی ڤێتنام لە ڕوژئاوادا، بەکارهێنانی کەوتە ناو خەڵکەوە، وەکو ئاماژەیەك بۆ بەشی ڕۆژهەلأتی هندی چینی، کە لە باکورەوە لە سنوری چینەوە تا دەلتای ڕوباری میکۆنگ لە باشور درێژ دەبێتەوە.

حوکمی داگیرکەری فەرەنسی نارەزاییەکی زۆری لای گەلی ڤێتنام و حزبی شیوعی بەشی هندی چینی کە ((هۆشی مەنە)) لە ساڵی ١٩٣٠ دا دایمەزراند دروست کردبو. لە ماوەی جەنگی دوەمی جیهانیدا یابانیەکان و فەرەنسیەکان، پێکەوە کاریان کرد بۆ کپ کردنەوەی شۆڕش. بەڵام لە ساڵی ١٩٤٥ دا هۆشی

مەنە ((یەکگرتویی ڤێتانم)) ی دامەزراند بۆ پەرەپێدانی خەبات لە پێناو سەربەخۆییدا. ئەم یەکگرتوییە بە شێوەیەکی گشتی بە ناوی ((فێت منە)) ناسرا. کە دوای خۆبەدەستەوە دانی یابان لە جەنگدا، دەستی گرتە سەر شاری هانۆی دا لە باکور.

لە ساڵی ١٩٤٦ بۆ ١٩٥٤ فەرەنسیەکان دژی ئەو سەربەخۆییە جەنگین، ئەمەش وای کرد کە ((هۆشی مەنە)) سەرکردایەتی جەنگێکی پارتی زانی بکات لە دژیان، لە ((جەنگی هندی چینی یەکەمدا)) کە بە سەرکەوتنی ڤێتنامیەکان کۆتایی هات لە جەنگ ((بیان فۆ)) دا لە ٧ ئایاری ١٩٥٤ دا.

لە کۆنگرەیەکی نێو دەوڵەتیدا کە لە ١٢ ی تەموزی ١٩٥٤ دا بەسترا دان نرا بەو سەرکەوتنەدا و، بە پێی رێکەوتن نامەیەك بۆ ماوەیەکی کاتی ڤێتنام دابەش کرا، بۆ باکور کە شیوعیەکان حوکمی بکەن و باشوریش ئەمریکیەکان پشتگیری بکەن. ئەم کۆنگرەیە بە سەرۆکایەتی هاوبەشی بەریتانیا، روسیا بەسترا، چین و ولاّتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش رۆڵی سەرەکیان تێدا بینی.

چالاکی شۆرشگێرانی باشور لە لایەنگرانی شیوعیەت وای کرد. ئەمریکا راستەوخۆ بەشداری جەنگی دوەمی ڤیتنام دا بکات لە (١٩٦٥ بۆ ١٩٧٥) کە زەرەر و زیانێکی زۆری گیانی و ماڵی لێکەوتەوە.

لە ساڵی ١٩٧٣ دا بۆ ماوەیەکی کورت جەنگ وەستێنرا بە پیێ ی رێکەوتن نامەیەك کە لە ٢٧ کانونی دوەمی ئەو ساڵەدا مۆرکرا و هێزەکانی ئەمریکا پاشە کشەیان کرد.

بەلاّم هەر زوو جەنگ دەستی پیێ کردەوە و تا لە ساڵی ١٩٧٥ دا حکومەتی ڤیتنامی باشور روخا لە ٢٠ نیساندا و رژێمێکی شیوعی شوێنی گرتەوە.

لە ساڵی ١٩٧٦ دا هەردوو بەشی ڤیتنام یەکیان گرت بە ناوی کۆماری ڤێتنامی سۆشیالیست.

## گازی ئۆزۆن چی یە؟

ئۆزۆن لە پێکهاتە کیمیاوەکەیدا لە ئۆکسجین دەچێت، بەلاّم لە شێوازدا لە ئوکسجین جیاوازە. بە واتا گەردیلەکانی ئۆزۆن تەنها دەنکۆکەی ئۆکسجینی

تيايه. بەلام ژمارەی ئەو گەردیلانه و ریکخستنیان جیاوازی هەیه لەگەڵ گەردیلەکانی گازی ئۆکسجین دا.
بەلام ئۆزۆن سێ دەنکۆکه له ئۆکسجینی تێدایه لەهەر گەردیلەیەکدا. که به شێوەی سێگۆشه ڕیز بوونه.
ئۆزۆن ڕەنگێکی شینی کراوەی هەیه و بۆنەکەی زۆر بەهێزه و به سروشت ژەهراویه – له تایبەتمەندە کیمیاویەکانیدا جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ئۆکسجین دا هەیه و به ڕێژەیەکی زۆر کەم له بەرگە جوی دا هەیه. له چینه بەرزەکانی ئاسماندا. که له یەکگرتنی کار لێکردنێکی سەروی وەنەوشەیی لەگەڵ ئۆکسجین دا دروست دەبێت.
ئۆزۆن به شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ زۆر سود بەخشه بۆمان. لەبەر ئەوەی تیشکه زیان بەخشەکانی سەروی وەنەوشەیی دەمژێت.
بۆ ئەوەی ئۆزۆنمان دەست بکەوێت ئۆکسجینی ئاسایی بەناو بوریەکدا دەبەین که له کارەبای بێدەنگ بەتاڵی دەکەین. ئەلکترۆداتەکانیش به مادەیەکی نەگەیەنەر دادەپۆشین. بۆ ئەوەی ڕەوتەکانی خاڵی کردنی کارەبایی نزم بێت. وه لێدانی ڤۆلتیەیەکی بەرز دەنێرێت بۆ ناوی ئەلکترۆداتەکان.
دەبێت ئەم ڕێگەیه بەکار بهێنین بۆ ئەوەی ئۆکسجین ئەو وزەیه وەرگرێت که پێویستی پێ یەتی بۆ دروست کردنی ئۆزۆن و هەروەها بۆ ئەوەی ئۆزۆنەکه گەرم نەبێت و ببێتەوه به ئۆکسجینه ئاساییەکەی جاران.
ئۆزۆن کارلێکەرێکی بەهێزی دژە ژەنگە، که له پاککردنەوەی ئاو و هەوا و لابردنی ڕەنگەکانی مەوادە خۆراکیەکاندا بەکار دێت. هەروەها بەرگری دەکات لەگەشەکردنی بەکتریادا له عەمبارەکانی خواردندا و له پیشەسازی دەرمانیشدا بەکار دەهێنرێت.

## پێشبڕکێ ی ماراسۆن

پێشبڕکێ ی ماراسۆن بڕینی نێوانێکی دووره به ڕاکردن. بۆ یەکەمین جار له یاریەکانی ئۆلۆمپی له ئەسینای پایتەختی یونان ساڵی ١٨٩٦ دا زیندوو کرایەوه. ماراسۆن له یادی سەربازی ئەغریقی ((فیدیبیدس)) دا دەمەزرا. که له

سالّی ٤٩٠ پێش زاین دا له ماراسۆنەوه تا ئەسینا ڕای کرد. بۆ ئەوەی هەواڵی سەرکەوتنی وڵاتەکەی بەسەر فارسەکاندا بگەیەنێته وڵاتەکەی. ئەو نێوانەش که بڕی ی چل کیلۆمەتر بوو.
یەکەم کەس له یەکەمین پێشبڕکێ ی ماراسۆندا بردیەوه له ساڵی ١٨٩٦ دا ((سپیرۆس لویس)) ی یونانی بوو.
له ساڵی ١٩٢٤ دا ماوەی ماراسۆن له یاریەکانی ئۆلۆمپی دا به ((٤٢١٩٠)) مەتر واته ((٢٦ میل و ٣٦٠)) یارده دیاری کرا.
بەڵام پێشبڕکێکانی تری ماراسۆن درێژی ماوەکەیان جیاوازی هەیە. لەبەر ئەوە یەکێتی نێودەوڵەتی وەرزشی، له تۆمارەکانیاندا ماوەیەکی دیاری کراویان نیه بۆ ئەم ڕوداوە.
پێشبڕکێ ی ماراسۆن ڕوداوێکی وروژێنەره لەوە ناچێت نه تەمەن و نه مەشق کردن هیچ ڕۆڵێکی هەبێت. بەڵام ماراسۆنی هاوڕێیان ((که له باشوری ئەفریقیادا و به درێژایی ٥٤ میل ڕێك دەخرێت له ساڵی ١٩٢٢ دا ((ئارپر نیوتن)) ی تەمەن ٣٩ ساڵ بردیەوە.
له ساڵی ١٩٥١ یش له ماراسۆنی یەکێتی وەرزشی که له بوسگن ی ئەمریکادا ڕێکخرا ((شێگیگی تاناکا)) ی ژاپۆنی تەمەن نۆزده ساڵ بردیەوە. چیکوسلوڤاکی ((ئەمیل زاتۆبیك)) له ساڵی ١٩٥٢ دا ریکۆردێکی تازەی بۆ خۆی تۆمار کرد که ماوەکەی ٢ کاتژمێر و ٢٣ خولەك و ٣,٢ چرکه بو.
له ساڵی ١٩٦٠ یشدا ((ئەبیبی بیکیلی)) ئەسیوبی. ئەو ماوه ئۆلۆمپییەی به دوو کاتژمێر و ١٥ خولەك و ١٦,٢ چرکه بڕی، به پێ خاوسی.
ئەوەی ماوه بیڵێین یاری ماراسۆن لای وەرزش وانان جەماوەرێکی زۆری هەیە.

## کۆنفۆشیۆس

کۆنفۆشیۆس به یەکێك له گەورەترین مامۆستایانی هەموو سەردەمەکان دادەنرێت له دەوروبەری ٥٥٠ پێش زاینی دا له هەرێمی سانتۆنگی چین له دایك بووه.
کتێبه کۆنەکانی چینی ی خوێندوه و، زۆر شتی به بیرۆکەی نوێ سەبارەت به دروست بونی ڕەوشت و پێش کەوتنی لێوه فێربوو.

چین لەو سەردەمەدا لە ژێر دەسەلاتی یەکێك لە ئیمپراتۆرەکاندا بوو. بەلام ئیمپراتۆر کەسایەتیەکی هێمایی بوو بە دەسەلاتێکی کەمەوە. هەرێمەکانی چین زیاتر لە ژێر حوکمی دەرەبەگە گەندەڵ و چاوچنۆکەکاندا بوون. خەڵکیش هەژار و پەراوێز کرا بون.

کۆنفۆشیۆش لەو بارودۆخەی بێزی دەهاتەوە. بۆیە دەستی دایە فێرکردنی هەرچی لە کتێبە چینیە کۆنەکاندا فێری بو بو. شوێن کەوتوی زۆری بۆ خۆی دروست کرد، وانەکانی تا ئێستاش نمونەیەکی زیندوی لای چینیەکان دروست کردوە. بە جۆرێك کە کاریگەری دروست کرد لەسەر شارستانیەتی چینی و بوو بە یەکێك لە بیرمەندانی ڕۆژهەلاتی دوور.

ناوی ڕاستەقینەی ((کۆنغ فۆ... تزو))یە بەلام نێرراوە تەبشیریە کاسۆلیکیەکان ناوەکەیان گۆڕی بۆ کۆنفۆشیۆس.

لەگەل ئەوەی ئێمە زۆر کەم نەبێت لەسەر بنەچەك و ژیانی نازانین، وەکو دەوترێت لە خێزانێکی هەژار بوە و هەر بە منداڵیش باوکی مردووە و لە کەشێکی هەژارانەدا گەورە بوە و خۆی خۆی فێری خوێندەواری کردوە. بەلام بوو بە بلیمەتی سەردەمی خۆی.

کاتێك گەیشتە تەمەنی ۳۰ ساڵ. دوای سێ ساڵ لە ژن هێنانی، کونفۆشیۆس خەڵکی فێری ئەوە دەکرد چۆن بە بەختەوەری بژیت. دەیگوت ((ئەوە مەکە لەگەڵ خەڵکیدا، کە حەز ناکەیت خەڵکی لەگەڵدا بیکەن)). هەروەها پەیرەوانی خۆی فێر دەکرد : دراوسێکەت خۆش بوێ، چۆن خۆتت خۆش دەوێت)) کەسێکی بێ فیز بوە و هەمیشە دوپاتی کردوەتەوە : من شتێکی نوێم بۆ ئێوە نەهێناوە. بەڵکو حیکمەتی کۆنتان بۆ دەگێڕمەوە.

کۆنفۆشیۆس ئەوەی دەیگوت بەسەری خۆیدا جێ بە جێ دەکرد. لە حکوومەتە ناوچەییەکەیدا چەند پۆستێکی گرنگی بۆ ماوەیەك وەرگرت.

کاتێك کرایە فەرمانە ڕەوای یەکێك لە شارەکان، باجی دەرامەدی لەسەر خەڵك کەم کردەوە و باری ئابوری خەڵکی چاك کرد و قەناعەتیشی بە چینە دەسەلات دارەکان کرد، کە ژیانێکی ئاسودە و خۆش گوزەران بۆ خەڵکی فەراهەم بکەن.

دەگێڕنەوە گوایە کراوەتە وەزیر و هەوڵێکی زۆری داوە بۆ پاککردنەوەی هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە گەندەڵی. بەڵام لە دوایدا گەیشتە ئەو بڕوایە، ئەو گەندەڵیە ڕیشەدارە و کاربەدەستە باڵاکانی حکومەت خۆیان گەندەڵی پەیڕەو دەکەن. بۆیە دەستی لە کارەکەی کێشایەوە.

بە درێژایی سیانزە ساڵی دوای ئەوە، هەموو ناچەکانی چین گەڕا، بۆ بڵاوکردنەوەی فەلسەفەی ڕەوشتی. بەڵام دەچووە هەر جێگەیەك بە سارد و سڕی پێشوازی لێ دەکرا. بۆیە لە ئەنجامدا لە ساڵی ٤٧٩ پێش زاین دا بە دڵ شکاوی سەری نایەوە.

لەگەڵ ئەوەی کۆنفۆشیۆس لە ژیانیدا ئامانجەکانی نەهاتە دی. بەڵام دوای مردنی ئامۆژگاری و ڕێنوماییەکانی بوو بە فەلسەفەی وڵاتەکەی بۆ ماوەی پێنجسەد ساڵ. تا وای لێهات چینییەکان لە پەرستگاکانیاندا قوربانیان بۆ دەکرد و کۆنفۆشیۆسیش بوو بە ئاینی ڕەسمی چین و تا ئێستاش کاریگەری لەسەر ملیۆنەها کەس هەیە لە جیهاندا.

## پادشای ماسیان

شێر پادشای ئاژەڵانە. قرشیش پادشای ماسیانە. قرش خێراترین و مەترسیدارترین ماسیە لە ئاودا. وەکو چۆن گەورەترینی ماسیەکانە. درێژیەکی لە نێوان ١ بۆ ٤ پێدایە. هۆیەکی تریش هەیە بۆ ئەوەی قرش بکاتە پادشای ماسیان، ئەندامێتی یەتی لە کۆنترین گروپی گیانلەبەرانی زیندوو لە جیهاندا.

هەندێك لە زانایان بڕوایان وایە تەمەنی قرش دەگەڕێتەوە بۆ ٢٥٠ ملیۆن ساڵ پێش.

قرش لە ئاوە سوێرەکاندا دەژی، کەللە سەری لە کڕکراکە پێکهاتوە نەك ئێسقان. هەروەها پێستەکەی لە پولەکەی زۆر بچوك داپۆشراوە.

لە جیهاندا زیاتر لە ٢٥٠ جۆر ماسی قرش هەیە، لەوانە سەگی ئاوی کە درێژیەکەی دەگاتە نزیکەی مەترێك، خواردنی قرش لەسەر ماسیە وردیلەکان و گیانلەبەرە بێ بڕبڕەکانە. بەڵام نەهەنگ

گەورەترینی ماسیەکانە. درێژیەکەی دەگاتە ١٥ مەتر و مەترسیدار نیە. زۆرلە

ماسیه قرشەکانی تر درێژییان دەگاتە چەند پێیەك و دانیان زۆر تیژە و لە چەقۆ دەچێت.

قرش هەرچی ی لە دەریادا دەست بکەوێت دەیخوات، لە بچوکترین گیانلەبەری دەرياییەوە تا ماسیه قرشەکانی تر و کیسەڵ و گوێلکی دەریا و دۆلفین. وا زانراوە لەسەر قرش کە دێتە ڕوبارەکانەوە و هێرش دەکاتە سەر تیمساح و ئەسپ و ئەو فیلانەی کە لەو ڕوبارانەدا مەلە دەکەن هەروەها مرۆڤەکانیش.

کاتێك قرش دوی نێچیرەکەی دەکەوێت، بە خێراییەکی وا دەچێت تەنانەت دەگاتە کەشتیەکانیشدا. تا پاشماوەی چێشتخانەکانیان بخوات.

هەندێك لە ماسیه قرشەکان بە تەنیا و هەندێکیان بە کۆمەڵ ڕاودەکەن ساڵانە ژمارەیەکی زۆر ماسی قرش ڕاو دەکرێت و گۆشتەکەی هەرزانە و بەهای خۆراکیشی زۆر بەرزە ئەگەر بە جوانی لێ بنرێت. پێستەکەشی بۆ بەرگی کتێب و دروست کردنی جانتاو پێڵاو بەکار دێت.

جوانترینی ماسیه قرشەکان جۆری ((ماکۆ)) یە کە ژێر سکیان سپیە و بانی پشتیان شینێکی تێرە. زۆر خێرایە و جەنگاوەرێکی بەهێزیشە لە کاتی گرتنیدا.

## یەکەم گەل کە مۆمیای داهێنا

مسریە کۆنەکان بڕوایان وابوو، دوای مردنیان زیندوو بونەوەیەکی تر هەیە. هەروەها بڕواشیان وابوو ڕۆح وەکو باڵندەیەکە لە شێوەی دەم و چاوی مرۆڤدا. کە دەتوانێت بە ڕۆژ بفرێت و لە شەودا بگەڕێتەوە بۆ ناو گۆڕەکەی لە ترسی گیانە شەڕانیەکاندا.

لەبەر ئەوە بوو لاشەکەیان دەپاراست بۆ ئەوەی ڕۆحەکە بناسێتەوە لەهەر گۆڕێکدا بێت. لەوەوە وشەی ((مومیاو)) پەیدابوو کە وشەیەکی عەربیە و بە مانای پاراستنی لاشە بە مۆم یان قیر دێت. زۆربەی مۆمیاکردنەکان بە هۆی مۆم و قیرەوە نەبون. بەڵکو بە خوێ دەپارێزران.

کاتێك خوێ دەکرایە ناو لاشەکەوە شێ ی دەمژی و هەوای وشکی بیابانیش یارمەتی ئەوەی دەدا. دوای ئەوەی لاشەکە وشك دەبوەوە. دیانشۆرد و بە مادەی (ڕاتینج) کە مادەیەکی کە تیرەییە و لە دار دەردەهێنرێت، دەیان شێلا دوای ئەوە

لاشەكەیان بە سەدان مەتر قوماشی كەتان دەپێچایەوە.
٣٠٠٠ ساڵ پێش زاین مسریەكان مردوەكانیان بە شێوەی لول لە لمی بیابانە گەرمەكاندا دەشاردەوە. لمەكەش لاشەكانی دەپاراست.
دوای ئەوە بە چەندین ساڵ كەسایەتیە گرنگەكان. لە گۆڕی بە بەرد دروست كراودا یان ئیهراماتی گەورەدا دەنرانە گۆڕ. بەڵام ئیهرامات و گۆڕە بەردینەكان وەكو لمی بیابانەكان وشك نەبوون. بۆیە پێویستی كرد هونەری مۆمیاكردن پەرە پێ بدرێت.
لە دەوروبەری ١٥٠٠ پێش زایندا، لاشەكان دەخرانە نێو بەرگێكی لكێنەر كە زۆر جوان بۆیاخ كرابوو. دوای ئەوە تابوت لەسەر هەمان شێوە دروست كرا.
مسریە كۆنەكان باوەڕیان وابو هەندێك گیانلەبەر پیرۆزن بۆیە، ئەو ئاژەلانەشیان وشك دەكردەوە لە گۆڕستانی تایبەت بە ئاژەڵاندا دەنێژران.

## كۆنینە (آثار) چیە؟

زۆر ئاستەمە پێناسەی كۆنینە بكەین، شتە كۆنەكان، ئەو شتە دێرینانەن كە پیشەوەرە دەست ڕەنگینەكان دروستیان كردووە.
زۆربەی حكومەتەكان گومركیان لە هێنانە ناوەوەی شتە كۆنینەكان بۆ ناو وڵاتی خۆیان هەڵگرتوە. بۆ ئەوەی شتێك بە كۆنینە ناو ببرێت دەبێت تەمەنێكی دیاری كراوی هەبێت.
لە وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكادا ئەو شتانە بە كۆنینە دادەنرێن كە پێش ساڵی ١٨٣٠ دا دروست كرابن. لە كەنەداشدا پێش ساڵی ١٨٤٧. بەڵام لە بەریتانیادا مەرجە پێش فرۆشتنی سەد ساڵی تەمەن كردبێت. لە زۆربەی وڵاتانی تردا دەبێت هەر شتێك بە كۆنینە دابنرێت تەمەنی شەش سەد ساڵ كەمتر نەبێت خەڵكی دەتوانن وەسفی هەرچی شتێك بكەن بە كۆنینە بێ ئەوەی سنورێكی دیاری كراو هەبێت بۆ جۆری شتەكە.
كۆنینەی وا هەیە لە سەدەی هەژدەهەمدا دروست كراوە و ئێستا بە نرخێكی زۆر گران دەفرۆشرێت. ئارەزومەندانی كۆنینە بە شوێنی شتە شوشەییەكاندا دەگەڕێن بۆ ئەوەی پەیدای بكەن وەكو كەمۆڵە و مەسینەی بێ لولە و پەرداخ و گوڵدان و

قاپ به هه‌موو جۆره‌كانیانه‌وه. ئه‌و كه‌ره‌ستانه‌ش له زیو دروست كراون وه‌كو چه‌تاڵ و فنجانه‌وه و مه‌سینه جۆره‌ها كۆنینه‌ی به‌نرخن. ئیشه ئاسنیه ده‌ستكرده‌كانیش وه‌ك كیلۆنی ده‌رگا و سێپا و به كۆنینه‌ی زۆر به نرخ داده‌نرێن.

## بۆچی توشی مێرولانه ده‌بین؟

((ته‌زین)) هه‌ست كردنه به چز دان كه مرۆڤ له هه‌ردوو ده‌ست و قاچیدا هه‌ستی پیێ ده‌كات. دوای ئه‌وه‌ی خوێن بۆ ماوه‌یه‌ك نه‌گه‌یشتن به‌و ئه‌ندامانه جارێكی تر پێیاندا ده‌ڕوات. هه‌ستێكه كه ئینگلیزه‌كان له باسكردنیدا ده‌ڵێن ((وه‌كو وایه ده‌رزی ئاژه‌ن بكرێیت))

بۆ نموونه كاتێك بۆ ماوه‌یه‌كی درێژ قاچ ده‌خه‌ینه سه‌ر قاچ و دوای ئه‌وه هه‌وڵی وه‌ستان ده‌ده‌ین، هه‌ست ده‌كه‌ین قاچمان توشی ئیفلیجیه‌ك بووه. كاتێك دوباره خوێن پێیدا ده‌چێته‌وه هه‌ست به سڕبون ده‌كه‌ین.

ئایا ده‌زانن بۆچی توشی سڕبون ده‌بین؟

ئێمه ده‌زانین خوێن به ئازادی به ناو ده‌ماره‌كانی له‌شماندا ڕێده‌كات، وه‌كو چۆن ئاو به ئازادی به‌ناو بوریه‌كدا ده‌ڕوات. بیهێننه پێش چاوی خۆتان چی ڕو ده‌دات ئه‌گه‌ر بوریه‌كه بچه‌مێنینه‌وه! بێگومان ئاوه‌كه به دڵۆپه دێته خواره‌وه.

گرنگترین ئیشی خوێن كه به ناو ده‌ماره‌كانی له‌شدا تێده‌په‌ڕێت لابردنی پاشه‌ڕۆ ژه‌هراویه‌كانه له هه‌موو ئه‌ندامه جیاوازه‌كانی له‌شدا.

ئه‌گه‌ر خوێن ڕێ ی نه‌كرد. ئه‌و پاشماوانه كۆده‌بنه‌وه و خانه‌كانی ده‌ماره‌كان له كاری خۆیان ده‌كه‌ون. كه گواستنه‌وه‌ی نامه‌كان له قاچه‌وه بۆ مێشك. بۆیه كاتێك قاچمان ڕاده‌كێشین جارێكی تر خوێن به ده‌ماره‌كاندا ده‌ڕۆن و ئه‌و مێرولانه كردنه‌مان بۆ دروست ده‌كات.

## فلۆراید چۆن دان به‌هێز ده‌كات؟

مرۆڤ له هه‌موو ژیانیدا دوو جار دان ده‌رده‌هێنێت. دانی شیری كه له ٢٠ دان پێك دێت و دانی هه‌میشه‌یی كه له جێگه‌ی دانه شیریه‌كاندا دروست ده‌بێت و بریتی یه له ٣٢ دان. هه‌ر دانێك له تاج و ڕیشه‌یه‌ك یان سێ ڕیشه دروست ده‌بێت به

گوێرەی جۆری دانەکە و شوێنەکەی لەناو دەمدا.

تاج ئەو بەشەی دانە کە لە سەروی لێوەوە دەردەکەوێت. بەڵام ناوەوەی کەلاوەکان ڕیشەکەی تێدا دەبێت. زۆر بەی دان لە مادەیەکی زەردی زۆر ڕەق دروست دەبێت کە پێ ی دەوترێت عاج (دنتاین یان دنتێن) کە بە مینایەکی سپی داپۆشراوە. بەشی سەرەوەی دان لە هەموو شوێنێکی تری لاشەی مرۆڤ ڕەقترە. مینای دان لە ڕەقیدا وەکو بەرد وایە. ئەو گەردیلانەش لێ ی پێك هاتوە بەڕێگەیەکی بلوری ڕیز بوونە.

فلۆراید کە مادەیەکی کیمیاویە مینای دان بەهێز دەکات. ئەگەر دانەکانمان بە فلچەی دان و فلۆریدا بشۆین، گەردیلەی فلۆرایدەکە بە شێوەیەکی بلوری (کریستاڵی) ڕیز دەبێت و دەچێتە شوێنی گەردیلەکانی تر. لەبەر ئەوەی گەردیلەکانی فلۆراید لە گەردیلەکانی تر پتەو ترن، ئەوەش وا دەکات مینا لە بەرامبەر شکاندا ڕەقتر بێت. هەر چەندە دان ڕەقتر بێت ئەگەری کلۆر بونی کەمتر دەبێتەوە. لە زۆر شاری دونیادا ئەمڕۆ فلۆراید دەکرێتە ناو ئەو ئاوەوە کە منداڵ دەیخوات بۆ ئەوەی لە گەورە بوندا دانیان بەهێز بێت.

فلۆراید پێکهاتەیەکە لە پێکهاتە کیمیاویەکان لە فلۆراید (کە توخمێکی گازیە و هیماکەی FL) ە لەگەڵ توخمێك یان کۆمەڵێك توخمی تردا. زۆربەی فلۆرایدەکان ئەنجامی کارلێکی هیدرۆفلۆریك لەگەڵ ئۆکسیدێکی کانزایی بەرهەم دەهێنرێت.

## بۆچی ئاوی دەریاکان هەرگیز وشك ناکەن؟

بە شێوەیەکی گشتی ڕوبار و گۆماوەکان لە وەرزی هاویندا وشك دەکەن. لە ئەنجامی کرداری بە هەڵم بوندا. کرداری بەهەڵم بون لە دەریاکانیشدا ڕوو دەدات بەڵام وشك ناکەن. دەزانن لەبەر چی؟

دەریاکان گەورەترین مەنگاوی ئاوین، ساڵانە ملیۆنەها مەتری سێ جا ئاوی لێ دەبێتە هەڵم و ئەو ئاوەش شێوەی هەڵم لە خۆی دەگرێت و بە شێوەی باران دەبارێتەوە لە ڕێگەی لافاو و ڕوبارەکانەوە جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ ناو دەریاکان، لەبەر ئەوەیە سەرەڕای کرداری بەهەڵم بون، ئاوی دەریاکان نەگۆڕن.

ئەم سوڕە هەمیشەییە یارمەتی مانەوەی ئاستی ئاوی دەریاکان دەدات، ڕێژەی ئاو

له ڕووبار و گۆماوەکاندا زۆر کەمە بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی ئاوی دەریاکاندا، لەبەر ئەوە زۆربەیان لە هاویندا وشك دەکەن. بەڵام هەرچەندە ڕێژەی ئاوە بە هەڵم بووەکە لە دەریاکاندا زۆر بێت. ئەوا ئاوی باران و توانەوەی بەفری چیاکان قەرەبوی دەکەنەوە. ئەو ڕێژەیەی ئاوی باران کە خۆڵ دەیمژێت دووبارە لەڕێگەی جۆگەلەکانەوە دەگاتەوە دەریاکان.

ئەم سوڕی ئاوەش زۆر بەسودە بۆ مرۆڤ، چونکە ئاوی باران ڕادەی شێ لە خۆڵدا دەپارێزێت ئەمەش بۆ خۆی یارمەتی گەشەسەندنی ڕوەك و بەروبومی کشت و کاڵی دەدات. هەروەها ئاوی ڕووبارەکان بۆ مەبەستی ئاودانیش بەکار دەهێنرێت.

بە بێ بونی سوڕی ئاو لە سروشتدا، دەشێت ژیان لەسەر زەویدا نەمێنێت.

## کێ کارەبای دۆزیەوە؟

مرۆڤ هەزاران ساڵ پێش ئێستا لێکۆڵینەوەی لەسەر کارەبا کردوە، بەڵام تا ئێستا نەیزانیوە چی یە! ئێستا بڕوا وایە کە مادە بە هەموو شێوەکانیەوە، پێکهاتوە لە گەردیلەی ورد، کە کارەبای هەڵگرتووە. بە پێ ی ئەم بیردۆزەیەش بە سادەیی دەتوانیت بڵێین کارەبا بریتی یە لە ڕەوتێکی جولاّ و لە ئەلکترۆنات و گەردیلەی تری شەحنکراو.

وشەی کارەبا ((Electricity)) لە زمانی ئینگلیزیدا سەرچاوەکەی وشەی ئەلکترۆن ((Electron)) ی ئەغریقیە.

ئایا دەزانن وشەی ئەلکترۆن لە یونانی کۆندا مانای چی بوە؟

بە واتای (کەهرەمان)) هاتوە، بەمەش تێبینی دەکرێت، کە ئەغریقیەکان شەش سەد ساڵ پێش لەدایك بونی عیسای مەسیح علیه السلام ئەوەیان زانیوە، بە لێکخشاندنی کەهرەمان دەتوانێت شتی تر بۆ خۆی ڕابکێشێت.

مرۆڤ تا ساڵی ١٦٧٢ دا لە بواری لێکۆڵینەوەی کارەبایدا پێش نەکەوت، تا لەو ساڵەدا پیاوێك بە ناوی ((ئۆتۆفۆن گۆیریك)) توانی بارەگەیەکی بەهێزتر لە کارەبا بەرهەم بهێنێت. بە سوڕاندنەوەی گۆیەکی گۆکردی بە خێراییەکی زۆر.

لە ساڵی ١٧٢٩ دا ((ستیڤن گرای)) دۆزیەوە کە هەندێك مەوادی کانزایی کارەبا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوێزێتەوە. خەڵکیش ناویان لەو مەوادانە نا

((گەیەنەرە کارەباییەکان)).

هەروەها ((گرای)) ئەوەشی دۆزیەوە کە هەندێکی مەوادی تر وەکو شوشە و گۆگرد و دار و مۆم کارەبا ناگوێزنەوە. ناوی ((نەگەیەنەرەکان)) یشیان لەم مەوادانە نا.

هەنگاوی گرنگ و داهاتو لە ساڵی ١٧٣٣ دا لە بواری کارەبادا نرا کاتێك ((دۆفینی)) فەرەنسی بارگە سالب و موجەبەکانی لە کارەبادا دۆزیەوە. لەو کاتەدا گومانی ئەوە کرا ئەو دوو جۆرە بارگەیە دوو جۆری جیاواز بن لە کارەبا.

بەلأم ((بنجامین فرانکلین)) یەکەم کەس بوو هەوڵی دا تەفسیری ماهیەتی کارەبا بکات.

کورتەی بیرۆکەکەشی ئەوە بوو: هەموو مەوادەکان لە سروشتدا شلەیەکی کارەباییان تێدایە لە کاتی لێکخشاندندا هەندێك لەو شلەیە دەگوێزرێتەوە بۆ سەر مەودای تر. ئەمڕۆ دەتوانین بڵێین ئەو شلەیە ئەلکترۆناتی سالبە.

گرنگترین پێشکەوتنی زانستی لە کارەبادا دەشێت لەگەڵ دروست کردنی یەکەمین پیل دا بوبێت، کە لە ساڵی (١٨٠٠) دا ((ئەلیساندرۆ ڤۆلتا)) دای هێنا.

ئەم پیلە یەکەمین سەرچاوە بو کە بە بەردەوامی کارەبای دایە دونیا و دونیای بەرەو دۆزینەوەی گرنگ لە بەکارهێنانی کارەبادا رێنومایی کرد.

## کێ قیبلەنمای داهێنا؟

قیبلەنما، بریتی یە لە دەرزیەکی موگناتیسی کە جێگیرە لە سەر میحوەرێك بە جۆرێك کە بە هەموو لایەکدا دەجوڵێتەوە و هەمیشە دەرزیەکە ڕوو لە باکور دەوەستێت. چونکە جەمسەری موگناتیسی گۆی زەویە.

لەبەر ئەوەی ئاراستەی جەمسەرەکە زانراوە، بۆیە هەموو ناوچەکان لە دەریا و وشکانیدا لەسەر ئەوە نەخشە دەکێشرێن. بەو جۆرەش قیبلەنما دەتوانێت ڕابەری رێبواران بکات بە نسبەت ئاراستەکانەوە لە هەر شوێنێکی ئەم دونیایەدا بن.

کەس نازانێت چۆن و کەی بۆ یەکەمین جار قیبلەنما داهێنراوە. بەلأم باوەڕ وایە چینیەکان پێش ٤٥٠٠ ساڵە دایان هێنابێت، ئەلبەت لەسەر ئەوەش مشت و مڕ هەیە. بەهەر حاڵ چینیەکان، لەگەڵ یەکەمەکان بوونە کە مەبدەئی قیبلەنمایان

زانيوه.

بازرگانه عەرەبەكانيش لەوانەوە فێربون و برديانە ئوروپاوە. ئێمە دەزانين قيبلەنما لە سەدەى دوانزەهەمدا لە ئوروپادا ناسراو بووە. ئەشێت كۆنترين جۆرى قيبلەنما پێك هاتبێت لە دەرزيەكى موگناتيسى و چەقێنرابێتە دارێكدا لە ناو ئاوێكى چەوردا.

دوەم پێش خستنى قيبلەنما، بەكارهێنانى دەرزيەك بوە لەسەر ميحوەرى بنكەكەى لە بنى ئاوێكى چەوردا. لە سەرەتادا تەنها گرنگى بەلاى باشوردا دراوە و پارێزگارييان لە ئاوە چەورەكە دەكرد. بە جۆرێك سەرى لاى باكورى دەرزيەكە لەسەر ئەو وێنەيەى ئاماژەى بە باكور دەدا دەمايەوە. دواى ئەوە كارتێكيان بەستە دەزيەكەوە، كە هەر چوار ئاراستەكەى دەست نيشان دەكرد

دەزانين كە جەمسەرى موگناتيسى باكور و جەمسەرى باكور ناكەونە هەمان شوێنەوە. جەمسەرى موگناتيسى باكور، دەكەوێتە دورترين خاڵى باكورى لە لێوارەكانى جەمسەرى ئەمريكاى باكوردا. لە شوێنێكدا كە ناوى نيمچە دورگەى ((بوسيا)) يە.

هەموو دەرزى قيبلەنماكان لە نيوەى باكورى گۆى زەويدا، ڕو لەو شوێنە دەكەن. خەڵكى كۆن جياوازى نێوان جەمسەرى باكورى جوگراف و جەمسەرى موگناتيسى باكوريان نەزانيوە. لەبەر ئەوەى دور بوونە لە هەردوو جەمسەرەوە و هەميشە قيبلەنماكانيان ڕوو لە باكور بووە.

بەلاّم ئەو دەرياوانانەى دواى ئەوەى گيانى خۆيانيان خستە مەترسيەوە و لە وڵاتى خۆيان دور كەوتنەوە، تێبينى ئەو جياوازيەيان كرد و ئەويش زۆر سەرسامى كردن.

## ئايا ئاژەڵان ڕەنگەكان لە يەك جيا دەكەنەوە؟

ئێمە دەزانين گيانلەبەران دەتوانن وەكو ئێمە شتەكان ببينن، بەلاّم ئايا دەتوانن وەكو مرۆڤ، ڕەنگەكان لەيەك جيابكەنەوە؟

زانايان بۆ ئەوەى بگەنە وەلاّمى ئەم پرسيارە، هەستان بە چەندين تاقيكردنەوە لە سەر زۆر لە گيانلەبەران وەكو پشيلە و سەگ و مەيمون و هەنگ و هيتريش.

گەیشتنە ئەوەی کە سەگ ناتوانێت ڕەنگەکان لەیەك جیا بکاتەوە. چەندین خواردنی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەردەم هەندێك سەگدا دانا. جیاوازی ڕەنگەکان، هیچ کاریگەرییەکی لەسەریان نەبوو. ئەمەش سەڵماندی کە سەگ ناتوانێت ڕەنگەکان لەیەك جیا بکاتەوە

ئەو تاقیکردنەوەیەش لەسەر پشیلە کرا، دەرکەوت کە توشی کوێری ڕەنگەکان، بوونە. مەیمون وەکو مرۆڤ لە گیانلەبەرە مەمکدارەکانە، بە تەنیا مەیمون دەتوانێت جیاوازی لە نێوان ڕەنگەکاندا بکات. بەڵام گیانلەبەرە مەمکدارەکانی تر هەموویان توشی کوێری ڕەنگەکان بوونە.

هەنگ هەموو ڕەنگەکان لێك جیادەکاتەوە تەنها ڕەنگی سور نەبێت. کە وەکو ڕەش دەیبینێت. لەسەر ئەو بنەمایەی جیاکردنەوەی ڕەنگەکان، دەبینین هەنگەکان لەسەر هەموو ڕەنگەکانی گوڵ دەنیشنەوە بۆ مژینی شیلە و کۆکردنەوەی هەنگوین. هەنگ دەتوانێت تیشکی سەروی وەنەوشەیی ببینێت، کە تەنانەت ئێمەی مرۆڤیش ناتوانین بیبینین. بە مەبەستی تاقیکردنەوەی بینی نی ڕەنگەکان. دوو کارتی یەکێك شین و یەکێك سوری پیشان درا.

هەندێك شیلە ڕژێنرایە سەر کارتە شینەکەدا و هیچ نەرژێنرایە سەر کارتە سورەکەدا. هەنگەکان لەسەر کارتە شینەکە کۆبوونەوە. ئەمجا کارتە شینەکە هیچ نەڕژێنرایە سەریا و لە شوێنێکی تر دانرا، دووبارە هەنگەکان لەسەری کۆبونەوە. ئەمەش دەیسەلمێنێت لە هەنگ ڕەنگە جیاوازەکان لەیەك جودا دەکاتەوە.

تەنانەت باڵندەکانیش دەتوانن ڕەنگەکان لەیەك جودا بکەنەوە. ڕەنگی باڵندە نێرەکان لە رەنگی مێینەکان جوانترن، لەبەر ئەوەیشە هەمیشە مێینەکان دەچن بۆ لای نێرەکان. تێبینی کراوە، کە باڵندەکان دەتوانن ڕەنگەکانی پەلکە زێڕینەش لەیەك جودا بکەنەوە.

ئاژەڵان بە شێوەیەکی گشتی پێویستیان بە جیاوازی کردنی ڕەنگەکان نیە. لەبەر ئەوەی زۆربەیان لەشەودا ڕاو دەکەن. بە شەویش هیچ ڕەنگیچك نابینرێت. بەڵام هێزی بۆنکردنیان هێندە بەهێزە، کە تەنانەت کوێری ڕەنگەکان نابێتە ڕێگر لەبەردەمیاندا.

## قەرەج لە كویَ وە هاتون؟

قەرەج خەڵكێكی گەڕۆكن، بە هەمیشەیی لە شوێنێكدا نیشتەجیَ نین و دەشێت لە هەرچی شوێنێكی دونیادا ببینرێن.

كەس بنەچەكیان نازانێت، بەلاَم باوەڕ وایە لە هندەوە هاتبن. سەرەتای دروست بونیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەهەمی زاینی. ئاماژەیەك هەیە، كە كۆمەڵێك دیاری كراو لە خەڵكی. لە هندەوە هاتبن بۆ ئێران لەسەدەی نۆهەمدا و لەوێیشەوە، بوبنە دوو بەشەوە.

كۆمەڵێكیان بە باشوری ڕۆژ ئاوادا واتە مسر و باكوری ئەفریقیادا ڕۆیشتبن و كۆمەڵی دوەمیش بەرەو باكور لەسەدەی پانزە و شانزەدا گەیشتبنە باشوری ئوروپا.

ئینگلیزەكان بڕوایان وایە قەرەجەكان لە مسرەوە هاتبن. دوای ئەوەش كۆمەڵێكیان كۆچیان كردبێت بۆ ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئسپانیا و گەیتشبنە سوید و فنلەندە.

زمانی قەرەج پیَ ی دەوترێت ((ڕۆمانی)). كە لە سەنسكریتی دەچێت، دوای چەندین سەدە لە گەڕوكی، زمانیان بووبە تێكەڵەیەك لە ووشەی وەرگیرا و لە زمانی ئەو ولاَتانەی كە تیایدا ژیاون. لەبەر ئەوەی خەڵكێكی جیاواز بونە خەڵكی لێیان ترساوە و خوشیان نەویستون.

قەرەج لەسەر چەند پیشەیەك دەژین، هەندێكیان لە دار شت دروست دەكەن، كۆمەڵێكی تریان قاپ و قاچاخ چاك دەكەنەوە و بەشێكیشیان خوێندنەوەی بەختیان كردوّتە پیشەی خۆیان. لەبەریتانیاش زۆر لە قەرەجەكان خەریكی بازرگانی ئەسپن.

هەندێكی تریان گۆرانی بێژ و كەمانچەژەنی زۆر چاكن. قەرەجەكانی ئسپانیاش بە سەمای فلامنكۆ بەناوبانگن. لە یوگوسلاڤیاشدا زۆر لە قەرەجەكان لە دروست كردنی باروتی تفەنگدا پسپۆڕن.

زۆریشیان خەریكی سواڵ كردنن، ژنەكانیان لە پیاوەكانیان زیاتر خەریكی پارە پەیداكردنن.

## گاز چیه؟

پێش ی چەندین سەدە، لە ناوچەیەکی یوناندا کە پێیان دەوت ((دڵفی)) شوانێك شتێکی دیتەوە کە لە زەویەوە دەهاتە دەریّ.

خەڵکی هەریەکە و سەبارەت بەوە شتێکیان ووت: ئەنجام گەیشتنە ئەوە کە ئەو گیانە خواوەندێکە و، بۆیە پەرستگایەکیان لەو شوێنەدا بۆ دروست کرد.

ئەو گیانە لە ((گازی سروشتی)) بەولاوە هیچی تر نەبوو.

ئێستا سیّ جۆری سەرەکی لە گاز هەیە. گازی سروشتی، گازی خەڵوز، گازی ئاوی ((کە گازێکی ژەهراویە و بۆ مەبەستی سوتەمەنی و ڕوناکی بەکار دێت))

گازی سروشتی لە زۆربەی ناوچەکانی دونیادا هەیە. لە ئەنجامی گۆڕانکاری لە پێکهاتەی توێکڵی زەویدا، لە ژێر زەوی کۆبۆتەوە.

ئەم گازە لە بۆری دا بە درێژایی سەدان میل ڕەوانەی شارەکان دەکرێت. کە زۆربەی لە کارگەکانی ئاسن و پۆڵادا بەکار دێت. هەروەها کۆمپانیاکانیش بۆ بەرهەم هێنانی وزە و تیشك بەکاری دێنن.

گازی خەڵوز لە خەڵوزی هاڕاوە دروست دەکرێت. کە لە فڕنی داخراوی گەورەدا دەسوتێنرێت. کاتێك گەرمای فڕنەکە گەیشتە پلەیەکی دیاری کراو، خەڵوزەکە وەك هەویری لیّ دێت و گازێکی لێوە دەردەچێت، کە لە ڕێگەی بوریەوە دەگوێزرێتەوە.

گازەکە لە دەفرێکی گەورەدا کۆ دەکرێتەوە و هەرچی پیسیە لیّ ی دەردەهێنرێت. ئەمجا بە بوریەکدا ڕەوانە دەکرێت و بە ئاو سارد دەکرێتەوە بۆ ((ئامێری شۆردنی گازەکە)). کە پیساییەکانی تری لێدەگرێت.

لە کۆتایدا گازە خاوێنەکە بەژێر پێوەرێکدا دەنێررێت، تا قەبارەکەی بپێوێت، دوای ئەوە دەنێررێتە ئەو تانکیانەی کە بوری بە ماڵان و کارگەکانەوە پەیوەست کراون.

زفتی ڕەشی خەڵوزی ئەستور، لە گاز دەردەهێنرێت، زۆر بەرهەمی بەنرخی تێدایە، کە لیّ ی دەردەهێنرێت، وەکو: بۆن، ڕەنگ، دەرمان، ڕۆن. ئەو پاشماوەیەش کە لە فڕنی گازەکەدا دەمێنێتەوە پیّ ی دەوترێت خەڵوزی ((کوك))

لەم سەردەمەدا گاز بۆ مەبەستی ڕووناککردنەوە بەکار ناهێنرێت. بەڵکو ٨٠٪ ی ئەو گازە ئەمڕۆ دروست دەکرێت. لە بەرهەم هێنانی گەرمای پێویست و گەرم کردنەوە و چێشت لێنان و کارگەکاندا بەکار دەهێنرێت.

گاز سوتەمەنیەکی زۆر خاوێنە ئەمەش وادەکات زۆر ویستراو بێت. گاز شلەیەکە، بە ئاسانی تەحەکومی پێوە دەکرێت و بەسیسەکردنی هیچی تێ ناچێت. ئەمڕۆ زۆربەی خۆراکەکان بە گاز لێدەنرێن، بەڵکو یەخچاڵیش هەیە بە گاز کار دەکات. بەکارهێنانی گاز وەکو سوتەمەنی یەکێکە لە ڕێگە چارەکان بۆ ئەوەی شارەکانمان بە خاوێنی بمێنێتەوە و دوور لە دوکەڵ بێت.

## قەبارەی گەردیلە چەندە؟

لە سەرەتادا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین، ئەوەی ئەمڕۆ لەسەر گەردیلە دەیزانین دەشێت سبەینێ بگۆڕێت. زانست بە بەردەوامی شتی تازە لەسەر گەردیلە فێر دەبێت.

ووشەی ((گەردیلە)) لە زمانی یونانیەوە وەرگیراوە. واتە ئەو شتەی کە دابەش کردن یان لەت کردن قبوڵ ناکات!

یونانیەکان باوەڕیان وابوو ((گەردیلە)) بچوکترین بەشە لە مادەدا.

ئێمە دەزانین کە زیاتر لە (٢٠) گەردیلۆکە ((الجزیئە)) ی جۆراجۆر لە ناوکی گەردیلەدا هەیە. زانایان بڕوایان وایە کە گەردیلە لە ئەلکترۆنات و نیوترونات و پۆزترۆنات و نیوترینات و میزونات و هایبرۆنات پێك دێت.

ئەلکترۆناتەکان گەردیلەیەکن کە بارگەی سالبی سانا هەڵدەگرن. بەڵام پرۆتۆن لە ئەلکترۆن بە ١٨٣٦ جار قورسترە و بارگەی کارەبایی موجەب هەڵدەگرێت.

نیوترۆن قورسترە و هیچ بارگەیەکی کارەبایی هەڵناگرێت.

پۆزترۆن : لە قەبارەی ئەلکترۆندایە و بارگەی موجەب هەڵدەگرێت.

نیوترین: نزیك لە سەر دووهەزار قەبارەی ئەلکترۆنە و هیچ بارگەیەك هەڵناگرێت.

میزۆن : دەشێت بارگەی موجەب و سالبیش هەڵبگرێت.

بەڵام هایبرۆن لە پرۆتۆن گەورەترە.

ئەو هەموو گەردیلانە یەك دەگرن بۆ ئەوەی توخم دروست بکەن. کە هەر یەکەیان

لەوی تریان جیاوازترە.

یەکێك لە ڕوە جیاوازەکانیان، جیاوازی کێشیانە. بە پێ ی کێشی گەردیلە پۆلینی توخمەکان دەکرێت.

بو نموونە: کێشی گەردیلەیی هایدرۆجین یەکە. بەلاّم کێشی گەردیلەیی ئاسن پەنجا و پێنجە. ئەمەش مانای وایە گەردیلەیەکی ئاسن پەنجا و پێنج جار لە گەردیلەیەکی هایدرۆجین قورسترە.

بەلاّم کێشەکان هێندە سوکن. بە جۆرێك کە گەردیلەیەکی هایدرۆجین یەك لە ملیۆن ملیۆن ملیۆن لە گرامێك دەکێشت.

بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکت هەبێت لەسەر بچوکی گەردیلە و بزانیت چەند گەردیلە هەیە لەیەك گرامی هایدرۆجین دا.

وەلاّم: ژمارە شەش و بیست و سێ توخمی تر لە بەردەمیدا هەیە.

ئەگەر دەست بە ژماردنی بکەیت و لە هەر چرکەیەکدا گەردیلەیەك بژمێریت. ئەوا پێویستت بە دەهەزار ملیۆن ملیۆن ساڵ دەبێت بۆ زانینی هەموو ئەو گەردیلانەی لە گرامێك ئۆکسجین دا هەیە.

## سەراب

بیهێنە پێش چاوی خۆت، کەسێك لە بیاباندا وێڵ بوە و خەریکە لە تینودا دەخنکێت. سەری هەڵدەبڕێت و وێنەی دەریایەك لە ئاوی ڕون چاو پێ دەکەوێت. دەچێت بەرەو ئاوەکە. بەلاّم لەگەڵ نزیك دەبێتەوە وێنەکە نامێنێت و لە لمێکی داخی گەرم زیاتر هیچی تر نیە.

ئەو دەریا ئاوەی کە بینرا لە سەراب زیاتر هیچی تر نەبووە. کەواتە هۆی چی بوو سەراب لە کەش و هەوایەدا دروست بو.

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین، ئێمە بۆیە دەتوانین شتەکان ببینین، چونکە ڕوناکی تیشك پێچەوانە دەبێتەوە بۆ چاومان. ئەم تیشکە لە هێڵێکی ڕاستدا دەگاتە چاو. لەبەر ئەوە ئەگەر سەیری شوێنێکی دوور بکەین شتەکانی سەروی ئاسۆ زیاتر هیچی تر نابینین.

ئێستا دێینە سەر ئەو فێلاّنەی کە کەش بە تیشکی ڕۆژی دەکات. لە بیاباندا و

لەسەر زەوی چینێك لە هەوای چڕ هەیە. ئەم هەوایە وەكو ئاوێنە ئیش دەكات. دەشێت تەنێك یان شتێك لە نێوانێكی دوورەوە لە پشتی ئاسۆوە نەبینرێت. بەلاًم كاتێك تیشكی خۆر دەكەوێتە سەر ئەو چینە چڕە لە هەوا و بەناویدا تێ دەپەڕێت ئەوا پێچەوانە دەبێتەوە بۆ چاومان و شتەكان وا دەبینین كە لەسەر ئاسۆوە یە یان لە بڕی چاودایە.

ئێمە فیعلەن ئەو شتانە دەبینین كە چاومان نایبینێت، كاتێك ئاسمانی دوور بەهۆی ئەو (ئاوێنە) وە لە هەوادا شتەكان پێچەوانە دەكاتەوە. هەندێك جار وەكو دەریا دێتە پێش چاو. بەوەش سەراب دەبینین.

لە رۆژێكی گەرمدا، كە لەسەری گردێك نزیك دەبینەوە وا دەزانیت ئەو رێگایەی لەبەر دەمتایە تەڕە. ئەوەش هەروەها سەرابە.

ئەوەی كە لەسەر جادەیەكی قیرتاوكراو دەیبینیت، تیشكێكە لە ئاسمانەوە. هەوای گەرم خواری كردوٚتەوە بۆ سەر جادەكە. كە وا دەزانیت لە جادەكە خۆیدا.

سەراب لە دەریاشدا ڕوو دەدات. كاتێك كەشتیەكان ڕێدەكەن، هەوایەكی سارد لە نزیك ئاوەكەوە هەیە و هەوایەكی گەرمیش لەسەرەوەی. دەشێت لەم دۆخەشدا كەشتیەكان هێندە دوور ببینرێن وا بزانیت لەو دیوی ئاسۆدان.

لەبەر ئەوەی شەپۆلە تیشكیە هاتوەكان لێیەوە بەهۆی هەوا گەرمەكانەوە پێچەوانە دەبێتەوە بۆیە كەشتیەكە ئاسماندا دەبینرێت!

بەناوبانگترین سەراب لە جیهاندا لە سەقەلیەدایە لە تەنگەی (مۆسینە) لە شاری مۆسینە، لە ئاسماندا پێچەوانە بوٚتەوە. وا دەزانیت كۆشكە بەرزەكانی لە هەوادا سەما دەكەن.

گەلی ئیتالیا بەم سەرابە دەڵێن ((ڤاتا مۆرغانا)) كە نسبەتە بۆ ((مۆرغان لاڤای)) كەوا گومان دەبەن دێوە زمەیەكی شەرانیە، ئەو سەرابە دروست دەكات.

## تینویەتی

مرۆڤی ئاسایی بڕوای وایە وشك بونی دەم و قوڕگ لە ئەنجامی تینوەتیەوەیە. بەلاًم ئەمە شتێكی ڕاست نیە. ئەم وشك بونە دەشێت لە ئەنجامی كرداری تردا بێت.

کاتێك وەرزش دەکەین گەرومان وشك دەبێت. هەروەها دڵەڕاوکێ یان ڕژاندنی لیکی کەمتر لەلایەن لودە لیکیەکانەوە، دەبێتە هۆی وشك بونی قورگ و دەم.

کەواتە بۆچی هەست بە تینویەتی دەکەین؟

ئێمە دەزانین خوێن ئاوو خوێ ی تێدایە. لەبەر ئەوەی لەش ئەو دوو مادەیەی تێدایە، کەواتە لە کاتی ئاساییدا ڕێژەی ئەو دوو مادەیە یەکسانە بەڵام ئەگەر ڕێژەی ئاو لەبەر هەر هۆیەك لە خوێندا کەم بوەوە. ئەوا ڕێژەی هەردوو مادەکە دەگۆڕێت. لەو کاتەدا ((بنکەی تینویەتی)) کە لە مێشکی مرۆڤدایە. هێمایەك دەنێرێت بۆ گەرو. گەروش دەست بە گرژ بون دەکات. ئەو کرژ بونەیە دەبێتە هۆی وشك بون و تینویەتی.

هەندێك جار لەگەڵ ئەوەدا ئاوی تەواو لەگەدە و خوێنماندا هەیە و غودەی لیکیش لە ئەندازەی خۆی زیاتر لیك دەرژێنێت، بەڵام هەرهەست بە تینویەتی دەکەین.

لەبەر ئەوەیە خواردنی سوێر (شۆر) ڕێژەی خوێ لە خوێندا زیاد دەکات. لە ئەنجامی ئەوەشدا. بڕی خوێ لە ڕێژەی سروشتی خوێ بەرزتر دەبێتەوە. کە دەبێتە هۆی تێکچونی ڕێژەی سروشتی خوێ و ئاو لە خوێندا.

لەو جۆرە دۆخەدا مێشك نامەیەك دەنێرێت بۆ گەروومان بۆیە هەست بە تینویەتی دەکەین.

## جمک ((دوانە))

بە شێوەیەکی گشتی ژن بە سکێك هەر یەك منداڵی دەبێت. منداڵەکە یان کچێکە یان کوڕێك. بەڵام هەندێك جار، ژن یان دوو منداڵ یان زیاتری دەبێت. بەو دوو منداڵە دەوترێت دوانە یان ((جمگ)).

ئایا دەزانیت دوانە چۆن لە دایك دەبن؟

لە نێوان ڕۆژی دەیەم و هەژدەهەمدا لە دەستپێکردنی بێ نوێژیەوە، کۆ ئەندامی مێینەی ژن هێلکەیەك دادەبەزێنێت پێ ی دەوترێت ((هێلکۆکە)). ئەم هێلکۆکەیە لەگەڵ توخمی پیاودا یەکدەگرن و پێ ی دەوترێت پیتێن ((الاخصاب)). بەوەش ژنەکە ئاوس دەبێت و دوای ٢٨٠ ڕۆژ منداڵی دەبێت.

بەڵام هەندێك جار هێلکوکە دەبێتە دوور بەشەوە، ئەو دوو بەشەش گەورە دەبن تا

دەبنە ئاو لەمە. ژنەکە دوو منداڵی دەبێت، کە لە دیمەنی گشتی و شێوەدا لەیەك دەچن و دەم و چاویشیان وەکو یەك وایە. دەشێت جومگەکە دوو کوڕ یان دوو کچ بن، لەبەر ئەوەی هەردوکیان لە هەمان هێلکۆکەوە هاتون. بەڵام هەندێك جار ئەگەرێکی تر هەیە. ئەویش ئەوەیە دەشێت دوو توخمی پیاو بە یەکجار لەگەڵ هێلکۆکەدا یەکبگرن، کە دەبێتە هۆی دروست بوونی دوو منداڵ لە منداڵ داندا. ژنەکەش دوو منداڵی دەبێت، لەم دۆخەدا دوو منداڵەکە لەیەك ناچن و دەشێت لەیەك ڕەگەز بن یان نەبن. هەروەها دەشێت ڕەوشتیشیان لەیەك جودا بێت.

هەندێك ژن لە دوو منداڵ زیاتریان بوە، ژنێکی بەرازیلی بە سکێك دە منداڵی بوو. دوو کوڕ و هەشت کچ.

ئسپانیا و چین ریکۆردی جیهانی تۆمار دەکەن لە ژمارەی ئەو ژنانەی بە سکێك دە منداڵیان بووە. لە ١٣ حوزەیرانی ١٩٧١ دا ژنێکی ئوسترالی نۆ منداڵی بە سکێك هێنا.

## قیر ((ئسفالت))

ئێمە ڕۆژانە بە پێ بێ یان بە سواری ئوتۆمبیل. بەسەر جادەی قیردا رێدەکەین. بەڵام زۆربەمان نازانین کە قیر لە دێر زەمانەوە بەکار هێنراوە!

قیر بەوە بەناوبانگە کە لەبەردەم ئاودا خۆڕاگرە.

لە سەردەمی یونانیەکاندا پێیان وتووە ((زفت)) یان ((قوپ)) دوای ئەوە ڕۆمانیەکانیش ناسییان و ناویان لێنا ((بقیومین)) ((قیر)). حەوزی مەلەوانی و تانکی ئاویان پێ ماڵەدەدا بۆ ئەوەی ئاوی لێ نەتکێت.

قیر مادەیەکی کانزاییە ڕەنگەکەی لە نێوان قاوەیی زۆر تێر و ڕەشدایە. لەسەر زەویدا. لە دۆخی شل و ڕەق و نیمچە شلدا دۆزراوەتەوە. هەروەها بەشێکی سروشتیە لە زۆربەی زەیتە خاوەکان.

قیر بە گەرم کردن نەرم و بە کوڵاندن شل و بەسەرما ڕەق دەبێتەوە. قیر تێکەڵەیەکە لە هایدرۆجین و کاربۆن.

دوو جۆرقیر هەیە -سروشتی و پترۆلی-

قیری سروشتی لە نیشتوەکانی سەر زەوی یان نزیك لێیەوە دێت. بەڵام قیری

پترۆڵی، دەبێت. لە نەوتی خاوی جویّ بکەیتەوە بە ڕێگەی پالاوتنی نویّ. قیری سروشتی لە چاخە کۆنەکاندا دروست بووە. لە ئەنجامی دەرچونی نەوت بۆ سەر زەوی لە ناو چینە لمیەکان و درزە بەرداویەکانەوە. پاکترینی لە ناو بەردەکاندا ماوەتەوە و بەردەکان پاراستویانە و وەکو قیرێکی پاکیش دەڵاندویەتی.

یەکێکیك لە گەورەترین دەریاکانی قیری سروشتی، دەکەوێتە دورگەی ترینیداوە لە ئەمریکا. ڕوبەری نزیکەی ٤٠ هیکتار دادەپۆشێت و قوڵیەکەشی زیاتر لە (٣٠) مەترە.

کاتێك لە ساڵی ١٨٧٦ دا جادەکانی واشنتۆن ی پایتەختی ئەمریکا قیرتاو کرا، قیرەکەیان لەو دەریایەوە هێنا!

چیمەنتۆی قیری ئەو ناوەیەکە لە قیری قیرتاوکردنی جادەکان نراوە. کە بەکار دەهێنرێت لە قیرتاوکردن و زفت کردنی جادەکان و بۆ ئەوەی بەرد و لمەکان یەکبگرن و ڕێگری لە ئاو بکات، بۆ ئەوەی درزە نەکات بۆ جادە و شۆستەکان.

یەکێك لە سیفاتەکانی قیر ئەوەیە وەکو (مگاگ) وایە، ئەگەر شتێکی قورسی بەسەردا بچێت، لەبری ئەوەی بشکێت، دەنیشێت.

فڕۆکە خانە و جادەکان بۆیە قیرتاو دەکرێن، تا بەرگەی ئەو فڕۆکە و ئۆتۆمبیلە بار بەرانە بگرن، کە کێشەکانیان لە نێوان ٤٥ هەزار و ١٤٠ هەزار گیلۆ گرامدایە.

## خێرایی گیانلەبەران

پێش چەندین ساڵ، زانا و دوژەرەوەیەکی ئەمریکی ((ڕۆی شاپمان ئاندروز)) بە سەرۆکایەتی تیمێکی دوژەرەوە چوو بۆ هند.

ڕۆژێك کە لە نزیك سنوری نێوان هند و نیپاڵدا ئۆتۆمبێلێکی جیّبی لیّ دەخوڕی. پڵنگێکی شکاری چاوپێکەوت و ئەندروز ڕوی ئۆتۆمبیلەکەی کردە پڵنگەکە. پڵنگ کە جێبەکەی بینی دەستی بە ڕاکردن کرد.

ئاندروز بڕیاری دا خێرایی پڵنگەکە تاقی بکاتەوە. خێرایی جێبەکەی گەیاندە ٨٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا. بەڵام هەر نەگەیشتە پڵنگەکە. گەیاندیە ١٠٠ کیلۆمەتر هەر پڵنگەکە لە پێشتر بوو. تا پڵنگەکە خۆی کردە نێو دارستانەکاندا و لە چاو وون بوو.

مروۆ دەتوانێت لەم ڕوداوەوە بگاتە ئەوە کە خێرایی پڵنگ لە ١٠٠ کیلۆمەتر زیاترە لە کاتژمێرێکدا.

پڵنگی شکاری خێراترین گیانلەبەرە لە ناو هەموو گیانلەبەرە چوارلاقەکاندا. دەتوانێت لە کاتژمێرێکدا ١١٢ کیلۆمەتر ببڕێت. دوای ئەوە ئاسکی ڕەش (ئاسکی هندی) دێت لە خێراییدا. دوای ئاسکی هندی ئاسکی مەنغۆلی و بزنە کێوی ئەمریکی دێن، کە خێراییەکەیان ٩٥ کیلۆمەترە لە کاتژمێرێکدا شێریش پلەی چوارەم وەردەگرێت لە خێراییدا کە ٨٨ کیلۆمەترە لە کاتژمێرێکدا. دوای ئەوانیش ئاسك و کەروێشك و ڕێوی دێن کە خێراییان ٧٥ کیلۆمەترە لە کات ژمێرێکدا.

ئەسپ و کەرە کێوی و تانجی ٦٤ کیلۆمەتر دەبڕن لە کاتژمێرێکدا. گامێشیش دەتوانێت لە کاتژمێرێکدا ٥٥ کیلۆمەتر ببڕێت. زەڕافە و گورگیش دەتوانن بە کاتژمێرێك ٤٥ کیلۆمەتر ببڕن. خێرایی فیل ٣٥ کیلۆمەترە. بەلأم کەنغەر و بەرخ دەتوانن لە یەك کات ژمێردا تەنها ٢٥ کیلۆمەتر ببڕن. حوشتر و بەرازیش ١٥ کیلۆمەتر. خێرایی ئەو ئاژەلأنە، بە تاقی کردنەوە لە لایەن ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆڕانەوە ئەنجام دراوە.

دەبێت بوترێت ئەو ئاژەلأنە، ناتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر غار بدەن. زۆربەی جار دەتوانن تەنها چەند کیلۆمەترێك لەسەر یەك بەو خێراییە بڕۆن.

## کلوە بەفر

یەکێك لە دیمەنە هەرە جوانەکانی سروشت، ئەو بەفرە تەنکەیە. کە لە زریانێکی بەفراویدا بە ملیۆنەهای لێ دەکەوێتە سەر زەوی.

بەفر وەکو دەزانین ((ئاوێکی بەستووە)).

ڕەنگە بپرسن بۆچی ڕەنگی بەفر سپیە، لە کاتێکدا ئاوێکی بەستووە و ئاویش ڕەنگی نیە؟ ئایا نابێت ئەمیش بێ ڕەنگ بێت؟

دەرکەوتنی بەفر بەو ڕەنگە سپیەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەسەری زۆرێك لە کریستاڵە بەفریەکان. کە کلوە بەفری لێ دروست دەبێت، تیشك پێچەوانە دەکاتەوە، لەبەر ئەوەیە بە سپی دەبینین.

كاتێك ئاوەكە دەیبەستێت كریستال دروست دەبێت. واتە گەردیلەكان بە جۆرێكی دیاری كراو یان بە شێوەیەكی ئەندازەیی ڕیز دەبن و پێ ی دەڵێن ((كریستاڵ)) گەردیلەیەكی ئاوی لە سێ یەكە پێك دێت : دوو گەردیلەی هایدرۆجین لەگەڵ یەك گەردیلەی ئۆكسجین. كاتێك وەك بلوری لێ دێت، دەبێت شێوەكەی سێ گۆشەیی یان شەش گۆشەیی بێت.

سەرمای ئاوەی كە دەیبەستێت بۆ ئەوەی بەفرەكە پێك بێنێت لە شێوەی هەڵمی شونایە لە كەشدا. كاتێك دەیبەستێت. ئەو كریستاڵانەی دروست دەبن زۆر بچوك و نەبینراون.

بەڵام كاتێك دەست بە دروست كردنی بەفر دەكات. شەپۆلی هەوا ئەو كریستاڵانە بەرز و نزم پێ دەكات. لە ماوەی ئەو بەرز و نزمیەدا كۆمەڵێك لە كریستاڵ لە دەوری شتێك كۆ دەبنەوە، وەكو گەردیلەیەكی تۆز یان خاڵێكی بچكۆلەی ئاو. كاتێك سەدان كریستاڵ لە دەوری یەك گەردیلە كۆ دەبنەوە و وردە وردە گەورە دەبن تا ڕادەیەكی دیاری كراو. دەست بە دابەزین دەكات بەرەو سەرەو زەوی، بەمەش دەوترێت ((كلوە بەفر)).

تیرەی هەندێك كلوە بەفر لە سێ سەنتیمەتر زیاترە. قەبارەی كلوە بەفر پەیوەستە بە پلەی گەرماوە.

هەرچەند پلەی گەرما ساردتر بێت، قەبارەی كلوە بەفرەكە بچوكتر دەبێتەوە. ئایا دەزانیت لە زۆر ناوچەی دونیادا بەفری شین و سەوز و سور و تەنانەت ڕەشیش دەبارێت؟!

هۆیەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ بونی قڵیش یان تۆز لە هەوادا، كە كلوە بەفرەكان لە دەوری كۆدەبنەوە.

## گرانەتا چی یە؟

گرانەتا نەخۆشیەكی داكەوتوی ترسناكە، هۆیەكەی بەكتریایەكەوە. كە لە ڕێگەی خواردن و ئاوی پیسەوە، دەچێتە لاشەوە بۆ ناو دەماری خوێن و ژەهراوی دەكات.

نیشانەكانی گرانەتا زۆرن. لەوانە تا لێهاتن، كۆكە، سەر ئێشە، گەرمە ژەنە،

ئاوسانی جگەر، دابەزینی ژمارەی خڕۆکە سپیەکان. دەشێت نەخۆش لە خواردن بکەوێت وردە وردە تاکەی بەرز ببێتەوە تا دەگاتە ٣٩,٤ و ٤٠ پلەی سەدی.

دوای خولێك کە حەفتەیەك یان دوو حەفتە دەخایەنێت تاکە دەست بە دابەزین دەکات و دوای نزیکەی سێ ڕۆژ گەرمای لەشی دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی ئاسایی خۆی.

پەتای گرانەتا زیاتر بەهۆی ئاو و شیری پیسەوە بلاّو دەبێتەوە. دەشێت خۆراکە نەکولاّەوکان بەهۆی هەڵگری تیفۆئیدەوە پیس بن کە مێشەکان بەکتریاکان بگوێزنەوە بۆ خوراکەکان.

زۆربەی توشبوان بە گرانەتا تەنانەت دوای چاك بونەوە شیان میکرۆبەکە لەشیاندا دەمێنێت.

لە کۆندا چارەسەری گرانەتا بە پێ ی نیشانەکان دەکرا. بەلاّم دوای ساڵی ١٩٤٨ چارەسەری تەواوی بۆ دۆزرایەوە. کە زۆر کاریگەر بو.

تەندروستی گشتی و چارەسەری کەسایەتی دوو کاری زۆر گرنگن، لەبەردەم بلاّونەبونەوەی ئەم نەخۆشیەدا.

دەبێت توشبوان بە نەخۆشی گرانەتا، بە جودا و لە قاپی تایبەتدا نان بخۆن. دەتوانرێت مرۆڤ بۆ چەندین ساڵ، لە توشبون بە گرانەتا بپارێزێت، لە ڕێگەی کوتانێکی تایبەتیەوە، کە پێکهاتوە لە میکرۆبی مردوی گرانەتا.

تا پێش شەست ساڵە گرانەتا، ساڵانە هەزاران کەسی دەکوشت بەلاّم پێش کەوتنی زانستی زاڵ بوە سەر ئەو کێشە گەورەیەشدا.

## پرخە

هەندێك کەس لە کاتی خەوتندا دەپرخێنن، چونکە دەمیان بە کراوەیی دەمێنێتەوە و دەنگێکی نامۆی لێوە دەردەچێت لەکاتی هەناسەداندا.

ئایا دەزانین ئەوانە بۆچی دەپرخێنن؟

مرۆڤ لە ڕێگەی لوتەوە هەناسەدەدات، بەلاّم هەندێك کەس لەبەر هەر هۆیەك بێت لوتیان دەگیرێت و ناچار لە دەمیانەوە هەناسە دەدەن.

کاتێك مرۆڤ خەوتوە و لە دەمیەوە هەناسە دەدات، هەوای دەرەوە ئەو پەردە

نەرمەی لە کۆتایی و سەرەوەی دەمدایە دەلەرێنێتەوە. بەوەش دەنگێکی نامۆ دەردەکات کە پیٚ ی دەوترێت ((پرخە)).

هەروەها ئەو لرفە لرف و لەرینەوانە، وا دەکەن هەردو کولْم و هەردوو لێوە و لوت بلەرێنەوە. ئەمەش وا دەکات دەنگی پرخەکە بەرز تر بێت. بەلاْم پرخاندن لە کاتی بێداریدا هەرگیز روونادات.

دەتوانین لە کاتی خەوتندانا رادەیەك تەحەکوم بە پرخەوە بکەین، ئەگەر ئەو کەسە دەم و لوتی پاك بکاتەوە پێش نوستن، کە دەبێتە هۆی هەناسەدان لە رێگەی لووتەوە وەك لە رێگەی دەمەوە، ئەگەر مرۆۃ خوی هەناسەدانی لە لووتەوە بێت، ئەوا ئەگەری پرخاندنی کەمتر دەبێتەوە.

هەناسەدان لە رێگەی دەمەوە زیانی زۆریشی هەیە بۆ تەندروستی، لەبەر ئەوەی میکرۆبی زۆر لە نەخۆشیەکان راستەوخۆ دەچنە ناو دەمەوە و ئەشێت ببنە هۆی توشبون بە هەندێك نەخۆشی.

بەلاْم هەناسەدان لە رێگەی لوتەوە، موەکانی ناو لوت ناهێلْن میکرۆبەکان بچنە ناو لاشەوە. بۆیە ئامۆژگاریمان ئەوەیە خۆتان رابێنن لە رێگەی لوتەوە هەناسە بدەن.

## بۆچی دەنگی ئافرەت لە دەنگی پیاو خۆشترە؟

بە شێوەیەکی گشتی دەنگی ئافرەت لە دەنگی پیاو خۆشترە. لەگەلْ ئەوەی دەنگی مندالاْن لە تەمەنی نێوان یانزە و دوانزەسالْیدا وەك دەنگی کچ ناسکە، بەلاْم دوای ئەو تەمەنە دەنگی کوران وردە وردە گڕ دەبێت، بەلاْم دەنگی کچان لەگەلْ گەورە بونیشیاندا وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

تەمەنی نێوان ١١ بۆ ١٣ سالْی کە تەمەنی بالْغ بوونە، لەو ماوەیەدا هەندێك رژێن (لوو) هۆرمۆناتی جنسی دەرژێنێت. کە دەبێتە هۆی گۆڕانی بەرچاو لە لەشی کوران و کچاندا. ئەم هۆرمۆنە لە کوراْندا بەر پرسە لە گەشەسەندن و سەوز بونی موو لە هەردوو بن هەنگلْ و دەم و چاو و گۆڕانی دەنگی کوڕ بەرەو نێری.

لەبەر ئەوەی لەشی مرۆۃ هۆرمۆنێك دەرژێنێت پیٚ ی دەوترێت ((تستۆسترۆن)) کە بەرپرسە لە ئەستور کردن و درێژ کردنی ژێکانی دەنگ. هەروەها کار لە قوڕگیش دەکات. لە ئەنجامی ئەوەدا لەرینەوەکانی ژێ دەنگیەکان دەگۆڕێت و دەبێتە هۆی

گۆڕان له چینەكانی دەنگدا.
لەبەر ئەوەی لاشەی كچ ئەم هۆرمۆنە نارژێنێت، بۆیە گۆڕانكاریەكی كەم نەبێت لە دەنگیدا دروست نابێت. ئەو گۆڕانكاریەش بە شێوەیەكی سەرەكی لە دەم و لوت و چەناگەی سەرەوەدا دەبێت.
لەبەر ئەم هەموو خالآنەیە دەنگی ئافرەت لە دەنگی پیاو خۆشترە.

## بۆچی قاز و قولینگ بە كۆمەڵ دەفڕن؟

جاری وا هەیە لە پڕ گوێمان لە دەنگێكی دوور دەبێت لە ئاسماندا ((هۆنگ – هۆنگ)) كە سەیری دەكەین، دەبینین پۆلێكە لە باڵندە لەسەر شێوەی ژمارە ((٧)) یان پیتی ((V)) ئینگلیزی، ئەو پۆلە قاز و قولینگە خێرایییەكەیان شەست میلەكە كاتژمێرێكدا.
دەتوانین پێش بینی ئەوە بكەین ئەو باڵندانە بۆچی بەو شێوەیە دەفرن، چونكە پۆلێك فرۆكەش بە هەمان شێوە دەفڕن، تا هەموو فڕۆكەوانێك بتوانێت ئەوی تر ببینێت، بینینی سەركردەش وا دەكات هەموویان شوێنی بكەون.
قازەكانیش بە هەمان شێوە دەفڕن. دەكەونە دوای سەركردەیەك كە لە هەموویان زاناترە یان بە تەمەنتر و شارەزاترە. دروست كردنی شێوەی ژمارە ٧ لای قاز و قولینگان وەكو هەمان رێكخستنی فرۆكەوانانە لای مرۆڤدا.
لە دونیادا (٤٠) جۆر قاز هەیە كە ١٠ تا ١٢ جۆریان لە ولآتە یەكگرتوەكانی ئەمریكادایە كە عادەتەن میوانی زستانەن. دەتوانین قاز بە باڵندەیەكی كەنەدی دابنێین. چونكە باشترین جۆری قاز ((قازی كەنەدی)) یە. كە لە كاتی ڕەكردنیاندا بەسەر هەموو ئەمریكای باكوردا باڵ دەگرنەوە.
ڕەنگی سەر و ملی ئەم جۆرە قازە ڕەشە لەگەڵ هێڵێكی سپی كە لە ژێر ملیەوە تا سەر هەردوو كوڵمی درێژ دەبێتەوە. قازی كەنەدی وەكو خو لە هەموو ژیانیدا لەگەڵ یەك هاوڕێیدا دەژیت. باشترین خواردنیشی لە بەهار هاوین دا كوللە مسكەیە. لە هەمان كاتدا مێر و كرمی زەویش دەخوات.
بەلآم زۆربەی كات لەسەر ڕوەكە دەشتیەكان و برنجی دەشتی و ڕەگی درك دەژی و هیلانەكەی لە زەویدا دروست دەكات. وەكو جۆرەكانی تری قاز. لە ناویشەوە بە

پەڕی سینگی خۆی دایدوپۆشێت.
قازی کەنەدی خواردنێکی بەلەزەتە و کێشی لە نێوان ٥ تا ٦ کیلۆدایە و خەڵکی سالآنە دەیان هەزاریان لێ سەردەبڕن. تا کار گەیشتە ئەوە ولآتانی ئەمریکا و کەنەدا بە بڕیارێك سەربڕینی قازی کەنەدیان قەدەغەکرد.

## خێراترین گیانداری چوار پێ کامەیە؟

مرۆڤ زۆر شانازی بە خۆیەوە دەکات، کە دەتوانێت بە خێراییەك بە ئاسماندا بفڕێت لە خێرایی دەنگ خێراتر بێت.
ئەوەی کە دەبێت مرۆڤ پێوەی بنازێت لەم بوارەدا مێشکیەتی، کەوای کردوە بتوانێت ئامێر گەلێك دروست بکات بەو خێراییە سەر سوڕ هێنەرە. ئەگەر بێینە سەر لاشەی مرۆڤ بە بێ مێشك، دەتوانین بڵێین زۆر دواکەوتوە لەبەرامبەر مەمکدارەکانی تردا و بگرە نزمترین پلەی بەردەکوێت.
وەرن بابە خێرایی سەیرێکی ئەو خێراییانە بکەین. کە چوار قاچەکانی تر دەتوانن ببڕن شایانی وتنە زۆر لەو گیانلەبەرانەی کە بە خێراییەکی زۆر دەردەپەڕن ناتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ ئەو خێراییە بپارێزن.
ئەو مرۆڤەی کە دەتوانێت ٣٥ بۆ ٤٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا ڕابکات تەنها بۆ ماوەی دوو سەد مەتر دەتوانێت ئەو خێراییە بپارێزێت.
ئەم خێراییانەی لەسەر چوار پێ کان لە ڕوی زانستیەوە زۆر ورد نین چونکە لە چەند کاتی جیاجیادا تۆمار کراون، بەلآم بیرۆکەیەکمان دەداتێ لە وردەکاری سەبارەت بە خێرایی ئاژەڵە جیاوازەکان.
پاڵەوانی سەرجەم گیانلەبەران ((شێری شکاری)) یە. کە خێراییەکەی حەفتا میلە لە کاتژمێرێکدا. دوای ئەوە ئاسکی هندی دێت. کە (٦٥) میل لە کاتژمێرێکدا دەبڕێت. دوای ئەوەش، ئاسکی مەغۆلی و بزنە کێوی ئەمریکی دێن، بە خێرایی (٦٠) میل لە کاتژمێرێکدا. ئەم ئاژەلآنە لە هەموو مەمکدارەکانی تری دەبەنەوە، لە پێشبڕکێیەکدا ئەگەر ماوەکەی لە دەوروبەری میلێکدا بێت.
شێر دەتوانێت (٥٠) میل لە کاتژمێرێکدا دوژمنەکەی ڕاوبنێت. بەلآم ناتوانێت درێژە بەو خێراییە بدات.

ئاسکی ئاسایی کە هەموومان بە خێراترین گیانلەبەری دادەنێین. خێراییەکەی لە نێوان ٤٥ و ٥٠ میلدایە لە کاتژمێرێکدا. ئەسپیش هەر هێندە خێرایە! تانجی لەو گیانلەبەرانەیە، کە بۆ ڕاوکردن بەکار دێت. خێراییەکەی لە نێوان ٣٥ بۆ ٤٠ میل دایە لە کاتژمێرێکدا. کەواتە خێراتر لە گورگی خاکی بە چەند میلێکی کەم. بەڵام خێرایی فیل ٢٥ لە کاتژمێرێکدا!

## ڤیتامین چی یە؟

ڤیتامین لە وشەی ڤیتا vita وە، وەرگیراوە. کە بە واتای ((ژیان)) دێت. ڤیتامینەکان مەوادی زۆر پێویستین بۆ مانەوەی ژیان. کە لە ڕوەکەکان و ئاژەڵاندا هەن و دەبێت بە ڕێژەیەکی کەم لیٚ ی بخورێت بۆ ئەوەی لاشە کارەکانی خۆی بەردەوام ئەنجام بدات.

تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم نەخۆشیەکی زۆر کوشندە هەبوو بە ناوی ((اسقربوت)) ئیسکە پوکە. لە نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە ئاوسانی پوك و خوێن لیٚ ڕۆیشتنی بو. کە توشی کەشتیوانەکان دەهات لە هەموو جیهاندا. لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا دۆزرایەوە کە خواردنی میوە و سەوزە ئەم نەخۆشیە چارەسەر دەکات. بەڵام زانایان پێویستیان بەسەد ساڵی تر هەبوو، تا بیدۆزنەوە کە چارەسەری ئەم نەخۆشیە لەو ڤیتامینانەدایە کە لە میوە و سەوزەدا هەن!

لەبەر ئەوەی زانایان پێکهاتەی کیمیاوی ئەم ڤیتامینانەیان نەدەزانی بۆیە ناویان بۆ دانەنابو و بە سانایی ناویان لێیان نابوو ڤیتامین A و B و C و هتد.

ئێستا وەرن بابزانین بۆچی هەندێك ڤیتامین پێویستە بۆ لاشە؟

ڤیتامین A هەمیشە پەیوەستە بەچەوریەوە لە لاشەی ئاژەڵاندا. کە لە ڕوەکە کورتەکاندا هەیە. ڤیتامین A یارمەتی بەرگری پەتا دەدات و لە شیر و زەردێنەی هێلکە و جگەر و ڕۆنی ماسی و کاهو و گەزەر و سپێناخدا هەیە.

تا چەندین ساڵ باوەڕ وابوو کە ڤیتامین B و ڤیتامین B کۆمپلێکیس یەك شتن. بەڵام ئێستا دەزانین کە ڤیتامین B شەش ڤیتامینی جیاوازن کە پێیان دەوترێت $B^{1}$ و $B^{2}$ و $B^{6}$ و $B^{12}$ و هتد.

کەمبونی ئەم ڤیتامینە لە لەشدا نەخۆشیەك دروست دەکات پیٚ ی دەوترێت

((بەری بەری)). ڤیتامین $B^1$ یش لە شیر و سەوزە و دانەویڵە و میوەدا هەیە. دەشبێت ڤیتامین $B^1$ بە بەردەوامی لە لەشدا تازە بکرێتەوە.

لە ڤیتامینە گرنگەکانی تر ڤیتامینی (C) یە کە کەمبونی لە لەشدا دەبێتە هۆی نەخۆشی پیستە، چونکە جومگەکان وشك دەبنەوە و ددانەکان لەق دەبن و ئێسك لاواز دەبێت. پورتەقاڵ و تەماتە و کەلەرم دەوڵەمەندن بەم ڤیتامینە. دەبێت بەردەوام ئەم ڤیتامینە لەلەشدا تازە بکرێتەوە چونکە ناتوانرێت خەزن بکرێت.

ڤیتامین D بۆ کۆرپە زۆر گرنگە بۆ دروست کردنی ئێسك و ددانەکانی. کە بە رێژەیەکی زۆر لە ماسی و جگەر و زەردێنەی هێلکەدا هەیە. هەروەها تیشکی رۆژیش ئەم ڤیتامینەمان دەداتێ.

ئەگەر خواردنەکانمان جۆراوجۆر بێت، ئەوا هەموو پێداویستیەکانمان لە ڤیتامینە جۆربەجۆرەکان دەست دەکەوێت.

## بۆچی ئارەق دەکەین؟

دەتوانین لەشی مرۆڤ بە فرنێکی هەمیشەیی دابنێین ((سوتەمەنیەکەشی)) ئەو خۆراکەیە کە دەیخۆین و دەسوتێت. لەم کردارەدا لەشمان رۆژانە نزیکەی ٢٥٠٠ گەرمۆکە بەکار دەبات. ئەم گەرمایەش بەسە بۆ کوڵاندنی ٢٣ لیتر ئاو! کەواتە ئەم هەموو گەرمایە لەلەشدا چی لێدێت؟

ئەگەر رێکخەرێك لەلەشدا نەبوایە بە دڵنیاییەوە لەشی مرۆڤ دەبوە تۆپەڵێکی گڕگرتوو. بەڵام هەموومان دەزانین تا نەخۆش نەبین گەرمای لەش بەرز نابێتەوە.

عارەق کردن یەکێکە لەو رێگایانە، بە هۆیەوە ((فڕن)) لەشی مرۆڤ دەتوانێت گەرمای لە پلەی دیاری کراودا بهێڵێتەوە. کە ٣٧ پلەی سەدەیە.

شوێنێك هەیە لە مێشکی مرۆڤدا کە بە ((بنکەی رێکخستنی گەرما)) ناسراوە، تەحەکوم بە پلەی گەرمای لەشمانەوە دەکات و لە سێ بەش پێك هاتووە. چەقی تەحەکوم، چەقی گەرم کردن، چەقی ساردکردنەوە.

باوا دبنێین پلەی گەرمای خوێن بە هەر هۆیەکەوە دابەزی، لەو کاتەدا، چەقی گەرم کردنەوە گورجوگۆڵ دەبێت و هەندێك شتی نا ئاسایی ئەنجام دەدات، هەندێك غودەی تایبەتی هەندێك مەوادی کیمیاوی دەرژێنن بۆ سوتاندن، ماسولکەکان و

جگەریش زۆرترین ((سوتەمەنی)) بەکار دەبەن.
بەوەش هەرزوو پلەی گەرمای لەشمان لە ناوەوە بەرز دەبێتەوە.
باوا دابنێین پلەی گەرمای خوێنمان بە هەر هۆیەکەوە بەرز بوەوە. لەو کاتەدا چەقی سارد کردنەوە کارەکانی خۆی گورجوگۆڵتر دەکات و کاری ئۆکساندن لە لەشدا خاو دەکاتەوە. لەگەڵ چەندین ئیشی تردا لەوانە:
کرانەوەی دەمارەکانی خوێن لە پێستدا بۆ ئەوەی تیشکی ڕۆژ وەربکرێت لە دەرەوە. لەگەڵ یارمەتی بە هەڵم بونی ئەو عارەقە دەدات کە لەش دەری دەدات کاتێك شلەکانی لەش دەبنە هەڵم. گەرماش لەگەڵیدا دەبێتە هەڵم. بۆ نموونە مرۆڤ دوای خۆشتن هەست بە سەرما دەکات. لەبەر ئەوەی ئەو ئاوەی سەر لاشەی هەر زوو دەبێتە هەڵم و لاشە سارد دەبێتەوە. بۆیە عارەق دەردان بەشێکە لە کرداری ساردکردنەوەی لەشی مرۆڤ.
لە ڕۆژانی پاك و بێ گەردا بە هەڵم بونی لاشەی بە خێرایی ڕودەدات، بەلاّم کاتێك شێ لە کەش وادا هەبێت سەخلەت دەبین، لەبەر ئەوەیە کرداری بەهەڵم بون بە ئاسانی ڕونادات. هەر بەو بۆنەیەوەیە پانکە و باوەشێن بەکار دێنین بۆ دورخستنەوەی هەوا شێدارەکە لە خۆمان، تا یارمەتیمان بدان بۆ بەهەڵم کردنی ئەو عارەقەی کە لەشمان دەری دەدات.

## سەرتاشە سەرەتاییەکان

لە سەردەمی زۆر کۆندا سەرتاش هەر هەبووە. بە جۆرێك کە نازانرێت سەرتاشە سەرەتاییەکان کێ بوونە.
پاشماوەی نوسینەکان لەسەر سەرتاشان لە مێژوودا دەگەرێتەوە بۆ مسریە کۆنەکان. دوای ئەوە سەرتاشخانە لە یونان و ڕۆمای کۆندا بو بە باشترین جێگە بۆ گفت و گۆ کردن لەسەر بارودۆخی ڕۆژ.
سەرتاش جلێکی بە هەردوو ڕەنگی سور و سپی لەبەر کردوە، ئەمەش پەیوەندی بەو ئیشەوە هەبوە کە سەرتاش لەو ڕۆژەدا کردویەتی.
چونکە سەرتاشەکان نەشتەرگەرییان کردوە و کەڵەشاخیان بۆ نەخۆشەکان گرتوە و هەروەها برین پێچی و هەندێکیشیان دانی هەڵکێشاوە.

له ساڵی ١٤٦٢ دا سەرتاشانی بەریتانیا، یەکەمین سەندیکای خۆیانیان دامەزراند له ساڵی ١٥٤٠ دا سەندیکاکەیان لەگەڵ سەندیکای برین پێچاندا کرده یەك. بەڵام دوای ئەوه پادشای بەریتانیا قەدەغەی کرد سەرتاشان خەریکی برین پێچی بن.
له دوو سەد ساڵی دوای ئەوەدا پیشەی سەرتاشینیان له برین پێچی جیاکردەوه و پیشەی ئەمان تەنها بوو به قژ برین.
ووشەی ((Barber)) ی ئینگلیزی له ووشەی ((Barba)) ی لاتینی یەوه وەرگیراوه که مانای ڕیش یان چەناگه دەدات. ئەشێت ئەو کاته ڕیش تاشین له سەر تاشین گرنگتر بووبێت.

## یەکەمین وێنەکێشی کاریکارتێری

ڕۆژنامه و گۆڤارەکانی ئەم سەردەمه بەردەوام لەسەر لاپەڕەکانیان وێنه ی کاریکارتێری بڵاو دەکەنەوه.
هەندێك لەو وێنانه وامان لێدەکات پێ بکەنین و هەندێکی تریان وامان لێدەکەن بیر لەو شتانه بکەینەوه له دەوروبەرمان ڕوو دەدەن.
باوکی کاریکارتێری نوێ هونەرمەندێکی ئینگلیزی بوو به ناوی ((ولیەم ئۆگاریت)) ١٦٩٧-١٧٦٤. هونەرمەندی تر هەبون پێش ئۆگاریت، جۆرێك وێنەیان دەکێشا که گاڵتەی به هەندێك هەڵس و کەوتی ناشایسته دەکرد. بەڵام ئۆگاریت هونەری کاریکاتێری دەست پێ کرد.
ئۆگارێت ڕەوشتی مرۆڤ و هەڵس و کەوت و کەسایەتیەکانی کرده بنەمای کارەکانی. وێنەکانیشی گاڵتەی به بارودۆخ و کێشه گشتیەکان دەکرد وەکو: مەی خواردنەوه و گەندەڵی گەنجان و تاوانەکان به هەموو جۆرەکانیەوه، تەنانەت هەڵبژاردنه ساختەکانیش!
هونەرمەندی ئینگلیزی تۆماس ڕۆلاندسون، درێژەی به قوتابخانەکەی ئۆگاریت دا و وێنه کاریکارتێریەکانی به ڕێژەیەکی زۆر چاپ دەکرد و بەهەموو بەریتانیادا بڵاوی دەکردەوه و زۆر زیاده ڕەوی دەکرد له وێنەکێشانی دەم و چاوی مرۆڤدا، به جۆرێك وای دەکرد که، ئەو وێنانه سەرەنجی خەڵکی ڕابکێشن و مەردوم به سەیرکردنیان پێ بکەنن که پێ ی دەوترێت کاریکارتێر. له سەرەتای سەدەی

نۆزدەهەمدا بڵاوکراوەکانی ئەوروپا بە شێوەیەکی گشتی وێنەی کاریکارتێریان بڵاو دەکردەوە، کە تەعبیری لە ڕوداوەکان دەکرد. ئەمەش بە سەرەتای وێنەی کاریکارتێری سیاسی دادەنرێت.

یەکێك لە وێنەکێشە مەزنەکانی کاریکارتێر (هۆنێر دۆمیر) ی سیاسی ی فەرەنسی بوو ١٨٠٨-١٨٧٩. کە بە وێنەکانی هێرشی زۆر سەختی دەکردە سەر دەسەڵات و گەندەڵی ئیداری. بەهۆی وێنەیەکیەوە کە گاڵتەی بە پادشا دەکرد شەش مانگ زیندانی کرا.

## مێشەنگ... چۆن هەنگوین دروست دەکات؟

ئەو مێشەنگەی هەنگوین دروست دەکات، لەو مرۆڤانە دەچن کە لە ئۆردوگایەکدا دەژین. هیچ کام لە گیاندارانی وشکانی نیە وەکو مێشەنگ ژیانی ڕێکخراو بێت. مەملەکەتی هەنگ، ئەوانەی هەنگوین دروست دەکەن لە شا و هەزاران هەنگی کارگەر پێك دێت. مەملەکەتی هەنگەکان دەکەوێتە خانەی هەنگەکانەوە.

شا، هێلکەی خۆی دادەنێت و هەنگەکانی تر دەیپارێزن. شا لە ڕۆژێکدا زیاتر لە ١٥٠٠ هێلکە دادەنێت کە دەکاتە نزیکەی ٢٥٠ هەزار هێلکە لە وەرزێکدا. لە هەمو ژیانیشیدا زیاتر لە ملیۆنێك هێلکە دادەنێت.

زۆربەی هەنگەکان لە ساڵێك تا دوو ساڵ دەژین. دەشێت شارە هەنگێك شەست هەزار مێشەنگ لە خۆ بگرێت.

مێشەنگە کارکەرەکان ئەرکیان زۆر لەسەرە. لە سەرەتادا شانەکان پاك دەکەنەوە و لوسی دەکەن. دوای چەند ڕوژێك چاودێری پورگە هەنگەکان دەکەن و دوای ئەوە دەردەچن بۆ کۆکردنەوەی شیلەی گوڵەکان.

ئایا دەزانیت هەنگەکان چۆن هەنگوین دروست دەکەن؟

لە ڕاستیدا خۆراکی هەنگەکان هەنگوینە، لەبەر ئەوە دروست کردنی هەنگوین لە کۆکردنەوەی خۆراکی ئەو مێشانە دەچێت، کە لە گوڵەکان کۆی دەکاتەوە. کە شلەیەکی شیرینی تێدایە پێ ی دەوترێت ((شیلە)) مێشەنگەکان ئەو شیلەیە دەمژن و دەیکەنە خانەیەکەوە لە تورەکەکانی هەنگوین دا.

ئەو تورەکانە لە گیرفانەکانی نزیکی سکی هەنگەکەدان. لەوێدا دەم قاپێك هەیە کە

تورەکەکە و سکی لەیەك جیا دەکاتەوە.

ئەو شەکرەی لە شیلەکەدا هەیە، بەکار لێکردنێکی کیمیاویدا تێدەپەڕێت و هەرچی ئاو هەیە لە شیلەکەدا دەبێتە هەڵم و دوای بوونە هەڵم، هەنگوینەکە دەشێت بۆ ماوەیەکی زۆر لە شانەکەدا بمێنێتەوە بیٚ ئەوەی خراپ بێت.

زۆر ڕێگە هەیە بۆ دەرهێنانی هەنگوین لە شانەدا. تام و ڕەنگی هەنگوین بە گوێرەی تام و بۆنی ئەو گولآنە دەبێت کە لیٚ ی دروست دەبێت.

هەنگوین مەوادی زۆری تێدایە لەوانە دوو جۆر شەکر، مەوادی کانزایی، ڤیتامیناتێکی زۆر و ڕێژەیەکی کەمیش لە پروتینات و مەوادی مزری، لەبەر ئەوەیە هەنگوین زۆر بەسودە بۆ مرۆڤ.

## توتی

مرۆڤ لە دێر زەمانەوە توتی خۆش ویستوە. ئەم باڵندەیە دەتوانێت لاسایی دەنگی مرۆڤ بکاتەوە.

زۆر جۆری توتی هەن کە دەتوانن زۆر ووشە و ڕستەی کورت بڵێنەوە وەکو مرۆڤ.

ئایا دەزانن توتی چۆن لاسایی دەنگی مرۆڤ دەکاتەوە؟

توتی زمانێکی درێژ و ئەستووری هەیە. بۆیە زۆر کەس بڕوایان وایە ئەوە هۆیەکەیەتی کە توتی دەتوانێت لاسایی مرۆڤ بکاتەوە. ئەگەر توتی ئەو زمانەشی نەبایە، دەشیا بیتوانیایە وەکو ئێمە قسە بکات.

توتی بەوە ناسراوە کە لە باڵندەکانی تر زیرەکترە، لەبەر ئەوە دەتوانێت لاسایی دەنگی مرۆڤ بکاتەوە. دەبێت بڵێین ئەوەی دەیڵێتەوە خۆی لیٚ ی تێناگات. تەنها بە تێبینی کردنی هەردوو لێوی مرۆڤ دەتوانێت لاسایی مرۆڤ بکاتەوە. زۆربەی توتیەکان لە ناوچە ئیستیوائیەکاندان، بە ڕێژەیەکی زۆریش لە ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتینیشدا هەن.

لەسەر سەوزە و میوە دەژین و ئەگەر خزمەتی باشیان هەبێت تا تەمەنی پەنجا ساڵ دەژین. جۆرەکانی توتی زۆرن، بەڵام زۆربەیان ڕەنگیان سەوزە و دەنوکێکی چەوتیان پێوەیە. درێژییان لە نێوان ١٥ بۆ ٩٠ سەنتیمەتر دایە.

توتی ((مەقۆ)) کە درێژترینیانە و کلکێکی درێژی پێوەیە لە ئەمریکای باشوردا

دەژی و درێژیەکەی ٩٠ سەنتیمەترە.
توتی ((کای)) نیوزلەندی گەورە درێژیەکەی ٥٠ سەنتیمەترە.
هەموو مێینەکانی توتی لەیەك هێلکە زیاتر دانانێن.
شایانی باسە توتی جۆرێکی ڤایرۆس دەگوێزێتەوە، دەبێتە هۆی نەخۆشیەك کە پیێ ی دەوترێت نەخۆشی توتی.

## گڕکان

هیچ گڕکانێك لە نزیکی نیوێۆرك و لەندەن و پاریسدا ڕونادات، ئەگەری ئەوەش ناکرێت لە داهاتودا تیایدا ڕوبدات. بەڵام شوێنی تر هەیە لە جیهاندا گڕکانی یەك لە دوای یەك تیایدا ڕوو دەدات.
ئەمریکای ناوەند، لەسەر زەریای باسیڤیکی، یەکێکە لە ناوچە گڕکانیەکانی جیهان. زیاتر لە دوو لەسەر سیێ ی گڕکانە چالاکەنان لە سنوری زەریای باسیڤیکی دا ڕو دەدات. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە، توێکڵی زەوی لەم ناوچانەدا ((لاوازە)) یان ((ناوچەیەکی لاوازە)) بە بەراورد لەگەڵ توێکڵی زەوی لە ناوچەکانی تری جیهاندا، چونکە گڕکان ناتوانێت توێکڵی زەوی بدرێت و لیێ ی بێتە دەرەوە ئەگەر خاڵێکی لاوازی تێدا نەبێت.
چۆن گڕکان دروست دەبێت؟
ناخی زەوی گەرمە، هەرچەند زیاتر بچینە ناخی زەوی یەوە پلەی گەرما بەرزتر دەبێتەوە، لە قولآیی نزیکەی بیست میلدا پلەی گەرما دەگاتە ١٠٠٠ بۆ ١١٠٠ پلەی سەدی، ئەمەش دەبێتە هۆی تواندنەوەی زۆربەی بەردەکانی ناخی زەوی، کاتێك بەردەکان دەتوێنەوە، دەکێشن و پێویستیان بە ڕوبەرێکی زیاتر هەیە. لە هەندێك ناوچەی جیهاندا زنجیرە چیای تازە دروست بوونە، هەزاران ساڵ پێش ئێستا. لە ژێر و نزیکی ئەو زنجیرە شاخە تازە دروست بوانەدا پاڵە پەستۆ کەمترە وەکو لە شوێنەکانی تردا. کەواتە جۆرێکە لە ((خاڵی لاواز)) لە توێکڵی سەختی زەویدا.
لەبەر ئەوەی بەردەکان دەتوێنەوە و دەکێشن و کۆگایەکی ناوچەیی لەبەردی تواوە دروست دەکەن، مەوادە تواوەکانیش لە درزەکانەوە دێنە دەرەوە و کاتێك پاڵە

پەستۆ لە عەمباری بەردی تواوەدا لە سەرەوەی خۆی گەورە تر دەبێت وەکو گڕکانێك بۆ سەرەوە دەتەقێتەوە و هەڵچوونەکەشی بەردەوام دەبێت تا لە هەموو گازەکان بەتاڵ دەبێت. ئەو مەوادانەی کە لە گڕکانەوە دەردەچن بە زۆری گازن.
بەلاّم ڕێژەیەکی زۆر لەو بەردە تواوانە کە پێ ی دەڵێن ((قەقنەن)) پلاشەی ڕەق کە وەکو سکڵی کوژراوە و خوڵەمێشە دەچێتە ئاسمانا.
شۆڕشی بورکان بریتی یە لە تەقینەوەیەکی گازی، بەلاّم هەندێك قەقنەزی گڕکانی دەبێتە هاڕاوەیەکی زۆر ورد کەوا دەکات، ئەوەی لە گڕکانەوە دێتە دەرەوە وەکو دووکەڵی ڕەش چاو بدات.

## بۆچی حکومەتەکان باج لە خەڵکی دەسێنن؟

حکومەتەکان لە هەموو وڵاتە پێشکەوتوەکاندا ساڵانە بڕێکی زۆر دارایی لە خەڵکی وڵاتەکەیان کۆ دەکەنەوە لە ژێر ناوی جۆرەها باجدا. بە بێ باج وەرگرتن حکومەتەکان ناتوانن ئیش و ئەرکەکانی خۆیان جێ بە جێ بکەن.
باج دوو جۆرە ((ڕاستەوخۆ)) و ((ناراستەوخۆ)) باجە ڕاستەوخۆکان وەکو باجی دەرامەد و سامان و خانوبەرە و هتد.
باجە ناراستەوخۆکانیش بە شێوەیەکی گشتی فرۆشتنەکان و ڕەسمە گومرگیەکان و بەرهەم هێنان و پول و ڕێگاوبان... هتد دەگرێتەوە.
ئایا دەزانن بۆچی دەبێت باج بدەین و ئەو هەموو پارەیە کۆ دەکرێتەوە بۆ کوێ دەچێت؟
ئەو سامانەی حکومەتەکان بەهۆی باجەوە کۆی دەکەنەوە لە پرۆژە خزمەت گوزاریەکاندا خەرجی دەکەنەوە. وەکو دروست کردنی نەخۆشخانە و خوێندنگا و کۆلێژ و زانکۆ و لەگەڵ دابین کردنی هۆیەکانی گواستنەوە و گەیاندن و فەراهەم کردنی خزمەت کردنی پۆلیس و ئاگر کوژێنەوە.
بە تێپەڕ بونی ساڵ ڕێژەی باجدانیش بەرز دەەبێتەوە، لەبەر زیادکردنی دانیشتوان پێویستی بە خزمەت گوزاری زیاتر هەیە. هەروەها دابەزینی نرخی دراو بەهۆی هەلایسانەوە. خاڵێکی ترە بۆ زیاد کردنی ڕێژەی باجدان. بۆیە پسپۆرانی باج پێشنیاری ئەوە دەکەن حکومەتەکان جۆرەها باجی تر بخەنە سەر

هاوولاّتیەكان.

## بۆچی سەركەوتن لە دابەزین گرانترە؟

كاتێك مرۆڤ بە پەیژەیەك یان شوێنێكی بەرزدا سەر دەكەوێت هەست بە ماندووبون دەكات، بەلاّم كاتێك دادەبەزێت بە پێچەوانەوەیە.
ئەگەر بمانەوێت شتێكی قورس هەڵبگرین دەبێت هێزێكی زۆر بەكار ببەین! ئەمەش هەمان شت كاتێك لە تەپۆڵكەیەك یان شاخێك سەردەكەوین، نارەحەتی زۆر تر دەبینین وەك دابەزین لە شاخێك یان تەپۆڵكەیەك.
ئایا دەزانیت بۆچی ئەوە ڕودەدات؟
ئێمە دەزانین زەوی هەموو شتێكی بۆ چەقی خۆی ڕادەكێشێت، لە ئەنجامی ئەو ڕاكێشانەی زەویدا، كاتێك لەسەر ڕوی زەوی دوور دەكەوینەوە، دەبێت هەوڵێكی زۆر بدەین بۆ ئەوەی بەسەر هێزی ڕاكێشاندا زاڵ بین. چونكە كاتێك لە تەپۆڵكەیەك سەر دەكەوین دەبێت قورسایی لەشمان هەڵبگرین بە پێچەوانەی ڕاكێشانەوە. بە پێچەوانەشەوە لە كاتی دابەزیندا لە شوێنێكی بەرزەوە هێزی ڕاكێشان یارمەتی جوڵەمان دەدات. بۆیە لە كاتی سەركەوتنماندا، بۆ شوێنێكی بەرز پێویستمان بە وزەی زیاتر هەیە وەك لە شوێنێكی هاماری و ڕاساندا. كاتێك لە تەپۆڵكەیەك سەردەكەوین، دەبێت ماسولكەكانمان زیاتر ئیش بكەن و دڵیش خوێنی زیاتر بنێرێت بۆ خانەكان. لە ئەنجامی ئەمەشدا سیەكان ئیشی زیاتر دەكەن بۆ دەردانی دوەم ئۆكسیدی كاربۆن لە دڵ و قەرەبو كردنەوەی بە ئۆكسجین، لەبەر ئەوەیە هەرچەند لە شوێنێكی بەرزتر سەربكەوین هەناسە دانمان خێراتر دەبێت.
بە بەراورد لەگەڵ ئەو وزەیەی لە شوێنێكی تەختایی داو لە كاتی ڕێكردندا خەرجی دەكەین، ڕێژەی ئەو وزە زیادەیەی بۆ سەركەوتن پێویستە لەسەر ئەو بەرزیە دەوەستێت كە پێیدا سەر دەكەوین.

## كام شارە دەكەوێتە دوو كیشوەرەوە؟

ئەستەمبوڵ گەورەترین شار و بەندەری دەریایی توركیایە و یەكێكە لە شارە هەرە

دێرینەکانی جیهانیش. بەشێکی ئەستەمبوڵ لە ئوروپا و بەشەکەی تریشی لە ئاسیادایە. بەشە زۆرەکەی لە دیوی ئوروپادایە لە تەنگەی پۆسفۆر، ئەوەی کە ئوروپا و ئاسیا لەیەك جودا دەکاتەوە.

بەمجۆرە ئەستەمبوڵ تەنیا شارێکە کە دەروازەی لەسەر دەریای ڕەشە. بەشی سەرەکی ی لەسەری سێگوشەکەیە لە باکوری شار، کە لێوارەکانی ((شاخی زێڕین)) ی بەناوبانگ دەشوات. ئەستەمبوڵیش وەکو ڕۆما لەسەر حەوت تەپۆڵکە دروست کراوە.

مێژوی ئەستەمبوڵ پڕیەتی لە شۆڕش و نائارامی ی گەورە. لە کۆندا پێیان وتوە ((بیزنگیە)). لە ساڵی ٣٣٠ زایینی دا ئیمپراتۆری ڕۆمانی قوستەنتین کردیە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی بیزنگیە و ناوەکەی گۆڕی بۆ قوستەنتینیە. لەو ڕۆژەوە تا گرتنی لەلایەن تورکەکانەوە لە ساڵی ١٤٥٣ ئەم شارە پارێزگای لە ڕۆشنبیری و کولتوری یونانی و ڕۆمانی دەکرد. بەو جۆرە ئەستەمبول ئەلقەی بەیەك گەیشتن بو لە نێوان شارستانیەتی کۆن و نوێدا.

بەهۆی هەڵکەوتە جوگرافیاییەکەیەوە زۆر مەعەرەز بوە بۆ بومەلەرزە.سەرەڕای ئەو هەموو بومەلەرزە زۆرە کە بە درێژایی چەندین سەدە لیٚ ی داوە هێشتا زۆربەی شارەکە وەکو خۆی ماوەتەوە.

لە بینا هەرە بەناوبانگەکانی ئەم شارە کەنیسەی ئایا صۆفیا (قدیسە صوفیا) کە ئیمپراتۆر جۆستنیانی یەکەم لە نێوان ساڵانی ٥٢٧ و ٥٦٥ دا لەسەر شوێنی کەنیسەیەکی کۆن کە پیٚ ی دەوترا کەنیسەی قوستەنتین دروستی کرد. دوای گرتنی لەلایەن ((محمد الفاتح)) ەوە ئەم کەنیسەیە کرایە مزگەوت و لە ساڵی ١٩٣٥ یشەوە کرایە مۆزەخانە.

## وەنەوزی دوای خواردن

دوای هەر ژەمێك خواردن هەست دەکەین خەومان دێت و لەشمان قورس و تەمەڵ دەبێت، ئەگەر دوای ئەوە بخەوین، ئەوا خەوێکی قوڵمان لێدەکەوێت.

ئایا دەزانن بۆچی ئەوەمان لیٚ ڕودەدات؟

ئەم حاڵەتە تەفسیرێکی زانستی هەیە، مرۆڤی ئاسایی لە لەشیدا نزیکە پێنج لیتر

خوێن هەیە، کە بەناو ئەندامە جیاجیاکانی لەشیدا هات و چۆ دەکات. ئەو خوێنەش دەچێت بۆ ئەندامە جیاوازەکانی لەش نەگۆڕ نیە و بە گوێرەی ڕیشاڵە جۆراوجۆرەکان خوێن بەناو لەشدا دەچێت.

لە دۆخی ئاساییدا جگەر ٢٨٪ ی ئەو خوێنە دەبات کە دڵ دەینێرێت، هەردوو گورچیلەش ٢٤٪ و ماسولکەکان ١٥٪ و مێشك ١٤٪ و ١٩٪ بۆ هەموو ئەندامەکانی تری لەش. بەڵام ئەم ڕێژانە بە گوێرەی پێداویستیەکانی لەش دەگۆڕێن.

کاتێك ژەمێك نان دەخۆین گەدە پێویستی بە خوێنی زیاتر هەیە بۆ هەرس کردنی ئەو خۆراکە. بۆیە زۆربەی خوێنی مێشك دادەبەزێت بۆ گەدە تا یارمەتی گەدە بدات لە هەرس کردندا، بەوەش بەشی مێشك لە خوێن کەم دەبێتەوە بەو هۆیەوە چالاکیەکانی مێشکیش کەم دەبێتەوە کە دەبێتە هۆی وەنەوز و خەو هاتن. کە هێمایەکە بۆ لەش بۆ ئەوەی پشو بدات. لەبەر ئەوە زۆر پێویستە دوای هەر ژەمە خواردنێك هەندێك پشو بدەین.

## هیلیوم

لە ساڵی ١٨٦٨ دا زانای بەریتانی ((نۆرمان لۆکێر)) کە خەریکی لێکۆڵینەوە بو لەسەر خۆر بە ئامێرێك کە پیێ ی دەووترێت ((شەبەنگ پێو)) کە دور بینێکە بۆ جودا کردنەوەی شەبەنگ، بەم ئامێرە زانایان دەتوانن توخمەکان بناسنەوە. لەبەر ئەوەی هەر توخمێك ڕەنگێکی دیاری کراوی خۆی هەیە لە شەبەنگدا.

لە کاتی سەیرکردنی ئەم ئامێردا هێڵێکی ئاڵۆز لەشەبەنگ دەرکەوت. بۆیە زانایان گەیشتنە ئەو بڕوایە، دەبێت ئەو ڕەنگە لە توخمێکی تازەوە بێت کە لەوە و پێش نەناسراو بوە. ئەو توخمە تازەیەش ناونرا ((هیلیۆم)) کە نسبەتە بۆ وشەی یونانی ((هیلیۆس)) کە مانای خۆر دەدات.

زانایان دەستیان بە گەڕان کرد بۆ ئەوەی بزانن ئەم توخمە لەسەر ڕوی زەویشدا هەیە، دوای تاقیکردنەوەیەکی زۆر، بۆیان دەرکەوت لە کەشی ئێمەشدا هیلیۆم هەیە، بەڵام بە ڕێژەیەکی زۆر کەم. لەهەر ٢٤٧,٣٥٠ مەتری سێ جای هەوادا یەك مەتری سێ جای هیلیۆمە.

چەندین تاقیکردنەوەی تریش کرا کە بوە هۆی دۆزینەوەی توخمی ڕادیۆمیش

ڕادیۆم کانزایی تیشکدەری چالاکە و هیلیۆم دەردەدات. کاتێك ڕادیۆم تیشك دەردەدات یەکێك لە شێوەکانی ((تیشکی ئەلفا)) یە کە گەردیلە کانی. هیلیۆمە و بە خێراییەکی زۆر دەجوڵێتەوە. دەرکەوت هیلیۆم توخمێکی زۆر بە سودە و هێندە سوکە تەنانەت تواناى بەرز بونەوەیەکی زۆری هەیە. لەبەر ئەوەی هیلیۆم ناسوتێت بۆیە زۆر گونجاوە لە باڵدانەوەی باڵۆنەکاندا بەکار بهێنرێت.

وڵاتە یەکگرتوەکان هەستی کرد کە هیلیۆم زۆر گرنگە بۆیە وتی: دەبێت سەر چاوەیەکی سروشتی بدۆزرێتەوە بۆ هیلیۆم. پاش تاقیکردنەوەی زۆر گەیشتە ئەوەی کە گازی سروشتی بە ڕێژەی یەك بۆ دوو لە سەدی گازی هیلیۆمی تێدایە.

لەسەرەتادا جوداکردنەوەی هیلیۆم لە گازی سروشتی زۆر گران دەکەوت. هەر یەك مەتری سێ جا لە هیلیۆم زیاتر لە ٧٠ هەزار دۆلاری تێدەچوو. بەڵام ئەمڕۆ زۆر لەوە کەمتری تێدەچێت.

هیلیۆم لە پیشەسازی دەرمانیشدا بەکار دێت، چونکە یارمەتی نەخۆشی تەنگە نەفەسی (ڕەبو) دەدات بۆ ئەوەی نەخۆشەکان بە ئاسانی هەناسە بدەن.

## زیو

گەڕان بە دوای زیودا لە دێر زەمانەوە هەر بوە، لە ئوروپادا پادشاکان وەکو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند کردنی خۆیان پشتیان پێ بەستوە.

کاتێك کانە زیوەکانی ئسپانیا تەواو بون، پادشای ئسپانیا زۆر بەوە دڵخۆش بو کە دۆزینەوەی ئەمریکا وای کرد بچێت کانی گەورەتری لە مەکسیك و پێرۆ دەست کەوێت. کانە زیوی ((بۆتۆسی)) لە پیرۆ، بە درێژایی ٢٥٠ ساڵ، ساڵانە بایی چوار ملیۆن دۆلاری دەدایە پادشاکانی ئسپانیا. لە ماوەی ڕۆژانی شۆرشی زێردا لە کالیفۆرنیا خەڵکی نەفرەتیان لەو گڵە ڕەشە دەکرد. کە دەنیشتە سەر زێرەکانیانەوە. بەڵام دوای بۆیان دەرکەوت ئەو خۆڵە ڕەشە زیوی خاوە.

زیو زۆرترین کانزایە کە لە سروشتدا بونی هەبێت. هەندێك جار لە شێوەی پارچەی ڕەقدا هەیە. جارێکیان لە نەرویج پارچە زیوێکی ڕەقیان دۆزیەوە کەسێ چارەکە تەن قورس بوو. بەڵام زیو بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ کانزاکانی تردا تێکەڵەو دەبێت جیا بکرێتەوە. زیو لەگەڵ گۆکردا یەکدەگرن لە شێوەی گۆگردی

زیودا، یان بەشێك لە گۆگردەکانی تر. وەکو بونی مس و قورقوشم و زەرنیخ دا لە جیهاندا ساڵانە نزیکەی ٨٥٠,٥٠٠,٠٠٠ گرام لە زیوی پاك بەرهەم دەهێنرێت. مەکسیك و وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و کەنەدا سەرچاوەی سەرەکین لە بەرهەم هێنانی زیودا.

زیو هێندە نەرمە ناتوانرێت بە تەنیا بەکار بهێنرێت، لەبەر ئەوە لەگەڵ کانزاکانی تردا تێکەڵ دەکرێت، بۆ نمونە دراوە زیویەکان ٩٠٪ زیوو و ١٠٪ یان مسە. بەڵام زیوی ئەستەرلینی کە خشل و جەواهیرات و قاپە زیوی لێ دروست دەکرێت ٩٢,٥٪ ی زیوە و ٧,٥ ی مسە.

وشەی ((ئەستەرلینی)) لە بنەماڵەیەکی ئەڵمانیەوە وەرگیراوە کە ناویان ((ئەستەرلینگ)) بوە.

ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە بازرگانێکی هێندە دەست پاك بونە، تا ئەو ڕادەیە وای کردوە لە پادشای بەریتانیا (جۆن) داویان لێبکات لە ساڵی ١٢١٥ دا دراوی بۆ لێدەن، ئەوانیش زۆر بە جوانی و ڕاستگۆیی و دەست پاکیەوە ئیشەکەیان بۆ کرد و، تا ئێستاش وەکو هێمایەك ناویان بۆ نرخی مادە بەکار دێت. زیوی پوختە لە هەوای پاکدا بریقەی خۆی لەدەست نادات. بەڵام کە ڕەنگی دەگۆڕێت بۆ شین. ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە گۆگرد لە هەوادا هەیە. وەکو دوکەڵی شارەکان یان چاڵە نەوتەکان.

دوای زێڕ، زیو دێت لە کاری خۆشکردندا، بە جۆرێك کە دەتوانین لە ٣٠ گرام زیودا تەلێکی ٣٠ میلی دروست بکەین. هەروەها باشترین گەیەنەریشە بۆ گەرما و کارەبا.

## سودەکانی مۆز

مۆز خواردنێکی میللی گەلێك گرنگە، لە خواردنی ڕۆژانەماندا. بنەڕەتی بۆ ڕۆژهەلاتی ئاسیا و ناوچەی ئەندونیسیا دەگەڕێتەوە. چونکە مۆزی زەمینی لە دارستانەکانی ئەوێدا دەڕوا.

بە تێپەڕ بونی ڕۆژگار لە نێوان جۆرەکانی مۆزدا مرۆڤ گرنگی دایە ئەو مۆزەی ئێستا دەخورێت.

لەگەڵ سەرەتای مەسیحیەتدا مۆز بوو بە خواردنێکی میللی لەناو وڵاتانی ئاسیا و حەوزی دەریای سپی ناوەڕاستدا. کاتێك ئسپانیەکان لە ئەمریکای باشوردا جێگیر بوون کشتیان کرد و بە جوانیش بەرهەم هات، لەبەر ئەوەی ڕوەکێکی ئیستیوائیە.

داری مۆز بە درێژایی ساڵ لە کەشتێکی گەرم و شێداردا گەشە دەکات. بەرەکەی بە سەوزی لێ دەکرێتەوە و لە کاتی گواستنەوەدا دەگات.

کرۆکی بەری مۆز بە شێوەیەکی سەرەکی ئاوە. ڕێژەی شەکری ٧٤٪ و پرۆتین ٢٠٪ و چەوری ٢٪ و سیلیلۆز ١,٥٪ و مەوادەکانی تریش ١٪ ە. کرۆکی مۆز دەوڵەمەندە بە زۆر لە ڤیتامینەکانی A و C و B١ و B٢.

مۆز میوەیەکە زوو هەرس دەکرێت. لە مۆزی وشکیش جۆرێك لە هەویر دروست دەکرێت.

ئەفریقیەکانیش سەری کوخەکانیان بە گەڵای مۆز دادەپۆشن. داری مۆز جۆرێك لە ڕیشاڵی تێدایە کە لە پیشەسازی پەتدا بەکار دێت.

نزیکەی ٢٠٠ جۆر مۆزمان هەیە کە سەر بە نزیکەی ٣٠ خێزانن لە مۆز. داری مۆز هەرگیز بە تۆو ناچێنرێت. بەڵکو دەبێت، بەشێك لە قەدە زەمینییەکەی کە لە ڕەگ دەچێت بڕوێنرێت. دارە نوێکان خێراتر لە چرۆکان دەڕوێن. بەرزی داری مۆز لە نێوان ٢٠ و ٣٠ پێدایە. هەر دارێك نزیکەی دەگەڵای هەیە کە هێشویەك لەبەر دەگرێت.

درێژی هەر گەڵای دار مۆزێك لە نێوان ٦ بۆ ٧ پێدایە. پانیەکەشی لە یەك بۆ دوو پێ یە.

## ڕەوڕەوە ((دولاب))

سەڵماوە کە داهێنانی ڕەوڕەوە یەکێکە لە گەورەترین نیعمەتەکان بۆ مرۆڤ. تا ئەمرۆش لە هەموو هۆیەکی گواستنەوەی نوێدا بەکار دەهێنرێت، وەکو ئوتومبیل، فرۆکە، شەمەنەفەر و چەندینی تر لە جۆرەکانی گواستنەوە. ئەگەر ڕەوڕەوە نەبوایە، ئەوا ڕێکردنی ئەم هۆیانەی گواستنەوە مەحاڵ بو. پێش داهێنانی ڕەوڕەوە مرۆڤ بە کوڵی خۆی شتەکانی دەگواستنەو، ئەمجا گیانلەبەرانی وەکو

گوێدرێژ و گاو ئەسپ و حوشتری بۆ بار هەڵگرتن بەکار هێنا.

بەرەبەرە مرۆڤ فێر بو بارەکانی لەسەر دارێك بگوێزێتەوە بە یارمەتی ئاژەڵان دوای ماوەیەکی تر لەوە مرۆڤ داری لە شێوەی بازنە دا هەڵهێنا و لە ناوەراستەوە کونێکی لێکرد و ئەمەش یەکەمین جۆری ڕەو ڕەو بو کە یەکێك بو لە داهێنانە هەرە مەزنەکانی مرۆڤ.

دوای ئەم داهێنانە، بەهۆی میحوەرێکەوە دوو ڕەوڕەوە لە دار پەیوەست کران بە یەکەوە، بەمەش یەکەمین جۆری گالیسکە لە جیهاندا دروست کرا. کە لە عێراقەوە بوو لە نێوان سالانی ٣٥٠٠ و ٣٠٠٠ پێش زایندا.

چاکسازی دوەم لە بەکارهێنانی ڕەوڕەوەدا پەیوەست کردنی میحوەرەکەی بو بە گالیسکەکەوە، کەوای دەکرد ڕەوڕەوەکە بە ئازادی بخولێتەوە.

یەکەمین گالیسکەی ڕەوڕەوەدار کە ئاژەڵان ڕایان دەکێشا، بۆ خواوەندەکان دروست کران. بەرەبەرە دوای ئەوە ڕەو ڕەوەی ناوبۆش دروست کرا لە ئاسیا دا و لە نزیکەی ساڵی ٢٠٠٠ پێش زاین. کە بە ڕێژەیەکی زۆر بوە هۆی سوککردنەوەی کێشی ڕەوڕەوەکان.

بە تێپەڕ بونی ڕۆژگار چاکسازی زۆر باشتر لە شێوەی دروست کردنی ڕەوڕەوە کاندا کرا. ئەمڕۆ دەبینین ڕەوڕەوە و تایە لە ئاسن و سیم دروست دەکرێت، کە بە لاستیك ڕوپۆش کراوە. لە ئەنجامی ئەم چاکسازیانەشدا ڕەوڕەوەکان زۆر سوك و بە تەمەن و بە تواناتر بونە.

زیادە ڕەویمان نەکردوە ئەگەر بڵێین ئەم هەموو پێشکەوتنە خێرایەی ئەمڕۆ بە یارمەتی ڕەوڕەوەکانەوە بوە.

## ئەو گیانلەبەرەی هەرگیز ئاو ناخوات

هەرچی ڕوەك و گیانلەبەر هەیە لەسەر ڕوی زەویدا، بۆ ئەوەی بژێت پێویستی بە ئاو هەیە. بەڵام ئەوەی کە زۆر نامۆیە گیانلەبەرێك هەیە لە هەموو تەمەنیدا ئاو ناخوات.

ئەو گیانلەبەرەش جۆرێکە لە ڕسق کە لە بیابانەکانی باکوری ڕۆژئاوای وڵاتە یەکگرتوەکاندا دەژێت. لە هەموو ژیانیدا یەك جاریش ئاو ناخوات. ئەم گیانلەبەرە

ناوى ((ڕسقى كەنغەرە)) بۆيە ئەم ناوەشيان لەبەر ئەوەى هەردوو قاچ و كلكى لە قاچى كەنغەرى ئوسترالى دەچێت و وەكو ئەويش قومچە دەنێت.

پرسيار لێرەدايە: ئايا ڕسقى كەنغەر چۆن دەتوانێت بە بێ ئاو بژێت؟

پێكهاتەى لاشەى ڕوەك و گيانلەبەرانى بيابان وايە، زۆر كەم پێويستيان بە ئاو هەبێت. لەوانەش رسقى كەنغەر.

ئەو كەمە ئاوەى ئەم گيانلەبەرە پێويستى پێ يەتى لە ڕيشكى ڕوەكە بيابانيەكاندا دەستى دەكەوێت. ئەمەش بەسە بۆ ئەوەى لە ژياندا بمێنێتەوە.

بەمجۆرەش ڕوەكە بيابانيەكان پێداويستى رسقى كەنغەر لە ئاو و خۆراك پێكەوە دابين دەكەن. بە بەراورد لەگەڵ لاشەيدا قاچى رسقى كەنغەر زۆر درێژە. كاتێك بەجەنگ دێت وا دەزانيت بە تێلاَ شەر دەكەن. ئەم ڕسقانە لە نزيك دارستانەكاندا دەژين. لەناو ئەو كونانەدا كە لە ژێر زەوى بۆ خۆيان هەڵى دەكەنن.

## كێ ئوستراليای دۆزيەوە؟

ئوستراليا بچوكترين كيشوەر و گەورەترين دورگەى جيهانە. ڕوبەرى كشتى ى نزيكەى هەشت مليۆن كيلۆمەترى چوارگۆشەيە. تا سەدەكانى ناوەڕاست خەڵكى باسيان لە بونى ((كيشوەرێكى گەورە دەكرد، لە نيوەى باشورى گۆى زەويدا)) بەلاَم هيچ كەسێك نەيبينيبوو.

خەڵكى سەبارەت بە شێوەى ئەو كيشوەرەكە بە ((ولاَتى باشورى ون)) ناسرابوو، ئايا خەڵكى لێ نيشتەجێ يە يان نە؟ پرسياريان دەكرد. ئايا دەزانن ئوستراليا چۆن دۆزرايەوە؟

لە سەدەى شانزەهەمدا ولاَتانى ئوروپا، لە پێناو پەرەپێدانى چالاكيە بازرگانيەكانياندا دەگەڕان بە دواى ولاَتانى تازە و نوێدا.

لە ساڵى ١٦٠٦ هۆلنديەكان يەكەم كەس بون سەردانى ئوستراليايان كرد كەشتيەكەيان كە ناوى ((ديوفكين)) بوو. لە بەرامبەر لێوارەكانى ئوستراليای باكورى دا لەنگەرى گرت. كە دەرياوانەكان دابەزين بۆ پڕ كردنى دەفرەكانيان لە ئاو هاو ولاَتيە دڕندەكان ڕاويان نان.

((ديوفكين)) دوركەوتەوە بێ ئەوەى هيچ بەشێك لەو كێشەوەرە بەر فراوانە

بدۆزێتەوە. لە ساڵی ١٦٤٢ دا هۆڵندیەکان کاپتن ((ئاپڵ تاسمان)) یان نارد بۆ دۆزینەوەی زیاتر لەسەر ئەم کیشوەرە.

تاسمانیش زانیاری زۆر لەسەر لێواری باکوری کۆکردەوە. هەروەها دورگەیەکی تری دۆزیەوە. کە ئێستا پیێ ی دەوترێت ((تاسمانیا)) لەگەڵ نیوزیلاندیشدا. لە ساڵی ١٧٧٠ دا کاپتنێکی ئینگلیزی بە ناوی ((کوك)) لێواری ڕۆژهەلاتی ئۆستralیای دۆزیەوە و ناوی ((نیو ساوپ ویلز)) ی لیێ نا، واتە ((ساوپ ویلزی نویێ)).

لە ساڵی ١٧٨٨ یەکەمین موستەعمەرەی ئینگلیزی لەم کیشوەرەدا لە شاری سیدنی دامەزرا.

پرسیار لێرەدا ئەمەیە. دانیشتوانی رەسەنی ئوسترالیا کێن؟

پێش نزیکەی بیست هەزار ساڵە ڕەگەزێك لە مرۆڤی ڕەشی قژ لول کە بە ((تسمانیەکان)) ناسراون لە غینیای تازەوە چون بۆ ئەو شوێنە کە ئێستا پیێ ی دەوترێت ئوستralیا و لیێ ی جێگیر بوون. لە هەمان کاتدا ((ئوسترالودیەکان)) لە باشوری هندەوە کۆچیان کرد بۆی.

شەڕێکی خوێناوی لە نێوان ئەم دوو نەژادەدا لەسەر زەوی دروست بوو. ئەنجام تسمانیەکان لەم شەرەدا شکان و دور خرانەوە بۆ ناوەڕاستی وڵات و لە شوێنێکی تردا کە ئێستا بە ((تسمانیا)) ناسراوە جێگیر بوون.

ئوسترالیدیەکانیش لە شوێنی خۆیاندا مانەوە و بوون بە هاووڵاتی پلەیەکی ئوسترالیا.

ئوسترالیای ئەمرۆ لە کیشوەرە پێشکەوتوەکان و هاوچەرخەکانی جیهانە. دانیشتوانی لە هەموو شتێکدا خودکەفان. ئوسترالیا تایبەتمەندی خۆی هەیە. دوو لەسەر سیێ ی خاکەکەی بیابانە و ئاژەڵ باڵندەیەکی زۆر نامۆ و سەیری لیێ دەژیت. کە لەنغەر یەکێکیانە. بینی نی قازی عێراقی یەکێکە لە دیمەنە هەرە جوانەکانی ئەو کیشوەرە. لە ئوسترالیادا ڕێژەیەکی زۆر لە کەروێشك هەیە.

زەویەکەی دەوڵەمەندە بە زۆرلە کانزاکان وەك زێڕ، تنگستن (توخمێکی کانزاییە بۆ چەماندنەوە و بڕینەوەی پۆلا بەکار دێت) و مەنگەنیز و کۆباڵت و قورقوشم و

توتیا.

## یەکەم کەس لەسەر مانگ دابەزی

چەندین سەدە بوو مرۆڤ بە گەشتی فەزا و دۆزینەوەی سەر زەمینی تازەوە خەونی دەبینی.

یەکێتی سۆڤێتی پێشو بوو یەکەم هەنگاوی راستەقینەیان بەم ئاراستەیەدا نا. کاتێك یەکەمین مانگی دەستکردیان ((Sponic-١)) لە ٤ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٥٧ دا هەڵدایە ئاسمان.

دوای یەك مانگ لەو بەرواره مانگێکی دەستکردی گەورەتریان ((Sponic-٢)) ناردە ئاسمان. کە یەکەم گیانلەبەری زیندوو، سەگی ((لایکا)) ی هەڵگرتبوو. ئەمریکاش زۆر لە یەکێی سۆڤێت دوانەکەوت و یەکەمین مانگی دەستکردی خۆی ((xblur-١)) لە ٣١ یەنایری ساڵی ١٩٥٨ دا، ناردە ئاسمان. بەمجۆرەش پێشبڕکێ ی نێوان هەردوو وڵات بۆ دۆزینەوەی زیاتری فەزا دەستی پێ کرد.

یەکەمین مرۆڤ پێ ی نایە سەرمانگ فەزاوانی سۆڤێتی ((یوری گاگارین)) بوو. ئەویش لە ١٢ ئەپریلی ١٩٦١ دا، بە کەشتی ئاسمانی ((Fostuk ١))

((ئالان شیبارد)) یش یەکەمین فەزاوانی ئەمریکی بوو لە ڕۆژی ٥ ئایاری ١٩٦١ دا بە کەشتی ئاسمانی ((Mirkori-٣)) چوە سەر مانگ.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ دا چوار ئەمریکی و شەش سۆڤێتی دوای ئەوە گەشتێکی ئاسمانی سەرکەوتویان پێکەوە ئەنجام دا.

لە ساڵی ١٩٦١ دا ولاتە یەکگرتوەکان پرۆژە گرنگەکەی ((ئوپوڵۆ)) ی دەست پێ کرد. کە ئامانجی گواستنەوەی مرۆڤ بوو بۆ سەر مانگ. ئەم کێشە تەموحە لە هەموو هەنگاوەکانیدا توشی بەربەست و کێشە هات.

لە ٢٧ جەنیوەری دا پرۆژەی ئەپۆلو توشی شکستێ کی ترسناك هات، کاتێك لە یەکێك لە مەشقەکانیدا هەر سێ فەزاوان ((فێرجیل گریسوٚم و ئەدوارد وایت و ڕۆجەر شافی)) لە ئەنجامی کەوتنەوەی ئاگرێك لە کەشتیەکەیاندا سوتان.

ئەم مەرگەساتەش وای کرد بیر لە چاکسازی زۆرتر بکرێتەوە لە کەشتیە فەزاییەکاندا. لە جولای ١٩٦٩ دا هەرسێ فەزاوان ((ئادوین بۆز ئاڵدورین و

ئارمستڕۆنگ و مایکل کۆلینز)) بە کەشتی ی ((ئەپۆلو – ٢)) لە کاتژمێر (١٠,٥٦) ی ئێوارەی ٢٠ جولای ١٩٦٩ بەکاتی گرینج. ئارمستڕۆنگ یەکەم پێ ی نایە سەر ڕوی مانگ و بە بێ تەل لەگەڵ زەویدا قسەی کرد و ووتی:((یەك هەنگاوی بچوکە بۆ مرۆڤ )) بەڵام بازدانێکی مەزنە بۆ مرۆڤایەتی. دوای تۆزێك لەوە ئاڵدرینیش دابەزیە سەر مانگ بەڵام کۆلینز هەر لەناو کەشتیەکەدا مایەوە.

ئارمستڕۆنگ و ئاڵدەرین بۆ ماوەی (٢١) کاتژمێر و (٣٥) خولەك لە سەر مانگ مانەوە.

دوای ئەوە چوار گەشتی تری سەکەوتوو بۆ سەر مانگ ئەنجام درا لە پرۆژەی ئەپۆلۆدا. کە دواینیان لە ١١ دیسەمبەری ١٩٧٢ دا بوو. لە ((ئەپۆلۆ – ١٧)) دا ((یۆجین سیرنان و هاریسۆن شمیت)) ٧٤ کاتژمێر و ٥٩ خولەك لە سەر مانگ مانەوە. کە گەڕانەوە (١١٣,٦) کیلۆگرام مەوادی سەر مانگیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە بۆ سەر زەوی.

## دوکەڵ چی یە؟

دوکەڵ لە ئەنجامی نەسوتانی تەواوی سوتەمەنیەکانەوە دروست دەبێت. ئەمەش مانای وایە ئەگەر هەموو جۆرەکانی سووتەمەنی بیانتوانیایە بە شێوەیەکی تەواو بسوتێن، ئەوا هەرگیز دوکەڵمان نەدەبینی.

زۆربەی جۆرەکانی سوتەمەنی لە کاربۆن و هایدرۆجین و نایترۆجین و ڕەنگە هەندێك خۆڵەمێشی کانزاییش پێك بێت.

ئەگەر هەموو ئەمجۆرە سوتەمەنیانە بە شێوەیەکی تەواو سوتابان ئەنجامی کۆتایی دوەم ئۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو و نایترۆجین و هەموو ئەو مەوادە نا زیان بەخشانە دەبون.

ئەگەر گۆگرد هەبوو تیایدا ئەوا ڕێژەیەکی کەم لە ئۆکسیدی گۆگرد دەردەچێت و کە لەگەڵ هەوا و شێدا تێکەڵ دەبێت ترشیەکی زۆر وەڕس کەر (مزعج) دەردەکات.

تا سوتەمەنیەکە بە تەواوی دەسوتێت دەبێت هەوایەکی تەواو هەبێت بۆ تەئەکسودی تەواو لە پلەیەکی گەرمای بەرزدا. ئەم بارودۆخەش ئاستەمە جێ بە

جیّ ببیّت به تایبه‌تی له‌گه‌لّ سوته‌مه‌نیه‌کی ڕه‌قدا. که ئه‌نجامه‌که‌ی ده‌رکردنی دوکه‌لّ ده‌بیّت. ده‌شیّت خه‌لّوزی ئه‌نتراسیّت و کوك بسوتیّن بیّ ئه‌وه‌ی دوکه‌لّ ده‌رکه‌ن. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ماده‌یی گڕاوییان تیّدایه.

به‌لاّم خه‌لّوزی ڕه‌ش له پله‌ی گه‌رمای نزمدا شیته‌لّ ده‌بیّت و گازات و مه‌وادی ڕه‌ش و قه‌ترانی (دووکه‌لّ) ده‌رده‌کات. که گه‌ردوو خوّله‌میّشی له‌گه‌لّدایه.

هه‌وای سه‌ر شاره‌کان پڕه له گه‌ردیله‌ی وشکی هه‌لّوه‌ستاو. به‌لاّم هه‌مووی دووکه‌لّ نیه و گه‌رد و توّز و مه‌وادی ڕوه‌کی و مه‌وادی تری تیّدایه.

هه‌موو ئه‌مانه به‌هیّزی ڕاکیّشان داده‌به‌زنه سه‌ر زه‌وی.

سالاّنه له ڕوبه‌ری یه‌ك میلی دوجادا له نیّوان ٧٠ بوّ ٨٠ ته‌ن له‌و پیسایيانه داده‌به‌زنه سه‌ر شاره بچوکه‌کان.

ده‌شیّت دوکه‌لّ ئه‌زیه‌تی زوّر گه‌وره‌مان بوّ دروست بکات. زیانی هه‌یه بوّ ته‌ندروستی و که‌ل و په‌ل و ڕوه‌که‌کان. هه‌روه‌ها له شاره گه‌وره‌کاندا، هیّزی تیشکی خوّر داده‌به‌زیّنیّت به تایبه‌ت تیشکی سه‌رووی وه‌نه‌وشه‌یی. که زوّر پیّویسته بوّ له‌ش. ئه‌گه‌ر با هه‌لّنه‌کات و دووکه‌لّکه بلاّوه پیّ نه‌کات، ئه‌وا شاره پیشه‌سازیه گه‌وره‌کان هه‌موو ڕوّژیّك سه‌ر به‌ته‌م ده‌بن. ئه‌گه‌ر دوکه‌لّیش ته‌می دروست کرد، ئه‌وا ڕیّژه‌ی مردوان ڕوو له زیاد بون ده‌کات له ئه‌نجامی نه‌شیه‌کانی سی و دلّدا.

هه‌روه‌ها کاریگه‌ری دووکه‌لّ له‌سه‌ر ڕوه‌که‌کان زوّر زیان به‌خشه. چونکه ده‌چیّته ناو ((هه‌ناس)) دانی ڕوه‌که‌کانه‌وه و به‌ری تیشکی خوّری پیّویست ده‌گریّت. هه‌روه‌ها ترشی ناو دوکه‌لّ به شیّوه‌یه‌کی ڕاسته‌وخوّ ڕوه‌که‌کان له‌ناو ده‌بات.

## لویس پاستوّر

ئه‌گه‌ر شیر نه‌کولّیّنریّت خراپ ده‌بیّت. به‌لاّم ئه‌گه‌ر بوّ ماوه‌ی چه‌ند کاتژمیّریّك کولّیّنرا ئه‌وا خراپ نابیّت.

چونکه شیر چه‌ندین جوّر به‌کتریای تیایه، کاتیّك شیره‌که هه‌وا لیّ ی ده‌دات ئه‌وا ژماره‌ی به‌کتریاکان به خیّراییه‌کی زوّر زیاد ده‌که‌ن، که ده‌بیّته هوّی ترش بونی شیره‌که.

بەكتریا بە سێ ڕێگە دەچێتە ناو شیرەوە. ئەگەر ئەو مانگایەی شیرەكەی لێ دەدۆشرێت نەخۆش بێت و بەكتریا لەگەڵ شیرەكەیدا دابەزێت. میكرۆبەكانی سیل بەم ڕێگایە لەو ئاژەڵانە دەگوازرێنەوە.

دەشێت مانگا دۆشكە نەخۆش بێت و شیرەكە پیس بكات. یان ئەو ئاوەی كە دەفری شیرەكە و گوانی مانگاكەی پێ دەشۆرین میكرۆبی تێدا بێت. ئەو بەكتریایەی لە هەر یەكێك لەم سێ سەرچاوەوە بچێتە شیرەكەوە زۆر بە خێرایی گەشە دەكات و شیرەكە خراپ دەكات.

لە پێناو پاراستنی شیر لە خراپ بوون. ((لویس پاستۆر)) ڕێگەیەكی زۆر چالاكی دۆزیەوە كە پێ ی دەوترێت ((بەستەرە)) ئەو كەرێ و شیرانەی لە بازاڕدا دەفرۆشرێن یەكەمجار بەستەرە دەكرێن ئەمجا دەنێررێنە بازاڕ.

كرداری بەستەرە، بریتی یە لە كوڵاندنی شیرەكە بۆ پلەیەكی گەرمایی دیاری كراو. ئەمجا بە خێرایی سارد دەكرێتەوە. كە دەبێتە هۆی كوشتنی هەرچی بەكتریایە لە شیرەكەدا.

ئەگەر شیرە لە پلەی گەرمای ٦٢ ی سەدیدا بۆ ماوەی سی خولەك و پلەی گەرمای ٧٢ی سەدیدا بۆ ماوەی پانزە خولەك بكوڵێنرێت. بەسە بۆ كوشتنی هەرچی بەكتریایە تیایدا.

كرداری بەستەرە تەنها نابێتە هۆی پاراستنی شیرەكە لە خراپ بوون، بەڵكو دەبێتە هۆی كوشتنی میكرۆبەكانی سیل و نەخۆشیەكانی تریش.

هەروەها دەتوانین شیرەكە بۆ ماوەیەكی زۆریش بیهێڵینەوە، بێ ئەوەی جارێكی تر بكوڵێنرێتەوە.

لە ئێستا دا تیشكی جاما و بیتا لە بەستەرەكردندا بەكار دەهێنرێت، كە دەبێتە هۆی كوشتنی بەكتریای ناو شیر و شلەكانی تریش.

## چۆن لاشەمان بە گەرمی دەمێنێتەوە؟

مرۆڤ لە گیانلەبەرە خوێن گەرمەكانە. لە گشت وەرزەكانی ساڵدا گەرمای لاشەی بە جێگیری دەمێنێتەوە. لەبەر ئەوەی ژینگەی دەوروبەر كار لە لاشەی ناكات. پلەی گەرمای مرۆڤێكی لەش ساغ ٣٧ پلەی سەدی یان ٩٨,٦ پلەی فەهرنهایەتە.

ئایا دەزانیت ئەو وزە گەرمیە لە کوێوە دێت بۆ هێشتنەوەی لاشەمان بە گەرمی.
لاشە، وزەی گەرمی لەو خورادنەوە وەردەگرێت کە بە کاری دەبات، خۆراك گەرمایەك بەرهەم دەهێنێت بەهۆی کردارێکەوە کە پێ ی دەوترێت ئۆکساندن.
ئۆکساندنیش جۆرێکە لە سوتان، ئێمە دەزانین کاتێك سوتەمەنی دەسوتێت گەرما دەردەدات، سوتانی خۆراکیش بەهەمان شێوە جۆرێك لە گەرما دەردەدات. تەنها جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە سوتانی سوتەمەنی گەرما و تیشك دەردەدات، بەلاّم سوتانی خۆراك بە تەنیا گەرمی دەردەدات.
ئەو گەرمایەی کە لە سوتانی خۆراکەوە دروست دەبێت. لەش بەکاری دەهێنێت بۆ هەستان بە جۆرەها ئیشی ڕۆژانە ٢٥٠٠ گەرموکە (سُعْرە) لە وزەی گەرمای بەرهەم دەهێنێت. ئەم وزەیەش وا دەکات لەش بە گەرمی بمێنێتەوە و ئەندامەکانی لەشیش فەرمانەکانی خۆیان بەجێ بێنن.
چەقی گەرمی لە مێشکدا پلەی گەرما لەش دەپارێزێت. کە لە سێ بەش پێك هاتووە.

-چەقی تەحەکوم، کە پلەی گەرما خوێن ڕێك دەخات.
-چەقی گەرمکردن، پلەی گەرمای خوێن بەرز دەکاتەوە کاتێك دادەبەزێت.
-چەقی ساردکردنەوە، لاشە سار دەکاتەوە، کاتێك پلەی گەرمای بەرز دەبێتەوە.

کاتێك تێکچون لە چەقی گەرمای مێشکدا دروست دەبێت، لاشە دەست بە موچرکە دەکات. کە دەبێتە هۆی تا لێهاتن. بەلاّم کاتێك تێکچون لە چەقی گەرمکردندا دروست دەبێت تەنها دەبێتە هۆی موچرکە. بەلاّم تێکچون لە چەقی ساردکردنەوەدا، دەبێتە هۆی تا لێهاتن.
بەردەوام لاشە گەرما بۆ دەوروبەری خۆی دەنێرێت، بۆیە کاتێك دەنوین یان لەسەر شتێك دادەنیشین دەبینین دوای ئەوە گەرم بووە.

## ئەسکەندەری گەورە

دوای چەندین سەدە، هێشتا ئەسکەندەری گەورە یەکێکە لە مەزنترین پیاوانی مێژوو. ئەم سەربازە بەجەرگە پێش لە دوو هەزار ساڵ لە (بابل) ی عێراقدا مردوە، لە تەمەنی سی و یەك ساڵیدا.

ئیمپراتۆریەتەکەی لە یونانەوە بۆ هند بووە. بەلام دوای مردنی پارچە پارچە کرا. لەو ماوە کەمەی ژیانیدا دەڵێن (٧٠) شاری دروست کردوە، کە تا ئێستا هەر ماون.

باسێك هەیە دەڵێن : ئەسپی ((بوسیفالۆس)) کە ئەسپێکی دڕ بوە، کەس نەیتوانیوە سواری ببێت، بەلام ئەسکەندەر لە چواردەساڵیدا توانیویەتی دەستە مۆی بکات و زاڵ بێتە سەریا و لە هەموو جەنگەکانیدا سواری ببێت. تا لە شەرێکدا لە هند دەکوژرێت و شارێك بەناوی ئەو ئەسپە ئازایەوە دروست دەکات!

((فیلیپ)) ی باوکی ئەسکەندەر لە ساڵی ٣٥٩ پێش زاین دەبێتە پادشای مەقدۆنیا و سوپایەکی تایبەت دروست دەکات پلانی گرتنی ئیمپراتۆریەتی مەزنی فارس دادەنێت. بەلام لە ساڵی ٣٣٦ پێش زایندا لە کۆشکەکەی خۆیدا دەکوژرێت. ئەسکەندەر لە تەمەنی بیست ساڵیدا لە شوێنی باوکی دەبێتە پادشای مەقدۆنیا.

ئەسکەندەر لە باوکیەوە فێری جەنگ بوە و ئەرستۆی فەیلەسوفی گەورەش مامۆستای بووە.

دوای مردنی باوکی شۆڕشێکی گەورە لە ولاتەکەیدا بەرپا بوو. بەلام ئەسکەندەر لە ماوەیەکی کەمدا، ئاسایش و یاسای گەڕاندەوە بۆ ولاتەکەی و لە دەورووبەری ساڵی ٣٣٤ پێش زاین دا، بە دوو هێرش ولاتی فارسی داگیر کرد و دوای ئەوە هێرشی بردە سەر مسر و داگیری کرد و شارێکی تیادا دروست کرد بە ناوی ((ئەسکەندەریە)).

کاتێك ئەسکەندەر ئاسیای ناوەڕاستی داگیر کرد، گالیسکەکەی ((گۆدیس)) ی پادشای کۆنی بینی و پێیان ووت ئەفسانەیەك هەیە کە دەڵێت: هەر کەسێك بتوانێت ئەو گرێیەی کە ئەم گالیسکەیەی پێ بەستراوە بکاتەوە. ئەوا فەرمان ڕەوای نیوەی جیهان دەکات. ئەسکەندەریش بەیەك شمشێر گرێکەی پچڕاند. لەو کاتەدا پادشای مەقدۆنیا و یونان و مسر و فارس و ئاسیا بوو. کە نیوەی جیهانی ئەو ڕۆژەی دەکرد.

شەش ساڵی دوای ئەوەش، سوپاکەی خەریکی پێشڕەوی بون بۆ گرتنی

ئەفغانستان و هند و سەمەرقند و گاشقەند. دوای داگیرکردنی ئاسیا، دەستی دایە ژیانی ڕابواردن و شازادەیەکی دەوڵەمەند و جوانی بە ناوی ((ڕۆکسانا)) کردە هاوسەری خۆی.

دوا جەنگی لەگەڵ ((بوروس)) ی پادشای هند دا بوو سەرکەوت و ئەسکەندەر هیوای وابو بگاتە ڕوباری ((غان)). بەڵام سەربازەکانی کە گەیشتنە سەر ڕوباری ((پیاس)) بڕیاریان دا لەوە زیاتر پێشڕەوی نەکەن.

چونکە زیاد لە هەشت ساڵ بوو ماڵ و منداڵی خۆیانیان نەدیبوو. هەرچەندە ئەسکەندەر هەوڵی دا قەناعەتیان پێ بکات، بەڵام گوێیان لێ نەگەرت و گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان. لە گەڕانەوە دا ئەسکەندەر توشی نەخۆشیەکی کوشندەبوو لە ساڵی ٣٢٣ پێش زایندا مرد.

## خێرایی دەنگ

هەر کە دەنگێك دروست دەبێت، دەبێت شتێك لە شوێنێکدا بلەرێتەوە. بۆ پێشەوە یان بۆ پاشەوە. کەواتە دەنگ بەشتێك دەست پێ دەکات کە بلەرێتەوە. بەڵام دەبێت بە ناوی شتێکدا تێ بپەڕێت. چونکە پێویستی بە شتێك هەیە، لە سەرچاوەکەیەوە بیگوێزێتەوە بۆ گوێگر ئەو شتەش پێ ی دەوترێت ((گوێزەرەوە)).

دەشێت گوێزەرەوەکە هەر شتێك بێت، هەوا، ئاو، تەنەکان، تەنانەت زەوی.

هندیەکان وا فێربوبون گوێیان دەخستە سەر زەوی بۆ بیستنی دەنگێکی دوور ئەگەر گوێزەرەوە نەبێت ئەوا دەنگ نابێت. ئەگەر شوێنێکی بۆشایی یان بەتاڵ لە هەوا و هەرچی مادەیەکی تردا هەبوو، ئەوا دەنگەکە ناتوانێت بەناوێدا تێپەڕێت.

هۆکەشی ئەوەیە دەنگ بە شەپۆل دەگوێزرێتەوە. ئەو تەنانەی کە دەلەرێنەوە وا دەکەن لە گەردیلەکان ی دەوروبەریان بلەرێنەوە. هەر گەردیلەیەکیش هەڵدەستێت بە گواستنەوەی ئەو جوڵەیە بۆ گەردیلەکەی تەنیشتی، ئەنجامەکەشی شەپۆلی دەنگی دروست دەکەن.

ئەو گوێزەرەوانەی کە دەنگەکان بەناویاندا دەچن دەشێت دار یان هەوا یان ئاو بن. کەواتە دەنگەکان خێراییان بە پێ ی ئەو مادانەی بە ناویاندا دەچن دەگۆڕێت.

بۆیە کاتێك کە لە خێرایی دەنگ دەپرسین. دەبێت بپرسین : گوێزەرەوەکەی چیە؟ خێرایی دەنگ لە هەوادا نزیکەی ٣٣٥ مەترە لە چرکەیەکدا. واتە ٧٥٠ میل لە کاتژمێرێکدا. بەلاّم ئەمە کاتێك دەبێت کە پلەی گەرما سفری سەدی بێت. هەر چەندە پلەی گەرما بەرزتر بێتەوە خێرایی دەنگەکە زیاتر دەبێت.

دەنگ لە ئاودا خێراترە وەك لە هەوادا. کاتێك پلەی گەرمای ئاو (٨) پلەی سەدی بێت ئەوا خێرایی دەنکەکە نزیکەی ١٤٣٥ مەتر دەبێت لە چرکەیەکدا. یان ٣٢١٠ میل لە کاتژمێرێکدا.

بەلاّم لە پۆلاّدا خێرایی دەنگەکە (٥٠٠٠) مەتر دەبێت لە چرکەیەکدا یان (١١١٦٠) میل دەبێت لە یەك کاتژمێرێکدا.

لەوانەیە بیرت بۆ ئەوە بچێت کە دەنگی بەرز، لە دەنگی نزم خێراتر بگات، ئەم بۆچونە بەهیچ جۆرێك ڕاست نیە، چونکە خێرایی دەنگ پەیوەندی بە بەرزی و نزمیەوە هەیە و هەروەها ئەو مادەیە کە دەنگەکە بە ناویدا دەڕوات.

ئەگەر دەتەوێت لەگەلّ دەنگدا خۆت تاقی کەیتەوە، لە هەوادا دووربەرد لە یەك بدە و پاشان بچۆرە بن ئاوێکەوە و هەمان دوور بەرد لەیەك بدە. بزانە چۆن بۆت دەردەکەوێت کە دەنگەکە خێراتر دەبێتە لە بن ئاوەکەدا.

## بۆچی خۆرگیران و مانگ گیران بەدەگمەن ڕودەدەن؟

کاتێك مانگ بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە، بە نێوان زەوی و خۆردا تێ دەپەڕێت و سێبەرەکەی دەکەوێتە سەر زەوی و خۆرگیران دروست دەبێت.

خۆرگیران کاتێك دروست دەبێت کە مانگ تازەیە و دەکەوێتە ئەو لایەی زەویەوە کە بەرامبەر بە خۆرە.

کەواتە بۆچی هەموو جارێك کە مانگ تازەیە خۆرگیران دروست نابێت؟

لەبەر ئەوەی ڕێڕەوی مانگ بە دەوری زەویدا، بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ ناکەوێتە سەر ئەو هێڵەی لەگەلّ خولگەی زەویدایە و بەدەوری خۆردایە. لەو گەشتەیدا بە دەوری زەویدا کە ٢٩ ڕۆژ دەخایەنێت، هەندێك جار مانگ بەسەر ڕێڕەوی زەویدا دەڕوات هەندێك جاریش بەسەر ئەو ڕێڕەوەکەدا.

دەشێت خۆرگیران گشتی بێت یان ئەلّقەیی بێت یان بەشێکی بێت، ئەگەر مانگ بە

تەواوی خۆری شاردەوە ئەوا گیرانەکەی گشتی دەبێت بەڵام هەموو جارێك مانگ هەمان دوریی نیە لە زەویەوە. زۆربەی جارەکان مانگ زۆر دورە لە زەویەوە بۆیە ناتوانێت بە شێوەیەکی تەواو خۆر داپۆشێت.

کاتێك مانگ گیران ڕوو دەدات، مانگ لە شێوەی پەپکەیەکی تاریکدا دەبینین کە هەموو خۆری داپۆشیوە جگە لە هەڵقەیەکی باریك نەبێت لە لێوارەکەیدا. ئەم بازنە ناسکە لە تیشك پێ ی دەوترێت ((هەڵقە)) و مانگ گیرانەکەش هەڵقەیی دەبێت.

مانگ گیرانەکەش بەشی دەبێت ئەگەر بەشێك لە پەپکەی مانگەکە، بکەوێتە نێوانی خۆر و زەویەوە.

کاتێکیش مانگ دەکەوێتە پشتی زەویەوە وردە وردە بە سێبەرێکی قوچەکی گەورەدا تێدەپەڕێت، کە هۆیەکی زەویە و مانگ لەبەر چاو ون دەبێت و بەو جۆرە مانگ گیران دروست دەبێت. ئەمجۆرە مانگ گیرانەش دروست نابێت ئەگەر مانگ پڕ نەبێت، مانگ گیرانی بەشیش کاتێك دروست دەبێت کە بەشێکی مانگ دەچێتە ژێر ئەو سێبەرەوە.

هەندێك ساڵ مانگ گیران هەر ڕونادات، هەندێك ساڵیش لە سێ جار بۆ پێنج جار ڕوو دەدات. لەبەرامبەر ئەوەدا ساڵانە کەمتر لە دوجار خۆرگیران ڕونادات هەندێك جار دەگاتە پێنج جاریش.

ناتوانرێت لە یەکلای زەویەوە بە تەواوەتی خۆرگیران ببینرێت جگە لە یەکجار نەبێت لە ٣٦٠ ساڵدا.

## ئەستێرەی بەخت چی یە؟

ئایا شەوێك لە شەوان سەیرێکی ئەستێرەکانی ئاسمانت کردوە و لەو هەموو چوارگۆشە و پیت و شێوانە ورد بیتەوە؟

لەسەردەمی کۆندا خەڵکی ئەمەیان کردوە و هەر کۆمەڵە ئەستێرەیەك و ناوێکیان لێ ناوە و بەو کۆمەڵە ئەستێرەیە وتراوە ((بورج)).

ئەو بورجانەی ئەمڕۆ بەکار دەهێنرێن لە سەردەمی ڕۆمانیەکانەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە و بگرە لە سەردەمی یونانیەکانیشەوە. بابلیەکان ناوی هەندێك لە ئەستێرەکانیان بە ناوی ئاژەڵان و هەندێکی تریشیان بەناوی پادشا و پاڵەوانی

ئەفسانەکانیانەوە ناوناوە. پاشان بابلیەکان ناوی پاڵەوانەکانیان نا بە بورجەکانیانەوە وەکو هیرکولیس و ئوریون (فەریك) و فرساوس. ڕۆمانیەکانیش هەندێك ناویان گۆڕی.

تا ئێستاش هەر ناوە کۆنەکان بۆ بورج بەکار دەهێنرێت، ناسینی بورجەکان لە ئاسماندا شتێکی ئاسان نیە چونکە بورجەکان بەو جۆرە دیار نین کە پێ ی دەناسرێن.

ساڵی ۱۵۰ پێش زاین زانای ئەستێرەناسی بەناوبانگ ((بگلیموس)) لیستێکی بە ٤٨ بورج کە دەیانی ناسی دانا. ئەو لیستە هەموو ئاسمانی نەگرتبووەوە، بۆیە ئەستێرەناسانی دوای ئەو بورجی تریان بۆ لیستەکەی بگلیموس زیاد کرد.

ئەو بورجانەی ئاسمان کەرەستەی زانستیان هەڵگرتبوو وەکو ئەستێرەی شەشەم و قیبلەنما و وردبین.

ئەستێرەناسان ئەمڕۆ ۸۸ بورج لە ئاسماندا دەناسن.

بورج بریتی یە لە ناوچەیەك لە ئاسماندا. ئەمەش مانای وایە هەموو ئەستێرەیەك دەکەوێتە بورجێکی دیاری کراوەوە. وەکو چۆن شارێك دەکەوێتە وڵاتێکەوە. بەڵام سنوری بورجەکان ڕێك نیە و زۆربەیان هێڵی خوار و خێچین.

ئەستێرەناسان لە ساڵی ۱۹۲۸ دا بڕیاریان دا هێڵەکان دیاری بکەن و هێڵە خوارەکانیش ڕاست بکەنەوە!

## کۆنترین هێڵی ئاسن لە ژێر زەویدا

ئەمڕۆ لە سەرانسەری دونیادا هێڵی ئاسنی زۆر گەورە هەیە. کە ڕۆژانە بە بەردەوامی شەمەندەفەر بەسەریدا دەڕوات و ڕۆژانە ڕێژەیەکی زۆر کەل و پەل و خەڵکی لە شوێنێکەو بو شوێنێکی تر دەگوێزنەوە. هەروەها زۆر لە وڵاتانی دونیا ئەمڕۆ هێڵی ئاسنیان لە ژێر زەویدا هەیە.

ئایا دەزانن کۆنترین هێڵی ئاسنی ژێر زەوی لە دونیادا کامە بووە؟

یەکەمین هێڵی ئاسنی ژێر زەوی لە جیهاندا لە لندەندا دروست کرا. دوای نەخشەکێشان بە تەنیشتی جادەکاندا خەنەقێکی گەورە هەڵکەنرا و هێڵە ئاسنەکانی تیادا دانرا، دوای ئەوە جارێکی تر سەری گیرایەوە. بۆ ئەوەی جادەی

لەسەر دروست بکرێت و تونێلی هێڵی ئاسنیشی لە ژێریدا بێت. ئەم شێوازەش لە هەڵکەندنی تونێلدا پێ ی وتر ((هەڵکەندن و داپۆشین)).

درێژی ئەم میترۆیەی لەندەن کە چوار میل بوو. لە ویستگەی بادینگتۆنەوە دەستی پێدەکرد بۆ جادی فرینگدۆن لە شاری لەندەن و لە ڕۆژی ١٠ کانونی دوەمی ساڵی ١٨٦٣ دا کرایەوە. ئەو شەمەنەفەرانەش لەو هێڵەدا بون بە هەڵم ئیشیان دەکرد و ئەو دوکەڵەش لێیانەوە دەردەچوو لەناو تونێلەکەدا دەمایەوە. ئەمەش وای کرد ڕۆیشتن پێیدا زۆر ناخۆش بێت. ڕۆژانە نزیکەی سی هەزار کەسێك بەم تونێلەدا گوزەریان دەکرد. لەبەر ئەوەی ئەم تونێلە کۆنترین هێڵی ئاسنی ژێر زەوی بو لە هەموو جیهاندا. بۆیە بو بە مایەی ورووژاندنی زۆر لە شتەکان.

دوای ماوەیەك بەشی تازەترەلەم میترۆیەدا کرانەوە. لە ساڵی ١٨٩٠ دا میترۆیەکی قوڵتریان لە لەندەندا هەڵکەند بۆ ئەو شەمەندەفەرانەی بە کارەبا ئیشیان دەکرد. بەلأم ئەم شەمەنەفەرانە پەنجەرەیان نەبوو. چونکە بەپێویست نەزانرا پەنجەرەی بۆ دروست کەن لەبەر ئەوەی بە ناو تونێلدا دەڕۆیشت. قوڵترین خاڵی ئەم میترۆیە کە ٦٧,٨ مەتر بوو لە نزیکی هاستدەوە بوو. تا ساڵی ١٩٧٩ نزیکەی ٥٠٠ شەمەنەفەر لەم هێلەدا ئیشیان دەکرد و ساڵانە نزیکەی ٥٩٤٠٠٠٠٠٠ کەسیان دەگواستەوە.

درێژترین ماوە لە نێوان ئەو دوو ویستگەیەدا لەسەر ئەو هێڵە لە ((ئیبنیگ)) ەوە تا ((رویز لیب)) ە ٥٤,٨ کیلۆمەترە.

ولأتانی تریش هێڵی ئاسنیان هەیە لە ژێر زەویدا. میترۆی شاری پاریس لە ساڵی ١٩٠٠ دا کراوەتەوە. یەکەمین میترۆش لە ولأتە یەکگرتوەکانی ئەمریکدا لە شاری بوسطن لە نێوان ساڵانی ١٨٩٥ و ١٨٩٧ دا کرایەوە.

شاری نیۆیۆرکیش یەکەمین میترۆی لە ساڵی ١٩٠٤ دا کردەوە کە گەورەترین میترۆیە لە جیهاندا. مۆسکۆش یەکەمین میترۆی لە سیەکانی سەدەی بیستەمدا دروست کرد. لە کەنەداشادا تۆرنتۆ یەکەمین میترۆی خۆی لە ساڵی ١٩٥٤ دا کردەوە. بەلأم تۆکیۆی یابان لە ساڵی ١٩٢٧ دا بوو. شاری کەلکەتای هندیش

ساڵی ١٩٨٥ یەکەمین میترۆی خۆی هەڵکەند بە درێژی ١٦ کیلۆمەتر.

کرداری میترۆ دروست کردن کارێکی زۆر سەخت و گرانە، بە تەنیشتی شەقامە گشتیەکاندا هەڵدەکنرێت، بریتی یە لە خەنەقێکی قوڵ کە هێڵە ئاسنەکەی تێدەخرێت. دیوارەکەشی لە خشت دروست دەکرێت و سەرەکەشی بە پۆڵایەکی زۆر بەهێز دادەپۆشرێت. بە جۆرێك کە شەمەنەفەرەکان بە ژێریدا و ئوتۆمبیلەکان بە سەریدا برۆن.

## ئایا مار بە مۆسیقا سەما دەکات؟

زۆر کەس هندیەکانی بینیوە لە بەردەم مارێکدا دەوەستن و مۆسیقا دەژەنن. کاتێك هندیەك لە ئامێرەکەی دەژەنێت. ماری کۆپرا سەری بەرز دەکاتەوە و لەگەڵ ئاوازەکەدا سەری دەجولێنێتەوە.

حیکایەتی زۆر هەیە لەسەر مار کە حەزیان لە مۆسیقایە. هەندێك لەو کەسانەی مۆسیقا بۆ مار لێدەدەن دەڵێن: دەتوانن بە مۆسیقا مار لە کون بێننە دەرەوە ئایا بە ڕاستی مار بە مۆسیقا سەما دەکات؟

مار وەکو مرۆڤ و مەمکدارەکانی تر نیە، سیستەمی بیستنی هەبێت. بەڵام ئێسکێکی لاکێشەیی تایبەت لە لەشیدا هەیە یارمەتی دەدات بۆ دۆزینەوەی لەرینەوەکانی زەوی. بەڵام ناتوانێت لەرینەوەکانی کەش (جۆ) بدۆزێتەوە. هەر بەهۆی ئەو ئێسکەوەیە مار دەتوانێت، گوێەك بە لایدا خل ببێتەوە بیدۆزێتەوە.

چەندین تاقیکردنەوە و لێکۆڵینەوە کراوە لەسەر ئەو لەرینەوانەی، کە مار دەتوانێت لە سەر زەوی و کەشدا بیدۆزێتەوە. ئەو تاقیکردنەوانەش دەریان خستوە کە کۆپرا سەری بۆ ئەو لەرینەوانە بەرز دەکاتەوە کە لەسەر زەوی دروست دەبن، بەڵام بۆ لەرینەوەکانی کەش ناجوڵێتەوە.

ئەم تاقیکردنەوەیە لەسەر پێنج جۆر مار کرا. جگە لە جۆری کۆپرا، ئەنجامەکانی هەموو یەکبوون، جگە لە ماری کۆپرا نەبێت کە دەنگی تەپڵەکانی وەردەگرت. بە لەرینەوەکانی سەر زەوی ئەو سندوقانەی کە مارەکانی تێدابوو.

بە کورتی دەتوانین بڵێن : مار زۆر هەستیارە بۆ ئەو دەنگانەی کە لەرینەوە لە سەر زەوی دروست دەکەن. لەبەر ئەو هۆیەیە ژەنیاران بۆ ماری کۆپرا ئامێرەکانیان بە

ڕوی زەویدا دەژەنن، تا لەرینەوەکان بگاتە مارەکان. هەروەها بە ئامێرەکانیان دەدەن لە مارەکان بۆ ئەوەی بیان وروژێنن و بە ئاراستەی ئامێرەکاندا سەمایان پێ بکەن.

## بۆچی لە پایزدا ڕەنگی دارەکان دەگۆڕێن؟

لە سەر بنەمای گەڵاوەرین لە وەرزی پایزدا، دەتوانین ڕوەکەکان بکەینەوە دوو گروپەوە. گروپی یەکەم ئەو ڕوەك و دارانە دەگرێتەوە کە هەموو ساڵێك گەڵایان دەوەرێت. گروپی دوەمیش ئەو ڕوەکو دارە هەمیشە سەوزانەن کە زۆر بە شێنەیی لە ماوەی ساڵێکدا گەڵاکانیان دەوەرێت.

گەڵای گروپی دوەمی هەمیشە سەوزانەش، هەمان شت دەوەرێت بەڵام بە ڕێژەیەکی کەم لەبەر ئەوە گۆڕانی ڕەنگەکەی زۆر کەم و نەبینراوە.

دارانیش هەموو ساڵێك لەگەڵ نزیك بونەوەی وەرزی پایزدا پشوی خۆیان دەست پێ دەکەن، لەو ماوەیەدا گەڵاکان وردە وردە دەگۆڕێن بۆ ڕەنگی زەرد و دوای ئەوە دەوەرن. لە پاشی ئەوە ئەو دارە دەچێتە پشویەکی تەواوەوە تا وەرزی بەهار دێت.

دیمەنی ڕوەك و دارە بێ گەڵاکان غەمباری و دڵتەنگی دەخەنە دڵی مرۆڤەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر بە سودە بۆ خودی ڕوەکەکان. لەبەر ئەوە دوای ئەو پشوە ژیانێك و دیمەنێکی تازەی بەبەردا دەکرێتەوە.

تەفسیری ئەم گۆڕانکاریەی گەڵای داران لە وەرزی پایزدا زۆر ئاسانە. ڕوەکەکانیش وەکو دەزانین گیانداری ئەندامین. بۆ ئەوەی بمێننەوە پێویستیان بە خۆراك هەیە. لەو مەوادە ئەندامیانەش خۆراکی دەست دەکەوێت کە گەڵاکان بۆی دابینی دەکەن. دارانیش وەکو ئاژەڵان پاشماوەیان هەیە و دەبێت ئەوانیش پاشماوەکانیان فڕێ بدەن. بەڵام ڕوەکەکان بە ڕێگەیەکی جیاوازتر لەو پاشماوانە ڕزگاریان دەبێت. دەبێت ئەو پاشماوانە لە ڕیشاڵەکانی خۆیاندا بهێڵنەوە تا وەرزی پایز. کاتی هاتنی وەرینی گەڵاکان هەرچی مەوادی بە سود هەیە. دارەکە هەموو دەمژێت و ئەمجا گەڵاکان دەوەرن و پاشماوەکان لەگەڵ خۆیاندا دەوەرێنن.

ئەم پاشماوانەن وادەکەن زەرد و قاوەیی و سور ببنەوە. کاتێك گەڵاکان دەوەرن لە

شوێن خۆیان لە سەر دارەکان گۆپکەیەکی بچوك وەکو دەرزی بەجێ دەهێڵن کە دەتوانرێت لە وەرزی زستاندا ببینرێت. بەو جۆرە وەرزی پایز وەرزی رزگاربونی ڕوەکەکانە لە پاشماوەکانیان.

## جاڵجاڵۆکەی چۆلەکە خۆر!

بە شێوەیەکی گشتی جاڵجاڵۆکەکان ئەو مێروانە دەخۆن کە دەیانخەنە تۆڕەکانیانەوە. نامۆیە ئەگەر بڵێین هەندێك جاڵجاڵۆکە هەن دەتوانن چۆلەکە بخۆن. بەلاّم هەندێك جاڵجاڵۆکەی لەش گەورە هەن کە دەتوانن جاڵجاڵوکە بخۆن و پێیان دەوترێت جاڵجاڵوکە چۆلەکە خۆرەکان.

درێژی ئەم جاڵجاڵۆکەیە ((٩ سم)) و ئەگەر هەر دوو قاچی بکاتەوە ((٢٥ سم)) نێوانیان دەبێت. سەرە ڕای چۆلەکە دەتوانێت گیانلەبەرانی بچوکی تریش بخوات. بەلاّم مەترسی نیە بۆ سەر گیانی مرۆڤ، هەرچەندە پێوەدانی ئازارێکی زۆر دروست دەکات.

لە جیهاندا نزیکەی ٣٠ هەزار جۆر جاڵجاڵوکە هەیە. بەلاّم مرۆڤ تا ئێستا توانیویەتی ٢٠ هەزار جۆری بناسێت. هەندێك لەو جاڵجاڵۆکانە بە تەواوی ئازاری مرۆڤ دەدەن وەکو جاڵجاڵۆکەی قاوەیی و بێوەژنی ڕەش و بێوەژنی قاوەیی و جاڵجاڵوکەی گورگی. ئەمەی دواییان زۆر مەترسی دارە و دەشێت پێوەدانی مردنی لێ بکەوێتەوە.

جاڵجاڵۆکەی چۆلەکە خۆر تۆڕی خۆی لەسەر داران دروستی دەکات و هەندێکیشیان چاڵێك بە قوڵی دوو پێ لە ژێر زەویدا هەڵدەکەنن و بە تۆڕ دایدەپۆشن، ئەگەر هەر نێچیرێك کەوتە داویەوە ئیتر رزگار بونی نیە. لەگەڵ کەوتنی چۆلەکەیەك تێ ی، جاڵجاڵوکە کە شلەیەکی ژەهراوی دەرژێنێت سەریدا، کە دەیکوژێت و دوای ئەوە بە ئاسودەیی دەیخوات.

## کێ یەکەمین مێزی دروست کرد؟

ئایا دەتوانن ماڵێك بێننە پێش چاوی خۆتان مێزی تێدا نەبێت؟

مێز بۆ زۆر مەبەست بەکار دێت، بۆ خواردن، نوسین، یاری لەسەر کردن و هتد.

بەمەڕا بۆمان دەردەکەوێت کە مێز لە سەرەتای شارستانیەتەوە هەبوە. سۆمەریەکان کە خاوەنی یەکەمین شارستانیەتن کە مێژوی مرۆڤایەتی نوسیبێتی مێزی بچوکیان لە دار و کانزا دروست کردوە.

بابلی و ئاشوریەکانیش بیرۆکەی مێزیان لە سۆمەریەکانەوە وەرگرتووە. میسریە کۆنەکانیش مێزی بچوك و نزمی زۆر جوانیان دروست کردووە.

ئەغریقیەکانیش زۆر شتیان لە شارستانیەتی مسرەوە وەرگرت و هەموو جۆرەکانی ناومالْ، لەوانە مێزیان پەرە پێدا.

ئەغریقیەکان بون مێزیان لە مەڕمەڕ و کانزا دروست کرد و نەخش و نیگاریان تێدا بەکار هێنا.

دوای ئەغریقیەکان ڕۆمانیەکان پیشەسازی ناومالْیان بۆ ئاستێکی بەرز تر پەرە پێدا. هەر بە دروست کردنی مێزەوە نەوەستان کە بە کانزا و دار دروست دەکرا بەلْکو بە نەخش و نیگار لە عاج و کانزای بە نرخ دەیان نەخشاند.

قاچەکانیشی لە شێوەی قیپارە یان گیانلەبەردا هەلْدەکۆلْی.

ڕۆمانیەکان لەسەر مێز دانەدەنیشتن بەلْکو پالْیان پێوە دەدا، لەبەر ئەوە مێزەکانیان نزم بوو.

شایانی باسە تەنها دەولْەمەندەکان توانیویانە مێزیان هەبێت.

کە چاخی ناوەڕاستدا بوو شێوازە جۆرا و جۆرەکانی مێز دروست کران، وەکو بازنەیی و هێلکەیی و لاکێشەیی. کە بریتی بون لە تابلۆیەکی قاچ دار یان قاچەکانی دەنوشتێنرایەوە و بە سفرەیەك دادەپۆشرا بۆ ئەوەی قاچەکانی بشارێتەوە. دوای نان خواردنیش لادەبرا تا شوێنەکە فراوانتر بێتەوە.

## بالْندەکان چۆن دەگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان؟

لە ناموٚترین دیاردەکانی سروشت توانای هەندێك لە گیانلەبەرانە بۆ زانینی ڕێگەکەیان لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ شوێنەکانی خۆیان. تەنانەت هەندێك جار لە شوێنێکی زۆر دوریشەوە. تەنها بالْندەکان نین دەتوانن ئەو بکەن، هەروەها ماسیەکانی ((سەلمۆن)) و ((ئەنقلەسیس)) و هەنگیش دەتوانن بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان.

تاقیکردنەوەی زۆر کراوە لەسەر باڵندەکان، بۆ زانینی ئەوەی چی ڕابەرایەتیان دەکات لە ڕێگەی گەڕانەوەیاندا بۆ وولاّتی خۆیان.

لە تاقیکردنەوەیەکدا حەوت باڵندە لە جۆری پەرەسێلکە گوێزرانەوە بۆ دووری چوارسەد میل، کاتێك بەرەلاّکران پێنجیان گەڕانەوە بۆ هێلانەکانی خۆیان. لە تاقیکردنەوەیەکی تردا جۆرێك لە باڵندەی دەریا بە فرۆکە، لە هێلانەکەیەوە کە لە لێوارەکانی وێلزی بەریتانیادا بوو، گوێزرایەوە بۆ شاری بوندوقیە لە ئیتالیا.

کاتێك بەرەلاّ کرا بە هێڵکی ڕاستدا کە (٩٣٠) کیلۆمەتر دوور بوو گەڕایەوە بۆ هێلانەکەی خۆی. باڵندە ڕەوکەرەکان نموونەیەکی ترن کە سەر سوڕمان دروست دەکەن.

پەرەسێلکەکان هەموو ساڵێك لە بەریتانیاوە کۆچ دەکەن بۆ باشوری ئەفریقیا و کاتێك لە ساڵی ئایندەدا، دەگەڕێنەوە بۆ بەریتانیا، دەگەڕێنەوە بۆ هەمان ماڵ کە ساڵی پێشوو لیّ ی بوونە. ئەو ڕێگایەش کە دەیبڕن لە گەڕانەوەدا شەش هەزار میلە!

ئایا دەزانن هەندێك لە جۆرەکانی پەپولەش ڕەو دەکەن؟ لە گەڕانەوەشیاندا بۆ شوێنی خۆیان چۆن ڕێگەکە دەدۆزنەوە. لە ناوچە ئیستیوائیەکاندا مرۆڤ دەتوانێت پۆلی گەورە گەورە لەو پەپولانە ببینێت کە هەموویان بە یەك ئاراستە دا و بە هێڵێکی ڕاستدا دەڕۆن. کە لە ولاّتی خۆیانەوە هەزاران میل دوورە.

تا ئێستا نازانرێت چۆن ئەو دروست کراوانەی خوا. لە گەڕانەوەیاندا بۆ شوێنی خۆیان ڕێگەکەیان دەدۆزنەوە. سەرەڕای ئەوەی هەوڵی زۆر دراوە بۆ زانینی، بەلاّم هێشتا بیّ وەلاّم ماوەتەوە. لەگەڵ ئەوەدا زۆر لە باڵندەکان لە ڕەوکردنیاندا بەسەر ڕووبەرێکی زۆر گەورە لە ئاودا دەچن. بەلاّم ناتوانین ئەمەش بکەینە تەفسیرێك کە باڵندەکان ڕابەرایەتی خۆیان بە نیشانەیەکی دیاری کراو دەکەن.

ئەوانەش کە دەڵێن بەهرە ڕابەرایەتی باڵندەکان دەکات ئەویش هەر تەفسیرێکی تەواو نیە.

ئەو هێما و نیشانانەی کە باڵندەکان ڕیّ پیشاندەری خۆیان پێدەکەن لە فرینیاندا تا ئێستا بۆ مرۆڤ نهێنیەکە!

## پەلکە زێڕینە چی یە؟

پەلکە زێڕینە جوانترینی دیمەنی سروشتە. هەر لە کۆنەوە مرۆڤ حەزی لە بینی نی کردوە و زۆریش پرسیاری لە بارەوە کردووە. تەنانەت ئەرستۆی گەورە فەیلەسوفی یونانی، هەوڵی داوە تەفسیری پەلکە زێڕینە بکات و بڕوای وا بوو شکانەوەی تیشکی خۆرە بە هۆی بارانەوە، بەلاّم هەڵە بوو.

تیشکی خۆر تیشکێکی سپی ئاسایە و تێکەڵەیەکە لە هەموو ڕەنگەکان. دەبینین کاتێك تیشك دەدات لە تلۆقەی سابونێك یان لێواری ئاوێنەیەکی خوار، ڕەنگە سپیەکە دەگۆڕێت بۆ زۆر ڕەنگ و ڕەنگەکانی سور و پرتەقاڵی و سەوز و شین و وەنەوشەیی بەدەردەکەون.

ئەو شتەش کە دەتوانێت بەو ڕێگەیە ئەو ڕەنگانە بشکێنێتەوە پیّ ی دەڵێن پوازك ((منشور)). ڕەنگەکانیش لە شێوەی شریتێك یان هێڵێکدا لێیەوە دەردەچن پیّ ی دەڵێین ((شەبەنگ)).

تا بارانێکی نەرم نەبارێت پەلکە زێڕینە بەدیار ناکەوێت. کاتێك باران دەبارێت و لە هەمان کاتیشدا خۆر دەدرەوشێتەوە. پەلکە زێڕینە دەکەوێتە ناوەراستیانەوە. دەبێت خۆر لە پشتەوە بێت و بارانیش لە پێشەوە. ئەگەر وا نەبێت پەلکە زێڕینە بەدەر ناکەوێت. خۆر لە پشتەوە دەدرەوشێتەوە و دەچێتە ناو دڵۆپەکانی بارانەکەوە و دەبێتە هۆی شکاندنەوەی تیشکەکە بۆ شەبەنگ یان شریتێك لە ڕەنگەکان، بەلاّم دەبێت خۆر و چاو و چەقی پەلکە زێڕینە لە یەك هێڵی ڕاستدا بن. بەلاّم ئەگەر خۆر لە ئاسماندا بەرز بوو. ئەوا هەرگیز ناتوانین هێڵێکی ڕاستی لەو جۆرە دروستی بکەین. لەبەر ئەوەیە لە بەیانی زوو دوای نیوەڕۆدا نەبێت ناتوانین پەلکە زێڕینە ببینین.

پەلکە زێڕینەی بەیانیان واتە خۆر لە ڕۆژهەلاّتەوە هەڵدێت و بارانی نەرمیش لە ڕۆژ ئاواوە دەبارێت. بەلاّم پەلکە زێڕینەی دوای نیوەڕوان واتە خۆر لە ڕۆژئاواوە دەدرەوشێتەوە و بارانیش لە ڕۆژهەلاّتەوە دەبارێت.

ئیماندارانی کۆن باوەڕیان وابوە، پەلکە زێڕینە هێمایە بۆ بەختێکی خراپ و دەیانگوت گیانەکان لەسەر پردی پەلکە زێڕینەوە دەچن بۆ ئاسمان و

هەرکاتێکیش پەلکە زێڕینە دەرکەوت ئەوە دەگەیەنێت کە کەسێک دەمرێت!.

## ئایا ئاژەڵان پێدەکەنن... یان دەگرین؟

ئەگەر گیانلەبەرێکیماڵیتان هەبێت بۆ نموونە پشیلەیەك یان سەگێك، بە تێپەڕ بونی ڕۆژگار لەگەڵیدا ڕادێن وا دەزانن ئەویش نزیکی مرۆڤی کردوتەوە. باوەڕ وا دەبەن کە دەتوانێت تەعبیر لە هەستەکانی بکات، وەکو چۆن مرۆڤ تەعبیر لە هەستەکانی خۆی دەکات، وەکو پێکەنین و گریان. بەڵام ئەوە شتێکی ڕاست نیە.

چونکە پێکەنین و گریان دوور ڕێگەی مرۆییە بۆ تەعبیر کردن لە هەست، هیچ گیاندارێکی تر نایزانێت. ئێمە دەزانین هەندێك ئاژەڵ دەتوانێت بوەڕێت و بنزرێنێت کاتێك ئازاری پێ دەگات. بەڵام گریان بە واتای فرمێسك لە چاوی بێت لەگەڵ ئەو هەستەدا، ئەمە هەرگیز لەئاژەڵاندا ڕونادات.

ئەمەش مانای ئەوە نیە کە فرمێسك لە چاوی ئاژەڵاندا نیە. بەڵام تەنها بۆ تەڕکردنەوەی بیلبیلەی چاوی بەکاری دەهێنێت. هەر گیانلەبەرێك بۆ ئەوەی بگریت دەبێت گیانلەبەرێکی هەستیار بێت و بیر بکاتەوە و هەست بکات. تەنانەت منداڵانیش دوای بیر کردنەوە و هەست کردن دەگرن، ئەگینا منداڵی کۆرپە گریانەکەی تەنها هاوارکردنە.

گریان بەدیلی قسە کردنە، کاتێك ناتوانین هەستی خۆمان بە قسەکردن دەربڕین، ناچار دەگرین، کەواتە گریان کاردانەوەیەکی پێچەوانەیە، بێ ئەوەی دەسەلاتمانی بەسەردا بێت ڕوو دەدات و یارمەتی ئازاد کردنی ئەو شتەمان دەکات کە هەستی پێ دەکەین. پێکەنینیش هەروەها دیاردەیەکی مرۆییە، هەندێك دیمەن لە ئاژەڵاندا ئەوە پیشان دەدات کە پێدەکەنن. بەڵام نەك وەك پێکەنینی مرۆڤ. هۆیەکەشی ئەویە کە مرۆڤ هەمیشە لەبەر هۆیەك پێدەکەنێت. ئەمەش مانای وایە کارەکە پەیوەندی بە کردارێکی عەقڵی یان هەستێکەوە هەیە. ئاژەڵانیش ئەو هەست و کردارە عەقڵیەیان نیە.

بۆ نموونە: کاتێك بە نوکتەیەك یان دیمەنێکی پێکەنیناوی پێدەکەنین عەقڵ و هەستمان وامان لێدەکات پێبکەنین.

لە ڕاستیدا پێکەنین جۆری زۆرە و هەروەها هۆیەکانیشی زۆرن.

ئێمە زۆر جار بۆ گاڵتەجاڕی پێدەکەنین (بە پیاوێکی کەتە کە چەترێکی بچوکی هەڵگرتووە) یان بۆ ڕابواردن یان بۆ گەپ لە کاتی وتنی نوکتەیەکدا. هەندێك جاریش بۆ شکاندنەوەی بەرامبەر.

زانایانی دەرون ناسی لایان وایە پێکەنین دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە. ئێمە پێدەکەنین کاتێك کۆمەڵێك کەس پێکەوەین و پێویست دەکات بە شتێك پێ بکەنین.

شایانی باسە ئاژەڵان بۆ هیچ یەکێك لەو هۆیانەی باسمان کرد ناتوانن پێ بکەنن.

## کێ پولی پۆستەی داهێنا؟

سەرەتای پولی پۆستە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی کۆن کە تیایدا نامەکان بەهۆی کۆمەڵێك ئەسپ سوارەوە لە ویستگەیەکەوە دەگەیەنرایە ویستگەیەکی تر و ئەوانیش لێیان وەردەگرن و دەیانگەیاندە ویستگەیەکی تر.

وشەی ((پول)) لەو سەرچاوەوە وەرگیراوە کە نامەکانی پێ مۆر کراوە. چونکە لەسەر نامەکان خاڵێکیان لە مۆم دادەنا و پێش وشك بونەوەی مۆرێکی هەڵکەنراویان لێ دەدا کە بریتی بو لە ئیمزا یان دیاری کردنی پێناسی نامەنوس.

پیاوێکی ئینگلیزی بەناوی ((روڵاند هیل)) یەکەم کەس بوو بیرۆکەی بەکارهێنانی پولی پۆستەی هێنایە کایەوە لە سیەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا.

هیل وتی: بەکارهێنانی پول خزمەت گوزاری پۆستە زیاتر دەکات و بەوەش حکومەت دەسکەوتێکی باشی دەبێت لە دەسکەوتنی دەخل دا. هەروەها پێشنیاری ئەوەشی کرد نرخی نامە ناردن زیاد بکرێ.

پێش هیل بڕی تێچونی نامە ناردن لەسەر دوو شت دەوەستا: یەکەم ژمارەی لاپەڕەکان دووەمیش دوری ڕێگەکە. هەرچەندە ڕێگەکە دورتر بوایە نرخی لاپەڕەکان گرانتر دەبوو. بەڵام هیل پێشنیاری ئەوەی کرد هەموو نامەکان بۆ شوێنی دور یان نزیك بچن یەك نرخیان هەبێت، نرخی نامە ناردن تەنها پشت بە کێشەکەی ببەستێت. بێ گوێدانە ئەو ماوەیەی کە دەیبڕێت.

بەریتانیا یەکەم وڵات بوو لە ساڵی ١٨٤٠ دا یەکەم پولی پۆستەی بەکار هێنا. بیرۆکەکە زۆر بە خێرایی بڵاو بوەوە و زیوریخ و جنیڤ کە دوو کانتۆنی سویسری

بوون دوای ئەوە پولی پۆستەیان چاپ کرد و بلاو کردەوە.
بەلام لە نیوەی ڕۆژئاوای گۆی زەویدا یەکەم ولات پولی پۆستەی بەکار هێنا بەرازیل بووە ئەویش لە سالی ١٨٤٣، ئەمجا ولاتە یەکگرتوەکانی لە سالی ١٨٤٧ دا. بەلام هەندێك کۆمپانیای کەرتی تایبەت هەبون لە ئەمریکادا کە سەر بە دەولەت نەبون لە سالی ١٨٤٢ وە پولی تایبەت بە خۆیانیان هەبوو، کە لە خزمەتی ناردنی نامەکاندا بەکاریان دەهێنا.

## کێ کاغەزی یاری ی داهێنا؟

لە بەریتانیادا لەهەر دەمالدا نۆمالیان یاری کاغەزیان هەیە. لە هەردە خێزانیشدا هەشت خێزان یاری کاغەز دەکەن.
لە راستیدا کاغەزی یاری هەر لە کۆنەوە مرۆڤ زانیویەتی و وێنە و نوسینی لەسەر کردوە. مێژوی بۆ هێندە زوو دەگەڕێتەوە بە شێوەیەك کە ناتوانین بزانین کەی و لە کوێدا پەیدا بووە.
بۆ ماوەیەکی زۆر باوەڕ وابوو چینیەکان یاری کاغەزیان داهێنابێت، چونکە سەردەمێك بو دراوی کاغەز و کاغەزی یاری هاوچەشن بون.
ئێمە دەزانین کاغەزی یاری پێش هەزار سال لە چیندا هەبووە! بەلام دلنیا نین چینیەکان یان مسریە کۆنەکان یان عەرەبەکان یان هندۆسەکان کاغەزی یاریان داهێنابێت. بەکارهێنانی کاغەزی یاری بۆ زانینی بەخت لەگەل سەرەتای خودی کاغەزی یاریدا بووە. ڕەنگە ئەگەری ئەوە هەبێت کە کاغەزی یاری بۆ مەبەستی بەخت گرتنەوە بەکار هێنرابێت پێش بەکارهێنانی لە یاری قوماردا. جادو و بازەکانیش بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست لە خوێندنەوەی بەختدا بەکاریان هێناوە.
کەی کاغەزی یاری چوە ئورووپاوە؟
هەندێك کەس بڕوایان وایە چینیەکان بردبێتیانە ئورووپاوە و هەندێکی تریش دەلێن عەرەبەکان بردویانەتە ئسپانیاو پاشان ئیتالیاوە. یان قەرەجەکان بردویانەتە ئورووپای ڕۆژهەلاتەوە. بەهەر حال لەسەدەی سیانزەهەمدا کاغەزی یاری لە ئورووپادا ناسراو بووە.

له بنەرەتدا دەستەکانی کاغەزی یاری جۆری زۆرە. دەستەی وای هەیە کاغەزەکانی ژمارەی لەسەر نیە و تەنها وێنەی لەسەرە ژمارەی هەر دەستەیەکی لەو جۆرە ٢٢ دانەیە، جۆرێکی تری ژمارەی لەسەرە و ژمارەی هەر دەستەیەکی ٦٥ دانەیە. فەرەنسیەکان یەکەم کەس بون، دەستەیەك کاغەزیان داهێنا کە بریتی بوو لە ٥٢ دانە، ئەوەی ئەمڕۆ بەکار دەهێنرێت لە یاریدا، ئینگلیزەکانیش پێشوازیان لەم شێوەکاغەزی فەرەنسیەکان کرد و لە یاریەکانیاندا بەکاریان هێنا.
کاغەزەکان لە سەرەتادا بە دەستی ڕەنگ دەکران بەڵام دوای ئەوەی هۆیەکانی چاپ و پەخش و هونەری هەڵکۆڵین پەرەی سەند و بڵاو بوەوە. نرخی کاغەز دابەزی و زۆر بە خێرایی بەناوی خەڵکدا بڵاو بوەوە.

## ئازار ((ئێش)) چی یە؟

ئایا حەزتان کردوە ڕۆژێك لە ڕۆژان لاشەتان ئازاری پێ بگات؟ دەبێت خۆتان بە خۆش بەخت بزانن کە هەست بە ئازار دەکەن! ئەگەر هەست بە ئازای دانتان نەکەن و لەکاتی گونجاو دا گرنگی پێ نەدەن. نایپارێزن. ئەگەر هەست بە ئازار نەکەن دەست لە شتێکی گەرم دەدەن و زیانی زۆر مەترسیدار بەخۆتان دەگەیەنن، کەواتە ئازار شتێکی بەسودە و لە زۆر شتی زیانبەخش و مەترسیدار دەمانپارێزێت.
ئایا دەزانن کەسانێك هەن توشی هەندێك نەخوشی دێن. وایان لێدەکات هەست بە هیچ جۆرە ئازارێك نەکەن؟
لەو نەخۆشیانە نەخۆشی ((کلۆربونی ئێسقانە)) کە توشی ((حبل الشوکی)) دەبێت ئەوانەی توشی ئەم نەخۆشیە دەبن دەتوانن شتی زۆر گەرم بە دەستەکانیان هەڵبگرن بێ ئەوەی هەست بە هیچ گەرمیەك بکەن. یان دەتوانن بزمار بچەقێننە دەستیانا بێ ئەوەی هەست بە ئازار بکەن. توشبوان بەم نەخۆشیە زۆر جار زیانی گەورە بە خۆیان دەگەیەنن، بەوەی کە شوێنێکیان دەسوتێت یان بریندار دەبێت هیچ گوێ ی نادەنێ چونکە هەست بە هیچ ئازارێك ناکەن. تا وایان لێ بکات پەلە بکەن لە چارەسەر کردنیدا.
ئەوەی نامۆیە تا ئێستا زانست نەیتوانیوە تەفسیرێکی تەواو لەسەر هەست بە

ئازارکردن پێشکەش بکات. ئەوەی تا ئێستا زانست پێ ی گەیشتوە، هیچ ئەندامێکی تایبەتی لە لەشی مرۆڤدا نیە بۆ پێشوازی یان وەرگرتنی ئازار. بەلاّم وا دەردەکەوێت دەماری تایبەت هەبێت لە لەشدا لە شوێنی هەست بە ئازار کردنەوە دەگوێزێتەوە بۆ بڕبڕەی پشت و پاشان مێشك.

ئەو شوێنانەی لەپێشدا هەست بە ئازار دەکەن پێ ی دەوترێت ((خالّی ئازار)) ئەو خالاّنەش بە یەکسانی لە لەشدا دابەش نەکراوە. چونکە هەندێك شوێن هەیە لە لەشدا هیچ خالّێکی ئازاری تێدا نیە. بەلاّم پێستی دەم چاو نزیکەی سێ ملیۆن خالّی ئازاری تێدایە! جۆرەکانی ئازاریش جیاوازن، وەکو سوتان، زام، گەستن، قرنجان، شکان. زۆر جار مرۆڤ هەست بە ئازارێك دەکات، بەلاّم ڕەنگە ئازارەکە تێکەلّەیەك بێت لە فشار و بەرز بونەوەی پلەی گەرما. بەمەدا دەتوانین بلّێین ئازار تێکەلّەیەکە لە هەستی ناخۆش.

## بیابانی وشك.... بیابان چی یە؟

ناوچەیەکە شێوەیەکی تایبەتی ژیان نەبێت هیچی تری تێدا نیە! هەموو بیابانەکان شێیان زۆر کەمە. بە واتا ئەو ژیانەی تێیدایە دەبێت بتوانێت لەگەلّ نەبونی ئاودا بژێت!

ڕێژەی ئاوی باران تەحەکوم بە بڕ و جۆرەکانی ژیانی ڕوەکەکانەوە دەکات لەهەر ناوچەیەکدا. کە باران زۆربو دراستان دروست دەبێت. کە باران کەم بو ڕوەکە بیابانیەکان شین دەبن. هەرچەندە باران کەمیش بێت ڕوەکە بیابانیەکان هەر دەتوانن بڕوێن.

بیابانە گەرمەکانی نزیکی هێلّی ئیستیوا، وەکو بیابانەکانی ئەفریقیا دەکەونە ناوچەیەکی نیمچە ئیستیوائیەوە. کە هەوا تیایدا زۆر گەرم و وشکە. کەواتە دەبێت زەوی ئەم ناوچانە وشك بێت. هەرچەندە لە زەریاشەوە نزیك بن. ئەم کەشە هەمان شت بەسەر بیابانەکانی باکوری ڕۆژئاوای ئەفریقیا و ڕۆژئاوای ئوستورالیادا جێ بەجێ دەبن.

بیابانە دورەکان لە هێلّی ئیستیواوە. لە ئەنجامی زۆر دوربیانەوە یا شێدارەکەیەوە دروست بوە، چونکە بەربەستە شاخاویەکان بارانەکە لە دیوی

دەریاوە گیر دەدەن و بەو جۆرە ناوچە ناوخۆییەکان بە وشکی دەمێننەوە. ئەم کردارەش پیێ ی دەوترێت کاریگەری ((سێبەری باران)) بیابانەکانی ئاسیای ناوەند دەکەونە ناو سێبەری بارانەوە کە بریتین لە زنجیرە چیاکانی هملایا و بانی تبت. هەمان شت بیابانەکانی حەوزی گەورە لە ڕۆژئاوای ولاّتە یەکگرتوەکاندا دەکەونە ژێر کاریگەری سێبەری بارانەوە.

زنجیرە شاخە بەرزەکان بەرەو ڕۆژ ئاوا –وەکو سیرانیڤدا– لەگەڵ بیابانەکاندا لە دیمەندا جیاوازن.

لە هەر کوێدا لم هەبو ئەوا با تەپۆڵکەیەکی لمی دروست دەکات. بەو بیابانانەش دەوترێت بیابانی لمی. بیابانە بەردیەکانیش لە بەردی ڕوت پێك دێن. کە کەندەلاّنێك لە بەرد یان دەشتێکی سەخت و زبرانی دروست دەکەن.

جۆرێکی تر لە بیابان هەیە کە شاخی بەردین و دەشتایی وشك و گڵین و بەرد لە خۆ دەگرێت. کە با هەڵدەکات خۆڵەکە لەگەڵ خۆیدا دەبات و ئەو بەردانەش دەمێننەوە ڕوبەرێك لە زیخەلاّن دروست دەکەن.

لە زۆربەی بیابانەکاندا جۆرێك لە ژیانی ڕووەکی و ئاژەڵی هەیە. ڕوەکە بیابانیەکان بە گشتی گەلاّیان نیە و دڕکاوین و تەنانەت ئاژەلاّنیش نایانخۆن. ئەو ئاژەلاّنەش کە دەتوانن لە بیابانەکاندا بژین، توانایان هەیە بۆ ماوەیەکی درێژ بیێ ئاو بژین و ئاوی ناو ڕوەکەکان و شەونمی شەو بەسیانە بۆ ئەوەی تینویان نەبێت.

## نینۆکەکان

کاتێك ئەندامێکی لەشمان لێدانێکی بەردەکەوێت یان بریندار دەبێت هەست بە ئازارێکی زۆر دەکەین. بەلاّم کاتێك نینۆکمان دەکەین هەست بە هیچ ئازارێك ناکەین، ئەگەر هاتبا نینۆك کردن ئازاری بۆ دروست کردباین. هیچ کەس نینۆکی نەدەکرد و ئێستا هەموو خەڵکی نینۆکیان زۆر درێژ بوو. ئایا دەزانیت بۆچی لە کاتی نینۆك کردندا ئازارمان ناگاتیێ؟

لە کاتی نینۆك کردندا هەست بە ئازار ناکەین، لەبەر ئەوەی نینۆکەکان لە خانەی مردو پێك هاتون. کە جۆرە پرۆتینێکی مردوە پیێ ی دەوترێت ((قارتین)) ڕیشەی

نینۆکەکان لەناو پێستی پەنجەکاندایە. پێستی ژێر نینۆکەکانیش لە بەشەکانی تری لاشە دەچێت. بەلاّم ئەمیان ریشاڵی نەرمی تێدایە.

ئەم ریشاڵانەش پەیوەستن بە نینۆکەکانەوە بۆیە لە دۆخێکی جێگیردا دەیهێلێتەوە لەگەڵ ئەوەی نینۆك ئەستورە بەلاّم ڕیشەکەی لەناو پێستدا زۆر ناسکە. ئەو بەشەشی کە نزیکی ڕیشەکەیەتی ڕەنگی سپیە و نیوچە بازنەیشە.

نینۆك لە یەکساڵدا نزیکەی دوو ئینچ درێژ دەبێت.

نینۆك بۆ لاشە زۆر بەسوودە، دەتوانین شتی پێ هەڵبگرینەوە و ئیشە هونەریەکانی پێ بکەین و هەروەها پارێزگاریش لە پەنجەکانمان دەکات.

سەبارەت بە خانمانیش نینۆك پەیوەنیەکی بەهێزی هەیە لەگەڵ جوانیاندا، بۆیە بە جۆرەها ڕەنگ بۆیاخی دەکەن.

بەلاّم نینۆك زۆر درێژ بو دەشکێت. لە ئەنجامی کەمی هەندێك توخمی خوراکیشدا دەشێت توشی عەیبە بێت بە شکان یان وەرین. یان دەشێت لە ئەنجامی سوتان یان شکاندا زیانێکی هەمیشەیی پێ بگات. هەروەها دەشێت لە ئەنجامی بەفر بردنیشدا نینۆك لەناو بچێت.

هەندێك ئاژەلیش هەن نینۆکیان هەیە، نینۆکەکانی شەمپانزی لە نینۆکی مرۆڤ دەچێت. هەروەها مەیمونیش. شێر و پشیلە و سەگیش لەگەڵ چرنوکەکانیاندا نینۆك هەیە.

مانگا و گا و ئەسپیش جۆرێك نینۆکیان هەیە.

## سیر

لە دێر زەمانەوە مرۆڤ سیر لە ناو چێشتدا بەکار دەهێنێت بۆ ئەوەی تامەکەی خۆش بکات. سیر بۆنێکی ناخۆش و تامێکی تاڵی هەیە.

سەربازانی ڕۆمان باوەڕیان وابوو سیر زیاتر بەهێز و بەجەرگیان دەکات، بۆیە بە ڕێکوپێکی دەیانخوارد.

لە چاخەکانی ناوەراستیشدا سیر بۆ خۆ پاراستن لە پەتا خوراوە. یان بە خۆیاندا هەڵیان واسیوە بۆ ڕاونانی گیانە شەڕانیەکاندا.

پێش چەند ساڵێکی کەم مرۆڤ گرنگی پزیشکی سیری دۆزیەوە. سەلکەکەی کە

((مچادێکی حیوی)) تێدایه پێ ی دەوترێت ((ئۆلیۆم)) که سیفەتی پاککەرەوەی هەیە و یارمەتی ڕزگار بون لە بەڵغەم و کرژبونی گەدە دەدات. هەروەها زۆر کاریگەرە لە ڕێکخستنی فشاری خوێنی بەرزدا. وەکو چارەسەرێکی کاریگەر بۆ نەخۆیەکانی دڵیش بەکار دەهێنرێت.

زۆر کەس دەیهاڕن و دەم و چاوی پێ چەور دەکەن بۆ چارەسەر کردنی، گەستن و شوێن دەمی پەخشە. هەندێکی تر شەرابی لێ دروست دەکەن بۆ چارەسەرکردنی سەرما. خاوەن باخەکانیش سیر بە دەوری دار قۆخەکاندا دەچێنن بۆ ڕاونانی ئەو مێروانەی زیان بەو دارانە دەگەیەنن. لە بنەڕەتدا سیر ڕوەکێکی ئاسیاییە، بەڵام لە ئیتالیا و باشوری فەرەنساشدا دەچێنرێت. توێکڵی سەلکی سیر بیست سەلکۆکەی پێوەیە کە بۆ خواردن دەست بدات. سیر بە چاندن قنجکەکانی زیاد دەکات.

وەکو بەرو بومێکی ساڵانە دەچێنرێت و شێوەی چاندنی زۆر لە چاندنی پیاز دەچێت. سیر (٠,١٪) ڕۆنی بۆنی تێدایە کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە دوەم و سێ یەم گۆگردیدپێك دێت.

## چیا سەرەکیەکانی سەر زەوی

چیا ئەو قەبارە وشکانیەیە کە لە زەویەکانی دەوروبەری بەرزترە و بە بەرزاییانە دەوترێت چیا کە ٣٠٠ مەتر بەرزترن.

هەموو شاخەکان لە ئەنجامی گۆڕانێکی توندوتیژی سەر زەویدا دروست بوونە. شاخەکان زۆربەیان بە شێوەی زنجیرە پێکەوە پەیوەندن.

با بزانین گرنگترین چیاکانی جیهان کامانەن؟

زنجیرە سەرەکیەکانی ئاسیا ئەمانەن : چیاکانی هەمەلایا کە گەورەترین زنجیرە چیایە لە دونیادا و درێژیەکەی نزیکەی ٢٤١٣ کیلۆمەترە و بەرزترین لوتکەشی لوتکەی ((ئەڤەرست)) ە. کە بەرزترین لوتکەی جیهانە و ٨٨٤٨ مەتر بەرزە. واتە ٢٩٠٢٨ پێ. چیاکانی Kar Koram ی هند و دوەم گەورەترین زنجیرە چیاکانی ئاسیایە. بەرزترین لوتکەشی لوتکەی کیادوە کە ٨٦١٠,٧ مەتر بەرزە.

چیاکانی بامیر سێ یەم زنجیرە چیای بەناوبانگە، لە نێوان ٣٣٥٢,٨ مەتر و

٣٩٦٢,٤٥ مەتر دايە.

زنجيرە چيا سەرەكيەكانى ئۆروپاش : ئەلب و قوقازوى Carpathians و بيرانيس و ئۆراڵن. درێژى چياى ئەلب نزيكەى ١١٩٠ كيلۆمەترە و بەرزترين لوتكەشى كە چياى ((Elbrus)) ە ٥٦٣٣ مەتر بەرزە. چياى CarPathians دارستانێكى چڕ دايدەپۆشێت و چياى پيرانيس يش هەريەك لە فەرەنسا و ئسپانيا لەيەك جودا دەكاتەوە. بەرزترين لوتكەشى ((دى ئانيستۆ)) يە كە ٣٤٠٤ مەتر بەرزە. بەڵام زنجيرە چياى ئۆراڵ ٢٤١٣ كيلۆمەتر درێژە و دەكەوێتە نێوان ئاسيا و ئۆروپاوە.

چياكانى ئەفريقيا هەريەكە و بۆ خۆيان سەربەخۆن و لە نێوانياندا پانتاييەكى زۆر فراوان هەيە. زنجيرە چيا سەرەكيەكانى ئەم كيشوەرەش بريتين لە بەرزاييەكانى حەبەشە و ئەتلەس و كليمانجارۆ... بەرزاييەكانى حەبەشە ناوچەيەكى شاخاوى فراوانە و ڕاس و داشان بەرزترين لوتكەى ئەم شاخەن كە ٤٦٢٠,٢ مەتر بەرزە درێژى چياى ئەتڵەس نزيكەى ٢٤١٣ كيلۆمەترە. بەڵام چياى Rawan زنجيرە چيايەكى بچكۆليە و درێژەيەكەى نزيكەى ١٠٤,٥٨٥ كيلۆمەترە و چوار لوتكەى سەرەكى و دارستانى چرى هەيە. چياى كليمانجارۆش بەرزيەكەى ٥٩٦٣ مەترە لە ئەمريكاى باكوردا دوو زنجيرە چياى سەرەكى نەبێت چياى تر نيە. كە ئەوانيش ڕۆكى و ئەبالاشن.

زنجيرە چياى ڕۆكى لە باكورەوە بۆ باشور درێژ دەبێتەوە بە درێژى ٣٥٢٩ كيلۆ مەتر و چياى مانگليش بەرزترين لوتكەيەتى كە ٦١٩٤ مەتر بەرزە. بەڵام زنجيرە چياى ئەبالاش زۆر كۆنە و لوتكەى زۆر بەرزى تيادا نيە و بەرزى چياى ميشل يش كە بەرزترين خاڵيەتى لە ٢٠٣٧ مەتر لە سەر ڕوى دەرياوە تێ ناپەڕێت. چياى ئاندۆزيش تاكە زنجيرە چياى سەرەكيە لە ئەمريكاى باشوردا كە ٧٣٦٩ كيلۆمەترە و Aconcagua بەرزترين لوتكەيەتى كە دەگاتە ٦٩٦٠,١ مەترە. لە دونيادا لە بنى دەرياكانيشدا چيا هەن كە لەسەر ڕوى دەرياكانيشدا بەرز بونەتەوە وەكو چياى مۆناكيا، كە بەرزيەكەى لەسەر ڕوى دەرياو ٤٢٠٥,٥ مەترە و لە بنى دەرياشەوە ٤٨٧٧ مەتر. كە سەرجەم بەرزيەكەى ٩٠٨٢ مەتر دەكات.

بەوەش تەنانەت لە لوتكەی ئەڤەرەست بەرزترە.

## بانكی نێودەوڵەتی

بانكی نێودەوڵەتی بە بانگی جیهانیش دەناسرێت. دەزگایەكی سەر بە نەتەوە یەكگرتوەكانە و بۆ مەبەستی ئاوەدان كردنەوە و گەشەپێدانی ولاَتانی ئەندام تیایدا دروست كراوە.

نەتەوە یەكگرتوەكان ئەم بانكەی لە ٢٧ كانونی دوەمی ساڵی ١٩٤٥ دا، دامەزراند. لەسەرتادا ژمارەی ئەندامەكانی ٢٩ ولاَت بون و لە حوزەیرانی ١٩٤٦ دا بەرەسمی كارەكانی خۆی دەست پیّ كرد. بارەگای لەواشنتۆی پایتەختی ولاَتەیەكگرتوەكانی ئەمریكایە و لە ساڵی ١٩٧٢ دا ژمارەی ئەندامانی گەیشتنە ١١٩ ولاَت. بانكی نێو دەوڵەتی لە لایەن ولاَتانی ئەندامەوە پارەی دەدرێتیّ.

بەشداری كردنی هەر ولاَتێكی ئەندام لە پارەداندا، پشت بە رێژەی سەرمایە ئابوریەكانی دەبەستێت. بەرزترین بەشداربون لە پارەداندا ولاَتە یەكگرتوەكانی ئەمریكایە ئەمجا بەریتانیا –ئەڵمانیا– فەرەنسا– كەنەدا – یابان – هند. بانكی نێو دەوڵەتی بە شێوەیەكی گشتی قەرز بە ئەندامانی دەدات. هەروەها بەو كۆمپانیایانەش كە حكومەتەكانیان كەفالەتیان دەكەن. بۆ ئەو پرۆژانەی كە پەیوەندییان بە ئاوەدانكردنەوە و گەشەپێدان و بازرگانی نێودەوڵەتیەوە هەیە. هەروەها قەرزی درێژ خایەنیش دەدات. رێژەی قازانجیشی پشت بە مەرجەكانی قەرزدان دەبەستێت. كە كاری گەشەپێدان و وزەی كارەبا و رێگاوبان و گەیاندن دەگرێتەوە. سەرە ڕای یارمەتی ئابوری ئەم بانكە یارمەتی هونەریش پێش كەش دەكات.

بانكی نێودەوڵەتی لەلایەن ئەنجومەنێكی پارێزگاران و بەڕیوەبەرە جیّ بە جیّ كارەكان و سەرۆك و دەستەی كرێكارە ئاساییەكانەوە بەڕێوە دەبرێت. ئەنجومەنی پارێزەران ئەنجومەنێكە كە هەر ولاَتێك و پارێزەرێك بە نوێنەری خۆی دەنێرێت و ساڵی جارێك كۆدەبنەوە.

سیاسەتی بانكیش بیست بەڕێوەبەری جیّ بە جێكار، جیّ بە جیّ ی دەكە ن. كە ئیمزا لەسەر هەموو قەرزەكان دەكەن.

## ساڵی تیشکی

نێوانە کورتەکان وەکو درێژی کتێبێك یان فایلێك بە سانتیمەتر یان ئینج دەپێورێت نێوان گەورەتر بە مەتر و بە پێ ی دەپێوێت. نێوان لەوە گەورەتر بە کیلۆمەتر و بە میل دەپێورێت. بەڵام ناتوانین ئەو نێوانانەی ملیاردها یان ترلیۆنها کیلۆمەتر درێژن بەو یەکانە بیان پێون.

چونکە پێویستمان بە پێوەرێکی جیاواز هەیە بۆ پێوانەی ئەو نێوانانە. ساڵی تیشکی لە ڕاستیدا ئەویەکەیە، کە دەتوانین ئەو ماوە زۆر دورەی نێوان گۆی زەوی و ئەستێرەکانی پێ بپێوین.

ساڵی ڕوناکی بەوە پێناسە دەکرێت کە ئەو ماوەیە تیشك لەیەك ساڵدا دەیبڕێت خێرایی تیشك ٣٠٠ هەزار کیلۆمەترە لە چرکەیەکدا.بەو پێ یە تیشك ١٨ ملیۆن کیلۆمەتر لە یەك خولەکدا دەبڕێت. ئەو ماوەیەش پێ ی دەوترێت ((خولەکی تیشکی)) کاتێك دەڵێین تەنێکی ئاسمانی دیاری کراویەك خولەکی تیشکی لێمانەوە دورە، بە سادەیی مانای وایە، ئەو تەنە ئاسمانیە ١٨ ملیۆن کیلۆمەتر لە زەویەوە دوورە، بۆ نمونە:

خۆر لە زەویەوە ماوەی ٨ خولەك و ٢٠ چرکەی تیشکی دوورە، کەواتە دوری خۆر لە زەویەوە یەکسانە بە ١٥٠,٠٠٠,٠٠٠ کیلۆمەتر.

ئەو ماوەیەی کە ڕوناکی لە ساڵێکدا دەیبڕێت ٩,٤٦٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ کیلۆمەترە. بە کورتی دەتوانین بڵێین ئەو ماوەیە ٩,٤٦ ترلیۆن کیلۆمەتر یان ٥,٨٨ ترلیۆن میلە. دەشتوانین بڵێین ٩,٤٦ ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتر یان ٩,٤٦×١٠ کیلۆمەترە. ئەو ماوەیەش بە یەکساڵی تیشکی دەناسرێت.

بەو پێ یە بێت مانگ لە زەویەوە ١,٢٥ خولەکی تیشکی و نزیکترین ئەستێرەش لە زەویەوە کە پێ ی دەڵێین ((زۆڵمانی گەورە)) ٤,٢٥ ساڵی ڕوناکی دورە. مانای وایە ئەگەر بە فرۆکەیەك خێراییەکەی ٣٠٠ هەزار کیلۆمەتر بێت لە چرکەیەکدا ئەوا دەتوانین بە ٤,٢٥ ساڵ بگەینە ئەو ئەستێرە (فرۆکەیەکیش بەو خێراییە هەرگیز دروست ناکرێت).

زۆر ئەستێرە هەیە، گەیشتنی تیشکەکەی بە زەوی هەزاران ساڵ دەخایەنێت.

لەبەر ئەوە زۆر گونجاوە پێوانەی نێوان ئێمە و ئەو ئەستێرانە بە ساڵی تیشکی بکرێت.

## بۆچی ئاگر تەنها بۆ سەرەوە بەرز دەبێتەوە؟

ئەوەی کە تێبینی دەکرێت مۆمێکی داگیرساو یان تەڵەشخارتەیەك یان دارێکی گڕگرتوو، هەمیشە ئاگرەکەیان بۆ سەرەوە بەرز دەبێتەوە.

ئایا هۆیەکەی دەزانن؟

دەتوانین ئەو دیاردەیە بەمجۆرە تێ بگەین:

هەموو مەوادێکی سوتەمەنی، وەکو دار و تەڵە شخارتە و مۆم، کاربۆن و هایدرۆجینی تێدایە. کاتێك ئەم مەوادانە دەسوتێن. کاربۆنەکە لەگەڵ ئۆکسجینەکەدا لە هەوادا یەکدەگرن و دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دروست دەکەن. بە هەمان شێوە هایدرۆجیەکە و ئۆکسجینەکە یەکدەگرن و ئاو دروست دەکەن. لە ئەنجامی ئەم کار لێکانە گازاتی تر دروست دەبن. لە ئەنجامی کرداری سوتان لەو مەوادانەدا گەرمی و تیشك دروست دەبن.

ئاگر لە گازە سوتاوەکان دروست دەبێت. ئەو گازانەش لە ئەنجامی سوتاندا دروست دەبن هەوا سوکترن، بۆیە بۆسەوە بەرز دەبێتەوە. لەبەر ئەو هۆیەشە ئاگر بۆ سەرەوە بەرز دەبێتەوە.

کاتێك فولە ئاگرێك دەکەین، دەبینین دەست بە لەرینەوە دەکات. چونکە کاتێك هەواکە گازە سوتاوەکان دەجوڵێنێتەوە، هەمان شت ئاگرەکەش دەست بە جولأنەوە دەکات. بە بێ جولأنەوەی هەوا ئاگر هەرگیز ناجوڵێتەوە.

ئاگریش دووجۆرە:

ئاگری گردار و ئاگری بێ گڕ. ئەو ئاگرەی لە ئەنجامی سوتانی درا و مۆمدا دروست دەبن گڕدارن. بەلأم ئەو ئاگرەی لە ئەنجامی،سوتانی گازی هایدرۆجین دا دروست دەبێت بێ گڕە.

## جاڵجاڵۆکە

ئەو تۆڕەی جاڵجاڵۆکە دەیچنێت شتێکە جێ ی سەر سوڕمان و ڕامانە، تەنانەت

خودی جاڵجاڵۆکە، لە زۆر ڕووەوە جێ ی سەرسوڕمان و تێڕامانە. زیندەوەرێکی زۆر سەیرە، لە هەموو وەرزێکدا و لە هەموو شوێنێکدا هەیە، لە هەوا، لەناو ئاو، لە وشکانی، لە ژێر زەویدا. قەبارەیان لە خاڵێکی بچوکەوە هەیە تا لاشەیەك کە دەگاتە ٢٠ سەنتیمەتر. جاڵجاڵۆکەی وا هەیە دەتوانێت بۆ ماوەی یەکساڵ بە بێ ئاو بژێت.

جاڵجاڵۆکەیەك هەیە پێ دەوترێت ((جاڵجاڵۆکەی گورگی)) لەسەر باڵندە دەژێت و دەشێت پانزە ساڵ تەمەن بکات. بەڵام زۆربەی جاڵجاڵۆکەکان بە شێوەیەکی گشتی لە یەکسال زیاتر ناژین.

جاڵجاڵۆکە هەشت قاچ و هەشت چاوی هەیە. لاشەشی لە دوو بەش پێك هاتووە، سەر و قەد. ئەو دەزوەی کە جاڵجاڵۆکە دەیتەنێت بۆ دروست کردنی تۆڕەکەی لە لویەکەوە دەردەچێت، شلەیەکە لە شێوەی بەنێکی باریکدا لە کونێکی بچوکەوە لەسەرەوەی سکی. دوای ئەوە هەوا لێیدەدا شلەکە یەکسەر ڕەق دەبێت. ئەو دەزوانە جۆریان زۆرە، هەندێکیان لینجن، هەندێکی تریان تەڕن.

دەزوی لینج یارمەتی جاڵجاڵوکەکە دەدات بۆ گرتنی نێچیرەکەی. کاتێك مشكێك یان مێرویەکی بچکۆلانە دەکەوێتە سەر تۆڕەکە ئیتر ناتوانێت ڕزگاری ببێت. بەڵام بۆچی جاڵجاڵوکە خۆی ناکەوێتە ناوی تۆڕەکەیەوە؟

لەبەر ئەوە جاڵجاڵۆکە ناکەوێتە داوی تۆڕی خۆیەوە، چونکە جۆرێك چەوری لەسەر قاچەکانیەتی، یارمەتی ئەوەی دەدات بە ئاسانی جموجوڵی خۆی بکات. جاڵجاڵۆکەکان جۆرەها شێوەی تۆڕ دروست دەکەن، بازنەیی، ڕەوڕەوەیی و چەندین جۆری تریش.

## چۆن تەمەنی دارێك دەزانرێت؟

ڕوەکەکان بە پێی ئەو تەمەنەی کە دەیکەن دەکرێنە سێ گروپەوە:

- تەمەن درێژەکان.
- تەمەن یەکساڵەکان.
- گروپێکیش کە دوو ساڵ دەژین.

ڕوەکە یەکساڵەکان ئەو ڕوەکانەن لە ماوەی یەکساڵدا شین دەبن و گەشە دەکەن و

بەردەدەن و دەمرن وەكو گەنم و جۆ و نۆك و نيسك و تەماتە و پاقلە.

ڕوەكە تەمەن دو ساڵەكان ئەوانەن كە ساڵی یەكەم گەڵا دەكەن و لە ساڵی دوەم دا گەشە دەكەن و بەردەدەن و ئەمجار دەمرن. وەكو حەیزەران و گوڵە هێر و كەلەخێزانی تۆڵەكەیە و (قمعیە) (جۆرەگیایەكە، گوڵەكەی لە ڕەحەتی دەچێت).

ئەو ڕوەكانەش كە دو ساڵ زیاتر دەژین پێیان دەوترێت دار. ئەوانەن كە ساڵانە بەر دەدەن وەكو داری زەیتون و داری میوە.

هەندێك دار هەن زیاتر لە ٤٠٠٠ ساڵ تەمەن دەكەن وەكو داری ((جبارە)) (درەختێكە لە كۆمەڵەی سنەوبەر، بەڵام گەورەترە و نزیكەی سەد مەتر بەرز دەبێت و لە ناوچەی شاخ و بەردەڵانیدا دەڕوێت). ئەم جۆرە دارەش لە كالیفۆرنیای ئەمریكادا زۆرە. داری ((تاكسوس)) كە درەختێكی هەمیشە سەوزە ٣٠٠٠ ساڵ تەمەن دەكات. داری شابەڕوش (كستناو) ٢٠٠٠ ساڵ تەمەن دەكات. بەڵام دار بەڕو تەنها ١٥٠٠ ساڵ تەمەن دەكات.

لێرەدا پرسیار دێتە گۆڕێ چۆن دەتوانین بزانین تەمەنی دارێك چەندە؟

زانایان شێوەیەكی زۆر سادەیان بۆ زانینی ئەو وەڵامەدا هێناوە. ئەویش بە زانینی ژمارەی گرێكانە لەسەر قەدی دارێك. ئەگەر دارێكمان دولەت كرد، زۆرێك لە گرێ ی لەسەر دەبینین. ئەو گرێیانە تۆماری تەمەنی دارەكەن. هەر چەندە دار بەتەمەنتر بێت قەدی ژێر توێكڵەكەی ئەستورتر دەبێت.

ئەو دارانەی لە زستان و پایزدا گەشە دەكەن، چڕ تر و ڕەقترن لەو دارانەی لەبەهار و هاویندا گەشە دەكەن. كە دەبێتە هۆی دروست بونی گرێ لەسەر قەدەكە هەموو ساڵێك.

بەمجۆرە ئەو ئەڵقانەی لەسەر قەدی دارەكەن پێمان دەڵێن تەمەنی دارەكە چەندە.

## ئایا ڕوەكی ژەهراوی هەیە؟

پێش نزیكەی ٢٥٠٠ ساڵ فەیلەسوفێكی مەزن هەبوو لە ئەسینای یونان‌دا بە ناوی ((سوكرات)). گەنجانی فێر دەكرد كە بە شێوەیەكی دروست بژین. بۆیە فەرمان ڕەوایانی یونان لە شێوەی فێركردنی ڕازی نەبون و لێ ی توڕە بون و حوكمی مردنیان بەسەردادا. بە خواردنەوەی پەرداخێك شەرابی شوكران. دوای

خواردنەوەی کوپە شەرابەکە لاشەی سارد بووەوە و مرد.

## ئایا دەزانن شوکران چی یە؟

ژەهرێکە لە ڕوەکێك دەردەهێنرێت بە ناوی شوکران، ڕوەکێکی گوڵ سپیە بۆنێکی ناخۆش دەردەکات. لە ناوچە شێدارەکاندا دەڕوێت. ژەهرەکەی تەنها لە ڕەگ و تۆوەکەیدایە. ئەم ژەهرە دەبێتە هۆی پەك خستنی هەموو ئەندامانی لاشە، لە هەردوو قاچەوە تا دڵ، هەر دوای خواردنەوەشی یەکسەر کەسەکە دەمرێت.

ڕوەکی تری ژەهراوی هەن. لەوانە ((گوێزی ڕشانەوە)) Nεx-vomica ڕوەکێکە لە وڵاتانی ئاسیا دەڕوێت و، بەرەکەی لە پرتەقاڵ دەچێت و لەهەر بەرێکدا پێنج تۆو هەیە. مادی ((سترکتین)) کە ژەهرەکەیەتی لەو ناوکانە دەردەهێنرێت. کە دەبێتە هۆی هەناسەسواری و وەستانی دڵ و مردن. بەڵام ئەو ژەهرەی پێ ی دەوترێت ((سۆرنجان)) لە ڕوەکێك دەردەهێنرێت هەمان ناوی هەڵگرتووە. لەبەر ئەوەی کاریگەرییەکی خێرای نیە بۆسەر پزیشکان بۆیەلە چارەسەرکردنی نەخۆشی جومگەژاندا بەکاری دەهێنن. نەك تەنها ئەمانە زۆر ڕوەکی تری ژەهراوی هەن لە سەرانسەری جیهاندا.

## میوەی شیرین و... میوەی مزر

هەندێك میوە وەکو کاڵەك، ترێ، سێو، شوتی، هەنجیر و هیتریش تامیان شیرینە. هەروەها میوەی ترش و مزریش هەن وەکو لیمۆ و پورتەقال و هەنار. هەر میوەك و تامێکی تایبەت بە خۆی هەیە. پرسیار لێرەدا ئەوەیە: بۆچی هەر میوە یەك و تامێکی تایبەت بە خۆی هەیە؟

تامی هەر موەیەك لەسەر ئەو توخمانە دەوەستێت کە لێ ی پێك دێت. میوە بەشێوەیەکی گشتی شەکر و ترشی دیاری کراو و فیتامینات و نیشاستە و پرۆتینات و سیلیلۆزی تێدایە. ئەم هەموو مەوادانە. بە تێکەڵی لە میوەدان. بەڵام، هەر یەکە و بە ڕێژەی جیاوازی خۆی.

کاتێك ڕێژەی فرکتۆز ((شەکر و هەنگوینی میوە)) لە میوەدا زیاتر بێت تامی میوەکە شیرین دەبێت. بەڵام ئەو میوەیەی ڕێەی مزری زیاتر بێت تامی مزر

دەبێت. پورتەقاڵ میوەیەکە مەوادی فرکتۆز و مزری تیادا یەکسانە، لەبەر ئەوە تامی هەم مزر و هەم شیرینە لە هەمان کاتدا.

بە شێوەیەکی گشتی میوە نەگەیشتوەکان مزریان زیاتر تێدایە. بەلاّم کە پێ ی دەگەن ڕێژەی مزری وردە وردە تیایاندا کەم دەبێتەوە و ڕێژەی شەکر تایاندا زیاد دەکات لەبەر ئەوە قەیسیەکی نەگیو ترشە، بەلاّم کە پێ دەگات شیرین دەبێت.

مۆزی نەگەیو نیشاستەی زۆرە بەلاّم کە پێ دەگات دەگۆڕێت بۆ فرکتۆز ((شەکر و هەنگوین)) لە ماوەی گەیندا گۆڕانکاری کیمیاوی لەناو میوەکەدا ڕوو دەدات. کە دەبێتە هۆی زیاد بونی ڕێژەی شەکر و شیرین بونی میوەکە.

دەبینین لە یەك کاتدا جیاوازی هەیە لە نێوان دوو میوەدا لە هەمان جۆر بۆ نموونە دوو سێویان دوو پرتەقاڵ یان دوو هەنار تامیان لەیەك ناچێت.

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بونی جۆری زۆر لەیەك میوە، ئەمجاش جۆری خۆڵ و کەش و هەواو ئاو و شێوازی چاندن و ئاسمان کاریگەری تەواوی خۆیان هەیە لەسەر میوە.

هەر هەموو ئەوانەی ناومان بردن کاریگەری خۆیانیان هەیە لەسەر ڕێژەی توخمەکان لەناو هەر میوەیەکدا. کە دەبێتە هۆی جیاوازی تامەکانیان.

میوە ترشەکان نمونەی ((لیمۆ ترش)) دوای گەیشتنیش هەر شیرین نابێت لەبەر ئەوەی ڕێژەیەکی زۆر مزری تێدایە.

## توتی چۆن قسە دەکات؟

کاتێك دەڵێین توتی هەندێك لە باڵندەکانی تر دەتوانن ((قسە بکەن)) مەبەستمان ئەوەیە دەتوانن لاسایی ئەو قسانە بکەنەوە کە مرۆڤ دەیکات.

باڵندەکان بە مەبەستی دەربڕینی هەست و بیریان دەست خستنی شتێکدا ئەو وشانە بەکار ناهێنن. ڕەنگە تەنها لەبەر ئەوە بێت چێژ لەو دەنگ دەرکردنە وەر بگرن. زۆر لە باڵندەکان لاسایی ئەو دەنگە جۆراوجۆرانە دەکەنەوە کە دەیبیسن هەندێکیشیان دەتوانن لاسایی گۆرانیەکانی باڵندەکانی تر بکەنەوە.

هەندێکی تریشیان دەتوانن تەنها لاسایی دەنگێکی تایبەتی مرۆڤ بکەنەوە. وەکو دەنگە مۆسیقیەکان. بەلاّم ئەو باڵندانەی کەسەر بەسێ خێزانن دەتوانن لاسایی

قسەی مرۆڤ بکەنەوە ئەوانیش ((توتی و قەلەڕەش و ڕیشۆڵەن)). ئامێرە دەنگیەکانی ئەو باڵندانەی کە قسە دەکەن. جیاوازە لە ئامێرە دەنگیەکانی مرۆڤ لە شوێن تواناداو. باڵندەکان ژێ ی دەنگییان نیە.

زۆربەی ئەو باڵندانەی دەتوانن قسە بکەن ناتوانن بخوێنن، لەگەڵ ئەوەدا زۆربەیان دەتوانن بجریوێنن. ئەو باڵندانەی کە قسە دەکەن وەکو توتی، دەبێت هەر لە منداڵیەوە لەسەر قسەکردن ڕایان بێنیت.

توتیەکان و باڵندە قسەکەرەکانی تر بە ئاسانی فێری قسەی مرۆڤ نابن. دەبێت قسەکانیان، چەندین جار و زۆر لەسەر خۆ لەسەریان دوبارە کەیتەوە.

کاتێکیش فێری ڕستەیەك یان قسەیەك دەبن هەرگیز لەبیریان ناچێتەوە. ئەو وشانەی کە دەیلێن بە دەگمەن مانای هەیە. تەنها دەنگێکە و هیچی تر.

زانایەك هەوڵی دا وشەکان لە هەستەوە نزیك بکاتەوە. بەلاّم سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، چونکە نەیاندەتوانی لە کاتی برسی بوندا بڵێن ((خواردن)) و کاتێك تینویان بو بڵێن ((ئاو)).

بەلاّم وڕر لە توتیەکان فێربون بڵێن ((بەیانیت باش)). لە کاتێکی دیاری کراوی ڕۆژدا. لەبەر ئەوە ئەو وشانەی کە ئەو باڵندانە دەیلێن لە دەنگێك زیاتر هیچی تر نین.

## بیبەری شیرین چی یە؟

بیبەر کە لە بەهاراندا بەکار دەهێنرێت، لە ڕوەکی بیبەر دروست دەکرێت. ناوە زانستیەکەشی ((Pipernigrum)) ە. بەلاّم چەند جۆری تری بیبەرمان لە گروپە جۆراوجۆرەکانی تری ڕوەکدا دەست دەکەوێت.

بۆ نمونە بیبەری سور (گەرم) مان هەیە کە سەر بە گروپێکە لە جنسی capsicum. جۆرێکی ترمان هەیە پێ دەوترێت ((طبسك)) کە بیبەرێکی پایزەیە جۆرێکی تر لە بیبەری سور هەیە لە شێوەی ((جام)) دایە. کاتێك تۆو دەگرێت. ڕەنگەکەی سور دەبێت و تون دەبێت. بەلاّم لە بیبەرەکانی تر کەمتر تون دەبێت. لەبەر ئەو هۆیەیە دەشێت ئەو جۆرە بیبەرە، لە جۆرەکانی تری بیبەر ئاسانتر بەکار بهێنرێت.

بیبەر گرنگترین بەهاراتە لە جیهاندا، زۆرترین بەکارهێنانیشی هەیە لە خۆراکدا.
لە سەردەمە کۆنەکاندا تەنها دەوڵەمەندەکان توانیویانە بیبەر بەکار بێنن. لەبەر ئەوەی گواستنەوەی بیبەر بەهۆی کاروانیەوە بوە لە ڕۆژهەلاتی دورەوە. بۆیە ئەوە وای کردوە نرخەکەی زۆر گران بێت بە جۆرێك لە یۆنەکاندا بیبەریان بۆ پادشایان ناردووە!
لە هەندێك ڕووەوە بیبەر وەکو زێڕ وابووە. تەنانەت دەوڵەت لە جیاتی باج لە خەڵکی وەرگرتووە. هەروەها خەڵکی وەکو سەرانە داویانەتە فەرمان ڕەواکانیان.
کاتێك سوپایەك هێرشی بردۆتە سەر دوژمن و داگیری کردوە. بیبەر گرنگترین دەسکەوت بووە. کە بەسەر سەربازاندا دابەش کراوە.
پورتوگالیەکان زۆر حەزیان دەکرد، ڕێگەیەکیان دەست کەوێت بەهۆیە بیبەریان بە پارەیەکی کەمتر دەست کەوتایە. ئەوەش وای لێکردن ڕێگەی دەریایی بەرەو هند بگرنە بەر. کاتێك ڕێگەی ((رأس الرجاء الصالح)) یان دۆزیەوە نرخی بیبەر بەرەو ئوروپا زۆر دابەزی، ئەمڕۆ بیبەر خوراندنێکی زۆر هەرزانە و هەموو کەسێك دەتوانێت بە ئاسانی دەستی بکەوێت و بیکڕێت.
بیبەر لەبەری یان تۆوی دارە هەڵزناوەکانە. بیبەری ڕەش لە بەری داری نەگەیوو دەکرێتەوە و، وشك دەکرێتەوە تا ڕەش دەبێتەوە. بیبەری سپیش بەلابردنی توێکڵەکەی دەرەوەی و هاڕینی دەستمان دەکەوێت.

## ئایا هەنگ دوای پێوەدان دەمرێت؟

مرۆڤی ئاسایی وا دەزانێت مرۆڤ دوژمنی سروشتیەتی. بەلانی کەمەو کاتێك توشی هەنگێك دەبێت، یەکەم شت بیری لێدەکاتەوە، وا دەزانێت پێوەی دەدات.
هەزاران جۆر لە هەنگ هەن، کە زۆربەیان نادەنە مرۆڤەوە. تەنیا شتێك کە دەتوانین بیڵێین ئەوەیە هەموو جۆرەکانی هەنگ سودبەخشن بۆ مرۆڤ.
هۆکەشی ئەوەیە هەموو جۆرەکانی هەنگ، لە ماوەی گەریانیاندا بە ناو گوڵەکاندا هەلاڵە بلاو دەکەنەوە. هەنگ زۆر یارمەتی گەشەسەندنی بەر و بوم دەدات بۆ مرۆڤ. لە راستیدا پەنجا جۆر بەروبومی کشت و کاڵی هەیە، پشت بە تەلقیحی هەنگ دەبەستێت!

هەنگ وەك هەریەك لە مێروەكانی ترشەش پێ ی هەیە و لەشیشی دەكرێتە سێ بەشەوە. سەر و سنگ (بەشی ناوەراست) و سك. لەسەری هەنگدا دوو هەوایی و كۆمەڵێك دوچاوی گەورە و سێ تاكە چاو هەیە. لەگەڵ دوو كەلاوەدا بۆ گەستن و زمانێكدا بۆ مژین و بەلەسە بوون.

سنگیشی لەسەر سێ جوت قاچ و دوو جوت باڵ وەستاوە. هەموو جۆرەكانی هەنگ قاچەكانیان بۆ كۆكردنەوەی هەلآلەكان بەكاردێنن، هەندێكیشیان قاچەكانیان سەللەی پێوەیە بۆ هەڵگرتنی هەلآلەكان!

زۆربەی هەنگە مێ یەكانیش لە نێوان هەردوو دیواری سكیاندا دەرزیەك هەیە. پێوەدانی هەنگ زۆر بۆژۆیە (مزعجە) بەلأم بە دەگمەن مەترسیدارە. واباوە كە هەنگ دوای پێوەدان دەمرێت بەلأم ئەمە شتێكی ڕاست نیە.

زۆربەی هەنگەكان چزەكانیان چەندین جار بۆ پێوەدان بەكار دێنن. كارگەرە كانیش دەرزیەكانیان دڕكاویە بۆیە دوای پێوەدان لە ناو پێستی مرۆڤدا دەمێنێتەوە!

## بطریق لە كوێدا دەژیت؟

بطریق جۆرێكی نامۆیە لە پەلەوەرەكان. لە كەشە زۆر ساردەكاندا دەژێت. دیارترین ڕاستی لەسەر ئەم پەلەوەرە ئەوەیە، دەتوانێت ڕاست وەكو مرۆڤ بوەستێت.

هەندێك كەس ڕایان وایە ئەم پەلەوەرە لە هەمو شوێنە ساردەكاندا هەیە، بەلأم ئەمە شتێكی راست نیە. لە نیوەی باشوری گۆی زەویدا نەبێت لە هیچ شوێنێكی تردا ناژێت. واتە كیشوەری جەمسەری باشور و دورگەكانی نزیكی و كەنارەكانی باشوری ئەفریقیا و ئوستراليا و نیوزیلەندا و ئەمریكای باشور. بگریق پشتی ڕەش و سكی سپیە بەلأم جۆرەكانی لەسەر و لاشەدا لەیەك جیاوازن. درێژیەكەیان لە نێوان ٤٠ بۆ ١٢٠ سەنتیمەترە، دوەمیان درێژ ترینیانە و پێ ی دەوترێت ئیمپراتۆر.

بطریق ناتوانێت باڵ بگرێتەوە لەبەر ئەوەی هەردوو باڵی وەكو باڵی ماسی وایە. بەلأم لە مەلەوانیدا پسپۆرە. ڕێكردنیشی زۆر نامۆیە. زانایان پێیان وایە لە

سەرەتادا وەکو باڵندەکانی تر فڕیوە، بەڵام بە تێپەڕ بونی ڕۆژگار باڵەکانی کورت بونەتەوە و. بەو هۆیەوەیە لە ناوچە دورە دەستەکاندا دەژێت چونکە هیچ دوژمنێکی تێدا نیە تا هێرش بکاتە سەریان. بگریق لەسەر وشکانی و لەناو ئاودا بە کۆمەڵ دەژێن و ماسی و قرژاڵ و ڕوبیان و گیانلەبەرە وردەکانی تری ئاوی خۆراکی سەرەکیانە. زۆربە کاتیان لە ئاوە بەستوەکاندا مەلەوانی دەکەن یان بە شوێن خۆراکدا دەگەڕێن.

باشە بگریق چۆن دەتوانێت لە کەش و هەوایەکی هێندە سارددا بژێت؟ بگریق بە پشت بەستن بەو پەڕە زۆرەی کە لەشی داپۆشیوە دەتوانێت لە کەش و هەوای زۆر سارددا هەڵ بکات. هەروەها ئەو پەڕەی لە تەڕبونی ئاویش دەیپارێزێت. لاشەشی بۆشایی هەوایی زۆر وردی تێدایە کە لەشی بەگەرمی دەهێڵێتەوە.

لە ژێر ئەم ڕوپۆشە چڕە پەڕ چینێکی جیاکەرەوە لە چەوری هەیە. کە دیسان یارمەتی لەشی دەدات بە گەرمی بمێنێتەوە. لە هەمان کاتدا خۆراك و ئاویشی پێ پەسیسە دەکات.

مێینەی بطریق هێلکەیەك یان دوو هێلکە دادەنێت، نێر و مێیەکە بە نۆرە لەسەری دادەنیشن، لە ماوەی کڕکەوتندا مێینە هیچ ناخوات. بێچوەکانیشیان لە ڕێگەی کردنە دەمەوە تێر دەکرێن.

## سیر سیرەك بۆچی لە شەودا دەسیرێنن؟

سیرسیرەکی شەو شوێنێکی هەیە لە دڵی مرۆڤدا. لە زۆر وڵاتاندا ئەفسانە لەسەر سیرسیرەکی شەو دروست کراوە. بۆ نمونە ووتویانە ئەگەر یەك دانەش لە ماڵا لەگەڵ مرۆڤدا بژێت نیشانەی خێرە و ئەگەر ماڵی بەجێ هێشت، نیشانەی شەڕە. لە ئیتالیا و باکوری ئەفریقیا و یابان دا سیرسیرەك دەخرێتە قەفەزە و چونکە خەڵکی حەز لە دەنگە خۆشەکەی دەکەن.

بەڵام سیرسیرەکی شەو ناخوێنێت بەڵکو یاری دەکات! بەلێك خشاندنی کەنار سکی بە یەکێك لە لە باڵەکانی پێشەوەی بە ڕوی باڵەکەی تریدا جیرە دەردەکات. تەنها نێرینە کانیشیان ئەمە دەکەن. ئەم دەنگ دەرکردنە تەنها بەڕۆژە و بە دەرکردنی ئەو دەنگانە بانگی مێینەکان دەکات.

سیرسیرەك زۆر گوێیان سوکە و قاچی لەسەر پێ یەتی نەوەك لەسەر سەری، شاخەکانی زۆر درێژن و قاچەکانیشی زۆر بەهێزن بۆ ئەوەی یارمەتی فڕینی بدات.

سیرسیرەکە ماڵیەکان پێیان دەوترێت ((سیرسیرەکی کوانو)) شوێنی پەیدابونیان ئوروپایە و زۆر دەمێکیشە چونەتە هەردوو ئەمریکاوە. مێرویەکی بچکۆڵەیە درێژ یەکەی نزیکەی سێ سانتیمەترە. رەنگێکی زەردی بەرەو خۆڵەمێشی هەیە، لەگەڵ خاڵی قاوەیدا تێکەڵ بوە و لە ماڵی خەڵکیدا دەژێت. سیرسیرەك حەزی لە شوێنی گەرمەوە بۆیە زۆر جار لە نزیکی شوێنە گەرمەکان و کونی دار و دیواران دەیبینین. بەڵام سیرسیرەکی کێڵگەکان گەورەترن و ڕەنگیان بەرەو ڕەشە. لە زەویدا چاڵێك بۆ خۆیان هەڵدەکەنن وەکو ماڵ.

کاتێك حەزی لە جوت بون و دڵداری بێت نێرەکانیان لە دەرگای ماڵەکانیان دادەنیشن و دەسیرێنن. جۆرێکی تریان هەیە لەسەر داران دەژین و دەنگێکی زۆر بەرزیان هەیە.

ئەمجۆرە سیرسیرەکە پێ ی دەڵێن ((جداجد)) بوّتە مایەی کێشە و دەردی سەر بۆ جوتیاران، لەبەر ئەوەی کرمۆکەکانی گەڵای ئەو دارانە دەخۆن کە لەسەری دەژین. ئایا دەزانن لە چیندا حەلەبەی شەڕکردن هەیە، تایبەتە بۆ بەگژادانی ئەو جداجدانە و خەڵکی بە تامەزرۆوە سەیریان دەکەن و هەندێك جاریش گرەوی لەسەر دەکەن.

## گەورەترین ڕوبارەکانی جیهان

نیل درێژترین ڕوبارەکانی جیهانە، بەڵام ئەمازۆن گەورەترینیانە و دوەم درێژترین ڕوباری دونیایە. لە باکوری باکوری بەرازیلەوە تا زەریای ئەتڵەسی ٦٤٤٨ کیلۆمەتر درێژە.

ئەمازۆن لە دوور ڕوباری سەرەکی پێك دێت کە ئەوانیش مارانون و ڤاکایالینە. لە بەشی پیروی شاخی ئەندیزەوە.

بۆیە یەکەمین جار ئەمازۆن لە ساڵی ١٤٩٩ دا لە لایەن ((ڤاسینت یانز بیزۆن)) ەوە کە کەشتیەوانیەکی ئسپانی بو لە دەستەکەی کۆلۆمپس دۆزرایەوە. لە ماوەی

گەشتە مەزنەکەیاندا.

لە کاتێکدا بیزنۆن خەرکیکی گەشت بوو لە بەرامبەر لێوارەکانیدا بۆی دەرکەوت لە ئاوێکی سازگاردا گەشت دەکات. بۆیە چو بەرەو لای لێوارەکان بۆ لێکۆڵینەوە و لە بوغازەی ڕوبارێکی پاندا لەنگەری گرت.

ئەوەی کە سەر سوڕهێنەرە لە ئەمەزۆندا ئاوی لقەکانی ڕەنگا و ڕەنگە. سەرچاوی ڕاستەقینەی ڕوبارەکەش (٥٢٤٠) مەتر لەسەر ڕوی دەریاوە بەرزە، کە دەکەوێتە چیای ئاندیزەوە لە وڵاتی پیرۆ. ئاوەکە لەسەرەتادا کە هەڵ دەقولێت ڕەنگەکەی سپی یان زەردێکی پیسە. هەموو زێکانیشی کە لە شاخی ئاندێزەوە هەڵ دەقولێت، ڕەنگەکەیان هەمان شێوەیە و ڕێژەیەکی زۆر لە خۆڵی سپی لە ئاوەکانیاندا هەیە.

بەڵام لقەکانی تری کە لە باکوری ڕۆژئاوای بەرازیل و فنزویلاوە سەرچاوە دەگرن ڕەنگی ئاوەکەیان ڕەشە. بەڵام زۆر ڕون و جوانە و تا دێت رەنگی ئاوەکە سور دەبێت چونکە ئاوی ئەو لقانە بەسەر بەردانێکی بێ ڕوەکدا دەڕوات کە مادەی ئاسنی تێدایە.

ڕوبەری حەوزی ئەمازۆن نزیکەی سێ ملیۆن میلی دوجایە. کە چوار لەسەر دەی ڕوبەری گشتی ئەمریکای لاتین دەکات. بە شێوەیەکی گشتی ساڵی یەکجار بە ئەمازۆندا لافاو دێت، ئەویش لە هەردوو مانگی ئاب و ئەیلولدا. کاتێك بەفری سەر چیاکانی ئاندیز دەتوێنەوە. بەڵام کاریگەری ئەم بەفر توانەوەیە بە دیار ناکەوێت تا مانگی تشرینی دوەم، کاتێك لەسەروی ڕوی ئەمازۆنەوەی ئاوەکە بەرز دەبێتەوە.

ئاوی لافاویش لە ئەمازۆنی خواروداا لە نێوان کانونی دوەم و ئایاردا دەبێت ئەو ماوەیەی کە زۆرترین شێ ی هەیە لە ساڵدا.

ئاستی ئاوی ئەمازۆن نزیکەی ٣٠ بۆ ٥٠ پێ بەرز دەبێتەوە لە بەشی ناوەڕاست و خوارەوەی ڕوبارەکەدا. لەگەڵ ئەوەی نزمایییەکان لە حەوزی ئەمازۆندا نزیکەی نیوەی ڕوبەری گشتی بەرازیل پێك دەهێنن، بەڵام لە ١٠٪ زیاتر خەڵکی لێ نیشتەجێ نیە.

زۆربەی بەرازیلیەکان لە لێواری ئەو ڕوبارانەی کە کەشتیوانەی تێدا دەکرێت نیشتەجێن. هەزارەها میلی چوارگۆشە هەیە کە خێڵەکانی هندیە سەرەتاییەکان نەبێت کەسی تری تیادا ناژێت. ڕوبەری زۆر گەورەش هەیە کە تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە و نە نەخشەی بۆ کێشراوە.

ڕوباری ئەمازۆن قوڵیەکەی بەسە بۆ ئەوەی کەشتیە دەرياييەکان پێیدا تێپەڕن تا شاری ((مانوس)) هەندێکی کەشتی بچوکتر لەوانە دەتوانن تا شاری ((ئیکویتۆس)) ی ڕۆژهەڵاتی پیرۆ بچن. کەشتیە زۆر بچوکەکانیش دەتوانن لە لقەکانی ئەمازۆندا هات و چۆ بکەن.

## کلۆرۆفیل

چی ڕوەکەکان لە زیندەوەرە زیندوەکان جیا دەکاتەوە؟

وەڵامەکەی بەوە دەبێت کە ڕوەکەکان سەوزن لەگەڵ ئەوەی هەندێك (استپناو) دا بەڵام سەوزی یاسایەکی بنەڕەتیە بۆ ڕوەکەکان.

سەوزی یان سەوز بونی ڕوەکەکان گرنگترین شتە لە جیهاندا، لەبەر ئەوەی ڕەنگی سەوز (کلۆرۆفیل) لە ڕوەکدا، دەتوانێت مەواد لە زەوی و هەواوە وەرگرێت و خۆراکی لێ دروست بکات.

ئەگەر ڕوەکەکان ئەو کردارەیەیان نەبوایە، ئەوا هیچ مرۆڤ و گیانلەبەرێك نەیدەتوانی بژێت. چونکە هیچ خۆراکێکیان دەست نەدەکەوت. تەنانەت زیندەوەرە گۆشت خۆرەکانیش، لەسەر ئەو زیندەوەرانە دەژین، کە ڕوەك خۆرن.

ئەگەر بەدواداچونی هەر خۆراکێك بکەین و بیگەڕێنینەوە بۆ بنچینەی خۆی دەبینین لە دروست کراوی ڕوەکە.

بەمجۆرە دەبینین کلۆرۆفیل موعجیزەیەکە. کە ڕوەکەکان لێیەوە دەتوانن خۆراك بە مرۆڤ و گیانلەبەرەکان بدەن. بۆیە زۆر پێویستە بۆ ژیان. کلۆرۆفیل لە خانەکانی گەڵادا هەیە، وەکۆ چۆن لە قەد و گوڵەکانیشدا هەیە. بە یارمەتی کلۆرۆفیل ڕیشاڵەکانی ڕوەك دەتوانن وزە لە تیشکی خۆرەوە بمژن و بەکاری بێنن بۆ گۆڕینی مەوادی کیمیاوی نا ئەندامی بۆ مەوادی کیمیاوی ئەندامی یان (ژیان بە بەرخستن) ئەم کردارەش پێ دەوترێت پێکهاتوی تیشکی.

بەلأم هەندێك ڕوەك هەن، ڕەنگی سەوز (كلۆرۆفیل) یان تێدا نیە، ئەی ئەمانە چۆن دەژین؟

ڕوەكی قارچك و، كۆمەڵێك لە ڕوەكە قارچكیەكان، هیچ كلۆرۆفیلێكیان تێدا نیە بۆیە ناتوانن خۆراكی خۆیان دروست بكەن.

لەبەر ئەوە ناچار دەبن بۆ دەست خستن و خۆراكی خۆیان پشت بە ڕوەك و گیانلەبەرانی تر ببەستن. بەم جۆرە ڕوەكانەش دەوترێت ((مشە خۆرەكان)). كە لەسەر شتی تر دەژین.

بەلأم ئەگەر لەسەر پاشماوەی ڕوەك و گیانلەبەرانی تر خۆراكیان دەست كەوت ئەوا پێیان دەوترێت ((گەنیو خۆرەكان)).

مرۆڤ دەتوانێت كلۆرۆفیل لە ڕوەكەكان دەربهێنێت و بە زۆر ڕێگا بەكاری بهێنێت. لەوانە، بەكارهێنانی لە كوشتنی جۆرێك بەكتریای دیاری كراودا.

## بۆچی ڕەنگی گەڵای دارەكان لە پایزدا دەگۆڕێن؟

لە هاویندا ئەگەر سەیری دار بكەین، لەیەك ڕەنگ زیاتر هیچی تر نابینین ئەویش ڕەنگی ((سەوزە)). بەلأم لە وەرزی پایزدا گەلأكان دەگۆڕێن بۆ ڕەنگی جۆراوجۆر. بابزانین ئەو ڕەنگە جۆراوجۆرانە لە كوێوە دێن؟

زۆربەمان دەزانین ڕەنگی سەوز لە گەلأدا، هۆیەكەی بونی كلۆرۆفیلە. كە كارگەیەكی تەواوی خۆراكە لە هەموو گەلأیەكدا.

دوو لەسەر سێ ی ڕەنگی گەلأ لە ئەنجامی بونی كلۆرۆفیلەوەیە. لەگەڵ ئەوەی ڕەنگی تریش لەو گەلأیەدا هەیە. بەلأم لەبەر زۆری كلۆرۆفیل ناتوانین بیبینین. كەواتە هەندێك لەو ڕەنگانەی تر چین؟

مادەیەك هەیە لە گەلأی دار یان دانەوێڵەدا، ڕەنگەكەی زەردە. كە لە كاربۆن و هایدرۆجین و ئۆكسجین پێك دێت. كە ٢٣٪ ی ڕەنگی گەلأ پێك دەهێنێت. بەلأم مادەی كارۆتین، ئەو مادەیەیە كە ئەو ڕەنگە دەدات بە گەزەر بە ڕێژەی ١٠٪ لە گەلأدا هەیە.

ڕەنگێكی تر هەیە پێ ی دەوترێت ((ئانسۆ سیانین)) كە ڕەنگی سور دەداتە قامیشی شەكر و بەڕو.

له هاویندا له كلۆرۆفیلی سەوز زیاتر هیچ كام لەم ڕەنگانە نابینین. بەلاّم كاتێك سارد دەكات كلۆرۆفیلی بەسیسەبو لەگەلاّدا دەست دەكات بە دابەزین بۆ قەد و لقی دارەكان. لەبەر ئەوەیە لە زستاندا خۆراك بەرهەم ناهێنرێت و كارگەی خۆراكی كلۆرۆفیل دەرگاكانی دادەخات و مادەی كلۆرۆفیلیش پەرش دەبێتەوە. كاتێك كلۆرۆفیلەكە دادەبەزێت و وچان دەگرێت. ڕەنگەكانی تری ناو گەلاّكە، خۆ قوت دەكەنەوە و لەبەر چاو ئاشكر دەبن و گەلاّكان ئەو هەموو ڕەنگە جوانانە لەخۆ دەگرن كە لە سەیركردنیان تێر نابین.

پێش وەرینی گەلاّكان چینێك لە خانە لە بنی هەر گەلاّیەكدا دروست دەبێت، دەبێتە هۆی ئەوەی گەلاّكان بە هەلّكردنی با بوەرن. دوای وەرینی گەلاّكان لە سەر لقی دارەكان شوێنە دوگمەیەك دەبینین. كە ئاماژە بەوە دەكات ئەمە شوێنی گەلاّ بووە.

دارە هەمیشە سەوزەكان، لە زستاندا گەلاّكانیان ناوەرێت، بەلّكو بەردەوام ڕۆژانە گەلاّ لەو دارانە دەوەرێت و سەوز دەبێتەوە، بۆیە ئەو دارانە هەمیشە سەوزن.

## بالّندەكان چۆن دەبیستن؟

بالّندەكان لە گیاندارە خوێن گەرمەكانن. وەكو شیر دەرەكان بڕبڕەیان هەیە. بەلاّم جیاوازیان لەگەلّ زۆربەی شیر دەرەكانی تردا، لەوەدایە كە ئاوس نابن و نازێن. بەلّكو هێلكە دەكەن. بالّندەكان پەڕ و بالّ و دەنوكیان هەیە ئەمەش وا دەكات جیاوازیەكی تەواویان هەبێت لەگەلّ گیانلەبەرانی تردا. نزیكەی ٩٠٠ جۆر بالّندە هەیە. كە لە لاشەدا لە یەكتر جیاوازن. هەر لە بالّندە ویز ویزكەرەوە كە درێژیەكەی پێنج سەنتیمەترە تا دەگاتە وشتر مرخ كە دەشێت بەرزیەكی ٢,٥ مەتر.

بالّندەكان ددانیان نیە، بەلاّم دەنوكیان هەیە، كە خواردنی پێ كوّدەكەنەوە. بە شێوەیەكی سەرەكی خواردنیان لەسەر مێرو و تۆو و گۆشتی ئاژەلاّنە. بە گوێرەی قسەی زانایان، بالّندەكان وەكو مرۆڤ توانای بیستنیان نیە. ئایا دەزانن ئالیەتی بیستن لای بالّندەكان چی یە؟

بالّندە گویّ ی بیستنی هەیە و لە زۆر ڕووەوە لە گویّ ی خشۆكەكان دەچێت. گویّ

ی دەرەوەی لە باریکە ڕێگەیەکی کورت پێك دێت. یان کەناڵێك لە ژێری پەڕەکەی لا جاینگیدایە. لە زۆربەی باڵندەکان ماسوڵکەیەك هەیە. لەناو پێسدا بە دەوری کەناڵەکەدا. ئەو ماسوڵکەیە بە نیوەیی یان تەواوی کونەکە دادەخات. تەپڵەی گوێکە لە دەرەوە دیارە. لە دیوی ناوەوەی تەپڵەی گوێچکەش ڕیزە ئێسقانێك هەیە، کە لەرینەوەکان دەگوێزنەوە.

ئەو ڕیزە ئێسقانەش کە لە ستونێکی کرکراکەیی پێك دێت درێژ دەبێتەوە تا دەگاتەوە تەپڵی گوێ.

تاقیکردنەوەکان دەریان خستوە، زۆربەی باڵندەکان، گوێیان لە لەرینەوەکانی نێوان ١٠٠ هیرتز و ١٢٨٠٠ هیتز دەبێت. لە کاتێکدا، بیستنی لەرینەوەکان لە گوێ ی مرۆڤدا لە ٢٠ هیرتز بۆ ٢٠٠٠٠ هیرتزە.

باڵندەکان توانای خۆیان لە بیستندا بەکار دەهێنن تا خۆیان لە دوژمنان و مەترسی بپارێزن.

## لەکەیەوە مرۆڤ ڕیشی دەتاشێت؟

چی بڕیاری ئەوەی داوە کە مرۆڤ ڕیش بهێڵێتەوە یان بیتاشێت؟ بە درێژایی مێژوو تەنها نەریتی ئاینی یان چاولێکەری بووە!

ئێمە بە ڕێکوپێکی نازانین، یەکەمین پیاوکێ بوونە ڕیشیان تا شیوە، بەڵام دەزانین مسریە کۆنەکان لەبەر هۆی ئاینی ڕیشیان تاشیوە. لە لایەکی تریشەوە پێویست بوە لەسەر یەهودیەکان ڕیش درێژ بکەن. تا ئێستاش زۆر لە یەهودە ئارسۆزیکسەکان لەبەر هۆ ئاینیەکان ڕیش درێژ دەکەن.

یونانیە کۆنەکان ڕیشیان درێژ کردووە. زۆر لە وێنەی فەیلەسوفە یونانیە بەناو بانگەکان ئەوە پیشان دەدەن کە ڕیشیان پرێژ بووە.

بەڵام ئەسکەندەری گەورە بو کە نەریتی ڕیش تا شینی بردە ناو یونانیەکانەوە. دەڵێن بۆیە فەرمانی بەوە کردە تا لە جەنگدا سەربازەکانی نەناسرێنەوە.

ڕۆمانە کۆنەکان تا بەر لە ٣٠٠ ساڵ پێش زاین ڕیشیان نەتاشیوە لە بەر نەبونی سەرتاش. یەکەمین ڕۆمانی کە زانرابێت هەموو ڕۆژێك ڕیشی تاشیبێت ژەنراڵی گەورە ((سکیبیو ئەفریکانۆس)) بوە کە لە نێوان ساڵانی ٢٣٧ و ١٨٣ پ.ز. ژیاوە.

دوای ئەوەش ریش تاشین لای ڕۆمانیەکان بوو بە نەریتێکی ڕێك و پێك. شایانی باسە لە کاتی پرسە و ماتە مینیدا، ڕۆمانیەکان ریشیان درێژ دەکرد و یونانیەکانیش ریشیان دەتاشی.

داب و نەریتی ریش تاشینی ڕۆمانیەکان کاریگەری کردە سەر کەنیسەی ڕۆمەی کاسۆلیك و تا وای لێهات پیاوانی ئاینیش ریشیان دەتاشی. بەلاّم نەریتی ریش درێژ کردن لە سەدەکانی شانزە و حەڤدەدا لە نێوان پاپاکان و کاردا لە کان و ڕاهیبەکاندا جارێکی تر پەیدا بوەوە.

دوای ئەوە ڕۆمی کاسۆلیك جارێکی تر چونەوە سەر بیرۆکەی ریش تاشین جگە لە هەندێك لە دەیرەکاندا نەبێت.

نەریتی ریش تاشینیش لە بەریتانیا ساکسۆنیەکان دایان هێنا.

## کێ چەتری دابەزین (پەرەشوتی) داهێنا

بیهێننە پێش چاوی خۆتان کەسێك لە بەرزی سێ مەترە و خۆی فڕێ دەداتە خوارەوە و جێیەکی دەشکێت و کەسێکیش لە بەرزی سێ میلەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارەوە و هیچی پێ نایەت، بەلاّم بە پەرەشوت!

چەتری دابەزین بە سانایی چەترێکی گەورەیە کە بەرەنگاری هەوا دروست دەکات.

بەهۆی ئەو چەترە شەوەیە، مرۆڤ دەتوانێت بە لەسەر خۆ دابەزێتە سەر زەوی بێ ئەوەی توشی هیچ کۆسپێك بێت.

ڕەنگە پەرەشوت بیرۆکەیەکی زۆر کون بێت، لە سالّی ١٥١٤ دا لیوناردۆی وێنەکێش لە دەفتەری تێبینیەکانیدا وێنەی پەرەشوتێکی لەو جۆرەی کێشاوە.

((فاوستۆ فیرانزیۆ)) ش وەسفێکی دەربارەی چەتری هەوایی لە سالّی ١٥٩٥ دا بلاّوکردۆتەوە. باوەڕ وایە یەکەم کەس پەرە شوتی بەکار هێنا بێت پیاوێکی فەرەنسی بوە بە ناوی ((جی. بی. بلانشارد)).

لە سالّی ١٧٨٥ دا بلانشارد سەگێکی لەسەلەیەکدا بە پەرە شوتێك خستە خوارەوە لە بالّۆنێکەوە.

هەروەها فەرەنسیەکی تریش بە ناوی (جی، گار، نارین)) یەکەم کەس بووە

چەتری دابەزینی بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بەکارهێناوە. یەکەمین پیشاندانی ئاشکراش بۆ دابەزین بە چەتر لە پاریسدا لە ٢٢ تشرینی یەکەمی ١٧٩٧ دا کرا، کاتێك کەسێك بە چەترێکی لە قوماشی سپی دروست کراو لە بەرزی شەش سەد مەترەوە خۆی فڕێ دایە خوارەوە. پەرەشوتەکەش لە شێوەی چەترێکدا بوو لە قوماشی سپی دروست کرابوو و تیرەکەی نزیکەی حەوت مەتر دەبوو. لە چەقی چەترەکەشدا پارچە دارێك بوو لە شێوەی بازنەدا و تیرەکەی نزیکەی ٢٥ سم دەبوو.

کە لە ناوەڕاستیەوە کونێك بوو بۆ ئەوەی هەوا لێیەوە بچێتە دەرەوە. بە دەوری کەنارەکەیشیدا هەموو پارچە پەتی کورت کورت بوو.

یەکەمین دا بەزینی سەرکەوتوو لە فڕۆکەوە بەهۆی پەرەشووتەوە لە ساڵی ١٩١٢ دا بوو. کە ((کاپتن بێری)) لە شاری سانت لویسی ویلایەتی مەیزوری ئەمریکادا کردی.

## پەرکەم (فێ) چیە؟

پەرکەم نەخۆشیەکە لە نەخۆشیەکانی کۆئەندامی ((عصبی)) ئەوانەش توشی ئەم نەخۆشیە دەبن هەندێك جار لە پڕ توشی مەرەیەك کرژبون ((نوبە تشنج)) دەبن و بێ هۆشیان دەکات و ئاگایان لە خۆیان نامێنێت. لەگەڵ تەواو بونی مەرەکەدا دەگەڕێنەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆیان.

(٠,٥٪) ی دانیشتوانی جیهان پەرکەمیان هەیە. توشبوان بەم نەخۆشیە لە پیاواندا زیاترە تا ژنان بە ڕێژەی نزیکەی ١٠ بۆ ٨.

پسپۆران تا ئێستا نەیانتوانیوە تەفسیرێکی تەواو بۆ هۆیەکانی توشبون بە پەرکەم بخەنە ڕوو. بەڵام ئەو تەفسیرەی تا ئێستا لەبەر دەستدایە، ئەوەیە کە کاری ئاسایی مێشك لە کاتی مەرەی پەرکەمدا بۆ ماوەیەکی کەم لە کار دەکەوێت. ئەتەمەکانی ((انسجە)) مێشکی توشبوان بە پەرکەم زۆر هەستیارە بۆ گۆڕانکارە کیمیاویەکان.

لەبەر ئەوە کاتێك هەر جۆرە گۆڕانکاریەك ڕوو دەدات، مێشك ناردنی بارگە بەتاڵەکان وەردەگرێت کە دەبێتە هۆی گرژبوونی.

مەرە پەركەمیەكان لە ئەنجامی مێشكە خورپە یان بەركەوتنێكی سەر یان برینێك لە مێشكدا یان تایەكی زۆر یان ئاوسانێك لە مێشكدا یان تەنانەت ڕودانی شلەژان لە كاتی خوێن تێكردندا دروست دەبێت.

هەندێك كەسیش بە هۆی ئاو و ئاگرەوە توشی پەركەم دەبن، هەندێكی تریش لە خەڵك زۆر هەستیارن بەرامبەر بۆنێكی دیاری كراوە. ئەگەر ئەوەش هەیە پەركەم نەخۆشیەكی پشتاو پشت بێت.

بەڵام پەركەم هیچ پەیوەندیەكی بە گەشەی عەقڵیەوە نیە. كەسانی توشبووە بە پەركەم دەبێت وەكو كەسێكی ئاسایی تەماشا بكرێن. نەك وەكو كەسێكی نەخۆش و بێزراو.

توشبوان بە نەخۆشیەكی پەركەم دەشێت ژیانێكی ئاسایی بژین و بچنە قوتابخانە و فێر ببن و ژن بێنن و خێزان پێكەوە بنێن. زۆر لە پیاوە ناودار و بلیمەتەكانی جیهان پەركەمیان لەگەڵدا بووە. وەكو دۆق ولینغتۆن و ڕیتشارد ڤاگنەر و لویس هكتۆر و برلیۆز.

زانستی پزیشكی دەرمانی زۆر باشی پەرەپێداوە، بۆ بەرگری كردن لە پەركەم و تەحەكوم كردن پێوەی لە كاتی ڕودانیدا.

ئەو دەرمانانە بۆ ماوەی چەند ساڵێك یان تەنانەت بە درێژایی تەمەنی دەبێت ئەو نەخۆشانە بەكاری بێنن بۆ ئەوەی ژیانێكی ئاسایی و بەختەوەر بەسەر بەرن. دەبێت توشبوان بە پەركەم بە ڕێكوپێكی و بەردەوام سەردانی پزیشكەكانیان بكەن بۆ وەرگرتنی چارەسەری گونجاو.

## كەی مەلەوانی بوو بە وەرزش؟

مەلەوانی یارییەكی میللی دونیای ئەمڕۆیە. لە كۆندا جەنگاوەران لە ڕۆما و ئاشور و یوناندا فێری مەلەوانی دەكران.

لە ساڵی ١٨٩٦ مەلەوانی وەكو وەرزش چوە ناو یارییەكانی ئۆلۆمپییەوە. بەڵام سەرەتا تەنها بۆ پیاوان بوو بەشداری بكەن.

لە ساڵی ١٩١٢ دا ڕێگە درایە ژنانیش بەشداری ئەم پێشبڕكێ یە بكەن. لە ئەمڕۆشدا پێشبڕكێ ی زۆر بۆ مەلەوانی دەكرێت لە سەرانسەری جیهاندا، كە

هەزاران مەلەوان تێدا بەشداری دەکەن.

مەلەوانی جگە لەوەی سەرگەرم کردنە سودمەندیشە بۆ لەش. بە جۆرێك بلاوبۆتەوە، کە لە زۆربەی خوێندنگە و زانکۆ و کۆلیژ و یانەکاندا مەلەوانگە هەیە.

پێشبرکێکانی مەلەوانی جۆراوجۆرن : هەندێکیان مەلەوانی ئاساییە و جۆرێکی تری باڵەمەلە و جۆرێکی تریشی سنگەمەلە و پشتە مەلە و، مەلەوانی خێرایە بە سەر بردنە ژێر ئاوەوە.

هەر پێشبرکێیە کیشی کاتی دیاری کراوی خۆی هەیە و براوەش لە هەموياندا ئەو کەسەیە خێراتر ماوەکە ببڕێت.

هەندێك مەلەوان هەوڵیان داوە نێوانی زۆر درێژ ببڕێت. وەکو ((مارسیۆ ویپ)) یەکەم پیاو بو کە کەناڵی ئینگلیزی کە ٣٢ کیلۆمەتر درێژە لە ٢١ کات ژمێر و ٤٥ خولەکدا بڕی، لە ئابی ١٨٧٥ دا.

بەلأم یەکەم ژن کە کەناڵی ئینگلیزی بە مەلەوانی بڕی ((مارۆلین ئیدەرلی)) ئەمریکی بو. کە بە ١٤ کاتژمێر و ٣١ خولکە بڕی ی.

لە ئەمرۆدا نێوان لەوە درێژ تر هەن کە مەلەوانان دەیبڕن، وەکو مەلەوانی دەریاچەی جۆرج ماراسۆن کە درێژیەکەی ٦٧,٢ کیلۆمەترە. ئەمڕۆ چونە ژێر ئاو بوە بەبەشێك لە پێشبرکێ ی مەلەوانی.

## ژاراوی بون بە خۆراك

ژاراوی بون بە خۆراك نەخۆشیەکە توشی کۆ ئەندامی ((عصبی)) دەبێت، هۆیەکەشی ((توکستین)) یان ئەو ژەهرەیە کە بەکتریایەکی دیاری کراو دەیڕێژێت.

کاتێك خۆراك لە شوێنێکی نا دروست دا بۆ ماوەیەکی درێژ هەڵدەگیرێت. کرداری شیبونەوە ڕو دەدات. دوای ئەوەی بەکتریای ترسناك زۆر دەبێت تیایدا بۆنێکی ناخۆشی لێ دروست دەبێت. ئەم جۆرە دەشێت ببێتە هۆی ژاراوی بونی خۆراکی، هەروەها بونی زنیك و قورقوشم و مس و دەشێت خۆراك ژەهراوی بکات. نیشانە سەرەتاییەکانی ژاراوی بونی خۆراکی سەرەگێژە و دڵ تێکچون و رشانەوەیە.

ئەم نیشانانەش دوای چەند کاتژمێرێك لە خواردنی خۆراکە پیسەکە دەردەکەوێت. کەسی توشبو هەست بە ماندو بون و سەر ئێشە و بەرچاو تەڵخی و

گەرو وشکی دەکات. ماسوڵکەکانی هەناسە دانیشی توشی ئیفلیجی دەبن. ئەگەر ژاراوی بونی خۆراکی زوو پیٚ ی بزانریٚت، دەشیٚت کەسی توشبو بە ((ئانتی تیٚکسین)) ی دژە ژەهر ڕزگاری ببیٚت.

بۆیە پزیشکان ئامۆژگاری ئەوەمان دەکەن، هەمیشە سەوزە و میوە پیٚش خواردن بە جوانی بشۆین و، هەروەها خۆراکیش بە شیٚوەیەکی دروست هەڵبگرین.

## کام پادشا دریٚژترین حوکمی بەریتانیای کرد؟

شا ڤیکتۆریا لە نیٚوان هەموو پادشایانی بەریتانیا دریٚژترین حوکمی بەریتانیای کردووە.

ڤیکتۆریا لە ٢٤ ئایاری ١٨١٩ لە لندن لەدایك بووە. تەنیا کچی ادوارد اغسگس ی میری کانت بوو.

لە پاش مردنی شا ولیەمی چوارەمی مامی لە ٢٠ حوزەیرانی ١٨٣٧ دا چوە سەر کورسی حوکم، کاتیٚك کە تەمەنی ١٨ ساڵان بوو.

بۆ ماوەی شەست و سیٚ ساڵ و حەوت مانگ حوکمی کرد، تا لە ڕۆژی ٢٢ کانونی دوەمی ١٩٠١ دا کۆچی دوایی کرد.

ڤیکتۆریا شاژنی بەریتانیای گەورە و ئایرلەندا و ئیمپراتۆری هند بو. ماوەی حوکمی پڕ بو لە ڕوداوی دریٚژ خایەن. لە ماوەی حوکمی دا بەریتانیا گەشەی سەند و بەهیٚز بوو و پیٚش کەوت و ئیمپراتۆریەتیٚکی گەورەی دروست کرد تا ئەودیوی دەریاچەکان. سەردەمی بەوە دەناسریٚت کە پڕ بوە لە داهیٚنانی مەزن و پیٚشکەوتنی پیشەسازی.

لە ساڵی ١٨٤٠ دا میٚردی کردە ((ئەلبیٚرت ئەمیر ساکس – گویرك – غاسا)) ی ئامۆزای و زۆر دڵسۆزی میٚردەکەی بوو و زۆریش گویٚ ی بۆ ئامۆژگاریەکانی دەگرت. کە لە ساڵی ١٨٦١ دا ئەلبیٚرت لە تەمەنی گەنجیدا کۆچی دوایی کرد. غەم و پەژارەیەکی زۆر شا ڤیکتۆریای داگرت و گۆشەگیر بو لە ژیاندا و بەشداری هیچ بۆنەیەکی کۆمەڵایەتی نەدەکرد و چەندین ساڵ بەو شیٚوەیە ژیا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گرنگیەکی تایبەتی و گورج و گۆڵی بە ئیدارەی وڵات دەدا و هەموو بڕیارە گرنگەکان لەلایەن خۆیەوە دەردەچوو.

شا ڤیکتۆریا نۆ کوڕی هەبوو، کە هەموو یان لەگەڵ خانەوادەی پادشاکانی ئەوروپادا ژن و ژن خوازیان کرد، لەبەر ئەوەیە هەموو خانەوادە شازادەکانی ئوروپا، پەیوەندی خزمایەتیان پێکەوە هەیە.
لە کۆتایی ماوەی حوکمیدا شا ڤیکتۆریا چوە ڕیزی پارتی پارێزگارانەوە.

## بۆچی شکسپیر بە مەزنترین شاعیر و شانۆ نوسی جیهان دادەنرێت؟

ولیەم شکسپیر شاعیری شانۆنوسی ئینگلیزی. بە مەزنترین نوسەردا دەنرێت کە مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینی بێتی.
بڕوا وایە شکسپیر ٣٤ شانۆیی نوسیبێت لە نێوان ساڵانی ١٥٩١-١٦١٤ دا. وای بۆ دەچین شانۆیی ((هینی شەشەم)) یەکەمین شانۆیی بێت کە نوسیبێتی. ((زریان)) و ((هنری هەشتەم)) یش دواین شانۆیی بێت. تا ئەمڕۆش شانۆییەکانی لە زۆربەی وڵاتانی دونیادا نمایش دەکرێت. بە ڕاستی پێش بینیەکانی ((جۆنسۆن)) کە یەکێك لە پیاوە مەزنەکانی سەردەمی شکسپیر بوە ڕاست دەرچو کە ووتویەتی ((شکسپیر تەنها پیاوی سەردەمێك نیە، بەڵکو بۆ هەموو سەردەمێك دەشێت)).
شکسپیر سەرەتای ژیانی لە ((ستراتفۆرد-ئابون-ئیفۆ)) بەسەر برد و لەوێدا چوە قوتابخانە.
لە تەمەنی ١٨ساڵیدا کچێکی بەناوی ((ئان هاساوا)) ی کردە هاوسەری خۆی کە کچێك بەناوی ((سۆزانا)) و دو کوڕی جمگ بە ناوەکانی ((هامنت و جۆدێت)) بوو.
لە ساڵی ١٥٨٤ شکسپیر وەکو شانۆ نوسێك لە لەندەن بەدەرکەوت. لە لەندەندا زۆر بە خۆش گوزەرانی و بەناوبانگ دەژیا وەکو ئەندامێکی گەورەترین تیپی شانۆی کە تیپی ((لورد تشامبرلین)) بو.
کە دوای ئەوە ناوی تیپی ((پیاوانی پادشا)) ی لێنرا ((Kingss man)) ئەم تیپە شانۆییەکانیان لەسەر شانۆی ((clup)) لە ناوچەی بانگساید پێشك کەش دەکرد. تا کاتی سوتانی لە حوزەیرانی ساڵی ١٦١٣ دا لە کاتی نمایش کردنی شانۆیی ((هینری هەشتەم)) دا.

له ساڵی ١٦١٠ شکسپیر چووەوە بۆ زادگای خۆی و وەکو پیاوێکی لادێ ی ژیا.
له مارسی ١٦١٦ وەسیەت نامەی خۆی نوسی پێش مردنی به چەند مانگێك. که مردیش له کەنیسەی شارۆچکەی ((ستراتفۆرد)) دا بەخاك سپێردرا.
لەگەڵ ئەوەی ئێمه زۆر شت دەزانین دەربارەی ژیانی شکسپیر و کارەکانی، بەڵام به تەواوی نازانین کەی شانۆییەکانی نوسیوه و کەی بۆ یەکەمین جار دەرهێنراوه!
بەڵام بەپیێ ی ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدایه. دەربارەی نمایش کردنی شانۆییەکانی بۆ یەکەمین جار، لەوانەیه له ساڵێکدا دوو شانۆیی نوسیبێت.
چاپی یەکەمی شانۆییەکانی که به ((بەرگی یەکەم)) ناسراوه. له ساڵی ١٦٢٣ دا چاپ کراوه. سۆنیتاکانیشی (سۆنیته قەسیدەیەکه که له ١٤ دێڕ پێك دێت) له ساڵی ١٦٠٩ دا بڵاوکراوەتەوه و مێژوی دانانیشی نەزانراوه. شکسپیر ١٥٤ سۆنێتەی نوسیوه. که به شێوەیەکی ڕەمزی بۆ خەڵکانێکی جۆراوجۆر ئاماژه دەکات. به تایبەت بۆ گەنجێکی قۆز و ئافرەتێکی ئەسمەر و شاعیرێکی مونافیسی خۆی که تا ئێستا نازانرێت کیێ یه.
شکسپیر له ساڵی ١٥٩٣ دوو چیرۆکه شیعری داناوه، که هەردوو پاڵەوانەکەی ((ڤینۆس و ئەدۆنیس)) ن. لەگەڵ ((ئەتك کردنی لوریس)) دا له ساڵی ١٥٩٤.
بەڵام لاواندنەوەکەی که له ٦٧ دێر پێك هاتووه به ناونیشانی ((سیمرخ و کیسەڵ)) له ساڵی ١٦٠١ دا بڵاوکرایەوه.
کارەکانی شکسپیر هەمه چەشنەن له نێوان شانۆیی و شانۆی تراجیدیا و کۆمیدیا و نەهامەتی مێژویی و مێژوییدا.

## ئاو بۆچی هەڵم دەکات؟

لای هەموان ئاشکرایه ئەگەر جله تەڕەکانت لەبەر هەتاودا هەڵخەیت وشك دەبێتەوه. یان شۆستەیەکی تەڕ بوی دوای باران، به شێوەیەکی لەسەر خۆ وشك دەبێتەوه.
به هەڵم بون ئەو کردارەیه، که شله ئەگەر خرایه بەر هەوا یان دەبێته هەڵم یان دەبێته گاز. بەڵام شلەکان به یەك خێرایی نابنه هەڵم. ئالکول (ئسپرتۆ) و ئەمۆنیا له ئاو خێراتر دەبنه هەڵم.

دوو هێز هەیە كار دەكەن لەو گەردیلانەی كە مادەی لیّ پێك هاتوو. یەكێك لەو دوو هێزە ((یەكگرتنە)) كە وا دەكات لە گەردیلەكان یەك بگرن. هێزی دوەمیش گەرمی گەردیلەكانە، كە لە یەك دوریان دەخاتەوە.

ئەگەر هەر دوو هێزەكە یەكسان بون ئەوا شلە دروست دەبێت وەكو ((ئاو)). لەسەر ڕوی شلەكە گەردیلە هەیە كە دەجولێنەوە. ئەو گەردیلانەی خێراتر دەجولێنەوە بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان و لە هێزی یەكگرتنەكە هەڵدێن. بە هەڵم بونیش ئەو بەرز بونەوەیەیە بۆ ئاسمان كە گەردیلەكان پیّ هەڵدەستن.

كاتێك شلەكە گەرم دەبێت، بە هەڵم بون بە شێوەیەكی خێراتر ڕودەدات، لەبەر ئەوەی گەردیلەكان خێراتر هەڵدین ((بەرز دەبنەوە)). بەڵام ئەگەر شلەكە لە دەفرێكی داخراودا بێت، ئەوا شلەكە دەوەستێت. لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەو گەردیلانەی بەرز دەبێتەوە، یەكسانە لەگەڵ ژمارەی ئەو گەردیلانەی دەتكێتەوە ناو شلەكە. كاتێكیش ئەمە ڕو دەدات، كە هەڵمەكە گەیشتبێتە پلەی تێربون.

كە هەوایەك بەسەر شلەكەدا دەڕوات، وا دەكات بە هەڵم بونەكە خێراتر ببێتەوە. هەر چەندە ڕوی شلەكە هەوا زیاتر لیّ ی بدات، بە هەڵم بونەكە خێراتر دەبێتەوە. ئەگەر شلە لە دەفرێكی پاندا بێت خێراتر دەبێتە هەڵم. وەكو لە دەفرێكی قوڵدا.

## بۆچی پێویستمان بە خویّ هەیە؟

لەشی مرۆڤ نزیكەی ٤٧ لیتر ئاوی تێدایە. لە ڕاستیدا زۆرێك لە ئەندامانی لەشمان ڕێژەیەكی سەر سوڕهێنەر ئاوی تێدایە. بۆ نموونە ماسولكەكان ڕێژەی ئاو تیایدا ٧٥ لە سەدە، لە جگەریشدا ٧٠ لە سەد مێشكیش ٧٩ لەسەد و ڕێژەی ئاوی گورچیلەش ٨٣ لە سەدە!

بەڵام شلەمەنیەكانی لەش هەموویان ئاوی ڕون نین و ڕێژەیەك لە خوێیان تێدایە. بۆچی؟

یەكێك لە بیردۆزە زانستیەكان دەڵێت، هەموو گیاندارانی وشكانی لەوانەش مرۆڤ لەو گیاندارە ئەندامیانەیە كە لە دەریادا ژیاوە و گەشەی كردووە. شلەمەنیەكانی لەشی ئەم گیاندارانە سەرچاوەكەی ئاوی دەریایە. كاتێك ئەو گیانلەبەرانە لە دەریاوە، گواستیانەوە بۆ وشكانی، ئەو ئاوەی دەریایان لە لەشی خۆیاندا

پاراست وەکو شلەمەنیەك.
بەلاّم وشکانی ناتوانێت بە شێوەیەکی سروشتی ئەو خوێیە دەست بخات کە لە شمان پێویستی پیّ یەتی.
لەبەر ئەوەی خویّ لە ئاودا دەتوێتەوە، بۆیە وشکانیە ڕەقەکان لەگەلّ باراندا زۆر لە خوێکەی خۆیان لەدەست دەدەن بۆ ناو ڕوبار و زەریاکان. بەو هۆیەوە ڕوەکەکانی وشکانی ڕێژەیەکی تەواوی خوێیان تێدا نیە.
لەبەر ئەوە ئاژەلّە ڕوەك خۆرەکان حەزیان زۆر لە خۆییە. لاشەی مرۆڤ ڕوژانە ڕێژەیەکی دیاری کرا و لەو شلەیە لە دسەت دەدات کە خویّ ی تێدایە. خۆراکە ڕوەکیەکانیش قەرەبوی ئەو ڕێژە لەدەست چوە لە خویّ ناکەنەوە. ئەو ئاژەلاّنەش لەسەر ئاژەلاّنی تر دەژین، تا ڕادەیەك پێویستیان بە خویّ نیە چونکە ئەوەندەی پێویستیانە لە خویّ، لە شلەکانی لاشەی ئاژەلّەکانی تردا دەستیان دەکەوێت.
بۆ نموونە: خۆراکی خەلّکی ئەسکیمۆ بە زۆری گۆشتە، لەبەر ئەوەی زۆر پێویستیان بە خویّ نیە.
لە مەکسیکی کۆندا خویّ زۆر بە نرخ بوە بە جۆرێك کە خواوەندی خوێیان هەبوە. کرێکارەکانی کانەکانی خوێش لە ئوروپای کۆندا، موچەیان وەرگرتوە. وشەی موچە (salary) لە زمانی ئینگلیزیدا سەرچاوەکەی وشەیەکی لاتینیە کە مانای (خویّ) دەدات.
خویّ بە زۆری لە پێستی لەشی مرۆڤدا کۆدەبێتەوە. ئەگەر یەکێك خواردنێکی بیّ خویّ ی خوارد، ئەوا خوێن لە چەند ڕێگەیەکەوە خوێکەی خۆی دەردەدات لەوە دەبێت پێستە واز لە بەشێك لە خوێکەی خۆی بێنێت بۆ خوێن بۆ ئەوەی خوێن پارێزگاری لە خەستیەکی دیاری کراو و جێگیر بکات لە خوێدا. ئەگەر ئەوە ڕوبدات بە گشتی کاریگەرییەکی بەسودی دەبێت لەسەرنەخۆشیەکانی پێست، لەبەر ئەو هویەشە پزیشکەکان زۆر جار خواردنی بیّ خویّ دەنوسن بۆ ئەوانەی نەخۆشی پێستیان هەیە.
لەشی مرۆڤ بە شێوەیەکی سەرەکی بەهۆی هەردوو گورچیلەوە رزگاری دەبێت لە خویّ. ئەگەر گورچیلەش توشی نەخۆشی هات، پزیشکەکان داوا لە نەخۆشەکان

دەکەن، خواردنی کەم خویّ بخوّن بوّ ئەوەی گورچیلەیان زوّر ماندوو نەبیّت.

## بوّچی شاخە بەفرینە دروست دەبیّت؟

ئەو قەبارە بەفرە گەورەیە، کە لە ئەمریکای باکوردا لە چاخی بەفردا دروست بوە، پیّ ی وتراوە ((شاخی بەفرینی کیشوەری)) لەوانەیە ئەستوریەکەی لە ناوەڕاستیەوە گەیشتبیّتە ٤٥٠٠ مەتر. دەشیّت لە ماوەی چاخی بەفرینیشدا چوار جار توابیّتەوە. ئەو چاخە بەفرینانەی کە لە شویّنەکانی تری دونیادا ڕوی داوە، تا ئیّستا هەلیّکی بوّ نەڕەخساوە بتویّتەوە. نمونەی ئەوەش دورگەی گرینلاندی بەربلاّو کە تا ئیّستاش بە شاخیّکی بەفرینی کیشوەری داپوّشراوە.

لە پەراویّزیّکی تەسکیدا نەبیّت بە دەوری لیّوارەکەیدا. لە ناوەوە بەرزی شاخە بەفرینەکە لە زوّر شویّندا لە ٣٠٠٠ مەتر زیاترە. کیشوەری (ئەنتارکتیا)) کە کیشوەریّکی چوّلە، دەکەویّتە دەوروبەری جەمسەری باشورەوە. بە شاخە بەفریّکی کیشوەری داپوّشراوە. لە هەندیّك شویّندا بەرزیەکەی دەگاتە ٤٠٠٠ مەتر.

لەبەر ئەو هوّیەیە بونی شاخە بەفر لە چەند ناوچەیەکی جیهاندا، هەلی توانەوەی بوّ نەڕەخساوە و سالّی ئایندە هیّندەی تر بەفری بەسەردا باریوە.

بەلاّم زوّربەی ئەو شاخە بەفرینانەی ئیّستا هەن، لەسەردەمیّکی تازەدا دروست بونە. شاخە بەفرینەکانی ئیّستا، کە بریتین لە شیویّکی پانی قولّ و لە پلیکانەی گەورە دەچیّت، بەفر بە سەریدا دەباریّت و بەمجوّرە قورس دەبیّت و بارستاییەکانی سەر شیوەکە دەخلیسکیّنیّت. بارستاییەکانیش بریتین لە قەبارەیەکی گەورە لە بەفر و بەندان.

ئەو بەفرە لە ماوەی وەرزی هاوینیشدا ناتویّتەوە بەلّکو سالّ لە دوای سالّ قولّتر دەبیّتەوە. لە ئەنجامی پالّە پەستوّی زوّر لەسەرەوە بوّ خوارەوە. سەرەڕای توانەوە و بەستنی سەر لە نویّ، هەواکەی بەشەکانی ژیّرەوەی قەبارەکە دەردەچیّت و دەیگوّڕیّت بوّ بەفریّکی زوّر ڕەق.

ئەو پالّە پەستوّیەش کە دروستی دەکات، بەفر و بەندانەکە، کەم دەکاتەوە لە سەر قەبارەکە و پالّی دەنیّت تا دەست دەکات. بە خلیسکانیّکی لەسەر خوّ بوّ ناو

شیوەکە.

ئەو زمانە جوڵاوەیە لە بەفر و بەندان پێ ی دەوترێت شیوی بەفرین.

لە شاخی ئەلبی ئوروپادا ١٢٠٠ شاخی بەفرینی لەو جۆرە هەیە. لە زۆر لە شاخەکانی ئوروپا و باشوری ئاسیادا شاخی بەفرینی لەو جۆرە هەیە.

لە ئەلاسکاشدا دەها هەزار لەو جۆرە شاخە بەفراویانە هەیە. کە درێژی هەندێکیان لە نێوان ٢٥ بۆ ٥٠ میلدا دەبێت.

## بۆچی مار کاژ دەخات؟

مار لە خشۆکە خوێن سارد و لاشە درێژەکانە. لە هەموو ناوچەکانی جیهانیشدا هەیە. نزیکەی (٢٤٠٠) جۆر مار هەیە و، هەموشیان کاژ فڕێ دەدەن. ئەم دیاردەیە بەهۆی ئەو تایبەت مەندیەوە ڕودەدات کە لە ماردا هەیە. لەبەر ئەوەی مار بە بەردەوامی لاشەی گەورە دەبێت تەنانەت لە کاتی پیریشدا کە کاتێك مارەکە گەورە دەبێت کاژەکەی تەنگ دەبێتەوە. لەبەر ئەوە ناچارە لەبەری خۆی دایکەنێت.

مار لە مانگێکەوە بۆ سێ مانگ جارێك. بە گوێرەی جۆری مارەکە بە ڕێکوپێکی کاژەکە فڕێ دەدات. بە لێخشاندنی پێستەکەی بە شتێکی زبر. ماران لە ڕوی بایەلۆجیەوە، پەیوەندیان بە بڕبڕە دارە خوێن ساردەکانەوە هەیە. وەك بزن مژەك و تیمساحی ئەمریکی و کیسەل.

## بۆچی لەسەر لوتکەی چیاکان دار ناڕوێت؟

بە شێوەیەکی گشتی دار لەسەر لوتکەی چیاکان ناڕوێت. لە ناوچە شاخاویەکانیش لە بەرزاییەکی دیاری کراو بەولاوە دار ناتوانێت بڕوێت. ئەو بەرزاییەش لە شاخێکەوە بۆ شاخێکی تر دەگۆڕێت.

ئایا دەزانن لەبەر چی لەسەر لوتکەی دار ناڕوێت؟

لەبەر چەند هۆیەك. یەکەمیان لەسەر چیاکان گڵ کەمە و تەنکە، تەنك بونەوەی گلیش دوو کێشە دروست دەکات:

یەکەمیان: دارەکە ئاو و خۆراکی تەواوی دەست ناکەوێت. دوەمیان: ڕەگەکەی ناتوانێت زۆر لەناو خۆڵەکەدا بچێتە خوارەوە.

کێشەی دوەمیش: زۆربەی شاخەکان زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵ بە بەفر سەریان داپۆشراوە و لەبەر نزمی پلەی گەرما ئەو دارانە ناتوانن بڕوێن. کێشەی سێیەمیش : دوری نێوان هێڵی ئیستیوا و شاخەکە یە. وەکو ڕێسایەکی گشتی بەهۆی دورییانەوە لە هێڵی ئیستیوا داری بەرز لەسەر شاخەکان ناڕوێن.

بۆ نموونە:

سەرما لە ناوچە جەمسەریە باکوری و باشوریەکاندا زۆر سەختە بە جۆرێك کە مەحاڵە داری لێ بڕوێت.

ڕوانی دار پشت بە بڕی باران و بەفر دەبەستێت. ئەو شاخانەی بارانیان زۆر لێ دەبارێت، داریان زیاترە لەو شاخانەی بارانیان کەم لێ دەبارێت. لە شاخە وشکو بێ بارانەکاندا، دارەکان کورتترن.

## هەستی بۆن کردن لای سەگ

سەگ بە درێژایی هەزاران ساڵە هاورێ یەکی بەوەفای مرۆڤ بووە. سەگ هەستی بۆنکردنی زۆر بەهێزە. ئەگەر بە شوێنێکدا تێ پەڕی ئەوا دەتوانێت بە هەستی بۆن کردنی ئەو شوێنە بدۆزێتەوە. لەبەر ئەو هۆیەیە پۆلیس بۆ دۆزینەوەی تاوانباران سەگ بەکار دێنن.

لەناو لوتدا ناوچەیەکی زەرد ڕەنگ هەیە، کە پانتاییەکەی نزیکەی ٢٥٠ میلیمەترەی دوجایە و. ملیۆنەها خانەی لە شێوەی قژدا تیایە. ئەو خانانە هەستیارن بۆ بۆنەکان و پێ ی دەوترێت ((کیمۆر یستبورز)) لەبەر ئەوەی ئەو خانانە چڵمیان تێدایە بۆیە بە هەمیشەیی تەڕن. هەروەها ئەو خانانە پەیوەستن بە خاڵێکی تایبەت بە بۆنەوە لە مێشکدا. کاتێك بۆنی شتێك دەکەین گەردیلەکان لەگەڵ هەوادا دەگاتە ئەو خانانە و لەرینەوەیەکی کارەبایی لە ریشاڵەکانیەوە دەردەچێت.

ئەو لەرینەوانە دەگەنە خاڵی تایبەت بە بۆنکردن لە مێشکدا و بەوەدا بۆنەکە دەناسینەوە.

لە راستیدا هێزی بۆنکردن بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە قەبارەی ئەو خاڵە تایبەتیەی بۆنکردن دەبەستێت کە لە مێشکدایە. هەر چەندە ئەو خاڵە گەورەتر

بێت ئەوا هێزی بۆنکردن زیاتر دەبێت.
لێکۆڵینەوەکان دەریان خستوە کە قەبارەی ئەو خاڵە، لە مێشکی سەگدا گەورەترە تا لە مێشکی مرۆڤدا. لەبەر ئەو هۆیەیە دەبینین هێزی بۆنکردن لای سەگ گەورەترە. هەروەها بۆشایی لوتی سەگ تەڕترە لە بۆشایی لوتی مرۆڤ ئەوەش یارمەتی زیاتری سەگ دەدات بۆ ناسینی بۆنەکان.
سەگ هەستی بۆنکردن بۆ خواردن و ڕاوکردن و ناسینەوەی دوژمنەکانی بەکار دەهێنێت.

## کەی سەندیکاکان دروست بوون؟

لە یونانی کۆندا، لە بەرامبەر پاراستنیاندا، کۆیلەکان بە نانەسەك بۆ ئاغاکانیان ئیشیان دەکرد.
لەگەڵ گەشەسەندنی بازرگانیدا شارەکان جێگەی دەرەبەگاکانیان گرتەوە وەکو سەنتەرێکی سەرەکی ئیشکردن. بازرگان و پیشەوەرانیش یەکێتی و سەندیکا و ڕێکخراوی تایبەت بە خۆیانیان پێك هێنا. پیشەوەرانیش یان لە ماڵی خۆیاندا یان لە جێگەیەکی بچوکدا ئیشیان دەکرد. چونکە کارگە زۆر کەمبوو و کارگەکانیش هێندە گەورە نەبوون تا خەڵکێکی زۆر تیایدا ئیش بکەن.
لەگەڵ دەست پێکردنی شۆڕشی پیشەسازیدا، لە سەدەی هەژدەهەمدا هەموو ئەمانە گۆڕان. کاتێك ئەو ئامێرانە دروست کران کە دەتوانن لە ماوەیەکی کەمدا زۆرترین بەرهەم بێنن، کارگە دروست کرا، بۆیە هەر زوو زوو کارە دەستیەکان بەرەو لاواز بون و نەمان چون و کریکار و پیشەوەران ناچار بوون، بۆ ئیشێك بگەڕین لای ((خاوەن کارگە)) کان. لەبەرامبەر کرێ دەستێکدا کە پێیان بدەن. کاتێك کرێکارەکان توشی کێشەیەك دەبون کەسێك نەبوو گوێیان لێ بگرێت. بارودۆخیش لە کارگەکانی لۆکەدا لە بەریتانیا زۆر خراپ بوو؛ بۆیە کرێکارەکان سەندیکایەکیان دروست کرد. چونکە هەستیان دەکرد ئەگەر یەك بگرن. هەلی گوێگرتن بۆ مەلزلومیەت و داواکاریەکانیان زیاتر دەگیرێت.
ئەم سەندیکایانە لە شارەکاندا وەکو یانەیەکی بچوك بۆ پیشەوەرە پسپۆڕەکان دامەزرا. لە ساڵی ١٨٦٨ دا لە شاری مانسستەردا، یەکەمین کۆنگرەی سەندیکاکان بەسترا. کە یەکەمین ڕێکخراوی پیشەیی سەرکەوتوو بوو.
لە ڕوژانی سەرەتای کۆماری ئەمریکادا سەندیکاکان زۆر پێویست بوون. بەڵام

ڕێكخستنی زۆر دژوار بو. چونكه ڕای گشتی لەگەڵیدا نەبوو.
لەساڵی ١٧٩٢ دا هەشت كارگەی پێڵاو دروست كردن لە فیلادلفیا دا، یەكەمین سەندیكایان دروست كرد. بەڵام تەمەنی ئەم سەندیكایە كەمتر لە ساڵێك بوو. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا سەندیكاكان یەكێتی پیشەییان پێك هێنا بۆ هەموو شارەكان.
یەكێتی سەندیكای كرێكارانی میكانیك یەكەمینی ئەو یەكێتیانە بوو، كە لە ساڵی ١٨٢٧ دا لە شاری فلادلیفیادا دامەزرا.
بەڵام یەكەمین یەكێتی لەسەر ئاستی نەتەوەیی ولاّتە یەكگرتوەكان لە ساڵی ١٨٦٦ دا دامەزرا.

## ئایا هەموو مەیمونەكان لە زیرەكیدا یەكسانن؟

مەیمون ئەو گیانلەبەرەیە كە كلكی نیە و لە مرۆڤ دەچێت و لە دارستانە ئیستیوائیە كانی ئاسیا و ئەفریقیادا دەژێت. وەكو گۆریلا و پەمپانزی و جیبۆنی دەست درێژی و مرۆڤی جەنگەڵ.
مەیمون بەوە وەسف دەكرێت كە ((هاوشێوەی مرۆڤە)) لەبەر ئەوەی لە زۆر ڕوەوە لە مرۆڤ دەچێت هەر لە ئێسكە پەیكەر و جۆر و ژمارەی دانەكانی و مێشكی، هەر چەندە مێشكی مەیمون كەمێك لەمێشكی مرۆڤ بچوكترە. تەنانەت خوێنیشی لە خوێنی مرۆڤ دەچێت. بەڵام جیاوازی سەرەكی نێوان مرۆڤ و مەیمون ئەوەیە مەیمون ناتوانێت قسە بكات.
گۆریلا گەورەترین جۆری مەیمونە، هێندەی مرۆڤ درێژە بەڵام ئەو قورستر و بەهێزترە. جیبۆن یش بچوكترینیانە و كەمترین شێوەشی لە مرۆڤ دەچێت.
لەناو مەیمونەكاندا شەمپانزی لە هەموویان زیاتر لە مرۆڤ دەچێت و لاشەی لە گۆریلا و مرۆڤی جەنگەڵ بچوكترە و لە هەموو مەیمونەكانی تریش زیرەكترە. زۆرترین توانای لاسایی كردنەوەی مرۆڤیشی هەیە. لاشەی هیچ جیاوازیەكی لەگەڵ لاشەی مرۆڤدا نیە. تەنها لە ژمارەی پەراسوەكانیدا نەبێت كە لای مرۆڤ بیست و چوار و لای شەمپانزی بیست و شەشە.
شێوەی دەم و چاویشی گۆشتیە و جگە لە هەردوو دەست و دەم و چاوی هەموو لاشەی بە توك داپۆشراوە. كاتێك پیر دەبێت، پیری لە دەوری و دەمیدا بە دیار دەكەوێت و ڕەنگی دەم و چاوی بەرەو ڕەش دادەگەڕێت.

دەتوانرێت شەمپانزی لەگەڵ ژیانی ناو باخچەی ئاژەڵاندا زوو ڕابهێنرێت و، ڕاو کردنیشی زۆر ئاسانە. توشی زۆر لەو نەخۆشیانەش دەبێت کە توشی مرۆڤ دەبێت. وەکو نەخۆشی سی و شیرپەنجە و هەندێکیشیان بەو نەخۆشیانە دەمرن.
شەمپانزیەکان مەیمونی کۆمەڵایەتین و بە ئاسانی و خێرایی فێری لاسایی کردنەوەی مرۆڤ دەبن. هێندێکیان هێندە هوگری بەخێوکەرەکانیان دەبن، کاتێك نەخۆش دەکەون هاواریان پێ دەکەن و جگە لەوانیش ئامادە نین دەرمان بە دەستی کەسی تر بخۆن!
زانایان لیستێکیان داناوە کە بیست دەنگی جیاوازی تیایە گوایە ((زمانی شەمپانزیە))!

## ئەنیشتاین

بە ئەلبیرت ئەنیشتاین دەوترێت ((باوکی فیزیای نوێ)).
ئەنیشتاین لە ١٤ ئازاری ١٨٧٩ لە شاری ((ئولم)) ی ئەڵمانیا لەدایك بوە. کە گەیشتە تەمەنی یەك ساڵان گواستیانەوە بۆ شاری ((مشن)) و ئەنیشتاینی منداڵی خۆی لەوێدا تەواون کرد.
ئەنیشتاین منداڵێکی زۆر شەرمن بوە و حەز و ئارەزوی لە منداڵیدا زۆر بووە. لای دایکی فێری ژەنینی ئامێری پیانۆ بوە و زۆر بە تواناش بوە تیایدا.
هەر لە منداڵیەوە گرنگیەکی بێ ئەندازەی بە کەرەستە زانستەکان داوە و لە بیرکاریدا زۆر زیرەك بووە. بەڵام لە بابەتەکانی تردا مام ناوەندی.
کە گەیشتە پانزە ساڵان خێزانەکەیان گواستیانەوە بۆ ئیتالیا، لەوێشەوە چو بۆ زانکۆی زیوریخ لە سویسرا و وردە وردە بلیمەتی تێدا دەرکەوت. دەرکەوت کە لێکۆڵەرێکی نائاساییە لە بواری فیزیا و بیرکاریدا.
لە ساڵی ١٩٠٠ خوێندنی تەواو کرد، ویستی ببێتە ماموستا بەڵام پلەیەکی شیاوی بە دڵی خۆی دەست نەکەوت. لەبەر ئەوە پەیوەندی کردە نوسینگە ((باتنت)) ی سویسریەوە لە بێرن بە پلەی نووسەر.
هەر لەوێدا ئاشنایەتی لەگەڵ کچی خوێنکاری زانستی یوگوسلاویدا پەیداکرد بە ناوی ((میلیڤیا ماریك)) و کردیە هاوسەری خۆی و بەرهەمی ئەم خێزانە دوو کوڕ بوو.
لە کاتی دەست بەتاڵیدا ئەنیشتاین خەریکی لێکۆڵینەوەی زانستی بوو هەوڵی

دەدا كێشە ئاڵۆزەكانی فیزیا چارەسەر بكات.
لە ساڵی ١٩٠٥ دا لێكۆڵینەوەیەكی بە پێنج لاپەڕە بلاو كردەوە، كە تیایدا شۆڕشێكی لە زانینی فیزیا نوسیبو. پاش ئەوە بە ماوەیەكی زۆر كەم ئەنیشتاین بوو بە زانایەكی بەناوبانگ. یەكێك لەو پێنج لاپەڕەیە پەیوەندی بە ((بیردۆزی ڕێژەییەوە)) هەبوو. كە تیایدا باسی ئەوە دەكرد. جوڵەی ڕەها بۆ تەنە مادیەكان بیرۆكەیەكە هیچ واتایەكی نیە. بەڵكو جوڵەی ڕێژەیی بە تەنیا ئەو مانایەی هەیە.
لە هەمان لاپەڕەدا هاتوە كە قەبارە و درێژی و كات جێگیر نین و بەگوێرەی خێرایی تەنەكان دەگۆڕێن. بە تەنیا خێرایی تیشكە بە جێگیری دەمێنێتەوە. لە لاپەڕەیەكی تردا بیرۆكەی یەكسانی بونی نێوان مادە و وزەی هێنابوە گۆڕێ. دروست كردنی موشەكی ئەتۆمی لە ساڵی ١٩٤٥ دا ئەنجامی ئەو ڕێسا بەناوبانگە بوو.
لە ساڵی ١٩٠٩ دا ئەنیشتاین كرایە مامۆستای زانكۆی زیوریخ. لە ساڵی ١٩١٦ دا بیرۆكەی ((ڕێژەی گشتی)) هێنایە پێش. كە بیرۆكەیەكی زۆر ئاڵۆز بوو و تەنانەت لە سەردەمی خۆیدا لە چوار زانا زیاتر كەسی تر لیێ ی تێنگەیشت. ئەم بیردۆزەش وای كرد ئەنیشتاین ببێتە گەورەترین زانا لە جیهاندا. لە ساڵی ١٩٢١ دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت. لە ساڵی ١٩٣٣ دا و لەسەردەمی هیتلەردا ئەڵمانیای بەجێ هێشت و پلەیەكی بەرزی لە زانكۆی برنستۆنی ئەمریكادا دەست كەوت. لە ساڵی ١٩٤٠ دا بو بە هاوڵاتیەكی ئەمریكی. لە ساڵی ١٩٥٥ دا كۆچی دوایی كرد.

## بۆچی ناتوانین بفڕین؟

ئێمە ناتوانین وەكو باڵندە بفڕین، لەبەر ئەوەی باڵمان نیە! بەلاّم وشەیە قەناعەتی تەواومان پێناكات، ئەی ئەگەر باڵێكی دەستكرد لە خۆمان ببەستین ئایا دەتوانین بفڕین؟
كەواتە باڵندەكان چۆن دەفڕن؟
باڵندەكان بێگومان بە یارمەتی باڵەكانیان دەفڕن. هەروەها كێشیشیان زۆر سوكە. سەرەڕای ئەوەش تورەكە و گیرفانی هەواییان هەیە وایان لێدەكات سوكتر بن. ئیسكە سوكەكانیشیان خاڵێكی ترە، لەگەڵ شێوە بەلەمیەكی لەشیدا كەوای لێدەكات خێراتر بفڕێت، لەبەر ئەوە هەوا بەرنگاری كەمترە لە بەرامبەر لەشە شێوە بەلەمیەكاندا.

کاتێك باڵندەیەك باڵەکانی لێك دەدات. هەواکە پاڵدەنێت بۆ خوارەوە و خۆیشی بەرز دەبێتەوە. بۆ سەرەوە. ئێمە لەبەر ئەوەی لاشەمان لە لاشەی تورەکە و گیرفانی هەواشمان نیە. ماسوڵکەکانیشمان بە گوێرەی لەشمان بەهێز نیە. بۆیە ناتوانین بە باڵی دەستکردیش بفڕین.

ئەو باڵندانەی لاشەیان سوکترە دەتوانن، ئاسانتر بفرن. بەڵام باڵندە لەش قورسەکان ڕووبەڕووی گەلێك سەختی دەبنەوە لە کاتی فریندا.

بۆ نموونە: قەل و تاوس ناتوانن بەرز بفڕن، ووشتر مورغ و بەتریقیش کە دوو باڵندەی لەش قورسن هەر ناتوانن بفڕن. بەڵکو تەنها دەتوانن ڕێبکەن.

کەواتە ئەگەر باڵی دەستکردیش ببەستین هەر ناتوانین بفڕین.

## بۆچی مو لەسەر لاشەی مرۆڤ دەڕوێت؟

پەلەوەرەکان پەڕیان هەیە، مەمکدارەکانیش وەکو مرۆڤ مویان هەیە. وا بڕوا دەکرێت پەڕ و توك وایان کردبێت پەلەوەر و مەمکدارەکان لە باپیرەیان خشۆك پەرەیان سەندبێت.

لەشی مرۆڤ تەنها دوو شوێنی نەبێت هەموو شوێنەکانی تری موی، پەویش لەپی دەستی و ژێری پیێ یە. زانایان پێیان وایە ئەم مووەی سەر لاشەی مرۆڤ، لە پاشماوە کانی ئەو موە چڕەیە کە چاخەکانی پێش مێژودا لاشەی باپیرانمانی داپۆشیوە. ئاولەمە (الجنین) کاتێك دەگاتە تەمەنی ١٠٠ ڕۆژ لە سکی دایکیدا. ڕوپۆشێك لە مووی چڕ لە سەر پێستەی لەشی دروست دەبێت. دوای سەد ڕۆژی تر دەوەرێت ئەمەش پیێ ی دەوترێت ((موی ئاولەمەیی)).

موە ئاو لەمەییەکە دەگۆڕێت بۆ مویەکی نەرم ئەمەش زۆر بە جوانی لە منداڵی تازە لەدایك بودا دەبینرێت. بەڵام لە گەمەنی پێگەیشتندا ئەو موە دەبێتە هەمیشەیی و هەموو لەش دادەپۆشێت.

(تەمەنی پێگەیشتن لە کوڕاندا ١٤ ساڵان و لە کچاندا نزیکەی ١٢ ساڵانە)

لوی جنسی لەلای پێگەیشتوان گەسەسەندنی موو ڕێك دەخات. لای نێرە هۆرمۆنێکی دیاری کراو هەیە، کە موی دەم و چاو و لەش دەڕوێنێت و لەگەسەندنی قژی سەر کەمدەکاتەوە. هۆرمۆنەکانی مێیش بە پێچەوانەوە ئیش دەکەن.

زانست تا ئێستا لەوە نەگەیشتووە بۆچی مرۆڤ پێویستی بە موو هەیە! بەڵام

دەتوانین بڵێین بونی موو لەسەر برۆ و برژانگ و لوت و هەر دوو گوێ. دەمانپارێزێت لە خوڵ و تۆز و جڕ و جانەوەر.
هەروەها موی ریشیش لە چاخەکانی پێش مێژوودا یارمەتی جویێ کردنەوەی پیاوانی لە ژنان داوە. تەنانەت لە دوریشەوە ڕەنگە یارمەتی پیاوی دابێت وەکو هێمایەکی بەهێز.
داروین وای بۆچوە کە موی تەنك یارمەتی لەش دەدات بۆ رزگار بون لە ئاو و عارەق ژمارەی موەکانی پیاوێکی پێگەیشتوو (البالغ) لە نێوان ٣٠٠ بۆ ٥٠٠ هەزار مودایە. خاوەنی قژەکاڵە جوانەکان قژیان پڕترە. بەڵام خاوەنی قژە سورەکان لە هەموو کەس قژیان زبرترە و لەسەر لەشیشیان کەمترین مو دەڕوێت.

## ئاوی ناساز چی یە؟

ئاو نەتام نەبۆن نە ڕەنگی نیە. پێکهاتەی دوو گازە یەکەمیان هایدرۆجینە کە گازێکی زۆر سوکە و ئەویتریشیان ئۆکسجینە کە گازێکی زۆر قورس و کاریگەرە.
ئاو لە بونەوەردا لە سێ دۆخدا هەیە، دۆخی شلی، دۆخی ڕەقی (بەفر) دۆخی گازی (هەڵمی ئاو). ئێمە کاتێك یایبەتمەندیە جۆراوجۆرەکانی ئاو دەخوێنین. بۆمان دەردەکەوێت کە ئاو هەرگیز بە شێوەیەکی پاك و بێ گەرد لە سروشتدا نیە. دەبێت مەوادی کانزایی تواوەی تێدا بێت لەگەڵ گازاتی تواوە و ئەندامێتی تردا. بۆیە دەگمەنە لەگەڵ ((تەنیا ئاودا)) هەلس و کەوت بکەین!
بۆ نمونە: کیمیاویەن ئاوی پاك تامی نیە. بەڵام هەموو دەزانین زۆربەی جار ئاو تامێکی کەمی هەیە، چونکە ئەو بارانەی کە دەبارێت، بەناو بەرگە گازدا دێتە خوارەوە و هەندێك لەو گازانە دەمژێت کە بە ناویاندا تێدەپەڕێت.
ئۆکسجین گرنگترینی ئەو گازانایە هەر ئەوەشە وا دەکات گیانلەبەران بتوانن لە ژێر ئاودا بژین. دوەم ئۆکسیدی کاربۆن، کە گازێکی زۆر گرنگە لە ئاودا، بونیشی لە گیراوەی ئاودا (ترشی کاربۆنیك) وا دەکات ئاوەکە بتوانێت بەردە قسڵیەکان بتوێنێتەوە و ئەشکەوت و کون لەبەرد دا دروست بکات.
ترشی کاربۆنیکیش لە ئاودا کاربۆناتی قیر و مەگنیسیۆم شیتەڵ دەکات. هەر ئەوەش وادەکات ئاوەکە (ناسان) بێت. ئاوی ناساز کەفی سابون هەڵناخات و ئەگەر کوڵاندمان چینێك لە قسڵ بە دیواری ناوەوەی دەفرەکەوە جێ دەهێڵێت.
ئاوی سروشتی جگە لە گازات خوێ ی تواوەشی تێدایە. رەنگە ئاوی دەریاچە و

ڕوبارەکان تەنۆکەی نائەندامی تێدابێت، کە بە ئاسانی بەکەوێتە سەر ئاوەکە.
ئاو لە (سوڕێکی وزەیی) دا بەسەر زەویدا دابەش دەبێت. خۆر ئاو بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان، بە هەڵم کردنی لە دەریا و زەریاکاندا. لە ئاسماندا هەڵمی ئاوەکە لە شێوەی هەوردا کۆدەبێتەوە و لە شێوەی باران یان زوقوم یان بەفر یان شەونم دا، دادەبەزێت و ڕێگەی خۆی دەگرێتە بەر بەرەو ناو دەریاکان.

## هۆیەکانی ئینفلەوەنزا

ئینفلەوەنزا نەخۆشیەکی بلاوە و، هۆیەکانیشی چەندین جۆری جیاوازە لە ڤایرۆس. نەخۆشیەکی درمیە و زۆر بە خێرایی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بلاوە دەبێتەوە. کاتێك خەڵکێکی زۆر لە ناوچەیەك توشی دەبن پێ ی دەڵێن پەتای ئینفلەوەنزا.
ئایا دەزانن هۆیەکانی ئینفلەوەنزا چین؟
سێ جۆر ڤایرۆس دەبنە هۆی ئینفلەوەنزا کە بەسەر گروپەکانی (ا. ب. ج) دا پۆلێن کراون، لەمانەشەوە هەندێك گروپی تری لاوەکی دروست دەبن. ڤایرۆسی ئینفلەوەنزا لە گروپی ((ا)) هەموو دوبارە بونەوەیەکی لە دوو ساڵ بۆ سێ ساڵە.
ڤایرۆسی گروپی ((ب)) خولەکەی لە چوار بۆ پێنج ساڵە.
ئینفلەوەنزا لە هەموو تەمەنێکدا توشی مرۆڤ دەبێت، بە زۆری لە زستاندا بلاو دەبێتەوە بەهۆی کۆکین و پژمەوە لە کەسێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر. ڤایرۆسی ئەم نەخۆشیەش لە لوت و قوڕگدا جێگیر دەبێت کە دەبێتە هۆی بژمین و کۆکین و ئاوسانی قوڕگ. هەروەها لەرز و تاش دروست دەکات لەگەڵ سەر ژان و هەست کردن بە ئازاری لاشە و بێ هێزیدا تەمەنی درێژی ئەم نەخۆشیە لە سێ بۆ حەوت ڕۆژە. بە دەگمەن نەبێت نابێتە هۆی مردن، ئەوانەش لە ئەنجامی ئەم نەخۆشیەدا دەمرن، هۆیەکەی نەخۆشی ترە.
هەندێك لە جۆرەکانی ئینفلەوەنزا زۆر سوکە و هەندێکیشی کوشندەیە. پەتای ((ئینفلەوەنزای ئسپانی)) کە دوای جەنگی دوەمی جیهانی بلاوبوەوە. ژمارەی ئەو کەسانەی بەم نەخۆشیە مردن لەوانە زیاتر بون لە جەنگدا کوژران. بەلام خۆشبەختانە ئەم پەتایە دوبارە نەبووەوە.
چارەسەرێکی دیاری کراو نیە بۆ ئینفلەوەنزا، دوای چەند ڕۆژێك خۆی سوك دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەرمای وەکو ئسپرین بەکار دەهێنرێت. بۆ کەم

کردنەوەی کاریگەرە ناخۆشەکانی و ئەو پەتایەی لەگەڵیدایە.
دەتوانرێت دەرزی بەرگیری لە دژی ئەو نەخۆشیانە ئامادە بکرێت کە هۆیەکەی ئەو ڤایرۆسانەن. بەڵام لەبەر ئەوەی ئینفلەوەنزا جۆری زۆرە، بۆیە ئاستەمە چارەسەر دژی هەموو جۆرەکان ئامادە بکرێت. بەڵام ئەگەر مەترسی ئەوە کرا پەتاکە بڵاو ببێتەوە، ئەوا دەتوانرێت دەرزیەك دژی ئەو جۆرە ئینفلەوەنزایە ئامادە بکرێت کە بڵاو دەبێتەوە.
ئەوانەی کە لەش و لاریان لاوازە زیاتر توشی ئەم نەخۆشیە دەبن و دەشێت لاوازی ترسناکیان لەسەر دروست بکات.
بەڵام ئینفلەوەنزا نەخۆشیەکی هێندە مەترسیدار نیە، بۆیە نابێت توشی دڵەڕاوکێمان بکات.

## خوێنی سارد و خوێنی گەرم

لەسەر بنەمای پلەی گەرمای لەشی مرۆڤ، هەمو گیانلەبەران بۆ دوو گروپ پۆلێن کراون : خاوەنی خوێنە ساردەکان و خاوەنی خوێنە گەرمەکان.
زیندەوەرە خوێن ساردەکان ئەوانەن کە پلەی گەرمای لەشیان جێگیر نیە و بە پێ ی پلەی گەرمای دەوروبەریان دەگۆڕێت. لە بەیانیاندا ساردە و لە نیوەڕوەاندا گەرم. بۆق، کیسەڵ، مار و هەندێك ماسی لە زیندەوەرە خوێن ساردەکانن. کە لە زستاندا هێندە دادەبەزێت وایان لێدێت، دەچنە زاخەکانیانەوە لە ژێر زەویدا بۆ ئەوەی بە زیندویی بمێننەوە.
ئەگەر وا نەکەن خوێنەکەیان دەیبەستێت و دەمرن. لە زستاندا لە زاخەکانیاندا لە ژێر زەوی بە خەوتویی دەمێننەوە تا ئەو ماوەیەی پێ ی دەوترێت ((خەفتانی زستانە)) ی خۆیان بەسەر دەبەن و لەو ماوەیەدا هیچ ناخۆن.
تەنانەت کردارە جەستەییەکانیشیان زۆر سست دەبێتەوە. دەبینین کاتێك دوای خەفتانی زستانە دێنەوە سەر زەوی زۆر لاواز بوونە.
بەڵام گیانلەبەرە خوێن گەرمەکان ئەوانەن. کە پلەی گەرمای لەشیان نەگۆڕە و دەوروبەر کاریان لێناکات. لە ژێری ئەم پۆلینەشدا: مرۆڤ، سەگ، پشیلە، مانگا، شەمشەمە کوێرە و باڵندەکان و هیتریش دێن. بە هاوین و زستان پلەی گەرمای خوێن گەرمەکان جێگیرە. نموونەی ئەوانەش پلەی گەرمای ئاسایی لەشی مرۆڤ کە ٣٧,٤ پلەی سەدیە. ئەم گیانلەبەرانەش پێویستیان بە وزەی زیاتر هەیە تا

پارێزگاری له پلەی گەرمای جێگیری خۆیان بکەن.
لەبەر ئەم هۆیە گیاندارە خوێن گەرمەکان پێویستیان بە خۆراکی زیاتر هەیە. لەبەر ئەوەی کردارە جەستەییەکانیان بە درێژایی ساڵ بەردەوامە.
ئەندامی تایبەت هەیە لە لەشدا کە تەحەکوم بە پلەی گەرماوە دەکات و ڕێ نادات لە پلەی دیاری کراوی خۆی زیاد و کەم بکات.

## نیوتن

ئیسحاق نیوتن، بە یەکێك لە زانا هەرە گەورەکانی جیهان دادەنرێت. لە ٢٥ کانونی یەکەمی ساڵی ١٦٤٢ دا لە دایك بووە. لەو ساڵەدا کە گالیلۆ تیایدا کۆی دوای کردوە.
لە چەند مانگی سەرەتای ژیانیدا هیوای ئەوەی لێنەما کە لە ژیاندا بمێنێتەوە. بەلاّم نەمرد و ژیا بۆ ئەوەی ببێتە یەکێك لە زانا هەرە مەزنەکانی جیهان. لە دوانزە ساڵیدا چوە قوتابخانە و کە گەیشتە هەژدە ساڵ چوە کۆلیژی تاریتمی لە زانکۆی کارمبورج. لەوێدا بلیمەتی لە بیرکاریدا دەرکەوت و لە ساڵی ١٦٦٩ دا، بو بە مامۆستای بیرکاری لە هەمان زانکۆدا.
نیوتن هەر بە منداڵی حەزی لە دروست کردنی یاریە میکانیکیەکان کردووە. دەڵێن ڕۆژێکیان لە باخچەکەیاندا دانیشتبوو سەیری کرد سێوێك لە دارێك بەربوەوە
پرسیاری لە خۆی کرد بۆچی ئەم سێوە کەوتە سەر زەوی و بەرز نەبوەوە بۆ ئاسمان؟ زۆری بیری کردەوە و پرسیاری کرد چی ئەو سێوەی بەرەز زەوی ڕاکێشا؟
هەر بیری لەم کێشەیە دەکردەوە تا لە ئەنجامدا (یاسای ڕاکێشانی زەوی)) دانا. بە پیێ ی ئەم بیردۆزەیە هەموو شتێك لەم بونەوەرەدا شتەکانی تر ڕادەکێشێت بە هێزێك، کە لەگەڵ قەبارەکەیدا بگونجێت و بە پێچەوانەشەوە لەگەڵ ماوەی نێوانیاندا بگونجێت و بیردۆزەی ئەوەی دانا کە زەوی هەموو تەنەکان بۆ چەقی خۆی ڕادەکێشێت. لەبەر ئەوە ئەگەر شتێکت هەڵدا بۆ سەرەوە، جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی.
جگە لەو بیر دۆزەیەی نیوتن زۆر لە شتە ئاڵۆز و نهێنیەکانی تری لە سروشتدا چارەسەر کرد. دەری خست کە تیشکی خۆری سپی دێتە پێش چاو. بەلاّم لە

ڕاستیدا له حەوت ڕەنگ پێك دێت. هەروەها توانی به هۆی پوازێکەوە (منشور) ئەو حەوت ڕەنگه له یەك جیا بکاتەوە. سەلماندیشی تێکەڵ کردنی ئەو حەوت ڕەنگه ڕەنگی سپیمان دەداتێ.

نیوتن له بواری فیزیادا خزمەتی زۆری به مرۆڤایەتی کردوه که یەکێکیان ((یاسای جولانه)).

دۆزینەوە و بیردۆزەکانی له کتێبێکدا به ناوی ((المبادئ)) بلاو کراوەتەوە. لەسەر بنەمای ئەو بیردۆزە و لێکۆڵینەوانه نیوتن به ((باوکی فیزیا)) دادەنرێت. له ساڵی ١٦٨٩ دا نیوتن بو به ئەندامی پارلەمان، له ساڵی ١٧٠٣ دا به سەرۆکی ((کۆمەڵەی پاشایەتی)) هەڵبژێردرا، تا کۆچکردنی هەموو ساڵێك هەر خۆی هەڵدبژێردرایەوە له تەمەنی ٨٥ ساڵیدا چو بۆ لەندەن بۆ سەرۆکایەتی کردنی کۆبونەوەیەکی ((کۆمەڵەی پاشایەتی)) له گەڕانەوەیدا نەخۆش کەوت و له ٢٠ ئازاری ١٧٢٧ دا کۆچی دوایی کرد.

## مارە ژەهراویەکان

مرۆڤ هەر له کۆنەوە له مار ترساوە. تەنها جوڵه و ڕێکردنه نامۆیەکەی بەس بوە، بۆ ئەوەی ترس بخاته دڵی مرۆڤەوە.

زۆر لەو خەڵکانەی مار پێیانەوە دەدات له ترسی صدمەکەیدا دەمرن نەك ژەهرەکەی. تا ئێستا لێکۆڵینەوە لەسەر ٢٤٠٠ جۆر مار کراوە، دەرکەوتووە که تەنها٨٪ یان ژەهراوین. واته نزیکەی دوو سەد جۆر لەو مارانەی که لەسەرانسەری جیهاندا دۆزراونەتەوە ژەهراوین.

مار له وشکانی و ناو ئاو و ژێر زەوی و سەرداران دەژین و له سەرانسەری جیهانیشدا هەن، جگه له هەردوو ناوچه ناوچه جەمسەریەکه نەبێت.

ئەو ژەهرەی له ماردایه پیێ ی دەوترێت ((ژاری کوشندە)) که له مارێکەوە بۆ مارێکی تر ڕێژەکەی دەگۆڕێت.

هەندێك له مار ڕێژەیەکی زۆر له ژەهریان هەڵگرتووە. که بەسە بۆ کوشتنی فیلێك. هەندێکی تریان ئەوەندە کەم ژەهریان تێدایە که له زیندەوەرە، وردەکان زیاتر ناتوانێت هیچی تر بکوژێت.

مارە ژەهر زۆرەکان مەترسی زۆریان هەیە بۆ سەر مرۆڤ.

مار غودەیەکی تایبەت به ژەهری لەهەر دوو دیوی سەری هەیە، لەگەڵ غودەیەکی

بچوك له ژێر هەر دوو چاویدا.
هەروەها دوو دانیشی پێوەیە ەل لای هەردوو کاکیلەی سەرەوەی، دانەکانی کونن بۆ ڕژاندنی ژەهر لێیەوە.
دانەکانی ماری کۆبرا کە لە مارەکانی ڕۆژهەلاّتی ئاسیایە جومگەیان هەیە، بەلاّم دانەکانی ماری فایبەر لە شێوەی لولەدایە.
چۆن دەتوانین ماری ژەهراوی لە ماری بیّ ژەهر لێك جودا بکەینەوە؟
دەتوانین بە ئاسانی ماری کۆبرا بناسینەوە. پۆنەیەکی بەسەرەوەیە کە لە کلاّو دەچێت. زۆربەی کۆبراکان بەو جۆرەن. کلاّوێکیان لەسەر دایە لە شێوەی ژمارە ٧.
ماری کریت هێڵێکی سپی لەسەر پشتیەتی. ئەم هێلاّنە لە کلکەوە بە ئاشکرا دیارە، بەلاّم تا لەسەری نزیك دەبێتەوە نادیارتر دەبێت.
ماری فایبریش ڕەنگی قاوەییەکی تێرە و پەڵە پەڵەی لە شێوەی لە ئەڵماس لەسەر لاشەیەتی.

## جەمسەری باکور و جەمسەری باشور

هەردوو جەمسەری باکور و باشور بە نیسبەت ئێمەوە، سەر زەمینێکی ئاڵۆزن، لە بیرۆکەیەکی ئاڵۆز نەبێت شتێکی تر سەبارەت بەو سەرزەمینانە نازانین. خەڵکی لایان وایە ئەم دو جەمسەرە لەیەك دەچن ! بەلاّم وا نیە و جیاوازیەکانی نێوان زۆر زۆ لە لەیەکچوەکانیان زیاترە.
جەمسەری باشور بە شێوەیەکی سەرەکی لە کیشوەرێك پێك دێت پیّ ی دەوترێت ((ئەنتاکتیکا)) کە کیشوەرێکە بە بەفر و بەستەڵەك داپۆشراوە و ڕوبەرەکەی دو ئەوەندەی ڕوبەری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە.
ناوچەی جەمسەری باکوریش بریتی یەلە زەریای جەمسەری باکوری کە ئەمریکای باکور و ئوروپا و ئاسیا دەکەونە چواردەوریەوە.
جیاوازیەکی تری زۆر گەورەیان ئەوەیە کە مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕوەك بە هێواشی کۆچیان کردوە بۆ ناوچەی جەمسەری باکور، پاشان لەگەڵ ئاو و هەواکەیدا خۆیانیان گونجاندوە. بەلاّم ناوچەی جەمسەری باشور کە سەدان میل زەریا لە هەموو کیشوەرەکانی تری جودا دەکاتەوە، جگە لە ئەمریکای باشور نەبێت هیچ گیانلەبەرێکی دەشتی و مرۆڤی لیّ ناژێت. ئەو ڕوەکانەی لەوێدا دەژین زۆر

دەگمەنن و بریتین لە گیای ئەشنە و قەوزە و هەندێك ڕوەکی تر. شایانی باسە یەکێك لەو هۆکارانەی وا دەکات لە باڵندەی بگریق لەو ناوچەیەدا بژێت ئەوەیە کە لەو شوێنەدا دوژمنێکیان نیە باینکوژێت!

ئەی لە بارەی ئاو و هەوای ناوچەی جەمسەری باشوریەوە چی؟

کەش و هەوای ئەم ناوچەیە دوو سیفەتی سەرەکی ی هەیە: پلەی گەرمای نزم تەنانەت لە هاوینیشدا، زریانە بەفری زۆر سەخت لە زستاندا.

لە ناوچەی جەمسەری باکور ڕەوتە هەواییە ئاویەکانی چواردەور بەرز دەبنەوە و کەمێك یارمەتی بەرز بونەوەی پلەی گەرما دەدەن. بەڵام لە ناوچەی جەمسەری باشوریدا کە چینێك بەفری ئەستور دایدەپۆشێت، قەبارەیەکی گەورە لە هەوای سارد دروست دەبێت کە پاڵە پەستۆیەکی بەرزی هەیە. لەبەر ئەوە کەش و هەوا لە باشوردا سارد ترە تا لە ناوچەی جەمسەری باکور.

تەنانەت لە هاوینیشدا لە ناوچەی جەمسەری باشور پلەی گەرما لە ژێر خاڵی سفرەوەیە. بەڵام لە ڕۆژە گەرمەکانی هاویندا بەرز دەبێتەوە بۆ چوار پلەی سەدی. لە زستانیشدا پلەی گەرمای جەمسەری باشور لە نێوان ٢٣ و ٣٥ پلەی ژێر سفردا دەبێت!

## زریان چی یە؟

لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ دروستکراوێکی بەهێزە و دەتوانێت کۆنترۆڵی زۆر لە هێزەکان بکات. بەڵام هێشتا سروشت لە مرۆڤ بەهێزترە و دەتوانێت لە کاتی هەڵکردنی زریاندا مەترسی بخاتە دڵیەوە.

کەواتە با بزانین زریان چی یە؟

کاتێك شتێك توندوتیژ لە کەش و هەوای سروشتدا ڕوەدەدات ئەوە زریانە! دەشێت زریان لە دەریادا بایەکی بەهێز یان گەردەلولێك بێت. بەڵام لە وشکانیدا زریان واتە بایەکی بەهێز کە زۆرجار بارانێکی زۆری لەگەڵدا بێت، یان بایەکی بەهێز و هەورە تریشقەی لەگەڵدا بێت. لە زۆر ناوچەدا زریان سەدان میل دەبڕێت لە شێوەی گێژەلوکەی بازنەیدا کە بە دەوری خاڵێکدا دەسوڕێتەوە لە فشارێکی جەوزی نزمدا.

کاتێك قەبارەیەکی وشك و سارد لە هەوا لە ناوچەی جەمسەری باکورەوە هەڵ دەکات لەگەڵ قەبارەیەکی هەوای شێدار و گەرمدا، کە لە باکورەوە دەچێت، لە

ناوچەی ئیستیوائی یەکدەگرن و ئەو جۆرە زریانە دروست دەکەن.
لە هەندێك ناوچەی دیاری کراودا زمانەیەکی گەورە لە هەوای گەرم ڕێگەی خۆی دەگرێتە بەر، بەرەو ناوچە ساردەکان، سەری زمانی ئەو هەوا گەرمەش دەبێتە ناوچەی فشاری جەوی نزم. چونکە با دەکشێتە سەریا بۆیە ناوچەیەکی زریانی بە دەوریدا دروست دەبێت. کاتێك قەبارە هەوا سارد و گەرمەکە لەیەك دەدەن، هەوای گەرمی سوك سەردەکەوێت بۆ سەرەوەی هەوا ساردەکە و ئەمەش وا دەکات هەوا شێدارە گەرمەکە سارد بێتەوە و پڕی بێت لە ئاو و هەور پێك بهێنێت کە ئەنجامەکەی باران و بەفر دەبێت.
لە نیوەی باکوری گۆی زەویدا، سوڕانەوەی زەوی دەبێتە هۆی گۆڕینی با بەرەو لای ڕاست، لەبەر ئەوە ((کێژە لولکە)) بە پێچەوانەی سوڕانەوەی میلی کاتژمێرەوە دەبێت.
تیفۆن ((زریانی ئیستیوائی)) کە زریانێکە هەورە تریشقە و بارانی لەگەڵدایە لە باکوری هێڵی ئیستیوادا. عادەتەن لە کۆتایی هاوین و پایزدا ڕوەدەدات لەسەر ئاوە ئیستیوائیە گەرمەکان. کە بە ڕێگەی پێچاوپێچدا بەرەو لای ڕاست بۆ باکور و باکوری ڕۆژئاوا دەچن.
بەڵام زریانی ((تۆرنادۆ)) کە بایەکی گێژەلولکاویە و بە شێوەی هەورێکی ڕەش لە کورە یان ڕەحەتی دەچێت دەست پێ دەکات. کە زریانێکی هەورەتریشقاوی گەورە ناوچەکەی دەگرێتەوە و ئەشێت پانی لایەکی ڕەحەتیەکی لە سەد مەتر زیاتر بێت و هەرچی بەر بکەوێت کاولی دەکات. کاول کردنەکەش لە ئەنجامی ئەو خێراییە زۆرەی دابەزینی گەورەی پاڵەپەستۆی جەوی کە دەبێتە هۆی ڕوخانی ماڵان و وێرانکردنی بیناکان.
زریانەکان زۆر کاولکەرن و خەڵکی ئەو ناوچانەی ئەو زریانانەی تیا ڕوو دەدات شوێنی تایبەتیان دروست کردوە تا لە مەترسی زریان خۆیان بپارێزن!

## چۆن ئاو دەگۆڕێت بۆ شەختە ((الجليد))

ئەگەر سەیری گۆماوێك یان دەریایەك یان ڕوبارێك بکەین لە دۆخی بەستندا، دەبینین چینێك لە شەختە لە سەر ڕوی ئاوەکە دروست دەبێت.
ئایا دەزانیت گۆماو و دەریاچە و ڕوبارەکان ئەگەر لە سەرەوە تا بنی بیبەستایە زۆر شتی گرنگ لە ژیانماندا دەگۆڕا؟ ئەمە نەك کەش و هەوای دەگۆڕێ بەڵکو

چەندین گیانلەبەری ئاویشی لەناو دەدا.

كەواتە با بزانین چۆن گۆماوێك دەیبەستێت؟

كاتێك هەوای سەر گۆماوەكە سارد دەبێت، چینی سەرەوەی ئاوەكەش سارد دەبێت، ئەم سارد بونەوەیەش وا دەكات ئاوەكە لە چینە گەرمەكەی ژێری قورستر بێت بۆیە ئاوە ساردەكەش دادەبەزێت بۆ خوارەوە. ئەم كردارە بەردەوام دەبێت تا هەموو ئاوی گۆماوەكە دەگاتە نزیكەی چوار پلەی سەدی. كاتێك چینی سەرەوەی ئاوەكە لە چوار پلە سارد تر دەبێتەوە لە سەرەوە دەمێنێتەوە لەبەر ئەوە سوكترە لە ئاوی سەروی چوار پلەی سەدی.

ئێستا چینی سەرەوەی ئاوەكە ئامادەیە بۆ بەستن، لەبەر ئەوە كاتێك پلەی گەرما لە خاڵی بەستندا (سفری سەدی) دەمێنێتەوە یان لەوە كەمتر دەبێت كریستاڵە وردەكان دەست بە یەكگرتن دەكەن. ئەو كریستاڵانەش هەریەكەو شەش تیشك یان خاڵیان هەیە. كاتێك یەكدەگرن شەختە دروست دەكەن و بەوەش توێژاڵێك لە شەختە لەسەر ئاوەكە بەدیار دەكەوێت.

هەندێك جار بەفرەكە سپی و جوان و هەندێك جار تەڵخە، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە كاتێك هەر دڵۆپەیەك ئاو دەیبەستێت تلۆقەیەك لە هەوای ورد دروست دەكات. ئەو تلۆقەیەش دەلكێتە لێواری كریستاڵەكەوە. هەرچەندە ژمارەی كریستاڵەكان زیاتر بن، تلۆقەكان لە ناوەوە دەمێننەوە و بەوەش شەختە كەڵێك دەبینین.

كاتێك ئاوی ژێر شەختەكە دەجوڵێتەوە تلۆقە هەوا وردەكان پێكەوە كۆ دەبنەوە لە ژێر شەختەیەكی پاكی ڕوندا. ئاو یەكێكە لەو مەوادە دەگمەنانەی كە لە دۆخی شلیەوە دەگۆڕێت بۆ دۆخی ڕەقی و كرژ نابێت.

كاتێك ئاو دەیبەستێت بۆ سەهۆڵ بە ڕێژەی یەك بۆ نۆ بەرامبەر دەكشێت. لەبەر ئەوە نۆ لیتر ئاو دەها لیتر سەهۆڵی ڕەقمان دەداتێ. بۆیە كاتێك لولەی ئاو و رادێتەری ئۆتۆمبیلەكان لە زستاندا دەتەقن، هۆیەكەی دەگەرێتەوە بۆ بەستنی ئاو و كشانی سەهۆڵەكە.

## ئایا هەمو شیرەکان وەکو یەك وان ؟

**مرۆڤ هەر لەکۆنەوە سودی لەشیری ئاژەڵان وەرگرتوە , وەك خواردن. لەبەریتانیاو زۆربەی ئەو وڵاتانەی بەزمانی ئینگلیزی قسە دەکەن , لە مانگاوە شیریان دەست دەکەوێت. بەڵام سەرچاوەی شیری خەڵکی ئیسپانیا مەڕو مێگەلە. خێڵە عەرەبە بیابان نشینەکانیش لە حوشترەوە شیریان دەست دەکەوێت. خەڵکی مسریش گامێش سەرچاوەی سەرەکی شیریانە. لە لابلاندیش ئاسکی ڕەنە سەرچاوەی شیرەو لە پیرۆش , لاما lama گیاندارێکە لە وشتر دەچێت , بەڵام بچوکترەو دوگی نیە "لە تبت تیش ئەلیاكو لەزۆر وڵاتانیشدا بزن.**

**ئایا شیری ئەم هەمو گیانلەبەرانە یەك تایبەتمەندیان هەیە ؟ بێگومان نەخێر.**

**هەر گیانلەبەرێك شیرێکی تایبەت بەرهەم دەهێنێت کە لەگەڵ کۆرپەکەیدا بگونجێت. شیری مانگا تایبەتە بە گوێلك نەك بە منداڵی کۆرپە چونکە گوێلك لە کۆرپە نەزانترە , کەواتە شیرەکەشی خراپترە. بەڵام شیری مانگاش وەکو شیری مرۆڤ لەکاتی خواردندا , بەسە بۆ ئەوەی گوێلکەکە نەش و نما بکات و تەندروست دەرچێت.**

**شەکر لەشیری مانگادا کەمترە وەك لەشیری مرۆڤدا. بەڵام خوێ ی زیاترەو کازینی "جبنین " چوا بەرامبەر شیری مرۆڤە. کازینیش مادەیەکی پرۆتینی گرنگە.**

**سەرەڕای جیاوازی زۆر لەنێوان شیری گیانلەبەراندا , هەمو جۆرەکانی شیر چەوری و پرۆتینات و کاربۆهیدرات و مادەی کانزایی تێدایە. ئەو شیرە هەرجۆرێك بێت کە لە هەمو دونیادا مرۆڤ دەیخوات , هەمیشە مادە زیندوەکانی خۆراکی تیا دەست دەکەوێت.**

**با بەراوردێك بکەین لەنێوان شیری مانگاو شیری ئاسکی ڕەنەدا :**

**شیری مانگا نزیکەی ٨٨٪ی ئاوە. بەڵام ڕێژەی ئاو لەشیری ئاسکی ڕەنەدا ٦٦٪.**
**ڕێژەی چەوری لەشیری مانگادا نزیکەی ٤٪ لە ڕەنەدا ١٧٪ شیری ڕەنە نیو هێندەی شیری مانگا شەکری تێدایە. بەڵام سێ بەرامبەر کازینی تێدایە لەگەڵ پێنج بەرامبەر پرۆتیناتدا. سەرەڕای بونی جیاوازیەکی گەورە لەنێوان ئەم دو شیرەدا , بەڵام دانیشتوانی لابلاند زۆر بە ئاسایی لەگەڵ شیری ڕەنەدا دەژین !**

بگره جیاوازیەکی گەورە لەنێوان خودی جۆرەکانی مانگادا هەیە. کە لەسەر بنەچەك و تەندروستی مانگاکە دەوەستێت لەگەڵ ماوەی دۆشینی نێوان دوشیر.
ئەو بڕە شیرەی لەدوایدا دەیدۆشین چەوری زیاترە وەك لەو بڕە شیرەی لەسەرەتادا دەیدۆشین. بۆیە دۆشینی مانگاش پێویستی بە کارامەیی و پسپۆڕی هەیە.

## کرۆم چیە ؟

کرۆم کانزایەکی ڕەقی ناسکەو لە بەرامبەر خوران و ڕزاندا زۆر خۆڕاگرە. ڕەنگەکەی سپیەکی زیویەو لەکاتی پاککردنەوەدا دەدرەوشێتەوەو گەیەنەرێکی خراپە بۆ گەرمی و کارەبا.
کرۆم وەکو کانزایەکی بێ گەردو پاك لەسروشتدا نیە. بەڵکو لەگەڵ چەند کانزایەکی تردا تێکەڵە کە زۆربەیان ڕەنگیان درەوشاوەیە. بەڵام کرۆم لە کانزایەك دەردەهێنرێت کە ڕەنگەکەی ڕەشەو کێشی قورسەو ناوی (کرۆمیتە) کەخوێ یەکی کرۆمیە. گەورەترین کانی کرۆمیش لە باشوری ئەفەریقیاو یەکێتی سۆڤێتی پێشوو فلیپین و زیمبابوێ (ڕۆدیسیا) دایە.
زۆربەمان کرۆم دەناسین چونکە لە بیچمی ئۆتومبیلدا بەکاردەهێنرێت. بەڵام گرنگترین بەکارهێنانی کرۆم لە داڕشتنی ئاسندایە. بەکارهێنانی هەندێك کرۆم لەگەڵ ئاسندا وادەکات ئاسنەکە بەهێزترو ڕەقترو تەمەن درێژتر بێت.
کرۆم بەشێکی زۆر گرنگە کە نایەڵێت ئاسنەکە ژەنگ بهێنێت بۆ نمونە لە پیشەسازی چەقۆو کەوچك و قاپ و قاچاخ و بۆری ئاودا بەکاردەهێنرێت. لەگەڵ کەرەستەو کەلوپەلی شیرەمەنی و ئامێرە پزیشکیەکانیشدا وەکو ڕوپۆشێکی درەوشاوە دەدرێت لە کەرەستە کانزاییە جۆراوجۆرەکان بۆ ئەوەی ژەنگ نەهێنن.
ڕوپۆش کردنی تەنەکان بە کرۆم کردارێکە پێی دەوترێت (پلێت کردن بەکارەبا ).
یەکەمجار پلێت کردن بە کارەبا بۆ جوانکردن و پاراستنی کاتژمێر بەکارهێنراوە.
لەساڵی ١٩٢٥ وە کۆمپانیایەکی دروست کردنی ئۆتۆمبێلیش دەستیان دایە پلێت کردن بە کرۆم. لەئێستادا پیشەسازی ئوتومبیل گەورەترین بەکارهێنەری پلێت بەکرۆمە.

پارچەی ئەو ئۆتۆمبیلانەی کە دەبێت زۆرترین تەمەن بکەن , بەزۆری بەکرۆم ڕوپۆش دەکرێن. ئەو پارچە ڕوپۆش کراوانەش دەتوانرێت بەبێ گریس و ڕۆن کردن ئیشیان پێ بکرێت.

مادەی کرۆمیت (خوێی کرۆم ) لە خۆشەکردنی پێستەو بۆیاخی جلوبەرگدا بەکاردەهێنرێت. هەروەها زۆرێك لە تێکەڵەی ڕەنگاوڕەنگی کرۆمی لە بۆیاخ و کرێمدا بەکاردەهێنرێت.

## هۆکانی سەرئێشە چین ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە دەشێت شتێك یان هەموشتێك بێت. هۆی سەرئێشە دەشێت یەکێك لەسەدان هۆبێت. سەرئێشە نەخۆشی نیە , بەڵکو نیشانەیە. بەسادەیی هۆیەکە بۆ ئەوەی بزانین , تێکچون لەشوێنێکی لاشەمان یان سەرماندا هەیە.

ئەڵبەتە ئێمە شتێك سەبارەت بە ئالیەتی سەرئێشە دەزانین. بەواتا ئەوەی ڕودەدات لەلاشە یان سەرماندا و دەبێتەهۆی سەرئێشە. خودی ژانەکە لە بەشێکی تایبەتی کەللەسەرەوە دێت.دەمارەگەورەکان لەمێشکدا کە خوێن دەگوێزنەوە زۆر هەستیارن بۆ ژانکردن. خودی مێشك بۆ ژان کردن هیچ هەستیار نیە. بەڵکو پەردەکەی و ئەو دەمارانەی خوێن دەبەن و دەهێنن کاتێك ئازاریان دەگاتێ توشی سەرژان دەبین.

کاتێك دانمان یان گوێمان یان ماسولکەکانمان تێکچون یان شڵەژان تیایاندا ڕودەدات , ئەو ئازارانەی لێیانەوە دروست دەبێت سەر دەکێشێن بۆ مێشك و ئازارمان بۆ دروست دەکەن. هەروەها ئەگەر ماسولکەکانمان لەسەرمل و نزیکی سەر توشی کرژبون ببن سەرئێشەمان بۆ دروست دەکەن.

کاتێك دەبیستین خەڵکی باسی کێشەی سەرئێشەدەکەن , هۆکاری فەرمی دەدەنێ , بەلام ئەو هۆکارانە لای زۆربەی خەڵکیدا شتێکی بلاوە. هەندێك کەس کە برسییان دەبێت توشی سەرئێشەدەبن. هەندێکی تریش ئەگەر چای بەیانیان نەخۆن , یان شەو نەخەون. ئەوەی لەم حاڵەتەدا ڕودەدات ئەوەیە کە خوێنبەرەکانی کەللەسەر لای هەمویان گەورە دەبێتەوە کە دەبێتەهۆی سەرئێشە.

ئەم جۆرەی سەرژانیش پێی دەوترێت سەرژانی مولولیەکانی خوێن.

گريمان كەسێك لێدانێكى بەهێزى بەركەوت يان ملى چەمايەوە يەكسەر هەست بە سەرئێشەدەكات. يان مرۆڤ بە حاڵەتێكى شپرزەيى سۆزدارى گەورەدا تێدەپەڕێت , كە دەبێتەهۆى كرژبون يان شلەژان لە ماسولكەكانى مل لەبەشى خوارەوەى سەريدا , ئەنجامەكەى چى دەبێت ؟

بێگومان , سەرئێشە !

بەلأم (سەراسىٚ) (الشقيقه ) ژانى نيوەى سەر , جۆرێكى تايبەتە لەسەر ژانو جياوازيەكى تەواوى هەيە لەگەڵ ئەو حاڵەتانەى كە لە پێشدا باسمانكرد.

## پلێتە ئەلەمنيۆم لەچى دروست دەكرێت ؟

ئەلەمنيۆم زۆرترين كانزايەكە بە فرەيى لە توێكڵى زەويدا هەيە. لەچينى سەرەوەى زەويدا , ڕێژەكەى لەنێوان ٧ بۆ ٨٪ دايە.

بەلأم ئەلەمنيۆم بەشێوەى پاكو بێگەرد لە سروشتدا نيە. بەڵكو بە تێكەڵ لەگەڵ توخمەكانى تردا هەيەو زۆر بەزەحمەت شيتەڵ دەكرێت. لەگرنگترين خاوەكانى ئەلەمنيۆم (بۆكسيت) ە كە لەبنەڕەتدا لە هايدرۆكسيدى ئەلەمنيۆم پێك دێت.

ئەم جۆرە گڵەسورە ڕێژەى ٤٠ بۆ ٦٠٪ ئۆكسيدى ئەلەمنيۆمى تێدايە.

ئەلەمنيۆم چەند تايبەتمەنديەكى هەيە كە واى لێدەكات بۆ زۆرشت بەسودبێت , لەوانە كێشى سوكە , كێشى يەك لەسەر سێى كانزاكانى وەكو ئاسنو مسو نيكلو زينكە. گەيەنەرێكى باشە بۆ كارەبا , بەلأم نەگەيەنەرێكى باشە بۆ گەرما. چونكە ڕوەلوسو بريقەدارەكەى تيشكى گەرميەكە پێچەوانە دەكاتەوە.

ژەنگ ناگرێتو ناڕزێت كاتێك هەوا لەگەڵ ئەلەمنيۆمدا يەكدەگرن بەخێرايى لەگەڵ ئۆكسجينەكەدا كارلێك دەكەن بۆ دروست كردنى چينێكى تەنكى ڕەقى بىٚ ڕەنگ كە دەبێتەهۆى پاراستنى لەكارلێكى ترى كيمياوىو بەوەش ژەنگ دروست ناكات.

لەبەر ئەم هۆيانە ئەلەمنيۆم لە پيشەسازى پلێت دا بەكاردەهێنرێت. پلێت بريتى يەلە پەرەكێكى كانزايى , ئەستوريەكەى (٠,١٢٧٠) مليمەترە يان كەمترە. بۆ ڕێك كردنى هەر كانزايەك بۆ ئەو تەنكيە , مرۆڤ پێويستى بە ئامێرى زۆر ورد هەيە. لەبەر ئەوەى بچوكترين جياوازى لە ئەندازەدا لەسەر پلێتەكە دەردەكەوێت.

جۆرەها كارگە دروست كراوە بۆ ڕێك كردنى ئەلەمنيۆم و كانزاكانى تر بۆ پلێت بەو ئەستوريەى كە پێويستە.
ئەلەمنيۆم نەرمەو قابيلە بۆ كوتاندن بۆ پلێتێك كە ئەستوريەكەى (٠,٠٠٥٠٨) لە ميليمەتر بێت. بۆ دەست خستنى پلێتى قايم , قاڵبى ئەلەمنيۆم بەكاردەهێنرێت. لەم حاڵەتەدا كانزاى تر لەگەڵ ئەلەمنيۆمدا تێكەڵ دەكرێت.
ئەو پلێتە ئەلەمنيۆمانەى كە لە ماڵاندا بەكاريان دەهێنين , خۆڕاگرن لەبەرامبەر شىَ و گازاتو ڕزينو ژەنگو چەوريدا. نەبۆنو نە تاميان نيە.
گەرماش پێچەوانە دەكەنەوەو , گەرماش لێيانەوە ناچێتە ئەوديوەوە.

## سەردەمى زێڕين چى بوە ؟

لەسەردەمێكى ديارى كراوو لەناوچەيەكى ديارى كراوى جيهاندا. وا ديارە شارستانيەت گەيشتبێتە ئاستێكى نائاساييو خەڵكى شتى مەزنيان ئەنجام دابێت , ئەو جۆرە سەردەمە لەيۆنانى كۆندا تىَ پەڕيوە كە پێيان وتوە (سەردەمى زێڕينى يۆنانى ) كە لەساڵى ٥٠٠ زاينيەوە بۆ ساڵى ٤٢٩ پێش زاين بوە.
لەسەرەتاى سەدەى پێنجەمدا فارسەكان يۆنانيان داگيركرد. بەلاَم يۆنانيەكان دواى ئەوە ڕاپەڕينو فارسەكانيان لە ولاَتى خۆيان دەركرد. خەڵكى ئەسينا بونە سەركردەى جەنگەكەو بەوهۆيەشەوە ئەسينا بو بە دەوڵەمەندترين و بەهێزترين دەوڵەت لە يۆنانى كۆندا.
ئەسينا ئوستولێكى دەريايى دروست كرد. كە لە هەمو ئوستولەكانى ترى يۆنان گەورەتربوە. لەهەمولايەكەوە خێرو بێر گەيشتۆتە خەڵكى شار , هەندێكى لەڕێگەى بەرتيلو هەندێكى تريشى لەڕێگەى سەرانەو بازرگانى و كانە زيوەكانەوە بوە. بەهۆى بارى ئابورى باشەوە دانيشتوانى ئەسينا چوار بەرامبەر زياديان كردو هونەر لە شارەكەدا گەشەى سەند.
سەردەمى (بيريكليس) ئەو سەردەمە بو كە ناوى سەركردەو سياسى ى ئەغريقى (بيريكليس) ى لەخۆگرتبو. كە لەنێوان ساڵانى ٤٩٠-٤٢٩ پێش زاين ژياوە. لەو سەردەمەدا (بارسينۆن ) ى دروست كرد كە پەيكەرى خواوەندى ئەسينابو لەشارى ئەسينادا كە يەكێكە لە جوانترينو بەناوبانگترين بيناكان لەجيهاندا.

ئەوانەی لەو سەردەمەدا لەئەسینادا ژیاون , پەیکەرتاشی مەزن فیدیاس , سوقراتی فەیلەسوف , هەردو شانۆ نوسی بەناوبانگ سوفوکلیس و یورپیدس , کە مەزنترین شانۆیی درامایان لەجیهاندا نوسیوە.

هەمولایەك هاریکاری یەکتریان دەکرد بۆ ئەوەی ئەسینا زیاتر جوان بکرێتەوە. بەهۆی سامانی زۆرو هێزەوە , وای لێهات خەڵکی کاتی زۆریان هەبو. بۆیە گرنگیان دایە بواری ڕۆشنبیری و هزر. بەجۆرێك هیچ کۆمەڵگەیەکی تر پێش ئەوان و دوای ئەوان ئەوەی بەخۆیەوە نەبینی.

سەردەمی زێڕینی یونانی شاکارو کارگەلێکی هونەری وای داهێنا کە تا ئێستاش کاریگەری لەسەر هەموو جیهان ماوە.

لەکۆتایی سەدەی پێنجەمی پێش زایندا جەنگ لەنێوان ئەسیناو ئسپارتەدا هەڵگیرساو ڕۆشنبیری ئەسیناش ڕوی لە کزی و هەڵوەشانەوە کردو ئەنجام سەردەمی زێڕین کۆتایی هات.

## ئەنترۆپۆلۆجیا یان زانستی مرۆڤ چیە ؟

وەکو زۆربەی زانستەکانی تر , ئەم زانستەش ناوی خۆی بەخۆیەوەیەتی , وشەی ئەنترۆپۆلۆجیا لە دو وشەی یۆنانی کۆن پێك دێت. ئەوانیش anthropos واتە مرۆڤ و logos وتای زانست دەدات. لەبەرئەوە دەبێت وشەی ئەنترۆپۆلۆجیا واتە : زانستی بینای لەشی مرۆڤ و داب و نەریت و زمان و عورف و هونەرو ئاین و شارستانیەتەکانی بێت. ئەمەش مانای ئەوەیە کە پەیوەندیەکی پتەوهەیە لەنێوان ئەنترۆپۆلۆجیاو لێکۆڵینەوە زۆرەکانی تری وەکو توێکاری و زانستی فەرمانی ئەندامەکان (فیسیۆلۆجیا) و دەرون زانی و کۆمەڵ ناسی و ڕەوشت و هی تردا.

بەلام لەڕوی ئومارەسەکردنی کرداریەوە , زانستی مرۆڤ پانتاییەکی زۆرکەم داگیردەکات. دەتوانین بڵێین زانستی مرۆڤ بۆ مەبەستە پراکتیکیەکەی لە سێ لێکۆڵینەوە پێك دێت. یەکەمیان لێکۆڵینەوەی پێگەی مرۆڤ لە سروشتداو ئەوەی لە ئاژەڵانی تری جودادەکاتەوە. ئەو سیفەتە لاشەی یانەی چیە کە لە مەیمون و ئاژەڵانی تری جیادەکاتەوە ؟ چۆن بەراوردی کەللەسەری , لەگەڵ کەللەسەری شەمپانزیدا دەکرێت ؟ ئامانج لەم لێکۆڵینەوانەش بەدواداچونی پەیوەندیەکانە

لەنێوان سیفەتەکانی لاشەی مرۆڤ و پێشکەوتن و شارستانیەتەکەی دا.
لێکۆڵینەوەی دوەم کە زانستی مرۆڤی لێ دروست دەبێت مەبەستمان نەژادی مرۆڤەکانو پۆلین کردنیانە. ئەمەش زانستی نەژادی مرۆڤایەتی یان ئەنپولۆجیای پێ دەڵێن. ئەم زانستەش لە جیاوازیەکانو جیاوازیە لاشەییەکانی نێوان نەژادەکانی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە. کەللەسەرەکان و ئێسکە پەیکەرەکانی مرۆڤی کۆن لەگەڵ کەللەسەرو ئێسکەپەیکەری مرۆڤی نوێدا بەراورد دەکات. هەروەها لێکۆڵینەوە لەسەر دابو نەریتی خێڵەکانو نەتەوە جیاوازەکان دەکات بۆ زانینی جیاوازیەکانی نێوانیانو چۆنیەتی پێشکەوتنیان.
لێکۆڵینەوەی سێ یەم لقێکی تایبەتیە لەزانستی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە. لەڕوی درێژیو کێشو شێوەی ئێسکەکان لەناو نەژادە جیاوازەکاندا. بەواتا ئەو زانستەی کە پێمان دەڵێت مام ناوەندی درێژی مرۆڤ ئەمڕۆ دەگاتە ١,٦٥ مەتر.

## کاتێك دەخەوین چی ڕودەدات ؟



هەمومان دەزانین خەو چیمان لێدەکات ؟ گورجوگۆڵیمان بۆ دەگێڕێنێتەوەو وامان لێدەکات دوبارە هەست بە چالاکی بکەین خەو ئەو شتەیە کە ئەندامو ڕیشاڵە ماندوبوەکانی لاشەمان پێویستی پێیەتی. بەلاّم ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە تا ئێستاش زانست دەستەوەستانە لە پێش کردنی تەفسیرێکی ورد. دەربارەی کە چۆن دەخەوین.
باوەڕوایە کە لەمێشکدا ناوچەیەکی زۆر ئاڵۆز هەیە پێی دەوترێت (چەقی خەوتن ) کە خوێن ڕێکی دەخات. بەڕۆژدا دەمارو ماسولکەکان لە ئەنجامی چالاکیەکانیاندا کالسیۆم لەلاشەوە دەنێرن بۆ چەقی خەوتن. لەکۆتایدا کالیسیۆمەکە چەقی خەوتن لەمیشکدا دەوروژێنێتو دەست بە ئیشکردن دەکاتو دەنوین.

ئێمە دەزانین ئەگەر ڕاستەوخۆ دەرزیەكی كالسیۆم لەچەقی خەوتن بدەین دەست بەجێ دەنوین , بەڵام ئەگەر دەرزیەكە لەدەمار بدرێت ئەوا گیاندارەكە ماوەیەكی دەوێت تا خەوی لێدەكەوێت. لەبەرئەوە دەبێت یەكەمجار چەقی خەوتن بەهۆی مەوادێكی كیمیاوی دیاریكراوەوە بوروژێنین وەك ئەوەی لەكاتی ماندوبوندا بەرهەمی دەهێنین. پێش ئەوەی چەقی خەوتن كالسیۆمەكە وەربگرێت وامان لێدەكات بنوین.

چەقی خەوتن لەكاتی خەوتندا دوو كار دەكات :

جیاكردنەوەی مێشك بەشێوەیەك كە توانامان بەسەریدا نەشكێت یان بەواتایەكی تر هۆشمان لای خۆمان نەمێنێت. ئەمەش پێی دەوترێت (خەوتنی مێشك ). كاری دوەمیشی جیاكردنەوەی یان لەكارخستنی دەمارە پەیوەستەكانە بەمێشكەوە. واتە خەواندنی ئەندامە ناوخۆیەكان و دەستو قاچمان. ئەمەش پێی دەوترێت خەوتنی لاشە. بەزۆریش ئەم دوكردارە لەكاتی خەوتندا پێكەوە ڕودەدەن. دەشێت بەجیاجیاش ڕوبدەن.

بۆ نمونە , مێشك دەتوانێت بنوێت بەڵام لاشە بێدار بێت ! سەربازێكی ماندو دەتوانێت بەدەم خەوەوە ڕێبكاتو مێشكیشی خەوتبێت ! ئەو كەسانەش بەدەم خەوەوە ڕێدەكەن هەمان شتن !

خەوتنی مرۆڤ جۆری زۆرە , لەوانە خەوی سوك , خەوی قورس , ئەوەی وادەكات سەرخەو شكاندن ماندویەتی مرۆڤ دەربكات ئەوەیە كە لەو ماوە كورتەدا ئەو كەسە خەوێكی قوڵی كردوە !

## تۆپی سەبەتە چۆن ئەو ناوەی وەرگرت ؟

تۆپی پێ ئەو یاریەیە كە زۆرترین بینەری لەئەمەریكادا هەیە. زۆرجار بەم یاریەدەڵێن (یاری نێو دەوڵەتی ) لەبەرئەوەی لەوڵاتە پێشكەوتوەكاندا ئەم یاریە دەكرێت. بەڵام تۆپی سەبەتە وەكو یاریەكانی تر چەندین سەدەی نەویستوە تا بەرەبەرە پێش بكەوێت. بەڵكو پیاوێك بەناوی (جیمس ئای نایسمیت ) لەساڵی ١٨٩١ دا دایهێنا. نایسمیت ویستی یاریەك پێشكەش بكات كە سەرنجی خوێندكارەكانی بەشی وەرزشی خوێندنگای سێر نیگفیلد سكول ی شاری

نیگفیلدی ویلایەتی ماساشوستی ئەمریکا ڕابکێشێت.
ناسیمیتی کەنەدی ، هەردو یاری (لاکرۆس)ی هیندیو تۆپی پێی بەریتانی تێکەڵ کرد بۆ ئەوەی یاری گونجاوی سێ یەم لەنێوانیاندا دابهێنێت. لاکرۆس یاریەکە یاری چیەکان هەوڵ دەدەن بە لێدەرێکی درێژ تۆپەکە فڕێ دەنە گۆڵی بەرامبەرەوە.
بەڵام لەبری بەکارهێنانی لێدەر لە لاکرۆسداو بەکارهێنانی پێ لەیاری تۆپی پێدا. سمیت ئەوەی داهێنا کە یاری چیەکان دەتوانن تۆپەکە بەدەست بدەنە یەکترو بەدەست بگیرێتو بەدەست گۆڵ بکەن.
کاتێك ناسمیت یاریەکەی داهێنا ، لەبری گۆڵ سەبەتەیەکی دارینی دانا بۆیە ناوی لێنرا تۆپی سەبەتە !
وەکو یاریەکانی تریش لەیاری سەبەتەشدا ، شوێنی یاری چی بەگوێرەی تواناکەی دەبێت. ئەو یاری چیانەی توانای گۆڵ کردنیان زیاترە ، هەمیشە لەپێشەوە دادەنرێن ، بۆ ئەوەی ڕابەرایەتی هێرشی تیپەکەیان بکەن بۆ گۆڵ کردن لەتیپی بەرامبەر ئەوانەش لەناوەڕاستو دڵی گۆڕەپانەکەدان دەبێت باڵایان بەرز بێت. بەجۆرێك کە بتوانێت تۆپەکە ڕەوانەی یەکێك لە ئەندامانی تیپەکەی بکات.
باڵا بەرزیەکەی ئەو توانایەی دەداتێ ئەگەر بۆی نەکرا گۆڵ بکات ، بتوانێت تەحەکوم بە تۆپەکەوە بکاتو لەدەستی دەرنەکرێت.
گۆڵچیەکانیش ئەرکیان ئەوەیە نەهێڵن گۆڵیان لێ بکرێتو بۆیە دەبێت باڵا ڕێكو فێڵ بازو بەتوانابن بۆ ئەوەی بزانن چۆن لەگەڵ تۆپدا لەهێرشو هێرش بردندا مامەڵە دەکەن.

## کەی یاری کریکیت سەری هەڵدا ؟

بڕوا وایە کە یاری کریکیت لەسەدەی پانزەهەمدا لە بەریتانیا سەری هەڵدابێت. گومانمان نیە لەو سەردەمەدا خەڵکی ئەو وڵاتە ئەو یاریەیان کردوە ، لە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا ، ڕیکلام کردن بۆ یاریەکانی کریکیتمان بەرچاو دەکەوێت.
یەکەمین یاری کریکیت ئەنجام درابێت لەساڵی ١٧١٩ دابوە. لەساڵی ١٧٥٥

درێژی گۆڕەپانەکە بە ٢٢ یاردە (٢٠مەتر ) دیاری کراو بەرزی خاڵی کۆبونەوەی بەردەکانیش کە یاری چیەکانی تیمەکانی کریکیت هەوڵ دەدەن بەتۆپی (ئالۆکت) بێپێکن بە ١١,٢٢ ئینج (٥٦سەنتیمەتر) دیاری کراو پانیەکەشی بە ٦ ئینج ١٥ سانتیمەتر. بەڵام هیچ سنورێك نەبو بۆ درێژی لێدەرەکە.

لێدەری ئەوکاتە درێژو بازنەیی بو لەچەند ڕویەکی کەمەوە نەبێت هیچی لە لێدەری ئەمڕۆ نەدەچو. هەندێك وێنە لەو سەردەمەدا گیراون ، ئەوە پیشان دەدەن کە یاری چیەکان تراکسوتو شۆرتو گۆرەوی سپی یان لەپێ کردوەو لەگەڵ لەسەرکردنی کلاّوی جۆراوجۆردا.

یانەی هامبلدۆن کە لەساڵی ١٧٥٠دا دامەزرا ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە مێژوی کریکێت دا. هامبلدۆن گوندێکی بچوکە لەناوچەی هامشایەر. بەڵام زۆر بەخێرایی ناوبانگی دەکرد.

تیپی هامبلدۆن لەو تیپەی بردەوە کە نوێنەرایەتی هەمو ئوروپای دەکرد. یاریگای لۆرد بۆ کریکیت لەساڵی ١٧٨١ دا کرایەوە. ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە پێشخستنی کریکیتدا. ئەم یاریگایە لەساڵی ١٨١٤ دا گواستیەوە بۆ ئەو شوێنەی ئێستای و یانەی ماریلبون بۆ کریکێتی دروست کرد. کە بە سێ پیتە ، یەکەمەکەی بە M.C.C بەناوبانگە.

ئەم یانەیە کە لەساڵی ١٧٨٨ دا دامەزراوە ، بو بە سەرچاوە بۆ دانانی یاساکانی یاری کریکیت. لەسەدەی هەژدەهەمدا درێژیەکانی (مجمع العصی ) بە ٢٧ ئینج دەست نیشان کرا. تا ساڵی ١٨٦٤ دان نەنرا بەوەشاندنی تۆپە دارینەکان لەسەر دەستەوە.

لەساڵی ١٨٧٧ وەکو تاقیکردنەوە یەکەمین یاری کریکیت کرا لەنێوان ئوستراليا و تیپێکی ئینگلیزیدا. بەڵام تیپی ئوسترالیا تیپی ئینگلیزی میوانی شکست دا. لەساڵی ١٨٨٠ دا ئەم یاریە بەردەوام ڕێکدەخرێت. تەنها لەساڵەکانی جەنگی جیهانی یەکەمو دوەمدا نەبێت.

## یەکەم فلیم کامەبو ؟



ئەوەی لەجێی سەرسوڕمانە. ئەو کەسانەی کە یەکەمین فلیمیان بەرهەم هێنا. هیچ کاتێك گرنگیان بە فلیم نەدەدا. ئەوانەی یەکەمین داهێنانیان کرد لەم بوارەدا خەڵکانێك بون , دەیانویست لێکۆڵینەوە لەسەر جوڵەی گیانلەبەران بکەن. تەنانەت (تۆماس ئەدیسۆن ) یش کە یەکەمین ئامێری نمایش کردنی داهێنا لەساڵی ١٨٩٣ داو بە (کینتۆ سکۆب ) ناسرابو. تەنها وەکو شتێکی تازەو دەگمەنو سەرنج ڕاکێش بیری لێ کردەوە. بەڵام زۆرکەس هەبون سەیریان کرد دەتوانرێت سودی زۆر لەو ئامێرە وەربگیرێت بۆ سەرگەرمی بۆیە سودیان لێ وەرگرت بۆ سازدانی فیلم.

سەرەتا تەنها وێنەی شتە جوڵاوەکان دەگیران وەکو شەپۆلی دەریا, ئەسپ سواری , یاری منداڵان و ئەو شەمەندەفەرانەی دەگەیشتنە وێستگەکان. بەڵام یەکەمین فلیمی ڕاستەقینە لە (تاقیگەکانی ئەدیسۆن) دا بەرهەم هێنرا لەساڵی ١٩٠٣ دا کەناوی (دزینی شەمەفدەفەرێکی گەورە ) بو و لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا هەڵایەکی زۆری نایەوە. لەمانگی تشرینی دوەمی ١٩٠٥ دا لەشاری پێتسبۆرگی ویلایەتی بنسلیڤانیادا یەکەمین سینەمای بەردەوام لە ئەمەریکادا کرایەوە.

ئەم شانۆ سینەماییە بەنەخشو نیگاری زۆر جوان و گران ڕازێنرایەوە و خاوەنەکەی ناوی (نیکلۆدیۆن) ی لێنا.

پاشی ئەوە هەر زۆربە خێرایی لە سەرانسەری وڵاتە یەکگرتوەکاندا نیکلۆدیۆناتی تر بڵاوبونەوە.

D.W.grifith ی ئەکتەر لەبەناوبانگترین دەرهێنەرو بەرهەم هێنەری ئەم سینەمایەبوو یەکەمین کەسیش بو کە کامێرای جوڵاند لەکاتی وێنەگرتنی

ديمەنەكاندا. لەگەڵ ئەوەشدا هونەرى نوسينى سينەمايى نوێيشى باش دەزانى.
لەساڵى ١٩١٤دا گريڤيت فليمى (لەدايك بونى نەتەوەيەكى )بەرهەم هێنا كە يەكێكە لە بەناوبانگترينى ئەو فليمانەى كە لەسەر جەنگى ناوخۆى ئەمريكا قسە دەكات. ئەم فليمە لەو سەردەمەدا برى ٧٥٠ هەزار دۆلارى ئەمريكى تێچو , كە تا ئەو بەروارە هيچ فليمێكى تر ئەو برە پارەيەى تىَ نەچوە.
دواى ئەوە سيسيل بى رۆميلو چيبسى لاسكى دەستيان دايە فليمێك بەناوى the scoman (هندى سور ) هۆليۆد بوبە پايتەختى سينەما لە جيهانداو كۆمپانيا تازەكان چون بۆ هۆليۆد بۆ بەرهەم هێنانى فليمى نوىَ.

## چۆن چێشت كولاّندن دەستى پىَ كرد ؟

ئێمە دەتوانين سەوزەو زۆر لە ميوەكان بە نەكولاّوى بخۆين بەلاّم دەبێت گۆشتو ماسى بكولێنين. هۆكەى چيە.
هەمومان دەزانين گۆشتو ماسى بە كولاّوى يان برژاوى تامو چێژى لەگۆشتە كاكەڵە خۆشترە. بەلاّم هۆيەكى گرنگتر هەيە ئەوەيەكە ئەگەر گۆشتو ماسى نەكولێنين ئەوا زيندەوەرە ئەندامیە زۆر بچوكەكان دەچنە لاشەمانەوەو نەخۆشيمان بۆ دروست دەكەن. بەناوبانگترين ئەو نەخۆشيانە "لەرزو تا يان ترخينە " يە ئەم نەخۆشيەش لەئەنجامى خواردنى گۆشتى بەرازى نەكولاّودا يان كەم كولاّودا توشى مرۆڤ دەبێت. بەلاّم هەمو جۆرەكانى ماسى ئەگەر نەكولێنرێت , دەشێت مرۆڤ توشى كرمى شريتىو مشەخۆرەكانى تر بكات.
بێگومان لاى مرۆڤى سەرەتايى هيچ رێگەيەكى ترنەبوە , جگە لەوەى چێشتەكەى بە نەكولاّوى بخوات. چونكە هيچ هۆيەكى چێشت لێنانى نەبوە. كاتێك مرۆڤ ئاگرى دۆزيەوە سەرەتا بۆ خۆگەرم كردنەوەو دواى ئەوەش بۆ دورخستنەوەى ئاژەڵە درندەكان لەخۆى بەكارى هێناوە.
ئەشێت مرۆڤ بەرێكەوت كولاّندنى چێشتى دۆزيبێتەوە. لەوانەيە ئەو ئاژەلاّنەى كوشتويانە يان ئەو پارچە گۆشتەى بەدەستيانەوە بوە , لەدەستيان كەوتبێتە ناو ئاگرو كاتێك سەيريان كردوە رەنگى گۆشتەكە گۆراوەو بۆنێكى خۆشى دەكردوە. كە خواردوشيانە , لەگۆشتى نەكولاّو خۆشتربوە , بۆيە لەوەوە مرۆڤ بريارى دا

ئیتر گۆشت ببرژێنێت یان بکوڵێنێت.
مرۆڤی سەرەتا هیچ قاپو قاچاخێکی نەبوە بۆ چێشت لێنان بۆیە ، بەردە گەرمەکانی دەوری ئاگرەکەی بەکارهێناوە بۆ لێنانی خواردنەکەی. یەکەمین فرنیش بریتی بوە لە چاڵێکی بە بەرد هەڵچێنراو و ئاگریان تێداکردۆتەوە.
دوای ئەوە فرنی چێشت لێنانیان لەسەر زەوی دروست کردو کونێکیان بۆ دوکەڵ تیا هێشتەوەو بەردێکیشیان خستە کونی فرنەکەوە بۆ بەرگری کردن لە ساردبونەوە. دوای ئەوەش فێربون چۆن لەناو پێستەی خۆشەکراودا چێشت لێنێن. هەنگاوی دوای ئەوەش فێربون چۆن سەبەتەی لە قامیش دروستکراو بەقوڕ سواق بدەن و لێی گەڕێن تا وشك دەبێتەوە.
ئەمەش یەکەمین مەنجەڵ بوە کە مرۆڤ دروستی کردبێت. بەوجۆرە مرۆڤی سەرەتایی گەیشتە دوشێوەی سەرەکی لەچێشت لێناندا یەکەمیان سورکردنەوە بەئاگری وشك. یان کولاندن بەهەڵم بە گەرمای شێدار.

## تیشك چیە ؟

ئەگەر تیشك نەبوایە ، نەماندەتوانی دەوروبەری خۆمان ببینین ، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا نازانین تیشك چیە !
ئێمە دەزانین تیشك شێوەیەکە لە شێوەکانی وزەو دەشێت خێراییەکەی بپێورێت. بەڵام ئەو ڕێگایە نازانین کە تەسەڕوف پێدەکات ! هەروەها ئەوەش دەزانین کە تیشکی سپی جۆرێکی تایبەت نیە لەتیشك بەڵکو تێکەڵەیەکە لە هەمو ڕەنگەکان کە پێی دەوترێت "شەبەنگ".
ئێمە بە هاوکاری تیشك ڕەنگی شتەکان دەبینین ، پارچەیەك گەڵای سەوز چاومان بە سەوزی دەیبینێت ، لەبەر ئەوەی گەڵاکە هەمو ڕەنگەکان دەمژێت تەنها ڕەنگە سەوزەکە نەبێت کە پێچەوانە دەبێتەوە بۆچاو.
شوشەی شین جگە لەڕەنگی شین نەبێت ڕێگەنادات هیچ ڕەنگێکی تر پیایدا تێپەڕێت ، لەکاتێکدا هەمو ڕەنگەکانی تر دەمژێت. تیشکی خۆر وزەیە ، کاتێك هەمو گەرمیەکانی کۆبکرێتەوە ، دەتوانێت ئاگرێت بکاتەوە. تیشكو گەرما لە مەوادە سپیەکان و لەجلە تاریکەکان ساردترن.

بەلأم سروشتی تیشك چیە ؟

یەکەم کەس هەوڵی دا تەفسیری تیشك بکات "ئیسحاق نیوتن " بو. چونکە بڕوای وابو تیشك لەخانەی بچوك پێك دێت. بەلأم بەپێی ئەم بیردۆزەیەی نیوتن نەدەتوانرا تەفسیری هەندێك لەو بابەتانە بکات کە تیشکەکە دروست دەکەن. لەبەرئەوە پیاوێك بەناوی "هایگلنز" بە تەفسیرێکی ترەوە لەسەر تیشك هاتەدەرێ.

گلینز بیردۆزەی "شەپۆلی تیشکی  دانا کە بیرۆکەکەی بریتی بو لەوە کە تیشك بەشێوەی لەرینەوە یان شەپۆل دەستی پێدەکات. وەکو چۆن کاتێك بەردێك دەخەینە ئاوێکەوە شەپۆل دروست دەکات. مرومشتێك بە درێژایی ١٥٠ ساڵ لەسەر ئەوە دروست بو کە ئایا  تیشك خانەی وردیلانەیە یان شەپۆلە. بیردۆزەی شەپۆلەکان وادیارە ئەو بیردۆزەیەبو کە زۆربەی زانایان قبوڵیان کردو بیردۆزەکەی ئیسحاق نیوتن سەرەوژێربو.

بابزانین سەبارەت بە تیشك زانین ئەمرۆ لەکوێدا دەوەستێت ؟

باوەڕێکی وا هەیە کە تیشك وەکو گەردیلەو وەکو شەپۆلیش دروست دەبێت. دەشێت بۆ سەلماندنی ئەم باوەڕە تاقیکردنەوە بکرێت. چونکە وادیارە یەك وەڵام قەناعەت لەسەر ئەو پرسیارە دروست ناکات. کە تیشك چیە ؟

## لەکەیەوە پشیلە ماڵی کرا ؟



پشیلە هەر لەزۆر کۆنەوە هەبوەو هەندێك پاشماوەی پشیلە دۆزراوەتەوە کە تەمەنی ملیۆنەها ساڵ دەبێت !

ئەو پشیلە ماڵیەی ئەمرۆ دەیبینین لە پشیلەی کێویەوە هاتوە. بەلأم نازانین بەچ شێوەیەك. چونکە کرداری بەماڵی کردن لەدێر زەمانەوە بوە. ئەو هەمو جۆرە پشیلەیە کە ئەمرۆ دەیبینین لە

دوو يا سێ جۆر پشیلەی بچوکی دەشتیەوە سەرچاوەیان گرتوە , کە پێش هەزاران ساڵە لە ئوروپا و باکوری ئەفریقیا و ئاسیادا هەبونە.

باشترین خەملاندن ئەوەیە ئەو پشیلە دەشتیانە پێش پێنج هەزارساڵە بۆ یەکەمجار ماڵی کرابن. ئێمە دەزانین مسریە کۆنەکان , پێش چوار ساڵ پشیلەیان بەخێوکردوە. بەڵکو پشیلەشیان وەکو خواوەندێکی ڕاستەقینە پاراستوە !

خواوەندی (باست) یان (باخت) سەری پشیلەی پێوەیە , سەرەڕای ئەمانەش قوربانیان بۆ پشیلە داوە.

خواوەندی (ڕەع)و (ئیزیس) خواوەندی (دایکایەتیو منداڵ بون) پشیلە بوە.

کاتێك پشیلەیەك مردوە , خێزانە مسریەکان برۆیان تاشیوەو پرسەیان بۆ گێڕاوە.

ئەگەر پشیلەی پەرستگاش بمردایە ئەوا هەمو شار پرسەی بۆ دەگێڕا.

لەمسردا هەرکەسێك پشیلەیەکی بکوشتایە سزاکەی مەرگ بو ! هەروەها زۆر مۆمیای پشیلە دۆزرانەوە , کە وەکو مۆمیای پادشاو ئیشرافەکان وشك کرابونەوە.

بەڵام ڕەنگە ئوروپا تا ساڵی هەزاری زاینی پشیلەی ماڵیان نەناسیبێت. وە ئوروپاییەکان لەکۆندا هەڵوێستێکی جیاوازیان هەبوە سەبارەت بە پشیلە وەك لە مسریەکان. ئوروپیەکان باوەڕیان وابو پشیلە خواوەند نیەو گیانێکی شەڕانیە. وە وێنەی شەیتانیان لەسەر شێوەی پشیلەی ڕەش دروست کرد.

نەژادە جۆراوجۆرەکانی پشیلەی ماڵی , بە ئەندازەی جیاوازی نەژادی سەگەکان لەیەکتر جیاوازن.

## بۆچی توشی تا دەبین ؟

لەگەڵ هەست کردن بە نەخۆش کەوتنی منداڵێك یەکەم شت دایکەکان یان پزیشکەکان دەیکەن پێوانەکردنی پلەی گەرمای لەشی منداڵەکەیە.

مرۆڤێکی لەش ساغ پلەی گەرمای لەشی ٣٧ پلەی سەدیە. نەخۆشی پلەی گەرمای لەش بەرزدەکاتەوەو , بەو بەرزبونەوەیەش دەوترێت (تا). زۆر لە نەخۆشیەکان نابنە هۆی بەرزبونەوەی تا , بەڵام زۆر نەخۆشی تر هەن دەبنە هۆی تا لێهاتن. بەجۆرێك کە ئاماژەیەك بێت بۆ لاشەی ئەو مرۆڤە کە توشی نەخۆشیەك

بوه.

پزیشکەکان لەنەخۆشخانەکاندا ، بەلای کەمەوە ڕۆژی دوجار پلەی گەرمای لەشی نەخۆشەکان دەپێون و لە تەبەڵەکانیاندا تۆماری دەکەن. زۆربەی جار پزیشکەکان لەو تەبەلأنەوە دەزانن نەخۆشەکان چ نەخۆشیەکیان توشبوە ئەوەی کە جێی سەرسوڕمانە تا ئێستا نەزانراوە "تا" چی یە ؟ بەلأم دەزانین فیعلەن تا یارمەتیمان دەدات بۆ بەرەنگاری کردنی نەخۆشی کە ئەمەش هۆکارەکەیەتی :

تا وادەکات کردارە زیندوەکان و ئەندامەکانی لەش بەشێوەیەکی خێراتر کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن. لاشە زۆرترین ژمارە لە هۆرمۆنات و ئەنزیمات کە کیمیاوی گەلێکی زۆر بەسودن لەلەشدا بەرهەم دەهێنێت بەهێزێکی زیاترەوە. خانەکانی خوێنیش هەڵدەستن بە کوشتنی میکرۆبە زیان بەخشەکانی ناو لاشە بەشێوەیەکی باشتر. سوڕی خوێنیش بەخێراییەکی زۆرتر دەسوڕێتەوە. هەناسەدانیشمان خێراتر دەبێتەوە. بەو جۆرەش لاشەمان لە پاشماوەو ژەهرەکانی بەشێوەیەکی باشتر ڕزگاری دەبێت.

بەلأم لاشەی مرۆڤ بەرگەی تا لێهاتن ناگرێت بۆ ماوەیەکی درێژ یان بونەوەی زیاد لەپێویستی. ئەگەر تا لە ٢٤ کاتژمێر زیاتر درێژەی کێشا ، هەرچی پرۆتینی پەسیسە بو هەیە لەلاشەی مرۆڤدا هەموی لەناو دەبات. لەبەرئەوەی پرۆتین مادەیەکی زۆر پێویستە بۆ ژیان ، بۆیە تا ڕێگە چارەیەکی زۆر سەختە بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی نەخۆشیەکان.

## ئایا گیانلەبەران دەتوانن لەیەکتر تێبگەن ؟



ئەگەر واتای پرسیارەکەمان ئەوە بێت ، ئایا گیانلەبەران دەتوانن پەیوەندی بە یەکترەوە بکەن. بە گواستنەوەی نامەیەکی دیارکراوەوە بەشێوەی هێما یان دەنگ ؟ ئەوا وەلأمەکەمان بە بەڵێ دەبێت. بەلأم ئەگەر پرسیارەکەمان ئەوە بێت ئایا دەتوانن وەك مرۆڤ لەگەڵ یەکتردا

قسەبکەن , ئەوا بێگومان وەڵامەکەی بە نەخێر دەبێت.

تەنانەت لەنێوان مرۆڤەکانیشدا , پەیوەندی کردنو لەیەك گەیشتن تەنها بە قسەکردن نیە. ئێمە تەعبیرمان هەیە بۆ ڕونکردنەوەی مەبەستێك کاتێك شانمان یان سەرمان دەجوڵێنینەوە نیشانەی ڕازی بونو ڕازی نەبون پیشان دەدەین. یان بە دەستمان جۆرەها هێما پیشان دەدەین. ئاژەڵانیش زۆرجار دەنگو هێما بۆهەمان مەبەست بەکاردەهێنن.

کاتێك مریشکێك قیقەیەکی بەرزدەکات یان لەسەر زەوی خپ دەکات بەو هێمایە بێچوەکانی تێدەگەیەنێت کە مەترسیەك هەیە. کاتێك ئەسپێك دەحیلێنێت یان سمکۆڵان دەکات , ئەوا پەیامەکەی دەگاتە ئەسپەکانی تر. هەندێك لە ئاژەڵان دەتوانن تێبینی ئاماژە هەرە سادەکانی ئاژەڵانی تر بکەن.

کاتێك باڵندەیەك دەفڕی لە چڵێکەوە بۆ چڵێکی تر دەبینین باڵندەکانی تر بە شوێنیدا نافڕن. بەڵام ئەگەر باڵندەکە بەجۆرێکی تایبەتی هەڵفڕی بەوە باڵندەکانی تر تێدەگەیەنێت کە بەشوێنیدا هەڵفڕن.

سەگەکانیش بەزۆر شێواز پەیوەندی بە یەکترەوە دەکەن , نەك تەنها بە وەڕین. بەڵکو بە قوزاندن بە مڕاندن , بە حەپە یان بەقاچ بەرزکردنەوەو دان جیڕکردنەوە سەگەکانی تر تێدەگەیەنێت.

هەندێك لە گیانلەبەرانی تر بەهۆی بۆنەوە یەکتر تێدەگەیەنن نەك لەڕێی جوڵەو دەنگەوە. زۆربەی ئەو ئاژەڵانەی بەکۆمەڵ دەژین بۆ مانەوە لەگەڵ یەکتردا پشت بەبۆن دەبەستن. ئێمە دەزانین سەگەکان بە بۆنکردن یەکترو خەڵکیو شتەکان دەناسنەوە.

مەیمون بە زیرەکترین ئاژەڵ دادەنرێت لەگەڵ ئەوەشدا , هیچ زمانێکی نیە پێی بدوێت. بەڵکو بەدەنگو جوڵاندنەوەی دەموچاوی هەستی خۆی لەمەترسیو برسێتی و دڵخۆشی دەردەبڕێت. بەو بۆنەیەوە ئاژەڵان پێویستیان بە فێربونی "زمان" نیە. بەپێچەوانەی مرۆڤەوە کە دەبێت قسەکردن فێرببێت.

ئەوان بە غەریزە زمان فێردەبن. ئەگەر لە پێشیشدا ئاژەڵانی تریانیش لە هاوجنسی خۆیانیان نەدیبێت. لەگەڵ چاویان بەیەکترکەوت بە دەنگو جوڵەو بۆن

يەكتر تێ دەگەيەنن.

## ئايا پشيلەكان لەتاريكيدا دەبينن ؟



ڕەنگە لای هەريەك لەئێوەدا پشيلەی ماڵی هەبێتو ياری لەگەڵدا بكاتو لە باوەشی بگرێتو واهەست بكات "يەكێكە لە خێزانەكەی". بەڵام پشيلە لە نامۆترين دروست كراوەكانی خوايە لەسەر زەويدا. لەگەڵ ئەوەی هەزارەها ساڵە هۆگری لەگەڵ مرۆڤدا هەيە. بەڵام وادەزانيت ئێستا لە دارستانەوە هاتوە !

پشيلە پەيوەنديەكی بەهێزی هەيە لەگەڵ گيانلەبەرە دڕندەكانی وەكو شێرو پڵنگداو بە ڕێبازە تايبەتيەكەی خۆی وەكو ئەوان هەڵسوكەوت دەكات. بۆ نمونە:

پشيلەش وەكو ئەوان خۆی بەنێچيرەكەی مەڵاس دەداتو ئەمجا هەڵ دەكوتێتەسەری لەدواوە. وەكو چۆن شێر لەگەڵ نێچيرەكەيدا دەيكات. پشيلە دەتوانێت تا بەرزی دومەتر بەشێوەی ستونی لەهەوادا بەرزبێتەوە و توكێكی پێوەيە لەژێری پێيدا ، كە وای لێدەكات دەنگی پێی نەيەتو بەبێ دەنگ نێچيرەكەی بگرێت. قاچی ١٨ چڕنوكی پێوەيە كە دەتوانێت بيان هێنێتە دەرەوەو بيان باتەژورەوە.

ئەی كەواتە چی وادەكات پشيلە بتوانێت لەتاريكيدا ببينێت ؟

چونكە چاوێكی پێوەيە دەتوانێت لەگەڵ هەر ئەندازەيەك لەتيشكدا بگونجێت. كاتێك تيشكی ڕوناكيەكە درەوشاوەتر بێت گلێنەی چاوەكانی بچوكتر دەبێتەوە. بەڵام كە تاريك دادێت گلێنەی چاوی بە ئەندازەی چاوەكانی گەورە دەبنەوە. ئەمەش مانای وايە پشيلە لە ئەوپەڕی تاريكيدا دەتوانێت ببينێت.

پشيلە ١٩ تا ٢٠ ساڵ تەمەن دەكات.

## چۆن دەبينين ؟

چاو شێوەیەکی خڕی هەیەو وەکو ئامێرێکی وێنەگرتن ئیش دەکات. ڕەشێنیەی چاو پێی دەوترێت "گلێنە" لەناو ئەم گلێنەیەدا کونێکی بازنەیی زۆر بچوك هەیە کە تیشك لێیەوە دەچێتە ژورەوە , پێی دەوترێت "بیلبیلە ".

لەپشتی گلێنەوە , ڕەشێنەی چاو تەحەکوم بەڕێژەی ئەو تیشکەوە دەکات کە دەچێتە ناو چاوەوە. لە پێشیشیەوە عەدەسەی قۆقزی هەیە. لەبەشی دواوەی چاویشدا تۆڕێك هەیە پێی دەوترێت "تۆڕ" وێنەی ئەو شتانەی تیا دروست دەبێت کە چاو دەیبینێت. ئەم تۆڕە پەیوەستە بە مێشکەوە و لەژمارەیەکی زۆر ورد دەماری هەستیار بەتیشك پێکهاتوە.

لەنێوان عەدەسەو تۆڕدا جۆرێك لە شلەمەنی هەیە پێی دەوترێت "شێی ئاوی " بەشی سپێنەی چاو , کە پەردەیەکی دەرەوەییە پێی دەوترێت "الُصلبە ".

لێرەدا دەپرسین چاوەکان چۆن دەبینن ؟

کە تیشکی خۆر دەکەوێتە سەر گلێنەی چاو , بەناو عەدەسەکەدا تێدەپەڕێتو وێنەیەکی سەرەوخواری شتەکە دروست دەکات لەسەر تۆڕی چاو.

ئەم وێنەیە لەسەر شێوەی کارەبایی دەگاتەچاوو لەڕێگەی دەمارە بینینەکانەوە , مێشك وێنەکان پێچەوانە دەکاتەوە و دەچێتە شێوەی تەواوی خۆی. بەم جۆرە شتەکان دەبینین.

ئەم کردارە زۆر خێرایە و وێنەی شتەکە لەسەر تۆڕی چاو بۆماوەی یەك لەسەر شازدەی چرکەیەك دەمێنێتەوە و دوای ئەوە لەپێش چاو ون دەبێت. ئەگەر دوشت لەماوەی ئەو ماوەیەدا ڕوبدات وادەردەکەون کە بەردەوامن. کاتێك فلیمێك دەبینین لەیەك چرکەدا شانزە وێنە پیشان دەدات , وادەزانین مەشهەدەکە بەردەوامە.

ئەگەر تیشکەکە بەهێزبێت ڕەشێنەی چاو دەچێتەیەك , ئەگەریش کزبو ڕەشێنەکە گەورە دەبێتەوە. قوچکەکانی تۆڕ یارمەتی جیاکردنەوەی ڕەنگەکان دەدەن , لەگەڵ یارمەتی دانی دەمارەکان بۆ بینین لە ڕوناکیەکی کزدا.

## ئایا ڕوەکەکان هەناسە دەدەن ؟

هەمو گیانلەبەران بۆ ئەوەی بژین دەبێت هەناسەبدەن. بەهەناسە وەرگرتن ئۆکسجین دەمژینو بەهەناسەدانەوە دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدەین. ئۆکسجین لەگەڵ هایدرۆکاربۆناتدا یەك دەگرن بۆ بەرهەم هێنانی وزەو دوەم ئۆکسیدی کاربۆن. ڕوەكو گیاندارانیش بۆ ئەوەی بژین دەبێت هەناسە بدەن.

تەنیا جیاوازیەك لەنێوان ئاژەڵانو ڕوەکەکاندا هەیە ، ئەوەیە ئاژەڵان ئۆکسجین دەمژنو دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدەن. بەڵام ڕوەکەکان لە ڕۆژدا دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەمژنو ئۆکسجین دەردەدەن. بەڵام لەشەودا ئۆکسجین دەمژنو دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدەن. کە لە ڕۆژدا گەڵای ڕوەکەکان دوەم ئۆکسیدی کاربۆن وەردەگرن و مادەی سەوز " کلۆرۆفیل " لەگەڵاکاندا دەیگۆڕێت بۆ شەکرو ئاو ئەم کردارەش پێی دەوترێت "ڕۆشنە پێکهاتە " ئەمەش تەنها بەبونی تیشکی خۆر ڕودەدات. بۆ ڕزگاربون لە ئۆکسجینی بەرهەم هاتو لەم کردارەدا ئەوەیە ئۆکسجینەکە دەردەدات بۆکەشو شەکرەکەش وەکو خۆراك بۆ ڕوەکەکە بەکاردەبات. شەکرەکەش دەگۆڕێت بۆ کاربۆهیدرات و ترشی کاربۆنیك و ڤیتامینات.

لەشەودا کە تیشکی خۆر دیارنامێنێت کرداری "ڕۆشنەپێکهاتە " کۆتایی دێت. ڕوەکەکان بەشێك لەو شەکرەی لەڕۆژدا بەرهەمیان هێناوە بەکاردەبەن و ئۆکسجینەکەش دەمژنو دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدەن. لەبەر ئەوە ئامۆژگاریتان دەکەین بەشەوان لەژێر داراندا مەخەون.

## بۆچی خۆراکی بەستو خراپ نابێت ؟

ئەو خۆراکانەی لەپلەی گەرمای نزمدا هەڵ دەگیرێن ، بۆ ماوەیەکی درێژ خراپ نابن و دەتوانین بۆ چەند مانگێك بیان پارێزین. ئایا دەزانن بۆچی ؟

دۆزینەوەی هەڵگرتنی خۆراك بەهۆی پلەی گەرمای نزمەوە ، بەسەرهاتێکی خۆشی هەیە. لەیەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵی ١٧٩٨ دا ، هەندێك لە دۆزەرەوان لە نەرویج ، لەنزیك ڕوباری "لینا" لەباکوری سیبیریا ، چادریان هەڵدا. لەپڕ گوێیان

لەدەنگی سەگەل بو کە لە دەرەوە دەوەڕین. کە لە چادرەکانیان هاتنەدەرەوەو سەیریان کرد , سەگەکان خەریکی چاڵ کردنن لەناو بەفرەکەدا. ئەمانیش چون بەلایانەوەو سەگەکان هەڵهاتن و ئەمانیش هەر لەو شوێنەدا دەستیان کرد بەچاڵ کردنی بەفرەکە , لەپڕ لاشەی ئاژەڵێکی گەورەی لەناوچویان دیتەوە.

گۆشتی کەلاکەکە وشك ببوەوەو , ئەوانیش هەندێکیان لیْ بڕی و کردیانە چێشت سەیریان کرد تامی گۆشتەکە نەگۆڕاوەو وەکو تامی گۆشتی تازە وایە. بەوجۆرە مرۆڤ بۆی دەرکەوت کە دەتوانێت پلەی گەرمای نزم لە پاراستنی خۆراکدا بەکاربێنێت.

پرسیار لێرەدا ئەمەیە , ئایا بۆچی لەپلەی گەرمای نزمدا خۆراك خراپ نابێت ؟ مەوادە خۆراکیەکان بەهۆی پەکتریاوە شیتەڵ دەبن و لەپلەی گەرمای ئاسایدا پەکتریاکان گەشەدەکەن و بەخێراییەکی زۆر گەورە زیاد دەکەن و خواردنەکە خراپ دەکەن. بەلاْم لەپلەی گەرمای نزمدا بە تایبەت لەپلەی سفردا کە ئاوەکە دەیبەسێت لە مەوادە خۆراکیەکاندا. پەکتریاکان لە جوڵەدەکەون و لەگەشەسەندن دەوەستن. بەوەش دەتوانین خۆراکە بەستوەکە بۆ ماوەیەکی درێژ هەڵبگرین.

لەئێستادا چەندین شێوازی جۆراوجۆری هونەری بەکاردەهێنرێت بۆ پاراستنی مەوادە خۆراکیەکان. لەهەمویان گرنگتر هەڵگرتنی خواردنەکەیە لە شوێنێکی سارد دا. لەکاتی هەڵگرتنی خۆراکەکە لەشوێنی سارد دا دەبێت ڕەچاوی چەند خاڵێکی گرنگ بکەین وەکو , جۆری خواردنەکە و پلەی گەرمای شوێنەکەو ڕێژەی شێی ئەو شوێنە. پلەی گەرمای هەڵگرتن لە شوێنە ساردەکاندا لەنێوان یەك پلەی سەدی و دە پلەی سەدیدا دەبێت.

بەلاْم بەستن بە بەفری وشك واتە دوەم ئۆکسیدی کاربۆنی ڕەق یان بەهەوای شل یان بە نایترۆجین بەهای خۆراکی خواردنەکە لەدەست نادات , هەرچەندە هەندێك لە نرخی ڤیتامینەکانی کەم دەکاتەوە.

یەکێکی تر لەو شوێنانە کە خۆراکی تیا هەڵدەگیرێت یەخچاڵی ماڵانە. بەلاْم لە یەخچاڵی ماڵاندا ناتوانرێت بۆ ماوەیەکی درێژ خواردن هەڵبگیرێت.

بەهۆی بەکارهێنانی پلەی گەرمی زۆر نزمەوە , ئەمڕۆ ڕێژەیەکی زۆر لە ئایس

کرێم و گۆشت و ماسی و میوه و سه‌وزه له سه‌رانسه‌ری جیهاندا له وڵاتێکه‌وه ده‌نێردرێت بۆ وڵاتێکی تر.

## مێشك چۆن زانیاریه‌کان په‌سیسه ده‌کات ؟



په‌سیسه‌کردنی زانیاریه‌کان و بەبیرهێنانه‌وه‌یان په‌یوه‌ندیه‌کی به‌تینی له‌گه‌ڵ فێربوندا هه‌یه. زانایانی ده‌رون هه‌وڵیان داوه ته‌فسیری ئه‌وه بکه‌ن چۆن خه‌ڵکی شته‌کانیان بیرده‌که‌وێته‌وه‌و زۆریش له‌و شتانه‌ی که فێری ده‌بن له‌بیریان ده‌چێته‌وه ؟

به‌ڵام تا ئێستا هیچ که‌س هه‌مو ئه‌و وه‌ڵامانه‌ی نه‌داوه‌ته‌وه.به‌پێی یه‌کێك له‌بیردۆزه‌کان باوه‌ڕوایه مرۆڤ کاتێك فێرده‌بێت , گۆڕانکاریه‌کی مادی له‌لاشه‌یدا ڕوده‌دات. که کاریگه‌ریه‌ك یان نیشانه‌یه‌ك له‌سه‌ر مێشکی به‌جێ ده‌هێڵێت.

زانایان وای بۆ ده‌چن ئه‌و کاریگه‌ریه‌ی زاکیره له‌سه‌ر مێشك به‌جێی ده‌هێڵێت به تێپه‌ڕبونی کات هه‌ڵ ده‌بڕسکێت یان ده‌سڕێته‌وه.

ڕوداوه خۆش و ناخۆشه‌کان به‌وجۆره‌ی له‌سه‌رمان ڕویان داوه کاریگه‌ریمان له‌سه‌ر داده‌نێن که له بیرمان بمێنێت یان له‌بیرمان بچێته‌وه.

به‌ڵام به‌شێوه‌یه‌کی گشتی خه‌ڵکی ئاره‌زویان له‌بیرچونه‌وه‌ی شته ناخۆشه‌کان و یاد هێنانه‌وه‌ی شته خۆشه‌کانه خاوه‌نی مێشکه زیره‌که‌کانیش ده‌توانن کاره ئاڵۆزه‌کان زیاتر فێرببن. به‌ڵام مێشك ئه‌و زانیاریانه چۆن و له‌کوێ هه‌ڵده‌گرێت که‌پێی ده‌ڵێن زاکیره ؟

پێشتر وتمان تا ئێستاش زانایان به‌ته‌واوی نه‌یان توانیوه ته‌فسیری ئه‌وه بکه‌ن. وادیاره چه‌ند شوێنێك له‌په‌رده‌ی مێشکی مرۆڤ له‌و کرداره به‌رپرسیاره. په‌رده‌ی مێشکی مرۆڤ مه‌خزنی ئاڵۆزی پێچاوپێچی زۆر تێدایه. کاتێك ڕه‌وتێکی کاره‌بایی

بێ هێز بەو شوێنانەدا دەچێت. مرۆڤ تاقیکردنەوەکانی ڕابوردوی بیردەکەوێتەوە. ئەم ئاگادارکەرەوە کارەباییەش ناچاری مێشك دەکات ئەزمونە پەسیسەکراوە کۆنەکانی تازە بکاتەوە.

ئاشکرایە کە ڕودانی بەرکەوتنێك لەناوچەیەکی دیاری کراوی مێشکدا توشی لەبیرچونەوەمان دەکات. ئایا ئەو شوێنە بەرکەوتوە , ئەو شوێنەیە کە مێشك زانیاریەکانی تیا پەسیسە دەکات ؟

ئەوە شتێکی نەزانراوە , وەکو چۆن نازانین مێشك چۆن زانیاریەکان پەسیسە دەکات. هەندێك لە زانایان باوەڕیان وایە , پەسیسەکردنی زانیاریەکان لەمێشکدا کردارێکی کیمیاویە و هەرخانەیەك لەخانەکانی دەمار سەربەخۆ زانیاری بەهێماکراوی کیمیاوی تێدایە. هەندێکی تر لە زانایان باوەڕیان وایە زاکیرە لە ئەنجامی گۆڕانکاری بەردەوامدایە لە پێکهاتەی دەمارەکاندا.

بەکورتی هەتا ئێستا زاکیرە نهێنیەکە لە نهێنیەکانی ژیان.

## چاوە قوڵە " طاعون "

ئەو میکرۆبەی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا یەك لەسەر چواری دانیشتوانی ئوروپای کوشت تا ئێستاش کە سەدەی بیستو یەکەمە لەناو ئێمەدا دەژی. تا ئێستاش نەخۆشی چاوە قوڵە کە لە کۆندا بە نەخۆشی "مردنی ڕەش " ناسراوە. ساڵانە ١٥٠٠حاڵەتی لێ تۆمار دەکرێت لە ئەفەریقاو ئاسیاو هەردو ئەمریکادا.

بەڵام بە بەراورد لەگەڵ نەخۆشیەکانی سیل‌و مەلاریادا , کە ساڵانە ملیۆنەها کەس دەکوژن. چاوەقوڵە , وەکو سەدەکانی ناوەڕاست مەترسیدار نیە. چونکە خۆپاراستنی مومکینەو چارەسەرکردنیشی ئاسانە.

هۆی داکەوتنی چاوەقوڵە جۆرێك پەکتریایە کە پێی دەوترێت "یارسینیا بستس " ئەم میکرۆبە حەزی لە کرتێنەرەکانی وەکو ڕسق‌و مشکەو دەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر لە لاشەیاندا هەڵی بگرن‌و پاشان دەیگوێزنەوە بۆ کێچ‌و ئەویش دەتوانێت بڵاوی بکاتەوە. بۆ بەدبەختی ئەو کێچانەی کە لەسەر کرتێنەرەکان دەخۆن , دەتوانن لەسەر مرۆڤیش بخۆن , ئەم نەخۆشیە لە شارەکانی جیهانی سێ یەمیشدا بڵاودەبێتەوە. بەڵام لە ولاتەیەکگرتوەکاندا بەهۆی سمۆرەو مشکە کێوی

و سەگی مروجەوە تەنها لە گوندەکاندا بلاّودەبێتەوە.

ئەگەر نەخۆشیەکە لەڕێگەی کێچەوە گوێزرایەوە بۆ مرۆڤ ئەوا توشی چاوە قوڵەی ڕشانەوە دەبێت. لەماوەی دوڕۆژ بۆ شەش ڕۆژ توشی تا دێت لەگەڵ ئازارو ئاوساندا , لەنزیك شوێنی گەستنی کێچەکە. ئەگەر زو چارەسەر نەکرێت هەمو لەش دەگرێتەوە. کە دەبێتە سەحایاو زاتە ڕیئە.

لەگەڵ توشبون بەنەخۆشی زاتە ڕیئە ڕاستەوخۆ نەخۆشیەکە , لەڕێگەی کۆکەو پژمینەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر.

پزیشکان کە دڵنیابون کەسێك بە چاوە قوڵە توشبوە , هەڵدەستن بە چاندنی خوێنەکەی یان نمونەیەك لە ڕیشاڵی نەخۆشەکە. هەروەها لەگەڵ ئەوانەی گومانی توشبونیان لێدەکرێت بەو نەخۆشیە , وەکو کەسێکی توشبوی ڕاستەقینە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت. چونکە نەخۆشی زاتە ڕیئە ١٠٠٪ نەخۆشیەکی کوشندەیە.

## چۆن هەناسە دەدەین ؟

هەناسەدان کردارێکی بنەڕەتیە بۆ هەمو گیانداران. مرۆڤ و باڵندەو ئاژەڵان و مێروان و ڕوەکەکان پێویستیان بە ئۆکسجین هەیە , کە لە ڕێگەی هەناسەدانەوە دەستیان دەکەوێت.

زیندەوەران بەشێوازی جیاواز هەناسە دەدەن. هەندێکیان لەڕێگەی سیەکانیانەوەو هەندێکی تریان لەڕێگەی پێستەوە هەناسە دەدەن وەکو کرمی زەوی. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە و بەلامانەوە گرنگە , مرۆڤ چۆن هەناسە دەدات و لەکاتی کرداری هەناسەداندا چی ڕودەدات ؟

مرۆڤ لەڕێگەی لوت و گوێوە هەوا هەڵدەمژێت و لەڕێگەی بۆری هەواوە دەچێتە ناو سیەکانیانەوە. لەلەشدا دو سی هەیە. یەکێکیان لای ڕاستی دڵەوە و ئەوی تریان لای چەپەوە. ئەم سیانە لە ڕیشاڵ گەلێك دروست بونە کە لە تورەکەی تەڕ دەچن. لەهەر سیەکدا ملیۆنەها تورەکەی هەوایی هەیە کە بە هەناسە وەرگرتن پڕ دەبن و بە هەناسەدانەوە دادەبەزن. ئەو ئۆکسجینەی کە دەیمژین بەهۆی خوێنەوە بەناو هەمو لاشەدا دەگەڕێت و مەوادە خۆراکیەکان دەئۆکسیدێنێت.

لەماوەی کرداری ئۆکساندندا دوەم ئۆکسیدی کاربۆن‌و ئاوو مەوادی تر دەردەدات ، لەکاتی هەناسەدەرکردندا دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەچێت. لەگەڵ گەرمادا. ئەو وزەی گەرمایەش هەڵدەستێت بە چەندین کاری جۆراوجۆر لەگەڵ پاراستنی پلەی گەرمای لەشدا.

کاتێك وەرزش یان کارێکی بازویی دەکەین ، وزەی زیاتر بەکاردێنین بۆ بەرهەم هێنانی وزەی زیاتر پێویستمان بە ئۆکسجینی زیاتر دەبێت ، لەبەر ئەوە رێژەی هەناسەدان زیاتر دەبێت کاتێك خەریکی کارێکی قورس دەبین ، منداڵێکی تازە لەدایك بو لەخولەکێکدا ٦٠ جار هەناسە دەدات. بەلآم پانزە ساڵانێك لە خولەکێکدا ٢٠ جار. کە لەکاتێکدا کەسێکی پێگەیشتو لەنێوان ١٦ بۆ ١٨ جار دایە.

رێژەی هەناسەدان لای پێگەیشتوان خێراترە تا لای کەسانی بەتەمەن ، رێژەی هەناسەدان لەسەر باری تەندروستی و تەمەن‌و هەست‌و سۆز دەوەستێت. بێگومان دەتوانین بۆ ماوەیەکی زۆر کورتیش هەناسە نەدەین.

## شەمشەمە کوێرە

شەمشەمە کوێرە ، گیاندارێکی شەوگەڕە. بەڕۆژ هەموی دەخەوێت و لەشەودا چالاك دەبێت. دەتوانێت زۆر بەخێرایی بڕوات بێ ئەوەی بدات لەهیچ شتێك. تەنانەت لە چڕترین دارستانداو لەتاریکترین کاتدا. هیچ گیاندارێك یان باڵندەیەکی تر ئەو توانایەی نیە. ئەنجامی ئەم سیفەتە نا ئاساییە. بو بە مایەی سەرسوڕمانی زانایان‌و لێکۆڵینەوەی زۆر لەسەر ئەم باڵندەیە.

زۆر تاقیکردنەوە لەسەر شەمشەمە کوێرە کراوە. بەلآم لەیەکێك لە تاقیکردنەوەکاندا ژمارەیەکی زۆر لەپەت بە سەقفی خانویەکەوە هەڵواسراو ، چەند شەمشەمە کوێرەیەکیان هێناو چاویان بەستن‌و لەژورەکەدا بەرەڵاکران. سەیریان کرد هیچ کام لە شەمشەمە کوێرەکان لە پەتەکانیان نەدا.

لەم تاقیکردنەوەیە دەرکەوت کە شەمشەمە کوێرە لەکاتی فڕیندا ، چاوی بەکارناهێنێت. تاقیکردنەوەی دوەم لەهەمان ژوردا کرا ، بەلآم ئەمجارەیان دەم‌وگوێی شەمشەمە کوێرەکان بەستران ، سەیریان کرد ناتوانن بەئاسانی بفڕن‌و

زیاد لەچەند جارێك خۆیانیان بەدارو دیوارو پەتە هەڵواسراوەكانی ناو ژورەكەدا. بەپێی ئەم تاقیكردنەوەیە زانایان گەیشتنە ئەوەی شەمشەمە كوێرە لەكاتی فڕیندا پشت بەگوێ و دەمی دەبەستێت.

چی ڕودەدات ؟

لەكاتی فڕیندا شەمشەمە كوێرە , شەپۆلی دەنگی زۆر بەرز لەدەمیەوە دەر دەكات كە پێیان دەوترێت شەپۆلەكانی سەروی دەنگ یان سەروی بیستن كە لەرینەوەكەی نزیكەی یەك ملیۆن هێرتزە.

ئەو شەپۆل و لەرینەوە زۆر بەرزانە. بەهێڵێكی ڕاستدا دەچن , كە دەدەن لە بەربەستێك یەكسەر دەگەڕێنەوەو دەگەنە هەردو گوێ هەستیارەكەی شەمشەمە كوێرە.

بەوجۆرە ئەو شەپۆلانە یارمەتی شەمشەمە كوێرە دەدەن بۆ زانینی هەر بەربەستێك. كە لەماوەی فڕیندا دێتە ڕێگەی و دەتوانێت خۆی لێ بپارێزێت.

گوێی ئێمە هەستیار نیە بۆ ئەو شەپۆلە زۆر بەرزانە. ئێمە ناتوانین شەپۆلی ٢٠ هێرتز بۆ ٢٠ هەزار هێرتز زیاتر ببیستین. سەبارەت بە چاوی شەمشەمەكوێرە بۆ بینینی مێرو و كرمو نێچیرەكانی تری بەكاری دەهێنێت.

### **ماریەلاس** chameleon "الحَربا "

ماریەلاس زیندەوەرێكە زۆربەی جارەكان , ڕەنگی پێستی دەگۆڕێت. زۆركەس بڕوایان وایە بەگوێرەی ئەو شوێنەی كە تێیدا دەژی ڕەنگەكەی دەگۆڕێت بەلام ئەمە شتێكی ڕاستی نیە.

ئایا دەزانیت ماریەلاس چۆن ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت ؟

چینی سەرەوەی پێستی ماریەلاس شەفافە. بەلام چینەكانی ژێری ئەوە بریتین لە خانەگەلێك كە ڕەنگەكانی زەردو ڕەش و سوری تێدایە. ئەم ڕەنگانە لەبنەڕەتدا (حبیبات)ن دەشێت ئەم حوبیاتانە بە ئاسانی لەشوێنێكی لاشەی ماریەلاسەكەوە بچن بۆ شوێنێكی تر. كاتێك خانەكان تەنگ دەبنەوە حوبەیباتەكان لەخاڵێكدا كۆدەبنەوە. كە ڕەنگی پێستەكە ڕەش دەكاتەوە.بەلام كاتێك بەهەمو لاشەدا بلاودەبێتەوە , ئەوا ڕەنگی تر بەرهەم دێت. بەو جۆرە كشان و چونەیەكی خانەكان

ڕەنگی پێستەکە دەگۆڕێت.

بەڵام چۆن ئەو خانانە دەکشێن و دەچنەیەك ؟

کاتێك مارپەلاس تورە دەبێت یان دەترسێت مێشکی هێمایەك دەنێرێت بۆ خانەکانی ، تورەبونەکەش ڕەنگی مارپەلاسەکە دەگۆڕێت بۆ ڕەش ، بەڵام وروژاندنی دەبێتەهۆی دەرکەوتنی خاڵی زەرد لەسەر لاشەی ، کەوا دەکات ڕەنگی زەرد بێت.

تەنانەت تیشکی خۆریش ڕەنگی دەگۆڕیت و لەئەنجامی گەرمای خۆردا خانەکان دەگۆڕێن بۆ ڕەنگی ڕەش. بەلام کە دونیا گەرم و تاریك بو ڕەنگی دەگۆڕێت بۆ سەوز. لەتاریکیدا کە پلەی گەرما بەرزبێت ڕەنگی پێستەکەی بەرەو زەردێکی کراوە دەچێت.

لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەست و تیشك و گەرما ، سێ خاڵی سەرەکین لەچونەیەك و کشانی خانەکانی مارپەلاسدا. کەدەبێتەهۆی گۆڕانی ڕەنگی. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی مارپەلاس ئەوەیە ، بەو ڕەنگ گۆڕینەی دەتوانێت خۆی لە دوژمنەکانی وەکو مارو باڵندە گۆشت خۆرەکان بشارێتەوە.

## پیکاسۆ کێ یە ؟

پاپلۆ پیکاسۆ گەورەترین و بەناوبانگترین هونەرمەندی سەدەی بیستەم بو. نەك تەنیا وێنەکێش ، بەڵکو پەیکەرتاش و وێنەگرو هونەرمەندی سیرامیك و نەخشەسازی شانۆش بوە. لەماوەی ژیانیدا بیست هەزار تابلۆی لەوێنەکێشان و هەڵکۆڵین و پەیکەرو ئیشی دەست دا دروست کردوە. کارەکانی هەمو لایەنەکانی گرتبۆوەو وێنەکانیشی لە سەرانسەری جیهاندا مایەی ڕێز لێ گرتن بون.

پیکاسۆ لە ٢٥ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨١ دا لەشاری "مەقلە"ی ئیسپانیادا لەدایك بوە. جۆزی ڕۆیز پلاسکۆی باوکی لە مەقلەدا مامۆستای هونەربوە. پیکاسۆ هەر لە منداڵیەوە گرنگیەکی بێ وێنەی بەوێنەدا. زۆر لە وێنەکانی کە لە تەمەنی نۆ ساڵیدا کێشاویەتی بلیمەتی ئەو هونەرمەندە دەردەخەن. لەتەمەنی ١٥ ساڵیدا لە کۆلیژی هونەرە جوانەکانی بارشەلۆنە وەرگیراوە لەساڵی ١٩٠٤ دا لەپاریس نیشتەجێ بوو کچێکی بەناوی "فیرناندی ئۆلیڤەر " کردە هاوسەری

ژیانی خۆیو دوای ژن هێنانی ناوبانگی بلاْوبووەوە.
لەنێوان ساڵەکانی ١٨٩٩ بۆ ١٩٠٥ دا وێنەی کابارەکانو گۆڕەپانی پێشبڕکێکان و سواڵکەرو سەرخۆشەکانی دەکێشا. بەلاّم دوای ئەوە دەستی دایە وێنەکێشانی هەمو لایەنەکانی تری ژیانی مرۆڤایەتی.
دوای ساڵی ١٩٢٥ پیکاسۆ دەستی کردە دروست کردنی لاشەو سەری مرۆڤ ، لەساڵی ١٩٤٧یشدا دەستی بەدروست کردنی "فخار" لەیەکێك لە کارگەکاندا لەساڵی ١٩٤٨ دا (١٥٠) پارچە وێنەی لەسەر فخار دروست کرد. دەتوانین بە پیکاسۆ بڵێین "باوکی هونەری نویٚ". دوای تەمەنی ٨٥ بۆ ٩٠ ساڵ پیکاسۆ هەندێك دیمەنی خوراق دروست کرد. ئەم هونەرمەندە گەورەیە لە ٨ نیسانی ١٩٧٣ دا لە مۆنێری فەڕەنسا کۆچی دوایی کرد.

## قوڕی سوری چینی چیە ؟

قوڕی سوری چینی ، جۆرێکە لە قوڕی سپی لوس ، بۆ یەکەمجار چینیەکان لەدروست کردنی قاپو قاچاخی گڵیندا بەکاریان هێناوە و لەگردی "کاولنیگ" دەستیان کەوتوە. بۆیە پێیشی دەوترێت "کاولنی".
ئەم قوڕە بەڕێژەی ٤٦٪ لەدوەم ئۆکسیدی سلیکۆنو ٤٪ ئۆکسیدی ئەلەمنیۆمو ١٤٪ ئاو پێك دێت. قوڕی چینی تایبەتمەندیەکی تایبەتی خۆی هەیە ئەوەیەکە دەخرێتە ژێر پلەیەکی گەرمای زۆر بەرزەوە ، ڕەنگەکەی سپی دادەگەڕێتو لوس دەبێت. بەهۆی ئەم تایبەتمەندیەوە. کاولین ، لە پیشەسازی قاپو قاچاخو فنجانو قۆریو کتریو هی تریشدا بەکار دەهێنرێت. قوڕی سوری چینی بەڕێژەیەکی زۆر لەهندستانو فەڕەنساو بەریتانیاو ئەمریکای باشوریشدا دەست دەکەوێت.
کاولین نەك تەنها لەپیشەسازی قاپو قاچاخدا ، بەڵکو لە پیشەسازی کاغەزو کەتیرەو ڕەنگو مەوادە جوان کارەکانو پیشەسازی دەرمانیشدا بەکاردەهێنرێت ، لەگەڵ لوس کردنو پڕکردنەوەی بۆشایی کاغەزو بەهێزکردنی کەتیرەو پیشەسازی ئەو فڕنانەی کە پلەی گەرمیان زۆر بەرزە. کەواتە قوڕی سوری چینی زۆر بەسودە بۆ مرۆڤ.

هاڕاوەی کوارتزو سلیکاتی ئەلەمنیۆم لەگەڵ قوڕی چینیدا تێکەڵ دەکرێتو پاشان هەویرەکە لەناو دەنرێتو قاپو قاچاخی گڵینە لەم هەویرە دروست دەکرێت پێش ئەوەی لەپلەی گەرمای ١٣٠٠ پلەی سەدیدا وشك بکرێتەوە.
دوای دەرکردن و ساردکردنەوەی ئەو دروستکراوانە لەفڕن بە شوشە ڕوپۆش دەکرێنو بەوێنەی جوان دەڕازێندرێتەوە و دەنێردرێتە بازاڕ بۆ فرۆشتن.

## مۆنالیزا

مۆنالیزا بەناوبانگترین تابلۆیە لەجیهاندا. لیۆناردۆ داڤنشی لەنێوان ساڵانی ١٥٠٣ و ١٥٠٦ دا کێشاویەتی.
مۆنالیزا خێزانی یەکێك لە پیاو ماقوڵانی فەرەنسا بوە بەناوی "فرانسیسکۆ دیل جیۆکەندا ". بەو هۆیەوە ئەم تابلۆیە بە " جیۆکەندا"ش ناودەبرێت. ئەم تابلۆیە ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی بەناوبانگی "لوڤەر"ی پاریسدایە. کە مۆزەخانەیەکی جیهانی بەناوبانگە و دەگمەن ترین تابلۆی هونەری لەجیهاندا لەخۆ دەگرێت. کە بە پارە ناخەملێنرێت. کاتێك داڤنشی دەستی دایە وێنەکێشانی مۆنالیزا ، تەمەنی ٥١ساڵ بو و مۆنالیزاش ٢٤ ساڵ.
مۆنالیزا واڕاهاتبو هەمو دوانیوەڕۆیەکی درەنگ کە ڕوناکی کز دەبو دەچو بۆ ئستۆدیۆی مامۆستای مەزن. لیۆناردۆ زیاتر لە سێ ساڵ لەو تابلۆیەدا ئیشی کرد. لەماوەی ئەو سێ ساڵە بۆ هەچ شوێنێك بڕۆیشتایە تابلۆکەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. لەو کاتەوە بۆ ئەم تابلۆیە کەشێکی تایبەتی بۆخۆی دروست کرد.
تەعبیری دەمو چاوە ئاڵۆزەکەی بەدرێژایی چەندین سەدە ، ملیۆنەها کەسی بۆلای ئەم تابلۆیە ڕاکێشاوە. ئەو دیمەنە سروشتیەی پشتی ، پشتێنەیەکی ئاڵۆزتر بۆ تابلۆکە زیاد دەکات. تابلۆکە تەنانەت خودی لیۆناردۆشی سەرسام کردو بەبیانوی ئەوەی کە هێشتا تەواونەکراوە هەرگیز نەیدایەوە مێردی مۆنالیزا.
لەساڵی ١٥١٦ داڤنشی لە فەرەنسا کۆچی کرد بۆ ئیتاڵیا و شا فەرەنیسی یەکەم لەدۆڵی لوار کۆشکێکی زۆر جوانی پێشکەش کرد. دەڵێن دەشێت فەرەنسیسی یەکەم بڕی ٤٠٠٠ کرۆنی زێڕی دابێتە لیۆ تا مۆنالیزای لێ بکڕێت بەڵام دوای مردنی داڤنشی لەساڵی ١٥١٩دا ئەم تابلۆ بەنرخە کەوتە لای پادشایەکی

فەرەنسا. لەساڵی ١٨٠٠ کەوتە لای ناپلیۆن و لەژوری خەوتنەکەیدا هەڵی واسی. بەدرێژایی ٤٥٠ ساڵ لەدوجار زیاتر ئەم تابلۆیە لەفەرەنسا نەچۆتە دەرەوە. جاری یەکەم لەساڵی ١٩١١ لە مۆزەخانەی لۆڤەر دزراو دوای دوساڵ لە ئیتاڵیا دۆزرایەوە.

جاری دوەمیش بۆ ماوەی ٢٦ ڕۆژ لەژێر چاودێریەکی توندوتیژو بە کەفالەتێکی زۆر بو بە میوانی جۆن ئێف کەنەدیی سەرۆکی ئەمریکا.



## مرۆڤ چۆن توشی کەڕی دەبێت؟

کەڕی و گوێ گرانی دوشتی لەیەك جیاوازن کەڕی واتە نەبیستن بەشێوەیەکی تەواو. بەڵام گوێ گرانی بەسەر ئەوانەدا جێ بەجێ دەبێت کە هەندێك لەتوانای بیستنیان لەدەست دەدەن. دەشێت کەڕی شتێکی زگماکی یان لە ئەنجامی نەخۆشیەکەوە یان ڕوداوێکەوە بێت یان دوای لەدایك بون ڕوبدات.

کەڕی زگماکیش دەشێت لە ئەنجامی یەکێك لەهۆکارە جۆراوجۆرەکان بێت. ئەگەر دایکی سك پڕ لەسێ مانگی یەکەمی سك پڕیدا توشی نەخۆشی سورێژە بێت، دەشێت منداڵەکەی کەڕ ببێت ٥٠٪ی ئەو ژنانەی نەخۆشیەیان پێوەبوە منداڵی کەڕیان هێناوە.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لە حاڵەتەکان دوای لەدایك بون ڕودەدات. یەکێك لەو حاڵەتانە شەپۆلە دەنگیەکان ناتوانن بگەنە تەپڵی گوێ. بەهۆی بونی مادەیەکی مۆمیەوە لەسەر پەردەی گوێ. دەشێت تێبینی مادەیەکی مۆمی قاوەییت کردبێت لەناو گوێچکەدا. ئەم مادەیە بەڕێژەیەکی کەم و بەڕێکوپێکی دێتە دەرەوە. هەندێك جار ئەم مادەیە لەسەر پەردەی گوێ کۆ دەبێتەوە و دەبێتەهۆی گەڕاندنەوەی شەپۆلە دەنگیەکان و نایەڵێت بگەنە تەپڵەی گوێ.

لەهەندێك جاری تریشدا دەمارە ناو خۆییەکانی گوێ دەتەقن لە ئەنجامی توشبون یان دەنگێکی زۆر تیژدا کە دەبێتەهۆی کەڕبون و نەبیستن. ئەو خەڵکانەی لەناوچە قەڵەباڵغو ژاوەژاوەکاندا دەژین توشی گوێ گرانی دەبنو ناتوانن لەدەنگی بەرز زیاتر ببیستن.

لە جەنگی دوەمی جیهانیدا بەهۆی دەنگی تیژی تانكو تۆپەوە ٥٨٠٠٠ سەرباز توشی کەڕی هاتن. کاریگەری نەخۆشیەکانی ئەندامەکانی تری لاشەش دەشێت ببێتە هۆی کەڕبون. گەورەبونی تەمەنیش هێزی بیستن کەم دەکاتەوە.

سەرەڕای ئەمانە , زۆر خواردنی هەندێك دەرمان کاریگەری دەبێت لەسەر توانای بیستن. هەندێك جاریش ئێسقانێك لەناو گوێدا دەردێت کە دەبێتە هۆی کەڕبون , چونکە ڕێگری لە شەپۆلە دەنگیەکان دەکات , بگەنە بەشە سەرەکیەکانی ناو گوێچکە.

## بۆچی دەپژمین ؟

باسو ئەفسانەی زۆر لەسەر پژمین هەیە. لای هەندێك لەگەلان پژمین هێمایە بۆ بەختێکی باشو هەندێك گەلی تر بە نەحسو شومی دادەنێن.

هندیەکان وای دادەنێن پژمین لەبەردەم ئەو کەسانەی ماڵ بەجێ دێڵنو لە ماڵ دەچنەدەرەوە نیشانەی شومیە. ڕۆمانیەکانیش باوەڕیان وابوە بە پژمین گیانە شەڕەکان ڕاودەنرێن. خەڵکی سەرەتاییش بڕوایان وابوە پژمین نیشانەیە بۆ نزیك بونەوەی مردن. کاتێك کەسێك دەپژمێت ئەوانەی لەدەوروبەرین پێی دەڵێن (رحمك الله ) لەبەرئەوەی پژمین بەهێمایەکی ترسناك دادەنرێت.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لایەنە زانستیەکەی پژمین وەلاًمدانەوەیەکی , خۆڕەسە , لەکاتی وروژاندنی لایەکانی پەردەی چڵمی لوتدا. ئەوەش کاتێك ڕودەدات کە توشی سەرمابون دەبین. هەروەها دەشێت ئەو تەنە نامۆیانەش دروستی کەن کە دەچنە ناو لوتەوە. تەنانەت حەساسیەش دەشێت ئەو وروژانە دروست بکات.

پژمین هەوڵێکە لاشە پێی هەڵدەستێت بۆ دەرکردنی تەنە وروژێنەرەکان و ڕزگاربون لێیان. هەروەها هەندێك جار دەماری چاو بەهۆی تیشکی زۆر تیژەوە پژمین دروست دەکات. لەکاتی پژمین دا هەمو گیان توشی موچڕکە دەبێت.

لەبەر ئەوە ئەو هەوایە بەخێرایی ١٦٠ کیلۆمەتر لەکاتژمێرێکدا دەردەچێت بۆیە هەمو گیان دەلەرزێتەوەو چاویش بە شێوەیەکی ئوتوماتیکی دادەخرێتو دوای پژمین لاشە دەبوژێتەوە. هەندێك کەس (توتن) دەکەنە لوتیانەوە بۆ ئەوەی بپژمن. بەلاَم ئەمە زۆر زیان بەلاشە دەگەیەنێت.

## چۆن دەبیسین ؟

ڕاستیەکی زانراوە کە لە ڕێگەی گوێچکەوە هەمو جۆرە دەنگەکان دەبیسین. دەشێت گوێچکە بکەینە سێ بەشەوە : گوێی دەرەوە , ناوەڕاست , ناوەوە. هەرشتێك کە دەنگێك دەردەکات یەکەمجار دەلەرێتەوە , ئەم لەرینەوانەش جولاَنەوەی شەپۆلە دەنگیەکان دەردەکەن لەڕێگەی هۆیەکەوە کە لێیەوە ئەو دەنگە دەگاتە گوێ. گوێی دەرەوە ڕویەکی گەورەی هەیە کە دەتوانێت گەورەترین ژمارە لە شەپۆلە دەنگیەکان وەربگرێت.

کاتێك شەپۆلە دەنگیەکان دەدەن لەگوێی دەرەوە , لەڕێگەی کونی بوریەکەوە ڕاستەوخۆ دەگوێزرێنەوە بۆ گوێچکەی ناوەڕاست. لەناو گوێی ناوەڕاستدا پەردەیەك هەیە لە ئەنجامی لێدانی شەپۆلە دەنگیەکان تیایدا لەرینەوەکان دروست دەبێت.

لەپشتی پەردەکەشەوە سێ ئێسقانی بچوك هەن کە پێیان دەوترێت "المگرقە , السندان , الرکاب " کاتێك پەردە , دەست بە لەرینەوە دەکات ئەم سێ ئێسکۆکەیەش دەست بە لەرینەوە دەکەن. ئەو لەرینەوانەش دەگوێزرێنەوە بۆ سەدەفە کە بەشێکە لەگوێی ناوینو وەکو زبرك ئیش دەکات و شلەیەکی بەچوار دەوردایە و سەری دەمارەکانیش لەناو شلەکەدایە. لەئەنجامی لەرینەوەی سەدەفەکە شلەکە دەست بە لەرینەوە دەکات. کە دەبێتەهۆی چالاك کردنی سەری دەمارەکان.

ئەم چالاك کردنەش لێدان بەرهەم دەهێنێت. کە دەماری بیستن دەیگوێزێتەوە بۆ مێشكو بەوەش دەبیستین.

گوێ دەتوانێت دەنگی سوكو بەرزیش ببیستێت , بۆ ئەوەی گوێچکەمان سەلامەت بێت دەبێت بەڕێکوپێکی پاکی بکەینەوە. ئەگەرنا مۆم لەسەر پەردەی

گوێمان کۆ دەبێتەوەو ئەشێت ئەنجامەکەی کەڕبون بێت.

## نزگەرە

کاتێك کەسێك توشی نزگەرە دەبێت بۆ ئەوەی لەبیری ببەینەوە , پێی دەڵێین قسەت بە فلاَن وتوە یان شتێکت دزیوە. هەندێکی تر دەڵێن ئەو کەسەی توشی نزگەرە دەبێت بە نهێنی شتێکی خواردوە !

بەلاَم ئەم قسانە هیچ بنەمایەکیان نیەو هیچ شتێکی ئالۆز لە نزگەرەدا نیە. نزگەرە کردارێکی خۆنەویستە لاشە پێی هەڵدەستێ بۆ پاراستنی خۆی. لێرەوە ئەو پرسیارە دروست دەبێت بۆچی توشی نزگەرە دەبین ؟

پەردەیەك هەیە لەنێوان سنگو گەدەدا پێی دەوترێت (حجاب الحاجز ) کاتێك هەوا دەمژین , پەردەکە دادەبەزێتو پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر گەدە. لەبەرئەوەی هەردو سی پڕی لەهەوا دەبێت. کاتێك هەناسە دەدەین (حجاب الحاجز ) بەرزدەبێتەوەو هەوا لە سیەکانمانەوە دێتە دەرەوە.

بەمجۆرە ئەو پەردەیە بەردەوام دادەبەزێت و بەرزدەبێتەوە بێ ئەوەی هیچ دەنگێك دەربکات. ئەو پەردەیە وەکو پەستێنەرێك کاردەکات. بەلاَم لەهەندێك کاتدا و لەئەنجامی دروست بونی گازاتو ترشی زۆر لەگەدەدا دەوروژێتو لەپڕێکدا دەچێتەیەك بۆیە ئەو هەوایەی دەچێت بۆ سیەکان دەبێتە ڕێگرێك ئەو دەنگە ناخۆشە دەردەکات کە پێی دەڵێن "نزگەرە ".

ئەم کردارە کەواتە ڕێگەیەکە , لاشە هەوڵ دەدات لەڕێگەیەوە ئەو گازاتو خۆزاکە ناباشانە کە لە گەدەدایە بنێرێتە دەرەوە. بۆ ئەوەی کرداری هەناسەدان بێ بەربەست بێت.

هاتنەیەکی (حجاب الحاجز ) لە ئەنجامی خواردنەوە یان بونی ئاوسانێك لەنزیکیەوە دەبێتەهۆی نزگەرە. باشترین ڕێگە بۆ وەستاندنی نزگەرە , خواردنی پەرداخێك ئاوی ساردە. لەبەر ئەوەی ئاوی سارد هەڵچونی (حجاب الحاجز ) دادەمرکێنێت و ئەویش جموجوڵی ئاسایی خۆی دەست پێ دەکاتەوە. هەروەها دەتوانین بە هەناسەدان بۆ ماوەیەکی کورت نزگەرە نەهێڵین. نزگەرە هەندێك جاریش بە بینینی شتی ترسناك لادەچێت. بەلاَم ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆردرێژ

نەوەستایەوە باشتر وایە سەردانی پزیشك بکەین.
لەو حاڵەتەدا پزیشکان ئامۆژگاری ئەوەمان دەکەن ، ئۆکسجینێك هەڵمژین کە ڕێژەی ٥ بۆ ١٠ ٪ دوەم ئۆکسیدی کاربۆنی تێدابێت.

## زمانو دیالێکتەکان

لەسەرەتای مێژوی مرۆڤایەتیدا ، ڕەنگە هەمو خەڵکی سەرزەوی ، بەیەك زمان قسەیان کردبێت. سەرەتا ژمارەیەکی کەم لەخەڵکی یان کۆمەڵی بچوك لێرەو لەویَ بەو زمانە ڕەسەنە قسەیان کردبێت. وردە وردە ژمارەی ئەو کۆمەڵانە زیادی کردوەو خواردنی تەواویان دەست نەکەوتوەو بۆیە ناچاربونە بگوێزنەوە بۆ شوێنی ترو کۆمەڵی تازە پێك بهێننو بە تێپەڕبونی ڕۆژگاریش زمانەکەیان گۆڕانکاری بەسەرداهاتوە.
کاتێك ئەو کۆمەڵە دەگەیشتنە شوێنە تازەکەیان و لێی جێگیردەبون بەهەمان زمانی ئەوانە قسەیان دەکرد کە لێیان جویَ بوبونەوە. بەلاّم وردە وردە شێوە وتنی تازە دەهاتە ناو زمانەکەوەو ئەندامانی گروپە تازەکە شتگەلێکیان دەگوت ، تۆزێك لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیان جیاوازتر بو. دوای ئەوە گۆڕانکاریش بەسەر دەنگی وشەکاندا هات.
هەندێك لەو وشانەی کە لە نیشتمانە ئەسڵیەکەدا پێویست بو لە شوێنی تازەدا پێویست نەبو ، بۆیە لابرا. وە تاقیکردنەوە تازەکانیش پێویستیان بە وشەی تازە دەکرد بۆ ئەوەی لە شتەکان بدویَ. بۆیە دەبو شێوەی دروست کردنی ڕستەکانیش بگۆڕیایە. گریمان کۆمەڵێك لەشوێنێکدا دەژیانو کۆمەڵێکی تازەش دەهاتن بۆی ، لەوەوە هەردو زمانەکە تێکەڵ دەبونو کاریان لەیەکتر دەکرد.
لەسەرەتادا کۆمەڵە تازەکە زمانیان دەگۆڕا بۆ زمانێکی تازەتر کە پێی دەوترێت "دیالێکت " دوای تێپەڕبونی ماوەیەکی زۆر درێژ. گۆڕانکاری زۆر بەسەر وشەو دەنگەکانی ڕێزمانەکەدا دێتو بە تەواوی لەزمانە ڕەسەنە جیاواز دەبێت و ئەمیشیان بە زمانێکی تازە دادەنرێت بەم شێوەیە زمانەکانی ئیسپانی ، فەڕەنسی ، پورتوگالی لە لاتینیەوە دروست بون.
زمانەکانی ئینگلیزیو نەرویژی و سویدی و دانیمارکی و هۆڵەندی لە ئەڵمانیەوە

دروست بون. زمانی دایك لەگەڵ ئەو هەمو زمانانەی لێیەوە دروست بوە پێیان دەوترێت "خێزانی زمانەکان ".

## چاو چۆن ڕەنگەکان لەیەك جودا دەکاتەوە ؟

تائێستا زانایان بەتەواوی لەو کردارە تێنەگەیشتون , کەوا دەکات لەچاو ڕەنگەکان لەیەك جودا بکاتەوە. لەبەرئەوە لەسەر ئەو بابەتە چەندین بیردۆزە هەیە. بلاوترین بیردۆزە , کە لەسەر ئەم بابەتەوە وەرگیرابێت بیردۆزەکەی "یۆنگ هیل مۆلتر " ە کە پزیشكو زانای فیزیك دانی ئینگلیزی "تۆماس تۆنگ " لەساڵی ١٨٠١ دا پشت ڕاستی کردەوە. ئەم بیردۆزەیە , لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا زانای ئەڵمانی هیرمان فون هیل مولتز پەرەی پێدا.

بەپێی ئەم بیردۆزە تۆڕی چاو , بریتی یە لە تۆڕێك کە لە زیاتر لە ١٣٠ ملیۆن ریشاڵە پێك دێتو هەموی لەگەڵ یەکتردا پەیوەستن. ئەم ڕیشاڵی دەمارانە دوجۆرن لە وەرگری هەستیار بۆ تیشك , هەندێکیان لەشێوەی لولەکدایەو جۆرەکەی تریشی لەشێوەی قوچەکدایە.

ریشاڵە قوچەکیەکان زۆر هەستیارن بەرامبەر تیشکە ڕەنگاوڕەنگەکان. بەلاّم ئەو ریشالاّنەی لەشێوەی لولەکدان تەنها سێبەری ڕەنگی ڕەشو سپی وەردەگرن. سێ جۆر لە ڕیشاڵی قوچەکی هەیە. جۆرێکی هەستیار بۆ ڕەنگی سور. جۆرێکیشی هەستیار بۆ ڕەنگی سەوز. جۆرێکیشی بۆ ڕەنگی شین. ئەمانەش هەرسێ ڕەنگە بنەڕەتیەکەن. وە هەریەك لەو ڕیشاڵە قوچەکیانەش ڕەنگی تایبەت بەخۆیان هەیە بۆ بینین. تیشکی ڕەنگاوڕەنگیش ڕێژەیەکی جۆراوجۆر دەوروژێنێت لەهەر سێ قوچەکیەکە. بەمجۆرە ڕەنگە ناوەندیەکان دەدۆزرێنەوە کە (پێکهاتەیەکە لەڕەنگە بنەڕەتیەکان ).

بۆ نمونە : تیشکی سەوز جگە لە ڕیشاڵە قوچەکیەکانی ڕەنگی سەوز زیاتر هیچی تر ناوروژێنێت. بۆیە کاریگەری ڕەنگی زەردمان دەداتێ هەمان شێوە بەسەر ئامێری وەرگرتنی تەلەفزیۆنی ڕەنگاوڕەنگدا جێ بەجێ دەبێت.

## هێلكه چۆن دروست دەبێت ؟

ڕەنگه وابزانین دروست بونی هێلكه شتێكی ئاسانه , بەلاّم بەرهەم هێنانی كارێكی زۆر ئالۆزه. یەكەم شت كه له هێلكەدا دروست دەبێت , زەردێنەكەیەتی. زەردێنەش لەناو هێلكەدانی باڵندەكەدا دروست دەبێت.

زەردێنەكه له هێلكەدان دێتەدەرەوه و دەچێته بەشی سەروی كەناڵی زاوزێوه. لەم بەشەدا سپێنه دێته سەر زەردێنەو ئەمجا شلەكه دەچێت بۆ بەشی ژێرەوەی كەناڵەكه. تا لەوێدا پەردەو توێكڵی بچێتەسەر. لەوێوه ئیتر باڵندەكان ئامادەن بۆ هێلكەكردن. توێكڵی هێلكه زۆر ڕەقه بەلاّم كونی تێدایه. كاتێك شلەی ناو هێلكەكه هەڵم دەكات له ڕێگەی كونەكانی توێكڵەكەوه هەوا دەچێته ژورەوه و ئۆكسجین دەدات بەئاولەمەكەو گەشەی پێ دەكات.

ئاولەمه ئەو بەشەیه كه گەشەدەكات بۆ بێچوی باڵنده. لەناو توێكڵی هێلكەكەدا دو پەرده هەیه. لەلای سەرەگەورەكەی هێلكەكەوه جیادەبنەوه بۆ دروست كردنی خانەی هەوایی.

هەردو هێلكەكه سپێنەی هێلكەیان تێدایه. یان "زُلال" كه جۆرێكه لەجەلاتینیو نەڕەنگو نەبۆنی نیەو زۆربەی ئاوه. زولالەكه ڕیشاڵی زۆر ئەستوری تێدایه كه مەبەست لێی ڕاگرتنی زەردێنەكەیه له چەقی هێلكەكەدا. وەكو جۆلانەیه بۆ پاراستنی لەبەركەوتن.

زەردێنه خۆراكی ئاولەمەیه كه میكرۆبی زۆر ورد , خۆی لەناو بۆشایی زور وردی ڕوەكەیدا مەلاّس دەدات. دەتوانرێت ئەگەر زۆر به وردی سەیری زەردێنەی هێلكەی مریشك بكەین ئەو میكرۆبەی تیا ببینین. هێلكەی باڵنده لەسەر گەورەو بچوكی ناوەستێت. بەڵكو قەبارەی هێلكه لەسەر ئەو خواردنه دەوەستێت كه بەسه بۆ گەشەسەندنی ئاولەمه لەكاتی هەڵ هێناندا.

ئەو بێچوه باڵندانەی به كوێری لەدایك دەبنوبێ توانان , سەرچاوەكەیان هێلكەیەكی بچوكه , ئەوەنده خۆراكی تێدانەبوه بەس بێت بۆ ئەوەی دوای لەدایك بون ئەو بێچوه پشت بەخۆی ببەستێت.

## کێ بو یەکەمجار بیری لە ئەبجەدی کردەوە ؟

لەواقیعدا پیتە ئەبجەدیەکان هێمان بۆ دەنگەکان. پێش داهێنانی ئەبجەدی خەڵکی وێنەیان بەکاردەهێنا بۆ تۆمارکردنی ڕوداوەکان یان گواستنەوەی بیرۆکەکانیان. وێنەی چەند ئاسکێك ڕەنگە واتای ئەوە بوبێت کە "ئێرە ناوچەیەکی باشە بۆ ڕاوکردن " لەبەر ئەوە وێنەکێشان یەکێك لەشێوەکانی نوسین بوە. ئەم نوسینی وێنەییەش تا ئەندازەیەکی زۆر بابلی و مسری و چینییە کۆنەکان پەرەیان پێدا.

بەتێپەڕبونی ڕۆژگار گوڕانکاری زۆر لەنوسینی وێنەییداکرا. وێنەکە لەبری ئەوەی هێما بۆ بابەتی وێنەکە بکات ، بیرۆکەیەکی دەردەبڕی کە پەیوەندی بە بابەتی وێنەکراوەکەوە نەبو. بۆ نمونە : وێنەی (قاچێك) ئاماژەی بۆ کرداری (ڕێکردن ) دەکرد. ئەم قۆناغەش لەنوسین پێی دەوترێت "نوسینی بیرۆکەکان ".

کێشە لەم جۆرە نوسینەدا ئەوەبو هەریەکەو بە بۆچونو لێ تێگەیشتنی خۆی تەفسیری بۆ وێنەکان دەکرد. بەو جۆرە ئەو شێوازەش وردە وردە گۆڕدراو هێماکان بون بە تێکەڵ کردن لەنێوان دەنگەکاندا.

بو نمونە : وشەی دەست کە مانای (باسك) ی دەدا ، ئەوا وێنەی باسك دەبو بە هێمایەك بۆ دەنگی (دەست) بەوجۆرە هەموجارێك ئەگەر بیان ویستایە دەنگی (دەست) بڵێن ئەوا وێنەی باسکێکیان دەکێشا. دەتوانین ئەم قۆناغەش ناوبنێین بە قۆناغی "نوسینی بڕگەیی ".

بابلیو چینیو مسریە کۆنەکان هێشتا ئەم قۆناغەیان تێنەپەڕاندبو لە نوسین کە مسریەکان جۆرێك لە ئەبجەدییان داهێنا ، کە (٢٤) ئاماژەی لەخۆدەگرت. کە هێمابو بۆ پیتەکان یا وشە سەربەخۆکان کە هەریەکێکیان لەدەنگێك یان پیتێکی بێ دەنگ پێکهاتبو. بەڵام مسریەکان نرخی ئەو داهێنانەی خۆیانیان نەزانیو بەچاکی سودیان لێ وەرنەگرت. پێش نزیکەی ٣٥٠٠ ساڵ ، ئەو خەڵکەی لەنزیك لێوارەکانی ڕۆژهەڵاتی حەوزی دەریای سپی ناوەڕاستدا دەژیان هەنگاوێکی زۆر مەزنیان هەڵگرت کەبو بە بنەمای ئەم ئەبجەدیەی ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت. هەستیان بەوەکرد کە خودی هێما دەشێت بۆهەمان دەنگ بەکاربهێنرێت لەهەمو

حاڵەتەکاندا.
لەبەر ئەوە ژمارەیەکی دیاری کراویان لەهێما بەکارهێنا. بەوجۆرە لەو هێمایانەوە یەکەم ئەبجەدی پەیدابو.
عیبرانیەکان وێنەیەکی پێشکەوتویان لەو ئەبجەدیە بەکارهێنا. دوای ئەوەش فینیقیەکان هەمان شتیان کرد. فینیقیەکان ئەبجەدیەکی خۆیانیان گواستەوە بۆ گریکەکان. ڕۆمانیەکانیش کاریان بە ئەبجەدیە ئەغریقییەکە کرد بەهەندێك دەست کاریەوە. ئەوانیش بەشێوەی ئەبجەدی لاتینی دایانە دەستی ئوروپای ڕۆژئاواوە و ئەو ئەبجەدیەی لێ پەیدابو کە ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوادا بەکاردەهێنرێت.

## یەکەم گەل بنێشتی جاوی

بۆچی خەڵکی بنێشت دەجون ؟ جاوینی بنێشت جۆرێکە لەجۆرەکانی پشودان ، بەڵام خەڵکی پێش ئەوەی بنێشت بناسن شتێکیان هەر جاویوە. لەبەرئەوە خەڵکی لەزۆر شوێنی دونیادا ئەو مادە کەتیرەییانەیان جاویوە کە لە دارەکانەوە دەستیان کەوتوە. هەندێك جار گەڵای دارو ڕوەکیشیان جاویوە.
بنێشت لەپێکهاتەی مەوادە کەتیرەییەکانە ، بگرە کەتیرە خۆی ئەو مادەیە بوە کە خەڵکی بەدرێژایی سەدان ساڵ جاویویانە.تیرەکانی مایاو تیرەکانی تری ئەمریکای ناوەند ، پێش ئەوەی سپی پێستەکان پێیان بگەن جۆرێك لە بنێشتیان جاویوە.
لەڕاستیدا هندیە سورەکان لەنێو ئینگلاند مادەیەکی کەتیرەییان جاویوە کە لە دارێکەوە دەستیان کەوتوە سەربەدارە سنەوبەریەکان بوەو پێی دەوترا (راتینجی). داگیرکەرە ئەمریکیەکانیش ئەم خوە لەوانەوە فێربونە. لەسەدەی نۆزدەهەم دا ، یەکەم جۆری بنێشت کەوتە بازاڕەوە لەوڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا. کە لە مادەیەکی کەتیرەی ڕاتینجی دروست کرابو. لەشەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بنێشت پەرە پێدرا ، بەجۆرێك کە جوینی ئاسانو تامو چێژی خۆشبو. لەئەنجامی ئەوەدا جەماوەرێکی زۆری بۆخۆی دروست کردو نرخی بەرزبوەوە.
بنێشتی نوێ نزیکەی ٢٠٪ بنێشتە ، ١٩٪ شەرابی زەڕەیە ٦٠٪ شەکرە ١٪تامە.

بۆ دەست خستنی بنێشتێکی باش ، دەشێت بنێشتەکە لەگەڵ نزیکەی ٢٥٪ جۆر لەشیری دارو مەوادی تری لەو شێوەیەدا تێکەڵ بکرێت. پاشان ببێتە بنێشتێك کە تامێکی خۆشمان بداتێ.

## کێ یەکەم پردی لەجیهاندا دروست کرد ؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ڕۆژانی پێش مێژو. لەبەرئەوەی جۆگەلەو ڕوبار هەبوە بۆیە مرۆڤ ناچاربوە ، بگەڕێت بەدوای ڕێگەیەکدا کە بتوانێت لێیان بپەڕێتەوە.

ڕەنگە خودی سروشت یەکەمین پردی بۆ مرۆڤ بەستبێت ، کاتێك کە دارێك کەوتوەو بوە بەپرد بەسەر جۆگەیەکدا. زۆر بە ئاسانیش مرۆڤ توانیویەتی چاو لەوە بکات و لەهاوشێوەی ئەوە پردی لەدار دروست کردبێت و بەکاری هێنابێت بۆ ماوەیەکی دورودرێژ پێش ئەوەی ئەندازیارێك لەچاخی پێش مێژودا بیری لێ کردبێتەوە بە کەڵەك کردنی کۆمەڵێك بەرد لەناوەڕاستی جۆگەیەکداو پێکەوە بەستنی هەردو دیوی جۆگەکە بەدارێك.

بەوجۆرە مرۆڤ ئەو پردە ئاساییەی دروست کرد لەگەڵ پایەیەکی سادەدا. ئەمەش هەنگاوێك بو ، بۆ دروست کردنی چەندین پایە لەناوەڕاستی ئاوێکی پانداو دوای ئەوەش بەپردی دارین یان چەند پارچە بەردێك پێکیانەوە دەبەستن.

کاتێك مرۆڤ دوپردی دارینی لەتەنیشت یەکدا بەستو سەرەکەی داپۆشی بۆ پەڕینەوە ، لە ئەنجامدا پردی یا هوەداری لێکەوتەوە.

بەڵام زۆر لەپردەکانی ئەمڕۆ بە ئاسنو پۆڵا دروست دەکرێن. دەبێت تاقەکانی پرد زۆر درێژ نەبن. بەڵام سنورێکی دیاری کراو نیە بۆ ئیجمالی درێژی پردێك کە بتوانرێت پایەی پێویستی لێ دروست بکرێت. لەبەرئەوە زۆر لەپردە ، زۆر پایەدارەکان بەدرێژی هێڵەئاسنەکان تاقی لێ یە. پرد بریتی یە لەدوو بەش : هەیکەلی دروست کراوی سەرەوەو هەیکەلی دروست کراوی ژێرەوە. یان پایەکانو بنەواکان ، کە بەشی سەرەوەی لەسەر دەوەستێت. دەبێت پایەکانو بنەواکان زۆر بەهێزو قایم بن چونکە ئەگەر بەشی ژێرەوەی ئاوبردی یان ڕوخا ئەوا بەشی سەرەوەش لەگەڵیدا دەڕوخێت.

ئەمڕۆ ئەندازیاران بنەواكان زۆر قوڵ دەكەن‌و باش دەیكوتنەوەو بەهێزترین شیش‌و چیمەنتۆی تیا بەكاردەهێنن. بۆ نمونە كاتێك ئەمریكیەكان (ترانسپای ) یان دروستكرد لەنێوان فرانسیسكۆو ئۆكلاندادا , پایەكانیان حەفتا مەتر قوڵ كرد بۆ ئەوەی زیاتر بەهێزبێت !

## كەی هەوێن لەهەویردا بەكارهێنرا ؟

بەكارهێنانی هەوێن لەهەویری تەڕو گەرمدا پێی دەوترێت (هەڵ هێنان) خانەكانی هەوێن نیشاستەی هەویرەكە دەگۆڕێت بۆ شەكر بۆ ئەوەی هەرسی بكات. لەكاتێكدا ئەو كارە ئەنجام دەدات , دوەم ئۆكسیدی كاربۆن , وەكو پاشماوەیەك دەردەدات‌و ئەم گازەش لەناو هەویرەكەدا دەمێنێتەوە تا دەبێتەهۆی دروست بونی تلۆقەی گەورە گەورە كەوا لە هەویرەكە دەكات پف بكات.
"بۆغات" ئەو خومرە وشكە , كە لەهەوادا هەیەو بەشێوەیەكی سروشتی دادەبەزێت بۆ سەر هەویرەكە. یەكەم كەس گرنگی خومرەی زانیبێت مسریەكان بونە. نانیان بەخومرەوە تاقی كردەوە سەیریان كرد سوكترو بەتامترە. هەروەها شێوەی تەحەكومیشیان دۆزیەوە. هەموجارێك نانیان دەكرد هەندێكیان لەهەویرەكە هەڵدەگرت بۆ جاری داهاتو كە پێی دەوترێت "هەویر ترش " تا لەگەڵیدا تێكەڵی كەن‌و هەویرەكەی پێ هەڵبێنن.
لەدەوروبەری ساڵی ١٠٠٠ پێش زایندا فینیقیەكان هونەری دروست كردنی نان بەهەویر ترشیان برد بۆ یونانیەكان. كە لە سەدە كۆنەكاندا بون بە مامۆستای نان دروست كردن. دەڵێن زیاتر لە ٧٠ جۆر نانیان هەبوە !
بەڵام ڕۆمانیەكان نانكردنیان كردە پیشەیەكی سەرەكی‌و یاساو ڕێسایەكی زۆریان دانا بۆ تەحەكوم كردن بە جۆرەكانی نانەوە. نانەواكان زۆر شانازییان بەوەوە دەكرد كە , نانەكەیان بەتام‌و چێژە. تەنانەت نانەواكان بە مۆرێك ناوی خۆیانیان دەدا لەسەر نانەكە. وەكو زۆربەی كارگەكانی پسكیت ئارمەكانیان لەسەر پسكیتەكان دەنەخشێنن.
لەسەدەكانی ناوەڕاستدا تەنها دەوڵەمەندەكان دەیانتوانی نانی گەنم بخۆن. خەڵكە هەژارەكە تەنها بە نانی جۆ تێردەبون.

## لەکەیەوە مانگا بۆ شیر بەکارهێنراوە ؟

تۆمارە کۆنەکان دەڵێن مرۆڤ لەکۆنەوە شیرو بەرهەمەکانی شیری بەکارهێناوە. تەنانەت پێش نوسینی ئەو تۆمارانەش مانگا بۆ شیردان بەکارهێنراوە. پەرستگەیەك لەنزیکی بابل دۆزرایەوە , لەسەر یەکێك لەدیوارەکانی وێنەیەك ئەوە پیشان دەدات کە چۆن پیاوێك مانگایەك دەدۆشێتو چەند پیاوێکی تریش قاپی خۆیانیان لەسەر زەویەکە ڕیزکردوە و کۆمەڵێکی تریش لەگۆزەیەکی گەورەی بەردینەوە شیر دادەکەن , وای پێ دەچێت ئەو پەرستگایە بگەڕێتەوە بۆ پێنج هەزار ساڵ بەر لەئێستا. بەوەدا بۆمان دەردەکەوێت مانگا دۆشین پێشی پێنج هەزار ساڵ لە بابلدا هەبوە.

لەم سەردەمە مانگاو مەڕ دوو ئاژەڵی سەرەکین کە شیر بۆ مرۆڤ داین دەکەن , بەڵام خەڵکی دونیا لەو ئاژەڵانە شیریان دەست دەکەوێت کە لە وڵاتەیەکاندا هەیە. بۆ نمونە وشترو گاکێوی و ئەسپ سەرچاوەی سەرەکی شیرین لەئاسیادا , بەڵام لە ئەسکیمۆدا شیر لە ڕەنە کە جۆرە ئاسکێکە دەگرن. لە هندو ئاسیای ناوەندیشدا لەگامێشی ئاو. لە ئوروپاو بەشێك لە ئاسیادا لەمەڕ.

شیر چەند سەد مەوادێکی کیمیاوی جۆراوجۆری تێدایە. بەڵام ئەوەی کە زۆر بەناوبانگە تیایدا پرۆتینو فۆسفۆرو کالسیۆمە. شیر مادەیەکە کە زو هەرس دەبێتو لاشە زۆر بە خێرایی سوی لێ وەردەگرێت. بەتایبەت لەکالسیۆمو فۆسفۆرو مەوادەکانی تری.

لاکتۆز "شەکری شیر" و پرۆتینی شیر لەشیردا نەبێت لەهیچ مەوادێکی تردا نین.

## کێ بۆنی داهێنا ؟

مرۆڤ زۆر لەکۆنەوە بۆنی بەکارهێناوە. وشەی "بیرفیوم" لەزمانی ئینگلیزی دا لەوشەی "فومس"ی لاتینیەوە , وەرگیراوە کە واتای (دوکەڵ) دەدات. لەبەرئەوە دەشێت مرۆڤ لەسەرەتادا بە سوتاندنی دار یان کەتیرە یان گەڵای ڕوەکەکان بۆنی خۆشیان دەست کەوتبێت. مسریە کۆنەکان پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا بۆنیان بەکارهێناوە.

بەلام عەرەبەکان یەکەم کەس بونە ی گوڵیان بەکارهێناوە بۆ دروست کردنی گولاو. پێش نزیکەی ١٣٠٠ ساڵ , گولاویان نە تەنها وەکو بۆن بەڵکو وەکو دەرمانیش بەکارهێناوە. کۆنترین بۆنیش دروست کرابێت گولاوبوە.

نیو هەکتار زەوی (دو هەزار دۆنم ) لەگوڵ یەك تەن گوڵ دەدات , لەو یەك تەن گوڵەش یەك کیلۆگرام بۆم بەرهەم دەهێنرێت. بۆیە سەیر نیە کە نرخی بۆن زۆر گرانە.

گوڵەکانی وەکو وەنەوشەو یاسەمین و گوڵی پورتەقاڵو نێرگس سەرچاوەی هەندێك لە بۆن خۆشترین ئەو بۆنانەن کە بەکاریان دەهێنین. ئایا دەزانن بۆنی واش هەیە لە دارەکانی ئەرزو سەندەڵو گەلای ڕوەکەکانی وەکو لالەو نەعناو دەرزی شوانو هەروەها لەڕەگی ڕوەکەکانی وەکو زەنجەبیلو سۆسەن و فلۆرەنسی دەردەهێنرێت.

کۆنترین ڕێگە لە دروست کردنی بۆندا بەڕێگەی پالاوتنی گوڵەکان بوە بە ئاو. فەڕەنسیەکان کردارێك بەکاردەهێنن پێی دەڵێن "خوساندنی گوڵ " بەهۆی پلێتی لەشوشە دروست کراوەوە کە لەناو چوارچێوەیەکی داردایەو بە پیوی بەراز چەور کراوە.

گوڵەکان ماوەی جارێك دەگۆڕدرێن تا پیوە پاکەکە. ئەو ڕێژەیەی حەزی لەبۆنە بیخوات. ڕێگایەکی تازە هەیە لەدروست کردنی بۆندا. کە بریتی یە لە گیراوەیەکی زۆر پاك کە لە پترۆڵ دەردەهێنرێت. ئەم گیراوەیە بەچەند قۆناغێکیدا بەسەر گوڵە تازەکەدا تێدەپەڕێنرێت. تا لە بۆن تێر دەبێت و ئەمجا گیراوەکە لەیەك جودا دەکرێتەوە و بۆنەکەش بە ئالکوڵ پاك دەکرێتەوە.

لەئێستادا کیمیا لەگەڵ سروشتدا کێ بەرکێ دەکات لەبەرهەم هێنانی بۆندا. کیمیا گەرەکان بۆنی دەستکرد دروست دەکەن لە دڵۆپەی خەڵوزو ڕۆنی تربنتینو سەدان مەوادی تر بەجۆرێك کە مرۆڤ لەگەڵ بۆنی سروشتیدا لێکیان جیاناکاتەوە. لەڕاستیدا کیمیاگەرانی بۆن دەتوانن بەجۆرێك بۆنی گولان بەرهەم بێنن بەجۆرێك نەتوانرێت لەگوڵی سروشتی ئەو بۆنە دەربهێنرێت.

# پێرست

## کیشوەرەکان چۆن دروست بون؟ .................... ١٢٤

- محمود برهوم
- نقولا ناصر
- محمد خروب

# بانکی زانیاری

بەرگی چوارەم و پێنجەم

وەرگێڕانی: مستەفا سەعید عەلی

چاپی سێیەم ٢٠٠٩
سلێمانی

## کەی بۆ یەکەمجار کتێب پەیدابو ؟

ئەو کتێبانەی ئەمڕۆ دەیزانین لەسەدەکانی ناوەڕاستدا پەیدابون. نوسین لەسەر داری پاك جۆرێك بوە لەکتێب. پەڕەکانی دارەکە بە کەتیرە بەیەکەوە دەلکێنران بۆ ئەوەی تۆمارێکی درێژی لێ دروست ببێت.

ڕۆمانیەکان بەم تۆمارانەیان دەوت "volum□" کە لە وشەی volume ی ئینگلیزیەوە ، وەرگیراوە و مانای بەرگ دەدات. لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەمدا پێستەی نەرم جێگەی کاغەزی داری گرتەوە. کە لە پێستی ئاژەڵان دروست دەکراو خۆشەدەکرا. تا دەکرایە کاغەزو لەدیوێکی دەنوسرا. هەمو پارچەکانی بە ئەندازەی یەکتربون‌و لەلایەکەوە هەمویان بە دەزو پێکەوە دەیاندوری‌و وەکو کتێبی لێ دەهات.

بەڵام کتێبەکانی شێوازی ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار لەسەدەکانی ناوەڕاستدا دروست کرا. چوار پارچە پێستە دەخرایە سەریەك. بەجۆرێك کە هەر پارچەیەکی لە دوو لاپەڕە پێك دەهات. پاشان ئەو پارچانە دەخرانە ناو یەکتر بەجۆرێك کە کۆمەڵێکی هەشت لاپەڕەیی لێ پێك دەهات‌و پێی دەوترا "بەش" ئەو بەشانەش دەنێردرا بۆلای کەسێك ئەو بابەتەی مەبەستە لەسەری بینوسێت. نوسەرەکەش هەرجارەی پەڕەیەکی وەردەگرت و چەند جارێك لەسەری دەینوسیەوە.

دوای ئەوە هەموی دەنوسرایەوە. پەڕەکان دەخرایە سەریەك‌و دەکرایە بەرگێك‌و پێکەوە دەزودەدران. ئەمجا لەدار بەرگێکی بۆ دروست دەکراو بەکەتیرە قایم دەکراو پارچەیەك پێستەی گەورە لە بەرگە دارەکە دەگیراو دوای ئەوە کاری نەخشاندن و ڕازاندنەوە بۆ بەرگەکە دەکرا.

زۆربەی کتێبەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بریتی بون لە ئینجیلەکان‌و کتێبە ئاینیەکان. ئەمجا کتێبی قانون‌و پزیشکی و مێژویی بەدواداهات. دوای ئەوەش چیرۆك و ڕۆمان. زۆربەی کتێبەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بەزمانی لاتینی نوسرابونەوە.

## یەکەم کتێبی منداڵان کامەبو ؟

دەگمەنە منداڵێك, بەمنداڵی هۆنراوەیەك یان گۆرانیەکی منداڵانەی ئەزبەر نەکردبێت. یەکەم گۆرانی منداڵان بەناوی "قازی دایکەوە " لەگەڵ کۆمەڵێك حیکایەتی دێوو جنۆکەدا لەساڵی ١٦٩٧دا بلاْوکرایەوە لەسەر دەستی پیاوێکی فەرەنسی بەناوی (شارل پیرۆڵت ).

دەڵێن "تۆماس فیلیپ " لە بوسگن لەساڵی ١٧١٩ دا. کتێبێکی بەناونیشانی "گۆرانی بۆ دایەنگا " یان "گۆرانی قازی دایك بۆ منداڵان " بلاْوکردەوە بەلاْم هیچ دانەیەك لەم کتێبە ئێستا نەماوە.

زۆربەی گۆرانیەکانی دایەنگا مەبەستی بیرۆکەی دایەنگابو. لەسەدەی شانزەهەمدا گەورەکان لەبەریتانیا , گۆرانی میللی هەڵپەرکێیان دەوت , لەگەڵ گۆرانی خۆشەویستی و بە کۆمەڵدا. دایکەکانیش لەلاسایی ئەواندا گۆرانیان بۆ منداڵەکانیان دەوت , بەمجۆرە گۆرانی چوە دایەنگاوە.

هۆنراوەش هەبون ئامارژەیان بۆ رِوداوی سیاسی دەکردو خەڵکی ئەزبەریان دەکردو لەهەمو شوێنێکدا وەکو گۆرانی دەیان وتەوە. بەلاْم منداڵەکان نەیاندەتوانی ئەو گۆرانیانە بەتەواوی لەبەرکەن. بۆیە تەنها رِستەیەك یان کۆپلەیەکیان ئەزبەر دەکردو لەگەڵ مۆسیقادا دەیانوتەوە !

## کاتی هاوینە

باوا دابنێین کەسێك لە کاتژمێر حەوتی بەیانی لەخەو رِادەبێتو لە کاتژمێر یانزەی شەو دەنوێت. کاتژمێر شەشو نیوی ئێوارەش لەئیش دەگەرِێتەوە و کات ژمێر هەشت نانی ئێوارە دەخوات. دوای ئەوە دەچێت بۆ نێو باخچەی ماڵەکەی بۆ ئەوەی پشویەك بدات. بەلاْم دەبینێت تاریك داهاتوەو کاتی سود وەرگرتن لەرِۆژ نەماوە.

با وادابنێین کاتژمێرەکەمان یەك کاتژمێر هێنایە پێشەوە , هەر ئەو پیاوە هەمان ئەو کارانە دەکات لەهەمان ئەو کاتانەدا. بەلاْم ئێستا کە دوای کاتژمێر هەشتی ئێوارە لەماڵ دەچێتەدەرەوە. زۆر لەرِۆژ بەدەستیەوە ماوە کە سودی لێ وەربگرێت. بەمەش یەك کاتژمێری لەتیشکی رِۆژ بۆخۆی "پاشەکەوت " کرد. پاشەکەوت کردنی کات لەرِۆژدا هیچ کاتژمێرێك بۆ رِۆژ زیاد ناکات. بەلاْم ئەوەی کە دەیکات زیادکردنی ژمارەی کاتژمێرەکانی تیشکی رِۆژە لەو وەرزانەدا , کە رِۆژ تیایاندا زوهەڵدێت.

ئەم پاشەکەوت کردنە لەشارەکاندا گرنگترە تا لادێکان. چون بواری ئەوە دەدات نوسینگەو خاوەن دوکان و کارگەکان لەدوا ڕۆژی حەفتەی کاردا کەدووکانەکانیان دادەخەن هێشتا خۆرئاوا نەبوە. گوندنشین و خاوەن کێڵگەو جوتیارەکان لەگەڵ خۆر دەرچوندا دەست بەکاردەبن و لەگەڵ خۆرئاوابوندا دەست لەکار هەڵ دەگرن و زۆر گویٚ بەکات نادەن.

ئایا دەزانن یەکەم کەس کێ بو بیری لەپاشەکەوت کردنی کات کردەوە لەڕۆژدا ؟

"بنجامین فرانکلین " بو کاتێك لە پاریسدا دەژیا لەسەدەی هەژدەهەمدا پێش نیازەکەی خستەبەردەستی خەڵکی پاریس بەلاٚم لەو کاتەدا گوێیان لیٚ نەگرت.

لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا بۆ یەکەمین جار یاسایەك دەربارەی پاشەکەوت کردنی کات لەڕۆژدا دەرکرا. چونکە لەماوەی جەنگی جیهانیدا کەمبودی سوتەمەنی هەبو بۆ وەگەڕخستنی موەلیدە کارەباییەکان. بەپێش خستنی یەك کاتژمێر لەڕۆژدا دەرکرا. دەتوانرا خەڵکەکە یەك کاتژمێر زوتر بخەوتنایەو یەك کاتژمێر زوتر لە خەو ڕابونایە.

ئەڵمانیا یەکەم وڵات بو لەساڵی ١٩١٥دا ئەم یاسایەی جێبەجیٚ کرد. پاشان بریتانیا لەساڵی ١٩١٦ داو دوای ئەوەش ئەمریکا لەساڵی ١٩١٨ دا.

شایانی باسە زۆر لەوڵاتان لەسەرەتای هاویندا کاتژمێرەکانیان یەك کاتژمێر دێنە پێشەوەو ئەمەش پێی دەوترێت "کاتی هاوینە ". عێراق لەساڵی ١٩٨٢ وە ئەم یاسایە پەیرەو دەکات.

## ئاو

کاتێك زانایان پرسیار دەکەن , ئایا ژیان لەسەر هەسارەکانی تر هەیە ؟ زۆربەی جار لەوە دەپرسن ئایا لەو هەسارەیەدا ئاو هەیە ؟ ژیان بیٚ ئاو وەکو دەزانن مەحاڵە.

ئاو تێکەڵەیەکە نەتامو نەڕەنگو نەبۆنی نیە , ڕێژەیەکی زۆر لەهەموو گیانلەبەراندا پێك دێنێت و لەهەمو شوێنێکی زەویشدا هەیە. وەکو چۆن بەڕێژەیەکی زۆر لەهەوادا هەیە. شتە زیندوەکان ناتوانن خۆراك بمژن و هەرسی بکەن , تا ئەو خۆراکە نەخەنە ناو ئاوەوە. ڕیشاڵە زیندوەکانیش بەشێوەیەکی سەرەکی لەئاو پێك دێن.

ئاو لەچی پێك دێت ؟

تێکەڵەیەکی سادەیە لەدوو گاز : هایدرۆجین کە گازێکی سوکەو ئۆکسجین کە گازێکی قورسە. کاتێك هایدرۆجینەکە لە ئۆکسجینەکەدا دەسوتێت , ئاو دروست

دەبێت. بەڵام ئاو هیچ کام لەو دوو توخمە نیە کەلێی دروست بوەو تایبەتمەندی خۆی هەیە.
ئاو , وەکو زۆربەی مەوادەکانی تر لەسیٚ دۆخدا هەیە : شلی , وەکو ئاو , رەقی , وەکو بەفر , گازی کە پێی دەوترێت هەڵمی ئاو. ئەم سیٚ دۆخەش لەسەر پلەی گەرما دەوەستن. لەپلەی سفری سەدی , ئاو لە شلیەوە دەگۆڕێت بۆ دۆخی رەقی یان دەیبەستێت. لەپلەی سەدیشدا لەشلیەوە دەگۆڕێت بۆ دۆخی گازی. لەبەرئەوەی مەوادی کانزایی لەناو گازە تواوەکاندا هەیە , کەواتە ئاو بەپاکی لە سروشتدا نیە.

## کەی یەکەم وێنەو تابلۆ دروست کرا ؟

مرۆڤی ئەشکەوت یەکەم هونەرمەندبوە , لەسەر دیواری ئەشکەوتەکان وێنەی کێشاوە. لەباشوری فەرەنساو ئیسپانیادا هەندێك وێنەی رەنگاورەنگی ئاژەڵان دۆزرایەوە کە مێژوی دەگەرێتەوە بۆ ۳۰۰۰۰ تا ۱۰۰۰۰۰ سالٚ پێش زاین.
مرۆڤ وێنەی ئەو ئاژەڵە دەشتیانەی وێنەکێشاوە کە لە چواردەوری بونە. وێنەکانیش لەو ساکەوە تاکو ئێستا وەکو خۆیان ماونەتەوە , لەبەرئەوەی ئەشکەوتەکان داخرابونەو باوباران و گەرما نەیتوانیوە کار لەو وێنانە بکات. هونەرمەندانی ئەشکەوت بەرەنگی زۆرجوان دەرودیواری ئەشکەوتەکانیان رازاندۆتەوە. هەندێك لەجوانترینی ئەو وێنانە , لەئەشکەوتی (لاسکۆ ) ی فەرەنسادایە. زۆربەی ئەو رەنگانەی کە وێنەکێشانی ئەشکەوت بەکاریان هێناوە بریتی بو لە " ئۆکسیدی ئاسنیکی " سروشتی ئاوی.
لەو بۆیاخەوە هەمو رەنگەکانی تری دەست کەوتوە , سەرەڕای بەکارهێنانی مەنگەنیز کە توخمێکی کانزاییە. ئەم مەوادانە دەهارانەوە تا دەبونە هاراوەیەکی نەرم. پاشان لەگەلٚ پیودا "رۆنی ئاژەلی " تێکەلٚ دەکران و بە فلچە وێنەکانیان پیٚ دەکێشا. بۆیاخەکە لەشێوەی لولەکی بچوکدا هەڵدەپێچراو پیوەکە لەگەلٚ بۆیاخە هاراوەکەدا تێکەلٚ دەکرا , چەوریەکە شل دبۆوەو ئەمەش وای دەکرد گەردیلەکانی بۆیاخەکە یەك بگرن.
دەشێت پیاوانی ئەشکەوت فلچەکانیان لەموی ئاژەڵان یان رووەك دروست کردبێت.
پێش نزیکەی ۳۰۰۰۰ هەزارسالٚ مرۆڤ کەرەستەو مەودای بنەرەتی وێنەوبۆیاخی داهێنا. لەسەدەکانی دوای ئەوەشدا چاکسازی لەشێوەو مەوادەکاندا کرا. بەڵام وێنەکانی مرۆڤی ئەشکەوت بە بنەمای هونەری تەشکیلی دادەنرێت.
پێش پێنج هەزار سالٚ مسریەکان رۆلی زۆر گرنگیان بینی لەپێش خستنی

شێوازەکانی وێنەکێشاندا. یەکێك لەو شێوازانە بۆیاخە ئاویەکە لەسەر خشتێکی قوڕین یان دیواری کڵێسا دادەنراو ئاوو هەوای وشکی ناوچەکەش یارمەتی هێشتنەوەی هەندێك لەو وێنانەی دەدا , کە بەبۆیاخی ئاوی دروست کرابون.

## خەڵکی لەکەیەوە شیر دەخۆن ؟

کاتێك باسی وشەی شیر دەکەین یەکسەر شیری مانگامان بەبیردا دێت , چونکە زۆربەی ئەو شیرانەی دەخورێن لە مانگاوە دەست دەکەوێت. بەڵام خەڵکی لەسەرانسەری زەویدا کەڵك لەشیری گیاندارانی تریش وەردەگرن. نیوەی ئەو شیرەی خەڵکی هندوستان بەکاری دەبەن لە گامێشەوە وەری دەگرن. شیری بزنیش بەزۆری لەوڵاتانی حەوزی دەریای ناوەڕاستدا بەکاردەبرێت.بەڵام خەڵکی باکوری ئوروپا شیری ڕەنە " کە جۆرە ئاسکێکە " دەخۆن.

کەواتە لەکەیەوە خەڵکی شیری گیانلەبەران دەخۆن لەگەڵ بەرهەمە شیریەکانی وەکو کەریۆو پەنیردا ؟

کەس ناتوانێت بەڕێکوپێکی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. لەبەرئەوەی شیرخواردن پێش مێژوی مرۆڤایەتی دەستی پێکردوە. دەشێت دۆو ماست خواردنی سەرەکی ئەو خێڵە گەڕۆکانە بوبێت کە هەزاران ساڵە لە دەشتاییەکانی ئاسیادا لەگەڵ ڕانەکانیاندا ژیاون.

لە ئینجیلدا ئاماژەی زۆر بۆ شیر کراوە , باس دەکات کە هابیلی کوڕی ئادەم پێغەمبەر علیه السلام شوان بوەو ڕەنگە شیریشی خواردبێت. خاکی کەنعان "فەڵەستینی ئێستا " لەساڵی ١٥٠٠ پێش زاین پێیان وتوە سەرزەمینی " ماستو هەنگوین ".

هەمو ئاماژەکان لە ئینجیلدا نیشانەی ئەوەیە کە شیر زۆر لەوەوپێش تریش بەکارهێنراوە. ڕەنگە وابزانن بیرۆکەی شیری وشك , بیرۆکەیەکی تازەبێت. بەڵام تەتەرەکان لەساڵی ١٢٠٠ی زاینی داو لەکاتی جەنگەکانی جەنگیزخاندا شیرێکی خەستیان لەشێوەی هەویر یان شیری وشکدا لەگەڵ خۆیاندا هێناوەو وەکو خۆراك بەکاریان هێناوە.

یەکەمین بەرائەتی داهێنان بۆ شیری وشك لەساڵی ١٨٥٦ دا بەخشرا. ئەو جۆرە شیرەش لەماوەی جەنگی ناوخۆی ئەمریکادا بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکارهێنرا. ڕێژەی ئاو لەشیری مانگادا نزیکەی ٨٧٪ و ٢٣٪کەی تری پێداویستیەکانی تری پۆژانەی مرۆڤە لەکالسیۆمو پرۆتینو ڤیتامین Aو B.

## کام فڕۆکەخانە لەجیهاندا زۆرترین جموجوڵی تێدایە ؟

داهێنانی فڕۆکە جیهانی بچوك کردۆتەوەو ڕۆیشتنی زۆر خێرا کردۆتەوە. ئەو نێوانەی جاران لە چەند مانگێکدا دەمانبڕی , ئێستا دەتوانین لەماوەی تەنها چەند کاتژمێرێکدا بیبڕین.

ئەمڕۆ لەهەموو پایتەختەکانی دونیادا , فڕۆکەخانە هەیە. بۆ فڕینی ناوخۆیی‌و نێودەوڵەتی. ئایا دەزانن کام فڕۆکەخانە لەجیهاندا زۆرترین جموجوڵی تێدایە ؟

زۆربەی خەڵکی بڕوایان وایە فڕۆکەخانەی جۆن کەنەدی نێودەوڵەتی بێت لە نیویۆرك. بەڵام وانیەو زۆرترین فڕۆکەخانەی جیهانی جموجوڵی تێدابێت فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی شیکاگۆیە. لەماوەی ٤٢,٥ چرکەدا فڕۆکەیەك یان دەنیشێتەوە یان دەفڕێت.

ئەمەش مانای وایە لەیەك کاتژمێردا ٨٥ فڕۆکە لێیەوە دەفڕێت یان تیایدا دەنیشێتەوە. بەپێی ئەم ئامارە ژمارەی گەشتەکان دەگاتە ٢٠٣٦ گەشت لەڕۆژێکدا. واتە ١٤٢٥٥ گەشت لەحەفتەیەکدا کە دەکاتە ٧٤١٢٧٢ گەشت لەساڵێکدا.

ئەم فڕۆکەخانەیە نوێترین‌و پێشکەوتوترین ئامێری چاودێری تێدایە.

## سەرچاوەی وشەی TIP واتە بەخشیش لەچیەوە هاتوە ؟

داب‌ونەریتی بەخشیش وەرگرتن لەڕۆژئاوادا لەگەڵ سەرتاشەکاندا دەستی پێکرد. ئەو سەرتاشانەی کەڵە شاخیان بۆ نەخۆشەکان دەگرت‌و ئەوانیش لەبری ئەوەدا پارەیان دەدایە سەرتاشەکان.

بەمجۆرە ئەم نەریتە لەسەرانسەری بەریتانیادا بڵاوبوەوەو هەر زۆر خێرا سندوقی بچکۆلە لەخانەکاندا "ئوتێلی کۆن " دانرا , میوانانی خانەکانیش لەبەرامبەر خزمەت گوزاریەکاندا پارەیان دەخستە ئەو سندوقانەوە.

بۆ ئەوەی خەڵکی زۆرترین پارە بخەنە سندوقەکانەوە , لەسەر سندوقەکان بەزمانی ئینگلیزی ئەم دەستەواژەیەیان نوسیبو.

TO INSURE PROMPTNESS واتە " بۆ زامنی خزمەتگوزاری خێرا ". وشەی TIP یش لەسێ پیتی یەکەمی ئەو دەستەواژە ئینگلیزیەوە وەرگیراوە.

## هۆی چیە کە توشی سەرەگێژە دەبین ؟

هەمو گیانلەبەرێك لەسەر ڕوی زەویدا دەبێت خاوەنی پارسەنگی خۆی بێت. هێزی ڕاکێشانی هەمو شتێك بەرەو ژێرەوە ڕادەکێشێت. لەبەرئەوە هەریەك لەئێمە

دەبێت بیرۆکەیەکی هەبێت سەبارەت بە پەیوەندی لەگەڵ زەوی و فەزادا. چون بەبێ ڕاکێشان هەمو شتەکان دەکەون یان دەڕوخێن. لەمرۆڤیشدا ئەو ئەندامانەی کە هەست کردن بە پارسەنگیمان پێ دەبەخشن پێیان دەوترێت (کەناڵە شێوە بازنەییەکان ) کە بریتی یە لەسێ بۆری لاکێشەیی لەشێوەی سێ بازنەی نیوەخڕدا. کە دەکەونە پشتی گوێچکەوە لە "گوێچکەی ناویندا ".

بۆچی ژمارەیان سیانە ؟ لەبەرئەوەی ڕوبەرەکە سێ ڕوی هەیە. ئەویش درێژی (بۆ پێشەوەو بۆ دواوە ) پانی ( بۆلای ڕاست و بۆلای چەپ ) بەرزی (بۆ سەرەوەو بۆ خوارەوە ) ئەم سێ کەناڵە دەکەونە سوچی لای ڕاستی یەکتریەوە. لەهەرسێ ڕوی پانتاییەکەوە. ئەم کەناڵانە شلەی (لنف) یان تێدایە. لەلایەکیانەوە وا پان دەبێتەوە کە شێوەی پیاز لەخۆ دەگرێت.

لەم سێ (پیان)ەدا سێ خانەی هەستیار هەن وردە دەماری زۆر ڕەقی تێدا دەڕوێت لەناو بۆشایی پیازەکەدا بەرزدەبێتەوەو پەیوەستە بەڕیشاڵی دەمارەکانەوە.

هەرچەندە شلەکە لەناو کەناڵەکاندا بجوڵێتەوە هێندەش وردە دەمارەکان دەجوڵێنەوە یان خوار دەبنەوە. ئەم جوڵانەوەو خواربونانەوە نامەیەك بۆ مێشك یان ماسولکەکان دەنێرێت. لەبەرئەوەی کەناڵەکان سێ ناوچەی جیاواز داگیردەکەن. بۆیە جوڵەکانمان بەرەو هەرلایەك بێت دەبێتەهۆی جوڵاندنی هەندێك لە ڕەقە دەمارەکان.

بۆ نمونە ئەگەر جوڵەکەمان بەرەوپێش بێت و لەناو ئۆتۆمبیلدا بین , ئەوا وردە دەمارەکانی دوکەناڵ , لەسێ کەناڵەکە هیچ جوڵەیەك تۆمارناکەن بەڵام کەناڵی سێ یەم کە جوڵانی بۆ پێشەوەو بۆ دواوە قبوڵ دەکات , دەبێتە هۆی جوڵانی وردە دەمارەکان بەهەمان ئاراستەدا. هۆیەکەشی جوڵانەوەی شلە لەنفاویەکەیە.

گریمان بەخێرایی بەدەوری خۆماندا سوڕاینەوە. لەم حاڵەتەدا شلەی ناو کەناڵە نیمچە بازنەییە ئاسۆییەکە دەبێتەهۆی چەمانەوەی وردە دەمارەکانی هەست کردن بەرەو دواوە. کاتێکیش لەسوڕانەوە دەوەستین شلەکە لەسوڕخواردن هەر بەردەوام دەبێت و دەبێتەهۆی چەمانەوەی وردە دمارەکان بەپێچەوانەوە. ئەوەشە وامان لێدەکات هەست بکەین بە پێچەوانەوە دەسوڕێینەوە. لەگەڵ ئەوەی کە دەزانین بە پێچەوانەوە ناسوڕێینەوە و پێمان لەشوێنی خۆیدا جێگیرە , بەڵام واهەست دەکەین لەپێش چاوماندا دەسوڕێتەوە. بەواتایەکی تر کەواتە توشی سەرەگێژە بوینە.

## بۆچی هەندێك کەس توشی (سرك ) حەساسی دەبن و

## هەندێکی تر توشی نابن ؟

توشبون بە حەساسیَ واتە کاریگەربونی مرۆڤ یان حەساسیەکەی بەمادەیەك یان زیاتر. دەشێت ئەو مەوادانە لەمەوادی خۆراکیدا یان کیمیاویدا یان ڕوەکی یان ئاژەڵیدا هەبن. دەشێت هۆیەکەی گەرما یان تەپوتۆزبێت.

بۆچی ئەو مادەیەی حەساسیە دەوروژێنێت کار لەهەندێك کەس دەکاتو کارلە هەندێك کەسی تر ناکات ؟ بەکورتی زانستی پزیشکی ناتوانێت تەفسیری ئەوە بکات. زۆر لە پزیشکان و زانایان باوەڕیان وایە کە پشتاوپشت (بۆماوە ) ڕۆڵێکی گرنگی لەوەدا هەیە. چونکە خێزانی واهەن لەباپیریانەوە تا ئێستا بەهەمان مادە کێشەیان لەگەڵ حەساسیدا هەیە.

حاڵەتی واش هەیە کە تەنیا یەك کەس لە خێزانەکە بەدەستی حەساسیەوە دەناڵێنێت. هەندێك لایان وایە (عواگف ) سۆز ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێت لە گەورەکردنی حەساسیەدا. بەشێوەیەك کە تا ئێستا نەزانراوە چۆن ترس و توڕەبون و دودڵی کاریگەریان لەسەر حەساسیە هەیە.

کەسی توشبو بە حەساسیە چی لەلاشەیدا ڕودەدات ؟

بڕوا وایە ئەو مادەیەی کە لە حەساسیەکە دەوروژێنێت ، کاتێك دەچێە لاشەوە وادەکات خانە تایبەتیەکان لەڕیشاڵدا مادەیەکی کیمیاوی دروست بکەن بەناوی (دژەتەن ) ئەم مادەیە لەدژی پەکتریا لەلەشدا دروست دەبێت. بەلأم دژەتەنەکان لەبەر گریە سەرەکیەکانی لەشی مرۆڤ لەدژی نەخۆشی. بەلأم ئەم تەنانە لای ئەو کەسانەی کە بە حەساسیە توشبونە کاردانەوەی خراپ دروست دەکەن.

زانایان پێیان وایە ئەو مادەیەی ، کە حەساسیەکە دەوروژێنێت لەگەڵ دژە تەنەکەدا یەك دەگرن و وادەکەن لەلاشە شتێك دەربدات کەپێی دەوترێت (همستین ) ئەم مادەیەش کار لەهەردو سی و دەمارەکانی خوێن و دەبێتەهۆی نیشانەکانی حەساسیە.

بەلأم ڕێژەی همستینی بەرهەم هاتو یان زۆر کەمە یان تەنها لەچەند شوێنێکی دیاری کراوی لەشدا بەدەردەکەوێت. چونکە تا ئێستا ئەم مادەیە لەخوێنی هیچ کەسێکی توشبو بەحەساسیەدا نەبینراوە. لەبەرئەوە هێشتا زۆرمان ماوە لەسەر حەساسیە فێربین. ئەو حەساسیێەی کە توشی کەساسیمان دەکات.

## کێ ئامێری چاپی داهێنا ؟

ئامێرەکانی چاپ پێشکەوتنێکی تازەن و تا ئێستاش بەردەوام چاك سازیان تێدا دەکرێت. ئایا دەزانن یەکەم بەرائەتی داهێنان لەساڵی ١٧١٤ دا درایە پیاوێکی

ئینگلیزی به ناوی (هنری میل ) ؟ بەلأم ئەو ئامێری چاپە هەرگیز دروست نەکرا ,
لەسەرەتادا ئامێری چاپ وەکو یارمەتی دەرێك بۆ نابینایان دروست کرا.
لەولأتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا یەکەمین بەرائەتی داهێنان بۆ ئامێری چاپ درایە کەسێك بەناوی "ولیەم بێرت " لەسالی ١٨٢٩ دا. ناوی لێنرا ئامێری "چاپ " ئەمرۆ لەهەمو دونیادا نمونەیەکی ئەو ئامێرە نەماوە.
لەسالی ١٨٤٣ دا ئەمریکیەك بەناوی "شارلز سێربار " ئامێرێکی تۆمارکرد کە بریتی بو لە کۆمەلێك دەستی چاپکردن. کە بەدەوری ڕەوڕەوەیەکی مسی زەردداو بەدەوری تەوەرێکی مەرکەزیدا دەسوڕانەوە. ئەو پیتەی مەبەست بوایە دەجولێنرایەوە و پیتەکانیش حوبریان پێوەبو. لەگەلٚ دەیاندا لەسەر کاغەزەکە یەکسەر چاپ دەبو. بەلأم ئەم ئامێرە لەبەرئەوەی زۆر خاو بو شتێکی کرداری نەبو.
لەسالی ١٨٥٦ دا هەنگاوێکی گەورە بەو پێشەوەنرا بەبەکارهێنانی مەبدەئی بازنەی چاپی دەستی , کە بە دەوری چەقێکی هاوبەشدا چاپی دەکرد. ئەمەش مەبدەئی ئەو ئامێرە چاپیانەیە کە ئەمرۆ بەکاردەهێنرێن.
یەکەمین ئامێری چاپکردن کە بۆ بواری بازرگانی دروست کرا , لەدروست کردنی هەرسێ داهێنەری ئەمریکی کریستۆڤەر شولس و سموئیل مۆل و شارلز گلیدن بو کە لەسالی ١٨٧٣ دا دروستیان کردو توانیان بیفرۆشن. ئەم ئامێرە بەهۆی لولەکێکی باغەوە کاغەزی تێدەخراو شریتێکی حوبراویشی لەسەربو لەگەلٚ هەلپێچێکی شریتدا , کە دەیتوانی شریتەکە بگەڕێنێتەوە دواوە بەتێپەڕبونی ڕۆژگار چاکسازی زۆرتر لەئامێری چاپدا کرا , تا توانرا بگەیەنرێتە ئامێری کۆمپیوتەری زۆر پێشکەوتو.

## چۆن خواردن هەرس دەکەین ؟

تەنها قوتدانی خواردن بەس نیە بۆ ئەوەی لەژیاندا بمێنینەوەو گەشەبکەین. دەبێت خواردنەکە بگۆڕێت تا لەش بتوانێت بەکاری بهێنێت , ئەم کردارەش پێی دەوترێت "هەرس ".
کرداری هەرس کردن لەخواردن خستنەناو دەمەوە دەست پیٚ دەکات , ئەمجا قوتدانو ڕۆیشتن بەناو کەنالی هەرسدا کە کەنالێکی درێژی پێچاوپێچەو بەناو لاشەدا درێژبۆتەوەو هەمو ئەندامەکانی ئەم کەنالە پەیوەستن بەیەکەوە بەلأم لە ئیشکردندا هەریەکەو لەویتر جیاوازە. دەم لەسەر قورگێکی فراوان لەگەرودا دەکرێتەوە , کە بریتی یە لە کەنالێك بۆ خۆراك و هەوا پێکەوە.

بەلاَم سورێنجك بەناو سنگدا دەچێت تا دەگاتە نێوان قورگ‌و گەدە و گەدە دەگەیەنێتە ڕیخۆڵە بچکۆلەی پێچاوپێچ "قۆلۆن" یان ڕیخۆڵە گەورە. دوابەشە لەکەناڵی هەرسدا. ئەمەش پێش چاو خستنێکی خێرایە , با بزانین خواردنەکە لەکاتی هەرس کردندا چی پێ دێت ؟

لیکی دەم لەناو دەمدا یارمەتی شیتەڵ کردنی نیشاستە دەدات لەناو مەوادە خۆراکیەکانی وەکو پەتاتەو دانەوێڵەدا. دوای تەڕبون‌و هاڕینی خواردنەکە لەناو دەمدا , دەچێت بۆ گەروو لەڕێگەی سورێنجکیشەوە دەڕوات بۆ ناو گەدە. زۆربەی کاری هەرس کردن لەگەدەدا دەکرێت. ئەو عوسراتانەی کە دیواری گەدە دەیانڕژێنێت , لەگەڵ خواردنەکەدا تێکەڵ دەبن. لەو عوسراتانە ترشی هایدرۆکلۆریك‌و هەوێنی هەرس کە لە ڕژێنەکانی گەدەیەو یارمەتی پرۆتینات دەدات بۆ شیتەڵ بون بۆ جۆرێکی سوکتر بۆ ئەوەی بە ئاسانی هەرس بکرێت. مەوادە نیشاستەییەکان لە شیتەڵ بوندا بەردەوام دەبن تا دەبنە مەوادی زۆر ترش لەگەدەدا. لەو کاتەدا هیچ نیشاستەی تێدا نامێنێت.

شلەکان لەگەدەدا بەردەوام دەبن تا بە تەواوی لەگەڵ عوسراتە هەرسیەکاندا تێکەڵ دەبن‌و کاتێك خواردنەکە دەگۆڕێت بۆ شلە پێی دەوترێت (گیمۆس). کە لە ڕێگەی سەمامێکی ژێرەوە کە پێی دەوترێت (دەرگەوان ) دەچێت بۆ ڕیخۆڵە باریکە. ڕیخۆلە باریکەش بریتی یە لە بۆریەك کە درێژیەکەی لەنێوان ٦,٥ بۆ ٧,٥ مەتردایە بە پێچاوپێچی. هەرس کردن لەبەشی یەکەمی ڕیخۆڵە باریکەدا کەپێی دەوترێت "دوانزە گرێ " دەست پێ دەکات‌و ئەو عوسراتانەی کە پەنکریاس‌و جگەر دەیڕژێنن یارمەتی شیکردنەوەی مەوادە خۆراکیەکان دەدات. شیتەڵ کردنی پرۆتیناتیش لێرەدا کۆتایی دێت.

بەلاَم چەوریەکان ورد دەبن بۆ پارچەی بچوك , وەکو چۆن مەوادە نەشەویەکانیش لە دوانزە گرێدا هەرس دەبن. لێرەشدا هەروەها خۆراکە هەرس بوەکان لەخوێن‌و لەنفرا دەمژرێن. لە ڕیخۆڵە گەورەشدا ئاو دەمژرێت و خۆراکەکان زیاتر وشك دەبن‌و لاشە لەشێوەی پاشەڕۆدا لێیان ڕزگاری دەبێت.

## گاڵتە کردن "فكاهة "

تۆ بەشتێك پێ دەکەنیت , بەلاَم هاوڕێکەت پێی پێ ناکەنێت ! باوکت بەشتێك پێدەکەنێت , بەلاَم تۆ پێی پێ ناکەنیت ! بۆچی ؟ ئایا گاڵتەکردن شتێکە وادەکات لەهەمو کەسێك کە پێ بکەنێت ؟

نوسەران‌و پزیشکان و زانایانی دەرون ناسی‌و ئەکتەرەگاڵتەجارەکان لە سەر بابەتی گاڵتەجاری گەلێك کتێبیان نوسیوە. بەلاّم هێشتا نەیان توانیوە تەفسیرێکی شیاو بۆ گاڵتەکردن بکەن !

ئێمە دەزانین هەندێك شت ڕودەدات وادەکات لەخەڵکی کە پێ بکەنن. لەبەرئەوە بەلای کەمەوە بتوانین بڵێین چەندین جۆر لەگاڵتە هەیە. بۆ نمونە خوێن سوکی‌و سادەیی وامان لێدەکات دەم بە پێکەنین بین. شانۆییەکی گاڵتەجاڕی وامان لێدەکات پێ بکەنین. مرۆڤ دەموچاوی خۆی ڕەنگ بکات یان سەبەتەیەك لەسەر بکات بەلامانەوە سەیرەو وامان لێدەکات پێ بکەنین !

هەندێك جار وشە وەکو توانج‌و یاری کردن بەوشەکان دەبێتە مایەی پێکەنین , داشۆرین شێوەیەکی کۆنە لە قەشمەری و گاڵتەکردن و زۆر لە نوسەران بۆ گاڵتەکردن بەشێوەکانی ژیان بەکاریان هێناوە.

ئێمە بۆ کەمکردنەوەی بەرامبەرو شکاندنەوەی کەسێك جۆرێك لەگاڵتەپێ کردن بەکاردێنین بۆ ئەوەی پێکەنین دروست بکەین.

بەوجۆرە گاڵتەجاڕی شێوەی زۆرەو ئێمە بەزۆر ڕێگەو شێوازی جۆراوجۆر گوێمان لێ دەبێت.

## بۆچی بایەقوش بەدانا دادەنرێت ؟

ئەگەر لەڕواڵەت یان لەخوو ڕەوشتی باڵندەیەکدا شتێکی نائاسایی هەبێت ئیتر ئەفسانەو پڕوپوچیی زۆریان لەسەر دروست کردوە. بایەقوشیش باڵندەیەکە , دیمەنێکی نامۆی هەیەو بەشێوەیەکی جیاواز لەسەرجەم باڵندەکانی تر هەڵس‌وکەوت دەکات. بەوهۆیەوە ئەفسانەی زۆری لەسەر دروست بوە.

ئایا دەزانن بایەقوش لەسەردەمی کۆندا بە شوم دانراوە ؟ ڕۆمانیەکان زۆریان ڕق لە بایەقوش بوە. ئەگەر گرتبێتیان یەکسەر سوتاندویانەو خۆڵەمێشەکەیان لەڕوباری تیباردا پرش‌و بلاّوکردۆتەوە !

بەلاّم خەڵکی لەبەریتانیاو شوێنەکانی تردا بە "پیرەدانا " ناویان بردوە. ڕەنگە بەهۆی ڕواڵەتیەوە بوبێت چونکە بایەقوش هیچ زیرەکیەکی تێدانیە. لەهەردو چاوە گەورەکەیدا وا پیشان دەدات کە بایەقوشەکە سەیردەکات لەجیهانی خەیالاّتدا نوقم بوە. بەلاّم ڕاستی ئەوەیە کە هەردو چاوی بایەقوش زۆر هەستیارن بەرامبەر بەتیشکی خۆر.

هەردو چاویشی لەشوێنێکدایە وادەکات بایەقوشەکە ناچاربێت بەتەواوی سەری بسوڕێنێت لەپێناو گۆڕانی ئاڕاستەی سەیرکردنیدا.

لە سەرانسەری جیهانداو لەهەمو شوێنێکدا بایەقوش هەیە. تەنانەت لەهەردو جەمسەری باکورو باشوریش. ڕەنگی پەڕەکەی لەو ناوچانەدا وەکو ڕەنگی بەفرەکە سپیە. بایەقوش لەشەودا نەبێت ڕاوناکرێت ، چونکە چاوەکانی زۆرتیژن و گوێی زۆر سوکە ، بە ئەندازەیەك کە دەتوانێت لەشەودا مشك ببینێت و گوێیشی لە جموجوڵیان بێت. باشترین خواردنیشی مشکە.

بایەقوش هەردو قاچە چڕنوکاویەکەی وەکو داو بەکاردەهێنێت بۆ گرتنی مشکەکان و تەنانەت دەتوانێت گیاندارانی وەکو کەروێشك و سمۆرەش بگرێت.

سەرەڕای دیمەنە نەزانەکەی ، بەلاّم بایەقوش بەخێراییەکی زۆر دەڕوات.

بەپەڕە نەرمەکەی دەتوانێت بەبێ دەنگ بفرێت. پەڕە سوك و نەرمەکەشی لاشەیەکی لەلاشەی ڕاستەقینەی خۆی زیاتر دەداتێ.

## ئەسڵی شەپقە چی یە ؟

شەپقە کلاّوێکە ڕۆژئاواییەکان لەسەری دەکەن ، وشەی (hat) لەزمانی ئینگلیزیدا ئاماژە دەکات بۆهۆی سەرەتای کلاّولەسەر کردن. ئەم وشەیە لەوشەی (heat) ی ئەنگلۆ- ساکسۆنی کۆنەوە هاتوە ، کە واتای "دایدەپۆشێت " دەدات.

هەمان وشەیە کە لە زمانی ئینگلیزیدا مانای ماڵو کەپر دەدات. یەکەمجار مرۆڤ بۆ بەرگری لەتیشکی خۆرو بەفروباران شەپقەی کردۆتەسەر لە ناوچە باکوریەکانی گۆی زەویدا. ڕەنگە سەرەتا شەپقە بۆ ئەوەش دروست کرابێت کە گەرما بداتە سەری مرۆڤ.

بەلاّم لەناوچە باشوریەکاندا یەکەمجار شەپقە لە پوش و پەلاّش دروست کراوە. شەپقەی سەربازی دوەمین پێشکەوتن بوە لە پیشەسازی شەپقەدا. هەمو نەتەوەکان کلاّوی سەربازیان بۆ مەبەستی جۆراوجۆر بەکارهێناوە. زۆرجار لەکانزا دروستیان کردوە بۆ ئەوەی سەر لە تیرو شمشێر پارێزراو بێت.

لای خێڵە سەرەتاییەکانیش شەپقە زۆرجار بۆ ترساندنی دوژمنان بوە. بە تێپەڕبونی ڕۆژگار هەر ولاّت و نەتەوەیەك شەپقەو کلاّوی تایبەت بەخۆی دروست کرد. ئیتر بۆ جوانی بوبێت یان بۆ مەبەستی ئاهەنگ گێڕان.

بۆ نمونە ، پێشکەوتنی (گربوش) بەڕەنگە سورەکەی لەچەند ولاّتێکی ڕۆژئاوای

ئاسیاداو , عەرەب عەگالّیان دهێنا , بەهەموو شێوەو ڕەنگەجیاوازیەکانیەوەو کوردیش مشکیو جامانە.
دروست کردنی شەپقە بۆ مەبەستی بازرگانی پێش ٥٠٠ یان ٦٠٠ سالێك بەر لە ئێستا دەستی پێکرد. لەسەرەتادا شەپقە لە خوری دروست دەکرا. ئەمجا توکی ورچ لەدروستکردنیدا بەکارهێنرا و خەڵکی ئاساییش شەپقەیان کردەسەر. بەلاّم شەپقە کەنارە پانەکان کلاّوی تایبەت بو بە گەورەو پیاوان , شەپقە بۆ مەبەستی ئاینیو سیاسییش بەکاردێت. مەلاو ڕاهیبو قەشەکان کلاّوی تایبەت لەسەر دەنێن.
شەپقەکانیش ناوی خۆیانیان هەیە. ناوەکانیان یان لەو کەسانەوە وەرگیراوە کە یەکەمجار لەسەریان کردوە , یان لەو کەسانەوە وەرگیراوە کە دایان هێناوە. وەکو شەپقەی (پاولەر) بەناوی ئەو ناوچەیە ناونرا کە یەکەمجار تیایدا لەسەر کراوە. یان شەپقەی (هامبۆرگ ) بەلاّم شەپقەی پەنەما , پێشی ٣٠٠ سالٚ بەر لەئێستا لە پەنەما دروست کرا.

## سەرمابون چی یە ؟

زیاتر لە ٩٠٪خەڵکی ئەمریکا سالاّنە توشی سەرمابون دەبن , زیاتر لە نیوەشیان سالاّنە چەند جارێك توشی سەرمابون دەبن. بێگومان نیشانەی سەرمابون دەزانن وەکو چۆن پزیشکەکان دەیزانن. ئاو لە لوتیان دێت , زۆر دەپژمن. توشی ئاوسانی قورگ دەبن هەندێك جاریش سەرژان. بەوەشەوە ناوەستێتو پەرە دەسێنێت بۆ کۆکەو بەرزبونەوەی پلەی گەرمای لەش.
بەدەگمەن سەرمابون لەسەر کەسی گەورە مەترسی هەیە. بەلاّم دەرکەوتنی نیشانەکانی سەرما لەسەر منداڵ دەشێت نیشانەی پێش وەخت بێت بۆ نەخۆشی منداڵانەی مەترسیدارتر. وەکو سورێژەو دەفتیریا. بۆیە دەبێت کاتێك منداڵ توشی سەرمابون دەبێت بە زوترین کات ببرێت بۆلای پزیشكو چارەسەر بکرێت.
سەرمابونەکە لەماوەی سێ ڕۆژدا گەشەدەکات , سەرمابونی ئاسایی بەسێ قۆناغدا تێدەپەڕێت , قۆناغی یەکەم پێی دەوترێت قۆناغی (وشك) کە زۆر ناخایەنێتو تیایدا نەخۆش هەست بە ئاوسانو لوت وشك بون دەکاتو قورگی دەسوتێتەوەو چاوەکانی ئاوی لێدێت. لە قۆناغی دوەمدا ئاو لە لوتی دێتو لە قۆناغی سێ یەمدا بە بەردەوامی ئاو لە لوتی دێتو توشی تاو کۆکە دەبێت.

ئێستا با بزانین سەرمای ئاسایی چیە ؟ هۆیەکانی چین ؟
دەتوانین بەوە وەسفی بکەین کە ئاوسانێکی زۆرە لە سەرەوەی بوری هەناسەدان بەلأم ئەم پێناسەیە وامان لێناکات زۆر لێی تێبگەین. بەکورتی زانستی پزیشکی تا ئێستاش بە وردی هۆی سەرمابونی ئاسایی نازانێت ! بەشێوەیەکی گشتی بروا وایە کە هۆی ئەم درمە جۆرێك بێت لە ڤایرۆس کە زۆربەی کات لەناو قورگا بێت. سروشتی ئەم ڤایرۆسە وایە هەرگیز هێرش ناکاتە سەر مرۆڤ ئەگەر بەرگری لەشی ئەو مرۆڤە بیٚ هێز نەبێت. وادەردەکەوێت کە ڤایرۆسی سەرما پیشاڵەکانی قورگ‌و لوتی مرۆڤ بیٚ هێز دەکات بۆیە میکرۆبەکانی تر دەتوانن زەفەری پیٚ ببەن.
باشترین ڕێگە بۆ توشنەبون بە سەرما پاراستنی تواناکانی لاشەیە بە خواردنی باش ، پشودان ، زۆر خەوتن ، لەبەرکردنی جل‌وبەرگێك کە لەسەرما بمانپارێزێت ، ئەمجا تێکەلأو نەبون لەگەڵ کەسانی توشبودا.

## ژەهراوی بون بەگۆشت یان ماسی !

ژەهراوی بونێك هەیە لە ئەنجامی خواردنی گۆشت‌و ماسی گەنیوەوە دروست دەبێت ، کە لە ئەنجامی خواردنی خۆراکێکەوە دەبێت کە چەوری زۆری تێدایە ، یان دەشێت خۆراکەکە باش هەڵنەگیرابێت ، کە بەکتریا بە ئاسانی تیایدا گەشەدەکات‌و خراپی دەکات.
دەستەواژەی (پوتیولیزم) واتە ژەهراوی بون بە خواردنی گۆشت‌و ماسی گەنیو. لەوشەی (بوتولوس) ی لاتینیەوە ، وەرگیراوە کەمانای (وشتر مورغ ) دەدات. دیارە لەکۆندا زۆربەی ژەهراوی بونەکان لەخواردنی وشتر مورغی باش هەڵنەگیراوەوە ڕویداوە.
کاتێك مرۆڤ توشی ژەهراوی بون دەبێت ، دەڕشێتەوەو بیٚ هۆش دەبێت‌و ماسولکەکانی توشی ئیفلیج بون دەبن‌و بەزەحمەت دەتوانێت ببینێت و قسەبکات و شت بخوات و ناو پەنجکی (حجاب الحاجز) بە تەواوی لەکاردەکەوێت ئەو بەکتریایەی دەبێتەهۆی ژەهراوی بون ، ڕەنگە بۆنێکی ناخۆش بڕژێنێت یان نەڕژێنێت بۆناوی خۆراکەکە. مانای وایە مرۆڤ ناتوانێت بونی ئەو بەکتریایە لەناو خواردنەکەدا هەست پیٚ بکات.چونکە خواردنەکە هیچ بۆنێکی ناخۆشی لێوە نایەت.

دەبێت هەر خواردنێکی هەڵگیراو تا بە شێوەیەکی جوان گەرمی نەکەینەوە نەیخۆین هەروەها دەبێت ئەو میوەو سەوزانەش دوای ڕنینەوەیان ڕاستەوخۆ بشۆردرێن و پێش بە قوتوکردنیشیان جارێکی تر بشۆردرێنەوە.
دەبێت گۆشتو ماسیو گۆشتی پەلەوەرەکانیش پێش بە قوتوکردنیان لە مەنجەڵێکی هەڵم پەستدا جوان بکوڵێنرێن. هەر خواردنێکی بە قوتوکراو بەوجۆرەش هێشتا چارەسەر نەکراوەو پێش خواردنی دەبێت جارێکی تر بکوڵێنرێتەوە. ئەگەر هەست کرا هەر خواردنێك ڕەنگو بۆنو تامی خراپ بوە دەبێت نەخورێتو فڕێ بدرێت.

## مرۆڤی کرۆمانیۆنی !

ڕۆژگارێك هەبوە مرۆڤ لە ئەشکەوتدا ژیاوە. دەشێت مرۆڤی ئەشکەوت پێیان بوترێت مرۆڤی کرۆمانیۆنی , کە لەکۆتایی چاخی بەفردا لە ئوروپادا ژیاون. بۆیە پێیان دەوترێت مرۆڤی کرۆمانیۆنی چونکە یەکەمین پاشماوەی دانیشتوانی مرۆڤی ئەشکەوتی لەوجۆرە , لە ناوچەی کرۆمانیۆی باشوری فەرەنسادا دۆزرایەوە کاتێك پسپۆڕان فەحسی یەکەم پەیکەری مرۆڤی کرۆمانیۆنیان کرد , گەیشتنە ئەوەی بڵێن مرۆڤی کرۆمانیۆن زۆر زیرەك بونەو ئەگەر بەعەقڵەوە لەم ڕۆژگارەدا بژیانایە دەشیا ببونایەتە زاناو پیاوی دەوڵەت و بازرگانی گەورە !
مرۆڤی کرۆمانیۆن لەڕۆژگارێکی زۆر سەختدا ژیاوە. ئاژەڵی دڕندەو مەترسی تری زۆر چواردەوری دابو. لەگەڵ ئەوەشدا کاتی ئەوەیان هەبوە , وێنەی جوان لەسەر ئەو ئەشکەوتانە بکێشن کە تیایدا ژیاون. تا ئێستاش ئەو وێنانە مایەی سەرسوڕمانن بەهۆی ئەو جوانی و سەلیقەیەوە کە تیایدا هەیە.
خەڵکی ئەو سەردەمە ژیانێکی کۆمەڵایەتی زۆر پێشکەوتویان هەبوە. چونکە لەناو خێزاندا ژیاونو بەکۆمەڵ ڕاویان کردوە. کەواتە وەکو تایەفەو خێڵو عەشرەت ژیاون. هەروەها بڕواشیان بەجیهانی ڕۆح هەبوە , کە مردو لەو دونیاکەی تردا زیندو دەکرێتەوە.
بەرەبەرە کەرەستەی خۆیانیان وەکو چەك و قاپ و قاچاخ لەبەرد دروست کردو فێربون چۆن لەشاخ و ئێسقان تیر دروست بکەنو بۆ ڕاوکردن بەکاری بهێنن.
بەوجۆرە دەبینین مرۆڤی کرۆمانیۆن زۆر زیرەك بوەو گەیشتۆتە پلەیەکی زۆر بەرز لە پێشکەوتندا.

## چۆن گروپی خوێن دیاری دەکرێت ؟

ڕەنگە باوەڕنەکەن کە خوێنی هەریەکێك لەئێوە , وەکو خوێنی کەسێکی تر نیە. بۆ ماوەیەکی زۆریش بو زانست بەمەی نەزانیبو. بۆیە کرداری خوێن گواستنەوە بەبێ زانینی گروپی خوێنەکە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەکرا. لەئەنجامدا دەرکەوت تەندروستی نەخۆشەکە لەبری ئەوەی چاك بێتەوە خراپتر دەبوو و پەنجا لەسەدی حاڵەتی خوێن گواستنەوەکان دەمردن.

لەبەرئەوە دەست کرا بە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بابەتەو دەرکەوت کەگروپی خوێنەکان جیاوازن. لەکاتی تێکەڵ کردنی دوجۆر خوێن دا , دڵۆپێك خوێن لە گروپێك تێکەڵ بە پلازمای زومرەیەکی تری خوێن دەکرێتو خانەکانی خوێن تەکەتول دەکەن پێکەوە و ئەم کردارەش پێی دەوترێت "تلازُن ".

کاتێك تولازون ڕودەدات خانەکانی خوێن توشی لەناوچون دەبن. بەهۆی تاقیکردنەوەکانی تولازونی خوێنەوە , دەرکەوت خوێنی مرۆۋ دەکرێتە چوار گروپەوە کە ئەمانەن AB B A O

خانەکانی گروپی A لەگەڵ پلازمای هیچ کام لەگروپەکانی تردا تولازون ناکات. کەواتە دەتوانرێت خوێن لەگروپی O بگوێزرێتەوە بۆهەرکەسێك , خاوەنی ئەم گروپەی خوێن پێیان دەوترێت. خۆبەخشە جیهانیەکان.

گروپی AB پلازماکەی لەگەڵ هیچ گروپێکی تردا تولازون ناکات. واتە تەکەتول ناکاتو نانوسێتە هیچ کام لەخانەکانی تردا. لەبەرئەوە خاوەنی ئەم گروپە خوێنە دەتوانن لەهەر گروپێکی ترەوە خوێن وەربگرن. هەر کام لەئێمە گروپێکی خوێنمان هەیەو هەتا هەتایە ناگۆڕیت کە جێی سەرسوڕمانو گرنگی پێدانە. وادەردەکەوێت بەشێوەیەکی دیاری کراو گروپە خوێنەکان دابەش کرابن. چونکە هەرچەندە لەڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات بچین ڕێژەی سەدی ئەو کەسانە کەم دەبێتەوە کە گروپی خوێنەکەیان Aیە. لەکاتێکدا ڕێژەی سەدی خاوەن گروپی O کان بەرزدەبێتەوە.

٤٣٪ خەڵکی بەریتانیا گروپی خوێنەکەیان A. بەڵام ڕێژەی هەڵگری ئەو گروپە لەڕوسیادا ٣٠٪و لەهندستاندا ١٥٪ گروپی B یش پێچەوانەکەی ڕاستە.

## گواستنەوەی خوێن چیە ؟

مرۆۋ لەزۆرکاتدا پێویستی بەخوێن دەبێت , سەربازێك لەجەنگدا بریندار دەبێت ,

یان کرێکارێك لەکارگەیەدا توشی ڕوداوێك دەبێت ، یان کەسێك بەهۆی خوێن بەربونەوە ڕوبەڕوی مەترسی مردن دەبێتەوە ، یان نەخۆشێکی لاواز لەکاتی نەشتەرگەریدا پێویستی بەخوێن دەبێت.

بۆیە خوێن دەکرێتە گیانی نەخۆشەوە تا قەرەبوی ئەو خوێنە بکاتەوە کە لە دەستی داوە یان بۆ زیادکردنی توانای نەخۆشەکەیە بۆ ئەوەی پێش وەخت بەرەنگاری تیادا دروست بکرێت. لیترێك یان دولیتر خوێنی تازەی تیٚ دەکرێت لەڕێگەی دەمارەوە ، ئەمەش مانای پیٚ بەخشینی ژیانێکی نوێیە بەو نەخۆشە !

بیرۆکەی گواستنەوەی خوێن شتێکی تازە نیە. لەساڵی ١٦٥٤ دا پزیشکێکی ئیتاڵی بەناوی (فرانسیسکۆ فوللی ) هەوڵی گواستنەوەی خوێنی دا لە ئاژەڵێکی زیندووەوە بۆ ئاژەڵێکی تر. دوای ئەوەش هەوڵی گواستنەوەی خوێن درا لە ئاژەڵەوە بۆ مرۆۋ بەلاٚم ئەنجامەکانی ئەکتیڤ نەبون.

ئێمە دەزانین خوێنی ئاژەلاٚن لەجۆرێکی دیاری کراو خوێنی گیانلەبەرانی تر لەجۆرێکی تر قبولٚ ناکات. ئەوە ڕاستیەکەو ئەگەر بکرێتە لاشەیەوە دەبێتە ژەهرو دەیکوژێت. لەجەنگی جیهانی یەکەمدا گواستنەوەی خوێن پێشکەوتنی گەورەی بەخۆیەوە بینی ، لەو کاتەدا زانراوە کە وەرگرتنی خوێن لەکەسانێکی ترەوە ناتوانرێت بکرێتە گیانی کەسانێکی تر. ئەوەش ڕابەرایەتی دیاری کردنی هەرچوار گروپە خوێنەکەی کرد بەهۆی تاقیکردنەوەی لەپێش بەکارهێنانی.

ئەوەی ئەمڕۆ زۆر باوە دیاری کردنی خوێنی خوێن بەخشەکانە پێش بەکارهێنانی ، هەروەها لەخەستەخانەکاندا بانکی خوێن هەیە کە خوێنی تیادا هەڵدەگیرێت لەپلەیەکی زۆر نزمدا. بۆ بەکارهێنانی لەکاتی پێویست دا.

ئەم بانکی خوێنانە وەکو بانکی دارایی ئیش دەکەن ، بەلاٚم لەبری ئەوەی پارە بدەنە خەڵکی خوێنی دەدەنیٚ. ئەمڕۆ بانکەکان نەك تەنها خوێن بەڵکو (پلازما)ش (زینجکاوێکە لەخانەکانی خوێن جودا دەکرێتەوە ) لە یەخچاڵی تایبەتیدا هەڵدەگرن. دوای وشك بونەوەی دەکرێتە هاڕاوەیەك و لەتورەکەی زۆر مەحکەم‌و داخراودا هەڵدەگیرێت و لەکاتی پێویستدا لەگەڵ کیسەیەك ئاوی دڵۆپێنراودا دەدرێتە نەخۆش.

لەکاتی پێویستی بون بەخوێندا ئاوەکە دەکرێتە ، ناو پلازما هاڕاوەکەوەو بەوجۆرە ئامادە دەبێت بۆ لێدان. لەبەرئەوەی پلازما هیچ جۆرە خانەیەکی خوێنی تێدا نیە. بۆیە گروپی خوێن هیچ کێشەیەك دروست ناکات‌و دەتوانرێت پلازماکە

بۆ هەرچى نەخۆشيەك بەكاربهێنرێت.

## بۆچى جۆرەها قژى جياواز هەيە ؟

پشتاوپشت جۆرى قژ ديارى دەكات. بەلأم پرسيار لێرەدا ئەمەيە بۆچى جۆرەها قژى بۆماوە هەيە ؟

لەنێوان خەلكيدا بەگشتى پێكهاتەى قژ جياوازيەكى زۆر كەمى هەيە. بەلأم جياوازيەكە لەشێوەو رەنگو داهێنانى قژدايە. قژ باشترين رێگەيە بۆ ناسينو دياريكردنى مرۆڤەكان كە سەر بە چ نەژادێكن. كەواتە ئەو قژەى پێمانەوەيە مۆرى رەگەزو نەژادى هەريەك لەئێمە ديارى دەكات.

بەپێى پێكهاتەكەى قژ دەكرێتە سێ بەشى سەرەكيەوە. يەكەميان قژى كورتى لول ئەگەر ئەم قژە درێژبو لەشێوەى هێلكە يان گورچيلەدا ديار دەدات. رەنگى ئەم جۆرە قژە رەشێكى خەلوزيەو نەژادە رەشەكان هەلگرى ئەم جۆرە قژەن. جۆرى دوەم قژى خاوو درێژو زبرە , ئەگەر تەلێكى بخرێتە ژێر ميكروسكۆبەوە شێوەكەى بازنەيى ديار دەدات. رەنگەكەى بەرەو رەشەو ئەمەش قژى چينىو مەغۆلىو هنديەكانى ئەمريكايە.

جۆرى سێ يەم لەقژ شەپۆلاوى يان نەرمێكى ئاوريشمى يە.لەژێر وردبيندا شێوەكەى هێلكەيى ديارى دەدات. ئەمەش قژى ئوروپاييەكانەو بەشێوەيەكى گشتى رەنگەكەى كراوەيە. لەنێوان رەشو قاوەيىو سورو زەردا.

جۆرى چوارەم لەقژ بەشێوەيەكى گشتى بەقژى (لول) ناسراوە كە قژى دانيشتوانى ئوستراليە رەسەنەكانە. قژى شەپۆلاوى بەشێوەيەكى گشتى لە پێكهاتەيدا گوشادەو هەرچەندە قژەكە زياتر چەماوەتر بێت رەقترە. سەبارەت بە رەنگ , هەندێك لەجۆرەكانى قژ چەند رەنگێك دەنوێنن , هەندێكى تريشيان رەنگەكانى تەنها يەك شێوەيە.

زۆربەى جياوازيەكان لەقژە شەپۆلاويەكاندا دەبينين. لەبەرئەو هۆيە تۆخترين رەنگى قژى رەش لەگەل قژى كەتانيدا (رەنگى كاييەكى زەردە ) لەنێوان ئوروپيەكاندا دەبينين. بەلأم قژى كال بەزۆرى لەباكورى ئوروپادا بلأوبۆتەوەو لەباشوريدا دەگمەنە.

هەروەها قژى كال (زەرد) لەنێوان نەژادى مرۆڤى قژ كورتە خاوەكاندا بەدەگمەن دەبينرێت. بەلأم قژى سور لەنێوان مرۆڤە قژلولەكانو قژەپۆلاويەكاندا بلأوە.

بەلاّم قژی سور تایبەتمەندیەکی تاکیەو هیچ نەژادێك نیە تایبەت بن بە قژی سورەوە !

## چی وامان لێدەکات یاد بکەینەوە ؟

هیچ کەسێك ناتوانێت تەفسیری ئەوە بکات , کە چۆن مێشك دەتوانێت یادەوەریەکان پەسیسەبکات , یاخود چۆن مرۆڤ دەتوانێت یادەوەریەکان یادبکاتەوەو بەبیری خۆیدا بیهێنێتەوە. بەلاّم تا ئەندازەیەك دەتوانین سەبارەت بەچەند جۆرێکی جیاواز لەو بیرهاتنەوە یان ئەو ڕێگایانەی یارمەتی وەبیرهێنانەوەمان دەدەن باس بکەین.

(ژاکرە) یاد , واتا توانای پەسیسەکردن لەعەقڵدا بەو شتانەی کە مرۆڤ فێری بوە یان تاقیکردۆتەوە. هەرچی شتێك لەمرۆڤ ڕودەدات جۆرێك لە "کاریگەری " یان "تۆمارکردن " لەمێشکیدا جیّ دەهێڵێت. ئەو تۆمارکراوەش ئەگەر ئیشی لەسەر نەکرێتو یادنەکرێتەوە و دوبارە نەکرێتەوە. وردە وردە لەناو دەچێت. چەند ڕێگایەك هەیە بۆ وەیاد هێنانەوەی شتەکان کە یەکێکیان "هێنانەوە بیرخۆ " یە ئەگەر کەسێك پرسیاری لیّ کردی , لەدوای چەند ڕۆژێکی کەم لەکۆتایی هاتنی ئەو ئاهەنگەی بەشداریت تێداکردبو. دەربارەی ئەو کەسانەی ئامادەی ئاهەنگەکەبونە. ئەوا هەولّ دەدەیت ناوو شێوەی ئەو کەسانە بێنیتەوە بیری خۆت.

"وەبیرهێناوە " جیاوازی هەیە لەگەلّ ڕام بوندا (الّادراك) ئەگەر پرسیاریان لێکردیت بۆ نمونە (فلاّن ) لە ئاهەنگەکەدا ئامادەبو. ئەوا دەزانیت کە ناوێکی لەوجۆرە فیعلەن لەئاهەنگەکەدا ئامادەبوە. یان ئەگەر لە جادەدا توشی یەکێك لەو کەسانە ببیت , ئەوا دەزانیت کە ئەو کەسە یەکێك بوە لە ئامادەبوانی ئاهەنگەکە.

وەبیرهێنانەوە لە ئیدراك گرانترە. ئەگەر مامۆستا داوای لێکردیت بابەتی وانەی حەفتەی پێشو بەبیری خۆت بێنیتەوە , گرانترە وەك لەوە بیر هێنانەوەی ناوی بابەتەکە. ڕامان (تصور) جۆرێکی سیّ یەمی وەبیرهێنانەوەیە. بەبیرتان دێتەوە کە لە پشوی هاوینی ڕابوردودا چی ڕویداوە. بەهۆی بینینەوە بەچاوی عەقلّ. هەروەها دەتوانین دوای وەستانی مۆسیقاش دەنگەکەی لەگوێچکەماندا بزرنگێتەوەو بیبیسین. خەیالّی یەکەم پێی دەوترێت خەیالّی (بینین)و خەیالّی دوەمیش پێی دەوترێت خەیالّی (بیستن ).

بەستنەیەکەوەی شتەکانیش ڕێگەی چوارەمە بۆ بیرکردنەوە , کاتێك یەکێکمان بە تاقیکردنەوەیەکدا تێدەپەڕێت. لەهەمان کاتدا شتێکی تر لەگەڵ ئەو تاقیکردنەوەیەدا یان لەپێشیدا یان لەدوایدا تاقیدەکاتەوە. ئەو تاقیکردنەوانە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە بەجۆرێك کاتێك یەکێکمان بیر دەکەوێتەوە ئەوانی تریشمان بیردەکەوێتەوە.

## چۆن لاشەی مرۆڤ لەپاشەڕۆکانی ڕزگاری دەبێت ؟

بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤ لاشە وەکو ئامێرێك بەردەوام ئیش دەکات. لەو خواردنەش کە دەیخۆین وزەی دەست دەکەوێت. لەماوەی هەرس کردنی پرۆتینندا مەوادەکانی وەکو شلەی ئەمۆنیاك (نەوشادر) و میزو ترشەمیز بەرهەم دێن. لەگەڵ ئاوو دوەم ئۆکسیدی کاربۆندا. لەبەرئەوەی ئەو ئاوانە ژەهراوین دەبێت لەلاشەدا نەمێنن.

ئایا دەزانن لاشە چۆن لەو پاشەڕۆیانە ڕزگاری دەبێت ؟

لەلاشەدا سیستەمێك هەیە بۆ دەرکردنی پاشەڕۆکان. بۆ نمونە دو گورچیلەهەن لەلاشەدا وەك فلتەر ئیش دەکەن بۆ لابردنی پاشەڕۆکان لەشێوەی میز لە خوێندا. هەروەها دو گورچیلە یارمەتی ڕێکخستنی پێکهاتەی کیمیاوی خوێن دەدەن بۆ ڕزگاربونی لەخوێ زیادەکە , کە تیایدایە.

پێستیش ئەندامێکی گرنگی ترە بۆ ڕزگاربون لە پاشەڕۆکانی لاشە. مرۆڤی باڵغی ئاسایی ڕۆژانە نزیکەی ٧٪ لیتر لەئاوو ڕێژەیەکی کەم لەخوێ دەردەدات لەڕێگەی عارەق کردنەوە.

سیەکانیش دو ئەندامی ترن بۆ ڕزگاربون لەپاشماوەکانی لەش , لەبەرئەوەی لەڕێگەی هەناسەدانەوە ڕزگارمان دەکەن لە دوەم ئۆکسیدی کاربۆن , هەر مرۆڤێکی ئاسایی ٢٪ لیتر دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدات لەخولەکێکدا.

دوای هەرس کردنی مەوادە خۆراکیەکانیش , پاشەڕۆکان لەڕێگەی ڕیخۆڵەگەورەو دەریچەوە بەشێوەی پیسی دەردەچن. هەروەها لوتیش ڕزگارمان دەکات لەچڵم بەو شێوەیە ئەندامەکانی لەش لەپاشەڕۆ ژەهراویەکان ڕزگارمان دەکەن.

## گالیلۆ

گالیلۆ بەیەکێك لە مەزنترین زانایانی سەرزەوی دادەنرێت. یەکەم کەس بو زۆر لەبیرۆکە نادروستەکانی سەبارەت بە سروشت سەلماند.

گالیلۆ لەساڵی ١٥٦٤ دا لەشارۆچکەی "بیزا " ی ئیتاڵیا لەدایك بوەو باوکی بازرگان بو. گالیلۆ هەر بە منداڵی بلیمەت بوەو حەزی لە مۆسیقاو وێنەکێشان کردوە و خۆی بە دروست کردنی یاریە زانستیەکانەوە خەریك دەکرد و زۆر سەرنج و تێبینی شتەکانی دەکرد. شەوێکی تاریك کە بۆ نوێژکردن چوبوە کەنیسە , بەرپرسی کەنیسە خەریکی داگیرساندنی مۆمەکان بو , کاتێك پیاوەکە هەمو مۆمەکانی داگیرساند گالیلۆ سەیری کرد ئاگرەکە بۆ پێشەوەو بۆ دواوە دەلەرێتەوە. زۆر بە وردی سەرنجی ئەو کردارەی داو , تێبینی کرد لە هەمو جارێکدا تیشکەکە پانتاییەکی کەمتر لە لەجاری پێشو داگیردەکات. هەستی کرد ماوەی نێوان هاتوچۆکان جار لە دوای جار کەمتر دەبێتەوە. بەلاّم ئەو کاتەی هاتوچۆکان پێویستیان پێی دەبێت نەگۆڕە.

لەو رۆژگارەدا کاتژمێر نەبو. گەورەترین کێشە کە روبەروی گالیلۆ دەبوەوە ئەوەبو چۆن بیرۆکەکەی بەکات پێوانە بکات ؟! بەلاّم هەر زۆر زو بیرۆکەیەکی بەبیردا هاتو لەبەرئەوەی لێدانی دڵی مرۆڤی دەزانی لێدانێکی گرتو ئەمجا لێدانەکەی دوبارە دەکردەوە لەماوەی هەر هاتو چۆیەکی گرەکەدا.

کاتێك هەستی کرد تێبینی یەکانی بەرەو بیرۆکەیەکی دروست دەچێت توشی گەشکەو خۆشی هاتو لەسەر ئەم بنەمایەش بۆ یەکەم جار کاتژمێری باندۆڵی دروست کرد. کاتێك گالیلۆ گەیشتە تەمەنی ٢٣ ساڵی وەکو مامۆستایەکی وانەبێژ لەزانکۆی "بیزا" دامەزرا. دوای دوساڵ لەفێرکردن بە باشترین مامۆستا راگەیەنرا. لەو ماوەیەدا لە کتێبێکی ئاینیدا خوێندبویەوە ئەگەر دوتەنی کێش جیاواز لە شوێنێکی بەرزی یەکسانەوە بخرێتە خوارەوە ئەوا تەنە قورسەکە زوتر دەگاتە زەوی.

بەلاّم گالیلۆ سەلماندی ئەم بیرۆکەیە هەڵەیەو هەستا چوە سەری قوڵلەی بیزای خوارو دوتەنی جیاوازی فرێ دایە خوارەوە یەکەمیان ١٠٠ پاوەندو ئەوی تریشیان ١ پاوەندبو هەزاران کەس ئەم تاقیکردنەوەیان بەچاوی خۆیان بینی زۆر سەرسام بون کاتێك بینیان هەردو تەنەکە لەیەك کاتدا گەیشتنە زەوی , گالیلۆ بو یەکەمین تەلیسکۆبی لە جیهاندا دروست کرد. کە لە رێگەیەوە توانی زۆر لە تەنە ئاسمانیەکان ببینێت. بەهۆی ئەو تەلیسکۆبەوە بو مانگی بینی کە لە خولگەی موشتەریدا دەخولێتەوە.

هەروەها لێکۆڵینەوەی لەسەر زۆر لە ئەستێرەکان کرد , لەوانە ئەستێرەکانی

ڕێگەی کاکێشان. گالیلۆ ڕاستی بیرۆکەکانی "کوپەرنیکۆس"ی سەلماند کە "زانایەکی گەردون ناسی " پۆڵەندی بوەو لەساڵی ١٤٧٣-١٥٤٣ دا ژیاوە , کە دەڵێت : زەوی و ئەستێرە سوڕاوەکانی تر بەدەوری خۆیان و خۆردا دەسوڕێنەوە. گالیلۆ بۆچونەکانی خۆی لەکتێبێکدا بلاْوکردەوە.

دۆزینەوەکانی گالیلۆ , پیاوانی کەنیسەی سەغڵەت کرد , لەبەرئەوەی پێچەوانەی زۆر لەو بیروباوەڕانەبو , کە باوەڕدارە مەسیحیەکان بڕوایان پیْ هەبو. لە ئەنجامی ئەوەدا لە تەمەنی پیریدا خرایە زیندانەوەو , کاربەدەستان ئامادەبون لێی ببورن ئەگەر بڵێت قسەکانم هەڵەیە. خرایە ژێر فشارێکی ئەوتۆوە کە ناچاربو مل کەچ بکاتو بەکاردەستان بڵێت : من لەژێر دەستاندام , تەنها خوای گەورە ڕاستیەکان دەزانێت , بەلاْم من هەست دەکەم زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. پیرەزانا لەساڵی ١٦٣٧ دا کوێربوو و لەکانونی دوەمی ١٦٤٢ دا کۆچی دوایی کرد.

## مرۆڤ چۆن توشی نابینایی دەبێت ؟

ڕەنگە توشی سەرسوڕمان بیت , ئەگەر بزانیت نزیکەی چوارملیۆن نابینا هەیە لەجیهاندا. نابینایی جۆری زۆرە. هەندێك کەس بەتەواوی نابینانو هەندێکی تر بەنیوەیی , خەڵکی وا هەن بە نابینایی لەدایك دەبن و هەندێکی تریش بە تێپەڕبونی تەمەنیان نابینا دەبن. ئەوانەی بە نابینایی لەدایك دەبن , ئەگەر بەراورد بکرێن لەگەڵ ئەوانەی لەماوەی ژیانیاندا نابینا دەبن زۆر کەمن.

ئایا دەزانن مرۆڤ بۆچی نابینا دەبێت ؟

ئێمە هەموو هۆیەکانی نابینای زگماکی نازانین. بەلاْم مسۆگەر ئەوە دەزانین کە ئاولەمە لە سکی دایکیدا کوێر دەبێت. لەئەنجامی نەخۆشی گەلێکدا کە ئافرەتەکە پێوەی دەناڵێنێت وەکو نەخۆشی (سیلان) کە نەخۆشیەکی کۆئەندامی زاوزیْ ی زۆر مەترسیدارە. کە دەشێت ببێتەهۆی کوێری ئەو ئاولەمەیەی لەسکی دایکە نەخۆشەکەدایە. ئەگەر دایکەکە نەخۆشی (سلفس)ی هەبو ئەوا چاوی مندالْەکە بەتەواوی لەنەشو نوما دەوەستێت.

هەروەها نەخۆشی تۆڕی چاوو وردە دەمارو چەقی بینین لەمێشکدا دەشێت ببێتەهۆی کوێربونی زگماکی. نابینایی دوای لەدایك بون سیْ هۆی سەرەکی هەیە کە بریتین لە :

تەراخوما , تاریك بونی عەدەسەی چاو , ئاوی ڕەش.

تەراخوما نەخۆشیەکی مەترسیدارە کە لە ئەنجامی جۆرێك ڤایرۆسەوە دروست دەبێت. کە دەبێتەهۆی دروست بونی زیپکە لەسەری ڕوی ناوەوەی پێڵوەکانی چاوو ئەزیەت دانی.

نەخۆشی (تاریك بونی عەدەسەی چاویش) شەفافیەتی عەدەسەی چاوتەسك دەکاتەوە تا گلێنە. ئەو کەسانەی ئەم نەخۆشیەیان هەیە وردە وردە چاویان لەدەست دەدەن و نابینا دەبن. بەلاَم دەشێت ئەم نەخۆشیە بە نەشتەرگەری چارەسەربکرێت. هەندێك کەسیش چاویان ئاوی ڕەشی دێت و گلێنەی چاویان وشك دەبێتەوە و پاڵەپەستۆی زیاتر لەسەر دەمارەکانی چاویان دروست دەبێت. ئەم نەخۆشیەش چاو بەرەوکزبون دەبات.

چەند نەخۆشیەکی تریش هەن چاوکز دەکەن وەکو سیل , شەکەری , دەفتیریا , سەحایاو هیتریش. دەشێت لەئەنجامی ڕوداوێکیشدا مرۆڤ چاوەکانی لەدەست بدات بۆیە پێویستە مرۆڤ زۆر گرنگی بەپاكو خاوێنی چاوەکانی بدات , بۆ ئەوەی بەساغی بمێنێتەوە و ماوەیەك جارێکیش سەردانی پزیشکی تایبەتی بکات.

## جۆرەکانی برێك

برێك ئامێرێکە بۆ خاوکردنەوەی خێرایی یان بۆ وەستان بە کاردەهێنرێت.برێك چون تەنە ڕۆیشتوەکان وزەیەکی ڕۆیشتنی زۆریان تێدایە,برێك ئەو وزەیە دەمژێت ,زۆربەی برێکەکان بە شێوەی میکانیکی یان هایدرۆ دینامی یان کارەبایی ئەو وزەیە دەمژن.

برێکی میکانیکی زۆر بەربلاَوە و لە ئۆتۆمبێل و ماتۆر و شەمەندەفەرەکاندا بە کار دەهێنرێت,بە لێکخشاندنێك لە ئەنجامی پاڵەپەستۆیەکەوە لە پارچەیەك لە مادەیەکی ڕەق لە سەر تەنە جولاَوەکە دروست دەبێت ,وە دەتوانرێت پرگالْ(کماشە)بە کاربهێنرێت کە بدات لە لێواری تایەکە ,لە برێکی ماتۆردا کە بە هۆی بەرزکەرەوەو سیمەوەدەخرێتە گەڕ.

برێکی ئۆتۆمبیلەکانیش بە سیستەمی هایدرۆلی(تایبەت بە جوڵەی شلەکانەوە)شلەکە بە هێزێك تیایدا دەگوێزرێتەوە.لە برێکی ئۆتۆمبیلە گەورەکانیشدا هەوای پەستێنراو بەکاردێت بۆ برێك گرتن.

لە برێکی سوڕاوەشدا دوو پارچە برێکی بازنەیی لە ناو لولەکێکی پەیوەست بە ڕەوڕەوەکەوە دادەنرێت ,لە کاتی پاڵەپەستۆدا بە هۆی ئەو پارچەیەوە لە دیوی

ناوەوەی لولەکەکە برێك گرتن ڕوو دەدات.
لە برێکە بازنەییەکانیشدا برێکەکە پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر بەشی دەرەوەی تایەکە ,کە پەیوەستە بە ڕەوڕەوەکەوە.
بەلاّم برێکی ئۆتۆماتیکی هەوایی خێرا لە سەر دەستی (جۆرج ولیتن هاوس)ی ئەمەریکی دا هێنراله ساڵی ١٨٦٩ دا.ئەم جۆرە برێکە بۆ وەستاندنی شەمەندەفەرەکان بەکاردەهێنرێت,بە یارمەتی هەوایەکی پەستاوەوە ,ئێستا لە ئەمەریکا و زۆربەی ولاّتانی تری دونیادا شێوەیەکی پێشکەوتوتر لە سیستەمی برێکەکەی ویستن هاوس.لە شەمەندەفەرەکاندا بە کاردەهێنرێت.فڕۆکەکانیش,جۆرێکی جیاواز لە برێکی میکانیکی بە کاردەهێنن کە لە برێکی ئۆتۆمبیل دەچێت.

## شڵی چییە؟

بۆ ئەوەی بزانین شڵی چییە و چۆن پەیدا دەبێت ؟دەبێت یەکەمجار تێبگەین چی ئەو ڕەنگە دەدات بە پێستی دەموچاو.
ڤیتامین گرنگترین ڕەنگە لە دیاری کردنی ڕەنگی پێستی دەموچاودا.دەتوانین بڵێین کە ڕەنگی پێستی مرۆڤەکان بە هەموو ڕەنگەکانیەوەبە تەواوی پشت بە جیاوازی ڕێژەی ڤیتامین دەبەستێت,لە کارە گرنگەکانی تری ڤیتامین لە پێستی مرۆڤدا,جگە لە دیاری کردنی ڕەنگ,پاراستنی مرۆڤە لە کاریگەرە زیانبەخشەکانی زیاد لە پێویستی تیشکی خۆر.
ڤیتامین تۆڕێکی تەواوە لە خانەی تایبەتی کە بلاّوبوەتەوە بەهەموو چینەکانی ژێر پێستداو ,پێی دەوترێت خانەکانی ڤیتامین.
هۆی شڵی کۆبونەوەی یان تەکەتولی خانەکامی ڤیتامینە لە جێگەیەکدا لە سەر دەموچاو لە بەر ئەوەیە کە ڤیتامین ڕەنگێکی قاوەیی لە خۆ دەگرێت,ئەی بۆچی شڵی لای هەندێ کەسدا دروست دەبێت وە لای هەندێکی تردا دروست نابێت؟
هۆیەکەی پشتاو پشتەو باوکەکانمان بڕیاڕی ئەوە دەدەن شڵی لە سەر پێستمان دروست بێت یان نا !
دەشێت ڕەنگی شڵی بە گوێرەی ڕەنگی ڤیتامینەکە بگۆڕیت.لە ڕەشەوە بۆ زەرد یان قاوەییەکی تێر.بە پێی گەرما بوون چونە بەر تیشکی خۆر.تیشکی خۆر نەك تەنها ڕەنگی شڵیەکە تێرتردەکات بەڵکو هۆیەکیشە بۆ دروسن بونی ڤیتامینی

تازەتر.

## بۆ چی مرۆڤ کە توشی (صدمە ) هات موی سپی دەبیت؟

بەڵێ ئەوە خۆی بۆ خۆی وەڵامی ئەو پرسیارەیە. بەڵام ئەوەی کە نامۆ یە ئەوەیە تا ئێستاش ناتوانین ئەفسیرێکی تەواو بۆ ئەوە بکەین بۆچی (صد مە) و هەڵچوونە دەروونییەکان هۆیەکن بۆ قژ سپی بوون. بەڵکو لەوەش زیاتر تا ئێستا هۆی قژ سپی بوون لە پیریشدا نازانین چی یە. سەرەڕای ئەمانەش ئەوەندەی پێمان دەکرێت بیرۆکەیەکتان بدەینێ کە چی ڕوو دەدات.

موو لەژێر پێستدا دەڕوێت هەر لەوێشدا ڕیشە دادەکوتێت. دوای ئەوە وەکو گۆڵە خەزێم دێتە دەرەوە. کاتێك خانەکانی موو لە ژێر پێستەوە دەر دەچن و لە پێست دوور دەکەونەوە. مووەکە دەگۆڕێت بۆ ماددەیەکی (قرنی) وە لەسەر ڕووی دەرەوەی مووەکە خانەکان وەکو زنجیر بەسەر یەکدا دەکەون , ئەمەیە کە ڕەنگێکی کانزایی دەداتە موو.

لە نێوان خانەکانی ڕەنگی موودا , خانەی تایبەت هەیە کە ڕەنگی تێدایە پێیان دەوترێت حانەکانی بۆیاخ.

کە لەگەڵ خانەکانی تری قژدا زۆر دەبن و بەرەو سەرەوە دەبزوێن بەڵام کاتێك بەرەو سەرەوە دێت لەگەڵ گەشە سەندنی مووە کەدا لە کۆتاییدا دەمرێت و تەنها دەنکۆکەکانی ڕەنگەکە (بۆیاخەکە) لە مووەکەدا دەمێنێتەوە خوودی ماددەی قەرەنی موو ڕەنگەکەی زەردە.

دەنکۆکەکانی ڕەنگەکان هەموویان زیاتر بەرەو ڕەنگی قاوەیین تاریکەکەیان لە نێوان ڕەنگی سوور بۆ قاوەیی بۆ ڕەشە.

لەبەر ئەوە ماددە قەرەنییەکە لەگەڵ ڕەنگەکانی دەنکۆکەکانی بۆیاخدا تێکەڵ دەبێت. لەبەر ئەم تێکەڵ بوونە هەموو ڕەنگەکانی قژ لە زەردەوە تا ڕەش بەرهەم دێت.

پشتاو پشتیش جۆری دەنکۆکەی ڕەنکەکان لە هەر یەکێکاماندا دیاری دەکات. تەفسیری ئێمەش بۆ قژ سپی بوون یەکەم جار گەورە بوونی تەمەن ئەمجا نەخۆشی و صەدمەو دڵە ڕاوکێش هۆیەکن کەوا دەکەن ڕێژەی بۆیەکە لە قژدا کەم بێتەوە قژ سپی ببێت.

تەفسیرێکی تریش هەیە ئەوەیە کە تلۆقەی هەوایی یان بۆشایی هەوایی دەست بە

دروست بوون دەكەن و دەچنە شوێنی دەنكۆكە ڕەنگی یەكان. ئێمە دەزانین كە دەشێت تووڕە بوون و غەمۆكی و دڵ تەنگی هۆیەك بن بۆ دەركەوتنی تلۆقە هەواییەكان لە نێوان خانەكانی موودا كە وای لێبكات سپی ببێت بەڵام تا ئێستاش نازانرێت ئەوە بۆچی ڕوو دەدات !

## كێ بڵندەك (مصعد) ی داهێنا ؟

بیرۆكەی بڵندەك ((ئاسان سوار)) كەسێكی دیاری كراو داینە هێناوە. ماوەیەكی دوور و درێژی خایاند تا پەرەی پێدرا. لەبەر ئەوەی مەبدەئی ئاسان سواری میكانیكی لە دێر زەمانەوە بەكار هێنراوە.
یۆنانی یە كۆنەكان بە بەكارهینانی بەكرە و بەرز كەرەوە وە , وەیانزانی چۆن شتەكان بەرز كەنەوە. بەكرە خولخولەیەكی چاڵە , دەشێت پەت لەسەری بسووڕێت. بڵندكەرەوەش ئامێرێكە خولخولەیەكی پان یان لولەكی پێوەیە.
كە بەهۆی بزواندنی لولەكەكە بە كرنێك پەتەكەی پێوە دەبەسترێت و دەتوانرێت پەتەكە لەسەر لولوكەكە لول بكرێت یان شۆڕ بكرێتەوە. بەهۆی جووڵاندنی پەتەكەی سەر بەكرەكە دەتوانرێت تەنەكە بەرز و نزم پێ بكرێت.
لەسەدەی هەڤدەهەمدا ((كورسی فریو)) داهێنرا. كە تایبەت بوو بۆ گواستنەوەی خەڵكی بۆ نهۆمەكانی سەرەوەی بیناكان دروست كراو بە سیستەمی بەكرەو سینی كاری پێ دەكرا.
لە نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بڵندەك پەیدا بوو. بەڵام لە زۆر بەی كاتەكاندا بۆ بەرز كردنەوەی شتەكان بەكار دەهێنرا و بە ووزەی هەڵم كاری پێ دەكرا. ئەوەی كە خەڵكی زۆر لێی دەترسان لەم ئامێرەدا , ئەوە بوو پەتەكە بپچڕێت یان سكەكەی دەرچێت و بارە هەڵگیراوەكە بكەوێتە خوارەوە و وورد و خاش بێت.
بەڵام ئیلیشیا ئۆتیش ئامێرێكی سەلامەتیی بۆ داهێنا و بەوەش ئەو كێشە و دڵە ڕاوكێیە كۆتایی هات و بڵندەك بوبە شتێكی داهێنراو. هەر لەو كاتەوە وزەی هایدرۆلیك (ئاوی) لە بەرز كردنەوە و دابەزاندنی بڵندەكاندا بەكار هێنرا.
ئەو ئاسان سوارە كارەباییانەی ئەمڕۆ بەكار دەهێنرێت لە داهێنانی ئەندازیاری ئەڵمانی ((ڤێرنەر فۆن سمینز)) ە.

## پێ هۆش كەر چی یە ؟

مەبەستی سەرەکی لە دەرمانە سڕکەرەکان زاڵ بونە بەسەر ئازارەکاندا. هەر لەکۆتەوە بەردەوام مرۆڤ هەوڵی داوە بگاتە ئەو ڕێگایانەی کە تەحەکوم بەسەر ئازارەکاندا بکات. کتێبێکی پزیشکی کە لە سەدەی یەکەمی زایینیدا نووسراوە باسی ئەو دەرمانانە دەکات کە دەبێتە هۆی خەوتن. ئێمە دەزانین لەو جۆرە لە ڕۆژهەلاتدا تەنانەت پێش ئەو مێژوەش بەکار هێنراوە. پزیشکە کۆنەکان هەوڵیان داوە ڕووەك و گژ و گیا و گازات و جۆرەها ڕۆن بۆ مەبەستی خەواندن بەکار بهێنن , بەڵکو لەوەش زیاتر ڕۆشتوون و هەوڵی موگناتیسیشیان داوە.

پێش بەکار هێنانی ئەم سڕکەرە نوێیانە هەموو نەشتەرگەرییەکی پزیشکی ئازارێکی بیٚ پایانی بۆ نەخۆش دروست دەکرد. زۆر بەی نەخۆشەکان لە ئەنجامی ئێش و ئازار و صەدمەدا دەمردن. بە دۆزینەوەی سڕکەرەکان نەشتەرگەری بوو بە شتێکی ئاسایی.

بۆ نەشتەرگەری دوو ڕێگە هەیە یەکێکیان دروست کردنی حاڵەتی بێهۆشییە بۆ ئەو کەسەی کە نەشتەرگەری بۆ دەکرێت کە

پێی دەوترێت (( بەنج کردنی گشتی )) ڕیگەی دووەمیش داخستنی ڕێگەی لێدانە دەمارییەکانە بۆ ئەو شوێنەی کە پێویستی بە نەشتەر گەری هەیە , کەپێی دەوترێت (( بەنج کردنی شوێنی )). زۆربەی بەنج کردنە گشتی یەکان بەهۆی گازاتێکەوە دەبێت کە نەخۆش هەڵی دەمژێت و پیٚ ی بیٚ هۆش دەبێت وەکو گازی (( ئۆکسیدی نیترۆز , ئەزۆتۆز , کلۆرۆفۆرم , ئەسیر , ئەسیلین )) کە تێکەڵەیەکی ئەندامی سڕکەرن. هەروەها سڕکەری تریش هەیە کە لە ڕێگەی دەمارەوە دەدرێت لە نەخۆشەکە.

ئەو دەرمانە سڕکەرە گشتییانە لەو نەشتەرگەرییانەدا زۆر بەسوودن کە پێویستیان بە نەشتەرگەرییەکی درێژخایەن هەیە.

زۆر جار ئەو دەرمانان لە بەنج کردنی یەکەمدا بەکاردەهێنرێت لەبەر ئەوە کاریگەرییەکی زۆر خێرا یە نەخۆش زۆر زوو بیٚ هۆش دەکات , دوای ئەوە لە ڕێگەی هەڵمژینەوە جالرێکی تر بیهۆشی نەخۆشەکە درێژ دەکەنەوە.

(( سڕکردنی شوێنی )) مادده سڕکەرەکە یان لە شوێنی نەشتەرگەرییەکە دەدرێت یان دەدرێت لە شوێنێك ئەو دەمارانە لە کار بخات کە خوێن بۆ شوێنی نەشتەر گەرییەکە دەنێرن. هەروەها دەتوانرێت ئەو دەرزییە لە ئاستە جیاوازەکانی کڕکڕەی پیشدا بدرێت.

ئەو دەرمانى بەنج كردنە كە لە كرِكرِەى پشت دەدرێت , زياتر لە نەشتەرگەرى منداڵ بووندا بەكار دەهێنرێت. هەروەها جۆرێكى تر لە سرِكەر هەيە كە بە (( سرِكەرى پەيوەست )) دەناسرێت. هەمان شت ئەميش لە منداڵ بووندا بەكار دەهێنرێت. لەم حاڵەتەدا سرِكەرەكە دەدرێت لەو شوێنەى كە دەرمانەكان لە بنكەى كرِكرِەى پشتەوە لێوە دەردەچێت و سرِكەرەكە ناچێتە ناو كە ناڵى كرِكرِەوە.

لەو دەرمانانەى لە بەنج كردنى شوێنيدا بەكاردێت (( نۆفۆكاين , يۆكايين )) نموونەى ئەم دەرمانانە واى كردووە تەنانەت هەڵكەندنى ددانێكيش تاقيكردنەوەيەكى بێ ئازار بێت.

## كێ وێنە كاريكاتێريەكان (( كارتوون )) ى داهێنا ؟

بێ گومان ئاشكرايە شتێك كە لە سەرەتادا , دادەهێنرێت تا دەگاتە لووتكە لەگەڵ يەكەمجاردا گەلێك جياوازى هەيە , باشترين نموونەش وێنەيە.

بۆ يەكەمجار وشەى (( كارتوون )) لەلايەن وێنە كێشانى ئيتاڵيا وە بەكار هێنراوە لە سەردەمى رێنيسانسدا. وە تا ئێستا هونەرمەندان هەمان وشە بەكار دەهێنن. كاتێك رِۆژنامەو گۆڤارەكان دەستيان دايە بەكار هێنانى وێنە بۆ رِوون كردنەوەى هەواڵ و سەروتار و سەرگەرم كردنى خوێنەرانى. ناوى (( كارتوون )) لەو وێنانە نرا !

رِۆژانى پێش دەركەوتنى رِۆژنامە , وێنە كێشانى بەناوبانگى وەكو هۆگاريت و گۆياو دۆمير و رِاولدسۆن زنجيرەيەك وێنەيان لەسەر بابەتێك كێشا (( كە بە زۆرى سەركەشى كەسايەتى كەسێكى دەردەخست )) كە بە بنەماى وێنەى كارتوون و كارتوونى نوێ دادەنرێت.

لەسەرەتاى سەدەى بيستەمدا ژمارەيەك گۆڤارى تايبەت بە كارتوون بلاّو كرانەوە وەكو (( تشاريفارى )) لە پاريس و

(( بوتش )) لە لەندەن و (( لايف )) و (( جورج )) لە وڵاتە يەكگرتووەكانى ئەمێريكا. كاتێك زۆر بەى رِۆژنامە و گۆڤارەكانى ئەمێريكا وەكو گۆشەيەكى بەردەوام وێنە كارتوونەكانيان بلاّو دەكردەوە , گۆڤارە تايبەتييەكان بە كارتوون رِەواجى خۆيانيان لە دەست داو لە بلاّو كردنەوە وەستان.

يەكەمين وێنەى گاڵتە جارِى لە سەرەتاى سەدەى بيستەمدا بلاّو كرايەوە ,

ريتشارد ئتكولت ئەو هونەرمەندە بوو کە کەسایەتی پۆستەر براون ی لە ساڵی ۱۹,۲ دا داهێنا. لە لایەن سەرجەم منالانی سەرانسەری ولاتەوە پێشوازی لێکراو هەموویان حەزیان دەکرد لە شێوەی جلەکانی (( پۆستەر براون )) لەبەر بکەن.
لە زنجیرە گاڵتە جارییەکانی کارتوون (( باوکی بەخێوکەر )) لە ساڵی ۱۹۱۲ داهێنرا و پاشان وەرگێڕرا بۆ ۲۷ زمانی جیاوازی دونیا لە ۷۱ ولاتدا بلاو کرایەوە.

## بۆچی هەندێك ئاژەڵ کاوێژ دەکەن ؟

هەندێك لە ئاژەلان وەکو مانگا و گامێش و مەڕ و بزن و وشتر و هیتر. یەکەم جار خواردنەکەیان دەخۆن و دوای ئەوە دەیهێننەوە ناو دەمیان بۆ ئەوەی بە شێنەیی کاوێژی بکەن. ئەو جۆرە ئاژەلانەش پێیان دەوترێت (( ئاژەڵە کاوێژکەرەکان)).
ئایا دەزانن ئەو خوە نا ئاسایی یە لای ئەم ئاژەلانە چۆن دروست بووە ؟ پێش هەزاران ساڵ ئاژەلان نەیاندەتوانی خۆیان لە دوژمنەکانیان بپارێزن وەکو شێر و پڵنگ و دڕندەکانی تر. بۆ ئەوەی مانەوەی خۆیان بپارێزن خوییەکی نائاساییان لە خواردندا دروست کرد. ئەویش پەنابردنە بەر هەجوین و قوتدانی خواردنەکە بوو. لێرەدا ئەو پرسیارە سەر هەڵدەدات چی وا دەکات ئەم کردارە نامۆ یە ببێت ؟ ئەوەی وا دەکات ئەم کردارە ڕوبدات بە فەزلی ئەو کۆئەندامە هەرسە جیاوازیانەیە لەم ئاژەلانەدا , کە ڕیخۆڵە یان لە چوار ژورۆکە پێکهاتووە و ئەمانەن:

- ورگ ( یان گەدەی یەکەمی ئامێرە کاوێژکەرەکانە ).
- ماوە.
- تلافیف ( پێچوپەنا ).
- گەدەی ڕاستەقینە یان ( ماسومە ).

کاتێك ئەو ئاژەڵە خواردن دەخوات , ڕاستەوخۆ دەچێت بۆ ورگ کە لە هەر چوار ریخۆڵەکە گەورەترە. خواردنەکە لەم قۆناغەدا لە شێوەی تۆپێکی زبردایە , ورگ هەڵدەستێت بە نەرم کردنەوەی و تەڕ کردنەوەی و لەوێشەوە دەچێت بۆ (شکە) ماوەو لە وێدا ورد دەکرێت. کاتێك کاتی کاوێژ کردنی دێت بەهۆی کردارێکەوە کە پێ ی دەوترێت ڕشانەوە خواردنەکە دێتەوە بۆ ناو دەمی ئاژەڵەکە.

دوای کاوێژ کردنی , خواردنەکە دەچێتەوە بۆ پێچاو پێچەکانی و لە وێوە بۆ گەدەو لە گەدەدا هەرس دەکرێت. بە پێچەوانەی کاوێژکەرەکانی ترەوە وشتر گەدەی سێ یەمی نی یە.
مانگا و مەڕ و بزن هیچ ددانێکیان نی یە لە کا جیرەی سەرەوەدا , لە جیاتی ددان چینێکی زۆر ڕەق لە پووك هەیە. بەهۆی ئەو کاجیرە و ئەو چینە ڕەقەی پووك ئەو ئاژەڵانە خواردنەکانیان لە دەمیاندا ورد دەکەن.

## بۆچی ژیان لەسەر هەموو هەسارەکان نی یە ؟

ڕەنگە زەوی تەنیا هەسارەیەك بێت لە کۆمەڵەی خۆردا کە ژیانی لەسەر بکرێت. لەبەر ئەوەی هەموو مەرجەکانی ژیان بردنە سەری تێدا هەیە. با چاوێك بە بارودۆخی سلبی هەسارەکانی تردا بخشێنین کەوا دەکات ژیان لەسەریان مەحاڵ بێت.

عەتارد نزیکترین هەسارەیە لە خۆرەوە , بەهۆی تەلسکۆپێکی زۆر بەهێزیشەوە ئاستەمە ببینرێت , بەرگە گازیشی نی یە.پلەی گەرمای لە ڕۆژدا لە ٤٠٠ پلەی سەدی تێدەپەڕێت و شەوانیش دادەبەزێت بۆ ١٢٧ پلەی ژێر سفری سەدی. نەبوونی ئۆکسجین و جیاوازی زۆر گەورە لە پلەکانی گەرمادا وا دەکات ژیان لەسەر عتارد نەبێت.زوهرە دورەم هەسارەی نزیکە لە خۆرەوە , وا وەسف کراوە کە خوشکی زەوی یە چونکە زەهرە و زەوی لە قەبارە و بارستاییدا وەکو یەك وان. تیرەی زەهرە ٩٥٠٠ و بارستایی ٨١٥٠٠ یە بە بەراورد لەگەڵ تیرە و بارستایی زەویدا یە.بە دەوری ئەم هەسارەیەدا هەورێکی زور چڕ هەیە کە ٩٥ ٪ ی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە , پاڵە پەستۆی سەر زهرە نزیکەی ٩٥ جار لە پاڵە پەستۆی سەر زەوی زیاترە.
پلەی گەرماشی نزیکەی ٤٨. پلەی سەدی یە. ئەمەش وا دەکات زوهرە لە هەموو هەسارەکانی تری کۆمەڵەی خۆر گەرم تر بێت. لەو کەش و هەوایەدا مسۆگەر ژیان ناکرێت.
لە دوای زەویش مەریخ دێت. کە پلەی گەرما ٦٢ پلەی سەدی یە و لە شەویشدا دا دەبەزێت بۆ ١٠١ پلەی ژێر سفر. دەرکەوتووە بەرگی مەریخ (١-٢) ٪ ی گازی ئۆرگۆنە و (٢-٣) ٪ ی نایترۆجینە و ٩٥ ٪ ی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە و (٦,٠)

٪ ی ئۆکسجینه. ئێوه بڵێن لەو بار و دۆخەدا ژیان بکرێت.
هەسارەکانی تریش کە لە دوای مەریخەوە دێن (( موشتەری , زوحەل , ئۆرانۆس , نیبتۆن , پلوتۆ )) لە خۆرەوە زۆر دوورن پلەی گەرما لەسەریان زۆر نزمە بە جۆرێك کە هیچ گیانلەبەرێك ناتوانێت لە سەریان بژێت. هەروەها بەرگە گازییەکەشیان , گازاتی وەکو میسان و ئەمۆنیا ی تیایە کە یارمەتی گەشەسەندنی گیانداران نادات.بەمجۆرە گۆی زەوی تەنیا هەسارەیەکە لە کۆمەڵەی خۆردا کە ژیانی لەسەر دەکرێت.

## ڕێوی فڕیو

ڕێوی فڕیو , ڕێوی نی یە یەڵکو جۆرێکە لە شەمشەمە کوێرە کە سەر و دەم و چاوی لە سەر و دەم و چاوی ڕێوی دەچێت. لەبەر ئەو هۆیە یە پێ ی دەڵێن ڕێوی فڕیو.
زۆر بەی شەمشمە کوێرەکان بچوکن و وەکو مشك دێنە بەر چاو , بەڵام ڕێوی فڕیو دەشێت لاشەی هێندەی سەگێکی بچووك بێت. دوو باڵی پێوەیە کە درێژی هەردووکیان دەگلتە ١٨٠ سم ددانەکانی درێژ و تیژن و دەتوانێت گوێزی هندی پیّ یشکێنێت , کە ١,٥ کیلۆ قرسە.
ڕێوی فڕیو لە هند و ئوسترالیا و مالیزیا وناوچەکانی تری ئاسیادا هەیە. تا ئێستا لێکۆڵینەوە لەسەر ٦٥ جۆر ڕێوی فڕیو کراوە. هەروەها چەندین جۆری تری جیاواز لە ڕێوی فڕیو لە دورگەکانی هەردو زەریا ی ئارام و هندیدا هەیە , کە زۆر کەم ڕەوشتیان لە ڕێوی فڕیوی ئاسایی دەچێت. بۆ نموونە : زۆر حەزیان لە میوە یە , لەم خووەش دەردی سەری گەورەی بۆ باخە ڕەزەکان دروست کردووە.
بە پێچەوانەی شەمشەمە کوێرەکانی ترەوە ڕێوی فڕیو جووتێك چاوی زۆر تیژی پێوەیە و لە ڕێگەی بینینەوە ڕێگای خۆی دەبڕێت , نەك لە ڕێگەی شەپۆلە دەنگییەکانەوە. ڕێوییە فڕیوەکان لە شوێنە زۆر قەرەباڵغەکاندا دەژێت و زۆر بەی کاتیشی لەسەر ئەو دارانە دەباتە سەر کە لە سەرچاوە خۆراکییەکەیەوە نزیکن.

## ئایا سمۆرە دەتوانێت بفڕێت ؟

سمۆرە گیاندارێکی ئاسایبە و لە هەموو شوێنێکی دونیا دا هەیە, جگە لە ئوسترالیا نەبێت. لە ناو باخچەکان, لە نزیك داران. سمۆرەکان شێوەیان زۆرە

هەندێکیان لاشەیان هێندەی پشیلەیەك گەورەیەو هەندێکی تریان بەقەد لاشەی مشکێك بچووکە.
بە شێوەیەکی گشتی سمۆرە دەکرێتە دوو کۆمەڵەوە. سمۆرەی زەوی و سمۆرەی دار. سەرە ڕای ئەو دوو جۆرە سەرەکی یە جۆری سێیەمیش هەیە , کە بە سمۆرەی فڕیو دەناسرێت.
سمۆرەی فڕیو پەردەیەکی هەیە لە پەڕەشووت دەچێت و پەیوەستە بە دەست و قاچەکانی پێشەوە و دواوەی. کاتێك قاچەکانی بڵاو دەکاتەوە پەردەکە وەکو باڵی بەلەمی شیراعی لێ دێت. کە یارمەتی دەدات لە هەوادا بفڕێت. کاتێك دوژمنەکانی وەکو کوندەپەپوو هێرشی دەکەنە سەر لە کاتی فڕیندا. زۆر بە خێرایی دەگەڕێتەوە سەر دارەکەی تا خۆی تیادا بشارێتەوە. تا ئێستا (٣٥) جۆر سمۆرەی فڕیو دۆزراونەتەوە , کە لە ئەمریکای باکوور و ئەفریقیا و ئەورپاو هەندێك شوێنی ئاسیادا هەن. بەڵام زۆر بەدەگمەن مرۆڤ دەیان بینێت چۆن بە ڕۆژان دەخەون و بە شەوان ڕاو دەکەن.سمۆرەی فڕیو لاشەی بە موویەکی نەرم داپۆشراوە و , درێژی یەکەی لە نێوان ٨–٦٠. سانتیمەتردایە جگە لە کلکی.لەسەر داران دەژی و خواردنیشی گوێز و بادەم و میوە و مێروولە و مەوادە ڕووەکی یەکانە. بە پێچەوانەی سمۆرە ئاساییەکانی ترەوە بە دەگمەن دادەبەزنە سەر زەوی. ئاژەڵی شەوانن و بە واتا دەتوانن زۆر بەڕوونی لە شەودا ببینن. هەروەها دەتوانن تا بەرزی ٦٠مەتر بە داراندا هەڵزنێن.

## زمانی ئینگلیزی چۆن دروست بوو ؟

لەگەڵ ئەوەی لە جیهاندا ٦٧٥ ملیۆن کەس بە زمانی چینی باکووری یان زمانی (ماندەرین) قسە دەکەن و ٤٠٠ملیۆنیش بە زمانی ئینگلیزی. بەڵام زمانی ئینگلیزی لە ماندەرین گرنگترە , چونکە زمانی ماندەرین تەنها لەچیندا بەکار دەهێنرێت. بەڵام زمانی ئینگلیزی زمانی ڕەسمی ٣٧ وڵاتی جیهانە. لە زۆر شوێنی دونیادا ئینگلیزی وەکو زمانی دووەم یان زمانی بەڕێوە بردن و فێر کردن و پیشە بەکار دەهێنرێت. زۆر لە زاراوە نوێ یەکانی زانست و تەکنەلۆژیا بە زمانی ئینگلیزی نە بێت تەعبیری لێ ناکرێت. لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین زمانی ئینگلیزی گرنگترین زمانی دونیایە.ئایا دەزانن زمانی ئینگلیزی چۆن دروست بوو ؟ زمانی ئینگلیزی نوێ تەمەنی تەنها ٥٠٠ ساڵە. پێش نزیکەی ٥٠٠٠ ساڵە

دانیشتوانی ولاٌتانی ئەورووپا بەزمانێك قسەیان دەكرد كە سەر بە خێزانی زمانەكانی هند و ئەورووپی بوون. خەڵكی باشووری ڕووسیا و خێڵە گەڕۆكەكانی نێوان ڕووباری ڕاین و ڕووباری ئارال Aral بە هەمان زمان قسەیان دەكرد. ئەوانەی بەو زمانە قسەیان دەكرد پەرش و بلاو بونەوە و زمانەكە بووبە دیالێكتی جیاواز و دیالێكتێكی لیٚ دروست بوو كە پێیان دەوت جەرمانی سەرەتایی یان (تیوتۆنیە).

تیوتۆنیەش لە لای خۆیەوە , لەگەڵ هاتنی مەسیحیەتدا بووبە چەند دیالێكتێكی ترەوە و دوو دیالێكتی سەرەكیشی لیٚ پەیدا بوو. ئەڵمانی ڕۆژ هەلاتی و ئەڵمانی ڕۆژ ئاوایی. ئەڵمانی ڕۆژ ئاواییش بووبە دوو دیالێكتەوە ئەڵمانی سەرو و ئەڵمانی خوارو. زمانی ئەڵمانی نویٚ لە دیالێكتی ئەڵمانی بەرزەوە دروست بوو. بەلاٌم ئەڵمانی نزم بەچكەی هەردوو زمانی هۆڵەندی و ئینگلیزی یە.

زمانی ئینگلیزیش لە زمانی ئەڵمانی خوارو وەوە , وەرگیراوە بەلاٌم بەدەست كاری و گۆڕان كاری یەكی زۆرەوە كە سەدان ساڵی خایاندووە.

ئەوەی لە (ئەڵمانی خوارو وەوە) دروست بووە لە سەرەتادا دیالێكتیك بووە پێیان ووتووە ئینگلیزی كۆن. یان زمانی (ئانگلۆ – ساكسۆن). كە لە ساڵی ٤٤٩ دا چووە بەریتانیاوە وتا ساڵی ١١٥٠ درێژەی هەبوو.

لە ساڵی ١١٥٠بۆ ساڵی ١٥٠٠هەندێك گۆڕانكاری لە زمانی ئینگلیزیدا دروست بوو كە پێیان دەووت ئینگلیزی ناوەند , بەلاٌم ئینگلیزی نویٚ لە دوای ساڵی ١٥٠٠ وە تا ئێستا بەكار دەهێنرێت.

## بۆچی لا موسە كرتێنەرەكان بە كۆمەڵ خۆیان دەكووژن ؟

لاموس كرتێنەرێكی بچوكە ڕەنگەكەی خۆڵەمێشی یان قاوەییە و لە مشك دەچێت. لە ناوچە زۆر ساردەكانی نیوەی باكووری گۆی زەویدا دەژی بە تایبەت لە ئەلاسكا و باكووری ڕۆژئاوای كەنەدا و سوید دا. درێژی یەكەی لە نێوان ١٢-١٦ سانتیمەتر دایە و كلكێكی بڕاوی پێوەیە. لاموس ماڵی خۆی لەسەر زەوی و لە گژ و گیای ووشك دروست دەكات خواردنیشی لەسەر ڕەگ و ڕیشە و قەوزە و قەدی ڕووەكەكانە.

لاموسە كرتێنەرەكان دروستكراوێكی زۆر نامۆ و سەیرن. لاموس ی ئەرووپی هەر سیٚ چوار ساڵ جارێك بە كۆمەڵ دەچن و خۆیان دەخەنە دەریاوە بەو كارەش

خۆیان بە کۆمەڵ دەکوژن.
ئایا دەزانن بۆچی لاموسەکان خۆیان بەکۆمەڵ دەکوژن ؟
مێینەی لاموس بەلای کەمەوە لەساڵێکدا دوو جار دەزێت. هەرجارەی ٣-٥ بەچکەیان دەبێت. بەڵام هەر سێ یان چوار ساڵ جارێك. بە جارێك بیست بەچکە زیاتریان دەبێت. لە ئەنجامی ئەم تەقینەوە دانیشتوانییەدا , هەرچی ڕووەك هەیە لە ناوچەکەدا هەمووی دەخۆن , کەوا دەکات بوونی ژیان لە ناوچەکەیاندا مەحاڵ بێت. ئەو کاتەی ڕووەك و خواردن نامێنێت غەریزەی کۆچ کردن زاڵ دەبێتە سەر لاموسەکاندا و بەکۆمەڵ ڕوو دەکەنە دەریا و هەرچی ڕووەکێك بێتە پێشیان هەمووی لە ناو دەبەن و لە ماوەی ئەو ڕەوەیاندا زۆربەیان دەمرن یان دەکوژرێن.
ئەو سوپای لاموسە دەڕۆن تا دەگەنە ڕووبارەکان و خۆیانی تێ فڕێ دەدەن و دەتوانن تەنها لە ١٥ بۆ ٢٠ خوولەك خۆڕاگری بکەن و سەر ئەنجام هیچ کامیان نامێنن و هەموویان دەخنکێن. ئەم ڕەوە خۆ کوژییە هەر سێ تا چوار ساڵ جارێك دووبارە دەبێتەوە , کە تایبەت مەندییەکی نامۆیی ئەم دروست کراوەی خوایە.

## گویچکە گەورەکانی کەروێشك

کەروێشك گیانبەبەرێکی بچووکی تووکدارە لە دارستانەکاندا دەژی. تائێستا زانایان لێکۆڵینەوەیان لەسەر زیاتر لە پەنجا جۆر کەروێشك کردووە. کۆنترین پاشماوەش لەسەر کەروێشك کە دۆزراوەتەوە لە ئەمێریکای باکووردا بووە. بەڵام لەئێستادا دەتوانین لە هەموو شوێنێکی دونیادا کەروێشك ببینین.
بە بەراورد لەگەڵ ئەندامەکانی تری لاشەیدا گورچەکەکانی کەروێشك زۆر گەورەن.
ئایا دەزانن بۆچی ؟
کەروێشك گیاندارێکی لاواز و ترسنۆکە وچواردەوری هەموو دووژمنە. لەبەر ئەوە سروشت دوو گوێی گەورەی پێ بەخشیوە , تا بچووکترین دەنگی پێ ببیسێت. گوێ گەورەکانی کەروێشك زۆربەی شەپۆلە دەنگییەکان دەبیسێت کە لەهەوادا دەگوێزرێتەوە , ئەمەش وا دەکات لە کاتی خۆیدا بەدووژمنەکانی بزانێت و لێیان هەڵبێت و بۆ شوێنێکی سەلامەت.
کەروێشکە کێوییەکان زۆربەی ڕۆژیان لە ژێر زەویدا بەسەر دەبەن و لە نێوان خۆرئاوا بوون و خۆر هەڵاتندا بە شوێن خواردندا دەگەڕێن. هەروەها هەستی بۆن کردنی زۆر بەهێزە لەگەڵ قاچە بەهێزەکانی دواوەی کە خێراییەکی زۆریان

دەداتیّ. کەرویٚشك دەتوانیٚت لە کاتژمیٚریٚکدا ٦٥ کیلۆمەتر ببڕیٚت.
کەرویٚشك بە شیٚوەیەکی سەرەکی لە سەر گیا دەژیٚت , بەلاّم ڕووەکی تریش دەخوات. زاوزیّ کردنیان زۆر خیٚرایە و دوای زایینیان بە چل ڕۆژ جاریٚکی تر دەزیٚنەوە. سەرەڕای زۆری دووژمنەکانی بەلاّم ئەو زیاد کردنە تایبەتی یە وای کردووە کەرویٚشکەکان لە ناو نەچن. میٚینەی کەرویٚشك سالاّنە دە بۆ دوانزدە بەچکەی دەبیٚت.

## ئەسپی دەریا

ئەسپی دەریا جۆرە ماسی یەکە , لە ئاوە سویٚرەکاندا دەژی و سەر بە خیٚزانی ((syngna thidae))
بەمجۆرە ماسی یە دەوتریٚت ئەسپی دەریا. لەبەر ئەوەی سەری لە سەری ئەسپ دەچیٚت و لاشەشی بە تەختە ئیٚسقانی زبر داپۆشراوە بەلاّم کلکی بە تەواوی لە کلکی مار دەچیٚت بە شیٚوەیەکی سەرەکی لە لیٚوارە قوڕاوی یەکانی دەریاکاندا دەژیٚت و لە نیٚوان ڕووەکە ئاوی یەکاندا خۆی حەشار دەدات.
لە دونیادا پەنجا جۆر لە ئەسپی دەریا هەیە. کە پیٚنج جۆری لە ئەمیٚریکای باکووردا دەژی دریٚژییان لە نیٚوان ٢,٥ سانتیمەتر و٣٠,٥ سانتیمەتر دایە. هەر چاویٚکیشی پەیوەندی بەو چاوەکەی تریەوە نی یە.
نیٚرینەی ئەسپی دەریا وەکو میٚینەی کەنگەر گیرفانیٚکی پیٚوەیە لەسەر سکی کە میٚینە هیٚلکەی تیٚدەخات بۆ ئەوەی تیایدا گەشەبکات. هەلّهیٚنانیشی نزیکەی ٤٥ ڕۆژ دەخایەنیٚت.
ئەسپی دەریا کاتیٚك مەلەوانی دەکات شیٚوەی ستوونی و سەری بۆ پیٚشەوە دەبات و گۆشتیشی ناخووریٚت. ئەم ماسی یە تەنها لە وەرزی هاویندا دەردەکەویٚت و هیچ کەس نازانیٚت لە زستاندا بۆ کویّ دەچیٚت. ماسی یەکانی تری دەریا حەزیان لە گۆشتی ئەسپی دەریا نی یە بۆیە کەمترین مەترسی بۆ دروست دەبیٚت لەلایەن دوژمنەکانی یەوە.

## چەك

دار یەکەمین چەکی مرۆڤی سەرەتایی بووە. کە لە دژی ئاژەلّە دڕندەکان و بەرەنگاری لە خۆی بەکاری هیٚناوە. بە تیٚپەڕ بوونی ڕۆژگار مرۆڤ هەستی کرد کە

بەرد دەتوانێت چەکێکی باش بێت بۆ کوشتنی ئاژەڵان. بۆیە بەردی لە ڕاوکردندا بەکار هێنا.
بە تێپەر بوونی ڕۆژگار مرۆۋ تیر و کەوانی دروست کردو بو بە باشترین چەکی مرۆۋ بە درێژایی هەزاران ساڵ. پێش نزیکەی هەشت هەزار ساڵ مرۆۋ دۆزییەوە کە دەتوانێت مس بتوێنێتەوە و فێربوو ئەگەر لەگەڵ قەلایی دا تێکەڵ بکرێت , برۆنزی لێوە دەست دەکەوێت. دوای ئەم پێشکەوتنە مرۆۋ خەنجەر و شمشێری دروست کرد. بە پێشکەوتنی شارستانیەت , مرۆۋ وای لێهات بە کۆمەڵ بژێت , بۆیە بۆ بەرەنگاری کردن لە خۆی یەکەی سەربازی بچووکی پێك هێنا.
لە ساڵی ٣٣٥ ی پێش زایینیدا فلیپی مەقدونی باوکی ئەسکەندەری گەورە ئامێرێکی لە دار دروست کرد , کە دەیتوانی مووشەکی بەردین بتەقێنێت و بگاتە سەنگەرەکانی دوژمن.
لە سەدەی یانزەهەمدا ڕاهیبێکی ئینکلیزی بە ناوی ((ڕۆجەر بیکۆن)) هاڕاوەی بارووتی دۆزییەوە. دوای ئەو دۆزینەوەیە پێشکەوتنی نوێ لە چەکسازیدا بە شێوەیەکی فراوان دەستی پێ کرد.
بە هاتنی نیوەی سەدەی پازدەیەم وڵاتە گرنگەکانی ئەورووپا هەموویان پڕ چەك بوون بە چەك و کەشتی جەنگ. لە سەدەی شانزدەهەمدا مرۆۋ لە دروست کردنی چەکی وەکو تفەنگی نوێ و نار نجۆکی دەستیدا سەرکەوت. ئەمریکییەکانیش لە ساڵی ١٨٦٢ دا ڕەشاشیان دروست کرد.
لە ساڵی ١٨٦٦ دا (( ئەلفرێد نۆبڵ )) دینامیتی داهێنا. دوای ئەوە چەك زۆر بەخێرایی پێشکەوت. دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ئینگلیزەکان تانکیان ((دەبابە)) دروست کرد و زۆر بە سەرکەوتوویی بەکاریان هێنا.
لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیشدا چەکی وەکو بۆمبی ئەتۆمی دروست کرا , ئەوەی ئەمێریکا دای بەسەر یاباندا. موشەکیش هەر لەو ماوەیەدا بو پێش خرا. دوای جەنگی دووەمی جیهانی پیشەسازی چەك بە ئاقارێکی مەترسیداردا ڕۆیشت و هیوادارین هەموو مرۆڤەکانی سەرزەوی مرۆڤایەتی هاوبەشی خۆیان لەبیر نەکەن و ئەو چەکە مەترسیدارانە بۆ لەناو بردنی یەکتر بەکار نەهێنن.

## کام مارە دەتوانێت بەرازێك یان ئاسکێك قووت بدات ؟

هەموو جۆرەکانی مار لە خێزانی خشۆکەکانن. زانایان تا ئێستا ٢٤٠٠ جۆر لە

ماریان ناسیوه. تەنها ٨٪ یان ژەهراوین. مار لەژێر زەوی , لەناو ئاو , لە سەر داران , لە هەموو شوێنێکی دونیادا هەیە. جگە لەناوچە جەمسەرییەکان و هەندێك دوورگە نەبێت. مارەکان لە شێوە و قەبارەدا جیاوازن , هەندێکیان هێندە گەورەن تا ئەو رادەیەی دەتوانن بەرازێك یان ئاسکێك قووت بدەن.

ئایا دەزانن ئەو مارانە کامانەن ؟

مارە گەورەکان لە گرووپی ئەژدیهان , تیپیاندامارێکی زۆر گەورە هەیە ناوی (( ئەناکۆدەیە )) و لە ئەمێریکای باشوور و هند و هندی چینی و ئوسترالیا و ئەفەریقا دا هەیە. کێشی سەد کیلۆیە و دەتوانێت بەیەك ژەم ئاسکێك یان بەرازێك قووت بدات. درێژی ئەناکۆدە نزیکەی١٠ مەترە ە بەهۆی درێژی و قورسی یەوە ناتوانێت بجوڵێتەوە. کاتێك ئاسکێك یان بەرازێك بە نزیکیدا دەڕوات , خۆی پێوە دە ئاڵێنێت و وای جەڕ دەدات تا دڵی لە لێدان دەخات. کەنێچیرەکە مرد قوتی دەدات بۆ ئەوەی قنجەی بکات. کرداری هەرس کردنەکەشی چەند کاتژمێرێك دەخایەنێت. گەدەی ئەناکۆدە شلەیەك دەڕژێنێت هێندە بەهێزە کە دەتوانێت ئێسقانە گەورەکانی قوربانیەکەش بتوێنێتەوە.

## چۆن سابوون جلەکانمان پاك دەکاتەوە ؟

سابوون یەکێکە لە بەناوبانگترین ئەو مەوادانەی کە لە پاك کردنەوەدا بەکاری دەهێنین. خۆ شتن و جل و بەرگ شتن و زۆر شتی تر. ئەمڕۆ لە یەك مەوادی پاکژ کەرەوە زیاتر لە کرداری پاکژ کردنەوەدا بەکار دەهێنرێت.

پرسیار ئەمەیە , چۆن سابوون پیسی لا دەبات ؟

سابوون لە بنەڕەتدا خوێیەکی ترشی چەورە. دەتوانین بە کوڵاندنی چەور ی و ڕۆن لەگەڵ ماددەیەکی تفتدا دەستمان بکەوێت. کاتێك چەوری یەکە کارلێك دەکات لەگەڵ تێکەڵەی (صودای کاوی یە) دا لە ئەنجامی ئەو کارلێکە کیمیاوی یە دا سابوون و گلسرین بەرهەم دێن. ئەمجا سابوون و گلسرینەکەش لە یەکتر جوودا دەکەینەوە.

کاتێك سابوونەکە دەخەینە سەر جل و بەرگێکی چڵکن گەردیلەکانی شیتەڵ دەبن ئایۆناتی ترشی چەوری و ئایۆناتی سۆدیۆم. ئاویش ئایۆناتە ترشی یە چەوری یە کە ڕاو دەنێت و دەچێت بۆ لای گەردیلەکانی پیسی چەوری.

ئایۆناتەکان دەور دەدەن لە هەموو گەردیلەیەك لە گەردیلەکانی چەوری و لەسەر

ڕووی جلە پیسەکە لای دەبەن , ئاویش لەگەڵ خۆیدا ئەو گەردیلانە هەڵدەگرێت و بەو جۆرە جلەکە پاك دەبێتەوە. بەڵام لێکخشاندن و ڕاوەشاندن و وشاردن کارگە لێکین یارمەتی جوڵانەوەی پیسی یەکە دەدەن بۆ ئەوەی بکەونە سەر ئاوەکە.
کۆمپانیاکانی دروست کردنی سابوون , بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان باشترین و تازەترین جۆری سابوون بۆ کڕیارەکانیان بەرهەم بهێنن. ئەمڕۆ شامپۆ و تایتیش لە پاك کردنەوەدا بەکار دەهێنرێت.

## زیپکە چۆن لەسەر ڕوومەت دروست دەبێت ؟

زیپکە سەرەکی ترین کێشەیە لە نێوەندی گەنجاندا , نەك تەنها جوانی دەشێوێنێت , بگرە گرێی خۆ بە کەم زانینیش تیایاندا دروست دەکات.
ئایا دەزانن بۆ چی لەو تەمەنەدا زیپکە لەسەر دەمو چاو دروست دەبێت ؟
ئەو هۆیانەی زیپکە دروست دەکەن زۆرن , ڕژێنی چەوری زۆر ورد لە ژێر پێستی دەمو چاوی مرۆڤدا هەیە. بۆ ئەوەی دەمو چاوی بە نەرمی بمێنێتەوە ڕێژەیەکی کەم لە چەوری , ئەو ڕژێنانە کونی زۆر وردیان هەیە کە چەوری یەگە لێیەوە دێتە دەرەوە هەندێك جار ئەو کونانە دەگیرێن بە پاش ماوەی خانەکانی ڕوومەت یان بە هەوا.
بەو جۆرە چەوریکە ناتوانێت بێتە دەرەوە و دەبێتە هۆی هەڵ ئاوسانی ئەو شوێنە کاتێك چەوری یەکە دێت بۆ ناوچەی خڕۆکە سپی یەکان , کە پاراستنە لە بەرەنگاری کردن لە لەش , بۆیە خڕۆکەکان دەبنە کێم و چڵك لە دەوری ڕژێنەکە و دەبێتە هۆی ئاوسانی. هەروەها تێکچوونی پێست و هەندێك نەخۆشی تر هۆی دروست بوونی ئەو زیپکانەیە , خواردنی چەور و بەهاراتیش یەکێك لە هۆیەکانی تری یەتی.ئەگەر کەسێك زیپکە لەسەر دەمو چاوی دەرکەوت دەبێت ڕاوێژ بە پزیشك بکات. بۆ ئەوەی هۆی کێشەکەی بزانێت و چارەسەرسی گونجاو بۆ بدۆزێتەوە دەبێت مرۆڤ خۆی بپارێزێت لە بەکار هێنانی ئەو کرێمە جۆراو جۆرانەی لە بازاڕ دا هەیە.هەروەها تا دەتوانێت ئەو زیپکانە نەتەقێنێت , چونکە دوای چابوونەوەی چاڵی یەك لە شوێنی خۆی بەجێ دەهێڵێت.
بۆ ئەوەی مرۆڤ نەهێڵێت زیپکە لەسەر دەمو چاوی دروست ببێت , دەبێت بەردەوام دوم وچاوی بە ئاوی سارد بشوات. وەرزشیش یارمەتی بەهێز کردنی سوڕی خوێن دەدات , بەوەش ئەگەری گیرانی کونەکانی پێست کەم دەبنەوە.

## خوێن چۆن دەمەێت ؟

کاتێك شوێنێکی لاشەمان برێندار دەبێت , خوێن لیٚ ی دێتە دەرەوە , بەلاٚم دوای ماوەیەکی کەم خوێنەکە دەوەستێتەوە.ئایا دەزانن چۆن خوێن دەمەێت ؟ دەتوانن بەم شێوەیە چۆنیەتی مەیینی خوێن تێبگەن.

سەرەڕای ئەو شلەیەی کە پیٚ ی دەوترێت پلازما , خوێن سیٚ جۆر خانەی نێدایە , خڕۆکە سپی یەکان , خڕۆکە سورەکان , ئەو خانانەی بەر پرسن لە مەیینی خوێن. ئەم خانانەی دواییە لە دەوری برینەکە کۆ دەبنەوە و مادەیەك بەرهەم دەهێنن پیٚ ی دەوترێت (( هەوێنی مەیین )) یان (( ترومبوپلاستین )).

هەوێنی مەیین لەگەڵ کالیسیۆم و پرۆتۆمبین ی ناو خوێندا یەك دەگرن و لەگەڵ فیبر ینجین ( پرۆتنیەکە لە خوێندا ) یان بەرهەم هێنەری لیفین دا کارلێك دەکەن و بۆ پێکهێنانی لیفیەکە دەتەنێن بۆ ئەوەی جۆرێك لە بەربەست لەبەردەم ڕۆیشتنی خوێنەکە دا دروست بکەن.

ئەو تۆڕەش کە لە ئەنجامی ئەو تەنینە دا دروست بووە ڕەق دەبێت و لە کۆتاییدا چینی سەرەوەی ئەو خانانە دەمرن و توێژاڵێك دروست دەکەن. کاتیٚ خانەی تازە دروست دەبێتەوە جێگەی خانە مردووەکان دەگرێتەوە , توێژاڵەکە لەگەڵ خانەکانی خانەی مەیین هۆرمۆنێك بەرهەم دەهێنن پیٚ ی دەوترێت (( سیرۆتۆنین )) کاری ئەم هۆرمۆنە تەسك کردنەوەی مولولەکان و وەستانی خوێنە.

پرسیار ئەمەیە : ئایا بۆچی خانەکانی مەین نابنە هۆی مەینی ئەو خوێنەی بە لاشەماندا ڕێدەکات ؟

چونکە خانە خوێنی یەکانی لاشەمان ترشی یەکی تێدایە پیٚ ی دەوترێت (( کیبدین )) کە نایەڵێت خوێن بمەێت.خێرایی خەست بوونەوەی خوێن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت. ئەوانەی خوێنیان درەنگ دەمەیەت , یان هەر نامەیەت نەخۆشی یەکی زۆر مەترسی داریان لەگەڵ دایە بەناوی (( هیمۆفیلیا )) { کە نەخۆشی یەکی پشتا و پشتەو دایکان دەیگوێزنەوە بۆ منداڵەکانیان } ئەگەر کەسێکی تووش بوو بەم نەخۆشی یە بریندار بوو دەشێت نەوەستانی خوێنەکە ببێتە هۆی مردنی.

## ترسان لە بار و دۆخێکی تایبەتی !

خەڵکێکی وا هەن لە بار و دۆخێکی تایبەتی دەترسن ,هەیە لە شوێنی قەڵە باڵغی دەترسێت و هەندێکیش لە شوێنی بەرز و ئاو و چۆڵەوانی و تاریکی دەترسن.
ئەم بار و دۆخە شازە پزیشکان پێ ی دەڵێن (( تۆقین )) یان فۆبیا.
ترسان لە شوێنی بەرز وەکو بینا بەرزەکان و لوتکەی چیاکان پێ ی دەوترێت (( تۆقینی بەرزییەکان )) ترسان لە چۆڵەوانیش پێی دەوترێت (( تۆقینی چۆڵەوانی )) ترسان لە ئاویش پێ ی دەوترێت (( تۆقینی ئاو )). بە هەمان شێوە ترسان لە پیسی و تاریکی و ئاژەڵان پێیان دەوترێت (( میسفۆبیا )) و (( نیکتۆفۆبیا )) و ((تۆقینی ئاژەڵان )). ئەوانەش لە قەڵەباڵغی دەترسن پێ ی دەڵێن ((تۆقینی نیگاکان )).
پرسیار ئەمەیە : بۆچی ئەم ترسە لای ئەو خەڵکانە دا دروست دەبێت؟ یان بۆچی تووشی دەبن ؟ ئایا هەڵەیەك لەو کەسانەدا هەیە ؟ یان نەخۆشن ؟
لە ڕاستیدا هەندێك لەو کەسانە تێکچونی سۆزدارییان هەیە , کە ڕابوردویان کاریگەرییەکی زۆر خراپی لەسەر عەقڵیان داناوە. سیگمۆند فرۆید (( باری تۆقینی)) بەوە شیکردۆتەوە , ئەو ترسەی ئێستا لە واقعدا ترسێك بووە کە لە منداڵیدا توشی بووە , لەگەڵ ئەوەی دەشێت هۆی ترسی ڕاستەقینە لە بیری ئەو کەسە چووبێتەوە. پزیشکەکان دەتوانن , بە وەبیرهێنانەوەی ڕووداوە یەکەمەکە کە ترسەکە لێوەی سەرچاوەی گرتوە یارمەتی ئەو نەخۆشانە بدەن کە لەو جۆرە بار و دۆخانە دەترسن

## کەی سەگ مەترسیدار دەبێت ؟

دەشێت سەگ یەکەم گیانلەبەر بووبێت کە مرۆڤ ماڵی کردبێت و بە بەوەفا ترین هاوڕێ ی مرۆڤیش دا دەنرێت. سەگ زۆر سودی بۆ مرۆڤ هەبووە لە هەمان کاتدا دەشێت لە هەندێك کاتدا مەترسیمان بۆ دروست بکات. دەتوانێت لە ڕێگەی گەڕی یەوە چەندین نەخۆشی پەکتیری و فیتری و مشەیمان بۆ بگوێزێتەوە لەگەڵ نەخۆشی ئێسکە نەرمەی منداڵ. لەو نەخۆشی یە پەکتریانەی سەگ دەیگوێزێتەوە , وەکو سیل , تای سپڵ, تای قرمزی و دەفتریا و هیتریش.
هاری مەترسیدار ترین نەخۆشی ڤایرۆسی یە , کە لە گەستنی سەگەوە پەیدا

دەبێت. ڤایرۆسی هاری لە لیکی سەگداهەیە و هەندێك جار سەگە ماڵی یەکان ئەم نەخۆشی یە دروست دەکەن بۆیە دەبێت سیٚ ساڵ جارێك ئەو سەگانە دژی ئەو ڤایرۆسی هاری یە بکوترێن.
ماوەیەك جارێك سەگ تووشی سورێژە و ملە خرێ دەبێت و دەشێت ئەم دوو نەخۆشی یە بگوێزرێنەوە بۆ مرۆڤ. هەروەها دەبێتە هۆی نەخۆشی ئێسکە نەرمەی منداڵان و سەرچاوەیەکی سەرەکیشە بۆ چەندین نەخۆشی مشەیی , کە تووشی مرۆڤدەبن دەشێت سەگ مێر و کرمە مشەییەکانیش بۆ مرۆڤ بگوێزێتەوە.
مرۆڤ لە ڕێگەی دەست لیٚ دان و خواردنی پیسەوە تووشی ئەو نەخۆشیانە دەبێت و ئەو منداڵانەی زۆر حەزیان لە یاری یە لەگەڵ سەگە ماڵیەکاندا , ئەگەری تووشبونیان لە هەموو کەس زیاترە.
لە پێناوی بەرگە گرتن لەو نەخۆشییانەی کە سەگ بۆمانی دەگوێزێتەوە. پێویستە دەرمان و بەرگری و چارەسەری لە ڕێگەی دەمەوە بدەینیٚ و هەروەها سەگەکان لەو نەخۆشانە دور بخەینەوە , کە تووشی نەخۆشی یە درمیەکان بونە.

## ئاگر

سووتان شێرازی زۆرە. بەڵام لە زۆربەی جارەکاندا دەبێت شتێکی سادە ڕوو بدات. ئەویش یەکگرتنی ئۆکسجینە لەگەڵ ئەو ماددەیەی کە دەشێت بسوتێت ئەمکارلێکەش گەرما بەرهەم دەهێنێت. ئەگەر کارلێکەکە بە خێرایی ڕۆیدا ئەوا کڵپە یەك یان زمانەیەك لە ئاگر دروست دەبێت.

کاتێك دار یان کاغەز لەگەڵ ئۆکسجین دا یەکدەگرن زمانەیەك لە ئاگر دەبینین هەروەها سووتان لە بزوێنەری ئۆتۆمۆبیلەکانیشدا هەمان شتە. سووتان لە بزوێنەری ئۆتۆمۆبیلدا هێندە بە خێرایی دروست دەبێت وا دەزانین تەقینەوەیە. بەو دیوەکەشدا بەپێچەوانەوە جۆرێك سووتانی هێندە خاو هەیە ماوەی چەند ساڵێك درێژە دەکێشێت.

بۆ نموونە :
کاتێك ئاسن ژەنگ لێیدەکات کرداری سووتان زۆر خاو ڕوو دەدات ! کاتێك سووتانی خاو ڕوو دەدات , ئەو گەرمایەی لێیەوە دروست دەبێت و دەچێت بۆ هەوا , پلەی گەرمای دەگاتە ئەو ئەندازەیەی کە لە سووتانێکی گورجو گۆڵدا ڕوو

دەدات ئەم سووتانە پیّ ی دەوتریّت (( سووتانی هەڕەمەیی )). دەشێت سووتانی هەڕەمەیی کۆما قوماشێکی نەوتاویشدا ڕوو بدات ,کە لە شوێنێکی داخراودا دانرابێت.

نەوتەکە بە کردارێکی ئۆکساندنی زۆر خاودا بەردەوام دەبێت و سووتاندنەکەش دەیبات بۆ گەرما , گەرماکەش لەبەر ئەوەی ناتوانێت بچێتە دەرەوە , بۆیە کۆ دەبێتەوە و لە کۆتاییدا گەرماکە هێندە دەبێت , کەوا بکات قوماشەکە گڕ بگرێت.

ئۆکسجین کە یەکێکە لە زۆرترین توخمەکانی سروشت زۆر پێویستە بۆ سووتاندن. هەوای دەوروبەریشمان نزیکەی ٢١ ٪ ی ئۆکسجینە , ئەم ئۆکسجینەش هەمیشە ئامادەیە بۆ کرداری سووتاندن.

ئەو مەوادانەی زۆر پێویستن بۆ ڕودانی سووتاندن وەکو ئۆکسجین قابیلی سووتانیش پێیان دەڵێن مەوادە خێرا گڕگرتووەکان , ئەو مەوادانەش کە لە سووتاندندا بەکار دەهێنرێت وەکو دار و خەڵوز و نەوت و گاز و غاز پێیان دەوترێت سووتەمەنی.

لە کاتی کرداری سووتاندندا دوو گەردیلە ئۆکسجین و یەك گەردیلە کاربۆن لە سووتەمەنیەکە یەك دەگرن و ماددەیەکی تازە دروست دەکەن پیّ ی دەوترێت دووەم ئۆکسیدی کاربۆن. ئەو کرداری سووتانەش کە لە لەشماندا ڕوودەدات گەرمی و وزە بەرهەم دەهێنێت. کە دەبێتە هۆی دروست بوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و لە ڕێگەی هەناسە دانەوە دەری دەکەین.

## ئەرخەمیدس

ئەرخەمیدس زانایەکی زۆر مەزن بووە , لە ساڵی ٢٨٧ پ ز لە سیراکۆزی سەقەلیەدا لە دایك بووە و لە ئەسکەندەریەدا نراوەتە بەر خوێندن. دوای ٢٠٠٠ ساڵ بەسەر مردنیدا هێشتا بە بلیمەت دادەنرێت و مەبادیئە زانستی یەکانی تا ئێستاش لە خوێندنگاکاندا دەخوێنرێت.

بەسەرهاتی دۆزینەوەی یاسای ئەرخەمیدس زۆر بە ناوبانگ و سەرنج ڕاکێشە دەڵێن : ڕۆژێك شاهیرۆنی پادشای سیراکۆز تاجێکی لە زێڕ دروست کراوی دایە ئەرخەمیدس بۆ ئەوەی تاقیبکاتەوە بیّ ئەوەی خراپی کات , چونکە شا گومانی ئەوەی دەبرد تاجە زێرینەکەی زیوی تێکەڵ کرابێت.

ئەمەش کێشەیەکی زۆر گەورە بوو ڕووبەڕووی ئەرخەمیدس بووەوە , بەڵام

بەشێوەیەکی زۆر سەیر چارەسەرەکەی دۆزییەوە. کاتێك چووە ناو حەوزێکی ئاوەوە سەیری کرد لاشەی ئاوەکەی ڕژاند و ئاستی ئاوەکەش بەرز بوەوە. بۆیە لە حەوزەکە هاتە دەرەوە و بە ڕووتی ڕای دەکرد و هاواری دەکرد , دۆزیمەوە , دۆزیمەوە. بە پێ ی ئەو دۆزینەوەیەی کە تا ئێستا بە یاسای ئەرخەمیدس ناسراوە , توانی بزانێت تاجە زێڕینەکە تا چەند بێ غەشە.
بۆ زانینی ڕادەی پاکی تاجە زێڕەکە دەفرێکی پڕ کرد لە ئاو و تاجەکەی خستە ناوی یەوە , ئەو ئاوەی کە تاجەکە ڕژاندبووی پێوانەی کرد و جارێکی تر دەفرەکەی پڕ کردەوە لە ئاو و قەبارەیەکی تری یەکسان بە قەبارەی زێڕە خالسەکەی خستە ناو ئاوەکەوە و , ئەمجا ئاوە ڕژاوەکەی کێشانە کرد دیتی قەبارەیان جیاوازە. لەم تاقیکردنەوەیەوە بۆی دەرکەوت ڕێژەی پاکی تاجە زێڕەکە چەندە. بە پێ ی ئەم دۆزینەوەیە یاسای ناسراو بە(( چڕی ڕێژەیی بۆ مەوادەکان)) دانا. ئەرخەمیدس هەروەها یاساکانی کەوتنە سەر ئاوی تەنەکان و نوێڵ و چەندین دۆزینەوەی تری دانا.
کاتێك ڕۆمانی یەکان لە ساڵی ٢١٢ پ ز دا سیراکۆزیان داگیر کرد , ئەو دەمە ئەرخەمیدس پیاوێکی پیر و بە تەمەن بوو , ڕۆژێکیان کە خەریکی وێنە کێشانی شێوەیەکی ئەندازەیی بوو. یەکێك لە سەربازە ڕۆمانی یەکان داوای لێکرد لەگەڵیدا بچێت بەڵام ئەرخەمیدس لەگەڵیدا نەڕۆیشت و داوای لێکرد لەسەری بووەستێت تا ئەنجامی شێوە ئەندازەییەکە بدۆزێتەوە , بەڵام بەڵام سەربازەکە لەسەری نەوەستا و شمشێرەکەی دەرهێنا و هەر لەوێدا کوشتی.

## جەنگی بایۆلۆجی چی یە ؟

جەنگی بایۆلۆجی واتە بەکارهێنانی هۆکارەکانی وەکو پەکتریا و ڤایرۆس کە دەبێتە هۆی بلاوبونەوەی نەخۆشی یەکانی دژی مرۆڤ و ئاژەڵان و ڕووەك. بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی خەڵکییەوە ئەو جۆرە جەنگە کەناوی لێ نراوە جەنگی میکرۆبی ,بە درێژایی سەدان ساڵە بەکار هێنراوە.
لە کۆندا سووپاکان لاشەی مردووانی توشبوو بە کۆلێرا و چاوە قووڵە (تاعوون) یان خستۆتە بیری ئاوی دوژمنەکانیانەوە.
بەڵکو فرێش دەدرانە ناو شایی دوژمنەکانیانەوە. بازرگانە فەرەنسی یەکانیش بە تانی میکرۆباوی بە نەخۆشی ئاوڵەیان دەفرۆشتە هندیە سورەکانی ئەمێریکا لە

ماوەی جەنگی نێوانیاندا.
میکرۆبی درمی زۆر هەیە بەرەنگاری تیشکی ڕۆژ و گەرما دەکەن و کاریگەرییان کوت و پڕ و درێژ خایەنە. کە زۆر ئاستەمە بزانین ئەو نەخۆشیانە لە ئەنجامی جەنگی میکرۆبیدا بلاو دەبنەوە یان پەتایەکی سروشتین. لەبەر ئەوە دەشێت هەر ولاتێك پێش هێرشی سەربازی هێرشی میکرۆبی بکات. بەلام لە ڕاستیدا هیچ میکرۆبێکی وردی جەنگی نی یە بتوانێت دانیشتوانی جیهان لەناو ببات. تەنیا بەرگری کاریگەری دژی جەنگی میکرۆبی بوونی خزمەت گۆزاری تەندروستی باشە ، کە بتوانێت نەخۆشی یەکان بدۆزێتەوە وچارەسەری بکات و دەمامك و جل و بەرگی خۆپاراستن و شوێنی تایبەت بۆ ئەو کەسانە دابین بکات کە تووشی ئەو جۆرە میکرۆبانە دەبن.
لە سالی ١٩٦٩ دا ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمێریکا ڕایکەیاند ، پەنا دەبات بۆ جەنگی میکرۆبی ئەگەر ، ولاتانی تر پەنای بۆ ببەن. لەسالی ١٩٧٢ شدا زیاتر لە ٧٠ ولات پەیمانێکی نێو دەولەتیان مۆر کرد ، کە بەرهەم هێنان و هەلگرتن و پیشەسازی چەکی بیۆلۆجی قەدەغە دەکات.

## پێ ی ڕاست لە پێ ی چەپ گەورەترە !

ئەگەر مرۆڤ درێژی هەردوو قاچی بپێوێت ، دەبینێت قاچی ڕاستی تۆزێك لە قاچی چەپی گەورەترە.
ئایا هۆی ئەوە دەزانن ؟
پێکهاتەی لەشی مرۆڤ بە تەواوی وەکو یەك نیز. هەردوو لای ڕاست و چەپی لاشە. فیت نین ، ئەگەر ورد بینەوە لای ڕاستی دەمو چاو زۆر گەشاوە ترە لەلای چەپ. هەروەها پێ ی ڕاست گەورەترە لە پێ ی چەپ. دەستی ڕاستیش تۆزێك لە دەستی چەپ گەورەترە. دل لە لای چەپەوەیە ، بەلام جگەر لەلای ڕاستەوەیە. هەروەها پێکهاتەی لاشەش لە ناوەوە ، تەواو پارسەنگ نین لەبەر ئەوە گەشە سەندنی ئێسکەکان نارێکن ، لەئەنجامی ئەم نارێکیە دا پێ ی ڕاست لە پێ ی چەپ گەورەترە.
بوونی ئەم نارێکی یە لە لەشدا لە زۆر ڕووەوە کار دەکاتە سەرمان. لەبەر ئەوە دەبینین کەسێك چاوی بەستراوە ناتوانێت بە هێلێکی ڕاستدا بڕوات و خوار و خێچ ڕێدەکات. ئەم نارێك ڕۆیشتنە بەسەر ئاژەلانیشدا جێ بەجێ دەبێت.

**ئێستا ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ : بۆچی لای ڕاست لە لای چەپ زیاتر نەشونوما دەکات ؟**

**لەگەڵ ئەوەی ناتوانین بە دڵنیاییەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە , بەڵام زانایان وای دەبینن لەبەر ئەوەی خەڵکی ڕاستیان زیاتر لە لای چەپیان بەکار دەهێنن لەبەر ئەوەیە لای ڕاستیان لەلای چەپیان زیاتر نەشونوما دەکات.**

**٩٦٪ ی خەڵکی دەستی ڕاستیان بەکار دەهێنن , بەڵام لە سەدا چوارەکەی تر چەپەن و دەستی چەپیان بەکار دەهێنن. بەکارهێنانی دەستی ڕاست پەیوەندی بە مێشکەوە هەیە. بەشی چەپی مێشك کاری لای ڕاست ڕێك دەخات , لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵکی خاوەنی لای چەپن لە مێشکدا , بۆیە ئەوانەی دەستی ڕاست بەکاردەهێنن زیاترن لە دەست چەپەکان.**

## بۆچی عارەق دەکەین ؟

لاشەی مرۆڤ وەکو فرنێك وایە , ئەو خواردنەش کە دەیخۆین سووتەمەنی ئێمەیە و لە ئەنجامی ئۆکساندندا وزەی گەرمی دەردەدات. لە ماوەی ئەو کردارەدا لەشی مرۆڤی گەورە ڕۆژانە نزیکەی ٢٥٠٠ گەرمۆکە دەردەدات. ئەم گەرمایەش بەسە بۆ کوڵاندنی ٢٥ کیلۆ گرام ئاو لە سفر پلەی سەدیدا.

کەواتە ئەو گەرمایەی لەش چی لێدێت ؟

کە چالاکی ئەیزی لە لەشماندا دروست دەبێت (کردار گەلێکن پەیوەندییان بەدروست بوون و فەوتانی پلازماوە هەیە. بە تایبەتی گۆڕانکاری یە کیمیاویەکان لە گیاندارە وردەکاندا ئەوانەی کە وزەی پێویست دابین دەکەن بۆ کردار و چالاکیەکان و ئەوەی کە مەوادە تازەکان قەرەبووی مەوادە لە ناوچووەکان دەکەنەوە).

ئەو چالاکی یە ئەیزیانە نایەڵن پلەی گەرمای لەش لە ٣٧ پلەی سەدی تێ بپەڕێت. بەهۆی عارەق کردنەوە لاشە پلەی گەرمای سروشتی خۆی دەپارێزێت. ئەو گەرمایەش (( چەقی پلەی گەرما )) کە لە مێشکدایە تەحەکومی پێوە دەکات. ئەم بنکەیەش سێ بەشە. بەشی چاودێری و بەشی گەرم کردنەوە و بەشی سارد کردنەوە.

ئەگەر پلەی گەرما بە هەر هۆیەك دابەزی بۆ ژێر ئاستی سرۆشتی خۆی. ئەوا چەقی گەرمکردن خێرا دەست بە چالاکی یەکانی دەکات. لە هەمان کاتدا هەندێك لوی تایبەتی , مەوادی کیمیاوی قابیل بە سووتان دەرژێنن. کە جگەر و ماسولکەکان بۆ بەرز کردنەوەی پلەی گەرمای ناوەوەی لەش بۆ ئاستی سروشتی خۆی بەکاری دەهێنن.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر پلەی گەرمای لەش بەهەر هۆیەکەوە , بەرز بوەوە , ئەوا چەقی سارد کردنەوە دەست بەکار دەبێت و کرداری ئۆکساندن لەنگ دەکات و لووە عارەقیەکان , دەست بە عارەق ڕژاندن دەکەن و رێژەیەك ئاو و خوێ لەگەڵ عارەقەکەدا دێنە دەرەوە و بەیارمەتی پلەی گەرمای لەش عارەقەکە دەبێتە هەڵم کە دەبێتە هۆی سارد بوونەوەی لاشە. هەروەها بەشەکانی ناوەوەی لاشەش پاك دەکاتەوە لە زۆر لەو مەوادانەی زیان بە لاشە دەگەیەنن. کاتێك ڕێژەی شێش زۆر بەرزە بەرزە , عارەق دروست دەکات , لەبەر ئەوەی ڕێژەی بە هەڵم بوون لەو بار و

دۆخەدا کەم دەبێتەوە.

## کام گیانلەبەرە سێ دڵی هەیە ؟

گیانلەبەرێکی دەریایی سەیر و نامۆ هەیە ناوی (( حەبارە )) گۆشتی دەخورێت و سێ دڵی هەیە. یەکێك لە دڵەکانی لە ژێر گۆشتی کە نار و لای گەردنیدایە , لە ژێر چەناگەیدا کە بۆ ناردنی خوێنی ژێر گەردنیدا بەکاری دە هێنێت چونکە حەبار ئۆکسجین دەمژێت و دوای ئەوە خوێن بە دڵی سێیەمدا یان ناوەڕاستیدا تێ دەپەڕێت بۆ ئەندامەکانی تری لەشی. خوێنی حەبار بەرەنگە دیاری یەکەی زۆر سەرنج ڕاکێشە.

خوێنی زۆربەی ئاژەڵان سورە , لەبەر ئەوەی هیمۆکلۆبینەکە ماددەی ئاسنی تێدایە. بەڵام حەبار و هەندێك گیانداری تر کە سەر بە گرووپی (( سەرە قاچی یەکانن)) لە گیاندارە نەرم و شلەکانن و ڕەنگی خوێنەکەیان شینە لەبەر ئەوەی ماددەی هیمۆسانینی پڕ لە مسی تێدایە. هەزار پێ و سپێدجیش لە خێزانی ئەم ئاژەڵەن.

حەبار لە زۆربەی دەریاکاندا دەژێت و بە شێوەیەکی سەرەکیش لە کەنارەکاندان. ڕەنگی لاشەی قاوەی یەکی تول تولینە و نیتکە نیتکە ڕەنگی ئەرخەوانی تێدایە. کاتێك تیشکی ڕۆژ لیٚ ی دەدات وەکو کانزا بریقە دەداتەوە. بەڵام زۆر جار ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت و وەکو ڕەنگی دەور و بەری خۆی لێدەکات. تا ئێستا لێکۆڵینەوە لەسەر زیاتر لە سەد جۆر حەبار کراوە , کە درێژییەکانیان لەنێوان ٨سانتیمەتر بۆ١,٨ مەتردا بووە.

لەشی حەبار بە کیسەیەك پێچراوەتەوە پیٚ یدەوترێت (( بەرگ)) کە سەر و سنگی لە بەشی بەرگی پێشەوە بە دەردەکەوێت و دوو باڵیشی هەیە لە هەردوو لاوە. لەگەڵ هەشت دەست و دوو سنگ دا.

حەبار باڵەکانی بۆ هەڵزنانە شتەکان و گرتنی خواردنی بەکاردەهێنێت. حەبار ڕێگەیەکی زۆر تایبەتی هەیە بۆپاراستنی خۆی لە دوژمنانی بە دەردانی دووکەڵێکی ڕەش کە هێلکەکانی تێدا دەشارێتەوە تا کاتێك دەتروکێن و دەبنە بەچکە. حەباری ئاسایی لە وەرزەکانی بەهار و هاویندا زیاد دەکەن و لە نێوان ١٠٠ بۆ ٢٠٠ هێلکە دادەنێن. هێلکەکانی بۆ خواردن دەشێت بەڵام ئێسقانەکانی بۆ خواردنی کەناری و توتی یەکان بەکار دەهێنرێت.

## جۆرەکانی سووتەمەنی

سووتەمەنی ماددەیەکە لە کاتی سووتاندندا گەرما و ڕووناکی دەبەخشێت. وزەی گەرمای سووتەمەنیش دەگۆڕێت بۆ وزەی میکانیکی کەلە بەگەڕ خستنی شەمەندەفەر و ئۆتۆمبێل و مووشەك و هیتردا سوودی لیٚ دەبینرێت هەروەها لەخودی وزەی گەرماش بۆ گەرم کردنی ئاو بۆ بەڕێوە بردنی کارگەلەوزە گەرمی یەکان سوود دەبینرێت.

سووتەمەنی جۆری زۆرە , دەتوانین دابەشی بکەین بەسەر سیٚ گروپ دا وشك , شل , گازی.

لە سووتەمەنی یە وشکەکان وەکو خەڵووز و خەڵووزی کوك و هیتریش , هەزاران ساڵە دار وەکو سووتەمەنی بەکار هێنراوە , بگرە یەکەمین سووتەمەنیش بووە کە مرۆۋ بەکاری هێناوە. پرافین (مۆمی کانزایی) و پیوی ئاژەڵ دوو جۆری تری سووتەمەنی ڕەق بونە کەبە شێوەیەکی سەرەکی بەکار هێنراون , بەڵام خەڵووز تا کوو ئێستاش گرنگترین جۆری سووتەمەنی وشکە و زۆرترین بەکار هێنانیشی هەیە.

زۆربەی سووتەمەنی یە شلەکان لە پترۆڵەوە دەست دەخرێن. دەشێت هەندێك جۆری سووتەمەنی شلیش لە خەڵووزەوە دەست بخرێت , بەنزین لە ئۆتۆمبێلدا بەکار دەهێنرێت بەڵام ئەو بەنزۆڵەی کە لە خەڵووز دەردەهێنرێت , لەو بزوێنەرانەدا بەکاردەهێنرێن کە ناوخۆیی دەسووتێن. لە هەندێك ولاٚتیشدا ئالکوڵ وەکو سووتەمەنی شل بەکاردەهێنن. بەڵام لە کۆندا ئەو ڕۆنانەیان وەکو سووتەمەنی بەکارهێناوە کە لە ڕووەك و پیوی ئاژەڵان دەریان هێناوە بەڵام گرنگترین جۆری سووتەمەنی گازی سروشتی و گازی خەڵووز و گازی ئاوی یە.

گازی سروشتی لە ئەنباری زۆر گەورەی ژێر زەویدا هەیە , گازی خەڵووزیش تێکەڵەیەکە لە گازات , کەدەگۆڕێت و خەڵووزی کوکی لیٚ دەردەهێنرێت کە سووتەمەنی یەکی گشتی یە بۆ ماڵان و کارگەکان. بەڵام گازی ئاوی تێکەڵەیەکە لە هایدرۆجین و یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن. بە ناردنی هەڵمی ئاو بەسەر خەڵووزی کوکە گەرم کراوەکەدا دەستمان دەکەوێت. گازی ئاویش لە پیشەسازیدا بەکار دەهێنرێت.

گازی بۆتانیش سەرچاوەیەکی گرنگی سووتەمەنی یە. سووتەمەنی گازی بە هەموو جۆرەکانی یەوە زۆر پاکن , چونکە لەکاتی سووتاندندا خۆڵە مێش و

دۆکەڵ لە شوێنی خۆیان بەجێ ناهێڵن. لەم سەردەمەدا زانایان بە دوای سەرچاوەی تازەی سووتەمەنیدا دەگەڕێن ئێستا یۆرانیۆم بەکار دەهێنرێت بۆ بەرهەم هێنانی وزەی ئەتۆمی ، وەکو چۆن وزەی خۆر بۆ مەبەستی جیا جیا بەکار دەهێنرێت. هەروەها هەوڵ دەدرێت بۆپێش خستنی ڕێگەکانی بەرهەم هێنانی وزە لە سەرچاوە سروشتی یەکانی ترەوە.

## باڵندەی ((دو دو))

((دو دو)) باڵندەیەکی لەناوچووە ، جۆرێك بووە لە باڵندە گێلەکانی دوورگەی مۆریشیۆز.{ دورگەیەکە ڕووبەرەکەی ٢٠٤٠ کیلۆمەتری چوار گۆشەیە و دەکەوێتە ٨٠٠ کیلۆمەتری ڕۆژهەلاتی مەدەگەشکەرەوە لە زەریای هندی }
باڵندەی (( دو دو )) هەر هێندەی قەلەمونێك گەورە بووە و دەنوکێکی گەورەی پێوە بووە و کێشیشی نزیکەی ٢٣ کیلۆ گرامێك بووە. دوو قاچی کورت و دوو باڵی بچووکی هەبووە. لەبەر بچووکی باڵەکانی دو دو نەیتوانیوە بفڕێت. زانایان دەڵێن ئەم باڵندەیە لە موریشیۆس زیاتر لە هیچ شوێنێکی تری ئەم دونیایەدا بوونی نەبووە.
دەریاوانە پورتوگالی یەکان بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٦٠٧ دا ئەم باڵندەیەیان بینی و ناوی (دو دو) یان پێوە نا. {وشەی دو دو لەزمانی پورتوگالیدا واتای (گێل) دەدات کە لە ڕاستیدا ناوێك بووە پڕ بە پێستی خۆی }
باڵندەی دودو باڵندەیەکی نادان بووە بۆیە نەیتوانیوە خۆی لە دوژمنەکانی بپارێزێت. دەریاوانە پورتوگالییەکان بە سەگ وپشیلەکانیان ڕاویان دەکردن و تەنانەت سەگ و پشیلەکان هێلکەکانیشیانیان لەناو دەبرد ، تا سەر ئەنجام ئەو باڵندەیە لە ساڵی ١٨٦١ دا لەناو چوو.
دوای دۆزینەوەی ((دو دو)) پورتوگالییەکان هەندێك لەم باڵندانانەیان بردە ئەورووپاوە کە لە ساڵی ١٦٣٨ دا یەك دانەی لە لەندەندا بینرا. لە ئێستادا ئەم باڵندەیە لە ناو چووە و تەنها ئێسکە پەیکەرەکانی نەبێت کە لە دورگەی مۆریشیۆس کۆکراوەتەوە و براوە بۆ هەندێك لە مۆزەخانەکانی بەرتانیا و ولاتە یەکگرتووەکان و لەوێدا پارێزراوە.

## چۆن بە خوری گەرم دەبینەوە ؟

لە سەرانسەری جیهاندا یەك ملیارد سەر مەڕ هەیە. کە زیاتر لە ١٥٠ ملیۆن

سەری لە ئوسترالیادایە. ئێمە لەو مەڕانەوە خوریمان دەست دەکەوێت کە لە پیشەسازی جۆرەها جل و بەرگدا بەکاری دەهێنین و سوود لە گەرمی یەکەی دەبینین.

ئایا دەزانن جل و بەرگە خورییەکان چۆن پارێزگاری لە گەرمای لەشمان دەکەن ؟

ئێمە دەزانین پلەی گەرمای لەشی مرۆڤ لە ناوەوە ٩٨,٤ پلەی فیهرنهایەتە بەڵام پلەی گەرمای پێستی ڕوومەتی مرۆڤ نزیکەی ٩١ پلەی فیهرنهایەتە. کاتێك لاشەمان بەر تەنێکی جیاواز لە پلەی گەرما دەکەوێت هەست بە گەرما یان سەرما دەکەین. کاتێك پلەی گەرمای دەور و بەرمان نزیکەی ٦٥ پلەی فیهرنهایەتە هەست بە حەسانەوەی تەواو دەکەین.

لەبەر ئەوەی گەرمای لاشەمان بە ٢٥ پلە لەوە زیاترە لەو دۆخەدا لاشەمان بە بەردەوامی گەرما دەر دەدات. بەڵام ئەگەر پلەی گەرمای دەور و بەرمان لەوە کەمتر بوو ئەوا هەست بە سەرما دەکەین. ئەو کاتە دەبێت جلێکی وا لەبەر بکەین کە گەیەنەرێکی خراپ بێت بۆ سەرما.

خوریش باشترین ماددەی گەیەنەری خراپە بۆ سەرما لەبەر ئەوەی هەوا لە ناو مەچیرەکانیدا گیر دەخوات. هەروەها هەواش گەیەنەرێکی خراپە بۆ گەرما. بەڵام خوری گەیەنەرێکی خراپ ترە. لەبەر ئەوە لاشەمان زۆر لە گەرماکەی لە دەست نادات.

لەبەر ئەم هۆیەیە کاتێك جل و بەرگێکی خوری لەبەر دەکەین هەست بەگەرما دەکەین. یەکێکی تر لە تایبەتمەندی یە گرنگەکانی خوری ئەوەیە دەتوانێت شێ بمژێت.

یەك پاوەند لە خوری دەتوانێت نزیکەی { ئۆنصە } لە هەڵمی ئاو هەڵمژێت.

سەرەڕای ئەوەش خورییەکە وشك دێتە بەر چاو. ئەو ئاوە مژراوە ناتوانرێت بە کام ئامێر بەهێزە دەربهێنرێت. بەهۆی ئەم تایبەتمەندی یەیەوە خوری دەتوانێت ئەو ئارەقەی لاشەمان دەری دەدات بیمژێت. ئەم کردارەش وا دەکات گەرمی بۆ لاشە دەستەبەر ببێت. مژینی ئارەقەکەش وا دەکات خوری یەکە هەندێك گەرم ببێت

١- یەك پاوەند نزیکەی ٤٥٣ گرامە.

٢- یەك ئۆنصە نزیکەی ٢٨,٣٥گرامە.

## خێرایی گیاندارە ئاویـــــەکان

له دەریا و زەریاکاندا هەزاران جۆر گیاندار هەن , له نێوانیاندا جۆرەها ماسی و کیسەڵ و تیمساح و نەهەنگ و مارماسی و هتد که له ژماردن نایەن.

ئایا دەزانیت کام لەم گیانلەبەرە خێراترە ؟

شێرماسی Sword fish جۆرە ماسیەکی دەریاییە و شەویلگەی سەرەوەی وەك شێر درێژ بۆتەوە , خێراترین گیاندارە له ناو گیاندارە ئاویەکاندا. که دەگاتە ٩٥ کیلۆمەتر له کاتژمێرێکدا. دوای ئەو ماسی سلفیس دێت که خێراییەکەی دەگاتە ٨٥ کیلۆمەتر له کاتژمێرێکدا. بەڵام ماسی تەنی Tinny خێراییەکەی ٧٥ کیلۆمەترە له کاتژمێرێکدا. دۆلفینیش ٦٥ کیلۆمەترە.

هەروەها جۆرەها گیانداری تری ئاویمان هەیە که خێراییەکانیان بەم جۆرەیە :

ماسی تەربۆن و قرش ٤٥ کیلۆمەترە. ماسی سالمۆنی خاڵخاڵین ٣٥ کیلۆمەترە , سالمۆنی سادە ٢٥ کیلۆمەترە , نەهەنگ ١٥ کیلۆمەترە , مارماسی ١٥ کیلۆمەترە. هەندێکی تر له گیاندارە ئاوییەکان کەمتر له ١٥ کیلۆمەتر دەبڕن له کاتژمێرێکدا که گرنگترینیان ڕۆبیان یان (کوللەی دەریا)یە. شبوت (ماسیەکی سەر بچوکی ناو قەد پانە) هەزار پێ و هیتریش.

خێرایی ئەم ئاژەڵانە به لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوە سەلمێنراوە. ئەو خێراییانەش ئەوپەڕیەتی که دەتوانن بیبڕن.

## بۆچی لاشەی مردوان دەکەونە ســــەر ئاو ؟

ئەگەر کەسێك له ئاوێکدا مەلە بکات و مەلەوانی نەزانێت ئەگەری خنکانی هەیە. بەڵام به پێچەوانەی گیاندارانەوە, لاشەی مردوو دەکەوێتە سـەر ئـاو

ئایا دەزانی هۆی چیە ؟

به پێ ی یاسای ئەرخەمێدس کاتێك تەنێك به شێوەیەکی بەشی یان گشتی دەچێتە ناو ئاوێکەوە , ئەوەندەی ئەو تەنە که چوەتە ناو ئاوەکەوە ئاو دەڕژێت. تەنەکەش دەکەوێتە سەر ئاو کاتێك کێشی کەمتر بێت له کێشی ئەو ئاوەی یەکسانە به قەبارەی. بەڵام ئەگەر کێشەکە هەمان کێشی بوو ئەوا تەنەکە به جێگیری دەمێنێتەوە. هەرچەندە قوڵ بێت بەڵام به گشتی ئەو تەنانەی دەکەونە سەر ئاو که کێشیان له کێشی ئاوەکە کەمترە یان هێندەی قەبارەکەیەتی.

بۆ نـمونە :

دار و تەپەدۆڕ دەکەونە سەر ئاو چونکە چڕییان له چڕی ئاو کەمترە , بەڵام ئەو

تەنانەی کە چڕییان لە چڕی ئاو زیاترە , دەچنە ژێری ئاوەوە.
چڕی لەشی مرۆڤ لە چڕی ئاو کەمترە. لەبەر ئەوە کاتێك کەسێك دەکەوێتە ئاوێکەوە بۆ چەند چرکەیەك دەکەوێتە سەر ئاوەکە. بەڵام کاتێك ئاو چوە ناو لاشەیەوە , چڕیەکەی لە چڕی ئاوەکە زیاتر دەبێت و دەچێتە قوتا. کاتێك لاشەی دەئاوسێت. بە هۆی ئەو ئاوەی چوەتە سکی‌یەوە , قەبارەی لەشی گەورە دەبێت و چڕی کەمتر دەبێتەوە.
بە واتا کێشی ئەو ئاوەی کە لاشە چوە جێگەکەی , لە کێشی لاشە زۆرتر دەبێت , لە ئەنجامی ئەوەدا , لاشە دەست بە کەوتنە سەر ئاو دەکات.
ئەم بیردۆزە یە هەمان شت جگە لە مرۆڤ جێبەجێ دەبێتە سـەر تەنەکانی تریشـدا.

## کـــــەرکـــــەدەن " یەك شـــــاخە" Rhino Ceros

کەرکەدەن لە گیاندارە مەمکدارەکانە و لە دوای فیل بە دووەم گیانداری گەورە دێت. کەرکەدەن کە ووشەیەکی یونانیە بڕگەی یەکەمی بە مانای لووت و بەشی دووەمیشی بە مانای شاخدار دێت. ئەم ئاژەڵە شاخێك یان دوو شاخ لەسەر لووتی دەردەچێت و سەر بە خێزانی ئاژەڵە سمدارەکانە.
کەرکەدەن لاشەیەکی گەورە لەسەر چوار قاچی کورتی بە هێز هەڵدەگرێت. لە هەر قاچێکیدا سێ پەنجە هەیە کە بە سمێکی جیا تەواو دەبێت. هەروەها قاچێکی پێشەوەی پەنجەی چوارەمی پێوەیە کە بەکاری ناهێنێت !
پێنج جۆری جیاواز لە کەرکەدەن هەیە , کە دوانیان لە ئەفریقیادا و سـیانیان لە ئاسیادایە. دووجۆرە ئەفریقیەکەو یەك جۆر لە ئاسـیاییەکە , کە ناوی (سوٚمترە) یە هەریەکەو دوو شاخیان پێوەیە. بەڵام دوو جۆرە ئاسیاییەکەی تر کە پێیان دەوترێت هندی و جافی یەکی یەك شاخیان هەیە.
گەورەترین جۆری کەرکەدەن جۆری ئەفریقی سپیە کە بەرزیەکەی ١,٨ مەترە و کێشیشی زیاتر لە ٣ تەنە.
جیاوازی نێوان کەرکەدەنی سپی و ئەو و ئەفریقیەکەی تردا , لە شێوەی هەردوو لێویاندایە , کەرکەدەنی سپی دەمێکی گەورەی چوار گۆشەو زۆر گونجاوی پێوەیە بۆ کروٚژینی گیاکان بە کاری دەهێنێت , بەڵام ڕەشەکانیان لێوی سەرەوەیان باریکەو بۆ بڕینی گەڵای دارەکان بە کاری دەهێنێت.

بچوکترین جۆریان سوٚمتره یه که بەرزیەکەی ١,٢٥ مەتر بەرزتر نیەو لە یەك تەن زیاتریش قورس نیە.
کەرکەدەن لەسەر ڕووەك و گیا دەژیێت و هیچ کات ڕاوی گیانداران ناکات بۆ خواردن. ئەم گیاندارە زەبەلاحە زۆر هێمن و لەسەرخۆ و بێوەیە. بەلاٚم ئەگەر ئەزیەت بکرێت دەبێتە دڕندەیەکی ترسناك.
کەرکەدەن دەتوانێت لە کاتژمێرێکدا ٣٠ کیلوٚمەتر ببڕێت , هەردوو شاخە بەهێزەکەشی بۆ هێرش کردنە سەر دوژمنەکانی بەکار دەهێنێت. پێستی کەرکەدەن زۆر ئەستورەو توکێکی تەنکی لەسەرە, دەلێیت پەردەیەکی مودەڕەعی لە بزمار لە بەردایە.
شاخی لە(نتوئات) پێکهاتوە کەلە توکێك دەچێت لەسەر ئێسقانی لووت و ئێسقانە بەردەمینەکانە. شاخیشی پەیوەست نیە بە کەللە سەریەوەو دەشێت لە کاتی جەنگ کردندا بشکێت. بەلاٚم کە شکا جارێکی تر بە خێرایی شاخی سەر لە نویٚ دەڕوێتەوە , هەندێك جار درێژی شاخی دەگاتە ١,٧ سانتیمەتر.
هەر سکێك یەك بەچکەی دەبێت و دوای هەژدە مانگ لە ئاوس بوون دەزێت و تا چەند ساڵێك بێچوەکەی لەگەڵ دایکیدا دەبێت. کەرکەدەن نزیکەی پەنجا ساڵێك تەمەن دەکات. دوای نیوەڕوان کەرکەدەن خۆی دەخاتە ناو ئاوە قوڕاویەکانەوە بۆ پاراستنی لەشی لە گەرما. کاتێکیش دێتە دەرەوە بە چینێك لە قوڕ خۆی دادەپوٚشێت بۆ ئەوەی خۆی لە گاز گرتنی مێشوولە بپارێزێت.
ئەمڕۆ کەرکەدەن یەکێکە لە گیاندارە دەگمەنەکان , لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان بە درێژایی چەندەها ساڵە بۆ شاخەکانیان ڕاویان دەکەن. مرۆڤە کوٚنەکانیش شاخی کەرکەدەنیان لە کاری جادوگەریدا بە کار هێناوە

## کــــێ کــــامیرای داهێنــــــا ؟

کاتێك یەکێك وێنەیەك دەگرێت و دەیشواتەوە بەو ئاسانیە, زۆر بە زەحمەت بڕوا دەکات کە سەدان ساڵ لە تاقیکردنەوە پێویست بووە, بۆ ئەوەی بگاتە ئەو ئاستەی ئەمڕۆ دەبینین. ناتوانرێت دروست کردنی کامیرا بدرێتە پاڵی هیچ کەسێك. بۆ ئەوەی بیروٚکەیەکی خێراتان بدەینیٚ لەسەر مێژووی وێنە گرتن.
ئەو هەنگاوانە دەخەینە ڕوو کە وێنە گرتنی گەیاندە, ئەم قوٚناغە سەیرەی ئەمڕۆ وێنە گرتنی تێدا دەبینین.

لە نێوان سەدەکانی ١١ بۆ ١٦ دا مرۆڤ (کامیرای ژووری تاریکی) دروست کرد کە توانی لەسەر کاغەز وێنە چاپ بکات بەڵام گرتنی وێنە نەبوو بە کردار. لە ساڵی ١٥٦٨ دا (دانیلۆ باربارۆ) عەدەسەو کونێکی گۆڕێنەری خستە سەر (کامیرای ژووری تاریک) بۆ ئەوەی وێنەکە زیاتر دیار بێت

لە ساڵی ١٨,٢ دا (تۆماس وید جود و همفری دیڤی) خەیاڵات و وێنەی سێبەرداریان خستە سەر کاغەزێکی لوس، بەڵام لە چاپکردنی وێنەیەکی هەمیشەییدا سەرکەوتوو نەبوون.

لەساڵی ١٨١٦ دا (جوزیف نیپس) ئامێری وێنە گرتنی فۆتۆگرافی سەرەتایی دروست کرد لە سندوقێکی جەواهیرات و عەدەسەکانی لە میکرۆسکۆبەوە ، وەرگیرابوو بەڵام وێنەیەکی سلبی دەست کەوت.

لە ساڵی ١٨٣٥ دا (ولیم تالپوت) یەکەم کەس بوو وێنەی ئیجابی لە وێنەی سلبی دروست کردو یەکەم کەسیش بوو وێنەی هەمیشەیی چاپکرد.

لە ساڵی ١٨٣٩ دا (لویس داگۆیر) تۆمارکردنی وێنەی لەسەر پلێتێکی زێڕ ئاشکرا کردو کردارەکەش بە ناوی ئەوەوە بڵاوبووەوە.

لە سەرانسەری جیهاندا بە درێژایی دەها ساڵ چەندین کەس هەوڵی پێش خستنی کامیرایان داوە لە گشت ڕویەکەوە ، کە زۆر ئاستەمە لێرەدا بتوانرێت ناوی هەموویان بهێنرێت. بەڵام شایانی باسە کرداری گەشە سەندن و پەرەپێدانی کامیرا زۆر خاو و درێژ خایەن بوە.

تا لە ساڵی ١٨٨٨ دا (کامیرای سندوق) خرایە بازاڕەوە کە لە لایەن کۆمپانیای (ئیستمان درای پلیت ئەند فیلم کۆمپانی) دروست کرابوو لەسەر بنەمای بەکار هێنانی سیستەمی کۆداک. ئەم کامیرایە فلیمێکی تێدا بوو کە دەیتوانی سەد وێنە بگرێت و پانی هەر وێنەیەکیشی شەش سانتیمەتر بوو. دوای گرتنی هەر سەد وێنەکە کامیراو فلیمەکە پێکەوە دەگەڕێنرایەوە بۆ (ڕۆچستەر) و لەوێ فلیمەکە لە کامیراکە دەردەهێنراو دەشۆرایەوە و سەرلە نوێ فلیمێکی تازە دەخرایە ناو کامیراکە و لە بازاڕدا دەفرۆشرایەوە.

بەمجۆرە کامیراش نهێنیەکانی دۆزرایەوە و کار لەسەر پێشخستنی کرا تا ئەمڕۆ دەبینین کامیراو وێنە گرتن لە چ ئاستێکی بەرزدایە.

•

## لۆکــــــه.... کچــی خــۆر

خەڵکی لە کۆندا بە لۆکەیان دەگووت کچی خۆر , چونکە ئەگەر لە ژێر تیشکی خۆرێکی بەهێزدا نەبێت شین نابێت و گەشە ناکات. هەرچەندە گەرمای ڕۆژ بەهێزتر بێت لۆکە زیاتر بەهێزو سپی دەبێتەوە. لەبەر ئەم هۆکارە زۆرترین لۆکە لە ناوچە ئیستیوائیەکان یان نزیك لێیەوە دەچێنرێت. لە گەرمترین ناوچەی جیهانە. ئەو هێڵەی کە لۆکەی تێدا دەچێنرێت دەکەوێتە نێوان هێڵی پانی ٣٧ ی باکور و ٣٧ ی باشورەوە. ئەم هێڵە کە دەوری گۆی زەوی دەدات ڕوبەرەکەی نزیکەی ٤٥.. میل دەبێت. ئەگەر لۆکە تیشك و گەرماو بارانی هەبێت زۆر بە جوانی و ساغی شین دەبێت.

لۆکە لە قۆناغی سەرەتاییەکاندا زۆر پێویستی بە ئاو هەیە. بەڵام دوای ئەوەی قۆزاخەکەی دەکرێتەوە و گوڵە سپیەکەی دەردەچێت کەمترین ڕێژەی شێی بەسە بۆ فەوتاندنی دەزوەکانی. لۆکە زۆرترین بەکارهێنانی لە پیشەسازی جل و بەرگدایە کە ئیش و کار بۆ ملیۆنەها کەس لە جیهاندا دەستەبەر دەکات.

دەزوەکانی لۆکە تەنیا دەزویەکە , کە پێویستی بە نەرم کردنەوە یان هەر چارەسەرێکی تری پرخەرج نیە.

تەنها پێویستی بەوەیە پێش بەکارهێنانی ناوکەکەی دەربکرێت. لە جیهاندا بیست جۆر ڕووەکی لۆکە هەیە کە تەنها چوار جۆری کشت دەکرێت. لە دوای یەکێتی سۆڤێتی پێشوو چین و وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە پلەی دووەم و سێیەم دێن لە بەرهەم هێنانی لۆکەدا.

جگە لەم وولاتانە لۆکە بە ڕێژەیەکی زۆر لە هند و پیرۆ و بەرازیل و میسر و پاکستان و ناوچە ئیستوائی و نیمچە ئیستیوائیەکانی جیهاندا کشت دەکرێت. درێژی ڕوەکی لۆکە لە نێوان یەك مەترو دوو مەتردایە. ڕیشکەکەی درێژەو گەڵاکانی پان و قاژقاژن و گوڵەکانی سپین و بۆ تەنیا یەك ڕۆژ دەژێت. کاتێك گوڵەکە دەمرێت , بەرەکەی دەگیرسـێت. بەڵام تورەکەی لۆکەکە پێویستی بە نزیکەی دوو مانگێك هەیە بۆ ئەوەی بگیرسێت و ببێتە قۆزاخە. کە ڕەنگێکی سەوزی هەیەو درێژی چێوەکەی نزیکەی پێنج سانتیمەترە. لەناو تورەکەکەدا تۆوی زۆرو دەزوی لۆکە هەیە. کە درێژی هەر دەزوویەکی نزیکەی سێ سانتیمەترەو ٩٠٪ ی ماددەکەی سلیلۆزە.

لۆکە لە کارگەکانی چنین و جل وبەرگ و مافورو چەرچەف و کاری پزیشکی‌دا بەکار دەهێنرێت هەروەها لە بەرگ تێگرتنی کتێبیشدا , لە ناوکەی لۆکە ڕۆن دەردەهێنرێت و لە پیشەسازی سابونیشدا قازانجی زۆر بە مرۆڤ دەگەیەنێت. دوای دەرهێنانی ڕۆن لە ناوکەی لۆکە , ناوکەکەی وەکو ئالیك بۆ ئاژەڵان بەکار دەهێنرێت.

## شیرینی چۆن پەیدابـــوو ؟

لە هەر وولاّتێك لە وولاّتانی جیهانی کۆندا , خەڵکی شتێکیان خواردوە کەلە شیرینی ئەم سەردەمە دەچون. لە میسردا دوای گەڕان هەندێك پاشماوە دۆزرایەوە کە تیایدا چۆنیەتی دروست کردنی شیرینی پیشان دەدات.
لەو سەردەمانەدا پالاّفتنی شەکر شتێکی زانراو نەبوە بۆیە لە بری شەکر هەنگوینیان بەکار هێناوە. لە میسری کۆنیشدا خورما مادەی سەرەکی دروست کردنی شیرینی بوە , لە ڕۆژهەلاّتیشدا هەر تیرەو خێڵێك وەستایەکی تایبەتی دروست کردنی شیرینییان هەبوە لەگەڵ پاراستنی نهێنییەکانی دروست کردنیدا.
لەم ناوچەیەی خۆمانیشدا بادەم و هەنگوین و هەنجیریان لە پیشەسازی شیرینی‌دا بەکار هێناوە وەسفەیەکی ڕۆمانی کۆن هەیە بۆ کولاّندنی ناوکدارەکان و خەشخاشی کولاّو لەگەڵ هەنگوین دا. پاشان تێکەڵەیەك لە بیبەرو کونجی هاڕاوە لەگەڵ هەنگویندا کراوە بەسەری‌دا. دەشێت ئەنجامی ئەم وەسفەیە شتێك بێت لە شێوەی (نوغە) (شیرینی‌یەکی سپیە لەگەڵ فستقدا تێکەڵ کراوە).
لە ئەورووپای کۆندا شەرابێکی شیرین کراو هەبوە , بەلاّم بۆ لابردنی تاڵی دەرمان لە دەمدا بەکارهێنراوە. لەو سەردەمەدا هیچ کەس بیری لە دروست کردنی شیرینی نەکردۆتەوە وەکو هونەرێکی سەربەخۆ. بەلاّم کاتێك لە سەدەی حەڤدەهەمدا شەکر چوە ئەوروپاوە , پیشەسازی شیرینی بوبە هونەرێکی سەربەخۆ. فەرەنسی‌یەکان لە میوە مرەبایان دروست کردووە وەکو شیرینی. لە سەردەمی داگیرکاریدا و لە دوای ئەوەش شەکری دارباسقەندەو دۆشاوی شەکرو هەنگوینیان لە مالاّنداو لە پیشەسازی مرەبادا بەکارهێناوە. باپیرانیش ڕەگی شلێرو سێو و زەنجەفیلیان لە پیشەسازی شیرینی و شەکردا بەکارهێناوە

## کـــێ پایســـــکلی داهێنـــا ؟

ئەگەربمانەوێت مێژووی پایسکل بگەڕێنینەوە بۆ سەرەتاکەی دەشێت بگەڕێینەوە بۆ میسری کۆنی هەزاران ساڵ پێش ئێستا. هەندێك بەڵگەنامە هەن کە میسریە کۆنەکان هۆیەکی میکانیکیان هەبوو و بریتی بوە لە دوو تایەو سینیەکی لەسەر بوەو بەهەردوو قاچ لێیان خوڕیوە. بەڵام لە ڕوی پراکتیکیەوە سەرەتای پایسکل دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨١٧.لەو ساڵەدا پیاوێکی ئەڵمانی بە ناوی (بارون فۆن درایس) ئامێرێکی دروست کردو بە ناوی خۆیەوە ناوی نا. کە بریتی بوو لە ستونێکی لە دار دروست کراو کە پەیوەند بوو لە نێوان هەردوو تایەی درایسین دا. ئەوەی سواری دەبوو , بەشێك لە قورسایی خۆی دەخستە سەر پایدەرە دارەکەو بە لێخشاندن بە زەویدا جارێك بە پێ ی ڕاستی و جارێك بە پێ ی چەپی خۆی بەرەو پێشەوە دەبرد. بە جولاندنی سوکانە دەستیەکەشی ئاڕاستەکانی دەگۆڕی.

ئەم ئامێرە نرخی زۆر گرانبوو بۆیە ناویان لێنا (ئەسپی نازدار ) جۆرجی چوارەمی پادشای بەریتانیا زۆر حەزی لە سوار بوونی دەکرد !

لە ساڵی ١٨٤٠ دا پیاوێکی سکۆتلاندی بە ناوی (ماکمیلان) ئەسپێکی نازداری کۆنی هێناو کرنکی خستە سەر میحوەری تایەی دواوەی و پەیوەستی کردە سوکانەکەیەوە و هێندە بە خێرایی لێ ی خوڕی لە لایەن پۆلیسەوە دەستگیر کرا بە تۆمەتی ( خراپ لێخوڕین ) !

بۆ یەکەمین جار ناوی ( پایسکل ) لە ساڵی ١٨٦٥ دا بەکار هێنرا. پیاوێکی فەرەنسی بە ناوی (لالمانت) هەستا بە گەیاندنی کرنگەکان بە تایەی پێشەوە بە پایسکلێکی سێ تایەییەوە کە لە ئەسپی نازدار دەچوو. بیچمی ئەم پاسکیلانە لە دار بوو زۆر قورس و تایەکانیشی لە ئاسن دروست کرابو. لە ساڵی ١٨٦٨ تایەی کانزایی لە تێل دروست کراوی زۆر سوك لەگەڵ تایەی ڕەقی لە پلاستیك دروست کراو بۆ پایسکل دانرا.

دوای ئەوە جۆرێکی تازە لە پایسکل دروست کرا کە تایەی پێشەوەی لە تایەی دواوەی گەورەتر بوو. ئەم پێشکەوتنە بە واتا سوڕێکی سینیە پەیوەستەکە بە میحوەری پایسکلەکەوە ماوەیەکی زیاتر دەیبردە پێشەوە. بەرزی تایەی پێشەوە لە هەندێك پایسکل دا دەگەیشتە مەترو نیوێك لە کاتێکدا دورترین ماوە لە نێوان

هەردوو تایەی پێشەوەو دواوە دا تەنها ٣٠ سم بو. بەڵام ئەم پایسکلە ئەوانەی سواری دەبون زۆر جار دەکەوتنە خوارەوە.
تا لە ساڵی ١٨٨٥ دا پایسکلی نویٚ دروست کرا کە سەلامەتی زیاتر بو بۆ سەرنشینەکەی و هەردوو تایەکەی بە قەد یەك بون و کورسی دانیشتنیشی لە ناوەڕاستدا بوو دانەکانی سینیەکەشی , لە دانەکانی تایەی دواوەی گەورەتربو.
بە تێپەڕبونی ڕۆژگار چاکسازی تر لە بەرهەم هێنانی پایسکل دا کرا تا گەیشتە ئەوەی کە ئەمڕۆ دەیبینین.

## کەی هەڵپەرکێی بە کۆمەڵ دەستی پیٚ کرد ؟

هەڵپەرکیٚ بە جۆرێك لە جۆرەکان لە ڕوی پراکتیکەوە لەگەڵ بونی مرۆڤدا دەستی پێکردوە. نەتەوە سەرەتاییەکان ,بۆ لاسایی کردنەوەی ئاژەڵان یان هێزی سروشتی هەڵپەرکێیان کردوە. هەڵپەرکیٚ ئاینیەکانیش لە دێر زەمانەوە بەشێك بوە لە مێژووی مرۆڤایەتی. بەڵام هەڵپەرکیٚ ی بە کۆمەڵ شتێکی جیاوازەو خەڵك بۆ چێژ وەرگرتن هەڵپەرکیٚ دەکەن.
ئەوەی کە جیٚ ی سەرسوڕمانە ئەمجۆرەش لە هەڵپەرکیٚ مێژویەکی درێژی هەیە. یۆنانیە کۆنەکان زۆر ئاشنای هەڵپەرکیٚ بونە , وەکو هۆیەکی سەر گەرم کردنی کۆمەلاٚیەتی.
بۆ نمونە : ئەرستۆ بڕوای وابو کە هەڵپەرکیٚ شتێکە نرخی خۆی هەیە و ڕەنگدانەوەی ڕەوشت و کردارەکانی خەڵکە.
هۆمیرۆسیش ڕێزی زۆری بۆ هەڵپەرکیٚ داناوە. بەڵام وتاربێژی ڕۆمانی شیشرۆن (کە کەسێکی سیاسی و وتاربێژێکی زۆر بە توانابوە) ئەمەی سەبارەت بە هەڵپەرکیٚ وتووە : ئەوەی عەقڵ و هۆشی ببێت هەڵپەرکیٚ ناکات ئەگەر بە تەنیا بێت یان بە کۆمەڵ بێت , بەڵام ئەگەر عەقڵ و هۆشی لە دەست دا ئەوا هەڵپەرکیٚ دەکات. لەبەر ئەوەی هەڵپەرکیٚ هاوڕێیەکی بیٚ ئابڕوو زیادە ڕەوو فاسقە.
هەڵپەرکیٚ هاوڕیٚی ئەغریقیەکان بوە لە هەموو ئاهەنگ و میوانداریەکانیاندا. بگرە بەشێك بوە لە ژیانی یۆنانیە کۆنەکان. تەنانەت سوکرات و ئەفلاتونیش لەگەڵیدا بونە. هەڵپەرکیٚ وەکو هونەرێکی کۆمەلاٚیەتی لە چوار هەزار ساڵەوە لای میسریەکان زانراو بوە. داب و نەریتی میسریە کۆنەکان وابوە میوانەکانیان بە سەماو هەڵپەرکیٚ دڵخۆش کردووە. لای هندیەکانیش هەڵپەرکیٚ وەکو شێوەیەك لە

شێوەکانی سەر گەرمی هەر لە کۆنەوە هەبوە. بە تایبەت لای هندیەکان هەڵپەڕکێ گرنگیەکی ئاینی هەبووە.
لە وولاٌتانی تریشدا هەڵپەڕکێ بە کۆمەڵ دەکرێت. وەکو ئیسپانیا و فەرەنسا , هەرچەندە زۆر لە هەڵپەڕکێی فەرەنسیەکان لە ولاٌتانی ترەوە سەرچاوەی گرتووە بەلاٌم لە فەرەنسا دا گەیشتۆتە کامڵ بوون. (کاترین دی میدیس) بە شێوەیەکی سەرەکی بەر پرسی پێشکەوتنی هەڵپەڕکێ بوە لە فەرەنسادا چونکە زۆر حەزی لە سەمای بە کۆمەڵ کردوەو حەزەکەشی لە کۆشکی پادشاوە بۆ نێو ماڵەکان بلاٌو کردەوە. لە سەردەمی لویسی چواردەدا هەڵپەڕکێ ی بە کۆمەڵ گەیشتە لوتکەو چەندەها ئاهەنگی ( bali )ڕێکخراو باشترین میوزیك زانی ئەو سەردەمە ئەو ئاوازانەیان دانا کە تایبەت بو بە سەمای دەربارەوە.

## مۆزەخانەکان کـــەی پەیدابــون ؟

مۆزەخانە ئەو جێگەیەیە کە کۆمەڵێك شتی دەگمەن و بە نرخی تێدا دەپارێزرێت و پیشانی خەڵکی دەدرێت. ئەو شتانەش یان لە سروشتەوە دەست کەوتوە یان مرۆۆ دروستی کردوە. مۆزەخانەی تایبەت بە هونەر , زانست , مێژوو, پیشەسازی , تەکنەلۆژیا هەیە.
وشەی مۆزەخانە لە وشەی (موزیون) ی لاتینیەیەوە هاتوە کە واتای (پەرستگای موزی)دەدات. موزی یەکێك بوە لە خواوەندەکانی نۆ خوشکەکە کە گۆرانی و هۆنراوە و هونەرو زانستیان دەپاراست لە میسیۆلۆجیای ئەغریقیدا.
یەکەمین (موزیون) لە ئەسکەندەریەی میسردا دروست کرا لە سەدەی سێیەمی پێش زایندا.
مەبەست لە مۆزەخانەی ئەسکەندەریەش , کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانە بوو کە دەشیا بەسود بوایە بۆ لێکۆڵەرەوان , چونکە لێکۆڵەرەوان لەوێدا دەژیان و لێکۆڵینەوەکانیشیان تێدا دەکرد. مۆزەخانەکەش کۆمەڵێك پارچەی هونەری و نامۆ و سەیری لە خۆگرتبوو کە بریتی بوو لە پەیکەرەکان و ئەو کەرەستانەی لە زانستی گەردوون ناسی و نەشتەرگەری‌دا بەکار دەهێنران. هەروەها لمۆزی فیل و پێستی ئاژەڵە نامۆکانیشی تێدابوو.
ئەو مۆزەخانەیە تەنها کاربەدەستان و دەوڵەمەندان بۆیان هەبو سەردانی بکەن و ببینن. تەنانەت مۆزەخانەی بەریتانیاش کەلە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمدا

دامەزرا , تەنها ڕێگە بە ژمارەیەکی زۆر کەم لە خەڵکی دەدرا سەردانی بکەن.
بەڵام شۆڕشی فەرەنسا دەرگای مۆزەخانەکانی بۆ هەموو خەڵکی خستە سەر پشت و لە ساڵی ١٧٩٣ داو لە ماوەی شۆڕشدا حکومەتی فەرەنسا ( لۆڤەر )ی لە پاریس , کردە مۆزەخانەیەکی نیشتمانی.
لە سەدەی نۆزدەهەمدا بینای تایبەت بە مۆزەخانە دروست کرا. یەکێك لە کۆنترین بیناکانی جیهان کە لە ساڵی ١٨٣. دا کرایە مۆزەخانە, مۆزەخانەی ( تالیس ) ە لە بەرلینی ئەڵمانیا.

## چــۆن تــــەلەفــۆن داهێنـــرا ؟

باسی داهێنانی تەلەفۆن زۆر سەیرە بە لاتانەوە سەیر نەبێت کە توانرا فلیمێکی سینەمایی لەسەری بەرهەم بهێنرێت بەڵام وەرن با پێکەوە تێبگەین کە چۆن تەلەفۆن ئیش دەکات ؟
کاتێك قسە دەکەین هەوا وا دەکات ژێ دەنگیەکانمان بلەرێنەوە. ئەم لەرینەوانەش دەگوێزرێنەوە بۆ گەردیلەکانی هەوا بە جۆرێك لە دەممانەوە شەپۆلێکی دەنگی دەردەچێت , واتە لەرینەوە لە هەوادا.
ئەم شەپۆلە دەنگیانە لەناو تەلەفۆنەکەدا دەدەن لە ئەلەمنیۆمێکی پانی تەنك و ئەلەمنیۆمەکەش بە هەمان ڕێگە کە گەردیلە هەواییەکان تیایدا دەلەرێنەوە دەلەرێتەوە. ئەو لەرینەوانەش تەزویەکی ناچون یەك و شەپۆلاوی دەنێرێت لەسەر هێڵی تەلەفۆنەکە.
تەزوە لاوازو بەهێزەکان وا دەکەن قورسە ئەلەمنیۆمە تەنکەکە لە دیوەکەی تری هێڵی تەلەفۆنەکەوە بە هەمان ڕێگە بگەرێتەوە کە قسەکەر بەناو بڵند گۆی تەلەفونەکەدا دەینێرێت. کاتێك ئەو شەپۆلە دەنگیانە دەگاتە گوێی بیسەر لەو دیوەکەی ترەوە هەمان کاریگەری هەیەو یەکسەر لەوسەرەوە دەبیسرێت.
با بگەرێینەوە لای ئەلکسەندەر گراهام بیل و بزانین چۆن تەلەفۆنی داهێنا ؟
لە دوی حوزەیرانی ١٨٧٥ دا , کەلە شاری بوستن ی ئەمریکا خەریکی تاقیکردنەوە بوو, لە ناردنی چەند نامەیەك بە بروسکە بە هۆی تەلەوە.
بێڵ لە ژورەکەی خۆیدا خەریکی کارکردن بوو ئامێری وەرگرەکەی لەلابوو. لە کاتێکدا جێگرەکەی ( تۆماس واتسۆن ) لە ژوورێکی تر لەسەر ئامێرێکی نێرەر کاری دەکرد کاتێك واتسۆن تەلە پۆڵاینەکەی بزواند, لەرینەوەکان دەنگێکیان

دەرکرد.( بێڵ) خێرا چوە سەری و هاواری کرد (دەستکاری مەکە : پێم بڵێ چیت کرد؟ لێم گەڕێ با سەیرێکی بکەم.
دەرکەوت کە تەلە پۆڵاکە لە کاتی لەرینەوەی سەروی موگناتیسی دەبێتە هۆی باریك کردنەوەی تەزویەکی جیاوازی هێز بە ناو تەلەکەدا. کەوا دەکات تەلەکە لە ژورەکەی بیڵ دا بلەرێتەوەو دەنگ دەربکات.
لەم ژورەکەی تردا یەکەم تەلەفۆن لە جیهاندا دروست کرا و توانرا بەناو هێڵی تەلەفۆنی یەکەمدا جیاوازی دەنگەکان بکرێت و لە سەربانی بینایەکی دوو نهۆمیەوە لەگەڵ خواردا قسەی پێ بکرێت.
لە ١٠ ی ئازاری ساڵی داهاتودا یەکەم ڕستە لە تەلەفوندا بیسترا کە دەیگوت (واتسۆن, وەرە بۆ ئێرە , کارم پێتە)

## قـــــــەوزە

زۆر جار ڕوەکێکی بچوك شێوەیەك لە بەڕەی سەوز لەسەر زەوی دروست دەکەن, زۆربەی ئەو ڕوەکانە قەوزەن. بەڵام قەوزەکان نە ڕەنگیان هەیەو نە گوڵ. بەڵکو ڕیشاڵێکیان هەیە لەسەر گڵ یان لە ناو گڵدا دەڕوێن. کە ئاو و مەوادی نا ئەندامی (کانزایی) لە گڵەوە دەمژن. هەروەها سیستەمێکی تایبەتیشی نیە بۆ گواستنەوەی ئاو لە ناو خۆیدا, وەکو چۆن لە ڕوەکە گەورەکاندا هەیە.
لەبەر ئەوە قەوزە لە شوێنی شێدارو سێبەردا دەڕوێت. هەندێك قەوزە لەسەر ئەو بەردانەش دەڕوێت کە شێیان هەیە
بەڵام کاتێك بەردەکە ئاوی نەمێنێت و ووشك بکات. قەوزەکەش ووشك دەبێتەوە , بەڵام نامرێت. کاتێکیش شێ بۆ بەردەکە دەگەڕێتەوە جارێکی تر قەوزەکەش دەبوژێتەوەو زیندوو دەبێتەوە.
سەدەها جۆر لە قەوزە هەیە, بەڵام بەناوبانگترینیان قەوزەی سپیە کە کتلەیەکی سەوز لە شێوەی ڕاخەرێك لە دەمبوس لەسەر زەویە شێدارەکان پێك دەهێنن.
قەوزەی (خپ) کە ڕەنگێکی سەوزی مەیلەو خۆڵەمێشی هەیە, لە خاکی زۆنگاوەکاندا دەڕوێت. لەگەڵ ناوی گۆماوو دەوری دەریاچەکان و دەریاچە بچوکەکاندا. گەڵاکانی خانەی زۆری تێدایەو شێوەی لە شێوەی بەرمیل دەچێت کە یارمەتی ئاو مژین و پەسیسە کردنی دەدات.
لە سەرەتای ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا , بۆ مەبەستی برین پێچی بەکار

هێنراوه هەروەها ڕاخەرێکی زۆر باشیشه بۆ ئەو حەوزانەی کە بۆق و سەمەندەر و سەمەندەلاتی تێدا دەژێت.
قەوزەی (خپ) لە قەوزەی ڕزیوو ڕوەکەکانی تر پێك دێت. کاتێکیش ووشك دەبێتەوە , لە زۆر ولأتدا وەکو سوتەمەنی بە کاری دەهێنن.

## ســــــۆبێر

هەموو زیندەوەرانی بیابان ناچار دەبن لەگەڵ کێشەی کەم ئاویدا خۆیان بگونجێنن ئەگەر ئەم کێشەیەیان بۆ چارەسەر نەکرا بێگومان دەمرن و لە ژیاندا نامێنن ڕوەکی سۆبێر بە بێ ئاو نازێت, بەلأم دەتوانێت بۆ ماوەیەکی درێژ بە بێ ئاو خۆی ڕابگرێت. ئەو ڕوەکانەی لە دۆخێکی ئاسایدا دەڕوێن ڕێژەیەکی زۆر ئاو لە دەست دەدەن. چونکە گەلأکانی ئاو لە ئاوگ ((ئەو شلەیەیە کە بە ڕەگی ڕوەکەکاندا دەڕوات و خۆراك و ئاو لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت و ئەمجا ئەو ئاوە لە هەوادا بلأو دەبێتەوە )).
ڕوەکی سۆبێری بێ گەلأ لەگەڵ ئەم کێشەیەدا دەژیت. قەدەکەی بە جۆرێکە کە ڕوبەری کەمەو هیچ شتێك لێی نایەتە دەرەوە, چونکە قەدەکەی زۆر ئەستورەو دەتوانێت ئاو لە ناویدا پەسیسە بکات. قەدەکەشی بە توێکڵێکی ئەستور داپۆشراوە کە زیاتر پارێزگاری لە مانەوەی ئاوەکە دەکات.
هەروەها دڕکەکانی سەر قەدی سۆبێر وا دەکات هیچ گیانلەبەرێك نەتوانێت دەمی بۆ بهێنێت و لە ئاوەکەی کەم کاتەوە. بەمجۆرە ڕوەکی سۆبێری گەورە دەتوانێت دوو ساڵ یان زیاتریش بە بێ ئاو بژێت. سۆبێر ڕوەکێکە گوڵ دەگرێت و بەرەکەی دەبێتە تۆو و گوڵی زۆربەی ڕوەکەکانی سۆبێر جوانن بە ڕەنگەکانی سورو زەردو ئەرخەوانی.
زیاتر لە هەزار جۆر سۆبێر هەیە کە لە ئەمریکای ناوەندو باشورو مەکسیك و بەشی باشوری ڕۆژئاوای ولأتە یەکگرتوەکاندا دەژین. ئەم ڕوەکانە جیاوازیان زۆرە, جۆرێکیان هەیە کە پێی دەوترێت((بەرەی دەمبوسەکان, کە زۆر بەرز نابێت و جۆرێکی تری زەبەلاحیشیان هەیە لە نێوان ١. بۆ ٢. مەتردا بەرز دەبێت.
ئەو شلەمەنی و ئاوەی لە ڕوەکی سۆبێردا هەیە لە دروست کردنی دەرمان و مەشروباتدا سودی لێ وەردەگیرێت. هەروەها دەتوانرێت شیرینی و ترشی زۆر خۆش لە قەدو تۆوی ئەم ڕوەکە دڕکاویە دروست بکرێت.

## نـــەهەنگ... ماســـــی نیـــــە !

نەهەنگ گیاندارێکی دەریاییە, لە زۆر ڕووەوە لە ماسی دەچێت, لەبەر ئەوەیە بە ماسی دادەنرێت. بەلاّم لە ڕاستیدا گیاندارێکی مەمکدارە.
دەڵێن لە گیاندارێکی خشۆکی گەورەوە بە ناوی دایناسور کە پێش ملیۆنەها ساڵە لەسەر زەویدا ژیاوە پەرەی سەندوە نەهەنگی شین یان ((سك گۆگردی)) بە گەورەترین گیانلەبەر دادەنرێت. کە درێژیەکەی دەگاتە٣٠ مەترو کێشیشی دەگاتە ١٢٥ تەن, پانی کلکیشی ٦ مەترەو ماسولکەکانی ٥٠ تەن و ئیسقانەکانیشی ٢٠ تەن و زمانیشی ٢,٥ تەنە. بۆچی نەهەنگ وەکو مەمکدارێك حیسابی بۆ دەکرێت نەك ماسیەك ؟
نەهەنگ وەکو مرۆڤ لە ڕێگەی سیەکانیەوە هەناسە دەدات , وەکو ماسی کەپوی نیەو لوتی لە بەشی پێشەوەی سەریەوەیەتی. نەهەنگ کاتێك لەناو ئاودایە لوتی دادەخات, کاتێکیش بیەوێت هەناسە بدات, پێنچ بۆ شەش خولەك جارێك سەری دێنێتە دەرەوەو یەکەمجار هەوای ناو لاشەی دەردەکات بە دەنگێکی گەورە کە لە شوێنێکی دورەوە دەبیسرێت. ئەمجا هەوا هەڵدەمژێت و خۆی دەکات بە ژێری ئاوەکەدا. دەتوانێت دەوروبەری ٤٥ خولەك لە ژێر ئاودا بمێنێتەوە بێ ئەوەی هەناسە بدات. هەروەها دەتوانێت تا قوڵی٦٠٠ مەتریش بچێتە ژێر ئاوەوە.
نەهەنگ دەزێت و شیر دەدات بە بێچوەکەی و تا ماوەیەکیش لە گەڵیدا دەبێت نەهەنگ دڵی هەیەو لە گیاندارە خوێن گەرمەکانە. بەلاّم لاشەی خۆی لەگەڵ ژینگەی ئاودا ڕاهێناوە. زۆر لە ئەندامانی لاشەشی لە ئەندامەکانی گیاندارە مەمکدارەکان دەچێت. هەندێکیان دانیان هەیەو هەندێکی تریان نیانە , بەلاّم ئێسقانێك لەناو دەمیدایە هێندەی لەگەنێکە.لەبەر ڕۆشنایی ئەم سیفەتانە, نەهەنگ بە گیاندارێکی مەمکدار دادەنرێت نەك ماســی.

## مـێـــش

لەسەر بنەمای زانستی زیندەوەرزانی هەرچی ئەو مێروانەی دوو باڵیان هەیە پێیان دەوترێت ((مێش)) کە سەر بە خێزانی دوباڵەکان یان جوت باڵەکانن. بە پێی ئەم پێناسەیە مێشولەو مێش دەچنە ڕیزی ئەم خێزانەوە. زانایان لێکۆڵینەوەیان لەسەر زیاتر لە ٤. هەزار جۆر مێشولەو مێشی دوباڵ کردوە.

هیچ شوێنێکی دونیا نیه مێشی دوباڵی لێ نەبێت , هەمیشەو بەهەر ڕێگەیەك بێت مرۆڤ تەنگەژە دەکەن. لەگەڵ ئەوەی دەرمانی مێش کوژ زۆر یارمەتی کەمکردنەوەیان دەدات.

بەڵام هێندە زۆرن وای لێهاتوە مەترسیەك دروست بکەن بۆ سەر مرۆڤ. لەو مێشولە دوبالانە مێشی مالیە کە زۆر بەر بلاون و یەکێکە لە گەورەترین دوژمنەکانمان. لەبەر ئەوەی جۆرەها میکرۆبمان بۆ دەگوێزێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. نەخۆشیەکانی وەکو گرانەتا, سك چون, دیزانتەری , کۆلێرا, سیل و هیتریش بلاودەکەنەوە. ئەم نەخۆشیانە سالانە ملیۆنەها کەس لە جیهاندا لەناو دەبەن. ((مێشی بەدرەفتار )) لە ئوسترالیا خوێنی مێشەکانی تر دەمژێت و لەسەری دەژێت. مێشی نەخۆشی خەوتن کەلە ئەفریقیادا دەژێت, نەخۆشی خەوتن دەگوێزێتەوە.

مێشی مۆرانە کە زۆر بچوکە, دەتوانێت بچێتە هێلانەی مێشولەوەو ئەویش لەسەر خوێنی مرۆڤ دەژێت. خەرەنگەز کە سەرێکی سەوزی هەیە, پێوەدانی زۆر بە ئازارە. مێشەنگیش لە هەمان خێزانە, کە بە مژینی شیلەی گولان هەنگوین دروست دەکات. بەلام کاتێك بە مرۆڤەوە دەدات ئازاری زۆرو ئاوسانی بۆ دروست دەکات.

مرۆڤ هەولی زۆری داوە لە مێش ڕزگاری ببێت, زۆر دەرمانی لەناوبەری مێروەکان دروست کراوەو لەمەودواش دروست دەکرێت. ئەگەر سەرکەوتین لە کەمکردنەوەیان ئەوا دەتوانین بەرگری لە زۆر نەخۆشی بکەین.

## دادگـــای دادی نێو دەوڵەتی

دادگای دادی نێو دەولەتی, دەسەلاتی قەزایی سەرەکی نەتەوە یەکگرتوەکانە. کەلە دوای جەنگی جیهانی دوەم دامەزراوە. بارەگای سەرەکی ئەم دادگایە لە شاری لاهای هۆلەندایە. بەلام دەتوانێت لە هەر شوێنێکی تری دونیادادانیشتنی خۆی بکات. یەکەم کۆبونەوەشی لە شاری لاهایدا بوو لە نیسانی ١٩٤٦ دا.

دادگای نێو دەولەتی کار دەکات بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نێوان ولاتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتوەکان. ئەم دادگایە لە پانزە قازی پێك هاتوەو بە پێی دەستور هیچ ولاتێك مافی نیە لە یەك قازی زیاتری لەو دادگایەدا هەبێت. قازیەکان کۆمەلەی گشتی و ئەنجومەنی ئاسایش هەلدەبژێرن, بۆ ماوەی نۆ سال و

بۆیانیش هەیە جارێکی ترخۆیان کاندید کەنەوە. ئەو قازیانەن نوێنەرایەتی هەموو کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی دەکەن.زمانی ڕەسمی دادگا هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیەو هەر لایەنێك دەتوانێت هەر کام لەو دوو زمانە بەکار بهێنێت لە کاتی دادگایی و قسە کردندا. دەستەی ئەم دادگایە زۆر سەربەخۆن و خۆیان سەرۆك و جێگرەکەی هەڵدەبژێرن لەگەڵ تۆمارکەر (المسجل) و بەر پرسان و نوسەراندا. مەرجە سەرۆکی دادگاو تۆمارکەر لە لاهای نیشتەجێ بن.

## هـــەڵاویســـــان

لە بنەڕەتدا هەڵاویسان واتا ڕودانی زیاتر لە خستنە ڕوی دراودا, یان دەخل یان نرخدا. کاتێك هەڵاویسان دروست دەبێت خەڵکی پارەی زیاتر خەرج دەکەن, کەلە بەرهەمی کاڵاکان خێراترە. هێزی کڕین لای دراوەکە کەمتر دەبێتەوەو ئەمەش کاریگەریەکی سلبی لەسەر ئابوری وڵاتان دروست دەکات.

ئایا دەزانن هۆیەکانی هەڵاویسان چین ؟

هەڵاویسان گەلێك هۆکاری هەیە, کاتێك بەرهەمی هەر وڵاتێك دادەبەزێت و داواکردن وەکو خۆی دەمێنێتەوە, نرخی کاڵاکان بەرز دەبنەوە, لەو بارودۆخەدا خەڵکی شتی زیاتر دەکڕن لە ترسی بەرزبونەوەی زیاتری نرخ. ئاو لەو کاتانەدا خەڵکی شت کڕین کەم بکەنەوە,دەشێت هەندێك لە هەڵاویسان کەم بکەنەوە. بەڵام ئاستەمە بتوانرێت وا لە خەڵکی بکرێت بەو ئیشە هەستن, ئەمەش دۆخەکە بەرەو بازنەیەکی داخراو دەبات. هەرچەندە لەو حاڵەتەدا بازرگانەکان قازانجی زیاتریان دەست دەکەوێت بەڵام زۆربەی خەڵکی زەرەرمەند دەبن.

مانگرتن و شڵۆقی و پاشا گەردانی پیشەسازی بەرپرسە لە هەڵاویسان بە هۆی مانگرتنەوە بەرهەم کەم دەبێت و نرخی بازاڕ بە خێرایی بەرز دەبێتەوە. هەروەها زۆربونی پارەش لە بازاڕدا دەبێتە هۆی هەڵاویسان ئەوانەی پاشەکەوت دەکەن و قەرزارەکان و کرێکاران و موچەخۆران زیاتر لە گشت چینێکی تر بە دەستی هەڵاویسانەوە دەناڵێنن. حکومەتەکانی ئێستا هەوڵ دەدەن هۆیەکانی هەڵاویسان بزانن و چارەسەری بکەن, بەڵام ئەگەر هۆیە سەرەکیەکەی تێ نەگەن و بە شێوەیەکی گونجاو چارەسەری نەکەن دەشێت دۆخەکە بەرەو ئاڵۆزتر ببەن.

## ئاسـکی مسـك

ئاسكەكان لەناو ئاژەلاّندا سەر بە خێزانێكن پێیان دەوترێت ((گروپی ئاسكەكان)) كەلە مەمكدارەكانن. تا ئێستا شەست جۆر ئاسك تۆمار كراوەو، كە یەكێك لەو شەست جۆرە مسك بەرهەم دەهێنێت و پێی دەوترێت ((ئاسكی مسك))
ئاسكی مسك ئاژەڵێكی بچوكی دورە پەرێزی شەرمنە. لە ناوچە شاخاویەكانی نێوان سیبیریا و هملایادا دەژێت. دوو گوێی گەورەو كلكێكی كورتی پێوەیە.
بە پێچەوانەی ئاسكەكانی ترەوە شاخی نیە. بەرزیەكەی ٥٠ بۆ ٦٠ سانتیمەترە. نێرەكانیان درێژو تیژە مسك بۆنێكی خۆشی بەهێزی هەیە. كە لە گیرفانەكانی ناو كیفی ژێر پێستی سكی دەست دەكەوێت. مسكی تازە لە شێوەیدا لە شلە دەچێت، بەلاّم كە ووشك بوەوە وەكو ئاردی گەنمی لێدێت.
مسك لە سابون و بۆندا بەكاردێت و بۆنێكی خۆشی هەیە. لە ئەمڕۆدا مسكی كیمیاوی دروست دەكرێت و لە پیشەسازی بۆندا بەكار دەهێنرێت.

## پشـیلەی ڕەش

ملیۆنەها كەس لە سەرانسەری دونیادا پشیلەی ڕەش بە شوم دادەنێن.
ئایا دەزانن پشیلە بە گشتی و پشیلەی ڕەش بە تایبەتی بۆچی بەشوم دادەنرێت؟ ئەم بیروبۆچونە لە خورافات زیاتر هیچی تر نیەو بیرۆكەكەی دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا كاتێك میسریە كۆنەكان پشیلەیان دەپەرست.
خواوەندێكیان هەبو بە ناوی ((پاشت)) كە سەری، سەری پشیلە بوو.بڕوایان وابو ئەم خواوەندەیان نۆ گیانی تێدایە بۆیە كاتێك پشیلەیەك لە میسردا دەمرد لاشەكەیان مۆمیا دەكرد.
لە گۆڕستانێكی میسردا پاشماوەی هەزاران پشیلەی ڕەش دۆزرایەوە. لەو سەردەمەدا كوشتنی پشیلە تاوانێك بو سزاكەی مردن بو، بۆیە خەڵكی زۆر لە پشیلەی ڕەش دەترسان. لە چاخەكانی ناوەڕاستدا جادو گەران و پزیشكان لە كەللە سەری پشیلەی ڕەش دەرمانێكی زۆر ئاڵۆزیان دروست دەكرد. لەبەر ئەوە خەڵكی بیریان دەكردەوە كە پشیلەی ڕەش خراپە. چەندین سەدەیە تا ئێستاش خەڵكی كێشەیان هەیە بە دەستی ئەو خورافاتەوە. بەلاّم لە ڕاستیدا پشیلە نە خراپەو نە بەختی خراپیش بۆ مرۆڤ دەهێنێت. پێنج هەزار ساڵێكیش دەبێت

پشیله ماڵی کراوه.

## وشـــــتر مـــورخ

وشتر مورخ باڵندەیەکی سەیرەو تەنانەت دەتوانێت بەردیش بخوات. لەوەش زیاتر دەتوانێت پارچە ئاسنێك و زۆر لە هاو شێوەی ئەو مەوادانە بخوات, سەبارەت بە خواردنی وشترمورخ باڵندەیەکی زۆر چڵێسەو خواردنی سەرەکی‌ی ڕوەك و تۆو و بەرهەمە ناودارەکانی وەکو ترێ و تەماتە و مۆزە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاسن و بەرد دەخوات و تەنانەت ئەوانەی دەیخوات هەرسیشی دەکات !

وشترمورخ گەورەترین باڵندەیە لە جیهانداو بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئەفریقیادا هەن و کێشی هەر یەکێکیان دەگاتە ١٣٠ کیلۆگرام و درێژییەکەشی دەگاتە ٢,٥ مەتر, دوو باڵی هەیە, بەلاّم ناتوانێت پێیان بفڕێت. باڵەکانی یارمەتی دەدەن بۆ پارسەنگ ڕاگرتنی لاشەی لەکاتی ڕاکردندا. دو قاچی درێژی هەیەو لە هەر قاچێکیدا دو پەنجە زیاتری نیە. پەڕێکی تەنکیش لەسەر سەرو ملی هەیە. پەڕی وشترمورخی نێرە ڕەش یان قاوەییەکی تێرەو هەردوو قاچیشی سپیە. بەلاّم پەڕی وشترمورخی مێ ڕەنگەکانی تاریکەو لە نێرەش بچوکترە.

لە نێوان باڵندەکاندا وشترمورخ گەورەترین هێلکە دادەنێت. کە درێژییەکەی لە نێوان ١٥ بۆ ١٨ سانتیمەترو تیرەکەی لە نێوان ١٢ بۆ ١٥ سانتیمەتردایە. سێ تا چوار وشترمورخ پێکەوە چاڵێك هەڵدەکەنن و هێلکەکەی تێ دەخەن و بە نۆرە لەسەری دادەنیشن, بەلاّم نێرەکان تەنها بەشەو لە سەری دادەنیشن. بە پێچەوانەی زۆر لە گیاندارانی ترەوە, دەنگی وشترمورخ هیچ خۆش نیەو لە دەنگێکی بەتاڵ زیاتر هیچی تر دەرناکات. کاتێك نێرو مێ بەیەك دەگەن, نێرەکان دەنگێکی وا دەردەکەن دەشێت لە شوێنێکی دورەوە ببیسرێت.

لەگەڵ ئەوەی پەڕی وشترمورخ زۆر جوانە بەلاّم بە ئاسانی دەوەرێت و ئەویش هیچ پێی ناڕەحەت نابێت بە وەرین و ڕوتانەوەی پەڕەکانی, لەبەر ئەوە پەڕی تازە دەردێنێتەوە.

وشترمورخ خێراترین باڵندەیە لە ڕۆیشتندا کە خێراییەکەی دەگاتە ٨٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا. لە کاتێکدا دەتوانێت یەك کیلۆمەتر بە هەمان خێرایی و بەبێ وەستان ببڕێت.

## دەرهێنانی دەرمان لە ئاژەڵان

زانایان لێکوڵینەوەیان لەسەر هەشت ملیۆن جۆر لە ئاژەڵ کردوە. لەم ئاژەڵانە شتی زۆر بەسودمان دەست دەکەوێت وەك گۆشت، هێلکە، شیر، پێستەو... هیتریش.

سەرەڕای ئەو مەوادانە، زۆر جۆری دەرمانیشمان دەست دەکەوێت لەو ئاژەڵانەوە کەلە چارەسەرکردنی نەخۆشیە جۆراوجۆرەکاندا بەکاردەهێنرێت.

ئایا دەزانن ئەو دەرمانانە چین کەلە ئاژەڵان دەردەهێنرێت ؟

زۆربەی دەرمانە هۆرمۆنیەکان لە ئاژەڵان دەردەهێنرێن. بۆ نموونە ئەدرینالین، کە دەرمانێکی بە بلوربوی سپیەو هۆرمۆنی کەزەرینی (بەزو چەوری سەر گورچیلە) ی تێدایەو لوی کەزەری سەر گورچیلە دەیرژێنێت و لە چارەسەرکردنی دڵدا بەکار دێت. ئەم ئەدرینالینە لە لوە کەزەریەکانی ئاژەڵان و بەرازەوە دەردەهێنرێت و لە ساڵی ١٩٠٤ دا دۆزراوەتەوەو بۆ چارەسەری نەخۆشی تەنگە نەفەسیش بەکار دێت.

دەرەقین دەرمانێکە لە لوە دەرەقیەکانی پشیلە دەردەهێنرێت و بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی پەیوەند بە لوە دەرەقیەکانەوە بەکار دەهێنرێت. بەڵام ئەنسوڵین کە دەرمانێکی ناسراوە لە چارەسەرکردنی نەخۆشی شەکرەدا. لە پەنکریاسی پشیلەو بەرازەوە دەردەهێنرێت.

هۆرمۆناتی جنسیش لە زۆربەی ئاژەڵان دەردەهێنرێت بۆ چارەسەری زۆر لە نەخۆشیە جنسیەکانی ژنان و پیاوان بەکار دەهێنرێت. زۆرێك لە پلازمای خوێنەکانیش بۆ زۆر لە نەخۆشیەکان، لە ئاژەڵانەوە، وەردەگیرێن وەکو پلازمای ئیفلیجی منداڵان، کە ڤایرۆسەکەی لە گورچیلەی ورچەوە وەردەگیرێت. سەرەڕای ئەم دەرمانانە ئاژەڵان لە زانستە پزیشکیەکاندا سودمان پێ دەگەیەنن.

تاقیکردنەوەی سەرکەوتنی دەرمانەکان یەکەمجار لەسەر ئاژەڵان ئەنجام دەدرێن. ئەگەر سەرکەوتو بوو ئەمجا بۆ مرۆڤەکان بەکار دەهێنرێن لە ماوەی توێکاری ئاژەڵە جۆراوجۆرەکاندا خوێندکارانی زیندەوەرزانی زۆر شت لەسەر ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ فێر دەبن. لە ماوەی لێکوڵینەوە لەسەر ئاژەڵان زانیاری زۆری دەست خستوین تا تەحەکوم بە زۆر لە جۆرەکانی ڤایرۆس و بەکتریاوە بکەین.

مرۆڤ لە ماوەی لێکوڵینەوەی لەسەر ئاژەڵان زۆر نەخۆشیی وەکو هاری،

ئاوڵە,مەلاریا, گرانەتا و باڵەشۆڕە(خانوق)
نەخۆشیەکە توشی باڵندە دەبێت دۆزیەوە. سەرەڕای ئەم دەرمانانە مرۆڤ زۆر شتی تری وەکو ئاوریشم, کەتیرە, مرواری لە ئاژەڵانەوە دەست دەکەوێت.

## بۆچی ئاو و ڕۆن تێکەڵ نابن ؟

لەناو شلەمەنیەکاندا, ئاو زۆرترین بەکارهێنانی هەیە. مەوادەکانی وەکو خوێ و شەکر زۆر بە خێرایی لە ئاودا دەتوێنەوە. بەڵام ڕۆن و چەوری و زۆر لە مەوادە ئەندامیەکان لە ئاودا ناتوێنەوە. ئایا دەزانن لەبەر چی ؟
بە پێی یاسا زانستیەکان هەموو شتێك هاوشێوەی خۆی دەتوێنێتەوە. بەواتا ئەو مەوادانەی کە هەمان شێوە گەردیلە یان هەیە. تێکەڵە دروست دەکەن.
هەر مادەیەك بۆ ئەوەی مادەیەکی تر بتوێنێتەوە. دەبێت توانای هەبێت ئەلکترۆستاتیەکە,لەگەڵ گەردیلەکانی ئاوەکەدا کۆ بکاتەوە.
گەردیلەکانی ئاو جەمسەرین,بەواتا لایەکی گەردیلەی ئاو بارگەی موجەبی هەڵگرتوەو لایەکەی تریش بارگەی سالب کاتێك گەردیلەکانی مادەیەکی وەکو خوێ (کلۆریدی سۆدیۆم ) دەکرێتە ناو ئاوەوە, تایبەتیەکی ئایۆنی یان جەمسەری هەیەو تیایدا دەتوێتەوە. چونکە گەردیلەکانی ئاوە جەمسەریەکە دەچێت بۆ لای سۆدیۆمەکە کە بە کارەبا بارگە کراوە. لەگەڵ ئایۆنی کلۆریدەکەدا شێوە هێشویەك بە دەوریدا دروست دەکەن.
کە ڕاکێشانی سۆدیۆم و کلۆرەکە بۆ لای یەکتری کەم دەبێتەوە. لە یەك جیا دەبنەوەو بەشێوەی تێکەڵەیەك لە ئاوەکەدا دابەش دەبن.
گەردیلەکانی ڕۆن بۆیە لەناو ئاودا ناتوێنەوە چونکە پەیوەندی گەردیلەکانی ڕۆن جیاوازە لە پەیوەندی گەردیلەکانی ئاو. چونکە گەردیلەکانی ئاو گەورەترو زۆرترن لە گەردیلەکانی ڕۆن. لەبەر ئەوەی هێزی ڕاکێشان لە نێوان ئاو و ڕۆندا زۆر کەمە, بۆیە ڕۆن لەسەر ئاو دەوەستێت. بەوەش گەردیلەکانی ڕۆن و چەوری لە ئاودا ناتوێنەوە.

## بۆچی ڕەنگی بەفر سـپیە ؟

بەفر ئاوێکی بەستوە. کاتێك هەڵمی ئاو لە کەشدا دەرچێت بەفر دروست دەبێت. هەڵمی ئاو کاتێك دەیبەستێت کریستاڵی گەورەو ڕون دروست دەکات. ڕەوتی

هەواش ئەو کریستالانە بە کەشدا پەرش و بلاو دەکاتەوە و دەست بە بەرزبونەوەو نزم بونەوە دەکەن بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین کریستاڵ.

کاتێك کۆمەڵێك کریستاڵ یەکدەگرن و دەبنە بەفرێکی قەبارە گەورە تا ئەو ئەندازەیەی کە بەس بێت بۆ دابەزین, لە شێوەی کلوە بەفردا دادەبەزێت بۆ سەر زەوی.

کلوە بەفر شێوازی جۆراوجۆری زۆرە. بەلام بە زۆری لە شێوەی ئەستێرە یان شەش پەڕەدایە. لە هەمو سەیرتر دو کلوە بەفر نیە لە دونیادا بە تەواوی لە یەك بچن. کاتێك تیشکی ڕۆژ دەکەوێتە سەر کلوە بەفرە بلور بوەکە زۆر لایەنی کریستاڵەکان پێچەوانە دەکاتەوە. لە ئەنجامی ئەو پێچەوانە کردنەوەیەدا ڕەنگی بەفر سپی دێتە پێش چاومان ئەو بەفرانەی لە بازاڕدا دەفرۆشرێن لەبەر ئەوەی ڕێژەیەکی زۆر ئاوی تێدایە, بۆیە پێکهاتەی کریستاڵی نیەو سروشتی شکانەوە تیایدا زۆر جیاوازە. بەو هۆیەیە ئەو بەفرە ڕەنگی نیەو شەفافە.

بەفری چیاکان سەرچاوەیەکی گرنگن بۆ ئاوی ڕوبارەکان.

بەفرە بەسەر یەکا کەوتوەکانیش زەوی لە مانگە سەختەکانی وەرزی زستان دەپارێزێت. بەفری تازە باریویش نزیکەی ٩٥٪ ی گەرمای خۆر دوبارە پێچەوانە دەکاتەوە بۆ ئاسمان. ئەمەش یەکێکە لە هۆیەکانی دابەزینی پلەی گەرما لە زۆربەی شەوانی زستاندا.

## ناوچە جەمســـەریەکان

هەردو بەشی باکورو باشوری گۆی زەوی بە هەردوو جەمسەری باکورو باشور دەناسرێن. هەندێك خەڵکی ئاسایی لایان وایە ئەم دو جەمسەرە وەکو یەك وان, بەلام ئەمە شتێکی دروست نیە. سەرەڕای بونی زانیاری زۆر کەلەسەر ئەم دو جەمسەرە دەستکەوتوە بەلام ئەم دو ناوچەیە تا ئێستاش نهێنیەکی گەورەن بە نیسبەت زانایانەوە

ناوچەی جەمسەری باکوری پێکهاتوە لە زەریای بەستەڵەکی باکوری کە بەشێك لە ئەمریکای باکورو ئوروپاو ئاسیا دەکەوێتە سەری. شەش مانگ بەردەوام ڕۆژی تیادا ئاوا نابێت و شەش مانگەکەی تریش لە ساڵەکەدا لە تاریکی تەواودا بەسەر دەبات.

لەم ناوچەیەدا ڕەوتە هەواییەکان, لە ئاوی زەریاکان بەرز دەبنەوەو نەختێك پلەی

گەرما بەرز دەکەنەوە. پلەی گەرماش تیایدا ٣٥ پلەی ژێر سفرو ١٠پلەی سەدیدایە.

دەشێت هەندێك گیانلەبەرو ڕوەك لەو پلەی گەرمایەدا بژین. ناوچەی جەمسەری باکور ئاوەدانەو بەو خەڵکانەش لەو ناوچەیەدا دەژین دەوترێت ( خەڵکی ئەسکیمۆ ). بەڵام ناوچەی جەمسەری باشور زۆر ساردەو زۆربەی بە بەفر داپۆشراوە و ساردترین شوێنی سەر ڕوی زەویە. ئەو ناوچەیەی بەفر داپیۆشیوە نزیکەی دو ئەوەندەی ڕوبەری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە.

لە وەرزی زستانیشدا پلەی گەرما تیایدا لە نێوان ٧٥ پلەی ژێر سفرو ٤٠ پلەی ژێر سفردایە. تەنانەت لە هاوینیشدا پلەی گەرما تیایدا لەژێر سفرەوەیە.

بەتریق بەناوبانگترین باڵداری ئەم ناوچەیەیە. هەروەها هەندێك مێروی تریش دەتوانن تیایدا بژین. خۆر شەش مانگ لەسەر یەك تیایدا هەڵدێت و شەش مانگەکەی تریشی تاریکستانە. هیچ کەسێك لەم ناوچەیەدا ناژێت و ڕوەکیش تیایدا دەگمەنە. جگە لە ڕوەکی ئەشنە و قەوزە و هەندێك گژوگیای تر نەبێت.

زانایان لە سەرانسەری جیهاندا هەوڵ دەدەن ناوچەی جەمسەری باشور بدۆزنەوە. هەندێك پاشماوە کە دەست کەوتون, دەیسەلمێنن ئەم ناوچەیە سەردەمانێك گەرم بوەو ڕوەکی لێ ڕواوە. بەڵام تا ئێستا نازانرێت چۆن ئەو گۆڕانە سەرسوڕهێنەرەی بەسەردا هاتووە.

## ئایا تەماتە میوەیە یان سەوزە ؟

بۆ ئەوانەی کە دەیخۆن زۆر گرنگ نیە تەماتە سەوزەیە یان میوە. بەڵام زۆربەی خەڵك لە وڵاتانی عەرەبیدا تەماتە بە سەوزە دەزانن. دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتوەکان, ڕۆژێك لەڕۆژان ناچاربو سەیری قەزیەیەك بکات کە ئایا تەماتە میوەیە یان سەوزە !

زانستی ڕوەك، تەماتە بەمیوە دادەنێت و هیچ دوودڵیەك لەوەدانیە. بەڵام تەماتە بە شلەو تەپسیو کاڵیو زۆرجۆری تر وەکو چێشت بەکاردەهێنرێتو یەکێکە لەخواردنە سەرەکیەکانی مرۆڤ. لەبەر ئەوە بۆ چەند مەبەستێك کە پەیوەندی بە بازرگانیەوە هەبو , دادگای باڵای ئەمریکا لەساڵی ١٨٣٩ دا بڕیاری دا تەماتە لە ڕیزی سەوزەدا دابنرێت.

تەماتە لە پیرۆو ئەکوادۆرو بۆلیڤیادا هەبوە , بە ماوەیەکی زۆر بەر لە ڕۆیشتنی

كۆلۆمپس بۆ دونیای نوێ‌و كشتی تەماتە لە مەكسیكدا زۆر پێشكەوتوبوەو تەماتەی مەكسیكی یەكەمین جۆری تەماتە بوە كە خەڵكی ئوروپا چاویان پێ كەوتبێت.

یەكەمین باسكردنی تەماتە لەكیشوەرەكانی ئوروپادا لە ئیتاڵیادا بوەو لەساڵی ١٥٥٤دا ناوی (سێوی زێرینیان) لێناوە. بەمەشدا وادیارە تەماتەی زەرد یەكەمین جۆری تەماتەبوە كە ئوروپا ناسیبێتی.

پێش كۆتایی سەدەی شازدەهەم لەوڵاتەكانی بەریتانیاو فەرەنساو وڵاتانی تری ئوروپای ناوەندیدا تەماتە كشت كراوە. بەڵام وەكو جۆرێك لە كەمالیات لە باخچەكاندا دەڕوێنرا، نەك بۆ خواردن.

لەنیوەی سەدەی هەژدەهەمدابو خەڵكی لەچەند وڵاتێكی ئوروپادا تەماتەیان وەكو خواردن بەكارهێنا. " تۆماس جێڤەرسۆن " یەكەم كەس بو لە ئەمریكادا و لەساڵی ١٧٨١ دا تەماتەی كشت كرد. بەڵام زۆرێك لەخەڵكی بڕوایان وابو كە خواردنێكی ژەهراویەو تا كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم تەماتە نەبوە خواردنێكی میللی.

تەماتەو توتن‌و پەتاتە سەر بەیەك خێزانن‌و پێویستیان بەماوەیەكی زۆر لەكات هەیە تا دێنە بەرهەم , لەگەڵ زەویەكی نەرمی بەپیتداو دەبێت ئاوی باشیش بدرێت. لە مەكسیك و وڵاتەیەكگرتوەكانداو بەتایبەت لەهەردو ویلایەتی تكساس‌و فلۆریدا دا لە زستاندا لەژێر لایلۆندا كشت دەكرێت.

تەماتەی زستانەی (چاڵاییەكانی ڕوباری ئەردەنیش ) زۆر بەناوبانگە. هەندێك جار تەماتە بە سەوزی لێ دەكرێتەوە و تا دەگاتە بازاڕ سور دەبێت و پێ دەگات.

## سكۆتلاند یارد چی یە ؟

بێگومان ئەوانەی چیرۆكی پۆلیسی دەخوێننەوە یان دەچنە سینەما یان سەیری تەلەفزیۆن دەكەن , وشەی سكۆتلاندیاردیان بیستوە.

"سكۆتلاندیارد " بارەگای سەركردایەتی هێزی پۆلیسی پایتەختی بەریتانیایە , كە گەورەترین هێزی پۆلیسە لە بەریتانیاداو نزیكەی ٢٧ هەزار پۆلیس‌و ئەفسەر لەخۆدەگرێت كە بەرپرسن لەناوچەیەك پانتاییەكەی نزیكەی (٧٨٧) میلی دوجایەو نزیكەی حەوت ملیۆن كەس لەناوچەی لەندەنی گەورەدا دەكەوێتە سنوری دەسەڵاتیانەوە.

جگه له دابین کردنی پیاوانی پۆلیس وهەواڵ نێران بۆ ناوچەی پایتەختی گەورەی بەریتانیا , سکۆتلاندیارد زۆر خزمەت گوزاری تریش پێشکەش دەکات وەکو ڕێکخستنی هاتوچۆی ناوشارو پێدانی مۆڵەتی شۆفێری و چاودێری کردنی ئۆتۆمبیله بارهەڵگرەکان و پاسه نەفەربەرەکان و شۆفێرەکانیان و بەشداری کردن له بەرگری شارستانیداو گەڕان بەشوێن شته ونبوەکاندا و پاراستنی تۆمارەکانی تاوانەکانی سەرانسەری بەریتانیا. بەڵام لەکاری تاوانەکانی دەرەوەی لەندەندا دەست وەرنادات. ئەگەر هێزەکانی پۆلیسی هەرێمەکان داوایان لێ نەکەن.

مێژوی سکۆتلاندیارد شتی زۆر خۆشی تێدایه. پێش نزیکەی هەزارساڵ ئادگاری پادشای بەریتانیا , پارچه زەویەکی بەخشیه کنیت ی پادشای سکۆتلاندا لەنزیکی کۆشکی ویستمنستر له لەندەن , ئادگار داوای له کنیت کرد کۆشکێك لەسەر ئەو زەویه دروست بکاتو ساڵانه سەردانی بکات بۆ ڕاگەیاندنی وەلاء بۆ پادشای بەریتانیا.

شا کنیت لەو شوێنەدا کۆشکێکی دروست کردو هەر که سەردانی لەندەنی دەکرد لەوێدا دەحەوایەوە. ئەم کۆشکه بو به موڵکی پادشای سکۆتلانداو خەڵکی لەندەن ناوی "سکۆتلاندیان " پێوەنا. که لەساڵی ١٦٠٣ دا شازاده ئەلیزابیشی پادشای بەریتانیا کۆچی دوایی کرد. شا جیمسی شەشەمی پادشای سکۆتلاندا بو به پادشای بەریتانیا و ئیتر سکۆتلاندا بەناوی جیمسی شەشەمەوه مانایەکی نەبو.

لەبەرئەوە " سکۆتلاند یارد " دابەش کرا بۆ دووبەش , بەشێکی بەناوی "گریت سکۆتلاند یارد " و دوەمیشی بەناوی " میدڵ سکۆتلاند یارد " ەوه ناونران که هەردو بەشەکە وەکو دوبینای حکومی بەکارهێنران.

## ئایا گیاندارانیش هەستی چێژ وەرگرتنیان هەیه ؟

هەستی چێژ وەرگرتن سەرچاوەی خۆشیەکی زۆره بۆ هەموومان. کەواته چی وادەکات بتوانین چێژ لەو خواردنه وەربگرین که دەیخۆین. هەستی چێژ وەرگرتن تەنها ئیشی ئەوەنیه خۆشی بخاته دڵمانەوه , بەڵکو زۆرجار دەمانپارێزێت لەو خواردنانەی زیانیان هەیه بۆمان.

کەواته کردازی چێژ وەرگرتن چی یه ؟

توانای هەست کردنه به کاریگەری گەردیلەو گەردیلۆکەکان , بەواتا گەردیله جوڵاوەکان دەمارەکانی هەستی چێژ وەرگرتن دەوروژێنن , بەپێی ئەو نامەیەی

وەری دەگرین دەزانین چێژی ئەو خۆراکە چۆنە. تەنیا دەتوانین چێژ لەو مەوادە شیتەڵ بوانە وەربگرین کە گەردیلەکانی بە ئازادی دەسوڕێنەوە بۆ نمونە : پارچە شوشەیەك لەبەرئەوەی گەردیلەکانی ناسوڕێنەوە هیچ تامو چێژێکی نیە.

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە مەوادە گەرمەکان چێژیان لەمەوادە ساردەکان زیاترە یەکەم شت کە هەست دەکات بە چێژکردن سەری زمانەکە لە واقعدا بریتییە لە دەمارێك لەشێوەی گۆمەمکدا ، کە توانایەکی تایبەتی هەیە لە وەرگرتنی هەستێکی دیاریکراودا کە پێی دەڵێن "چێژ".

گۆمەمکی چێژ لەسەر زمانی هەریەك لە مرۆڤ و ئاژەڵە ڕاقیەکاندا هەیە کە بەپێی جۆری ئاژەڵەکەو پێویستی بۆ چێژوەرگرتن ژمارەی گۆمەمکەکانی دەگۆڕێن. بۆ نمونە : مرۆڤ چێژوەرگرێکی مام ناوەندیەو ژمارەی گۆمەمکەکانی چێژ لەسەر زمانی نزیکەی ٣٠٠٠ گۆمەمکە. بەلآم نەهەنگ کە بەیەکجار برێك ماسی لوش دەدات بەبێ ئەوەی بیان جوێت گۆمەمکی چێژ لایدا زۆر کەمە یان هەر نیە.

بەلآم بەراز زۆر لە مرۆڤ زیاتر چێژ وەرگرەو نزیکەی ٥٥٠٠ گۆمەمکی چێژ وەرگرتنی هەیە. مانگاش ٣٥٠٠٠ گۆمەمکی هەیە ئاسکیش نزیکەی ٥٠ هەزار. بەمجۆرە دەبینین گیانداران نەك هەر هەستی چێژ وەرگرتنیان هەیە بەڵکو لە مرۆڤیش زیاترە.

ئەو گیاندارانەی لەدەریادا دەژین گۆمەمکی چێژ بەهەمو لاشەیاندا بلآوبۆتەوە بۆ نمونە لەهەمو لاشەی چێژ وەردەگرێت ، تەنانەت لە کلکیشی. گیاندارە فڕیوو بەپولەکانیش بە قاچیان چێژ وەردەگرن ، کاتێك قاچی پەپولەیەك بەر شتێکی شیرین دەکەوێت زۆر بەخێرایی لمۆزی دا دەزێنێت و دەیمژێت.

مارو بزن مژەکان بۆ چێژ وەرگرتن زمانیان بەکاردەهێنن بەلآم بەو شێوەیەی لای مرۆڤ هەیە. لای زمانیان درێژدەکەنەوەو گەردیلەکانی دەگرنو دەیگەرێننەوە بۆلای ئەندامێکی تایبەت کە لە مەلآشوی دەمیدایەو ئەویش بۆنی دەکاتو چێژی لێ وەردەگرێت !

## سوریژە چی یە ؟

سورێژە نەخۆشیەکە توشی گشت کەسێك دەبێت لەسەرانسەری دونیادا ، ئەم نەخۆشیە لەولآتێکی دیاریکراودا سەری هەڵنەداوە. سورێژەی ئەڵمانی زۆر جیاوازە لەگەڵ سورێژەی ڕاستەقینەداو کاریگەریەکەی جیاوازی هەیە لەسەر

لاشه.

سورێژه نەخۆشیەکی منداڵانەیە بەڵام گەورەکانیشی دەشێت توشی بن ئەگەر بەمنداڵی نەیانگرتبێت. ئەم نەخۆشیە هۆکارەکەی ڤایرۆسێکە کە بریتی یە لە میکرۆبێکی زیندوی زۆر بچوك بەجۆرێك کەبەهۆی میکرۆسکۆبی ئاساییشەوە نابینرێت.

سورێژه نەخۆشیەکی درمیەو لەڕێگەی کۆکین‌و پژمینەوە زۆر بەئاسانی بڵاودەبێتەوە ، هەروەها بە بەیەکگەیشتنیش لەگەڵ ئەو کەسەی ڤایرۆسەکەی هەڵگرتوە ، بەڵام هێشتا نەخۆش نەکەوتوە. هۆی ئەوەی بۆچی گەورەکان توشی سورێژه نابن ، ئەوەیە زۆربەیان بەمنداڵی گرتویانە ، ئەم نەخۆشیەش مرۆڤ تەنها یەك جار لەژیانیدا دەیگرێت.

دوای ١٠-١٢ ڕۆژ لە وەرگرتنی ڤایرۆسەکە خاڵی سور لە گەروو دەمدا بەدەر دەکەون‌و پلەی گەرمای لەش بەرز دەبێتەوەو ئاو بە لوتەوە ناوەستێت‌و توشبو دەست بە کۆکین دەکات‌و ئاوسانی "سپێنە"ی هەردووچاو و هەستیاری هەردو چاو لەبەرامبەر تیشکدا لە نیشانەکانی سورێژەیە. لەپڕدا پلەی گەرمای نەخۆشەکە دادەبەزێت‌و لەگەڵ داپۆشرانی لاشەی بە مێکوتەی سور منداڵەکە هەست بە چاکبونەوە دەکات. هەندێك جار ڕودەدات کە میکرۆبی تر هێرش دەکەنە سەر هەردوو گوێ‌و سیەکانی نەخۆشەکە. ئەمەیان زۆر لە سورێژەکە مەترسیدارترە بۆ سەر منداڵەکە.

ئەم درمە لەشارە گەورەکاندا هەردوساڵ یان چوارساڵ جارێك سەرهەڵدەدات‌و کاتێك بڵاودەبێتەوە زۆربەی ئەو منداڵانەی توشی سورێژه نەبونە دەیگرن. ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لەپانزە مانگ کەمتر بێت ، ئەگەر دایکیان گرتبێتی ئەوا خۆیان نایگرن. بەزۆری ئەم نەخۆشیە لەوەرزی بەهاردا بڵاودەبێتەوە. هیچ چارەسەرێکی تایبەتی بۆ سورێژه نیە. بەڵام دەشێت توشبو دەرمانێك وەرگرێت بۆ بێ هێزکردنی درمەکە. ئەوەی منداڵی توشبو بە سورێژه پێویستی پێ دەبێت ، زۆر حەوانەوەو هێشتنەوەی لەژورێکی تاریکدایە.

## کێ دۆزیەوە چۆن شتەکان کێشانە دەکرێت ؟

ئەمرۆ کرداری کێشانە نەك تەنها لەکاری بازرگانیدا گرنگە ، بەڵکو لەکردارە زانستیەکانیشدا ڕۆڵێکی بەرچاووگرنگی هەیە.

کیّ بون ئەوانەی دۆزیانەوە چۆن شتەکان دەکێشرێت ؟
ناتوانین بەوردی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە. بەڵام لە لایەنە مێژوییەکەوە دەتوانین بڵێین مسریەکان بون. مسریەکان پێش حەوت هەزارساڵ شتێکی سادەیان هەبو بۆ پێوانەی شتەکان واتە "تەرازو" کە بریتی بو لە دووتا تەرازو لەئەمسەرو ئەوسەری دارێك , کە بە سیّ پەت شۆڕکرابوەوە. ڕەنگە تەرازوی (مسری) یەکەم جۆری تەرازو بوبێت بۆ کێشانە بەکارهێنرابێت , کە بریتی بوە لەدارێك و لەناوەڕاستیەوە کونێکی لیّ کراوەو پەتێکیان تیّ خستوە بۆ ئەوەی بەدەست بگیرێت و بەرزبکرێتەوە.
لەهەر سەرێکەوە دوتا تەرازوی هەڵواسراوی لیّ بوە بەهۆی پەتێکەوە , سەنگێك کە هەموو لایەك قبوڵیان کردوە خراوەتە تایەکیو ئەو شتەش کە ویستویانە بیکڕن یان بیفرۆشن خراوەتە تایەکەی تری. بەدرێژایی پێنج هەزار ساڵ ئەم ئامێرە باشترین تەرازوی کێشانە بوە کە مرۆڤ بەکاری هێنابێت.
تا لە سەردەمی عیسی مەسیح علیە السلام ڕۆمانیەکان چاکسازیان کرد لە تەرازودا بە بەکارهێنانی بزمارێك لەچەقی باڵی تەرازوەکەدا , بۆ ئەوەی ببێتە خاڵی چەق بۆ ئاسنە ئاسۆییەکە , هەروەها ڕۆمانیەکان بون قەپانیان داهێنا قەپانی ڕۆمانی بریتی بو لە گەردنەیەکی تەرازو کە بە قولابێکەوە هەڵواسرابو , لەگەڵ دوو دەست یان دوو بەرزکەرەوەی نایەکسان، ئەو شتەش کە مەبەست بو بکێشریت بە بەرزکەرەوە بچوکەکەوە هەڵدەواسرا.
ئەمجا کێشەکەی دەجوڵێنرا بەدرێژایی درێژترین بەرزکەرەوە , تا دەگەیشتە ئەوەی هەردوکێشەکە بەرامبەر دەبون , نوسراوە هەڵکەنراوەکانی سەر بەرزکەرەوەکە کێشی پێوانەکەی دیاری دەکرد. ئەو دوو ئامێرە ساکارە بنەمای زۆربەی تەرازوە نوێیەکان بون.
بەڵام ئەمرۆ قەپانی وا دروست کراوە دەتوانێت شتی وا بکێشرێت بە خەیاڵیشیدا نەهاتوە , بۆ نمونە تەرازوی وا هەیە دەتوانێت یەك تاڵ مو بکێشێت. یان نوسینی سەر یەك پارچە کاغەز , هەروەها قەپانی واش هەیە دەتوانێت ترێلەیەك بەبارەوە بکێشێت. لەکرداری زانستی دا دەبێت پێوانەکان زۆر وردبن , ئاشکرایە کە شیّو لەرینەوەو کاریگەریە موگناتیسیەکان یان هەر جۆرێکی تری هێز دەتوانێت کار لە کێشانە بکات سەرەڕای ئەمانە هەمو دەتوانن کێشانەی کێشێکی وابکەن کە یەك لە سەدی ملیۆن بێت !

## بانکەکان کەی دروست بون ؟

بانکەکان ئەمڕۆ گەلێك خزمەت گوزاری پێشکەش بە مرۆڤ دەکەن , کە لە دوخالی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە :

*وەرگرتنی پارە لەخەلك‌و پاراستنیەتی لای خۆیان تا کاتێك داوای دەکەنەوە.

*پێدانی قەرز بۆ ئەو کەسانەی کە ئامادەن قازانجی بخەنەسەر بۆ بانکەکان.

لەبەرئەوەی بانکەکان سویان دەخستەسەر پارەی خەڵکی , خەڵکی حەزیان نەدەکرد پارەکانیان لە بانکەکاندا دابنێن‌و حەزیان لەکاری بانکی نەدەکرد. چونکە ئەو کارەیان بە حەرام دەزانی تا کار گەیشتە ئەوەی هەندێك لە وڵاتان کاری بانکیان قەدەغەکرد. سەرەڕای ئەوەی کاری بانکی مێژویەکی زۆر کۆنی هەیەو لە وڵاتانی بابل‌و مسرو گریکی کۆندا کاری بانکی کراوە. بەڵام پێش ئەوە خەڵکی پارەیان لە پەرستگاکاندا داناوە , تا لەساڵی ٢١٠ پێش زایندا ڕۆما یاسایەکی شارەوانی دەرکرد کە بریتی بو لە دیاری کردنی گۆڕەپانێکی گشتی بۆ پارە گۆڕەکان.

بەو بۆنەیەوە وشەی (بانك) لەوشەی بانکۆی ئیتاڵیەوە هاتوە کە بریتی بوە لە کورسیەك جێگەی دوکەس یان زیاتری کردۆتەوە پارە گۆڕەکانی چەرخی ناوەڕاست لەسەر جادەکان بەکاریان هێناوە بۆ کاری پارە گۆڕینەوە , بەڵام کاری بانکی نویێ دەتوانین بڵێین لەشاری بندقیەوە دەستی پێکرد. کاتێك لەساڵی ١٥٨٧ دا بانکی (دیریالتو ) دامەزرا. لەساڵی ١٦١٩ دا بانکی (بانکو دل گیرۆ ) دەستی گرتە سەر ئەم بانکەداو چەکەکانی بەپارەی زێرو زیو دەفرۆشت‌و خەڵکیش ئەو چەکانەیان وەکو پارە بەکاردەهێنا.

بانکێکی تر پەیدابو ئەو چەکانەی دەیدایە خەڵکی وەکو (ئەموالی بانکی ) بەکاردەهێنرا ئەویش بانکی ئەمستەردام بو کە لەساڵی ١٦٠٩ دا دامەزرا. لەبەریتانیاشدا تا ساڵی ١٦٩٤ زێڕنگەرەکان سەڕاف وڵات بون , تا کاتێك لەساڵی ١٨٢٥ (بانکی بەریتانیا ) دامەزراو هەمو کارە بانکیەکانی خستە ژێر دەستی خۆیەوە. یەکەم بانکی یاساییش لەوڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا. بانکی ئەمریکای باکور بو لە فلادلفیا , کە کۆنگرس لەساڵی ١٧٨٢ دا مۆڵەتی کاری دایە.

لەبەرئەوەی سو لە ئیسلامدا حەرامەو قازانجی بانكی بەجۆرێك لە جۆرەكانی سو دادەنرێت. بۆیە لە ولاًتە ئیسلامیی و عەرەبیەكاندا , لەم سالآنەی دوایدا (بانكی ئیسلامی ) دامەزرا , كەپشت بە (مرابحە) دەبەستێت لەبری قازانج.

## ئامێری چاپ

ئامێری چاپی نویٔ زۆر ئامێرێكی ئالۆزەو پێشخستنی سالآنێكی زۆری خایاندوە تا گەیشتۆتە ئەو شێوە جێگیرەی ئێستای خەڵكانێكی زۆر لە پێشخستنیدا بەشداریان كردوە. هەر لە سەدەی هەژدەهەمەوە , داهێنەرەكان بیریان لە ئامێرێك كردوە بۆ چاپكردن. بەلاًم یەكەم ئامێر لەساڵی ١٨٦٧ دا لەسەر دەستی كریستۆڤەر شۆڵز دروست كرا , لە میلۆكی ویسكونسینی ولاًتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا.

ئامێرەكەی شۆڵتر پێی دەوترا (نوسەری چاپ) خەڵكی سەرەتا گرنگیەكیان بەم ئامێرە نەدا. بەلاًم كاتێك لەساڵی ١٨٨٠ دا گۆڕانكاریی و چاكسازی زۆرباش لەم ئامێرەدا كرا دوای ئەوە ناوبانگی بلاًوبوەوە.

بەلاًم ڕێكخستنی زۆر سەیر لە كلیلەكانی ئەم ئامێرەدا هەرگیز چاكسازیەكی تێدا نەكرا. ئەو شێوە ڕێكخستنەی كلیلەكان ئەو شێوەیە بو كە یەكەم نەخشەسازی ئامێری چاپ بەكاری هێنا. هەندێك لەوانەی ئامێری چاپ دروست دەكەن بڕوایان وایە دەكرا كلیلەكان بەشێوەیەكی شیاوتر ڕێك بخرایە. هەوڵدرا چاكسازیی و گۆڕانی لەو جۆرە لە ئامێری چاپدا بكرێت , بەلاًم سەرنەكەوتن و وادیارە خەڵكی ڕاهاتون لەسەر شێوەی كلیلەكانی ئامێری چاپ و پێویست بە گۆڕان ناكات.

ئەو ڕێككخستنەی كلیلەكان لەهەموو جۆرە ئامێرەكانی چاپدا وەكو یەكەو ئەو شێوەیەش بەبۆردی كلیلی جیهانی ناسراوە. پسپۆڕان لایان وایە ئەم ڕێكخستنە زۆر باشەو دەڵێن ئەو پیتانەی دەكەونە لای یەكەوە , بۆیە بەو شێوەیە دانراوە تا ئەوانەی ئامێری چاپ بەكاردێنن پەنجەكانیان پێی بگات بە سەركەوتویی و بەشێوەیەكی سروشتی.

## كەی یەكەم ماڵ دروست كرا ؟

بەر لە هەزاران ساڵە , مرۆۋ خانوی دروست كردوە بۆ ئەوەی خۆیی و خێزانەكەی تیادا بحەسێنەوە. ئەو مالآنەی لەكۆندا دروست كراوە بەپێی ئەو كەش وهەوایە بوە كە تیایدا ژیاون , لەگەڵ ئەو مەوادەی لەبەردەستیاندابوە یان ئەو

مەترسیانەی ڕۆژانە ڕووبەڕویان بۆتەوە. لەبەرئەوە ناتوانین بڵێین ئەم جۆرەیان ئەو جۆرەماڵەیە یەکەمجار بیناکراوە.

بۆ نمونە : کاتێك پێش لەهەزاران ساڵە تێشوی بەردین داهێنرا , دار ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە بیناکردنی خانودا. لەبەرئەوە لەکۆندا خەڵکی لەدار ماڵیان بۆخۆیان دروست دەکرد. لەلایەکی ترەوە لەکۆندا ئەوانەی لە شوێنە گەرمەکاندا دەژیان , سەیریان کرد ماڵ لە گژوگیا ئاسانتر دروست دەکرێت و ژیان تیایدا خۆشترە بەوجۆرە لەناوچە گەرمەکانی ئەفریقیاو هەندێك لە دورگەکانی باشوری پاسیڤیك لەڕوەك و گژوگیاو گەڵای داران ماڵیان دروست دەکرد.

پێشی هەزاران ساڵ ئەو خەڵکانەی لەناوچەگەرمەکاندا دەژیان ڕێگەیەکی زۆر نایابیان بۆ بیناکردنی خانوەکانیان داهێنا ئەویش سواقدانی دیواری خانوەکانیان بو بەقوڕ. کە وشك دەبوەوە دەبو بە بەربەستێك لەبەردەم سەرماو گەرمادا. لەوە دەچێت مسریە کۆنەکان یەکەم خەڵك بوبن چۆنیەتی دروست کردنی خشتیان دۆزیبێتەوە. لە عێراقیشدا خەڵکی شێوەی دروست کردنی خشتیان پەرەپێداو لەبری ئەوەی دایان بنایە تا لەبەرخۆردا وشك ببێتەوە , لەناو کورەدا دەیان برژاند.

دوای ئەوەش ئاشوریە کۆنەکان شێوازی زاخاودانی خشت و شوشە خستنە ناویان داهێنا بەڕێگەی سوتاندنیەوە لەکورەدا. ئەمجۆرە خشتە هەزاران ساڵ تەمەنی کرد.

## پاسای پۆلیس... داهێنانێکی لەندەنیە !

بیرۆکەی پاسای پۆلیس بۆ پاراستنی شارەکان لە لەندەندا دروست بو. لەساڵی ١٧٣٧ دا پاسایەك دانرا بۆ پێکهێنانی دەزگایەکی پۆلیس کە لە ٦٨ کەس پێك دەهات. بەڵام کاتێك شاری لەندەن گەورەبوەوەو هەژاری تیایدا زیادی کرد کرداری دزین و برین و تاڵان و نا ئارامی لە لەندەندا بو بە شتێك کە خەریك بو لە کۆنترۆڵ دەربچێت !

لەساڵی ١٨٢٩ دا (ڕۆبەرت بیل ) هەستا بە دامەزراندنی (پۆلیسی لەندەن ) کە بارەگاکەی لە (سکۆتلاندیارد) بو , پۆلیسە تازەکان کلاویان لەسەر دەکردو پاڵتاوی درێژیان لەبەردەکرد کە لە دواوە وەکو کلکی پلیسرك هەڵقلیشێنرابو ئەم هێزە تازەیە کە بیل دروستی کرد , لەگشت ڕویەکەوە لەو هێزە پێشوەی پۆلیس

باشتربوو. ئەم هێزە توانیان نائارامی شاری لەندەن نەهێڵن , بەلاّم نائارامی لەشارەکانی تری بەریتانیادا سەری هەڵدا. لەئەنجامی ئەوەدا لەساڵی ١٨٣٥ دا ڕێگە درا هەر شارێك و بەڕێوبەرایەتیەکی پۆلیسی تایبەت بەخۆی دابمەزرێنێت. لەبەریتانیادا بەهەمووپیاوێکی پۆلیس دەوترا (بوبی) ئەمەش ئەو ناوە بو کە ڕۆبەرت بیلّ پێی بەناوبانگ بو.

لە سیەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا کۆمەڵێك لەخەڵکی شاری نیۆیۆرك هەستان بە لێکۆڵینەوە لەسەر یاسای پۆلیسی بەریتانی. لە ئەنجامی ئەوەدا لەساڵی ١٨٤٤ دا شاری نیۆیۆرك بو بە یەکەم شار لەولاّتەیەکگرتوەکانی ئەمریکادا هێزی پۆلیس پێك بهێنێت. لەهاوشێوەی پۆلیسی لەندەن , دوای ئەوە بو شارەکانی تری ئەمریکا هەنگاوی لەو جۆرەیان نا.

لە ئەمریکا وەکو کینایە بۆ پیاوانی پۆلیس وشەی (کوپ) یان (کۆپر) یان بەکاردەهێنن. بروا وایە ئەم وشەیە لەوەوە هاتبێت کە پۆلیسی نیۆیورك ئەستێرەیەکی مسی هەشت پەڕەیی بە کلاّوەکانیانەوە بوە , چون وشەی کوپر لەزمانی ئینگلیزیدا بەواتای (مس) دێت.

هەندێکی تر لایان وایە ئەم وشەیە لەسێ پیتی یەکەمی سێ وشەی ئینگلیزیەوە هاتوە واتە (پۆلیسێك لە گەشتدا ).

## نوکتەو لوغز لەکەیەوە هەبوە ؟

مەتەڵ هەر لەسەردەمەکانی کۆنەوە هەبوە. ئێمە ئەمڕۆ لوغز بەجۆرێك لە سەرگەرمی دەزانین , بەلاّم لەکۆندا خەڵکی بەجدی لوغزیان وەردەگرت. کاهینە کۆنەکان زۆربەی جار پرسیارو نەسیحەتەکانیان لەشێوەی لوغزو مەتەڵدا دەکرد. پاشان کە نامەیان بۆ یەکتر دەنارد بە نهێنی بەشێوە زمانی مەتەڵ بوو.

یونانیو ڕۆمانیەکان لە جەژنەکانیاندا پێشبڕکێی مەتەڵیان ڕێکدەخست و خەلاّتیان دەدایە براوەکان. تەنانەت لە تەوراتیشدا هاتوە , لەئاهەنگی ژن هێنانی شمشۆندا پێشبڕکێ یەکی مەتەڵ ڕێکخراو شاژنی سەبە ء هەندێك مەتەڵی ئاراستەی سلێمان پێغەمبەر کرد.

مێژوی نوکتە زۆر کۆنەو لەگشت ولاّتانی دونیاداو لەهەموو چەرخێکی مێژودا خەڵکی نوکتەو گاڵتەجاڕییان کردوە بۆ ئەوەی خەڵکانی تر بکەنێنن. لەچاخەکانی ناوەڕاستدا لە ئورویا گاڵتەجاڕەکانی دەربار بە نوکتەو قسەی خۆش

پادشاو دەستو پێوەندەكانیان دەكەناندو سەرگەرم دەكرد. لەسەرەتادا بە ئازایەتی و پاڵەوانیەكانی پادشا هەڵیان دەدا.
بەڵام لەدوایدا دەستیان دەكردە گێڕانەوەی نوكتەو بەسەرهاتی پێكەنیناوی. دوای ئەوە ئەو نوكتەو قسەگاڵتەجاڕیانە كۆ دەكرانەوەو بە كتێب بڵاودەكرانەوە. یەكێك لەو كتێبە گاڵتەجاڕیانە كە بەزمانی ئینگلیزی نوسراوە و ناوی (نوكتەكانی تارلتۆن) ە لەساڵی ١٦١١ دا بڵاوكرایەوە. بەناوبانگترین كەس لە مێژودا كە نوكتەی گێڕابێتەوە شانۆكاری ئینگلیزی (جومیللر ) بوە كە لەنێوان ساڵانی ١٦٨٤و ١٧٣٨ دا ژیاوە.

## كەی پێشبڕكێی ئەسپ سواری دەستی پێكرد ؟



وادیارە بەكارهێنانی ئەسپ لە پێشبڕكێدا یەكێكە لە كۆنترین ئەو وەرزشانەی كە مرۆڤ خەریكی بوە. لەزۆر كۆندا لەمسرو بابلو سوریادا پێشبڕكێی ئەسپ سواری كراوە.
هۆمیرۆسی شاعیری كۆنی یۆنانی باسی پێشبڕكێی ئەسپ سواری دەكات كە هەشت سەدە پێش زاین لەیوناندا كراوە. بەڵام پێشبڕكێی ئەسپ سواری بەشێوازی نوێ , وەكو دەزانین لەبەریتانیاوە سەرچاوەی گرتوە , لەگەڵ پەروەردەكردنی ئەسپی ڕەسەن لە بەریتانیادا كە دەگەڕێتەوە بۆ كۆتایی سەدەی حەڤدەهەمو سەرەتای سەدەی هەژدەهەم , كە سەرەتای بەخێوكردنی ئەسپی تایبەتە بە وەرزشەوە.
لە وڵاتانی عەرەبیو توركیاو ئێرانەوە , ئەسپی ڕەسەنی ڕۆژهەڵات برانە بەریتانیاو لەوێ ئەسپی نێری ڕۆژهەڵاتی , پەڕێنرا لە ئەسپی مێی ئینگلیزی. سێ خێزانی زۆر گرنگ لە ئەسپ هەن ئەسپی دارلی عەرەبیو گاداو لفینی عەرەبیو بایرلی توركیە , هەموو ئەسپەكانی بەریتانیا دەگەڕێنەوە سەر ئەم سێ

نێره ئەسپه. لەسەدەی هەژدەهەمدا پێشبڕکێی ئەسپ سواری بو بە وەرزشێکی ئینگلیزی زۆر گرنگ‌و یەکەم (یانەی پێشبڕکێ) لەساڵی ١٧٥١ دا دامەزراو لەساڵی ١٧٩٣ یەکەمین چاپی کتێبی (ئەسپی گشتی ) بلاوکرایەوە. کە تیایدا ڕەگەزی ئەسپە ڕەسەنەکان دیری کرا.

پێشبڕکێی ئەسپ سواری بۆ ماوەیەکی درێژ بە (وەرزشی پادشایان ) ناسراوبو لەبەرئەوە تەنها خێزانی پادشاکانی بەریتانیا ئەسپیان هەبوو پێشبڕکێیان پێ دەکرد , هەر ئەوانیش بون ئەم یاریەیان داهێنا.

## هۆکارەکانی لافاو چین ؟

ئەگەر چاوێك بەمێژوی مرۆڤایەتیدا بخشێنین , نمونەی زۆر لە لافاوی گەورەمان بەرچاو دەکەوێت. خورافات‌و ئەفسانەی زۆر لەسەرلافاو دروست بوە بەلاّم لەڕاستیدا مرۆڤی سەرەتایی بۆ یەکەمجار لە شیوی نزیك ڕوبارەکان نیشتەجێ بوە. لەبەرئەوەی لەوێدا پێویستە سەرەکیەکانی لەئاوو زەوی بەپیت دەست کەوتوە.

لافاو چی یە ؟

کاتێك ئاوی ڕوبارەکان بەرزدەبنەوەو دەڕژێنەسەر زەویەکانی دەوروبەریاندا دەڵێن لافاو ڕویدا. دەشێت لافاو زۆر وێران کەر بێت. زۆرجار زەوی دادەڕوخێت‌و زەویە بەپیتەکان دەبات‌و بۆماوەی چەند ساڵێك ئەو زەویانە بەبێ کەڵك دەهێڵێتەوە , یان شارو لادێ دەڕوخێنێت‌و زیانێکی زۆری گیانی و ماڵی لەشوێن خۆی بەجێ دەهێڵێت. بەلاّم زۆر لە لافاوەکانیش سودبەخشن بۆ مرۆڤ. نمونەی لافاوی ساڵانەی ڕوباری نیل کە نیعمەتێکی گەورەیە بۆ مسریەکان.

بۆچی لافاو ڕودەدات ؟

هەندێك جار باران بارینی زۆرو نائاسایی کە ڕوبارەکان ناتوانن هەڵی بگرن لێیانەوە سەردەکات بۆ زەویەکانی دەوروبەرو بەوەش لافاو ڕودەدات.

ئایا دەتوانرێت ڕێگری لەلافاو بکرێت ؟

ڕەنگە بەرگری کردنی لافاو شتێکی مەحاڵ بێت. چونکە باران بارینی زۆر لە دەسەلاّتی مرۆڤدا نیەو ناتوانرێت ڕێگری لێ بکرێت. بەلاّم هەوڵ دەدرێت بەم سێ ڕێگەیە تەحەکوم بەلافاوەوە بکرێت.

١-دروست کردنی بەربەست لە زەویە نەویەکان‌و ئەو ناوچانەی لافاو هەڕەشەی

لێدەكات بۆ پاراستنی كشت‌وكاڵ‌و كێڵگەكان.
٢-هەڵكەندنی كەناڵی كورت و پڕ بۆ ڕۆیشتنی ئاوی لافاوەكە.
٣-دروست كردنی بەنداوی زۆر گەورەو وردە وردە ناردنی ئاوەكەی بۆ ناو ڕوبارەكان.

## پاتری ئۆتۆمبیل... چۆن ئیش دەكات؟

پاتری ئامێرێكە بە كارلێكی كیمیاوی كارەبا بەرهەم دەهێنێت. كە زیاتر لە یەك خانەی تێدایەو هەر خانەیەكیش تەزوی تایبەت بەخۆی بەرهەم دەهێنێت. پاتریە چەند خانەییەكانیش بەكاردەهێنرێت بۆ بەرهەمهێنانی كارەبای ئۆتۆمبیل‌و كەرەستە قورسەكان‌و موشەكی ئاسمانی‌و ژێر دەریایی‌و گڵۆپ‌و هیتریش.
ئەو پاتریانەی لە ئۆتۆمبیلدا بەكاردەهێنرێت پێیان دەوترێت (مركم) (ئامێری كارەبا پەسیسەكردن ) یەكەم مركم لەساڵی ١٨٥٩ دا لەسەر دەستی زانای فیزك زانی فەرەنسی (گاستۆن پلانتی) یەوە دروست كرا. بە بەراورد لەگەڵ پیلی وشكدا ئەمیان ڕێژەیەكی زیاتر لە كارەبا بەرهەم دێنێت.
لەپاتری ئۆتۆمبیلدا زنجیرەیەكی پەیوەست لەسێ یان شەش خانە هەیە. كە دەتوانرێت ئەو پاتریانە چەند جارێك شەحن بكرێتەوەو بۆ ماوەیەكی درێژتر بەكاربهێنرێت. دوجۆر مركم مان هەیە ترش‌و تون. پاتریە ترشیە قورقوشمیەكان لە حاویاتێك پێك دێت لە پلاستیك یان لاستیكی ڕەق دروست كراوە و لەهەموو دونیادا هەر ئەمجۆرە پاتریە بەكاردەهێنرێت.
هەمو خانەكانی ئەمجۆرە پاتریە بریتی یە لە دو كۆمەڵە جەمسەری كارەبایی (الكترودات ) یەكێكیان موجەب‌و ئەویتریان سالبە. یەكێكیان لە قوڕقوشم‌و ئەوی تریان لە دوەم ئۆكسیدی قوڕقوشم دروستكراوە. هەردو جەمسەرەكەش سەرەكەیان لەناو تێزابێكی كاڵ كراوەدایە. خانەكانی ئەم پاتریەش پێویستی بەئاوی دلۆپ‌او هەیە و هەر خانەیەكیش توانای كارەباییەكی جیاوازی هەیە كە دەگاتە دوو ڤۆڵت.
لای جەمسەری موجەبەوە دوەم ئۆكسیدی قوڕقوشمەكە لەگەڵ هایدرۆجین‌و ئایۆناتی كبریتات ( سلفات ) كارلێك دەكەن لە تێزابەكەداو سلڤاتی قورقوشم و ئاو پێك دەهێنن. لەم كارلێكەدا دو كەهرەبی بارگە سالبەكە واتە (دو ئەلكترۆن ) پارسەنگی كارلێكە كیمیاویەكە دەكەن. لە جەمسەرە سالبەكەش ئایۆناتی سلڤات

كارلێك دەكاتو سلڤاتی قورقوشم دروست دەكات. ئەو تەلەش ئایۆناتی سلڤات

كارلێك دەكاتو سلڤاتی قورقوشم دروست دەكات. ئەو تەلەش دو ئەلكترۆنە دەردەدات كە پارسەنگی كارەباییەكە دەپارێزێت.

كورتەی ئەم كارلێكەش ئەوەیە , ئەلكترۆنەكاتەكان دەست بە ڕۆیشتن دەكەن لە پلێتە سالبەكەوە بەرەو پلێتە موجەبەكە. كاتێك دوەم ئۆكسیدی قورقوشم تەواو دەبێت خانەكە لە ئیش كردن دەوەستێت. دەتوانرێت بە ناردنی تەزویەكی كارەبایی لە پلێتە سالبەكەوە بەرەو پلێتە موجەبەكە جارێكی تر خانەكە شەحن بكرێتەوە. لەم كردارەدا (سلفاتی قورقوشمەكە ) لە پلێتە سالبەكەدا لەناودەچێت و دەگۆڕێت بۆ قورقوشم , لە پلێتە موجەبەكەش دەگۆڕێت بۆ دوەم ئۆكسیدی قورقوشم. لەكرداری دوبارەكردنەوەی شەحن كردندا وزە كارەباییەكە دەگۆڕێت بۆ وزەی كیمیاویو سلفاتی قورقوشمیش دەگۆڕێت بۆ قورقوشمو دوەم ئۆكسیدی قورقوشم. ئەوەش وادەكات ئایۆناتی سلفات لەگەڵ ئاوەكەدا یەك بگرن و بگۆڕێن بۆ تێزابێكی كاڵ.

كاتێك خانەكە بەكاردەهێنرێت , ئەم كارلێكردنانە بە ئاراستەی پێچەوانەدا بەردەوام دەبێت. لەبەرئەوە دەڵێن ئەو وزە كارەباییەی بەكاردەهێنرێت جارێكی تر لە خانەكەدا هەڵدەگیرێت , لەماوەی دوبارەكردنەوەی شەحن كردندا.

لە پاتریە تونەكاندا لەبری تێزاب هایدرۆكسیدی پۆتاسیۆم بەكاردەهێنرێت ئەو پاتریانەش دو جەمسەریان هەیە. بەڵام لە پاتریە تونەكاندا جەمسەری موجەب لە ئۆكسیدی نیكڵو جەمسەری سالب لەكادیۆم دروست دەكرێت. وە ئەم خانانە پێویستیان بە دوبارە ئاو تێكردنەوە نیە. بە بەراورد لەگەڵ خانە ترشە قورقوشمیەكاندا , ئەم كێشی سوكترە. بەڵام توانای بەرهەم هێنانی كارەبای ئەم تەنها ١,٢ ڤۆڵتە.

جۆرێكی تر لە خانەی تونی دو جەمسەرە لە ئۆكسیدی زیوو پلێتی زنك دروست دەكرێت. ئەم جۆرە خانانە وزەی كارەبای زیاتر دەدەن. بەڵام هەموكەس ناتوانێت بەكاری بێنێت چونكە دروست كردنی پارەی زۆری تێدەچێت , لەبەرئەوەی نرخی زیو گرانە.

## كەی بۆ یەكەمین جار مۆم بەكارهێنرا ؟

یەكەمین هۆكاری ڕوناك كردنەوە بۆ مرۆڤ بریتی بوە لە پارچە دارێكی سوتاو كە

له ئاگر کەوتنەوە یەکەوە دەستی کەوتوە. یەکەمین چراش مرۆڤ بەکاری هێنابێت بریتی بوە لە بەردێکی هڵۆڵ یان کەللەسەرێك یان گوێچکە ماسیەك کە پڕی کردوە لە پیوی ئاژەڵ یان ڕۆنی ماسی و فتیلەکەشی بریتی بوە لە قامیشێك یان ڕیشاڵی ڕوەکێك یان نەیزەیەك.

مۆم مێژوی زۆر کۆنەو لەسەرەتادا لە لولەکی سەرەتایی لە مۆم یان مەوادی چەوری وشك دروست کراوەو هەڵپێچراوە بەدەوری ریشاڵێکی ڕوەکی یان پارچە قوماشێکدا وەکو فتیلە ، مۆمەکەش لە مۆمی هەنگوینی دروست کراوە. هەر لەزۆر کۆنەوە بەکارهێنراوە. بۆ ماوەیەکی زۆر دورو درێژ چاکسازی لەمۆمدا نەکرا ، تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم تا ئەو کاتەی دروست کردنی هێشتا لە ئەرکەکانی خانمی ماڵ بو. بۆ دەست خستنی مۆم ، پیویان لەناو مەنجەڵێکدا دەکوڵاندو دەزوی لە خوری یان لۆکە دروست کراویان چەند جارێك دەژەندە پیوە کوڵاوەکەداو هەڵیان دەواسی تا سارد دەبوەوە ، کاتێك فتیلە خوریە یان لۆکەکە دەگەیشتە ئەستوریەکی دیاری کراو مۆمەکە ئامادە دەبو بۆ بەکارهێنان. دروست کردنی مۆمی نوێ ، چاکسازی زۆری کرد لەو مۆمانەی لەماڵاندا دروست دەکران. هێشتا فتیلەکان لەلۆکەو خوری دروست دەکرێن ، بەڵام جگە لەپیو دەژەنرێتە مۆمی هەنگوین و پارافین و مەوادی تریشدا. ئەمڕۆ پیوەکە وا چارەسەر دەکرێت کە زۆرترین ڕوناکیو کەمترین دوکەڵمان بداتێ. بەڵام لەکۆندا مۆمەکان بە بەردەوامی دوکەڵیان دەردەداو بەهۆی بونی مادەی گلیسیرین لەناو پیوەکەدا ، بۆنێکی زۆر ناخۆشی دروست دەکرد. بەڵام کارگەکانی دروست کردنی مۆمی تازە ئەو مەوادە بۆن ناخۆشانەی لێ جودا دەکەنەوە.

## کێ گەردیلەی دۆزیەوە ؟

یونانیە کۆنەکان (گریکەکان ) بڕوایان وابو هەموو مادەیەك لە گەردیلە پێك دێت. لەڕاستیدا وشەی گەردیلە "atom" لە زمانی ئینگلیزیدا لە وشەیەکی ئەغریقیەوە هاتوە کە مانای (ئەوەی دابەش ناکرێت ) دەدات.

یونانیە کۆنەکان باوەڕیان وابو ئەو مەوادانەی کە دابەش بونیان بەردەوام بێت تا ئاستێکی دیاری کراو ، دواین بەشی دابەش بونی پێی دەوترێت (گەردیلە ). بەڵام ئەمڕۆ ناتوانین بڵێین گریکەکان گەردیلەیان دۆزیەوە ، ئەوە تەنها وەکو بۆچونێك بوە لایاندا. ئەو باوەڕو بۆچونەیان شتێکی زانستی نەبوو هیچ شتێکی

زانستیشی لیّ نەکەوتەوەو تەنها بیرۆکەیەکی فەلسەفی بو لەسەر مادەوجیهان.
ئەو گەردیلەیەی ئەمڕۆ دەیزانین لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو بیردۆزەی زانستیەوە دروست بوە , تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم چۆنیەتی دروست بونی مادە لەڕاستیدا شتێك بو تەنها فەیلەسوفەکان بیریان لیّ دەکردەوە. تا لەساڵی ١٨٠٣ دا زانای کیمیك و ماتماتیك زانی ئینگلیزی (جۆن دالتۆن ) هاتو یەکەم کەس بو بیردۆزەی زانستی گەردیلەی دانا.
"دالْتۆن " تاقیکردنەوەیەکی زۆر وردی کردو هەستایە پێوانەکردنی نمونەیەك لەهەر گازێك و سەیری کرد جیاوازی هەیە لە کێشیاندا , بۆیە بۆی دەرکەوت گازەکانیش وەکو شلەمەنیەکان و مەوادە ڕەقەکان لە گەردیلۆکە پێك دێن.کە بە پلەی وردیی بڕواناکرێت و ئەویش ناوی (گەردیلە)ی لێنا. دالْتۆن مەزەندەی کێشە ڕێژەییەکانی کرد بۆ گەردیلەی توخمە ناسراوەکان کاتێك ڕایگەیاند کە گەردیلەی توخمە جیاوازەکان , تایبەتی جیاوازو کێشی جیاوازیان هەیە , لەوەوە زانینی زانستی بۆ گەردیلە دەستی پێکرد. بەلاّم هێشتا بەوردی تەفسیری ئەوەی نەکردبو گەردیلە چی یەو چۆن ئیش دەکات.
دوای سەدساڵ لەوە (ئیرنست ڕۆزەرفۆرد ) کە ئەویش زانایەکی ئینگلیزی بو بیردۆزەیەکی سەبارەت بە گەردیلە دانا , کە لە وەسفی کۆمەڵەی خۆر دەچو کە دەیگوت : لەچەقدا ناوکێکی قورس هەیە , کە بارگەی موجەب هەڵدەگرێت و بەدەوری ئەم ناوکەشدا ئەلکترۆناتی بارگە سالب هەیە. ئەمڕۆ زانایان باوەڕیان وایە گەردیلە لە ئەلکترۆنات و پرۆتۆنات و نیوترۆنات و پۆزترۆنات (تەزوی بارگە موجەب ) و نیوترانیۆت (گەردیلەیەکی وردەو بەرامبەرە لەژێر ئەلکترۆناتی قەبارەوە ) و میزۆنات (تەنۆکەی ئەلکترۆنی و هیبرونات ) "تەنۆکەی ئەتۆمی کە لە نیوترۆن سوکترە و لەدیریترۆن قورسترە".
لەڕاستیدا زانایانی ئەمڕۆ لەناو دڵی گەردیلەدا زیاتر لە بیست جۆری جیاواز لە گەردیلۆکەی زۆر وردیان دۆزیوەتەوە. ئەوەی کە سەیرو نامۆیە تا ئێستاش وێنەیەکی تەواو لەسەر گەردیلە نیە , کە بتوانرێت هەمو شتێکی لەسەر تەفسیر بکرێت !

## کیّ وردبین "میکرۆسکۆب"ی داهێنا ؟

وشەی میکرۆسکۆب microscope لەزمانی ئینگلیزیدا لە دوو وشەی ئەغریقی

پێکهاتوه , یەکەمیان میکرۆس mikros بەواتای (ورد) دوەمیشیان skopos بەواتای بینەر یان چاودێر دێت. بەمجۆرە میکرۆسکوب بەواتای (بینین یان چاودێری کردنی شتە وردەکان ) دێت!

کەواتە میکرۆسکۆب ئامێرێکە بۆ بینینی ئەو شتە وردانە بەکاردێت کە بەچاوی ئاسایی نابینرێن. شتەکان تا لەچاوەوە نزیك ببنەوە , گەورەتر دەنوێنن. بەلاّم ئەگەر لە ٢٥ سم نزیکتر بونەوە لەچاو ئەو کاتە نابینرێن‌و پێی دەوترێت لە دەرەوەی توانای بینیندایە بەلاّم ئەگەر عەدەسەیەکی قۆقز بخەینە نێوانی چاوو ئەو شتەی دەمانەوێت ببینین , دەشێت ئەو شتە کەمتر لە ٢٥ سم نزیکتر بکاتەوەو لەئاستی بینینی چاودا بمێنێتەوە.

ئێمە ئەمڕۆ ئەم کردارە زۆر بە ئاسانی وەسف دەکەین‌و دەڵێین (شوشەی گەورە کەرەوە ) بەکاردەهێنین , بەلاّم شوشە گەورەکەرەوە ئاساییەکان لەواقیعدا (وردبینی سادەن ) ئەم وردبینە سادەیەش هەر لە مێژەوە بەکارهێنراوە. بەلاّم ئێمە ئەمڕۆ کە باسی (وردبینی جوتە دوربین ) دەکەین. واتە مەبەستمان داهێنانی میکروسکۆبە.

کەواتە میکروسکۆبی جوتەدوربین چیە ؟

لەم جۆرە دوربینەدا بە دو قۆناغ گەورە کردنەوە دەکرێت. عەدەسەیەکی هەیە کە پێی دەوترێت (شیئیە ) کە وێنەی گەورەکراوی یەکەم گەورەتر دەکاتەوە. لەڕوی کرداریەوە چەند عەدەسەیەکی ( شی ء) و (عینی ) پێکەوە هەن , بەلاّم بنەمای بنەڕەتی ئەوەیە کرداری گەورەکردنەوە بە دو قۆناغ دەبێت. (جوتە وردبین ) لەنێوان سالاّنی ١٥٩٠ و ١٦١٠ دا داهێنراوە. فەزڵی داهێنانیشی دەگەڕێنرێتەوە بۆ گالیلۆ.

سەرەڕای نەبونی هیچ کەسێك کە بزانێت کێ دایهێناوە هەندێك جار زانای هۆڵەندی (لیهونهۆك ) بەوە ناودەبرێت کە (باوکی میکرۆسکۆب) ە بەلاّم هۆی ئەو ناونانە بۆ وە دەگەڕێتەوە کە ئەوبو میکرۆسکۆبی بەکارهێنا بۆ گەیشتنە زۆر لە دۆزینەوەکانی. لیۆنهۆك بو ڕایگەیاند کە کێچ‌و ئەسپێ‌و گەنەو زۆری تریش لە زیندەوەرەکان بە هێلکەدەبن‌و نازێن. یەکەم کەسیش بو پەکتریاو زیندەوەرە یەك خانەکانی لەژێر وردبیندا بینی. هەر بەهۆی وردبینەکەیەوە بو لیونهۆك وەکو یەکەم کەس بەتەواوی سوڕی خوێنی بینی.

ئەمڕۆ وردبین چەندە بۆ مرۆڤ گرنگە هێندەش لە بوارە زانستی‌و پیشەسازیەکاندا

بەکاردێت.

## چۆن شوشە دۆزرایەوە ؟

بەدرێژایی هەزاران ساڵ وەکو خشڵو دیمەن سەیری شوشە کراوە , گرانیەکەی لەوەدا بەوە کە بۆ دروست کردنی شتە بەنرخەکان بەکارهێنراوە. بەڵام لەو کاتەدا مرۆڤ توانی لە شوشەوە ئەودیو ببینێت توانی سود لە شوشە وەربگرێت. بە حەق کەس نازانێت کەیو لەکوێدا بۆ یەکەمجار نهێنی پیشەسازی شوشە فێربوە. بەڵام ئەوەی دەیزانین لە مێژەوە شوشە بەکارهێنراوە.

پێکهاتە سەرەکیەکان لە پیشەسازی شوشەدا بریتی یە لە لم‌و خوڵەمێشی صۆدا (کاربۆناتی صۆدیۆمی نائاوی ) یان پۆتاس‌و قسڵو تواندنەوە یان پێکەوە لەژێر پلەیەکی گەرمای زۆر بەرزدا. چونکە ئەم مەوادانە بەزۆری لەزۆربەی ناوچەکانی دونیادا هەن. دەشێت دۆزینەوەی شوشە لەزۆر وڵاتانی دونیادا بوبێت.

باسێك هەیە دەڵێت : فەزڵی دۆزینەوەی شوشە دەگەڕێتەوە بۆ فینیقیەکان کاتێك سەرنشینی یەکێك لە کەشتیەکان لەسەر ڕوبارێك لە سوریا دابەزین‌و خۆیان ئامادەکرد بۆ چێشت لێنان هەرچیەکیان کرد , بەردیان دەست نەکەوت مەنجەڵەکەیانی بخەنەسەر , بۆیە ناچاربون چنگێك نەتراتی سۆدیۆم لەناو کەشتیەکەیانەوە بێنن , گەرمی ئاگرەکە نەتراتەکەی تواندەوەو لەگەڵ لمەکەدا تێکەڵ بوو جۆگەلەیەکی بچوك لە شوشەی شل جۆگەی بەست !

دەشێت ئەم قسەیە ڕاست بێت‌و دەشێتیش درۆبێت. بەڵام سوریا لە وڵاتە هەرە دێرینەکانی پیشەسازی شوشەیەو بازرگانە فینیقیەکان کاڵا شوشەکانیان لە هەمو ئەو وڵاتانەدا دەفرۆشت کە کەوتبونە سەر دەریای سپی ناوەڕاست. مسریش یەکێکی تری ئەو وڵاتانەیە کە لە مێژەوە پیشەسازی شوشەی زانیوە. لەگۆڕێکدا هەندێك مت‌و مورو پارچەشوشە دۆزرایەوە , مێژوی دەگەڕێتەوە بۆ حەوت هەزارساڵ پێش زاین. دەشێت ئەو پارچەشوشانە لە سوریاوە گەیشتبێتە مسر. بەڵام ئێستا دەزانین مسریەکان لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠٠ پ ز شوشەی تایبەت بەخۆیان دروست کردوە.

مسریە کۆنەکان کوارتزیان لەگەڵ لمدا تێکەڵ دەکرد بۆ گۆڕینی ڕەنگی شوشەکە. هەروەها کۆباڵت‌و مس‌و مەنگەنیزیان بۆ تێکەڵەکە زیاد دەکرد بۆ ئەوەی شوشەی شین‌و سەوزو ئەرخەوانیان دەست بکەوێت. دوای ساڵی ١٢٠٠ پێش زاین ,

مسریەکان فێربون بە پاڵەپەستۆ شوشەی قاڵب کراو دروست بکەن. بەلاّم باتێکەری شوشە تا پێش ماوەیەکی کەم لەسەردەمی مەسیحیەت بەکارنەهێنرا. ئەو باتێکەرەش داهێنانێکی فینیقی بو. ڕۆمانیەکان لە گەورە پیشەوەرانی شوشەبونەو هەر ئەوان بون شوشەی تەنکیان وەکو ڕوپۆشی دیوار بەکارهێنا. لەسەدەمی مەسیحیەتیشدا شوشە لە پەنجەرەدا بەکارهێنرا.

## وزەی ئەتۆمی

وزەی ئەتۆمی وزەیەکە لە گەردیلە دەردەهێنرێت. هەمو گەردیلەیەك گەردیلۆکەی وزەی تێدایە. ئەو وزەیەیە کە بەشەکانی گەردیلە پێکەوە دەهێڵێتەوە. لەبەرئەوە ناوکەی وزە سەرچاوەی وزەیە ئەو وزەیەش کاتێك گەردیلەکە شیتەڵ دەکرێت دەردەچێت. بۆ دەست خستنی وزە بە بەکارهێنانی گەردیلە دو ڕێگە هەیە. یەکێکیان پێی دەوترێت (بەیەکەوە جۆشدان ) دوەمیشیان پێی دەوترێت (لەت کردن ) کاتێك جۆشدان ڕودەدات دو گەردیلە پێکەوە گەردیلەیەك پێك دێنن. ئەو جۆشدانی گەردیلانە دەبێتەهۆی دەرکردنی ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لە وزە لەشێوەی گەرمیدا. لێرەدا دەبێت بڵێین زۆربەی وزە لەخۆرەوە دێت. لەئەنجامی ئەو لەحیم بونەی کە لەسەرخۆ ڕودەدات. ئەمەش شێوەیەکە لەشێوەکانی وزەی ئەتۆمی.

شێوەیەکی تر هەیە بۆ وزەی ئەتۆمی کە بەکرداری لەت کردن ڕودەدات , کاتێك گەردیلەیەك لەت دەبێت بۆ دوو گەردیلە ئەمەش بە بۆردومان کردن یان لێدانی گەردیلە دەبێت بە گەردیلۆکەکانی وەکو نیوترۆنات. مەرج نیە هەمو جارێك گەردیلەکان بە لێدان یان بە نیوترۆنات لەت ببن , لەبەرئەوەی زۆربەی گەردیلەکان هەرگیز لەت نابن. بەلاّم گەردیلەکانی یۆرانیۆم و بلۆتۆنیۆم لە بارودۆخی گونجاودا لەت دەبن.

جۆرێك لەجۆرەکانی یۆرانیۆم (U-٢٣٥) کە ناسراوە بە هاوشێوەی یۆرانیۆم کاتێك بە نیوترۆنات لێی دەدرێت لەت دەبێت و وزەیەکی گەرمی یەکجار زۆر بەرهەم دەهێنێت. بەجۆرێك لە یەك کیلۆگرام (U-٢٣٥) دا یەك ملیۆن جار ئەوەندەی سوتاندنی یەك کیلۆگرام لە خەڵوز وزەمان دەداتێ !

یەك بلورەی زۆر بچوك لە یۆرانیۆم دەتوانێت کەشتیەکی نەوت یان فڕۆکەیەك یان مولیدەیەکی کارەبا بخاتەگەڕ !

بەمجۆرە دەشێت وزەی ئەتۆمی لەداهاتودا ببێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی وزە.

## مارمێلکە "قومقومە"

کاتێك قومقومە ڕوبەڕوی هێرشی دوژمنەکەی دەبێتەوە ، زۆربەی جار هەڵدێتو بەشێك لەکلکی لەشوێنی خۆی بەجێ دەهێڵێت. ئەو بەشە براوەی کلکی بۆ ماویەك هەڵبەزودابەز دەکات ، بەوەش دوژمنەکەی توشی شلەژان دەکاتو دەتوانێت بۆی هەڵبێت.

قومقومە هەر کاتێك بیەوێت ، دەتوانێت واز لە بەشێك لەکلکی بێنێت. لەبەرئەوەی ئێسکی کلکی زۆر نەرمە ، تەنانەت هەر بەشێکی کلکی زۆر بە ئاسانی لەلاشەی جودا دەبێتەوە. کاتێك کلکیشی فڕێ دەدات زۆر خوێنی لێ ناچێت لەبەرئەوەی سەری دەمارەکانی شێوە داخراوێکە. بۆیە قومقومە زۆر بە ئاسانی دەتوانێت واز لە کلکی خۆی بێنێتو لەماوەی چەند ڕۆژێکدا کلکێکی تازە لەشوێنیدا بڕوێتەوە.

زانایان لێکۆڵینەوەیان لەسەر زیاتر لە ٢٥ هەزار جۆری قومقومەکردەو گەیشتونەتە ئەوەی لەشی قومقومە دابەشکراوە بۆ سێ بەشی سەرەکی. سەر ، قەد ، کلك. هەمو جۆرەکانی قومقومە چوار قاچیان هەیە. لەگەڵ ئەوەی زۆربەی قومقومەکان هێلکەدەکەن بەلاَم هەندێکی کەمیشیان دەزێن. زۆربەی قومقومەکان لەسەر مێروەکان دەژین ، بەلاَم ژمارەیەکی کەم لەجۆرە گەورەکانیان مێروو باڵندەش دەخۆن.

درێژی هەندێکیان لە سێ مەتر زیاترەو دیمەنێکی ترسناکیان هەیە. دەتوانن بە کلکە درێژە بەهێزەکەیان ئاژەڵێکی گەورە بکوژن. ئەمجۆرە قومقومە لە وڵاتە ئیستیواکاندا دەژین. قرژاڵو کەرکەدەنیش بەهەمان شێوە دەتوانن لەکلکیان ڕزگاریان بێت.

## ئەستێرەکان لەکوێوە هاتون ؟

لەڕوە زانستیەکەوە هێشتا وەلاَمی ئەم پرسیارەمان پێ نیە ، کە گەردون چۆن دروست بوە ؟ چەندین بیردۆزەی جیاواز هەیە سەبارەت بە دروست بونی گەردون بەلاَم هێشتا نازانین چۆن دەستی پێکردوە. بەلاَم بۆ خستنەڕوی بیردۆزەیەکی وا هەوڵ دەدەین تەفسیری مێژوی ژیانی یەکێك لە ئەستێرەکان بکەین.

ئەستێرە ، تەنێکی ئاسمانی ڕوناکە ، بەلاَم هەسارەکان وەکو دەزانین ئەو تیشکانە

دەشكێننەوە كە لە خۆرەوە دەكەوێتە سەريان. تيشكى هەسارە نەگۆڕەو تيشكى ئەستێرە درەوشاوەيە. بەهۆى نائارامى هەوا لە نێوانى ئەستێرەكەو زەويدا هەوا ناجێگيرەكە دەبێتە مايەى شكاندنەوەى تيشكى ئەستێرەكان كەوا دێتە پێش چاو دەلەرێتەوە.

ئەستێرەكان لەڕوى قەبارەو چڕىو پلەى گەرمايانەوە جياوازى زۆر لەنێوانياندا هەيە. هەندێك ئەستێرە هەن پێيان دەوترێت "زەبەلاحە سورە گەورەكان " كە چەندين جار لەخۆر گەورەترن , لەو لاشەوە هەندێك ئەستێرە هەن پێيان دەوترێت كورتە بالاً سپيەكان كە ئەستێرەى وايان تيايە بە قەبارەى گۆى زەويە.

(زەبەلاحە گەورەكان ) چڕيەكەيان يەك لەسەر هەزارى چڕى ئەو هەوايەيە كە هەڵى دەمژين بەلاًم چڕى (بالاً كورتە سپيەكان ) سەدان هەزار جار لەوە زياترە. يەكێك لە بيردۆزەكان دەڵێت : ئەستێرەكان لە تەمەنياندا بە دو قۆناغدا تێپەڕيون بەپێى ئەم بيردۆزەيە بێت ئەستێرەكان وەكو هەورێك لە تەپو تۆزى گەردونەوە دەستيان پێكردوە. بەهۆى ڕاكێشانى گەرديلۆكەكانەوە بۆ يەكتر كرژبونەتەوەو دواى ئەوە ئەو مادەيە گۆڕاوە بۆ مادەيەكى گازى و دەستى بە ڕوناك بونەوە كردوەو بۆتە ئەستێرەيەكى زەبەلاحى سور.

دواى ئەوە دەست بەچڕبونەوەى زياتر دەكاتو ئەستێرەكە دەگۆڕێت بۆ شێوەيەك كە لە ڕوى قەبارەو پلەى گەرماوە لەخۆر دەچێتو تا بليۆنەها ساڵ دواى ئەوە وەكو ئەستێرەيەكى ئاسايى دەمێنێتەوە. وە وزەى خۆر لە گۆڕينى هايدرۆجينەوە بۆ توخمەكانى ترى قورستر دەست دەكەوێت. كاتێك هايدرۆجينەكە خەريكە تەواو ببێت ئەستێرەكە دەست بە داڕوخانو نەمان دەكات. بۆيە تەقينەوە ڕودەداتو لەكۆتايدا "زەبەلاحى سور " دەگۆڕێت بۆ "بالاًكورتى سپى " بەتێپەڕبونى كات سەرچاوەكانى وزە تەواو دەبنو ئەستێرەكە ڕوناكى خۆى لەدەست دەدات تا سەرەنجام هيچ ڕوناكيەكى نامێنێت.

## چى وادەكات خۆر درەوشاوە بێت ؟

خۆر نزيكترين ئەستێرەيە لە زەويەوە , ئێمە دەزانين ژيان پشت بەخۆر دەبەستێت ئەگەر گەرمى خۆر نەبوايە , ئەوا يەك دڵۆپ ئاو لەسەر زەويدا نەدەبوو..

ئەگەر تيشكى خۆر نەبوايە هيچ ڕوەكو گيانلەبەرو مرۆڤێك بونى نەدەبو. خۆر نزيكەى ٩٣٠٠٠٠٠٠ ميل لە زەويەوە دورە , خۆر ١٣٠٠٠٠٠هەزارجار لەزەوى

گەورەترە. بەلاّم ئەوەى جێى سەرنجە خۆر وەكو زەوى تەنێكى ڕەق نيە. چۆن ئەم ڕاستيە دەزانين ؟

گەرما لەسەر ڕوى خۆر دەگاتە نزيكەى ٦٠٠٠ پلەى سەدى , ئەم گەرمايە هێندە بەرزە بەسە بۆ گۆڕينى هەر بەردو كانزايەك بۆ گاز , لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت كە خۆر گۆيەكە لەگاز.

پێش چەندين ساڵە زانايان باوەڕيان وابو , ئەوەى والە خۆر دەكات درەوشاوە بێتو تيشكو گەرمى بدات , ئەوەيە كە دەسوتێت بەلاّم خۆر سەدەها مليۆن ساڵە گەرمەو تيشك دەدات , هيچ شتێكيش نيە ئەوەندە ماوە بەردەوام بسوتێت. زانايان ئێستا باوەڕيان وايە گەرماى خۆر لە ئەنجامى كردارێكەوەيە كە لە كەرت بونى ناوكى بۆمبێكى ئەتۆمى دەچێت , چونكە خۆر مادەيەكە لە شێوەيەكەوە بۆ شێوەيەكى تر دەگۆڕێت , ئێمە پێويستمان بە مەوادى زۆركەم هەيە بۆ بەرهەم هێنانى ڕێژەيەكى زۆر لەوزە. بۆ نمونە : ٢٨ گرام لە مادەيەك دەشێت وزەيەك بەرهەم بێنێت بەس بێت بۆ تواندنەوەى يەك مليۆن تەن لەبەرد.

ئەگەر زانست ڕاستى كردبێتو پێكابێتى ئەوا خۆر هەر بە درەوشاوەيى دەمێنێتەوە لەبەرئەوەى بەردەوام مەواد دەگۆڕێت بۆ وزە. يەك لەسەر سەدى قەبارەى خۆر دەتوانێت وزەيەكى وا لە گەرمى دروست بكات لە ١٥٠ هەزار مليۆن ساڵ بە گەرمى بمێنێتەوە !

## بۆچى جوتياران پەينى كيمياوى بەكاردەهێنن ؟

هەمو جوتياران بۆ دەست خستنى بەرهەمى باشتر پەين بەكاردەهێنن. بەلاّم هەمويان بەروبوميان وەكو يەك بەرهەم نادات. ئايا دەزانن بۆچى ؟

زۆر لێكۆڵينەوە دەرى خستوە كە كاربۆن و هايدرۆجين و ئۆكسجين گرنگترين توخمن بۆ ڕوانى ڕوەكەكان بەشێوەيەكى ڕاستو دروست. ڕوەكەكان كاربۆنو دوەم ئۆكسيدى كاربۆنو هايدرۆجينو ئۆكسجين لەڕێگەى ڕەگەوە لە ئاوەوە وەردەگرن. سەرەڕاى ئەم توخمانە يانزە توخمى تر پێويستە بۆ شين بونى ڕوەكەكان بەشێوەيەكى دروست كە بريتين لە : نايترۆجين , پۆتاسيۆم , فۆسفۆر , كاليسيۆم , مەگنيسيوم , گۆگرد , ئاسن , مەنگەنيز , بۆرن , زنك , مس.

دەبێت زەوى خوێى تواوەى ئەم توخمانە لەخۆيدا ڕێك بخات , ئەگەر ئەم توخمانە لەزەويدا نەبو , ئەوا بەشێوەى پەينى دەستكرد بۆى زياد دەكرێت. پەين ئەو

خوێیەیەکە توخمە بنەڕەتیەکان بۆ ئەو ڕوەکانە دابین دەکات کە پێویستیان پێ یەتی.

پەین دوجۆرە سروشتیو دەستکرد (پیشەسازی)

پەینە ئەندامیەکان (سروشتیەکان) لەپەینی سروشتی یان ڕوەکی یان ئاژەڵی یان پاشماوەی زێرابەکان دروست دەبێت کە نایترۆجین و هەندێك توخمی تری خۆراکی بەڕێژەیەکی یەکسان دەستەبەر دەکات.

بەزۆری پەینی ئاژەڵی لەگەڵ کادا تێکەڵ دەکرێتو چاوەڕێ دەکرێت تا دەگەنێتو دەبێتە پەینێکی تەواو. پەینی سەوزیش بەو ڕوەکانە دەوترێت کە لەگەڵ جوت کردندا جارێکی تر دەکەونەوە ناو زەویەکە بۆ پاراستنی توخمە خۆراکیەکان.بەڵام کودی ئاژەڵی ئەو مەوادانەن وەکو ئێسكو خوێنی وشك کە هەندێك جار وەکو کودی ئەندامی بەکاردەهێنرێن.

بەڵام پەینە ئاوێتەکان یان دەستکردەکان لەکانزا گەلێك پێك دێن کە ڕێژەیەکی دیاری کراو لە توخمە خۆراکیە ناسراوەکانیان تێدایە. کە بریتی یە لە فۆسفۆرو نایترۆجینو پۆتاسیۆم. یۆریاو کبریتاتی ئەمۆنیۆمیش مەوادی سەرەکی پەینی شیمیایین کاتێك پەین لەناو خۆڵدا دەتوێتەوە ، توخمە خۆراکیەکان دەدات بە ڕوەك. زانایانی کشتوکاڵ یەکەمجار شیکاری لەسەر جۆری خۆڵەکە دەکەن ، ئەمجا بڕیار دەدەن چ جۆرە پەینێکی بۆ بەکاربێنن. شۆرشی کشوکاڵی ، بەرهەمی ئەو لێکۆلینەوانەیە.

## چۆن کەش ناسێك بارودۆخی کەش دەزانێت ؟

کەش : هەمو بارودۆخێکی بەرگە بایە بە گەرمی یان ساردی بە وشکی یان شێداری هەتاو بێت یان هەور بێت ، با بێت یان زریان. کەشوهەوا ڕۆژێك بۆ ڕۆژێکی تر دەگۆڕێت ، کاریگەری لەماوەی یەکساڵدا پێی دەوترێت ئاووهەوا "المناخ " زۆر هۆی ئاڵۆز هەیە بۆ گۆڕانکاری لەکەشدا. بەڵام گرنگترین کاریگەر خۆرە. گەرمای خۆر ئاو دەکاتە هەڵمو هەوا گەرم دەکات. لەبەرئەوە ڕەوتە سەرکەوتوەکان لە هەوای گەرم هەڵمی ئاو هەڵدەگرێت بۆ ئاسمان ، لەوێدا هەواکە سارد دەبێتەوەو هەڵمەکە چڕ دەبێتەوە بۆ باران. ئەو گۆڕانکاریانە بە هێواشی یان توندی ڕوو دەدەن ، کاتێك بە توندی ڕودەدەن دەبێتەهۆی دروست بونی زریان.

لەبەریتانیادا نزیکەی ٢٠٠ وێستگەی چاودێری کردنی کەشوهەوا هەیە ،

نزيكەی هەمان ژمارەش لەسەرانسەری ئوروپادا هەيە. جگە لە "كەشتی تايبەت بە كەش " كە لە زەريای ئەتلەسيدا هەن. فڕۆكەی تايبەتيش هەيە بەڕێكوپێكی گەشت دەكەن‌و ڕاپۆرتی خۆيان سەبارەت بە كەش‌وهەوا بۆ زەوی دەنێرن. لەهەموو ئەمانەوە پێش بينی كەش‌وهەوا دەكرێت.

ئەو نەخشانەی پسپۆڕانی كەش‌وهەوا لێكۆڵينەوەی لەسەر دەكەن‌و زۆر شتيان بۆ دەردەخات بريتی يەلە :

-ئەو شوێنانەی كە پاڵەپەستۆی هەوا تيايدا يەكسانە.

-ئەو شوێنانەی پلەی گەرما تيايدا يەكسانە.

-ئاراستەكانی بای ناوچەيی.

-ئاسمان هەورە يان سامالە.

-باران‌و بەفر.

-ڕێژەی باران.

-ئەو ناوچانەی كە پاڵەپەستۆی كەش تيايدا بەرزە يان نزمە يان يەكسانە. كەش ناس لەو نەخشەوە دەتوانێت بزانێت لەژێر ئەو بارودۆخانەدا چی ڕودەدات چونكە دەزانێت پاڵەپەستۆی نزم دەبێتەهۆی زريان , لەبەرئەوەی هەوای سارد دەجوڵێت‌و دەچێتە شوێنی هەوای گەرم. بەڵام پاڵەپەستۆی بەرز نيشانەی كەش‌وهەوايەكی خۆشە.

لەنيوەی گۆی باكورەوە بايەك هەڵدەكات بەسەر خاڵێكی پاڵەپەستۆ بەرزدا , بە ئاڕاستەی ميلی كاتژمێر. بەڵام لەناوچەی پاڵەپەستۆ نزمدا با بە پێچەوانەی ميلی كاتژمێرەوە هەڵدەكات. بۆيە دەتوانرێت بەو ئاراستانەی كە با هەڵدەكات پێش بينی بكرێت‌و كەش ناسيش خێرايی ماوەكانی پاڵەپەستۆ بەسەر ولاَتدا دەزانێت. كاتێك هەمو ئەم شتانە دەزانێت‌و ڕاپۆرت سەبارەت بە كەش‌و هەوا لەزۆربەی ناوچەكانی ولاَتەوە وەردەگرێت , بيرۆكەی وای بۆ دروست دەبێت پێش بينی كەش‌و هەوا لەداهاتودا چۆن بكات‌و چی بڵێت.

## ڕاديۆم

ڕاديۆم توخمێكی تيشك دەرە. بەڵام مانای تيشك دەر چی يە ؟ توخمەكان لە گەرديلە دروست دەبن , زۆربەی گەرديلەكانيش نەگۆڕن واتە لەساڵێكەوە بۆ ساڵێكی تر ناگۆڕێن. بەڵام ژمارەيەكی كەم لە گەرديلە قورسەكان لەت دەبن‌و

دەگۆڕێن بۆ چەندین جۆری تر. ئەم لەت بون و خورانە پێی دەوترێت چالاکی تیشکی.

بە دەردانی تیشك بەرێژەیەکی دیاری کراو هەموو توخمێکی تیشکدەر دەخورێت یان هەڵ دەوەشێتەوە. کە هیچ کات ناتوانرێت لەو رێژەیە بەهیچ جۆرێك پەلەو خاوی بکرێت. هەندێکی بەخێرایی و هەندێکی تری بە لەسەرخۆ دەگۆڕێت , ئەمەش کردارێکە مرۆڤ ناتوانێت تەحەکومی پێوە بکات.

لەڕادیۆمدا ئەم خورانە بەردەوام دەبێت تا ڕادیۆمەکە دەگۆڕێت بۆ قورقوشم , بۆ نمونە : نیوگرام لەڕادیۆم دەشێت بگۆڕێت بۆ گەردیلەی کێشی گەردیلەیی لە کەمتر لە ١٥٩٠ ساڵدا. دوای ١٥٩٠ ساڵی تریش نیوەکەی تری دەشێت بگۆڕێت بەمجۆرە تا هەموی دەبێتە قورقوشم !

ڕادیۆم لەسەر دەستی مدام کوری و خێزانی دۆزرایەوە. کاتێك خەریکی پاڵفتەکردنی تەنێك لە (بتشبلند ) بون ( کە کانزایەکی ڕەشی درەوشاوەیەو ئۆکسیدی یۆرانیۆم و یۆرانیۆمی تێدایە. هەردو کۆری دەیانزانی کە یۆرانیۆم تیشکێکی نەبینراوی تێدایە. بەلاّم نەیاندەزانی مادەیەکی تری بەهێزتری تێدابێت. بۆیە پلۆتۆنۆمیان دۆزیەوە. کە توخمێکی تری تیشکدەرە , لەکۆتاییدا توانیان ڕێژەیەکی زۆرکەم لە ڕادیۆم جیابکەنەوە.

ڕادیۆم سێ جۆر تیشك دەردەخات :

–تیشکی ئەلفا.

–تیشکی جاما

تیشکی ئەلفا گەردیلە گەلێکە لەگازی هیلیۆمی زۆر جوڵە خێرا.

بەلاّم تیشکی بیتا ئەلکترۆناتی خێرا جولاّوەیە.

تیشکی جاما لەتیشکی ئێکس دەچێت بەلاّم توانای بڕین و بەرزبونەوەی زیاترە کاتێك یەکێك لەو توخمانە دەردەکرێت , گەردیلەی دایك کە لێیەوە دەردەچێت لەتوخمێکەوە دەگۆڕێت بۆ توخمێکی تر. ئەم گۆڕانکاریەش پێی دەوترێت گۆڕانی گەردیلەیی. گەورەترین ئەنباری توخمی بتشبلند کە یۆرانیۆمی هەڵگرتوە لەناوچەی "دەریای ورچی گەورەیە " لەکەنەدا.

## چالاکی تیشکی

ڕەنگە کەسێك نەبێت لەدونیادا دەربارەی چالاکی تیشکی شتی نەبیستبێت. ئێمە

دەزانین تاقیکردنەوە لەسەر ناپاڵمە گەردیلەییەکان ، چالاکی تیشکی دروست ناکات کە یەکێکە لە گەورەترین ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە.

بەڵام چالاکی تیشکی چییەو بۆچی زیان بەخشە بە مرۆڤ ؟

با لە گەردیلەوە دەست پێ بکەین ، هەموو جۆرێکی گەردیلە لەسیستەمی خۆری دەچێت لەجیاتی خۆر ناوکەو لەجیاتی ئەستێرەکانیش ئەلکترۆنات هەیە کە بەدەوریدا دەسوڕێتەوە. ناوکەکە لە گەردیلۆکە یان گەردیلەیان بارگەی هەڵگری موجەب پێك دێت. کاتێك شتێك گەردیلە ناچار دەکات گەردیلۆکەیەك یان زیاتر فڕێ بدات لە ناوکەکەیەوە ، ئەو کاتە چالاکی تیشکی ڕوودەداتو لەهەمان کاتدا گەردیلەکە وزە لەشێوەی تیشکی "جاما" دا دەردەدات.

هەندێك توخم بە سروشتی تیشکی چالاکن ، ئەمەش مانای وایە گەردیلەکان بەشێوەیەکی بەردەوام گەردیلۆکەکان فڕێ دەدەن. بەم کردارەش گەردیلە هەڵدەوەشێتەوە. کاتێك گەردیلۆکەکانیش ئازاد دەبن ، توخمەکە توشی گۆڕانکاری دەبێت. بەم ڕێگەیە ڕادیۆم ، بەشێوەیەکی سروشتی زۆر تیشکی چالاکە. گەردیلۆکە دەردەداتو هەڵ دەوەشێتەوە بۆ توخمێکی تر تا دەبێتە قورقوشم.

زانایان لەم سەردەمەدا دەزانن چۆن چالاکی تیشکی دەستکرد بەرهەم دێنن. لەڕێگەی لێدانی گەردیلەی دیاری کراو لە گەردیلەکان دەتوانن وابکەن ئەو گەردیلانە هەڵبوەشێتەوەو ببێتە تیشکی چالاك. لەوەوە ئەو گەردیلانەی کە توشی لێدان دەبن وزەیەك دەردەکەن ، بەو لێدەرانەش دەوترێت "وردکەری گەردیلە ".

چی وادەکات چالاکی تیشکی لەسەر مرۆڤ مەترسیداربێت ؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت تەسەور بکەیت لەو گەردیلۆکە فڕیوانەی لە گەردیلە ورد کراوەکەوە دەردەچێت. کاتێك ئەم گەردیلۆکانە دەدەن لەگەردیلەی تر ، وای لێدەکەن هەڵبوەشێتەوەو سیفەتە کیمیاویەکانی خۆی بگۆڕێت. ئەگەر ئەو گەردیلۆکە هەڵوەشاوانە بدەن لە خانە زیندوەکانی لاشە بێگومان گۆڕانکاری تێدا دروست دەکەن. چونکە ئەو گەردیلۆکانە دەتوانن پێست بسوتێننو لەناوی ببەن. ئەگەر خڕۆکە سورەکانی خوێن لەناوچون ، ئەوا دەبێتەهۆی گۆڕانکاری لەخانەکانی تردا. لەگەڵ ئەوەی چالاکی تیشکی دەشێت بچوك بێت بۆ مرۆڤ. بەڵام زۆر پڕمەترسیو وێران کەر دەبێت.

## بۆچی دەگرین

زۆربەی خەڵك هەستیان وایە كە مرۆڤ تەنها لەكاتی غەمباری و دڵتەنگیدا دەگری. ئایا دەزانن هەر مرۆڤێك لەدرێژایی تەمەنیدا نزیكەی ٢٥٠٠٠٠٠٠٠ جار دەگری ؟ پێڵوەكانمان بریتی یە لەچەند چینێك لە پێستەی دەقكراو كە وەكو پەردەی شانۆ بەهۆی ماسولكەكانەوە دادەخرێت و دەكرێتەوە.

ئەم پەردەیە هێندە بەخێرا دەجولێتەوە بەجۆرێك كە كار لە بینینی چاو ناكات تەنانەت هەست بە جولاندنەوەشی ناكەین. لەڕاستیدا پێڵوی چاو بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤ هەر شەش چركە جارێك لەخۆیەوە دەكرێتەوەو دادەخرێت. لەهەر چاوێكدا لویەكی فرمێسك هەیە دەكەوێتە سەروی گۆشەی دەرەوەی چاوەوە. كەناڵیشی تێدایە ئەو فرمێسكانە دەگوێزێتەوە بۆ پێڵوی سەرەوەو كەناڵگەكانیش فرمێسكەكان لەبەردەمی چاودا دەسڕنەوە. لەگەڵ چاوتروكاندندا مژین ڕودەدات بۆ هەندێك لە فرمێسكەكان بە پاڵەپەستۆ خستنە سەر كەناڵەكانی فرمێسك. ئامانجی ئەوەش تەڕكردنەوەی گلێنەی چاوو وشك نەبونەوەیەتی ، ئەوەش لەڕوی ئالیەتەوە جیاوازیەكی لەگەڵ گریاندا نیە. كاتێكیش دەگرین هەر ئەوەمان لیٚ ڕودەدات !

ئایا تێبینی تان كردوە ئەو كەسانەی زۆر پێدەكەنن فرمێسك لەچاویان دێتەخوار ؟ هۆكاری ئەوەش ئەوەیە كە پێكەنینی بەهێز وادەكات ماسولكەكان پاڵەپەستۆ بخەنەسەر ئەو لوانەی فرمێسك پەسیسەدەكەن بەوەش فرمێسك لەچاو دێتە دەرەوە. هەمومان دەزانین ، بیٚ ئەوەی غەمبارببین پیاز وامان لێدەكات بگرین ، هۆكاری ئەوەش ئەوەیە كە فرمێسك مادەیەكی (متگایر ) دەردەدات كاتێك دەگاتە چاومان ، چاومان بەفرمێسك خۆی لیٚ دەپارێزێت. بەواتە فرمێسكەكە مادە متگایرەكە كە دەبێتەهۆی ئالۆش دەشواتەوەو لەچاو دوری دەخاتەوە.

كاتێكیش دەگرین هەستمان بە ئالیەتێك تەعبیر لەخۆی دەكات ، وامان لێدەكات لەبری ئەوەی قسەبكەین بگرین ، كاردانەوەیەكی پێچەوانەی ناویستە بیٚ ئەوەی دەسەلاتمانی تێدابێت ڕودەدات. بەلاٚم ئەو هۆیەی وامان لێدەكات بگرین ئەوەیە كە لاشەمان دەتوانێت گوزارشت لەخۆی بكات بەگریان ، لەبەرئەوەی ناتوانێت وشە بەكاربێنێت بۆ گواستنەوەی ئەوەی هەستی پیٚ دەكەین.

## نیکۆتین چی یە؟

ئەگەر سەیرێکی سەر پاکەتە جگەرەکان بکەین ، دەبینین لێی نوسراوە ئەم جگەرانە مادەی قەتران و نیکۆتینیان تێدایە. کەواتە نیکۆتین چی یەو بۆچی خەڵکی گرنگی دەدەن بەرێژەی نیکۆتین لەناو توتن و جگەرەکاندا ؟
جگەرەکێشان تا ئەندازەیەك ڕازین لەو جگەرەیەی دەیکێشن. چونکە بەو نیکۆتینەی لە جگەرەکاندایە ئارامی دەکاتە کۆئەندامی عەسەبییاز. هەروەها جگەرەکێشان هەست کردن بەماندوبون لادەبات ، وادەکات جگەرەکێش کەمتر هەست بە شەکەت بون بکات. جگەرەکێشان تەنانەت هێزی بیرکردنەوەش دەوروژێنێت تا ئەندازەیەکی دیاری کراو. لەبەرئەوە جگەرەکێش لەکاتی جگەرەکێشاندا دەتوانێت بەشێوەیەکی باشتر بیربکاتەوە. نیکۆتینیش یەکێکە لە پێکهاتە سەرەکیەکانی توتن. بەڵام نیکۆتینی پەتی ئەگەر لە توتنەکە دەربهێنرێت کاریگەریەکەی وەکو ژەهر وایە. بۆیە جگەرەکێش نابێت ژەهرێکی ڕوت هەڵمژێت لەبەرئەوە لاشە قبوڵی نیکۆتینێکی پاك ناکات.
کەواتەبا بزانین لەکرداری جگەرەکێشاندا چی ڕودەدات ؟
جگەرەکێشان کردارێکی "دڵۆپاندنی وشکە" واتە مەوادە وشکەکان دەگۆڕێن بۆ هەڵم یان دوکەڵ لەکاتی داگیرساندنی جگەرەدا گەرمترین شوێنی ئەو شوێنەیە کە دەسوتێت و ڕوناك دەبێتەوەو گەرما دەبەخشێت. ئەو گەرمایەش کیمیاویەن ٢٥٪ نیکۆتینەکە لەناو دەبات. بەڵام لەدوای ئەو بەشەی دەسوتێت توتنەکە تا پلەیەکی مامناوەندی گەرم دەبێت ، لە بەشە گڕنەگرتوەکەدا گازێك دێتەدەرەوە کە نیکۆتینی تێدایەو بەرێژەی ٣٠٪ ی ئەو نیکۆتینە لەهەوادا ون دەبێت. بەڵام بەشەکەی تری لە جگەرەکەدا دەمێنێتەوە ، کە گەردیلۆکەی توتنی ساردی تیایە.
کاتێك کە نیکۆتین بەسەر ئەو گەردیلۆکانەدا ڕەد دەبێت لەسەری دەنیشێتەوە. لەئەنجامی ئەم نیشتنەوەیەدا ، بەرێژەی نزیکەی ١٥٪ی نیکۆتینەکە دەچێتە دەمەوە. ئەو جگەرانەی فلتەریان بۆ دانراوە هەوڵێکە بۆ گرتنی زۆرترین ڕێژەی نیکۆتین پێش ئەوەی بچێتە ناو دەمەوە. هەرچەندە ماوەی نێوان ئەو بەشەی لەجگەرەکە دەسوتێت لەگەڵ دەمدا کەمتر بێت ئەوا ڕێژەی ئەو نیکۆتینەی دەچێتە دەمەوە زیاترە. لەبەرئەوە هۆیەیە جگەر درێژەکان لەجگەرە کورتەکان مەترسییان کەمترە. کێشانی جگەرەیەك تا تەواوبون هۆیەکە بۆ ئەوەی ڕێژەیەکی زۆر لە

نیکۆتین بچێته دەممانەوە. کاتێك جگەرەیەك لەنیوەدا دەکوژێنینەوەو دەبینین جاری دوەم وەکو یەکەمجار بەئاسانی داناگیرسێتەوە , ئەمەش وادەکات زۆرترین ڕێژەی نیکۆتین بچێته دەممانەوە.

لەگەڵ ئەوەی ١٥٪ی نیکۆتین دەچێته دەمەوە , بەڵام کاریگەری ئەو ڕێژەیە تەنها لەڕێگەی "پەردەی مخاگی " یەوە دەگاتە خوین لەناو دەمدا بەڵام لەکاتی هەڵمژینی دوکەڵی توتن لەڕێگەی لوتەوە ئەو ڕێژەیە دو بەرامبەر دەبێتەوە. ئەگەر دوکەڵەکە گەیشتە سیەکان ئەوا ڕێژەکە چوار بەرامبەر دەبێتەوە.

## چۆن گەشە دەکەین ؟

هەمو گیانداره زیندوەکان لە بونیەتی خۆیاندا گەشەدەکەن واتا "شێوەو قەبارەو چۆنیەتی پێکهاتەی " هەروەها لە فرە خانەکانیشدا "ئەوەی کە دەتوانێت بیکات ". گرنگترین هۆ لەناو گیانداراندا کە لە دروست بونیەوە شاراوەیەو دەبێتەهۆی گەشەسەندنی بریتی یە لە هۆکار گەلێك کەپێی دەوترێت "پشتاوپشت " کە گیانداران و مرۆڤ پێیدا تێ دەپەڕن , کە بریتی یە لە قۆناغەکانی گەشەسەندن واته "تۆو , ئاولەمە , منداڵی , گەنجی , پیاوی , پیری ".

هەندێك لەگیانداران زۆر بەخێرایی بەقۆناغی منداڵیدا تێدەپەڕن. هەندێك لە باڵندەکانیش لەگەڵ دەرچونیان لەهێلکە دەتوانن بفڕن. بەرازی هندی (بەرازی غینیا ) دوای سێ ڕۆژ لەدایك بونی دەتوانێت خۆی خزمەتی خۆی بکات. بەڵام مرۆڤ تا دەگاتە تەمەنی بیست ساڵان پێویستی بە خزمەت کردنه.

منداڵێك کە تازە لەدایك دەبێت هەمو ئەو خانە دەماریانەی هەیەتی , لەخانەکانی مێشك و برِبڕەی پشت و ئەو خانانەی کە دەگەنە هەموو بەشێکی لاشه , پەیوەندی گەشەسەندن لەنێوان ئەم خانە دەماریانەدا وادەکات مرۆڤ بتوانێت زاڵبێت بەسەر جموجوڵ و فێربونی ڕەوشت و نوسین و فێربونەکانی تری وەکو خەڵکانی تری ناو کۆمەڵگا. لەبەرئەوە مرۆڤەکان لەگەشەسەندنیاندا زۆر لەیەك دەچن , بەڵام لێرەدا جیاوازیەکی گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە کە هەردوو ڕەگەز "نێرومێ " بەهەمان شێوە گەورە دەبن. بەڵام هەریەکەو بەخێراییەکی تایبەت بەخۆی.

مرۆڤ لە حەفتەکانی یەکەمی ژیانیدا لەهەموو قۆناغەکانی تر خێراتر گەشەدەکات و لەکۆتایی ساڵی یەکەمی تەمەندا گەشەکردن زۆر خاو دەبێتەوە. لەماوەی منداڵیدا ڕێژەی گەشەکردن مامناوەندی دەبێت , دوای ئەوە جارێکی تر

خێرا دەبێتەوە. ئەم خێرایی دوبارە گەشەسەندنە لای کچان لەنێوان ١١ بۆ ١٣ ساڵ و لەلای کوڕاندا ١٢ بۆ ١٤ ساڵ دەبێت. بۆ ماوەیەك بەخێرایی گەشەدەکەن تا دەگەنە لوتکە , بەڵام جارێکی تر گەشەسەندن خاودەبێتەوە تا بە تەواوی گەشەسەندنی بەرزبون دەوەستێت و مرۆڤ دەگاتە قاڵبی تەواوی خۆی.

زۆرجار گەشەسەندن لەدرێژی و پانیدا پاش و پێش دەکەن. یەکەمجار درێژ دەبین پاشان قەڵەو دەبین. زۆربەمان بە قۆناغی "قەڵەوبون " دا تێدەپەڕین کاتێك تەمەنمان دەگاتە نزیکەی ١١ بۆ ١٣ ساڵان , بەڵام هەر دوای ئەوە خێرا لەساڵانی دواتردا بەرز دەبین و ئەو قەڵەویەمان دەشارێتەوە.

## کێ یەکەمین نەخشەی وێنەکێشا ؟

کۆنترین بەڵگە لەبەردەستدا بێت سەبارەت بە نەخشە , ئەو نەخشە قوڕەیە کە لەسەر ئاگر سورکراوەتەوەو پێش چوار هەزارساڵ لەمسردا دروست کراوە. لەو سەردەمەدا خاوەن زەویەکان نیشانەیان بۆ سنوری زەویەکانیان دادەنا. پاشاکانیش سنوری دەسەڵاتی خۆیانیان لەسەر نەخشە دەزانی. بەڵام کاتێك خەڵکی هەوڵیان دا شوێنە دورەکان لەسەر نەخشە دیاری بکەن کێشەی زۆریان ڕوبەڕو بوەوە , هۆیەکەش خڕی زەوی بو , کە وای دەکرد پێوانەکردنی شوێنە دورەکان بەپێوانەکردنی دروست شتێکی سەخت بێت.

کارمەندانی گەردون ناسی یارمەتی زۆری نەخشەسازە سەرەتاییەکانیان دا چون لێکۆڵینەکانیان پەیوەندی بە قەبارەو شێوەی زەویەوە هەبو. یونانیەك بەناوی "ئیراسیشینیز " کە ماتماتیك زان و جوگرافی ناس و گەردون ناس بوو لەدایك بوی ساڵی ٢٧٦ پ ز بو , توانی بەشێوەیەکی دروست چێوەی زەوی مەزەندە بکات. مەزەندەکەی ئیراتۆ وای کرد بتوانرێت بۆ یەکەمجار نێوانی باکورو باشوری زەوی بەشێوەیەکی ڕاست حیساب بکرێت.

لەهەمانکاتدا "هیبار خۆس " کە گەردون ناسێکی یونانی بو پێشنیاری ئەوەی کرد نەخشەی جیهان بەشێوەیەکی یەکسان بۆ هێڵی وەهمی پانی و درێژی دابەش بکرێت. وە وتی : شوێنی گونجاو بۆ ئەم هێڵانە دەبێت لەسەر ئەو بنەما زانستیانەوە دیاری بکرێت , کە لە لێکۆڵینەوەکان سەبارەت بە ئاسمان دەست کەوتوە " وە هیبار خۆس یەکەم کەس بو نەخشەی بۆ ئاسمان کێشا ".

لەسەدەی دوەمی دوای زایندا بەتلیمۆس هەمان بیرۆکەی بەکارهێناو نەخشەیەکی دروست کرد کە هێڵەکانی پانیو درێژی تیادا دیاری کردبو. بەلاّم وانەی جوگرافیا نەبو بە پرۆگرامی خوێندن تا دوای دۆزینەوەی ئەمریکا. دۆزینەوەکانی کۆلۆمپسو ئەوانەی دوای ئەویش هاتن گرنگیەکی زۆری بەنەخشەو نەخشەسازی دا. لەساڵی ١٥٧٠ دا " ئەبراهام ئورتیلۆس" یەکەم کەس بو کۆمەڵێك گەورەی لەنەخشە بلاّوکردەوە. بەلاّم "گیرادۆس مرکاتۆر " بو بە باوکی وێنەکێشانی نەخشەی نویێ. نەخشەیەکی کێشا هەمو هێڵە چەماوەکانی لەسەر زەوی کردبوە هێڵی ڕاست لەسەر نەخشە. ئەمەش وایکرد هێڵێکی ڕاست لەنێوان دو شوێندا دەربکەوێت , کە وادەکات ئاراستەی دیاری کردنی ڕاست بەهۆی قیبلە نمایەکەوە مومکین بێت. ئەمجۆرە نەخشانە پێیان دەوترێت "خستنەسەر " بەواتا سەر ڕوی زەوی دەگوێزرێتەوە بۆ سەر نەخشە. وە لە بەرگی کتێبەکەیدا وێنەی "اگلس" ێکی کە " خواوەندێك بوە لە خواوەندەکانی یونانی کۆن " دانابو بە گەورەیی. بەو هۆیەوەیە ئەمڕۆ هەر کۆمەڵە نەخشەیەك بە اگلس دەناسرێت.

## کەی قوتابخانە دەستی پێکرد ؟

مرۆڤی ئەشکەوت هەرچیی دەزانی فێری منداڵەکەی دەکرد. ئەگەر وایان نەکردبا بێگومان منداڵەکانیان دەفەوتان , چونکە ڕوبەڕوبونەوەی دڕندەو ڕوەکە خۆراکیەکانو چۆنیەتی کردنەوەی ئاگریان نەدەزانی. دوای چەندین سەدە مرۆڤ فێربو ئەوەی دەیزانێت بینوسێت , بەم ڕێگەیەش توانی زانینی زیاتر کۆبکاتەوەو بیگوێزێتەوە بۆ منداڵو نەوەکانی داهاتوی.

کاتێك نوسین داهێنرا , قوتابخانە دەستی پێکرد. یەکەمین قوتابخانە کە زانرابێت لەولاّتی عێراقو مسردا بوە لەنێوان ٣ تا ٤ هەزارساڵ بەر لەئێستا. بەمجۆرە قوتابخانە دروست کرا بۆ گواستنەوەی زانیاری و پێگەیاندنی منداڵان , بەلاّم ئەو ڕێگایانەی کە کۆمەڵگای لەسەربوە لەزۆر شوێنی دونیادا لە سەردەمە کۆنەکاندا ئامارژە بۆ قوتابخانەو فێرکردنی باش ناکات بۆ هەمو منداڵان. بۆ نمونە ئەوانەی دەبونە کاهین یان لێپرسراوی حکومی یان ئەندازیارو پزیشك , دەبوایە لەئاستێکی زۆر بەرزی فێربوندا بونایە , ئەم خوێندنە بەرزەش کەم گەنج هەبون تیایدا سەرکەوتن بەدەست بێنن.

هەروەها گەلێكی تری دێرین هەن "يەهوديەكان " دابو نەریتێكی زۆر درێژخایەنیان هەبو لە فێركردندا. دەبوایە هەر سەرۆك خێزانێك منداڵەكەی فێری مێژوو ئاینو یاساكانی یەهودیی بكردایە. كاتێكیش یەهود توشی داگیركردن هاتن ترسان دابو نەریتەكانیان لەناوبچێت , بۆیە هەستان قوتابخانەی ڕەسمیان كردەوەو هەمو كەسێكی دەوڵەمەندو هەژار دەبوایە فێری زمانو ئاینو مێژوی یەهودی ببوایە لەو قوتابخانەیەدا.

ئەوەش یەكەمجار بوە لە مێژوی مرۆڤایەتیدا , كە لە قوتابخانەی ڕەسمیدا هەژارو دەوڵەمەند توانیبێتیان پێكەوە بخوێنن.

## كێلی سەر قەبران

یەكەم كەس كەر بەردو كێلی لەسەر قەبران دانا , گەلێك بون لە ڕاوچیانی گەڕۆك لە ئەفریقیای باشوردا بەناوی "بۆشمان" لەگەڵ چەند خێڵێكی تری سەرەتایی دا لە ئەفریقیا. چونكە بڕوایان وابو گیانە شەڕانیەكان لە جەستەی مردواندا دەژینو ئەگەر بەردێكی قورسیان لەسەر قەبر دانا , ئەوا دەتوانن ڕێگە لە هەستانەوەی گیانە شەرانیەكان بگرن ! بەڵام دانانی كێڵو هێمای سەرقەبران دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێكی زۆر كۆن مرۆڤی سەرەتایی كە نیشانەو كێلی لەسەر قەبران داناوە , تەنها بۆ ڕێگەگرتن نەبوە لەهەستانەوەی گیانە شەرانیەكان. بەڵكو بۆ دیاری كردنی ئەو شوێنەش بوە كە كراوە ڕێگەی لێ بگیرێت.

یونانیەكان كێلیان بۆ سەر قەبری مردوەكانیان بەكارهێناوەو بە نەخشو نیگار ڕازاندویانەتەوە. یەهودیەكانیش بە كێلێكی بەرز گۆڕەكانیان دیاری كردوە. مسریەكانیش لەو شوێنانەی مردوەكانیان دەناشت بە نیشانەو قوچەك دیاریان دەكرد.

خەڵكی بۆ ڕازاندنەوەی گۆڕەكان شتی جۆراوجۆریان بەكارهێناوە وەكو پردو دانانی بەردی درێژی نەخشێنراو و بێشكەی لەدار دروست كراو و دروست كردنی خانوو كۆشكی گەورە لەسەر گۆڕەكان. لەگەڵ بڵاوبونەوەی ئاینی مەسیحیدا ناسینەوەی قەبر بو بە شتێكی باوو خاچ بو بە یەكێك لە بەرچاوترین نیشانەكان لەنێوان مەسیحیاندا.

ڕازاندنەوەی قەبران بە گوڵ نەریتێكە دەگەڕێتەوە بۆ سەر دەمانێكی زۆر كۆن

یونانیەکان گوڵی لەزێڕ دروست کراویان لەسەر گۆڕەکان داناوە. لەسەرەتای مەسیحیەتدا لە کاغەزو پەڕۆ گوڵ دروست دەکراو وەکو یادگاریەك دەدرایە مردوەکە.

## کەی جەمسەری باکوری دۆزرایەوە ؟



هەردو ناوچە جەمسەریەکە دەوری هەردو جەمسەری جوگرافی زەوی دەدەن. هەردوو جەمسەرەکەش دەکەونە ناوەڕاستی ئەو دو ناوچەیەوە. ئەوانیش ناوچەی جەمسەری باکورو جەمسەری باشورە. ناوچەی جەمسەری باکوریش بە ناوچەی جەمسەری باکوری ناسراوە.

ئەم ناوچەیە هەر لە سەردەمی یونانی کۆنەوە سەرنجی مرۆڤی ڕاکێشاوەو مرۆڤ حەزی کردوە دەربارەی شت بزانێت. بەڵام ئەو پیاوەی فەزڵی دۆزینەوەی جەمسەری باکوری بۆ دەگەڕێتەوە دۆزەرەوەی بەناوبانگی یونانی "ڤیسیاسە" کە لە سەدەی چوارەمی پ ز لەدەریای سپی ناوەڕاستەوە بەرەو باکور دەستی بە ڕۆیشتن کرد بەرەو لای ناوچەی جەمسەری باکور. دەشێت پیاوانی وڵاتی باکور وەکو نەرویجو بەریتانیا پێش ڤیسیاس گەیشتبنە دەریاکانی باکور , بەڵام هیچ بەڵگەیەك نیە ئەوە بسەلمێنێت.

لە سەدەی شازدەهەمدا لێکۆڵینەوەیەکی گەورە دەست پێکرا سەبارەت بە گوزەرەکانی باکوری ڕۆژئاواو باکوری ڕۆژهەڵات. لە ئوروپاوە بەرەو ڕۆژهەڵات. زۆر لە دۆزەرەوەکان بەرەو ناوچەی جەمسەری باکور ڕۆیشتنو زۆر شت لەبارەیەوە فێربون.

ئەم لێکۆڵینەوەیە تا سەرەتای سەدەی بیستەم درێژەی هەبو. تا کاتێك دۆزەرەوەی نەرویژی "ڕوالدا مۆندسن " لەساڵی ١٩٠٣ دا شێوەی ئەو ڕێڕەوانەی دۆزیەوەو دوای ئەوە دۆزەرەوەکانی تر ئامادەبون هەوڵ بدەن بۆ گەیشتنە خودی

جەمسەری باکوری.
ئەدمیرالی ئەمریکی "ڕۆبەرت بێری " هەستا بە هەڵمەتێکی دۆزینەوە لەسەر بەفرەکانی دەریای جەمسەری لەبنەکەی بەشی باکوریەوە لە دورگەی ئیلیزمیر. وە لە ٦ نیسانی ١٩٠٩ دا یەکەم پیاو گەیشتە جەمسەری باکور بەلأم یەکەم گەشتی ئاسمانی بەسەر جەمسەری باکوردا "ڕیتشارد بێردی " ئەمریکی کردی لە ٩ ئایاری ١٩٢٦ دا.

## کێ نەوتی دۆزیەوە ؟

ئەو نەوتەی دەیدەلأند بۆ سەر زەوی , لای زۆربەی گەلانی کۆنی دونیادا ناسراوبو , هەندێك جار خەڵکی بۆ گراندنی چرا بەکاریان دەهێنا. لە ولأتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا ناوچەی "یاگنی " ی شاخاوی چەڵەنەوتی زۆر دەوڵەمەندی تێدابو , لەهەندێك شوێندا هێندە لەسەر زەویەوە نزیك بو وەکو جۆگەلە لەبەری دەڕۆیشت. لەکۆندا نەوتی خاو وەکو دەرمان بەکارهێنراوە. بەلأم بەبیری هیچ کەسێکدا نەدەهات بۆ نەوت بگەڕێت. فەزڵی گەڕان بەدوای نەوتدا دەگەڕێتەوە بۆ پارێزەرێکی نیوێۆرکی بەناوی "جۆرج پیشڵ ". پیشڵ هەستا بەشیکاری نمونەیەك لە نەوت و بۆی دەرکەوت کە دەشێت لەپترۆڵ زۆر مەوادی تری بەسود بەرهەم بهێنرێت. بۆیە لەساڵی ١٨٥٧ دا پیشل پیاوێکی بەناوی "ئۆدین دریك " ڕاسپارد تابەرپرسێتی مومتەلەکاتە نەوتیەکان لە "ئویل کریك " ی نزیك تیتۆ سڤیلی بنسلیڤانیا بگرێتە ئەستۆ.
دریك بڕیاری دا زەویەکی نەوتاوی هەڵکەنێت بۆ گەڕان بەدوای نەوتدا. بەلأم درزی زەویەکە کێشەی گەورەبو لەم کارەداو لەئەنجامدا بیرۆکەیەکی زۆر گرنگ هاتە بیری دریك دا : کە بۆچی بۆری ئاسن دانەبەزێنێت بۆ ڕێگەگرتن درزە خورماوەکانی دیوارەکە ؟
ئەم بیرۆکەیە تا ئەمرۆش لەهەموو بیرە نەوتەکانی دونیادا پەیڕەو دەکرێت. لەڕۆژی یەکشەممە ٢٨ ی ئابی ١٨٥٩ دا , قوڵی چاڵە نەوتەکە گەیشتبوە ٢١ مەترو دریك بڕیاری دا سەیرێکی بیرەکە بکات. کە سەیری کرد بینی شلەیەکی ڕەشی تێدایە. هەستا بە دابەزاندنی ئاوگردانێکی داخراو بە تەلێك، پاشان ڕایکێشایە سەرەوەو بۆنی کرد , بینی نەوتە. کەواتە دریك یەکەم کەس بو بەدوای

نەوتدا گەڕا , هەواڵی دۆزینەوەی نەوت بەخێرایی بڵاوبوەوەو بەوەش سەردەمێکی نویٚ لەژیانی مرۆڤدا دەستی پێکرد.

## کەی ئاگاداری پەیدابو؟

ئاگاداری جۆرێکە لە ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لەشتێك. کە بریتی یە لە ئاگادارکردنەوەیان لەشتێك یان کالأیەکی فرۆشتن یان کارێکی خزمەتگوزاری یان هەستان بەکارێکی دیاریکراو. یان تەنانەت ناساندنی کەسێك.
بەوجۆرە ئاگاداری لەسەرەتادا بەشێوەیەکی سروشتی پەیدابوەو شێوازی زۆری بەخۆیەوە بینیوە. بۆ نمونە لە مسردا دەستنوسێکی سەر کاغەزی بەردی دۆزرایەوە لێی نوسرابو کە کەسێك وبنوە , هەرکەسێك بیدۆزێتەوە خەڵات دەکرێت , ئەمە لەڕاستیدا ئاگاداریە. لەمسرو یونانیشدا نزیکەی ١٥٠٠ ساڵ پێش , بەتابلۆ ئاگاداری خەڵکی دەکرایەوە لەخزمەت گوزاری بەردەست لەدەرەوەی مالأندا , ئەمەش جۆرێك بوە لە ئاگاداری.
لەگەڵ داهێنانی چاپەمەنیدا ئاگاداری شێوازێکی نوێی بەخۆیەوە بینی. لەدەوروبەری ساڵی ١٤٧٧ دا یەکەم ئاگاداری چاپکراو لە لەندەندا بڵاوکرایەوە دەربارەی فرۆشتنی کتێبێك لەسەر نوێژ. یەکەمین ئاگاداریش لەڕۆژنامەدا بڵاوکرایەوە لە ڕۆژنامەیەکی لەندەنیدابو لەساڵی ١٦٢٥ دا.
لەدوای ساڵی ١٧٠٤ لەوڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکادا دەست کرایە بڵاوکردنەوەی ئاگاداریەکان لەبەرامبەر کرێی بڵاوکردنەوەدا. بەهاتنی ساڵی ١٧٧١ لە مستوگناتەکانی ئەمریکادا ٣١ حەفتەنامە هەبون کە هەمویان ئاگادارییان بڵاودەکردەوە.
لای هەموان ئاشکرایە ئەمرۆ ئاگاداری تەنها لەڕۆژنامەکاندا بڵاوناکرێتەوە , بەڵکو لە گۆڤارو میدیاکانیشدا بڵاودەکرێتەوە. پەخشی یەکەم ئاگاداری بازرگانی لەدەوروبەری ساڵی ١٩٢٠ دا بڵاوکرایەوە. دوای جەنگی جیهانی دوەمیش ئاگاداری بازرگانی بەشێوەیەکی زۆر فراوان لە تەلەفزیۆنەکاندا پێشکەوتو بیرۆکەی ئاگاداری زۆر بەخێرایی بڵاوبوەوەو ئەمرۆ ئاگاداری لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان بوە بە شتێکی زۆر ئاسایی‌و تەنانەت زۆرکەس ئاگاداریەکان , لەزهنیاندا دەمێنێتەوە تا زنجیرە تەمسیلیەکان‌و ئەو بەرنامانەی کە دەیبینین.

## زەردویی

ئایا دەزانیت کاتێك فەرەنسیەکان ویستیان کەناڵی پەنەما بدرن , ناچاربون بەهۆی ئەو نەخۆشی زەردوییەوە کە توشی کرێکارەکان بو کارەکەیان بوەستێنن ؟ تا لەساڵی ۱۹۰۰ دا "والتەر راید " هۆکاری زەردوییو چۆنیەتی گواستنەوەی دۆزیەوە , لە ئەنجامی ئەو دۆزینەوەیەدا دەستکرایەوە بە ئیش کردن لە کەناڵەکەداو لەساڵی ۱۹۱٤ دا کارکردن تیایدا کۆتایی هات.

زەردویی لە نەخۆشیەکانی ناوچە گەرمەکانە. لە تایبەتمەندیەکانی میزی زولالیو یەرەقانو خوێن چونو رشانەوەیە. ئەگەر نەخۆشەکە دوربخرێتەوە لەخەڵك یان شوێنەکە دورە دەستو چەپە بێت , ئەوا مەترسی نەخۆشیەکە کەمتر دەبێتو چاك بونەوەشی نیمچە مسۆگەرێك دەبێت. بەڵام ئەگەر بو بە پەتا ئەوا ٥٠٪ ی توشبوان بەم نەخۆشیە دەمرن.

ئەم نەخۆشیە لە ئەنجامی هێرشی ڤایرۆسێکەوە دەبێت بۆ سەر جگەرو ئەم ڤایرۆسە خانەکانی جگەر لەناو دەباتو دەبێتەهۆی "یەرەقان " زەردوییش ناوەکەی پر بە پێستی خۆیەتی چونکە رەنگی نەخۆشەکە زەردهەڵدەگەرێت. ئەم ڤایرۆسە بەهۆی مێشولەوە دەگوێزرێتەوە , جۆرێکی تایبەت لە مێشولە مێینەکان دوای سێ رۆژ لە توشبونی کەسەکە خوێنی دەمژێتو دوای نزیکەی دوانزە رۆژ ڤایرۆسەکە لە مێشولەکەدا پەکی دەکەوێت. کاتیك مێشولەکە بە کەسێکەوە دەدات ئەگەر ئەو کەسە لەدژی زەردویی نەکوترابێت ئەوا نەخۆشیەکەی پەرە دەسێنێت.

نەخۆشی زەردویی هیچ چارەسەرێکی نیە , باشترین چارەسەریش خۆپاراستنە. کوتانێك هەیە وادەکات خەڵکی بەرگری دژی ئەم نەخۆشیە پەیدا بکەن. هەروەها زاڵبون بەسەر مێشولەدا لەو ناوچانەی کە نەخۆشی زەردویی تێدایە رێگەیەکی ترە بۆ خۆپاراستن لەم نەخۆشیە.

## توخمە خێرو شەرەکانی سروشت کامانەن ؟

کاتێك "مندلیف " لەساڵی ۱۸۹٦ دا خشتەی سوری بۆ توخمەکان دانا , بیری لەلایەنە رەوشتیو مرۆییەکانی ئەم توخمانە نەکردەوە. ئەمرۆ تەنانەت توخمەکانی سروشتیش بێ پەیوەندی نین بەم لایەنەوە.

ئەمەش ڕابەرێك بۆ توخمە "خێر"و "شەڕ" ەكانی خشتەی سوڕی كە ژمارەی گەردیلەكانی هەریەكێكیان لەناو جوت كەوانەدا نوسراوە :

*هایدرۆجین (١) بچوكترین‌و بەربلاوترین توخمە , توخمێكی "شەڕە " لەو كاتەوەی ناوی كەوتوە لەگەڵ بۆمبای نایترۆجینیدا. بەلام ناوبانگی بەرەو باشی دەچێت لەبەر هۆیەكی زۆر سادە , ئەویش ئەوەیە هایدرۆجینی سوتاو پێی دەوترێت "ئاو " لەبەرئەوە هایدرۆجین سوتەمەنیەكی تەواو پاكە. سوتەمەنی "پاكی " تازە ڕێژەی هایدرۆجینی زیاترە لە كاربۆن بۆ هایدرۆجین لە داردا (١٠٠-١ ) لەخەڵوزدا (١-١) لە نەوتدا (١-٢) لەگازی سروشتیدا (١-٤) ە.

ئەگەر كار بەمجۆرە بچێت ئەوا مرۆڤەكان لەداهاتودا هایدرۆجینی پاكی لەئاو دەرهێنراو دەسوتێنن بە بەكارهێنانی وزەی لە تواندنەوە یان تیشكی خۆردا.

*لیسیۆم (٣) ئەم كانزایە لە چارەسەركردنی جۆرەها نەخۆشی عەقڵیدا بەكاردەهێنرێت‌و كەسیش نازانێت ئەوە چۆن ڕویدا.

*بۆرۆن (٥) هێشتا لە توخمە شەرانیەكانە.

*هیچ توخمێك وەكو كاربۆن بەختی خۆی لەدەست نەداوە , بە تایبەتی دوای تۆمەت باركردنی بە بەرپرسێتی پیس كردنی ژینگەو ئەو گۆڕانكاریە سلبیانەی دروستی دەكات. تا وای لێهات هەندێك ولات بەباجی كاربۆن ناوی ببەن.

*نایترۆجین (٧) لەتوخمە خێرەكان بو بەلام گۆڕا بۆ شەڕ. لەسەرەتادا فەزڵی شۆڕشی كشتوكاڵی وەكو پەین بۆ ئەم گەڕێنرایەوە. كە دەركەوت تیشكی كیمیاوی دروست دەكات. كە لە بزوێنەری ئۆتۆمبیلەكانەوە دەردەچن‌و دەبێتەهۆی شێرپەنجەو ئاوی خواردنەوە پیس دەكات‌و دەریا‌و ڕوبارەكان پڕ لە قەوزە دەكات‌و ئەو ئەندامیەتانە دەكوژێت كە ئۆكسجین دروستیان دەكات.

*ئۆكسجین (٨) سەرەڕای كاریگەری چینی ئۆزۆن لەسەری بەشێوەیەكی سلبی , بەلام هێشتا لای خەڵكی ناوبانگێكی باشی هەیە.

*صۆدیۆم (١١) ئەم كانزایە تیشكدەرە ناوبانگی خراپەو لە دۆخە شلەكەیدا لە ساردكردنەوەی كارگەكانی پیتاندندا بەكاردەهێنرێت. پزیشكەكان لەناوی خوێدا دەری دێنن.

*ئەلەمنیۆم (١٣) ئەو كانزا سوك‌و بەهێزە كە لە دروست كردنی بچمی فڕۆكەدا بەكاردەهێنرێت , لەم دواییانەدا بەوە تاوانبار دەكرێت كە هۆیەكی یارمەتی دەرە

بۆ توشبون بە نەخۆشی (زهمیر ) بەلاّم بەهەرحالْ پێویستی بە ئەندازەیەکی زۆر لە کارەبا هەیە تا دەتوێنرێتەوە.

*سلیکۆن (١٤) لە ڕیشاڵی مەمکە دروستکراوەکاندا بۆ ژمارەیەکی زۆر لەبەکارهێنان بەدرێژایی دوو دەهەی ڕابوردو. ئەم توخمە بە خراپ دادەنرێت , هەرچەندە بەم دواییە ناوبانگی بەرەو خراپ بون دەچێت , بەتایبەت دوای دۆزینەوەی لاوازی لەڕیشاڵەکانی ئەو سلیکۆنەی لەچاندنی مەمکدارە دەستکردەکاندا بەکاردێت.

*گۆگرد (١٦) خەڵکی وا ڕاهاتون لەدێر زەمانەوە هەمو کێشەکان بخەنە ملی ئەم توخمە دوای ئەوەی باس لەسەر ترشە باران بڵاوبوەوە لەسەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم دا.

بەلاّم بەم دواییانە دەرکەوت ئۆکسیدی کبریتی دەرچو لە وێستگەکانی وزەوە دارەکان لەناونابات , بەڵکو ئۆکسیدی نایترۆجین و ئۆزۆنن کە لە ئۆتۆمبیلەوە دەردەچن و دەبنەهۆی کوشتنی دارەکان. دوای ئەوە دەرکەوت کە (ئۆکسیدی کبریت ) لە بەرگی زەمهەریریدا کە (چینێکی ئارامە , دەکەوێتە سەروی ترۆپۆسفیرەوە ) نیە کە وادەکات هەورەکان لەئاسماندا کەم ببنەوەو بەری خۆر بگرن.

*کلۆر (١٧) ناوبانگی کلۆر وەکو گازێك کە بۆ کوشتنی مرۆڤ بەکاردەهێنرا لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا زۆر خراپ بو. دوای ئەوە خراپتربو کە دۆزرایەوە فلۆری نزیکی هێرش دەکاتە سەر چینی ئۆزۆن.

*بۆتاس (١٩) ئێمە پێویستمان بە خواردنی مۆز هەیە بۆ ئەوەی دڵنیابین کە هێشتا بۆتاس توخمێکی خێرە.

*تیتانیۆم (٢٢) ئەو کانزاییە , کە تەکنەلۆژیای پێشکەوتو لەزۆر لە جێبەجێ کردنە زانستیەکاندا بەکاری هێناوە. بەڕەنگە بریقەدارەکەی بۆ بۆیاخ کردنی ژێردەریایی و فڕۆکەکان بەکاردێت.

*ئاسن (٢٦) خەڵکی وازیان لە پۆلاّ هێنا ئاسنیان خستە شوێنی , سپێناخ زۆر دەوڵەمەندە بە ئاسن , زانایان پێشنیاری ئەوەیان کرد "زەریای جەمسەری باشوری " بەچینێك لەئاسن بڕوێنرێت. بۆ ئەوەی درەختەکان بەخێراییەکی زیاتر گەشەبکەن. بۆ جێگیرکردنی کاربۆن لەبەرگەی کەشدا. بەلاّم هێشتاکە نەچوینەتە

سەردەمی ئاسنەوە.

*زەرنیخ (٣٣) ئەمەیان ژەهرە , بەلآم کاتێك لەگەڵ گالیۆم دا تەزویج کرا بوبە نیمچە گەیەنەرێك.

*ئیتریۆم (٣٩) لەپێك هێنەرە سەرەکیەکانی گەیەنەری گەرمی زۆر گەیەنەرە کە لە ساڵی ١٩٨٧ دا داهێنرا.

*ئیریدیۆم (٧٧) کانزایەکە لە فەزای دەرەوەدا زیاتر دەست دەکەوێت وەك لەزەویدا. کاتێك ناوبانگی دەرکرد کە لەناو بەرانێکدا دەرکەوت کە مێژوی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گیانلەبەرە لەناوچوەکانی وەکو دایناصور , پێشی نزیکەی ٦٥ ملیۆن ساڵ بەر لەئێستا. دۆزینەوەی بەڵگەیەکە , کە زەوی لەسەردەمی زۆر کۆندا خۆی بە نەیزەکێکدا کێشاوە.

*پلاتین (٧٨) توخمێکە هەڵکەندن لەسەری زۆر ئاسانەو لە پیشەسازی زێرو جەواهیراتدا لەگەڵ گۆڕێنەری هەڵکەندنی ئۆتۆمبێلەکاندا بەکاردێت , لەبەرئەوە نرخی زۆر بەرز بوەوە.

*جیوە (٨٠) توخمێکی خێرە لە تەرازوی گەرمادا , بەلآم توخمێکی شەڕە لە ماسیە ژەهراویەکاندا.

*سالیۆم (٨١) کانزایەکی زۆر قورسەو بەناوبانگ نیە. هەندێك لە ڕژێمە دکتاتۆرەکان بۆ لەناوبردنی دوژمنەکانیان بەکاریان هێناوەو دەیهێنن.

*قوڕقوشم (٨٢) ئەمرۆ مرۆڤ لەقوڕقوشم نەوتو بۆیاخ دەردەهێنێتو بۆ سەربانی مالآنیش بەکاردەهێنرێتو نرخی زۆر گرانە.

*ڕادۆن (٨٦) توخمێکی فلزی تیشکدەرە , گازێك لەناو سکی زەویەوە دەردەکات کە گەردیلەکانی "ئەلفا"ی تێدایە. دوای جگەرەکێشان یەکێکە لە هۆیەکانی نەخۆشی شێرپەنجە.

*یۆرانیۆم (٩٢) توخمێکی کوشندەیە , پلۆتۆنیۆمی لێ وەردەگیرێت لەگەڵ زۆربەی توخمە تیشکدەرە پڕ مەترسیەکاندا. وەکو بۆمباو وێستگەکانی وزەو پاشماوەکاندا. بەلآم ئەگەر لە تیشکدەرەکانی ڕزگارمان بو , دەگۆڕێت بۆ کانزایەکی زۆر گرنگ لەدروست کردنی قورقوشمی کوشندەدا.

*پلۆتۆنیۆم (٩٤) تەنیا شتێك کە دەتوانێت ناوبانگی ئەم کانزایە بپارێزێت ئەوە کە یارمەتیمان دەدات لە چارەسەری شێرپەنجەدا , هەروەها یەکێکیشە

لەهۆیەکانی توشبون بەشێرپەنجە.

## بۆچی سەگ لەهاویندا زمان دەردەهێنێت ؟

سەگ وەکو مانگاو فیلو مرۆڤ گیانلەبەرێکی مەمکدارە ، هەمو ئاژەڵە مەمکدارەکان خوێنیان گەرمە. بەڵام لەجیهانی گیانداراندا تەنها مەمکدارەکانو باڵندەکان خوێن گەرمنو گیاندارەکانی تر خوێن ساردن. گیاندارە خوێن گەرمەکان پلەی گەرمای لەشیان تا ئەندازەیەك جێگیرە بەڵام گیاندارە خوێن ساردەکان ، بەپێی پلەی گەرمای دەوروبەر پلەی گەرمای لەشیان دەگۆڕێت.
لاشەمان بە بەردەوامی گەرما بەرهەم دەهێنێت ، بەشێکی ئەم گەرمایە لەڕێگەی پێستی ڕومەتەوە دەردەچێت ، چونکە لەژێر پێستی ڕومەتدا لوی عارەقی هەیە کە بریتی یە لەکونی زۆر بچوك عارەقەکەی لێ دێتەدەرەوە. کاتێك عارەقەکەی لەشمان گەرما دەمژێت ، لەئەنجامی ئەوەدا هەست بە سەرمادەکەین بۆ بەدبەختی هەموو مەمکدارەکان ناتوانن ، بۆ ڕزگاربون لە گەرمای لاشەیان ئەو ڕێگایە بەکاربێنن. بۆ نمونە لەسەگدا ژمارەیەکی کەم نەبێت لوی عارەق نیە لەبەرئەوە سەگ وەکو مرۆڤ عارەق ناکات. هەروەها شێرو پڵنگو مەیمونو هیتریش لەگەڵ ڕسقو باڵندەکاندا.
سەگ خاوەنی ئالیەتێکی جیاوازە بۆ تەحەکوم کردن بەپلەی گەرمای لەشیەوە. ئەویش بە دەرکردنی زمانیەتی بۆ دەرەوە کاتێك سەگ هەسکەهەسك دەکات هەوا لە لوتیەوە هەڵدەمژێتو لەدەمیەوە دەری دەدات. بەوەش لیکەکەی دەبێتەهەڵم ، هەڵم کردنی لیکیش وادەکات سەگەکە هەست بە ساردبونەوەو پشودان بکات.
فیل بەشێوەیەکی زۆر سەیر پلەی گەرمای لاشەی دەپارێزێت ، لەبەرئەوەی پێستی دەموچاوی زۆر ئەستورەو گەرمای لێ نایەتە دەرەوە ، بۆیە بەپێستە ناسکەکەی هەردو گوێی لەگەرما زیادەکەی لەشی ڕزگاری دەبێت. خواش دوگوێی هێندە گەورەی داوەتێ کە دەتوانێت بە ئاسانی بیان جوڵێنێت و لەگەرما زیادەکەی لەشی خۆی ڕزگارکات.

## هە ندیك گوڵ هەن تەنها لە شەودا دەکرێنەوە

زۆر ئاژەڵو گیاندار هەن لەڕۆژدا وچان دەدەنو لەشەودا چالاك دەبن ، ڕوەکی

زۆریش هەن لەشەودا گەش دەبنەوە وەکو "شازادەی شەو " زۆر جۆری تریش لەڕوەکەکان.
ئەو گولأنەی بەشەو دەکرێنەوە بۆنیان زۆرخۆشە , بەهۆی ئەو بۆنە خۆشەوە زۆر لە گیانداران بۆلای خۆیان ڕادەکێشن. وەکو "بشارە " کاتێك ئەو زیندەوەرانە لەسەر گوڵەکە دەنیشنەوە هەندێك لەشیلەو تۆوی گوڵەکە دەنوسێتە قاچ‌و باڵەکانیانەوەو کە دەچن لەسەر گوڵێکی تری هەمان جۆر دەپەڕن بەوتۆوە,وە بەبێ کرداری پەڕین هیچ گوڵێك بەرنادات. ئەگەریش بەری نەدا ئەو تۆوە کە بەرپرسە لە سەوزبونی سەر لەنوێی ڕوەکەکە بەرهەم نایەت.
زۆربەی ئەو گولأنەی بەشەو دەکرێنەوە بەرگەی پلەی گەرمای بەرزو ڕوناکی ڕۆژ ناگرن. "شازادەی شەو "یش بەرگەی پلەی گەرمای بەرز یان پلەی گەرمای زۆر نزم ناگرێت لەگەڵ تیشکی ڕۆژدا بۆیە لەشەودا دەکرێتەوە. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی ئەو گولأنەی لەشەودا دەکرێنەوە ئەوەیە ڕەنگیان ڕاکێشەر نیەو بۆ چاویش قورسن. لەبەرئەوەی ئەو ڕەنگانە لەشەودا نابینرێن , ئەو گولأنەی شەو دەکرێنەوە سپین.
چونکە سپی ڕەنگێکە بەئاسانی لەتاریکیدا دەبینرێت‌و بەهێزیشە لەڕاکێشانی ئەو مێروانەی دەپەڕن. بۆیە دەبینین "شازادەی شەو " ڕەنگی سپی‌و بۆنی خۆشە.

## ناوچەکانی کاتی (ماوەیی )

پێش ئەوەی ناوچە کاتیەکان دابنرێن کێشەو تەشویشی زۆر هەبون , بەتایبەت خەڵکی ناچاردەبون کاتەکانی هێڵی شەمەندەفەر بەکاربێنن. بۆ ڕێگەگرتن لەم تەشویشە ولأتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەساڵی ١٨٨٣ دا دەستی دایە بەکارهێنانی یاسایەك بۆ ناوچەکانی کاتی.
لەساڵی ١٨٨٤ دا کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی لەواشنتۆنی پایتەخت بەسترا بۆ دانانی سیستەمێك کە لەگەڵ هەموو جیهاندا بگونجێت , ئەوەبو سەر زەوی دابەش کرا بۆ ٢٤ ناوچە , کەهەر هێڵێکی ١٥ پلە لە هێڵی درێژی داگیربکات. ئەم دابەشکردنە سروشتیە بۆ زەوی بەڕێژەی ١٥ پلە لەکاتژمێرێکدا دەسوڕێتەوە کە کات لەهەموو ناوچەیەکدا هەمانکات بێت , بەلأم جیاوازی هەر ناوچەیەك‌و

ناوچەیەکی کە لە دوایەوە دێت یەك کاتژمێر بێت. "گرینج " ی لەندەن لەبەریتانیا دەستنیشان کرا خاڵی دەستپێکردن بێت.

بەوجۆرە ئەگەر کات لە گرینج نێوەڕۆ بو ئەوا کات لەناوچەی ڕۆژهەلآتی تەنیشتیەوە دەکاتە کاتژمێرێکی پاش نیوەڕۆو کات لەناوچەی ڕۆژئاوای تەنیشتیەوە کاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆ دەبێت. وە لە نیۆیۆرك کەلە گرینجەوە پێنج ناوچە دورە کاتژمێر دەکاتە حەوتی بەیانی.

ولآتە یەکگرتوەکان دابەشکراوە بۆ چوار ناوچە کە بریتی یە لە بازنەکانی هێڵی درێژی ٧٥ , ٩٠ , ١٠٥ , ١٢٠ بەکاتەکانی ئەم ناوچانە دەوترێت کاتی ڕۆژهەلآتی , کاتی ناوەندی , کاتی شاخ , کاتی باسیڤیکی. لەبەرامبەرەکەی تری جیهانەوە هێڵێکی تری ڕاست هەیە کە هێڵی گۆڕینی بەرواری نێودەوڵەتیە , کە بریتی یە لە هێڵی درێژی ١٨٠ کاتێك کات لە گرینج نیوەڕۆ دەبێت ئەوا کات لە هێڵی گۆڕانی بەرواری نێودەوڵەتی نیوەی شەوە.

کاتێك کەسێك ئەو هێڵە ببڕێت بەرەو ڕۆژئاوا ئەوا ڕۆژێکی دەست دەکەوێت , ئەگەر بەرەولای ڕۆژهەلآتیش بچێت ئەوا ڕۆژێکی لەکیس دەچێت.

## گۆنەستێرە

بێگومان هەمومان دەزانین گۆنەستێرە چی یە. پەپولەیەکە لەشەودا دەفڕێت و تیشکێك دەردەدات. مندالآن حەز لەبینینی دەکەن و زانایانیش لەدێر زەمانەوە سەرقاڵی ئەوەن کە بزانن چۆن و بۆچی گۆنەستێرە ڕوناکی دەردەکات. لەڕاستیدا گۆنەستێرە کرمێکی فڕیوە , نێرو مێکانیان باڵیان هەیەو ڕەنگیان ڕەشەولاشەیان نەرمە. بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر شیلەی گوڵ دەژین و بەڕێژەیەکی زۆر لەناوچە ئیستیواکاندا هەن.

گۆ ئەستێرە ڕوناکیەك وەکو بریسکە دەردەکات , ئەو بەشەش تیشکەکە دەردەکات دەکەوێتە بەشی دواوەی ژێری سکەیەوەو دەمار تەحەکومی پێوە دەکات و دو مادەی کیمیاوی تێدایە پێیان دەوترێت "لۆسفرین " ئەو مادەیەیەکە تیشکەکە دەردەکات لەگەڵ "لوسیفیر " دا مادەی یەکەم لەگەڵ ئۆکسجیندا یەکدەگرن و تیشکەکە بەرهەم دەهێنن , لەکاتێکدا مادەی دوەم لەم یەکگرتنەدا وەکو یارمەتی دەرێکە.

ئەوەی گرنگە بیلێین ئەو ڕوناكیەی گۆئەستێرە دەری دەكات , هیچ گەرمی تێدانیەو ئەم كردارەش لەبەرهەم هێنانی تیشكدا پێی دەوترێت "درەوشانەوە ". لوسفرینیش بەمادەی سەرەكی دادەنرێت لەڕودانی ئەم درەوشانەوەیەدا ئەو ڕوناكیەی گۆئەستێرە لەشەودا دەری دەكات پرتەقاڵی یان زەردە. لەگەڵ ئەوەی زانایان دەتوانن لە تاقیگەكانیاندا ئەو ڕوناكیە بەرهەم بێنن. بەلأم بەبێ بونی هەردو مادەی لۆسفرین‌و لۆسیفیر ناتوانن ئەو كارەیان ئەنجام بدەن.

پرسیار : بۆچی گۆئەستێرە ئەو ڕۆناكیە بەرهەم دەهێنێت ؟

هۆی یەكەم : بۆیە نێرو مێ ئەم ڕوناكیە بەرهەم دەهێنن تا هەریەكە ئەویتر بۆلای خۆی ڕابكێشێت.

هۆی دوەم : گۆئەستێرە بەو ڕوناكیەی دوژمنەكانی دەترسێنێت بۆ ئەوەی هێرش نەكەنە سەری. هۆیەكەی هەرچی بێت , هەمو كەسێك حەزدەكات لەشەودا گۆئەستێرە ببینێت !

## وشتر

بە وشتر دەڵێن كەشتی بیابان , لەبەرئەوەی بەبێ ئاوخواردن لە شەش ڕۆژ بۆ دەڕۆژ دەتوانێت بژێت. خوا بەشێوەیەك لوت‌و گوێ‌و چاوی دروست كردوە كە تۆزو گەردی بیابان كەمترین كاری لێدەكات‌و گیانلەبەرێكی بەسودە بۆ ڕێبوارانی بیابان.

باوەڕێكی واهەیە كە حوشتر بەشێوەی ژەمە خواردن پێویستی بەخواردن نیە , بەلأم ئەمە ڕاست نیە. حوشتریش وەكو ئاژەڵەكانی تر بەڕێكوپێكی پێویستی بەخواردن‌و ئاو هەیە. بەلأم ئەو دەتوانێت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك پەسیسەی بكات. حوشتر (سنام ) ێكی گەورە لەسەر پشتی هەیە. كۆگایەكی چەوریەو كێشی دەگاتە ٤٥ كیلۆگرام. حوشتر ئەو چەوریە وەكو سەرچاوەیەكی وزە بەكاردەهێنێت لە گەشتە درێژە بیابانیەكەیدا. لەسكی حوشتردا دو تورەكە هەیە لەشێوەی كەمۆڵە یان بوتل دایەو بۆ پەسیسەكردنی ئاو بەكاری دەهێنێت. كاتێك حوشتر ئاوی دەست نەكەوێت پەنا دەباتە بەر ئەو تورەكە ئاوانە , لەبەرئەوەیە دەتوانێت بۆ ماوەیەكی زۆر خۆراك‌و ئاو نەخوات. چونكە پشت بەچەوری سنام‌و ئاوی ناو ئەو تورەكانە دەبەستێت. حوشتر ئەوەندە زۆر لەخۆراك‌و ئاو پەسیسە

دەكات , كە بەشی ماوەیەكی درێژی بكات.

كاتێك حوشتر ئەو ڕێگە دورە دەبڕێت , سنامەكەی خاو دەبێتەوە كە نیشانەی توانەوەی چەوریەكەیە لەناو سنامدا. هەروەها ئاوی ناو تورەكەكەش بەكاردەبات.

دوای گەشتێكی درێژ حوشتر توشی ماندوبونێكی زۆر دەبێتو بۆ ماوەیەكی درێژ خایەن خۆی بەزەویدا دەداتو پێویستی بە حەسانەوەیەكی درێژ هەیە تا بگەڕێتەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆی.

دوای ئەوە جارێكی تر خواردنو ئاو دەخواتەوە , وردە وردە لەش ساغو بەهێز دەبێتەوە. حوشتر هەر لەكۆنەوە هاوڕێی مرۆڤ بوە , دەڵێن مسریەكان پێش نزیكەی ٣٠٠٠ ساڵ حوشتریانماڵی كردوە. تا ئەمڕۆش هۆیەكی گرنگی گواستنەوەیە بۆ ڕێبواران و كاڵاكان لەبیابانو ناوچە لماویەكاندا.

## مێروە تەمەن درێژەكان

ئەگەر زۆربەی مێروەكان لەگەڵ زیندەوەرانی تردا بەراورد بكرێت زۆر تەمەن ناكەن. ئایا دەزانن ئەو مێروانە كامانەن كە زۆر تەمەن دەكەن ؟
گازۆڵك (قالۆنچە ) لەو گیاندارانەیە كە زۆر تەمەن دەكاتو تەمەنی هەندێكیان دەگاتە زیاتر لە ٣٠ساڵ. مێرولەی سپیش نزیكەی ١٥ ساڵ تەمەن دەكات. (بەرزچیر) جیرەجیرە نزیكەی ١٧ ساڵ دەژێتو مێرویەكی زۆر سەیرە. مێینەكان هێلكەكانیان لەسەر لقی دارەكان دادەنێنو كاتێك جیرەجیرە كە لە هێلكە دەردەچێت دەكەوێتە سەر زەویو پەنهان دەبێتو دەلكێتە ڕەگی دارو ڕوەكەكانەوەو نزیكەی ١٧ ساڵ بەوشێوەیەی دەمێنێتەوەو ئاوگی ڕیشەی دارەكان دەخوات.
پاش ئەو ماوە زۆرەی لەخۆماتدان لەژێر زەویدا غەریزەیەكی نادیار دەیهێنێت بۆ بەر ڕوناكیو بەلقی دارەكاندا هەڵدەزنێت و پێستەكەی فڕێدەدات. تا جیرەجێرە كە بەتەواوی دەربكەوێتو ژیانێكی گورجوگۆڵ لەژێر تیشكی خۆردا دەست پێ دەكات كە نزیكەی تەنها پێنج حەفتە دەژێتو پاشان دەمرێت ! بەوجۆرە ١٧ ساڵ لە نەشونومادا بەسەردەبات تا تەنها پێنج حەفتە لەژیاندابێت !
نێرەكانیان دەنگێكی تیژدەردەكەن كە دەشێت بۆ بانگكردنی مێیەكان بێت. بەپێی قسەی زانایان ئەو ئەندامانەی كە دەنگ لە جیرجیرەكدا دەردەكەن ئاڵۆزترین ئەندامن لەسروشتدا , زیاتر لە ٨٠٠ جۆر جیرجیرەك هەیە لە دونیادا كە ١٠٠ جۆری لەئەمریكای باكوردایە. بەڵام ئەو جیرجیرەكەی ١٧ ساڵ دەژێت تەنها لە ئەمریكادا هەیە , ئەگینا جۆرەكانی تر تەنها دە ساڵ دەژین.

## تاوس

تاوس باڵندەیەكە لەهەمو جیهاندا ناسراوەو كاتێك كلكی بڵاودەكاتەوە دیمەنێكی زۆر قەشەنگی هەیە.
ئایا دەزانن تاوس بۆچی پەرەكانی بڵاودەكاتەوە ؟
تاوس زنجیرەیەك لەپەری جوانی هەیە. كە لە وەرزی ئاوێزان بوندا بڵاوی دەكاتەوە بۆ ڕاكێشانی مێینەكان. بەڵام كاتێك مێینەكان نزیك دەبنەوە پەرەكان

دەچنەوەیەك. دوجۆر تاوس هەیە یەکێکیان لەهندو سیریلانکادایە کە ڕەنگەکەی شینە , دوەمیشی لەباشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادایەو ڕەنگەکەی سەوزە.

درێژی تاوسی نێرە ٧٥ سەنتیمەترەو کلکەکەشی ١٥٠ سەنتیمەترە. مێینە لەنێرینە بچوکترەو کلکەکەشی لەپەڕێکی جوان پێك هاتوە. لەکاتی نمایشکردندا تاوس کلکی بەرز دەکاتەوەو بۆ پێشەوەی دەبات و کاتێکیش ناز بکات , کلکی لەیەك دەدات و دەنگێکی بەرز دەردەکات.

لاشەی تاوسی شین , شین و سەوزە , بەڵام تاوسی سەوز , سەوزو برۆنزیە. مێینەکانیش دوجۆرن سەوزو قاوەیی و کلکیان تاجی پێوە نیە. هەردوجۆرەکە لە دارستانەکاندا دەژین و لەڕۆژدا کۆدەبنەوەو لەسەر داران پەنادەگرن. هەر نێرەیەك لەگەڵ ١ بۆ ٥ مێینەدایەو هەر مێینەیەکیش چوار بۆ پێنج هێلکە دادەنێت. تاوس مەوادی ڕوەکی و ئاژەڵیش دەخوات , تەنانەت دەتوانێت ماری بچوکی جۆری کۆبراش بخوات.

## پترۆل

پترۆل یەکێکە لەو مەوادانەی کە زۆرترین خزمەتی مرۆڤی کردوە. چونکە گەرمی و تیشکمان دەداتی و وزەیە بۆ ئوتومبیل و فڕۆکە و کەشتیەکان و زۆر لەئامێرەکانی تریش. ئەمڕۆ ئەگەر پترۆل نەبێت زۆربەی ئامێرەکان لەکاردەوەستن. لەپترۆل بەنزین و گازو گازۆیل و غازو گریس و ڕۆن و قیرو زۆر لە بەرهەمەکانی تریش دروست دەکرێت.

کەواتە با بزانین پترۆل چی یە ؟

پترۆل وشەیەکی لاتینی یە بەمانای "ڕۆنی بەرد " ین دێت. زانایان باوەڕیان وایە پترۆل لەپاشماوەی ئەو ڕوەك و ئاژەڵانەوە دروست بوە کە پێش ملیۆنەها ساڵە لەدەوروبەری ئاو گەرمەکاندا ژیاون و ڕوبەرێکی زۆریان لەپانتایی زەوی داگیرکردوە. کاتێك ئەو ڕوەك و گیانلەبەرانە مردون لەبنی دەریاکاندا کۆبونەتەوەو بەتێپەڕبونی ڕۆژگار ملیۆنەها تەن لم و قوڕ داپیۆشیون و لەئەنجامی پاڵەپەستۆدا ئەو قوڕولیتەیە گۆڕیویەتی بۆ بەرد.

ڕوەك و گیانلەبەرانیش گۆڕاون بۆ شلەیەکی ڕەش و لەدرزی بەردەکاندا کۆ بونەتەوەو شۆڕشی توێکڵی زەوی بنی دەریا کۆنەکانی گۆڕیوە بۆ زەوی وشك و

دوای ئەوە هەندێك لەو شلەیە دەلاٌندویەتی بۆ سەرزەوی و سەرنجی مرۆڤی ڕاکێشاوە. پترۆل یان نەوتی خاو لەکۆندا وەکو دەرمان بەکارهێنراوە. لەسەردەمی مەسیحیەتیشدا لەهند دا وەکو سوتەمەنی بەکاریان هێناوە. هەروەها لەکۆندا بۆ سوتاندنی چراو وەکو زفتو قیریش بۆ مەبەستی قایم کردنی خشتو گرتنی درزی سەبەتەو ڕۆچونی ئاوو بەستنی درزی کەشتیەکان بەکاریان هێناوە. هندیە سورەکانی ئەمریکاش بۆ چەندین مەبەستی جیاواز بەکاریان هێناوە. کاتێك سپی پێستەکان چونە ئەمریکاوە چاویان لەهندیە سورەکان کردو بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاریان هێنا.

پترۆلی خاو کاتی دەرهێنانی لەچاڵ سودی کەمەو دەبێت پاڵفتەبکرێت. کرداری کردنیش لەبنەڕەتدا لەسەر "دڵپاندن " دەوەستێت لەبەرئەوەی پترۆل تێکەڵەیەکە لەزۆربەی شلەمەنیەکانو غازاتو مەوادە ڕەقەکان. بەهۆی گەرمیەوە دڵپاندنەکە شتە جیاوازەکان لەیەك جودا دەکاتەوە کە سروشت لەنەوتی خاودا دروستی کردوە. ئەوەش شتێکی مومکینە لەبەرئەوەی هەمو بەشێك لەتێکەڵەکە دەکوڵێت یان دەگۆڕێت بۆ غاز لە پلەیەکی گەرمای جیاوازدا.

یەکەم شت بەرز دەبێتەوە بەنزینەکەیە ئەمجا گاز ئەمجا نەوت ئەمجا گازۆیلو گریس.

## تۆو

چۆن باڵندەکان بەهێلکە زۆر دەبن , ڕوەکەکانیش بەتۆو زیاد دەبن. دەبێت کوود بکەینە تۆوەوە بۆ ئەوەی ئەو تۆوەی بەرهەمی دێنیت گەشەبکات. دوای ئەوە تۆوەکە بەتەواوی گەشەدەکات , یان دەڕوێت. دەبێت پشوبدات ماوەی پشودانیش بەگوێرەی جۆری تۆوەکە دەگۆڕێت. زۆربەیان ئەگەر بەتەواوی لەزستاندا پشونەدەن شین نابن.

شین بونی تۆو پێویستی بەشیٌو ئۆکسجین و گەرما هەیە. تیشكو ڕوناکیش یارمەتی هەندێك لەڕوەکەکان دەدات بۆ دەست پێکردنی شین بونی تۆوەکە. ئەگەر تۆوەکە لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا شین نەبو ئەوا دەمرێت. کاتێك مرۆڤ تۆو هەڵدەگرێت بۆئەوەی لەداهاتودا بیوەشێنێت , دەبێت بەوشکی بمێنێتەوە لە پلەیەکی گەرمای دیاری کراود ا.

تۆوەکان لەقەبارەو شێوەو ڕەنگدا جیاوازن , بۆ نمونە جۆرێك لەتۆو هەیە لە ناوەڕاستەوە باریکەو لەچوار دەوریدا خۆراك هەیە کە خواردن ئەداتە ڕوەکە تازەکە تا ئەو کاتەی ڕەگ‌و گەلاّ دروست دەکات‌و دەتوانێت خۆی خواردن بۆخۆی دروست بکات. ئەگەر تۆوەکە بەپیت بێت‌و ماوەی پشوی تەواوکردبێت‌و بەشی خۆی لە شێ‌و ئۆکسجین‌و گەرما وەرگرتبێت ئەوا شین دەبێت. ئەم کردارەش پێی دەوترێت "سەوزبون".

کاتێك شێ دەگاتە تۆوەکە دەست بەسەوزبون دەکات. کاتێك ئاو دەمژێت دەکرێتەوەو کاتێك گۆڕانکاری کیمیاویش ڕودەدات خانەی تۆوەکە جارێکی تر ژیانی بەبەردا دێتەوە. ڕوەکە بچوکەکەی ناو تۆوەکە دەست بە نەشو نوما دەکات‌و زۆربەی بەشەکانی تۆوەکە لەڕوەکە سەوزبوەکەدا دەچێت‌و توێکڵی تۆوەکە دەدڕێت‌و ڕوەکە تازەکە گەورەدەبێت‌و تۆوی تازە دروست دەکات.

دەشێت تۆو بچوك یان گەورە بێت. تۆوی ڕوەکە "بەگۆنیەکان " کە ڕوەکێکی ئیستیوائی ڕەنگینە , سەلکی هەیەو بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت تۆوی ئارگیل زۆر بچوکە تەنانەت وەکو گەردیلەی تۆز دیارە. بەلاّم تۆوی گوێزی هندی "درەختێکە لەدار خورما دەچێت‌و لەولاّتە گەرمەکاندا دەڕوێت‌و بەرێکی گەورەی پێوەیە کە بە گوش داپۆشراوەو شیری تیایەو ڕۆنی لێ دەردەهێنرێت " کێشی هەریەکێکی ١٨ کیلۆگرامە.

هەندێك لەڕوەکەکانیش لەبیست تۆو زیاتر بەرهەم ناهێنن بەلاّم ڕوەکی تری وەکو داریاسقەند mapple هەزارەها تۆو بەرهەم دەهێنێت. تۆوەکان بەجۆرەها ڕێگە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دەگوێزرێنەوە. تۆوە دڕکاویەکان دەلکێنە خوری ئاژەلاّنەوە. بەلاّم ئەو تۆوانەی دەلکێنە قوڕەوە بەڕێگەی لکانیان بە سمی ئاژەلاّنەوە دەگوێزرێنەوە.

ئەو تۆوانەش لەهەوادا هەن لەڕێگەی مرۆڤ و گیانلەبەرانەوە دەگوێزرێنەوە , هەروەها هەندێك تۆو باڵیان هەیەو لەگەڵ بادا دەفڕن. هەندێکی تریش لەتۆو دەکەونە سەر ئاوو هەندێکی تریشیان ڕوەکەکان خۆیان دەیانهاوێژن !

## یەکەمین ئامێری مۆسیقا کامەبو ؟

حیکایەتێکی ئەغریقی هەیە دەڵێت "بان " یەکەم کەس بوە ئامێری مۆسیقای

دروست کردوه که بریتی بوه له "شمشالّ ". حیکایەکە دەڵێت :ڕۆژێکیان بان له کەناری ڕوبارێکدابو گوێی لیّ بو دەنگێکی غەمۆك لەقامیشێکەوه دەردەچێت. ئەویش قامیشەکانی بەدرێژی جۆراوجۆر شکاندو پێکەوەی بەستن , بەوه یەکەم ئامێری مۆسیقای دروست کرد لەجیهاندا !

بەلاّم ڕاستی ئەمەیه , ئێمه ناتوانین مێژوی دروست کردنی یەکەمین ئامێری مۆسیقا لەجیهاندا دەست نیشان کەین. لەبەرئەوەی هەمو کۆمەڵگا سەرەتاییەکان ئامێری مۆسیقای لەو شێوەیەیان دروست کردوه. چونکه ئەو ئامێره مۆسیقیانه گرنگیەکی ئاینیان هەبوەو جەماوەر به سەماکردن یان تەپلّ لێدان یان چەپڵەڕێزان یان بەگۆرانی وتن لەگەڵیدا بەشداری ئاهەنگه ئاینیەکانیان کردوه , که بۆته مایەی دڵخۆشیان , ئەو مۆسیقا سەرەتاییانەش مانای بەشێك لەژیانی خەڵکی داوه. بەلاّم ئەفسانەی "بان"و قامیشەکه ئەوه دەگەیەنێت , که چۆن مرۆڤ بۆیەکەم جار بیری کردۆتەوه ئامێره مۆسیقیه جۆراوجۆرەکان دروست بکات. ڕەنگه به لاسایی کردنەوەی دەنگەکانی سروشت یان به بەکارهێنانی مەواده سروشتیەکانی چواردەوری خۆی بوبێت له بەرهەم هێنانی مۆسیقادا.

ئامێره مۆسیقیه سەرەتاییەکان لەشێوەی تەپلّ دا بونه. دوای ئەوه بو مرۆڤ لەشاخی ئاژەلاّن ئامێره هەواییەکانی دروست کرد. دوای ئەوه ئامێری مۆسیقی نویّ له مس دروست کرا.

مرۆڤ لەماوەی بەکارهێنانی مۆسیقای قامیشدا کۆمەڵێك له ئاوازی سروشتی زۆر خۆشی بەرهەم هێنا. لەدوایدا مرۆڤ ژێی دۆزیەوەو قیپارەی داهێنا که تەنها لەیەك ژیّ پێك هاتبو. که دوای ئەوه جۆرەها ئامێری کەمانچەی لیّ کەوتەوه. لەچاخی ناوەڕاستدا خاچ پەرستان زۆر له ئامێره ڕۆژهەلاّتیەکانیان گواستەوه بۆ ئورروپاو دوای لێکدانیان لەگەلّ ئامێره میللیو ڕۆژئاواییەکاندا ئەو ئامێرانەی لیّ دروست بو که ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێن.

## کیّ زانستی حیسابی داهێنا ؟

حیساب واته زانستی ژمارەکان که پەیوەندی بەواتای ژمارەکانو هێماکانو چۆنیەتی بەکارهێنانیانەوه هەیه. هیچ کەس زانستی حیسابی دانەهێناوه , بەڵکو بەپێی پێویستیەکانی مرۆڤ پێشکەوتوەو لەسەرەتادا پەیوەندی به ئەندازەو برەوه

بوە ، نەك بە ژماردنەوە ، پێش ئەوەی خەڵکی بتوانن بژمێرن "هەستی ژماردن " لایاندا هەبوە. بۆ نمونە : ڕاوچیەك بە لەدەست دانی هەر تیرێکی دەیزانی چەندی ڕاوکردوە.

بەتێپەڕبونی کات مرۆڤ پێویستی بە ژمارەکان‌و ناوی ژمارەکان بو ، خاوەن ئاژەڵەکان دەیانویست بزانن بەروبومی ئاژەڵەکانیان چەندەو جوتیارەکانیش دەیانویست کاتی کێڵان‌و کشت‌وکاڵ بزانن. هەروەها لەکاتێکی نەزانراوو لە سەردەمانێکی دوردا ، ژمارەکان و ناوی ژمارەکان داهێنرا. واتە ئەو ژمارانەی کە پێیان دەوترێت ژمارە گشتیەکان یان سروشتیەکان.

دوای ئەوە مرۆڤ پێویستی هەبو ژمارەیەکی هەبێت لەیەك کەمتر بێت‌و ژمارەیەکیش بکەوێتە نێوان دو ژمارەوە ، بەمجۆرە کەرتەکان داهێنران. دوای ئەوە جۆرەکانی تر لە ژمارەکان داهێنران. کە یەکێکیان ژمارە سالبەکان بو وەکو -٢ و -٧.

بیرۆکەی ژمارە سالبەکان‌و دۆزینەوەی شتێکی زۆر سەخت‌و گران بو. لە یونانی کۆندا دەیانزانی پێنج لەحەوت ببەیت دوی دەمێنێتەوە. بەلأم ئایا دەتوانرێت حەوت لە پێنج دەربکرێت ؟ بۆیە یونانیەکان بڕیاریان دا ئەوە شتێکی مومکین نیە. لەسەدەی شازدەهەمدا خەڵکی سەیریان کرد دەشێت ژمارەیەك هەبێت لەهیچ کەمتر بێت ، بۆ نمونە : ئەگەر حەوت لە پێنج دەربکرێت ئەوا دو لە سفر کەمتر دەمێنێتەوەو دەبێتە -٢.

کاتێك ژماردن بو بە کردارێکی بنەڕەتی مرۆڤ فێری کۆکردنەوەو لێدەرکردن‌و لێکدان‌و دابەش کردن بو. کە چوار کردارە سەرەکیەکەن لەزانستی حسابدا.

## بۆچی نیشانە لەسەر لاشەی مرۆڤ دروست دەبێت ؟

ئەفسانەیەکی کۆن هەیە دەڵێت ، کاتێك دایکێك دەترسێت یان بە تاقیکردنەوەیەکی بەهەست جوڵێنەردا تێدەپەڕێت پێش منداڵ بون ، ئەوا منداڵەکەی نیشانە لەسەر لاشەی دروست دەبێت‌و نیشانەکەش شێوەی ئەو شتە دەگرێت کە دەبێتەهۆی ترسانی دایکەکە ! بە سانایی تا ئێستا زانست هیچ تەفسیرێکی نیە بۆ دەرکەوتنی نیشانە یان بۆ نەهێشتنی دروست بونی.

ئایا دەزانن هەمو کەسێك بەلای کەمەوە یەك نیشانە لەسەر لاشەی هەیە ؟ ڕێژەی

**مامناوەندی نیشانە لەسەر لاشەی هەر کەسێکدا ١٤ نیشانەیە !**

نیشانە لە گەشەسەندنی ئەو ڕیشاڵانەوە دروست دەبێت کە لێی پێك دێت , کە لە ڕیشاڵی دەماری خوێن یان خانە گەلێکە کە ڕەنگی تێدایە. یان لەخانەی تورەکەی موە یان لەڕیشاڵگەلێکی پەیوەند لەنێوان ئەندامەکانی لەشداو... هتد.

بەوجۆرە دەبینین هەر نیشانەیەكو لەگەڵ نیشانەیەکی تردا جیاوازی هەیە. نیشانەکان لەبەر دوهۆ پەسەند نین , یەکەمیان ڕەنگەکە گەشەبکاتو ببێتەهۆی شێرپەنجە. ئەمەش بەدەگمەن ڕودەداتو هیچ پێویست بە نارەحەتیو دودڵی ناکات.

دوەمیان : نیشانە شتێکی جوان نیە , بە تایبەت ئەگەر لەسەر ڕومەت بێتو گەورەش بێت. باشترین شت ئەوەیە دەستکاری نەکرێتو وازی لێ بهێنرێت لەبەرئەوەی زۆربەیان هیچ مەترسیەك دروست ناکەن. بەڵام ئەگەر نیشانەکە لەشوێنێکدا بو زانرا بریندار دەبێت باشتر وایە لەناو ببرێت.

بۆ نمونە : هەندێك جار نیشانە لە پاژنەی پێ یان لەناو لەپ یان لەپشتی ملدا یان لەژێر قایشی پانتۆڵدا دروست دەبێتو بەردەوام توشی برینداربونو کولاندنەوە دەبێت. لەم حاڵەتەدا باشتر وایە پێش تەمەنی بیست ساڵی لابرێت. هەروەها ئەو نیشانانەش کە ڕەنگەکانیان دەگۆڕێت یان توشی خوێن بەربون دەبن یان قەبارەیان گەورە دەبێت یان توشی خوراندن دەبن دەبێت لابرێن. دەبێت تەنها پزیشکی نەشتەرگەر هەستێت بەلابردنی ئەو نیشانانە نەك کەسێکی تر !

## هەور چیە؟

**هەورچۆن دروست دەبێت؟**

**کاتێك هەوای گەرم بەرز دەبێتەوە، شێ لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت بەرەو ئاسمان. کە دەگاتە بەرزیەکی دیاریکراو. هەوا گەرمەکە سارد دەبێتەوە. لە پلەی گەرمای سارددا، هەواکە ناتوانێت ئەو هەموو شێیەی هەڵی گرتوە لە شێوەی هەڵمی ئاودا، بپارێزێت. لەبەرئەوە شێ زیادەکە دەگۆڕێت بۆ دڵۆپەی بچوکی ئاو. یان پارچەی بچوك بچوك لە بەفر: ئەمەش هەور پێك دەهێنێت. هیچ لێك چونێك نیە لە نێوان بەفرەکانداو، بە بەردەوامی شێوەیان دەگۆڕێت. هۆی جیاوازیش لە جۆرەکانی هەوردا ئەوەیە کە هەورەکان ئاستی بەرزی و گەرمی و گەردیلەکانیان جیاوازە. ئەمەش لەسەر بەرزونزمی پلەی گەرما دەوەستێت. کاتێك هەڵمی ئاو لە هەوادا دەبێتە شلە، ئەم کردارە پێی دەوترێت "چڕبونەوە" چونکە هەڵمەکە پەیوەندی دەکات بە تۆزو گەردیلەکانی ترەوە لە هەواداو لە دەوری هەر گەردیلەیەکی بچوك دڵۆپەیەك ئاو دروست دەبێت. یەك دڵۆپە باران نزیکەی لە سەد ملیۆن دڵۆپە ئاو پێك دێت. لەبەرئەوەی کارەکە پێویستی بە نزیکەی یەك ملێون، ملێون، ملێون دڵۆپە هەیە تا هەورێك دروست ببێت درێژیەکەی یەك کیلۆ مەترو پانیەکەی یەك کیلۆ مەترو بەرزیەکەی یەك کیلۆ مەتر بێت. هەورێك بەو قەبارەیە نزیکەی ٧٩٠ تەن ئاو لە شێوەی دڵۆپەی ئاوی شلدا هەڵدەگرێت. لەگەڵ نزیکەی ٧٩٤٠ تەن ئاو لە شێوەی هەڵمدا. هەڵمی ئاو چڕ دەبێتەوە، لە شێوەی دڵۆپە بۆ پێکهێنانی هەورێك. بە دەوری چەندین جۆر لە گەردیلەکاندا. چەندین جۆر لە گەردیلەمان هەیە. گەردیلەی تۆزی هەیە کە با لە بیابانەکانەوە دەیهێنێت. خۆڵیمان هەیە لەسەر ڕوی گڵە وشکەکان. گەردیلەی گڕکانیمان هەیە. هەروەها کریستاڵی بچوکمان هەیە لە خوێی زەریاکاندا. لەگەڵ گەردیلەی ڕەقدا لە ئەنجامی سوتانی خەڵوزدا، لەگەڵ چەندین جۆری تردا.**

## شێری پادشای دارستان

**شێر لەهەموو جیهاندا بەهێمای هێز دادەنرێت. زۆر جار دەبیسین کەوەسفی**

پیاوێکی بەهێزو ئازا دەکرێت بەشێر دەشوبهێنرێت. شێوەی شێر وەکو هێمایەك بۆ هێز لەسەر زۆرێك لەو میدالیانە هەڵدەکەنرێت، کە دەدرێتە یاری چییە براوەکان. هەندێك لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن وێنەی شێر هەڵدەگرن. بڕوایەکی وا هەیە لای خەڵکی کەشێر بەهێزترین گیانداری دارستانە، کەدەتوانێت هەمووگیاندارانی تر بشکێنێت. بەڵام هەمووجارێك ئەمە ڕاست نییە. بۆیە پێی دەوترێت شای دارستان لەبەرئەوە زۆر بەخێرایی هێرش دەکاتە سەر قوربانییەکەی بەجۆرێك کەنێچیرەکە کاتی نابێت بۆ بەرەنگاری کردن لەخۆی، لەدواوە هێرشی دەکاتە سەر ئاژەڵی لەخۆی گەورەتری وەکو زەڕافەو گامێش. بەیارمەتی چڕنوك و کەڵبەکانی نێچیرەکەی لەت وپەت دەکات. بەهۆی خێرایی و هێزەکەیەوە پێی دەوترێت ((پادشای دارستان)). پێش نزیکەی ٢٠٠٠سالْ شێر لە زۆربەی ناوچەکانی ئەوروپا هەبووە. بەڵام بەرەبەرە لەناوبران. ئێستا تەنها لە دارستانە چڕەکانی ئەفریقیاو باکوری ڕۆژئاوای هندا هەن. شێر لە ئاژەڵە گۆشت خۆرەکانە. گیاندارە دەشتیەکان دەکوژێت و لەسەر گۆشتەکەی دەژێت و سەر بە خێزانی پشیلەکانە. درێژییەکەی نزیکەی سێ مەتر دەبێت. کێشیشی لەنێوان ١٨٠بۆ ٢٢٥ کیلۆ گرامدایە. مێینەکانی لە نێرینەکانی بچوکترن و کاکۆڵێك بەسەر سەریانەوەیە. زۆرجار مێیەکان ڕاودەکەن و بێچوەکانیش بەخۆشیەوە لێی دەخۆن. شێر بە نەڕە بەناوبانگە. بەڵام بەپێچەوانەی پشیلەکانەوە ناتوانن بەداراندا هەڵزنێن. شێر بەکۆمەڵ دەژێن و هەر گروپێکیان لە نێوان ٤ بۆ٣٠ دانەدایە شێران لەڕۆژدا پشودەدەن و بەشەو ڕاودەکەن. هێرش ناکەنە سەر فیل و ئەسپی دەریا و گامێشی ڕووبار. لەوگیاندارانەی کە هێرش دەکەنەسەر کەری وەحشی، ئاسك، ورچ، چەقەڵ، مەرو بزن و هی تریش. ئەگەر ئەزیەتی نەدەیت هەرگیز هێرش ناکاتە سەرمرۆڤ. بەڵام ئەگەر ئەزیەت بدرێت. یان هێرش بکرێتە سەری ئەوا بەتەواوی دڕندە دەبێت. هەندێك لەو شێرانەی چێژی گۆشتی مرۆڤ دەکەن. دەبنە مرۆڤ خۆرو لە دارستانەکانی .نزیك گوندەکاندا، دەژێن. هەر هەلێکیان بۆ بڕەخسێت هێرش دەکاتە سەر مەڕومالاْت و مرۆڤەکان. دەتوانرێت شێر دەستەمۆ بکرێت، وەك لەیارییەکانی سێرکدا دەیبینین.

## ڕێوی ئاوی چییه؟

ڕێوی ئاوی سەر بەگرووپێکە لە ئاژەڵان، کەپێیان دەوترێت Mustelids کە سەرچاوەکەی وشەیەکی لاتینیییە بە مانای ((فێڵباز)) دێت. ئەو ئاژەڵانەی کە سەربەم گرووپەن، موش خورما، زەربان، چالاکە. هەموو ئەم ئاژەڵانە قاچیان کورتەو بەچینێکی ئەستور لەتووك داپۆشراوە. دانیان تیژە، کەیارمەتیان دەدات لەهاڕینی نێچیرەکەیان و لە مەمکدارە گۆشت خۆرەکانن. ڕێوی ئاوی زۆر حەزی لەئاوە قاچە بەرگنیەکانی و کلکە ئەستورەکەی و تووکە زۆرەکەی، وای لێدەکات بەتەواوی ژیانی لەگەڵ ئاودا گونجاوبێت. لە ئەمریکای باکوورودەورووبەریدا، دووجۆر ڕێوی ئاوی هەیە. یەکێکیان ڕێوی ئاوی ئاوە سازگارەکان و ئەوی تریشیان ڕێوی ئاوی دەریاکانە. ڕێوی ئاوی ئاوە سازگارەکان لە جۆگەو دەریاکانی نێوان مەکسیك و ئەلاسکادا دەژین و ڕەنگیشیان قاوەییەکی تێرە. ئەم جۆرەی ڕێوی ئاژەڵێکە ئارامی نازانێت و بە بەردەوامی دەسوڕێتەوە. نێرەکانیان لە گەڕانەکانیاندا، لە وەرزی زستاندا هەندێك جار ماوەی پەنجا بۆ شەست میل دەبڕن. بەڵام ڕێوی ئاوە سازگارەکان گیاندارێکی زۆر شەرمنەو بەدەگمەن خەڵکی دەیانبینێت. ماڵی ڕێوی ئاوە سازگارەکان بریتیە لە چاڵێك، لە کەناری ڕووبارێك یان دەریاچەیەك، کە گەڵای دارەکان داییپۆشیوە. هەر لەوچاڵەدا بەچکە دەکات و بەهەر سکێکیش ٢ تا٣ بەچکەی دەبێت. لە کۆتایی وەرزی زستان و سەرەتای وەرزی بەهاردا دەزێت. تا کاتی فێربوونی مەلەوانی لەئاودا دایکەکە، بەچکەکان لەسەر پشتی خۆی هەڵدەگرێت. بەڵام بێچوەکان زۆر بەخێرایی فێری مەلەوانی دەبن. دایك و باوکەکە، بێچوەکانیان فێری چوونە ژێر ئاوو ڕاوە ماسی دەکەن کە خواردنی سەرەکییانە. هەر زۆر بەخێرایی بێچووی ڕێوی ئاوی توانای ئەوەی دەبێت بۆ ماوەی چوار خولەك لەژێر ئاودا بمێنێتەوە. ڕێوی ئاوی لەبەرامبەر لێوارەکانی ڕۆژئاوادا، لە ئەمریکای باکور لەویلایەتی کالیفۆرنیادا هەیە تا ئەلاسکاو تادەگاتە ئاوەکانی تری بەرەو باکور. ڕێوی دەریاکان، گەورەتر و قورسترن، لە ڕێوی ئاوە سازگارەکان. توکێکی زۆر چڕیان پێوەیە. کە قاوەییەکی تێرە. لە دیمەنیا وا دیار دەدات کە بەستویەتی و ریشێکی سپی پێوەیە، کەوای

لێکردوه پێی بوترێت ((پیرەمێردی دەریا)). ئەگەر ڕێوی دەریا کارێکی پەلەی نەبێت، خۆی بەسەر پشتدا دەخات و دەست دەکات بەمەلەوانی کردن و سکی دەکاتە خوانی نان خواردن بۆ زیژکەکانی دەریاو مڵەکان و قرژاڵەکان، لەگەڵ گیاندارانی تری دەریادا. خەڵکی لەبەر توکە جوان و گرانەکەی، بەڕێژەیەکی زۆر ڕێوی دەرياییان ڕاو دەکرد. تا لەئەنجامدا خەریك بوو لەناوبچن. بەڵام پەیمانگا نێودەوڵەتییەکان ئێستا دەیان پارێزن و ڕێژەیان لەزیادبوندایە.

## ماسی فڕیو

جۆرێك ماسی هەیە دەتوانێت وەکو فڕۆکەی شیراعی بفڕێت و پێی دەوترێت ((ماسی فڕیو)) بەڵام ناتوانێت وەکو باڵندە بفڕێت چونکە باڵی نییە. لەڕاستیدا یەکەمجار مەلەوانی دەکات بەخێراییەکی زۆر بەسەر ئاودا دەڕوات و ئەمجا باڵە بەردەمینەکانی بڵاودەکاتەوەو لە هەوادا دەست بەفڕین دەکات. لە ماوەی فڕیندا بە یارمەتی ماسولکەکانی باڵەکانی بەکراوەیی دەمێنێتەوە. بەڵام کە دەنیشێتەوە باڵەکانی دەچنەوە یەك و دەچێتە دۆخە سروشتییەکەی خۆی. درێژی ماسی فڕیو جیاوازە لە نێوان ٥ سانتیمەترو٤٥ سانتیمەتردا. هەندێك جار لەکاتی فڕینیدا دەدات لەشەپۆلە ئاوییەکان. بەوەش دیمەنی زۆر جوان دەنوێنێت. دانی لەشەپۆلە ئاوییەکان وزەیەکی زیاتری دەداتێ کە بتوانێت بۆ ماوەیەکی دورتر بفڕێت. هەندێك جار هێندە بەرز فڕیوە لەسەر کەشتیەکان نیشتۆتەوە. ئەم ماسیە لە زۆربەی دەریاکانی جیهاندا هەیە. بەڵام ژمارەیان کەمەو بە دەگمەن دەبینرێن.

## ماسی چۆن هەناسەدەدات ؟

ئێمە جۆرەها ماسی لە گۆماوو ڕوبارو دەریاکاندا دەبینین. کەناتوانن لەدەرەوەی ئاودا بژین. کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە ئاوێکەوە، زۆر زوو دەخنکێت لەئەنجامی هەناسەبڕاندا. بە پێچەوانەوە ماسیش ناتوانێت بەبێ ئاو بژێت. لەگەڵ لە ئاو دەرهێنرا دەمرێت. ئێستا ئەو پرسیارە دەکەین.

## ماسی چۆن لەئاودا هەناسەدەدات؟

جگە لەو ماسیانەی سییان هەیە. هەموو ماسیەکانی تر لەڕێگەی لوتەوانەکانیانەوە هەناسەدەدەن. چونکە وەکو مرۆڤ سییان نییە. کرداری هەناسەدان لای ماسیدا زۆر سەیرە. هەندێك ئاو دەکاتە دەمیەوە بەمەبەستی هەناسەدان. بەڵام ئاوەکە لە سەروی لوتەوانەکانیەوە دەڕوات و لەکونەکانی پشتی پولەکەکانیەوە دەردەچێت. خانەکانی لوتەوانەکانی هەڵدەستن بە مژینی بڕی ئەو ئۆکسجینەی کە لەناو ئاوەکەدا هەیە. لەبەرئەوەی ڕوبەری لوتەوانەکان گەورەن بۆیە ئەو ڕێژەیە لە ئۆکسجین دەیمژێت بەشی دەکات. ئۆکسجینەکە لەگەڵ خوێندا تێکەڵ دەبێت و بەهەموو لاشەیدا بڵاودەبێتەوە. بەو کردارە ماسییەکە خوێنەکەی پاك دەکاتەوە. بەڵام دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کەماسیەکە بەرهەمی دەهێنێت لەڕێگەی سوڕی خوێنەوە دەردەچێت بۆ پولەکەکانیو لەوێشەوە لەئاودا دەتوێتەوە. بەم جۆرە کرداری هەناسەدان لای ماسیدا بەردەوام دەبێت. ئەگەر ئاوەکە پیس بوو ماسیەکە هەندێك جار دێتە سەرئاوەکە و هەوا هەڵدەمژێت ماسی لە گیاندارە خوێن ساردەکانە. زۆریش هەستیارە بۆ دەست لێدان و چێژ وەرگرتن و بۆن کردن و هتد. ئەندامی جیاوازی هەیە بۆ ئەو مەبەستانە. زانایان تائێستا لێکۆڵینەوەیان لەسەر زیاتر لە ۲۰ هەزار جۆری ماسی کردووە.

## کرمی زەوی چی دەخوات؟

مرۆڤ وەسفی کرمی زەویی وا کردووە کە گرنگترین گیاندارە لەجیهاندا. ئەڵبەت زانایان بۆیە ئەوەیان ووتووە، چونکە چالاکیەکانی زەوی بە پیت دەکات بۆ کشتوکاڵ، کە ژیانی مرۆڤ لە سەری دەوەستێت. کرمی زەوی گڵ شی دەکاتەوە. لە نیو هکتار زەویدا نزیکەی ١٦ تەن خۆڵ لە ساڵێکدا هەڵدەگەڕێنێتەوەو ڕێگە دەدات ئاوو هەوا بگەنە ڕەگ و ڕیشەی ڕوەکەکان و مەوادە ڕووەکی و ئاژەڵیەکان دەشارێتەوە. بەڵکو تۆوی تازە دەچێنێت. کاتێك گەڵای داران دەباتە کونەکەیەوە. بەوەش تۆو لە داران ڕادەکێشێت. بۆ ئەوەی لە ژێر زەویدا بیڕوێنێت. کودی کرمی زەوی قسڵی تێدایە کە خۆڵ بەپیت دەکات. دەتوانین لە دۆزینەوەکانەوە گرنگی

ئەو قسلە بزانین کەزانایان لەدۆڵی نیلدا دۆزییانەوە کە یەکێکە لە بە پیترین ناوچەکانی جیهان. پاشماوەی کرمی زەوییان لەڕووبەری نیوهکتار* زەویدا. لە دۆڵی نیل بەنزیکەی ١٨٠ تەن مەزەندە کردووە. ئەمەش تاکە هۆبووە کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ مسر بە ((هبة النيل)) ناو ببرێت! ئەو کرمانەی کە لەوولاتە یەکگرتووەکاندا دەژین. ئەگەر بکێشرێن دە جار قورسترن لە کێشی ئەومرۆڤانەی، کە لەولاتە یەکگرتووەکاندا دەژین! لاشەی کرمی زەوی لەدوو کەناڵ پێك دێت. کە یەکێکیان لەناوی ئەوی تریاندایە. کەناڵە ناوخۆییەکە کۆئەندامی هەرسە. کاتێك کرمەکە بیەوێت شتێك بخوات، قورگی خۆی لە ناوەوە بۆ دەرەوە هەڵ دەگەڕێنێتەوەو بەرەو بەردەم دەیهێنێت بۆ ئەوەی هەندێك خۆڵ بخوات و بەهۆی ماسولکەکانی قورگییەوە ڕاکێشێتەوە بۆ ناوەوە. بۆ ناو کۆگایەك کەپێی دەوترێت. (سیقەتۆرە) لەوێشەوە بۆ ((چیکڵدان)) کە گەدەی دووەمیەتی. بوونی دەنکۆڵەی لم یارمەتی هاڕینی دەدات. ئەمجا کرمەکە ئەو ((خۆراکە)) هەرس دەکات و لەشێوەی ((کود)) دا لەپیسیەکەی ڕزگاری دەبێت. کرمی زەوی چاویان نیە. بەلام خانەی هەستیاریان هەیە. لەسەر دەرەوەی لەشیان کە دەتوانێت شەوو ڕۆژی پیّ لێك جودا بکاتەوە. یان هەست بە بچوکترین لێکخشاندن بکات. وەکو چۆن هەر لەڕێگەی پێستیەوە هەناسە دەدات. کرمی زەوی لە زەوی باشی شێداردا دەژی. هەرگیز ناتوانێت لەناو لمدا بژێت. بە شەو نەبێت دەرناچێت. بە وەرزی زستان خۆی گلۆڵە دەکات و لىێی دەنوێت. ئەگەر یەکێکیان لەسەر زەوی بینرا یان بۆ ماڵێکی تازە دەگەڕێت یان بۆ خۆڵێکی باشتر. کرمی زەوی ناتوانێت لەبەر تیشکی خۆردا بژێت.

## داری نان

داری نان لە دورگەکانی باشوری باسیڤیکدا هەیە. لە بەشەکانی تری ناوچە مەداریەکانیشدا هەیە، بەلام بە ڕێژەیەکی کەمتر. دارێکی زۆر جوانەو بەرزییەکەی دەگاتە نزیکەی شەست پێ. گەلاکانی زۆر گەورەن و شێوەیان هێلکەیی و سەوزێکی زۆر تێرن. دوو جۆر داری نان هەیە. جۆرێکیان بێ ناوك و جۆرێکیان ناوك دارە. کە ژمارەیەکی بێ شومار ناوکی تێدایە، ئەگەر بکوڵێنرێت یان

ببرژێنرێت تامەکەی وەکو تامی بەڕوی لێدێت. داری نان ڕێژەیەکی زۆر لە نیشاستەی تێدا نیە. میوەش نیە. زۆر بە دەگمەن بە کاڵی دەخورێت. دەتوانرێت بکوڵێنرێت یان ببرژێنرێت و لەگەڵ خوێ و کەرەو شۆربادا بخورێت یان وەکو پەتاتە قاش قاش ببرژێنرێت. دەتوانین بڵێین ئەسڵی داری نان لەم لایەدایەو لەوێشەوە، بۆ هەموو ناوچەکانی باشوری باسیڤیك بڵاوبۆتەوە. لە سەردەمی پێش مێژووەوە. گەیشتنی بە جیهانی نوێ. لەگەڵ گەشتەکەی کاپتن ((ولیەم پلای)) بووە. بە کەشتی بەریتانی پاونتی ((ئەو گەشتەی کاپتن)) ((جیمس کوك)) وەسیەتی کرد کە بکرێت. کاتێك کەداری نانی لە دورگەکانی باسیڤیك دا بینیو هەستی کرد دەشێت خواردنێکی بەسوود بێت بۆ کۆیلە زنجیەکانی ناوچەی ((ویست ئاندز)) دوای سەرنەکەوتنی گەشتی یەکەمی پلای، بەڵام گەشتی دووەمی بوو بە هۆی کشت کردنی ئەم دارە لە جامایکادا. لەگەڵ ئەوەی لەوکاتەوە چەندین جۆر لەم دارە لە دورگەی باسیڤیکی دا ڕوێنراوە. بەڵام تا ئێستاش لە ئەمریکای مەداریداد نەناسراوە. ئەم دارە لە ناوچە ساردەکاندا ناڕوێت، چونکە بەرگەی سەرما ناگرێت بۆیە کشت کردنی لەوپەڕی باشوری ناوچەی فلۆریدادا سەرنەکەوتوو بوو. لە توێکڵی ئەم دارە پارچە دروست دەکرێت و لە دارەکەشی کەرەستەی ناوماڵ. مادەیەکی کەتیرەییشی لێ دەردەهێنرێت، کە بۆ پڕکردنەوەو گرتنی کونەکان بەکاردەهێنرێت.

## زیادبوون لە ڕێژەی کۆلسترۆڵدا.

کۆلسترۆڵ ماددەیەکی چەوریە، لاشەی مرۆڤ و ئاژەڵان بەرهەمی دەهێنێت ڕێژەی کۆلسترۆڵ لە لاشەی هەر مرۆڤێکی ئاسایدا نزیکەی ٣،٠ ٪ی کێشیەتی. ئەم ماددە چەورییە زۆر گرنگە بۆ لاشە. لەبەرئەوەی (( )) بەرهەم دەهێنێت. لەگەڵ ژمارەیەکی تر لە هۆرمۆناتدا. بەڵام زیادبونی لە لەشدا زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت. بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٨٨٢دا کۆلسترۆڵ لە خوێن و ڕیشاڵەکان و ئەندامەکانی مرۆڤدا بە تایبەت مێشك و دەمارەکان و جگەردا، دۆزرایەوە. ڕێژەیەکی زۆر لە چەوری کۆلسترۆڵ لەسەر دیواری، دەمارەکان دەنیشێتەوە. کە دەبێتە هۆی کرژبونەوەو پەککستنی ڕۆیشتنی خوێن بە ئازادی بەناو دەمارەکاندا. لە ئەنجامی

ئەوەدا ڕێژەی خوێنی ڕۆیشتوو لە دەمارەکاندا کەم دەبێتەوەو ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی ڕێژەی ئەو ئۆکسجینەی کە دەگاتە. ئەندامە زیندووەکانی لاشە. ئەم حاڵەتەش پێی دەوترێت ((گرژبوونی دەمارەکان)). ئەگەر کۆڵسترۆڵ زۆر بوو لە خوێندا دەبێتە هۆی مەینی خوێن کە ئەنجامەکەی وەستانی دڵە. دەتوانرێت بە خۆپاراستن و پارێزکردن تەحەکوم بکرێت بە ڕێژەی کۆڵسترۆڵەوە لە خوێندا. بە بەکاربردنی کەمترین ئەو مەوادانەی کە چەوریان تێدایە، لەگەڵ وەرزشی گونجاودا. نیشتنەوەی کۆڵسترۆڵ لە ((زەردە لینجاو)) ڕەنگە لە شێوەی بەرد لە زراودا دروست بێت. لەگەڵ ئەوەی زیادبونی لە لەشدا زیان بەخشە، بەڵام کۆڵسترۆڵ کاری زۆر گرنگ ئەنجام دەدات و گەلێك هۆرمۆنی گرنگ بەرهەم دەهێنێت لەوانە هۆرمۆنی سێکس. کۆڵسترۆڵ لە خواردنەکانی وەکو گۆشت، هێلکە کەرەدا هەیە. بەڵام لەمیوەو سەوزەو دانەوێڵەدا نیە.

## چی لە بۆق ڕوودەدات لە زستاندا؟

لە سەرانسەری جیهاندا نزیکەی سی جۆری جیاواز لە بۆق هەیە. کە ناسراوترینیان بۆقی ئەمریکی و پڵنگی و بۆقی دارستانەکانە. بۆقەکان لە شێوەو ڕەنگ و لاشەدا جیاوازیان هەیە. هەندێك لە بۆقی دار درێژییەکەیان لە ٢,٥ سانتیمەتر زیاتر نییە. بەڵام بۆقی پڵنگ درێژیەیەکەی دەگاتە ٥ بۆ١٠ سانتیمەتر. درێژی بۆقی ئەمریکیش دەگاتە ٢٠ سانتیمەترو درێژی هەریەك لە قاچەکانیشی نزیکەی ٢٥ سانتیمەترە. بۆقی ئەمریکی ئەگەر ڕەنگی تەواوی خۆی وەرگرێت سەوز یان قاوەییە. کەوا دەکات لەنێو قوڕو گژوگیادا نەبینرێت.

## بۆقەکان لە زستاندا چی دەکەن؟

لە وڵاتانی باکوردا کاتێك دونیا سارد دەبێت، هەندێك لە بۆقەکان دەچنە گۆماوەکانەوە خۆیان لە قوڕاودا دەشارنەوەو بە درێژی وەرزی زستان لەوێدا دەمێننەوە. گۆماوەکە بە تەواوی نایبەستێت، بۆیە هەرچەندە زستانەکەشی سەخت بێ بۆقەکە نایبەستێت، بەڵام زۆر دەرچێت. بۆق گیاندارێکی (وشکاوییە)و سەر بە گیاندارە خوێن ساردەکانە. کاتێك لە زستاندا دەرچێت

پێویستی به کەمێك ئۆکسجین هەیە، لەبەرئەوەی تۆزێك خواردن دەسوتێنێت، ئەمەش تەفسیری ئەو هۆیە دەکات، کەوا دەکات لە بۆقەکە بتوانێت بە درێژایی زستان لەژێر ئاودا بمێنێتەوە، بێ ئەوەی هەوا بمژێت. ڕێژەیەك ئۆکسجین لە ئاودا هەیە کە بەسە بۆ بۆق لە ڕێگەی پێستیەوە وەری گرێت و پێی بژێت. هەندێك جار بۆق لە وەرزی زستاندا لەکونێك یان شوێنێکی نەرم لەژێر گڵ و بەرددا دەباتە سەر.

## ئایا دەزانن هەندێك بۆق هەن لەناو داردا دەژین؟

ئەو بۆقانە بۆقی دارستانن، بچوك و هێمنن لیکێك بەسەر قاچیانەوەیە یارمەتیان دەدات بە دارانددا هەڵبزنێن.

## بۆچی ڕەنگی سوور گا دەوروژێنێت؟

وەك دەزانن زۆرانبازی گا، گرنگترین وَ میللی ترین وەرزشە لە ئیسپانیادا. وەك ئەوەی یارییەکی گرنگە لە زۆر لەولاتانی تریشدا. ئەم وەرزشە زۆر سەرنج ڕاکێشە، بۆ ئەو کەسانەی بیروباوەڕی تایبەتیان لە بارەوە هەڵگرتووە، کە هیچ کەسێك ناتوانێت تیایاندا بیگۆڕێت. ئەو بیروباوەڕەی کە زۆربەی ئەوانەی سەرسامن بە زۆرانبازی (گا)وە، ئەوەیە کە هەرچی شتێك ڕەنگی سوور بێت گا دەوروژێنێت و پاڵی پێوە دەنێت بۆ هێرشکردن، لەبەرئەو هۆیە زۆران بازانی گاگەل ناچار دەبن پەردەیەکی سوور هەڵبکەن و زۆر بە کارامەیی بەکاری بێنن. ئەوەی ڕاستی بێت خودی زۆرانباز ئەگەر جلێکی سپی یان زەرد یان سەوز یان ڕەش لەبەر بکات، بەهەمان شێوە دەتوانێت گاکە بوروژێنێت. لەبەرئەوە گا ڕەنگ نابینێت و توشی کوێری ڕەنگەکان بووە! زۆر لە زۆرانبازەکانی گا، دان بەو ڕاستییەدا، دەنێن و ئەو ڕاستییە دەزانن، بەڵکو لەوەش زیاتر، زۆرانبازەکان بە بەکارهێنانی پەردەی سپی ئەو ڕاستییەیان سەلماندووە. هەروەها توانیان بە بەکارهێنانی پەردەی سور گاکە بوروژێنن!

## کەواتە ئەوەی گا دەورووژێنێت چیە؟

ئەوەی گاکە دەورووژێنێت جوولاندنی پەردەکەیە، نەك ڕەنگی پەردەکە. هەرچی شتێك لەبەردەم گادا ڕاوەشێنین دەیورووژێنێت. لەبەرئەوە گا کوێری ڕەنگەکانی هەیە. ڕاوەشاندنی پەردەیەکی سپیش دەشێت کاردانەوەیەکی باشتر لای گاکە دروست بکات، لەبەرئەوەی ڕەنگی سپی لە هەموو ڕەنگەکانی تر باشتر دەبینێت.

## کامیان زیرەکترن: کچان یان کوڕان؟

ناتوانین ڕێك بکەوین لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا. هەندێك کەس دەڵێن کچان لە کوڕان زیرەکترن، هەندێکی تریش بە پێچەوانەی دەبینن. تا ئێستاش زانایان پێوەرێکی مەنتقیان دانەناوە، بۆ پێوانی کام لەم دو ڕەگەزە زیرەکترن. فەرموون لەگەڵ هەندێك ڕاستیدا، کە بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەم پرسیارەمان وەڵام دەداتەوە. کێشی مێشکی ئاسایی لە کوڕاندا تۆزێك لە مێشکی ئاسایی کچان زیاترە. لەگەڵ ئەوەی کێشی لاشەی کوڕان گەورەترە. بەڵام کێشی مێشك لە هەردو ڕەگەزەکەدا، هەمان ڕێژەی سەدیە بۆ کێشی ئیجمالی. جیاوازی لە مێشکیشدا گرنگیەکی زۆری نیە. لەبەرئەوەی مرۆڤەکان بە نێرو مێیانەوە ژمارەیەکی زۆر خانەی (اعصاب) لە مێشکیاندا هەیە. بە جۆرێك کە تۆزێك زیاد یان کەم لە مێشکدا گرنگیەکی ئەوتۆی نیە شایانی باس بێت. چەندین تاقیکردنەوەی جۆراوجۆر کرا لەسەر کۆمەڵێك لە کوڕان و کچان، ئەنجامەکەی یەك شت بوو. لە تاقیکردنەوەی تایبەت بە کارامەیدا، کارامەیی کچان لە کوڕان بەرزتر بوو. بەڵام لە تاقیکردنەوەی تواناکان لە بیرکاری و میکانیکدا توانای کوڕان بەرزتر بوو. ڕەنگە ئەم ڕێژەی بەرزیە لە یەکێك لە ڕەگەزەکاندا بەرزتربێت، وەك لەوی تر. بەڵام لە تاقیکردنەوە گشتیەکاندا ئەنجامەکان یەکێك دەبن. کچان و کوڕان هەر لە منداڵیەوە بە دوو ڕێگەی جیاواز مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. کچان بووکە شوشەیان دەدرێتێ بۆ ئەوەی یاری پێ بکەن. لە کاتێکدا کوڕان ئوتومبیل و تفەنگ و ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ڕەگەزی نێرەوە هەیە. لەبەرئەوە ئاساییە کچان توانای میکانیکیان لە کوڕان کەمتر بێت. بەڵام ئەمڕۆ ڕۆژگار گۆڕاوەو کچان پێشبڕکێی کوڕان دەکەن

لە توانا زانستیەکاندا. لەبەر ئەو هۆیە تواناکان هاوسەنگ دەبێ. بەم جۆرە لە ئێستادا ئێمە بەڵگەیەکی زانستیمان لەبەردەستا نیە بیسەلمێنێ کامیان زیرەکترن کچان یان کوڕان.

## جیوە

جیوە توخمێکی کانزایی نا ئاساییە. پلەی گەرمای زۆر کاری لەسەر دەکات و لەپلەی گەرمای ٣٩ پلەی سەدی ژێر سفردا دەیبەستێت لەگەڵ ٣٥٧ پلەی سەدیشدا هەمدیسان دەیبەستێت. جیوە ١٣,٦ جار لە ئاو قورسترە. یەکگرتنی سەرەوەی زۆر گەورەیە بە جۆرێك زۆر شت تەڕ ناکات. بەڵکو حەز لە شیتەڵ بوون دەکات بۆ خڕۆکەی بچوك. جیوە لە زەنجەفەر (**کبریتید الزئبقیك**) کانزای سور دەردەهێنرێت ئەم مادەیە بە زۆری لە هەموو جۆرەکانی بەرددا هەیە. بەڵام بەزۆری لەو بەردانەدا هەیە کە لە بنەڕەتدا گڕکانین وا گریمان دەکرێت، لە ئەنجامی گڕکانەوە بێت. جیوە بە ئاسانی دەگۆڕێت بۆ هەڵم، بۆ ئەوەی جیوەیەکمان دەست بکەوێت لە خاوێکدا دەبێت توخمە خاوەکە تا پلەی نزیك ٤٨٢ پلەی سەدی بکوڵێنین هەڵمەکە کۆبکرێتەوەو چڕ بکرێتەوە. مرۆڤ چەندین جۆری جیوەی جیاوازی بەکارهێناوە، پێش مێژو زنجەفەر لە بۆیاخ کردنی ڕەنگی سوردا بەکارهێنراوە. لە ساڵی ٤١٥ پێش زاییندا جیوە لە خاوەکەی دەرهێنرا بۆ بەکارهێنانی لە بۆیاخ کردن و کاری پزیشکیدا. کاتێك (خەمائیەکان) "ئەوانەی لە کۆندا لە بواری کیمیك دا کاریان دەکرد"، هەوڵیان دەدا کانزای بەنرخ دروست بکەن. بڕوایان وابوو جیوە مادەیەکی سیحریە بۆیە لە تاقیکردنەوەو ئاهەنگە ئاڵۆزەکانیاندا بەکاریان دەهێنا! بەڵام لە ئێستادا گرنگترین بەکارهێنانی جیوە لە بواری پزیشکیدا دەکرێت. لەگەڵ ئەوەی جیوەو پێکهاتەکانی ژەهراوین، بەڵام لە دەرمان و پاکژکەرەوەکاندا بەکاردەهێنرێت. نزیکەی دوو لەسەر سێی ئیجمالی جیوە ساڵانە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردەهێنرێت. زۆربەمان دەزانین جیوە بۆ پێوانەی گەرما بەکاردەهێنرێت. چونکە جیوە زۆر خێرا دەکەوێتە ژێر کاریگەری گۆڕانکاریەکانی گەرماوە. هەروەها جیوە بۆ زۆر لە دەرمانەکانی دانیش بەکاردەهێنرێت. لەگەڵ کلۆرو سۆدای کاویەو کەرەستە کارەباییەکاندا.

## چۆن ئۆکسجین وەردەگرین؟

مرۆڤ ناتوانێت بەبێ ئۆکسجین بژێت. ئێمە پێویستمان بە ئۆکسجین هەیە، تاوەکو ژیانمان بەردەوام بێت. لە هەموو شوێنێکی دەوروبەرمان ئۆکسجین هەیە کە نزیکەی یەك لەسەر پێنجی هەوا پێك دەهێنێت. هەریەك لە ئێمە کۆمەڵێك خانەی تایبەتیمان هەیە وامان لێدەکات کە بتوانین ئۆکسجین بمژین، ئەم خانانە لە سیەکانماندایەو ئێمەش ئۆکسجین بۆ ناو سیەکان دەمژین و لەوێوە دەچێت بەرەو ناو خوێن و لەوێشەوە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش بڵاوە دەکات. ئەو ئۆکسجینەی خوێن دەیگوێزێتەوە بەشێکە لەو هەوایەی کە دەیمژین ئێمە لە رێگەی لوتەوە هەوا وەردەگرین. لەکاتی رۆیشتنندا بۆ ناو قوڕگ گەرم دەبێت و پاك دەبێتەوە. هەوا لە رێگەی قوڕگەوە دەچێت بۆ قەسەبە هەواییەکان و لەوێوە بۆ سییەکان. لە سینەدا قەسەبە هەواییەکان پف دەکەن و دەبنە دوو بەشەوە. کە پێیان دەوترێت دوو لقە هەواییەکە. هەر لقێکی دەچێت بۆ یەکێك لە سییەکان و لەوێشەوە دوو لقەکە دەبنە دوو لقی بچوکترەوە هەر لقێکی بچووکیش پف دەکات تا دەبێتە تورەکەیەك یان گیرفانێك. ئەو خوێنەی پاشماوەکان هەڵدەگرێت دڵ لە (شعیرات) یان گیرفانی هەواییدا پاڵی دەنێت و لەوێدا کرداری ئاڵوگۆڕ دروست دەبێت. کە گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بە دیوارە موییە باریکەکاندا دەچێت بۆ گیرفانە هەواییەکان. بەڵام ئۆکسجین لە گیرفانە هەواییەکانەوە دەچێت بۆ دەمارە باریکەکان و خانە سوورەکانی خوێن. کاتێك خوێن ئۆکسجین وەردەگرێت دەجوڵێت بۆلای چەپی دڵ. لەوێشەوە دڵ خوێن و ئۆکسجین پێکەوە دەنێرێت بۆ هەموو خانەکانی لاشە.

## کەری وەحشی بۆچی خەتخەتە؟

کەری وەحشی سەر بە خێزانی ئەسپەکانە. بەڵام کاتێك بەراوردی بکەین لەگەڵ جۆرەکانی تری ئەم خێزانەدا، ئەوا تەریك دێتە پێش چاومان بەهۆی پێستە خەتخەتەکەیەوە. لە ئەمڕۆدا سێ گروپ لە کەری وەحشی هەیە. کە بە درێژایی زەمانە لە بەرامبەر سەختیەکانی رۆژگاردا خۆ ڕاگرییان کردوەو لە ژیاندا

ماونەتەوە. ناسراوترین و بەربلاوترینی ئەم سێ جۆرە. جۆری "كواغە" یە كە لە ڕۆژهەلات و باشوری ئەفریقیاو باشوری ئەسیوبیادا دەژین و هەروەها بە كەری (الزرد)یش ناسراوە. جۆری دووەم كەری وەحشی سۆمالیە كە گەورەترین جۆریانەو هێڵەكانی باریكەو دوو گوێی زۆر گەورەی هەیە. جۆری سێیەم كەری وەحشی شاخاویە كە لە شاخەكانی نامیبیا (باشوری ڕۆژئاوای ئەفریقیاو ئەنگۆلادا دەژی لەبەرئەوەی ئەم گروپە هێڵەكانی تەریبەو ڕەنگی ڕەش یان قاوەییەكی تێرە لەسەر تەختەیەكی سپی، بۆیە ئەو هێڵانە زۆر بەسوودن بۆ ئەو ئاژەلانەی كە ڕوەك دەخۆن!

لەگەڵ ئەوەی چەندین بیردۆزە خرانە ڕوو بۆ تەفسیركردنی ئەو دیاردەیە. بەلام هیچ كام لە بیردۆزەكان نەیانتوانی تەفسیرێك بدەنە دەستەوە قەناعەت پێكەر بێ. یەكێك لە بیردۆزەكان دەڵێت هێڵەكان شێوازێكی جوان دروست دەكەن. ئەوەش یارمەتی كەرە وەحشیەكە دەدات، كە خۆی لە دوژمنەكانی بشارێتەوەو خۆی لەگەڵ ئەو سێبەرانەدا تێكەڵ كات كە تیشكی خۆر دروستی دەكات لەو كەشەدا كە تیایدا دەژێت. لەبەرئەوەی شێر یەكەم دوژمنیەتی. ئەم تایبەتمەندیە سروشتیە یارمەتی دەدات كە خۆی لێ بپارێزێت. هەندێكی تر لە لێكۆڵەرەوان دەڵێن هێڵەكان سەر لە شێرەكان دەشێوێنن لەبەرئەوە ناتوانێت تەركیز بكاتە سەر كەرێكی وەحشی كاتێك لەناو كۆمەڵێك كەردایە. كەری وەحشی گیا دەخوات، بە هەموو جۆرەكانیانەوە. بە گشتی لە كۆمەڵی بچوك بچوكدا دەژین. بەوە ناسراون كە جەنگاوەرێكی درن و هەرگیز ماڵی ناكرێن و ڕاناهێنرێن. ماوەی ئاوس بون لای كەرە وەحشیە شاخاویەكان ٣٠٠ ڕۆژەو لای دوو جۆرەكەی تریان ٣٩٠ ڕۆژە. هەر جارەو یەك بێچووی دەبێت و دەشێت دووانەش بێنێت. ئەمڕۆ هەموو جۆرەكانی كەری وەحشی مەترسی لەناوچونیان لەسەرە، جۆری "كواغە" كە تەنها سەری خەتخەت بوە.لە ساڵی ١٨٨٠وە لەناوچوە.

## بۆچی كەسێك دەپژمێت پێی دەڵێین "یرحمكم الله" ؟

كاتێك كەسێك لاماندا دەپژمێت پێی دەڵێین "یرحمكم الله". ئینگلیزەكان دەستەواژەیەك دەڵێن هەمان واتای هەیە. ئەڵمانیەكانیش دەڵێن "گینسندهایت"

به واتا "تەندروستیەکی باش". ئیتاڵیەکان دەڵێن "فیلیسیتا" واتە "بەختەوەر". لە ڕۆژهەڵاتی دورو نزیکدا مرۆڤەکان هەردو دەستیان، لەناو یەك دەنێن و خۆیان دەچەمێننەوە، ڕوەو ئەو پیاوەی کە دەپژمێت! دەڵێن ئەم نەریتە لە کاتێکەوە دەستی پێ کردوە، کە خەڵکی کۆن بڕوایان وابوە کە ڕۆحی مرۆڤ شێوەی هەواو هەناسە وەردەگرێت و لەسەردایە. لەبەرئەوەی پژمین ئەو گیانە بۆ ماوەیەکی کورت یان بۆ هەتا هەتایە فڕێ دەدات، ئەگەر خوا حەزی نەکرد گیانەکە دەرچێت، بۆیە وتنی "یرحمکم الله" پاڕانەوەیەکە لەخوا کە نەهێڵێت گیانەکە بڕوات. داب و نەریتی چەمانەوەش لەڕوی ئەو کەسانەی کە دەپژمن مانای وایە "هیوادارین گیانت دەرنەچێت!". هەندێك لە ئینگلیزەکان دەڵێن، ئەوانەی دەڵێن "یرحمکم الله" هیچ خورافاتی تێدانیە بڕوایان وایە دەگەڕێتەوە بۆ کاتی بڵاوبونەوەی چاوە قوڵە "طاعون" لە ئیسپانیای کۆندا. کاتێك کەسێك پژمیوە مانای وابوە ئەو کەسە توشی چاوە قوڵە هاتوە. ڕۆمانەکانیش لەدوای پژمین پاڕاونەتەوەو ئەو نەریتەیانیش گواستۆتەوە بۆ بەریتانیەکان. کاتێك چاوە قوڵە لە بەریتانیاشدا بڵاوبوەوە، خەڵکی دەیانگوت "یرحمکم الله". کە مانای وابوە ئەو کەسە توشی چاوە قوڵە بوەو لە خوا پاڕاونەتەوە، کە خوا ڕەحم بەو کەسە بکات.

## گسکی کارەبایی چۆن ئیش دەکات؟

گسکی کارەبایی، ئامێرێکە بە کارەبا ئیش دەکات و بەکاردەهێنرێت بۆ پاککردنەوەی فەرش و زەوی و ئامێرە ئەلکترۆنیەکان و کارگەکان و پەردەو دیوارو تەنانەت ئوتومبیلیش. کە دەتوانێت چی پیسی و پارچە کاغەزی ورد هەیە هەمووی هەڵگرێتەوەو تەنیا یەك کەسی بەسە بۆ ئیش پێ کردنی بە واتا ئامێرێکی زۆر بەسوودە. گسکی کارەبایی لە بزوێنەرێکی کارەبایی بچوك پێکهاتوە، کە پەیوەستە بە پانکەیەکی بچوکەوە. پانکەکە بە خێراییەکی یەکجار زۆر دەسوڕێتەوەو هەوا لە دیوێکەوە دەمژێت و لە دیوێکی ترەوە دەری دەکات. لەناو لاشەیدا تورەکەیەکی لە قوماش دروست کراو هەیە بۆ ئەوەی هەرچی پیسی هەیە بچێتە ناویەوەو تیایدا کۆبێتەوە. ئەم تورەکەیەش بە جۆرێك دروست کراوە کە هەوا لێیەوە گوزەر بکات بەڵام بچوکترین پیسی گل بداتەوە. لەکاتی

بەگەڕخستنیدا، پانکەکە لەناوەوە بە خێراییەکی یەکجار زۆر دەسوڕێتەوە. کاتێك لمۆزی گسکەکە مەحکەم دەخەینە سەر قاڵیەك. هەوا دەچێتە ناوی لمۆزەکەوەو هەرچی تەپ و تۆزو پیسی هەیە لەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرێت بۆ ناوی تورەکەکە، بەوەش ئەو شوێنەی مەبەستمانە بۆمان پاك دەکاتەوە. کاتێك پانکەکە دەسوڕێتەوە نیمچە بۆشاییەك لەناو ئامێرەکەدا دروست دەبێت و دەبێتە هۆی ئەوەی هەوای دەرەوە پاڵە پەستۆیەك دروست بکات بۆ ناردنی شتەکان بۆ ناوی تورەکەکە. ئەمڕۆ لە بازەڕاکاندا گەلێك جۆر لە گسکی کارەبایی هەیە کە زۆر بەسوودن بۆ مەبەستی پاککردنەوە.

## مێروەکان چۆن هەناسە دەدەن؟

هەموو زیندەوەرانی سەر زەوی بۆ ئەوەی بژین دەبێت هەناسە بدەن. لە کرداری هەناسەدانیشدا بۆ دەست خستنی ئۆکسجین هەوا هەڵدەمژین. ئۆکسجینەکەش بەهەناسە دانەوە دەگۆڕێت بۆ دووەم ئۆکسیدی کاربۆن. زیندەوەرەکان ئالیەتی جۆراوجۆریان هەیە بۆ هەناسەدان، بۆ نموونە مرۆڤ بەهۆی سیەکانیەوە هەناسە دەدات. ماسیەکانیش بەهۆی لوتۆکەکانیانەوە. کرمی زەویش بەهۆی پێستەوە. لەگەڵ ئەوەی بۆقەکان سییان هەیە بەڵام لە ڕێگەی پێستەوە هەناسە دەدەن. بەڵام ئالیەتی هەناسەدان، لای زیندەوەران نائاسایی و جێی سەرسوڕمانە. ئەگەر سەیری سکی یان گەدەی یەکێك لە زیندەوەرەکان بکەین ژمارەیەکی زۆر لە کونی بچوك دەبینین. گیاندارێکی وەکو فیل نزیکەی ١٠٠ جار لە یەك خولەکدا هەناسە دەدات، لە کاتێکدا مشك پێویستی بە ٢٠٠ جار هەناسەدانە لە یەك خولەکدا. ئەو ئۆکسجینەی کە زیندەوەران دەیمژن زۆر پێویستە بۆ ئۆکساندنی ئەو خۆراکە. کە لاشە پێویستی پێیەتی. بەوەش لاشە بەهۆی هەناسەوە لە پاشەڕۆکانی ڕزگاری دەبێت.

## خێرایی سوڕانەوەی زەوی

گۆی زەوی وەکو زۆربەی خەڵکیش دەیزانن دوسوڕانەوەی هەیە، جارێکیان بە دەوری خۆیداو، جارێکی تریان بە دەوری مەداری خۆردا. جوڵانەوەی یەکەمی

زەوی کە مرۆڤ دۆزییەوە بە دەوری خۆیدا بو. ئەم سوڕانەوەیەش دەبێتە هۆی خۆرهەڵاتن و خۆر ئاوا بون و دەرچونی مانگ و ئەستێرەکان و ئاوابونیان و ڕودانی شەوو ڕۆژ. سوڕانەوەیەکی زەوی واتە ٣٦٠ پلە ٢٣ کاتژمێرو ٥٦ خولەك و ٤ چرکە دەخایەنێت. بە درێژایی چەندین سەدە باوەڕ وابو کە ڕێژەی سوڕانەوەی زەوی هەرگیز ناگۆڕێت. بەڵام بەهۆی لێکخشاندنی زەریاکان و گۆڕان لە توێکڵی زەویدا، جیاوازیەکی زۆر کەم هەیە. کە نزیکەی یەك لە هەزاری چرکەیەك لە هەر سەد ساڵدا ڕۆژ درێژ دەبێت. زانایانیش گرنگی بەم کارە دەدەن و کاری لەسەر دەکەن. هەروەها زەوی بە دەوری خۆریشدا دەسوڕێتەوە. خەندێك جار مەداری زۆر لە خۆر نزیك دەبێتەوەو کاتێك زۆرترین لە خۆر نزیك دەبێتەوە دەچێتە دۆخی دابەزینی خۆرەوە. کاتێك ئەوپەڕی لێی دوردەکەوێتەوە دەچێتە دۆخی بەرزترین خاڵی خۆرەوە. زەوی و هەموو هەسارەکانی تر لە مەداری خۆیاندا. خێراییان بەگوێرەی دوریان لە خۆرەوە دەگۆڕێت. کاتێك کە هەسارەیەك نزیکترە لە خۆرەوە، دەبێت خێراتر بێت. لەبەرئەوە کاتێك لە دابەزینی خۆردایە خێراترە، وەك لە بەرزبونەوەی خۆردایە. دوری زەوی هەمو کاتێك وەك یەك نیە لە خۆرەوەو بە بەردەوامی خێراییەکەی دەگۆڕێت. لە دۆخی دابەزینی خۆردا زەوی بە خێرایی ٢/ و٣٠ کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەسوڕێتەوە، لە دۆخی بەرزی خۆریشدا، بە خێرایی ٢و/ ٢٩ کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەسوڕێتەوە.

## هۆیەکانی ئالۆش "خوراندن"

هەست کردن بە ئالۆش لای هەمومان شتێکی ئاشکرایە. کاتێك هەست بە ئالۆش دەکەین، خوراندنی پێست هەندێك پشومان دەداتێ. ئایا دەزانی بۆچی توشی ئالۆش دەبین بۆچی هەست بە پشو دەکەین کاتێك شوێنی ئالۆشەکە دەخورێنین. کاتێك دەمارەکانی ئازار لە پێستماندا تۆزێك دەورووژێت.هەست بە ئازار ناکەین بەڵکو هەست بە خوراندن دەکەین. هۆیەکانی ئالۆش زۆرن. قەپ گرتنی مێشولە دەمارەکانی ئازار لە پێستی مرۆڤدا دەوروژێنێت. تا ئەو ئەندازەیەی کە بیهێنێتە خوراندن. هەروەها وشکی پێست و هەمو جۆرەکانی حەساسیەو زۆر لە نەخۆشیەکانی وەکو، تێکچونی گورچیلەو شێرپەنجەو هەندێك جار بیرکردنەوەش

وامان لێدەکات خۆمان بخورێنین. ئەگەر بە توندی خۆمان بخورێنین، پێستی لاشەمان بریندار دەکەین. هەندێك لە پزیشکان دەڵێن: باشترین ڕێگە بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ ئالۆشی شوێنی دەمی مێشولەدا. خوراندنێکی، لەسەرخۆیە بە چواردەوری شوێنی دەمی مێشولەکەدا. نەك خوراندنی شوێنی قەپ گرتنەکە. خوراندنی پێستەکە لە یەك شوێندا بۆ ماوەیەك ئالۆشەکە سوك دەکات.بەڵام دەبێتە هۆی ئالۆش لە شوێنی تری لەشدا. هۆی ئەوەش وەکو هەندێك لە پزیشکان دەڵێن: دەمارەکانی ئازار لەشوێنەکانی نزیك ئالۆشەکە زیاتر هەستیار دەبن، خوراندنیش ئەو دەمارانە دەوروژێنێت بە ئەندازەیەك کە بەس بێت بۆ دروست کردنی ئالۆشی تازە. بەو جۆرەش ئالۆشەکە بلاو دەبێتەوە. لێرەدا پرسیار ئەمەیە. بۆچی تەنها لە لاشەدا پێست توشی ئالۆش دەبێت؟ ئەمە هێشتا نهێنیەکی گەورەیەو تا ئێستاش زانایان نەیانتوانیوە وەلامی بدەنەوە.

## بۆچی قاوەکان یەك تامیان نیە؟

پێش هەزاران ساڵە قاوە خواردنێکی موفەزەڵ بووە لای مرۆڤدا. بۆ یەکەم جار لە نیوەدورگەی عەرەبیدا دۆزرایەوەو لە سەدەی شانزەهەمدا برایە ئەوروپاوە. چوونە ناوەوەی قاوە بۆ ئەوروپا هۆیەك بوو، بۆ ڕودانی ئاژاوەی کۆمەلایەتی. کە بووە هۆی قەدەغەکردنی جارێك و بەکارهێنانی جارێکی تر وەکو دەرمان! بەلام لە کۆتایدا وەکو خواردنەوەیەکی میللی لە قاوەخانەکانی بەریتانیادا بلاوەی کرد. قاوە جۆری زۆرەو هەر جۆرێکیشی تامی خۆی هەیە. هۆکار لە جیاوازی تام و جۆرەکانیدا دەشێت لە شێوازی ئامادەکردنەکەیدا بێت. یان لە شێوازی سورەوە کردنەکەیدا بێت. بەلام گرنگترین هۆ لە جیاوازی تامی قاوەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ جۆری دانەکانی. قاوەی هەر ولاتێك بە گوێرەی جۆرو چاکیی بۆ ولاتێکی تر دەگۆڕێت. قاوە لە بەرزی ٤٥٠ مەتر بۆ ١٨٠٠ مەترەوە کشت دەکرێت. باشترین قاوە ئەو قاوەیەیە کە لە بەرزی زیاتر لە ٩٠٠ مەترەوە کشت دەکرێت. بەلام ئەمە تاکە هۆ نیە. لە بازرگانی قاوەدا جۆرەکانی دەکرێتە دو گروپەوە: قاوەی بەرازیلی و قاوەی نا بەرازیلی. بەگشتی ئەو قاوانەی لە ولاتانی تردا جگە لە بەرازیل کشت دەکرێن باشترن. بەلام چەند جۆرێکی قاوەی بەرازیلی باشترن. لە جۆرەکانی تری

نا بەرازیلی. جۆرەکانی قاوەی بۆن پێکهاتەکەی تایبەتە. تام دانە قاوەو پۆلێن کردنی پێویستی بە کارامەیی زۆر بەرز هەیە. لێهاتەیی لە برژاندنی قاوەو شێوازی هاڕین لە هۆکارە گرنگەکانی تری جیاوازی تامەکەیەتی. قاوە کچی سروشتە، بەڵام مرۆڤ تام و بۆنی دیاری دەکات.

## کریپ فروت "لیمۆی بەهەشت"

بەری کریپ فروت یان لیمۆی هندی یان لیمۆی بەهەشت دو ئەوەندەی پورتەقاڵێکە، لەگەڵ ئەوەی لە ترێ گەورەترە، بەڵام ناوەکەی لە ترێی کریبەوە هاتوە! ئەگەر مرۆڤ بەناو باخەکانی کریب فروتدا ڕێ بکات دەزانێت هۆی ناونانی لە چیەوە هاتوە. ئەم بەرە قورسە کە وەکو هێشوی ترێ شۆڕبۆتەوە، هەر هێشویەکی لە نێوان ٣-٨ دانە دەگرێت. ئەو ئیسپانیانەی لیمۆو پرتەقاڵیان بردە فلۆریداو ویست ئاندیزی ئەمریکاوە هەر ئەوان بون کریب فروتیشیان گەیاندە ئەو ناوچەیە. بەڵام لە سەرەتادا خەڵکەکە تەنها بۆ جوانی، ئەم دارەیان دەڕواند، چونکە گوڵێکی بۆنخۆش و گەڵایەکی جوانی پێوەیە. لە کۆندا خەڵکی کریپ فروتیان نەخواردوە. چون بەرەکەی ڕەگێکی تاڵی تیا بووە، بۆیە خەڵکی حەزیان لێ نەکردوە. لەبەرئەوە خاوەن باخەکان بەرەکەیان نەچنیوەو هەموی کەوتۆتە سەر زەوی و خراپ بوە. گەشتیارەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، کە لە باکوری ئەمریکاوە دەهاتن بۆ فلۆریدا، حەزیان لەم میوەیە کردو، لە گەڕانەوەیاندا لەگەڵ خۆیاندا دەیانبردەوە. یەکەمین باری فرۆشتنی لە نێوان ساڵانی ١٨٨٠ و ١٨٨٥ دا نێردرا بۆ نیویۆرك و فلادلیفیاو بازاڕێکی تایبەت بە کریپ فروت کرایەوە. دوای ئەوە باخی کریپ لە کالیفۆرنیا زۆر بو. ئەم میوەیە، ئەمڕۆ بە ڕێژەیەکی زۆر لە تکساس و ئەریزۆناو کوباو جامایکادا کشت دەکرێت. داری کریپ فروت نزیکەی ٧,٥ مەتر بەرز دەبێت، جۆریشی زۆرە، بەڵام بەناوبانگترین دۆنکان و مارش و والترز دایە، کە ناوکیان نیە.

## لە کەیەوە مرۆڤ بە شوێن کانزاکاندا دەگەڕێت؟

کانزا توخمێکی کیمیاویە یان تێکەڵەیەکە، بە شێوەیەکی سروشتی لەسەر زەوی

دەردەكەویت. مادەی خاویش شتێكی كۆوەبوە لە زەویدا، كە دەوڵەمەندە بە كانزایەك ئەوە دەهێنێت بە شوێنیدا بگەڕێیت. هیچ كەس نازانێت لەكەیەوە دەست كراوە بە گەڕان بە شوێن كانزاكاندا. بەڵام یەكەمین هەوڵی گەڕان بە شوێن كانزاكاندا، لە مێژودا تۆمار كرابێت هەڵمەتێكی مسری بووە لە نیمچە دورگەی سینادا. لە نزیكەی ساڵی ٢٦٠٠ پ.ز، مسریەكان ڕۆیشتون بۆ سینا بۆ گەڕان بەدوای پیرۆزەدا "Turquoise" پیرۆزە: بەردێكی بەنرخە بریتی‌یە لە مادەی ئەلەمنیۆم و مس و فۆسفۆرو ئۆكسجین، ڕەنگەكەی شینێكی مەیلەو خۆڵەمێشی‌یە. بەڵام كانزایەكی زۆر بەسوود تریان دیتەوە كە "مس" بوو. یونانیە كۆنەكانیش لە دەوروبەری ساڵی ١٤٠٠ پێش زاییندا لە باشوری ئەسینادا بە شوێنی زیودا گەڕان و لە ساڵی ٦٠٠ بۆ ٣٥٠ پێش زاین كانەكانیان كردەوە، كە قوڵی هەندێكیان زیاتر لە ٢٠٠ مەتر بوو چەندین كانزای تری وەكو قوڕقوشم و توتیاو ئاسنیان لەم كانە هەڵكنراوانە دەرهێنا. ڕۆمانیەكان بۆ ئەوەی ئەمپراتۆریەتە، بەرفراوانەكەیان بەهێز بكەن، بەشێوەیەكی بەرفراوان بە شوێن كانزادا دەگەڕان. هەر لە ئەفریقیا تا بەریتانیا، لەنێوان گرنگترین كانەكانی ڕۆمانیادا كانی "ریۆ تینتۆ"بوو لە ئسپانیا. كە ڕێژەیەكی زۆر لە زێڕو زیوو مسی قەڵایی و قوڕقوشم و ئاسنی لێدەرهێنرا. لە سەدەی هەژدەهەمدا گەڕان بە دوای كانزاكاندا زیادی كرد، چونكە شۆڕشی پیشەسازی لە لوتكەی گەشەكردندا بو. بۆیە پێویستی بە ڕێژەیەكی زۆر هەبو لە خەڵوز بۆ تواندنەوەی ئاسن و بەگەڕخستنی فڕنی كارگەكان. بۆیە گەڕان بەدوای خەڵوزدا بە شێوەیەكی خێرا پەرەی سەند لەگەڵ گەڕان بەدوای كانزای نوێدا. لە وڵاتە یەكگرتوەكانیشدا "تای زێڕ" لە سەدەی نۆزدەهەمدا، گەیشتە لوتكەو لەساڵی ١٨٤٨ دا لە كالیفۆرنیادا دەست كرا بە دەرهێنانی زێڕ. تەنها لە كالیفۆرنیا لە ماوەی ١٠ ساڵ دا بایی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار زێڕ دەرهێنرا. لە ساڵی ١٨٩٦دا بۆ دەرهێنانی زێڕ ڕو لە ئەلاسكا كرا. لە ساڵی ١٨٨٦ دا لە باشوری ئەفریقیا دەوڵەمەندترین كانە زێڕ دۆزرایەوە. هەر لەوێداو لە ساڵی ١٨٧٠ گەورەترین ئەوریینی ئەڵماس دۆزرایەوە.

## ڕووەكەكان چۆن خۆیان لە زوقم دەپارێزن؟

ملیۆنەها جۆر ڕوەك لە دونیادا هەیە. هەموشیان لە پێناوی مانەوەیاندا. لەگەڵ بەفرو باران و زریان و خۆردا بەرخود دەكەن. هەندێكیان لە زستاندا دەمرن. بەلام پێش مردنیان تۆوەكەیان لە زەویدا بلاو دەكەنەوە، تا لە پایزدا سەر لەنوێ بڕوێنەوە. بەلام هەندێكی تر لە ڕوەكەكان دەتوانن بەرگەی سەرمای سەختی زستان بگرن. ئەو جۆرە ڕوەكانە گەلاكانیان بەسەر زەویدا پان دەكەنەوەو گەرمی خۆڵ بۆ خۆیان وەردەگرن و خۆیان دەپارێزن. كە وەنەوشە یەكێكە لەو ڕوەكانە. گوڵی واش هەن بەشی سەرەوەیان دەمرێت بەلام قەدەكەی هێشتا زیندوە وەكو ئالاس و خەلەنج. دوبارە چرۆ دەكەن و دەڕوێنەوە بۆ ئەوەی جۆری خۆیان بپارێزن. زۆر لە ڕوەكەكان لە ترسی سەرمادا خۆیان لە ژێر خۆڵدا دەشارنەوە لەوانە "سەرك دارەكان و دەرەنیەكان". هەشیانە خۆراكەكەیان لە ڕەگەكانیاندا دەپارێزن بەگوێرەی پێویستیان. كاتێك وەرزی هاوین هات چرۆ دەكەنەوەو گەلاكانیان سەرلەنوێ سەوز دەبنەوە. هەندێك جار بەڕێگەی دەستكرد ڕوەكەكان لە زوقم دەپارێزین، وەكو گەرم داپۆشینی لیمۆو پرتەقاڵ. لە هەندێك شوێنیشدا پانكەی گەورە بەكاردەهێنرێت، بۆ جولاندنەوەی هەواكە بە جۆرێك كە زوقمەكە لەسەر دار مێوەكان نەنیشنەوە.

## زیندەوەر چیە؟

زانایان دەڵێن، هەموو شتێكی زیندوو زیندەوەرە. مرۆڤ زیندەوەرە، هەروەها مشك و ماسی و مێرو دارو بەكتریاو مارغریتای بچوك "گوڵێكی بەهاریە" لەگەڵ زیندەوەرە بچوكەكانی تردا. گیاندارەكان لە هەندێك سیفاتی گرنگدا هاوبەشن لەبەر ئەو هۆیە زانایان وشەی "زیندەوەر" یان بۆ بەكاردێنن. وشەی زیندەوەر هەمو گیاندارێكی زیندو دەگرێتەوە. بە واتا ئەندام و بەشەكانی بە ڕێگەیەكی دیاریكراو پەیوەستە بە یەكەوەو لەناو زیندەوەرەكاندا كاری دیاریكراوی خۆی دەكات. بۆئەوەی ماددەكە زیندو بێت دەبێت چالاك بێت. چالاكی كیمیاوی زیندەوەر، لەناو زیندەوەرەكەدا ڕوو دەدات. ئەو چالاكیە كیمیاویەش كردارێكی

بەردەوامە. ئەگەر بوەستێت و بەردەوام نەبێت ئەوا زیندەوەرەکە دەمرێت. دەبێت ووزە بچێتە ناو لاشەی زیندەوەرەکەوە، تاوەکو ئالیەتی ژیانی کارا بێت. وەکو چۆن دەبێت مەواد بەناو زیندەوەرەکەدا بچێت. زیندەوەر شێوەو خۆراکە. دەبێت خۆراکی تازە بچێتە گیانی زیندەوەرەکەوە بچێتە شوێنی ئەو خۆراکەی لە لەشی دەردەچێت. دەرچونی ووزەو ماددە بەناو لاشەی زیندەوەردا پێی دەوترێت "الأیض" کە بریتی‌یە لە کردارگەلێك پەیوەندی هەیە بە پێکهاتەی پلازماو لەناوچونیەوە بەتایبەت ئەو گۆڕانکاریە کیمیاویانەی. کە ووزەی پێویست بۆ کردارەکان و چالاکیە زیندوەکان دەستەبەردەکات. کە بریتی‌یە لە چونی خۆراکی تازە بۆ شوێنی خۆراکە دەرچوەکە. دەبێت زیندەوەر گەشە بکات تا دەگاتە قەبارەی خۆی. دەشبێت زیاد بکات. واتە زیندەوەری بچوك بەرهەم بێنێت تا بچێتە شوێنی زیندەوەرە گەورەکان. بەو جۆرە دەتوانین بڵێین ئەگەر زیندەوەرەکان گەشە بکەن و زیاد بکەن ئەوا لە ژیاندا دەمێننەوەو لەناو ناچن.

## شانشینی یەکگرتوو "المملکە المتحدە" کەی دروست بووە؟

شانشینی یەکگرتو لە بەریتانیاو سکۆتلاندا ویلزو ئیرلەندای باکور پێك دێت. کە لە ساڵی ١٨٠١ دا دروست بوو. کاتێك "یاسای یەکێتی" ئیرلەندای خستە ژێر دەسەڵاتی ئەپارلەمانەوە کە بەریتانیاو سکۆتلانداو وێلزی لەژێر دەستدا بوو. بە فەرمیش ناوی وڵات گۆڕا بۆ "شانشینی یەکگرتوی بەریتانیای مەزن و ئیرلەندا" بەڵام ٢٦ بەشی ئیرلەندا لە ساڵی ١٩٢٢دا وازیان لەیاسای یەکێتی هێناو بۆ خۆیان "وڵاتی ئیرلەندای ئازاد" یان پێکهێنا کە ئەمڕۆ پێی دەوترێ "کۆماری ئیرلەندا". دوای پێنج ساڵ یاسا ناوی وڵاتی گۆڕی بۆ "شانشینی یەکگرتوی بەریتانیای مەزن و ئیرلەندای باکور". وێلز یەکەم ناوچە بو کە یەکگرتنی لەگەڵ بەریتانیادا کرد. تا لەساڵی ١٢٨٢ زایینی شا ئەدوارد خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. دوای ئەوە واریسی کورسی ئینگلیزی بە "میری ویلز" ناسرا. کە شا ئەدوارد لە ساڵی ١٣٠١ دا ئەو لەقەبەی بەخشیە منداڵە شیر خۆرەکەی. بەڵام ئەم میرنشینە تا ساڵی ١٥٣٦ نەچووە پاڵی شانشینەوە. بەڵام لە ماوەی حوکمی هنری هەشتەمدا، کە لە بنەماڵەی تیۆدۆرەوە لە بنەچەکدا دەچێتەوە بۆ وێڵز، بە

ئارەزوی خۆیی و بە ئاشتی چووە پالی شانشینەوە. دوای ئەوە جیمس ی شەشەم پادشای سکۆتلاند، توانی لە سالی ١٦٠٣ دا بگاتە کورسی حوکمی بەریتانیاو ناوی بەریتانیای مەزن کەوتە سەر زمانەکان و جیمس هەردو تاجی سکۆتلاند و بەریتانیای کردە یەك، بەلام نەیتوانی هەردوو گەل بکاتە یەك. تا لە سالی ١٧٠٧ دا "یاسای یەکێتی" دەرچو، کە هەردو حکومەتی ئسکۆتلانداو بەریتانیا کرانە یەك حکومەت. ئالای یەکێتی شانشین پێك دێت ئالای بەریتانیا بە رەنگی "سپی لەگەل خاچێکی سوردا" لەگەل ئالای سکۆتلاندا بە رەنگی "شین لەگەل خاچێکدا کە لە خوارەوە سپیە". لەگەل ئالای ئیرلەندا کە خاچێکە لە خوارەوە سورە. لە ٢٩ ی ئایاری ١٩٥٣ یاسایەك دەرکرا کە "ئەلیزابیس ی دوەم" پادشا بێت لەسەر شانشینی یەکگرتوی بەریتانیاو ئیرلەندای باکورو هەمو ئەو زەویانەی سەر بە ئەمانن. لەگەل ولاتانی کۆمەنوەلسدا. ئەوانەی بەرگری لە ئاین دەکەن.

## تەقەمەنیەکان چۆن پێش کەوتن؟

باوەر وایە راهیبی ئینگلیزی رۆجەر بایکۆنی یەکەم کەس بوبێت هاراوەی باروتی دروست کردبێت لە سەدەی سیازدەهەمدا. هەرچەندە دەشلێن عەرەب و چینیەکان پێشی ئەوە بە چەند سەدەیەك هاراوەی لەو جۆرەیان دروست کردوە. داهێنانی هاراوەی باروت سەلماندی کە نیعمەتێکی باشە بۆ پیاوانی سوپا. چونکە چەکی زۆری لێ دروست دەکرێت. سەرەتا هاراوەی باروت لە مالان و دەزگا تایبەتیەکاندا دروست دەکرا. بەلام ئەمە شتێکی مەترسیدار بوو. لەسەدەی حەڤدەهەمدا هاراوەی باروت نرخی پەیدا کرد چونکە وەکو هۆکارێك بۆ تەقاندنەوەی بەردەکان بەکاردەهێنراو سەرکەوتنێکی گەورەی لەم بوارەدا بە دەست هێنا. کاتێك لە سالی ١٨٤٦ دا کیمیاگەری ئەلمانی "شۆنباین" "لۆکەی بارود" ی دروست کرد وەکو مادەیەکی تەقەمەنی، بە ریشالی لۆکە خستنە ناو ترشی نەتریك (تیزاب) و ترشی گۆگردیکەوە. لە سالی ١٨٤٧ دا "ئەسکانیۆ سوبریرۆ" ی ئیتالی نیترۆگلسرین "کە زەیتێکی تەقینەوەی بەهێزە" داهێنا کاتێك گلسرینەکەی کردە ناو هەردو ترشی نەتریك و گۆگردیکەوە. بۆ دەست خستنی ئەو تەقەمەنیە زۆر مەترسیدارە.

زۆربەی تەقەمەنیەکان کاربۆن و نایترۆجین و هایدرۆجینیان تێدایە. دوای تەقینەوە گازەکانی دوەم ئۆکسیدی کاربۆن و هەڵم و نایترۆجین دەردەدەن. سێ جۆر لە تەقینەوە هەیە:

١- تەقەمەنیە میکانیکیەکان: لەوانە "کاردۆکس" کاردۆکس کە لە لولەکێکی کانزایی پێك دێت. زۆر مەحکەم داخراوەو پڕیەتی لە دوەم ئۆکسیدی کاربۆنی بەستو لەگەڵ ئامێرێکدا بۆ گەرمکردنی لولەکەکە. کاتێك لولەکەکە گەرم دەکرێت دوەم ئۆکسیدی کاربۆنەکە دەکشێت و دەمە داخراوەکە دەتەقێتەوە. کاردۆکس زۆر خاو دەتەقێتەوەو هێزی تێکدانیشی کەمە، زیاتر لە تەقاندنەوەی کانە بەردەکاندا بەکاردەهێنرێت.

٢- تەقەمەنیە کیمیاویەکان: ئەمانەش دو جۆرن، تەقەمەنی نزم و تەقەمەنی بەرز. جۆری یەکەم ئەگەر لە شوێنی تەنگەبەریدا بێت زۆر بەخێرایی دەتەقێتەوە. "کلی باروت" ی تەقیەوە زۆر نزمەو زیاتر بۆ پاڵنانی گولله لە تفەنگدا بەکاردەهێنرێت. یەکێك لەو جۆرە تەقەمەنیانە "کوردێت" ە. کە لە نیترۆگلسرین و نیتروسیلیلۆزەوە دەست دەکەوێت. بەڵام تەقینەوە کیمیاویە بەرزەکان، گەرماو گازاتی زۆر بەرز دەردەدەن. بە کارلێکی کیمیاوی زۆر خێرا. لەمەوادە تەقەمەنیە بەرزەکان. سێیەم نەتراتی تۆڵۆن (ترایننیترولوین) و ترشی گۆگردیك و نیتروگلسرین و هی تریش ئەم تەقەمەنیانە ناتوانرێت لە تفەنگدا بەکاربهێنرێت.

٣- تەقەمەنیە ئەتۆمیەکان: کە پشت بە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لە گەرما دەبەستێت کە دەگاتە ملیۆنەها پلەی سەدی. ئەم گەرمایەش یان بە کەرت کردنی ئەتۆمی یان بە جۆشدانی ئەتۆمی بە دەست دەهێنرێت. ئەمجۆرە، بەهێزترین جۆری تەقەمەنیە کە تا ئێستا مرۆڤ زانیبێتی. کە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لە گازات و گەرماو تیشك دەردەدات. نمونەکانی ئەم تەقەمەنیەش بۆمبا گەردیلەیی و هایدرۆجینەکانە. ئەم تەقینەوانە لە جەنگ و شکاندنی کانە بەردەکان و بەفرە بەستوەکانی ناو دەریاکاندا بەکاردێن.

## سوڕی کاربۆن لە سروشتدا

کاربۆن زۆرترین توخمی سروشتە کە مرۆڤ ناسیویەتی و گرنگ بوە بۆی. ئەڵماس

که یەکێکە لە گرانترین گەوهەرەکان، یەکێکە لە شێوەکانی کاربۆن. گرافیت (قوڕقوشمی ڕەش) کە پێنوسی داری لێ دروست دەکرێت. جۆرێکە لە جۆرەکانی کاربۆن. هەروەها خەڵوز کە سەرچاوەی سەرەکی گەرماو وزەیە، زۆرینەی کاربۆنە. گرنگترین ڕاستی سەبارەت بە کاربۆن ئەوەیە کە توخمێکی زۆر پێویستە بۆ هەموو زیندەوەران. لاشەی زیندەوەران لە پێکهاتەی کاربۆنی پێك دێن. لە ڕاستیدا بۆچون و باوەڕی زانایان وایە، لە هەرکوێدا ڕێژەیەك کاربۆن هەبێت. ئەگەری ژیان لەو شوێنەدا هەیە.

## ئایا دەزانن سوڕی کاربۆن لە گەردون دا چیە؟

سوڕی کاربۆن ئەو کردارەیە کە تیایدا گواستنەوەی کاربۆن لە سروشتەوە بەردەوام دەبێت بۆ ئەوەی زیندەوەران بەکاری بێنن و، بە جۆرێك کە ڕێژەی سەدی جێگیری کاربۆن لە سروشتدا پارێزراو بێت. سەرچاوەی سەرەکی کاربۆن لە پێناوی ژیاندا دوەم ئۆکسیدی کاربۆنە لە کەشدا کە زیندەوەرە ئەندامیەکان لە هەوادا وەری دەگرن و دەریشی دەدەنەوە بۆ هەوا. ئەم سوڕە بەردەوام دەبێت و ژیان بێ ئەوە نابێت. لەو خولەدا بەکارهێنانی دوەم ئۆکسیدی کاربۆن لە هەوادا بەردەوامی دەبێت. بۆ ئەوەی ڕوەکەکان دوەم ئۆکسیدی کاربۆن بەرهەم بێنن لە تیشکی خۆرەوە وزە وەردەگرن و ئەم کردارەش پێی دەوترێت "ڕۆشنەپێکهاتە". ڕۆشنەپێکهاتە بەرپرسە لە گەشەسەندنی ڕەگی ڕوەکەکان و قەدو گەڵاکانیان. ڕوەکەکان بە دو ڕێگە دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدەن بۆ هەوا. یەکەمیان بە شەو کاتێك خۆر نامێنێت و ڕۆشنەپێکهاتە دروست نابێت دوەمیشیان کاتێك ڕوەکەکە دەمرێت و شیتەڵ دەبێت. پاشماوەکەی دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدات بۆ هەوا. مرۆڤیش بە هەناسەدانەوە دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەداتە هەوا. پاشماوە ڕزیوەکانی ڕوەك و ئاژەڵان لە شێوەی سوتەمەنی جۆراوجۆردا وەکو خەڵوزو نەوت و گازی سروشتی لە کاتی سوتانیاندا جارێکی تر دوەم ئۆکسیدی کاربۆن بەرزدەکەنەوە بۆ بەرگە گاز. بەم جۆرە هەموو گیانداران بەردەوام دەبن لە بەکارهێنانی دوەم ئۆکسیدی کاربۆن لە بەرگە گازداو دوای ئەوە بۆی دەیگەڕێننەوە. بۆ ئەوە ڕێژە سەدیەکەی دوەم ئۆکسیدی کاربۆن لە سروشتدا

نەگۆڕ بێت.

## داشۆرین چیە؟

داشۆرین جۆرێکە لەرەخنەی ئەدەبی دەشێت بە شێوازی هۆنراوە یان نوسین یان دراما یان فیلم یان نوکتە بێت. ژمارەیەکی زۆر لە نوسەرانی جیهانی لە داشۆریندا ناوبانگیان دەرکردوە لەوانە ((ئامپرۆز پێرس))ی ئەمریکی کە زۆر پارچە داشۆرینی نوسیوە. هەروەها ((ئایسۆب))کە خورافاتە کۆنە بەناوبانگەکانی نوسیوە، لەگەڵ ((جیمس سیربر)) کە ((خورافات بۆ سەردەمی ئێمە))ی نوسیوە. کە هەردوکیان بە ئەنقەست بەزمانی تەیرو تیورو ئاژەڵانی ترەوە گێلی و نەزانی مرۆڤیان خستۆتە ڕوو. داشۆرەکان زمانی گاڵتەجاڕی، بە ڕەوشتی مرۆڤایەتی بەکاردەهێنن. گەورەترین شاکاری داشۆرین لە ئەدەبی ڕۆژئاوادا کتێبی ((گەشتەکانی شلیفر))ە کە بۆ ((ناسان سۆیفیت)) دایناوە. لەگەڵ کتێبی ((کانداید)) کە ڤۆلتێر نوسیویەتی. کتێبی ((دۆن کیشۆت))یش کە ((میشیل دی کیرڤان))یش دایناوە کتێبێکی تری گاڵتە جاڕی کلاسیکە. نوسەر هەوڵ دەدات لەرێگەی پاڵەوانی چیرۆکەکەوە ئەو زوڵم و زۆرانە نەهێڵێت کەتوشی جیهان بوە. بەلاّم جەنگێکی دۆڕاو دەکات. لەسەدەی حەڤدەهەمدا کتێب و درامای گاڵتەجاڕی زۆر بلاّوبونەوە کە دیارترین نوسەریان ((موللەر)) بوو.

## ڕووەك چۆن لە خۆڵدا دەڕوێت؟

شتی زۆر لەناو خۆڵدا هەیە، کەوا دەکەن لە ڕووەکەکان تیایدا بڕوێن و گەشە بکەن. خۆڵ تێکەڵەیەکە لە مەوادی ئەندامی و نائەندامی. بەشە ئەندامییەکەی لە شتە زیندوەکان پێکدێت. لەگەڵ پاشماوەی ئەو شتانەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان زیندوو بوون. بەشە نائەندامیەکەشی، لە گەردیلەکانی بەردو مەوادە کانزاییەکان پێکدێت. مەوادە ئەندامیە ڕزیوەکان لە خۆڵدا پێی دەوترێت ((پەین)) کە ماددەیەکی ئەسمەر یان ڕەشەو لە ئەنجامی شیتەڵ بوونی مەوادە، ڕوەکی‌و ئاژەڵیەکانەوە دروست دەبێت و بەشە ئەندامیەکە لە خۆڵدا پێکدەهێنێت. پەین گەردیلەکانی ئەو بەردانەی پێکەوە نوساون لەیەك جیا دەکاتەوەو وا دەکات ئاوو

هەوای زیاتر بچێتە ناوی خۆڵەکەوە. هەروەها خۆراك بۆ بەکتریاو زیندەوەرە بچوکەکانی تر دابین دەکات لە خۆڵدا. ئەو زیندەوەرە زۆر بچوکانەش، مەوادە ئەندامیە مردووەکان شیتەڵ و مەوادێك پێك دەهێنن کە ڕوەکەکان دەتوانن بەکاری بێنن، لەبەرئەوە پەین زۆر گرنگە بۆ بەپیت کردنی زەوی. یان یارمەتی دانی ڕووەکەکان بۆ گەشەسەندن. جۆرەها گیاندار لە خۆڵدا دەژین. پاشەڕۆکانیان زۆر گرنگە بۆ خۆڵ. هەروەها کرمەکانیش زۆر گرنگن لە ژێرەوبانکردنی خۆڵدا. زیندەوەرە زۆربچوکەکانی ناو زەوی لەسەر گەردیلەی مەوادە ئەندامییەکان دەژین. ئەوانیش مەوادە ئەندامیەکان شیتەڵ دەکەن بۆ کانزاو گازو شلە. مەوادە ڕزیوەکانیش شیتەڵ دەبن و کۆمەڵێکی تر لە توخمی بنەڕەتی بەرهەم دێنن. کە ڕوەکەکان دەتوانن وەکو مەوادێك بۆ گەشەسەندن بەکاری بێنن. ڕوەکەکان پێویستیان بە دە توخم هەیە تا گەشەی پێ بکەن. کە سیانیان لە هەوا یان ئاو یان هەردوکیاندا هەن کە بریتین لە ئۆکسجین و هایدرۆجین و کاربۆن. حەوت توخمەکەی تریشی لە خۆڵدا دەست دەکەوێت کە ئەمانەن نایترۆجین، فۆسفۆر، پۆتاسیۆم، کالسیۆم، مەنگەنیز، ئاسن، گۆگرد.

## پرۆتۆپلازما

زانست پێشکەوتنی زۆر گەورەی بەخۆوە بینیوە. لە تاقیگەکانیدا دەتوانێت زۆر لەشتە سەیرەکانی سروشت کۆپی بکات. بەڵام تەنها ماددەیەك هیچ زانایەك نەیتوانیوە تا ئێستا دروستی بکات ((پرتۆپلازما))یە. کە بریتییە لەماددەی زیندو لە هەموو خانە ڕووەکیو ئاژەڵیەکاندا. هەموو گیاندارەکان ئەگەر ڕوەك بن یان ئاژەڵ و زیندەوەر لەخانە پێکدێن، دەشێت ملیۆنەها خانەیان هەبێت وەکو مرۆڤ. یان تەنها یەك خانەیان هەبێت وەکو برزۆریات. لە هەمو خانەیەکدا پرۆتۆپلازما لە دووبەش پێکدێت. یەکێکیان مەرکەزیەو زۆر ڕەقەو پێی دەوترێت ((ناوك)) دووەمیشیان بەشی دەرەوەیەو زۆر نەرمەو پێی دەوترێت ((حەشوە)). هەموو پرۆتۆپلازماکان چونیەك نین و هەر زیندەوەرێك جۆرێکی تایبەت بەخۆی لە پرۆتۆپلازمای هەیە وەکو چۆن جۆرە جیاوازەکان لە خانەکانی هەر زیندەوەرێکدا شێوەی تایبەتی خۆی هەیە. لەگەڵ ئەوەی پرۆتۆپلازماکان

جیاوازن بەلام ٩٩٪ یان لە کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و نایترۆجین و هەندێك توخمی تر پێکدێن. ئەوەی وا دەکات لەپرۆتۆپلازما زیندو بێت شتێکە تا ئێستا نەزانراوە چییە! بەلام دەزانین هەرچی کارێك لە گیاندارانەوە بکرێت. بەهۆی پرۆتۆپلازماوە نەبێت، ناکرێت. کاتێك خۆراك دەچێتە لەشەوە، یەکەم جار هەرس دەکرێت، پاشان دەگۆڕێت بۆ شلەیەك. ئەم کردارەش پێی دەوترێت ((هەرس کردنی خواردن)) لە ئەنجامی هەرس کردنی خواردندا پلازما دروست دەبێت. ئەمەش مانای وایە پرۆتۆپلازما بە هەرس کردنی خواردن لە ماددەیەکی مردووەوە دەگۆڕێت بۆ ماددەیەکی زیندوو لە ماددەیەکی نامۆوە بۆ ماددەیەکی هاوشێوە. هەروەها پرۆتۆپلازما هەرچی وزە هەیە لە ڕوەکەکان و گیانداراندا، پەسیسەی دەکات و دەری دەدات. هەرچی پرۆتۆپلازماو ئەو لاشانەی لەسەر پرۆتۆپلازما بینا کراون. بە قۆناغی کارو پشوداندا تێدەپەڕن. هەروەها پرۆتۆپلازما زۆر هەستیارە بەرامبەر ورووژێنەرەکان و شرۆڤە دەرەکیەکان و تیشکێکی بەهێز یان گەرماییەکی بەتین لەناوی دەبات. هەروەها مەوادە کیمیاوییەکان ڕای دەکێشن یان پاڵی دەنێن. بەلام ڕەوتە کارەباییەکان وای لێدەکەن بە شێوازی جۆراوجۆر کاری خۆی بکات. زۆر شت ماوە تا ئێستا. لەسەر پرۆتۆپلازما کە نەزانراوەو هێشتا تەحەدایەکی گەورەیە لەبەردەم زانستدا.

## بۆچی خەو دەبینین؟

کاتێك دەخەوین خەو دەبینین، زانایان سەلماندوویانە، هەمو کەسێك لە شەوێکدا دوو تا سێ خەو دەبینێت. ئەوانەی کە دەڵێن خەو نابینین، ئەو خەوانەی بینویانە لە ڕاستیدا نایەتەوە بیریان. بەلام ئەوانی تر بە شێوەیەکی باش دەتوانن خەوەکانیان بە بیردا بێتەوە. خەو بینین دەشێت دڵخۆشکەر یان ئاسایی یان ترسناك بێت. هەموو خەوبینینەکانمان پەیوەندیان بە هەست و ترس و حەزو پێویستیەکانمانەوە هەیە. ئەگەر کەسێك برسی یان تینو بێت، دەشێت خەو بینینەکەی پەیوەندی بە نان یان ئاوەوە هەبێت. هەندێك لەزانایان وای دەبینن حەزو پێویستیەکانمان لە خەودا جێبەجێ دەبن. خەونەکانمان حەزە جێبەجێ نەبوەکانمان دەستەبەردەکەن. کاتێك کەسێك خەو دەبینێت، جوڵانەوەی

چاوەکانی خێراتر دەبنەوە. وەکو وایە چاوەکانی بە شوێن کرداری خەوبینینەکەدا بڕوات. ئەو جوڵانە لە ١٥ بۆ ٢٠ خولەك بەردەوام دەبن و لەو ماوەیەدا شێوازەکانی شەپۆلەکانی مێشکیش دەگۆڕێن. کە هەندێك جار بۆ تێبینیە زانستیەکان تۆمار دەکرێن. پێیان دەوترێت وێنە گرتنی ئاشکردنی کارەبایی بۆ کاری مێشك. یان تۆمارکردنی شەپۆلەکانی مێشك. زانا دەرون زانەکان ڕایان وایە، خەو بینین. تەعبیرە لە حەزە جێبەجێ نەبوەکانی مرۆڤ. هەندێکی تر لەزانایانی دەرون زانی دەڵێن مێشك خۆی بەتاڵ دەکاتەوە، بۆ خۆ ئامادەکردن، بۆ گورجوگۆڵیو بەکارکەوتنێکی باشتر بۆ ڕۆژی داهاتو. هەندێك خەڵك دەڵێن کێشەکانیان لە خەودا چارەسەر کراوە. ((گیگۆڵ)) کە کیمیاگەرێکی بەناوبانگ بوەو بەنزینی دۆزیوەتەوە دەڵێت: دوای بینینی خەوێك پێکهاتەی گەردیلەکانی بەنزینی زانیوە. هەندێك کەس بڕوایان وایە خەو ئاگاداریان دەکاتەوە. کە لە داهاتودا چی ڕودەدات. بەڵام تا ئێستا زانایان نەیانتوانیوە بە تەواوی تەفسیری ئەو دیاردەیە بکەن. بەڵام وەك دەردەکەوێت خەو بینین شتێکی بەسودە بۆ لاشەی مرۆڤ.

## سوکترین و قورسترین کانزا؟

لیسیۆم ((توخمێکی کانزایی زیوی سپیە)) و لە هەموو کانزاکان سوکترە. ((ئەمۆزیۆم)) ((توخمێکی کانزایی قورسەو قورسترینی توخمەکانیشە)). یەك سانتیمەتری سێجا لە لیسیۆم. ٥٣٤٪ لە گرامێکدایە. هەمان کێش لە ئەمۆزیۆم ٢٢,٤٨گرامە. دوەم قورسترین کانزا ((ئیریدیۆمە)) ((توخمێکی کانزایی زۆر گرانەو لەپلاتین دەچێت)) یەك سانتیمەتری سێجای ٢٢,٤ گرام دەکێشێت. نزیکەی هەمان کێشی ئەمۆزیۆم. یەك مەتری سێجا لە ئەمۆزیۆم ٢٢,٤٨ تەن دەکێشێت. واتە بەرامبەر کێشی پێنج فیل. ئەمۆزیۆم و ئیریدیۆم دوکانزای زۆر گرانن. نرخی یەك مەتری سێجایان نزیکەی ٤٤,٤ ملیۆن ڕوپیەی هندیە! لیسیۆم کانزایەکی نەرمی سپیەو بریقەکەی، لە بریقەی زیو دەچێت. ((یۆهان ئۆگاست ئەفۆدسۆن))ی سویدی لە ساڵی ١٨١٧دا دۆزییەوە. لبیدولیپ و تریفیلیت یان ((تریفیلین)) دو خاوی سەرەکین بۆ ئەم کانزایە. کە لە ئەفریقیای پێشوو

ئەمریکای باشوردا هەیە. زۆر بە خێرایی لەگەڵ ئاودا کارلێك دەکەن بۆئەوەی هایدرۆجین و هایدرۆکسیدی لیسیۆم پێك بێنن. لەبەرئەو هۆیە ئەو کانزایە لە ناوی کیرۆسیندا هەڵدەگیرێت و بۆ زیادکردنی چڕی پیو بەکار دەهێنرێت. ئەمۆزیۆمیش کانزایەکی ڕەقی سپیە، سروشتێکی فشۆڵی هەیە. بەشێوەیەکی پاك لە سروشتدا نیە. بەڵکو لە ئاوێتە دەردەهێنرێت. خاوەکەی لە پیشەسازی نێشی پێنوسی مەرەکەب و دەرزیی فۆتۆگرافدا بەکاردەهێنرێت. سمیپون تبینانت لە ساڵی ١٨٠٣دا ئەم کانزایەی دۆزیەوەو لە ساڵی ١٨٠٤یشدا کانزای ئیریدۆمی دۆزیەوە. ئەم کانزای دوەمە زۆر ڕەقەو بریقەیەکی زیویی هەیە. زۆر لە ئەمۆزێۆم بە سود ترەو، پلەی تواندنەوەی نزیکەی ٢٣٤٤ پلەی سەدیە. لەبەرئەوەی لە پیشەسازیو تاقیکردنەوەی زۆر گرنگدا بەکاردەهێنرێت. چونکە ترشیەکان هیچ کاری لێ ناکەن. خاوەکەشی لە پیشەسازی نێشی پێنوسە مەرەکەبەکاندا بەکاردەهێنرێت. لەگەڵ ئامێرەکانی تاقیگەدا.

## کوارتز

کوارتز یەکێکە لە زۆرترین کانزاکانی سروشت و سودیشی بۆ مرۆڤ زۆرە. خەڵکی ڕۆژانە کوارتز دەبینن و بەکاری دەهێنن بێ ئەوەی بزانن کوارتزە. کوارتز ناوێکی تریشی هەیە ئەویش ((سیلیکا))یە. کە پێکهاتوە لە سلیکۆن و ئۆکسجین و لە پۆڵا ڕەقترەو لە شوشە ڕونترە. کوارتز بە تەنیا بێ گەردو بێ ڕەنگ و سپیە. بەڵام کە مەوادی تری تێکەڵ بو بە ڕەنگەکانی سور، زەرد، قاوەیی، سەوز، شین، ئەرخەوانی، ڕەش، بەرچاو دەکەوێت. هەندێك جار کوارتز لە کریستاڵی گەورەی بێ گەردی شەش گۆشەدا هەیە. لاکانی وەك قوچەکن و پێی دەوترێت ((کریستاڵی بەردین)). هەندێك لە بەردەکان لە کوارتز پێك دێن، بەردە لمیەکان دەمارێك لەکوارتزیان تێدایە. کە بە ماددەیەکی چەسپی پێوەی نوساوە. کوارتز بەشێکی گەورە پێکدێنێت لەو بەردانەی کە پێیان دەوترێت ((گرانیت)) لمی سپی کوارتزی بێ گەردە. هەمو لمەکان لە کوارتز پێکهاتون. هەموو بەردە بەنرخەکان کوارتزی ڕەنگاوڕەنگن، لەگەڵ ڕێژەیەکی کەم لە مەوادی تر تیایاندا. نمونەی: عەقیق، جمشت ((بەردێکی بەنرخی ڕەنگ ئەرخەوانی یان وەنەوشەییە)). لەگەڵ

عەقیقی یەمانیدا. كوارتز لە پیشەسازی شوشەو كەرەستەبینینیەكان و پەخشی ئیستگەكاندا بەكاردەهێنرێت. كاتێك كریستاڵە بەردیە بێ گەردیەكانی لە پلەی گەرمای ١٧١٠ پلەی سەدیدا دەتوێنینەوە، ئەو كوارتزەی دەستمان دەكەوێت ماددەیەكی زۆر بەسودو بەنرخە و لە هەر ماددەیەكی تر كەمتر هەڵدەكشێو دادەكشێو زۆر لە شوشە ڕونترە. ماددەیەك بەو جۆرە بەهێز بێت لە بەردەم ئاگرو توانەوەدا. زۆر بەنرخ دادەنرێت بۆ كەرەستەی تاقیگە. دەتوانین سینیەك لە كوارتزی تواوە بە گەرمی یەكسەر بكرێتە ئاوێكی زۆر ساردەوە بێ ئەوەی هیچ زیانێكی پێ بگات. بە ئاسانی تیشك و گەرمای پێدا دەڕوات، ئەو تیشكەی سەروی وەنەوشەیی كە شوشە دەیمژێت بە ناو كوارتزی تواوەدا دەڕوات.

## سوتەمەنی چیە؟

سوتەمەنی ماددەیەكە دەسوتێنرێ بۆ ئەوەی گەرمی و ڕووناكیمان بداتێ، لەگەڵ وزەدا. كرداری سوتان كردارێكی كارلێكی كیمیاویە. ماددە سوتاوەكە لەگەڵ ئۆكسجینەكەدا یەك دەگرن لە هەوادا بۆ بەرهەم هێنانی وزە. وزەكەش لە شێوەی ڕوناكیو گەرمیدا دەردەچێت. سەرچاوەی وزەی سوتەمەنییەكان خۆرە، ڕووەكەكان كە سوتەمەنی لێیانەوە دروست دەبێت، وزەی خۆر پەسیسە دەكەن لە دروستكردنی ڕیشاڵەكانیاندا، ئەو وزەیەی كە لە دارو خەڵوزی سوتاوەوە دەردەچێت ڕوەكەكان بەو جۆرە پەسیسەیان كردووە. ئێمە كاتێك خەڵوز یان نەوت دەسوتێنین واتە بەكارهێنانی ئەو وزەیەی كەڕوەكەكان پێش ملێۆنەها ساڵ پەسیسەیان كردووە. چەندین جۆر لە سوتەمەنی هەیە، لە واقیعدا ئەوەی بسوتێت دەتوانین بە سوتەمەنی ناو ببەین. بەڵام بەناوبانگترین جۆری سوتەمەنی خەڵوزو دارو گازی سروشتیو نەوتە. دەتوانین سوتەمەنی پۆلێن بكەین بۆ وشك، شل، گازی. یان بە گوێرەی بنەچەكی خۆیان پۆلێنیان بكەین بۆ سوتەمەنی سروشتیو كیمیاویو كانزایی. دار یەكەمین جۆری سوتەمەنی بووە كە مرۆڤ بەكاری هێناوە. بە درێژایی هەزاران سەدە دار گرنگترین سوتەمەنی بوە بۆ مرۆڤ. چونكە بە ئاسانی دەستی كەوتوەو هەرزانیش بوە. بەڵام لە سەدەی شازدەهەم دا، دار وای لێهات بە ئاستەم دەستی مرۆڤ دەكەوت و خەڵوز جێگەی گرتەوە. خۆر

ڕێژەیەکی زۆر لە کاربۆنی تێدایە، کاربۆنیش بەشێکی گرنگە لە زۆربەی جۆرەکانی خەڵوزدا. هەر سوتەمەنیەکیش ڕێژەیەکی زۆر لە کاربۆنی تێدابێت باشتر دەسوتێت و ئاگرەکەشی گەرمترە.

## چۆن کۆترەکان دەگەڕێنەوە زێدی خۆیان؟

دیارترین شت لە سروشتدا ئەو توانا گەورەیەیە، لای کۆترەکان، کاتێك ماوەیەکی زۆر دەبڕن و پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە باڵیان گرتۆتەوە. لەبەر ئەو هۆیە کۆتر پێش دوو هەزار ساڵ ڕۆمانیەکان بەکاریان هێناوە بۆ نامە گواستنەوە. لە سەدەی دوانزەهەمیشدا، خەلیفەی بەغداد کۆتری بەکارهێناوە بۆ گواستنەوەی نامە نهێنیەکانی. لە جەنگی دوەمی جیهانیشدا سوپاکان کۆتریان بەکارهێناوە بۆ گواستنەوەی نامەی نهێنی. تەنانەت لەم ڕۆژگارەشدا سەرەڕای بوونی هەمو هۆیەکی گواستنەوەو گەیاندن، سوپاکان تا ئێستاش کۆتر بۆ گواستنەوەی نامەی نهێنی بەکاردێنن.

## ئایا دەزانن کۆتر چۆن ئەو ڕێگایانە دەزانێت و چۆنیش لێیەوە دەگەرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە باڵی گرتۆتەوە؟

ئەم پرسیارە تا ئێستناش زانایانی سەرسام کردوە. ئەوان وای دەبینن کە کۆترەکان بە یارمەتی خۆر ڕێگاکان دەردەکەن. لەبەرئەوەی شوێنی خۆر لە ڕۆژدا دەگۆڕێت و لە نیوەڕواندا بە ستونی دەوەستێت و لە ئێوارااندا ئاوا دەبێت. دەڵێن کۆتر توانایەکی تایبەتی هەیە لە زانینی ئاڕاستەکان و ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ڕۆژدا بەسەر شوێنی خۆردا دێت. هەموو کۆترەکان ئەو توانا سەیرەیان نیە. نزیکەی ٢٨٩ جۆر کۆتر هەیە کە دەتوانن ئەو ماوە دورانە بڕن لەگەڵ زانینی ئاڕاستەکاندا. هەروەها لە کۆترەکاندا هەندێك نەریتی سەیر هەیە. بۆ نمونە هەندێکیان پێیان باشە بە تەنیا بژێن و بە تەنیا بفڕن. هەندێکی تریشیان بە کۆمەڵ. هەندێك جۆری کۆتر لە شاردا دەژین و هەندێکی تریشیان لانەکانیان لە ناو دارستانە چڕەکاندا دروست دەکەن. کۆتر توانایەکی بێ وێنەی هەیە لە بڕینی نێوانێکی دوردا. کۆترێکی دۆقی لویلتعتون لە ٨ی نیسانی ساڵی ١٨٤٥دا باڵی

گرتەوە لە ڕۆژئاوای ئەفریقیاو دوای پەنجاو پێنج ڕۆژ لە دوری ١,٥ کیلۆ مەتری لە نزیك لەندەن کەوتە خوارەوەو مرد. دوای ئەوەی لەو ماوەیەدا ١١٢٦٥ کیلۆ مەتری بڕیبو. لە ساڵی ١٩٤١ دا لە ئەمریکا، کۆترێك بە ٢٤ کاتژمێر ١٢٩٢ کیلۆ مەتری بڕی. لە بەریتانیاش لە ٨ی ئایاری ١٩٦٥ کۆترێك بە یەك کاتژمێر ١٧٧ کیلۆ مەتری بڕی.

## گیانداری دەریایی هەیە قسە دەکات!

دۆلفین گیاندارێکی دەرییاییەو لە زۆر ڕووەوە لاسایی مرۆڤ دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەی لەدیمەندا لە ماسی دەچێت. بەڵام گیاندارێکی مەمکدارەو بەچکەی دەبێت و شیری دەداتێ. هەریەك لە نەهەنگ و دولفین و بەرازی دەریایی لە گیاندارە مەمکدارەکانن. دۆلفین سیفەتێکی تری هەیە، ئەوەیە کە، کەپوی نییە هەناسەی پێ بدات، بەڵکو لە ڕێگەی سیەکانیەوە هەناسە دەدات. چون لە سەریدا کونێك هەیە پێی دەوترێت لوت. سەری لە ئاو دەردەهێنێت و لە ڕێگەی ئەو کونەوە هەناسە دەدات. کلکی دۆلفین بە شێوەی ئاسۆییە، لە کاتێکدا کلکی ماسی لەگەڵ لاشەیدا بەشێوەی ستونی وەستاوە. درێژیەکەی دەگاتە ١,٧٥مەترو لە دەمیدا ٨٠ بۆ ١٠٠دان هەیە. ڕەنگی ڕەش یان قاوەییە و لە هەردوو زەریای ئەتڵەسی و باسیفیکی دا هەیە. دۆلفین یەکێك لە گیاندارە هەرە زیرەکەکانەو پسپۆڕە لە لاسایی کردنەوەی مرۆڤدا، بە جۆرێك کە دەتوانێ لاسایی دەنگی مرۆڤیش بکاتەوە. لە پێشانگای دەریایی فلۆریدادا، دۆلفین هەیە بە دەنگی مرۆڤ قسە دەکات، ڕۆژێك ئافرەتێك لە نزیکەوە دەستی کرد بە پێکەنین، دۆلفینەکەش یەکسەر لاسایی کردەوە. ئەو بەشانەی قوڕگی دۆلفین کە دەنگ دەردەکەن. دەتوانن دەنگی مرۆڤیش دەرکەن. هەروەها لەسەر قسەکردنیش ڕادەهێنرێت. لە سەرو کەلاوەکانی دۆلفیندا جۆرە زەیتێك دەردەهێنرێت، کە بۆ چەورکردنی بەشەکانی کاتژمێرو ئامێرە گران بەهاکانی تر بەکاردەهێنرێت. زانایان بەردەوام تاقیکردنەوە لەسەر زیرەکی دۆلفین دەکەن.

## کە مۆم دەسوتێت بۆ کوێ دەچێت؟

خەڵکی ئاسایی وا دەزانن، دار یان خەڵوز یان زەیت کە دەسوتێن لەناو دەچن بەهەمان شێوە سوتانی مۆمیش. بەڵام لە ڕاستیدا دوای سوتانیان ئەو مەوادانە لەناو ناچن، بەڵکو تەنها شێوەیان دەگۆڕێت. سوتان گۆڕانێکی کیمیاوییە. بە هاوکاری ئۆکسجین ڕودەدات و مادەش لەم کردارەدا نافەوتێت. بەڵام بەسانایی شێوەی خۆی دەگۆڕێت. ئەم کردارەش بە یاسای لەناونەچونی مادده دەناسرێت. کاتێك مۆم دەسوتێت دەگۆڕێت بۆ مەوادی تر. لەگەڵ داگیرساندنی فتیلەی مۆمەکەدا، بەهۆی گەرماوە مۆمەکە دەست بەتوانەوە دەکات. ئەم دیاردەیەش لە تایبەتمەندییەکانی شلەکانە. دوای ئەوە مۆمەکە دەگۆڕێت بۆ گازو گازەکەش دەست بە سوتان دەکات و گەرماو ڕوناکیمان دەداتێ! مۆم تێکەڵەیەکی ئەندامی هایدرۆکاربۆنی زۆر ئاڵۆزە. واتە هایدرۆجین و کاربۆنی تێدایە. لە کاتی سوتاندا کاربۆنەکە لەگەڵ ئۆکسجینی هەوادا یەك دەگرن و دوەم ئۆکسیدی کاربۆن پێکدێنن. هایدرۆجینی مۆمەکەش لەگەڵ ئۆکسجینی هەوادا یەکدەگرن و هەڵمی ئاو پێکدەهێنن. لە ئەنجامی ئەو دو کارلێکەدا مۆمەکە بەکاردەبرێت و لە ئەنجامی بەکاربردنیشدا قەبارەی بچوك دەبێتەوە. ئەگەر هەڵمی ئاوەکەو دوەم ئۆکسیدی کاربۆنەکە کۆبکەینەوەو بیکێشین. کێشیان لە کێشی مۆمە ئەسڵیەکە زیاترە. هۆی ئەو زیادەیەش ئەنجامی یەکگرتنی ئۆکسجینە لەگەڵ کاربۆن و هایدرۆجیندا. بەو جۆرە دەبینین مۆمەکەش دەش سوتێت، بەڵام لەناو ناچێت بەڵکو دەگۆڕێت بۆ دوەم ئۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو.

## گەرما

ڕۆژێك لەڕۆژان زانایان باوەڕیان وابوە گەرما جۆرێکە لە شلەمەنی، لەتەنە گەرمەکانەوە دەچێت بۆ تەنە ساردەکان. ئەو شلە خەیاڵیە پێی دەوترا ((تین)) یان یەکەی گەرمایی. بەڵام ئێستا دەزانین گەرما جوڵەیەکی بەردەو لمە بۆ گەردیلەو گەردیلۆکەکان لە تەنەکان و شتەکاندا. بۆ نموونە: کاتێك گەردیلەو گەردیلۆکە دەرباییەکان زۆر بەخێرایی دەجوڵێنەوە، دەڵێین پلەی گەرما بەرزە،

یان هەوا گەرمە، کاتێك لەسەرەخۆ دەجولێتەوە. وەکو لە ڕۆژێکی سارددا دەیبینین، هەست دەکەین هەوا خۆشە گەردیلەو گەردیلۆکەکان ناتوانن بە ئازادی لە شلەمەنیەکان و تەنە ڕەقەکاندا بجولێنەوە. بەڵام جولەش هەیە. تەنانەت لەپلەی گەرمای بەفری تواوەدا. گەردیلەکان، لەجولانی بەردەوامدان. بە جۆرێك کە گەردیلەیەکی هایدرۆجین، لەو پلەی گەرمایەدا بە خێرایی (١٩٥٠) مەتر لە چرکەیەکدا دەجولێتەوە. لە ١٦ سانتیمەتری سێجاداو لە یەك چرکەدا هەزار ملیۆن، ملیۆن لێدان ڕودەدات لە نێوان گەردیلەکاندا. گەرمیو گەرما یەکێك نین. سوتاندنی گازێکی زۆر لە سوتاندنی گازێکی کەم گەرمتر نییە. بەڵام گەرمای زۆرتر دەدات چونکە ڕێژەیەکی زیاتر لە گاز سوتاوە. گەرمی شێوەیەکە، لە شێوەکانی وزە. ئێمە کاتێك گەرمی دەپێوین، واتە وزە دەپێوین گەرمی بە (کالوری) دەپێورێت. ((کالوری)) ڕێژەی گەرمایەکی پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی گەرمای یەك گرام لە ئاوی یەك پلەی سەدی. بەڵام پلەی گەرمای لەش بە تەرازوی گەرمی پێو ((ترمۆمەتر)) دەپێورێت. کاتێك دو شت بەیەکەوە دەنوسێنین، دەشێت دەرفەتێك لە نێوانیاندا نەمێنێت بۆ چونی وزەی گەرما لە یەکێکیانەوە بۆ ئەوی تر. بۆیە پێیان دەڵێن پلەی گەرمایان یەکێکە. بەڵام ئەگەر یەکێکیان لە ئەنجامی خاوی گەردیلەکانی، گەرمای خۆی لەدەست داو ئەوی تریش لە ئەنجامی خێرایی گەردیلەکانی وەری گرت، ئەوکاتە دەڵێن گەرماکە لە شتە گەرمەکەوە چوو بۆ شتە ساردەکە.

## مەدام کوری

ڕادیۆم توخمێکی کانزایی تیشکدەری بەهێزە. یەکێکە لەو توخمە نەبینراوانەی کە تیشکی نەبینراو دەردەدات. ئەم جۆرە توخمانە پێیان دەوترێت ((توخمەکانی تیشکە چالاکەکان)). ئەو تیشکانەش کە دەری دەدەن پێیان دەوترێت تیشکی چالاك. کە سێ جۆرن. تیشکی ئەلفا، تیشکی بیتا، تیشکی گاما. نیوەی ئەو تیشکەی لە ڕادیۆمەوە دەردەچێت لە ماوەی ١٦٢٢ساڵدا شیتەڵ دەبێت و دەگۆڕێت بۆ قورقوشم. ئەمەش پێی دەوترێت ((نیوەی تەمەن)). توخمی تیشکدەری چالاك لە ١٦٢٢ساڵی داهاتودا، نیوەکەی تری دەخورێت و دەگۆڕێت

بۆ قورقوشم. ئەم کردارە بۆ هەتا هەتایە بەردەوام دەبێت. تیشکی تیشکدەری چالاك، هێندە بەهێزە تەنانەت دەتوانێت، چەندین جۆر لە مەوادی جیاواز ببڕێت، لەوانە لاشەی مرۆڤ. ئەم تیشکە ئەگەر بە باشی بەکاربهێنرێت زۆر بەسودە. بە تایبەت لە چارەسەرکردنی نەخۆشی شێرپەنجەدا.

## ئایادەزانن کێ ڕادیۆمی دۆزییەوە؟

لە ساڵی ١٨٩٦دا هنری بیکیریل دیاردەی چالاکی تیشکی دۆزییەوە. سەیری کرد یۆرانیۆم جۆرێك لە تیشکە، نەبینراوەکان دەردەدات کە لە تیشکی × بەهێزترە. لە ساڵی ١٨٩٨دا پیە کوری و مەدام کوری. دۆزیانەوە ((ئۆریۆم)) کە توخمێکی کانزایی چالاکی تیشکدەرە. تیشکێکی لەو شێوەیە دەردەدات. سەیریان کرد ((بتشبلەند)) کە کانزایەکی ڕەشی بریقەدارەو یۆرانیوم بەرهەم دەهێنێت. دەشێت هەندێك مەوادی تیشکدەری چالاکی تێدابێت لەبەرئەوە تاقیگەیەکیان نەبوو، بەبێ گوێدانە باو باران لەناو کەپرێکدا دەستیان کرد بە پالاوتنی ((بتشبلەند)) لە پێناو دەست خستنی توخمێکی تازەی تیشکدەری چالاکدا. شەوو ڕۆژیان دەخستە سەریەك و ئیشیان دەکرد، تا لە کۆتایدا توانیان لە چەند تەن بتشبلەند ١٠٠ میلیگرام. لە ڕادیۆم دەست بخەن. سەیریان کرد ئەم توخمە تازەیە زۆر لە یۆرانیۆم بەهێزترە. ڕەنگی ڕادیۆمی پوخت، سپیە. زۆریش قورسەو نرخەکەشی هەزاران جار لە نرخی زێڕ گرانترە. ڕێژەی ڕادیۆمی پاك لە دونیادا زۆر کەمە. ئەم تیشکە ئەگەر بە خراپ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێت، بۆ لاشە زۆر زیان بەخش دەبێت.

## ئۆکسجین

ناوە ناوە دەبیستین کە مرۆڤ ناتوانێت بەبێ ئۆکسجین بژێت. ئەوەی کەڕاستی ئەم قسەیە دەسەلمێنێت ئەوەیە کە ئۆکسجین زۆر پێویستە بۆ ژیان و بەبێ ئۆکسجین مرۆڤ لە چەند خولەکێك زیاتر ناتوانێت بژێت. ئۆکسجین توخمێکە زۆرترین بوونی لە گەردووندا هەیە. کە نزیکەی نیوەی بەرگە گازو زیاتر لە یەك لەسەر پێنجی هەوا پێك دێنێت. ئێمە ئۆکسجین دەمژین و دەچێتە سیەکانمانەوە. بۆ ئەوەی

خڕۆكە سورەكان لەگەڵ خۆياندا هەڵی بگرن بۆ خانەكانی لاشە. لەوێدا خواردن دەسوتێت و گەرمای پێویست بەرهەم دێت بۆ هێشتنەوەی مرۆۆ لە ژیاندا. ئۆكسجین بە ئاسانی لەگەڵ زۆربەی توخمەكانی تردا یەك دەگرێت و ئەو كردارەی پێی دەوترێت (ئۆكساندن). كاتێك ئۆكساندن بە خێرایی ڕوودەدات (سوتاندن) دروست دەبێت. لە هەموو كردارەكانی ئۆكساندندا گەرما بەرهەم دێت. بەڵام هێندە بە خێرا بەرهەم دێت كاتی نیە بۆ گواستنەوە، بەوەش پلەی گەرما زۆر بەرزدەبێتەوەو ئاگر دەكەوێتەوەو. جۆرێكی تری ئۆكساندن، سوتاندنی خواردنە لە لەشدا بۆ بەردەوام بوونی ژیان. ئۆكساندنی خاویشمان هەیە كە بەهۆی ئۆكسجینی هەواوە ڕوودەدات وەكو دروست بونی ژەنگ لەسەر ئاسن ووشك بوونەوەی چەوری و گۆڕانی كحول بۆ سركە. ئەو هەوایەی دەیمژین تێكەڵەیەكە لە نایترۆجین و ئۆكسجین. لەبەرئەوە دەتوانین ئۆكسجینی پاك لە هەوادا دەستمان بكەوێت. ئەویش بە ساردكردنەوەی هەوا بە زیاتر لە ١٨٠ پلەی ژێر سفر تا دەبێتە شلە. دوای ئەوە شلەكە گەرم دەكرێت و دەكوڵێنرێت، نایترۆجینەكە دەچێت و ئۆكسجینەكەش بە پاكی دەمێنێتەوە. زۆر كەس كە تەنگە نەفەسییان لەگەڵدایە، بەهۆی بەكارهێنانی ئۆكسجینەوە درێژە بە ژیان دەدەن.

## هەرمێ لەكوێدا پەیدابووە؟

كشت و كاڵی هەرمێ لە ناوەڕاستی ئاسیادا سەری هەڵداوە و پاشان بەسەرانسەری جیهاندا بڵاوبۆتەوە. تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم. جۆرەكانی هەرمێ لە دووسەد جۆر زیاتر نەبوون. بەڵام لە سایەی كشتوكاڵی نوێدا ئێستا جۆرەكانی لە هەزاران جۆر تێدەپەڕێت. میوەی هەرمێ بە بۆنی خۆش ناسراوە وەكو چۆن ئاوی زۆر یەكێكە لە تایبەتمەندیەكانی. هەرمێ لە مانگەكانی ئەیلول و تشرینی یەكەم و دوەمدا بە ڕەقی لە دار دەكرێتەوە. دوو جۆر هەرمێ هەیە، یەكێكیان توێكڵەكەی ڕەقەو خۆی نەرمەو بۆنەكەی زۆر گوڵاویەو شێوەی خڕەو تامی شیرینە. بەڵام جۆری دوو ەم شێوەكەی هێلكەییەو تۆزێك مەیلەو ترشە. لە مانگی تشرینی یەكەمدا جۆرێك لە هەرمێ لە دار دەكرێتەوە، شوێنی ئوستralیاو تامەكەشی لە نێوان ترش و شیریندایە. چەندین جۆر لە هەرمێ هەن، تا كۆتایی

مانگی کانونی دووەم بە دارەوە دەمێنێتەوە هەرمیٚ لە دروستکردنی زۆرشتدا بەکار دەهێنرێت بە تایبەت کێك و شیرینی. هەندێك لە گەلان. لەگەڵ گۆشتی باڵندەکاندا دەیبرژێنن، لە فەرەنساشدا لەگەڵ گۆشتی ماسیدا دەیخۆن. لە وولاتی شامیشدا وشکی دەکەنەوەو پاشان بە قوتوکراوی دەیفرۆشن.

## سوقرات

سوقرات بە یەکێك لە گەورە فەیلەسوفەکانی جیهان دادەنرێت. لە ساڵی ٤٧٠پێش زاین لە ئەسینای یونان لەدایك بووە. سوفرونیسکۆسی باوکی پەیکەرتاش و دایکیشی مامان. هیچ شتێك دەربارەی منداڵی نازانین بەلاّم کە گەیشتە تەمەنی گەنجی بو بە کەسێکی زۆر ناسراو لە شاردا. سوقرات پیاوێکی ناشرینی لووت فشی چاو بە قولاّ چوو بووە. بەلاّم زیرەکییەکەی نا ئاسایی بووەو هیچ کەسێك نەیتوانیوە بۆ ماوەیەکی درێژ مونازەرەی بکات ڕۆژێك لە ڕۆژان پیاوێك پرسیاری کرد، ئەگەر کەسێك هەبێت لە زیرەکیدا لە سوقرات بچێت، هاورێکەی وەلاّمی دایەوە. هیچ کەسێك نییە لە داناییدا بگاتە سوقرات. سوقرات لە بازاڕەکانی شاردا دەوەستاو باسی سەلامەتترین شێوازی ژیانی بۆ خەڵکی دەکرد. کاتێك خەڵکی دەبینی چەندین جۆر مەوادیان کڕیوە. پرسیاری لێیان دەکرد دەتوانم بەبیٚ چەندێك لەو مەوادانە بژیم؟

سوقرات وای دەبینی هەموو هەڵەکان لە نەزانینەوە سەرچاوە دەگرن. ئەگەر خەڵکی ڕاستی بزانن، ئەوا لە هەڵبژاردنی شێوازی دروستدا سەختی نابینن. ڕاهاتبو لەسەر ئەو وتەیە ((چاکە لە زانیندایە)) ((کەس حەزی لە هەڵەکردن نییە)) هەمیشە خەڵکی هەڵدەناو دەیگوت. باشتر وایە موعاناتی هەڵە هەڵگریت، تا ئەوەی هەڵەکە بکەیت. پێناسەی دروستی دادپەروەری و خۆشەویستی و هەڵنانی خەڵك بۆ هەوڵدان بۆ پاك ڕاگرتنی لاشەیان بەناو خەڵکدا بلاّو دەکردەوە. هەمیشە ئەم ووتەیەی دوبارە دەکردەوە ((هەوڵبدەن خۆتان بناسن)) سوقرات هیچ کتێبێکی دانەناوە بەلاّم زۆربەی قسەو ئامۆژگاریەکانی بەهۆی ئەفلاتونی قوتابییەوە بوو بە ویردی سەر زمانی خەڵکی. لە ڕێگەی ئامۆژگارییەکانیەوە سوقرات باوەڕ بوون بە خۆی لای زۆر کەس دروست کردو شوێنکەوتوانێکی

زۆری هەبوو. بەڵام کاربەدەستانی ئەسینا لە ڕێنومایی و ئامۆژگاریەکانی ڕازی نەبون. بۆیە حەسودییان پێ بردوو تاوانباریان کرد بە وێڵکردنی گەنجانی ئەسینا. بۆیە خستیانە زیندانەوە. بەڵام سوقرات لە زیندانیشدا کۆڵی نەداو سوربو لەسەر بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی. تا لە ئەنجامدا بەرپرسەکان، زۆر لێی بە تەنگ هاتن و بڕیاری خنکاندنیان دا. بەڵام ئەمەش سوقراتی نەترساند. لە سێدارەیان نەدا بەڵام ناچاریان کرد، پەرداخێك لە ژەهری شوکران بخواتەوە. سوقرات بە پێکەنینەوە پەرداخە ژەهرەکەی خواردەوە لە کاتێکدا ئەو هاوڕێیانەی لە دەوری بون بۆی دەگریان. بەڵام سوقرات هەتا گیانی سپارد پێدەکەنی.

## مارمێلکەی سەوز جوانترینی خشۆکەکانە

لەسەر زەویدا نزیکەی ٥٠٠٠ جۆر لە خشۆك هەیە. لەوانە مارمێلکە، کیسەڵ، تیمساحەکان وهتد... زۆربەی خشۆکەکان لە گۆماوەکاندا دەژین. هەندێکیشیان لە ئاودا، درێژییان لە نێوان پێنج سانتیمەترو دە مەتردایە. بچوکترین مارمێلکە لە ناوچە ئیستیوائیەکاندایە گەورەترینیشیان ماری (ئەسلە)یە. هەموو خشۆکەکان لە گیاندارە خوێن ساردەکانن. لەگەڵ ئەوەی لە هەموو شوێنێکی زەویدا هەن، بەڵام بەزۆری لە ناوچە ئیستیوائیەکاندان. مارمێلکەی سەوزی ئەورووپی جوانترینی خشۆکەکانەو دووەم گەورەترین مارمێلکەیە لە ئەورووپادا. درێژی نێرەکەیان ٤٠ سانتیمەترە، تەنها درێژی کلکی ٢٥ سانتیمەترە. لە هەموو کیشوەری ئەورووپادا مارمێلکەی سەوز هەیە. بەڵام لە بەریتانیادا ئەم گیاندارە دەگمەنەو هەوڵی زۆر درا جێگایەکی تایبەتیان بۆ دروست بکرێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. مارمێلکەی سەوز لە دوکانی فرۆشتنی ئاژەڵەماڵیەکاندا دەفرۆشرێت. خەڵکیش لەبەر ڕەنگە جوانەکەی دەیکڕن. ئەگەر کەش و هەوای گونجاوی بۆ نەڕەخسێت ئەستەمە لە ماڵدا بەخێو بکرێت. مارمێلکەی سەوز خواردنی لەسەر مێروو جاڵجاڵۆکەو کرمی زەویە.

## چۆن شتە گەرمەکان دەمانسوتێنن؟

ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە که ئاگر و شتە گەرمەکان ئازارێکی زۆرمان بۆ دروست

دەكەن. لە ئەنجامی ئەوەی کە پێی دەڵێین "سوتان" شتێکە دەبێت خۆمانی لێ بپارێزین. بەڵام منداڵ ئەو ڕاستیە نازانێت. لەبەرئەوە خۆی توشی سوتان دەکات و لێیەوە ئەزمون فێر دەبێت. لە پارچە ئاسنێکی گەرمکراودا گەردیلەکان زۆر بە خێرایی دەجوڵێنەوە، کە دەشێت یەك ملیۆن جار بێت لە چرکەیەکدا. ئەگەر دەستمان دایە ئەو ئاسنە گەرمەوە. یەکسەر هەست بە سوتان و ئازار دەکەین. لەبەرئەوە گەردیلەکان هێندە بە خێرا دەجوڵێنەوە، کەوا دەکەن. گەردیلۆکەکانی پێست هەست بەجوڵەیەکی زۆر خێراو کوت و پڕە بکەین. لەبەرئەوەیە شتە گەرمەکان دەمانسوتێنن! ڕەنگە پرسیار بکەیت، دەبێت ئەو گەردیلانە چەند بە خێرایی بڕۆن تا بتوانن بمانسوتێنن؟ دەبێت خێراییان لە ١٧٠٠ مەتر زیاتر بێت لە چرکەیەکدا.

## لەکەیەوە ڕوەکەکان لەسەر زەویدا پەیدابوون؟

زانایان دەڵێن ژیانی ڕوەکەکان. لە پێش دوو هەزار ساڵەوە لە دەریاوە پەیدا بووە. ئەو کاتەی کە وشکانی بێ ڕوەك بووە ژیانی لەسەر نەبوە. دوای ئەوە پێش نزیکەی ٤٢٥ ملیۆن ساڵە. ڕێژەیەکی لە ڕوەکی سەوز لەسەر زەوی پەیدا بوون. کە دەشێت لە گژوگیای دەریاوە پەرەی سەندبێت. ئەو ڕوەکە وشکانیانە لە قەوزەی ئەمڕۆ یان ڕوەکە زۆر بچوکەکان (خەوتوەکان) چوونە. کە ئەمڕۆ لە شوێنە تاریك و شێدارەکاندا دەیانبینین. پێش نزیکەی ٤٠٠٠ ساڵ، ڕوەك گەلێکی پێشکەوتوو تر هاتنە بوونەوە کە لە کلکی ئەسپ و سەرخەس و قەوزەکانی ئەمڕۆ دەچوون. سەرخەسیش یەکەم ڕوەك بووە کە ڕەگ و قەدو گەڵای هەبووە. کاتێك دایناسوڕەکان هاتنە سەر زەوی، ئەوکاتە دارستانگەلێکی گەورە لەسەر وشکانیدا هەبوون. داری سەرخەسیس یەکەمین داربووە لە ڕێگەی تۆوەوە زیادی کردوە. پێش نزیکەی ٣٠٠ ملیۆن ساڵیشە داری سنەوبەر لەسەر وشکانیدا هاتنە بونەوە. کە تۆوەکەی لە گۆزەدا هەڵگیراوە. زۆربەی زنجیرە چیاکان ئەمڕۆ بە دارە سنەوبەریەکان داپۆشراون. یەکەمین گوڵی جوانیش نزیکەی ١٥٠٠ ملیۆن ساڵە پەیدابووە. وردە وردە جۆرو ژمارەکانی زیادیان کرد. ئەمڕۆ گوڵی جوان لە هەموو شوێنێکی دونیادا هەیە.

## بەفر چۆن بەسودە بۆ بەروبوم؟

هەمومان دەزانین تا چەند بەفر ژیان لە کۆمەڵگادا یەك دەخات. بەڵام دەشێت بەسودیش بێت. بە تایبەت بۆ بەروبومی کشت و کاڵی. بەروبومەکان بۆ ئەوەی گەشە بکەن دەبێت ئاو بخۆن. کەواتە ئەو ئاوەی لە جۆگەلەو کانیەکاندا هەن لە کوێوە دێن؟ ئەی چی دەربارەی ئەو ئاوەی لەژێری زەویدایە؟ شتێکی بەڵگە نەویستە کە هەموو ئاوەکان "بەشێکی زۆر کەمی نەبێت" لە بەفرو بارانەوە دێن. ئاوی باران و بەفری تواوە دەچنە ژێری زەویەوە بۆ ئەوەی ڕوبارو جۆگەلەو کانیاوەکان دەوڵەمەند بکەن. بونی ئاو لەبەرگە گازدا.

هەمیشە لە شێوەی گازی نەبینراودایە. بۆ نمونە هەڵمی ئاو. ئەگەر بارودۆخی کەش لەباربێت، هەڵمی ئاوەکە چڕ دەبێتەوە بۆ دڵۆپەی ئاو یان کریستاڵی بەفرین و دەگۆڕێت بۆ هەورو، لە ئەنجامدا لەشێوەی بەفر یان باراندا دەبارێت بۆ سەر زەوی. لە زۆربەی ناوچەکانی دونیادا باران سەرچاوەی سەرەکی شێیە. بەوەش سەرچاوەی سەرەکی ئاوە. بەڵام دەشێت بەفر سەرچاوەی سەرەکی ئاو بێت لە ناوچە بەستوەکان و زۆر بەرزەکاندا. لە ڕاستیدا بەفری سەر شاخەکانی نزیك ناوچە، وشکانیەکان گەورەترین ئەمباری سروشتی ئاوەو، لە هەرچی ئەمبارە گەورەترە کە مرۆڤ دروستی دەکات. کاتێك لە بەهار یان هاویندا ئەو بەفرانە دەتوێنەوە. لە هەندێك ناوچەدا دەبنە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ ئاودان. بگرە تەنها ئاوێکە بۆ بەروبومی کشت وکاڵی سودی لێ وەردەگیرێت.

## ئایا ڕووەکەکان هەناسەدەدەن؟

هەمووگیانداران بۆ ئەوەی بژین دەبێت هەناسە بدەن. بەهەناسە وەرگرتن ئۆکسجین وەردەگرن و بە هەناسەدانەوە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدەن. تەنیا جیاوازییەك لە نێوان ئاژەڵان و ڕوەکەکاندا هەیە لە هەناسەداندا. ئەوەیە کە ئاژەڵان ئۆکسجین دەمژن و دوەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدەن. بەڵام ڕووەکەکان لە ڕۆژدا دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەمژن و ئۆکسجین دەردەدەن. بەڵام لە شەودا بە پێچەوانەوە. لە ڕۆژدا گەڵای ڕووەکەکان دووەم ئۆکسیدی کاربۆن وەردەگرن و

ماددەی سەوز (کلۆرۆفیل) لە گەڵاکاندا دەیگۆڕێت بۆ شەکرو ئاو. ئەم کردارەش پێی دەگوترێت (ڕۆشنەپێکهاتن) ئەمەش تەنها بەبوونی تیشکی خۆر ڕوودەدات. بۆ ڕزگاربون لە ئۆکسجینی بەرهەم هاتوو لەم کردارەدا ئەوەیە دەری دەدات بۆ کەش و شەکرەکەش وەکو خۆراك ڕووەکەکە بەکاری دەبات، شەکرەکەش دەگۆڕێت بۆ کاربۆهیدرات (شەکرو نیشاستە) و ترشی کاربۆنیك و ڤیتامینات. لە شەودا کاتێك خۆر نامێنێت کرداری ڕۆشنەپێکهاتن کۆتایی دێت ڕووەکەکان بەشێك لەو شەکرەی لە ڕۆژدا بەرهەمیان هێناوە، دەکەنە خۆراکی خۆیان و ئۆکسجینی کەش دەمژن و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەدەن لەبەرئەوە ئامۆژگاریتان دەکەین بە شەوان لەژێر داراندا مەخەون.

## بۆچی مرۆڤ لە گەشەسەندن دەوەستێت ؟

منداڵێك کە لە دایك دەبێت، درێژیەکەی نزیکەی ٥٠ سانتیمەترە، تا دەگاتە بیست ساڵان نزیکەی سێ ئەوەندە درێژ دەبێت کە دەکاتە نزیکەی ١,٧مەتر. بۆچی مرۆڤ تا کۆتایی تەمەنی گەشە ناکات و ئەو هۆکارە چییە وا دەکات لاشەی مرۆڤ لە گەشەسەندن بوەستێت؟ لە لاشەی مرۆڤدا سیستەمێکی لویی هەیە ناوی (غودة الصما) ە کە تەحەکوم بە گەشەکردنمانەوە دەکات. لوە صمائیەکان بریتین لە لوی دەرەقی لە ملدا، لوی نوخامی لە بنکەی مێشکدا، لوی عەستەری (توتە) لە سنگدا نزیك لە بنکەی ملەوە. لەگەڵ لوە سکسیەکاندا. لوی نوخامی بەرپرسە لە گەشەسەندنی ئێسقانەکان. ئەگەر چالاکیەکانی زیاد لە پێویست بو ئەوا هەردو باڵ و هەردوو قاچ، لە ئەندازەی خۆیان درێژتر دەبن و دەست و پێ لە ئەندازەی خۆیان گەورەتر دەبن. بەڵام ئەگەر چالاکیەکانی کەمتر لە پێویست بو، کورتە باڵا دەردەچین. منداڵ بە توتەیەکی گەورە لە دایك و لەماوەی قۆناغی منداڵیدا درێژەی دەبێت. بەڵام کە دەگاتە ١٣ و ١٤ ساڵ کرژ دەبێتەوە. ڕەنگە پەیوەندیەك لە نێوان توتەو لوە سکسیەکاندا هەبێت. هەتا توتە ئیش بکات لوە سکسیەکان بە بچوکی دەمێننەوە. بەڵام کاتێك لوە سکسیەکان گەشەدەکەن کە توتە لە ئیشکردن بوەستێت. لەبەر ئەم هۆیە کاتێك مرۆڤ دەگاتە نزیکەی (٢٢) ساڵ یان پێدەگات لە لایەنە سکسیەکەیەوە یان لە گەشەسەندن دەوەستێت! هەندێك جار لوە

سكسيەكان پێش وەخت. گەشە دەكەن. بۆیە كاری توتە پێش وەخت خاو دەكەنەوە. ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی درێژی مرۆڤ لەئەندازەی خۆی كەمتربێت. كەوا دەكات قاچەكانمان كورت ترین. چونكە قاچەكان لە دوای هەمو ئەندامەكانی تری لەشی مرۆڤ گەشە دەكەن. لەبەر ئەو هۆیەیە، ئەو كەسانەی پێش وەخت پێ دەگەن (بالغ دەبن) بە زۆری قەڵەون، كە ناپلیۆن یەكێك لەو جۆرە كەسانە بووە. بەڵام ئەگەر گەشەسەندنی لوە سكسیەكان دواكەوت. ئەوا توتە لە كاری خۆیدا بەردەوام دەبێت و مرۆڤ لە ئەندازەی خۆی زیاتر درێژ دەبێت. مرۆڤ تا تەمەنی ٢٥ساڵی بەشێوەیەكی خاو گەشەدەكات. بەڵام لەتەمەنی نێوان ٣٥ بۆ٤٠ ساڵ دەگاتە لوتكەی درێژ بوون، دوای ئەوە لاشەی مرۆڤ بە رێژەی ١٢ملیمەتر. لە هەر دەساڵدا كورت دەبێتەوە. هۆیەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ وشك بونەوەی كڕكڕاگەی جومگەكان و كڕكڕاگەی پشت لە تەمەنی پیریدا.

## كێ (اختزال)ی داهێنا؟

(اختزال) یاسایەكە بۆ نوسینی خێرا، بە بەكارهێنانی پیتە ئەبجەدییەكان یان كورت كردنەوەیان، یان دانانی هێما بۆ پیتەكان یان وشەكان یان ڕستەكان. ئەمڕۆ اختزال بە شێوەیەكی بەرفراوان لە نوسینگەكانی هەموو وڵاتە پیشەسازییەكانی جیهاندا، بەكاردەهێنرێت لەبەرئەوەی سودێكی زۆر دەگەیەنێت. زۆربەی مێژونووسان بنەمای اختزال دەگەڕێننەوە بۆ مێژونوسی ئەغریقی كسینفون Xenphon. كە سیستەمێكی ئەغریقی كۆنی بەكارهێنا بۆ نوسینەوەی یادەوەریەكانی سوكرات. لەڕۆماش ((ماركوس تولیوس تیرۆ))ش لە ساڵی ٦٣ پێش زاین، اختزالی بە لاتینی داناو فەرهەنگێكیشی لەسەر دانا. بەڵام پێشكەوتنی پرۆگرامی لە سەدەی حەڤدەهەمدا ڕویداو، ((جۆن ویللیس)) بە باوكی ((اختزال)) دادەنرێت. دوای پێشكەوتنی پیشەسازی اختزال زیاتر لە بواری بازرگانیدا بەكارهێنرا. لە سەدەی هەژدەهەمدا چەندین سیستەمی اختزال دانران. بەڵام زمانەكانی فەرەنسی و ئیسپانی و پرتوگالی و سویدی و ئەڵمانی و هۆڵەندی و هی تریش سیستەمێكی اختزالیان پەیڕەو كرد. كە لە ساڵی ١٨٦٨دا، لە لایەن موختەزیلی بەریتانی ((صمۆئیل میلۆر))ەوە دانرا. اسحاق بێتمانیش لە ساڵی

١٨٣٧دا سيستەمێكی نوێی اختزالی دانا، كەناسراوە بە سيستەمی ((باتمان))و لە ٢٥پيتی بێ دەنگ و ٢٤جوتە دەنگی بێ دەنگ و ١٦دەنگی بزوێن پێك دێت. لە ساڵی ١٨٨٨دا، جۆن گريك ی ئيرلەندی سيستەمێكی تری اختزالی دانا، كە لەسەر بنەمای بازنەو قولاب و ئەڵقەيی پێك هاتبو. ئەم سيستەمەی جۆن لە ساڵی ١٨٩٣وە. لە ئەمريكادا كاری پێدەكرێت و پێشكەوتنی زۆری لە پێشخستنی اختزالدا دروست كرد. ئەمڕۆ ئامێری زۆر هەن بۆ تۆماركردنی دەنگی خێرا.

## مار چی دەخوات؟

هيچ مارێك نيە ڕووەك خۆر بێت، هەمو مارەكان گۆشت خۆرن. لە لاشەی ماراندا شيراوگی هەرسی زۆر بەهێز هەيە، پێويستيشە لە ماردا ئەو شيراوگانە هەبن، لەبەرئەوەی مار هەميشە خواردنی تەواوو قورس دەخوات. مار دانێكی وای نييە كە خواردنی پێ ورد بكات. ئەوەی كە ماران هەيانە دانگەلێكی لاوازن. كەلە دەرزی دەچن و دەتوانێت بەهۆيەوە نێچيرەكەی بگرێت و بريندارى بكات و ڕايكێشێت بۆ ناوی دەمی. بەڵام ناتوانێت بيجوێت. نامۆترين شت لەمارو خواردنيدا پێكهاتەی كەلاوەكانيەتی، كە زۆر بە لاوازی پێكەوە نوساون و بە ئێسقانەكانی تری كەللەسەريەوە. لە هەردو ديوی كەلاوەكانيەوە دان هەيە. زۆربەی مارەكان لە سەقفی دەمياندا دو ڕيز دان هەيە. هەريەك لەو ڕيزە دانانە لەسەر ئێسقانێكن كە ماسولكەی تايبەتی دەيجوڵێنێت. مار بەپاڵنانی كەلاوەی قوربانيەكە قوت دەدات و بە دانەكانيشی دەيخوات. كەلاوەكەی تريشی بەهەمان شێوە بەسەر قوربانيەكەدا، دەبات بەوجۆرە ماران خواردنەكەيان بۆ ناو گەرويان پاڵ دەنێن. بەو پێكهاتە سەيرەی كەلاوانەی، مار دەتوانێت، ئاژەڵێكی ئەوەندە گەورە بخوات كەجێی سەرسوڕمان بێت. بۆ نموونە ماری ((ئاسڵە)) دەتوانێت ئاژەڵێك بە ئەندازەی ئاسكێك يان پڵنگێك قوت بدات! زۆر سروشتيە كە مارە بچوكەكانيش گيانداری بچوك بخۆن. زۆربەی مارەكان، گيانلەبەرانێك دەخۆن، بە ئەندازەی لاشەی خۆيان بێت. وەكو شێرەكوللەو بۆق و ماسی و مشك و باڵندە. هەندێ كوێرە مارو مارە لاوازەكانيش، مێرولەی سپی دەخۆن و هەندێك مار هەن ماری تر دەخۆن! مارەكان حەز لە هەڵبژاردنی ئەوە دەكەن كە دەيخۆن. مارە

سەوزەکان ماسی و چۆلەکە و جالْجالۆکە و پرگەکانی پەپولە دەخۆن. بەلاّم مارمێلك و مشك ناخۆن. ماری ئاویش ماسی و بۆق دەخوات. بەلاّم مێرو و جرج ناخوات. ((گەرتەر))کە مارێکی ئەمریکی بێ ژەهرە، وەکو دەردەکەوێت چەندین جۆری جیاواز لە گیانداران بخوات، وەکو کرم، ماسی، بۆق، بالّندە و کرتێنەرەکان.

## ڕوەك هەن لەسەر ڕوەکی تردەژین!

هەموو گیانلەبەران لەژیاندا پشت بە خواردنی ئاژەلاّنی تر یان ڕوەکەکان دەبەستن. وەکو چۆن زۆربەی ڕووەکەکان خواردنەکانیان بەهۆی ڕۆشنەپێکهاتنەوە بەرهەم دەهێنن. بەلاّم هەندێك ڕوەك هەن بەهۆی نەبونی کلۆرۆفیلەوە ناتوانن خۆراکی خۆیان دروست بکەن، بۆیە ناچارن لەسەر ڕووەکی تریان گیاندارە مردووەکان بژین. ئەو ڕوەکانەی کە لەسەر زیندەوەرە مردووەکان دەژێن پێیان دەوترێت ((کەڕوییەکان)). ئەوانەشیان لەسەر ڕووەکەکان دەژین پێیان دەوترێت ((مشەخۆرەکان)).

## ئایا دەزانن ئەو ڕوەکانە کامانەن؟

کەڕوییەکان ڕۆلێکی گرنگ دەبینن لە کرداری فشەلْ کردن و پاککردنەوەی زەوی لە گیاندارە مردووەکان. بە هەرس کردن و مژینی مەوادە خۆراکییەکان لە ماددە مردوەکەدا. هەموو جۆرە کەڕووییەکان و بەکتریاکان کە کلۆرۆفیلیان تێدانیە. لە ژێر ئەم گروپەدا پۆلین دەکرێن. چونکە ناتوانن خۆراکی خۆیان دروست بکەن. مشەخۆرەکانیش ئەو ڕوەکانەن. کە ناتوانن خۆراکی خۆیان دروست بکەن بۆیە لەسەر ڕوەکی تر دەژین. مشەخۆرەکان ئەوخۆراکەی دەستیان دەکەوێت لەو ڕوەکەوە لەسەری دەژین. لەڕێگەی ئەندامێکەوەیە پێی دەوترێت ((مژەرەکان)). کەچونە ناو بۆ مشەخۆرەکە مسۆگەر دەکات بۆناو ڕوەکەکانی ترو لەسەر ڕیشالّەکانی دەڕوێت. زۆربەی مشەخۆرەکان ژمارەیەکی زۆر گەیەنەریان هەیە. بەلاّم هەشیانە لەیەك گەیەنەر زیاتری نییە. پشت بەستنی ڕوەکە مشەخۆرەکان لەسەر ڕوەکی تر، لەسەر شێوە سەوزەکەی دەوەستێت. ڕوەکی گیالّەکە ((کە

ڕوەکێکی زیان بەخشی بێ گەڵایە)) ڕوەکێکی مشەخۆری ناسراوەو وەکو مار نەرمەو وردە. ڕەنگەکەی لە زەردی کاڵەوە دەچێت بەرەو سور. کاتێك دەڕوێت شێوەی بازنەییەو دارێك دەدۆزێتەوە خۆی پێوە دەئاڵێنێت و خواردنی خۆی لێوە دەست دەخات. ڕوەکێکی تر هەیە، نمونەی ((ورت)) یان جەعفیل یان گورگە کە لەسەر ڕەگی ڕوەکەکانی تر دەژێن. نەك لەسەر قەدەکەیان. ئەم ڕوەکانە کەمتر لە ڕوەکی گیاکەڵە دیارن، چونکە بەشە سەوزەکەیان لە ژێر زەویدایە. ڕوەکێکی تری مشەخۆر هەیە ناوی دەموکانە Loranthus. وەکو هێشو لە لقی داراندا دەڕوێت و پێوەی دەئاڵێت. مژکێك بەرهەم دەهێنێت پەیوەندی دەکاتە قەدی ڕوەکە لەسەر ژیاوەکەو وە ئاوو مەوادی کانزایی تری لێیەوە دەمژێت. دەتوانێت خۆراك بە ڕۆشنەپێکهاتن بەرهەم بێنێت. بەڵام دەبێت ئاوو مەوادی کانزایی لەدارەکە وەرگرێت. قەوزەکان، ڕوەکی مشەخۆرن و توێکڵی دار دادەپۆشن و خۆراکی خۆیانی لێوە وەردەگرن.

## لیك چیە؟

لەناو دەمی مرۆڤدا سێ جۆری لو هەیە، کە لیك بەرهەم دەهێنێت. دو لوی نەکەفی لەگەڵ دو لودا دەکەونە ژێری زمانەوە. لەگەڵ دو لوی تردا کە دەکەونە ژێری کاجیڕەوە. دو لوە نەکەفیەکەش دەکەونە نێوانی ئێسقانی گوێ و کاجیڕەوە. کە دەفرێکی بچوکیان تێدایە پێی دەوترێت کەناڵی ((ستنن))کە لیك دەگوێزێتەوە بۆ ناودەم، لەگەڵ دو لوی بچوکتر کە دەکەونە ژێری زمانەوە. بەڵام لوەکانی ژێر کاجیڕە هەر لویەکی بە ئەندازەی بادەمێکەو دەکەونە نێوانی زمان و ئێسقانی کاجیڕەوە. لیك شلەیەکی تەڕی لینجە ڕەنگی نییە، زۆر گرنگە بۆ هەرس کردنی خۆراك. ڕێژەی ئاو لە لیکدا ٩٨٪ و ٢٪کەی تریشی ئەنزیماتە. گرنگترین ئەنزیماتی لیك ((هەوێنی لیك)) یان ((تایلین))ە کە نیشاستە دەگۆڕێت بۆ شەکر. ئەو شەکرەش پێی دەوترێت ((ملتۆز)). لە هەوێنە لیکییەکانی تر ئەنزیمی ((لیسیۆزیم))ە کە کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی هەیە لە کوشتنی ئەو بەکتریایانەی دەچنە ناو دەمەوە. ئەگەر خواردن بە باشی بجوین لیك زیاتر دەرژێت. کە یارمەتی نەرم کردنەوەی خواردنەکەمان دەدات بۆ ئەوەی بە سورێنچکدا بڕوات.

هەروەها دەمیش تەڕ دەكاتەوەو لە وشكبونەوە دەیپارێزێت. ئەگەر كرداری لیك ڕژان خاو بوەوە یان دواكەوت ئەوا هەست بە تینویەتی دەكەین.

## پرسیار لێرەدا ئەمەیە چۆن لیك ڕژان دروست دەبێت؟

لەگەڵ بیرمانكردەوە یان بۆنی چێشتێكی خۆش بە لوتماندا هات یان خواردنێكمان بینی یەكسەر ڕژاندنی لیك زیاد دەكات و لوە لیكیەكان بەناویست دەست بە جوڵە دەكەن. لوە لیكیەكان دەماری ویستی و ناویستیان تێدایە، وروژاندنی ئەو دەمارانە دەبێتە هۆی لیك ڕژاندن. لوە لیكیەكان ڕۆژانە نزیكەی ١,٥لیتر لیك دەڕژێننە دەمی مرۆڤەوە. لە ئەركە سەرەكیەكانی لیك پاراستنی ئاستی ترشیە لە دەمدا. بۆ ئەوەی ئەنزیماتەكان كاریگەربن. ڕێژەی لیك ڕژاندن لە منداڵدا زیاترە تا گەورە. هۆیەكەشی ئەوەیە لوە لیكیەكان تا چەند ساڵێك دوای لە دایك بونیش هەر چالاكن. هەندێك كەس هەن لە كاتی خەوتندا لیك لە دەمیان دێتە دەرەوە. ئەو كەسانە كێشەی خراپی هەرس كردنیان هەیە.

## سودەكانی سێو

وتەیەكی كۆنی ئینگلیزی هەیە كە دەڵێت ((هەموو ڕۆژێك سێوێك بخۆ پێویستت بە پزیشك نابێت)). ڕێگەیەكی چاك بوو كە دەیگوت سێو ڕێگری لە قەبزبوون دەكات. هەرچەند باوەڕ وابوو كەئاوی سێو بە نەگەیشتویی یارمەتی هەرس كردنی خۆراك دەدات. لە ئەمڕۆدا زانست گومانی لەم حوكمە هەیە. بەڵام گومان لە وەدا نیە كە سێو زۆر سودی بۆ لاشەی مرۆڤ هەیە. هەندێك كەس ئەو وتەیەی پێشویان ڕاست تر كردەوە بە ((خواردنی سێوێك ڕۆژانە پێویستت بە پزیشكی ددان نابێت)) پزیشكان دەڵێن قەپ دان لە سێوی نەرم ڕێگەیەكی زۆر چاكە بۆ لابردنی پاشماوەكانی خواردن لەبنی ددانندا. خواردنی سێوێك دوای هەر ژەمێكی خواردن لە ئێوارەو بەیانیدا باشترین ڕێگە چارەیە بۆ پاراستنی تەندروستی ددان. سێو ڤیتامینەكانی C وA تێدایە كە هەردوكیان دەوڵەمەندن بە سیلیلۆز و كاربۆهیدرات و هەندێك كانزا ٢٥جۆر سێو هەیە كاتێك تۆوی سێو پێ دەگات بە گشتی سوریان زەرد یان سەوزە. سێو بە شێوەیەكی بەربلاو لە هەموو جیهاندا

هەیە. بەلأم دارەکەی لە زۆربەی ناوچە ئیستیوائیەکاندا ناڕوێت، لەبەرئەوەی پێویستی بە کەش و هەوایەکی نیمچە سارد هەیە. زانایان باوەڕیان وایە بنەچەکی سێو دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران سالْ پێش ئێستا کە لە تورکیا، وەکو بەری دارێکی کێوی بوە. بەلأم مرۆڤ ئەو دارە کێویەی پەرەپێدا بۆ چەندین جۆر لە داری سێو کە ئەمڕۆ دەیناسین.

## بوزا

وشەی بوزا بەمانای ((ڕوناکی بەخش ))دێت. ئەم لەقە بە بەخشرایە ((سیدهار ساغو تاما))ی دامەزرێنەری ئاینزای ((بوزی)) بوزا کوڕی پادشابوە. لەسەدەی شەشەمی پێش زایندا لە کۆمەڵگەیەکی جەنگاوەر لە نیپالدا بەناوی ((ساکیاس))لە دایك بووە. لەگەڵ ئەو هەموو خۆشگوزەرانیەدا لەبەردەستیدا بووە، بەلأم هیچ خۆشیەکی لەگەڵ ماددەدا پیشان نەداوە. لە گەنجیشدا میزاجی زۆر هەستیارو فەلسەفیانە بوو. هەرچەندە، ئەوەی پێویستی ژیانی بوو، بۆی دەستەبەربوو. بەلأم هێشتا ڕازی نەبوو. ڕۆژێکیان "سید هارسا" بە گالیسکەکەی لە کۆشك چووە دەرەوەو گەشتێکی ناوشاری کرد. سێ دیمەنی چاو پێکەوت، نەخۆشێکی بینی، پیاوێکی پیری بینی، لەگەڵ پیاوێکی مردودا. دیمەنی ئەم سێ پیاوە کارێکی زۆری لە عەقلّی کردو توشی خەمۆکی کرد، چونکە توانی بە ئاشکراو بە چاوی خۆی ئازاری نەخۆشی و پیری و مردن لە دونیادا ببینێت. سید هارسا بڕیاریدا دەبێت دەست بەجێ سروشتی ڕاستەقینەی ئازارەکان لە جیهاندا ئاشکرا بکات، لەگەڵ چۆنیەتی چاك بوونەوەیاندا. لەوکاتەدا سید هارسا تەمەنی ٢٩ سالأن بوو. ژنی هێنابوو کوڕێکیشی هەبوو. بەلأم بۆ گەیشتنە ئامانجی خۆی هەر هەولّی دەدا، تا شەوێکیان بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت کۆشکی بەجێ هێشت و ڕوی کردە دارستانێك. چەند سالّێك لەوێدا مایەوەو لەژێر دەستی چەندین مامۆستادا دەستی بە خوێندن کرد. بەلأم هیچ کامیان نەیانتوانی ئەو حیکمەتەی ئەم بە دوایدا دەگەڕا بۆی ڕوون کەنەوە. دوای ئەوە دەستی کرد بە گەڕان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر تا گەیشتە شوێنێك لە باکوری هندا کە ئێستا پێی ئەلّێن "بۆدگایا". لە ژێر دارێکدا چەند ڕۆژێك دانیشت و هەر بیری

دەكردەوە. تا لە بەرەبەیانی یەكێك لە ڕوژەكاندا بە تاقیكردنەوەیەكی زۆر دڵخۆشكەردا تێپەڕی. ئەو ڕووناكیەی كە دەوروبەری ڕووناك كردەوە، ئەو ڕوناكیە بوو ئەم بۆی دەگەڕا. دوای ئەوە هەموو ژیانی بەو خۆشیەوە گوزەراندو هەوڵی دەدا بۆ خەڵكانی تریشی ئاشكرا بكات چۆن بتوانن بە شوێن پێی ئەمدا بڕۆن و ڕۆیشتن بە تاقیكردنەوەی خواییدا تەنها شتێكە كە كۆتایی بە ئازارەكان دێنێت. بوزا یەكەمین وتارو ئامۆژگاری خۆی لە "بنارس"ی كەناری ڕووباری "غانج" دا پێشكەش كرد. كە تیایدا بیروباوەڕەكانی باسكرد كە دوای ئەوە بوو بە بنەمای ئاینزای بوزیەت. بوزا دەڵێت: دونیای ماددە ناتوانێت ئەوپەڕی خۆشی بداتە مرۆڤ. بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ خۆی لە لەزەت و ڕابواردندا نەخنكێنێت و زوڵمیش لە خۆی نەكات بەڵكو دەبێت بە ڕێگەیەكی مام ناوەندیدا بڕوات. وە وتی: ئەم ڕێگەیە ڕێگەی "هەشت شتە چاكەكەیە" وە ژمارەی ٨ مەبادئی سەرەكین كە دەبێت مرۆڤ كاری پێ بكات كە ئەوانەش: ١- تێگەیشتنی دروست. ٢- بیركردنەوەی دروست. ٣- وتنی ڕاست. ٤- كاری دروست. ٥- ژیانی دروست. ٦- هەوڵدانی دروست. ٧- هۆش و بیری دروست. ٨- تەركیز كردنی دروست. هێمایەك درایە بوزیەت كەپێی دەوترێت "مەبادئی هەشت بەشە" كە هەر بەشێكی ڕێگەیەكە بۆ "نیرفانا" ئەوپەڕی بەختەوەریە كە بەسەر هەموو ئازارەكاندا زاڵ دەبێت و بوزیەكان زۆر كۆشش بۆ ئەم پلەیە دەكەن. بوزا لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا كۆچی دوایی كرد. لە نزیكی بنارس. دوای مردنی بوزیەت لە زۆر وڵاتدا بڵاوبوەوە. ئەو وڵاتانەی ئایینی بوزیەت ئایینی ڕەسمییانە پۆرما، تایلاند، سریلانكا، یابان، لە ئەمریكای باكوریش نزیكەی ١١٠٠٠٠٠ بوزی هەیە.

## جەنگی كیمیاوی چیە؟

جەنگی كیمیاوی بریتییە لە بەكارهێنانی چەكی كیمیاوی لە دژی دوژمنان، بۆ كوشتنیان یان زیان پێ گەیاندنیان یان لەناوبردنی خۆراكەكانیان، ئەم جۆرە چەكە زیاتر ژیان لەناودەبات بێ ئەوەی زیان بە مومتەلەكات بگەیەنێت. بە درێژایی مێژوو مرۆڤ جەنگی كیمیاوی كردوە. بەڵگە هەیە دەیسەلمێنێت گریكەكان لە یونانی كۆندا جۆرێك ڕۆكێتی كیمیاویان دروست كردوەو لە دژی

دوژمنەكانیان بەكاریان هێناوە. لە جەنگی یەكەمیشدا ١٩١٤ – ١٩١٨ بە شێوەیەكی بەرچاو چەكی كیمیاوی بەكارهێنرا. لە كانونی یەكەمی ١٩١٥ دا ئەڵمانیەكان لە پۆڵەندا گازی كلۆریان دژی ڕوسەكان بەكارهێنا. لەگەڵ ئەوەی كاریگەری ئەم گازە زۆر كەم بوو بەڵام ئەڵمانیەكان، بەكارهێنانی هەمان گاز لە نیسانی هەمان ساڵدا لەدژی فەرەنسی و بەریتانیەكان لە فلاندن، سەركەوتنێكی گەورەی بۆ بەدەست هێنان كە خۆشیان چاوەڕێیان نەدەكرد. كلۆرەكە كاری كردە سەرسەی سەربازەكان و توشی تەنگەنەفەسی كردن و ئەم چەكە زۆربەی سەربازەكانی توشی پەك خستن هێناو، وای كرد ئەڵمانیەكان كاتێكی زۆری خۆیان تەرخان بكەن بۆ لێكۆڵینەوە لەسەر گازە زیان بەخشەكان. لفە ساڵی ١٩١٧دا ئەڵمانیەكان گازی خەردەلیان هێنایەناو. لە تایبەتمەندیەكانی ئەم گازە ڕاستەوخۆ كار لە پێست دەكات و وشكی دەكات. كەوا دەكات دەمامكی دژە گاز هیچ سودێكی نەبێت. ئەم گازە دەبێتە هۆی زامبونی پێست و ئاوسانی سیەكان. ئەو سەربازانەی كە بە هۆی ئەم گازەوە لە جەنگی جیهانی یەكەمدا گیانیان لە دەست دا لە هەموو ئەوانە زیاتربوون كە بە هەر هۆیەكی ترەوە مردن. دوای جەنگی جیهانی یەكەم ئەڵمانیا هەنگاوێكی مەزنی لە پەرەپێدانی گازەكانی ((اعصاب))دا. كەلەهەموو گازەكانی تری جەنگی جیهانی یەكەم كاریگەری زیاتربوو. بەڵام خۆشبەختانە هەرگیز بەكار نەهێنرا. لەڕاستیدا گازەكانی ((أعصاب)) ڕاستەوخۆ كارلە چالاكیە ئاساییەكانی خانەكانی ((أعصاب)) دەكات و دەبێتە هۆی كرژبون و ڕشانەوە و دوای ئەوە مردن. زۆربەی گازەكانی اعصاب نەتام و نەڕەنگ و نە بۆنیان نیە. گازی واهەیە كاریگەریەكەی كاتییە وەكو گازی ئەشك هاوەر كە دەبێتە هۆی ڕژاندنی فرمێسكێكی زۆرو كۆكین و ئاوساندنی دەم و لوت و هەردوو چاو. پۆلیس ئەم گازانە بەكاردەهێنێت بۆ كۆنترۆڵكردنی ئەو خەڵكانەی دەیانەوێت خۆپیشاندان بكەن. جەنگی گازەكان زیانێكی گەورەی لێدەكەوێتەوە، بۆیە چەندین ڕێكەوتن نامەی نێو دەوڵەتی مۆركراوە، كە بەكارهێنانی ئەم گازە قەدەغە دەكات. چەندین جۆر مەوادی كیمیاوی بۆ كوشتنی ڕووەكەكان بەكاردەهێنرێت. بە شێوەیەكی بەرچاو لە جەنگی ڤێتنام و كۆریادا

ئەمریکییەکان دەیانرژاندە سەر کێڵگەو دارستانەکانداو وشکیان دەکردەوە.

## ئایا کەمتیار پێدەکەنێت؟

جۆرێك لە کەمتیار هەیە پێی دەگوترێت کەمتیاری پێکەنیو. کە کەمتیارێکی گوڵ گوڵیەو گەورەترین جۆرە لە خێزانی کەمتیارەکاندا. کاتێك دەوروژێت یان دەگەڕێت بە دوای شتێکدا جۆرێك دەلورێنێت لە پێکەنینی خنکاو دەچێت. بەڵام دەنگەکە پێکەنین نیە. بە مانای ئەو پێکەنینەی کە مرۆڤ دەیزانێت. بەڵکو تەنها دەنگێکە وەکو پێکەنین دێتە بەر گوێ کەمتیاری پێکەنیو دیمەنێکی سامناکی هەیەو بەرزیەکەی لای شانیەوە مەترێکەو درێژیەکەی ١,٨٥مەترەو کێشیشی نزیکەی ٨٠کیلۆگرامە. کەمتیار بە ڕۆژ لە بێشەکەیدا وچان دەگرێت و کە تاریك داهات دەردەچێت و بەشوێن خواردندا دەگەڕێت. کەمتیار بەتەنیا ڕاو دەکات، بەڵام کە شێرێك یان ئاژەڵە دڕندەکانی تر، ئاژەڵێك دەکوژن کەمتیارەکان لەسەر لاشەکەی کۆدەبنەوە. هەستەکانی کەمتیار زۆر بەهێزە. لەگەڵ ئەوەدا گیاندارێکی ترسنۆکەو حەز لەکەلاکێك دەکات کە ئاژەڵانی تر کوشتبێتیان و لاشەکەیان بەجێ هێشتبێت. هەروەها نزیکی گوندەکان دەبێتەوەو هەندێك جاریش هێرش دەکاتە سەر ئەو خەڵکانەی لە دەشتدا نوستون. زۆربەی جارەکان دەکەوێتە شوێن ڕانە مەڕو هێرش دەکاتە سەر ئاژەڵە نەخۆش و پەك کەوتوەکان. کەمتیاری گوڵ گوڵی یان پێکەنیو شوێنی سەرەکیان لە ئەسیوبیا و ((رأس رجأ الصالح))ە. ئەوەی نامۆیە لەم کەمتیارەدا مێیەکانیان لە نێرەکانیان گەورەترن.

## شۆڕشی فەرەنسا

شۆڕشی فەرەنسا بەیەکێك لەگەورەترین ڕوداوەکانی مێژوی مرۆڤایەتی دادەنرێت. کەچەرخێکی نوێی لە ئازادی و یەکسانی و برایەتی هێنایە گۆڕێ. شۆڕشەکە لە ١٤ تەموزی ١٧٨٩ دا بەشکاندنی زیندانی باستیل لەپاریسدا دەستی پێکرد. شۆڕشی گەل لەماوەی حوکمی لویسی شانزەهەمدا هەڵگیرسا. کەرەگ و ڕیشەی لەناڕەزاییەکی جەماوەرییەوە لەدژی چەوسانەوە و نابەرانبەری و دڕندەیی چینە ئوروستوکراتی و حاکمەکەوە سەرچاوەی گرتبوو. لەساڵی

١٧٨٩دا لویسی شازده، بەبانگهێشت کردنی پارلەمانی فەرەنسا بۆ کۆبونەوە هەوڵیدا قەیرانە داراییەکان چارەسەربکات. کاتێك ڕۆژی ٥ئایار پارلەمان کەنزیکەی ١٧٥ساڵ بو لەبیرچوەوە. کۆبونەوەی بەست، ئەنجومەنی سێیەم کەبریتی بوو لە پیاوماقولان و پیاوانی ئاینی خۆیانیان بە ئەنجومەنی نیشتمانی ڕاگەیاند و تەحەدای لویسان کردو لە ٢٠ی حوزەیراندا هەموو ئەندامان بەتێکڕای دەنگ سوێندیان خوارد بڵاوەی لێنەکەن تادەستورێك نەنوسنەوە بۆ فەرەنسا. کە بەرگری لەچینی ناوەڕاست و جوتیاران بکات لەدژی دەرەبەگەکان. لەو کاتەدا پادشا بریاری دا کۆبونەوەکە نەکرێت و بانگهێشتی سوپای کرد بۆ ئامادە باشی. لەهەمان کاتدا دەنگوباسێك بڵاوببوەوە کە ئەندامانی سەرکردایەتی ئەو ئەنجومەنە دەستگیر دەکرێن. ئەمەش وای کرد جەماوەر توڕەببێت و هەزاران کەس لەپاریسدا کۆبونەوە و زۆر زوو سوپاش هاتە پاڵیانەوە و لەڕۆژی ١٤تموزدا گەمارۆی زیندانی باستیل یان دا. کە گەورەترین زیندانی حکومەت بوو. دوای چوار کاتژمێر لە گەمارۆدان، بەزۆر دەرگای زیندانیان شکاندو هەرچی زیندانی بوو ئازاد کران. ڕوخانی باستیل نیشانەیەك بوو بۆ ڕوخانی زوڵم وزۆر، تائەمڕۆش ڕۆژی ڕوخانی باستیل پشوی ڕەسمی فەرەنسایە. دوای ١٤تەموزی ١٧٨٩لویسی شازدەهەم، تەنها بەناو پادشابوو. ئەنجومەنی نیشتمانیش دەستی بەدارشتنی دەستوری خۆی کرد. دوای دوساڵ لە ڕوخانی باستیل ئەنجومەنی نیشتمانی ((مافی مرۆڤ و هاوڵاتی بونی ڕاگەیاند))کە ((ئازادی و یەکسانی و برایەتی))دروشمی بوو. دوای ئەوە خێزانی دەسەڵات دار هەڵاتن یان گیران. لە مانگی ئەیلولی ١٧٩٢دا کۆماری فەرەنسا ڕایگەیانرا. دوای چوارمانگ شاو شابانو دادگایی کران و لە سێدارە دران. دوای ئەوە جەنگ لەگەڵ بەریتانیا و هۆڵەندا و مەجەر و ئیسپانیادا ڕاگەیەندرا. دەسەڵات دارانی تازە لەوە دەترسان حوکمی کۆن بگەڕێتەوە بۆیە لەماوەی چواردە مانگ دادگاییدا نزیکەی ١٧هەزار کەس لەسێدارە دران و هەزارەهای تریش لە کوشتنی بە کۆمەڵدا گیانیان لەدەستدا. پاش هەموو ئەمانە توندو تیژی هێور بوەوەو بریاری دەستوری نوێ درا. بەڵام سوپا بەهێز بوو بوە هۆی دروست بوونی ناپلێۆن. لە ٩ی تشرینی دوەمدا ناپلێۆن

پۆناپەرت دەسەلاّتی گرتە دەست و شۆڕش كۆتایی هات و بۆ ئوروپا و هەموو جیهان ئەرسێكی هەمیشەیی لە توندو تیژی و كوشت و بڕی بەجێ هێشت لە پێناوی ئازادی و یەكسانیدا.

## لیۆناردۆ داڤنشی كێ بوو؟

ڕەنگە هیچ كەسێك بە ئەندازەی لیۆناردۆ داڤنشی لە هەموو بوارەكاندا شوێن دەستی دیارنەبێت. داڤنشی لەنێوان ساڵانی ١٥١٩دا ژیاوە. وێنەكێش و پەیكەرتاش و بیناسازێكی بەناوبانگ بوە. نەخشەی زۆری بۆ پردە خێراكان و چەك و جل وبەرگ و ئامێرە زانستیەكان داناوە. ژێر ئاوی و فڕۆكەی داهێناوە بەلاّم بەوكەرەستانەی لەوسەردەمەدا، لەبەردەستیدا بوە، نەیتوانیوە دروستی بكات. هەروەها دۆزینەوەی زۆر گرنگی لە پێكهاتەی لەشی مرۆڤدا كردوە. لیۆناردۆ زانست و هونەر بەیەك شێوە فێربوە. لێكۆلّینەوەی لەسەر كێشەكان دەكرد ئەمجا پڕۆگرامی دادەنا بۆ چارەسەری، هیچ جاوازییەكی لە نێوان دروست كردنی ئامێرێك و دروست كردنی وێنەیەكدا نەدەكرد. پسپۆڕ بو لەو بوارانەی كەسەرنجی ڕادەكێشاو جێی مەبەستی بوو. لەتەمەنی بیست ساڵیدا كرایە نەقیبی سەندیكای وێنەكێشان. كارەكانیشی كاریگەری زۆری هەبوو لەسەر وێنەكێشانی تر. چونكە هەمیشە هەوڵی‌دەدا شتی نوێ دروست بكات. وەكو دابەشكردنی تیشك و سێبەر لە تابلۆكاندا. ((دواین شێوان)) لەمەزەنترین تابلۆكانی داڤنشی یە. هەرچەندە بەیەكێك لەشاكارە جیهانیەكان دادەنرێت، بەلاّم لەڕاستیدا تاقیكردنەوەیەكی سەرنەكەوتوبو. چونكە بە بۆیەی زەیتی لەسەر دیوارێكی شێدار وێنەكەی دروست كرد، وردە وردە تابلۆكە كاڵ بوەوە و تێكچوو، ئێستا بەتەواوی شوێنەوارێكی لێ نەماوە. داڤنشی گرنگی زۆری بەلاشەی مرۆڤ دەدا، ئەندامەكانی لاشەی مرۆڤی لەیەك جودا دەكردەوە تابزانێت چۆن پێكەوە دەنرێت. هەروەها دۆزینەوەی زۆر كرد سەبارەت بە گەشەسەندنی ڕوەكەكان. بەناوبانگترین تابلۆی داڤنشی تابلۆی ((مۆنالیزایە)) كە لەمۆزەخانەی لۆڤەری پاریسدایە.

## ئایا یاریە ئۆڵۆمپیەکانی ئێستا هەمان یاریە ئۆڵۆمپیەکانی کۆنن؟

لەگەڵ ئەوەی یاریە ئۆڵۆمپیەکانی ئێستا لەسەرهەمان ئەوشێوازە کۆنە دەکرێت، کەلە یۆنانی کۆندا کراوە. بەڵام لەوساکەوە تائێستا گۆڕانکاری زۆر گەورەی تێدا دروست بوە. تا ئێستاش ئەم یارییە چوارساڵ جارێك رێك دەخرێت، وەکو چۆن لەکۆندا چوارساڵ جارێك رێکخراوە و لەکاتی جەنگدا وەستێنراوە. لەساڵەکانی ١٩١٦ و ١٩٤٠ و ١٩٤٤دا بەهۆی جەنگی جیهانی یەکەم و دوەمەوە رێك نەخرا. یاریە ئۆڵۆمپیەکانی کۆن هەمیشە لە ئۆڵۆمپیای یۆناندا رێکخراوە. بەڵام ئۆڵۆمپیاتی ئێستا لە ناو یان لەنزیك شارە جیاوەزەکانی جیهاندا رێکدەخرێت. لە کۆندا تەنها هاوڵاتیانی ئەغریق و وەرزش وانانی وڵاتانی حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست بۆیان بوە بەشداری یاریەکانی ئۆڵۆمپیات بکەن. لە جیاوازیە گەورەکانی تریش، ئەمڕۆ ژن بۆتە بەشێکی سەرەکی لەیاریەکانی ئۆڵۆمپیدا ژنانی براوەش هەمان خەڵات وەردەگرن کەپیاوانی براوە وەری دەگرن. لەیاریەکانی کۆندا خەڵاتەکان تایبەت دادەنران بۆ دەست کەوتە رۆشنبیریەکان. بەڵام یاریەکانی ئەمڕۆ بەتەواوی تایبەت بە پێشبڕکێ وەرزشیەکانەوە. زۆر لە پێشبڕکێکانی ئەمڕۆ لە کۆندا نەبوە. وەکو پێشبڕکێی پاسکیل سواری کەشتی رانی، تۆپی سەبەتە، جۆدۆ، وەشاندنی ئاگرو تۆپی ئاو. لە بەناوبانگترین یاریەکانی ئۆڵۆمپی لە ئێستادا، کەجەماوەرێکی زۆری هەیە، یاری ((ماراسۆنە)) کە ماوەکەی ٢٦میل و ٣٨٥یاردەیە. کە گەورەترین تاقی کردنەوەیە بۆ تواناو نەفەس درێژی وەرزش وانان. لەگەڵ ئەوەی ئەم یاریە لە یۆناندا سەری هەڵداوە بەڵام لە کۆندا بەشێك نەبوە لە یاریەکانی ئۆڵۆمپی. لە گرنگترین گۆڕانکارییەکانی یاریەکانی ئۆڵۆمپی، یاریە زستانیەکانە؛ کە لەساڵی ١٩٢٤وە دەستی پێکردووە. کەبەجودا لە ئۆڵۆمپیە هاوینەکان، لەزستانی هەمان ساڵدا دەکرێت. لەیاریە زستانەییەکان خلیسکانی سەربەفر، هۆکی سەربەفر و وەشاندنی ئاگر.

## لە کوێوە خوێی چێشتمان دەست دەکەوێت؟

زانایان دەیخەملێنن کە نزیکەی ٥,٤ملیۆن میلی سێجا خوێ لە ئاوی دەریاکاندا هەیە. ئەوهەمو خوێیە لە زەویەوە گەیشتۆتە دەریاکان. بەسیفەتێکی گشتی ئاوی دەریا لە ٣ بۆ ٣,٥٪ی خوێیە. پێش ملیۆنەها ساڵە ئاوی ئەوکەنداوانەی کە چواردەوریان وشکانی بوو بونە هەڵم و گۆڕان بۆ ئەودەریا خوێیانەی ئەمڕۆ دەیانبینین. لەوانە دەریای گەورەی خوێ لە ویلایەتی ئۆتاوا کە ئەمریکا کەرێژەی خوێ تیایدا لە ٤ بۆ ٥جار، زیاترە لە ڕێژەی خوێ لە دەریاو زەریاکاندا. کە گرنگترینیان دەریای مردوە لە دۆڵی ڕوباری ئوردن.

پرسیار ئەمەیە چۆن خوێی چێشتمان دەست دەکەوێت؟

خوێی چێشت پێکهاتەیەکە لە سۆدیۆم و کلۆرین، کەپێی دەوترێت ((کلۆریدی سۆدیۆم)) گەردیلەیەك سۆدیۆم لەگەڵ گەردیلەیەك کلۆریندا یەکدەگرن و پێکەوە گەردیلۆیەك لە کلۆریدی سۆدیۆم دروست دەکەن.بەهۆی ئەو خوێیە زۆرەی لەدەریاداهەیە، کەواتە دەریا گەورەترین سەرچاوەی خوێیە بۆ مرۆڤ. بۆ دەست خستنی خوێی چێشت بە هۆکاری دەستکرد. ئاوی دەریا دەکرێتە حەوزی گەورە گەورەوە. کە قوڵی هەر حەوزێکی سێپێیە. لە حەوزی یەکەمدا پیسی‌و لم و قوڕو زیندەوەرە زۆر بچکۆلەکان گیر دەخۆن. دوای ئەوە ئاوەکە دەچێت بۆ چەند حەوزێکی ترو، لەوێدا دەبێتە هەڵم و کلۆریدی سۆدیۆمەکە لە شوێنی بەجێ دەمێنێت. دوای ئەوە کۆدەکرێتەوەو لە خەڵتە پاك دەکرێتەوەو دەپاڵێورێت. لە وڵاتە ساردەکاندا ڕێگەیەکی جیاوازتر بۆ دەرهێنانی خوێ بەکاردەهێنرێت ڕێگە دەدرێت بە ئاوی دەریاکان بیبەستێت. لەبەرئەوەی بەفر لە ئاوی بەستوی دەریادا هیچ گەردیلەیەکی خوێی تێدا نیە. ئەو گەردیلۆکانەی لەژێر چینی بەفری ئاوە نەبەستۆکەدا کۆ دەبنەوە، وای لێدەکات زیاتر سوێربێت و وردە وردە چینە بەستوەکە لادەبرێت و جارێکی تر دەیبەستێتەوە تا ڕێژەیەکی زۆر کەم لە ئاوی زۆر سوێر دەمێنێتەوەو کۆ دەکرێتەوەو بەهۆی پلەی گەرمای دەست کردەوە دەکرێتە هەڵم و دوای ئەوە خوێکەی لەشوێن بەجێ دەمێنێت و کۆدەکرێتەوە. کانە خوێی زۆر گەورە لە جیهاندا هەن. کانە خوێکان لە ویلایەتەکانی کانساس

و ئۆکلاهوماو تکساس و نیومەکسیکۆ، لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا ڕوبەری سەد هەزار میلی دوجا دادەپۆشن، کە گەورەترین کانە خوێن لە جیهاندا کانە خویێ لە زنجیرە چیای ئۆرالیشدا هەیە لە ڕوسیا، کانەکانی ستارسفۆرتیش لە ئەڵمانیا زۆر بەناوبانگن. زانایان دەڵێن ئەو کانە خوێیانە نزیکەی ١٥٠ بۆ ٢٠٠ ملیۆن ساڵ بەر لەئێستا دروست بونە.

## یاری سێرك چۆن پەیدا بوو؟

یاری سێرك یاریەکی میللیەو خەڵکی لە سەرانسەری دونیادا حەز بە بینینی دەکەن. لە سێرکی نوێدا، نمایشی وا دەبینین خەریکە بڕوا نەکەین، وەکو ڕێکردن بەسەر پەتداو چونە سەر ملی یەکتری لەسەر تەلێکی باریکداو یاریکردن بە ئاژەڵان و هتد...

## ئایا دەزانن یاریەکانی سێرك چۆن پەیدا بوو؟

یەکەمجار سێرك لە ڕۆمای کۆندا، لەسەدەی سێیەمی پ.ز دەستی پێکرد. کە زۆر جیاوازی لەگەڵ ئەو سێرکەی ئەمڕۆدا دەکرێت، هەبووە. لە دەشتێکی پان و بەریندا نمایش دەکرا کە پێی دەوترا "سیرکۆس مکسیمۆس" کە سەرەکی ترین نمایشی پێشبڕکێی ئەسپ سواری بو. لەماوەی پێشبڕکێکەدا، پاڵەوانەکان و ئەوانەی بەسەر پەتدا ڕێیان دەکردو ئەسپ سوارەکان بینەرانیان سەر گەرم دەکرد. گۆڕەپانی پێشبڕکێکە هێندە گەورە بو، جێگەی نزیکەی ١٥٠٠٠٠ هەزار کەسی دەکردەوە. قۆشمە چیەکان و پاڵەوانەکان، ئەوانەی بەسەر پەتدا ڕێیان دەکرد لەگەڵ ڕاهێنەرانی ئاژەڵەکاندا، بە چەندین شێواز خەڵکیان سەرگەرم دەکرد. ئەنجامی هەموو ئەوانە، ئەوەی لێکەوتەوە کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت "سێرك" دوای ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما. بۆ چەندین سەدە یاریەکانی سێرك لەبیرچونەوە. یەکەمین سێرکی نوێ لەلایەن پیاوێکی ئینگلیزیەوە بە ناوی "فیلیپ ئەستیلی" یەوە ڕێکخرا لە ساڵی ١٧٦٨ دا، کە نمایشەکەی بریتی بو لە ڕۆیشتن بەسەر پەتدا. لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا چەندین گروپی سێرك لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا دروست بون. وردە وردە سێرك بو بە

سەرچاوەیەکی میللی بۆ سەرگەرم کردن لە سەرانسەری جیهاندا. گەورەترین هۆڵی سێرك لە ویلایەتی نیفادای وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادایە کە لە ١٨ تشرینی یەکەمی ١٩٦٨ دا کرایەوە، لەسەر پانتاییەك کە ڕوبەرەکەی ١١٩٨٤ مەتری دوجایە.

## کەی یەکەم منارە دروست کرا؟

مانرە بریتیەیە لە قوللەیەکی بەرز، کە لە چیمەنتۆ یان بەردو گەچ دروست کراوەو گڵۆپێکی سور لە لوتکەکەی دادەنرێت بۆ ئەوەی ڕێنومایەك بێت لە شەودا ئەم گڵۆپە دەبێت هێندە بەهێز بێت، لە دوری چەند کیلۆ مەترێکەوە ببینرێت. منارەکان بە زۆری لەسەر بەرد یان لەسەر دورگەکانی نزیك بەندەرە دەریاییەکانەوە دروست دەکرێن. دەبێت بنکەکەی لە لوتکەکەی پانتر بێت. یەکەمین منارە لە مێژودا ئەو منارەیەی. نزیکی شاری گروادە بوە لە ئاسیای بچوکدا کە مێژوی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٦٦٠ پێش زاین و یەکێك بوە لە حەوت سەرسوڕهێنەرەکانی ئەوسای جیهان. نزیکەی ١٥٠٠ ساڵ تەمەنی کردوەو لە دەوروبەری سەدەی سیازدەهەمدا بە بومەلەرزە ڕوخا. بەرزیەکەی ١٣٠ مەتر بوەو لە لوتکەیەکدا بە هەمیشەیی ئاگرێك گڕاوەو، دوای ئەو منارەیە بوو ڕۆمانیەکان منارەی زۆریان لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا دروست کرد. ئەمڕۆ هەر منارەیەك، ڕەنگ و شێوەی تایبەتی خۆی هەیە. هەریەکەو بەجۆرێك ڕەنگ و درەوشاوەیی خۆی پیشان دەدات. کتێبێك هەیە بەناوی ((پایەکانی ڕووناکی))کە بەدورودرێژی باسی هەموومنارەکانی جیهان دەکات. لە ئەنجامی ئەوەشدا کەشتیوانەکان، بەتەنها گەڕانەوە بۆ ئەوکتێبە دەتوانن ئەوشوێنە بدۆزنەوە کەبۆی دەچن. منارەکان یارمەتی دەرێکی سەرەکین بۆ کەشتیەکان لەتەنگە ئاویە مەترسیدارەکاندا. لەبەر ئەوهۆیە لە دەروازەی بەندەرەکاندا. منارە دروست دەکرێت. تارێنومایی کەشتیەکان بکات.

## دیموکراتیەت لە کویدا سەری هەڵدا؟

ڕەچەڵەکی ووشەی دیموکراتیەت دو وشەی یونانیە. بەواتای دەسەڵاتی گەل

دێت. ئەمرۆ كەئەم وشەیە بەكاردەهێنرێت بۆ حكومەتێكی هەڵبژێردراو لەلایەن گەلەوە. لەهەر وڵاتێكی دیموكراتیدا، نوێنەران لە لایەنی گەلەوە بەدەنگدان هەڵدەبژێردرێن. نوێنەرە هەڵبژێردراوەكانیش حكومەتێك پێك دەهێنن، كەئیش بكات بۆ خوش گوزەرانی گەل. تا ئێستاش دوجۆر دیموكراتیمان هەیە. ڕاستەوخۆ و نوێنەرایەتی دیموكراتی ڕاستەوخۆ ئەودیموكراتیەیە كەخەڵكی كۆدەبنەوە و سیاسەتێكی گشتی دادەڕێژن و ئەمجا لێپرسراوێك هەڵدەبژێرن بۆ جێبەجێ كردنی ئەو سیاسەتە. دیموكراتی نوێنەرایەتیش. خەڵكی بە هەڵبژاردن نوێنەری خۆیان هەڵدەبژێرن تا بەناوی ئەمانەوە حوكم بكەن. دیموكراتی ڕاستەوخۆ لە جیهانی نوێدا شتێكی كرداری نیەو بۆیە وڵاتانی دیموكراتی تەنها لە ڕێگەی نوێنەرایەتیەوە مومارەسەی كاری دیموكراتی خۆیان دەكەن. حكومەتە دیموكراتیەكان لە جیهاندا، لەمافە بنەڕەتیەكان زیاتر بە هاوڵاتیانیان دەدەن، كە گرنگترینیان، مافی ڕادەربڕین، كۆچ كردن لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر،كاركردن لە سەندیكاكاندا، مومارەسەكردنی هەر پیشەیەك یان هەڵبژاردنی هەر ئاینێك و یەكسانی لە بەردەم یاسادا. دیموكراتی سیاسی لە وڵات و شارەكانی یونانی كۆندا سەری هەڵدا. ئەسیناش نمونەیەكی ئەو دیموكراتیە بو. حوكم تیایدا جۆرێك لە جۆرەكانی دیموكراتی ڕاستەوخۆ بو. دوای ڕوخانی شارستانیەتی یونانی، دیموكراتیەت بۆ ماوەی نزیكەی ١٨٠٠ ساڵ بونی نەما. بەڵام دیموكراتیەتی سەردەم لە چاخەكانی ناوەڕاستدا سەری هەڵدایەوە. بیردۆزەی "گرێ بەست" لەوكاتەدا بەناوبانگ بو. بڕوا وابو گرێ بەستێك هەیە لە نێوان دەسەڵاتداران و گەلدا. كە تیایدا هەر لایەك ئەركەكانی دیاری كراوە، كە دەبێت بەجێی بهێنیت. ئەگەر دەسەڵاتدار نەیتوانی، ئەركەكانی بە ڕێك وپێكی بەجێ بهێنێت، ئەوا گەل بۆی هەیە دەسەڵاتی لێ وەربگرێتەوە. لە هەردو سەدەی نۆزدەو بیست دا. زۆر لە وڵاتان ئەم حوكمەیان جێبەجێكرد. كۆنترین كۆمار لە دونیادا وڵاتێكی بچوكە كە دەكەوێتە باشوری ئەوروپاوەو ناوی "سان مارینۆ" یە كە لە سەدەی دەهەمی زاییندا دەوڵەتێكی تایبەتیان دروست كرد. ئەم كۆمارە لە سەدەی چواری زاییندا پیاوێك دروستی كرد بەناوی "مارینۆس"

## مارکۆنی.. داهێنەری بێ تەل

کۆغلیلمۆ مارکۆنی لە ٢٦ نیسانی ١٨٧٤ دا لە پۆلۆگنای ئیتاڵیا لە دایك بوە. لە قوتابخانەی هونەری لانگهۆرن ی ئیتالیا فێری فیزیا بو. یەکەمین تاقیکردنەوەکانی خۆی لە نزیك پۆلۆگنادا کرد. کاتێك لە ساڵی ١٨٨٧ دا زانای هارینریگ هێرتز شەپۆلە بێ تەلیەکانی (تیشکەکانی) دۆزیوەتەوە. بیریکردەوە ئەو شەپۆلانە بۆ گواستنەوەی نامە بەکاربێنێت. لەوکاتەدا نامە بە سیستەمی هێمای "مۆرس" دەنێردرا. بە خاڵ و بە بەکارهێنانی تەلی کارەبایی "مارکۆنی" هەندێك ئیشی کرد بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیەو زەنگێکی کارەبایی دروست کرد کە دەیتوانی لە دوری سی پێوە بەهۆی شەپۆلە کارەباییەکانەوە بە لێدانی کارەبایی بیخاتە گەڕ. لە ساڵی ١٨٩٥ مارکۆنی توانی پەرە بە ئامێرێك بدات کە دەیتوانی، بۆ دوری یەك میل لێدان بنێرێت. بەڵام مارکۆنی گرنگی نەدا بەوکارەی و بریاری دا بچێت بۆ لەندەن و لەوێدا بەختی خۆی تاقی بکاتەوە. بۆیە لە ساڵی ١٨٩٦ دا گواستیەوە بۆ لەندەن. لە ساڵی ١٨٩٦ – ١٨٩٧ دا زنجیرەیەك تاقیکردنەوەی سەرکەوتوی ئەنجام دا بۆ ئامێری نامە ناردنی بێ تەل کە دروستی کردبو. لە ساڵی ١٨٩٧ دا. مارکۆنی توانی تا دوری دوانزە میل پەیوەندی دروست بکات. هەر لەوساڵەدا کۆمپانیای مارکۆنی دامەزراند. دوای دو ساڵ واتە ساڵی ١٨٩٩. مارکۆنی یەکەم هێمای بێ تەل بەسەر کەناڵی بەریتانیادا نارد، کە دوریەکەی ٣١ میل بو. هەروەها لەو ساڵەدا. دو کەشتی ئەمریکی بەرێ خست بۆ ئەوەی راپۆرت لەسەر پێشبڕکێی بەلەم سواری جامی ئەمریکا بگوێزنەوە بۆ رۆژنامەکانی نیویۆرك. لە ١٢ کانونی یەکەمی ١٩٠١ دا. پیتی S نێردرا بە سیستەمی مۆرس. بەسەر زەریای ئەتڵەسیدا. کە دەنگوباسێکی جیهانی دروست کرد. لە ساڵی ١٩٠٩ دا مارکۆنی خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت لە فیزیادا. دوای ئەوە مارکۆنی هەوڵیدا، ناردنی بێتەل بە شەپۆلی کورت بێت. ئەم ئیشەی بو بە بنەمای پەیوەندی بێتەلی نوێ. بۆ نێوانە دورەکان لە ساڵی ١٩٣٠ مارکۆنی کرایە سەرۆکی ئەکادیمیای پاشایەتی ئیتاڵیا لە ٢ ی تەموزی ١٩٣٧، ئەم زانا گەورەیە کۆچی دوایی کرد.

## جان دارك كێ بو؟

گەلی فەرەنسا ڕێز لە قەدیسە جان دارك دەگرن، كە گوایە یەكێكە لە مەزنترین پاڵەوانەكانی فەرەنسا. جان دارك لە ٢٦ كانونی دوەمی ١٤١٢ لە دایك بوەو لە ٣٠ ئایاری ١٤٣١ دا، لە تەمەنی ٢٩ساڵیدا سوتێنرا. كاتێك جان دارك گەنج بو، كۆمەڵێكی زۆر لە دەوڵەمەندو وەجاخ زادەكان چونە ناو ئەو ئینگلیزانەوە، كە حوكمی زۆربەی فەرەنسایان دەكرد. ئەوانە لە ناوچەیەكی فەرەنسادا بون بەناوی "بۆرگەندیا" بۆیە ناویان لێ نرا "بۆرگەندیەكان". ئەو كاتە جان دارك تەمەنی ١٣ ساڵ بو.كە دەنگێكی بیست دەیگوت دەنگی هەردوو قەدیس كاترین و مارگرێت و دەنگی مایكڵی گەورەی پەریە جاك وتی: پێیان وتوە بە تاج لەسەركردنی "دۆفین شارلز" كە وەریسی تەختی پاشایەتی فەرەنسا بو، ئاشتی دەگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا. بە تێپەڕبونی كات "جان" توانی قەناعەت بە شارلز بكات كە دەتوانێت سەركردایەتی هێزەكەی بكات بەرەو سەركەوتن. جان هاندەر بو بۆ سەربازە فەرەنسیەكان. بۆیە ئینگلیزەكانیان شكاند. دۆفین بەناوی شارلی حەوتەم تاجی فەرەنسای لەسەر نرا.بەلاّم دوای ئەوە پادشا پشتگیری تەواوی سەربازەكانی نەكرد بۆ جەنگ. بۆیە فەرەنشیەكان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەشكان و جان داركیش لەلایەن بۆرگەندیەكانەوە بەدیل گیراو بە جادوگەری تاوانبار كرا. دادگاییەكەشی. لەلایەن ئەو پیاوە ئایینیانەوە بو كە سەر بە بۆرگەندیەكان و ئینگلیزەكان بون. جان دارك لەماوەی دادگایی كردنەكەیدا ئازایەتی نواندو چاو نەترسانە بەرەنگاریان بوەوە بەلاّم سەرئەنجام حوكمی مردنیان بەسەردا دا. لە ساڵی ١٤٥٥ دادگا ڕای گەیاند كە سوتاندنی جان دارك بە هەڵە بوە. لە ساڵی ١٩٢٠ یشدا كەنیسەی كاسۆلیك، ڕایگەیاند كە جان دارك قەدیسە بوەو هەموو ساڵێك، كەنیسە لە ڕۆژی سوتاندنیدا واتە ٣٠ ئایار جەژنی قەدیسە دەگێڕێت. چیرۆكی جان دارك بوەتە یەكێك لە بەناوبانگترین ڕوداوەكانی مێژوو چەندین چیرۆك و شانۆگەری و شیعرو گۆرانی لەسەر دانراوە.

## پۆلیڤار کێ بووە؟

ناپلیۆن لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، کاریگەریەکی زۆرمەزنی هەبوو لەسەر ئۆروپا. لەهەمان کاتدا پیاوێکی تر کەناوی سیمۆن پۆلیڤار بوو کاریگەری هەبوو لەسەر ئەمریکای باشور. بۆماوەی نزیکەی سێسەدسالْ زۆربەی کیشوەری ئەمریکای باشور لەژێر حکومی ئیسپانیەکاندا بوو. پۆلیڤیار سوێندی خوارد وڵاتەکەی ((ڤینزوەیلا)) لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەری ئیسپانیدا ڕزگاربکات. کاتێك کەمرد هەریەك لە ئەکوادۆر و پۆلیڤیاو پیرۆو کۆلۆمبیاو ڤنزوەیلای ڕزگار کردبوو. پۆلیڤیاری گەنج وەکو منداڵێکی چینی خواپێداوەکان فێری خوێندەواری بوو لەگەڵ خوێندنەکەشیدا، سەرانسەری ئوروپا گەڕاو هەردوو شۆڕشی فەرەنساو ئەمریکا کاریگەریەکی زۆر قوڵیان کردە سەری. لەساڵی ١٨١١ پۆلیڤیار لەگەڵ کۆمەڵێك لەنیشتمان پەروەراندا سەربەخۆی ڤنزوەیلایان ڕاگەیاند. بەڵام هێزەکانی ئیسپانیا بەتوندی لێیان دان و پۆلیڤیارهەڵات بۆ دەرەوەی وڵات. لەساڵی ١٨١٩ پۆلیڤیار لەگەڵ سوپایەکدا شۆڕشیان هەڵگیرساندوو شاخەکانی ئاندێزی بەبەفر داپۆشراو یان بڕی و دایانە سەرسوپای ئیسپانیاداو توانیان کۆڵۆمبیا ڕزگاربکەن. دوای دووساڵ پۆلیڤیار ڤنزوەیلاشی ڕزگارکرد. ساڵێك دوای ئەوەش ئیکوادۆر. ڤنزوەیلا و ئەکوادۆر و کۆڵۆمبیابوون بەیەك و کۆماری کۆڵۆمبیای مەزنیان ڕاگەیاند، بەسەرۆکایەتی پۆلیڤیار. دوای ئەوەش پیرۆ ڕزگارکراو، پیرۆی سەرو بۆ ڕێزلێنانی پۆلیڤیار ناونرا ((پۆلیڤیا)) لەگەڵ ئەوەی پۆلیڤیار دەسەڵاتی دکتاتۆری هەبوو. بەڵام بانگەشەی ئازادی و دادپەروەری دەکردو تەشجیعی دروست کردنی حکومێکی دەستوری کرد، لەگەڵ ڕزگارکردنی کۆیلەکان و دروست کردنی زۆرێك لە قوتابخانە. بەتێپەڕبوونی پۆژگار هەروڵاتێك داوای سەربەخۆیی خۆی کردو کۆڵۆمبیای مەزن بەش بەش بوو. دوژمنەکانی پۆلیڤیار یان بە دکتاتۆرو تاك ڕەو تاوانبارکرد، تا وای لێکرا وەکو سەرۆك کۆمارێك دەست لە کار بکێشێتەوە. پۆلیڤیار لە ساڵی ١٨٣٠دا لە تەمەنی ٤٧ ساڵی. بە نائومێدی و دڵشکاوی سەری نایەوە. لە کاتێکدا دوژمنێکی زۆری هەبوو. بەڵام گەلی ئەمریکای باشور تائێستاش بەڕزگارکەری خۆیانی دادەنێت.

## كەی بۆ یەكەمجار مرۆڤ پەینی بەكارهێنا؟

هەرمادەیەك بكرێتە زەوییەوە بۆ ئەوەی یارمەتی سەوزبوونی ڕوەكەكان بدان پێی دەوترێت ((پەین)).

## بۆچی پێویستمان بە پەین هەیە؟

چونكە بەشێوەیەكی سەرەكی پیتی خۆڵ دەپارێزێت، یان چارەسەری كەم پیتی خۆڵی لاواز دەكات. لەكاتی دروێنەكردندا زەوی ئەوتوخمە خۆراكیانەی پێوەكراوە هەموی لەدەست دەدات، چونكە بەروبومەكان هەموو ئەوتوخمە خۆراكیانە دەمژن. كە بۆزەوییەكە زیادكراوە. جوتیاران پەین بەكاردەهێنن بۆ گەڕاندنەوەی ئەو توخمانە یان زیادكردنی بۆ زەوی، ئەگەر بەشێوەیەكی سروشتی لە زەویدا كەمبوو. پەینی سروشتی هەیە كەلەپاشماوەی گیاندارەكانەوە وەردەگرێت وەكو پەین یان ئێسقانی هاڕاوە، وەكو چۆن پەینی كیمیاویمان هەیە كەلەزۆر سەرچاوەوە دەستی دەخەین. لەدێر زەمانەوە مرۆڤ پەینی بەكارهێناوە، كە نازانین لەكەیەوە بوو. بەلاّم دەزانین چینەكان پێش هەزاران ساڵە، پاشماوەی ڕوەكو ئاژەڵەكانیان وەكو پەین بەكارهێناوە. ڕۆمانیەكان، لەسەدەی دوەمی پێش زاینەوە ساڵێك نە ساڵێك كشتوكاڵیان لە زەویدا كردوە. زەویەكە شیان بەقسڵ پەین كردوە بە چاندنی پاقلەو فاسۆلیاو بەزالیاش نایترۆجینیان بۆ زەویەكە زیادكردووە.لەسەدەی حەڤدەهەمدا بە گواستنەوەی پاشماوەی شارەكان بۆ كێڵگەكان پەینی ئاژەڵی لەناوچەكانی ئوروپادا بەكارهێنراوە، وێنجە ((سێپەڕە))شیان لەپاش هەركێڵانێكدا بەكاردەهێنا. لەساڵی ١٧٤٨ بینجامین فرانكین، بەهای پەینی كلسی ئاشكراكرد. كاتێك سواغێكی لە قسڵ لەشێوەی پیتی گەورەدا دانا لەناو، كێڵگەیەكدا، كەبەتەنیشت جادە دوسایدیەكەی فلادلیفیادا دەڕۆیشت. پیتەكان ڕایان گەیاند ((ئەمە كێڵگەیەكی گەچاوییە)). هەرزوو پیتە سپیەكان دیارنەمان و كاتێك تۆوەكان سەوز بون، نامەكە جارێكی تر هەواڵی ئەوەی دا، كە ئەم شوێنە پەین كراوەو لە ناوچەكانی تری كێڵگە سەوز تربوو.

## قەقنەسە هاویشتە گڕکانیەکان

چەقی زەوی شوێنێکی زۆر گەرمە. ئەگەر توانیمان ٤٨ کیلۆ مەتر، بە قوڵی لە زەوی هەڵکەنین. دەشێت پلەی گەرما بگاتە ١٢٠٠ پلەی سەدی. لەوانەیە پلەی گەرما لە چەقی زەویدا نزیکەی ٥٥٠٠ پلەی سەدی بێت. لەو پلەی گەرمایەدا بەردەکان دەتوێنەوە. قەقنەسەکان یان هاویشتە گڕکانیەکان بریتین لە بەردی تواوە بە تێکەڵ لەگەڵ هەڵم و گازدا. لە ڕێگەی شەقەکانی زەویەوە پاڵپاڵێن دەکەن و لە چەقی زەوی دێنە دەرەوە. هەندێك جار شەقەکان شێوەکەیان کونێکی بازنەییە. کە قەقنەسەکان دێنە دەرەوە، بەشێوەی بازنەیی بڵاو دەبنەوەو ئەنجا سارد دەبنەوەو دەبنە بەرد. ئەگەر قەقنەسی تر هاتنە دەرەوە ئەوا دەکەونە سەر کۆمای یەکەمداو بەرزتر دەبنەوە. لەگەڵ بەردەوامی ئەم کارەدا. قەقنەسەکان چین چین بە سەریەکدا دەکەون تا لە ئەنجامدا شاخێك لە بەرد دروست دەبێت کە پێ ی دەوترێت شاخی گڕکانی. لەکاتی هاتنە دەرەوەی قەقنەسەکان و بڵاوبوونەوەیاندا، بەسەر زەویدا هەرچیەکیان هاتە ڕێ وێرانی دەکەن و لەناوی دەبەن. چونکە قەقنەسەکان لافاوێکن لە بەردی تواوە، کە پلەی گەرمایان لە نێوان ١٠٩٠ و ١٦٤٠ پلە دایە. ئەو شارانەی نزیکن لە گڕکانەکانەوە، هەمیشە مەترسی وێران بوونیان هەیە بە دەستی ئەو قەقنەسانەوە. زۆر جار بۆ ماوەیەکی درێژ هیچ شتێك ڕوونادات، خەڵکی وا دەزانن، ئیتر ڕزگاریان بوە. بەڵام لە پڕێکدا جارێکی تر دەست پێ دەکاتەوە. دو هەزار ساڵ پێش لە ئێستا شارێکی ئیتاڵیا بە ناوی "بۆمبی" لە ژێر قەقنەسەکانی گڕکانی بەناوبانگی "فیزۆن" دا کاول بو.

## پشتێنەی بومەلەرزەکان

بومەلەرزەکان، لەرینەوەکانی سەر زەوین. هۆی سەرەکی بومەلەرزەش "عەیب" ێکە، لە بەردەکانی توێکڵی زەویدا. درزێك کە توشی قەبارەی بەردێکی زۆر گەورە دەبێت، بە هێزێکی زۆر گەورە دەدات یان دەخشێت لە قەبارەی بەردێکی ترو بومەلەرزە دروست دەکات. لەبەرئەوە بومەلەرزە لە هەموو شوێنێکی دونیادا ڕونادات. تەنها لە چەند ناوچەیەکی دیاری کراودا ڕوو دەدات کە پێی دەوترێت

"پشتێنەی بومەلەرزە" گرنگترین پشتێنە لێواری زەریای باسیفیکی‌یە. کە زۆرترین بومەلەرزەی دونیا تیایدا ڕوو دەدات. ئەو پشتێنەیە لە دیوی باشوری شیلیەوە دەست پیێ دەکات، تا دەگاتە لێواری باسیفیکی لە باشوری ئەمریکا. بۆ ئەمریکای ناوەندو دەریای کاریبی لقێکی لێ دەبێتەوە، بە لێواری مەکسیکدا درێژ دەبێتەوە بەرەو کالیفۆرنیاو ئەلاسکا. بەڵام بەوەش کۆتایی نایەت، پشتێنەکە لە ئەلاسکاوە درێژ دەبێتەوە تا کامشاتاکاو بەناو دورگەکانی کورایل و تیانادا تیێ دەپەڕێت و درێژ دەبێتەوە تا یابان و فلیپین و ئەندۆنیزیاو غینیای نوێ. لە باشوری باسیفیکیەوە بەناو چەندین دورگەدا تێدەپەڕێت. زۆربەی بومەلەرزەکان لە مێژوودا، لە چوارچێوەی پشتێنەی باسیفیکی دا ڕویداوە. پشتێنەیەکی تری بومەلەرزەیی هەیە کە لە بەرامبەریاندا دەست پیێ دەکات و شۆڕ دەبێتەوە، بەناو چین و ئێران و تورکیا یونان و دەریای سپی ناوەڕاستدا. لە زۆربەی ناوچەکانی ولاتێکی وەکو یاباندا ڕۆژانە بە بەردەوامی بومەلەرزە ڕوو دەدات، بەڵام خۆشبەختانە هێندە بەهێز نین کە زیانیان لێ بکەوێتەوە. لەلایەکی ترەوە ولایەتەکانی نیوئینگلاند هەزاران ساڵە بومەلەرزەیەکی وای بە خۆیەوە نەدیوە کە زیانی بە دواوە بێت.

## ئایا کیشوەرەکان دەجولێنەوە؟

ئەو بیردۆزەیەی کە دەڵێت، کیشوەرەکان دەجولێنەوە یان دەخزێن بۆ یەکەمین جار لەلایەن زانای ئەڵمانی "ئەلفرێد فیگیز" ەوە خرایە ڕوو لە ساڵی ١٩١٢ دا. ئەلفرێد ووتی: لە تەواوی نیوەی گۆی باکور خەڵوز هەیە. بەڵام، خەڵوز لەو ڕوەکانەوە دروست دەبێت، کە لە دارستانە ئیستیوائیەکاندا دەڕوێن. لەو شتانەی تر کە ووتی: لێواری ڕۆژئاوای ئەفریقیا لەگەڵ لێواری ڕۆژهەڵاتی ئەمریکای باشوردا هێندە لەیەك دەچن، دەڵێی پارچەیەك بونەو بونەتە دوو لەتەوە. ئەلفرێد وای بۆ دەچێت. کە هەموو کیشوەرەکان. سەرەتایەك قەبارە بوونە لە وشکانی و پاشان لێك ترازاون و ئەو شێوەیەی ئێستایان وەرگرتووە.ئەنجا زانایان چەند ئەگەرێکیان دانا کە دەشێت ئەوە ڕویدا بێت، یەکێك لەو ئەگەرانە دەڵێت: گەرمای ژێر زەوی ڕەوتی هەڵگرتن دروست دەکات، کە دەشێت وا بکات کیشوەرەکان

بجولێنەوە. هەندێکی تر لە زانایان بڕوایان وایە، بنی زەریاکان بەهۆی ڕەوتەکانەوە لە توێکڵی زەویدا، ڕادەکێشرێن و شیتەڵ دەبن هیچ ڕێکەوتنێکی یەك دەنگ نیە لەسەر ئەم بۆچوونانە. زانایانی زەوی زیاتر، بەلای وەرنەگرتنی ئەم بیرۆکەیەدا دەچن. بەڵام ئەوانەی لێکۆڵینەوە لەسەر جیۆلۆجیای زەریاکان دەکەن. زیاتر ئامادەن بۆ وەرگرتنی ئەم بیرۆکەیە. ئەگەر هەموو جیۆلۆجیەکان، ئەو بیردۆزەیە قبوڵ بکەن، کە دەڵێت: کیشوەرەکان دەجولێنەوە، ئەوا شۆڕشێکی گەورە لەسەر زانستی زەوی لە بیرو بۆچوونماندا ڕوو دەدات.

## ئایا فیلەکان بە کۆمەڵ دەژین؟

ڕانەفیلێك لە نێوان دە بیست فیل تا پەنجا فیلدایە، یان زیاترە، زۆربەشیان پەیوەندی خزمەتیان پێکەوە هەیە. ئەو فیلەی سەر قافڵەی فیلەکانی تر دەکات، عادەتەن فیلێکی بە تەمەنی دانایە. زۆربەی ئەوانەش لەگەڵیدان لە فیلە مێیەکان و بەچکەکانن. بەچکە نێرینەکانیش لەگەڵیاندان. بەڵام فیلە پێگەیشتوەکان بە تەنیا دەگەڕێن. زۆربەی نێرە فیلەکان بە جیا دەژین، بەڵام زۆر جار سەردانیان دەکەن. کاتێك دو نێرینە لە یەك کاتدا سەردانی ڕانە فیلەکە دەکەن. جەنگێك لە نێوانیاندا دروست دەبێت. بە زۆری بە سەرکەوتنی یەکێکیان کۆتایی دێت. فیلی سەرکەوتو. بە دانەکانی برینداری فیلی دۆڕاو دەکات و دوری دەخاتەوەو دەشێت بیشی کوژێت. ڕانە فیلەکان لەناوچە بەرفراوان و دورەکاندا دەگەڕێن. دەچنە ئەو شوێنانەی باشترین خواردنیانی لێ بێت. لە هاویندا دەچن بۆ ناو دارستانەکان یان لە نزیك ئاوێکی باشدا دەبن لە زستان و بارانیشدا دەچنە دەشتاییە لەوەڕدارەکان. ژیانی ڕۆژانەی ڕانە فیلەکان بە زۆری لەسەر سیستەمێکی ڕۆتینی بەڕێوە دەچێت. لە بەیانی زوودا دەچن بۆ سەر ڕووبارو ئاو دەخۆنەوەو خۆیان دەشۆن ئاو بە خۆیاندا دەکەن و یاری خۆیان دەکەن و ئاو دەکەن بە خۆیاندا. بۆ زانیاریتان فیل مەلەوانێکی زۆر کارامەیەو دەتوانێت، لە ڕووباری زۆر بەرپانیشدا بپەڕێتەوە. دوای خۆ شۆردن. فیلەکان بۆ چەند کاتژمێرێك دەلەوەڕێن. کە نیوەڕۆ داهات دەچن بۆ سێبەری دارەکان بۆ پشودان. کە ئێوارە داهات جارێکی تر دەچنەوە بۆ ئاو خواردنەوە. کە تاریك داهات ئەوان هێشتا خەریکن دەلەوەڕێن.

پێش ئەوەی بۆ جاری دووەم بچنەوە بۆ پشودان. لە شەودا هەندێك لە فیلەکان دەنون، بەڵام زۆرێك لە فیلە گەورەکان. بە تایبەتی فیلە ئەفریقیەکان بە ڕاوەستانەوە دەخەون. هەموو فیلە گەورە پێگەیشتوەکان، هەمیشە لەوپەڕی ئامادەباشیدان بۆ هەر مەترسیەك ڕوبەڕویان بێتەوە. هەستی بینین لای فیلدا زۆر لاوازە. بەڵام بۆنکردنی زۆر بەهێزە. کاتێك بەچکەیەکیان، لەلایەن شێر یان پڵنگەوە هێرشی دەکرێتە سەر. فیلەکانی تر دەچنە یارمەتی تا ڕزگاری بکەن. لە ئاسیادا لە هەر چوار بەچکە فیلێکدا پڵنگ یەکێکیان دەکوژێت. بەڵام فیلە گەورەو پێگەیشتوەکان، زۆر بە دەگمەن لە لایەن ئاژەڵانی ترەوە هێرش دەکرێتە سەریان.

## ئایا هێڵی ئیستیوا گەرمترین شوێنی سەر ڕوی زەویە؟

کاتێك دەڵێین شوێنێکی "گەرم" یان "سارد" هەیە لەسەر زەویدا. بە واتا: ئێمە باسی ئاوو هەوا دەکەین. بە سیفەتێکی گشتی گەرمای خۆر بڕیاری هەموو جۆرەکانی ئاوو هەوا دەدات. گەرمای خۆر زەوی و زەریاکان و بەرگە گازی زەوی گەرم دەکاتەوە. هەر گەرمای خۆرە، کە دەبێتە هۆی دروست کردنی شێ لە بەرگە گازدا و ئەگەری باران بارین دەخولقێنێت. گەرمای خۆرە دەبێتە هۆی جیاوازی بەرگە باو "با" بەرهەم دەهێنێت. گەرمای خۆر. لەگەڵ بادا پێکەوە، ڕەوتە دەریاییەکان لە زەریاکاندا دروست دەکەن. لەبەرئەوە زۆر گرنگە، کە بمانەوێت لێکۆڵینەوە لەسەر ئاوو هەوای هەر ناوچەیەك بکەین، دەبێت سەرەتا بیر لە کاریگەری خۆری لەسەر ئەو ناوچەیە بکەینەوە. لەبەرئەوەی سەر ڕوی زەوی کەوانەییە، کەواتە گەرمای خۆر لەسەر هێڵی ئیستیواو هەردو جەمسەردا لەو پەڕیدا دەبێت، لە هێڵی ئیستیواشدا تیشکی خۆر بە شێوەی ستوونی دادەبەزێت بۆ سەر زەوی. بەڵام دابەزینی خۆر لە سەروو خوارووی بە شێوەی گۆشەیی دەبێت بۆ سەر زەوی. یان بە لاری دەبێت بە واتا هەردوو ناوچە ئاوو هەوا خۆشەکەی باکورو باشوری هێڵی ئیستیوا تیشکی خۆر بەشێوەی تیشکێك وەردەگرن. کە کەمتر گەرمە لەو تیشکەی ڕاستەوخۆ دەکەوێتە سەر هێڵی ئیستیوا. مانای وایە ئەو ناوچانەی لە هێڵی ئیستیواوە دورن گەرمای کەمتریان بەردەکەوێت. کاتێك تیشکی خۆر بەشێوەی گۆشەیی دادەبەزێت بۆسەر زەوی، واتە ڕوبەرێکی

گەورەتر لەبەرگە گاز دادەپۆشێت، کە هەواکەی هەندێك لە گەرماکەی دەمژێت. ئەمەش هۆیەکی ترە بۆ کەم گەیشتنی گەرما بۆ ناوچەکانی تری نا ئیستیوائی. ئەوەی باسمان کرد وا دەکات کە هێڵی ئیستیوا، گەرمترین شوێن بێت لەسەر ڕوی زەویدا. ئێمە تا ئێستا باسی ئاوو هەوای خۆرمان کردوە. واتە ئەو کە ش و هەوایەی کە تەنها پشت بە گەرمای خۆر دەبەستێت. بەڵام هۆکاری تری زۆر هەن یارمەتی ئەوەی پێی دەڵێین "ئاوو هەوای سروشتی" دەدەن. کە کەش و هەوای ڕاستەقینەی زەویە. لە گرنگترین ئەو هۆکارانە ئاوو وشکان و بەرزاییە. ئاوی زەریاکان و ڕەوتەکانیان و بونی ناوچەیەکی وشکانی گەورە، بەرزاییەکانی سەر زەوی. هەمووی هۆکارن دەشێت، یەکبگرن بۆ دروستکردنی، کەش و هەوای جۆارو جۆر بە چاو پۆشی لە شوێنەکە لەسەر زەویدا. لەبەر ئەو هۆیەیە، کەش و هەوا لە کاتێکدا یان شوێنێکدا یان ناوچەیەکدا دور لە هێڵی ئیستیوا دەشێت لە کەش و هەوای ناوچەی ئیستیوا گەرمتربێت.

## پیس بوون چیە؟

پیسبوون واتە پیس بونی ژینگە، هەوا – ئاو – وشکانی، بە پاشماوە زیان بەخشەکانی مرۆڤ. شۆڕشی پیشەسازی و گەشەسەندنی شارەکان و بەکارهێنانی ئۆتۆمبێلەکان هۆکاری سەرەکین بۆ پیس کردنی ژینگە. پیس بونی ژینگە ئەمڕۆ بۆتە کێشەیەکی جیهانی زۆر گەورە. پیس بون نەك تەنها زیانی بۆ گیانداران و ڕووەکەکان هەیە. بەڵکو دەشچێتە سوڕی سروشتی ئاساییەوە. وەکو زنجیرەی خواردنەکان و سوڕی کاربۆن و نایترۆجین و ئۆکسجینەوە. هۆی سەرەکی پیس بون سوتانی سوتەمەنی کارگەکان و ماڵان و ئوتومبیلەکانە. سوتەمەنیە سوتاوەکان گەردیلەو گازاتی زیان بەخش دەردەدەن بۆ ژینگە. کارگەکان ڕێژەیەکی زۆر دوکەڵ بەرهەم دەهێنن. کە هەموو ڕۆژێك ژینگە پیس دەکات. دوکەڵ و گازەکان هێندە زیان بەخشن کە دەبنە هۆی زۆرێك لە نەخۆشیەکانی سیەکان و شێرپەنجە و هی تریش. یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن و دووەم ئۆکسیدی نایترۆجین و دووەم ئۆکسیدی گۆگرد، کە لە ئەنجامی سوتەمەنی ئۆتۆمبیلەکانەوە دروست دەبن، بە گازی ژەهراوی دادەنرێن. بەهۆی ئەو پیس بونەوە، ساڵانە

هەزاران كەس دەكەونە نەخۆشخانە. زۆربەی پیس بونی ئاوەكانیش لە ئەنجامی پاشەڕۆی كارگەكان و كێڵگەكان و ماڵانەوە دەبێت. پاشەڕۆ پیشەسازیەكان و مرۆڤیەكان و ئاژەڵیەكان سەرەڕای زێرابەكان ئاو پیس دەكەن و دەبنە هۆی گەشەسەندنی بەكتریا لە ئاودا. كاتێك ئێمە ئەو ئاوە پیس دەخۆین توشی زۆر لە نەخۆشیەكان دەبین. هەروەها زۆر لەو دەرمانانەی بۆ لەناوبردنی، مێروە كشتوكاڵیەكان بەكاردەهێنرێت، سروشتێكی ژەهراویان هەیەو كاتێك دانەوێڵەكان دەخۆین دەشێت زیانمان پێ بگەیەنێت. لەبەرئەوە دەبێت پێش خواردنیان دانەوێڵەكان زۆر بە باشی بشۆنەوە. وەشاندنی دەرمانی كشتوكاڵی و هی تریش لە مەوادە كیمیاویەكان، كە بۆ چاككردنی بەرهەمی كشتوكاڵی بەكاردەهێنرێت، دەبنە هۆی پیس بونی ژینگەی وشكانی. زۆر جاریش دەبنە هۆی ژەهراوی بونی زۆر لە گیاندارەكانی تر. كە لە بنەڕەتدا بۆ لەناوبردنی ئەوان بەكانەهێنراوە. هەندێك لە ژەهرەكان بە زنجیرەیەكی خۆراكیدا تێدەپەڕن تا دەگەنە مرۆڤ و زیانی پێ دەگەیەنن. پاشماوە ڕەقەكانیش هۆیەكی ترن بۆ پیس بونی وشكانی دەنگە دەنگ و ژاوە ژاو، لە زۆر لە شوێنەكاندا. كێشەیەكی سەرەكیە، بەڵكو مەترسیەكیشە بۆ سەر تەندروستی. تیشكەكانیش خاڵێكی تری پیس بونن. چەكی ئەتۆمی و تیشكی ئێكس و فڕنەكانی مایكرۆ وەیڤ. هەموویان تیشك گەلێك دەردەدەن. دەشێت زیان بەخش بن. ئەمڕۆ زانایان هەوڵی ئەوە دەدەن شێوازێك بگرنە بەر بۆ زاڵ بون بەسەر پیس بوندا. هەندێك پاڵاوگە داهێنراوە بۆ كەمكردنەوەی ڕێژەی ئەو دوكەڵەی كە لە كارگەكانەوە دەردەچن.

## جۆدۆ

وشەی جۆدۆ لە وشەی یابانی "جۆجیتسۆ" وە هاتوە. جۆدۆ هونەرێكی جەنگیە لە یاری زۆران بازی دەچێت. بەهۆی جوڵەكانی لاشەو پارسەنگ ڕاگرتن و هێزی هەردو دەستەوە سەركەوتن بە دەست دەهێنرێت. یاری جۆدۆ دەوروبەری ساڵی ٧٠٠ زایینی سەری هەڵدا. بۆ یەكەمجاریش لە ساڵی ١٩٦٤ دا لە یاریەكانی ئۆڵۆمپیدا بەشداری كرد. لەم یاریەدا هێزی نەیار بۆ قازانجی بەرگریكەر بەكاردەهێنرێت، بە پێی ڕێساكانی ئەم یاریە، بەشدار بو ناتوانێت هێرش بكاتە

سەر بەرامبەرەكەی. لە یاریەكانی ئۆلۆمپیدا هیچ ولاّتێكی بەشداربو ناتوانێت بەشەش یاریچی زیاتر بەشداری بكات. پێنج كۆمەڵ هەن لەم یاریەدا كە لەسەر، بنەمای كێش پۆلێن كراون:

١- كێشی سوك: ئەم كۆمەڵەیە ركەبەرەكانی نابێت كێشیان لە ٦٣ كیلۆ گرام زیاتر بێت.

٢- كێشی تێكەڵ: كێشی ئەم كۆمەڵەیەش لە نێوان ٦٣ بۆ ٧٠ كیلۆ گرامدایە.

٣- كێشی ناوەند: ئەم كۆمەڵەیەش كێشیان لە نێوان ٧٠ بۆ ٨٠ كیلۆ گرامدایە.

٤- كێشی قورسی سوك: ركەبەرەكان كێشیان لە نێوان ٨٠ بۆ ٩٣ كیلۆ گرامدایە.

٥- كێشی قورس: بۆ ئەوانەیە كێشیان لە ٩٣ كیلۆ گرام زیاترە.

٦- كۆمەڵی شەشەم: كراوەیە بۆ ئەو ركەبەرانەی كێشیان هەرچەندە بێت. لەم كێشەدا، هەر ولاّتێك. بە یەك بەشداربو زیاتر ناتوانێت بەشدار بێت. لە یاری جۆدۆدا چوار جەولە هەیە: جەولەی خۆ ئامادەكردن، جەولەی سەرەتایی، جەولەی پێش كۆتایی، جەولەی كۆتایی. دەبێت یاری چی جۆدۆ چاكەتێكی نەخشین و پانتۆڵێكی سپی‌ی قایم ی لە قوماش دوراو لەبەر بكات. یاری چیە سەرەتاییەكان دەبێت قایشی سپی و پسپۆڕان و مامۆستایانیش قایشی ڕەش ببەستن. یاری جۆدۆ لەسەر ڕاخەرێكی تایبەتی دەكرێت كە ڕووبەرەكەی ١٠م$^2$. هەردو جەولەی خۆ ئامادەكردن و سەرەتاییشی شەش خولەك دەخایەنێت. یاری چی ئەگەر دەستی جوانی وەشاند، یان بەرامبەرەكەی بەرزكردەوە یان بۆ ماوەی ٣٠ چركە خۆی ڕاگرت. ئەوە بە براوە دادەنرێت. هەروەها دەشێت یاری چی نیوە خاڵ و چارەكە خاڵیش وەرگرێت. بارەگای یەكێتی جۆدۆی نێودەوڵەتی لە پاریسی پایتەختی فەرەنسایە.

## ئیسفەنج چیە؟

ئەو ئیسفەنجەی ئەمڕۆ لە بازاڕدا دەیكڕین و بۆ پاككردنەوە بەكاری دەهێنین ئیسفەنجی ڕاستەقینە نیە. بە ڵكو لە جۆرێك مەوادی كیمیاوی دروست كراوە كە بەتەواوی لە ئیسفەنجی ڕاستەقینە دەچێت و، وەكو ئەویش ئیش دەكات. لەوە دەچێت دروستكەرەكانی زۆر بە باشی لە دروست كردنیدا سەركەوتبن.

ئیسفەنجی ڕاستەقینە لە دەریاوە دێت نەك لە تاقیگە کیمیاویەکانەوە. ڕۆژگارێکی دورو درێژ تێپەڕی و هیچ کەس نەیزانی ئیسفەنج چیە. وایان دەزانی ڕوەکە. بەڵام زانایەك بەناوی "ڕۆبەرت گرانت" لە ساڵی ١٨٢٥ دا سەلماندی کە ئیسفەنج گیاندارە! گرانت بەهۆی ورد بینەوە ڕوەك گەلێکی لە ئاودا بینی کە دەچونە کون گەلێکەوەو لە کون گەلێکی ترەوە دەردەچون. بەڵام چەندین ساڵی تر دوای ئەوە تێپەڕی کە هێشتا زانایان نەیان دەزانی ئیسفەنج چ جۆرێکە لە ئاژەڵ. وای بۆ دەچون کە ئاژەڵێکی لاوازی یەك خانەیەو بە کۆمەڵ لە موستەعمەراتی گەورەدا، دەژین. بەڵام ئێستا دەزانین ئیسفەنج بریتیە لە پەیکەری وشکەوەبویی ئەو ئاژەڵە دەریاییانەی کە سەر بە گروپێکن پێیان دەوترێت "کون کونەکان" یان ئیسفەنجیەکان کە گروپێکی گەورەن لە مەملەکەتی ئاژەڵاندا. لەگەڵ ئەوەی ئیسفەنج نزمترین شێوەیە لە شێوەکانی ژیانی ئاژەڵی بەڵام پێکهاتەو دروست بونی زۆر ئاڵۆزە. چینی دەرەوەی ئیسفەنج لە ڕیشاڵی زیندو پێکهاتوە، کە لە پولەکە دەچێت، کەناڵەکانی دادەپۆشێت. لە هیچ لەوانە ناچێت کە لە هەر ئاژەڵێکی تردا هەیە. لەشێوەی ڕیزدایەو هەر لایەکی بە تاژانکێکی درێژ کۆتایی دێت. کە دەدا لە ئاوەکە ئیسفەنج دەچێتە ژورەوەو لێیەوە دەردەچێت. بەم ڕێگەیە ئیسفەنجەکە ئۆکسجین و ملیۆنەها ئەندامی وردیلەی تری دەست دەکەوێت کە لەسەری دەژێت. لەگەڵ ئەو ئاوەش کە لێیەوە دێتە دەرەوە لە پاشەڕۆکانی ڕزگاری دەبێت. لەبەر ئەو هۆیەیە ئیسفەنجی تازە بۆنێکی ناخۆشی هەیە، تا ئاژەڵانی تر لێی هەڵبێن و نەیخۆن! لە ناوەڕاستی ئیسفەنجدا قەبارەیەکی هێلمی هەیە کە خانەکان بەناویدا دەسوڕێنەوەو دەشێت خواردن هەرس بکات لەگەڵ یارمەتی دانی هەناسە دان و ڕزگار بون لە پاشەڕۆکان. ئیسفەنج شێوازی زۆرەو ڕەنگیشی جوانە، گرانترین ئیسفەنج ئەو ئیسفەنجەیە کە لە قوڵایی ئەو ئاوانەدا دەردەهێنرێت کە ٥٠ بۆ ٨٠ میل لە کەنارەکانەوە دورن.

## ئایا مارەکان دەبیسن؟

ماسی گوێچکەی دەرەوەی نیە، ئەمەش مانای وایە ئەو دەنگانە نابیسێت کە بەهۆی هەواوە دەگوێزرێنەوە. بەڵام مار زۆر هەستیارن بۆ لەرینەوەکان لەسەر

زەویدا. کاتێك بەرەو ڕوی مارێك دەچیت هەست بە لەرینەوەکانی دەکات. لەگەڵ ئەوەی وا دەردەکەوێت. کە مار هیچ هەستێکی بیستنی نیە. بەلاّم بە هەستەکانی تری ئەو ناتەواویە قەرەبو دەکاتەوە. مار لە ڕێگەی جموجوڵەکانەوە تێبینی قوربانیەکەی دەکات. نەك لە ڕێگەی ڕەنگ و شێوەیەوە. مار هەستی بۆنکردنی هێندە بەهێزە کە دەتوانێت نێچیرەکەی لەگەڵ دوژمنەکەیدا لە یەك جیا بکاتەوە. بەو بۆنەی کە لە نێچیرەکەی یان دوژمنەکەیەوە دەردەچێت. هەروەها مار هەستێکی تری هەیە کە پەیوەندی بە بۆن و چێژکردنەوە هەیە پێکەوە، ئەو هەستە لە مرۆڤدا نیە. بەڵکو مارەکان دەتوانن گەردیلە کیمیاویەکان، لە هەوا یان لە زەوی یان لە ئاژەڵێکی تر یان تەنێکی تر وەربگرن، بەهۆی هەردوو لا زمانە درێژو فرە لقەکەیەوە. دوای ئەوە دو کون هەیە لە سەقفی دەمیدا کە خانەی دەماری زۆر هەستیاریان تێدایە. کە لە ڕێگەیانەوە مارەکە دەتوانێت، گەردیلە کیمیاویەکان لە یەك جیا بکاتەوەو بزانێت ئەوەی هەستی پێ دەکات خۆراکە یان دوژمنە یان دۆستە، یان هەر شتێکی ترە. لە ڕاستیدا مار هەستێکی کیمیاوی زۆر پێشکەوتوی هەیە، دەتوانێت بە شوێنی پاشماوەی ئاژەڵانی تردا بچێت. وەکو سەگێکی باش ڕاهێنراو. سەرەڕای ئەمانە ماری وا هەیە، بۆ نمونە مارە پیسەکان یان ماری بوا، هەستێکی وای هەیە هیچ ئاژەڵێکی تر نیەتی. بە جۆرێك ئەگەر دونیا تۆزێك سارد یان گەرم بکات، دەتوانێت هەست بە بونی نێچیرەکەی بکات. ئەو هەستە پێی دەڵێن هەستی گەرما، کە یارمەتی ماران دەدات شوێنی نێچیرەکەیان، دیاری بکەن لە تاریکی شەودا بۆ ئەوەی ببینن.

## بۆمبای نیوترۆن

هەمومان بۆمبای ئەتۆمی و بۆمبای هایدرۆجینیمان بیستوە. یەکەمیان بە مەبدەئی کەرت بونی ئەتۆمی و دوەمیان بە مەبدەئی تواندنەوەی (بون بە یەك) ی ئەتۆمی ئیش دەکات. ئەم هەردو بۆمبایە زۆر بەهێزن، بەلاّم بۆمبای هایدرۆجینی هێزی وێرانکردنی زیاترە لە بۆمبای ئەتۆمی. وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو فەرەنسا جۆرێکی تازەیان لە بۆمبا دروست کرد کە پێی دەوترێت بۆمبای نیوترۆنی. بۆمبای نیوترونی بە "چەکی تیشکی نیوترون" یش ناودەبرێت. کە

چەکێکی ئەتۆمی بچوکەو کێشی لە نێوان یەك بۆ دوو تەندایە. لە ئەنجامی تەقینەوەیدا دەنگێکی گەورەو گەرمایەکی زۆری لێوە دەردەچێت، دەشێت لە ڕووبەری نیوە تیرەی (١٢٠ – ٣٥٠) مەتردا هەموو شتێك وێران بکات. لەم چەکەدا مادەی نیوترۆن بەکاردەهێنرێت کە نیوترونات و تیشکی گامای کوشندە دەردەدات لە ڕووبەرێکدا کە نیوەتیرەکەی یەك بۆ دوو کیلۆ مەترە. تایبەتمەندیەکانی ئەم بۆمبە ئەوەیە کە تەنها، مرۆڤ و ئاژەڵ دەکوژێت و زیان بە بیناو ڕوەك ناگەیەنێت. لە ئەنجامی چونی نیۆترۆنات و تیشکی گاما بۆ ناو گیانی مرۆڤ و ئاژەڵەکان دەبێتە هۆی مردنیان. لەبەرئەوەی نیۆترۆن لە مرۆڤ و ئاژەڵ زیاتر ناکوژێت. بۆیە بە تایبەت دروست کراوە بۆ بەکارهێنان لە جەنگی بەرەییدا.

## چۆن بۆن دروست دەکرێت؟

بۆن تێکەڵەیەکە لە مەوادی وەرگیراو لە ڕوەکەکان و گیراوە کیمیاویەکانەوە کە بۆنێکی خۆش دەدەن. عەرەبەکان و چینیەکان و هندیەکان و یۆنانیو ڕۆمانیو میسریە کۆنەکان، لە زۆر کۆنەوە دروست کردنی بۆنیان زانیوە. ئەو مەوادانەی لە دروست کردنی بۆندا بەکاردێن، بریتین لە بەرهەمە سروشتیەکانی ڕوەك یان ئاژەڵ لەگەڵ گیراوە کیمیاویەکاندا کە بە ڕێژەیەکی دیاری کراو تێکەڵ دەکرێن. ڕۆنی بنەڕەتی مەوادە ڕوەکیەکان زۆربەیان بەهۆی دڵۆپاندنی هەڵمەوە دروست دەکرێن. بە بەکارهێنانی تێکەڵەیەك، لە مەوادی ڕوەکی و ئاو دەشێت هەندێك ڕۆنی هەستیار بە بەکارهێنانی مەوادی توێنەرەوەمان دەست بکەوێت. هەندێك جیاکەرەوەی ئاژەڵی بۆندار وا دەکات بۆنەکە زیاتر بڵاوبێتەوەو بۆ ماوەیەکی زیاتریش لە هەوادا بمێنێتەوە. لەو مەوادانە عەمبەری دەرهێنراو لەو نەهەنگەی کە بە نەهەنگی عەمبەر ناسراوە. ڕۆنی ئاژەڵی سەگلاوی و بۆنی ئاژەڵی سنۆرو مسك، لە ئاسکی مسکدا. لەگەڵ بەکارهێنانی هەندێك کیمیاویدا، بۆ بەرهەم هێنانی بۆن. تێکەڵ کردنی ڕێژەکانی بۆن، پێویستی بە کارامەییەکی زۆر گەورە هەیە. وەستای بۆن پێویستی بە ساڵانێکی دورو درێژ هەیە، تا ئەو هونەرە فێر بێت. پۆلێن کردنی بۆنەکان بە گوێرەی بۆنەکەیەتی. کۆمەڵی بۆنی تایبەت بە

گوڵان، لە بۆنەکانی یاسەمین و گوڵە خەزێم و کردینیا تێکەڵ دەکرێت. کۆمەڵەی دارانیش بریتییە لە خەسخەس Khus Khus و سەنەل و هاڤریشك. فەرەنساش یەکەم وڵاتە لە بەرهەم هێنانی بۆندا.

## بۆچی هێلکەی باڵندەکان وەکو یەك نین؟

ڕاستیەکی ئاشکرایە کە باڵندەکان هێلکە بە ڕەنگی جیاواز دادەنێن. دەشێت ڕەنگی هێلکەکان سپی یان شین یان سەوز یان کایی یان زەرد بن زۆر جاریش هێلکەکان نیتکە نیتکە یان هێڵیان لەسەرە.

## ئایا هۆی جیاوازی هێلکەکان دەزانن؟

زانایانی باڵندە ناس، تا ئێستاش بە تەواوی هۆی ئەوە نازانن. بەڵام ئەو باڵندانەی لە زەویدا هێلانە دروست دەکەن. ڕەنگەکە یارمەتی ڕوکەش کردنی هێلککە دەدات. کاتێك دایکەکە، دەچێت بۆ گەڕان بە شوێن خواردندا ناچار دەبێت هێلکەکە لە هێلانەکەدا بەجێ بهێڵێت. لەماوەی نەبونیدا لەوێ، دەشێت هێلکەکە توشی فەوتان یان خوران بێت لەلایەن مار یان سمۆرە یان ڕسق یان باڵندەکانی ترەوە، یان تەنانەت مرۆڤیشەوە. بەمجۆرە ئەو هێلکانە ڕەنگی ئەو شوێنە دەگرن کە تێیدان بۆ ئەوەی پارێزراوبن لە دوژمنەکانیان. باڵندەی شۆکە، هێلکەکەی لەناو بۆشایی گوڵاندا دادەنێت، هێلکەکە وەکو گژوگیای چواردەوری هێلکەکەی لێدێت. بەڵام باڵندەی قەلە بازەڵە هێلکەکانی لەنێو بەردی کەنار دەریاکاندا دادەنێت. لەبەرئەوەی شێوەی ڕەنگەکەی لە بەردەکان دەچێت و جیاوازی لە نێوانیاندا ناکرێت. ئەو باڵندانەی هێلکەکانیان. لە کلۆری داران دا یان کوندا یان هێلانەدا دادەنێن بە گشتی هێلکەکانیان سپیە یان ڕەنگیان کاڵە. ئەگەر لە هێلانەکانیان دەربهێنرێت و لە دەشتێکدا دابنرێت بە ئاشکرا لە زەویەکە جیا دەکرێتەوە. بۆ ئەو ڕەنگە خۆ پارێزە نمونەی زۆرمان هەیە. نامۆترین نموونە لەسەر ئەو ڕەنگە هێلکەی باڵندەی کوکو "وقواق" ە کە هێلکەکەی دەخاتە هێلانەی باڵندەیەکی ترەوە. یەکێك لە هێلکە ئەسڵیەکانی ناو هێلانەکەی تر دەردەهێنێت و هێلکەیەکی خۆی بە هەمان شێوەو ڕەنگ و نیشانە لە شوێنی

دادەنێت. بەمجۆرە باڵندەکان هەریەکەو بە جۆرێکی تایبەت خۆیان لە دوژمنەکانیان دەپارێزن.

## ئامێری ئاشکرا کردنی درۆ

جۆن ئالای لارسۆن کە یەکێك بوو لە خوێندکارانی کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی کالیفۆرنیای ئەمریکا. لە ساڵی ١٩٢١ ئامێرێکی دروست کرد دەیتوانی تا رادەیەکی زۆر باش درۆ ئاشکرا بکات. ئەم ئامێرە بە (( پولیگراف )) واتە ئامێری دۆزینەوەی درۆ، ناسرا. ئەم ئامێرە ئەمرۆ لە دۆزینەوەی تاوانەکاندا بەکاردەهێنرێت. ئایا دەزانن ئەم ئامێرە چۆن درۆ ئاشکرا دەکات؟ کاتێك کەسێك درۆ دەکات گۆڕانکاری فسیۆلۆجی لە لەشیدا دروست دەبێت و لێدانی دڵی زیاد دەکات، کە دەبێتە هۆی ئارەق کردنی، ئامێری دۆزینەوەی درۆ هەموو ئەو گۆڕانکاریانە تۆمار دەکات. کاتێك کە کەسێك دەخەنە ژێر تاقیکردنەوەوە چەند بەشێك لە ئامێرەکە، بە لاشەیەوە پەیوەست دەکەن و لێکۆڵەر دەست بە پرسیار کردن دەکات لەیی. ئامێرەکەش ئەو گۆڕانکاریانەی لە کاری ئەندامەکانی لەشیدا دروست دەبێت هەمووی تۆمار دەکات. لە کۆتاییدا هەرچی ئەو تێبینییانەی ئامێرەکە تۆماری کردووە هەموو شی دەکرێنەوە.

بەڵام سەد دەرسەد ناتوانین پشت بە زانیارییەکانی ئەم ئامێرە ببەستین ووردی زانیارییەکانی بە ٨٠٪ مەزەندە دەکرێت لە ڕاستیدا زیاتر پشت بە لێهاتوویی کەسی شیتەڵکار دەبەسترێت. هەندێك کەس هەست بەوە ناکەن کە درۆ دەکەن بۆیە ناتوانرێت بەم ئامێرە بدۆزینەوە. هەروەها ئەوانەی لە تاواندا ڕابردوویەکیان هەیەو لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دەتوانن بەسەر هەڵچوونەکانیاندا زاڵ بن، ئەم ئامێرە لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا بێ کەڵك دەبێت. لەبەر ئەم هۆیانە ئەو ئەنجامانەی کە بە هۆی پۆلیگرافەوە بەدەست دەهێنرێت ناتوانرێت وەکو بەڵگەیەك لە دادگادا وەربگیرێت. لەگەڵ ئەوەشدا بنکەکانی پۆلیس لە هەموو وولاتانی دنیادا لە ساڵی ١٩٢٤ وە ئەم ئامێرە بەکاردەهێنن.

## سۆز چییە؟

دەتوانرێت وەسفی سۆز بکرێت بەوە کە وورووژانێکی زهنیە. لە ئەنجامی پەرچەکارێك دروست دەبێت لەسەر بیرو بۆچوون یان منەبیحێکی تایبەتی. دەشیت سۆز ئەکتیف یان نیگەتیف بێت. سۆزە ئەکتیڤەکان وا دەکەن مرۆڤ دڵخۆش بێت نموونەی سۆزی خۆشەویستی، بەختیاری، دڵخۆشی‌و خۆهەڵکێشان سۆزە نەگەتیڤەکانیش وا دەکەن لە مرۆڤ کە دڵتەنگ بێت وەکو تورەیی، ترسان، غەمۆکی ڕق لێهاتنەوە، بێ ئومێدی‌و بێزاری. بەلای زۆربەی پزیشکەکانەوە وایە، ئەوانەی تازە لە دایك دەبن هیچ سۆزێکیان تێدا نییە، بەڵکو بەرەبەرە لە دەوروبەرەوە فێری دەبن. وەکو چۆن فێری قسە کردن‌و ڕێك کردن دەبن. بۆ نموونە منداڵێك لە سەگ یان مار ناترسێت تا گازی لێ نەگرێت یان پێوەی نەدات دوای ئەوە لێیان دەترسێت و خۆی لێیان دەپارێزێت. سۆزەکان گۆڕانکاری کیمیاوی زۆر لە لاشەدا دروست دەکەن، ئەم گۆڕانکاریانەش ئالیەتێکی لەشە بۆ بەرگری کردن لە خۆی. بۆ نموونە: ئەگەر مرۆڤ خۆی لە بارودۆخێکی مەترسیداردا دۆزییەوە لووی کەزەری هۆرمۆنێك دەرژێنێت بۆ ناو خوێنی بەناوی (( ئەدرینالین )).لەگەڵ خوێنەکە گەیشتە دڵ لێدانی دڵ زیاد دەکات.دڵیش خوێنێکی زیاتر دەنێرێت بۆ مێشك‌و ماسولکەکان‌و لە هەمان کاتدا ڕێژەی شەکر لە خوێندا زیاد دەکات بۆ ئەوەی وورزەیەکی زیاتر بداتە لەش بۆ بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ ئەو بارودۆخە سەختەدا.تێکچوونی باری سۆزداری دەشێت سەر بکێشێت بۆ نەخۆشی جەستەیی جۆراو جۆر وەکو تەنگە نەفەسی، گەدە ژان، ئاوسانی جومگەکان ( ووشك بوونەوەی جومگوکانی ئێسك ) لەگەڵ فشاری خوێندا هەروەها هستریاش لە ئەنجامی تێکچوونی سۆزدارییەوە دروست دەبێت کە تیایدا نەخۆش هەست بە پەك کەوتنی ئەندامەکانی لەشی دەکات. لەگەڵ ئەوەی بە ڕاستی ئەندامەکانی پەکیان نەکەوتووە. دەمارو ماسولکەکان بە شێوەیەکی ئاسایی دەتوانن کاری خۆیان ئەنجام بدەن، بەلام باری خراپی ئەقڵ نایانهێڵێت کارەکانیان ئەنجام بدەن. پزیشکان دەڵێن ئەو نەخۆشیانە پێویستیان بە چارەسەری پزیشکی‌و دەروونی هەیە.

## ئەو ئۆتۆمبیلە كۆنانەی لەكاركەوتوون چیان لێ دەكرێت؟

لە وولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا كارگەیەكی زۆر گەورە هەیە. ئۆتۆمبیلە لە كار كەوتووەكان، وەردەگیرێتو بە ئامێرێكی سوڕاوە كە قورسییەكەی چل و چوار تەنە، بە بێ ڕوحمانە لە ماوەی تەنها چل چركەدا دەیهاڕێت. ئەمجا بە ئامێرێكی موغناتیسی كارەبایی ئاسنو پۆڵاو كانزاكانی تری لەیەك جوودا دەكاتەوە. تا دوای تواندنەوەی سەر لەنوێ ئۆتۆمبێلێكی تری لێ دروست بكەنەوە. ئێستا لەم جۆرە كارگەیە لە زۆربەی وولاتانی دنیادا هەیە. بەلاّم لە دوو دەهەی ڕابردوودا پیشەسازی ئۆتۆمبێل گۆڕانكاری گەورەی بەخۆیەوە بینی بۆ نموونە لە پێناو كەم بەكاربردنی سووتەمەنی كێشی ئۆتۆمبێلەكان سووك كرانەوە. بۆ كەمكردنەوەی كێشی ئۆتۆمبێلەكان لە بری ئاسنو كانزاكانی تر پلاستیك بەكار دەهێنرێت. ڕێژەی پلاستیك لە هەر ئۆتۆمبێلێكدا ئەمڕۆ دروست دەكرێت لە نێوان ١٠ بۆ ٢٠ لە سەدی كێشەكەیەتی، واش چاوەڕوان دەكرێت لە دە ساڵی داهاتوودا ڕێژەكە دووقات بكرێتەوە. لە ئەڵمانیادا كارگەكانی دروست كردنی ئۆتۆمبێل هەمیشە بە شوێن شێوازی تازەدا دەگەڕێن. لە دروست كردنی ئۆتۆمبێل دا كە ئابووری تر بێتو مەوادەكانی جارێكی تر سەر لەنوێ لە پیشەسازیدا سوودی لێ وەربگیرێت. لە وولاتە یەكگرتووەكاندا، جۆرە پلاستیكێك لە پیشەسازی ئۆتۆمبیلدا بەكار دەهێنن دەتوانرێت بتوێنرێتەوەو جارێكی تر بەكاربهێنرێتەوە.

## بۆچی ڕووەكەكان ڕەگیان لێ دەڕوێت؟

ڕووەكەكان لەبەر دوو هۆ پێویستیان بە ڕەگ هەیە. یەكەمیان وەكو ڕاگیركردنو جێگیربوونیان لە زەوی‌دا، دووەمیشیان مژینی ئاوو خوێ كانزایی‌یەكان لە خۆڵدا. ڕەگی زۆربەی ڕووەكەكان كە لەخۆڵدا دەڕوێن. بە وەستانی لە شوێنی خۆیدا بەس نی‌یە بەڵكو دەبێت بەناو خۆڵدا شۆڕ ببێتەوە، بۆ ئەوەی یارمەتی گەشە كردنو ڕووانی ڕووەكەكە بدات. لە لاكانیەوە درێژ دەبێتەوە، بەوەش دەگاتە پانتایی‌یەكی تازە تر لە خۆڵدا. هەزاران وورده ڕەگ لە ڕووەكەكاندا دەڕوێن بۆ

ئەوەی مەوادە خۆراكيەكان لە خۆلدا بمژن. هەندێك لە ڕووەكەكان ڕەگی مێخیيان هەيە. ڕەگی مێخی لە هەموو ڕەگە باريكەكان گەورەترە. بەلكو چەند ڕەگێكی قەبارە يەكسانی هەيە كە سيستەمی ڕيشەيی لێ پێك دێت. سيستمی ڕيشەيی لەو ڕووەك‌و خۆلانەدا زۆرە كە ڕيشكيان زۆرەو لە خواردن‌و دامالين دەيپارێزێت. لە ڕووەكەكانی تردا زۆربەی ڕيشەكان لە قەددا دەڕوێن، وەك لە ڕووەكی ((دەرزی شوان))ەدا SHEPHERD'S NEEDLE كاتێك ڕەگەكان دەڕوێن‌و گەورە دەبن. هەندێكيان ڕێژەيەكی زۆر لە شەكرو نيشاستە پەسيسە دەكەن، وەك لە پەتاتەی شيرين‌و چەوەنەردا. هەندێك ڕووەك هەيە ڕيشەی نىيە لە خۆلدا بڕوێت وەك هێلەساوی ئيستيوائی كە هەلدەزنێت بە دارانداو ڕەگێكی ئيسفەنجی هەيە. كە لە هەواد دەڕوێت‌و شێ دەمژێت. هەندێك ڕووەكی تر ڕەگی تايبەتیيان هەيە، كە لە قەدەكەيدا بەسەر زەویدا دەڕوێت، ئەمجا دەچێتە ناو زەوييەكەوە بۆ ئەوەی قايمی بكات.

## بۆچی لاشەی هەر مرۆڤێك بۆنێكی تايبەتی هەيە؟

سەگە پۆليسيەكان بە ڕێگەی بۆنی لاشەوە تاوانباران دەناسنەوەو. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت، كە لاشەی هەر يەك لە مرۆڤەكان بۆنێكی تايبەت بە خۆی هەيە. چەندين تاقيكردنەوە، كراوەو سەلماندوويەتی تەنانەت تۆزێك جياوازی هەيە لە نێوان بۆنی دووانەكانيشدا ( جمك ) ئەو سەگانەی كە بە باشیو بە تايبەتی مەشق دراون جياوازی نێوان بۆنی دووانەكانيش دەكەن. ئايا دەزانن بۆچی لاشەی هەر مرۆڤێك بۆنێكی تايبەت بەخۆی هەيە؟ بۆنی لاشەی هەر مرۆڤێك تا ئەندازەيەك پشت بەو شلە زەيتیيە دەبەستێت كە لووە ئارەقيەكان، لە لەشيدا دەيڕژێنن. بەلام هۆی سەرەكی بۆنەكە ئەو بەكترياية كە لەسەر ئارەقە دەژێت. كە منداڵێك لە دايك دەبێت، زۆرێك لەو بەكترياييانە لە دايكەوە وەردەگرێت، لەگەل ئەو پزيشك‌و پەرستيارانەی دەستی پێوە دەدەن هەرچەند دەست لێدانی منداڵەكە زياتر بێت، ژمارەی بەكترياكان زياتر دەبن، ڕێژەی بەكتريا لە پێستدا لەناوچە شێدارەكان زياترە وەك لە ناوچە ووشكەكان. دوای چەند ڕۆژێك لە لەدايك بوون، چەندين جۆری جياواز لە بەكتريا لەسەر پێستی مرۆڤ بۆ هەتا هەتايی جێگير

دەبن. جۆرەکانی بەکتریا لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازەو چەندین جۆر بۆنی جیاواز دەردەکەن. لەبەر ئەو هۆیەیە کە بۆنی مرۆڤەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازی هەیە.

## پشیلە چۆن لە تاریکیدا دەبینێت؟

پشیلە سەر بە خێزانێکی زۆر تایبەتیە لەناو گیانداراندا کە بریتین لە شێرو پڵنگو پشیلە، سەرە ڕای ئەو شوێنەی پشیلە لێی دەژێت و شێوەی لاشەی هەموو پشیلەکان لە زۆر ڕووەوە لەیەك دەچن. هەموویان دەتوانن ڕاو بکەنو بجەنگنو هەموشیان لە گیاندارە دڕندەکانن. یەکێك لەو شتانەی یارمەتی پشیلە دەدات ڕاوچیەکی لێهاتوو بێت چاوەکانێتی چونکە چاوەکانی دەتوانن لە تاریکی شەویشدا ببینن و زۆربەی ڕاوکردنیشی لە شەودا دەبێت لە ڕۆژدا گلێنەی چاوەکانی زۆر بچوك دەبنەوە و لە شەودا دەکرێنەوەو ڕێ دەدەن بچوکترین تیشك لێیانەوە بچێتە ژوورەوە باگراوندی چاویشی بە ماددەیەك لە شێوەی زیوی زاخاو دراو سواخ دراوە. کەمترین تیشك کە دەدات لە چاوی پێچەوانەی دەکاتەوە. لەبەر ئەوە ئەگەر لایتێکی دەستی بەشەو بگرینە پشیلە دەبینین وەکو چرا دەگرێت.

## ئەی چی وا دەکات پشیلە ڕاوچیەکی لێهاتوو بەتوانا بێت؟

پشیلە چوار دانی زۆر تیژی لە پێشەوەی دەمیدا هەیە. کە چەکێکی زۆر کاریگەرە لە قەپگرتنو داڕزاندنی گۆشت دا، کۆمەڵێك چڕنووکی چەماوەی پێوەیە لە تیژیدا لە دەرزی دەچن. بۆ ئەوەی بە بێدەنگی بگاتە نێچیرەکەی ژێری پێی تووکاویە. هەستی بیستن و بینین و بۆنکردنیشی زۆر بەهێزە.

## بۆچی پەنجە مۆری دوو کەس وەك یەك نین؟

ئەگەر کەسێك پەنجە گەورەکەی بخاتە سەر ئیستامپێكو ئەمجا بیخاتە سەر کاغەزێکی سپی. پەنجە مۆرێکی دەست دەکەوێت کە لە دونیادا هاوشێوەی نیە ئەوراستیە بە سەر هەموو پەنجەکاندا جێبەجێ دەبێت. هەر دە پەنجەکە لە یەکتر جیاوازن وهەر لە دایکبونیشەوە تا مردن ناگۆڕێن. بەکورتی خواشێوەی پەنجەکانی وا جیاواز دروست کردووە، کەنابیت پەنجەی دووکەس لەیەك

بچن.چینەکان ئەم راستیە سەرسورهێنەرەیان پیش نزیکە ی ٢٠٠٠/ساڵ ەزانیوە.چونکە ئیمپراتۆرەکانی چین، بەڵگەنامەو ڕێکەوتنەکانیان بە پەنجە مۆر ئیمزا دەکرد.لەسالی ١٨٩٢/زانای ئینگلیزی فرەنیس جالتۆن، یەکەم کەس بوو ئەو ڕاستیەی سەلماند. لەبەر ڕۆشنایی ئەو دۆزینەوەو سەلماندنە ئەدوارد هینری، سیستەمێکی پەرەپێدا بۆ ناسینی تاوانباران. لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ پۆلیس لەسەرانسەری هەموو دوونیادا، ئەم سیستەمە بەکاردەهێنێت بۆ ڕاوەدونانی گومان لێکراوان و تاوانباران. ئەدوارد هینری پەنجەکانی دابەش کرد بۆ چەند جۆرێك لەوانە: جۆری گرێ، جۆری گرێدارێك کە گێرفانێکی لە ناوەڕاستەوە هەیە، جۆری دوگرێ، جۆری کەوانەیی، جۆری بازنەیی، جۆری پان. لە ڕێگەی ژماردنی کەنارەکانی نێوان دوو خاڵدا لەهەر نمونەیەك، توانی هەر پەنجەیەك لە دە چەنجەکە، لە چوارچێوەی هەمان گروپدا پۆلێن بکات. ئەمجا هەموو کۆمەڵەکان پێکەوە وەردەگرین وەکو یەکەیەك. بۆ ئەوەی سیستەمێکی تەواومان دەستکەوێت بۆ پۆلێن کردنی پەنجەکان. دەزگاکانی پۆلیس ملێۆنەها پەنجەمۆر لە فایلەکانیاندا هەیە، کە بە هۆیانەوە، دەتوانن تاوانباران بدۆزنەوە. ئەگەری لێکچونی پەنجەمۆری دوکەس. لەوانەیە لە ٢٤ ملێۆن کەسدا، یەك حاڵەتی لەوشێوەیە هەبێت.

### ئایا لە مێروەکاندا خوێن هەیە؟

کاتێك، کە مێرو یان زیندەوەرێکی زۆر ورد دەبینین، زۆربەمان وای بۆ دەچین کە ئەو زیندەوەرانە ئەو ئەندامانەیان تێدا نیە، کە لە لەشی مرۆڤدا هەیە. چۆن زیندەوەرێکی وا بچوك دەتوانێت دڵی هەبێت؟ یان ئایا دەشێت زیندەوەرێکی هێندە گچکە و لاواز سوری خوێنی هەبێت؟

بەڵام موعجیزەی خوا، لە بوونی ئەندامەکانی ئەو گیاندارانەدایە. لەشی مێروەکان دەکرێتە سێبەشەوە. سەر، سنگ، سك. جۆرێك هەستەوەر لە پێشی سەریەوەیەتی کە ئەندامی زۆر هەستیاری تێدایە بۆ بۆنکردن هەروەها چاوەکانی و دەمی بەشێکن لەسەری. مێرو نەك تەنها دڵی هەیە، بەڵکو سوڕی خوێنیشی هەیە. خوێن بەهۆی کونگەلێکەوە کە دەمەوانەی هەیە دەچێتە دڵیەوە. کاتێك دڵ

دێته یەك ئەو کونانە دادەخرێن. خوێن لە ڕێگەی خوێنبەرەکانەوە دێتە دەرەوە، بەڵام مێروەکان وەکو مرۆڤ دەمارو دەماری خوێنیان نیە. هۆی گەورە نەبوونی مێروەکان ئەوەیە پشت بە سوڕی خوێن نابەستن بۆ وەرگرتنی ئۆکسجین. وەکو دەزانن دڵ لە لاشەی مرۆڤدا خوێن دەنێرێت بۆ هەموو ئەندامەکانی لاشەو بەوەش مرۆڤ دەتوانێت هەموو کارەکانی ئەنجام بدات. هەروەها مێروەکان سیستەمێکی جیاوازیان هەیە لە هەناسەداندا، کە جیاوازە کە کۆئەندامی هەناسەدانی مرۆڤ. لە لاشەی مێروەکاندا کەناڵی ووردی لق لق هەیە، کە ئەو سەرەکەی بە کونی هەوایی ورد ورد لە لاکانی لاشەیدا کۆتایی دێت. کە هەوا ڕاستەوخۆ لەسەر ڕووی لاشەیەوە دەبات بۆ خانەکان. ئایا دەزانن یەکێك لە ناوەکانی مێرو (( شەش پێ ))یە؟ ئەگەر قاچەکانی هەر مێرویەك بژمێرین دەبینین ناوی شەش پێ باشترین ناوە بۆ زۆربەی مێروەکان. قاچی مێروەکان لە سێ جووت پێکهاتووە، کە پەیوەستن بە سنگیەوە واتە بەشی ناوەڕاستی لاشەی. لە دونیادا هەزاران هەزار جۆری مێرو هەیە. جۆری وایان هەیە، بە باشترین دۆستی مرۆڤ دادەنرێت، هەندێکیشیان ئەوپەڕی دوژمن.

## ئایا شاخێك هەیە ڕەنگی خۆی بگۆڕێت؟

زۆرجار دەبیسین بزن مڕە، ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت. بەڵام بوونی شاخێك کە ڕەنگی خۆی بگۆڕێت شتێکی سەیرو نامۆیە. گردێك هەیە لە باشوری وسترالیا پێی دەوترێت گردی " ئایرز" کە هەموو ڕۆژێك و لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت. ئەم گردە گەشتیاری ئینگلیزی بلیۆجی گۆز لە ساڵی ١٨٣٧ دا دۆزییەوە. لەو سەردەمەدا هینری ئایرز سەرەك وەزیرانی ئوترالیای باشوور بوو، گردەکەش هەر بەناوی ئەوەوە ناونرا. شێوەی گردەکە هێلکەییەو درێژیەکەی ٧ کیلۆمەترو پانیەکەی ٢,٤ کیلۆ مەترو بەرزیەکەی ٣٤٨ مەترە.

ئەم گردە لە بنەڕەتدا ڕەنگی خۆی سوورە، لە کاتی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابووندا بە شێوەیەکی سەیر ڕەنگی دەگۆڕێت. کاتێك بەیانیان تیشکی خۆر لێی دەدات وا دەزانێت گردەکە، هەر هەمووی دەسوتێت و گڕی گڕی سووری لێ بەرز دەبێتەوە. بەهەمان شێوە مرۆڤ دەتوانێت لە خۆرئاوابونیشدا سێبەرێکی قرمزی ڕەنگ لەسەر

ئەو گردە گەورەیە ببینێت. لە بەیانیەوە تا ئێوارە بە ڕەنگەکانی زەرد، پرتەقاڵی، سوور، هەندێك جار قرمزیو تەنانەت ڕەشیش خۆی دەگۆڕێت. خەڵکی وا دەزانن گردێکی سیحریە بەڵام هۆی گۆڕانکاریەکانی ئەوەیە، دابەزینی تیشکی خۆرو ئاوو هەوا ئەو گۆڕانە دروست دەکەن. گردەکە لە تاوێرێکی لماوی پێك دێت. لە کاتی خۆرهەڵاتنو خۆر ئاوابووندا ڕەنگەکانی پرتەقاڵیو سوور بەسەر تیشکی خۆرەکەدا زاڵ دەبن. لەبەر ئەوەی ئەو گەردیلە تۆزاویانەی لە کەشدا هەن بڵاوە بە ڕەنگەکانی تر دەکەن. بۆ ڕەنگی گردەکە لە بەیانی و ئێوارەدا سوور یان پرتەقاڵی دێتە بەر چاو. لە نیوەڕۆدا، کە ڕەنگەکانی تر زاڵ دەبن لە ناو تیشکی خۆرەکەدا، ڕەنگی گردەکە دەگۆڕێت. لە کۆندا گەیشتن بەو گردە زۆر زەحمەت بو بەڵام ئێستا ڕێگاوبانی بۆ براوەو بو بە یەکێك لە شوێنە گەشتیارە سەرنج ڕاکێشەکان و حکومەتی ئوستورالیا باخچەی " ماونت ئۆڵگا" ی نیشتمانیی لەسەر ڕووبەری ٤٨٧ میلی دوجا. لە نزیك ئەم گردە دروست کردوەو ساڵانە هەزاران کەس سەردانی دەکەن.

## چۆن بۆن دەکەین؟

لوت ئەو ئەندامەیە کەبۆ بۆنکردن و هەناسە دان بەکاردەهێنرێت. ئەگەر بەشێوەیەکی گونجاو ئیشی نەکرد، ئەوا ناتوانین جیاوازی بکەین لە نێوان بۆنەکاندا.

## ئایا دەزانیت چۆن بۆن دەکەین؟

لوت بریتیە لە دوو ئێسك. کە دەکەوێتە نێوان هەردوو چاوەوە لەسەرو هەردو لێوەوە. ئەو دوو ئێسقانە جۆرێك لە پرد، دروست دەکەن. کە لە نێوانیاندا دیوارێکی کرکراگەیی هەیە. لوت دەکاتە دوو بەشەوە کە پێیان دەوترێت کونە لوت. لە کۆتایی هەر کونە لوتێکدا پەردەیەك هەیە پێی دەوترێت "پەردەی چڵمی" کە شلەیەکی تایبەت دەرژێنێت بۆ ئەوەی ناو لوت هەمیشە تەڕ بێت. لەناو لوتدا موو هەیە کە ناهێڵێت تۆز بچێتە ناو سیەکانەوە. ئەو هەوایەی کە لوت پاکژ دەکات لە ڕێگەی بۆریە هەواییەکانەوە دەچێ بۆ سیەکان. بۆنەکە خانە

گەلێك دەیدۆزێتەوە، کە لە کۆتایی کونە لوتدان و پێیان دەوترێ "وەرگرەکان". ناوچەیەك داگیر دەکەن کە پانتاییەکەی ۲٥٠ ملیمەتر دوجایە. کاتێك بۆنی شتێك دەکەین، ئەو گەردیلانەی لەو شتەوە دەردەچێت لە ڕێگەی هەردوو کونە لوتەوە دەگاتە ئەو ناوچە هەستیارە، کە دەبێتە هۆی دروست کردنی لێدانێکی کارەبایی، لەو ماسولکانەی لەوێدان. لێدانە کارەباییەکانیش دەگەنە "چەقی بۆنکردن" لە مێشك داو بەو جۆرە هەست بە بۆنکردن دەکەین. بەپێی یەکێك لە بیردۆەکان، لە لوتدا حەوت جۆر لە وەرگرەکان هەیە کە هەریەکەیان بۆنێکی جیاواز دەکات، ئەو حەوت بۆنەش "گوڵەکان، سووتان، ئاڵکوڵ، میوە، نەعنا، مسك و بۆنە تیژەکان". ئەو وروژاندنانەی ئەو بۆنانە دروست دەکات لە ڕێگەی لوتەوە دەچن بۆ خانەکانی مولولەکانی بۆنکردن و لێدانی کارەبایی بەرهەم دەهێنن. بەواتا نامەکان دەنێرن بۆ مێشك و بۆنەکە دەکات. کاتێك توشی هەڵامەت دەبین، ئەو خانە هەستیارانەن دادەپۆشرێن بۆیە ناتوانن هیچ بۆنێك بکەن. مرۆڤ بە بەراوورد لەگەڵ ئاژەڵاندا کەمتر توانای بۆن کردنی هەیە.

## کام وڵاتە لە جیهاندا زۆرترین کاتژمێر دروست دەکات؟

لە سەرەتاکانی دروست کردنی کاتژمێردا. هیچ وڵاتێك پێشەنگ نەبوو لە بەرهەم هێنانی کاتژمێری دیوارو دەست و گیرفاندا، کارگەرانی کاتژمێر دروستکردنی لە وڵاتێکەوە دەچوون بۆ وڵاتێکی ترو بەوەش پیشەسازی کاتژمێریش بوو بە بازرگانیەکی نێودەوڵەتی. بەڵام هەر زوو چەندین وڵاتێکی دیاریکراو بوون بە پسپۆڕ لە دروستکردنی چەندین جۆری جیاوازی کاتژمێردا. بۆ نموونە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەریتانیاو تا ئێستاش بەناوبانگە لە دروستکردنی "کرۆنۆمیتر" دا کە ئامێرێکی ووردە بۆ پێوانە کردنی کات بەکاردەهێنرێت لە کەشتیەکاندا. کە بریتیە لە چەند کاتژمێرێکی گەورە. لەناو شوێنێکی سێگۆشەدا دانراوە، لەسەر ڕێك وەستانی کەشتیەکە لەسەر ئاوی دەریا هەڵچووەکان. هەروەها بەریتانیا تایبەتمەندە لە دروستکردنی کاتژمێری زەنگ داری زۆر گەورەدا. ناوچەیەك هەیە لە ئەڵمانیا کە تەنها کاتژمێری سەر دیوار دروست دەکات. ئەمانە باشترین کاتژمێر نین. بەڵام دارەکەی زۆر جوان و سەرنج

ڕاکێشە لە دارستانە ڕەشەکەی ئەڵمانیاوە دەهێنرێت. هەروەها لە ئەڵمانیادا هەندێك دار دروست دەکرێت بە زێڕ نەخشێنراوە. بەڵام کاتژمێری سویسری پیشەسازیەکی نیشتمانی زۆر گرنگە بۆ ئابووری سویسرا. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە، سویسریەکان لە ڕیزی یەکەمەوە لە بەرهەم هێنانی کاتژمێردا، بەتایبەتی کاتژمێری دەستی. سویسریەکان پسپۆڕن لە دروستکردنی کاتژمێری زۆر چاك و بچووك دا. دەتوانین بڵێین سویسرا تەنها وڵاتێکە پسپۆڕی خۆی لەم بوارەدا وەرگرتووە. بەڵام پیشەسازی کاتژمێری ئەمریکی زیاتر، لە دروستکردنی کاتژمێری ئەلکترۆنی و کاتژمێری ئۆتۆمبێلەکان و کاتژمێرە هەرزانەکاندایە هەروەها کۆمپانیاکانی کاتژمێر لە ئەمریکادا، کاتژمێر لە وڵاتانی وەکو سویسراو ئەڵمانیاو یابان و فەرەنساوە دەهێنن و لە ئەمریکادا دەیبەستن.

## خۆڵ

ئەگەر خۆڵ سەر زەوی دانەپۆشیایە مرۆڤایەتی لەناودەچوو ئەگەر خۆڵ نەبوایە ڕووەکێك نەدەڕواو بەوەش مرۆڤ و ئاژەڵەکانی تر هیچ خۆراکێکیان دەست نەدەکەوت. خۆڵ ئەو وشکیە هاڕاوەو شێیەیە ڕووەکەکان تیایدا دەڕوێن. کە لە پارچەی زۆر بچووکی بەردو ڕووەکی ڕزیوو مەوادی ئاژەڵی پێك دێت. ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو پارچە بچووکانی بەشێك بوونە لە بەردێکی گەورەو مەوادە ڕووەکیو ئاژەڵیەکانیش لە لاشەی ئاژەڵ و ڕووەکەکانەوە هاتوون. هیچ بەردێکی ڕەق نیە. نەڕزێت و شیتەڵ بوون و ڕزانی بەردەکان پێیان دەوترێ "بە کەش بوون" واتە شیتەڵ بوونی بەردی سروشتیو کیمیاوی لە ئەنجامی کاریگەریەکانی کەش و هەوادا. ئەمەش بە چەند ڕێگەیەك و بە درێژایی چەندین هەزار ساڵدا ڕوو دەدات. ڕووارە بەفراویەکانیش لەبەردەمی خۆیانەوە، چەندین کۆمەڵە بەرد پاڵ دەنێنن، ئەو پاڵنانەش یارمەتی شیتەڵ بوونی بەردەکان دەدات. مەوادە کیمیاویەکانی ناو ئاویش شیتەڵ و فشۆڵی هەندێ لە بەردەکان دەکەن. هەروەها گۆڕانکاری لە پلەی گەرمادا یارمەتی ڕزینی بەردەکان دەدا بۆ پارچەی بچووك بچووك. گەرم بوون و سارد بوونەوەی بەردەکان دەبێتە هۆی درز تێکەوتنیان، چونکە ئاو دەچێتە درزەکان و لە زستاندا دەیبەستێت و درزەکان گەورە تر دەکاتەوە. تەنانەت ڕەگی

ڕووەکەکانیش دەبنە هۆی شیتەڵ بوونی بەردەکان. هەندێك جار تۆوی دارەکان دەکەونە درزەکانەوە سەوز دەبن و دەبن و دەبنە ڕیشك. ئەمەش ڕۆڵی خۆی هەیە لە شیتەڵ کردنی بەردەکاندا. هەروەها (با) ش یارمەتی شیتەڵ کردنی بەردەکان دەدات، کاتێك لەگەڵ خۆیدا لم هەڵدەگرێت و بە بەردەکانیدا دەدات. بەڵام هەموو ئەمانە لە سەرەتای دروست کردنی خۆڵ زیاتر نیە. بۆ ئەوەی خۆڵی ڕاستەقینەمان دەست بکەوێت، دەبێت پەیینی تێکەڵ بکەین. لاشەی هەریەك لە گیاندارە مردوەکانی وشکانی لە ڕێگەی بەکتریاوە دەبێتە بەشێك لە خۆڵەکە. بەکتریا وا دەکات لە ڕوەك و گیاندارەکان بڕزێن و وابکەن لە خۆڵ زیاتر بە پیت بێت. وەکو چۆن کرمی زەوی چەندین جۆری تر لە مێرووەکان یارمەتی دەوڵەمەند بوونی خۆڵ دەدەن. دەوڵەمەنترین چینی خۆڵ، چینی سەرەوەیە، کە زۆرترین ڕێژەی پەیینی تێدایە. چینی ژێر ئەوە پێی دەوترێ "ژێر خۆڵ" کە زۆرترین ڕێژەی بەردی تێدایە.

## جیاوازی ڕەنگی پێستی مرۆڤەکان

ڕەنگی پێستی مرۆڤەکان، یەك ڕەنگ نین. مرۆڤەکانی باکوری ئەوروپا ڕەنگی پێستیان سپی‌یە. لە ئەفریقیاشدا خەڵکی پێستیان ڕەشە. خەڵکی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش پێستیان زەردە.

## ئایا دەزانن لەبەرچی ڕەنگی پێستی مرۆڤەکان جیاوازن؟

بە شێوەیەکی سەرەکی پێست، لەسەر سێ "ڕەنگ" دەوەستێت. کە لە لەشی مرۆڤدا هەیە. یەکەمینی ئەو ڕەنگانە پێی دەوترێت "ڤیتامین" کە ماددەیەکی قاوەییەو ئەگەر خەست ببێتەوە ڕەش دەنوێنێت. بۆیاخی دووەم پێی دەوترێت کارۆتین یان جەزرین، کە ڕەنگەکەی پرتەقاڵی یان سورە. سێیەمیش پێی دەوترێت "هیمۆگلۆبین" کە ڕەنگی سوری خوێنە. لە نەبوونی ئەم ڕەنگانەدا ڕەنگی پێست دەبێت و هەندێك زەردی کاڵی تێکەڵ دەبێت. بەڵام تێکەڵ بوونی ئەو سێ ڕەنگە بە ڕێژەی جیاواز ڕەنگی جۆراوجۆر دەداتە پێست. ئەو کەسانەی ماددەی ڤیتامین لە لەشیاندا زیاتر بێت، ڕەنگی پێستیان ڕەش دەبێت، ئەو

کەسانەش هەڵگری ڕەنگی "جەزرین" بن ڕەنگی پێستیان زەرد دەبێت. کاتێك لاشەی مرۆڤ، تیشکی سەرو وەنەوشەیی زۆر لێی بدات، "ڤیتامین" زیاتر دەرژێنێت. لەبەرئەوە دەبینین ئەو کەسانەی لە ناوچە ئیستیوائیەکاندا دەژین زۆر ڕەشن. بەڵام ئەو کەسانەی لە وڵاتە ساردەکاندا ئیش دەکەن پێستیان سپیە. چونکە پێست کەمترین ڤیتامینی تێدا بەرهەم دێت. کەمبوونی ئەم ڕەنگانە لە لەشدا دەبێتە هۆی دەرکەوتنی پەڵە لەسەر لاشە.

## ئایا هەموو ماسیەکان هێلکە دەکەن؟

زۆربەی ماسیەکان هێلکە دادەنێن و هێلکەکانیش لە دەرەوەی لاشەی ماسیەکەدا دەگیرسێن، ئەو ماسیانەی هێلکە دادەنێن. پێیان دەوترێت هێلکەکەرەکان. ئەوانەشیان دەزێن پێیان دەوترێت، بەچکەکەرەکان. لەو ماسیانەی بەچکە دەکەن ماسی "سەرتیلی" یە. کە ماسیەکی ئەمریکی بچوکە. ماسی "مۆلینیزی" ماسیەکی جوانی ڕەنگاو ڕەنگە. کە گیرسان لەناو لاشەی مێیەکاندا دەبێت. هەندێك لە ماسیەکان دوای ٢١ ڕۆژ لە گیرسان دەزێن. ژمارەی ئەو هێلکانەی دادەنرێت، لە ماسیەکەوە بۆ ماسیەکی تر دەگۆڕێت. هەندێك لە ماسیەکان کە هێلکەکانیان دادەنێن بەجێی دێڵن و هیچ گرنگیەکی پێ نادەن. ئەو جۆرە ماسیانەش ژمارەیەکی یەکجار زۆر گەرا دادەنێن. بەڵام ئەو ماسیانەی کە گرنگی بە بەچکەکانیان دەدەن ڕێژەیەکی کەمتر لە هێلکە دادەنێن. ماسیەکان دوو جۆر هێلکە دادەنێن، جۆرێکیان دەکەونە سەر ئاو، جۆرەکەی تریش دەکەونە ژێر ئاو. ئەو هێلکانەی دەکەونە سەر ئاو پێیان دەوترێت، هێلکەی "ئۆقیانوسی" کە عادەتەن هێلکەیەکی بچوکی سپی شەفافن و زەردێنەی زۆریان تێدا نیە. ئەو هێلکانەش دەکەونە بن ئاوەوە پێیان دەوترێت هێلکەی "ژێر ئاو". کە هێلکەی ئۆقیانوسی قورسترەو زەردێنەی زیاترە. ماسی ڕنگە Herring کە لە ڕەگەزی سەردینە، هێلکەی ژێر ئاوی دادەنێت و هیچ گرنگیەکی ناداتێو بیست بۆ چل هەزار هێلکە دادەنێت. بەڵام ماسی قەد کە لە ماسیەکانی باکوری ئەتڵەسیە هێلکەی ئۆقیانوسی دادەنێت و دەشێت نزیکەی یەك ملیۆن هێلکە دابنێت. ماسی سەقمەریش لە وەرزێکدا نزیکەی ٤٠٠ بۆ ٥٠٠ هەزار هێلکە دادەنێت. بەڵام

هەرجارەو پەنجا هەزار. ماسی "هالبوت" کە گەورەترین پانە ماسیە دەشێت لە دوو ملیۆن هێلکە زیاتر دابنێت. هێلکەکان لە قەبارەدا جیاوازن، هێلکەی ماسی ڕنگە تیرەکەی یەك ملیمەترە. بەڵام تیرەی ماسی قەد یەك و نیو ملیمە. لە کاتێکدا تیرەی هێلکەی ماسی هالبوت سێ ملیمە. ئەو هێلکانەی زیاتر چاودێری دەکرێن، هەلی زیاتریان لەبەر دەستدایە بۆ مانەوە لە ژیاندا. بەڵام گیاندارانی تر ملیۆنەها ملیۆن لە هێلکەی ماسیەکان دەخۆن.

## خوێندنەوەی بەخت

باوەڕی خەڵکی بە بەختی مرۆڤ لەگەڵ خوێندنەوەی هێڵەکانی ناو دەستدا سەری هەڵداوە. پێشی نزیکەی ٢٥٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا لە هنددا. لەوێشەوە بە وڵاتانی تردا بڵاو بۆتەوە. لە سەرەتادا خوێندنەوەی بەخت گرنگیەکی زۆری بە هێڵەکانی سنگی پێ دەدا، بەڵام سەیریان کرد خوێندنەوەی ناو لەپ ئاسانترە. هونەری خوێندنەوەی ناو لەپ لەگەڵ خوێندنەوەی کەسایەتی مرۆڤ و داهاتووی بە تەفسیری هێڵەکانی ناو لەپی دەستی پێ کرد. پرسیار لێرەدا ئەمەیە: ئایا خوێندنەوەی بەخت لە داهاتو ئاگادارمان دەکاتەوە؟ سەرەڕای نەبوونی هیچ بنەمایەکی زانستی بۆ زانینی دوا ڕۆژ لە هێڵەکانی دەستدا، بەڵام دەستی مرۆڤ ئەو پیشەیە پیشان دەدات کە مرۆڤ دەیکات لەگەڵ خوو ڕەوشت و میزاج و گرنگی دان و کەسایەتی‌یدا. تاڵە گرە کۆنەکان دەڵێن هێڵی سەرەوە پەیوەندی بە دڵەوە هەیەو توانای خۆشەویستی دەردەخات. ئەو هێڵەی ڕاستەوخۆ لە ژێریدایە، پەیوەندی بە مێشکەوە هەیەو پێی دەوترێت هێڵی سەر. بەڵام هێڵی قەدەر هەردو ئەو هێڵە دەبڕێت کە باسمان کرد. وایان داناوە هێڵی چەماوەی ژێری هێڵی سەر هێڵی ژیانە. درێژیەکەشی ئاماژە بە درێژی تەمەنی مرۆڤ دەکات. هەروەها چەندین هێڵی تر زۆر کە دەلالەت لە لایەنە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤ دەکەن. لە کۆن دا بەخت چۆن خوێندراوەتەوە ئێستاش بە هەمان ڕێگە دەخوێنرێتەوە. ئەو پێشبینیانەی کە بە خوێندنەوەی بەخت دەکرێت هیچ بنەمایەکیان نیەو نابێت بڕوایان پێ بکەین، بۆیە ئەگەر ڕاستیشیان کرد هەر درۆیان کردووە.

## ئەسپێ چییە؟

هەزار جۆر مێرو هەیە کە پێیان دەوترێت "ئەسپێ" بەڵام ئەو ئەسپێیەی لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە دەچێتە لاشەی مرۆڤەوە. ئەسپێ گیاندارێکی مشەخۆرەو زۆر پیسەو خوێن دەمژێت. خواردنیشی خوێنی مرۆڤە. لە مەملەکەتی گیانداران پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا لە هەموو گیاندارانی تر زیاترە، چونکە لە هەموو قۆناغەکانی تەمەنیدا لەسەر لاشەی مرۆڤ دەژێت. هەر لە گەرا دانانەوە لەسەر جل و بەرگی مرۆڤ تا گەورە بوون. لە ڕێگەی جل و بەرگ لەبەرکردنەوە یان خەوتن لەسەر ئەو جێگایانەی ئەسپێیان تێدایە، ئەسپێ دەگوێزرێتەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر. ئەوەی زانراوە ئەسپێ نەخۆشی تای تیفۆس دەگوێزێتەوە. جۆرێکی تر لە ئەسپێ هەیە هێرش دەکاتە سەر مرۆڤ و لەناو قژو ئەبرۆو ئەندامەکانی تری لەشیدا دەمێنێتەوە. دەتوانین بە ڕژاندنی دەرمانی D. D. T زاڵ بینە سەر ئەسپێدا. بەڵام ئەوەی سەیرە لە دونیای ئەسپێدا، جۆری وایان هەیە دەتوانێت هێرش بکاتە سەر گیانلەبەرانی تر. هەشیانە لەسەر باڵندەو مەمکدارەکانی تر دەژێت. هەشیانە لەسەر مێروو هەشیانە لەسەر شیلەی گوڵ دەژێت.

## ئەو ئەندامانەی لەشی مرۆڤ کامانەن کە ناتوانرێت بگۆڕدرێت؟

لە ئەنجامی نەخۆشیەك یان ڕووداوێك، کە ئەندامێك یان ڕیشاڵێك لە لەشی مرۆڤ لەناو دەچێت. پزیشکەکان هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی "چاندن" ەوە بیگۆڕن. بە گواستنەوەی ئەو ئەندام و ڕیشاڵە، لە شوێنێکی تری لاشەی خودی نەخۆشەکەوە یان لە کەسێکی ترەوە بۆی. ئەگەر کەسێك توشی سوتانێکی زۆر بوو بوە هۆی لەناوچوونی زۆرێك لە خانەکانی لەشی ئەوا چاندنی پێست شتێکی پێویست دەبێت بۆی. بۆ ئەو مەبەستە پارچەیەکی بچووك لە پێست وەردەگیرێت لە شوێنێکەوە کە نەسووتابێت یان لە لاشەی کەسێکی ترەوە. ئەگەر لاشەی کەسە سووتاوەکە ئەو پێستەیەی وەرگرت کە بۆی دادەنرێت. ئەوا خانەکانی پێستە

دابەش دەبێت و پێستەکە سەر لە نوێ دروست دەبێتەوە. بەلآم کێشەی ڕاستەقینە لەوەوە دەست پێ دەکات، ئەگەر لاشەی قوربانیەکە پێستە تازەکە قبوڵ نەکات. زۆربەی لاشەکان بە خێرایی ئەو ڕیشاڵانە قبوڵ ناکەن کە بۆیان دادەنرێت. بەلآم چاندنی پێست لە ئەمڕۆدا بۆتە شتێکی ڕۆتینی لە نەشتەرگەری پزیشکیدا. هەندێك جار گورچیلەکان کە خراپ دەبن، تەنها چارەسەریان ئەوەیە کە بگۆڕدرێن ئەوانەی گورچیلە دەبەخشن دەتوانن دەست لە گورچیلەیەکی خۆیان هەڵگرن، چونکە مرۆڤ دەتوانێت بە یەك گورچیلەوە بژێت. نەشتەرگەری گورچیلە چاندن ئەمڕۆ شتێکی هێندە گران نیە. ئەگەر لاشەی کەسی نەخۆش، ئەو گورچیلەیەی بۆی دادەنرێت وەربگرێت. ئەوا لە مردن ڕزگاری دەبێت. بە هەندێك نەخۆشی دڵیش خراپ دەبێت، بەلآم بە هیچ جۆرێك دڵ نەشتەرگەری بۆ ناکرێت و تەنها چارەسەر گۆڕینیەتی. چونکە هەر مرۆڤێك یەك دڵی هەیە، بۆیە بەخشینی شتێکی نامومکینە، بەلآم دەشێت دڵی کەسێکی تازە مردو بگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر، تا ئێستا چەندین تاقیکردنەوەی لەو جۆرە کراوە لە سەرانسەری جیهاندا. یەکەم نەشتەرگەری سەرکەوتوو بۆ چاندنی دڵ. پزیشکێکی باشوری ئەفریقیا کردی بەناوی "کریستیان ئان بارنارد" لە ٣ کانونی یەکەمی ١٩٦٧ دا بۆ پیاوێکی تەمەنە ٥٥ ساڵ. جگە لەوانەی باسمان کرد نەشتەرگەری سەرکەوتوو بۆچاندنی ئێسك و سی و جگەرو ئەندامانی تری لەشی مرۆڤ کراوە. گرنگترین شت لە گواستنەوەی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ دا ئەوەیە کە لاشەی مرۆڤەکە، ئەو ئەندامە قبوڵ بکات کە بۆی دەیگوێزنەوە. لەبەر ئەو هۆیە دوای دوای چەند مانگ یان چەند ساڵێك، نەشتەرگەری گواستنەوەی ئەندامان و چاندنی ناسەرکەوتوو دەبن، ئەگەر قبوڵی نەکرد. دەرمانی زۆر لەگەڵ تیشکی ئێکس بەکاردەهێنرێت بۆ پیس نەبوونی ئەو ئەندامە کە دەگوێزرێتەوە. ئەگەر ئەندامەکە لە لەشی خودی مرۆڤەکە یان جومگەوە بگوێزرێتەوە، کەمترین ئەگەری پیس بوونی هەیەو بەگشتی نەشتەرگەری سەرکەوتووی لێ دەکەوێتەوە.

## گازی ئەمۆنیا (نەوشاتر)

گازی ئەمۆنیا تێکەڵەیەکە کە لە نایترۆجین. گەردیلەیەك لە نایترۆجین کاتێك لەگەڵ سێ گەردیلە هایدرۆجین یەکدەگرێت. یەك گەردیلە ئەمۆنیا پێك دەهێنن. گازی ئەمۆنیا ڕەنگی نیەو بۆنێکی زۆر تیژی هەیە. دەتوانرێت بە فشار یان سارد کردنەوە لە ٣٢ پلەی سەدیدا شل بکرێتەوە. زۆر بە جوانی لە ئاودا دەتوێتەوە. لە فشارو پلەی گەرمای ئاساییدا، دەتوانرێت ٧٠٠ قەبارە لە ئەمۆنیا لە یەك قەبارە لە ئاودا بتوێنرێتەوە. توانەوەی لە ئاودا تونی دروست دەکات و پێی دەوترێت هایدرۆکسیدی ئەمۆنیۆم. چەندین ڕێگە هەیە بۆ دەست خستنی گازی ئەمۆنیا. لە تاقیگەدا، بە گەرمکردنی تێکەڵەیەك لە کلۆرایدی ئەمۆنیۆم و قسڵ، گازی نەوشاترمان دەست دەکەوێت. بەڵام زۆرترین ڕێژەی بە کارلێکی کیمیاوی لە نێوان هایدرۆجین و نایترۆجین دا دروست دەکرێت. ئەم ڕێگەیە پێی دەوترێت "کرداری هابر" یان "ڕێگەی هابر" بەپێی ئەم کردارە یەك گەردیلە لە نایترۆجین لەگەڵ سێ گەردیلە هایدرۆجین دەخرێنە ژێر فشارێکی ٥٠٠ پلەییەوە. لەگەڵ بوونی ئاسندا کە وەکو یارمەتی دەرێك بەکاردەهێنرێت. دەشێت بە دڵۆپاندنی خەڵوز بۆ خەڵوزی کوك و گازی خەڵوز ئەمۆنیامان دەست بکەوێت. گازی نەوشادر بۆ مرۆڤ زۆر بەسوودە. لە پیشەسازی زۆر لە پێکهاتە کیمیاویەکاندا بەکاردەهێنرێت. لە پیشەسازی زۆر لە پێکهاتە کیمیاویەکاندا بەکاردەهێنرێت، هەروەها لە پیشەسازی تێزابیشدا، کە لە شیتەڵ کردنی زۆر لە خانە وشکەکاندا بەکاردەهێنرێت، لەگەڵ پیشەسازی بۆیاخ و چاپکردنیشدا. سلفاتی ئەمۆنیۆم پێکهاتەیەکی گرنگە لە پێکهاتەکانی ئەمۆنیا، چونکە لە ئەمۆنیاو ترشی گۆگردیك دروست دەکرێت و وەکو پەیین بەکاردەهێنرێت چونکە نایترۆجین دەداتە زەوی. نیتراتی ئەمۆنیۆم لە پەیینی کشت وکاڵی و تەقینەوەکان و پیشەسازی ئۆکسیدی نیترۆزدا بەکاردەهێنرێت کە هەندێك جار بە "گازی پێکەنین" ناو دەبرێت. ئەمۆنیا وەکو پاك کەرەوە لە ماڵاندا بەکاردەهێنرێت. چونکە شلەیەکی گازی زۆر بەهێزە لە ئاودا. سەردەمانێك ئەمۆنیا بۆ ساردکردنەوەی ڕیشاڵە دەستکردەکان بەکاردەهێنرا.

## گەورەترین و بچوکترین گوڵ لە جیهاندا؟

لە دونیای سروشت دا جۆرەها گوڵ دەبینین. هەرچی گوڵێك تۆ بیری لێ دەکەیتەوەو بە خەیاڵدا دێت لە دونیادا هەیە. هەندێکیان هێندە جوانن یەکسەر سەرنجت ڕادەکێشێت و هەندێکی تریان لە مێروو ئاژەڵان دەچن. زۆربەی گوڵەکان بۆنیان خۆشە. بەڵام گوڵەکان تەنها بۆ جوانی نین. بەڵکو بەرێکی زۆر بە سوودمان دەدەنێ. بە کرداری پەڕاندن تۆو بەر، بەرهەم دەهێنێت، تۆویش بەرپرسە لە بەردەوامی جۆرەکانی گوڵ. ئەمە لە دونیای گوڵە گەورەکاندا. ئایا دەزانن گەورەترین و بچوکترین گوڵ کامەن؟ گەورەترین گوڵ لە دونیادا گوڵی "ڕافلسیا" یە Rafflesia Arnoldi کە لە دارستانەکانی سۆمگرەدا هەیەو تیرەکەی لە یەك مەتر زیاترە. ئەستوریەکەشی نزیکەی ٣ بۆ ٤ ئینجەو نزیکەی ١١ کیلۆ قورسەو لە پێنج ڕۆژ بۆ حەوت ڕۆژ گوڵ دەگرێت و ڕەنگی گوڵەکەی سور یان پرتەقاڵی یان قاوەییە. بۆنێکی ناخۆشی هەیەو ئەو مێروانەی بە دارستانەکاندا دەفڕن بۆ خۆی ڕادەکێشێت. ڕافلسیا ڕوەکێکی مشەخۆرەو لەسەر دارەکانی تر دەژێت و هیچ گەڵایەکی پێوە نیە. بەڵام بچوکترین گوڵ. گوڵی "وۆلف"ە (نسبەتە بۆ دۆزەرەوەکەی، زانای توێکاری ئەڵمانی کاسبار فەردەیەك وۆلف کە لە ساڵی ١٧٩٤ دا مردوە) وۆلف گوڵێکی ئاوی گەڵادارە. درێژیەکەی لە حەوت لەسەر دەی میلیمەترێك درێژ تر نیە. بەڵام بچوکترین گوڵ لە تیرەدا گوڵی پیلیا Pilea یە کە لە ڕۆژئاوای هنددا هەیەو تیرەکەی ٠,٣٥ میلیمەترە. زۆر گوڵی تری زۆر جوان و دەگمەن هەن. بۆ نموونە گوڵێك هەیە ناوی "ئەزریون"ە. ڕەنگەکەی سپیەو دەگمەنترین گوڵە. بەڵام خاوترین گوڵ لە سەوز بووندا گوڵی پۆیۆ Puyu یە. کە دوای وەشاندنی بە ١٥٠ ساڵ سەوز دەبێت. لە ڕوەکە خاوەکانی تر گوڵی "ئاغاق"ی ئەمریکیە. کە جۆرێکە لە سۆبێرو دوای ٤٠ ساڵ لە وەشاندنی سەوز دەبێت. چەندین شێوازی تری سەیرو نامۆ هەیە لە گوڵدا.

## مێشولەکان لە زستاندا بۆکوێ دەچن؟

لەزستانداو لەناوچە ساردەکاندا یەك مێشولەو مەگەزنابینین. بەڵام لەگەڵ

ئەوەشدا، دەشێت. هەرمێشولە. لەوشوێنانەدا هەبێت. مێشولە بەشی یەکەمی ژیانی لە ئاوداو باقی ژیانیشی لەسەر وشکانی و هەوادا دەباتە سەر. ژیانی مێشولە، لەوێوە دەست پێ دەکات کە مێشولە هێلکۆکەکانی لە ئاوە وەستاوەکاندا دادەنێت و هەرزوو پرگەکانی (الیرقان) ئەم هێلکۆکانە دەتروکێن و دەست بە مەلەوانی دەکەن بە دەوری خۆیاندا، بۆ گەڕان بە دوای خۆراکدا. بە تێپەڕبوونی کات پرگەکان دەگۆڕێن بۆ "خادرە" ئەنجا هەموو خادرەیەکیش گەشە دەکات بۆ ئەوەی ببێتە مێروویەکی تەواو بفڕێت. ئەم هەموو قۆناغە لە هێلکەیەکەوە بۆ مێشولەیەکی کامڵ نۆ ڕۆژ بۆ چواردە ڕۆژ دەخایەنێت کە زستان دێت. هێلکۆکەکان لە شوێنی خۆیاندا خپ دەکەن و ناتروکێن و تەنانەت مێینە ئاوسەکانیش دەچنە جۆرێك لە خەفتانەوە بۆیە بەو جۆرە لە زستاندا مێروەکە چ کامڵ بێت یان هێلکە بێت یان پرگە بێت یان خادرە بە نووستوویی بە سەری دەبات. لە ڕاستیە تاڵەکان لەسەر مێشولە، ئەوەیە. لەناوچە ساردەکانی ئەوپەڕی باکور وەکو: کەنەدا و ئەلاسکاو سیبیریا. زۆر زیان بەخش ترن وەك لەناوچە گەرمەکان. هۆیەکەشی ئەوەیە. هێلکۆکەی مێشولە دەتوانێت بە درێژایی زستان لەناو بەفردا بژێت. کاتێك بەفرەکە دەتوێتەوەو گەرما دادێت، هێلکەکان سوپایەك لە مێشولەی گەورە دروست دەکەن. باسێك هەیە کە گوایە لە زۆری ئەو مێشولانە، لەو ناوچانەدا هەندێك کەس شێت بوونە! ئەو مەترسیەی مێشولە بۆ مرۆڤ دروستی دەکات تەنها لە چاڕس کردنەکەیدا نیە. بەڵکو نەخۆشی لە نێوان خەڵکیدا دەگوێزرێتەوە. کە نەخۆشێك دەگەزێت و دوای ئەوە لەش ساغێك دەگەزێك، میکرۆب و ڤایرۆسی، کەسە نەخۆشەکە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسە لەش ساغەکە. بەهۆی مژینی خوێنەکەیەوە.

## ئایا دەتوانرێت سوود لە گەرمای ژێر زەوی وەربگیرێت؟

وەکو دەزانین زەوی هێلکەییە، ئەگەر لەسەر زەویەوە چاڵێك هەڵکەنین. دەبینین هەرچەندە قوڵتری کەین پلەی گەرما، بەرزتر دەبێتەوە، لە ڕاستیدا قوڵایی زەوی زۆر گەرمە. بەگوێرەی ئەو وزە زۆرەی لە کاتی تەقینەوە گڕکانیەکاندا دێنە دەرەوە. دەتوانین تەسەوری پلەی گەرمای ژێر زەوی بکەین. لە دەورووبەری ساڵی

١٨٠٠ دا چەند زانایەكی ئیتالّی هەستان بە چەند تاقیكردنەوەیەكی تایبەت بۆ سوود وەرگرتن لە گەرمای ژێر زەوی. كونێكیان هەڵكەند لە زەویدا هەڵم و گەرمی و گازاتی لێ هاتە دەرەوە. ئەو كەلێنە گازیە هێمایەك بوو بۆ جموجوڵی گڕكانی كە لەژێر زەویدا ڕوو دەدات. ئەو گازانەی كە لێی دەهاتنە دەرەوە سەرچاوەكەی كەلێنە بەردەكان بوون ە قولایی بیست بۆ هەشتا هەزار مەتر یان زیاترەوە. بۆ دەرهێنانی ئەو مەوادە كیمیاویانە اە ساڵی ١٨١٨ دا كارگەیەك دروست كرا. دوای ئەوە دەركەوت كە دەتوانرێت هێزی ئەو گازانە كپ بكرێنەوەو بۆ مەبەستی تر وەكو بەرهەمی هێنانی كارەبا. بۆ یەكەمجار، بە گەرمای ژێر زەوی لە لاندا ریلۆی ئیتالّیا لە ساڵی ١٩٠٤دا كارەبا بەرهەم هێنرا. بە چوار ڕێگا دەتوانرێت گەرمای ژێر زەوی بۆ بەرهەم هێنانی وزەی كارەبا بەكاربهێنرێت:

یەكەم: ڕێگەی هەڵمی وشك. وەكو لە لانداریلۆدا كرا.

دووەم: ڕێگەی ئاوی گەرم وەكو لە ریكیا ڤیكی ئیسلاندا كرا.

سێیەم: ڕێگەی ناوچە تەوورژم بەرزەكان كە لە كاتی گەڕان بە دوای نەوت دا دۆزرایەوە.

چوارەم: لەم ساڵانەی دوایشدا زانایان توانای خۆیانیان چڕ كردۆتەوە بۆ سوود وەرگرتن لە گەرمای ژێر زەوی و هەوڵیان داوە، ئامێرێك دروست بكەن كە سوود لە وزەی جیۆ گەرمایی زەوی وەربگرێت.

## دەریاكانی مانگ

كاتێك بە چاو سەیری مانگ دەكەین دەبینین هەندێك ناوچەی تاریكی تێدایە زانا گەردوون ناسە سەرەتاییەكان، بڕوایان وابوو، ئەو شوێنە تاریكانە لەسەر ڕووی مانگدا. وەكو دەریاكانی ڕوی زەوی بە ئاو داپۆشراوە. گالیلۆ یەكەم كەس بوو، بەهۆی تەلیسكۆبەكەیەوە، لە ساڵی ١٦٠٩دا لێكۆڵینەوەی لەسەر ئەو شوێنانە كردو گەیشتە ئەو ئەنجامەی كە ئەو شوێنانە بە ئاو داپۆشراون، لەبەرئەوە ناوی لێنا "دەریاكانی مانگ" هەروەها گالیلۆ لێكۆڵینەوەی لەسەر هەندێك ناوچەی دەشتایی ڕووناك كرد لەسەر ڕووی مانگدا. بۆی دەركەوت كە بەرزایین. بەرزترین شاخ لەسەر ڕووی مانگ بەرزیەكەی دەگاتە نزیكەی ١٠٠٠٠ مەتر، واتە بەرزتر لە

شاخی ئەڤەرستی سەر زەوی. لە سەدەکانی دواترداو لەگەڵ دروست کردنی تەلیسکۆبی باشتردا، دەرکەوت کە دەریاکانی مانگ دەریا نین. بەڵکو حەوزی دەشتی نەوت ڕوتن. بەلاّم ناویان هەر بە دەریاکان مایەوەو زانایانی گەردوون ناسیش ناوی "ماریا" Maria یان لە ناوچە تاریکەکان نا. ئەوەی کە نامۆیە ماریای فراوان لە لای دوری مانگەوە بوونی نیە. دەتوانین بڵێین بەشی زۆری بە شاخ داپۆشراوە. دەتوانین دەریاکان بکەینە دوو جۆرەوە: جۆرێکیان شێوەی بازنەییە. جۆرەکەی تری هێڵی چێوەکەی ناڕێکە. دەریا بازنەییەکان بە شێوەیەکی گشتی شاخ دەورەی داون. لەوانە "دەریای ئەزمات" لە دیوی نزیکی مانگەوە. وە دەریای "مۆسکۆ" لە دیوی دووری مانگەوە. لە دەریا ناڕێکەکانیش "دەریای زریانەکان" دەریاکانی مانگ و ڕێژەوی قەقنەسە گڕکانیە یەك لە دوای یەکەکان، ڕەنگە لە ئەنجامی لێکدانی پرشە ئاگرە زەبەلاحە زۆر خێراکانی سەر ڕووی مانگەوە دروست بووبێت.

## دەریاچەکان چۆن دروست بوون؟

دەریاچەکان ئەو قەبارە ئاوەن، کە شوێنە نزمەکانی سەر ڕشوی زەوی پڕ دەکەن. ئەو نزماییانەش پێیان دەوترێت حەوزەکان. دەریاچەکان لە ئەنجامی هاتنی ئاو بۆ ناوچە نزماییەکان دروست دەبن. سەرچاوەی ئاوی دەریاچەکان تا ئەندازەیەکی زۆر باران و بەفری تواوەیە. لە ڕێگەی ڕووبارو جۆگەلەو سەرچاوە ژێر زەمینیەو ئاوی دەشتەکانەوە، دەچنە ناو ئەو حەوزانەوە. بەلاّم حەوزی خودی دەریاچەکان بە چەند ڕێگەیەك دروست دەبێت، زۆرێك لە دەریاچەکان لە ئەنجامی شکان و لەیەك ئالاّن، لە توێکڵی زەویدا دروست دەبێت. دەریاچەی "لیك سۆپیرێر" لە ئەمریکای باکوردا بەو جۆرە دروست بووە. حەوزی دەریاچەکان هەندێك جار لە ئەنجامی ڕوودانی گڕکانەوە دروست دەبن کاتێك کە، گڕکان لە یەکێك لە شێوەکاندا ڕوو دەدات، حەوزی دەریاچەیەکی تازە دروست دەکات. هەندێك جاری تریش چاڵی گڕکانێکی دامرکاو پڕ دەبێت لە ئاو. وەکو دەریاچەی "کراتیر لیك" لە باشوری ویلایەتی ئاریگۆنی ئەمریکادا، کە بەم شێوەیە دروست بووە. زۆرێك لە دەریاچەکان، لە ئەنجامی توانەوەی بەفرەکاندا، حەوزەکانیان پڕ

له ئاو بوونه. هەریەك له "دەریاچه گەورەکان" جگه له "لیك سوبریر" له ولآته یەکگرتووەکان و دەریاچەی "لیگ وینیبیغ" له کەنەدا بەو جۆره دروست بوو، دوای ئەوەی که ڕووباره بەفراویەکان حەوزیان بۆ دروست کرد لەسەر ڕووی زەویدا. هەندێك جار شەپۆلەکان و ڕەوته ئاویەکانی لێوارەکان، له کەنارەکاندا کەنداو گەلێك دادەخەن. بەوەش دەریاچەی کاتی دروست دەکەن. هەندێك جاری تریش ئاوی ڕووبارەکان زۆرەو سەره ڕۆ دەکەن بۆ شیوەکانی دەوروبەرو دەریاچه دروست دەکەن. لەو شوێنانەی ژێرەکەی تاوێره. ئاوی ژێر زەوی دەبێته هۆی وردو خاش کردنی بنکەکەی و دروست کردنی کون و چاڵ تیایداو دابەزینی ئاوی سەرەوه بۆ ئەوەی دەریاچەیەکی تازه دروست بکات. له ویلایەتی فلۆریدای ئەمریکادا دەریاچەی زۆر لەم شێوەیه هەیه. هەروەها دەتوانرێت دەریاچەی دەستکرد دروست بکرێت. کاتێك بەنداوێك لەسەر ڕووبارێك دروست دەکرێت. بەربەستێك له ڕووی ڕۆیشتنی ئاوەکەدا دروست دەکرێت. بەوەش له پشتی بەنداوەکەوه دەریاچەیەك دروست دەبێت دەریاچەی دەربەندیخان له کوردستان و "الناصر" له مسر نموونەی ئەو دەریاچەیەیه.

## میکا

mica بەردێکی تێکەڵاوە،له چەند کانزایەك به شێوەی کریستاڵ.میکه کانزایه،ئێمه ئەم ناوه له وەسف کردنی یەك خێزانی تەواو لەو کانزایانه که له بەردەکان پێك دێت بەکار دەهێنین.کانزاکانی میکا بریتین له:فلوگۆبیت، مسکۆڤیت، بیتۆتیت، لیبرولیت. لەبەرئەوەی بەکارهێنانی ئەم ناوه قورسن لەسەر زمان، بۆیه به باشی دەزانین هەر وشەی میکا بەکار بهێنین. هەر چەندە هەر یەك لەو ناوانه له کانزایەکی جیاوازە،بەڵام هەمویان له یەك دەچن. دەتوانرێت لەهەمو جۆرەکانی میکا پلێتی زۆر تەنك دروست بکرێت چونکه زۆر نەرمەو دەتوانرێت به نینۆك بڕوشێنرێت.هەروەها هەموو جۆرەکانی میکا هەمان جۆر له کریستاڵەکان پێك دەهێنن،بەڵام ڕەنگەکانیان لەنێوان بێ ڕەنگ و ڕەنگەکانی سەوزو سورو قاوەیی و ڕەشدان. میکا له ناو زۆر له بەردەکانی توێکڵی زەویدا هەیه. بەشێکی گرنگیشه له کۆمەڵەیەکی گەورەی بەرده گرکانیەکان. واته ئەو بەردانەی له

ئەنجامی سارد کردنەوەی مەوادە گەرمبوە تواوەکاندا دروست بون. هەندێك جار کانزاکان لە ئەنجامی کرداری داماڵیندا,,گۆڕانی بەهێزی دروست بو لە پاڵە پەستۆو گەرماو ئاوەوە،،دەگۆڕێن بۆ میکا. دەتوانین بە گەڕان و هەڵکەندن میکا بدۆزینەوە. گرنگترین ناوچەکانی بەرهەم هێنانی میکا لەجیهاندا: کەنەدا، هند، مەدەغەشکەر، ڕوسیا، بەڕازیل، باشوری ئەفەریقیاو شاخی ڕۆکیە لە ئەمەریکا. میکا بەپێ ی داواکردنی بازرگانی بەو قەبارەیەی داوا دەکرێت ئامادە دەکرێت وەکو پلێت.میکا نەگەیەنەرێکی زۆر باشەو گەرماو کارەبا ناگەیەنێت بۆیە لە پیشەسازی کەرەستە کارەباییەکان و دژە ئاگرەکاندا بەکار دەهێنرێت.ئایا دەزانی پێش بەکارهێنانی شوشە،میکا وەکو شوشە بۆ پەنجەرەی ماڵان بەکار هێنراوە.

## دیزنی لاند لە کوێدایە؟

دیزنی لاند باخچەی کایارەکانە لە ئەناهایمی باشوری ڕۆژئاوای ویلایەتی کالیفۆرنیا لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.ئەم باخچەیە لە ساڵی ١٩٥٥ دا بە ڕەسمی کرایەوە. دیزنی لاند باخچەیەکی زۆر بە ناوبانگەو زۆرێك لە وێنەی سەرنج ڕاکێشی تێدا دانراوەو ساڵانە هەزاران هەزار کەس لە سەرانسەری جیهانەوە سەردانی دەکەن. وۆڵتەر ئەلیاس دیزنی لە ساڵی ١٩٠١ لە شاری شیکاگۆ لە دایك بوەو لە تەمەنی ٦٥ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە. لە ماوەی ژیانیدا ژمارەیەکی زۆر فلیمی کارتۆن و فلیمی سینەمایی و تەلەفزیۆنی بەرهەم هێناوە.زۆر بلیمەت بوەو شوێن پەنجەی بەسەر هەر فلیمێکەوە دەری هێناوە دیارە. یەکەمین دیزنی لاندی لە ویلایەتی کالیفۆربیادا،دامەزراند و هەر بە ناوی خۆشیەوە ناونرا.

## ئەڵماس

ئەگەر پارچە هەویرێکت لابو ویستت ڕەقی بکەیتەوە چی دەکەیت؟ دەیگوشیت و پاڵەپەستۆی دەخەیتە سەر،هەرچەندە بیگوشیت و پاڵەپەستۆی بخەیتە سەر هێندە ڕەقتر دەبێت. ئەڵماسیش بە کرداری سروشت بە هەمان ڕێگە دروست دەبێت.پێش سەد ملێن ساڵ زەوی،لە قۆناغە یەکەمەکانی سارد بونەوەدا بوە.لەو

کاتەدا لە ژێر زەویدا قەبارەیەك بەردی شلی گەرم هەبوە،کە توشی گەرمیو پاڵەپەستۆیەکی زۆر هاتوەو ئەو کاربۆنەی توشی ئەو پاڵەپەستۆیە بوە،بوە بەوەی کە پێی دەڵێین (ئەڵماس). ئەڵماس ڕەقترینی مادەیە لە سروشتدا کە مرۆڤ ناسیبێتی،بەڵام ناتوانرێت بە شێوەیەکی وردو دروست پێوانەی ڕەقیەکەی بکرێت. یەکێك لەو ڕگایانەی بۆ زانینی ڕەقیەکەی بەکار دەیەنرێت ڕوکاندنیەتی بە مادەیەکی ڕەق. لە ساڵی ١٨٢٠دا پیاوێك بە ناوی (هۆمس) تەرازویەکی دروست کرد بۆ پێوانی ڕەقی کانزاکان.بە پێی تاقیکردنەوەکان ڕەقی کانزاکان بەم شێوەیە بونی لە ڕەقەوە بۆ ڕەقتر:

١- گلق "کانزایەکی تەڕە لە جوانکردنەوەدابەکار دەهێنرێت"

٢-گەچ

٣-کالیست

٤-فلۆریت "کانزایەکی بە کریستاڵ بوی شەفافە چەندین ڕەنگی هەیە لە تواندنەوەی کانزاکان و پیشەسازی شوشەو هیتریشدا بەکار دەیەنرێت"

٥-فلسبار "سلیکاتی ئەلەمنیۆم"

٦-کوارتز

٧-تۆباز

٨-کورندم "ئۆکسیدی ئەلەمنیۆم"

٩-ئەڵماس.

هەمو پێوانەکانی بەراورد کردنی هەر یەکێکیان بوە لەگەڵ ئەوی تردا. بەڵام دەرکەوتوە کە ئەڵماس لە هەمویان ڕەقترە. ئەی ئەگەر ئەڵماس هێندە ڕەقە چۆن دەتوانرێت ببڕێت و شتی لێ دروست بکرێت؟ تەنیا شتێك کە دەتوانێت ئەڵماس ببڕێت،خودی ئەڵماسە! ئەوانەی ئەڵماس بڕەکان بەکاری دەهێنن،هەر یەکە کە دەمەکەی ئەڵماسە.

٪٨٠ی ئەو ئەڵماسانەی ئەمڕۆ دروست دەکرێت لە پیشەسازیدا بەکاردەیەنرێت.

## نویٚ سازی یابان

یابان یەکێکە لە وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانی جیهان.بەحەق پێشکەوتوترین وڵاتە لە بواری ئەلکترۆناتدا.ئەم پێشکەوتنە مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە.شارستانیەتی یابان کاتێك دەستی پێکرد،کە ڕۆشنبیری چینی و کۆری چونە ناویانەوە لە سەدەی چوارەمی زایینیدا. یابانیەکان لە چینی و کۆریەکانەوە فێری هونەری وێنە کێشان بون.لە سەدەی هەشتەمدا.کاتێك هێشتا بەریتانیا لە سەردەمی تاریکیدا دەژیا.یابانیەکان لە نارا پایتەختێکی جوانیان بۆ خۆیان دروست کرد. لە سەدەی دوانزەهەمدا لە کاتێکدا یابان خەریکی پێشکەوتن بو،شەڕێکی ناوخۆ تیایدا هەڵگیرسا.کەتا سەدەی شانزەهەم درێژەی کێشاو خەریك بو پێشکەوتن لە وڵاتدا بوەستێنێت. لە ساڵی ١٦٢٤دا "تۆگۆغا واشۆغۆن"ی پادشای یابان بڕێکی زۆر مەیرسیداری دەرکردو یابانی کردە وڵاتێکی داخراو.بڕیارەکەش بریتی بو لە نەهاتنە ژورەوەی هیچ بیانیەك و نەچونە دەرەوەی هیچ یابانیەك لە وڵات.ئەم بڕیارە پەیوەندی یابانی لەگەڵ هەمو جیهانی دەرەوەدا پچڕاند.تا لە ساڵی ١٦٥٣دا یەکێك لە ئەفسەرەکانی دەریایی سوپای ئەمریکا بەناوی"کۆمۆدۆبیری"ناچاری یابانی کرد،سنورەکانی لەبەردەم بیانیەکاندا بکاتەوە لە ساڵی ١٨٦٨دا تۆکیۆ کرایە پایتەختی یابان و حکومەتی نوێی یابان بڕیاریدا وڵات ببوژێنێتەوە،بۆ ئەوەی یابان لە شێوەی ڕۆژئاوا بەهێز بێت. دوای ئەوە لە یاباندا شۆڕشی پیشەسازی ڕویدا.یابانیەکان دەستیان دایە دروست کردنی هێڵی ئاسن و گارگەو چەکسازی و دروست کردنی کەشتی جەنگی زۆر بە سەرکەوتویی.

لە ساڵی ١٩٠٥دا یابان توانی وڵاتێکی بە هێزی وەکو ڕوسیا،لە جەنگی ڕوسیا- یاباندا شکست بدات. لە ماوەی دەهەی سیەکانی سەدەی بیستەمدا پیاوانی سوپا لە ناو حکومەتدا زۆر بەهێزبون و لە ساڵی ١٩٤١ یابان چووە ناو جەنگی دوەمی جیهانیەوە،بە هاوپەیمانی لەگەڵ ئەڵمانیاو ئیتاڵیادا.لەو جەنگەدا،ئەمریکا دوو بۆمبای گەردیلەیی لە ٦و٩ی ئابی ١٩٤٥دا،دا لە هەردو شاری هیرۆشیما و ناکازاکی. بەوەش یابان ناچار بو لەو جەنگەدا خۆی بەدەستەوە بدات. دوای

جەنگ یابانیەکان ئەوپەڕی هەوڵیان دا بۆ پێشخستنی وڵاتەکەیان. بەرهەمی ئەو ماندو بونەیان یابانی گۆڕی بۆ یەکێك لە وڵاتە هەرە پێشکەوتوەکانی جیهان.

## گیانداران چۆن لەگەڵ کەش و هەوادا خۆیان دەگونجێنن؟

خۆگونجاندن و ڕاهاتن سیفەتێکی بایۆلۆجیە ئامارژە بە کردارێك دەکات کە هەمو گیانلەبەران تیایدا دەگۆڕێن یان لەگەڵ بارودۆخێکی تازەدا دەگونجێن. کە دەشێت لەناویان ببات. بەو جۆرە مرۆڤ و ڕوەکەکان و هەمو گیانلەبەرانی تر لەگەڵ ئەو کەشەی تیایدا دەژین،دەگونجێن بۆ ئەوەی بمێننەوە. با نمونەی داربەرو وەرگرین. ئەم ڕوەکە کاتێك لە ئاوو هەوایەکی شێداردا دەڕوێت،گەڵاکانی سەوزن و بۆ کرداری ڕۆشنە پێکهاتە پێویستی بە ئاوێکی زۆر هەیە. لە لایەکی ترەوە ڕوەکی سوپێری بیابان، کە ناتوانێت گەڵاکانی تێر ئاو بکات دەبینین گەڵاکانی پچوك بونەتەوە بۆ چقڵی نوك تیژ. ئەگەر بێینە سەر گیاندارانیش دەبینین دەنوکی هەندێکیان،بەو جۆرە گونجاوە کە لەگەڵ خواردنەکەیدا دەگونجێت بۆ نمونە دەبینین باڵندە گۆشت خۆرەکان، دەنوکیان بە جۆرێك بە هێزو تیژە کە یارمەتی دەدات ئەنجر ئەنجر نێچیرەکەی پێ بکات.

دوو جۆر لە گونجان هەیە، گونجانی تاك، گونجانی بە کۆمەڵ.

گونجانی تاکی، ئەو تاکە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لە ماوەی ژیانیدا لەگەڵ ئەو بارو دۆخە تازەیەدا ئالودە دەبێت. بەڵام ئالودە بونی بە کۆمەڵ. کردارێکی زۆر خاوەو بە درێژایی چەندین نەوە ڕودەدات. بۆ نمونە ناچار بونی مرۆڤ بۆ گونجان لەگەڵ ڕۆتینی ئیش کردنی شەودا. ڕەنگە لەسەرەتادا نەتوانێت بە ڕۆژ بخەوێت و خەوی لێ نەکەوێت بەڵام بە تێپەر بونی کات ڕادێت، بە ڕۆژانە بنوێت. زەڕافە حەزی لە گونجانی بە کۆمەڵە. لە سەردەمێکی کۆندا، زەڕافە وەکو ئەسپ ملی کورت بوە. جارێکیان لە ئەفریقیادا وشکەساڵیەك کەوت و چەندین ساڵی خایاند و ڕوەك بە زەویەوە نەما. بۆ ئەوەی بمێننەوە زەڕافە دەستی کرد بە، خواردنی گەڵای داران. ئەو زەڕافانەی کە ملیان دەگەیشتە گەڵای دارەکان زاوزێیان کردو زۆر بون و نەوەیەکی مل درێژیان لێ کەوتەوە. بە تێپەڕ بونی ڕۆژگار دارەکان بەرزترو بەرزتر بون، دەبوایە زەرافەکانیش خۆیان درێژکەنەوە بۆ ئەوەی بیگەنێ،

ئەنجامەکەشی ئەوە بو بە درێژایی زەمانێکی دورو درێژ ملی زەڕافەکانیش درێژ بونەوە. بەڵام هەموو گیاندارەکان ناتوانن لەگەڵ بارو دۆخدا بسازێن. هەندێکی وەکو مرۆڤ بە ئاسانی دەسازێت و هەندێکی تریشی هەر ناسازێت.

## باترۆس....گەورەترین باڵندەی دەریایی

باترۆس. گەورەترین باڵندەی دەرياييە و هەردو باڵی ٣,٦ مەتر درێژن. سەر بە خێزانی ئەو باڵندە دەرياييانەيە کە بە شێوەيەکی سەرەکی لە باشوری هێڵی ئيستيوادا دەژين. باترۆس دەنوکێکی درێژی ئەستوری هەيە لەگەڵ دوو باڵی درێژی تەسکداکە وای لێدەکات بێ ماندو بون و بۆ چەند کاتژمێرێکيش بە ڕوی هەوادا بڕوات. درێژی لاشەشی نزيکەی ١٢٠ سانتيمەترە. زياتر لە دوانزە جۆر باترۆس هەيە کە کێشەی هەڵفڕينيان هەيە. چونکە پێويستيان بە هەندێك با يان ڕاکردن بەسەر وشکانيدا هەيە پێش ئەوەی بتوانن بفڕن. وەکو هەمو ئەو باڵندانەی تر کە لە دەرياو زەرياکاندا دەژين. باترۆسيش ئاوی دەريا دەخواتەوەو لەگەڵ ئەوەی لەسەر حەبار دەژيت، پاشەڕۆی کەشتيەکانيش ڕايدەکێشێت. بۆ کەوتنە شوێن کەشتيەکان. بۆ زاوزێ کردن نەبێت هەرگيز ڕو لە کەناری ئاو دورگەکان ناکات. مێينەی باترۆس هێلکەيەکی سپی زۆر گەورە لە وشکانيدا دادەنێت. بەبێ ئەوەی دايپۆشێت نێرو مێکە بە نۆرە لەسەری دادەنيشن گەشەکردنی بێچوی باترۆس زۆر خاوەو بە ٣ تا ١٠ مانگ فێری فڕين دەبێت. دوای ئەوە پێنج تا دە ساڵ لە دەريادا دەژێت. کە تيايدا فێری شێوازەکانی فڕين و دابين کردنی خۆراك بۆ خۆی دەبێت. باترۆسەکان ژيانێکی درێژ دەکەن و يەکێکن لەو باڵندە کەمانەی کە دوای تەمەنێکی درێژ دەمرن. گەورەترين باڵندەی دەريايی، کە باڵەکانی بۆ مەلەوانی نەك بۆ فڕين بەکار دەهێنێت ئەمپراتۆری بەتريقی کيشوەری جەمسەری باشوريە. کە بەرزيەکەی يەك مەترەو کێشيشی دەگاتە ٤٠گيلۆگرام. کە ناوچە بە بەفر داپۆشراوەکانی کيشوەری جەمسەريدا دەژێت. بەڵام قورسترين باڵندە، باڵندەی "باوە" لە باشوری ئەفريقيادا. ئەو بازەی کەپۆی دەوترێت "کوندور" لە ئەمريکای باشوردا، خاوەنی درێشترين ماوەيە لە نێوانوکی هەردو باڵيدا.

## شیوی مەرگ لە كوێدایە؟

یادە پەیكەری نەتەوەیی دەكەوێتە شیوی مەرگەوە لە باشوری كالیفۆرنیا. نزیك سنوری نیفادا لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا. درێژی شیوی مەرگ نزیكەی ٢٢٥ كیلۆمەترو پانیەكەشی لە نێوان ٨ بۆ ٢٤ كیلۆمەتردایە. ئەم دۆڵە گەرمترین و وشكترین ناوچەیە لە ئەمریكای باكوردا. وەكو چۆن وشكترین و نزمترین زەویە لە نیوەی ڕۆژئاوای گۆی زەویدا. بە نزمیەك كە دەگاتە ٨٦ مەتر لەسەر ڕووی دەریاوە. پلەی گەرما تیایدا دەگاتە ٤٩ پلەی سەدی. بەهۆی ئەو كەش و هەوایەوە، بە دەگمەن باران لەم شیوەدا دەبارێت و ڕێژەی باران بارینی ساڵانە تیایدا تەنها پێنج سانتیمەترە. هەر گۆمە ئاوێكیش لەو شیوەدا دروست دەبێت هێندە سوێرە بە كەڵكی هیچ نایەت. گەرمای سوتێنەری شیوەكەش وای كردوە هیچ ڕووەكێك تیایدا نەڕوێت. سەرانسەری شیوەكە لمە. بەهۆی سەختی بارودۆخیەوە مرۆڤ ناتوانێت تیایدا بژێت. لە ماوەی گەڕان بە شوێن زێڕدا، گەڕۆكەكان ناچار بوون لەو شیوە بپەڕنەوە. بەهۆی تینویەتی و گەرماو ماندو بوونەوە زۆربەیان مردن لەبەر ئەو هۆیە ناوی "شیوی مەرگ" ی لێ نرا. لە ساڵی ١٩٣٣ ئەو ناوچەیە بە (باخچەی نەتەوەیی) ڕاگەیەنراو لە ئێستادا ساڵانە نزیكەی نیوملیۆن كەس سەردانی دەكەن.

## صەدمەی كارەبایی

ساڵانە هەزاران كەس بەهۆی گرتنی كارەباوە گیانیان لە دەست دەدەن. بۆیە دەبێت زۆر بە ووریاییەوە ئامێرە كارەباییەكان بەكاربێنین و پێویستە هەموو كەسێك مەبادیئە بنەڕەتیەكانی كارەبا بزانێت. كارەبا زۆر بە ئاسانی، بەناو كانزاكانی وەكو زیو، مس، ئاسن و ئەلەمنیۆم دا گوزەر دەكات. ئەم كانزایانە بەوە وەسف دەكرێن، كە گەیەنەرێكی باشن بۆ كارەبا. بەڵام دارو شوشەو پلاستیك و هەوا مقاوەمەی گەیاندنی كارەبا دەكەن، ئەمانەش بەوە ناودەبرێن كە نەگەیەنەری باشن. بۆیە دەیپێچنە دەوری تەلی كارەباوە. لە ئەنجامی بەكارهێنانی ڕۆژانەی ئەو ئامێرانەدا دەشێت وایەرەكان بریندار بن و سیمەكان بكەونە دەر، بە واتا بریندار

بوون و دەرکەوتنی سیمەکان زۆر مەترسیدارە. ئەگەر بەر لاشەی مرۆڤ بکەوێت دەشێت ببێتە هۆی سووتانی یان مردنی. بۆیە دەبێت ئەگەر وایەرێکی کارەبا لە ماڵماندا یان لە ئامێرێکماندا تووشی برینداری و قڵیشان بوو بە خێرایی بیگۆڕین. دەبێت سێ وایەر بەکاربهێنرێت لەگەڵ ئامادەکردنی وایەری زەمینی زۆر باشدا وایەری سێیەم ناردنی کارەبای شۆرتە بۆ زەوی، نەبوونی وایەری زەوی مەترسیەکی گەورەی هەیە بۆ توشبون بە گرتنی کارەبا.

## دەزانن چۆن کارەبا دەمانگرێت؟

ئەگەر لاشە وشك بوو مقاوەمەی بەهێزی تەزوی کارەبا دەکات. بەڵام بە تەڕی مقاوەمەکەی لاواز دەبێت. لەشێکی وشك لە ١٠٠ جار بۆ ١٠٠٠ جار بەرەنگاری لە لەشێکی تەڕ زیاترە. کاتێك لاشەمان وشکەو لەسەر پارچە دارێك یان پلاستیکێك وەستاوین. ڕێژەیەکی زۆر کەم نەبێت تەزووی کارەبا بە لاشەماندا ناڕوات. بەڵام کە تەڕ بین و لەسەر زەویەکی تەڕ بوەستین بۆ نموونە لە حەمام دا ئەوا زۆرترین ڕێژەی وزەی کارەبا بەناو لاشەماندا تێدەپەڕێت. توندی صەدمە کارەباییەکە، لەسەر ڕێژەی ئەو وزە کارەبایە دەوەستێت کە بە لاشەماندا تێدەپەڕێت. ئەگەر تەزویەك بەهێزی ١,٠ ئەمپێر، بەناو ئەندامێکی گرنگی لاشەدا چوو بۆ نموونە دڵ دەشێت زۆر مەترسیدار بێت. هەرچەندە ڕێژەی تەزووە کارەباییەکەو ماوەکەی درێژتر بوو لە لاشەماندا ئەوەندە کوشندە دەبێت. ئەو تەزوەی بە لەشدا دەڕوات، دەبێتە هۆی کرژبوونی ماسولکەکان، بە جۆرێك کۆنترۆڵ ناکرێت و هەناسەمان دەبڕێت و نارێکوپێکی لێدانی دڵی لێ دەکەوێتەوە. هەرکام لەم نیشانانەش لەوانەیە ببنە هۆی مردن. تەزووی بەهێزیش بەهۆی گەرماکەیەوە هەرچی ڕیشاڵ و دەمارو ماسولکە هەیە هەمووی دەسوتێنێت. کاتێك بە هەردوو دەستمان ئامێرێکی کارەبایی دەگرین تەزووەکە بەناو دڵماندا دەڕوات، بۆیە باشتر وایە بە دەستێك بیگرین. کاتێکیش خەریکی چاککردنەوەی ئامێرێکین، دەبێت پێڵاوی لاستیکمان لە پێدا بێت. دەشێت هیچ سیم و وایەرێکی گەیەنەر بە دەست نەگرین و دەبێت نەگەیەنەرەکانی وەکو دارو پلاستیك لەژێر پێماندا بێت، ئەگەر ڕووداوی کارەباش ڕووی دا، یەکسەر لە مەنی سویچەوە بکوژێنرێتەوە. ئەو کەسەش کارەبا

دەیگرێت دەبێت بە هەناسەی دەستکردی بۆ بکرێت. تا دەگەیەنرێتە نەخۆشخانە. دەبێت ئەوەمان لەبیرنەچێت کە کارەبا خزمەت گوزاریەکی نایابە بۆ مرۆڤ. بەڵام بۆ ئەوەی ڕێزی نێوانمان نەدۆڕێنین دەبێت ئەندازەیەك لە یەکەوە دوور بین.

## بڕینی دیواری دەنگ

فڕۆکەکانی سەروی دەنگ ئەو فڕۆکانەن، کە دەتوانن بە خێراییەك بفڕن لە خێرایی دەنگ زیاتر بێت. خێرایی دەنگ پشت بە کاریگەریەکانی وەکو چڕی هەواو پلەی گەرما دەبەستێت. لەسەر ئاستی دەریاو هەردوو پلەی گەرماو پاڵەپەستۆی ئاسایی، خێرایی دەنگ دەگاتە نزیکەی ١٢٢٥ کیلۆ مەتر لە کاتژمێرێکدا. هەرچەندە لەسەر ئاستی دەریا بەرزتر بینەوە، خێرایی دەنگ نزمتر دەبێتەوە. لە بەرزی ١٠,٥٠٠ میلەوە خێرایی دەنگ دەبێتە نزیکەی ١٠٦٠ کیلۆ مەتر لە کاتژمێرێکدا. خێرایی ئەو فڕۆکانەی بە خێرایی دەنگ یان زیاتر دەفڕن بە "ماك" دەپێورێت ژمارەی "ماکەکان" یش بە دابەشکردنی خێرایی فڕۆکەکەیە، بەسەر خێرایی دەنگەکەدا لەو بەرزییەی کە فڕۆکەکە پێی دەفڕێت. ئەگەر فڕۆکەکە بە خێرایی دەنگ بفڕێت دەڵێین خێراییەکەی "١-ماك"ە دەڵێین خێراییەکەی "٢-ماك"ە. ئەگەر بە خێرایی دوو ئەوەندەی خێرایی دەنگ بفڕێت. دەڵێین خێراییەکەی "-ماك"ە و هتد. بە فڕینی کەمتر لە خێرایی دەنگ دەڵێین، خێراییەکەی لە خێرایی دەنگ کەمترە. ئەو فڕۆکانەی کە بە خێرایی دەنگ یان زیاتر دەفڕن، گرمەیەك دەردەکەن "شەپۆلێکی شۆك". ئەو شەپۆلانە، شەپۆلی پاڵەپەستۆن کە لە ئەنجامی جوڵەی فڕۆکەکەوە دروست دەبێت. کاتێك ئەو شەپۆلانە دەگەنە زەوی هەندێك جار وەکو دەنگی تەقینەوە دێنە بەر گوێ. کە پێی دەوترێت "تەقینەوەی دەنگی" تەقینەوەی دەنگی هەندێك جار دەبێتە هۆی شکانی شوشەی پەنجەرەکان و زیان گەیاندن بە مومتەلەکات. لەبەرئەوە ئەندازیارانی فەزا هەوڵ دەدەن تەقینەوەی دەنگی کەم بکەنەوە، بە دروست کردنی فڕۆکەکان، بە شێوەی بەلەمی. ئەو فڕۆکانەی خێراییەکەیان لە دەنگ خێراترە، هەموو بەشەکانی بەهۆی لێکخشاندنی هەواوە گەرم دەبێت. ئەمرۆ فڕۆکە خێراکان. لە تیتانیۆم و پۆڵا دروست دەکرێن چونکە ژەنگ ناهێنن و گەرم نابن.

بەناوبانگترین فڕۆکە کە لە دەنگ خێراترە، فڕۆکەی "کۆنکۆرد"ە. کە فڕۆکەیەکی نەفەر هەڵگرەو دوو کۆمپانیای بەریتانیو فەرەنسی بە هاوبەش دروستیان کردووە. کۆنکۆرد لە لەندەن تا نیویۆرك بە سێ کاتژمێر دەبڕێت. ڕوسیا و ئەمریکاش چەندین جۆر فڕۆکەی خێراتر لە دەنگیان دروست کردووە بۆ هێزی ئاسمانی خۆیان.

## کە بانگی کەسێکی دوور دەکەین بۆچی دەستمان بە دەوری دەمماندا گرد دەکەینەوە؟

وا باوە، کە بانگی کەسێکی دوور دەکەین. یان بە دەنگێکی بەرز هاواری لێ دەکەین. یان دەستمان بە دەوری دەمماندا گرد دەکەینەوە.

## ئایا دەزانن بۆچی وا دەکەین؟

ئێمە دەزانین لەرینەوەکانی ژێ دەنگیەکان لە قوڕگماندا شەپۆلی دەنگی دەر دەکەن کە لە دەمەوە دەردەچێت و بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە. ئەو دەنگانە، کە دەگەنە هەر کەسێك گوێی لە دەنگمان دەبێت. کاتێك شەپۆلەکان لە هەوادا بڵاو دەبنەوە، ئەو وزەیەی کە هەڵی گرتووە، لە هەوادا بڵاو دەبێتەوەو لە هەر یەکەیەکی ڕووبەر یان چڕی دەنگەکە وزەکە دادەبەزێت. بۆیە کاتێك کە بانگی کەسێك دەکەین لە دوورەوە دەستمان دەخەینە دەوری دەممان. ئەوەش وا دەکات دەنگەکە بە هەموو لایەکدا بڵاو نەبێتەوەو بە یەك ئاراستەدا بڕوات. بۆیە وزەکەش بە یەك ئاراستەدا دەڕوات و وەکو جاری یەکەم خێرایی دەنگەکە دانابەزێت. لەبەرئەوە دەگاتە شوێنێکی دوور ترو ئەو کەسەی لێمانیشەوە دوورە دەتوانێت دەنگەکەمان ببیستێت. لەبەرئەوەیە دەستمان بە دەوری دەمماندا گرد دەکەینەوە بۆ ئەوەی دەنگمان بگاتە شوێنێکی دوورتر.

## ئۆپەرێت چیە؟

شێوەیەکە لە شێوەکانی ئۆپێرا. یان ئۆپێرای چیرۆکێکی سوکە. یان درامایەکی سۆزداری ئاواز بۆ دانراوە. شوێن و کاتی ئۆپەرێت هەمیشە سازو نامۆیە. لە ڕەنگ و شێوازی جل و بەرگ دا. زۆر لە کەسایەتیەکان دەبنە شازادەو پیاوان

جلی سەربازی لەبەردەكەن و ئافرەتانیش جل و بەرگی زۆر جوان. چیرۆكەكانی پۆپەریت هەمیشە ڕۆمانسین و چاكەكان سەردەكەون و خراپەكانیش سزا دەدرێن و لە كۆتایشدا خۆشەویستان بە یەك دەگەنەوە. لە دەوروبەری سەدەی هەژدەهەمدا ئۆپەرێت لەو وڵاتەدا لە دایك بوو كە بە زمانی ئەڵمانی قسە دەكەن. لە واقیع دا "فرانتز فۆن زۆبا" ئەم جۆرە شانۆ مۆسیقیەی داهێنا. زۆر تەركیزی كردە سەر ڕۆمانسیەت و سۆزو لە گرنگی كۆمیدیای كەمكردەوە. یەكێك بوو لەو یەكەم ئاواز دانەرانە. كە پانتاییەكی گرنگی دا بە سەمای ڤاڵس لە مۆسیقای ئۆپەرێت دا. "یوهان شتراوس"ی "كوڕ" هەندێك لە گرنگترین ئۆپەرێتەكانی داناو لەگەڵ بەهێزكردنی بنەما سەرەكیەكاندا. دەشێت ئۆپەرێتی "Bat" بەناوبانگترین ئۆپەرێت بێت كە تا ئێستا دانراوەو تا ئێستاش لە زۆر وڵاتانی جیهاندا پێشكەش دەكرێت. لەوانەیە "بێوەژنی سەماچی" دووەم بەناوبانگترین و میللی ترین ئۆپەرێت بێت كە "فرانتز لایهەر" دایینابێت. لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ئۆپەرێتی میللی لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا ڕەواجێكی باشی پەیدا كردو هەر زۆر زوو چەندین كەس هەڵكەوتن ئۆپەرێتیان دانا. كە تا ئێستاش لەناو خەڵكیدا بەناوبانگن. ئۆپەرێت شێوەیەك بووە لە شێوەكانی سەرگەرمی لەناو ملیۆنەها خەڵكی جیهاندا.

## ئایا وشتر مرخ سەری خۆی لە لم دا دەشارێتەوە؟

ووشتر مرخ باڵندەیەكی تا ئەندازەیەك سەیرە. زۆر ڕەوشتی تایبەت و سەرنج ڕاكێش و جێی گرنگی پێدانە. بەڵام سەر شاردنەوەی لەناو لمدا تیا نیە! باوەڕی خەڵك وایە كاتێك ووشتر مرخ دەترسێت. وا هەست دەكات سەلامەتترین ڕێگە ئەوەیە سەری خۆی لە لمدا بشارێتەوە. لەوەوە، وەكو چیرۆكە میللیەكان باسی دەكەن هەر كەسێك دەتوانێت بچێت و بیگرێت. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت هیچ كەسێك بە چاوی خۆی نەیبینیوە ووشتر مرخ سەری لە لمدا بشارێتەوە! بە سادەیی ووشتر مرخ سەری خۆی لە لمدا ناشارێتەوە. ئەوەی ئەم بیرۆكەیەی لای خەڵك دروست كردووە ئەوەیە كە ووشتر مرخ كاتێك دەترسێت. خۆی دەكوتێتە زەویداو ملی بەسەر زەویدا درێژ دەكاتەوەو خۆی لێ بێ دەنگ دەكات و زۆر بە

ووریایی چاودێری دەوروبەری خۆی دەکات. بەڵام کە مەترسیەکە لێی نزیك بووەوە. ئاژەڵانی تر چی دەکەن ئەمیش و ا دەکات. واتە هەڵدێت! ئەڵبەت ووشتر مرخ لەو باڵندانەیە کە نافڕێت. بەڵام ئەو ناتەواویەی خۆی بە غاردانی خێرا قەرەبوو دەکاتەوە. ووشتر مرخ خێراترین باڵندەیە لە جیهاندا. کە بە خێرایی ٥٠ میل لە کاتژمێرێکدا دەڕوات و بۆ ماوەی نیو میل ئەو خێراییە بپارێزێت! هێلکەی ووشتر مرخ لە هێلکەی هەرچی باڵندەی ترە گەورە ترە. درێژی هەر هێلکەیەکی ١٥ بۆ ١٨ سانتیمەترەو تیرەکەشی ١٣ بۆ ١٥ سانتیمەترە. ئەگەر کەسێکیان بیرتان کردبێتەوە وەکو ژەمێکی خواردن بخۆن. کوڵاندنی هێلکەیەکی ووشتر مرخ ٤٠ خولەك دەخایەنێت!

## کێچ چیە؟

زۆربەمان وای بۆ دەچین کێچ زیندەوەرێکی زۆر بچوکەو لەسەر لاشەی سەگ دەژێت و وای لێدەکات بەردەوام خۆی بخورێنێت. ئایا دەزانن لە جیهاندا زیاتر لە ٩٠٠ جۆر کێچ هەیە. کێچ مێروویەکی مشەخۆرە، لەسەر گیاندارە مەمکدارەکان لەوانە مرۆڤ و باڵندەکان و زۆر لە ئاژەڵانی تر. مرۆڤ بە چاکی کێچ دەناسێت لەبەرئەوەی مرۆڤ و ئاژەڵان تووشی نەخۆشی دەکات وەکو چۆن لە دێر زەمانەوە تووشی کردوون. گەستنی کێچ زۆر بە ئازارە. بەڵام کێشە لە خودی گەستنەکەدا نیە. نەخۆشی مەترسیداری وەکو گرانەتا، چاوە قوڵەی دبلی، چاوە قوڵەی سیەکانمان بۆ دەگوێزێتەوە. کێچ ڕاستەخۆ هێلکەکانی لەسەر لاشەی ئەو گیاندارە، یان ئەو شوێنەی لێی دەژێت دادەنێت. جوڵانەوەی گیاندارەکەش دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی هێلکەکان، هێلکەکان دەتروکێن و کێچەکانی لێوە دەردەچن، تا لە کۆتایدا گەورە دەبن و دەبنە کێچێکی باڵغ. ئەو کێچەی دەبێتە مشەخۆر لەسەر پێویستی بە ٢٨ تا ٤٨ ڕۆژ هەیە تا لە هێلکەوە ببێتە کێچێکی کامڵ. کێچەکان باڵیان نیە. بەڵکو قاچێکی زۆر پێشکەوتوویان پێوەیە کە بۆ بازدان بەکاری دەهێنن، هەندێك لە کێچەکان لە بازداندا زۆر کارامەن و دەتوانن بە بەرزی ٢٠ سانتیمەترو بە ئاسۆیی ٣٠ سانتیمەتر باز بدەن! دەمی کێچ بە جۆرێك دروست کراوە کە دەتوانێت پێستی ئاژەڵان بدڕێت و خوێنەکەی بمژێت. بەڵام

لاشەی خودی کێچ پانیلکەیە. ڕێژەی کێچ لە ناوچە گەرمەکاندا زیاترە. بەڵام لە هەمان کاتدا لە ناوچە جەمسەریە ساردەکان و بیابانە وشکەکانیشدا هەن. لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا کێچی مرۆڤ و سەگ و پشیلە بە زۆری هەن و هێرش دەکەنە سەر ئاژەڵانی تریش.

## چۆن دەزانین چی لە چەقی زەویدا هەیە؟

لەبەر نا تەوانایی زانایان و ئامێرەکان بۆ شۆڕبوونەوە بۆ ناوجەرگەی زەوی. بۆیە پەنایان بردۆتە بەر ڕێگای تر بۆ زانینی چی لەناو جەرگەی زەویدا هەیە. لەو ڕێگایانە لێکۆڵینەوە کردنە لەسەر تەقینەوە گڕکانیەکان، ئەو تەقینەوانە گازاتی زۆر گەرم و بەردی تواوە، هەڵدەدەن بۆ سەر ڕووی زەوی. دەری دەخەن کە ژێر زەوی زۆر گەرمە. لە ڕێگاکانی تر لێکۆڵینەوەیە لەسەر لەرینەوەکانی زەوی و بومەلەرزەکان. چونکە شەپۆلەکانی بومەلەرزەکان جۆرێك لە وێنەی X مان دەدەنێ سەبارەت بە جەرگەی زەوی. کاتێك لەرینەوەیەکی زەوی ڕوو دەدات، بە هەموو لایەکداو بەناو بەردەکاندا چەندین جۆری جیاواز لە لەرینەوە بڵاو دەبێتەوە. ئەو شەپۆلانە بە خێرایی جیاوازو بەهۆی جۆرەها مەوادی جیاوازەوە، دەگوێزرێتەوە لەگەڵ گواستنەوەی لە جۆرێك بەردەوە بۆ جۆرێکی تر ئاراستەکەی دەگۆڕێت. بە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو شەپۆلانە، بەهۆی ئامێری زۆر وردو هەستیارەوە. زانایان دەزانن چی لە ژێر زەویدا هەیە. زانایان تێبینی ئەوەیان کردووە کە لە قوڵایی ١٨٠٠ میلەوە. گۆڕانێکی کت وپڕ لەو شێوازەدا ڕوو دەدات، کە شەپۆلە بومەلەرزەییەکان بەهۆیەوە دەگوێزرێنەوە. جۆرێك لەو شەپۆلانە ئاراستەکەیان دەگۆڕن و جۆرێکی تریان بە تەواوی لێی دەوەستن. زانایان لەوەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامە کە جیاوازییەکی زۆر گەورە لە مەوادەکانی ژێر زەویدا هەیە. چەپۆلە شۆکیەکان کە لە ئەنجامی بومەلەرزەوە دروست دەبن. لە کاتگەلێکی جیاوازدا دەگەنە وێستگە جیاوازەکانی چاودێری بومەلەرزەکان. ئەمەش بەشێکی بۆ جۆری ئەو مەوادانە دەگەڕێتەوە، کە شەپۆلە بومەلەرزەییەکان بەناویاندا تێدەپەڕن. لێرەوە کلیلێکی ترمان دەست دەکەوێت بۆ زانینی ئەو مەوادانەی، کە لەناو جەرگەی زەویدا هەن. ئەمەش بیرۆکەیەکی گشتی لەسەر چی

لەناو سكی زەویدا هەیە. چینی سەرەوە كە توێكڵی زەویە لە بەردی زۆر ڕەق پێكهاتووە، ئەستووری ئەم توێكڵە نزیكەی ٢٠ بۆ ٣٠ میلە لە ژێری كیشوەرەكانەوە. لە ژێری زەریاكانیشەوە نزیكەی ٣ میلە. چینێكیش دەكەوێتە ژێری ئەو توێكڵەوە، هەمان شت ئەمیش لە بەردی زۆر ڕەق پێكهاتووەو قوڵیەكەی نزیكەی ١٨٠٠ میلە. بەڵام ناو سكی زەوی قوڵترین بەشیەتی كە بە زۆری لە ئاسن و نیكڵ پێكهاتووە. لەناو ئەم دڵەدا دڵێكی تر هەیە لە كانزای ڕەق. كە تیرەكەی دەگاتە نزیكەی ١٦٠٠ میل.

## جیاوازی نێوان ڕوەكەكان و ئاژەڵان.

ئێمە دەزانین كە ڕوەكەكان و ئاژەڵان دەكەونە ناو بازنەی زیندەوەرانەوە. هەموو زیندەوەرانلە ژمارەیەكی بێ شومار خانە پێك دێن. هەمو چالاكیەكانیشیان لە ئەنجامی كاری پەیوەستی ئەو خانە وردانەیە بە یەكەوە. نزیكەی سێ ملیۆن جۆر لە ڕوەك وئاژەڵ هەن كە تا ئێستا لێكۆڵینەوەیان لەسەر كراوەو ناویان بۆ دانراوە.

## ئایا دەزانن جیاوازی چیە لە نێوان ڕوەك و ئاژەلدا؟

لە زۆر ڕووەوە ڕوەكەكان جیاوازن لە ئاژەڵان. ڕوەكەكان دەتوانن خۆراكی خۆیان بە ڕێگەیەك دروست بكەن كە پێی دەوترێت "ڕۆشنە پێكهاتە" بەڵام ئاژەڵان ناتوانن بۆ خۆیان خۆاك دروست بكەن، بەڵكو لەسەر گیانلەبەری تر دەژین. هەندێك ئاژەڵ ڕوەك دەخۆن و پێیان دەوترێت "گیا خۆرەكان". هەندێكی تریشیان تەنها گۆشت دەخۆن و پێیان دەوترێت "گۆشت خۆرەكان" هەندێك ئاژەڵی تر هەن هەم گۆشت خۆرن و هەم گیاخۆر. لە كرداری ڕۆشنە پێكهاتەدا ڕوەكەكان دوەم ئۆكسیدی كاربۆن لە هەواوە وەردەگرن، لە زەویشەوە ئاو دەمژن بۆئەوەی خۆراك و ئۆكسجینی پێ دروست بكەن. ئەو خۆراكەی كە ڕوەك دروستی دەكات یان پەسیسەی دەكات بەكاری دەهێنێت. ئاژەڵانیش خۆراك و ئۆكسجین بەكار دەهێنن بۆ ئەوەی دوەم ئۆكسیدی كاربۆن و ئاو دروست بكەن. زۆربەی ڕوەكەكان بە درێژایی تەمەنیان لە یەك شوێندا جێگیرن و ناجوڵێن. بەڵام زۆربەی ئاژەڵان دەتوانن لە شوێنێكەوە بچن بۆ شوێنێكی تر. ڕوەكەكان دەتوانن بە هەر قەبارەو

حەجمێك گەشە بکەن، بەڵام ئاژەڵان لە ئاستێکی دیاری کراو زیاتر گەشە ناکەن. خانەی ڕوەکەکان جیاوازن لە خانەی ئاژەڵان، ئەو مادە کیمیاویەی لە خانەی ڕوەکدا هەیە لە لاشەی ئاژەڵاندا نیە.

لە کاتێکدا ڕوەکەکان ناتوانن هیچ خۆراکێك بخۆن ئەگەر لە شێوەی گیراوەدا نەبێت. بەڵام ئاژەڵان دەتوانن خۆراکی ڕەقیش بخۆن. بە پێچەوانەی زۆربەی ئاژەڵانەوە، ڕوەکەکان ئەندامی جوڵان یان ئەندامی میز کردن و دەریچەیان نیە. بە پشت بەستن بەم سیفەتانە بە ئاسانی دەتوانن جیاوازی لە نێوان ڕوەکەکان و ئاژەڵاندا بکەین.

## پرتەقاڵ لە کوێدا سەری هەڵدا؟

تۆمارەکان واپیشانی دەدەن کە پێشی چوار هەزار ساڵ چینیەکان پرتەقاڵیان ناسیوە. پرتەقاڵ دوو جۆرە، شیرین و ترش داری پرتەقاڵی ترش یەکەمجار لە ئوروپا کشت کراوە. تا سەدەی پانزەهەم مزرەمەنیەکان بە شێوەیەکی بەر چاو لە باشوری ئوروپادا کشت دەکران. هەرچەندە تا ئێستاش هەندێك مزرەمەنی لە ئوروپادا کشت دەکرێت و دەخورێت، بەڵام ئێستا زیاتر بۆ پەیوەند کردنی لەگەڵ پرتەقاڵە شیرینەکاندا دەیچێنن. پرتەقاڵی شیرین لە سەرەتادا تەنها دەوڵەمەندەکان دەیانتوانی بیخۆن. پادشاو میرو دەوڵەمەندەکان پارەیەکی زۆریان دەداو دارەکەیان دەکڕی و لە باخەکانیاندا دەیانناشت. لە وڵاتە ساردەکاندا سەرما دارە ناسکەکانی پرتەقاڵی ڕەقدەکردەوە، بۆیەماڵی شوشەیان بۆ دروست کرد. چونکە داری پرتەقاڵ لە حەوزدا کشت دەکراو لە هاویندا دەهێنرایە دەرەوەو لە زستاندا لە ماڵی شوشەدا دەپارێزرا. لەگەڵ ئەوی ئوروپا وڵاتێکی سارد بو بەڵام هەر کشتیان دەکرد.

### ئایا دەزانن کاتێک کریستۆفر کۆلومبس گەشتی کرد بۆ "دونیای نوێ" لەگەڵ خۆیدا تۆوی پرتەقاڵ و زۆر لە میوە مزرەمەنیەکانی تری برد؟

ئەو تۆوانەی کۆلومبس لە دورگەی "هیسبانیولا"دا کشت کران و داری مزرەمەنیەکان لە ئاوو هەوای ئیستیوائی ڕۆژئاوای ئانریزدا سەوز بون. ئەو

شوێنەی ئێستا پێی دەڵێن ولایەتی فلۆریدا. هندیە سورەکان لەهەر کوێدا پرتەقاڵیان بخواردایە، هەر لەوێدا ناوکەکەیان فڕێ دەدا. بە هۆی کۆچ و باری زۆریانەوە، زۆر بە خێرایی باخی میوە مزرەکان لە دەشتەکاندا سەوز بون. ئەمریکا بە تایبەت ولایەتی فلۆریدا پێشەنگی جیهانە لە بەرهەم هێنانی پرتەقاڵی شیریندا.

## بۆقی شوشەیی

هەمومان دەزانین بق چیە. لە سەرانسەری جیهاندا نزیکەی ٢٥هەزار جۆر بۆق هەیە. لاشەی بۆق زۆر نەرمەو دەست و قاچەکانیشی زۆر بەهێزن. لە هەموو دنیادا جگە لە هندستان نەبێت دەتوانین ئەو جۆرە بۆقە ببینین کەپێستی شەفافە و پێی دەوترێت "بۆقی شوشەیی" کە دەتوانین لە ڕێگەی پێستەکەیەوە هەموو ئەندامە ناوجۆییەکانی لەشی ببینین. بۆقە شوشەییەکان، لەسەر داران دەژین. مرۆڤ دەتوانێت بە ڕونی ئێسقانەکان و دڵ و ئەندامە ناوخۆییەکانی تری و ئەو خوێنەی ئە ناو دەمارەکانیدا ڕێدەکات ببینێت. بۆقی شوشەیی بە ڕێژەیەکی زۆر لەئەمریکای ناوەندو باشوریدا هەیە، لەگەڵ هەردو کیشوەری ئاسیاو ئەفریقاشدا. لەسەر قاچەکانی بۆق جۆرێك توك هەیە کە یارمەتی دەدات لە دارێکەوە بفڕێت بۆ دارێکی تر. بۆق دەتوانێت، بۆ پاراستنی خۆی لە دوژمنەکانی ڕەنگی لاشەی خۆی بگۆڕێت.

## هەندێك ڕوەك هەن مێرو دەخۆن !

ڕەنگە سەرسام بیت کە بزانیت هەندێك ڕوەك هەن مێرو دەخۆن! نمونەی ئەو جۆرە ڕوەکانە پێیان دەوترێت "ڕوەکە مێروییەکان" چونکە ناتوانن پرۆتینی خۆیان دروست بکەن. بۆیە لە ڕێگەی خواردنی مێروو کرمەکانەوە دەستیان دەکەوێت. هەر یەك لەو ڕوەکانە شێوازی تایبەتی خۆی بەکار دەهێنێت بۆ گرتنی مێروەکان.بە ناوبانگترین ڕوەکی مێرویی، ڕوەکی "سلونی"یە بەشی سەرەوەی گەڵاکەی لە مەسینەیەکی پچوك دەچێت و ڕەنگەکەی زۆر سەرنج ڕاکێشە و شلەیەکی زۆر لینجی تێدایە. کونی مەسینەکە ڕیشاڵی زۆر پچوکی تێدایە کە

ڕێگە دەدات بە مێروەکە پچێتە ناویەوە. بەڵام کاتێك بیەوێت بێتە دەرەوە دەمەکەی دادەخرێت. ڕوەکەکەش شلەیەکی تایبەتی دەرژێنێت و مێروەکە هەرس دەکات. ڕوەکێکی تر هەیە پێی دەوترێت کۆپرای ئەمریکی کە لە ماری کۆپرا دەچێت و مێروەکە دەخوات. ئەمیش شێوازی گوڵەکانی لە مەسینە دەچێت. ڕوەکێکی تر هەیە گەڵاکانی توکاوین و لەسەری توکەکانی جۆرێك شلەی پێوەیە کە زۆر سەرنج ڕاکێشە. کاتێك مێروەکان بەرەو لای دێن، ڕوەکەکە خۆی بۆ پێشەوە ڕادەکێشێت و مێروەکە دەگرێت و بە یارمەتی شیلەکەی هەرسی دەکات. لە ڕێگەی گەڵاکانیشیەوە مێروەکە دەمژێت و دوای ئەوە توکەکانی ئاسایی دەبنەوە. ڕوەکێکی تر لە ئەمریکادا هەیە ناوی "مێش خنکێنە"یە ڕەنگی گەڵاکانی زۆر جوانن و کاتێك مێروەکە لەسەری دەنیشێتەوە قوتی دەدات و هەرسی دەکات. ڕوەکێکی ئاویش هەیە ناوی "یۆتیکۆلاریا"یە، لە هەموو شوێنێکی جیهاندا هەیە، ڕەگەکانی لەناو ئاودایە و تورەکەی ئاوسی پێوەیە. کاتێك مێروە ئاویەکە دەچێتە ناو تورەکەکەیەوە، توکەکانی ڕێگە نادەن بە مێروەکە جارێکی تر بێتە دەرەوە. دیواری تورەکەکە شلەیەکی هەرسکەر دەرژێنێت و ئەو پرۆتینەی لە مێروەکەدایە هەموی دەمژێت. ڕوەکێکیش هەیە پێی دەوترێت "بیبەی هندی" ئەویش مێروخۆرە. جگە لەوانەی باسمان کرد چەندین جۆری تر لەڕوەکی مێروخۆر هەیە لەسەرانسەری جیهاندا.

## یۆگا چیە و کەی پەیدا بوو؟

هەندێك کەس وای دەبینن ئامانج لە ژیاندا، گەیشتنە خۆشگوزەرانی و خۆشی هەتاهەتایە. بۆ گەیشتنە ئەوەش دەبێت لە ڕێگەی ناسینی خواوە بێت. هەندێك کەسی تر خودی خۆشگوزەرانی هەتاهەتایی بە خوا دەزانن. شتێکی سروشتیە بۆ ئەوەی بۆیان جێبەجێ بێت دەبینین خەڵکی چەندین بیرو بۆچونی جیاوازو ڕێگەی جیاواز دەگرنە بەر بۆ ئەوەی پێی بگەن. بەو جۆرە یۆگا یاسای تێگەڵ بونە لەگەڵ خوادا. بۆ گەیشتنە ئەو پلەو پایەیە دەبێت گەشە بە پاکی ڕۆح بدرێت. ئەوەی کە بە یۆگا ناودەبرێت خۆی لە ڕاستیدا ناوی "هاسا یۆگایە". مەبەست لە هاسا یۆگا بە هێزکردنی لاشەیە. بەو ئەندازەیەی کە بتوانرێت تەرکیز

لەسەر ڕاستی کۆتایی بۆ ژیان بکرێت و بۆ گەشتنە ئامانجی ناوبراو ئەو کەسەی هاسایۆگا دەکات. تەحەکوم بە لاشەو دەرونی خۆیەوە دەکات لەڕێگەی سیستەمی "ئاسانابرانایام"ەوە. ئاسانا یارمەتی هەموو دەدات بۆ بە دەست هێنانی لاشەی تەندروست و دور لە هەموو نەخۆشیەك. سیستەمی ئاسانا سەلماندویەتی، کە سودێکی زۆری لە ئەمڕۆی جیهانی پڕلە ئاژاوەی نەبڕاوەدا هەیە. لە بەر ئەوە بوو بە سیستەمێکی میللی. تەنانەت لە ولاتانی ڕۆژئاوای پێشکەوتوشدا. لەوەش زیاتر حکومەتی هندی لە تەلەفزیۆنەکاندا بازاڕ گەرمی بۆ هاسایۆگا دەکات و بیریشیان لەوە کردۆتەوە. وەکو پرۆگرام لەقوتابخانەکانی هندا بخوێنرێت. لە سیستەمەکانی تری یۆگا:

سیستەمی "بهاکتی" "کارما" "جنانا یوگا" بەلام بەناوبانگترینیان "بهاکتیوگایە" کە لەلایەن قەدیس و شاعیرەکانەوە شیعری بۆ دانراوە. "بهاکتی" نۆ جۆری سەرەکی هەیە. ئەم جۆرە لە یۆگا بڕوا بە خوا بەهێز دەکات و ئەو کەسەی مومارەسەی دەکات چێژ لەو خۆشبەختیە وەردەگرێت کە خۆی تێدا دەبینێتەوە. بەلام یۆگای کارما بۆ کەسە زیرەکەکانە. ئەو کەسانەی ئەرکەکانیان بە باشی ڕادەپەڕێنن. ئاشکرایە کە بابەتی یۆگا شتێکی زۆر فەلسەفیەو هەر لە زۆر کۆنەوە مێشکی باشترین کەسی زیرەکی تەنیوە لە جیهاندا. مەبدە سەرەکیەکانیشی حەکیمی هندی "باتان جالی" داینا لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا "یۆگا سوتراس" لە دەوروبەری ٢٠٠٠ ساڵ پێش زایین.

## جۆرەکانی لم

کە بەردێك بەردەوام باو باران و شەونم لێیبدات، ورد دەبێت بۆ گەردیلەی بچووك بچووك کە تیرەکەی لە نێوان ٠,٠٥ و ٢,٥ ملیمەتردایە. بەو گەردیلانەش دەوترێت لم. لەبەرئەوەی لم لە دەنکی بچووکی ئەو کانزایانە پێك دێت کە بەردەکان پێك دەهێنن، بۆیە دەبینین هەریەك لەو کانزایانە لە لمدا هەن. سەرەکی ترین کانزا کە لە لمدا دەستمان دەکەوێت "کوارتز"ە ماددەیەکی زۆر ڕەقە، هەندێك لە جۆرەکانی لم ٩٩ ٪ یان کوارتزی پاکە. کانزاکانی تری وەکو: فلسباز "سلیکاتی ئەلەمنیۆم" "کالیست" کاربۆناتی کالیسیۆمی بە کریستاڵ بوو. میکە "ماددەیەکی شێوە

شوشەییە" ئاسنی خاو ڕێژەیەکی کەم لە ئەقیق و ترمالین "کە جۆرێکن لە بەردە بەنرخەکان" لەگەڵ "تۆباز" کە ئەویش جۆرێك بەردی بەنرخە" لە لمدا هەن. لە هەر کوێدا کەش کار لەسەر بەردەکان بکات دەشێت لەوێدا لممان دەست بکەوێت. کەناری دەریا یەکێکە لەو شوێنە سەرەکیانەی لمی لێ پێك دێت چونکە کەنارەکە، توشی هەڵکشان و داکشان دەبێت و دەدات لە بەردەکان و بەردەکان شیتەڵ دەکات بۆ لم. ئاوی سوێریش ڕۆڵی خۆی هەیە لە دروست کردنی لمدا. با لم بۆ ناوچە ناوخۆییەکان هەڵدەگرێت. هەندێك جار ڕێژەی ئەو لمەی کە با دەیگوێزێتەوە ئەوەندە زۆرە، دارستانێك بە تەواوی دادەپۆشێت.

## ئەی چی دەربارەی ئەو لمەی لە بیاباندا هەیە؟

زۆربەی ئەو لمانەی با هەڵی گرتوون. بەڵام لە هەندێك حاڵەتدا، لمی بیابانەکان لە ئەنجامی ووردبوونی بەردەکانەوە دروست بوونە. لە حاڵەتێکی تریشدا بیابانەکان ڕۆژێك لە ڕۆژان بنی دەریا بوونەو پێشی هەزاران ساڵ ئاوەکەی ووشکی کردووەو لمەکەی ماوەتەوە. لم ماددەیەکی زۆر بەسوودەو بە شێوەیەکی سەرەکی لە دروستکردنی بینا هاوچەرخەکاندا بەکاردێت بە تێکەڵ کردنی لەگەڵ ئاوو چیمەنتۆدا. زۆر بە خێرایی دەگۆڕێت بۆ ماددەیەکی ڕەق کە پێی دەوترێت "کۆنکرێت". هەروەها لە پیشەسازی شوشەو وەکو فلتەرێك بۆ پاککردنەوەی ئاو بەکاردەهێنرێت.

## بۆن و بەرامەی گوڵەکان

کاتێك لە بەهاردا بەناو باخچەیەکدا تێدەپەڕین، بۆنی خۆشی گوڵەکان بەرزە دەماخمان دەکەن. خوای گەورە نیعمەتی جوانی و ڕەنگی ڕاکێشەرو بۆنی خۆشی بەخشیوە بەگوڵەکان. ئەو جوانی و بۆنخۆشیەی گوڵانەش وای کردووە، باڵندەو مێروەکان بۆلای خۆیان ڕابکێشن و لەسەر یان بنیشنەوە. کاتێك هەڵدەفڕن و لەسەری لادەچن تۆوی گوڵێك دەبەن بۆ گوڵێکی تر، ئەمەش یارمەتی پەڕینی گوڵەکان دەدات و بەمجۆرە تۆو بەرهەم دێتز بەم ڕێگەیەش دارو گوڵ و ڕووەکەکان زیاد دەکەن. گوڵەکان ڕۆنی جۆراوجۆریان تێدایە، کە بۆنی جیاجیا بە گوڵەکان

دەدەن. لەبەرئەوەی ڕۆنەکە بەردەوام دەبێتە هەڵم، بۆیە بۆن و بەرامەی گوڵەکان لە هەوادا بڵاودەبنەوە. چەندین ڕێگەی جیاواز هەیە بۆ دروست کردنی بۆن. لە زەیتی گوڵەکان. گوڵەکان دەکرێنە دەفرەوەو هەڵمیان لێ دەدرێت. هەڵمە بەرزبوەکە زەیتەکە. لەگەڵ خۆیدا بەرزدەکاتەوەو هەڵمەکە بەسەر ئاودا ڕەوانەدەکرێت. ئەو زەیتەی کە هەڵمەکە هەڵی گرتووە، دەتکێتە سەرئاوەکە و دوای ئەوە، ئاوو زەیتەکە لەیەك جیادەکرێنەوە. چەندین ڕێگەی تریش هەیە بۆ دروستکردنی گوڵ. فەڕنسا بەیەکەم وڵات دادەنرێت لەبەرهەم هێنانی بۆندا. بەرهەم هێنانی ٣١گرام لە بۆن پێویستی بە١١٠کیلۆگرام لە گوڵ هەیە. بۆن لە گوڵەکانی وەکو خەزێم و یاسەمین و گوڵەباخ دەردەهێنرێت ڕەنگی ئەنسۆسیانین لە گوڵدا ڕەنگەکانی سورو شین و وەنەوشەیی بەرهەم دەهێنێت. وەکو چۆن بونی کلۆرۆفیل و کارۆتین وادەکەن لە هەندێك لە گوڵەکانی سەوزبن.

## سودی ڕوەکەکان

هەموومان گرنگی ڕوەکەکان دەزانین، لە ژیانی ڕۆژانەماندا، تائێستا لێکۆڵینەوە لەسەر ژمارەیەکی زۆر لە ڕوەکە جۆراو جۆرەکان کراوە، ئەوانەی کەچەندین جۆر لە مەوادی خۆراکی و دار و سوتەمەنی و خەڵوزو کاغەزو هتد یان لێوە وەردەگرین. سەرەڕای ئەو هەموو مەوادە زۆرانەی لە ڕوەکەکانەوە وەریان دەگرین، دەرمانیشیان لێ دەردەهێنین. ئایا دەزانن ئەو دەرمانانە چین لە ڕوەکەکانەوە دەستمان دەکەون. دەرمانی ((کینین)) کە لەچارەسەری نەخۆشی مەلاریا بەکاردەهێنرێت لە ڕووەکی ((کینا)) ((قەنەقینە)) دەردەهێنرێت ((قەنەقینە)): دارودەوەنێکە لە ناوچە گەرمەکان ئەڕۆیت، گوڵەکەی بە شێوەی هێشوە، بەرەکەی قوچەکیە دەرمانی ((کینا))لە توێکی قەدەکەی دەردەهێنرێت)) دەوای ((قمعية)) ((جۆرە گیایەکە گوڵەکەی لە ڕەحەتی دەچێت)) بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی دڵ بەکاردەهێنرێت. مۆرفینیش لەڕوەکی خەشخاش دەردەهێنرێت، کەبۆ لابردن و چارەسەری هەموو جۆرەکانی ئازار بەکاردەهێنرێت. پەنسەلین و ئەسترۆ بتۆمایسین یش بۆ چارەسەری نەخۆشیە کەڕوییەکان بەکاردەهێنرێت. لە ڕوەکی ڕەزەلەش مادەی سرکەر دەردەهێنرێت. زۆربەی ڤیتامینەکان، کەلەچارەسەری

نەخۆشیە جیاوازەکاندا بەکاردەهێنرێت، لە دارو ڕوەکەکان دەردەهێنرێت. هەمو دەرمانە دژەزیندەییەکان، لەگەڵ دەرمانە پەرێزدەرەکان وەکو کافیین و ئەسپرین لەڕوەك دەردەهێنرێن. کاغەزو ڕیشاڵ و سلیلۆزو لە داران دەردەهێنرێت "ئامادە دەکرێت" وەکو چۆن "مطاط" دەردەهێنرێت. ڕۆنی زەیتونیشی لە داری سنەوبەرەوە، وەردەگیرێت. مادەی (کاد*) یش لە کولاندنی ڕیشاڵی داری سینە مەکێ "کە ڕوەکێکی تەمەن درێژی دەشتەکی پزیشکی‌یە". خوساوەی گەڵاو بەرەکەی بۆ ڕەوان کردن بەکاردێت، بەرەکەی لە خرنوك دەچێت "وەردەگیرێت. زۆرێك لە بۆیاخ و چەوریەکانیش لە دارو ڕوەکەکانەوە دەردەهێنرێت. جگە لە داری سەندەل کە زەیتی سەندەڵو بەخوری لێ دروست دەکرێت. بەو جۆرەش دەبینین ئەگەر ڕوەکەکان نەبایە ژیان لەسەر ڕوی زەوی نەدەبوو.

* کاد: ماددەیەکە لە داری سینەمەکێ و ئەقاقیا، دەردەهێنرێت و لە بورای پزیشکی و بۆیاخ و خۆشە کردنی پێستەدا بەکاردەهێنرێت.

## ماسی بێ ئاو

ماسی بێ ئاو هەمووماں دەزانین کە ماسیەکان ناتوانن بە بێ ئاو بژین. ئەگەر ماسیەك لە ئاو دەرهێنرا لە ماوەیەکی زۆر کورت دا دەمرێت. بەڵام ماسیەك هەیە ناوی "ئەنقلیس" ە کە دەتوانێت لە وشکانیدا بژێت. زۆربەی ماسی ئەنقلیس لە دەریادا دەژین. بەڵام هەندێکیان لە ئاوە سازگارەگانیشدا دەژین. ئەو ماسیانەی لە ئاوە سازگارەکاندا دەژین هیچ کێشەیەك نابینن لە هاتنیان بۆ وشکانی. چونکە دەبێت هێلکەکانیان لە ئاوە سوێرەکاندا دابنێنن. بۆیە دەبێت بیگوێزێتەوە بۆ ئاوە سوێرەکان. کە لە ئاوە سازگارەکانەوە دەچێت بۆ ئاوە سوێرەکان، ناچارە چەند ڕۆژێك بەسەر وشکانیدا بڕۆن. بەڵام لەو ماوەیەدا بەسەر وشکانیدا دەڕوات چۆن نامرێت؟ لاشەی ئەنقلیس مادەیەکی لینجی تێدایە پێی دەوترێت چڵم، ئەم ماددەیە ڕێگە نادات لەو ماوەیەدا ماسیەکە. بەسەر وشکانیەکەدا دەڕوات لاشەی وشك بێتەوە. تەنها لە شەویشدا ئەنقلیسەکان ڕێ دەکەن و بە ڕۆژ لە سێبەرێکدا خۆیان حەشار دەدەن. نێرینەکانیان لە مێینەکان بچوکترن و درێژی نێرەکان لە نێوان ٣٠ بۆ ٥٠ سانتیمەتردایە. لە پێناو زاوزێ کردندا نێر و مێکان دەچنە

قولایی دەریاكانەوە. ماسی ئەنقلیس لە پایزدا سەدان میل دەبڕێت. بۆ گەیشتنە ئاوە قوڵەكان تا هێلكەكانی تێدا دابنێت و خۆی بمرێت. ئەو ماسیە ئەنقلیسانەی كە لە دەریاكانی ئەورووپای ڕۆژئاوادا دۆزرانەوە. لە ئاوە سازگارەكانەوە هاتبوون تا لەوێدا لە ئاوە سوێرەكاندا هێلكەكانیان دابنێن. كاتێك هێلكەكە دەگاتە قۆناغی پرگە (اليرقة) جۆگەلەكان هەڵی دەگرن بەرەو ڕۆژهەڵات و لە ماوەی ٢,٥ تا سێ ساڵدا. ئاوەكان هەڵی دەگرن بۆ ڕێژگەكانی ڕووبارە ئەورووپیەكان و لەوێدا گەشە دەكەن تا دەبنە ماسیەكی گەورە. ڕەنگی ماسی ئەنقلیس قاوەییەكە بە سێبەری ڕەش. پێستەكەی نەرم و شلەو ڕێژەی تەمەنی ١٢ ساڵە. بە زۆری لە بەرمۆدای زەریای ئەتڵەسیدان و ساڵانە ٩٠٠ هەزار كیلۆ گرامیان لێ ڕاو دەكرێت بۆ خواردن.

## دەرزی ئاژن "الوخز بالأبر"

دەرزی ئاژن وەكو جۆرێك لە چارەسەری پزیشكی پێش نزیكەی ٢٥٠٠ ساڵە لە چیندا سەری هەڵدا. ئەم چارەسەرە بریتیەیە لە چەقاندنی دەرزی بە جومگە جیاوازەكانی لەشی مرۆڤدا. پسپۆڕانی دەرزی ئاژن لە چین دا وێنەیەكی ڕێنوماییان دروست كردووە بۆ ئەو شوێنانەی كە دەرزی ئاژن دەكرێت و بریتیەیە لە (٧٨٧) خاڵی جیاواز لەسەر لاشەی مرۆڤدا. ئەم وێنانە تا ئێستاش كاری پێ دەكرێت. بە یارمەتی ئەو وێنانە دەرزی دەچەقێنرێتە ئەو شوێنانەی دیاری كراوە بۆ هەر نەخۆشیەك لە نەخۆشیەكان. بۆ نموونە كەسێك چاوی دێشێت دەرزی دەچەقێنرێتە دەوری چاویدا. دەرزیەكە ناچەقێنرێتە ناو گۆشت و هیچ ئازارێكیشی نیە. هەر چارەسەرێكیش لە دە خولەك ناخایەنێت. دەرزی ئاژن لە چین و یابان و ووڵاتە یەكگرتوەكان و زۆر لە ووڵاتانی تری دونیادا بەكاردەهێنرێت، چارەسەرێكی زۆر كاریگەریشە. بۆ لابردنی ئازار لە زۆر ئەندامی لەشدا. بۆ چارەسەری مەلاریاو تێكچونی گەدەو ئازارەكانی ڕۆماتیزم بەكارهێنراوە لەگەڵ هەندێك نەخۆشی تردا. لە ئێستادا بە شێوەیەكی بەرفراوان بەكاردەهێنرێت بۆ مەبەستی بەنج كردن. لە ساڵی ١٩٧١ دو زانای ئەڵمانی چاودێری نەشتەرگەریەكیان كرد. كە بریتی بوو لە لابردنی تورەكەیەك لە هێلكەدانی خانمێك دا، لە پەكێن دوای بەنج كردنی بە دەرزی ئاژن. تا ئێستا

زانایان نەیان توانیوە تەفسیری ئەوە بکەن کە دەرزی ئاژن چۆن کاری خۆی دەکات. بەلام هەندێکیان وای بۆ دەچن کە دەرزیەکان پشوو بەو دەمارانە دەدات کە کار لە نەخۆشیەکە دەکەن. تێبینی ئەوە کراوە کە چەقاندنی دەرزیەك لە لە خالێکی لەشدا. پەرچە کردار دروست دەکات لە خالێکی دیاریکراودا. بۆچونێکی تر دەلێت هەر نەخۆشیەك لە ئەنجامی تێکچونی پارسەنگە لە هێزی لەشی مرۆڤدا. ئەو تێکچوونەش بە دەرزی ئاژن دروست دەبێتەوە.

## بۆق لە زستاندا لە کوێدا خۆی دەشارێتەوە؟

بۆق گیاندارێکی وشکاویە، بە واتا دەتوانێت لەناو ئاوو لە وشکانیشدا بژێت. بە زۆری لە گۆماوو جۆگەلەو بن گژوگیا شێدارەکانی دەوروبەری ڕووبارەکاندا دەژی. بە جۆرێك دەتوانێت بە ئاسانی بیان بینێت. بەلام لەگەڵ کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمدا لەبەر چاو، ون دەبن و تاکۆتایی مانگی شوبات نابینرێن.

## ئایا دەزانن لە ماوەی وەرزی زستاندا بۆقەکان لە کوێدا خۆیان حەشار دەدەن؟

بۆق سەر بە خێزانی گیاندارە خوێن ساردەکانە. وەکو گیاندارانی تر ئەم گروپەش پلەی گەرمای لەشیان جێگیر نیەو بەپێی ئاوو هەوای دەوروبەریان دەگۆڕێت. کاتێك لە زستاندا پلەی گەرما دادەبەزێت. پلەی گەرمای لەشی بۆقیش دەست بە دابەزین دەکات. لەبەرئەوە فەرمانە جەستەییەکانی خاو دەبێتەوە. بۆق بۆ ئەوەی نەمرێت، دادەبەزێت بۆ قولایی ٦٠ سانتیمەتر لەناو ئاوو قوڕاودا، بە درێژایی وەرزی زستان لەو قولیەدا پشوو دەدات. ئەم پشودانەش پێ ی دەوترێت "سڕبوونی زستانە". لەو ماوەیەدا کارە جەستەییەکانی بۆق خاو دەبێتەوەو لوت و چاوو دەمی دادەخرێت. لە ڕێگەی پێستەوە هەناسە دەدات. بۆ ئەوەی لەو ماوەی سڕبوونی زستانەدا نەمرێت پیوو گلایکۆجین "شەکری جگەر" ی پەسیسە بوو لە لەشیدا بەکار دەبات. لەماوەی سڕبووندا بۆق زۆر لاواز دەبێت، بەلام نامرێت. کە لە کۆتایی زستاندا گەرما بەرەو بەرز بوونەوە دەچێت و لەگەڵ پێکهاتەی بایۆلۆجی دا دەگونجێت. بەهۆش دێت و لەناو قوڕو لیتە دێتە دەرەوە.

که پلەی گەرما زۆر بەرز دەبێتەوەو گۆماوەکان وشك دەکەن، بۆق هیچ چارەیەکی تری نیە جگە لەوەی بگەڕێتەوە بۆ گلە شێدارەکان تا لە ژیاندا بمێنێتەوە. ئەم حاڵەتەش پێی دەوترێت "سڕبوونی هاوینە" بەلام لەگەڵ دەست پێکردنی باران باریندا، جارێکی تر دەچێت بۆ سەر وشکانی.

## چۆن ئاگر بە ئاو دەکوژێتەوە؟

بە شێوەیەکی گشتی ئاو لە کوژاندنەوەی ئاگردا بەکاردێت. کاتێك ئاگرێك لە شوێنێکدا دەکەوێتەوە تیمەکانی ئاگر کوژێنەوە. بۆ کوژاندنەوەی ئاو بەکاردێنن. هەر کە تیمی ئاگر کوژێنەوە نەبوو. خەڵکی بە دۆلکە ئاو ئاگرەکە دەکوژێننەوە.

## ئایا دەزانن ئاگر چۆن بە ئاو دەکوژێتەوە؟

بۆ ئەوەی ئەو دیاردەیە تێبگەین دەبێت سروشت و تایبەتمەندیەکانی ئاگر بزانین. ئاگر لە کارلێکی کیمیاویەوە، واتە لە توخمەکانی ئاگرو تیشکەوە بەرهەم دێت. سێ مەرجی سەرەکی هەن بۆ سووتاندن. یەکەمیان کە زۆر پێویستە بوونی سووتەمەنیە. وەکو دار، کاغەز، خەڵوز و هتد.... مەرجی دووەم بونی ڕێژەیەکی تەواوە لە ئۆکسجین، ئۆکسجینیش لە هەواوە دێت. مەرجی سێیەمیش کە پێویستە گەرم کردنی سوتەمەنیەکەیە، تا ئەو ئەندازەیەی بگاتە ئاستی گڕگرتن. کە سووتەمەنی گەیشتە پلەی گڕگرتن دەست بە سووتان دەکات. ئەڵبەت بە یارمەتی ئۆکسجین لە هەوادا. لەبەرئەوە دەتوانین بە سێ شێوازی جیاواز ئاگر بکوژێنینەوە. لە هەر شێوازێکدا یەکێك لە مەرجەکانی سووتاندنەکە لادەبەین. شێوازی یەکەم بریتیە لە لادانی سووتەمەنیەکە. شێوازی دووەم برینی ئۆکسجینەکەیە شێوازی سێیەمیش لادانی گەرماکەیە لە ئاگرەکە. بە جۆرێك کە پلەی گەرماکە دابەزێت بۆ ئاستی گڕ نەگرتن. کاتێك ئاوێك بە ئاگرێك دا دەکەین. ئاوەکە دەبێتە هۆی دابەزینی پلەی گەرماکە. چونکە ئاوەکە گەرماکە لە ماددە سووتاوەکەدا، دەمژێت و پلەی گەرمای دادەبەزێنێت. لەگەڵ دابەزینی گەرماکە بۆ ژێر پلەی گڕگرتن، سووتەمەنیەکە لە سووتان دەوەستێت. لە حاڵی سووتانی چەوریدا، لەبەرئەوەی ڕۆن لە ئاو سووکترە. هەمیشە چەوریەکە دەکەوێتە سەر

ئاوو دەشێت ئاگرەکە ڕووبەرێکی گەورەتر داگیر بکات. بەڵام ئاگر گرتنی کارەباو کوژاندنەوەی بەهۆی ئاوەوە، دەشێت بە شرۆڤەی کارەباییەوە ببێتە هۆی مردن. تیمەکانی ئاگر کوژێنەوە، بەهۆی دوەم ئۆکسیدی کاربۆنەوە، ئەو جۆرە ئاگرانە دەکوژێننەوە. چون دوەم ئۆکسیدی کاربۆن، ئۆکسجین لە ئاگرەکە دەبڕێت و بەوەش ئاگرەکە دەکوژێتەوە.

## بۆچی ماندوو دەبین؟

دوای ئیش کردن یان ڕاکردن یان مەشقی وەرزشی ماندو دەبین. ئایا بۆچ دەبێت دوای ئیش و کار ماندو ببین؟

کاتێك بە خێرایی ئیشێك ئەنجام دەدەین ماسولکەکانمان ئەوەی پێویستیانە لە ئۆکسجین وەری ناگرن. لەو حاڵەتەدا لاشە پێویستی بە وزەی زیاتر هەیە. گلایکۆجین (شەکری جگەر) ی پەسیسە کراو لە کرداری ترشاندندا دەگۆڕێت بۆ ترشی لبنی. ئەم ترشی لوبنیەش هێزو تواناى ماسولکەکان کەم دەکاتەوە لە ئیش کردندا ئەم حاڵەتەی لاشە بە پەککەوتن دەناسرێت. ترشی لبنی وەکو ژەهری لێدێت ئەگەر توانیمان بەهەر ڕێگەیەك لە ماسولکەکان دەری بێنین، ئەوا جارێکی تر ماسولکەکان وەکو خۆیانیان لێ دێتەوە. لە ئەنجامی کاری بازوییدا مەوادی تر لاوازکەر بەرهەم دێت کە جۆرە ترشیەکە خوێن دەگوێزێتەوە بۆ سەرتاپای لاشەو لە ئەنجامدا لاشەو مێشك تووشی ماندوو بوون دەبن. تەنانەت کاتێك بە کارێکی زەیتی هەڵدەستین دیسان لاشە ترشی لبنی و ئەو ترشیە لاوازکەرە بەرهەم دەهێنێت و توشی ماندوو بوون دەبین. زانایان گەلێك تاقیکردنەوەیان لەم بوارەدا کردووە. جارێکیان سەگێکیان هێندە ماندوو شەکەت کرد خەوی لێکەوت و هەستان بە گواستنەوەی کەمێك لە خوێنەکەی بۆ سەگێکی چالاك. سەگی دووەمیش توشی ماندوو بوون بوو خەوی لێکەوت. ئەنجا هەستان بە گواستنەوەی خوێنی سەگێکی چالاك بۆ سەگێکی ماندوو، دیتیان سەگە ماندووەکە گورجوگۆڵ بووەوە. ماندوو بوون نەك تەنها کردارێکی کیمیاوی بەڵکو کردارێکی بایۆلۆجیشە. چونکە ئالیەتێکی بەرگریە ئاگادارمان دەکاتەوە کە کەی دەبێت لە کار بووەستین و پشوو بدەین. ناتوانین بە خێرایی لە ماندوو بوون

ڕزگارمان ببێت. زۆر پێویستە خانەکانی لەشمان ماوەیەکی زۆر پشوو بدەن بۆ ئەوەی لە ماندوو بوون ڕزگاریان ببێت. خەوتنیش باشترین هۆکارە بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە. چونکە خانە مردووەکانی لاشە ساغ دەکاتەوە. بە گەیشتنی ڕێژەیەکی گونجاو لە ئۆکسجین بۆ لاشە لە ڕێگەی هەناسەوە، ترشی لبنی سەر لە نوێ دەگۆڕێت بۆ گلایکۆجین و دوای ئەوە هەست بە بوژانەوەو ژیانەوە دەکەین. پشوودانی کەم تا ئەندازەیەك ماندوو بوونمان لا دەبات. ئەگەر هەندێك خواردنیش بخۆین گلایکۆجینە لە دەست چوەکەمان بۆ دەگەڕێتەوەو وامان لێدەکات هەست بە برسێتی نەکەین.

## سەمای بالێ کەی پەیدا بوو؟سەمای بالێ چییە؟

جۆرێکە لە سەرگەرمی شانۆیی تیایدا سەماکەر لەگەڵ بیرو بۆچونی شانۆو مۆسیقاکەدا تێکەڵ دەبێت. هەندێك لە سەماکانی بالێ چیرۆکێك دەگێڕنەوە. هەندێکیشیان بیرۆکەیەك یان حاڵەتێکی مرۆڤایەتی باس دەکەن. کاتێك سەمایەکی بالێ دەبینین سەیر دەکەین لەشی مرۆڤەکە بەوپەڕی تواناو جوانیەو تەنسیقەوە دەجوڵێتەوە، بۆ ئەوەی سەما چیەکانی بالێ بە جوانترین شێواز نمایشی خۆیان بکەن پێویستیان بە مەشق و پرۆڤەو ماندوبونێکی زۆر هەیە. تەمەنی بالێ نزیکەی ٥٠٠ ساڵە. لەو کاتەدا کۆڵۆمپس ئەمریکای دۆزیەوە بالێ لە ئیتاڵیادا سەری هەڵدا. لەو سەردەمەدا بالێ شێوەیەك بوو لە شێوەکانی سەرگەرم کردن لای سەرۆك هۆزەکاندا. دەوڵەمەندەکانی ئیتاڵیا خۆیان و میوانەکانیان بە سەماو مۆسیقاو هۆنراوەو نمایش کردنی شانۆیی سەرگەرم دەکرد. لەبەرئەوە یەکەمین سەماچی لە خێزانی پادشایان و دەوڵەمەندانی دەربار بوونە. ئەو کاتەش وەکو ئێستا بالێ پێشکەوتوو نەبووە. تەنها بریتی بووە لە چەند هەنگاوێکی جوان و گونجاوو ئاسان. سەما چیەکانیش بەپێی پەتێو لەسەر پەنجە سەمایان کردووە. بەڵام ناوی بالێ دوای سەد ساڵ بەو سەمایەوە نرا لە کۆشکی هنری سێیەمی پادشای فەرەنسادا. لە ساڵی ١٥٨١ دا شا "کاترین دومدیس" فەرمانی ئاهەنگێکی گەورەی دا لە زەواجی یەکێك لە ئەندامانی خێزانی شازادەکاندا، کە تیایدا سەدان سەماچیەو گۆرانی بێژو شانۆکارو ژن و پیاو بەشداریان کردو

ئەنجامەکەی بالێیەکی قەشەنگ بوو. ئەم ئاهەنگە لە لایەن مۆسیقاری ئیتالی "دوبۆ جوبیوکلس" ەوە ڕێکخرا کە ڕەنگە یەکەم ڕێکخەری سەما بوبێت لە جیهاندا. ناوی "بالێی گاڵتەجاڕی پادشا" لەو ئاهەنگە نرا. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا هەر نمایشێکی لەو جۆرە پێی دەوترێت "باڵێ". ئەو خانمەی ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە باڵێ دا پێی دەوترێت "سەماچی یەکەم" یەکەمین سەماچی لە سەرەتای باڵێ دا بە جوانی سەمای کردبێت کەسێك بووە بە ناوی "لاڤونتین". دوای ئەو زۆر خەڵکی تر گۆڕانکاری و چاکسازیان لە باڵێ دا کرد.

## چۆن ئاژەڵە دایکانەکان بێچووەکانیان دەناسنەوە؟

ئەمڕۆ لە دونیادا زیاتر لە یەك ملیۆن جۆری گیانلەبەر هەیە، هەر لەوانەوە کە هێندە بچوکن بە چاو نابینرێن تا نەهەنگێکی گەورە.

ئایا دەزانن ئەو ئاژەڵانە چۆن بێچووەکانی خۆیان دەناسنەوە؟ ئەو بێچوانەی کە لە لایەن دایك و باوکیانەوە بەخێو دەکرێن زۆر گرنگە بۆ دایك و بێچووەکە بۆ ئەوەی یەکتر بناسنەوە لە یەکتر دا بچڕێن. ئەمەش لە ڕێگەی ئەم چوار هەستەوە دەبێت: بۆن کردن – بیستن – بینین – دەست لێدان.

زۆربەی گیاندارە مەمکدارەکان بەهۆی بۆنەوە بێچوەکانیان دەناسنەوە. ئەمەش بە ئاشکرا لە نێوان ئاسك و بەرخ و ئەسپ و گوێلکی دەریادا دیارە. شایانی باسە مەڕ دەتوانێت لە نێوان چەندین بەرخ دا. بە بۆن بێچوەکەی بناسێتەوە. لە نێوان ئاژەڵانی تردا، کاتێك دایکێك دەزێت، بۆنی بێچوەکەی دەکات و ئەو بۆنە تیایدا دەمێنێتەوە، کاتێك دایکەکە بێچوەکەی ویست، بۆنی هەرچی بێچوەکانی تری دەوروبەری دەکات تا بێچوەکەی دەدۆزێتەوە! بەڵام ناسینەوە لە نێوان باڵندەکاندا، بە دەنگ دەرکردن دەبێت. چونکە هەر دایکێك دەنگێکی تایبەت بەخۆی هەیە، لەگەڵ بێچوەکەی بیستی دەیناسێتەوەو دەزانێت دەنگی دایکی خۆیەتی. زانای سروشت ناسی نەمساوی "دکتۆر کونارد لورینز" لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر قاز کرد. لێکۆڵینەوەکە لەپێش دەرچوونی بێچوەکە لە هێلکە دەستی پێکرد، هەر لەو کاتەوە دایکەکەی لە هێلکەکە دور خستنەوەو بە دیاری هێلکەکەوە دانیشت. کاتێك بێچوەکە لە هێلکەکە دەرچوو

دایکی هێناو دایکی دەنگێکی دەرکرد، لە ئەنجامی ئەوەدا دایکەکە، بەرەو هەچ شوێنێك بڕۆیشتایە بێچوەکە بە شوێنیدا دەچوو. بەڵام بێچوە قازەکان کە ئەو لاشە زلەیان بینی توشی پەشۆکان بوون. لە هەمان کاتدا هەستیان بە خۆشحاڵی دەکردو بە شوێنیدا دەڕۆیشتن و خۆیان بەسەر دەست و پێیدا دەدا. دەست لێدانیش ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە ناسینەوەی بێچودا.

## کارل مارکس کێیە؟

کارل هانریگ مارکس دروست کەری چەرخی نوێ و فەیلەسوف و سیاسی و کۆمەڵ ناس و ئابوری ناسی سەدەی نۆزدەهەم. بیردۆزەکانی کاریگەریەکی زۆر گەورەیان هەبوو لەسەر سیستەمی سیاسی زۆر لە وولاتانی جیهان و پێی دەوترێت "باوکی سۆشیالیستی زانستی" کارل مارکس لە ٥ ی ئایاری ١٨١٨ دا لە شاری تاریری ئەڵمانیا لە خێزانێکی یەهودی لە دایك بوونی "هاندیك" ی باوکی پارێزەرو سیاسیەکی بە توانا بووە. پێش ساڵێك لە لەدایك بوونی "کارل" باوکی بوو بە مەسیحی و کارل لە تەمەنی شەش ساڵیدا نەخۆشێکی خراپ کەوت. لەنێوان ساڵانی ١٨٣٠ و ١٨٣٥ دا کارل لە ناوەندی "تریردا" دەستی بە خوێند کرد. لە تشرینی یەکەمی ١٨٣٥ دا، لە تاقیکردنەوەیەك دەرچوو کە ڕێگەی پێ دەدا لە زانکۆی بۆن بخوێنێت. دوای ساڵێك لە خوێندن بۆنی بەجێ هێشت و پەیوەندی کردە زانکۆی بەرلینەوە. بۆ خوێندنی قانون و فەلسەفە. دوای تەواو کردنی خوێندن، لە ساڵی ١٨٤٣ دا. بوو بە نووسەر لە ڕۆژنامەیەکدا. لەو ساڵەوە تا ساڵی ١٨٤٨ مارکس لە پاریسدا ژیاو جموجوڵە سیاسیەکانی درێژە پێدا. بەڵام بەهۆی بۆچوون و هەڵوێستە سیاسیەکانیەوە، لە پاریس دەرکراو پەنای برد بۆ لەندەن و تا مرن ژیانی لەوێدا گوزەراندا. لە ساڵی ١٨٤٨ بە هاوکاری ئەنگڵزی هاوڕێی کارە بەناوبانگەکەی "البیان الشیوعی" بڵاو کردەوە. لە ساڵی ١٨٤٨ بە دواوە، ئیتر دەتوانرا جیاوازیەك بکرێت لەنێوان ژیان و نوسینەکانی و چالاکیە سیاسیەکانیدا. لە ساڵی ١٨٥٩ دا مارکس کتێبەکەی لە بیردۆزەی ئابوریدا واتە "راس المال" بڵاو کردەوە. کە بە بەناوبانگترین کتێبی دەژمێردرێت. مردنی ژنەکەی لە ٢ ی کانونی یەکەمی ١٨٨١ داو ئەنجا کچەکەی لە ١١ ی کانونی

دووەمی ١٨٨٣ دا، كاریگەریەكی زۆری لەسەری داناو باری تەندروستی بە جارێك خراپ كرد، كە بوە هۆی مردنی خۆیشی لە ساڵی ١٨٨٣ دا. ئەو قوتابخانە فكریەی ماركس و ئەنگڵزی هاوڕێی دروستیان كرد، بە ماركسیەت بەناوبانگەو، ماركسیەتیش بیردۆزەیەكی شۆڕشگێڕی سیاسیە لە سروشتیا داوای دروست كردنی كۆمەڵگایەكی یەكسان دەكات، كە دوور بێت لە چەوساندنەوەو ئیستیغلال كردن، كە دەوڵەت تیایدا لەناو دەچێت و ئامانجی نەهێشتنی موڵكایەتی تایبەتیە، بە گۆڕینی هەموو هۆیەكانی بەرهەم هێنان. بۆ موڵكایەتی گشتیو كاریش بە پێویست دەزانێت بۆ هەموو كەسێك.

## تاقیگەی فەزای ئەمریكی "سكایلاب"

سەردەمی فەزا لە ساڵی ١٩٥٧ وە، دەستی پێكرد، كاتێك یەكێتی سۆڤێتی پێشوو یەكەمین مانگی دەستكرد "سپوتنیك -١"ی ڕەوانەی ئاسمان كرد، لەو كاتە بە دواوە تەكنۆلۆجیای فەزا پێشكەوتنی تازە لەسەر تەكنۆلۆژیای فەزا دەكرێت. لەوانە تاقیكردنەوە گەلێك كە یارمەتی مرۆڤ بدات بۆ ئەوەی ماوەیەكی زۆر لە فەزادا بمێنێتەوە، پرۆژەی تاقیگەی فەزای ئەمریكی "سكایلاب" یەكێكە لەو پرۆژانە، كە ئەگەری مانەوەی تاقیگەی مەداری دەدۆزرێتەوە. لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٧٣ دا دەست كرا بە پرۆژەی سكایلابی ئەمریكی و تا مانگی شوباتی ساڵی ١٩٧٤ درێژەی هەبوو. یەكەمین تاقیگەی فەزایی سكایلاب لە ١٤ ی ئایاری ١٩٧٣ بەبێ سەرنشین ڕەوانەی ئاسمان كرا. لەم گەشتەدا گەلێك شتی گرنگ دۆزرایەوە. بە تایبەت لە دەستدانی كێش لە فەزاداو هی تریش لە بارودۆخی بایۆلۆجی دا. دوومین گەشتی سكایلاب، كە سێ سەرنشینی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و ٢٨ ڕۆژ لە ئاسماندا مانەوە، گەلێك تاقیكردنەوەی بەسوودیان ئەنجام دا. كە وای كرد لە ئەمریكا ٢٨ ی تەموزی ١٩٧٣ دا كە گەشتی سێیەمی سكایلاب بنێرێتە ئاسمان، ئەمجارەشیان سێ سەرنشینی تێدابوو بۆ ماوەی ٥٩ ڕۆژ مانەوەو گەلێك تاقیكردنەوەی بەسوودیان سەبارەت بە دۆزینەوەی فەزا ئەنجام دا. گەشتی چوارەم و پێنجەمی سكایلاب لە شانزەی تشرینی دووەمی ١٩٧٣ دا بوو، بۆ بەرزی ٤٨٠ كیلۆمەترو بۆ ماوەی ٨٤ ڕۆژ. دوای پێنج ساڵ

تاقیگەی فەزا کە کێشی ۷۷ تەن بوو. بەهۆی چالاکی چڕوپڕی خۆرەوە دەستی بە لەناوچوون کردو لە ئەنجامی ئەوەشدا چەند بەشێك لە سکایلاب لەسەر ئوسترالیاو زەریای هندی لە ۱۱ تەموزی ۱۹۷۹ دا کەوتە خوارەوە. خۆشبەختانە ئەم کەوتنە خوارەوەیە هیچ زیانێکی گیانی بە دواوە نەبوو.

## چۆن گیانلەبەران لە شڵەژان ڕزگاریان دەبێت؟

زۆر جار ئاژەڵان وەکو دیلێك خۆیان لەبارودۆخێکدا دەبیننەوە. نە دەتوانن لە دوژمنەکانیان هەڵبێن. نە دەشتوانن لە هەمان کاتدا لە گەڵیاندا بەشەڕ بێن. لە بارودۆخێکی ئاوادا ئەو گیانلەبەرە زۆر دەشڵەژێت و بۆ ڕزگاربوون لەو شڵەژانە، گیانلەبەران کاردانەوەی جۆراوجۆریان هەیە. بۆئەوەی ئالیەتی ڕزگاربوون لەو شڵەژانە تێبگەین، نموونەی قوتابیەك وەردەگرین کە، هەڵەیەکی کردبێت و لەبەردەستی مامۆستاکەیدا گیری خواردبێت قوتابیەکە هەست بە تاوان دەکات و لە هەمان کاتیشدا دەترسێت. بەڵام نە دەتوانێت لەگەڵ مامۆستاکەیدا بەشەڕ بێت. بۆیە خۆی دیلی بارودۆخێك دەبینێتەوە هەرچۆنێك بوە دەبێ لێی ڕزگار بێت. لەبەرئەوە شتێك دەکات کە نیشانەی شڵەژانە. سەری دەخورێنێت، یان لوتی پاك دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بەرەنگاری لە شڵەژانەکەی بکات. ئەم جۆرە جوڵانەش یارمەتی دەدات بۆ کەمکردنەوەی شڵەژانەکەی. بە هەمان شێوە ئەگەر پشیلەیەك لە سوچێکدا مشکێکی بەگیر هێنا، مشکەکە دادەنیشێت و دەم و چاوی پاك دەکاتەوە. بەڵام باڵندەیەك کە لە پشیلەیەك دەترسێت، بە دەنوکی دەنگ دەر دەکات و دەنوکی دەجوڵێنێت. ورچیش لە بارودۆخێکی وادا چەندین جۆر دەنگ دەردەکات. بەهەمان شێوە سەگەکانیش بە وەڕین لە شڵەژانی خۆیان کەم دەکەنەوە. گیانداران بۆ پارسەنگ ڕاگرتنی خۆیان بەو شێوە هەڵسوکەوت دەکەن. هەندێك جار گیانلەبەران لەو بارودۆخەدا زیان لە دڕندەکەیان دەدەن و هەرچی ئەو کاردانەوانەش هەیە هەمووی خۆنەویستە (لا إرادي). نموونەیەك لەسەر ئەو کاردانەوەیە. زانای ڕوسی "ئیڤان پافلۆف" تاقیکردنەوەیەکی بەناوبانگی لەگەڵ هەندێك سەگدا کرد: هەموو جارێك کە نانی بۆ سەگەکان دادەنا لیك لە دەمیان دەهاتە خوارەوە لە هەمان کاتدا کە نانەکەی دادەنا دەیدا لە زەنگ بۆ ئەوەی بێن

نانەکەیان بخۆن ئەم کردارەی چەندین جار دوبارە کردەوە. ئەنجا دای لە زەنگ بێ ئەوەی نانەکەیان بۆ دابنێت، بۆیە سەگەکان ڕاهاتبوون لەسەر پەیوەستی کردنی دەنگی زەنگەڵە لەگەڵ دیمەنی خواردنەکەدا بۆیە هەمان شێوە لیك لە دەمیان عات. ئەمە پێی دەوترێت "کرداری پەرچی مەرجی" کاتێك گیانداران ڕادەهێنرێن بۆ مەبەستێك ئەو شتە بە خۆنەویستی ڕوو دەدات و یەکسەر دەست بە، بەجێهێنانی پەرچەکردار دەکات. ئەمە ئەو ڕێگەیەشە کە خەڵکی فێری، خوێندن و قسەکردن دەبن پێی.

## هەموو بڕبڕەدارەکان کلکیان هەیە، مرۆڤ نەبێت.

جگە لە مرۆڤ، هەموو بڕبڕەدارەکان کلکیان هەیە. زانایان دەڵێن مرۆڤیش لە کۆندا کلکی هەبوە. بەڵام لەبەرئەوەی بەکاری نەهێناوە لەناوچووە، هێشتا شوێنەواری ئەو کلکە لەسەر لاشەی مرۆڤ دیارە.

## ئایا دەزانن ئاژەڵەکان سودی چی لە کلکیان دەبینن؟

کلك دەکەوێتە سەروی کۆمەوە. هەر ئاژەڵێك و بەجۆرێك بەکاری دەهێنێت. لە ماسیدا بە پەڕەکە دەورە دراوە. لێکۆڵەرەوان لێکۆڵینەوەی زۆریان کردووە لەسەر کلك و چۆنیەتی گەشە سەندنی لە بڕبڕەدارە ئاویەکاندا. ماسیەکان جۆری کلکیان زۆرە کە یارمەتیان دەدات لە مەلەوانی کردن و جوڵان بەرەو سەرەوەدا. لە نەهەنگ و تیمساحدا کلك وەکو ئەندامێکی بەهێزی جوڵاندنەوە بەکاردەهێنرێت. لە بۆق دا لە قۆناغی یەکەمدا کلك هەیە. بەڵام کە گەورە دەبێت نامێنێت. بەڵام ئەو کلکەی کە لە بچوکیدا هەیەتی یارمەتی جوڵانەوەی دەدات لە ئاوو وشکانیدا. لە هەموو خشۆکەکاندا کلك هەیە. بەڵام درێژیەکانیان جیاوازە. لە کیسەڵ دا کورتەو لە مارمێلکەدا درێژە. هەر کە بکەوێتە بەر هێرش مارمێلکە بەشێك لە کلکی فڕێ دەدات وەکو ڕێگە چارەیەك بۆ بەرەنگاری کردن لە خۆی. خشۆکەکان بە یارمەتی کلکیان خۆیان پێچ دەدەن. کلکی مار زۆر بچوکە، مارەکان وەکو کۆگایەك بۆ ڕۆن بەکاری دەهێنێت. بەڵام کلك لە ماسی ئاویدا بچوکەو، لە سەوڵ دەچێت و بۆ مەلەوانی کردن بە کاری دەهێنێت. کلك لە باڵندەکاندا زۆر کورتن و یارمەتی

فڕینیان دەدات. زۆربەی مەمکدارەکان کلکیان هەیە. لە مێرووەکانیشدا گیزگیزە بە یارمەتی کلکی دەفڕێت. بەڵام مرۆڤ کلکی نیە. لە نەهەنگەکاندا دو پەڕەکەی کلکێکی لای ڕاست و یەکێکی تری لەلای چەپەوە هەیە، کە یارمەتی نەهەنگەکە دەدەن بۆ مەلەوانی کردن. کلکی ئەسپ درێژو توکنە. سمۆرە کاتێك لە زستاندا لێی دەنوێت کلکە توکنەکەی بە خۆیدا دەدات. کەروێشکەکانیش کلکیان وەکو هێمایەك بۆ وریایی بەکاردەهێنن. تاوسەکانیش بۆ مەبەستی سێکسی کلکیان بڵاودەکەنەوە.

## کافور پێش ئەوەی بگۆڕێت بۆ شلە دەگۆڕێت بۆ گاز

مادده ڕەقەکان بە گەرمکردن دەگۆڕێن بۆ شلە و ئەگەر زیاتر گەرمیان کەین دەگۆڕێن بۆ گاز. کاتێك پارچە بەفرێك دەکەینە دەفرێکەوە. دوای ماوەیەك دەبێتە ئاوو پاش ماوەیەکی تریش ئاوەکە دەبێتە هەڵم. بەڵام هەندێك مەواد یەکسەر لە دۆخی ڕەقیەوە دەگۆڕێت بۆ گاز ئەو مەوادانە بە "لەناوچو" وەسف دەکرێن و کرداری گۆڕانەکەش ڕاستەخۆ لە ڕەقیەوە بۆ گازی پێی دەوترێت "گەرم بوون".

## ئایا دەزانن "گەرم بوون" بۆچی ڕوو دەدات؟

وەکو دەزانین هەموو مەوادەکان لە گەردیلەو گەردیلۆکە پێك دێن. ئەو گەردیلانەش بە هێزی ڕاکێشان بەیەکەوە جۆش دەخۆن. ئەگەر هێزی ڕاکێشان لاواز بوو ئەوا دەکرێت بە ئاسانی لە یەکتریان جیا بکەینەوە. لە پارچە بەفرێکدا هێزی ڕاکێشان زۆر لاوازە. بە تۆزێك گەرما بەفرەکە دەتوێتەوەو دەبێتە ئاوو بە گەرمای زیاتر گەردیلەکانی ئاو لە یەکتر جیا دەبنەوەو دەگۆڕێن بۆ هەڵمی ئاو. ئەگەر پارچە کافورێك لە دەشتێکدا دابنێین، زۆر بە ئاسانی دەبێتە هەڵم بێ ئەوەی یەکەمجار بتوێتەوە. هۆیەکەشی ئەوەیە کە هێزی ڕاکێشان لە گەردیلەکانی کافوردا زۆر لاوازە. لە گەردیلەکانی بەفر زۆر لاوازترە. پارچەیەکی بچووکی کافور بۆنێکی زۆر دەردەکات. بەواتا گەردیلەکانی کافور تەنانەت. لە پلەیەکی گەرمای ئاسایدا بۆنەکەی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە. تەنها گەرمای کەش بەسە بۆ جیاکردنەوەی گەردیلەکانی کافور لە یەکتر. بەڵام کافور لە پلەی گەرمای ۱۷۹

پلەی سەدیدا دەتوێتەوە بۆ شلە. لەگەڵ توایەوە شلەکە گڕ دەگرێت و دەسوتێت. ئەگەر ئۆکسجینی لێ ببڕین. کافورەکە دەگۆڕێت بۆ شلە. شلەی کافور ڕەنگی نیە.

## بۆچی پشیلە مرەمڕ دەکات؟

کاتێك پشیلە، دەیەوێت دڵخۆشی یان بێزاری خۆی دەربڕێت مرەمڕ دەکات. مرەمڕ جۆرێکە لە دەنگی خێرا، کە پەیوەندی بە دەنگی ڕاستەقینەی پشیلەوە نیە. پشیلە دایکانەکان کاتێك بیانەوێت، بانگی بێچووەکانیان بکەن بۆ ئەوەی تێریان کەن. دەمرخێنن، چونکە بێچووە پشیلەکان، لە کاتی لە دایك بوونیاندا، نە دەتوانن ببیستن نە ببینن نە بۆن بکەن. لەبەرئەوە یەکەم ماوەی دوای لە دایك بوون، مرەمڕ یارمەتی بێچووەکان دەدات تا پەیوەندی بکەنە دایکەکانیانەوە. کاتێك بێچووەکان دەست بە شیر خواردن دەکەن. دایکەکە لە مرەمڕ دەوەستێت لەبەرئەوە مرەمڕ وەکو جۆرێك لە جۆرەکانی گرتنەخۆ دەست پێ دەکات! پرسیار ئەمەیە، چۆنۆ پشیلە ئەو مرەمرە دروست دەکات؟ مرەمڕ لە ئەنجامی لەرینەوەی ژێ دەنگیەکانی پشیلەوە دروست دەبێت. کاتێك پشیلە هەوا هەڵدەمژێت، دەیباتە ناو سیەکانەوەو هەواکە لە ڕێگەی قوڕگیەوە دەچێت کە ژێ دەنگیەکانی تێدایە. ئەگەر پشیلە بیەوێت ڕازی بوونی خۆی دەربڕێت لەسەر شتێك. ئەوا ڕێگە دەدات بە ژێ دەنگیەکانی کاتێك هەوایان پێدا دەچێت بۆ سیەکان و بلەرێنەوە. لەکاتی هەناسەداندا. لەگەڵ ئەوەی لە خێزانی پشیلەکان، ئەندامی تری وەکو شێرو پڵنگ و کۆچەر "شێری ئەمریکی" و یاغور "پڵنگی ئەمریکی ئیستیوانی نیتکە نیتکە" ئالۆت "ئاژەڵێکی ئەمریکیە کە لە پڵنگ دەچێت" زۆرن. بەلام پێکهاتەی قوڕگیان لەگەڵ قوڕگی پشیلەدا جیاوازە. بۆیە ئەم ئاژەڵانە ناتوانن بمرێنن بەلام دەتوانن دەنگی جۆراو جۆر دەرکەن.

## ئایا ماسی دەتوانێت ببیستێت؟

ئامۆترین ڕاستی ئەوەیە تۆ ناتوانی هیچ لە ماسی ببیسی، بەلام بە دڵنیاییەوە ئەو دەتوانێت دەنگی تۆ ببیسێت. ماسیەکان ئالیەتی بیستنیان هەیە. دوو گوێیان هەیە. بەلام نەك وەکو هەردوو گوێی مرۆڤ، گوێی ماسی دو گوێی بچوکن لە

هەردوو لای سەرەوە. کە پەیوەستە بە گوێی ناوەوە. لەبەرئەوەی ماسی گوێی دەرەوەی نیە بۆ ئاراستە کردنی دەنگ. بۆیە دەشێت ئەو دوو گوێیە وەکو گوێی ئێمە نەبن بۆ بیستن، بەڵام ماسیەکان ڕێگەی تریان هەیە بۆ وەرگرتنی دەنگەکان یان لەرینەوەکان لە ئاودا. لە هەر دیوێکی لاشەی ماسیەوە ڕیزێك کونی بچوك هەیە. کە دەتوانێت لەرینەوەکان و گۆڕانەکانی پاڵە پەستۆ لە ئاودا وەرگرێت. بەوەش نامەیەك دەنێرێت بۆ مێشك. ئەو ڕێژە کونەش پێی دەوترێت "ڕیزی تەنیشتی" کە دەتوانرێت بە ئاسانی ببینرێت. ماسی دەتوانێت بە بەکارهێنانی ئەو "ڕیزە تەنیشتە" خۆی لە هەموو مەترسیەك بپارێزێت. چونکە زۆر هەستیارە، بۆ گۆڕانکاری پاڵە پەستۆ کە لەرینەوەی ماسیەکانی تر یان تەنەکانی تر دروستی دەکەن. جۆرێك لە ماسیەکانی تر بۆ نموونە ماسی "سەلور" کە لە ئاوە قوڕاویەکاندا دەژێت. سمێڵێکی درێژی پێوەیە کە زۆر هەستیارەو یارمەتی زانینی گۆڕانکاریەکانی دەدات. ماسیەکانی خێزانی سورە ماسی، ئێسقانی زۆر ورد لە سەریاندا هەیە. کە پەیوەستە بە تورەکەی مەلەوانیەوە. ئەو تورەکەیەش وا دەکات ماسیەکە، بە شێوەیەکی ستوونی لە ئاودا بوەستێت. هەروەها وەکو تابلۆیەکیش بچوکترین لەرینەوە. وەردەگرێت و لە ڕێگەی ئێسقانەکانەوە ڕەوانەی گوێی ناوخۆ دەکات. ئەمانە ئەو ئالیەتە جۆراوجۆرانەن کە ماسیەکان بە هۆیانەوە دەتوانن تەنانەت کەمترین دەنگ ببیسن.

## ماسی بە وەشاندنی ئاو خۆراکی خۆی پەیدا دەکات؟

ماسیەکان ژمارەیان لە هەموو بڕبڕەدارەکان زۆرترە. کە لە ٢٥ هەزار جۆر تێدەپەڕێت. هەر جۆرێك و شێوازێکی خۆی هەیە لە کۆکردنەوەی خۆراکیدا. ماسی "وەشێنەر" جۆرێکە کە دەتوانێت، بە وەشاندنی ئاوو مێرووەکان لەسەر لقی دارەکان بخاتە خوارەوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە جوانی نیشانی خۆی دەپێکێت و دەتوانێت لە دووری چوار پێوە نێچیرەکەی بخاتە خوارەوەو بیگرێت و بیخوات. ئەوەی کە جێی سەرسوڕمانە چۆن ماسی "وەشێنەر" دەتوانێت ئەو ئاوە بوەشێنێت بەو وردیەو لەو ماوە دورەوە. ئەویش بە گۆل کردنی سەقفی دەمی لەگەڵ داخستنی پەردەی کەپوەکانی. لەناکاو ئاوەکە لە ژووری کەپوەکانەوە

فیشقه دەکات بەرەو ناو دەم، لە هەمان کاتدا زمان بەرز دەبێتەوە، بە جۆرێك کە گۆلەکە دەگۆڕێت بۆ بۆریەکی درێژو ئاوەکە دەبێتە هێلێکی ڕاست. ماسی وەشێنەر لەو جۆرە ماسیانەیە، کە لە ئاوە سازگارەکاندا دەژێت و سەر بە خێزانی، ماسیە وەشێنەرەکانە کە لە هندو هندی چینی دەژین ناوەکەشی لە شێوەی پەیداکردنی خواردنەکەیەوە هاتووە. ماسی وەشێنەر دەتوانێت لە ئاوە سوێرەکانیشدا بژێت. بەناوبانگترین ماسی وەشێنەر جۆرێکە ناوی "توکسوتیز"ە Toxotese کە درێژیەکەی دەگاتە ١٨ سانتیمەتر. تا ئێستا زانایان لێکۆڵینەوەیان لەسەر پێنج جۆر لەو ماسیانە کردووە کە لەسەر مێرووەکان دەژین.

## جۆن کالْفن کێ بوو؟

جۆن کالْفن یەکێك بوو لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی "چاکسازی" کە بزوتنەوەیەکی ئایینی مەسیحی بوو لە سەدەی شازدەهەمدا ئەوروپای گرتەوەو دونیای مەسیحیەتی کردە دوو بەشەوە، کاسۆلیك و پرۆتستانت. کالْفن لە ١٠ی تەمووزی ١٥٠٩ لە فەرەنسا لە دایك بوو. دوای ئەوەی لاتینی و فەلسەفەو مەنتیقی خوێند، بیروباوەڕی نوێی پرۆتستانتی وەرگرت. ناچار بوو بەهۆی بیرو باوەڕە ئاینیەکانیەوە لە ساڵی ١٥٣٦دا فەرەنسا بەجێ بهێڵێت و بچێت بۆ جنێفی سویسرا، جگە لە ماوەیەکی کەمی تەمەنی نەبێت هەموو تەمەنی لەوێدا بەسەر برد. بە سەرکردایەتی ئەو جنێف بوو بە مەڵبەندی پرۆتستانت.کەنیسە لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە یاسای بۆ شار دانا. یاساکانیش زۆر سەخت بوون. سەپاندیە سەر خەڵکی جنێف دا کە دەبێت زۆر تێکۆشەرو دڵسۆزو دونیا نەویست بن. سەماو گۆرانی لێ قەدەغە کردن جگە لە تەراتیلە ئایینیەکان نەبێت. سزای سەرپێچیکەران زۆر سەخت بوو. ئایینی کالْفن زۆر سەخت بوو. بڕوای وابوو کە مرۆڤ تاوانبارە بە گوناهو بە ڕەحمەتی خودا نەبێت لێی ڕزگاری نابێت. کالْفن لە ٢٧ ی ئایاری ١٥٦٤دا کۆچی دوایی کرد. بەلأم ڕێنومایییەکانی لە دوای خۆی لە جنێف و زۆربەی ئەوروپای ڕۆژئاوادا بلأوبوەوە. بیوریتانە ئینگلیزەکان کە لە سەدەی حەڤدە هەمدا کۆچیان کرد بۆ ئەمریکا لە شوێن کەوتووەکانی ئەو بوون.

كەنیسە برسبیتریەكان و هی تریش لە كەنیسە چاكسازیەكان لە بنەڕەتدا بیروباوەڕە ئاینیەكانیان لە ڕێنومایيەكانی كاڵفنەوە وەرگرتووە.

## داروین

خەڵكی بۆ ماوەیەكی زۆر باوەڕیان وابوو، هەر شێوەیەك لە شێوەكانی ژیان، بە جیاواز لەوی تر پەیدا بووە. بەڵام شارلز داروین یەكەم زانا بوو پێچەوانەی ئەو بۆچوونە وەستاو بنەمای بیردۆزەی "نەش و نوماو گەشەكردن"ی دانا. بەپێی ئەو بیردۆزەیە داروین دەڵێت: نەش و نوماو گەشەكردن كردارێكە كە هەموو شتە زیندووەكان لە بنەمایەكی هاوبەشەوە هاتوون، كە پێشی ملیۆنەها ساڵە ژیاون و هەموو ڕووەكەكان و گیانداران بە شێوەیەكی ڕێك و پێك پێشكەوتوون و ئەو گۆڕانكاریانە تا ئێستاش بەردەوامە. داروین لە ساڵی ١٨٠٩ لە دایك بوو. خوێندنی لە زانكۆی ئەونبەرە تەواو كردوە. زۆر گرنگی دەدا بە لێكۆڵینەوە لەسەر گیانداران. كە گەیشتە تەمەنی بیست ساڵی، بە كەشی ئینگلیزی "بیگڵ" هەلی گەڕانێكی پێنج ساڵی بۆ هەڵكەوت. لەو پێنج ساڵەدا داروین توانی زۆر لە وڵاتانی دونیا ببینێت و لێكۆڵینەوە لەسەر جۆرەها گیاندار بكات. كە لە گەشتەكەی گەڕایەوە. كتێبێكی سەبارەت بە گەشتەكەی نووسی بە ناوی "اصل الانواع" و لە ساڵی ١٨٥٩دا بڵاوی كردەوە. "اصل الانواع" هەوڵی داوە بەپێی لێكۆڵینەوەكانی داروین بیسەلمێنێت كە ئەو شێوەیەی ئێستای گیانداران دوای چەندین نەوە لە پێشكەوتن بوەو هەمووشیان یەك بنەچەكیان هەیە. سەرەڕای ئەوەش بیردۆزەكەی سەبارەت بە "تاقیكردنەوەی سروشتی" دەڵێت: لە ململانێ لە پێناو ژیاندا مانەوە چاكترەو هەموو گیاندارێكیش تۆزێك جیاوازی دەبێت لەگەڵ نەوەی پێشی خۆیداو هەموو جۆرەكان بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار گەیشتوونەتە ئەم شێوەیەی ئێستایان. داروین هەموو ژیانی بۆ لێكۆڵینەوە تەرخان كرد لەسەر كێشە ئاڵۆزەكانی زیندەوەران لە ساڵی ١٨٨٢دا كۆچی دوایی كردو چوار كوڕی لە شوێن بەجێما كە هەر چواریان بوون بە چوار زانای زۆر گەورە.

## دەشێت بەرزی دارێك بگاتە چەند؟

لەوانەیە توشی سەرسوڕمان بیت، کە بزانێت داری وا گەورە هەیە لە دارستانە چڕەکانی کالیفۆرنیادا. زیاتر لە ۲۰۰۰ تەنە. ئەم دارە نزیکەی ۳۰هەزار پێی سێ جار دارمان دەداتێ. یەك داری لەو جۆرە لە باخچەی "سکۆی نیشتمانی" دا هەیە لە کالیفۆرنیا. تیرەی قەدی ئەم دارە: لە نزیکی زەویەوە ۱۰ مەترەو بەرزیەکەشی دەگاتە ۹۰ مەتر. ئەم پیرە دارە پێی دەوترێت "سکۆی" ئەم دارە دوو تایبەتمەندی هەیە. یەکەمیان، لە قەدو قەبارەدا زۆر گەورەیە. دووەمیشیان زۆر تەمەن دەکات، دەڵێن دەشێت ٤٠٠ ساڵ تەمەن بکات. سەبارەت بە بەرزی داری "ئۆکالبتۆز" پلەی یەکەم وەردەگرێت و سەدان جۆری هەیە. بەرزترین داری ئۆکالبتۆز لە باشوری ئوسترالیادایە. کە بەرزیەکەی دەگاتە ۹۵ مەترو ڕۆنی ئۆکالبتۆز لە گەڵای ئەم دارە، دەردەهێنرێت. لەگەڵ ئەوەی لە داری سکۆی بەرزترە، بەڵام بە گەورەی هەر هێندەی داری سکۆیە. ئەمیش تیرەی قەدەکەی دەگاتە ۱۰ مەتر. ئەم دارە بۆ مرۆڤ سوودی زۆرەو لە توێکڵەکەی جۆرەها پەت و جل وبەرگ دروست دەکرێت. لە ئەنجامی نەرمی و ناسکی دارەکەی. هەندێك لە دانیشتوانی دارستان هلۆڵی دەکەن و تیایدا دەژین. لە هەندێك شوێنیشدا ونیان کردوەو، وەکو جادە پێیدا هاتوچۆ دەکەن!

* ئۆکالبتۆز: دارێکە گەڵاکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردەهێنرێت.

## بیردۆزەی ڕێژەیی "ئینیشتاین"

دەڵێن کاتێك بۆ یەکەمجار ئەو بیردۆزەیە بڵاوکرایەوە، تەنها دە زانا لێی تێگەیشتن. لەبەرئەوە بە درێژی باسی ناکەین، بەڵانم خراپ نیە ئەگەر بیرۆکەیەکی گشتی لەسەر وەربگرین. مرۆڤ لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی ڕۆژانەیدا زانیوێتی کە جوڵە شتێکی ڕێژەییە. ئەمەش مانای وایە بە پەیوەندی لەگەڵ شتەکانی تردا پێوانە دەکرێت. بۆ نمونە: کاتێك تۆ لە فارغۆنێ‌شەمەندەفەرێکدا دادەنیشیت و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکەیت. کە دەبینیت شتەکان بە خێرایی دەجوڵێنەوە بەوەدا دەزانیت تۆ دەجوڵێیتەوە. بەڵام ئەگەر کەسێك لە بەرامبەرتدا

دانیشت ئەگەر خۆت بەو کەسە پێوانە بکەیت، ئەوا تۆ ناجوڵێیتەوە. لەبەرئەوە بوونی جوڵە مانایەکی دەبێت ئەگەر لەسەر شتێکی نەجوڵاوە وەربگیرێت. ئەمەش ئەو بەشە بنەڕەتییەیە لە بیردۆزەکەی ئینشتاین. کە دەتوانین بەم جۆرە باسی بکەین. جوڵەی تەنێك بە خێراییەکی ڕێك و پێك لە فەزادا دەجوڵێتەوە کە ناتوانین بەچاودێری تەنیا لاشە ببینین. بەشی دووەمیش لە بیردۆزەکەی ئینیشتاین دەڵێت: خێرایی تیشك ئەو تەنها ڕێژە ڕەها نەگۆڕەیە. ئێمە دەزانین خێرایی تیشك نزیکەی ١٨٦٠٠٠ میلە لە چرکەیەکدا. ئەگەر ئۆتۆمبێلێك بە خێرایی ٦٠ میل بڕوات لە کاتژمێرێکدا بە واتا خێراییەکەی ٦٠ میلە لە کاتژمێرێکدا. ئەگەر پێوانە بکرێت کە ڕاوەستاوە. بەڵام ئەگەر ئۆتۆمبێلێکی تر بە هەمان ئاڕاستەداو بە خێرایی ٤٠ میل بڕوات. کەواتە ئۆتۆمبێلی یەکەم خێراییەکەی ٢٠ میلە لە کاتژمێرێکدا. بەڵام ئەگەر ئۆتۆمبێلی دووەم ئاڕاستەکەی پێچەوانە بێت. ئەوا خێرایی هەریەکەیان بۆ ئەوی تریان ١٠٠ میلە لە کاتژمێرێکدا. بەپێی بیردۆزەکەی ئینشتاین: ئەگەر خێرایی تیشك بە هەمان ڕێگە بپێورێت، ئەوا هیچ کاریگەریەك ڕوونادات. چونکە تیشکی ڕووناکیەکە بە خێرایی ١٨٦٠٠٠ میل دەڕوات لە چرکەیەکدا. ئەمە بیرۆکەیەکی گشتی بوو لەسەر بیردۆزی ڕێژەیی کە ئینیشتاین دایناوە، لەو شتانەی تر کە باسی دەکات، قەبارەو ووزەیە، کە چۆن دەتوانرێت هەریەکەیان بگۆردرێت بۆ ئەوی تریان.

## مارمێلکەی سەوز جوانترینی خشۆکەکانە.

لەسەر زەویدا نزیکەی ٥٠٠٠ جۆر لە خشۆك هەیە. لەوانە مارمێلکە، کیسەڵ، تیمساحەکان وهتد... زۆربەی خشۆکەکان لە گۆماوەکاندا دەژین. هەندێکیشیان لە ئاودا، درێژییان لە نێوان پێنج سانتیمەترو دە مەتردایە. بچوکترین مارمێلکە لە ناوچە ئیستیوائیەکاندایە گەورەترینیشیان ماری (ئەسلە)یە. هەموو خشۆکەکان لە گیاندارە خوێن ساردەکانن. لەگەڵ ئەوەی لە هەموو شوێنێکی زەویدا هەن، بەڵام بەزۆری لە ناوچە ئیستیوائیەکاندان. مارمێلکەی سەوزی ئەورووپی جوانترینی خشۆکەکانەو دووەم گەورەترین مارمێلکەیە لە ئەورووپادا. درێژی نێرەکەیان ٤٠ سانتیمەترە، تەنها درێژی کلکی ٢٥ سانتیمەترە. لە هەموو

کیشوەری ئەورووپادا مارمێلکەی سەوز هەیە. بەڵام لە بەریتانیادا ئەم گیاندارە دەگمەنەو هەوڵی زۆر درا جێگایەکی تایبەتیان بۆ دروست بکرێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. مارمێلکەی سەوز لە دوکانی فرۆشتنی ئاژەڵەماڵیەکاندا دەفرۆشرێت. خەڵکیش لەبەر ڕەنگە جوانەکەی دەیکڕن. ئەگەر کەش و هەوای گونجاوی بۆ نەڕەخسێت ئەستەمە لە ماڵدا بەخێو بکرێت. مارمێلکەی سەوز خواردنی لەسەر مێروو جاڵجاڵۆکەو کرمی زەویە.

## چەند جۆر پرتەقاڵ هەیە؟

کەس بەتەواوی نازانێت شوێنی سەرهەڵدانی پرتەقاڵ کوێ بووە. لەگەڵ ئەوەی پرتەقاڵ ئەمڕۆ لەزۆربەی شوێنەگەرمەکانی دونیادا شین دەبێت. بەڵام بەروبومەکەی ماوەیەکی زۆرکەمە بڵاوبۆتەوە. ئەغریق و ڕۆمانەکان لەسەر پرتەقاڵ شتیان زانیوە. لەوانەیە لەهندەوە چوبێتە ڕۆژئاوای ئاسیاوە و لەوێشەوە بۆ هەموو ئورووپا. دوای دروست کردنی یەکەم موستعمەرە تیایدا، لەساڵی ١٥٦٥دا. داگیرکەرانی ئیسپانیا لەگەڵ خۆیاندا پرتەقاڵی تریشیان بردە ئەندێزی ڕۆژئاوا و فلۆریداوە.

سێ جۆرە گرنگەکەی پرتەقاڵ بریتین لە پرتەقاڵی شیرین، پرتەقاڵی مەندەرین یان یوسفی، پرتەقاڵی ترش. تەنها جۆرەکانی پرتەقاڵی شیرین و مەندەرین نزیکەی ٩٧جۆرن. چەندین جۆری تری پرتەقاڵ ' لەناوچە جیاجیاکانی دونیادا دەڕوێنرێت. لەجۆرە سەیرەکانی پرتەقاڵ جۆری ((خوێنی زەغول))ە. کەناوەکەی سورێکی تێرەو بە زۆری لە حەوزی دەریای سپی ناوەڕاستدا کشت دەکرێت. بەڵام پرتەقاڵی ترش لەهەموو شوێنێکدا دەڕوێنرێت. ئیسپانیا بەناوبانگە بەبەرهەم هێنانی ڕێژەیەکی بازرگانی لێی. بەکارهێنانی سەرەکیشی بۆ دروستکردنی مرەبایە. لەبەرئەوەی تامەکەی وەکو میوەیەك تاڵە بەهۆی ئەوترشییە زۆرەی کەتێیدایە. بەڵام کەدەکرێتە مرەبا شیرین دەبێت. بەکارهێنانەکانی تری لەنێوان بەکارهێناندایە لە پیشەسازی بۆن و پیشەسازی دەرماندا.

## ڕۆن

لە لاشەی ئاژەڵان و ڕووەکاندا، ڕۆن هەیە کە دەشێت شل یان ڕەق بێت. بەڵام زۆربەی ڕۆنی ئاژەڵان ڕەقن. بە ڕۆنی شل دەوترێت (زەیت) بەڵام هەموو زەیتێك ڕۆن نیە. سیفەتێك هەیە کە هەموو ڕۆنە شل و ڕەقەکان کۆ دەکاتەوە، ئەوەیە کە لە ئاودا ناتوێنەوە، بەڵکو ئاو ڕۆنیش تەڕ ناکات. لەبەرئەوەی ئاو لە ڕۆن سوکترە بۆیە ڕۆن دەکەوێتە سەر ئاو. لێکۆڵینەوە کیمیاویەکان لەسەر ڕۆن دەریان خستووە کە هەموویان لە سێ توخم پێك دێن: خەڵوز، هایدرۆجین، ئۆکسجین. لەبەرئەوەی ڕۆنەکان تێکەڵەی ئەندامین، دەشێت بەهۆی کرداری کیمیاویەوە لە یەك جودا بکرێنەوە بۆ دوو تێکەڵە. یەکەمیان (گلیسرین). دووەمیشیان پێی دەوترێت (ترشی ڕۆنی). ئەوەی وا دەکات ڕۆن و زەیتەکان لە یەکتر جیاواز بن، جۆری ئەو ترشی ڕۆنیەیە کە تیایاندایە. ڕۆن لە ئاودا ناتوێتەوە. بەڵام دەتوانین لە چەند جۆرێك شلەدا بیتوێنینەوە، وەکو بەنزین (شلەیەکی گەرکە لە قەترانی خەڵوز دەردەهێنرێت و لە دروست کردنی سکرین و ئەسپریندا بەکاردەهێنرێت) ئەو بەنزینە نیە کە لە پەترۆڵ دەردەهێنرێت. کە ڕۆنەکە دەکوڵێنین لەگەڵ تفتیەکەدا، شیتەڵ دەبێت بۆ گلسرین و صابوون. صابوون لە خوێیەکی تفت نەبێت لە ترشی ڕۆنی. هیچی تر نیە. ئەم کردارەش پێی دەوترێت بە صابوون کردن. کاتێك ڕۆنەکە دەشڵەقێنرێت و دەکرێت بە ئاو هەندێك صابوونی تیایە شیتەڵ دەبێت بۆ پارچەی وورد ووردو وا دەکات کە ئاوە صابووناویەکە وەکو شیر دیار بێت. ئەم کردارەش پێی دەوترێت (بەشیر کردن). سەرەڕای کاربۆهیدرات (شەکر و نیشاستە) و پرۆتینات، ڕۆنەکان یەکێکن لە سێ کۆمەڵە سەرەکیەکەی خۆراکی مرۆڤ. لە لاشەدا بە شیر بوون دەبێت و ئەنجا دەسووتێت. ئەم کردارەش ووزەمان دەداتێ. لە پێوانی نرخی ووزەدا ٣٠ گرام لە ڕۆن یەکسانە بە نزیکەی ٦٠ گرام لە کاربۆهیدرات و پرۆتین. ڕۆنە شل و ڕەقەکان. ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەر هەوادا بن بۆگەن دەکەن. هەرکاتێك ترشیە ڕۆنیەکە گۆڕانی کیمیاوی بەسەردا هات و شیتەڵ بوو ئەو کاتە بۆگەن دەکەن.

## خەڵوز چۆن دروست دەبێت؟

خەڵوز سووتەمەنیەکە، کە زۆر بەکاردەهێنرێت و لە کانە خەڵوزەکان دەردەهێنرێت. گەورەیی‌و بەرفراوانی ئەو کانانە چەندین میل دەبێت، خەڵوز بە چینی ئەستوورو لووس لە کانەکاندا هەیە. ئەستووری ئەو چینانە لەنێوان چەند سانتیمەترێك و چەند مەترێك دایە. لەو کانە خەڵوزانەدا هەزاران کرێکارو ئەندازیار بە بەردەوامی ئیش دەکەن.

## ئایا دەزانن خەڵوز چۆن دروست دەبێت؟

دروست بوونی خەڵوز بۆ یەکەم جار پێش لە ٢٥٠ ملیۆن ساڵ بووە. لە "چەرخی خەڵوز" دا. گۆی زەوی لەو سەردەمەدا پڕ بووە لە زۆنگاو. کە تیایدا ڕووەك و داری زوو پێگەیشتوو ڕوواوە وەکو داری "قژی کەنیشك Fren" بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار ئەو ڕووەك و دارانە مردن و کەوتنە ئاوی زۆنگاوە هێمنەکانەوە. بەڵام بەهۆی نەبوونی ڕێژەیەکی تەواو لە هەوا، بە تەواوی شیتەڵ نەبوون. بەکتریا بەشەکانی ئەو دارانەی شیتەڵ کردوو گۆڕی بۆ ماددەیەکی لینج کە پێی دەوترێت (الخث) بە درێژایی سەدان ساڵ ئەو لم و قوڕانە لەسەر ئەو (الخثان) کۆبوونەوەو بەهۆی گەرمی و پاڵەپەستۆی چینەکانی زەویەوە چینەکانی (الخث) گۆڕان بۆ جۆرێك لە خەڵوزی بەردی و سەرەنجامیش گۆڕا بۆ خەڵوزی ڕەق. بەم جۆرە لە چینە زۆرەکانی ناو زەویدا خەڵوز دروست دەبێت. بۆ ئەوەی دەست بکەوێت، دەبێت چاڵێکی زۆر قوڵ هەڵبکەنین. بۆ ڕاستی دروست بوونی خەڵوز بەو شێوەیەی باسمان کرد، پاشماوەکانی درەختی (سەرخەس) ئەوە دەسەلمێنێت. زۆر جاری تر ڕیشك و توێکی دار کە لەگەڵ خەڵوزەکەدا دەردەهێنرێت دەیسەلمێنێت، کە دەشێت لە پاشماوەی دارو ڕووەك و گژوگیاکانی پێش هەزاران ساڵ بێت. دەرهێنانی خەڵوز لە کانەکان، کارێکی پەکجار سەختە. پێش هەموو شتێك دەبێت ئەو هەموو قوڕو لیتەو پیسیەی لەسەر کانە خەڵوزەکە کۆ بۆتەوە لاببرێت. کە خەڵوزەکەش دەردەکەوێت. دەبێت بە تەقاندنەوە بشکێنرێت بۆ پارچەی بچووك بچووك. لە لایەنە کرداریەکەیەوە، دەبێت هەموو خەڵوزەکە بەهۆی

ئامێروو تەقاندنەوەوە دەربهێنرێن. دوای دەرهێنانی خەڵوزەکە. ئەنجا کرێکاری کانەکان بەهۆی بڵندەکەوە. کانەکان بەجێ دەهێڵن، لە ڕێگەی کونێکی ستوونیەوە کە پێی دەوترێت (دەروازە). خەڵوزەکەش زۆر بە ئاسانی دەسووتێت. لەگەڵ کەوتنەوەی هەر ئاگرێك دا لە کانێکدا زۆر بە زەحمەت دەکوژێنرێتەوە. لەبەرئەوە بەشە سووتاوەکە دادەبڕێت لە کانەکە بۆ ئەوەی ئاگرەکە هەموو کانەکە نەگرێتەوە. ساڵانە نزیکەی سێ بلیۆن تەن خەڵوز لە هەموو جیهاندا دەردەهێنرێت. کە نزیکەی ١٠٠ ملیۆن تەنی لە هندا دەردەهێنرێت.

## گورگ چۆن ڕاو دەکات؟

گورگ هەر لە دێر زەمانەوە ناوبانگی خراپی لای مرۆڤ هەبووەو زۆر باس و ئەفسانەو هەڵبەست و سروودی لەسەر دروست کراوە، کە گوایە خراپ و بێ ئەمانە بێگومان باسی گورگ و شەو لای هەموومان شتێکی ئاشکرایە.

## با بزانین گورگ خۆراکی خۆی چۆن پەیدا دەکات؟

کاتێك گورگ بە شوێن خۆراکدا دەگەڕێت، ماوەیەکی دوورو درێژ دەبڕێت کە دەشێت بگاتە سەد میل یان زیاتر. هەندێك جار چەند هەفتەیەك دەخایەنێت پێش ئەوەی گورگەکان بازنەی ئاراستەی خۆیان تەواو بکەن. ماوەیەك جارێك کەمینێك دادەنێن و چاو لووت و گوێیان دەخەنە کارەوە زۆر بە وریایی چاودێری ناوچەکە دەکەن، بە تایبەت ئەگەر بزانن لەو دەوروبەرەدا نێچیرێك هەیە. بە درێژایی ڕێ ڕۆیشتنیان گورگەکان، ڕادەوەستن، لە ژێر داران یان سەر داران یان بنە بەردەکاندا یان نیشانەکانی ڕێگادا پێدا دەمیزن. هەندێك کە گەلە گورگ دەگەنە شوێنێك یان نیشانەیەك زۆر بە وریاییو ووردی بۆنی دەکەن، بەو جۆرە دەزانن ئەگەر گورگی تر بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتبێت. گۆشت، خۆراکی سەرەکی گورگە. گورگ بە کۆمەڵ هێرش دەکەنە ئەو ئاژەڵانەی سمیان هەیە، ڕانە ئاسك و گوێرەکە ڕاو دەنێن و تەریکی دەکەن لە کۆمەڵەکەییو دەیکوژن. تەنانەت هەندێك جار دەکەونە سەر گامسکەکان لە ناوچەی جەمسەری باکوردا. هەر کە ئاژەڵەماڵیەکان بەبێ شوان و بە تەنها بن. لەلایەن گورگەکانەوە هێرشیان دەکرێتە سەرو

دەکوژرێن و دەخورێن. کە هیچیان دەست نەکەوێت، هێرش دەکەنە سەر کەروێشك و کرتێنەرەکان ئەگەر ئەوەشیان دەست نەکەوت، ئەوا میوە دەشتیەکان دەخۆن. هەندێك جار گورگ بۆ ماوەی چەند سەعاتێك نێچیرەکەی ڕاودەنێت و دەتوانێت بەبێ ماندوو بوون ئەو چەند سەعاتە بە هەمان خێرایی بڕوات. گورگ زۆر خێرا نیە. بەڵام دەتوانێت چەندین میل ئەو خێراییە بپارێزێت. تا دەگاتە ئەوەی نێچیرەکەی پەکی دەکەوێت و توانای ڕاکردنی نامێنێت. هەندێك لە گورگەکان لە دواوە هێرش دەکەنە سەر نێچیرەکەیان، هەندێکیشیان لە پێشەوە کە نێچیرەکە لە کۆتاییدا دەکەوێتە بەردەستیان، بە قەپ و چرنووك لەت و پەتی دەکەن تا دەمرێت. ئەنجا لەسەری کۆمەڵ دەبن و هەر گورگە بەشی خۆی دەخوات. کە دەشێت بگاتە حەوت کیلۆ، هەرچیەکیش لە گۆشتەکە بمێنێتەوە، هەڵی دەگرن بۆ ژەمەکانی تریان.

## ماری فڕیو

بە لێکۆڵینەوە لەسەر پاشماوەکان، زانایان گەیشتنە ئەوەی کە پێش نزیکەی ٦٥ ملیۆن ساڵە مار لەسەر زەویدا هەبووە. ئەمڕۆش زیاتر لە ٢٤٠٠٠ جۆر مار هەیە. کە تەنها لە ٨٪ یان ژەهراوین. مار لە ووشکانیو لە ژێر زەوی و لەسەر داراندا دەژێت. زۆربەیان خشۆکن و بەسەر زەویدا دەڕۆن. بەڵام جۆرێکیان کە پێیان دەڵێن کاری فڕیو دەتوانن بفڕن.

## ئایا دەزانن ئەو مارانە چۆن دەفڕن؟

مارە فڕیوەکان باڵیان نیە بەڵام دەتوانن بۆ ماوەیەکی کەم لە هەوادا بفڕن ئەویش بە ڕاستکردنەوەی لاشەیان و توند کردنی سکیان بە جۆرێك کە بقوپێتەوە. بەو ڕێگەیە دەتوانن لە دارێکەوە بۆ سەر زەوی یان لە دارێکەوە بۆ دارێکی تر بفڕن. (یۆرۆ بڵتاید) ئەو جۆرە مارە فڕیوەیە کە لە باشوری ئاسیاو هندی ڕۆژهەڵات و هنددو سریلانکادا هەیە. ئەم مارانە لە ڕۆژدا چالاك دەبن و دەست بە گرتنی شەمشەمە کوێرەو چۆلەکەو مارمێلکەو کرتێنەرەکان دەکەن. ماری (کرایس و پیلی) جۆرە مارێکی تری فڕیوە کە لە هنددو سریلانکادا دەژێت و هەندێك

جاریش پێی دەوترێت مارو دارە ئاڵتوونیەکان. کە درێژیەکەی دەگاتە سەد سانتیمەترو ڕەنگەکەی ڕەش یان سەوزەو خاڵی زەردو سووری لەسەرە.

## چی ئازار لە گوێچکەدا دروست دەکات؟

زۆر حاڵەت هەیە، ئازار لە گوێدا دروست دەکات. تەنانەت شێوازی ژان کردنەکانیش جیاواز دەبن. سەرەڕای تووش بوونی میکانیکی، زۆربەی ئازارەکانی گوێ لە جۆرێك نەخۆشی بەکتریەوە دێن. هەندێك جار گوێ ژان. بەهۆی شتێکەوە دەبێت کە دەچێتە گوێوە هەندێك جار منداڵان شتێك دەخەنە گوێی خۆیان یان گوێی منداڵێکی تر. گوێ ژان جاری وا هەیە لە ئەنجامی بوونی چڵکی ووشك لە گوێدا دروست دەبێت ئەو چڵکە یان هەر شتێکی تر لە گوێدا دەبێت بەهۆی پزیشکەوە دەربهێنرێت. چونکە پزیشك باشتر دەزانێت چۆن دەریدەهێنێت و زیانمان پێ ناگەیەنێت. دەشێت گوێ ژان لە ئەنجامی بەکارهێنانی شتێکی پیسدا بێت، لە کاتی گوێ پاککردنەوەدا، وەکو دانە شقارتە یان قژ گیرە یان هەر شتێکی تر. ڕەنگە ئەو شتانە پەردەی گوێ زام بکەن و ببنە هۆی دروست کردنی ئازار لە گوێدا. کەڕوو لە گوێی دەرەوەو کەناڵدا دەشێت ببێتە هۆی ئاوسانی کەناڵی گوێو دروست کردنی ئازار تیایدا. هەندێك جار مرۆڤ دوای تووشـ بوونی بە ڕشانەوە یان هەر نەخۆشیەکی تری کۆئەندامی هەناسە. هەست ـ ـێکی زۆر دەکات لە گوێیدا مانای وایە تەپڵەی گوێی ئاوساوەو گوێی دەردوەی لە گوێی ناوەوە جیا کردۆتەوە. هەر کەسێك بەشێوەی نادروست هەوا لە لووتیەوە دەر بکات، گوێی ناوەڕاستی تووشی ئازار دەبێت. بۆیە دەبێت. هەردوو کونە لووت بە یەك کات بەکاربهێنین بۆ هەوا دەرکردن. ئەمەو چەندین هۆکاری تریش دەبنە هۆی گوێ ژان. بۆیە ئامۆژگاریتان دەکەین، لەگەڵ هەستتان بە گوێ ژان کرد سەردانی پزیش بکەن!

## شەمشەمەکوێرەی خوێن مژ

لێکۆڵینەوەیەك لەسەر پاشماوەی گەڵاکان سەلماندوویەتی، کە ٦٠ ساڵ لەمەوبەر شەمشەمە کوێرە لەسەر زەویدا هەبووە. ئەمڕۆ زانایان زیاتر لە ٢٠٠٠ جۆر لە

شەمشەمەکوێرە دەناسن. شەمشەمە کوێرە لە هەموو شوێنێکی دنیادا هەیە جگە لە ناوچە جەمسەریەکان نەبێت. شەمشەمە کویرەکان تەنها گیاندارێکی مەمکدارن کە دەتوانن بفڕن. ەگەر باڵەکانی بکاتەوە، باڵەکانی لە نێوان ١٥ بۆ ١٨ سانتیمەتردایە. شەمشەمە کوێرەکان مێروو میوەو ماسی دەخۆن. بەڵام جۆرێکیان هەیە لەسەر خوێن دەژێت. کە پێی دەوترێت شەمشەمەکوێرەی خوێن مژ. بە بۆنەی ئەو جۆرەیانەوە خەڵکی لە هەرچی جۆری شەمشەمەکوێرەیە دەترسن. شەمشەمە کوێرە خوێن مژەکان تەنها لە ئەمریکای ناوەندو باشوردا هەن و درێژی باڵی هەر یەکێکیان بە کراوەیی ٣٠ سانتیمەتر دەبێت و درێژی لاشەشی ١٠ سانتیمەتر دەبێت. شەمشەمە کوێرەی خوێن مژ دانەکانی پێشەوەی زۆر تیژەو بەکاری دەهێنێت بۆ گەستنی مرۆڤی خەوتوو ئەسپ و مانگاو سەگ و مەڕو مریشك. یەکەمجار ئەو شوێنەی دەیەوێت پێوەی بدات دەیلێسێتەوە ئەگەر قوربانیەکە کە ئاگای بووەوە ئەوا هەڵدێت و ئەگەر نا بە دانەکانی برینێکی هێندە بچووك لە نێچیرەکەی دەکات کە هەست بە ئازار ناکات و بەهۆی زمانێکی شێوە بۆریەوە خوێنەکەی ڕادەکێشێت. شەمشەمە کوێرەی خوێن مژ هەموو شەوێك پێویستی بە ٢٠ گرام خوێن هەیە، کە دەتوانێت تەنها لە یەك ئاژەڵ یان زیاترەوە وەری بگرێت. زۆر بە کەمی هێرش دەکاتە سەر مرۆڤ. یەکێکە لەوانەی کە نەخۆشی هاری دەگوێزێتەوە. لەبەرئەوە گەزینی زۆر مەترسیدارە، چونکە هاری نەخۆشیەکی کوشندەیە، ئەگەر نەخۆش بە زوویی چارەسەر نەکرێت، دەبێتە هۆی مردنی.

## ئەبرۆکان

هەموو مەمکدارەکان لەسەر گشت ئەندامە جیاوزەکانی لەشیان موو هەیە. ئەو مووە بە نسبەت زۆربەی مەمکدارەکانەوە، وەکو چینێکی جیاکەرەوە ئیش دەکات بۆ ئەوەی لاشە لە زستاندا گەرم و لە هاویندا فێنك بمێنێتەوە، شتێکی باشیشە بۆ پاراستنی لاشە. لاشەی مرۆڤ لە ئاژەڵەکان کەمتر مووی پێوەیە. لووە جنسیەکان پێشکەوتنی (پەردەی موویی) لە مرۆڤ دا ڕێك دەخەن. هۆرمۆنە نێرینەکان دروست بوونی ڕیش و مووی لاشە بەهێز دەکەن و گەشەسەندنی قژی

سەر دەوەستێنن. بەڵام هۆرمۆنی مێینە، تەواو بە پێچەوانەوە. بەرگری لە گەشەسەندنی موو دەکات. لەسەر لاشەو سەوز بوونی قژی سەر بەهێز دەکات. لەگەڵ ئەوەی زانایان ئەم ڕاستیە دەزانن. بەڵام تا ئێستا نایانتوانیوە، ئامانجی دروست بوونی موو لەسەر لاشە بزانن. ئەوەی کە ڕوونە: موو لە چەند وێنێکی دیاریکراودا سەوز دەبێت وەکو جۆرێك لە پارێزگاری کردنی مرۆڤ لە خۆڵ و تۆزو مێرووەکان، لەبەر ئەو هۆیەیە موو لەناو لووت و گوێدا دەردەچێت. وەکو چۆن مەبەست لە ئەبرۆکان و برژانگەکان پاراستنی چاوەکانە لە خۆڵو تۆز. شارلز داروینی زانای سروشت ناسی بەریتانی. کە لە نێوان ساڵانی ١٨٠٩ و ١٨٨٢ دا ژیاوەو خاوەنی بیردۆزەیەکە بە ناوی خۆیەوە. بڕوای وا بووە کە مووی نەرم لەسەر لاشە، وەکو پلوسکێکە بۆ ئارەق و ئاوی باران. باوەڕیش وایە سەوز بوونی موو لەسەر دەم و چاوی پیاو بۆ ئەوە بووبێت ژن و پیاو لە یەك جیابکرێتەوە. لەسەر لاشەی هەر مرۆڤێك لە نێوان ٣٠٠ بۆ ٥٠٠ هەزار تاڵە موو هەیە کەسە سوورو سپیەکان بە ڕێژەی یەك لەسەر چوار لە کەسە ئەسمەرو موو زبرەکان موویان کەمترە.

## مارمێلکەی سێ چاو

"توتارا" گیاندارێکی نامۆیەو لە مارمێلکە دەچێت و سێ چاوی هەیە. تەنها گیاندارێکە لە نێوان خشۆکەکاندا لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا پۆلێن کراوە. هەرچەندە لە مارمێلکە دەچێت. بەڵام پێکهاتەی ناوەوەیی بە تەواوی جیاوازە لەگەڵ مارمێلکەدا. "توتارا" لە دوورگە بچووکەکانی دەوروبەری نیوزلاندادا دەژی. نێرەکانیان کە گەورە دەبن کێشیان دەگاتە کیلۆ گرامێك، بەڵام مێینەکانیان کە پێ دەگەن دەبنە نیو ئەوەندەی کێشی نێرەکان. "توتارا" پێش لە دوو سەد ملیۆن ساڵە لەسەر زەویدا پەیدا بووە. بەڵام لاشەی ئەو سەردەمەی لەگەڵ ئەو لاشەیەی ئێستایان زۆر جیاوازی هەیە. ئەوەی نامۆیە لەم ئاژەڵەدا. ئەوەیە سێ چاوی هەیە. چاوی سێیەمی شێوەکەی خڕەو دەکەوێتە، بۆشایی نێوان سەرو مێشکی. پێڵویەکی هەیە بە ئاسۆیی دادەخرێت و ناتوانین سەبارەت بە بەکارهێنانی چاوی هیچ شتێك بڵێین. "توتارا" بە شەو دەگەڕێت و بەشێوەیەکی گشتی لە کون دا

دەژی. زۆر شەرمنەو خواردنی ڕۆژانەی لەسەر مێروو ئاژەڵانی ترە. وەکو بۆق و مشك و هێلکەی باڵندەکان. ئەم گیاندارە لە ٧٧ بۆ ١٠٠ ساڵ تەمەن دەکات. لە بەهارداو دوور لە لانەکانیان مێیەنەکانیان لە ٨ بۆ ١٥ هێلکە دادەنێن و لە هاوینی داهاتوودا هێلکەکان هەڵدێن. ئەم گیاندارە ئێستا. بەرەو لەناوچوون دەچێت. بەڵام حکومەتی نیوزلاند هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ لەناو نەچوونیان.

## چی ماسولکەکانمان ماندوو دەکات؟

ماسولکەکانە لەشمان دەجوڵێنێت.هەر ئێسقانێك دەجوڵێتەوە دەبێت ماسولکەیەك هەبێت بیبجوڵێنێتەوە.ماسولکەکانیش پەیوەندی‌یەکی پتەویان هەیە لەگەڵ! ئێسقانەکاندا. ماسولکەکان بە پتەو بونیان ئێسیقانەکان دەجوڵێننەوە ماسولکەکان دەتوانن خۆیان ڕەقتر و ئەستورتر بکەنەوەز ماسولکەکان لەکاتی ڕەقبونیلاندا ترشی لکتیك بەرهەم دەهێنن ئەویش هۆی سەرەکی‌یە کەوا دەکات ماسولکەکان هەست بە ماندوبوون بکەن.

بۆ نمونە ئەگەر ترشی لکتیك لە ماسولکەیەکی ماندودا دەربهێنین دوبارە دەتوانێت وەکو جاری یەکەم ئیشی خۆی بکاتەوە.لەبەرئەوە کاتێك ماسولکەکانمان لە ڕۆژدا ماندوو دەکەین کەواتە خۆمان بەترشی لکتیك(ژەهراوی)دەکەین بۆیە ماندوو دەبین. لە لاشەماندا مەوادی تر هەیە وامان لێدەکات هەست بە ماندوو بووە بکەین ناوی((تۆکسینات))ە کە لە ئەنجامی کارێکی بازوییەوە،لەلەشدا بەرهەم دێت.بۆریەکانی خوێن ئەو ژەهرانە دەگەیەننە هەموو ئەندامەکانی لاشەو بەجۆرێك نەك ماسولکەکان بەڵکو هەموو لاشە هەست بە ماندوبون دەکات بەتایبەتی مێشك. تاقیکراوەتەوە ترشی لکتیك و تۆکسینات پەیوەندی تەواویان بە ماندوبونەوە هەیە. سەگێکیان هێناو هێندە ماندویان کرد تا خەوی لێکەوت،ئەنجا هەستان بە گواستنەوەی خوێنی ئەو سەگە بۆ لاشەی سەگێکی ناماندوو گورجوگۆڵ، لەماوەی گواستنەوەی خوێنەکەدا سەگی دووەمیش خەوی لێکەوت! بە پێچەوانەشەوە. خوێنی سەگێکی چالاکیان گواستەوە بۆ گیانی سەگێکی ماندو و نوستوو دیتیان لەخەو هەستاو گورج بووەوە.

## بۆچی لاشه ماندوو دەبێت؟

لەبەرئەوەی خانەکان پێویستیان بە پشودان هەیە. کاتێك دوای ماندوبون پشو دەدەین، خانە لەناوچووەکانی لەشمان سەر لەنوێ دروست دەبنەوە. مێشکیش خۆی شەحن دەکاتەوەو جومگەکانیش گریسی خۆیان دەکەنەوەو.....هتد.

## شەمشەمە کوێرە

شەمشەمە کوێرە گیاندارێکی سەیرە. وەکو باڵندە دەفرێت بەڵام بە باڵندەش ناژمێرێت. لە مەمکدارەکان حساب دەکرێت، دەزێت و شیر دەداتە بێچووەکانی، بە پێچەوانەی باڵندەکانەوە پەڕی نیەو لەسەر لاشەی تووك هەیە. تەنها مەمك دارێکە کە دوو باڵی هەیە بۆ فڕین. ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر پاشماوەکان کراوە، دەریان خستووە کە لە نزیکەی ٦٠ ملیۆن ساڵەوە شەمشەکوێرە لەسەر زەویدا هەیە. زانایان لێکۆڵینەوەیان لەسەر نزیکەی ٢٠٠ جۆر لە شەمشەمە کوێرە کردووە لە سەرانسەری جیهاندا. جگە لە هەردوو جەمسەرەکە نەبێت. چەندین جۆری جیاواز لە شەمشەمە کوێرە هەیە. هەیانە کە باڵی بڵاو دەکاتەوە دەگاتە دوو مەتر. زۆربەی شەمشەمە کوێرەکان لەسەر کرم و مێرووەکان دەژین. بەڵام لە ناوچە ئیستیوائیەکاندا لەسەر مێروو گوڵەکان. جۆرێکی تر لە شەمشەمە کوێرە هەیە، لەسەر وێنی باڵندەو ئاژەڵەکان دەژین. ئەم جۆرەیان پێی دەوترێت شەمشەمە کوێرەی "خوێن مژ" ڕەنگە لەبەر ئەم جۆرەیان بێت کە زۆربەی خەڵکی لە شەمشە کوێرە دەترسن. درێژی شەمشەمە کوێرەی خوێن مژ دەگاتە ٣٠ سانتیمەترو دانەکانی وەکو دەرزی تیژن و دەیچەقێنێتە لەشی نێچیرەکەیەو بە یارمەتی زمانی خوێن دەمژێت. ئەم جۆرە لە شەمشەمە کوێرە هێرش دەکاتە سەر مرۆڤی نووستوو خوێنی دەمژێت. زۆربەی جارەکان لەسەر خوێنی مانگاو کەرو ئەسپ و هی تر دەژێت. سیفەتێکی تری مانۆی شەمشەمە کوێرە ئەوەیە کاتێك پشوو دەدات سەرەو ژێر خۆی بە لقی داراندا هەڵدەواسێت. پێکهاتەی هەردوو لای یارمەتی وەستانی ڕاستی نادەن. بۆیە بەسەرەو ژێر وەستان بۆیان ئاسانترە.

## سەگەکان لە کوێوە هاتوون؟

هەموو جۆرەکانی سەگ، لە گیانلەبەرێکەوە هاتوون لە گورگ چووەو پێی ووتراوە "تۆمارکتۆس" ئەم سەگە کۆنە. کە پێی دەوترێت باوکی سەگان پێش لە ١٥٠ ملیۆن ساڵە ژیاوە. سەگی ماڵیو سەگی کێوی لە سیفات و ڕەوشتیاندا هاوبەشەز سەگە ماڵیەکان گورگ و چەقەڵو سەگی کێوین کە هەموویان سەر بە جۆرەکانی سەگن. هەموو ئەوانەی ناومان بردن پەیوەندیەکی بەهێزیان هەیە پێکەوەو دەشێت لەگەڵ گورگ و چەقەڵدا زەواج بکەن و نەوەیەکی ڕەسەنیان لێ دروست ببێت. بەڵام هیچ کام لەو جۆرانە لەگەڵ ڕێویەکاندا زەواج ناکەن. ڕێوی سەر بە تیرەیەکی ترە لە جۆرەکانی سەگ. مرۆۋ لە کۆندا سەگی کێوی ماڵی کردووە.دەشێت ئەو سەگانە بێچوی گورگ یان چەقەڵ یان جۆرێکی تر لە سەگ بوبن.لە ماڵی کردنیاندا مرۆۋ بۆی دەرکەوت کە دەشێت ئەو گیاندارانە بەسودبن بۆی. بۆیە لە ڕاوکردنی باڵندەو ئاژەڵەکانی تردا بەکاری هێنا. لەگەڵ شاری بوونی مرۆڤدا، بۆی دەرکەوت سەگ هاوڕێیەکی بەوەفایەو پاسەوانێکی بەسوودی ڕان و ماڵەکەیەتی بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار چەندین جۆری سەگ پەیدا بوون کە بۆ مەبەستی جۆراو جۆر بەکاردەهێنرێن. وەکو سەگی لووت درێژی "ساتر" سەگی ڕاو. "بۆنی تر" سەگی ڕاو "بیجڵ" سەگی توکنی بچووکی ڕاو. چەندین جۆری تر سەگ هەیە. وەکو تانجی کە دەتوانێت کەروێشك و ئاسك بگرێت سەگی وا گەورەش هەیە کە دەتوانێت گالیسکەیەك ڕابکێشێت. ئێستا سەگ بەرهەم دەهێنرێت لە پاسەوانی کردن و بۆن کردندا بەکاردەهێنرێت جگە لە ڕاوو کارکردندا. چەندین جۆری سەگ هەن لە وەرزشدا بەکاردەهێنرێن.

## ئۆشفێنتز چیە؟

ئۆشفێنتز ناوی ئەو سەربازگە بە کۆمەڵە بوو، کە هێزەکانی ئەڵمانیای داگیرکەر لە جەنگی دووەمی جیهانیدا لە پۆڵەندادا کردیانەوە. کە بوو بە هێمای تاوانەکانی جەنگی نازی، ئێستا لە شوێنی ئەو سەربازگەیەدا مۆزەخانەیەك و پەیکەرێکی نازی لێ دروست کراوە. حکومەتی شیوعی پۆڵەندا مۆزەخانەی ئۆشفێنتزی لە

ساڵی ١٩٥٥ دا کردەوە کە وێنەی گیراوەکان و ٣٥٠٠ لە جزدانەکانیان و ٢٩٠٠٠ فلچەی دانیان و ڕێژەیەکی زۆر لە قژیان تیایدا دانراوە. لەگەڵ چەندین وێنەی فۆتۆگراف کە موقاوەمە پیشان دەدەن لە دژی سوپاکەی هیتلەردا. لە سەرەتادا هێزەکانی نازی سەربازگەی ئۆشفێنتزیان وەکو زیندانێك بۆ ناسیۆلیستەکان و شیوعیەکان و دیموکرات خوازەکانی پۆڵەندا بەکارهێنا. نزیکەی ٢٧٠,٠٠٠ پۆڵەندی لەو سەربازگەیەدا مردن. سەربازگەکە گەورە کرایەوە بۆ جێ کردنەوەی ئەوانەی لە دژی نازیەکان دەوەستان، لە دەرەوەی پۆڵەنداش. بە تایبەت یەهودیەکانی ئەڵمان ژمارەی ئەوانەی لەو سەربازگەیەدا گیانیان لە دەست دا، بە چوار ملیۆن کەس مەزەندە دەکرێن بەڵام مێژوو نووسان بەپێی بەڵگە نامەکان، ئەو ژمارەیەیان دابەزاند بۆ ملیۆن و نیوێك تا دوو ملیۆن. بەڵام یەهودیەکان لەم ژمارەیە ڕەخنەیان گرت. ساڵانە لە پۆڵەندا ئەڵمانیاو ئەمریکاوە نزیکەی حەوت سەد هەزار کەس سەردانی ئ‌وشفێنتز دەکەن کە زۆربەیان یەهودین. پۆڵەندیەکان و یەهودیەکان لەسەر ئۆشفێنتز، زۆر جار ناکۆکی کەوتۆتە نێوانیانەوە چونکە هەریەکیان دەیگوت، کە زۆرترین قوربانی لە ڕیزی ئەودا بووە. دوای ڕووخانی بلۆکی کۆمۆنیستی، لە کۆتای هەشتاکانی سەدەی ڕابووردودا لیژنەیەکی نێودەوڵەتی پێك هێنرا بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ڕاستیەکان سەبارەت ە سەربازگەی ئۆشفێنتز، کە پێکهاتبوون لە پۆڵەندیەکان و یەهودیەکان. پۆڵەندیەکان ئۆشفێنتز بە ڕەمزی بەرخودانی نیشتمانی دادەنێن. سوورن لەسەر ئەوەی میوانە ڕەسمیەکان سەردانی ئەو شوێنە بکەن. بەڵام یەهودیەکان بە ڕەمزی چەوسانەوەی خۆیانی دادەنێن، لە لایەن نازیەکانەوە. بەڵام دەبێت بووترێت لە دوایدا ئۆشفێنتز، بوو بە گۆڕستانێکی بە کۆمەڵی خودی نازیەکان. ڕەمزێکیشە بۆ تاوانێك کە بەرامبەر مرۆڤایەتی کراوە.

## وزە

ئەگەر بە ووردی گوێ لە هەواڵەکان بگرین دەبینین مەبەستی زانست لە ئێستادا ئەوەیە، لە گەردیلەوە وزەی دەست کەوێت. بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بتوانن ژیانێکی درێژو ئارام بەسەر بەرن. ئەگەری بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئامانجە، یەکێکە لە

گەورەترین هەنگاوەکان، لە مێژووی بیری مرۆڤایەتیدا. ئەلبێرت ئەنشتایان، یەکەم کەس بوو، ماددەی بە زمانی وزە پێوانە کرد. ئاشکرای کرد کە دەتوانرێت ماددە بگۆڕدرێت بۆ وزە. ئەمەش بیرو بۆچوونی لە ڕووی دونیای ماددەدا گۆڕی. ماددە بوو بە شتێکی لاوەکیو وزەش بوو بە گرنگترین شت لە جیهانی ماددەدا.

## وزە چیە؟

توانای هەستانە بە ئیشێك. کەوا دەکات هێز شتێکی مومکین بێت. بۆ ئەوەی بزوێنەر وەگەڕ بکەوێت، دەبێت هێز بەکاربهێنین.دەبێت شتێکیش هەبێت ئەو هێزە دەستەبەر بکات. ئەو شتەش وزەیە. ئەی لە کوێوە دێت؟ لە پترۆڵەوە دێت. لە ئەنجامی سووتانی پترۆڵ لەناو سلێندەردا دروست دەبێت. ئەو وزەیەش هێزێکی دیاری کراو بە گەڕ دەخات کە جوڵاندن لە داندارەکان و تایەکاندا دروست دەکات. بەوەش بزوێنەر بەهۆی وزەوە بە گەڕ دەکەوێت.

دوو جۆر وزەمان هەیە شاراوەو جوڵاوە.

با یەکەم جار بزانین وزەی شاراوە چیە؟ لە دۆخی پترۆڵدا، گەردیلەکان بەهۆی هێزە کارەباییەکانەوە یەك دەگرن. وزە ئەو گەردیلانە پەسیسە دەکات بەوەش وزەی شاراوە دروست دەکات. کاتێك پترۆڵەکە دەتەقێتەوە وزە شاراوەکە بەکاردەهێنێت. نموونەیەکی تری وزەی شاراوە. قورساییەکی هەڵواسارو. کە لە وزەیەکی پەسیسە کراودا هەیە. دەتوانین بە خستنە خوارەوەی قورسیەکە بیخەینە گەڕ. وزەی شاراوە لەسەری تاڤگەو پشتی بەنداوەکانیشدا هەیە. ئێستا گریمان ئەو قورساییەی دەکەوێت، یان ئەو ئاوەی لە تاڤگەیەك دیچتە خوارەوە. لەگەڵ جوڵانی ئاوەکە یان قورساییەکەدا، بە خێراییەکی دیاری کراو. وزەکە دەجوڵێت و بەو وزەیەش دەوترێت وزەی جوڵاوە. کاتێك تەنەکە دەکەوێتە خوارەوە. وزەی شاراوە لە دەست دەدات و وزەی جوڵاوە وەردەگرێت. لە ڕاستیدا ئیجمالی ڕێژەی وزە لە گەردووندا یەکێکە. ئێمە نە دەتوانین دروستی بکەین، نە دەتوانین لەناوی بەرین. بەڵام ئەوەی دەیکەین ئەگەر ئاوی خوڕ یان خەڵوز بەکاربێنین. گۆڕانی شێوەکەیەتی لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر.

## سەحایا چیە؟

سەحایا نەخۆشیەکی زۆر مەترسیدارە، هۆیەکەی ئاوسانی سەحایەیە، کە بریتی‌یە لەو پەردەیەی مێشکی مرۆڤ دادەپۆشێت. لەگەڵ بڕبڕەی پشتدا. ئەگەر ئەم نەخۆشیە بە شێوەیەکی گونجاو چارەسەر نەکرێت. سەر دەکێشێت، بۆ مردن هەر دوای هەست کردن بە تووشبوونی دەبێت هەوڵی چارەسەر کردنی بدرێت.

## ئایا دەزانن هۆی نەخۆشی سەحایا چیە؟

بەکتریاکە پێی دەوترێت بەکتریای سەحایا، ئەم نەخۆشیە وەکو درم بڵاو دەبێتەوە. هەندێك لێکۆڵینەوە دەریان خستوە ئەم درمە هەر ١٠ بۆ ١٢ ساڵ جارێك بڵاو دەبێتەوەو هەر جارێکیش لە ٤ بۆ ٥ ساڵ درێژە دەکێشێت. درمێکە بە زۆری تووشی منالآن دەبێت. بە تایبەت مندالآنی ژێر تەمەنی پێنج ساڵ. بەڵام دەشێت تووشی هەر کەسێکیش بێت، بڵاوبوونەوەی لە وەرزی هاویندا کەمترە. بەڵام لە کۆتایی وەرزی زستان یان بەهاردا زۆر بە خێرایی بڵاو دەبێتەوە. نەخۆشی سەحایا زیاتر تووشی ئەو خەڵکانە دەبێت کە لە ژینگەیەکی پیسدا دەژین. نەخۆش بە پژمین و کۆکین بەکتریاکە دەگوێزێتەوە بۆ کەسێکی لەش ساغ. سەرەتا هێرشەکە بۆ لووت و قورگەو تیایدا بەکتریاکە گەشە دەکات. دوای چوار پێنج ڕۆژ نیشانەکانی بە دیار دەکەون. کە توشبوو هەست بە سووتانەوەی قورگ دەکات و ئاو لە لووتی دێت. دوای ئەوە دەست بە ڕشانەوە دەکات و پلەی گەرمای لەشی بەرز دەبێتەوە، لەگەڵ پشت ژاندا. هەر کە بەکتریاکە گەیشتە مێشك تووشی سەر ئێشەش دەبێت. کە ملی دەجوڵێنێتەوە هەست بە ئازارێکی زۆ ردەکات. پەنجەکانی بە تەواوی کرژ دەبن. دوای دوو یان سێ ڕۆژ پێستی سوور دەبێتەوەو دوای ئەوەش هەموو لەشی دەگرێتەوەو زۆر تای بەرز دەبێتەوە. هەندێك جار نەخۆشیەکە کە کار لە بینین و بیستنیش دەکات. ئەگەر نەخۆشیەکە زۆر بە خێرایی چارەسەر نەکرێت لە ماوەی یەك هەفتەدا کەسی تووشبوو دەمرێت. خەڵکی ئاسایی بڕوایان وایە لە سەحایا نەخۆشیەکە چارەسەری نیە. بەڵام ئەمە بۆچونێکی ڕاست نیەو ئەگەر نەخۆشەکە چارەسەری دروستی بدرێتێ

دوای ٢٤ کاتژمێر هەست بە چاك بوونەوە دەکات. سلڤادیازین و پەنسلین و تترا سیسلین و ئەمپیسیلین زۆر بەسوودن بۆ لەناودانی ئەم نەخۆشیە. ئەگەر نەخۆش ڕۆژی دوو جار یەك گرام لە سلڤادیازین بخوات لە ماوەی سێ ڕۆژدا لەم نەخۆشیە ڕزگاری دەبێت. "پەتای ئاوسانی سەحایا" هێرشی کردۆتە سەر هاوولاتیانی هەموو وولاتانی جیهان دەتوانین لەسەر ئەو بنەمایە ئەو بەکتریایەی دەبێتە هۆی ئەم نەخۆشیە بکەینە سێ گروپەوە. أ – ب – ج. نەخۆشی سەحایا لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لە نێوان سالانی ١٩١٥ بۆ ١٩٦٣ دا هۆیەکەی بەکتریای گروپی (أ) بووە. لەنێوان سالانی ١٩٦٤ بۆ ١٩٦٨ یش هۆیەکەی بەکتریای گروپی (ب)بووە. لەم سالانەی دوایشدا بەکتریای گروپی (ج) زیاتری چالاکیەکانی خۆیان دەکەن. لە ئێستادا ئەمپول بۆ چارەسەر کردنی سەحایا لەهەر سێ گروپەکە دروست کراوە.

## ئاژەلان چۆن تووشی هاری دەبن؟

ڤایرۆسەکان چەندین جۆر نەخۆشی لە مرۆڤ و ئاژەلاندا دروست دەکەن. ڤایرۆس میکرۆبێکی زۆر بچووکەو بە چاو نابینرێت. ئەو ڤایرۆسەی کە بە ڤایرۆسی (هاری) ناسراوە دەشێت تووشی هەموو گیاندارە خوێن گەرمەکان بێت. دەشێت ئاژەلە کێویەکانی گورگ و ڕێوی و وورچ و شەمشەمە کوێرەو ئاژەلە مالیەکانی وەکو مانگاو پشیلەو سەگ تووشی ئەم نەخۆشیە ببن. بە واتا ڤایرۆسی هاری دەچێتە لاشەی ئەو ئاژەلانەوەو تووشی هاریان دەکات. دوای تووش بوون نەخۆشیەکە دیار نادات، چوار تا شەش هەفتەی سەرەتا، سەگەکە هێمنەو تا دەیگرێت و خواردن کەم دەخوات. دوای ئەوە دەست بە وەڕین و پەلاماردان دەکات و لیك لە دەمی دێت و ئەگەری گەزینیشی هەیە. دوای دەرکەوتنی ئەو نیشانانە لە ماوەی سێ بۆ پێنج ڕۆژدا دەشێت سەگەکە بتۆپێت. لەبەرئەوەی ڤایرۆسەکە لە لیکدایە. نەخۆشیەکە بە ڕێگەی گەزین دەگوێزرێتەوەو زۆر دەگمەنە بە جۆرێکی تر بگوێزرێتەوە. نەخۆشیەکە چۆن لە سەگ دا دەست پێدەکات لە مرۆڤیشدا بە هەمان شێوەیە. یەکەم جار کەسی تووشبوو هێمنەو دوای ئەوە تای لێ دێت و هەستێکی سەیرو نامۆی لا دروست دەبێت و ماسولکەکانی گرژ دەبن.

کاتێك خەریکە شتێك بخوات بۆی ناخورێت لەبەر گرژبوونی ماسولکەکانی دەم و گەرووی. کە لە ئەنجامی گۆڕانکاریەکی کۆ ئەندامی (عصبی) دا گرژ دەبن لەگەڵ ماسولکەکانی هەناسە داندا. لەگەڵ ئەو گرژ بوونەدا، ئیتر کەسە تووشبووکە دەمرێت. کاتێك نەخۆشیەکە لە مرۆڤ یان ئاژەڵدا دەردەکەوێت، مردنەکە نیمچە مسۆگەرێکە بۆیە دەبێت. تێکەڵاوی نەخۆش نەبین بەواتا بە دوور لە خەڵکی دایان بنێین و شوێنی گەستنەکە پاك بکرێتەوەو ئەگەر کرا لە ماوەی سێ ڕۆژدا دەرزی تایبەت بەم نەخۆشیە بەکاربهێنرێت چ بۆ مرۆڤ یان ئاژەڵ بێت. دەرزیەکە دەبێت پێش گەورە بوون و هێرش کردنی ڤایرۆسەکە بۆ مێشك بەکاربهێنرێت. دەرزیەکە هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی دوو تا سێ هەفتە بەردەوام بەکاربهێنرێت نەخۆشەکە چاك دەبێتەوە.

## مێشووله "مەگەز"

وەکو گیاندارەکانی تر مێشووله، لە سەر زەویدا هەیە. مرۆڤ ئاواتە خوازە هەرگیز مێشووله نەبینێت، بەڵام کێشەی مێشووله بۆ هەتا هەتایە کۆتایی نایەت. لە گشت شوێنێکی دنیادا مەگەز دەبینرێت. هەندێك جۆریان لە هەموو شوێنێکی دنیادا هەن و هەندێك جۆریشیان تەنها لە ناوچەیەکی دیاریکراودا هەن. بۆ نموونە لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا نزیکەی ٧٠ جۆر مەگەز هەیە. مرۆڤ هەوڵ دەدات بە هرچی جۆرێك بێت. لە مەگەز ڕزگاری بێت چونکە جۆرەها نەخۆشیمان بۆ دەگوێزنەوە. ئەو مەگەزەی ڤایرۆسی زەردوویی دەگوێزێتەوە، لە زۆر لەو ناوچانەدا کە هەن بە تەواوی لەناو دەبرێن. مرۆڤ دوو کێشەی تری هەیە لەگەڵ مێشوولەدا، یەکەمیان قەپ گرتنەکەیەتی. کاتێك مێینەکانیان، کەسێك یان گیاندارێك دەگەزن. ژەهرێك دەکەنە خوێنەکەیەوە، کە دەبێتە هۆی ئاوسان و ئازاردانی. کێشەی دووەمیش گیزە گیزەکەیەتی، کە زۆر مرۆڤ وەڕەس دەکات. ئەو گیزە گیزە بۆ مێشووله زۆر گرنگە چونکە هۆیەکە بانگی جۆرەکەی تری پێ دەکات. نێرەکان گیزەیەکی زۆر قوڵو نەرم بە لێدانی باڵەکانیان دەردەکەن. لە کاتێکدا دەنگی گیزەی مێیەکانیان زۆر تیژە.

## دەشێت مەگەز سوودی بۆ مرۆڤ هەبێت؟

تەنها هیوایەك، كە مرۆڤ دڵخۆش دەكات بەوەی مێشووله سوودی بۆی هەبێت، ئەوەیە كە هەندێكیان هەندێكی تریان لەناو دەبەن. چونكە چەندین جۆریان لەسەر چەندین جۆری تریان دەژین. جۆری وایان هەیە بە مرۆڤەوە نادەن، بەڵام جۆری واشیان هەیە بە مرۆڤەوە دەدات. بۆیە زۆر بەسوودن ئەگەر ئەو جۆرەی پێمانەوە نادەن ئەو جۆرەكەی تر لەناو بەرن.

## زانستی پشتاو پشت

زانستی پشتاوپشت لێكۆڵینەوە لەسەر خاڵە لێك چوو جیاوازەكانی نێوان مناڵان و دایك و باوكاندا دەكات لەگەڵ تایبەتمەندیە پشتاوپشتیەكان لە ڕووەك و گیانداراندا. لێكۆڵینەوەی ڕاستەقینە لە زانستی پشتاوپشت دا لە دوو سەد ساڵی ڕابووردودا دەستی پێ كرد. لە ساڵی ١٨٦٠ ڕاهیبی نەمساوی "گریگۆر مەندڵ" هەستا بە چەندین تاقیكرنەوەی جۆراو جۆر لەسەر ڕوەكی "پاقلە" و گەیشتە هەندێك ئەنجام لەوانە بۆی دەركەوت هەندێك تایبەتمەندی لە نەوەیەكەوە دەگوێزرێتەوە بۆ نەوەی دوای خۆی. لە ساڵی ١٩١٠ زانای ئەمریكی "تۆماس هنت مۆرغان" سەلماندی كە جینات لە كرۆمۆسۆم دایە. كە لە باوكانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵەكانیان دوای ئەوانیش زانایان (جۆرج بیدڵ و ئەدوارد تاتۆم و هارگۆبانید خۆرانا) و هی تریش هاوكاری بەرچاویان لە زانستی پشتاوپشتدا كرد. لە چەند ساڵی ڕابووردودا زانایان هەردوو ترشی نەوەوی DNI و RNI یان دۆزیەوە، كە هەردووكیان بڕیاری تایبەتمەندیەكانی گیانداران دەدەن. ئەمڕۆ زانایان بە ڕێگەی پشتاوپشت دەتوانن چەندین جۆری تازە لە ڕووەك بەرهەم بهێنن. ڕووەكی خۆراكی وایان پەرە پێداوە كە هێزی زیاترو بەرهەمیشی زۆرترە. لەم چەند ساڵەی دواییدا جۆری وایان بەرهەم هێناوە كە بەرهەمی سەرسوڕهێنەری داوە. بە ڕێژەیەك بەرهەمی خۆراكی جیهانی لە سەرانسەری دنیادا بەرز كردۆتەوە. تەنانەت بە بەكارهێنانی ڕێگاكانی پشتاو پشت باشترین جۆری ئاژەڵیان بەرهەم هێناوە. دەتوانرێت بە بەكارهێنانی

ئەندازەی جینات پێکهاتەی جینی هەر گیاندارێك بگۆڕدرێت. تەنانەت دەتوانن ئەنسۆلین بەرهەم بێنن، سەرەڕای ترشی نەوەوی DNA کە لە خانەی ئاژەڵێکی دیاریکراو وەردەگیرێت بۆ هەمان ترشی لە خانەی بەکتریۆلۆجیا. لە (بێژنگ) دانی جینات یارمەتی زانایان دەدات لە دیاریکردنی چەندین جۆری نەخۆشی. هەروەها بۆ وەرگرتنی شلەی ناو منداڵدانی ژنەکە دەزانرێت منداڵەکە کوڕە یان کچ. زوو دۆزینەوەی نەخۆشیە جینیەکان. یارمەتی پزیشکان دەدات لە چارەسەر کردنی منالآن بە ماوەیەکی کەم، دوای لە دایك بوونیان ئەمڕۆ زانایان لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوە دەکەن ئایا دەتوانن جینات لە بلیمەتەکانەوە بگوێزنەوە، بۆ بەرهەم هێنانی مرۆڤی بلیمەت.

## قەبارەی هەسارەکان چەندن؟

هەسارە جیاوازە لە ئەستێرە. ئەستێرە بریتیەیە لە تۆپەڵەیەکی گەورە لە گازاتی گەرم کە تیشك و گەرمای لێوە دەردەچێت. بەڵام هەسارەکان زۆر بچووکترن لە ئەستێرەکان و تیشکی ئەستێرەکان پێچەوانە دەکەنەوە. با لە نزیکترین هەسارەوە دەست پێ بکەین کە خۆرە، نزیکترین هەسارە لە خۆرەوە عەتاردە کە تیرەکەی نزیکەی ٢٩٠٠ میلە واتە بە نزیکەی پانی زەریای ئەتڵەسی کاتێك تۆزێك دوور تر دەکەوینەوە ڤینۆس (زوهرە) مان دێتە ڕێ، کە قەبارەی نزیکەی قەبارەی زەویەو تیرەکەی لە دەوروبەری ٧٦٠٠ میلدایە بەڵام تیرە زەوی ٧٩١٣ میلە. ئەو ڕاستیە نامۆیە لەسەر ڤینۆس دەبێت بیزانین ئەوەیە کە بە پێچەوانەوە دەسوڕێتەوە، واتە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا. دوای ڤینۆس هەسارەی زەوی دێت. لە دوای زەوی، مەریخ دێت. کە فەزا بە ڕەنگی سوور دەدرەوشێنێتەوە تیرەکەی ٤٢٠٠ میلە. واتە تۆزێك زیاتر لە نیوەی تیرەی زەوی. هەندێك لە شوێنەکانی سەر ڕووی مەریخ لە مانگ دەچن. چاڵێکی گەورەی تێدایە کە نیازکەکان کەندوویانە. هەروا لەسەر مەریخ دا گڕکان و دۆڵو شیوو ئاو هەیە. کە بوونیان تواناو چالاکی جیۆلۆجی سەر مەریخ دەسەلمێنێت. موشتەری زۆر لە خۆرەوە دوورەو هەر سوڕێکی نزیکەی ١١ ساڵو ٩ مانگ دەخایەنێت. موشتەری گەورەترینی هەسارەکان و تیرەکەی ٨٨٧٠٠ میلە. بە واتا ١١ جار لە تیرەی زەوی گەورە ترە. هەسارەیەکی

تر كه له خۆرەوە دوور بێت زوحەله. زەبەلاحێكی ترە كە تیرەكەی دەگاتە ٧٥١٠٠ میل، واتە ٩ جار لە تیرەی زەوی گەورە ترە. دوای زوحەل ئۆرانۆس دێت، ئۆرانۆس زۆر لە زەوی گەورە ترە، تیرەكەی دەگاتە نزیكەی ٣٢٠٠٠ میل. ئەم هەسارەیە بە لادا كەوتووەو میحوەرەكەی خوارە بە گۆشەی ٩٨ پلە. بەلام خواری زەوی بە گۆشەی ٢٣,٥ پلەیە. دوای ئۆرانۆس بنتۆن دێت كە تیرەكەی ٣٠٠٠٠ میلە. دوای هەموویان دەگەینە پلۆتۆ. وا مەزەندە دەكرێت تیرەكەی بگاتە ١٨٦٥ میل. پلۆتۆ هێندە لە خۆرەوە دوورە كە خۆر وەكو ئەستێرەیەكی درەوشاوە بێت لە ئاسماندا وا دێتە بەرچاو.

## شیلان "المرجان"

مرۆڤ هەر لە كۆنەوە شیلانی سووری لە خشڵدا بەكارهێناوە. ڕۆمانیەكان بۆ خۆ ڕازاندنەوە كردویانەتە ملی منداڵەكانیان و باوەڕیان وابووە كە شیلان لە نەخۆشی و مەترسی دەیانپارێزێت. تا ئێستاش لە هەندێك ناوچەی ئیتاڵیا خەڵكی پارچە شیلان لە مل دەكەن بۆ خۆپاراستن لە چاوی پیس.

## ئایا دەزانن شیلان چیە؟

شیلان پەیكەرە ئێسكی ئاژەڵێكی دەریایی زۆر بچووكی نەرمە كە پێی دەوترێت "بولب" واتە شیلان. ئەم ئێسكە پەیكەرە لە دەرەوەی لاشەی بولب دا گەورە دەبێت و دەیپارێزێت و پاڵپشتی دەكات. لەگەڵ گەشەسەندنی ئاژەڵەكەدا ئەمیش گەشە دەكات. هەموو بولبێك لە لولەكێكی باریك دەچێت. كە لە سەرێكەوە داخرا بێت و ماددەیەكی قسلی دەرژێنێت ئەو ئێسكە پەیكەرەی لێ دروست دەبێت كە لە كوپێك دەچێت لە دەرەوەو ژێرەوەو هەر چوار لادا دەوری لاشەكەی دابێت. لە سەرەتادا بولبەكە لە ژێری ئاوەكەدا دەنوسێتە بەردێكەوەو بولبەكانی تر وەكو چرۆی بچووك لەسەر لاشەی دەردەچن. كاتێك بولبە كۆنەكان دەمرن بولبە زیندووەكان هەر بە قەد ئێسكە پەیكەرەكەوە دەمێننەوەو زۆرترین لە جۆری خۆیان بەرهەم دەهێنن. بەم ڕێگەیە شیلانەكە گەشە دەكات و دەكۆڕێت بۆ موستەعمەرانێك كە لە ملیۆنەها دانە پێك هاتووە. هەر كە چینێك دروست دەبێت

لەسەر چینێکی تر لە ئەنجامدا دەبێتە زنجیرەیەك لە دورگەی شیلانێ لە زەریاکانادا. کە مەترسیەکی زۆر بۆ ئەو کەشتیانە دروست دەکات کە بەناو زەریاکاندا تێدەپەڕن ئەو چینە قسڵیانە ڕەنگەکانیان لە ڕەنگی ئەو مەوادانەوە وەردەگرن کە لە دەریادا هەیە. بەو جۆرە ئێمە لەو ئێسکە پەیکەرانەوە جۆرەها ڕەنگی شیلانەمان دەست دەکەوێت. شیلان بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئاوە گەرمەکان و زەریای هێمن و هنددی و دەریای سپی ناوەڕاستدا هەیە. دوای زاخاودانی شیلانە بریقە دەداتەوەو خەڵکی بۆ خۆ ڕازاندنەوە بەکاری دەهێنن.

## زەردەواڵەی دەریا

ئەو گیاندارەی کە بە کوشندەترین گیاندار دادەنرێت لە جیهاندا، زەردەواڵەی دەریایە. دوای پێوەدان قوربانیەکە تەنها لە ماوەی پێنج خولەکدا گیان لە دەست دەدات. چزوەکانی سەدان هەزار خانەی بچووکی پڕ لە ژەهری تێدایە. کە لە ژەهری ماری کوبرا دەچێت. ژمارەیەکی زۆر زەردەواڵەی دەریایی لە ئاوەکانی بەرامبەری باکوری ئوسترالیاو وڵاتە یەکگرتووەکاندا لە کارولیناوە بۆ فلۆریدا لە باشور بەرامبەر لێوارەکانی ئەتڵەسیەو ڕۆژئاوای ئەفریقیاو زەریای هندیدا هەیە. زەردەواڵەی دەریایی ڕەنگی نیەو لاشەی لە شێوەی زەنگدایەو ٩٥ ٪ ی لاشەی ئاوەو گیاندارێکی زۆر فێڵبازەو بە دوو چاوی زۆر تیژ نەبێت نابینرێت لەناو ئاوە گەنیوو مەنەکانی لێوارەکاندا دەژێت، لاشە زەردەواڵەکان جیاوازی لە نێوان ٤ بۆ ٢٠ سانتیمەترو درێژیشیان دەگاتە ١٠ سانتیمەتر ڕەنگی چزوەکانیان شین یان ئەرخەوانیەو درێژیەکەی دەگاتە ١٢٠ سانتیمەترو بە ئاسانی دەتوانرێت ببینرێت. هەر زەردەواڵەیەکی دەریایی نزیکەی بیست چزویەکی پێوەیەو هەر چزویەکیشی نزیکەی ٧٥٠ هەزار خانەی چزوی تیایە، کە بتوانێت ژەهر بڕژێنێتە لاشەوە. لە بنەڕەتدا کاری ئەو چزوانە دابین کردنی خۆراکە لەگەڵ بەرەنگاری لە خۆی هەر گیاندارێك لەگەڵ گەیشتنی بەو چزوانە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەمرێت لەگەڵ ئەوەشدا قوربانیەکە توشی ئازارێکی زۆر دەبێت. تا ئێستا زانایان نەگەیشتونەتە چارەسەرێکی کاریگەر بۆ ژەهری ئەم زیندەوەرە، لەبەرئەوە دەبێت مرۆڤ، لەکاتی مەلەکردندا لەو ئاوانەی زەردەواڵەی دەریایی لێیە، ئاگای لەخۆی

بێت نەپێکرێت.

## ئەزتەکیەکان چییان بەسەر هات؟

دیارترین گەلانی ئەمریکای کۆن ئەزتەکیەکان بوونە. گەلێکی شارستانی بوونەو تا ساڵی ١٥١٩، تا ئەو کاتەی ئیسپانیەکان مەکسیکیان داگیر کرد، حوکمی مەکسیکیان کردوە. لە دۆڵێکدا دەژیان کە ئێستا شاری مەکسیکۆستی لەسەر بینا کراوە. ئەو هندیە ئەمریکیانە، شێوازێکیان لە ژیان پێشخست لە زۆر ڕووەوە لە شارستانیەتی ئێستای ئەورووپا دەچو. پەرستگاو بورجیان دروست کردو بیناو ماڵی بەرز بەرزیان بینا کردو لە زانستەکانی ئەستێرە ناسیو قانون و حوکم دا زۆر شارەزا بوون. وەکو چۆن لە زۆر هونەرو پیشەدا پسپۆڕ بوون. زۆریش پەیوەست بوون بە مۆسیقاو سەماو ئەدەبەوە. جگە لەمانە، کێڵگەی کشت و کاڵییان هەبوو، ئەمەش شتێك بوو کە ئەورووپیەکان نەیان بوو. هەروەها یاسای کەناڵی ئاودێریشیان دەزانیو هەیان بوو لەگەڵ پیشەسازی چنین و خەستەخانەو پزیشکی چاکیشیان هەبووە وەکو ئەورووپا. لە ساڵی ١٥١٩ کاپیتانێکی بە ناوی "هێرناندۆ کۆرتیز" کە لە نێوان ساڵانی ١٤٨٥ و ١٥٤٧دا ژیاوە. بە سەرکردایەتی سوپایەکی بچووك هێرشی کردە سەر ئەزتەکیەکان و دوای شەڕێکی خوێناوی توانی هێزی ئەزتەك بشکێنێت و دوای ئەوە مەکسیکی کردە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا. تا ئێستاش زۆرێك لە هندیە، ئەمریکیەکان کە لە مەکسیکدا دەژین بە زمانی ئەزتەکی قسە دەکەن. مەکسیکیەکان و مەکسیکیە تازەکانیش شانازی بە ئەزتەکیەتی خۆیانەوە دەکەن. و زۆر لە داب و نەریتی باوو باپیرانیان پاراستووە. کە لە پێش داگیرکردنی ئیسپانیەکاندا هەیانبووە. تا ئێستاش زۆر ووشەی ئەزتەکی، نەك تەنها لە زمانی مەکسیکیدا. بەڵکو لە بەشێك لە زمانی ئینگلیزیشدا بەکاردەهێنرێت. لەگەڵ ئەوەی هێزو ئیمپراتۆریەتی ئەزتەکیەکان، لە پێش ٤٥٠ ساڵدا ڕوخا. بەڵام هێشتا کاریگەرییان هەرماوە.

## فلاشی کامیرا چۆن ئیش دەکات؟

کاتێك کەسێك دەیەوێت لە تاریکیدا وێنەیەك بگرێت. فلاش بەکاردێنێت لە

کامیرادا. به تەنها پەنجە گوشاردان لەسەر دوگمەی کامیراکە بلاچەیەك دەردەچێت، ئەو شتەی مەبەستە وێنە بگیرێت ڕووناك دەکاتەوە.

## ئایا دەزانن فلاش لە کامیرادا چۆن ئیش دەکات؟

فلاشی نوێ سەرچاوەیەکی ڕوناکی هەیە کە بریتییە لە گلۆپێکی "زەنون" "زەنون توخمێکی گازی خاوە هێماکەی نوە". بۆ وەگەڕ خستنی فلاشەکە خولی کارەبایی و سەرچاوەی وزەی کارەبایی هەیە کە وزە دەداتە گلۆپەکە. سەرچاوەی کارەباکەش بریتی یە لە پیلێکی وشك. بەلام دەتوانرێت لە فلاشدا کارەباش وەکو سەرچاوەیەکی وزە بەکاربهێنرێت. فلاشەکە هەڵدەستێت بە گۆڕینی وزە کارەباییەکە بۆ وزەی ڕووناکی. گلۆپی زەنون بۆرییەکی شوشەیە درێژیەکەی دوو ئینج و تیرەکەی چارەکە ئینجێکە. لە هەردوو سەرەوە داخراوە. ئەم بۆریە بەتاڵ دەکرێت و بە گازی زەنون پڕ دەکرێت لە ژێر پلەی فشاری جیوە ٤٠٠ بۆ ٥٠٠ ملیمدا. سیمێکی زۆر باریك دەپێچرێتە دەوری بۆریەکەوە. وەکو ئەلکترۆدی سێیەم ئیش دەکات و بە جەمسەری تێر ناسراوە. هەردوو سەری ئەلکترۆدەکە، لە گلۆپەکەدا پەیوەست دەکرێتە بازنەیەکی کارەباییەوە کە چرکەرەوەیەکی تێدایە بۆ پەسیسە کردنی وزەی کارەبایی. کاتێك وێنەگر پەنجە دەنێتە دوگمەی کامیراکەدا، کلیلە کارەباییەکەش پاڵەپەستۆی دەکەوێتە سەرو لە جەمسەری سێیەمەوە لێدانێکی ڤۆڵتی زۆر بەرز دەردەچێت کە دەبێتە هۆی بە ئایۆن بوونی گازە زەنوونەکە. بە جۆرێك کە دەبێتە گەیەنەرێکی کارەبایی. لەم حاڵەدا وزە پەسیسە کراوەکەدا، لە چرکەرەوەکەدا، لە ڕێگەی گلۆپە زەنونەکەوە بەتاڵ دەبێت. لە ئەنجامی بەتاڵ بوونەکەدا تیشکێك دەردەچێتکە ئەو تەنە ڕووناك دەکاتەوە مەبەستمانە وێنەی بگرین. لە دواوەی گلۆپە زەنونەکەوە پێچەوانەکەرێك هەیە. ڕووناکیەکە ئاراستە دەکات بەرەو ئەو شوێنەی مەبەستمانە وێنەکەی لێبگرین. ئەو تیشکەی لە فلاشەکەوە دەردەچێت لە شێوەی لێداندایە، ماوەی هەر یەك لێدانی یەك لە هەزاری چرکەیەکە. بەلام تیشکەکە زۆر چڕوپڕە. لە ئێستادا هەموو کامیراکان فلاشیان لە سەرە.

## دەريا ژێر زەمينيەكان

ئێمە دەزانين ڕووبارەكان بەسەر زەويدا دەڕۆن. بەلاّم ڕووبار هەيە لە ژێر زەويدا ئايا دەزانن ئەو ڕووبارانە چۆن دروست دەبێت ؟

زۆر هۆكار هەيە دەبێتە هۆى بوونى ئاو لە ژێر زەويدا.

كاتێك ڕووى سەرەوەى زەوى ئاو دەيەڵێت ئاوى باران لێيەوە بچێتە خوارەوە بۆ چينەكانى ژێرەوەى زەوى ڕەق، ئەو ئاوە لە ئەنجامى پاڵە پەستۆى بەرزى ئاودا (تدفق) دەست بە ڕۆشتن دەكات و شێوەى ڕووبارى ژێر زەوى وەردەگرێت.

ڕۆشتنى ئاو بەناو بەردەكاندا پشت بە دوو هۆكار دەبەستێت :

_ كونى بەردەكان.

_ تواناى ڕۆشتنى ئاوەكە بەناوياندا. كون لە پارچە بەرددا ئەو شوێنە كونەيان هەڵكۆڵيوە. بەردە نەرمەكان شلەكان زياتر تێيدا دەڕۆن. بەلاّم بەردە ڕەقەكان ئەوان كونيان كەمترە. (النفاديه) دەستەواژەيەكى گشتى يە بۆ ئەوحاڵەتە بەكاردەهێنرێت كە شلە دەتوانێت بەناو (فجوه) ى بەردەكەدا بڕوات. ئەويش بەشێوەيەكى بنەڕەتى لەسەر قەبارەى كونەكە دەوەستێت ئاوى ژێر زەوى بەشێوەيەك دەڕوات كە شوێنەكەى لێژ بێت.

بەردە قسڵيەكان سيفەتى كون و شێوازى (مخروگى ) يان هەيە. كاتێك باران بەسەرياندا دەبارێت كەرێژەيەكى ديارى كراو ترشى تێدايە. ئەوە كردارێكى سەر سوڕهێنەر ڕودەدات. بە جۆرێك ئاوەكە دەست بە (تدفق) دەكات لەناو كونى بەردەكانەوە وبۆ جۆرە (مخرج) يك دەگەڕێت.لەگەڵ ڕۆشتنى ئاوەكەدا (يحت) بەردەكەو كونى درێژ دروست دەبێت و دەبێتە ڕووبارى درێژ لە ژێر زەويدا. ئەو ڕووبارانەش زۆر جار ئاويان دەگاتە دەرياكان. شێوەيەكى ترى دروست بونى ڕووبارى ژێر زەوى هەيە. كاتێك سەرچاوەيەك ناتوانێت لەبەر ڕەقى بەردەكان بتەقێنێت و ئاوەكەى بێتە سەرەوە. ئەوا دەست بەڕۆشتن دەكات. بەژێرى زەويدا. ئەو ماوەيەى كە ڕووبارەكانى ژێر زەوى دەيبڕن جياوازن. بۆ نموونە ڕووبارى ڕاينى فەرەنسى بەناوبانگ. ماوەيەكى زۆر كورت دەبڕێت. ڕووبارێكى ترى ژێر زەوى زۆر بەناوبانگ هەيە لە بەريتانيا دا كەناوى ((سومرست)) ە. پسپۆڕان

لەبوارى ئەشكەوت ومەغاراندا هەولْ دەدەن، ڕێڕەوەكان لەوە تەسك ترن بچێتە ناويەوە. بۆيە بۆ ئەو مەبەستە كردارێك داهێنرا. كە بريتى يەلە بۆياخ كردنە ناو ئاوەكەيەوە بۆ ئەوەى كە دێتە دەرەوە جارێكى تر بناسرێتەوە.

## نابينا چۆن دەخوێنێتەوە و دەنوسێت؟

((بريل)) سيستەمێكە بۆوێنانەى كە نابينايان لە سەرانسەرى جيهاندا بەكارى دێنن بۆ خوێندنەوە و نووسين.
ئەم سيستەمە لويس بريلى لە سالْى ١٨٢٩ دا كاتێك خۆى خوێندكارێك بوو پەيمانگاى نيشتمانى مندالأنى لە پاريس. بريل بەهۆى ڕوداوێك لە تەمەنى سىْ سالْيدا چاوەكانى لەدەست دا.. كاتێك خەريكى بڕينى چەرم بوو لەدووكانەكەى باوكيدا چەقۆكە چوو بە چاويدا و كوێرى كرد. لە سالْى ١٨١٩ بريل چوو بۆ ئەوە پەيمانگايەى ناومان برد. لە وێدا نووسينێكى تازەى بۆ نابينايان داهێنا. لە نێوان سالأنى ١٨٢٩و١٨٢٧ داسيستەمى نووسينەكەى بلأو كردەوە. ئەم سيستەمە پشت بەخانەيەكى ٦ خالْى دەبەستێت. ئەم خالأنە لە خوارەوە بۆ سەرەوە ڕيز كراون ١_٢_٣ لە چەپەوە لە بچووكەوە بۆ گەورە هەروەها ٤_٥_٦ لە ڕاستەوە دەپيتى يەكەمى پيتە هيجاكانى زمانى ئينگليزى بە خالْ نووسراوە ١،٢،٣،٤،٥ لەپيتەكانى T_K. نوسراوە سەرەڕاى خالْى ٣بۆ هيماكان لە ستوونى ١ دا. پێنج پيتە ماوەكان پێك دێن وەپێنج ووشە زۆر ناسراوەكە سەرەڕاى خالْى (٦) بۆ هێماكان لە ستونى (٢) كاتێك خالْى (٦) دەخرێنە سەر دەپيتى يەكە) (٩) كۆمەلە پيتى پێك دەهێنن، وەكو چۆن سيستەمەكە شتەكانى تر پيشان دەدات. ڕێگەى بريل لە شيفرەيەكى (كۆمەلێك هێما ) پێك دێت كە بريتى يە لە ٣٦ پيت. ئەم پيتانە ٢٦ يان پيتە ئينگليزيەكانن، لەگەلْ ووشەو ژمارە گەلێكى تردا. ئەم پيتانە لەسەر كاغەزێك هەلْدەكەنرێت و بەهێواشى پەنجەى بەسەردا ڕەد دەكەين. دواى مردنى بريل ٢سالْ لە سالْى ١٨٥٢ سيستەمەكەى بەشێوەيەكى ڕەسمى پەيڕەو كراوە لە ئەمڕۆدا چاپخانە هەيە كتێبەكانى بريل چاپ دەكات. لە سالْى ١٨٩٢ وە چاپخانەى تايبەت لە وولأتە يەكگرتوەكاندا داهێنرا بۆ ئەو مەبەستە ڕێگەى بريل سەلماندويەتى كە قازانجێكى زۆربە نابينايان دەگەێنێت.

## منداڵ بۆچی زۆر دەگری؟

واباوه منداڵانی تازه له دایك بوو له سه‌ره‌تایی مانگه یه‌كه‌مه‌كاندا زۆر ده‌گرین. به‌ڵام كاتێك ده‌ست به‌ نه‌شوونما و گه‌وره‌ بوون ده‌كات دیارده‌ی گریان لایاندا ده‌ست به‌كه‌م بوونه‌وه‌ ده‌كات. كاتێك ده‌گاته‌ ته‌مه‌نی دوو ساڵ، ئه‌م دیارده‌یه‌ به‌ ته‌واوی كۆتایی دێت.

ئایا ده‌زانیت بۆچی منداڵان زۆر ده‌گرین ؟

به‌ شێوه‌ی یه‌كه‌م گریان نامه‌یه‌كی ده‌نگیه‌ كه‌ منداڵ به‌كاری دێنێت. وه‌ك و په‌یوه‌ندی ئاژه‌ڵی وایه‌. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی منداڵان هه‌ست و ئاره‌زووه‌كانیان ناتوانن قسه‌كانیان ده‌ربڕن بۆیه‌ به‌ گریان په‌یوه‌ندی ده‌كاته‌ ئه‌وانه‌ی له‌ چوارده‌وریدان.

هێمای گریان ته‌نها ته‌عبیر كردن نیه‌ له‌ ئاره‌زووه‌كان و ته‌نگژه‌ییه‌كانی وه‌كو برسێتی و نه‌خۆشی به‌ڵكو مومارەسه‌یه‌كیشه‌، فرمێسكیش له‌ چاوی منداڵ تایبه‌ت تازۆر ته‌نگژه‌نه‌بێت. زۆربه‌ی دایكان ده‌توانن جیاوازی بكه‌ن له‌ نێوان جۆری گریانه‌كاندا. ئه‌وه‌ی كه‌ نیشانه‌ی برسێتی و تووره‌ بوون یان ژانه‌ دایكان ده‌توانن زۆر به‌ووردی بزانن منداڵه‌كانیان چیان ده‌وێت. ئه‌گه‌ر برسی بێت ته‌نانه‌ت له‌ كاتی لاواندنه‌وه‌شدا ئاشت نابێته‌وه‌ تاتێر نه‌گرێت. به‌ڵام ئه‌گه‌ر گریانه‌كه‌ی ئه‌نجامی بێزاری بێت، له‌گه‌ڵ ده‌ركردنی له‌لانك و گواستنه‌وه‌ی بۆ شوێنێكی تر ئاشت ده‌بێته‌وه‌. لێكۆڵینه‌وه‌كان ده‌ریان خستوه‌ ئه‌گه‌ر دایك هه‌ستیار بێت بۆ گریانی منداڵه‌كه‌ی وزوو بچێت به‌ده‌میه‌وه‌ ئه‌وا منداڵه‌كه‌ له‌ كۆتایی ته‌مه‌نی یه‌ك ساڵیدا گریانی كه‌م ده‌بێته‌وه‌. به‌ به‌راورد له‌گه‌ڵ منداڵێكی تردا كه‌ ئه‌و گرنگییه‌ی پێ نه‌درێت. كاتێك منداڵ ده‌گاته‌ ته‌مه‌نی چوار یان پێنج مانگ زۆربه‌ی منداڵان جۆرێك له‌ده‌نگ ده‌ر ده‌كه‌ن ئه‌و ده‌نگه‌ پێی ده‌وترێت (خرخره‌) تێبینی كراوه‌ منداڵان چێژ له‌و ده‌نگه‌ وه‌رده‌گرن. ناتوانین هه‌موو جارێك بزانین بۆچی منداڵ ده‌گری. جاری واهه‌یه‌ منداڵ نه‌ برسێتی و نه‌ تورنیه‌تی نه‌ ته‌نگاوه‌ و نه‌ترساوه‌ و نه‌بێزاره‌ به‌ڵام هه‌ر ده‌گری. به‌ هه‌رحاڵ گریانی منداڵ واته‌ ناردنی نامه‌یه‌كی دیاری كراو !.

## بۆچی دەنگی خەڵکی جیاوازیان هەیە ؟

ئێمە دەزانین پەنجە مۆری خەڵکی جیاوازیان هەیە، بەو شێوەیە دەنگی خەڵکیش وەکو یەك نین. ئایا هۆی ئەوە دەزانن ؟

کرداری قسە کردن و ووشە دەربڕین، جوڵەی سەدان ماسولکە تیاندا بە شداری دەکات. بە تەنسیقی گونجاو. ئەندامی قسە کردن، یان ووشە دەربڕین کەپێ ی دەوترێت (( قورگ)) دەتوانێت ژمارەیەکی بێ ئەندازە لە دەنگ دەربکات. قوڕگ بەشێکە لە گەردن. کە هەوا پیایدا دەڕوات کاتێك هەناسە دەدەین هەوا لە ڕێگەی قورگەوە دەچێت بۆ دەم و لووت بۆ قصبە لموایییەکان ئەمجابۆ سیەکان. قوڕگ لە دیوارێکی غفرونی پێك دێت. بەڵام بەشی ناوەوەی لە چینێك لەڕیشال پێکهاتووە. کە بە هەردوولادا درێژ دەبێتەوە لە (فجوە) یەك لە نێوانیاندایە. لە حاڵەتی هەناسەدانی ئاساییدا قوڕگ لە نێوان ژێ دەنگیەکاندا بەکراوەی دەمێنێتەوە. ژێ دەنگیەکان نەرمن، بەڵام لە کاتی قسەکردن و هاوار کردن و گۆرانی وتنی توندا توندەبێت و لە کاتی دەرکردنی هەوادا، ژێکان دەلەرنەوە و دەنگ دەردەکەن. دەشێت ژێ دەنگیەکان نزیکەی ۱۷۰ دۆخی جیاواز بە خۆیانەوە ببنین. کاتێك ژێکانیش نەرمن بەنزیکەی ۸۰ جار لە چرکەیەکدا دەلەرنەوە ئەنجامەکەشی دەرکردنی دەنگێکی نەرمە. کاتێك توند دەبێت بە خێرایی دەلەرێتەوە. دەشێت ۱۰۰۰ جار لە چرکەیەکدا. شەپۆلی دەنگی کورت یاندەنگی بەرز دەردەکات. لەبەر ئەوەی منداڵان ژێ دەنگیەکانیان کورتە، بۆیە شەپۆلی دەنگی کورت و بەرز بەرهەم دەهێنێت.

لەگەڵ گەشەکردنی منداڵدا، ژێ دەنگیەکانی درێژ ترو قوڵتر دەبنەوە لەبەر ئەوە دەنگی گەورەکان لە دەنگی منداڵەکان گڕترو گەورەترن. بە وشێوەیە دەنگی زۆربەی پیاوان، لە دەنگی ژنان قوڵترە. لەبەر ئەوە قوڕکی پیاو لە دەنگی ژن درێژ ترە.

پلەی دەنگ لەسەر درێژی ژێ دەنگیەکان دەوەستێت. هەموو دەنگێك (مەودای)یەکی دیاری کراوی هەیە لەلەرینەوەدا. ئەو مەودایەیە کە بڕیاری جۆری کەسە دەدات. دەتوانین دەنگەکان بکەینە شەش چینەوە.

جۆری دەنگی مرۆڤ لەسەر زۆرشتی تردەوەستێت وەكو سیەكان و زمان و هەردوو لێوو بارودۆخی مرۆڤ.

## ددان

دان ئێسقانێكی زۆر رەقە و لە دەمی زۆربەی بڕبڕەدارەكاندا هەیە. مرۆڤ بە درێژایی تەمەنی دوو جۆر ددانی لێ دەردێت. (( دادنی شیری و ددانی هەمیشەیی)). ددانی شیری لە تەمەنی شەش مانگیدا دەست بە دەرچوون دەكات و لە تەمەنی سێ ساڵی منداڵەكەدا كۆتایی دێت و نزیكەی ٢٠ دانیشە. بەڵام منداڵەكە كە گەیشتە تەمەنی ٦ساڵاُن دانە شیریەكانی دەست بەكەوتن دەكەن و وردە وردە لە شوێنەكەیدا دانی هەمیشەی دەردێت. كاتێك مرۆڤ دەگاتە سەرەتایی ٢٠ ساڵانی تەمەنی دەبێتە خاوەنی ٣٢دانی هەمیشەیی. هەموو ٣٢ دانەكە وەكو جووت بەڕیز لە هەردوو دیوی ڕیزی سەرو خوار درێژ بوونەتەوە. چوار جۆر لە ددان هەیە. بڕەرەكان، كەڵبە، خریَ (كە چوار خریَ لە دوای كەڵبەوە دێت.لە لای سەرەوە دا، هەروەها چواریش لەلای خوارەوەدا ) لەگەڵ (بڕەرەكان ). بڕەرەكان ٨ دانن لە بەردەمەوە لەهەر لایەك چوار. سەرەكانیان تیژەو بۆ گرتن و بڕینی خۆراك بەكاردێن. چوار كەڵبە كەش هەریەكەكێكی لە لایەكەوەو لەهەر شەویلگەیەكدان ٢ دان هەیە. ئەو ددانە بەهێزانە بۆ ورد كردنی خۆراك بەكار دەهێنرێت. هەر بڕەرێك و هەر كەڵبەیەك ڕشیكیان هەیە لە دوای هەر كەڵبەیەكەوە دوو بڕەر دێت. لەهەر شەویلگەیەكیشدا ٤ خریَ هەیە. هەر خرێیەكیش سەرێكی (سندوق)ی و ڕیشكێك یان دووڕشیكی هەیە. لە دوای هەر جووتێك بڕەرەوە ٣ خریَ دێت لەهەر شەویلگەیەكدا شەش خریَ هەیە. خرێیەكان چەند سەری (سندوق) و چەند سەری ڕشێكێكی هەیە. سێ یەم خریَ پیَ دەوترێت ((ددانی ئەقڵ)) لەبەر ئەوەی ئەو ددانە لە بیست ساڵی دا دەردەچێت. بڕەرو خریَ یەكان بۆ بڕین و هاڕینی خواردن بەكارێت. هەر ددانێك لە دوو بەش پێك دێت، تاج و رەگ. تاج ئەو بەشە دیارە یە لە سەروی هێڵی پوكەوە. بەڵام ڕەگ بەشە شاراوەكەیە لە ژێریدا. بەڵام ئەوبەشەی كە وتوَتە سەر هێڵی پوك كە تاج ورەگی تێدا پیَ دەوترێت((عنق)). هەر ددانێك لەسێ چین پێك دێت. چینی سەرەوە پیَ

دەوترێت (( مینا)) کەرەقترینی بەشەکانە. ئەوچینەی دوای ئەودێت پیێ ی دەوترێت ((عاج)) کە زۆربەی ددانی لێپێکهاتووە. دوا چینیش کە چینی ناوەوەیە پیێ ی دەوترێت ((للب)) کە دەمارو دەمارە خوێنەکانی پێوە پەیوەستە. ((لب)) خۆراك دەداتە عاج و دەمارو دەمارە خوێنەکانیش لە لوبدا پەیوەستە بە لاشەی مرۆڤەوە بە هۆی کەنالی ڕەگەوە. پرسیار لێرەدا ئەوەیە. بۆچی دانەکان خراپ دەبن ؟

ڕۆژانە ژمارەیەکی بێ شوومار بەکتریا دەچنە ناودەمی مرۆڤەوە. ئەم بەکتریایانەش شەکر دەنێنن و دەیگۆڕن بۆ ترشی. ئەو ترشانەش لەگەڵ میناداد کارلێکی کیمیایی دەکەن کون یان کلۆری دەکەن،کونەکانیش کەلە ئەنجامی کلۆر بوونەوە دروست بون پڕ دەبن لە خۆراك شیتەڵ بوونی، دەبێتە هۆی بونی دانیش. بۆ پاراستنی تەندروستی مرۆڤ پێویستە ددانەکان پاك ڕابگیرێن. هەروەها خواردنەوە زۆر ساردو زۆر گەرمەکانیش ئازاری ددان دەدەن. هەروەها شەکریش.بەڵام میوەو لیمۆ یارمەتی پاراستنی تەندروستی ددان دەدات.

## یاری تۆپی باسکە (سلە)

ئەمڕۆ یاری باسکە یاریەکی بەناوبانگە لە جیهاندا.ئەم یاریەلە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە سەری هەڵداوە. لە ساڵی ١٨٩١ دا جیمیس نیسمیس دایهێنا لە قوتابخانەی مەشقی سەربە یەکێتی لاوانی مەسیحی لە شاری سپر ینغفیلدی وولایەتی ماساتشوسیتس. نیسمیس ئەوکاتە مامۆستای وەرزش بوو لەو قوتابخانەیەدا.قوتابیان لە قوتابخانە خەریکی مەشقی ڕۆتینی بێزار کەربوون حەزیان دەکرد گۆڕانی تێدا بکرێت. بەو جۆرە نیسمیس دەگەڕا بە شوێن یاریەکدا کەسەرنجیان ڕاکێشێت. بۆیە یاری تۆپی باسکەی داهێنا بەکۆکردنەوەی چەند توخمێك لە یاریەکی هندیە سورەکان لەگەڵ چەند توخمێك لە تۆپیێ پیێ ی بریکانی. ئەم یاریە تازەیە پێویستی بەلێدەر نەبوو. (دار) وەکو لەیاری (ئاکرۆس) دا. کە هندیە سوورەکان دەیانکرد. تەنانەت بەپیێ شتەکە دەدرا لە تۆپەکە وەکو لە تۆپی پێدا. بەڵکو دەبێت تۆپەکە بخرێتە ناو سەلەیەکەوە. بۆیە بە یاری تۆپی سلە ناسرا. دوای جەنگی جیهانی دووەم ئەم یاریە جەماوەری زیادی کرد. ئەم یاریە

لە نێوان دوو تیپدا دەکرێت کە هەر تیپێکیان بریتی یەلە پێنج یاریچی یاریگاکەی لاکێشەییە درێژیەکەی ٢٦ م و پانیەکەی ١٤مەترە دو ناوەڕاستی هەرلایەکی دا سەلەیەك بەستونێکەوە هەڵوەسراوە بۆ ئەوەی هەر تیپێك گوڵی خۆی بکات دەبێت تۆپە کەبخاتە ناو سەلەکەوە. یەکەم یاری تۆپی دەست لە کانونی ١٨٩٢ داکرا. ئەم یاریە لە ساڵی ١٩٣٦ وە چووەتە ناو یاریەکانی ئۆلۆمپیاتەوە. تیپەکانی ئەمریکا لە یاریەکانی ئۆلۆمپیدا دوای ئەو ساڵە حەوت خوول لەسەر یەك پلەی یەکەمیان بەدەست هێنا. لە ساڵی ١٩٣٠ دا یەکیەتی تۆپی دەستی بریتانی دامەزرا.

## بۆچی هەندێك کەس توشی کوێری ڕەنگەکان دەبن ؟

ئەوانەی کە ناتوانن جیاوازی نێوان ڕەنگەکان بکەن پێیان دەوترێت توشی کوێری ڕەنگەکان هاتوون. دەشێت ڕەنگێك یان دوو ڕەنگ یان سێ ڕەنگ لە ڕەنگە بنەڕەتیەکان ( شین، سەوز، سوور) نەبینێت.

هەندێك ڕەنگی سوور نابینن. هەندێکی تر ڕەنگی شین. ئەوانەی ڕەنگی سوور نا بینن ناتوانن جیاوازی بکەن لە نێوان ڕەنگەکانی سوور و سەوز دا. هەشە ناتوانێت جیاوازی لە نێوان ڕەنگەکانی شین و زەرد دا بکەن. هەشە شین نابینێت بۆیە ڕەنگی سەوزیش نابینن.

ئەوانەی کە تووشی کوێری ڕەنگەکان بووە خۆیان ئەو ڕاستیە نازانن،کوێری ڕەنگەکان بەهۆی تابلۆگەلێکی تایبەتیەوە دەبێت کە لە چەند ڕەنگێکی جیاواز پێکهاتوون. ئەگەر کەسەکە نەیتوانی بەچاوی جیاوازی ڕەنگەکان بکات، پێ دەوترێت تووشی کوێری فلاَنە ڕنگ بووە.

ئایا دەزانن چی دەبێتە هۆی کوێری ڕەنگەکان ؟

کوێری ڕەنگەکان نەخۆشیەکی پشتاو پشتە و هیچ چارەی نیە. هۆیەکەشی هەڵاوێژیاریە لە شێوە قوچەکیە هەستیاریەکاندا بۆ ڕەنگەکان کە لە تۆڕی چاودان. ئەو شێوە قوچەکیانەش بۆ ڕیشاڵە تۆڕیەکان لای مرۆڤ ئاسایی زۆر هەستیارە بۆ سێ ڕەنگە بنەڕەتیەکە کە سوور و سەوز و شینن. ڕەنگە جیاوازەکانی ترلە ئەنجامی تێکەڵ کردنی ئەم سێ ڕەنگەوە پەیدا دەبن. ئەگەر خانە ڕیشاڵیە شێوە

قوچەکیەکان لە تۆڕەکەدا هەستیار نەبوون بۆ ڕەنگەکان ئەوا ئەو ڕەنگە ناتوانێت بیوروژێنێت و لە ئەنجامی ئەوە مرۆڤ توشی ئەو ڕەنگە دەبێت. کوێری ڕەنگەکان توشی نێرینە و مێینەش دەبێت. بەڵام زیاتر توشی ڕەگەزی نێریە دەبێت. زۆر زەحمەتیشە هۆیەکەی بزانرێت. لە هەموو جیهاندا نزیکەی ٦٪ لە پیاوان و ١٪لە ڕەگەزی مێ بە دەست ئەم نەخۆشیەوە کوێری ڕەنگەکان کار لە هێزوو تیژی چاوناکات. هەروەها کێشەیەکی گەورەش نیە. بەڵام دەشێت بۆ فڕۆکەوان و شۆفێران زۆر مەترسیدار بێت. لە بەر ئەوەی ناتوانن جیاوازی لە نێوان هێما سوورو سەوزەکاندا بکەن. لە بەر ئەوەی توشبوان بە کوێری ڕەنگەکان لەو کارانەدا دانامەزرێنن.

کیماگەری بە ناوبانگ (( دالّتۆن )) یەکێك بوە لەو کەسانەی توشی ئەم نەخۆشیە بووە بۆیە هەندێك جار بە کوێری ڕەنگەکان دەوترێت (( دالّتۆنی)) ،.

## زمانی کەڕوو و لاڵان.

پێش سەدەی شانزەهەمی زاینی کەڕو لاڵ ( ئەوانەی ناتوانن قسە بکەن وببیستن ) کۆمەڵگا وەکو مینیوزیك هەڵس وکەوتی لەگەڵ دەکردن. بە شێکیان دەزانین کە ناتوانن ئیشی باش ئەنجام بدەن، لەملجیێ تایبەتدا زیندانی دەکران و یان دەکوژران ئەم بارودۆخەیان کاری کرد لە پزیشکی ئیتالّی (( جیرو نیموکارنۆ )) بۆیە سیستەمی تایبەتی بۆ فێرکردنیان داهێنا. کە بەهۆی تیپی نوسراوەوە فێری دەکردن.

لە سەدەی ١٨ (( ئابی شارلز مایکڵ ئابی )) فەڕەنسی. زمانی هێماکانی داهێنا بۆ کەڕو لاڵان. ئەم سیستەمە پشت بەهێمای دەستەکان و باسکەکان دەبەستێت هەندێکیان وەکو پیتی ئەبجەدی و هەندێکی تریان ووشەو تەنانەت دەستەواژەش بەم جۆرە کەڕو لاڵان تاپێشی ٨٥ ساڵ، بەهۆی پەیوەندی بەهۆی هێماو تەعبیری دەم و چاو و ئەبجەدی پەنجەکانەوە. فێر دەبوون. هەندێکیان دەیانتوانی لەیەك خولەکدا تەعبیر لە ١٣٠ ووشە بکەن. بەڵام زۆرێك لە پسپۆڕانی ئەم بوارە نەیاری خۆیانیان دەبڕی سەبارەت بەزمانی هێماکان و ئەبجەدی پەنجەکان. بەبیانوەی ئەم سیستەمە لاڵ پەراوێز دەخات بە دوور خستنەوەیان و پەیوەندی نەکردنیان

لەگەڵ خەڵکانی ئاسایی دا. ئەو پسپۆڕانە بڕوایان وایە دەبێت لاڵ خوێندنەوەی لێوەفێربێت، بەڵکو فێر بکرێن پەیوەندی بەخڵکانی ترەوە بکەن بە هۆی دەنگانەوە ئەگەر توانرا. لە مەزنترین مامۆستایانی ئەم سیستەمە ( موریتز هیل) ی ئەڵمانی بوو ( ١٨٥٠_١٨٧٤) لە ئێستادا مامۆستایان هەردوو شێوازەکە تێکەڵ دەکەن. لە ئەمڕۆدا کەڕوو لاڵن خوێندی لێوان فێر دەبن. وەکو چۆن بۆ خۆیان لە ڕێگەی تێبینی کردنی مامۆستا و ئەندامە دەنگیەکانی و لاسایی کردنەوەی فێر دەبن. لە سەردەمی بیستەم دا پێشکەوتنی گەورە لەم بوارەدا دانراوە. کەوای کردوە کەڕولاڵن بتوانن لەبەردەم خەڵکی تردا تەعبیر لەخۆیان بکەن.

ئامێری (( تدس))

ئامێری ((لدس)) ئامێرێکە بۆ پێوانەی گۆشەکان بەکار دەهێنرێت. وەبەشێوەیەکی سەرەکی بەرزی تەنە ئاسمانیەکان وەکو خۆر یان یەکێك لە ئەستێرەکان. هەروەها لەکەشتی و فڕۆکەکاندا بۆ دیاری کردنی بەرزیەکان. ووشەی ئامێری((لدس)) لە زمانی ئینگلیزی دا لەووشەی sextus ی لاتینیەوە وەرگیراوە کەمانای ((شەش یەکی )) دەدات. ئەم ئامێرە کەوانەیەکی پێوەیە لە شێوەی شەش یەکی بازنەیەیەك یان ٦٠پلە. لە دیوە بازنەیەکەشیەوە. پێوەرێکی ژمارەدارە. ئەم ئامێرە لە سەر دەستی پیاوێکی ئینگلیزی بەناوی (( جۆن هودلی)) لە ساڵی ١٧٣١ دا، داهێنرا. کە بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ زانینی بەرزی کەشتیەك یان دووریی لە هێڵی ئستیواوە بەکاردەهێنرێت. بەڵام داهێنانی ئامێری ((لدس)) بنەمای کەشتیوانی هاوچەرخی دانا. ئامێری لدس لەکەوانەیەکی بازنەیی پێك دێت کەپلەپلە ژمارە کراوە لەگەڵ باسکێکی نیووە تیرەیدا کە دەجوڵێتەوە میحوەرەکەشی دەکەوێتە چەقی بازنەکەوە. ئاوێنەیەکی جوڵاوی پێوەیە کە لە دیوی باسکەکەوە قایم دەکرێت، بەڵام ئەو لاکەی تر بۆ پێوەرەکە درێژ دەبێتەوە. تەلیسکۆبەکە دەخرێتە سەری و ئاوێنە یەکیش لەبەردەم تلسکۆبەکە دادەنرێت. لە پێناو وەرگەڕخستنی ئامێرەکەدا. ئەوەی ئیش لەسەری دەکات لە تەلسکۆبەکەوە سەیری ئاسۆ دەکات. وە بەجوڵاندنی ئاوێنەکە خۆر یان هەر هەسارەیەکی تر مەبەستی بێت لە ئاسۆکەدا بەدەر دەکەوێت. ئەو باسکەش

که ئاوێنەکە دەجولێنێت، پێوانەی تەواوی گۆشەکەمان دەداتێ. لەڕێگەی زانینی گۆشەکەو کاتی تەواوی ڕۆژەوە، ئەوا بەرزیەکەی دەزانین. زانینی بەرزیەکان بۆ کەشتی وانان زۆر بەسوودە. لەبەر ئەوەی پێیان دەڵێت لە کوێی زەویدان !

## چۆن فڕۆکە بە فڕیووی لە ئاسماندا دەمێنێتەوە ؟

فڕۆکە ئامێرێکی فڕیوە. کێشی لە هەوا قوورسترە. و دووباڵی جێگری پێوەیە. کاتێك فڕۆکە کە لە ئاسماندایە بۆ سەرەوە و خوارەوە بەردەم و دواوە دەبێت. هەموو ئەمانە لەیەك کاتدا. لەیەك کاتدا ٤ هێزی جیاوازکاری لێدەکات:

١_ کێش

٢_بەرزکردنەوە

٣_ پاڵنانی بۆ پێشەوە

٤_ ڕاکێشان.

ڕاکێشان ئەو هێزە ڕاکێشەرەیە بۆ ژێر. بەرزکردنەوەش فڕۆکە کە پاڵ دەنێت بۆ سەرەوە. هێزی بەرز کردنەوەش لە باڵەکانیەوەیە کە هەوا کەدەبڕێت. هێزی ڕاکێشانیش فڕۆکەکە بۆ دواوە ڕادەکێشێت. بەلاّم هێزی پاڵ نان بۆ پێشەوەی دەبات. بەلاّم فڕۆکە کە لە بەر دوو هۆی گرنگ دەتوانێت بە جێگیری بفڕێت:

١_ هێزی پاڵنان لە بزوێنەرەکانیا =بە هێزی ڕاکێشان.

٢_هێزی بەرز کردنەوەی باڵەکانی =بەهێزی ڕاکێشانی بۆ خوارەوە.

فڕۆکە لە سێ بەشی سەرەکی پێك دێت ئەوانیش باڵەکانی، لاشەی، کۆمەڵەی کلیکی. لاشەی فڕۆکە ژوری فڕۆکەوانی تێدایە لەگەڵ هۆڵی سەرنیشینان ( ڕێبواران) نەفەرەکان کەپێ یدەوترێت قەدی فڕۆکە.بەشی ستونی لە کلکی فڕۆکەکەشی پێ ی دەوترێت دفە ئاراستەی فڕۆکە. بەشی کۆتایی لەکلك پێ ی دەوترێت ( زعنفە). فڕۆکەوان لە ژووری سەرکردایە تیەوە تەمەکوم بە هەموو ئەو بە شانەی ترەوە دەکات. باڵەکانی فڕۆکە بە پاڵە پەستۆی هەوا بەرز دەبێتەوە. باڵۆکە کانیش پەروانەن لەسەر باڵەکان فڕۆکەکە دەپارێزن لە دۆخی چەماوەیدا لەکاتی لادانداْ. پەروانەکانی تریش هێزی بەرزبونەوەی زیاتر دەدەن بە فڕۆکە کە کاتێك خێراییەکەی کەمە. لە کاتی فڕین و دابەزیندا. کۆمەڵەی کلکی فڕۆکە کەش

فڕۆکه که به جێگیری دەهێڵتەوە. فڕۆکەوان دەتوانێت دەفەکە بۆ لای ڕاست یان چەپ وەرگەڕێنێت. کاتێك دەفەکە بۆ لای ڕاست دەجولێنێت پێشەوەی فڕۆکەکە بولای ڕاست وەردەگەڕێت. کاتێکیش بۆ لای چەپ وەری دەگێڕێت پێشەوەی فڕۆکە کە بولای چەپ وەر دەگێڕێت. زعنفه کەش پارسەنگی فڕۆکە کە دەپارێزێت بۆ فڕین بەرەو پێشەوە. موازنی فڕۆکە دا نایەلێت بەرز و نزم بکات لە هەوا دا. کۆمەڵەی کلکیش کەپێ ی دەوترێ ((دفە)) بەرزبونەوە وپەیوەستەبە موازنەوە یارمەتی بەرز بوونەوە و دابەزینی دەدات.

## سێودۆلایت (لیڤڵ) چیە؟

سێودولایت (( ئامێرێکە بە کار دەهێنرێت بۆ پێوانە کردنی گوشە ستونی و ئاسۆییەکان. نەخشە کیشان دەتوانین بەهۆیەوە پێوانەی نێوانەکان و ئاراستەکان لەنێوان جیگا جیاوارەکانی سەرزەویدا بکەن. هەروەها سێودولایت پێوانەی زۆر ورد و سەبارەت لە گۆشەکان لە دڕینی جادە و تونێلە کاندا و ئیشەکانی تری ئەندازیاری شارستانی مان دەداتێ. بەیارمەتی سێودولایت زانایانی گەردون ناسی لەسەری ئاسۆوە گۆشەی مانگ لە دوو شوێنی سەرزەوی یەوە بپیوَن. ئەوش پێ ی دەڵێت سیستەمی ( تلیس) لەو گۆشانەشەوە دەتوانن ماوەی نێوان مانگ و خۆر دیاری بکەن.

ئایا دەزانن سێودولایت چیە؟

سێودولایت بۆ یەکەمجارلەسەدەی شازدە هەمدا لە لایەن زانای ماتماتیکی ئینگلیز یونارديگزی بریتانەوە دروست کرا. بەتێپەڕ بوونی ڕۆژگار گۆڕانکاری زۆری تیاداکرا. لەشێوە تازەکەیدا لە دوربینێکی پێك دێت کەلە سەر محیوەرێکی ئاسۆیی و ستونی پێکەوە دانراوە. پێواەنی بەهۆی تەرازویەکی ڕاستی کحولی. دوو هێڵەیەکتر بڕە کەلە کونی چاوەکەوە لە دوور بینەکە دا. دەهێڵێت زۆر بەووردی پێوانەکان نیشانەکە بکرێت. لەگەڵ ڕێکخستنی دوور بینەکە دا هەر دوو پێوەرکە زۆر بەوردی پێوانەکان دەخوێننەوە. ئاسۆیی و ستونی پێکەوە. سێودولایت لەسەر بۆ ئەوەی زۆر بەووردی پێوانەکان بخوێنینەوە لەسەر پایەك دادەنرێت. دەشتوانین ئەندازەی ٣٦٠ پلە بیسوڕێنین.

## چۆن پاککەرەوە کیمیاییەکان دروست دەکرێت ؟

پاکرەوەی کیمیاییەی مادەیەکی ئەندامیە. لە کاربۆن و ئۆکسجین و گۆگرد و هایدرۆجین پێك دێت ز کاتێك ئەو تێکەڵەیە لەگەڵ ئاودا یەکدە گرن یارمەتی پاککردنەوەی مەوادە پیسەکان دەدات. سابوونی ئاسایی جۆرێکە لە جۆرەکانی پاککەرەوەکان. بەڵام پێکهاتە کمیاییەکەی جیاوازە. پاکژ کەرەوەماڵیەکان کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە پاککردنەوەی جل و بەرگ و کەل و پەلەکاندا بەکاردێت لە شێوەی هاڕاوە یان شلە یان توێکڵدا دروست دەکرێت.

یەکەم پاکژکەرەوەی کمیایەی لە لایەن زانای ئەڵمانی (فرنتیز گۆنسەر )) وە لە ساڵی ١٩١٦ دروست کرا. لە ساڵی ١٩٣٣ پاکژکەرەوە کمییاییە ماڵیەکان چووە وولاتە یەکگرتوەکانەوە لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بەکار هێنانی پاکژ کەرەوە کمییایەکان بە شێوەیەکی بەر بلاْوو پەرەی سەند. دوای ئەوەش زیاتر. هەموو پاك کەرەوە کمییایەکن، مادەی بنەڕەتی پاککردنەوەی تێدایە. کە بریتی یە لە مادەیەکی کاریگەر لەسەر شتەکان. ئاو کەکاتێ دەلکێتە گەردیلەکانی پیسیەکەوە لەسەر ڕووی شتە پیسەکە ولێ دەکات و دەیڕزێنێت. بە چینێك ئاو دەورەی دەدات کە وای لێدەکات بخزێت بۆدوور لەڕووی شتە پیسەکە. مادە پاکرەوەکە کە ئاوەکە زیاتر تەڕدەکاتەوە بەکەم کردنەوەی توتری ڕووی. لەبەر ئەوە هەریەکەی پێ ی دەوترێت (( نویێ کەرەوەی توتری ڕوویی )). توتری ڕووی واتە هێزە لە جیابوونەوەی ( نویات ) ی ئاوەکە لە یەکتر دەپارێزێت بە چوونە قولاْیی ڕیشاڵەکاندا نیشتوتەوە. بۆ نموونە :

مەوادە پاککەرەوە ڕوویەکان یارمەتی لابردنی چەوری و کەف هەڵخستن دەدەن. مەوادی پاکژ کەرەوەی ڕوویی بەچارەسەر کردنی ڕۆنی مانگا پیوەکەی بە مەوادی کمییایی جۆراو جۆر دروست دەکرێت. سەرەڕای ئەوەی مەوادە کمیاییە ڕوویەکان پاکژ کەرەوەی کمییا یان تێدایە توخمی تری زۆر شتی تێدایەکە دەبێتە هۆی سپی کردنەوە و بریقە دانەوەی جل و بەرگەکانمان. دەتوانین مەوادی پاکژ کەرەوەی ڕوویی بکەینە سێ گروپی سەرەکیەوە :

(ئاینۆنات ) ( یان ئایۆنات کە هەڵگری بارگەی کارەبای سالبە ) کە بارگەکەی

دەبێتە سالب کاتێك لە ئاودا ئەتوێتەوە. ( کایتۆنات ) یان ( ئایۆناتی هەڵگری بارگەی کارەبایی موجەب ) کە ئایۆناتی مووجەب درووست دەکات کاتێك لە ئاودا دەتوێتەوە. مەوادە نا ئایۆنیەکان کە ناگۆڕێت بۆ ئایۆنات. دەکرێت پاککەرەوە کمییایەکە یەکێك لەو سێ گروپە پێك بێت یان لە تێکەڵ کردنی دوانیان یان زیاتریان بێت.

## شێرپەنجە چیە؟

شێر پەنجە نەخۆشیەکە، بەزۆر بوونی کۆمەڵێك خانەی دیاری کراوە دەست پێ دەکات بەبێ هیچ ڕێکیەك بە لەناو چوونی ڕیشاڵە ساغەکانی لاشە. نەخۆشیەکی کوشندەیە. لەبەر ئەوەی تائێستا چارەسەرێکی بۆ نەدۆزراوەتەوە. ساڵانە هەزاران کەس لە سەران سەری جیهاندا بەم نەخۆشیە دەمرن.

ئایا دەزانن شێر پەنجە چیە ؟

لاشەمان لەخانە پێك دێت. ئێمە دەزانین گەشەسەندنی لاشە بە کەرت بوونی خانەکان ڕوودەدات لە زۆربەی ڕیشاڵکاندا بە درێژایی تەمەنی مرۆڤ. تەنها بەم ئالیەتە زیندەوەرەکان خانەی تازە لە شوێنی خانە کۆنەکان دروست دەکەن و بەو جۆرە ڕشاڵەکانی دەپارێزێت بۆ ئەوەی ئیشەکانی بەرێکو پێکی ئەنجام بدات. ئەم کردارەش زۆر ڕێك وپێکە. بەلاَم ڕوودانی (شزون)لە کرداری دابەشبوونی خانەکاندا لە قەبارەیەکی گەورە لە ڕیشاڵکاندا دەبێت کە پێی دەوترێت( الورم) وەرمەکان دوو جۆرن، پیس و صحیدە. وەرم پیسەکان شێرپەنجەیین و بەلاَم صحیدەکان نەئ وەرەمە پیسەکان هێرش دەکەنە سەر ڕیشاڵە ساغەکان بەلاَم ورەمە صحیدەکان هێرش ناکەن سەری. دەشێت خانە شێرپەنجەییەکان لە وەرەم بترازێن و بۆریەکانی خوێن بیگوێزنەوە. خانە ترازاوەکان بچن لە بەشەکانی تری لاشەی مرۆڤدا جێگیربن، کە وردە وردە زیاد دەکەن بۆ ئەوەی وەرەمی تازە دروست بکەن. جولاَنەوەی خانە شێر پەنجەییەکان بەبلاَوو بوونەوەی شێر پەنجە ناو دەبرێت. دەشێت وەرەمە شێر پەنجەییەکان لە کۆتایدا ئەندامە گرنگەکانی لاشە لە ناو ببەن و ببێتە هۆی مردن. دەشێت خانە شێر پەنجەییەکان لەسەر هەر بەشێك لە لاشەی مرۆڤدا دروست ببن جۆرەهاو جۆر لە شێر پەنجە هێرش دەکاتە

سەر مرۆڤ کە ژمارەی لە ١٠٠ جۆر زیاترە. کە گرنکگترنیان : شێر پەنجەی پێست، سی، خوێن، منداڵدان، مەمك و هتد. شێرپەنجەی پێستە زۆر بە شێنەیی دروست دەبێت و بلاو نابێتەوە بۆ بەشەکانی تری لاشە. شێر پەنجەی سی بەزۆری توشی پیاوان دەبێت، بەلام شێر پەنجەی مەمك زیاتر لە ناو ژناندا بلاو دەبێتەوە وەك پیاوان. شێر پەنجەی خوێن کەپیێ ی دەوترێت ((لوكمییا)) ( سپی بوونەوەی خوێن ) تیایدا خانە خوێنیە سپیە ناتەواوەکان بلاو دەبنەوە. دەشێت مرۆڤ لەرێگەی دەست لێدان و مەوادی کیمیاوی و تیشکەکان و ڤایرۆسەوە تووشی شێرپەنجە بێت هەندێك لە جۆرەکانی شێر پەنجە بە پشتاو پشت ( بۆماوە) دەگوێزرێتەوە. زۆر جگەرەکێشان دەشێت ببێتە هۆی شێرپەنجەی سی. سێ جۆررێگە هەیە بۆ چارە سەری شێرپەنجە. ئەگەر شیرپەنجەکە پێش بلاو بوونەوەی بەدەرکەوت ئەوا پزیشك دەتوانێت بە برین و فرێ دانی چارەسەری نەخۆشەکە بکات. چارە سەری ددوەم بەکارهێنانی تیشکی X و تیشکەکانی گامایە موادە تیشکدەرەکانی وەکو کۆباڵت و ڕادیوم. چارەسەری سێیە میش بەدەرمانە. کەپیێ ی دەوترێت چارەسەر بە مەوادی کیمیایی هەندێك دەرمان سەرکەوتنی بەدەست هێناو لە چارەسەری سپی بوونی خوێن و درمی لنفاویدا.سەرەڕای ئەوەی زانایان لە سەرانسەری جیهاندا خەریکی لێکۆڵینەوەن لەسەر نەخۆشی شێر پەنجە بەلام تائێستا چارەسەرێکی دڵنیای بۆ نەدۆزراوەتەوە.

## ئایا عەندەلیب تەنها لەشەوادا دەخوێنێت ؟

شاعیران هێندە بۆ عەندەلیب شعریان ووتوە بۆ هیچ باڵندەیەکی تر نەیانووتووە. ئەم مەلە بە دەنگە خۆشەکەی دڵی شاعیرانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە.

شاعیران دەڵێن عەندەلیب تەنها لەشەوادا دەخوێنێت، بەلام ئەمە قسەیەکی ڕاست نیە و عەندەلیب باڵندەیەکی گەڕۆکە و لە نێوانی نیوەی نیسان و نیوەی حوزەیراندا ئەبێت دەنکی ئەم مەلە لە بەریتانیا نابیسترێت.هەرگیز لە ئیرلندا یان ویلز یان سکۆتلاند دا نابینرێت.بەرێژەیەکی زۆر لە ئەورووپاو باشوریدا هەیە. لێشیان دەگاتە ئێران و نیوە دوورگەی عەرەی نیوە دوورگەی سینا و جەزائیر و

کەناری زێڕین لە ئەفریقییا. لە شتە سەرەکانی ئەم مەلە ئەوەیە تەنها نێرەکانیان دەخوێنن. بۆ ڕاکێشانی مێیەکان لە دارستانەکان یان دارێکی نزیکەوە. عەندەلیب لە شەوو ڕۆژدا دەخوێنێت و دەتوانرێت لە نێوان دەنگی باڵندەکانی تردا. دەنگی بناسرێتەوە.

کەمێیەکان هێلکەکان دا دەنێت عەندەلیب لە خوێندن دەکەوێت. بۆ ئەوەی سەرنجی دوژمنەکانی بۆلای هێلانەکەی ڕانەکێشێت. کە خۆی ئێشکی لێ دەگرێت. ئەو دەنگەش دەری دەکات زۆر کورتە بۆ ئاگادار کردنەوەی مێینەکە کە هەموو شتێك باش دەڕوات یان ئاگاداری دەکاتەوەلە هەرچی مەترسیەك هەستی پێ بکات.نێرو مێی عەندەلیب تا ئەندازەیەکی زۆر لەیەك دەچن. ڕەنگیشیان قاوەییەکی بەرەو سوورە لە بەشی سەرەوە سپی لەسەر خۆڵەمێشیە لە بەشی خوارەوەی. عەندەلیب هێلانەکەی جیاواز لە باڵندەکانی تر دروست دەکات.لە نزیك زەویدا دروستی دەکات. لەدەرەوە لەگەلأی دار دروستی دەکات لەناوەوەش هلۆلیەکی قوڵە لەجام دەچێت. کەبەڕیشاڵی ڕەگی ڕووەکەکان دەوری دەدات. هێلانەی عەندەلیب زۆر فشۆڵەوو تەنها بەدەست لێدانێك دەڕوخێت. هەمیشە لە ٤ بۆ ٦ هێلکەی ڕەنگ زەیتوونی تێری تێدا دادەنێت.

## ژمارەی یەکەمی چیە؟

ژمارەی یەکەمی ژمارەیەکی تەواوی ئیجابیە لەیەك گەورەترە بەسەربەخۆی و بەسەر یەکدا نەبێت دابەش نابێت واتە ٢،٣،٥،٧،١١،١٣،١٧،١٩،٢٣، واتە ئەو ژمارانەی کە دابەش نابن. ژمارە یەکەمییەکان ئەسڵی بیرکارین، هەمیشە ئەوانەی هاج و واج کردووە کە گرنکی بە ژمارەکان دەدەن. مەزنترین زانایانی بیرکاری هەوڵیان داوە ژمارەیەکەمیەکان دابەش بکەن بەسەر یەکێکی تردا بەڵام سەرکەوتو نەبوون. دەتوانین تەعبیر لەو ژمارە تەواوانە بکەین کە لەیەك گەورە ترن، گوایە کە تەنها ئەنجامن بۆ گرووپێکی لە ژمارەیەکەمیەکان سەرەڕای ئەوەی ڕاستی ژمارەیەکەمیەکان بۆ یەکەمجار ٣٠٠ ساڵ پێش زاین لەلایەن ماتماتیك دانانی ئەغریقی وەکو اقلیدس و ایراتوستینسەوە تێبینی کراوە بەڵام تائێستا جیٚ ی پرسیاری بەئەنجام نەگەیشتوە. ژمارەیە کەمینەکان بێ کۆتاین، لە ڕووی

تیۆریەوە دەشێت هەرچی شتێك لە ((بێ كۆتایی )) دا ڕوویدات بەڵام خاوەنی بیردۆزەكان تا ئێستا نەیان توانیوە ڕێسایەك بدۆزنەوە تەحەكومی كەم و كورتیەكانی ژمارە یەكەمینەكانەوە بكات. كە تا ئێستاش مەتەڵێكی هەڵنە هێنراوی گەورەی ماتماتیكە.

## داركون كەرە.

دار كون كەرە بۆیە بەو ناوە ناونراوە چونكە دار كون دەكات. كاتێك دەبینینن دار كون كەرەیەك دار كون دەكات، وا دەزانین زیانی پێ دەگەیەنێت بەڵام وانیە.بەڵكو زۆر قازانجی پێ دەگەیەنێت و هەرچی مێرووی زیان بەخشە لە دارەكەدا هەمووی دەخوات و لە ناویان دەبات. زۆرێك لە مێرووە ڕەقانە كرمیەكان كە لە قڵیشی توێكڵی داراندا خۆیان حەشار داوە دار كون كەرە بە غریزە دەتوانێت بیا دۆزێتەوە. تەنانەت ئەگەر لە دەرەوەش نەبینرێت. دار كون كەرە هەڵ دەستێت بە هەڵكەندنی كونێكی قوڵ و بە خێرایی پێ یدەگات، ئەو مێروو كرمانە زۆرجار زیان بەخشن بۆ دارەكان. دان كوون كەرە دەنوكێكی وەكو ئەزمیل ( ئامرازی چەرم بڕینی كارگەی پێڵاوو كەووش دروان ) دەتوانێت كون لە دارە مردووەكان ونەخۆشەكاندا هەڵكەنێت. ئینجا زمانە درێژەكەی بەكار دەهێنێت بۆ گرتنی و خواردنی مێرووەكان.زۆربەی دار كون كەرەكان كونی گەورە لە قەدوولقی داران دەكەن و دەیكەنە هێلانە بۆ خۆیان. ٢٤ جۆر دار كونكەرە لە ئەمریكای باكووریدا هەیە. دار كون كەرەكان درێژیان لە نێوان ١٤ بۆ ٣٤ سانتیمەتردایە. كاتێك دار كون دەكەن دەرگایەك لە پێشەوە و دەرگایەك لە پشتەوە بۆ خۆیان دەكەنەوە تا لەكاتی تەنگاو كردنیانەوە لە لایەن دوژمنانیانەوە لێیەوە هەڵبێن.

## ئێسكە پەیكەر.

ئێسكە پەیكەر ئەو بیناغەیە كە لەشی مرۆڤ لەسەری دەوەستێت. لە ئێسك و كرکڕاگەو ڕیشاڵی زۆر بەهێزپێك هاتووە. هەندێك لە ئێسقانەكانی درێژ و زۆر بەهێزن و هەندێكیشیان پانن. زۆربەی ئێسقانەكان بەڕیشاڵی لیمفی زۆر بەهێز دا

پۆشراو سەری ئێسقانەکان لەلای جوومگە جوڵەییەکانەوە بە (کرکراگە ) داپۆشراوون. لەگەڵ یەکتردا بە ڕشاڵێك پەیوەستن گرێ دەدات پێیان دەوترێت( روابگ) بەڵام ماسولکەکان ئێسقانەکانە بە هۆی ڕیشاڵکەوە پێکەوە گرێ دەدات پێی دەوترێت (ژێیەکان ) ئەو ماسولکانە یارمەتی جوڵانەوەی ئێسکە پەیکەر دەدات تابتوانێت بجوڵێتەوە. کاتێك منداڵ لەدایك دەبێت (٣٠٠) ئێسقانی جیاوازی هەیە. بەڵام کاتێك گەورە دەبێت زۆرێك لەو ئێسقانانە پێکەوە جۆش دەخۆن و ئێسکە پەیکەر لە مرۆڤی گەورە دا دەبێتە (٢٠٦) ئێسك دەتوانێنن ئێسکە پەیکەر بکەینە دوو بەشی سەرەکیەوە:

محیوەر کە لەسەرو قەد پێك دێت.

بەشی دووەم هەردوو دەست و قاچ.

کەللە سەر لە چەند پارچە ئێسقانێك پێك دێت کە مێشك دەپارێزێت. بڕبڕەی پشتیش لە چەند ئێسقانێکی جووتدا پێك دێت حەوتی لە ملدایە و ١٢ لە پشتیدایە و ٥دوایی لە پشتی سکدایە ٥ تریش لەناوچەی سمت دایە ٤ی تری لەناوچەی کلێنچکەدایە.

١٢ جووت لە پەراسووش بە دەوری سنگدایە. زۆربەی ئەو دەندەلانە لە ناوەڕاستی سنگدا پەیوەستە بە قەفەزەوە یان ئێسکی سنگەوە. ئێسقانی دەست و قاچەکان درێژ و بەهێزن. قوولەپێ و دەست لە هەشت ئێسقانی رسغی وە ئێسقانی یان پێکهێناوە پێنج پەنجەی دەستەکانیش لە ١٥ سلامی تێدایە. ئێسقانی قاچەکان گەورە تر و بەهێزترن لە ئێسقانی باسکەکان. گەورە ترین ئێسقان لە لەش دا ئێسقانی ڕانە. ئێسقانی مرۆڤ بە شێوەیەکی سەرەکی لە کالسییۆم و فۆسفۆرپێك دێت بەشی ناوەڕاستیشی مادەیەکی تێدایە پێ ی دەوترێت (( درکە مۆخ) کە خوێن دەداتە ئێسقانەکان ئێسقانەکان نەك تەنها لەشی مرۆڤ ڕاگیردەکەن بەڵکو هەندێك شوێنی هەستیاریشی دەپارێزن. ئێسقانەکان بەر پرسن لە جوڵانەوەی لاشە. بەبێ ئێسقان لەشی مرۆڤ تەنها کۆما گۆشتێکە.

## بۆچی توشی هەڵامەتی ئاسایی دەبین ؟

ڕەنگە کەسێك نەبێت لە دونیادا تووشی هەڵامەتی ئاسایی نەبێت. زۆرترینی

نەخۆشیە درمەکانە لە جیهاندا. بڵاوبوونەوەی لە وەرزی زستاندا زۆترە وەك لە وەرزی هاوین دا لە وولاّتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا دا ٩٠٪ ی خەڵکی ئەمریکا بەلای کەمەوە ساڵی جارێك توشی هەلاّمەت دەبن.

ئایا دەزانن بۆچی توشی هەلاّمەت دەبین ؟

هەلاّمەتی ئاسایی هۆیەکەی ڤایرۆسە. زانانیان تائێستا لێکۆڵینەوەیان لەسەر ٢٠٠ جۆری جیاواز لە ڤایرۆس کرادوە کە دەبێتە هۆی هەلاّمەت. ئەو ڤایرۆسانە دەچنە لوت و قورگەوە و پەردەکەی بریندار دەکەن و بەوەش لوت و چاو دەست بە ئاو ڕژاندن دەکەن. پژمین لە نیشانە سەرەکییەکانی هەلاّمەتە. کاتێك نەخۆشیەکە دەگاتە سیەکان. نەخۆش توشی تاو کۆکین دەبێت. توشبوان بە هۆی کۆکین و پژمینەوە ئەم نەخۆشیە بلاّو دەکەنەوە. کاتێك کەسێکی ساغ هەوای پیس هەڵدەمژێت میکرۆبەکان دەچنە لوت و دەمیەوە و توشی دەکەن. هەلاّمەتی ئاسایی سێ ڕوژ دەخایەنێت و بەسێ قۆناغدا تێ دەپەڕێت قوناغی یەکەم کەپێ ی دەوترێت قۆناغی ووشك بوونی لوت و قورگ توشبوو لوت و قورگی ووشك دەبن و هەست بە سوتانەوە دەکات و چاوی ئاوی لێدێت. لە قۆناغی دووەمدا لوت دەست بە ئاولێهاتن دەکات لە قۆناغی سێیەم و کۆتایدا نەخۆش تاو کۆکەی بۆ دروست دەبێت. هەلاّمەتی ئاسایی لەلای کەسە پێگەشیتوەکان دروست ناکان. بەلاّم دەشێت مندالاّن توشی ( سورێژە ) حصبە و دڤیتریا بکات. هەلاّمەت نەخۆشیەکی درمیە بەدەست لێدان بلاّودەبێتەوە.

## لەشی مرۆڤ لە چی پێکدێت ؟

هەموو گیاندارە زیندوەکانی سەرزەوی ڕووەك بن یان گیاندار لە خانەپێك دێن. وەکو چۆن بیناکان لەخشت و بەرد پێك دێت. خانەکان پارچە یەکەن کە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی فەرمانەکان لە هەرگیانداڕێکی زیندوو. ئێسکەکانمان و دانەکانمان و مووەکانمان و خوێنەکانمان و دەمارەکانمان وپێستەکانمان و هتد هەر هەمووی لە خانە پێکهاتووە. لاشەی مرۆڤ لە ملیۆنەها خانە پێکهاتووە. ئەو خانانەش هێندە قەبارەیان بچووکە کە بە هۆی وردبینەوە نەبێت نابینرێت. ئەندامە جیاوازەکانی لەشمان لە جۆرەها خانەی جیاواز پێك دێت. کە

هەرجۆرێکی فرمانێکی تایبەتی جێ بەجێ دەکات. هەندێك لە خانەکان هێندە وردن تەنانەت بەهۆی وردبینە ئەلەکترۆنیەکانەوە کە ٢٠٠ هەزار جار شتەکە گەورە دەکاتەوە ناتوانرێت ببینرێت.

مرۆڤ ئەوکاتە دەزانێت خانە مرۆڤیەکان چەندە بچووکن ئەگەر بزانیت لاشەی مێروویەکی ئاسایی ٢٠٠ هەزار جار گەورە بکرێتەوە درێژیەکەی دەبێتە کیلۆمەترێك هەروەها خانە جیاوازەکان شێوازی جیاوازیان هەیە. هەیانە هێلکەییە هەیانە خڕە. هەیانە پانە هەیانە لاکێشەییە و هەیانە لولەییە و هتد. بەدەوری هەریەکەیاندا پەردەیەکی نەرم هەیە پێی دەوترێت پلازما کە نیوچە (نقان) یکە. لەبەرئەوە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە ڕێکخستنی ئەو موادانەی کە لێیەوە دەڕۆن. پەردەی خانەش پڕە لە شلەیەکی شێوە هێلمی نیوە ڕوون کە پێ ی دەوترێت پرۆتۆ پلازما.

پرۆتۆ پلازما ( کە مادەی زیندووی بنەڕەتیە لە خانە ڕووەکی و ئاژەڵیەکاندا ) مادەیەکی کیمیایی زۆر ئاڵۆزە چەندین فرمان ئەنجام دەدات لەلەشدا. هەڵدەسێت بەهەموو کردارە پێویستیەکانی ژیان. خۆراك و ئۆکسجین دەمژێت. هەندێك لە و مادە خۆراکیەکان دەگۆڕێت بۆ مادەی زیندوو ئەوەی لاشەمان پێویستی پێ نەبێت لەناوی دەبات.ئەندامە لەناوچووەکان چاك دەکاتەوە وزیاد دەکات. خانەکان یەکدەگرن بۆ ئەوەی ڕیشاڵەکان پێك بێنێت، کە جۆرەها ئەندامی جیاوازی لەش لێ پێك دێت. بەو جۆرە دەتوانین بڵێن خانەکان یەکەی دروست بونن لە هەموو گیاندارە زیندووەکاندا.

## وردبینی ئەلەکترۆنی چۆن ئیش دەکات ؟

وردبین ئامێرێکە شتە بچووکەکانمان بۆ گەورە دەکاتەوە. دوو جۆر ووردبین هەیە:

١_ ووردبنی چاوی.

٢_ ووردبینی ئەلەکترۆنی.

لە ووردبینی چاوی دا ئەو شتەی دەمانەوێت ببینین بە ڕووناکی ڕۆشن دەکرێتەوە. وێنە گەورە بووەکە بە یەکگرتنی دوو عەدەسە دەستمان دەکەوێت. یەکەمیان پێ ی دەوترێت عەدەسەی شت و ئەوی تریان پێ ی دەوترێت

عەدەسەی چاو.

بەڵام وردبنی ئەلەکترۆنی تەزویەك لە ئەلەکترۆناتی زۆر خێرا بە کار دەهێنێت لەبری بەکارهێنانی سەرچاوەیەکی ڕووناکی. ووردبینی ئەلەکترۆنی عەدەسەیی نیە بەڵام عەدەسەی موگناتیسی و بواری ئەلەکترۆناتی بەکار دەهێنێت. لە مووگناتیسی کارەباییەوە ئەو بوارە موگناتیسیەمان دەست دەکەوێت. کە لە شێوەی گلۆڵە، دیاردەی (الترکز) لەکاتی دەردانی تەزوە کارەباییەکان بەرهەم دێنێت تیایدا. ووردبینی چاوی دەتوانێت ۲۵۰۰جار ئەو شتەی خراوەتە ژێری گەورەی بکاتەوە. بەڵام ووردبینی ئەلەکترۆنی دەتوانێت ۲۰۰ هەزارجار گەورەی کاتەوە.

ووردبینە ئەلەکترۆنیەکان لە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەندامە زۆر ووردەکانی وەکو ڤایرۆسەکان و بەکتریا و ڕیشاڵەکان بەکار دەهێنرێت. ئێمە دەزانین تیشك بەشێوەی شەپۆل دەگوێزرێتەوە. بە هەمان شێوە شەپۆلەکان پەیوەستی دەبێت لەگەڵ جوڵەئەلەکترۆناتەکاندا. کەبە شەپۆلەکانی ماددە دەناسرێت. ووردبنی ئەلەکترۆنی بە بەسود وەرگرتن لە پەیوەندی شەپۆلەکانی مادە لەگەڵ ئەلەکترۆناتەکاندا دروست کراوە. لەبەرئەو هۆیە وردبنی ئەلەکترۆنی تواناى شیتەڵکردنی بەرزترە لە توانای شیتەڵ کردنی ووردبینی چاوی. لە ووردبینی ئەلەکترۆنیدا گورزێك لە ئەلەکترۆنات دەخرێتە سەر ئەو شتەی کەمەبەستە ببینرێت. بەیارمەتی (عەدەسە) ی موگناتیسی کارەبایی وێنەی گەورە کراوەی شتەکەمان دەست دەکەوێت کەلە سەر شاشەی فۆرسنتێك دەردەچێت. وێنەی ئەو وێنەیە لەسەر وێنەیەکی فۆتۆ گراف یان تابلۆیەك دەگیرێت و بەیارمەتی ئەو وێنەیە لێکۆڵینەوەی پێکهاتەی شتەکە دەکرێت. بەدوورو دێژی. ووردبینی ئەلەکترۆنی لە لێکۆڵینەوەی شتە وردەکان بەکار دەهێنێت. ئامێرێکی زۆر بەسودە و بە زۆری لە لێکۆڵینەوەی لە پێکهاتەی کریستاڵەیەکان و خانەکان و ڤایرۆس و بەکتریاکاندا بەکار دێت. زۆربەی تاقیگەی گەورەکانی لێکۆڵینەوە بەکاری دێنن.

## هندیەکانی ئینکا.

ئینکا هندیەکانی ئەمریکای باشوورن، کە حکومەتیان بەسەر ئیمپراتۆریەتێکدا

دەکرد لە ناوەڕاستی شیلی تا سنوری ئێستای نێوان کۆلۆمبیا و ئیکوادۆر. هندیەکانی ئینکا پایتەختی خۆیان لە (( کزکۆ )) دروست کرد لە سەدەی ۱۸ ((مانکۆکایان )) یەکەم حاکمی ئینکابوو. بڕوایان وابوو کە لە نەوەی خواوەندی ڕۆژە. هندیەکانی ئینکا جەنگە کانیان لە سەرەتای سەدەی ۱۵ هەمدا دەست پێ کرد و لە ماوەی (۱۰۰) ساڵدا توانیان دەست بگرنە سەر دانیشتوانی ئەندیز دا کە ئەوکات ژمارەیان نزیکەی ۱۲ ملیۆن کەسێك دەبوو. کۆمەڵگای ئینکا کۆمەڵگایەکی چینایەتی بوون.ئیمپراتۆر بەیارمەتی چینە دەرەبەگە بە ئەوپەڕی دڕندانە دڵ ڕەقیەوە ممارەسەی دەسەڵاتی خۆی دەکرد. تەکنۆلۆجیان و تەلارسازیان زۆر پێشکەوتوو بوون. جوتیاران بەشی زۆری کۆمەڵگای ئینکای پێك دەهێنا. هیچ کەس باجی نەدەدا بەڵام دەبوایە پیاوەکانیان وەرزانە لە سوپادا خزمەتی دروست کردنی بیناو ڕێگاو بان یان پەرستگایان بدایە. هندیەکانی ئینکا پردی هەڵواسراوییان دروست دەکرد. بەینی شاخەکان جادەیان دروست دەکرد. لەگەڵ کەناڵی درێژی ئاو دا , هەروەها قەڵای زۆر گەورەیان دروست کرد. تا ئێستاش لە سەرانسەر شاخەکانی ئەندێردا دەتوانرێت شوێن دەستیان لە کەناڵی ئاو و ڕێگا وبان و پەرستگاو کۆشکەنیاندا ببینرێت. سەرەڕای ئەوانە پزیشکی و نەشتەرگەری لە سەردەمیاندا زۆر پێشکەو توو بووە. بە دەستی خۆیان لە خوری ئاسکی لاما و لۆکە جلو بەرگی خۆیانیان دروست کردووە. هەر جوتیارێکیان دەیتوانی نان و جلوبەرگی خۆی بەرهەم بێنێت.

جونگاوەری ئسپانی ((فرانیسکۆ)) بیزارۆ لە ساڵی ۱۵۳۲ دا جەنگی لەگەڵ هندیەکانی ئینکا دا کرد بیزارۆ بە ۱۸۰ جەنگاوەرەوە چووە ناو ئیمپراتۆریەتی ئینکاوە لەوکاتەدا ناکۆکی کەوتبووە نێوان هواسکار و تاهولبای برای کە کامیان ببینە حاکمی ئینکا ئەنجام ئەتاهولبا جەنگەکەی بردەوە. بەڵام بیزارو گرتنی و بەخیانەت تاوانباری کرد. لە هەمان کاتدا هولسکاریش بەدیل گیراو کوژرا. دوای ئەوە بیزارو ئەتاهولباشی کوشت ئیمپراتۆریەتی ئینکا بەبێ سەرکردە مایەوە و نەیتوانی لە بەرامبەر جەنگاوەرە دڕەنکانی ئیسپاندا خۆڕاگری بکەن. ئیسپانیەکان ئیمپراتۆریەتی ئینکایان کردە موستەعمەرەیەکی سەربە ئیسپانیا.

پیویستیه ئابوری داگیرکەریەکان وای کرد چاو بخەنە سەر دەرهێنانی زیوو لە کاتەکاندا. کەوای کرد دابەشکردنی دانیشتوان بگەڕێتەوە بۆ شارە گەورەکان. زۆر لە هندیەکان بەرەو ڕۆژهەلات هەلهاتن لە ترسی کانەکان و ڕژێمی داگیرکاریدا. بە کۆمەلێك هیرش دەزگا ئاینیەکانی گەلی ئینکا لە ناوبران. زۆرێك لە میژوو نوسان دەلێن ئەو شارستانیەی ئیسپانیەکان لەناویان دا، لە زۆر ڕووەوە لە شارستانیەتەکەی خۆیان پێشکەوتوو تر بوون.

## زێڕی خەلەتێنەر چییە؟

زێڕی خەلەتێنەر کانزایە کە لە سروشتدا هەیە و لە زێڕ دەچێت ناویشی (( کبریتورئاسنە )) یان مسە. هەروەها بیریتی ئاسن یان بورگسی پیٚ دەوترێت. بەبۆنەی ڕەنگە زەردەکەی و درەوشانەوەکەیەوە زۆر کەس وا دەزانێت زێڕە. لەبەر ئەوە ناوی زێڕی خەلەتێنەریان لیٚ ناوە.دەتوانین بە ڕەقیەکەی و زۆر شکانەوەیەوە بورگس لە زێڕ جیا بکەینەوە.

بیرتی ئاسن ناوەکەی لە (بیر)) ی ئیغریقیەوە وەرگیرتوە کە مانای (( ڕۆژ)) دەدات لەبەر ئەوەی کەبە ئاسنێك لێی دەدەین بلاٚچەیەك دەردەکات. پارچەی بچووکی بیریت لە گۆڕستانگەلێکدا دۆزرایەوە کە میژووی دەگەڕێتەوە بۆپێش نوسینەوەی میژوو. وای بۆ دەچن وەکو هۆکارێکی سەرەتایی بۆ ئاگر کردنەوە بەکارهێنرابێت. بیرتی پاك ٤٦,٦٧ ٪ ئاسن و ٥٣,٣٣ ٪ کوگردە. ئەم کانزایە بە شێوەیەکی بەربلاٚو هەیە و لە بارودۆخی کانزایی جۆربە جۆردایە. بەرێژەیەکی زۆر دەبینرێت لەگەلٚ بەردە (متحولە) کاندا. کانی بیریتی گەورە لە ئیسپانیا و ولاٚتی یەکگرتووەکان و ئیتالیا و نەرویج و یابان و کنداو پورتوگال و چیکوسلوڤاکیای پێشودا هەیە. بیریت سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ ترشی گۆگردیك، لە بازرگانیش دا وەکو سەرچاوەیەك بۆ گۆگرد و دوەم ئۆکسیدی گۆگرد بەکاردێت. ڕێژەیەکی سەدی زۆر بەرز لە گۆگردی تێدایە، بەبیٚ سەرچاوەیەکی دەرەکی یارمەتی سوتانی دەدات. بیریت وەکو ئاسنی خاو بەکار ناهێنرێت بەهۆی بوونی سەرچاوەی باشتر لە ئاسن تیایدا.

( **میقدار** )

**کیتۆژی ئەو خێراییە لە لەندەندا ٣٢,١٩ پێیە لە هەر چرکەیەکدا. لە جەمسەری باکوردا ٣٢,٢٦ پێیە لە هەر چرکەیەکدا. لە هێڵی ئستوا ٣٢,٩ پێیە لەهەر چرکەیەکدا. لەسەر ئاستی دەریا لە واشنتون ٣٢,١٥ پێیە لە هەر چرکەیەکدا. یان ٩٨٠,٠٨ سم لە هەر چرکەیەکدا. ئەو خێراییەی کەلە هێزی ڕاکێشانەو دروست دەبێت بەوە پێناسە دەکرێت کەرێژەیەکی گۆڕانی خێرایی تەنە دابەزیوەکە یە لە ئەنجامی ڕاکێشانیدا بە بەراوورد لەگەڵ کات دا. پێوانی ڕێژەی گۆڕانی خێراییەکە بە مەتر لە چرکەی هەر چرکەیەکدا تەعبیری لێ دەکرێت. لەو خاڵە گرنگانەی کە دەبێت سەبارەت بە کەوتنە خوارەوەی تەنەکان تێ بینی بکەن. ئەوەیەکە. تەنەکان چەندە کێشیان بێت بەیەك خێرایی دا دەبەزن. بەڵام بەرەنگاری هەوا دەشێت کاریگەری هەبێت لە خێرایی دابەزینەکەدا. ئەم ڕاستیەش زانای بە ناوبانگ گالیلۆ سەلماندی کاتێك تۆپی مدفع ێکی قورس تۆپی تفەنگێکی کۆنی لەیەك کاتدا لەسەر بوورجی بینراوە بەردایەوە. لەیەك کاتدا هەردوو تۆپەکە گیشتنە سەر زەوی. مقاومەی با هۆی کەوتنە خوارەوەی هەندێك لە تەنەکانە خێراتر لەوانی تر.پەڕێك بۆ نموونە لە هەوادا باڵ دەگرێتەوە لە کاتی دابەزینیدا بەهۆی ڕووە گەورەکەی کەوا دەکات لە با کاری لێ بکات. بەڵام بەرێك بەهۆی بچوکیەوە با کەمتر کاری لێ دەکات. بەڵام ئەگەر بانەبوو پەڕەکەو بەردەکە لەیەك کاتدا دەگەنە سەر زەوی.**

## خێرایی کەوتنە خوارەوەی تەنەکان چەندە ؟

**ئەگەر گۆیەکان لە هەوادا بەردایەوە ئەوا کاردانەوەکەی ئاشکرایە. لەسەرەتادا خێراییەکەی کەمە. ئەمجا لە بەشێك لە چرکەیەکدا لە هەوادا دەوەستێت. دوای ئەوە دەست بە دابەزین دەکات بۆ سەر زەوی. ئەوەی کە شایەنی تێبینی یە لە دابەزینیدا گۆکە لە سەرەتادا بەهێواشی دەجولێتەوە. ئەمجا جوڵەکەی خێرا دەبێتەوە. ئایا دەزانن خێرایی دابەزینی گۆکە چەندەو ئەو هۆیە چیە وای لێدەکات دابەزێت ؟**

گۆكە بەهێزی ڕاكێشان دادەبەزێت بۆ سەر زەوی. زەوی مەوادەكان بە ئاڕاستەی چەقی خۆی ڕادەكێشێت بە هێزێك كەبە (( هێزی ڕاكێشان )) ناسراوە. مەوادەكان لە دابە زینیاندا زیاتر خێراتر دەبنەوە بەهۆی هێزی ڕاكێشانەوە. ئەو خێراییەی كە هێزی ڕاكێشانەوە دروست دەبێت، خێرایی تۆپەكە زیاتر دەكات بە نزیكەی ٩,٨ مەتر لە هەر گشت چركەیەكدا. (٣٢پێ لەهەر چركەیەكدا ) ئەمەش مانای وایە ئەو مادەیە لە هەر چركەیەكدا ٩,٨ مەتر خێرا تر دەبێتەوە لە خێرایی یەكەی لە چركەكەی پێش خۆیدا. لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی تر خێرایی تۆپەكە دەگۆڕینێت بەم شێوەیە :

لە سەرەتا دا خێرایی تۆپەكە یان مادە دابەزیوەكە وەستاوە. یا سفرە لە چركەیەكدا. لەكۆتایی چركەی یەكەمدا لەدەست پێ كردنی خێراییەكەی، بە خێرایی ٩,٨ مەتر لە چركەیەكدا دادەبەزێت لە كۆتایی دووەم چركەدا لە دابەزینی بەخێرایی ٩,٦ مەتر لە چركەیەكدا ماددە دابەزیوە كە ٩,٨ مەتر خێرا تر دەبێتەوە. خێرایی بەهۆی ڕاكێشانەوە بە پێی هێڵی پانی دەگۆڕێت. ( بە واتا بە جیاوازی دووری لە هێڵی ئستیواوە) بەرزی و قوڵیەوە. هێزی ڕاكێشان لە هەردوو جەمسەردا لەو پەڕیایەتی وەك لە هێڵی ئیستوا. نرخی خێرایی دادەبەزێت كە لە هێزی ڕاكێشانەوە دروست دەبێت. هەرچەندە لە سەر ڕووی زەوی بەرزبینەوە یان دابەزین.

## تاقی كردنەوەی زیرەكی چییە؟

((ئەنجامی زیرەكی)) دیاردەیەكی دەرونیە كە بە ژمارە تەعبیری لێ دەكرێت. بە دابەش كردنی تەمەنی عەقڵی لەسەر تەمەنی كاتی لێكدانی ١٠٠ زیرەكی هەر كەسێك بمانەوێت بۆمان دەردەچێت. هاوكێشەكەشی بەم جۆرە دەبێت :

چەندین تاقیكردنەوەی جیاواز تەمەنی عەقڵی كەسێك دیاری دەكات. هەركەسێك زیرەكی ی لە نێوان (١٣٠ _ ١٤٠ )دابوو ئەوا بە زۆر زیرەك دادەنرێت (١٠٠) ملم ناوەندیە.(٧٠) یان كەمتربە دواكەوتویان كەم ئەقڵ دادەنرێت.

سەردەمانێكی زۆر ڕۆیشتو زانایانی بڕوایان وابوو. هەموو خەڵكی بەڕێژەیەكی نەگۆڕ لە زیرەكی لە دایك دەبن وایان هەست دەكرد زیرەكی سیفەتێكە وەكو

چاوی شین یان بالاّ بەرزی و دەشێت لەیەك تاقیکردنەوە دا زیرەکیەکەی بپێورێت. بەلاّم زانای دەرون زانی ((فۆلّسی ئەلّفرێد)) دەبینیت ئەم بۆ چوونەی پوچەلّ کردەوە. بینیت کاری زۆری کرا بۆ چارەسەر کردنی ئەم هاوکێشەیە لە هەولّێکدا بۆ پێشخستنی تاقیکرنەوەیەك یارمەتی بدات بۆ جیاوازی لە نێوان قوتابیە زیرەکەکان و دەولّەمەندەکان دا. یەکەم تاقیکردنەوەی لەسەر قوتابخانەی فەرەنسیەکان کرد لە سالّی ١٩٠٥ دا.و لە سالّی ١٩١٥ دا هەردوو زانای دەرون ناس ویلیام شتیرنی ئەلّمانی و لویس تیرمانی ئەمریکی پێشتگیری تاقیکردنەوە کانیان کرد. زۆربەی زانایانی دەروون ناسی بڕوایان وایە تاقیکردنەوەکانی زیرەکی، زیرەکەی زۆربەووردی ناپێورێت. بەم جۆرە ئامانجی تەواو نادات بەدەستەوە. زۆربەی زانایان زیرەکی بەوە پێناسە دەکەن کە توانایە لە فێربوون یان تێگەیشتندا. ئێمە دەزانین کە توانای خەلّك جیاوازە لە تێگیشتندا. ئەوان جیاوازن لە توانایاندا لە تێگەیشتنی بیرۆکەکان و بیرهێنانەوەیدا. هەروەها جیاوازن لە بەکارهێانی زانین و ئەزموونە پێشوەکانیان لە چارەسەر کردنی کێشەکاندا. لە بەرئەوە تا ئەمڕۆ پێناسەیەك نیە بۆ زیرەکی کە هەمووﻻ ڕازی بکات. تا ئێستاش زانایان هەولّ دەدەن بزانن چی وادەکات کەسێك زیرەکتربێت. ئەنجام گەیشتنە ئەو ڕایە کە زیرەکی بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە بۆماوە و ژینگە دەبەستێت. هەموو بە توانایەکی عەقلّی دیاری کراوەوە لە دایك دەبن. دەتوانرێت بەپێ ی ئەو شوێن و ژینگە یە ئەو کەسە تیایدا دەژی ئەو زیرەکیە زیاد یان کەم بکرێتەوە. ئەو منداڵانەی بەردەوام گالّتەیان پێ دەکرێت یان لێیان دەدرێت، گرێیەك لایان دروست دەبێت وای لێدەکات نایەلّێت زیرەکیەکەی پەرە پێبدا. زۆرێك لەو منداڵانەی بەهۆی ڕەگەزیانەوە دووچاویان لەگەلّدا دەکرێت یان کەم ئەندامن هەروەها ئەوانیش شکست دێنن لەپەرەپێدانی توانا عەقلّیەکانیان. لەم ڕاستیانەوە بۆمان دەردەکەوێت زیرەکی وەکو باڵاّ بەرزی نیە. یەك سیفەت نیە پێ یبوترێت زیرەکی. یەك هۆکاریش نیە بۆ دیاری کردنی زیرەکی.

## بەچ هۆکارێك لە (( ئاوی زێرابەکان )) ڕزگارمان دەبێت ؟

((زێراب ))تێکەلّەیەکی ئاویە لە هەرچی پاشەڕۆکان لە ماڵاندا. لەوانە پاشەڕۆی

خودی مرۆڤ و ئاوی پیسی سابونا وو، پاشماوەی خواردنەکان و پیسیەکانی تر کە لە زێرابەکاندا کۆ دەبنەوە زیاتر لە ٩٠٪ ی ئاوی زێرابەکان بۆ پاککردنەوەی پاشماوەکان بەکاردەهێنێت. ماڵی وا هەیە ڕۆژانە سەدان لیتر ئاو بە زێرابە کەیدا دەڕوات.

ئایا دەزانن چۆن لەو زێرابانە ڕزگارمان دەبێت ؟

دوو ڕێگە هەیە بۆ ڕزگاربوون لە ئاوی زێرابەکان.

١_ بکرێنە چاڵێکەوە و خوڵەکە هەڵی مژێت.

٢_ یان ڕەوانەی ناو دەریا و زەریاکان بکرێت.

شارە گەورەکان ڕۆژانە ملیۆنە گاڵۆن ئاوی زێرابیان دەبێت وئەو زەویەش نیە بۆ مژینی ئەو هەموو ئاوە بۆ شارەکان ناچارن زێرابەکانیان ڕەوانەی ناو دەریاو زەریاکان بکەن. بۆ بەدبەختی ئەوەش پیس بونێکی زۆر مەترسی داری لێ دەکەوێتەوە. دەتوانین لە شوێنی ئەوە ئاوی زێرابی ماڵان بە هۆی بۆریەوە ڕەوانەی کارگە تایبەتیەکان بکەین بۆ پاك کردنەوەی جارێکی تر. ئەویش بە لابردنی پیسیە ووشکانە تیایدا. بەڵام ئاوە پیسەکەش دەنێرێتە ناو تانکی بەرز، پاشەڕۆ ووشکەکانیش لەبنی تەنکیەکە دا کۆ دەکرێتەوە و دەسوتێنرێت. ئەنجا ئاوە کە دەنێرێت بۆ دەریاو زەریاکان. زۆربەی گارگە نوێکانی چارەسەر کردنی ئاوی زێرابەکان کەرەستەی پاککردنەوەی نوێیان لە سەرە بۆ چارەسەرکردنی سەرەتایی وەکو ڕزگار بوون لە میکرۆبە زیان بەخشەکان و پاشەڕۆ پیسەکان. ئاوی زێرابەکە لەگەڵ ئەو بەکتریایانەدا تێکەڵ دەکرێت کە دەتوانێت پاشەڕۆکان شیتەڵ بکات بۆ بەرهەمە نازیانبەخشەکان. ئەم کردارەش زۆرێك لە میکرۆبەکان دەکوژێت ئینجا ئاوی زێرابەکە لەگەڵ ڕێژەکی زۆر لە کلۆردا تێکەڵ دەکرێت بۆ کوشتنی هەموو میکرۆبەکان و زیندەوەرە زۆر بچوکەکانی تر. زۆر لە گارگەکان بۆ پاککردنەوەی ئاوی زێرابەکان قۆناغی سێیەمیشی داناوە ئەویش پاککردنەوەی ئاوی زێرابەکەیە لە مەوادە کمیاییەکان کەوای لێ دەکات نەخورێتەوە. دوای ئەوەی بەو سێ قۆناغەدا تێدە پەڕێت، دەتوانرێت ئاوی زێرابەکان وەکو ئاوێکی پاك بخورێتەوە.

## تەلسكۆبێك تەمەنی گەردوون دەدۆزێتەوە.

لە مانگی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٩٤ دا وەكالەتی لێكۆڵینەوەی فەزای ئەمریكی ناسا ڕایگەیاند كە تەلیسكۆبی ((هابل)) ی فەزایی یارمەتی زانایانی وەكالە بەسەرۆكایەتی (( ویندی فریدمان )) وتیان بەهۆی ئەم تەلیسكۆبەوە توانرا ماوەی نێوان زەوی و هەسارەیەكی دوور كەپیێ ی دەوترێت (١٠٠م ) بەوردی دیاری بكرێت. دەركەوت كە ئەم هەسارەیە بەنزیكەی ٦٦ ملیۆن ساڵی تیشكی لێمانەوە دوورە. (١٠٠م ) یش دورترین هەسارەیەكە بەو ووردیە لە زەویەوە بپێورێت. وەكالە ((ناسا )) ڕاشی گەیاند توانای مرۆڤ بۆ دیاری كردنی ئەو پێوانانە ئەوا لە داهاتوودا یارمەتی دەدات دەربارەی ڕێژەی فراوانی گەردوون ئەمەش خالێكی یەكلاكەرەوەیە لە دیاری كردنی قەبارەو تەمەنی گەوردووندا. تائێستا چری گەردون بەووردی نەزانراوە.بەلاّم تەمەنی گەردوون وەكو دەزانرێت بە ٨ بۆ ١٢ ملیار ساڵ دادەنرێت. ئەوەی لێرەدا جێی تێبنیە هەموو هەسارەكان دوورن لە زەویەوە. هەرچەند لەزەویەوە دوورتربن خێراییان زیاتر دەبێت. بەپێی ئەو زانیاریانەی كە لە تەلیسكۆبی هابڵەوە كۆكراوتەوە دەڵێت خێرای هەسارەكان(١٠٠م) هێندە خێرایە كە دەتوانێت لەسێ چركە دا بەدەوری كیشوەری ئەمریكادا سوڕێك بخوات !

## لە سەر دەمە كۆنەكاندا خەڵكی چۆن جل و بەرگی خۆیان دووریوە.

دوورین كرداری گەیاندنی پارچە پەڕۆیەكە بە پەڕۆیەكی ترەوە بەهۆی دەرزی و دەزووەوە لە ڕاستیدا لە سەرەتایی كارامەییەكان بوە كە مرۆڤی كۆن قەرەی پێداوە. پێش داهێنانی دەرزی خەڵكی تەنیا قوماشیان بە خۆیانەوە پێچاوە. بەلاّم هەر لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ بوو بەشاری هەستی كرد پێویستی بە دوورینی جل و بەرگی هەیە. لە بەر ئەوە لەگەڵ كۆنترین شارستانیەتدا دەرزی هەبووە. لەم تازانەدا دەرزی دۆزراوەتەوە كە لە ئێسقانی باڵندە و ماسیەكان دروست كراوە هەروەها لە بڕۆنزیش.لە میسری كۆندا نەك تەنها دەرزی دەزویان زانیوە بەڵكو،

تەترپزیشیان کردوە. پێش لەسێ هەزار ساڵ هندۆسەکان لە هندا فێربوون چۆن جل و بەرگ ببڕن وئەندازە بگرن و بیدوورێت. لە چەرخی ناوەڕاستدا جلو بەرگ زۆر سادە بوون. ژنان لە ماڵدا دەیان دووری. دوای ئەوە مۆدێل پەیدا بوو. بۆیە بەپێویست زانرا جل و بەرگی نوێ و قایم تر دا بهێنرێت. بۆ ئەوەی لەگەڵ لەشدا زیاتر بگونجێت.

## بۆچی باران لەهەندێك ڕۆژدا دەبارێت و لە هەندێك ڕۆژدا نابارێت ؟

کاتێك سەیری ئاسمان دەکەین و هەورێکی ڕەش بە ئاسمانەوە دەبینین وای بۆ دەچێت باران دەبارێت. وەباوەڕمان وایە هەر ئەوەندە بەسە بۆ باران بارین. بەڵام لە واقعیدا باران لە ئەنجامی کردارێکی دوور و درێژی ئاڵۆزەوەیە. باران بارین پێویستی بە هەوڵی هاوبەشی خۆروو زەوی و (غلاف جوی ) هەیە. کردارەکەش بەوە دەست پێ دەکات کاتێك خۆر زەوی گەرم دەکات. ئاوی دەریا و زەریاو ڕووبار و شێی زەوی دەگۆڕێت بۆ هەڵمی ئاو. دوای ئەوە هەڵمی ئاوەکە لەگەڵ هەوا دا تێکەڵ دەبێت. هەوا گەرمە بەرزبووەکە هەڵمی ئاوەکە لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ بەرگە گازییەکە. لەوێدا دەکشێت و سارد دەبێتەوە. کاتێك ڕوو دەدات هەوا گەرمەکە لە هەندێك لەهەڵمی ئاوەکە ڕزگاری دەبێت هەور دروست دەکات. ئەم کردارەش پێ ی دەوترێت چڕبوونەوە. لەناو هەورەکەدا تنۆکەکان وردە وردە گەورە دەبن کاتێك لەشێ زیاتر لە خۆیان کۆدەکەنەوە تا لە کۆتاییدا ڕەوتە هەواییەکان توانای هەڵگرتنیان نیە و لە شێوەی باران دادەبەزێت بۆ سەر زەوی.

بۆچی لە هەندێك کاتدا کرداری باران بارین ڕوودەدات لە هەندێك کاتی تردا ڕوونادات ؟

هەنگاوی یەکەم لەم کردارە دا بەهەڵم بوونی بەردەوامە لە هەموو کاتەکانی ڕۆژدا. هەڵمی ئاوەکەش بەرز دەبێتەوە بۆ بەرگە گازیەکە. بەڵام هەڵمی ئاوی نەبینراو، هەموو ڕۆژێك ناگۆڕێت بۆ تنۆکی هەوری بینراو. لە بەر ئەوە هەڵمی ئاو پێویستی بەڕوویەکە لەسەری چڕبێتەوە. ئەگەر هەواکە هیچ تۆزو گەردێکی تیانەبوو یان کەمی تیا بوو. ئەوا کرداری چڕبوونەوە ئەگەری دروست بوونی زۆرکەمە. لەبەر

ئەوەی كریستاڵە زووقومی و بەفریەكان لە چینەكانی سەرەوەی بەرگە گازدا هەروەها یارمەتی دروست بوونی تنۆكەكان دەدەن. ئەوەی كە باران پێویستیەتی بۆئەوەی ببارێت جووڵانی بەرەیەكی هەوای گەرمە دژی بەرەیەكی هەوای سارد. یەكەم هەوور شێی تێدایەو دووەمیش ساردی دەكاتەوە كە دەبێتە هۆی دروست بوونی دڵۆپە ئاوو دابەزینی لە شێوەی باراندا. لە بەرئەوە هەمیشە بۆچوونی كەش و هەوا باسی ئاراستەكانی با دەكات و بیرۆكەیەكمان دەداتێ ئەگەر باران دەبارێت یان نە.

## ئامێری (( كات )) بۆ فەحس كردنی بە تیشك.

ئامێری (كات) تازەترین ئامێرە بۆ نیشاكردنی پزیشكی. لە ڕاستی دا بریتیە لە تەكنەلۆژیایەكی پێشكەوتوو. بۆ بەكارهێنانی تیشكی X بۆ مەبەستی دیاری كردنی پزیشكی ئەم ئامێرە دەتوانێت نەخۆشیەكانی مێشك و گورچیلە و ڕیخۆڵە.,........هتد. دەست نیشان بكات.

ووشەی كات كورتكراوەی سێ پیتی یەكەمە كە بە وێنەگرتنی تیشكی چینی میحوەری بە هۆی كۆمپیوتەرەوە دەناسرێت. ئەم ئامێرە ئەندازیاری ئەلكترۆنی بریتانی ((گود فی هاوڵسفیل )) لەگەڵ زانای ئەمریكی ((ئیلان ماركۆك )) لەساڵی ١٩٧٢ دا دایان هێنا. هەردووكیشیان لەبری ئەوە داهێنانە لە ساڵی ١٩٧٩ دا خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرت. ئامێری كات دوجۆرە :

١_ جۆرێكیان بۆ وێنەگرتنی سەر.

٢_ جۆرەكەی تریان بۆ وێنەگرتنی هەموو لەش.

جۆری یەكەم بۆ دەست نیشان كردنی نەخۆشیەكانی مێشك و سەكتەی مێشك ووەرەمی مێشك و خوێن لەبەر چوونی مێشك و هتد بەكار دەهێنرێت. جۆری دووەمیش بۆ نیشان كردنی نەخۆشیەكانی گەدە،جگەر، سنگ، و هتد.

ئامێری كات لە سەرچاوەیەكە تیشكی X پێك دێنێت كە دەخرێتە سەر ئەو شوێنەی دەبێت پشكنینی بۆ بكرێت لە لەشدا. لەبەرئەوە دا دوژەرەوەی زۆر هەیە كە زانیاریەكان وەردەگرین لە ئەندامە جیاوازەكانی لەشەوە. لە ناوەڕاستی ((نقالە)) یەك كە نەخۆشەكە لەسەری ڕادەكشێت ئینجا بەهۆی بزوێنەرێكەوە

نقالەکە دەجوڵنرێت. دۆزەرەوەکان لە یۆدی سۆدیۆم و فلۆراتی کالسیۆم و پیرمنیتی بزمۆس دروست دەکرێت ئامێرەتازەکان تا نزیکەی ۳۰۰مادەی کمیایی دۆزەرەوە لە خۆدەگێت.

لەسەر چاوەی تیشکە X کە (نبگات) ی تیشکی دەردەچێت کە ماوەی هەریەکێك ویەکێکی تریان لە ۲-۳ چرکەیە. دەخرێتە سەر ڕیشاڵە جیاوازەکانی لەشدا. کاتێك ئەو تیشکانە ڕیشاڵە جیاوازەکان دەبڕن. لەگەڵ خۆیاندا زانیاری هەڵ دەگرن بۆ دۆزەرەوە جیاوازەکان کە پەیوەستە بە ئامێرێکی کۆمپیوتەرەوە. ۳۰۰ دۆزەرەوە دوای وەرگرتنی ۳۰۰ هێما بە تیشکی X (۳۰۰*۳۰۰ =۹۰,۰۰۰ ) هێما دەنێرن بۆ ئامێری کۆمپیوتەرەکە. کە ئەویش شی دەکاتەوەو لەسەر شێوەی ئەندامەکانی لاشە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنێك پیشانی دەدات. وێنەکانیش نیشانەکانی نەخۆشیەکە پیشان دەدەن. وێنەکانیش بەشێوەیەکی بەردەوام لەسەر کاغەزی (برۆمید) تۆمار دەکرێت. پزیشکیش لەبەر ڕۆشنایی ئەو وێنانە دەتوانێت نەخۆشیەکە دەست نیشان کات و چارەسەری گونجاوی بۆ بنوسێت.

## لە کەیەوە مرۆڤ قژی دەستکرد ((بارۆکە )) ی بەکارهێناوە ؟

ئایا دەزانن ئەو مۆمیایانەی میسرکە پێش ٤ هەزار ساڵە دروست کراون، کاتێك دۆزرانەوە قژی دەست کردیان پێوە بوو ؟ بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە قژی دەستکرد لە نێوان میسریەکۆنەکاندا بەکارهێنراوە. لە یۆنانی کۆنیشدا ژنان و پیاوانیش قژی دەستکردیان بەکارهێناوە. ئێستا بڕوا وایە کە قژی دەستکرد لە وولاتی فارسەوە پەیدا بووە و پاشان بەهەموو ئاسیای بچووکدا بلاّوبۆتەوە. لە یۆنانی کۆندا قژی دەستکرد لە شانۆدا بەکارهێنراوە. لە ڕۆمای کۆنیشدا لە ڕۆژە یەکەمەکانی ئمپراتۆردا بەکارهێنراوە ژنانی ڕۆما ئەوانەیان بە مۆدێل ڕێیان دەکرد حەزیان دەکرد قژی دەستکرد بەکاربهێنن بەتایبەت ئەو قژە ئاڵتونیانەی لە ئەڵمانیاوە دەیان هێنا. ژنان بە گوێرەی ڕەنگی جل و بەرگەکەیان قژیشیان بەکاردەهێنا. دەڵێن ژنی ((مارکۆس ئەورلیۆس )) چەند سەد جۆری قژی دەستکردی هەبووە. لە سەدەی شانزەهەم دا بە سادەیی قژی سروشتی بەکاردەهێنرا. بەلاّم دوای سەد ساڵ قژی دەستکرد بوو بە بەشێکی گرنگ لە جل

و بەرگ مۆدێلی جل و بەرگیش لە فەرەنساوە دەستی پێکرد. لە ساڵی ١٦٢٤ دا لویسی ١٣هەم کەسەری ڕوت بوو قژی دەستکردی بەکاردەهێناو خەڵکیش لاساییان کردەوە. لە فەرەنساوە مۆدێل بەهەموو ئەوروپا دا بڵاوو بووەوە. لە بەریتانیا شارلزی دووەم ((باڕۆکەی )) بەکارهێنا. کە قژێکی کورتە. دوای ئەویش بەکارهێنانی بڵاو بووەوە. لە سەردەمی شاژن ((ئان )) دا بەکارهێنانی قژی دەستکردی درێژ بڵاو بووەوە. بەشان وەل و سنگی دا دەپۆشی دوای ئەوە بەکارهێنانی قژی دەستکرد هەریەکە و تایبەت بەپیشەیەك بڵاو بووەوە. سەردەمێك هات تەنها پیشەوەران قژی دەستکردیان بەکاردەهێنا. بەڵام دوای ئەوە پزیشکان و سەربازان و پیاوانی ئاینی وردە وردە وازیان لەم خوە هێنا ئەمڕۆ لە بەریتانیا دا بەکارهێنانی قژی دەستکرد بەشێکە لە جل وبەرگی ڕەسمی کە تەنها سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی لە پەرلەمان و نوسەرانی پەرلەمان و قازیەکان و داواکارە گشتیەکان و سەرۆکی قازیان و سەرۆکی ئەنجومەنی لۆردات بەکاری دەهێنێت.

## چۆن ڕەنگەکان دەبینین ؟

کاتێك کامێرایەك وێنەیەکی ڕەنگاو ڕەنگ دەگرێت، ئەوە کردارێکی فیزیایی مادیە. بەڵام کاتێك مرۆڤ ((ڕەنگەکان دەبینێت )) ئەوەی کە دەبینیت لە واقیعدا ئەزمونێکی دەرونیە !

خۆی لە ڕاستیدا مێشك شتەکە دەبنێت. چونکە کاتێك وێنەکە دەگاتە مێشك. مێشك شیتەڵی دەکات حوکمی خۆی لە سەر دەدات. لەگەڵ ئەوەی مێشك (( دەبێت ))و لەگەڵ ئەوەی ئێمە ((ڕەنگەکان دەبینین)) لە مێشکماندا لەبەرئەوە مێشك هێشتا پێویستی بە وەرگرتنی وێنەی دیاری کراوە لە چاوەوە. پێکهاتەی چاو جۆرێکە هەست بە حەوت ڕەنگەکەی شەبەنگ دەکات کە ئەوانیش سوور، پرتەقاڵی، زەرد، سەوز، شین، نیلی و ئەرخەوانیە. خانە ئەندامیەکان لە دەرەوە (شبکیە) دەتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان ڕووناکی وتاریکی دا. بەڵام خانە شێوە نحروتیەکانە لە چەقی شبکیە دا درێژی شەپۆلە ڕەنگەیەکان وەردەگرێت هەریەك بە جیا لەوی تر.

با بزانین چۆن بەکردار چاو ڕەنگەکان وەردەگرێت ؟
تا ئێستا زانست وەلأمی تێرو تەسەلی ئەم پرسیارەی نەداوەتەوە کە هەموو لایەك ڕازی بکات. بەلأم بیردۆزێك هەیە کە تەفسیری ئەو کردارە بەم شێوەیە دەکات. کەناوی بیردۆزی یۆنگ بۆ بینینی ڕەنگەکان (( بەپێ ئەو بیردۆزە یە چاو سێ کۆمەڵە دەماری تێدایە کە سێ ڕەنگە سەرەتاییەکەکان وەردەگرن ئەوانیش ڕەنگەکانی سوور _سەوز_ شین_ ئەرخەوانین ئەگەر هەرسێ کۆمەڵە دەمارەکە بەیەکسانی بووروژێن ئەو هەستەی وەری دەگرین هەست کردنە بەڕەنگی سپی، بەلأم ئەگەر تیشکی سەوز زیاتر گەیشتە دەمارەکان ئەوا دەماری ڕەنگی سەوز لە دەمارەکانی تر زیاتر دەوروژێت. بۆیە ڕەنگی سەوز دەبینینن. کاتێکیش تیشکی زەرد گەیشتە چاومان هەردوو کۆمەڵە دەمارەکانی تایبەت بەڕەنگی سەوز و سوور دەوروژێن و ڕەنگی زەرد دەبینین.

## کێ یەکەم چاویلکەی دروست کرد ؟

زۆر لەسەرکردەو پیاوە بەناوبانگەکانی جیهان ئەمڕۆ چاویلکە لە چاودەکەن. کەس نازانێت کێ یەکەم کەس بووە لە جیهاندا یەکەم چاویلکەی لە چاو کردووە. بەلأم لە ساڵی ١٢٦٦ ز. ڕوجرباکۆن بەهۆی گۆیەکی شوشەییەوە نوسینی سەرلاپەڕەیەکی گەورە کردەوە. بەلأم یەکەمین کەس کێ بوو بیری کردەوە شوشەیەك بخاتە نزیك چاوی و دایببەستێت ؟ لە تابلۆیەکی وێنە کێشراو دایە لە ساڵی ١٣٥٢ دا وێنەی کاردینالْ ((ئاوجون ))ە کە تیایدا دەردەکەوێت دوو عەدەسەی لەناو دوو چوار چێوە دا دوو باڵی هەیە و لەسەر چاو دانراوە. دەشێت یەکێك لەو دوانە چاویلکەیان داهێنابێت لە نێوان ١٢٦٦ و ١٣٥٢ دا. کاتێك کتێبی چاپکراو بەدەرکەوت، خەڵکیش پێویستیان کرد چاویلکە. هەر چەندە کرێکارانی شوشە لەو کاتەدا لە باکوری ئیتالیا و باشووری ئەڵمانیا دا دادەنیشتن بۆیە ئەو چاوێلکانەی لەسەدەی شانزەهەمدا دروست دەکران لەو دوو شوێنە دابوون. لە ساڵی ١٦٢٩ شارلزی یەکەمی پادشای بریتانیا میساقی بەخشیە سەندیکای چلویلکە سازان. لە ساڵی ١٧٨٤ دا بنجامین فرانکلین چاویلکەی دووبنۆرەی داهێنا ئەمڕۆ جۆرەها چاویلکە بەکاردەهێنرێت سەرەڕای

بەكارهێنانی لە لایەن خەڵكەوە بۆ خوێندنەوە.ئێمە دەزانین چاویلكەی فۆتۆگرافی داهێنراوە لە كەمكردنەوەی تیشكی خۆر. هەروەها چاویلكەی ڕەنگاو ڕەنگ بۆ دۆزینەوەی نیشانە ڕەنگاو ڕەنگەكان بەكار دەهێنرێت. بەلأم عەدەسە سووورەكان وێنەگرەكان و فڕۆكەوانەكان لە شەودا بەكاری دەهێنن. ئەو چاوێلكانەی ڕەنگی سەروی وەنەوشەیی دەمژن لەلایەن فڕۆكەوانان و كیوتەوەردان ئەوانەی بەفرە خلیسكێ دەكەن و دۆزینەوەرانی جەمسەردا بەكار دەهێنرێت. كرێكارانی فڕنیش عەدەسە گەلێك بەكار دەهێنن دەیان پارێزێت لە تیشكی ژێری سوور فووبە شوشەكەرەكانیشدا جۆرێك عەدەسەی تایبەتی بەكار دەهێنن كە یارمەتی باشتر بینینیان دەدات. ئەمڕۆ چەندین جۆر چاویلكە و بۆ چەندین مەبەستی جیاجیا دروست دەكرێت.

## درێژترین مار لە جیهاندا كامەیە ؟

زیاتر لە دوو هەزار جۆر مار لە جیهاندا هەیە. كە گیانلەبەرێكی ترسێنەرو مەترسیدارە ئەمەش وای كردووە خەڵكی جۆرەها بیرو بۆچوونی هەڵەی لەسەر دروست كەن. لەو بۆچوونە نادروستانە كەلای خەڵك دروست بووە گوایە مار وا گەورەو ترسێنەر هەیە درێژیەكەی لە نێوان ١٨ بۆ ٢١ مەتر دایە. بەلأم لە ڕاستیدا مارێك نیە هێندە گەشە بكات تا بگاتە ئەو درێژیە. لەگەڵ ئەوەی هەندێكیان ڕاستە درێژن. بەلأم درێژ ترین ماری ناسراو ((الاصليه الملوكيه )) یە كە درێژیەكەی دەگاتە نزیكەی ١٠م مارە لە نیوە دوورگەی ملاوی و پۆرماو ئەندۆنیسیاو دوورگەكانی نلیپین دا هەیە. دووەم درێژترین جۆری ماری ((ئەناكۆندایە ))كەلە فیصلەی ((بوا)) یەكە لە ناوچەكانی ئەمریكای باشوری ئستیوائیدا دەژین و درێژیەكەی دەگاتە نزیكەی ٧ م ئەمەش درێژیەكی كەم نیە. دوای ئەم ((الاصلەهندیە )) دێت، كەلە هند و نیوە دوورگەی ملاوی دا دەژی و درێژیەكەی لە نێوان ٦_٧ م دایە. ئەسڵەی بەردەلأنی ئەفریقیش نزیكەی بەهەمان درێژیە. بەلأم ((الاصلیەكاسیە)) لە ئوستورالیاو غینیای تازە بە زۆری درێژیەكەی دەگاتە ٦,٥ م. دێن بۆ مارێكی تر كە زۆر كەس بڕوایان وایە. درێژترین مارە لە جیهاندا. ئەویش ماری ((بوایە)) كە بەخۆپێچ دانە دەوری نێچرەكەی دا و

جەردانى دەيكوژێت. بەڵام ئەو پەڕى درێژى ئەم مارە (٥) م. ئەم مارە پيسە لە باشوورى مكسيك و ئەمريكاى ناوەند و باشووريدا دەژى. مارى (كۆبراش) لەمارە پيسەكانى ترە كە ئەو پەڕى درێژيەكەيدەگاتە نزيكەى ٥,٥ م. درێژترين مار لە وولاَتە يەكگرتووەكاندا كە دوو مەتر زياتر نيە مارى ((دەنگ نێرى ڕۆژهەلاَتى پشت ئەلْماسيە )). ئەم مارەكانى ترى وەكو(( ڕەش مار))و(( بول))و ((غوفر)) كەلە ٢م كەمتر درێژن شايەنى باسە مارى (( الاصليە الملوكيە)) هەرچەند درێژ ترين مارە بەلاَم قورسترين مار نيە هەرچەندە ((اناكندە )) لەو كورترە،بەلاَم كێشى دەگاتە (١٦٠) كيلۆگرام. بەواتە لە ئەصلاً نزيكەى ٤٥ كيلۆ قورسترە. درێژترين ژەهراوى ((شاى كۆبرا ))يە قورسترين مارى ژەهراويش دەنگ نێرى ڕۆژهەلاَتى پشت ئەلْماسيە.

## چى وادەكات لىَ دانى دلْت بگۆڕێت ؟

هەر لێدانێكى دلْ نزيكەى هەشت لە دەى چركەيەك دەخايەنێت. دلْ نزيكەى ١٠٠ هەزار جار لە ڕۆژێكا لىَ دەدات.هەمان ژمارش پشوو دەدات. لە ساڵێكدا نزيكەى ٤٠ مليۆن جار لىَ دەدات !!!

لێدانى دلْ بريتى يە لە هاتنەيەكى دلْ بۆئەوەى خوێن بەسەرانسەرى لەشدا دابەش بێت. لەبەرئەوە بەپىَ ى پێويستى لەشمان دلْ لىَ دەدات. گۆڕانكارى لێدانەكانى دلْ، زۆربەى جار لە ئەنجامى كارەوەيە. كاتێك ماسولكەيەك لە شوێنێكى لەشدا كارێك ئەنجام دەدات. ترشى كاربۆنيك بەرهەم دەهێنێت. گەرديلەكانى ترشيەكەش بەهۆى خوێنەوە دەچێت بۆ شوێنێكى ديارى كراو لە دلْدا. لەماوەى دەچركە دا، ئەو شوێنەش گوێچكەلەى ڕاستە. لەوێدا خانەكان گەرديلەكانى ترشى كاربۆنيكە كە وەردەگرن. ئەو وەرگرتنەش لەگەلْ ڕێژەى لێدانەكانى دلْداو چەندى ترشى كاربۆنيك لە خوێنەكەدايە ڕێك دەكەوێت. ئەگەر ماسولكەكە لە كار وەستاو برى ترشى كاربۆنيكە كە كەم بووەوە لە خوێندا ئەوا كارى دلْ خاو دەبێتەوە. بەلاَم كارى دلْ پەيوەستە بە پێداويستەكانى هەموو لەشەوە. ووروژاندنێكى مێشكى، دەمارێك دەووروژێنێت كەوادەكات دلْ خێرا تر لىَ بدات. كاتێك دەترسين يان دلْتەنگ دەبين ئەوا دەمارێكى تر دەووروژێت و وادەكات

له دڵ بەشێوەیەکی خاوتر لێ بدات. مرۆڤ ناتوانێت ڕێژەی لێدانی دڵی بگۆڕێت. لە بەر ئەوەی نایەوێت بەڵام کەسانێك هەن کە ئەتوانن ئەوە بکەن.

## لە کەیەوە ژنان قژیان پەلکە دەکەن ؟

هەر لە سەتارەی مرۆڤایەتی یەوە ژنان پیاوان گرنگیان بە جوانکردن و داهێنانی قژیان داوە. ئەوەی کە جێ سەرنجە جوان کردنی قژ نیشانەی شارستانیەت و پێشکەوتن نەبووە. نەتەوە سەرەتایی و هەمەچینەکانیش لە هەموو جیهاندا گرنگیەکی زۆریان داوە بە قژ. وا دیارە،تەنانەت لە سەردەمە کۆنەکانیشدا قژی لول زۆر لە قژی خاو گرنگتر بووە. بۆ چەندین هۆکاری دەستکرد بە کاریان هێنراوە بۆ قژلول کردن. ژنان و پیاوانیش وەکو یەك ئەوەیان کردووە !!
تەنانەت پیاوانیش ڕیشیان لول کردووە ! لەگەڵ هاتنی شارستانیەتدا، جۆرو شێوازەکانی قژ لول کردن زۆر بوو. لە سەردەمی ئێستاشدا ئامێری تایبەت بە قژ لول کردن بە هەموو ئەوروپادا بڵاو بوەوە. لەگەڵ خەنەو بۆیە دا. دوای ئەوە پیاوان قژیان درێژکرد. تاگەیشتە ئەوەی پادشای بەریتانیا هنری پێنجەم فەرمانێکی دەرکرد کە نابێت پیاو قژ درێژ بکات. بەڵام ڕێگەیانی دا ڕیش درێژبکەن و سمێڵ لول بکەن. بەڵام لە جمیسی یەکەم لە ساڵی ١٦٠٣ دا چووە سەر تەختی پادشایەتی بەریتانیا، مۆڵەتی دایە پیاوان قژ درێژ بکەنەوە ! داب ونەریتی قژ کورت کردنی پیاوان لە سەدەی نۆزدە هەمەوە دەستی پێکرد. بەڵام ژنان قژیان درێژ دەکردەوە لە بەرئەوەی بە (( نیشانەی سەر بەرزی دەیزانن )). دەبێت بووترێت قژ کوورت کردنەوە بیدعەیەك بوو لە دیوانی لویسی چوارەمەوە داهێنرا. هەروەها عادەتێکی پەیرەو کراویش بوو لە دیوانی جیمس ی یەکەمی بەریتانیا دا.

## گڵۆپی نوێن ( شمعە ) چۆن ئیش دەکات ؟

مرۆڤ لە دێر زەمانەوە ڕووناکی دەستکرد بە کاردەهێنێت.لە سەرەتا دا پارچە داریان سوتاندوە بۆئەوەی ڕووناکیان دەست بکەوێت. دوای ئەوە سەری فتیلەیەکی خستۆتە ناو چاڵی بەردەوە کە پڕیان کردوٚتەوە لە ڕۆنی ئاژەڵان. دوای

ئەوە مۆم داهێنرا. بەلأم داهێنانێك كە شۆڕشی دروست كرد لەم بواری ڕوناكیدا،ئەو گلۆپە كارەباییە بووكە تۆماس ئەدیسۆن لە ساڵی ١٨٧٨ دایهێنا، بەهاتنی ساڵی ١٩٣٠ زانایانی ئەمریكا و ئەوروپا لولەكی فلۆرسنت(نوێن ) ی قەشەنگیان دروست كرد. لولەكی فلۆری بریتی یە لە شوشەیەكی درێژی ناو بەتاڵ بە مادەی فلۆری ڕووپۆش كراو، و لەهەردوولای لولەكەوە دوو ئەلكترۆڕ لە تنگستن هەیە. لولەكە كە لە هەوا بەتاڵ دەكرێت و ڕێژەیەكی كەم لە جیوە و گازی ئارگۆنی تێدە كرێت. كاتێك لولەكە كە دەگەیەنرێتە كارەبا، ئەلكترۆداتە كە تنگستنەكە گەرم دەكات و دەست بە بەرهەم هێنانی ئەلكترۆدات دەكات. كاتێك دەدات لەگەردیلەكانی جیوەكە لە كاتی لێدانیشی دا لە مادە فلۆریە كە تیشكێكی سەرووی وەنەشەی دەردەدات كە دەوروبەرمان بۆ ڕووناك دەكاتەوە. ڕەنگی ئەو ڕووناكیەش لەسەر مادە فلۆریەكە (فلۆرسنتیەكە ) دەوەستێت..ئەو لولانەبەتنگستنی قسلی دادەپۆشرێت بۆ ئەوەی ڕەنگی شین بدات. ئەگەر بە سلیكاتی كالسیۆم داپۆشرا ڕەنگێكی سەوزمان دەداتێ. نوێن سەرچاوەیەكی بەسودی ڕووناكیە. لەبەر ئەوەی كارەبا كەم خەرج دەكات و توانای ڕووناكی بەخشینیشی بەرزە. دەتوانێت نواێنێكی ئاسایی بۆماوە (٤٠) كاتژمێر هێزی بە چل وات لە كارەبا بگرێنێن.

## چیمەنتۆ چۆن دروست دەكرێت ؟

چیمەنتۆ بەسوودترین مەوادی بینایە وە لە هەموو وولأتانی دونیا دا بەكار دەهێنرێت وەكو مادەیەك بۆ جۆشدان و یەكگرتن. لە دروست كردنی بیناو ئەندازەیاری شارستانیدا. چیمەنتۆ هاڕاوەیەكی ڕەنگ خۆڵەمێشی یە. كاتێك لەگەڵ ئاودا تێكەڵ دەكرێت و بۆماوەیەك دەهێلرێتەوە وەكو بەردی لێدێت. ڕۆمانیەكان پێشی (٢٥٠) پ.ز چیمەنتۆیان دۆزیەوە. كەلە تێكەڵ كردنی قسلی مردوو لەگەڵ لم و لمی گڕكانیدا دروستیان دەكرد و پێیان دەوت : (( بۆزولان)). تا ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم  بە شێوەیەكی بەربلأو ئەم چیمەنتۆیە بەكاردەهێنرا.لە ساڵی ١٧٥٧ دا ئەندازیارێكی بەریتانی بەناوی (( جۆن سمیتۆن )) جۆرێكی زۆر باشی لە چیمەنتۆ دروست كرد. بە گەرم كردنی قسلی مردوو

لەگەڵ گلێنە (( قورە سورە )) دا ئەم جۆرەش لەچیمەنتۆ بۆ چەند ساڵێکی زۆر بەکار هێنرا. بەڵام بەر بلاوترین چیمەنتۆی بەکار هێنراو ئەو جۆرەیەکە ئینگلیزی جۆزیف ئەسبدین لە ساڵ ١٨٢٤ دا دروستی کرد. لە بەر ئەوەی ئەگەر ووشك بێتەوە ڕەنگی لە ڕەنگی بەردی پۆرتلاند بۆیە ناوی چیمەنتۆی پۆرتلاندیان لێنا. چیمەنتۆی پۆرتلاند بە تێکەڵ کردنی بەشێك لە گلێنە لەگەڵ بێ بەش لە قسل دادەبێت لە فڕنێکی پلەی گەرمای زۆر بەرز بێت. بەهۆی دەسارێکەوە (ئاشێکە ) وە هەردوو مادەکە دەهاڕێت و ئینجا تێکەڵ دەکرێت. ئینجا تێکەڵەکە ڕەوانەی فڕنێکی زۆر گەرم دەکرێت کەپێی دەوترێت تەنور کە پلەی گەرمای لە نێوان ١٥٠٠_١٦٠٠ پلەی سەدیدایە. تا دەبێتە پارچەیەکی ڕەق کەپێ یدەوترێت ((خشنت )) کاتێك خشکە سارد دەبێتەوە دەهاڕێت بۆ هاڕاوەیەکی زۆر ورد ئینجا بەرێژەی نزیکەی (٣٪) گەچی تێدەکرێت بە مەش دەوترێت (چیمەنتۆی پۆرتلاند ) دوای ئەوەی کرایە کیسەوە ڕەوانەی بازاڕ دەکرێت. بەڵام زانایانی هندی توانیویانە لە بەڵمە برنج جۆرێکی تایبەتی لە چیمەنتۆ دروست بکەن.

## شێرپەنجەی خوێن (سرتان ).

شێرپەنجەی خوێن یان (لوکیما ) (سپی بونەوەی خوێن ) نەخۆشیەکی کوشندەیە توشی ئەو ئەندامانە دەبێت کە خوێن دروست دەکەن. دەشێت لە هەر تەمەنێکدا و لە هەر ڕەگەزێکدا توشی مرۆۋ ببێت. تا ئێستاش هویەکانی نەزانراوە. ئایا دەزانیت چی لەم نەخۆشیەدا ڕوو دەدات. ئێمە دەزانن خوێن شلەیەکی (جیوەی ) یەلە لەشدا. توخمەکانی و پێکهاتەکانی ئیشی دیاری کراوی خۆیان هەیە. لە خوێندا ژمارەیەکی زۆر لە خڕۆکەی سوور هەیە. ڕێژەیەکی کەمیش لە خڕۆکەی سپی. خڕۆکە سوورەکان ئۆکسجین دەبەن بۆ هەموو (انجە) کانی لەش ئیشی خڕۆکە سپیەکانیش پاراستنی لاشەیە. بەشێوەیەکی سەرەکی نوخاع و غودەی لنفاوی خڕۆکە سپیەکان دروست دەکەن. لەکاتی ڕوودانی لۆکمیا دا دەبێت ئەو انسجانەی کە خڕۆکە سپیەکان توشی شتێك هاتین. بۆیە ئەو خڕۆکانە بەرێژەیەکی نا سروشتی دەست بە زیاد بوون دەکەن. بۆیە کەسی توشبوو خڕۆکە سپیەکان لە ٣٠ بۆ ٦٠ بەرامبەر خڕۆکە سپیەکانی لە ڕێژەی

ئاسايى خوێ زياتر دەبێت.لە هەمان كاتدا ڕێژەی بەرهەم هێنانی خڕۆكە سورەكان زۆر سست دەبنەوە و بەمەش كەسی توشبوو توشی هەژاری خوێن (ئەينميا ) دەبێت. نەك هەر ئەمەش بەڵكو رەوشتی خانەكانی ڕەگەزيش نا سروشتی دەبێت و غودە لە نفاويەكان وسپڵ دەئاوسێت. بۆيە كەسی توشبوو تاو ئازار لە هەر دوو قاچيدا دەبێت. ئەم نەخۆشيە ئەگەر بە قورسی توشی كەسێك ببێت لە ماوەی چەند هەفتەيەك يان چەند مانگێكدا دەيكوژێت، بەڵام درێژ خانەكەی لە سێ ساڵەوە بۆ دەساڵ درێژ دەبێت و دوای ئەو دەشێت توشبوەكە بمرێت زانستی پزيشكی لە چارە سەركردنی سپی بوونەوەی خوێندا پێشكەوتنی بە خۆيەوە بينيوە. بەدەرمانێك كەدەدرێتە نەخۆش بۆ لە ناودانی خڕۆكە شازەكان هەروەها بەتيشكی ايركس ( النگائر الشيعه) ش چارەسەر دەكرێت. خوێن گۆڕينی نەخۆشيش يەكێكە لە چارەسەرەكان. تێبينی كراوە كە سپی بونەوەی خوێن دەشێت لە ئەنجامی بەر كەوتنی تيشكی X يان تيشكە گەرديلەييەكانەوە بێت. هەندێك ئاژەڵيش لە ئەنجامی ڤايرۆساتەوە توش دەبن. بەڵام تا ئێستا نەدۆزاوەتەوە ڤايرۆس دەبێتە هۆی سپی بوو نەوەی خوێن لە مرۆڤدا.

## ياساكانی كيپلر بۆ خولانەوەی ئەستێرەكان.

جوهانز كيپلر يەكێكە لە مەزنترين گەردوون ناسانی سەردەمی خۆی، يەكەم كەس بوە سێ ياسايی بنەڕەتی لەسەر جولانی ئەستێرەكان دانا. وای لێكرد لە هەموو جيهاندا دەنگ بداتەوە. كيپلر لە (فيلَ ) ی باشوری ئەلمانيا دا لە ٢٧ ك ١٥١٧ دا لە دايك بوو. كوڕی پياوێكی هەژار بوو كە لە (خان ) ئوتێلێكی بچكۆلە بوو لەو سەردەمەدا كاری دەكرد. بە گوێرەی داب و نەريتی سەردەمی خۆی بچێتە پاڵی باوكيەوە بۆ يارمەتی دانی لە پيشەكەيدا. بەڵام خۆی خوێندنی بە پێويست و باشتر زانی لە كار و ئيش كردن لە ئوتێلێكی بچوكدا. لەبەر ئەوە باوكی ناردی بۆ زانكۆی (( توبنگن )) لەوێشدا لاهوتی خوێند. لە زانكۆی تۆبنگن دا بۆنەيەك ڕووی دا كە دوا ڕۆژی دياری كرد. ئەويش ناسينی پرۆفيسۆرێك بوو كە خەريكی تەفسيری بيردۆزەكە (كۆپەرنيكۆسی ) دەكرد سەبارەت بە سيستەمی خۆری.

كۆپەرنیکۆس ئەم بیردۆزەی لە ساڵی ١٥٤٣دا بلاَوکردەوە. کە تیایدا بیردۆزەکە بگلیموس ی سەبارەت بە چەقی زەوی ڕەت کردەوە. بەگوێرەی بیردۆزەکەی بکلیموس زەوی بەچەقی گەردون دادەنرا و خۆرو ئەستێرە کانیش بە دەوریدا دەسوڕانەوە. کۆپەرنیکۆس ڕەتی کردەوە و وتی. خۆر چەقی سیستەمی خۆریە. هەموو ئەستێرەکانی تر بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، لە ناویانیشدا زەوی. ئەم بیردۆزەیەش بەبیردۆزی (( چەقی خۆری )) ناسراوە. کلێبەر ڕاستی بۆ چوونەکانی کۆپەرنیکۆسی پشت ڕاست کردەوە. پەنای بردەبەر چەندین حیساباتی بیرکاری زۆر ئالۆز. بۆئەوەی هەرسێ یاساکانی سەبارەت بە جولاَنەوەی ئەستێرەکان دابڕێژێت.

١_ هەموو ئەستێرەکان بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە لە مەداری هێلکەیدا نەك لە مەداری بازنەیدا.

٢_دوری جەمسەری لەئەستێرەوە ناوچەیەکی یەکسان دەبڕێت لە کاتێکی یەکساندا (یاساکانی ناوچەکان ) ئەم یاسایەش دەری دەخات کە خێرایی هەر ئەستێرەیەك لە سوڕانەوەیدایە بەدەوری خۆردا. بە گوێرەی دوریی لە خۆرەوە دەگۆڕێت، کاتێك لێیوە نزیکە بەخێراتر دەسوڕێتەوە، کاتێکیش لێ دوور دەکەوێتەوە. خێرایی کەم دەبێتەوە.

٣_ دووجای ماوەی سوڕانەوەی ئەستێرەکە بە دەوری خۆری دەدرێتە پاڵ سێ جای دووری ئەستێرەکە بەلای کەمەوە لە خۆر ( یاساکانی ماوەکان ) دەتوانێت ئەم یاسایەش بەم نموونە ڕوون بکەینەوە :

ئەستێرەی عەتار پێویستی بە ٨٨ ڕۆژ و زەوی پێویستی بە ٣٦٥ ڕۆژ هەیە تا خولێك بە دەوری خۆردا بخۆن. دووجای ئەم دوژمارەیە ٧٧٤٤ و ١٣٣٢٢٥ لەسەر یەکن کەواتە ڕێژەی نێوانیان ١ بۆ ١٧ یە. عتار لە خۆرەوە ٣٦ ملیۆن میل دوورە. زەویش لە خۆرەوە ٩٣ ملیۆن میل دوورە.

سێ جای ئەم دووژمارەیە ٤٦٦٥٦ و ٨٠٤٣٣٧ لەسەریەك وە ڕێژەی نێوانیان ١ بۆ ١٧ دەبێت. دوای ڕاگەیاندنی ئەم یاسایانە کلیپر بووبە کەسایەتیەکی جیهانی بەناوبانگ و تەنانەت زانای گەردوون ناسی بەناوبانگ (تیکۆ براهی ) لە ساڵی

١٥٩٩ دا بانگی کرد بۆ (پراگ) بۆئەوەی ببێتە یارمەتی دەری،کاتێك براهی لە ساڵی ١٦٠١ دا کۆچی دوایی کرد کلیپر جێگەی گرتەوە وەکو گەردوون ناسێك لای ئمپراتۆر ڕۆدلفای یەکەم. بەلاّم بە دریژایی تەمەنی بە هەژاری ژیا. کلیپر هەروەها وەکو زانایەکی فیزیك ناوبانگی دەرکرد، بەتایبەت لە بواری موگناتیسی زەویدا. هاوڕێی گالیلۆ یووە و زۆر زانیاریان سەبارەت بە باسەکانیان دەربارەی زەوی و گەردوون ناسی ئالوگۆڕ کردووە. کلیپرلە تشرینی دووەمی ١٦٤٠ دا لە تەمەنی ٦٩ ساڵدا کۆچی دوایی کرد، لە ژورێکی بچوکی یەکێك لە بازرگانەکانی ڕیجینز بورگی لە باشوری ئەڵمانیادا.

## لوقاح چیە ؟

لە هەموو گیانداران هێزێکی خۆی هەیە بۆ بەرگری و زالّ بوون بە سەر نەخۆشیەکانیدا پیێ ی دەوترێت ((بەرگری )) یان ((حصانە )) دەبێت یارمەتی لەش بدرێت بۆ وەرگرتنی ئەو بەرگریە. زۆرێك لەو نەخۆشانەی بە ڤایرۆس تووش دەبین، مرۆڤ دوای تووش بوون ساغ بوونەوەی بەرگری لە لەشیدا درووست دەبێت. بۆ نموونە نەخۆشیەکانی ئاوڵە و سووریژە، جۆری ئاو لەو نەخۆشیانە کە بەرگریەکی هەمیشەیی دەدەنە لاشە. بەواتایەکی تر ئەو نەخۆشیانە ئەگەر یەکجار توشی مرۆڤ بوو جارێکی تر توشی نابێتەوە. بەلاّم نەخۆشی هەلاّمەت، دەشێت مرۆڤ چەندین جار توشی ببێت، بۆ دروست کردنی بەرگری لە لەشدا بەشێوەیەکی دەستکرد. دەشێت لاشە بە ڤایرۆسێکی ئەو نەخۆشیە بکوترێت دوای لاواز کردنی لەو حاڵەتەدا نەخۆش نەخۆشیەکە بە سووکی وەردەگرێت. لێشی هەڵدەداتەوە بۆ ماوەیەکی درێژ بەهێز دەبێت لە بەرامبەری دا. کوتان بەو ڤایرۆسانە لە دوای لاواز کردنی بە ( لوقاح ) دەناسرێت. لوقاح لەو ئەندامیانە دروست دەکرێت کە دەبنە هۆی نەخۆشیەکە دوای ئەوە لاوازکراوەکە زیان ناگەیەنێت. ئەوەی کە بەرگری دروست دەکات لەبەرئەوەی هۆیەکە لە دروست کردنی دژە زیندوییەکاندا ئەو دژانە یان دژەتەنەکان (( ڤایرۆسەکان ) دیار دەکات و لاشە خۆی بەرهەمی دەهێنێت. لوقاحیش لاشە دەوروژێنێت بۆ ئەوەی بەرهەمی بێنێت. دەتوانین لوقاحمان دەست کەوێت بە توشکردنی هەندێك گیانداران بەو

نەخۆشیە و ئینجا بەوە لاخقنی ڤایرۆسەکان.ئەم کردارە چەند بارە دەکرێتەوە تا ڤایرۆسەکە دەگاتە پلەی لاوازی و ئەگەر چوشە لاشەی مرۆڤەوە توشیی ناکات. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بەرگری لە لەشدا دروست دەکات. هەروەها دەتوانین لە برێکی زۆری ڤایرۆسە کوژراوەکانەوە یان ئەوانەی تواناکانییان لەکار دەخرێت لوقاحمان دەست بکەوێت. کاتی کوتانی لاشە بە ڕێژەیەکی زۆر لەو لوقاحە لەش دەوروژێنێت بۆ بەرهەم هێنانی دژەتەنەکان بۆ لەناوبردنی نەخۆش. بەم ڕێگەیە لوقاحەکانی دژی نەخۆشیەکانی خوتن و ئەنفلۆنزا بە کاردەهێنێت هەندێك جار بە کوتانی پێست بە ڤایرۆسێکی چالاك بەرگری دروست دەکرێت. لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە ڤایرۆسانە بەڕێگەیەکی تر دەچنە لەشەوە.

## چۆن سەگ ڕادەهێنرێت ڕێنمونی نابینایان بکەن ؟

سەدان گەنجی نابیناو لەش ساغ ئەمڕۆ ئازادیەکی تازەیان وەرگرتوە بۆ ئیش کردن و گواستنەوە بەهاوکاری و ڕێبەری سەگەکانەوە. سەگان بۆ کارێکی وەها بەکردارێکی درێژخایەن و سەختدا مەشق دەکرێن، یەکەم جار دەبێت سەگەکە پروڤەی پێ بکرێت ڕابێت فەرمانەکانی گەورەی خۆی بەجێ بێنێت. هەروەها دەبێت ڕابهنرێت بەجێ بەجێ کردنی هەر فەرمانێك مەترسی تێدابێت بێت بۆ سەر سەلامەتی. سەگی ڕابەر دەبێت جێ بەجێ فەرمانەکانی ئاغاکەی نەکات لە بەردەم ئۆتۆمبێلێکی خێرادا هەرچەند ئاغاکەی سووربێت لەسەر پەڕینەوە. سەگە ڕابەرەکان بەگشتی لەوسەگە شوانیە ئەڵمانیانەن، هەرچەند هەندێك جۆری سەگی تریش هەندێك جار بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێن، ڕاهێنان و مەشق کردنی هەرسەگێك سێ مانگ دەخایەنێت لە سەرەتادا پرۆڤەکردنی مل کەچی دەست پێ دەکات، سەگەکە مەشق دەدرێت لەسەرجێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی وەکو هاتن و دانیشتن وەستان، ئامادەکردنی شتەکان. هەموو ڕۆژێك ئەم پرۆڤانە دووبارە دەکرێتەوە. وەکو خۆ ئامادەکردنێك. دوای ئەوە ملی سەگەکە بە قامیشێك دەپێچرێتەوە لەسەر شێوەی ڕەشمەی ئەسپ یان پیتی U ئینگلیزی فێر دەکرێت کەلە لەلای چەپی ئاغاکەی یان ڕاهێنەرەکەیەوە ڕێ بکات و تۆزێك لە پێشیەوە بێت.هەروەها فێر دەکرێت چۆن گەورەکەی لە چاڵ و چۆڵی بپەڕێنێتەوە. هەروەها

فێر دەكرێت بوەستێت و چاوەڕوانی بكات. تاوەكو ئۆتۆمبیلەكان لە جادەكاندا تێپەڕ دەبن ونەڕوات تابەتەواوی لە جادە دڵنیا دەبێت سەرەڕای هەموو فرمانێكیش كە بە سەریابكرێت. پێش ئەوەی سەگی ڕابەر تەسلیم بە ئاغاكەی بكرێت دواین تاقی كردنەوەی بۆ دەكرێت ئەویش بەبەستنی هەردوو چاوی و گەڕاندنی بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ. دوای ئەوە سەگەكە لەگەڵ ئاغا نابیناكەیدا مەشق دەدرێت بۆماوەی یەك مانگ هەردووكیان ڕۆژانە ڕادەهێنرێن بەجێ بەجێ كردنی فەرمانەكان. سەگەكەش لەسەر (مەدیح) ی ئاغاكەی دەژێت. دوای ئەوە لەسەر ڕێكردن و ڕێنومایی كردن ڕادەهێنرێت بۆ ئەوەی هەردوولایان لەسەر جوڵەو هێماكانی یەكتر ڕابێن دوای ئەوە نابیناو ڕێبەرەكەی ئامادەن بۆ ئەوەی خۆیان تاقی بكەنەوە. لە ناوقەرەباڵغی و هات و چۆی ئۆتۆمبیلدا لەیەكێك لە جادەكاندا. بەسەرپەرشتی ڕاهێنەرێك. سەگەكەش زۆربەلێهاتووی بەناو خەڵك و قەرەباڵغیەكەدا ڕێگەی خۆی دەبرێت و خۆی لە هەرچی كۆسپ و چاڵی و چوڵیەك بەدوور دەگرێت. لەهەموو شوێنێكی ڕاوەستاندا ڕادەوەستێت و ئێستا هەردووكیان زۆربە باشی وەكو تیمێك كاردەكەن پێكەوە و دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ بۆ دەستپێكردنی ژیانێكی تازە تر كە ئازادی زیاتری تێدابێت بۆ نابینا.

## گەورەترین باڵندە كامەیە كە دەتوانێت باڵ بگرێتەوە ؟

گەورەترین باڵندەی زیندو كە ناتوانێت بەهیچ جۆرێك بفڕێت وشترمورخی ئەفریقیە كە درێژیەكەی ٢,٥ مەترە كێشی (١٣٥) كیلۆگرامە.كێشێكی لەو جۆرە باڵندە لە فڕین قەدەغە دەكات. گەورەترین دووكۆمەڵی باڵندە كە دەتوانن باڵ بگرنەوە یەكەمیان قوترسە alba tross ( باڵندەیەكی دەریایی گەورەیە لەشەكەی سپی یە باڵی قاوەییە بەرز ئەبێتەوە لە هەوادا ) ئەوەی تریشیا ( كندۆر)ە condor ( سیسارکێکی ئەمریكی گەورەیە و لەهەموو باڵندەیەك زیاتر بەرز ئەبێتەوە ) كەكێشی هەردووكیان نزیكەی ١٣ كیلۆگرامە. قوترسی گەڕۆك لە پێشەنگی باڵندە فڕیوەكاندا دێت كاتێك باڵەكانی دەكاتەوە نزیكەی ٣,٥ مەترە. دوای ئەو كندۆر دێت ئەویش كە باڵەكانی دەكاتەوە ٣,٥ مەترە. دوای ئەوان پاشای بازدان دێت كە لە ئەمریكای باشوور و مەكسیك و ئەمریكایی ناوەندا هەن

و درێژی باڵەكانی بەكراوەیی دەگاتە ٣ مەتر. دوای ئەوان (بجع ی سپی ) دێت باڵەكانی بەكراوەی ٢,٥ مەترە و لە كەنەدا دەژی بە ئاراستەی باشوور. كەلە وەرزی زستاندا بە درێژایی لێواری كەنداوی ئەمریكا دەبینرێن دوای ئەوان مێشەسی bustard دێت كەلە قازی گەورە دەچێت و سەر بە خێزانی قولنگە یە، مێشەسی لە هەندێك ناوچەكانی ئەوروپادا دەژی و هەروەها لە ئاسیاو ئەفریقادا باڵەكانی بەكراوەی لە ٢,٥ مەتر درێژ ترە. لەدوای ئەوان بازی ئەمریكی دێت و باڵەكانی بەكراوەیی دەگاتە ٢, ٥ مەتر، بازی ئالتونیش هەمان شتە. دوای ئەوە قولنگی دەنگ خۆش. پاشان قولنگی گردەكان. كەباڵەكانی بەكراوەیی دەگاتە (٢) مەتر، هەروەها هەڵۆ. ئەمانە گەورە ترین ئەو باڵندانەن كە دەتوانن باڵ بگرنەوە. بەڵام خێراییان وەك یەك نیە. خێراترین باڵندە فریبێت و خێراییەكەی پێوانەی باڵندە سمامەیە SWIFT (جۆرێكە لە پەرەسێلكە ) دوانیان لە هند داڵی باڵ درایەوە لەماوەی ٤٦,٣٦ چركەدا ( ٢) میلیان بری. یان بەخێرایی ١٧١,٤ و ٢٠٠میل لە كاتژمێرێكدا ! دوای ئەوان لە خێراییدا بازی مراوی دێت كە ١٦٠ و ١٨٠ میل كەلە كاتژمێرێكدا دەیبڕێت دوای ئەوان (ئەلحمام ئەزاجل ) دێت كە ٦٠ میل لە كاتژمێرێكدا دەبڕێت. باڵندە ( تنانە) كانیش ٥٠ بۆ ٥٥ میل لە كاتژمێرێكدا.

## ئایا قرش مرۆڤ دەخوات ؟

زیاتر ١٥٠ جۆرێك ماسی قرش هەیە. هەندێكیان زۆر دڕندەو زیان بەخشن و بەڵام زۆربەیان بێ زیانن !

قرش لە زۆر ڕووەوە لە ماسی جیاوازە. ماسیەكانی تر بە پەردەیەكی جولاو سەری ڕیشوەكانی گیراوە. بەڵام قرش پێستەكەی شەق شەقە. بڕبڕەی پشتییشی لەبری ئێسقان لە( غچاریف) پێكهاتووە. دانەكانیشی هەروەها لەشتە نایاساییەكانە لە ماسیەكاندا. ماسی قرش (نتوائت) هەڵتۆقیوی دانی نرمی هەیە بەڕیز لە پوك و دەمدا، لە جیاتی دانی ڕاستەقینە ئەو پێستە تەڕی لە هەڵتۆقیوە دانیەكانی لێوە دەردەچێت زۆر بە لەسەرخۆ و بەرەو دەرەوە گەشە دەكات. كە لەگەڵ خۆیدا ڕیزێك هەڵتۆقیوی دانی هەڵ دەگرێت، هەركە ڕیزێك لە دانەكانی

کەوتن لە شوێنیدا چینێکی تر دەڕوێتەوە. دەمی قرش لە دیووی خوارەوەی سەرەوەیەتی. کاتێك شت دەخوات دەمی بۆ خوارەوەیە بۆیە ناچارە خۆی بەپشتدا بخات بۆئەوەی نێچیرەکەی بگرێت یان خواردنێك بخوات لەسەر ئاو. قەبارەکانی قرش جیاوازن لە نێوان ٣٪ و ١٥ مەتر دان. زۆربەی جۆرەکانی قرش بێ ئازارن وەکو ئەوانەی دەکەونە شوێنی کەشتیەکان، تەنانەت ماسیەکانیش لێیان ناترسن. بەڵام دوو جۆریان هەیە کە زۆر مەترسیدارن. یەکێکیان ناوی (( قرشی پڵنگە)) لە ئاوی ئیستوائیەکاندا دەژی کێشی دەگاتە (٢٧٠) کیلۆگرام. قرش دەتوانێت شێری دەریا قوت بدات وازانراوە لەسەری کەهێرش دەکاتە سەر مرۆڤ. بەڵام گەورە ترین ماسی قرش کە مەترسیدار بێت قرشی ((سپیە)) کە درێژیەکەی دەگاتە ١٢ مەتر، زۆرترین جۆری قرشەکە مەترسی دەخاتە دڵەوە. لە خواردنی مرۆڤدا دوو دڵی ناکات. هەروەها ئەوەشی لەسەر زانراوە کە بەیەك پارو شێری دەریا قوت دەدات. ئەوەی کەسەیرە گەورەترین جۆری قرش، بێ زیانە ئەویش ((قرشی نەهەنگە )) کە ١٥ مەترە درێژ دەبێت کێشی دەگاتە ١٨ تەن. خواردنیشی لەسەر ئەندامە بچووکەکانە دەرهاتە دانیەکانیشی ٣٠ میلی مەترنیە.

## بۆچی خەودەبینین؟

باله هۆکارەکانەوە دەست پێبکەین کەوامان لێ دەکات خەو نەبینین. خەوەکانمان لە دونیایەکی ترەوە نایەت. هەموو خەوەکانمان پەیوەندیان بەسۆزەکانمان و ترسەکانمان و حەز و پێویستی و بیرکردنەوەکانمانەوە هەیە. بەڵام شتێکی (( دەرەکی )) دەشێت کار لەوە بکات کە بەخەو بیبینین. ئەگەر یەکێکمان برسی بێت یان ماندوو بێت یان هەست بە سەرما بکات، ئەوا لە خەودا هەر بەوشتانە دەبینێت. ئەگەر لێفەکەی لەسەر لاچوو لە شەوێکی ساردی زستاندا ئەوا خەو بەوەوە دەبینێت کە لە سەر شاخێکی بەفراویە. مادەی ئەو خەوەی کە مرۆڤ کە لە شەودا دەیبینێت بەزۆری سەرچاوەکەی ئەو تاقی کردنەوەیە کەلە ڕۆژدا پێیدا تێپەڕ دەبێت. لە بەر ئەوەیە ((ناوەڕۆکی ))خەو لە شتێکەوە دێت کە کار لە و کەسەبکات لە کاتی خەوتنیدا وەکو ( سەرما یان ژاوەژاو یان نارەحەتی و هتید....) هەروەها تاقیکردنەوەکان و گرنگیەکان و

ئارەزوەكانیشی دەگرێتەوە كەلە ڕابووردوو دا هەیبوە. لەبەرئەوە لە منداڵ زیاتر خەو بە پەپولەو باڵندەكانەوە دەبینێت. مندالآنی لەوان گەورەترن خەو بە تاقیكردنەوەكانی قوتابخانەوە دەبینن. برسیەكان بە خواردنەوە. سەربازان بە وولآت و خێزانەكانیانەوە زیندانیان بە ئازادیەوە. بۆئەوەی بزانن لە كاتی خەوتندا چی ڕوو دەدات چۆن پێداویستی حەزەكانتان تێكەڵ دەبێ لە خەودا ئەمەش بەسەرهاتی یەكێك لە تاقی كردنەوەكان :

پیاوێك خەوتبوو بە پارچەیەك لۆكە پشتی دەستیان سڕی، خەوی بینی كەوا لە نەخۆشخانە دایە و خۆشەویستەكەی سەردانی دەكات و بە تەنیشتیەوە دانیشتووە و دەستی دەشێلێت !!

ئەوانەی زۆر پسپۆڕن لە شیكردنەوەی دەروونی لێكۆڵینەوەی تایبەت بەو هۆیانەی وادەكات مرۆڤ خەو ببینێت، بەو شتانەوە و تەفسیر كردنی، تەفسیر هەموو كەسێك بۆ خەو وەرناگیرێت. بەلآم ئەو تەفسیرانە دەروازەیەكی گرنگە بۆ تێگەشتنی مەسەلەكە. ئەوان بڕوایان وایە خەو بریتی یە لە تەعبیرە جیاوازەكانی مرۆڤ كە بۆی جێ بەجێ نابێت واتە خەو ڕێگەیەكە بۆ جێ بەجێ بوونی حەزەكانی مرۆڤ. بەپێ ئەم بیردۆزەیە، قەدەغە لێكراوەكانمان لە خەودا بۆجێ بەجێ دەبێت.

## دیاری كردنی نەخۆشیەكان بە ئازمایشكردنی میز.

دیاری كردنی نەخۆشیە جۆراو جۆرەكان بە هۆی ئازمایشكردنی میزەوە لە ئەمڕۆدا كارێكی زۆر شائیعە. لەگەڵ ئەوەی ئازمایشی تایبەتی بۆ هیز لە تاقیگەكاندا دەشێت زۆر لە نەخۆشیەكان ئاشكرا بكات،بەلآم ئازمایشێكی ( نمایشی ) دەشێت تەنها چەند نەخۆشیەكی دیاری كراو بە دەربخات.

ئایا ئەو نەخۆشیانە دەزانیت چین كە بەهۆی ئازمایشی میزەوە دیاری دەكرێن ؟

ڕەنگی میزی ئاسایی زەردێكی كراوەیە. لە ئەنجامی بوونی ڕەنگی میز تیایدا، ئەگەر كەسەكە توشی تا بوو ڕەنگی میزەكە دەبێتە زەردێكی تێر. ئەگەر توشی ((یدقان )) بوو ئەوا ڕەنگی میزەكە زۆرتر زەرد دەبێتەوە. هەروەها خواردنی ڤیتامیت b ڕەنگی میز زۆر زەرد دەكات. ئەویش بەهۆی بوونی ڕیبوفلافین لە

ڤیتاميناتدا. ئەگەر میزە کە گۆڕا بۆ قاوەیی یان ڕەش مانای وایە نەخۆشیەکی (خلقی) لەو کەسەدا هەیە. ئەگەر میزی کەسێکی توشبوو بە شەکەری بەسەر بەتاڵی دابنرێت بۆ ماوەیەك ئەوا مێشهەنگ بۆخۆی ڕادەکێشێت بە هۆی بوونی کلوکۆز تیایدا. چونکە تامەکەی شیرینە. ئەگەر بمانەوێت ئازمایشی میزێك بکەین و بزانین شەکری تێدایە. ئەوا لەگەڵ گیراوەی بنیدیکتی دا گەرمی دەکەین، ئەگەر (ترسبات ) ی سوور درووست بو ئەوا مانای وایە کلوگوزی تیدایە. لە پێناو ئازمایشکردنی (زلال ) ئاوی پاکدا، ئەوا ترشی سرکە دەکرێتە میزەکەوە وەرم دەکرێت. ئەگەر (ترسبات ) ی سپی دروست بوو ئەوە نیشانەی ئەوەیە زلالی تێدایە. شایانی باسە میزی ئاسایی زلالی تێدانیە. هەروەها ئازمایشی چاندنی میز زانیاری زۆرباشمان دەداتیٚ سەبارەت بە پیس بوونی بەکتریا لەلەشدا.

## سەردەمی بەردی

سەردەمی بەردی بەوە ناودەبرێت ئەو ماوەیە بووە کە مرۆڤ تیایدا فێری دروست کردن و بەکارهێنانی کەرەستە بەردیەکان بووە. سەردەمی کانزیش دوای سەردەمی بەردین هاتووە. دەتوانین سەردەمی بەردین بکەین بەسیٚ بەشەوە:
سەردەمی بەردینی یەکەم و سەردەمی بەردینی ناوەڕاست سەردەمی بەردینی نویٚ.
سەردەمی بەردینی یەکەم (کۆن) لەگەڵ شێوە یەکەمەکانی مرۆڤدا (( مرۆڤی یەکەم )) دەستی پیٚ کردووە. مرۆڤی سەرەتا ڕاوچی بووە و کەرەستەکانیشی سەرەتایی بووە. کۆنترینی ئەو کەرەستانە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ نزیکەی ٢,٥٠٠,٠٠٠ هەزار ساڵ پێش ئێستا. دەشێت مرۆڤی سەرەتای کەرەستەکانیشی لەدارو ئێسقان دروست کردبێت. سەردەمی تازەی نزیك (( بلستوسینی )) پێشی نزیکەی ٢,٥٠٠,٠٠٠ هەزار ساڵ دەستی پیٚ کردووە و درێژەی بووە تا پێشی نزیکەی ١٠,٠٠٠ هەزار ساڵ. لە بەشی کۆتایی سەردەمی بەردینی یەکەمدا مرۆڤ فێری وێنە کێشان و پەیکەر دروست کردن بوون لە سەر دیواری ئەشەکەوتەکان. سەردەمی بەردینی ناوەڕاست ئاماژە بەو ماوەیەیە دەکات لە باکووری ڕۆژئاوای لە ئەوروپادا کەتیایدا پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی و لە ساڵی ٨٠٠٠ پێش زاین

دەستی پێ دەکات تا نزیکەی ساڵی ۲۷۰۰ پ. ز لەو ماوەیەدا مرۆڤ توانی کەرەستەی بەردینی باشتر درووست بکات هەروەها لە و ماوەیەدا تیرو کەوان بۆ ڕاوکردن بەکارهێنرا. لەچەرخی ناوەڕاستدا بوو مرۆڤ چەندین شتی جۆراو جۆری لە ئێسقان و دار دروست کرد. بەڵام چەرخی بەردینی نوێدا کشتوکاڵ و پیشەسازی و کەرەستەی گڵین بەشێوەیەکی فراوان لە ئەورووپادا بڵاوو بووەوە. مرۆڤ لە سەردەمی بەردینی نوێدا فێر بوو چۆن بەرد بهاڕێت و سوری کاتەوە بۆ دروست کردنی کەرەستەو چەك. هەروەها بە خێوکردنی ئاژەڵی ماڵی هۆکارێکی گرنگ بوو لە ژیانی ئەم سەردەمەدا. هەروەها سەردەمی (وراعە) و گرنگی دان بەرووەکەکان و کشتوکاڵی بەروبوومەکان بوو. لەم سەردەمەدا مرۆڤ دەستی کرد بە دەرهێنانی کانزاکان. لەگەڵ دەست پێکردنی کشتوکاڵدا خەڵکیش دەستیان کرد بە درووست کردنی گوند. چەرخی بەردینی ناوەڕاست کرداری پێشکەوتنی سروشتی ئاشورشی بوو. کاتێك ئەورووپیەکان ئەمریکایان دۆزیەوە. دانیشتوانە ئەسڵەکەی (هندیە سوورەکان ) لە سەردەمی بەردینی نوێدا دەژیان. بەڵام لە سەردەمی ۱۸ دانیشتوانە ئەسڵیەکەی ئوستراليا و تسمانیا لە قۆناغی یەکەمی چەرخی بەردیندا دەژیان. خێڵێك هەیە لە فلیپین دا تا ئێستاش لە چەرخی بەردینی یەکەمدا دەژین. دابەشکردنی سەرەمی بەردین بۆ ۳ قۆناغ تەنها بەسەر ئەورووپا دا جێ بەجێ نابێت. بۆ نموونە لە ئاسیادا بەدرێژایی چەرخی بەردین گۆڕانێکی گەورە بەسەر کەرەستەکانی چەرخی بەردیندا نەهاتووە. لە ئەفریقاشدا چەرخی بەردینی ناوەڕاست هەر بوونی نەبووە. کاتێك سەردەمی چەرخی بەردینی یەکەم کۆتایی هات ئەو چەرخەیان هەر نەزانی.

## چۆن دەتوانین شوێنی ئەستێرەیەی قوتبی باکوور دیاری بکەین ؟

زیاتر لە هەزار ساڵ دەریاوانەکان لە نیوەی باکوری گۆی زەوویدا، بە ئەستێرەیەکی پرشنگدا دۆزیوەتەوە. کە دەکەوتە ئەوسەری جەمسەری باکورەوە تەقریبەن. ناوی (( ئەستێرەی قوتب )) یان ((بولارلیس )) یان لەم ئەستێرە نابوو. زۆر سروشتیە دوای دۆزینەوەی قیبلەنما دەریاوانەکان پێویستیان بەم ئەستێرەیە نەمێنێت ڕێنوویان بکات. هەروەها ئاراستەی تازە بەبێ تەل دەتوانین

بلّێین پێویستی ڕێنموونی کردنی ئەستێرەی قوتبی نەهێشت. بەلاّم بابزانین شوێنی ئەم ئەستێرەیە دیاری بکەین، کەڕۆڵێکی گرنگی بینیوە لە دەریاوانیدا بۆ زەمانێکی دوورو درێژ. شەوێکی ساماڵ کە هەور بە ئاسمانەوە نەبێت لە ماڵی خۆت دەرچۆ. و سەیری لای باکور بکە کۆمەڵێك لە حەوت ئەستێرە دەبینیت کە درێژ بوونەتەوە لەسەر شێوەی ئەسکۆیەکی (کەوگیر ) دروست چەماوە وایە، کاتێك ئەستێرەی لەو شێوەیە دەدۆزیتەوە. لە هەمان ئاڕاستەوە بگەڕێ بەشوێن پۆلە ئەستێرەیەکی تردا، هەمان شت شێوەی لەئەسکۆیەك دەکات بەلاّم دەستەکەی بە پێچەوانەی ئەسکۆی یەکەمەوە چەماوەتەوە. گەورەترین ئەستێرە لەناو ئەو ئەستێرانە دا پێی دەوترێت (( ورچی گەورە )) و ئەویتریش (( ورچی بچووك )) سەرنج بدە لە بەشی پێشەوەی لە بۆشایی ئەسکۆی ((ورچی گەورە )) لە دوو ئەستێرە پێك دێت. ئەوەی کەوتۆتە سەرەوە پیٚ ی دەڵێن بۆشایی (( دبهی DUBHE )) دووەمیش پیٚ دەڵێن ((میراك ))MIRAK. ئەو دوو ئەستێرەیە بە دوو ئاماژەکە ناسراوون لەبەر ئەوەی ئەگەر هێڵێك بکێشین لە نێوانیاندا هێڵکەمان گەیاندە نێوانێك، لە نێوان دوو هێماکە چوار جار زیاتر بوو. ئەوا دەگەینە ئەو ئەستێرە ڕووناکەکە بۆی دەگەڕێین و پێی دەوترێت ئەستێرەی قوتب.

## ژەهر چی یە ؟

ژەهر مادەیەکی ژەهراویە، ئەگەر بە ڕێژەیەکی زۆر لیٚ بەکاربهێنرێت دەبێتە هۆی ئاوسان و بریندار بوون و تێکچوون و سووربونەوە لەلەشدا. دەشێت هۆیەك بێت بۆنەخۆشیەکی هەناوی یان ببێتە هۆی مردن.چەندین جۆر لە ژەهر هەیە.ژەهری (اکالە)و (مهیجە)هەیە یان ژەهرێك هەیە کار لە کۆئەندام و فرمانەکانی لەش دەکات. یان ژەهری گازی و ژەهری خۆراکی. ژەهری (اکالە) ڕیشالە زیندوەکان دەکوژێت بەمەبەستی مرۆڤیشەوە دەشێت ناودەم یان گەرو بفەوتێنێت. هایدرۆکسیدی سۆدیۆم نمونەی ئەم ژەهرەیە. هەروەها تەشیەکان و فینول(ترشی کربۆلیل) دەشێت کاریگەری هەمان ژەهرەکانی (اکالە ) تیان هەبێت.

ژەهرە مهیجەکان دەبێتە هۆی ئاوسانی پەردەی خمالی و بریندار کردنی. هەروەها گەدە یان ڕیخۆڵەکان یان چەقی دەماخ لەناودەدات. ئەگەر هەندێك دەرمان بە

زۆری بخورێت هەمان كاریگەری ژەهرە میجەكانی هەیە. بەڵام ئەو ژەهرانەی هێرش دەكەنە سەر كۆئەندام و كارەكانی لەش، هێرشیش دەكەنە سەر مێشك و ئەندامە گرنگەكانی تری وەكو دڵ جگەر. بۆ نموونە دەشێت جورعەیەكی كەم لە ترشی بروسی ( گیراوەی سیانیدی هایدرۆجین ) یان ستركنین ( كە مادەیەكی تفتی ژەهراویە ) مرۆڤ بكوژێت. زۆرێك لە وەرگیراوەكانی برتبیوریت ( خویەكانی ترشی برتبیورین ) ئەگەر بە جورعەی زۆر بەكار ببرێت دەشێت كاریگەری هەمان جۆر لەو ژەهرانەی بێت. كە ترشی بومازین و كیندین ( مادەیەكە هاوشێوەی كینینە و نەخۆشی مەلاریای) پێ چارەسەر دەكرێت. مەوادی زۆر ژەهراوین. ژەهرە گازیەكان تەنگە نەفەسی دروست دەكەن دەشێت سەربكێشێت بۆ مردن. هەندێك لە گازەكان تهیج لە هەردوو چاو و لوت و پێستی لەشدا دروستی دەكەن. گازی یەكەم ئۆكسیدی كاربۆن گازێكی یەكجار ژەهراوەیە. هەروەها گۆگرتید ( یان كربتون) ی هایدرۆجین لە گازە جەنگیە زۆر ژەهراویەكان. ژەهراوی بوون بە خۆراك لە ئەنجامی خواردنی مەوادی كیمیایەوە یان زیندەوەری ئەندامی تایبەت كە باش نیە بۆ خواردن دروست دەبێت. بۆ نموونە دەشێت دەرمانە كشتوكاڵیەكان خۆراك ژەهراوی بكەن. هەروەها گوێچە ماسی و شوكران یش دەشێت خۆراك ژەهراوی بكەن هەندێك ژەهری زۆر بە هێز هەن بۆ نموونە دیوكسین كەبۆ لەناوبردنی گژوگیا زیان بەخشەكان بەكاردەهێنرێت ژەهرێكی زۆر زیان بەخشە. پۆتاسیۆمیش ژەهرێكی یەكجار بەهێزە هەموو ئەندامەكانی لەش لە كاردەخات ومردنی خێرا لێدەكەوێتەوە. لە ژەهرە زۆر بەهێزەكانی تر هێروین و نیكۆتین وئەترۆبین. هەر ژەهرێك لەوی تر جیاوازە لە تایبەتمەندیە كانیدا. لەبەر ئەوە باشتروایە لە كاتی ڕودانی ژەهر خواردندا بو زروترین كات خۆمان بگەیەنینە لای پزیشك.

## گولی

گولی نەخۆشیەكی زۆر پیس و ئاڵۆزەو بە شێوەیەكی سەرەكی لە ناوچە شێدارە مەداری و نیمچە ئستیوائیەكاندا دەردەكەوێت. زۆربەی كەسانی توشبو بە گولی لە ئاسیاو باشووری ئەمریكا و یابان و كۆریا و دوورگەی باسفیكی دایە لەگەڵ

ئەوەی پەتایە بەلاّم بەئاسانی بلاّوو نابێتەوە. گولی لە ئەنجامی بەکتریایەکی دیاری کراوەیە پێدەوترێت میکرۆبی کەڕوویی. هێرش دەکاتە سەر پێست و کۆئەندامی عصبی و بریندارو بەڵەکی دەکات. ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی لەسەر هەردوو گوێو دەم و چاوو جوتە گون و ( الاوصال) دروست دەبێت.هەروەها توشی بەشی ناوەوەی دەم ولوت دەبێت. کاتێك ئەم نەخۆشیە بگاتە چاو کەسی توشبوو کوێر دەکات. دەمارە توشبوەکان لە ناو دەبات وپەنجەکان هەڵ دەوەرن و هیچ هەستێکیان نامێنێت و ئفلیج دەبن. گولی دوو جۆرە : پێستی و سیلی. لە نیشانەکانی گولی پێست، بوونی ( کتلەیەك ) لە ڕیشاڵی ئاوساو لە ژێر پێست و دەم و چاوو جووتە گون(الاغشیە الچماگیە) و بۆری هەناسەی سەرەوە. بەلاّم گولی سیلی پەڵی سوور دروست دەبێت. چارەسەری ئەم نەخۆشیە درێژخایەن دەبێت بە دەمارنە گۆگردیەکان بەلاّم حاڵەتە سەختەکانی پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە. لە دونیادا دوو ملیۆن حاڵەتی گولی لە دونیا دا هەیە. بەلاّم ژمارەی ڕاست ڕەنگە لە دەملیۆنیش تێ بپەڕێت. تا ئێستاش نازانرێت چۆن میکرۆبەکانی ئەم نەخۆشیە دەگوێزرێتەوە. بەلاّم وادیارە پەیوەندی کردن بە کەسی توشبووەوە. دەبێتە هۆی توشبونی ئەو کەسانەی کە توانای وەرگرتنی ئەو نەخۆشیەیان هەیە. منداڵی کەسی گول توشی ئەم نەخۆشیە نابێت ئەگەر بە منداڵی لە باوك و دایکیان دور بخرێتەوە.

## نروەل چیە؟

نەروەل جۆرێکە لە نەهەنگەکان زۆرترین جۆرە لە ئاژەلاّن کەجێی تێرامان بێت. زۆربەمان وا دەزانین تەنهایەك جۆر نەهەنگ هەیە. بەلاّم لەڕاستیدا چەندین جۆر نەهەنگ هەیە. ئەو نەهەنگانەی دانیان هەیە بە شێوەیەکی گشتی لە سەر چەندین جۆر لە ماسی دەژێن کەڕاویان دەکەن و دەیانگرن. نەهەنگی عەنبەر گەورەترین ی نەهەنگە دان دارەکانە کە درێژیەکەی دەگاتە ٢٠ مەترێك و سەری زۆر گەورە یە. لە جۆرەکانی ئەو نەهەنگە نەهەنگێکە لوتێکی شێوە شوشەیی هەیە و لە هەردوو لای سەریەوە پەڕێکی گەورەی سەیری هەیە. نەروەل لە نەهەنگەدان دارەکانەو بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئاوە جەمسەریەکاندا هەیە و شتێکی تیایە کەلە لە

نەهەنگەکانی تردا نیە. نەروەل ( کەرکەدەنی دەریا ) دانێکی عاجی درێژی هەیە لە لای چەپی دەمیەوە، کە لە دەمیەوە وەکو شمشێر دەردەچێت !

## هەنگ چۆن هەنگوین دروست دەکات.

هەنگ هەنگوین وەکو خواردنێك بۆ خۆی دروست دەکات. لەبەرئەوە کرداری دروست کردنی هەنگوین ئەو ڕێگەیەیە بۆ پەسیسە کردنی خۆراك لە خانەی هەنگدا. یەکەم شت کە هەنگ دەیکات لەو کردارە دا سەردانی گوڵەکان و هەڵمژینی شیلە کەیەتی. ئینجا ئەو شیلەیە دەگوێزرێتەوە لە ناو تورەکەی هەنگوینەکەیدا بۆ خانەکانی. تورەکەی هەنگوینی لە هەنگدا بریتی یە لە شوێنێك لە تورەکە دەچێت لە کەناڵی هەرسیدا کەلە بەرامبەر گەدەی هەنگەکە دایە. دەم قاپێك هەیە کە تورەکەو گەدە لەیەك جودا دەکاتەوە.

یەکەم هەنگاو لە کرداری دروست کردنی هەنگویندا لەوەوە دەست پێ دەکات کاتێك شیلەکە لە ناو تورەکەی هەنگوینەکە دایە لە لاشەی هەنگەکەدا. گۆڕانێکی کمیایی بەسەر مەوادە شەکریەکەدا دێت کەلە شیلەکە دا هەیە. هەنگاوی دووەم قوتاربوونی شیلەیکەیە لە بەشێکی زۆر لەو ئاوە کە تیایدایە. ئەویش بە هەڵم بوون دەبێت لە ئەنجامی ئەو گەرمایەی لە ناو خانەی هەنگەکە دایە. ئەو هەنگوینەی هەنگ پەسیسەی دەکات لە ناو شانەکاندا دوای ڕزگار بوونی شیلە ئەسڵیەکە لە زۆربەی ئاوەکەی بۆ هەتا هەتایە خراپ نابێت. ئەگەر هەنگ شیلەی دەست نەکەوت هەندێك جار هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی ئەو شلانەی کە تامی شیرینیان تێدایە.کە مێروە جۆراو جۆرەکان دەیڕژێنن یان بە کۆکردنەوەی ئیفرازاتە ناشیلەییەکان کە ڕووەکەکان دەیڕژێنن ( دەری دەدەن ) هەنگوین بە چەندین جۆر لە شانە دەردەهێنرێت، دەتوانین لە شانەدەری بهێنین یان بە شانەکەوە دەری بهێنین. بەلاًم زۆربەی هەنگوینەکان لە شانەکان بە هۆی ئامێرێکەوە دەردە هێنرێت کەناوی (( هەنگوین کۆکەرەوەیە )).

هەنگوین بەپێ ی جۆری گوڵەکان کەلێیەوە دروست بووە لەگەڵ ئەو کەش وهەوایەی کە شانەکەی تێدایە دەگۆڕێت. هەنگوین لە دوومادەی سەرەکی شەکر پێك دێت ئەوانیش ( دکستروز ) شەکری تریّ و (لفیولوز ) شەکری میوە و

هەنگوینە لەگەڵ چەندین مەوادی تردا شەکری قامیش و چەوەندەر و ملتۆز ( شەکری جۆ ) و دکسترین ( مادەیەکی کەتیرەییە لە نیشاستە دەردەهێنرێت ) لەگەڵ چەندین مەوادی تری کانزایی لە ئەنزیمات و ڤیتامینات لەگەڵ ڕێژەیەکی کەم لە پرۆتینات ومزرەمەنی هەروەها ڕەنگ و بونی جۆرەکانی بە گوێرەی سەرچاوەی شیلەکە دەگۆڕێت.

## جیاوازی چیە لە نیۆن میوە و سەوزەدا ؟

وشەی میوە بە بەناوکی ئەو ڕووەکانە دەوترێت کە گەڵاَ و تۆویان هەیە. سەوزەش بە ڕووەکە گیاییەکان دەوترێت. ڕووەکە گیاییەکان قەدەکانیان نەرم و تەڕوو هیچ ریشاڵێکی داریان تێدانیە یان کەمیان تێدایە. زانایان ڕووەك ناس دەڵێن : ئەو بەشەی کە تۆوەکە هەڵ دەگرێت لە ڕوەکدا ئەو میوەکەیەتی و میوە دەکەنە سێ بەشی سەرەکیەوە : گروپی ناوك دارەکان کە ناوکەکەی تۆوەکەی هەڵ دەگرێت وەکو پرتەقاڵ و کاڵەك و سێو. گروپێك کە ناوکەکەی ڕەقە وەکو قۆخ، قەیسی، چەقالە و گێلاس. لە میوە ووشکەکانیش وەکو گوێز، بادەم، بوندوق، دانەوێڵە و لۆبیا و فاسۆلیا ئەگەر بەلاتەنەوە نامۆ بوو زانایانی ڕوەك لۆبیا و فاسۆلیا بە میوە دا دەنێن !! لەبەر جیاوازی داب و نەریتی خواردن لە نێوان خەڵکا، بەشی چاك بۆ خواردن لە ڕوەکەکان لە هەندێك ناوچەی دونیا دا بە میوە دادەنرێت، هەمان بەشی لە هەندێ ناوچەی تردا بە سەوزە دادەنرێت. چۆن لە مملەکەتی گیانداراندا گروپەکان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە. زۆر لە سەوزەکانیش پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە., ئایا دەزانن بۆ نموونە : کەلەرم و شێلم و قەڕنابیت، قبنیگ سەر بە گروپییێکی سەوزەن ؟

کاهوو و هەندەبا ( تاڵیشك ) گیایەکە بۆ مەبەستی لەوەڕ و پزیشکی بەکاردێت ) کنگر سەربە هەمان گروپن. ئەم گروپە کولەکەو کاڵەك و شەمامەش دەگرێتەوە.گروپی قۆخیش هەموو جۆرەکانی پاقلە فاسۆلیا لۆبیا پاقلەی سۆیا دەگرێتەوە. گیامارانە asparagus لە گروپی زەنبەقیەکانە وەکو پیاز و سیر و کەوەر و کەوەری ئەندەلوس و (جۆرە ڕوەکێکە سەلکەکەی لە سەلکی سیر ئەچێت shaldotسەربە هەمان گروپن. چەوەندەر و سپێناخ و چەوەندەری سویسریش

سەر بەهەمان گرووپن ئینجا گرووپێکی نامۆ هەیە کە ترێ ڕێوی ((ڕەزەڵە )) و پەتاتە و توتن و بیبەر و باینجان دەگرێتەوە !! سەوزە و میوە لە زۆر لایەنەوە لەیەك دەچن چونکە هەردوو لایان ڤیتامینات و مەوادی کانزایی دەدەن بەمرۆڤ کە یارمەتی پاراستنی لاشەی دەدات.

## بۆچی ئەڵماس دەدرەوشێتەوە ؟

گریمان ئەڵماس وەکو ئێستا دەگمەن نەدەبوو. وە گریمان گرانیش نەدەبوو وە هەموو کەسێك دەیتوانی هەیبوایە. ئایا ئەڵماس ئەو نرخەی دەما ؟
دەشێت دووشت وابکات خەڵکی حەز بکەن خاوەنی ئەڵماس بن :
یەکەمیان ئەوەیە کە ئەڵماس ڕەقترین مادەیە کە مرۆڤ ناسیبێتی. لەبەر ئەوە زۆر بەنرخە لە پیشەسازیدا.
دووەمیان ئەوەیە کە ئەڵماس هەمیشە جوانە و خەڵکی بەسەیر کردنی چێژ وەردەگرن.
ئەڵماس لە ئەنجامی کردارێکەوە بووە لە سروشتدا ڕووی داوە. پێش ملیۆنەهاساڵ پلەی گەرمای زەوی وردە وردە دادەبەزی لەو زەمانە کۆنەدا لە ژێر زەویدا قەبارەیەك لەبەردی شلی گەرم لە ژێر زەویدا هەبوو. ئەم قەبارەیە تووشی پاڵە پەستۆو گەرمیەکی زۆر بوو. کە بوە هۆی پەستاندنی گەردیلەکانی کاربۆن لە سەریەك بۆ ئەوەی بگۆڕێت بۆ کریستاڵی ڕوونی چڕ. بە سادەیی ئەڵماس کریستاڵێکە لە کاربۆنی چاك. ئەگەر ئەڵماس بەشێوەی ((خاو )) بدۆزرێتەوە دیمەنی دەرەوەی کاڵ و کرچە. بۆیە مرۆڤ زاخاوی دەدات بۆئەوەی بگۆڕێت بۆ گەوهەرێکی درەوشاوە کە هەموومان دەیزانین. زۆربەی ئەڵماسەکان دەکرێنە دوو پارچەوە. و هەریەکەیان زاخاو دەدرێت بۆ ئەوەی بگۆڕێت بۆ ئەڵماسێکی خڕی درەوشاوە. ئینجا ڕووکەی چاڵ دەکەین کەژمارەیان ( ٥٨) چاڵە یان زیاترە ئەو چاڵانە وا دەکات لە ئەڵماسەکە بدرەوشێتەوە. هۆی ئەوەی کە ئەڵماس هێزی شکانەوەی زۆر بە هێزە، واتا ئەو تیشکەی تیٚ ی دەچێت ئەڵماسەکە هەر مادەیەکی تر زیاتر دەشکێنێتەوە و تیشکەکە بۆ ناوی ئەڵماسەکە دەشکێتەوە لە بری ئەوەی بیبڕێت. لەبەر ئەوە ڕێژەیەکی زۆر لە تیشك دەگەڕێتەوە بۆ چاومان.

کاتێك سەیری ئەڵماسەکە دەکەین، وامان بۆ دەردەکەوێت کە زیاتر درەوشاوەیە لەبەر ئەوەی ئەڵماس تیشك شیتەڵ دەکات بۆ چەندین ڕەنگی جیاواز، ئەوەیە کە درەخشانی دەداتە ئەڵماسەکە.

ئایا دەزانن تا ساڵی ١٤٣٠ خەڵکی بە ئەڵماس خۆیان ڕازاندوٚتەوە تا لەو ساڵەدا ئافرەتێکی فەڕەنسی بە ناوی ((ئوٚگنس سوٚریل )) خۆی پێ ڕازاندەوەو دوای ئەو بو بە باوو.

## فەزای دەرەوە تا کوێ درێژ دەبێتەوە ؟

گەردوون ناسان باوەڕیان وایە ئەو گەردونەی کە دەتوانین بینینین یان سەیری بکەین تەنها بە شێکە لە هەموو گەردوون. ئەوان بۆچونیان وایە گەردون بۆ ماوەیەکی دورتر لە فەزا درێژ دەبێتەوە.

بەڵام تاچ مەودایەك مەودایەك درێژ دەبێتەوە ؟ ئایا درێژ بوونەوەکەی بێ کۆتاییە یان لە شوێنێکدا کۆتایی دێت ؟ ئەگەر کۆتایی هەیە چی لە دوای ئەوەوە دێت ؟

گەردوون ناسان بڕوایان وایە وەڵامەکەی ئەوەبێت لە سروشتدا خودی گەردوون. بە پێی ئەو بیردۆزەی تا ئێستا، فەزا لول دەخوات یان پێچ دەخوات بە دەوری خۆیدا ئەمەش مانای وایە ناتوانیت لە فەزا دەربچێت. لەبەرئەوەی ڕێگەکەت دەتباتەوە هەمان شوێن کە لێیەوە دەستت پێ کردووە. بۆ ئەوەی ئەم بابەتە تێ بگەی ئەم نموونەیەت بۆ دەهێنمەوە : بیهێنە پێش چاوی خۆت فڕۆکەیەك لە نیویۆرکەوە دەفڕێت بۆ سان فرانسیسکۆ. بەرزیەکەی ٣٠٠٠ کیلۆ مەترە لە هەوادا. ئەوش لەبەر ئەوە زەوی کەوانەییە، فڕۆکەیەك ئەگەر بە هێڵی ڕاستدا بفڕێت، دوورتر لە زەویەوە دەفڕێت لە فەزادا.

لە فڕینەوە لە نیوێورك بۆ سان فرانسیسکۆ فڕۆکەکە ئاڕاستەیەکی کەوانەی وەردەگرێت. ئەگەر فڕۆکە کە بەو ئاڕاستەیەدا لە فڕین بەردەوام بوو، لە کۆتایدا دەگەڕێتەوە سەر زەوی. گەردوون ناسان باوەڕیان وایە فەزا چەماوە یان کەوانەییە بە جۆرێکی تایبەتی. بەڵام نەك وەکو کەوانەیی زەوی : ناتوانرێت وێنەیەکی لەسەر کاغەز بکێشرێت. یان ناتوانین وێنەیەکی لێ دروست بکەین. کەوانەی فەزا دەتوانرێت بە بەکارهێنانی حساباتی زۆر ئاڵۆز وێنە بکێشرێت. بەو جۆرە دەشێت

بۆ هەتا هەتایی بەدەوری زەویدا بسوڕێتەوە بێ ئەوەی لێ ی دوربکەوێتەوە.

## کیسەڵ لە ژێر ئاودا چۆن هەناسە دەدات ؟

زۆر لە کیسەڵەکان زۆربەی ژیانیان لە ئاوە سازگارەکاندا بەسەر دەبەن. دەشێت لە گۆماو گۆلاو و جۆگەکاندا بژین. بۆیە دێنە سەر ووشکانی تا خۆیان گەرم کەنەوە یان هێلکە دابنێن. بەلاّم کاتێك لە ناو ئاودان چۆن هەناسە دەدات ؟ کیسەڵەکان سییان هەیە و هەوا دەمژن، بەلاّم ئۆکسجین لە ئاودا وەرناگرێت. وەکو ئەوەی ماسیەکان دەیکەن. لەبەرئەوە دەبێت کیسەڵ پڕی سیی خۆی بکات لە هەوا تا بتوانێت لە ژێر ئاودا بمێنێتەوە. ناشتوانێت به جوولأنەوەی پەراسووەکانی ئەوە بکات وەکو خۆمان دەیکەین چونکە پەراسووەکانی نووساوە بە ئێسقانی پشتیەوە. بۆیە کیسەڵ بە جۆرێکی تر سییەکانی پڕ لە هەوا دەکات. دووکۆمەڵە ماسولکەی تایبەتی هەیە لە سکیدا هەریەك لەو کۆمەڵە ماسولکانە ئەندامەکانی تری لەش دەجوولێنێت و لە سیەکان دووری دەخاتەوە ئەو کۆمەڵە کەی تریش ئەندامەکان دەجولێنێتەوە بۆ ئەوەی لە سیەکان نزیك ببنەوە کەوا دەکات هەوا لێیانەوە دەرچێت هەناسەیەکی قوڵ بەشی چەند کاتژمێرێکی دەکات. هەندێك لە کیسەڵەکان چەند ڕۆژێك لە ئاوە سازگارەکاندا دەمێننەوە بێ ئەوەی دەرچنە دەرەوە. بۆیە دەتوانێت ئەوە بکات چونکە تۆزێك ئۆکسجین بە کاردەبات و لە بنی ئاوەکەدا خۆی دەهێڵێتەوە. ژمارەیەکی کەم لە کیسەڵەکان پەردەیەکی تایبەتیان هەیە لە قورگدا یان لە کۆمدا، کە لێیەوە پاشەڕۆکانی لاشەی فڕێ دەداتە دەرەوە. دەشێت ئەو پەردەیە یان کونە ئۆکسجین لە ئاوەکەوە وەرگرێت وەکو لە لوتی ماسیدا هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا کیسەڵ پێویستی بە دەرچونە دەرەوە هەیە بۆ وەرگرتنی هەوا. کیسەڵ مل درێژەکان دەتوانن بێ ئەوەی بێنە دەرەوە لە ئاو تەنها بەسەر دەرکردنێك ئۆکسجین خۆیان وەرگرن.

## پشتگیری كردنی دراو بە زێر.

دراو ئەو پارە كانزاییە یان پارچە كاغەزە چاپكراو نیە بەڵكو ئەوانە تەنها هێمایەكن كە نوێنەرایەتی شتێكی ڕاستەقینە دەكەن.
پارە دەبێت بە ڕێژەیەكی زۆر لە كانزایەكی بورز پشتگیری بكرێت لە لایەن ئەو حكومەتانەوە كە پارە دەردەكەن. پێوەری نرخی پارە كەلە هەموو دونیا ئێستا بەكاردێت یان زێڕ یان زیووە كە دوو كانزای دەگمەنن بەجۆرێك دەتوانن نرخی خۆیان بپارێزن. هێندەش زۆرن كەوا دەكەن بەس بن بۆ پێداویستی بازاڕ. بە واتایەكی تر. ئەو كاغەزو دراوە كانزاییانەی كە هەرحكومەتێك وەكو پارە دەری دەكات نرخێكی دیاری كراوی هەیە. لەبەر ئەوەی ڕێژەیەك لە زێڕو زیوو لەگەڵ خۆیدا هەڵ دەگرێت كە پشتیوانی لیّ دەكات. لە ساڵی ١٨٢١ دا بەریتانیای مەزن یەك كانزای كردە بنەما بۆ یاسا دراویەكەی ئەویش زێڕ بوو. لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٩١٤ دا زیڕ بوو بە پێوەر بۆ هەموو دراوەكان لە جیهاندا. دوای وەرگرتنی یەك پێوەر بۆ نرخ، وڵاتان بە ئاسانیەكی زیاتر بازرگانی لە نێوان خۆیاندا بكەن. دۆلاری ئەمریكی و فرنكی فەرەنسی و ماركی ئەڵمانی نرخێكی دیاری كراویان هەیە بەزێڕ ئەو نرخەش بە پێوەری زێڕ دەناسرێت. لەگەڵ ساڵی ١٩٣٣ دا زۆربەی وولاتان لە پێوەری زێڕ هاتنە دەرەوە. بەڵام زۆربەی دراوەكان لەوانەش دراوی وولاتەیەككرتوەكان تا ئێستاش پشت بەنرخی دیاری كراوی زێڕ دەبەستێت , تا ئێستاش زێڕ زۆر گرنگە لە بازرگانی نێودەووڵەتیدا، زۆر لە دەوڵەتان قەرزەكانیان بەزێڕ دەدەنەوە دەیكڕن و بەشێكی هەڵدەگرن. ئەو بەشەی هەڵی دەگرن پیّ ی دەوترێت یەدەك.

## چەقی زەوی.............. زۆر گەرمە.

زەوی لە سیّ چینی سەرەكی پێكدێت. توێكڵ، بەرگ، چەق. چینی سەرەوە توێكڵە كە لەبەردی زۆر ڕەق پێك دێت و ئەستوریەكەی لە ژێری كیشوەرەكانەوە لە نێوان ٣٥,٣٠ كیلۆمەتردایە. چینی دووەم توێكڵە كە قوڵیەكەی دەگاتە نزیكەی ٢٩٠٠ كیلۆ مەتر ئەم چینەش هەروەها لەبەردی زۆر ڕەق پێكدێت. بەشی

ناوەوەی زەوری کەپێی دەوترێت چەق نیوەتیرەکەی دەگاتە نزیکەی ٣٣٨٠ کیلۆ مەتر. لە ئەنجامی گەرمایەکی زۆردا، ماددەی چەق شلەیەو هەندێك لە زانایان وای بۆ دەچن، چەقێکی ناوخۆیی هەبێت لە کانزای ڕەق کە تیرەکەی بگاتە نزیکەی ٢٥٧٥ کیلۆ مەتر. بیردۆزەیەك هەیە لەسەر بنەچەکی زەوی کە دەڵێت : گێژاوێك بووە لە گازو تەم ومژ و هەندێك لەو گازە دەرچووە بۆفەزا. تەم و مژەکەش بەهۆی ڕاکێشانەوە یەکیان گرتووەو بووە بەو زەویە ڕەقەی ئێستا. چەند توخمێکی تیشك دەر چوونەتە ناو تەم و مژە ڕەقەکەوە و کەتیایاندا توخمێك هەیە بەبەردەوامی شیتەڵ دەبێت و گەرما بەرهەم دەهێنێت ئەو گەرما تیشکیە وردە وردە بوو بەهۆی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمای زەوی و تەم ومژەکەش لە ناوی زەویدا دەستی بە توانەوە کرد. ئینجا ماددە تواوەکە دەرچوو بۆ سەر ڕووی زەوی و گەرماکە کەم بووەوە و ئینجا سەر ڕووی زەوی ڕەق بوو تا سەرەتای توێکڵی زەوی پێك بهێنێت. پێشی نزیکەی سێ هەزار ملیۆن ساڵ. توێکڵی زەوی دروست بوو. بەلاَم زەوی لە ژێر ئەو توێکڵەدا هەر بە زۆر گەرمی مایەوە و ئەو گەرمایەی توخمە تیشك دەرەکان بەرهەمیان هێنا دەرنەچوو...

شاخی ئیڤەرست.......... بەرزترین شاخ نیە لەجیهاندا !!

## شاخ چیە ؟

شاخ بەشێکە لە سەر ڕووی زەوی، لە هەرچی دەوروبەری خۆی بەرزترە، شاخەکان لە سەختی و توشی قەبارەدا جیاوازن. هەندێکیان بەرزترییان چەند کیلۆ مەترەێکە و هەندێکی تریان زۆر کەم بەرزن.شاخ بەرزیەکەی لە ٣٠٠ مەتر کەمتر بوو پێی ناوترێت شاخ : هەندێك لە لوتکەی شاخەکان دابڕاون، بەلاَم زۆربەی جار یەك دەگرن بۆ ئەوەی زنجیرەیەکی شاخی پێك بێنن. هەندێك لە زنجیرە چیاکان سەدان بەڵکو هەزاران لوتکەیان هەیە. شاخ تەنها لە ووشکانیدا نیە، بەڵکو لەژێر دەریاکانیشدا هەیە. لە ڕاستیدا زەریا قوڵەکان هەندێك لە مەزنترین و بەرزترین شاخەکانی جیهانیان تێدایە ئەگەر ئیحجالی شاخێك بپێووین بەشی ژێرەوەی ناو دەریاکە دا لەگەڵ بەشی سەرەوەی دەریاکەدا دەشێت

ببێته بەرزترین شاخ له زەویدا. ئەویش شاخی (( ماوناکیا )) یەله دوورگەی هاوای. که ( ٤٢٠٥ ) مەتری لەسەر ڕووی دەریاوە و ( ٤٨٧٧ ) مەتری له ژێری ڕووی دەریاوەیە. بەوەش( ٩٠٨٢ )مەتر بەرزە که دەبێته بەرزترین شاخ له جیهاندا !!

بەڵام بەرزترین شاخ له ڕووی ووشکانی دا شاخی ئەڤەرەستە.له سنوری نێان نیپاڵ و چیندا.که بەرزیەکەی( ٨٨٤٨) مەترە. دووەم شاخی بەرز لەسەر ڕووی ووشکانیدا شاخی ( کەی ٢ ) ە که شاخی (( گاودین اوستن )) یشی پیێ دەڵێن له کشمیرە که بەرزیەکەی دەگاتە( ٨٦١١) مەتر. بەرزترین شاخ له ئەمریکای باکووری شاخی (( ماکینلی )) یەکه بەرزیەکەی ( ٦١٩٤) مەترە بەرزترین شاخیش له ئەورووپا شاخی (( ایلبرۆس )) ە له یەکێتی سۆڤێتی پێشوو که بەرزیەکەی دەگاتە ( ٥٦٣٣ ) مەتر. بەرزترین شاخیش له ئەفریقادا شاخی (( قلیمیا نجارۆ )) یە بەرزیەکەی دەگاتە ( ٥٩٦٣ ) مەتر. بەرزترین شاخیش له ئەمریکای باشوور دا شاخی ( ئاکۆ نکاغوا )) یە له نێوان ئەرجەنتین و شیلی که بەرزیەکەی ( ٦٩٦٩ ) مەترە. بەڵام بەرزترین شاخ لەئوستralیا شاخی ( کوسکلیو سکۆ ) یەکه بەرزیەکەی تەنها ( ٢٢٢٦ ) مەترە..

## زەیتی زەیتوون.

خەڵکی له دەنکی زەیتوونەوە زەیتی زەیتونیان دەست دەکەوێت. که له سەرداری زەیتوون دەڕوێت که دارێکی زۆر کۆنە له مێژوو دا.

یونانیە دێرینەکان ئەفسانەیەکیان هەبووە ووتویەتی داری زەیتوون خەڵاتێکە له خواوەندی ئەسیناوە. ( که ئەسینای پایتەختی یونان بەناوی ئەو خواوەندەوەناو نراوە ) سنووری شارەکانی یونان کاتی خۆی بەداری زەیتون دیاری کراوە. دار به نسبەتی یونانیەکانەوە هێمای ئازادی و ئومێدوو ڕەحمەت ونوێژ و پاکی و خاوێنی و پاسابووە له یاریەکانی ئۆڵۆمپیشدا چەپکە گوڵیان له گەڵای زەیتون دروست کردووە و داویانەتە یاری چیە براوەکان.

زەیتی زەیتوون له زۆر کۆنەوە بۆ چەندین مەبەست بەکارهێنراوە. پێش دۆزینەوەی سابوون دەوڵەمەندان له یۆنان و ڕوماندا بەزەیتی زەیتوون لاشەیان

چەور كردوه. لە وولاّتانى دەرياى سپى ناوەڕاستدا زەيتى زەيتوونيان بەمەبەستى چێشت لێنان بەكارهێناوه. لەسەردەمە كۆنەكاندا زەيتوونيان هاڕيويانەو دواى ئەوە زەيتوونە هاڕاوەكەيان كردوّتە پارچە پەڕۆيەكەوە و گوشيويانە و ڕۆنەكەيان لىٚ دەرهێناوه. بەلاّم ئەمڕۆ ئامێرى نوىٚ و هايدرۆليكى لە گرتنى زەيتى زەيتووندا بەكار دەهێنرێت كەزۆر بەپاك و خاوێنى بەرهەمى دەهێنێت. زەيتى زەيتوون لە نێوان ١٥بۆ ٣٠٪ كێشى دەنكە زەيتوونە گەيشتوەكە پێك دەهێنێت. ڕۆژێك لە ڕۆژان هەبووە پادشايان لە هەندێك شوێنى دوونيادا. حوكميان بە سامانەكەيانەوە كردووە لە ڕێگەى ژمارەى كوپە پڕ لە زەيتەكانى ناو كۆشكەكانيان..

## جەنگى پارتى زانى.........

جەنگى پارتى زانى هێزێكى نا نيزامى دەيكات، لە شەڕێكى بچووكدا. لەو زەويانەدا كە دوژمن داگيرى كردوه. بەم جەنگەش دەوترێت جەنگى پارتى زانى.
ئەم جەنگە بۆ يەكەم جار ىللينغتونى ئينگليزى بەكارى هێنا بۆ يارمەتى هێزە نا نيزاميەكان يان پياوانى چەتەى ئيسپانى و پورتوگاليەكان لە دەركردنى فەڕەنسيەكان لە نيمچە دوورگەى ئيبرريا دا. گرنگى شەڕى پارتى زانى لە ٢٠٠ ساڵى ڕابووردوودا جۆراو جۆر بووه.
دواى جەنگى جيهانى دووەم جەنگى پارتى زانى ڕۆڵێكى گرنگى بينى لەوەى كە بە (( شۆڕش گێڕى )) دەناسرێت. لە دواى جەنگى جيهانى دووەم شەڕى پارتى زانى دژى دوژمنانى زۆر وولاّتان بەرپاكرا. زۆر بە سەركەوتووى لە قبرص و كينيا و جزائردا بەكار هێنرا. لە سەرەتاى حەفتاكانى سەدەى بيستەم دا چالاكى پارتى زانى بەشێوەيەكى بەر فراوان هندى چينى گرتبووەوە لەوانە ڤێتنامى باشوورى ( لاوس، كمبۆديا، تايلاند ) هەروەها بەنگلادش و كوباش پەنايان بردەبەر جەنگى پارتى زانى. پياوانى پارتى زان، هێزێكى دەست وەشێنن، لە جلوبەرگدا نيزامى نين. چەك و تەقەمەنيەكانيان سادەن، زۆر جوڵەو لە شوێنێكى ديار كراودا جێگيرنين. تۆڕێكى زۆر لە جۆراو جۆر لە چەك بەكار دەهێنن. هەندێكيان خۆيان دروستى دەكەن. هەندێكيشى دەسكەوتە. هەندى سێەميش لە وولاّتە

دۆستەکانیانەوە دەستیان دەکەوێت. کەبریتی یەلەتفەنگ و نارنجۆك و مین و تەکتیکی ڕێکخستنی پیاوانی پارتی زان بەپێی پێداویستی دەست و شاندنەکەیان دەگۆڕێت. بە زۆری گروپەکانی پارتی زانی لەنێوان ٤ بۆ ١١ کەسدایە. وەڕەسترین لایەن لە جەنگی پارتیزانیدا پەنابردنە بەر تیرۆرە. وەکو کوشتنی کە سایەتیە گرنگەکان و تەقاندنەوەی ئۆتۆمبیلی مین ڕێژکراو لە ناو خەڵکیدا بەبێ جیاوازی پەنا بردنە بەر کاول کردن و تیرۆرو تۆقاندن. ئەوش بۆ ئەوە دەکرێت تا سەرنجی جیهان بۆلای دۆزی خۆیان ڕابکێشن یان بۆ ڕزگار بوونە لەسەرکردە نەیارەکانیان یان بۆ پەك خستنی چالاکیەکانی دەوڵەتی دوژمنە. پیاوانی پارتی زان هەموو کاتێك ناتوانن بجەنگن، دەبێت شوێنێکییان هەبێت تیایدا پشووبدەن و خۆیانی تیارێك بخەنەوە و چەکەکانیانی تیا مشت و ماڵ بدەنەوە ویان تەقەمەنی و جل و بەگیان دەست کەوێت. هەروەها دەبێت ناوچەیەکی سەلامەتیان هەبێت بۆئەوەی جەنگاوەرەکانیانی تێدا مەشق وپرچەك و ڕۆشنبیر بکەنەوە. لەسەرکردە ناودارەکانی جەنگی پارتی زانی ( جێ گیڤارا، لنین، تروتسکی، ماوتسی تۆنگ، جۆزیف برۆزتیتو، هۆشی مەننەو،............ هیتدیش.

## ئۆپێرا چی یە ؟

ئۆپێرا ووشەیەکی ئینگلیز و ووشەیەکی ئیتالی یەوە وەرگیراوە کەمانای (( کاری مۆسیقی )) دەدات. لە ڕاستیدا ئۆپێرا تێکەڵەیەکە لە مۆسیقاو دراما. واتە لە بنەما دا، دانروێکی درامی درێژە کە هەمووبەشەکانی بەهاوکاری ئامێری مۆسقی دەوترێت. لە ناوەڕۆکدا جۆرێکی کراوەیە لەسەر گەرم کردن...... بەدرێژای نزیکەی پێنج سەدە خەڵکی حەزیان لێ کردوە. بەسروشت زۆر ئاڵۆزە......... بەلأم سەرگەمیەکی موکلیفە. چیرۆکی ئۆپێرا گۆرانیەك دەگێڕێتەوە. کە لە ئەسڵدا پێ ی نوسرابێت بۆیە بەوردی گوێ لێ گرتنی و بەدواداچوونی زەحمەتە.

سەرتا ئۆپێرا لە ساڵی ١٥٨٢ دا لە فلورنسای ئیتاڵیادا سەری هەڵدا، کاتێك کلاسیکیەکان هەوڵیان دەدا دراما کۆنە یونانیەکان زیندوو بکەنەوە، کە بریتی بوو لە مۆسیقا و ووشە. یەکەمین خانەی ئۆپێرا ١٦٢٧ دا لە ڤینیسا کرایەوەو زۆربە

خێرایی لە ئیتاڵیاوە بڵاوبووەوە بەرەو فەڕەنسا و ئەڵمانیا ساڵی ١٦٥٠. بەڵام تاماوەیەکی درێژ نەبوبوو بە هونەرێکی میلی. وردەوردە ئۆپێرا بەوڵاتانی جیهاندا بڵاوو بووە وەکو (( نمسا، بەریتانیا، ڕوسیا، چیکوسلۆڤاکیای کۆن، حەجەر ( هەنگاریا ) بوولیندا، اسپانیا، ووڵاتە یەکگرتووەکانی امریکا و چین.))

ئەو ئۆپێرایانەی ئەمڕۆ، پیشان دەدرێن، لە دانانی موسیقیە بەرزەکانی جیهانە. لەوانە ڕسینی و فێردی (ایتالی) مۆزات ( نمساو ئەڵمانیا ) فاگنەر ( ئەڵمانیا ) غونووبیزیە ( فەڕەنسا) چایکۆفسکی ( ڕوسیا ) و غلینگاو بووروودین ڕیمسکار کارساکۆف (ڕوسیا ).

## چۆن مێرووەکان عەزیەتی مرۆڤ دەدەن ؟

لە سروشتدا جۆرەها مێرووی سودبەخش هەیە کەلەگەڵ مرۆڤدا دۆستن. بەڵام هەندێك مێروو هەن کە گاز دەگرن یان بە مرۆڤەوە دەدەن، مێرووی واش هەیە نەخۆشی دەگوێزێتەوە.

هەندێك مێروو زیان دەگەیەنن و دەبێت خۆمانیان لێ بپارێزین. لە نێوان مێرووەزیان بەخشەکاندا (( بێوەژنی ڕەش )) کە جۆرێك جاڵجاڵۆکەی ئەمریکیی ژەهرداره کەهەر لە کالیفورنیا تا شیلی هەیە )یان ناوچە شێدارو سێبەرەکاندا دەبینرێن. ژەهری بێوەژنی ڕەش ئازارێکی زۆر دروست دەکات و دەبێتە هۆی کرژبوونی ماسولکەکانی سك وزۆر لە قوربانیانی بێوەژنی ڕەش دەمرن !!

زۆربەی گازو پێوەدانی مێروەکان بۆماوەیەك ئەزیەتمان دەدەن. بەڵام مەترسیدار نین. هەندێك کەس زۆر هەستیارن بۆ ژەهری هەنگ و زەردەواڵە. بۆیە ئەگەر کەسێك پێوەی درا دەبێت سەردانی پزشیك بکات و دەرمانی تەواو وەرگرێت بۆ ئەوەی حەساسیەت لە گیانی دا دروست نەبێت. هەندێك لە مێشوولەکان میکرۆب هەڵدەگرن و دەبنە هۆی نەخۆشی وەکو زەردوویی و مەلاریاو نەخۆشی خەوتن ئەو میکرۆبەی کەدەبێتە هۆی نەخۆشیەکە میشوولەکە بە قاچی هەڵی دەگرێت دەیگوێزێتەوە بۆکەسەکەی پێوەی دەدات. ڕەشە گرانەتاو تا پەڵەنەخۆشی گەلێکن کەئەسپێ دەیان گوێزێتەوە نەخۆشی گەلێکی زۆر مەترسیدارن و ئەوکەسانە توشی دەبن کەلە شوێنەپیس و قەرەباڵغەکاندا دەژین. مەگەزیش

ڕۆڵێکی بالاْ دەبینێت لەکواستنەوەی نەخۆشیەکانی وەکو کۆلێرلو دیزانتری ( سك چوون ) و ئاوسانی جگەر و گرانەتا.

ئەم نەخۆشیانەش وەکو نەخۆشیەکانی تر کە مێشووله دەیگوێزێتەوەو بلاْوی دەکاتەوە ئەگەر پاك و خاوێنی ڕابگیرێت و بەرگری مێرووەکان بکەین لە زیادکردن ڕوونادەن.

## نوێلەکان چین ؟

ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا چەقۆ و قەیچی و گوێزشکێن و گسکی دەستی و هیتریش بەکاردەهێنین. ئەمانە هەموو بریتین لە ئامێرگەلێکی ساکار و بەم ئامێرە ساکارانە دەوترێت (( بەرز کەرەوەکانە )).

بەرز کەرەوە لە ڕاستیدا ئامێرێکی ساکارە کە دەتوانێت بە دەوری خاڵێکدا بسوڕێتەوە. ئەو خاڵەش پێی دەوترێت (( خاڵی جێگیربوون )) بەیارمەتی نوێلەکان دەتوانین سەرکەوینە سەر کێشێك یان مقاومەیەکی گەورە بە هەولْ یان هێزێکی کەم. سیْ گروپ لە نوێلْ هەن :

یەکەم و دووەم و سیْ یەم. هەریەك لەم جۆرانە سیْ خاڵی هەیە. ئەو خاڵەی کە نوێلەکە تیایدا ئازادە لە جولاْندا پیْ ی دەوترێت (( خاڵی جێگیربوون )) بەلاْم خاڵی دووەم لەو شوێنە دایە کە کێش یان مقاومە کاری خۆیانی تیادا دەکەن، ماوەی نێوان جێگیر بوون و کێش بە باڵی بەرزکرنەوە یان قورسایی دەناسرێت. ماوەی نێوان خاڵی جێگیربوون و خاڵی هەولْ بەباڵی هەولْ دەناسرێت.

بەپیْ ئەو سیْ خاڵەی کە باسمان کرد نوێلەکان دەبنە سیْ جۆرەوە :

جۆری یەکەم : ئەو نوێلاْنەن کە خاڵی جێگیر بوونیان دەکەوێتە نێوان هەولْ و قورساییەوە. بۆ نموونەی ئەم جۆرە نوێلە ( قەیچییەکان ) ئەو شوێنەی پەنجەکانمانی پێدا دەکەین خاڵی هەولە ئەو شوێنەش کە دەیبڕین خاڵی مقاومەیە. خاڵی چەقیش خاڵی جێگیربوونە نوێلەکان و جولاْنە و تەرازوو نینۆك بڕەکان نموونەی جۆری یەکەمی نوێلەکانن.

جۆری دووەم :کێش تیایدا دەکەوێتە نێوان خاڵی جێگیربوون و هەولْ نموونەی ئەوانەش ( تایەیی دەستی و گوێزشکێن ).

جۆری سێیەمیش لە نوێڵەکان هەوڵ دەکەوێتە نێوان کێش و خاڵی جێگیربوون وەکو گاسنەکان و موکێشەکان،
لەم سێ جۆرەدا دەشێت باڵی هەوڵ درێژ تربێت لە باڵی کێش. بۆیە تایبەتمەندیەکی میکانیکی گەورەتری دەداتێ.

## چۆن دەتوانین تیشکی خۆر بگۆڕین بۆ ووزەی کارەبا ؟

خۆر گەورەترین سەرچاوەیە بۆتیشك وگەرمایی و هۆی سەرەکیشە بۆبوونی ژیان لەسەر زەویدا. زانایان ئەمڕۆ لە هەوڵی ئەوەدان کارێك تەن زیاتر سوود لە وزەوی خۆر وەربگرن بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ. تاقیکردنەوەکان سەلماندوویانە کاتێك تیشکی خۆر دەکەوێتە سەر کانزاکانی وەکو پۆتاسو سلیکۆن........ هتد. ئەلکترۆناتەکان لەسەر ڕووی ڕاودەنێت. ئەو ئەلکترۆناتانەش بە ئەلکترۆنانی تیشکی دەناسرێن و دیاردەکەش بە دیاردەی (( کارە تیشکی )) دەناسرێت دەتوانین ئەو ئەلکترۆنە تیشکیە ڕاو نراوانە بەکار بهێنین بۆ بەرهەم هێنانی تەزوی کارەبا. دیاردەی (( کارۆ تیشکی )) بۆ دروست کردنی خانەی خۆری بەکار هێنراوە. خانەی خۆری لە ڕاستیدا ئەلەتێکە بۆ گۆڕینی وزەی خۆر ڕاستەوخۆ بۆ وزەی کارەبا. بۆ دروست کردنی خانەی خۆری پارچە پلێت لە توخمی سلیکۆن بەکاردەهێنرێت. بەشێوەیەکی گشتیی پارچە پلێتێك بەکار دەهێنرێت کە درێژیەکەی (٤) سم و پانیەکەی (٢)سم بێت و ئەستوریەکەی ١,٤سم بێت بۆ هەر خانەیەکەکی خۆری.کاتێك تیشکی خۆر دەکەوێتە سەر ئەو پلێتانە دەگۆڕێت بۆ ووزەی کارەبایی. هەرخانەیەکی خۆری دەتوانێت نزیکەی ١/٢ ڤۆلت لە کارەبا بەرهەم بێنێت. بۆبەرهەم هێنانی ڕێژەیەکی سوودبەخش لە کارەبا پێویستە ژمارەیەکی زۆر لە خانە خۆریەکان پێکەوە ببەستین بەهۆی پلێتی گەورەوە خانەکان چێکەوە پەیوەست دەکرێن و لە ژێرتیشکی خۆریدا دادەنرێن. دەتوانین پلێتی وا دانێن (٢٠) هەزار خانەی تێدا بێت تا(٥٠٠)واگ لە کارەبا مان دەست کەوێت. دەتوانین کاریبای بەرهەم هاتوو ڕاستەوخۆ بەکاری بێنین یان دوای ئەوە لە چارج کردنی پاتریە کارەباییەکاندا بەکاری بێنین. هەروەها لە دروست کردنی خانە خۆریەکاندا مەوادەکانی تری. وەکو گۆگردیتدی کادمیۆم و زەرنیخیدی

جاليۆم بەكاردێت. خانە خۆریەكان بەكارهێنانی جۆراو جۆریان هەیە.
لە شوێنە خۆریەكاندا، پلێتە خۆریەكان بۆ بەهێز كردنی هێماكانی تلفۆن بەكار دەهێنرێت. لەفەزا دا لەبەر ئەوەی بەرێژیەكی زۆر و سوود بەخشن لە تیشكی ڕۆژ هەیە بە شێوەیەكی تایبەت. بۆیەكە كەشتیە ئاسمانیەكان و تاقیگەكانی فەزا و مانگە دەست كردە بچوكەكان. ژمارەیەكی زۆر لە خانەی تیشكیان هەیە، بۆ ئەوەی ئامێرەكانی بلاْوكردنەوە و ئامێرە زانستیەكانی تری پێ پڕ ووزەكەن.
ئێستا زانایان لە هەوڵی ئەوەدان خانەی خۆری باشتر دروست بكەن.

## سپلیتەكان چۆن ئیش دەكەن ؟

سپلیت كە ئامێرێكە بەكارەبا ئیش دەكات، لەمالاْن و تاقیگە و كارگە و نوسینگە كاندا بەكاردێت، بۆ ئەوەی بەهاوین فێنكی بدات و بە زستانان گەرمی.سپلیت نەك تەنها تەحەكوم بە پلەی گەرماوە دەكات بەڵكو ڕێژەی شێش لەكەندا ڕێدەخات. ئێمە ئەمڕۆ چەندین جۆر و قەبارەی جیاواز سپلیت بەكار دەهێنین.سپلیتە گەورەكان دەتوانن بینایەكی تەواو فێنك یان گەرم بكەنەوە. سپلیتەكان بە شێوەیەكی گشتی پلەی گەرمای نێوان ٧٨,٦٨ پلەی فەرنهایت دەپارێزن لەگەڵ پاراستنی شێ نێوان٣٠ و ٥٠٪ سپلیت لە كومپرێسەرێك لەگەڵ هۆكارێكی سارد كردنەوە دا وەكو گازی فرێون. شلەی سارد كەرەوە كە لەناو لەفەیەك بوریدا هەڵم دەكات و هەڵمە كە دوای ئەوە دەچێت بۆ ناوی كۆمپرێسەرەكە، كە بە كارەبا ئیش دەكات و لە وپێشەوە بۆ چركەرەوە كە لەوێدا هەواكە یان ئاوە ساردی دەكاتەوە. كاتێك بە ڕادێتەرەكە دا تێدەپەرێت جارێكی تر هەڵمەكە دەبێتەوە بەشلە. و گەرما دەبەخشێت. ڕۆڵی كۆمپرێسەرەكە گواستنەوەی گەرمایەلە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر. پانكەكەش هەوای پاك دەداتە ئەو شوێنە و ئەمەش پلەی گەرمای ئەو شوێنە دەپارێزێت بەو جۆرەی حەزمان لێ یە. سپلیت هەندێك مەوادی دیاری كراوی تیایە كە شێی كەش دەگرێت هەروەها فلتەرەكانیش خۆڵ وتۆزی كەش دەگرن. بەم جۆرە سپلیتەكان تەحەكوم دەكەن بە پلەیگەرماو ڕیژەی شێ ودابین كردنی هەوایەكی پاكەوە بۆمان....

## دارِشته (( سبائك )) چیه؟

دارِشته تێكەڵەیەكە لە دوو مادده یان زیاتر بەلای كەمەوە دەبێت یەكێكیان كانزایی بێت  هەموو دارشتەكانی نزیكەی لەو توخمانە درووست دەكرێن كە پێكەوە دەگونجێن. مرۆڤ هەرلە كۆنەوە كەمێك لە دارِشتەكانی ناسیوە وەكو مسی زەرد و برۆنز. كانزا پاكەكان زیاد لە پێویست نەرمن بۆ مەبەستی بەكارهێنان. دەتوانین هێز وتوانای بۆ راكێشان ورەقی و توانەوە و رەنگە كەی بە تێكەڵ كردن لەگەڵ كانزایەك یان چەند كانزایەكی تردا دیاری بكەین. بۆنموونە ئەلەمنیۆم پاك وسوك و لاوازە، بەلاّم دارِێژراوەكەی بەهێز تردەبێت ئەگەر مس ومەگنسیۆمی بۆ زیاد بكەین. هەروەها مس و قەلاّیی دووكانزای لاواز ونەرمن بەلاّم ئەگەر بە یەكەوە دایان رِێژین بەهێز دەبن. مسی زەردی دارێژراو لەمس و زنك دارِێژراوێكی بەهێز و  بەسودە.قورقوشم دا دەرِێژرێت لەگەڵ قەلاّیی دا بۆ جۆشكاری كانزاكان. تایبەتمەندی دارِێژراوەكان باشترە لە كانزاكان لە بەرامبەر رزین و ژەنگ هێناندا. گرنگترین دارِێژراوی ئەمرۆ(( پۆلاّیە )) كە بۆ جۆرەها كەرەستەی جیاواز بەكاردەهێنرێت. دارِێژراوەكانی (( مس _ نیكل _ برۆنز _ ئەلەمنیۆم )) لە پیشەسازی دراودا بەكاردێت. لەگەڵ پیشەسازی زێرو كەشتی و دروستكردنی فرۆكەدا. دارێژراوی قورقوشمیش لە پیشەسازی جەمسەرەكانی پاتریدا بە كاردێت، لەوحیش لە پیشەسازی ئۆتۆمبیلدا، نیكل و زیوو لە دارِشتی مس داو نیكل و زنك لە پیشەسازی كەرەستەی نان خواردندا بەكار دەهێنرێت دارِشتن گرانبەها كانیش وەكو پلاتین و زێر و زیوو لە پیشەسازی خشل دا. بەو جۆرە دەبینین دارِشتەكان چەند بەسوودده بۆمان....

## هۆی هەڵگیرسانی شۆرِشی رِوسیا چی بوو؟

لە سەردەمی نۆزدەهەم دا زۆربەی كیشوەری ئەروپا ژیانیان لە نائارامی كۆمەلاّیەتی و ئابووری و رامیاری زۆر دا دەبردە سەر.فەرەنسا بۆكۆماری و بەریتانیاش بۆشانشینێكی دەستوری. ئۆروستوكرایەتی دەرەبەگی لە حاڵەتی لەناوچوندا بوو. پیشەسازان و بازرگانان بوبونە دەسەلاّت داری تازە. بەلاّم تا

**ئەوكاتە ڕوسیا هەرلە ((سەردەمی كۆن)) دا دەژیا. لە ژێر حوكمی دكتاتۆری قەیسەردا. جوتیاران**

**و كرێكاران لەو پەڕی چەوساندنەوە دا بوون. وەكو كورد دەڵێت بەسكێك تێروبە دەسك برسی بوون. بە هۆی نەبوونی چینی ناوەڕاستەوە بۆ یە پیشەسازی لەڕووسیا دا لەپاش بوو. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا سەرمایەدارانی ڕوس لەگەڵ بەرهەم هێنەرانی بیانیدا ركەبەریان كرد لەڕێگەی كەمكردنەوەی ڕۆژانەی كرێكارانەوە. كە بووە هۆی چەرمەسەری و بەدبەختی زیاتری كرێكاران. كرێكاران كەمترین ماف سیاسی یان نەبوو لەگەڵ نەبوونی هیچ هۆیەك بۆجێ بەجێ كردنی داواكاریەكانیان. قەیسەری نیقولای دووەم كەشۆڕش لەسەردەمی ئەودا هەڵگیرسا هێشتا بڕوای بەحەقی خوایی بۆ پادشایەتی خۆی هەبوو. وەمومارەسەكردنی حوكمی بەشێوەیەكی ڕوها بەئەركێكی پیرۆزدەزانی. تەنها لایەنگری دەوڵەمەندان و پیاوانی پایە بەرزی ئاستی بوو. هەرچی دانیشتوانی تری ئەمپراتۆریەتی ڕوسیا هەبوون هەموویان دوژمنی بوون. ئەوبیروكراتیەی قەیسەر دروستی كرد بوو زۆرسەخت و قورس ونا بەرامبەر بوو. دامەزراندنی پیاوانی دەوڵەت لەسەر بنەمای ئیمتیازات بونەك لەسەر بنەمای تواناو دڵسۆزی. امپراتۆریەتی ڕوسیا ڕوبەرێكی فراوانی لە ئەورووپا ئاسیا داگیركردبوو. زمانی ڕسیان سەپاند بەسەر خەڵكیدا بەوەش گۆڕانگارییان لەڕۆشنبیری خەڵكیدا دروست كرد. كەبوبەهۆی دروست بونی كێشەوناكۆكی لەنێوان قەیسەری ڕوسیا وهێزە داگیركەرەكانی تردا. كرێكاران و جوتیارانی بەش خوراو ڕێنومایيە سۆشیالیستسەكانی ماركسیان وەرگرت ولەساڵی ١٩١٧دا دژی دەسەلأتی قەیسەری دووەم شۆڕشیان كرد. كەهێزی سوپا فەرمانەكانی قەیسەریان جێ بەجێ نەكرد بەتەقەكردن لەشوڕشگێران هەرچی دام و دەزگای دەوڵەت هەبوون هەموویان ڕوخان. لە ٢١ ئازاری ١٩١٧ سانت بیترسبورگی پایتەخت. كە دوای ناوی لێنرا بیتروگرادو ئینجا لینینگراد،كەوتە دەستی شۆڕشگێران. هەرزو شۆڕشگێران كۆنترۆڵی مۆسكۆیان كرد. قەیسەر لەسەر كورسی حوكم دابەزی. لینین بویە پیاوی یەكەم. بەسەركردایەتی لینین پارتی بەڵشروی، سیاسەتی**

دیاری کراوی خۆی دانا بۆ کۆتایی هێنان بەجەنگی جیهانی یەکەم وگواستنەوەی زەویەکان بۆجوتیاران. ئەم شۆڕشە حکومەتێکی بۆکرێکاران دروستکرد. دوای ئەوە ڕوسیا پێشکەوتنێکی بەرچاوی لەبوارەکانی کشتوکاڵ وپیشەسازیدا بەخۆیەوەبینی.

## ڕێژەی کوڕان بۆکچان لەجیهاندا چەندە؟

ڕێژەی لەدایك بوونی کوڕان لەدوونیادا٥١٪، بەڵام لەکۆمەڵگای ڕۆژئاوای پیشەسازیدا تائەندازەیەك ژیانی کچان باشترە. لەبەرئەوە ڕێژەکە یەکسان دەبێتەوە لەتەمەنی باڵغ بووندا. بەڵام دوای تەمەنی ٥٠ ساڵ ڕێژەی ژنان تۆزێك زیاتر دەبێت لەڕێژەی پیاوان لەوکۆمەڵگایەدا.

## دڵی مار لەکوێدایە؟

کەسەیری مار دەکەین تەنها گیاندارێکی درێژی لاواز دەبینین کەقاچی نیە وەکو سەروکلك بەیەکەوە نوساونن هیچی ترنیە! بەڵام لەنیوان سەروکیلکدا لاشەیەکی درێژێکی زۆر ئاڵۆزە هەیە. مار بڕبڕەی پشت و کۆئەندامی هەرس وجگەرو دڵشی هەیە. لەگەڵ ماسولکە و لوو هەرچی ئەو ئەندامانەی لەزۆربەی گیاندارە بڕبڕەدارکانی تردا هەیە. سیفەتی جیاواز لەماردا ئەوەیەکە قاچی نیە. لەگەڵ سیفەتێکی تردا کەپێڵوی چاوی نیە. کەئەو بینینە جێگیرە دەداتە مار. زۆربەی مارەکان لەیەك سی زیاتریان نیە. لەئەنجامی ئەوەدا بوارێکی زیاتر هەیە بۆئەندامە ناو خۆیەکانی تری لەولاشە لاوازەیدا. بەڵام ماری (( ئاسلە)) وهەندێك لەمارەکانی تر دوسییان هەیە. مار هیچ گوێیەکی نیە لەدەرەوەی سەر. بەڵام لەڕێگەی زەویەوە زۆرهەستیارە بۆلەرینەوەکان واتە هەستگەلێکی هەیە قەرەبوی هەستی بیستنی دەکاتەوە. زۆربەی مارەکان دەتوانن بەشێوەیەکی باش ببینینن. لەماوەی جوڵەکانیانەوە نێچیرەکان دەبینن نەك لەڕێگەی شێوەو ڕەنگیانەوە. مارهەستێکی بۆنکردنی زۆربەهێزی هەیە. لەڕێگەی بۆنکردنەوە دەتوانێت دۆست و دوژمنەکانی لەیەك جودا بکاتەوە. مار دەتوانێت تەنۆکە بچووکەکان یان هەرتەنێکی تر لەهەواو زەویدا وەرگرێت چونکە هەندێك ئەندامی تایبەتی هەیە

بەهەستی کمیاوی دەتوانێت تەنۆکە کمییایەکان لەیەك جودابکاتەوە کەدوژمنە یان دۆستە یانخواردنە یان هەرشتێکی ترە.

## بۆچی چاومان دەپرتێت؟

پرتاندنی چاو بەبێ وەستان، شتێکی خۆرسکەو زۆر بەدەگمەن بیری لێ دەکەینەوە. وەکو ڕێژەیەکی مام ناوەندی لەشەش چرکەدا چاومان یەك جار دەپرتێت. ئەمەش مانی وایەلە ماوەی ژیانی هەریەکێکماندا ٢٥٠ ملێون جار چاومان دەپرتێت.

ئایادەزانن بۆچی چاومان دەپرتێت؟

کاتێك چاو دەپرتێت پێڵوەکان بۆسەرەوەو خوارەوە دەجولێنەوە. لەژێر پێڵوەکانی سەرەوەدا ژمارەیەك لوی فرمێسکی هەن. کاتێك پێڵوەکان دادەخەنین، لوە فرمێسکسەکان دەست بەڕژاندنی شلەیەکی سوێردەکەن. ئەوشلەیە دەبێتە هۆی ووشك نەبونەوەی چاوەکان. کاتێك ئەولوانە بەڕێژەیەکی زۆرئەو شلەیە بڕژێنن ئەوە فرمێسك دوست دەکەن. لوەکانی فرمێسك ڕۆژانەنزیکەی ٧٥٪ بۆ ١,١گرام لەوشلەیە دەڕژێنن. کەناری چاو ئالیەتێکە بۆپاراستنی کاتێك شتێك دەکەوێتە چاوەوە، شلەی ڕژاو دەست دەکات بەچۆردن و دەرکردنی ئەوشتە. هەروەها کەناری چاو، چاولەتیشکی زۆر درەوشاوە دەپارێزێت.کەتیشکەکە تیژبوو پێڵوەکانی چاو لەخۆیانەوە دادەخرێن، بەوەش نایەڵن تیشکەکە بچێتە تۆڕی چاوەوە چونکە تیشکی تیژ زیان بەچاو دەگەیەنێت. بەوجۆرە کەناری چاو، چاوبەتەڕی دەهێڵێتەوەو دەیپارێزێت لەمەوادە زیان بەخشەکان و تیشکی بەهێز.

## هەندێك لەترشیەکان دەبنە هۆی سوتان.

ترشیەکان مادەیەکی ترشن، گەڵای گوڵەبەڕۆژە سورهەڵدەگەڕێنن. کارلێك دەکەن لەگەڵ کانزاگەلێکی دیاری کراوداو ئۆکسجین دەردە دەن. لەگەڵ (تفتیە) کاندا کارلێك دەکەن بۆئەوەی خوێکان دروست کەون وبێتەهوێ کارلێك گەلێکی کمیاوی دیاری کراو. دووگرووپی سەرەکی کمیاوی هەیە لەترشیەکان، ئەوانیش ترشی نائەندامیەکان و ترشە ئەندامیەکانن. ترشە ئەندامیەکان کاربۆنی تێدایە.

کەلەنائەندامیەکاندانیە. هەمووترشیەکان بەشیتەڵ بوونی لەئاودا (ئایۆنات) ئۆکسجین دەردەدات. ترشی هایدرۆلیك. ترشی نەتریك و ترش کبریتۆز. نموونەی ئەو ترشیەنائەدامیانەن. هەروەها پێیان دەوترێت ترشی کانزای. کەزوربەهێزن. ترشی نەملیك. ( فورمیك) وترشی خەلیك وهیتدیش........ترشی ئەندامین ولەترشیە نائەندامیەکان لاوازترن. زۆربەی ترشیە ئەندامیەکان، زیانمان پێ ناگەیەنن. بەلآم ترشیە نائەندامیەکان دەشێت مەترسیداربن. ترشیە نائەندامیە خەستەکان دەشێت پێست بسوتێنێت یان بریندار بکات.

هەندێك ترشی لاشە دەسوتێنێت؟

ترشە نائەندامیەکان توانای مژینی ئاویان هەیەلەگەڵ ڕێژەیەکی زۆر لەگەرمادا. لەئەنجامی کرداری مژیندا. لەبەر ئەوەی زۆربەی خانەزیندوەکان ئاوی تێدایە. ترشیە بەهێزەکانی وەکو هایدرۆلیك ونتریك و گۆگردیك کارلێك دەکەن و خانەکانی لاشە دەکوژن ودەبێتە هۆی سوتانێکی زۆر. لەگەڵ ئەوەدا ترشیەکان پیست دەسووتێنن، بەلآم زۆر پێویستن بۆلاشە. گەدەی مرۆڤترشی هایدرۆلیکی کالکراوەی تیدایە کەیارمەتی هەرس کردنی خواردن دەدات. هەروەها ترشی (ئەمینی) پێویستە بۆهەموو جۆرەکانی ژیان. ئێمە بۆئەوەی لەژیاندا بمێنینەوە پێویستمان بەهەشت ترشی ئەمینی تایبەت هەیە. هەروەها ترشیەکان گرنگیەکی زۆریان هەیە لەپیشەسازیدا، سالآنە ملیۆنەهاتەن لەترشی گۆگردیك (تێزاب) دروست دەکرێت. کەبۆ جۆرەها مەبەستی پیشەسازی بەکاردێت ئەوترشیە سوری ژەنگ لەسەر ئاسن لادەبات. ترشیەکان لە پیشەسازی پەینی کمیای و ڕەنگ وپلاستیکدا بەکاردێت. (( ئاوی پاشایەتی )) تێکەڵەیەکە لەترشی نەتریك وترشی هایدرۆلیك، لەپیشەسازی زێروپلاتین دابەکاردێت. ئەوکەسانەی هەڵسوکەوت لەگەڵ ترشیەکاندا دەکەن، زۆربە ووریایەییەوە دەجولێنەوە و دەبێت جلو بەرگی تایبەتی لەبەربکەن بۆئەوەی لاشەیان لەسوتان بپارێزن. دەبێت ترشیەکان زۆر بەهێواشی بڕژێنرێتە ئاوەوە. ناشبێت ئاو بڕژێنرێتە ناو ترشیەکانەوە. کەتوشی سوتان بوبێت بەیەکێك لەترشیەکان دەبێت شوێنەکەی ئاوێکی زۆر بشوێت و دوای ئەوە((گیراوەکە)) نەوشاتر بەکاربێنییت، ئەگەر ترشیەك چووە چاوتەوە

دەبێت خێرا بەئاو بشۆرێت و دوای ئەوە گیراوەی دووەم ئۆکسیدی صودا بەکاربێنیت.

## مانگی دەست کردی پەیوەندیەکان چییە؟

لەسەردەمی کۆندا خەڵکی وا ڕاهاتبوون بەلێدانی پەیوەندی بەیەکترەوە بکەن، لەوسەردەمە کۆنودا و لەغیابی زانست دا، زۆرگران بوو. نامە بنێرێت بۆشوێنە دوورەکان. بەلأم ئەمڕۆ جۆرەها هاوکاری پەیوەندی کردنمان هەیە وەکو مۆبایل، تەلەفۆن ئیستگە و تەلەفیزیۆن ورۆژنامەو..........هتد.

سەرتای هۆیەکانی نویٚ پەیوەندی کردن دەگەڕێتەوەبۆ ١٥٠ ساڵی ڕابردوو. بەلأم لەئێستا دا زانایان توانیویانە مانگێکی دەست کرد بۆ پەیوەندی دروست بکەن. بەهۆی تلفون و تلفزیۆنەوە، پەیامەکان بنێرێت بۆ دورترین جێگە. مانگی دەست کرد ئامێرێکە کەمرۆڤ دروستی کردووە و بەهۆی موشەکێکەوە لە خولگەیەکدا دادەنرێت بەدەوری زەویدا. مانگە دەست کردەکە دەنێردرێت بۆ بەرزاییەك کەپەسەند بێت پێش ئەوەی دەست بکات بەخولانەوە بەدەوری زەویدا. ئەو ڕێگایەی کەمانگە دەست کردەکە پێیدا دەڕوات پیٚ دەوترێت ((خولگە)) دەشێت خولگەی مانگە دەست کردەکان بازنەیی یان هێلکەیی بن. مانگی دەست کرد لەئامێرێکی وەرگر و نێرەر پێکدێت. ئەو ڕێنومایانەش دەگاتە ئامێری وەرگر بەهۆی مکبەرەیەکەوە گەورە دەکرێتەوە. بۆدەست خستنی ووزە. ئەوئامێرە چەندین جۆری جیاواز لەخانەی خۆری بەکار دەهێنێت کەهەڵدەستێت بەگۆڕینی وزە خۆریەکە بۆ ووزەی کارەبایی. لەمانگە دەستکردەکاندا کەناڵی جیاواز هەیە بۆ هێماکانی تەلەفۆن و تلفزیۆن سەرەتا هێماکە دەنێرێت بۆمانگە دەستکردەکە بەهۆی شەپۆلی بەرزی زۆر ووردەوە. هەواییەکی جێگیر لەمانگەکەدا وەری دەگرێت. دوای گەورە کردنەوەی ئەو شەپۆلانە. ئامێرەکە بەهۆی ئامێرێکی بەهێزکەرەوە دەنێرێت. بەم ڕێگەیە هێماکان دەتوانن بۆدووری هەزاران میل بنێرێت. ئەگەر بمانەوێت ئەونامانە بەهۆکارە تەقلیدیەکان بنێرین، پێویستمان بەهەزاران میل لەسیم هەیە. ئەمڕۆ وبەیارمەتی مانگە دەستکردەکان، قسەکردن ونامەکان ووەرگرتنیان لەزیاتر لە١٥٠ ولأتی جیهاندا بەهەوایی دەنێرێن.

لەڕاستیدا چیرۆكی مانگە دەستكردەكان لەساڵی ١٩٤٥ وە دەستی پێكرد. كاتێك هەندێك هێما بەشەپولی ورد نێردرا بۆمانگێكی دەستكرد، ڕووی مانگە كەش پێچەوانەی كردەوە بۆئەوەی دووبارە لەسەر ڕووی زەوی وەربگیرێت. دوای ئەوە وولآتە یەككگرتوەكان ((ایكو_١, ایك_٢)) لەساڵی ١٩٦٠ داهەڵدرایە ئاسمان. بەلآم وەرگرتنی لەسەر زەوی زۆر لاواز بوو. لەساڵی١٩٦٢((تلستار)) بوویەیەكەم مانگی دەستكردی پەیوەندی كەبەسەر زەریای ئەتڵەسیدا وێنەی تەلەفزیۆنی نارد هەرخولێكی بەدەوری زەویدا ١٥٨ خولوكی دەخایاند. بۆیە وێستگە زەمیینیەكان ناچاربوون بەدوای دا بكەڕێن. وەكو چۆن هەندێك جار پچرانی تێدا دروست دەبوو.

بەهەڵدانی ((سینكۆم_٣)) لەساڵی ١٩٦٤دا، زاڵ بوون بەسەر ئەم كۆسپەشدا. كەمانگێكی دەست كردنی جێگیر بوولە سەرزەوی. دوای ئەوە بەرنامەكانی ((ئەنیتلسات)) هاتەبونەوە.

((ئەنیتلسات_١)) تەنها(٤٨٠) كەناڵی تەلەفونی ویەك كەناڵی تەلەفزێونی لەخۆدەگرن.

بەلآم لەبەرنامەكانی ((ئەنیتلسات)) دا ئەم ژمارەیە بەرز بووەوە بۆ(٣٠) هەزار كەناڵی تەلەفۆنی و١٢كەناڵی تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ.

تاساڵی ١٩٨١تەنها پێنج ولآت مانگی دەستكردی تایبەت بەخۆی هەڵدابوو. كەئەوانیش وولآتەیە كگرتوەكان ویەكێتی سۆڤێت وكەنەداو ئەندۆنیسیاو یابان بون. هندیش لە ١٩٨٤/٤/١٠ بەهەڵدانی ((ئەنیتلسات))چوە ڕیزی ئەو ولآتانەوە. لەچەند ساڵی ڕابردوودا بازدانی زۆرخێراكرا لەبواری پەیوەندیەكاندا بەهۆی مانگە دەستكردەكانەوە. زانایان لەئێستادا سەرقاڵی پێشخستنی تەكنۆلۆژیایەكی وان، كەوابكات لەو مانگانە هەزاران كەناڵی تەلەفزیۆنی و ملیۆنەها كەناڵی تەلەفونی خۆبگرن.

## لێك خشاندن چیە؟

زۆرجار دەبینین كەگۆیەك گلۆربونەوە دوای ماوەیەك دەوەستێت. بەو ڕێگەیە هەمان شت شتەكانی تریش لەخۆیانەوە دەوەستنەوە.

ئایا دەزانن بۆچی ئەوە ڕوودەدات؟

هەمووتەنێکی جوڵاوە هێزێك پەرچی دەداتەوە پێی دەوترێت هێزی لێکخشاندن. کاری لێکخشاندن هەمیشە دژی ئاڕاستەی جووڵە ئیش دەکات. هێزەکەشی لەسەر زبری ڕووی گەیەنەرەکە دەوەستێت. نەك لەسەر ڕووبەری شتە گلۆربوەکە.

لێکخشاندن دووجۆرە:

لێکخشاندنی خزان ولێکخشاندنی گلۆربوەوە.

بەهۆی لێکخشانەوە، خراپ بوون ولەناوچون لەهەندێك شوێنی تەنەگلۆربوەکان دا دروست دەبێت، پلەی گەرمای ئامێرەکان بەرز دەبێتەوە لەئەنجامی لێکخشاندنداو ڕێژەیەکی زۆر لەوزە بەزایە دەچێت. بەهۆی لێکخشاندنەوەیە تایەی ئۆتۆمبیلەکان دەتەقن. زەیتی چەورکردن بۆدابەزاندنی هێزی لێکخشاندن بەکاردێت.

لێکخشاندن زۆر بەسودە ئەگەر لێکخشاندن نەبایە، هیچ ئۆتۆمبیلێك نەی دەتوانی بڕۆشتایەو، نەبرێکە کانیش برێکیان دەگرت، تەنانەت نەمان دەتوانی پێنوسێك بگرین وپیێ بنوسین. ئەگەر لێکخشاندن نەبوایە تەنانەت یەك ماڵت نەدەبینی لەسەر ڕووی زەویدا. چونکە بەردەکان یەکیان نەدەگرت وبەسەریەکەوە نەدەوەستان.

## بزوتنەوەی دیدەوانی کەی دەستی پیێ کرد؟

لەساڵی١٩٠٣ بزوتنەوەی دیدەوانی دروست بوو. دوای بڵاوبوونەی کتێبێك بەناونیشانی ((چالاکی دیدەوانی بۆکوڕان)). ئەم کتێبە لەدانانی ((ڕوبرت بادون باوڵ)) بوکە لەوکاتەدا سەرپەرشتیاری گشتی سوارە بوولە سوپای بەریتانیادا بەپلەی موقەدەم.

ئامانجی سەرەکی دانەر، دانانی بنەماو ڕێنومایەکان بوکە لەوکاتەدا ڕێکخراوە خوێندکاریەکان لەسەری دەچون. لەڕاستیدا دەوترێت باودل باوکی بزوتنەوەی دیدەوانیە.

بادوڵ چادرگەیەکی تاقیگەیی لەدوورگەی بروانسی ڕێکخست لەبەندەری پۆڵ لەدورست. هەرچی بیروکەی هەبوو هەمووجیێ بەجیێ کرد. بیروڕای وابو کوڕان لەڕێکخراوی بچوکدا خۆیان ڕێکخەن کەهەر گروپێکیان بریتی بێت لەشەش یان

حەوت کەس ویەکێك ببێت بەسەرکردەیان بڕوای وابو مەشق کردنیان دەبێت زانیاری زیاتر بخاتە سەر زانستیان وەك نەخشەکێشان، فێربوونی هێماکان. فریاکەوتنی سەرەتایی، ئەو کارامەییانەی کەپێویستن لەسەر بازگەو غەیری سەرباگەدا. چونکە گرنگیەکی زۆری هەیە بۆپشت بەخۆبەستن. هەرکوڕێك دەبێتە دیدەوان ئەگەر بچێتە ناو تیمی دیدەوانیەوە لەتەمەنی ١١بۆ١٦ ساڵی. ئەگەر قبوڵی کرد ببێتە دیدەوان دەبێت سوێند بخوات، کەئەرکەکانی لەبەرامبەر خواو وولات وخەڵکیدا بەجوانی ودروستی جێ بەجێ بکات ولەهەموو کاتێکدا یارمەتی خەڵکی بدات ومل کەچی یاساکانی دیدەوانیبێت. کە بریتین لە:

١_ دیدەوان دەبێت جێ باوەڕبێت.

٢_ دیدەوان دەبێت دڵسۆزبێت.

٣_ دیدەوان دەبێت خەڵکی خوش بوێت وماف وهەستی خەڵکی ترلەبەر چاو بگرێت.

٤_ دیدەوان دەبێت برای هەموو دیدەوانەکانی تربێت.

٥_ دیدەوان دەبێت بەجەرگ وئازا بێت لەبەرەنگار بوونەوەی هەرچی ناڕەحەتیەکاندا.

٦_ دیدەوان دەبێت سود لەکارەکەی وەربگرێت وگرنگی بدات بەموڵك ومالی خەڵکانی تر.

٧_ دیدەوان دەبێت رێز لەخۆی وخەڵکی تریش بگرێت.

لەچالاکیەکانی دیدەوانی، رێ ڕۆشتن، سازدانی چادرگە ودیدەوانی، جگە لەچالاکیەکانی تری وەکو بەکارهێنانی بێ تەل، پەڕینەوەلە( ڕێگوزەرەکان)، خلیسکان بەسەر بەفروئاو هتد.

ئەمڕۆ بزوتنەوەی دیدەوانی نزیکەی ١٤ملیۆن ئەندامی هەیەلە ١٥٠وڵاتدا. لەبەر ئەوە بزوتنەوەیەکی جیهانیە، لیژنەیەکی جیهانی هەیە بو دیدەوانی کەبریتیە لە(١٢) کەس کەنوێنەرایەتی ١٢ وولات دەکەن. کەکۆنگرەی جیهانی بۆدیدەوانی هەڵیان دەبژێرێت. ئەم کۆنگرە گشتیە بۆدیدەوانی جیهانی هەر دووساڵ جارێك دەبەسترێت.

## دەریایی سپی ناوەڕاستی شین.

ئێمە دەزانین ٧١٪ ڕوی زەوی بەئاوی زەریاکان داپۆشراوە. سێ زەریای سەرەکی هەیە، ئەتڵەسی، باسیفیکی، هندی. زەریای بەستوی باکوری بەشێك لە زەریای ئەتڵەسی دادەنرێت. وزەریای بەستوی باشوریش بەبەشێك لەبەشەکانی باشوری زەریاکانی تر دادەنرێت.

زەریای ئەتڵەسی قەبارەیەکی گەورەی ئاوە. ئوروپا وئاسیا لەئەمریکا جودا دەکاتەوە. شێوەکەی لە کاتژمێرێکی گەورەی لمی دەچێت. کەتیایدا ئەفریقیا و ئەمریکای باشوری دەردەکەون. لەگەڵ ئەوەی ڕووبەری ئەتڵەسی لەنیوەی ڕووبەری باسیفیکی کەمترە، بەلأم دەریای زۆری لیٚ دەبێتەوە وەك زەریای بەستوی باکوری ودەریای سپی ناوەڕاست. یەکێك لەڕاستیە سەر سوڕهێنەرەکان سەبارەت بەدەریای سپی ناوەڕاست وزەریای ئەتڵەسی. ئەوەیە دەتوانرێت بەوشوێنەدا ئاوەکە یان لەیەك دەدەن جیاوازی بکەین لەنێوانیاندا. لەبەر ئەوەی ئاوی سپی ناوەڕاست شینە وبەلأم ئاوی ئەتڵەسی سەروزە.

ئایا هۆی ئەوە دەزانن؟

دەریای سپی ناوەڕاست دەکەوێتە نێوان باشوری ئۆروپاو ئەفریقیاو باشوری ڕۆژئاوای ئاسیاوە. لە(تەنگەی شاخی گارقی بەر تەسك) دەگاتە زەریای ئەتڵەسی. لە ڕۆژئاواوە ولەلای ڕۆژهەلأتیشەوە لەڕێگەی دەریای مەرمەرەوە پەیوەست دەبێتە دەریای ڕەشەوە. ڕەنگە جیاوازەکانی دەریای سپی ناوەڕاست وزەریای ئەتڵەسی بەشوەیەکی بنەڕەتی لەسەر ڕێژەی ئەو تیشکی خۆرە بوەستێت کەدەکەوێتە سەریان، ڕەنگی خۆرەکەش لەسەر مەوادە تواوەکانی دەریاکە دەوەستێت. لەهەر حەوت ڕەنگەکەی خۆر لەبەر ئەوە ڕەنگی شین لەهەموویان زۆرتر پێچەوانە دەبێتەوە بۆیە زۆربەی دەریا وزەریاکان بەڕەنگی چاو دەدەن.بەلأم سەبارەت بەزەریای ئەتڵەسی، لەبەر ئەوە ڕوەکێکی زۆری سەوز ڕەنگ لەبنەکەیە، کاتێك ئەم ڕوەکانە شیتەڵ دەبن ودەرزێن. ڕەنگە زەردەکان دەچن وشیتەڵ دەبن لەئاودا وئاوەکەش تیشکی شین وزەرد بلأودەکاتەوە. ئەم دوو ڕەنگەش کەتێکەڵ دەبن ڕەنگێکی سەوز بەرهەم دێنن.

## كارى قەد لەڕووەكدا چيە؟

ئەو بەشەيە لەڕووەك كەلەسەر ڕووى زەوريەوە دێتەدەرەوە. ئەم پێناسەيە بەسەر هەموو ئەو ڕووەكانەدا جێ بەجێ دەبێت كەبەر دەدەن.
بەگشتى قەد بەشێوەيەكى ستوونى بەرز دەبێت، ئينجا لق وچڵى لێ دەبێتەوە كەگەلاّ وميوە دەگرێت. لەكۆتايى قەدەكەدا گۆپكەيەك هەيە هۆرمۆنێك بەرهەم دێنێت پێى دەوترێت ((ئۆكسجين)) كەتەحەكوم دەكات بەگەشەسەندنى گۆپكە لاييەكانەوە. لەناو دواگۆپكەدا ڕيشاڵێك هەيەكە بەرپرسە لەگەشەسەندنى زۆربەى ڕوەكەكان.
ئەى كەواتە كارو فەرمانى قەد چيە لەڕووەكدا؟
بەئەندازەى ڕەگ وگەلاّ، قەد پێويست نيە بۆژيانى ڕووەكەكان. بەلاّم قەد ڕووەك بەرز دەكات بۆسەرەوە بەشێوەيەكى ڕاست، كەهەلى باشترى بۆدەستەبەردەكات كەتيشكى خۆروهەواكە زۆر پێويستن بوگەشەسەندنى.
قەد لەڕوەكدا دوكارى هەيە:
١_ هێشتنەوەى ڕووەكەكە لەدۆخى ڕاست وستونيدا.
٢_ گواستنەوەى ئاو وكانزا تواوەكان لەئاودا بۆبەشە جياجياكانى ڕووەكەكە.
لەڕاستيدا قەد وەكو پردێك ئيش دەكات لەنيوَن ڕەگى ڕووەكەكەو گەلاّكانيدا. دەشێت قەدى ڕووەكەكان كورت وباريك يان كەتەو درێژبن. بەلاّم لەهەموو شێوەكانيدا هەر ئەو دوو كارە ئەنجام دەدەن.
دوو جۆرى بنەڕەتى لەقەد هەيە لەڕووەكەكاندا. گيايى ودارى. قەدەگياييەكان تا ئەندازەيەك لاوازن، بەلاّم قەدە دارييەكان بەهێزترن، ڕيشاڵ وخانەى تايبەتيان هەيەكە هێزو خۆراگرييان دەداتێ. لەئەنجامى ئەوەدا كارى پشتگرى دەكات لەڕووەكەكە. كارى دووەمى قەد گواستنەوەى ئاووكانزا تواوەكانە لەڕەگەوە بۆ بەشەكانى سەرەوەى ڕووەك بۆهەستان بەم كارە لەناو قەددا سيستەمێك لەبۆرى وكەناڵ هەيە. كەلەبەشى خوارەوە ئەو شلەمەنيانە دەگوێزێتەوە بۆبەشى سەرەوەى ڕووەكەكەو بەپێچەوانەشەوە. لەچەقى قەددا ((زيليم)) هەيەكە ئاوو خۆيى تواوە لەڕەگەوە دەگوێزێتەوە بۆگەلاّكان. پيستە يەكيش ڕاستەخۆ

دەكەوێتە ژێر توێكڵی دەرەوە ئەو ئاوە دەگوێزێتەوە كە تواوەی ئەندامیان تیایە لەگەڵاكانەوە بۆهەموو بەشەكانی تری ڕووەكەكە. بەو جۆرە دەبینین هاتوچۆیەكی بەردەوام هەیە لەڕێگەی زەویەوە بۆسەرەوە لەڕێگەی توێكڵەوەبۆ خوارەوە.

## ئاژەڵان چۆن دەجولێنەوە؟

ملیۆنەها ئاژەڵ لەسەر زەویدا دەژین. بەسەدەها ڕێگەی جیاواز دەجولێنەوە، هەندێكیان ڕێ دەكەن یان غاردەدەن، هەندێكی تریان باز دەدەن یان دەخشێن یان مەلەوانی دەكەن یان خز دەبەن. فەرموون لەگەڵمان بن بۆخستنە ڕووی ئەو ڕێگە جیاوازانەی كە ئاژەڵان پێ دەجولێنەوە : _

١_ ڕێ كردن:_ گیاندارە چوار قاچەكان قاچی پێشەوە یان بۆلای چەپ وڕاست دەجولێنن لەگەڵ قاچی دواوە دا بۆلاكەی تر. ئەمەش ڕێكردنی بنەڕەتیە بۆ ئەو ئاژەڵانەی قاچیان هەیە. ئەو مێرووانەش كە شەشە قاچیان هەیە دووقاچی پێشەوە ودواوە بۆلایەك وقاچە ناوەڕاستیەكان بۆلایەكی تر دەبزوێنێت. بەجۆرێك كەهەمیشە لاشەی لەسەر سێ قاچەكەی تری كەناجولێت جێگیركات.

٢_ ڕەوت ڕۆین:_ بریتیە لەبزواندنی دووقاچ لەیەك لاوە. (ڕاستەكان و چەپەكان) پێكەوە. لەهەمان كاتدا وەكو ئەوەی زەڕافەو فیل وزۆركەم لەئاژەڵانی تر دەیكەن.

٣_ لۆقە ڕۆشتن:_ ئەسپ ووولاخ تایبەتمەندن بەمجۆرە ڕێكردنە تەنها تۆزێك هەولی دەوێت ئەو ئاژەڵانە دەتوانن ماوەیەكی زۆر بەلۆقە ببڕن. لۆقە ڕێكردنێكە لەنێوان ڕێكردنی ئاسایی و غارداندا. ئەگەر مرۆڤ بیكات پێی دەوترێت((هەولە)).

٤_ غاردان :_ ئەم جۆرە بزواندنە لەئاژەڵاندا ئەوەیە ئاژەڵەكە بۆماوەیەك هەرچوار قاچی لەهەوادا بێت، زۆر ماندوكەرە وئەسپ وشێر وپڵنگ دەتوانن بەم شێوە ڕێكردنە بڕۆن.

٥_بازدان:_كەنغەر وبۆق وكوللەوسیسرك وكێچ بازدەری چاكن.

٦_كشان وچونەوەیەك:_ گیاندارەكانی وەكو كرمی زەوی وقاقڵە جنۆكە وپرگە وهێللكەشەیتانۆكە و ئەمانە بەبردنەیەك وكشان لاشەیان ڕێ دەكەن لەدواوە بۆپێشەوە.

٧_كشان :_ مارەكان بەكرژكردن وخاوكردنەوەی ماسولكەكانیان دەبزوێن.

ڕێکردن بەمجۆرە چالاك نیە ئەگەر لەسەر ڕوویەکی زبر نەبێت. مارەکان بەیارمەتی چەند چینێکی بەیەکاچوور لە پولەکە کەلەسەر ڕیخۆڵکانیەتی وخۆی بەسەردا ڕادەکێشێت ڕێ دەکات.

٨_ ڕێ کردنی شەپۆلاوی:_ ئەم جوڵە تایبەتەبە مارمێلکەکان قاچەکانی بەوچەشنە بەکار دێنێت کەمندالی بچووك پێی گاولکی دەکات. بەڵام لاشەی شەپۆلاوی دەکات چونکە ڕیخۆڵەکانی دەدەن لەزەوی. تیمساحەکان وسەمەندەلی ئاوو سەمەندەریش بەهەمان شێوە ڕێ دەکەن.

گیاندارە ئاویەکان:

١_ مەلەوانی کردنی ماسی:_ ماسیەکان بەجولاندنی لەلایەکەوە بۆ لایەکی تر مەلەوانی دەکەن.

٢_ جوڵەی ئەمیبی :_ ئەمیبا گیاندارێکی زۆر لاوازە ولاشەی هێلمیە، لاشەی ڕادەکێشێت بۆپێشەوە وئەمجا هەموو لاشەی بەدوایدا پاڵ دەنێت بەو جۆرە شوێنی خۆی دەگۆڕێت.

٣_ جوڵەی هەدبی:_ هەندێك لەیەك خانەییەکان دەزوولەیەکیان هەیە پێی دەوترێت ((سوگ)) دەیدات لەئاوەکە ومەلەوانی پێ دەکات.

٤_جوڵەبەشەپۆل :_ ماسی انقلیس ومارەئاویەکان خۆشەپۆلاندنی هەموو لەشیان مەلەدەکەن، جولاندنی لەشیان بەو جۆرە ڕەنگە لەنەرمیانەوە بێت.

٥_ سەوڵ لێدان: _ کیسەڵ ومراوی قازەکان بەبەکارهێنانی قاچەکانیان وەکو سەوڵ مەلەوانی دەکەن.

٦_جولان بەهۆی پەڕەکەی پشتەوە :_ ئەسپی دەریا بەهۆی جولاندنی پەڕەکەی پشتیەوە بەخێرایی مەلەوانی دەکات.

## نان

لەسەرانسەری جیهاندا ڕۆژانە نان دەخورێت، بۆیە پێی دەوترێت ((مادەی ژیان)) لەزۆربەی وولاتاندا، نان ٥٠٪ یان زیاتر گەرمۆکە ڕۆژانەییەکان بۆخەڵکێکی زۆر دەستەبەر دەکات.

لەبەر ئەوەی زۆرێك لەخەڵکی هەن دەرامەدیان نزمە، بۆیە نان یەکێکە لەخۆراکە

ئابورییەكان وبەشێكی گرنگیشە لەخۆراك.

لەوولاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا كە دەرامەدی تاكەكانی لەدەرامەدی تاكەكانی زۆربەی وولاتانی تربەرز ترە. بۆیەخەلكی زۆر خواردنی گران بەهادەخۆن. لەبەرئەوە پشت بەخواردنی تر دەبەستن تا نانی ووشك.

نان ئەم ڕێژانە لەمەوادی خۆراكی دەستەبەر دەكات كەبە پێویست دادەنرێت.

٢٠٪ لەپرۆتینات، ٢٦٪ لەڤیتامینB١، ٢٤٪ لەترشی نیكۆتین، ١٤٪ لەریبو فلاجین ڤیتامینێكە كەلە ماست وهێلكە وگۆشت وسەوزە دا هەیە،٣٦٪ ئاسن، ١٧٪ كالسیۆم بۆچی نان زۆربەگرنگ دادەنرێت.

لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵك نانی سپی دەخۆن لەبەر ئەوەی دەرامەد كەمەكان ڕێژەیەكی زۆرتری لیّ دەخۆن. بۆیە وابەباش زانرا مەوادی خۆراكی تری تیّ بكرێت. لەبەر ئەوە لەهەندێك لە وولاتاندا مەوادی خۆراكی تر بۆنان زیاد دەكەن.

## خەڵوزی لینجنت چیە؟

گەران بەدوای سەرچاوەی تازە بۆوزە لەگرنگترین كردارەكانی گەڕانە كەزانایان لەئێستادا پێی هەڵدەسن. هۆیەكەی ئەوە نیە دەیانەوێت سەرچاوەی باشتر وهەرزانتری وزە بدۆزنەوە، بەڵكو لەبەر ئەوەیە هەندێك سەرچاوەی وزەی سروشتی ئێستا فەراهەمە بۆمروۆ وڕۆژێك دێت نەمێنێت وكۆتایی بێت!

ئایا كەسێك هەیە لەئێوە كانەخەڵوزێكی وێرانەی بینبێت؟

ڕۆژێك لەڕۆژان لەوكانەدا خەڵوز دەرهێنراوە وفڕنی زۆر گەورەی پیّ وەگەڕخراوە. بەلاّم لەئێستادا، ئەوەندە خەڵوزی تێدانەماوە شایانی ئەوەبێت لەكانەكەدا بۆی بگەڕێت.

سەرەڕای ئەوە تائێستا خەڵوز سوتەمەنی وشكی زۆرگرنگ وفەراهەمە بۆمروۆ. بۆنموونە خەڵوز نیوەی سوتەمەنی بەكاربراوە لە ئەمریكادا. ئەگەر سەیری جۆرە جیاوازەكانی خەڵوزبكەین بەڕوونی بۆمان دەردەكەوێت، ئەو كردارەی ملێونەها ساڵی خایاندوە. تەنها یەك جۆر خەڵوزی لیّ نەكەوتۆتەوە لەهەموو شوێنەكانی جیهاندا.

بۆنموونە كۆترە لەهەموو جۆرەكانی خەڵوز كەم تەمەنترە، بەواتا ئەو ڕوەكانەی

کۆترەکەی لیٚ دروست بوە، ماوەیەکی کەمتر کەوتۆتە ژێر گلّ وقوڕ لەوڕووەك دارانەی کەجۆرەکانی تری خەلّوزی لیٚ دروست بوە. نرخی گەرمای کۆترە کەمترە لەهەموو جۆری سوتەمەنیە ڕەقەکان. لینجینێت هەندێك جار خەلّوزی (الحمری) یش پیٚ دەلّێن تەمەنی تۆزێك لەکۆترە لەپێشترە بەلاّم گەرمای زۆر دەبەخشێت.
بەلاّم خەلّوزی (القاری) لەنیوّ هەموو جۆرەکانی سوتەمەنیە ڕەقەکاندا بەرزترین پلەی گەرمای هەیە. لەکۆتایدا خەلّوزی (( ئەنسراسیێت)) مان هەیە کەکۆنترین وڕەقترین جۆری خەلّوزە لەسروشتدا.

## قارچك

قارچك ڕوەکێکی زۆر سەیرە، نەڕەگی هەیە نەقەدی هەیەو نەگەلاّ. هێندە بەخێرایی سەوز دەبێت بەجۆرێك وابزانیت وهەست بکەیت بەبەرچاوتەوە بەرز دەبێت. بۆیە بەقارچك دەوترێت ((کەڕوو)) چونکە هیچ کلۆرۆفیلێکی تێدانیە تاخۆراکی خۆی دروست بکات، هەندێك جۆری قارچکەکان زۆر خۆش وبەلەزەتن وهەندێکیان هێندە ژەهراوین، لەگەلّ خواردن دەمریت.
ئەو بەشەی کەلە زەوی دێتەدەرەوە ئەو بەشەیەکە دەخورێت، باقی ڕووەکەکە لەژێر زەویدا لەشێوەی تۆرێکی سپی دایە لەدەزوو کەپێیان دەوترێت(لقۆکە). دەزووی لقۆکەکان لەتۆوەکەوە سەرچاوە دەگرن ودەڕوێن هێندە بچوکە نابینرێت و قارچکەکە دەیوەرێنێتە سەر زەوی لەسەر ئەم دەزوانە گریٚ سپی بچووك سەوز دەبێت وبەرەوسەرەوە دێن وتا لەئەنجامدا لەشێوەی چەترێك یان هەرشێوەیەکی تری قارچك سەوز دەبن.
لەژێر ئەوشتەدا شتێك هەیە لەلوتۆکە دەچێت، کەپارچەی بچووکی تیشکدەری پێکەوە نوساوە. لەسەر ئەو لوتۆکانە تۆوەکان گەشەدەکەن وئینجا تۆوەکان دەکەون وبا هەلّیان دەگرێت ودەیانبات کاتێك دەکەونەسەر ڕوویەکی گونجاو وەکو ڕوەکێکی تازە دەڕوێت. زۆربەی جۆری قارچکەکان لەزەویە سێبەرە شێدارەکاندا دەژین. یان لەبنی شیوە تەسکەکاندا. کەهەم شێدارو هەم گەرمابیان تێدایە. قارچك بەشێوەیەکی زۆر باش لەناوگژوگیا بەرخۆریەکاندا دەژێت. بەلاّم لەبەر ئەوەی قارچك بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەئاوپێك دێت بۆیە زۆربەی جۆرەکانی

ناتوانن لەو شوێنانەدا بژین کەبای گەرمی وشکی زۆر یان خۆری هاوینی گەرمە.

## بەرزترین هێڵی ئاسن لەجیهاندا، دەکەوێتە کوێوە؟

ئەمرۆ هێڵی ئاسن گرنگترین هۆکاری گواستنەوەیە لەجیهاندا. چونکە ڕۆژانە ملیۆنەها کەس لەسەرانسەری دونیادا بەسەری دەڕۆن. لەگەڵ گواستنەوەی هەندین جۆرلەکەلوپەل نموونەی: دانەوێڵە، دار، ئامێرەکان وچەندین جۆری تری بەروبووم.

خێرایی شەمەنەفەرە تازەکان لە٢٠٠کیلۆمەتر زیاترە لە کات ژمێرێکدا. شەمەندەفەرە بارهەڵگرەکان دەتوانن هەزاران تەن لەکەل وپەل بەدرێژایی کیشوەرێکدا بگوێزنەوە. دەتونین بڵێن لەهەموو وولآتانی دونیادا هێڵی ئاسن هەیە.

ئایادەزانن بەرزترین هێڵی شەمەندەفەر لەجیهاندا دەکەوێتە کوێوە؟

دەکەوێتە پیرۆ، لقێکی لێ بەرز دەبێتەوە تابەرزایی ١٥,٨٤٤ پێ لەسەر ڕووی دەریاوە. بەلآم بەرزترین خاڵ لەهێڵە سەرەکیەکەدا. دەکەوێتە بەرزی ١٥,٦٨٨ پێ وە لەسەر ڕووی دەریاوە. لەناو تونێلێکدا کەناوی (( لاغالیرا)) یە.

هەموو هێڵە ئاسنەکان یەك ئەندازەیان هەیە ئەویش ٤ پێ و٨,٥ ئینجە وەکو زۆربەی هێڵە ئاسنەکانی ئوروپاو ئەمریکای باکور.

بەرزترین ویستگەی شەمەندەفەر لەجیهاندا لە ((الاغالیرا)) دایە. ئەم ویستگەیە ١٥,٦٨٥ پێ لەسەر ڕووی دەریاوە بەرزە. ئەم هێڵی ئاسنە پێش نزیکەی دووسەد ساڵە ئەندازیارێك بەناوی ((هنری دیگن)) دروستی کردوە.

بەلآم درێژترین هێڵی ئاسن لەجیهاندا وەکو دەزانین لەیەکێتی سۆڤیێتی پێشوودایەو درێژیەکەی (٩٠١٠) کیلۆمەترە ومۆسکۆ دەگەیەنێتە(( فلادیفوستوك)) ەوە. شەمەندەفەر هەڵگرەکانی یابان خێراترین شەمەندەفەرن لەجیهاندا کەبە خێرایی زیاتر ١٦٠/کم لەکاتژمێرێکدا دەڕۆن.خێراترین شەمەندەفەرەکانی یابان بەسەر هێڵی ئوکسایدی نوێدا دەڕۆن لەنێوان تۆکیۆ وئۆساکادا کە ٥١٥ کم دورەو لەسێ کاتژمێردا دەیبڕن.

## چارەسەری سروشتی.

**چارەسەری سروشتی لقێکە لەلقەکانی پزیشکی کەسوود لەتاقیکردنەوە دەبینێت لەچارەسەرکردنی نەخۆشیەکاندا.**

**چارەسەری سروشتی زۆر بەسودە لەچارەسەرکردنی چەندین جۆری نەخۆشی ویەك کەوتنی لاشەیدا. وەکو ئیفلیجی ولاوازی ماسولکەکان. هەروەها لەچارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی دڵ وسیەکانیشدا بەکاردێت.**

**دەشێت چارەسەری سروشتی وەکو یارمەتی دەرێك بۆچارەسەرکردنی حاڵەتەکانی شکان و توشبون وبڕانی ئەندامەکان بەکاربهێنرێت. بەیارمەتی ئەم چارەسەرەکەسی پەککەوتو دەشێت بگەڕێتەوە بۆژیان ولەڕووی لەش ولاریەوە.**

**چەندین جۆر لەئامێروچارەسەر چارەسەری سروشتی دا بەکاردێت گلۆپی گەرمی تیشکی بۆگەرم کردنی لاشەو لابردنی ئازار لەبڕبڕەی پشتدا بەکاردێت. هەروەها پەردەی گەرمی کارەبایی، چارەسەری ئاوی(چارەسەربە ئاو) وگەرماوی تایبەتی بەکاردەهێنرێت بۆگەیاندنی گەرما بەئەندامەکانی لەشی مرۆڤ. گەرمکردنی لاشە ئازار کەم دەکاتەوە، سوڕی خوێنی لاشەش باش دەکات. لەبەرامبەر ئەوەشدا چەند ڕێگەیەك ڕێگەیەکی ساردکرنەوە بەکاردەهێرێت بۆ چەند توشبونێکی دیاری کراو بۆگەرم کردنەوەی ئازار وسان. تیشکی سەروی وەنەوشەیی بەکاردەهێنرێت لەکوشتنی میکرۆبگەلێکی دیاری کراوەو یارمەتی دانی چاکبونەوە، لەبەر ئەوەی تیشکی سەروی وەنەشەیی. وزەی زیاتری تێدایە ودەتوانێت میکرۆبەکان بکوژێت. هەروەها شەپۆلەکانی دەنگی زۆربەرز، بەکاردەهێنرێت لەچارەسەرکردنی ئەو گرۆئێشانەی توش ماسولکەو جومگەکان دەبن. ڕاهێنان گرنگرین بەشەلە چارەسەری سروشتیدا، پسپۆڕانی ئەم بوارە ئامۆژگاریمان دەکەن کە ئامێری جۆراو جۆربەکار بێنین لەچارەسەری سروشتیدا وەکو بەرز کردنەوەی قورسی. پاسکل وبەکرە.**

## كۆنترین وەرزش لەجیهاندا؟

((پۆلۆ)) کۆنترین یاریە لەجیهاندا. لەسەدەی یەکەمی زاینی دا لەئێراندا ئەم یاریەیان کردوە هەندێك لەڕۆشنبیران دەڵێن فارسەکان پێش نزیکەی ۲۰۰۰ لەزاین ئەم یاریەیان داهێناوە. ولەئێرانەوە بڵاوبوەتەوە بۆووڵآتانی تر. لەناوچەی تبت بەم یاریە دەڵێن(پلو) وشەی پلوش مانای تۆپ دەدات.

لەسەدەی سیانزەهەمدا موسڵمانەکان ئەم یاریەیان بردە هندەوە. لەساڵی ۱۸٦۰ دا لەهندەوە چووە بەریتانیاوە. ئەمڕۆ نەك تەنها لەهنددا بەڵکو لە ئەرجەنتین وبەریتانیاو ووڵآتەیەکگرتوەکان و هەندێك ووڵآتانی تری دونیاشدا ئەم یاریە دەکرێت. کۆنترین یانەی پۆلۆ لەسەردەمی نوێدا دروست کرابێت((یانەی کاشار)) بوەلەئاسامی هنددا کەلە ساڵی ۱۸٥۹ دا دامەزرا. یاری پۆلۆ بەدارێك وتۆپێك دەکرێت بەسەر پشتی ئەسپەوە. داری پۆلۆ پێی دەوترێت ((لێدەری پۆلۆ)) ئەم یاریە لەدەشتێکدا دەکرێت لەیاریگایەك کەبە هەرێز داپۆشرابێت ودرێژیەکەی ۲۷٤,۳۲ مەترو پانیەکەی ۱٤٦,۳ مەتر بێت. گوڵی پۆلۆ لەدوو ستونی کێش سوك پێك دێت کەماوەی نێوانیان ۷,۳۸ مەترە, بەچونە ناوی تۆپ بۆناو ئەو ستونانە گۆڵ تۆمار دەکرێت. هەرتیپێکی ئەم یاریە بریتیە لەچوار کەس. بۆئەوەی کەسێك یاری چیەکی چاکی پۆڵوبێت، دەبێت پسپۆر بێت لەسواربونی ئەسپدا. ڕکەبەری لەم یاریەدا لەیاریەکدا دەبێت کەشەش یان حەوت یان هەشت جەولەیە. هەر جەولەیەکیشی ۷,٥ خولەك دەخایەنێت. دوای هەرجەولەیەکیش ماوەیەکی پشودان دەدرێت بەیاری چیەکە. ئەم یاریە زۆرگران دەکەوێت تەنها دەوڵەمەندەکان دەتوانن خەرجی هەڵگرن، بۆیە پێی دەوترێت یاری پادشایان.

یەکەم یاری پۆلۆ بەسواری فیل لەساڵی ۱۹۷٦ دا لەجایبوری هند ئەنجام درا. کە ٤۰ هەزار کەس تەماشایان کرد. لەساڵی ۱۹۷۸ یەکەمین یاری پۆلۆ بەسواری حوشتر کرا هەمدیسان لەجایبوری هنددا. ئێستا خەڵکی بەسواری باسکیل ئەم یاریە ئەنجام دەدەن. گەورەترین جامی پۆلۆ لەجیهاندا، جامی خولی پۆلۆبوو بۆیەکەم ئەندامان کەلە بانغالوری هنددا ڕێکخرا کەبەرزیەکەی شەش پێ یە وبۆیەکمین جار لەساڵی ۱۹٤٦ داپێش کەش کرا.

## فریاکەوتنی سەرەتایی

ڕووداوەکان بەشێکن لەژیانی مرۆڤ، هەندێك لەو ڕووداوانەش دەشێن هێندە مەترسیدار بێت پێویست بەچارە سەربکات لای پزیشکی پسپۆڕ وهەندێکی تری مەترسیدار نەبێت لە برینداریەکان لاوەکی بن وەکو ڕووکان وسجج ئەژنۆکان لەئەنجامی کەوتنی مرۆڤ لەکاتی یاری کردندا. یان برینداربوون لەئەنجامی شوشەیەکی شکاودا. یان سوتانێکی بچووك لەئەنجامی گرتنی تەنێکی گەرم و هتد. ئەم جۆرە برینانە لەماڵدا چارەسەر بکرێت. وە چارەسەرکردنی ئەم برینە سوکانە لەماڵدا پیێ ی دەوترێت (( فریاکەوتنی سەرەتایی)).

لاشەمان توانایەکی زۆر بەرزی هەیە لەچاککردنەوەی ئەو برینە سوکانە بەجۆرێك کەپێویستی بەچارەسەرێکی پسپۆڕ نیە. ئەوەی کەزۆر پێویستە بیکەین پاك ڕاگرتنی برینەکەو پاراستنیەتی لەماوەی قۆناغەکانی چاکبوونەوەدا. وەلە ئەمڕۆدا (چمادات)ی لاسق (پلاستەر و چماداتی دژەگەنین و تخجج هەیە کەدەتوانین لەهەرشوێنێکی لاشەدا بەکاری بێنین. ئەمەش چەند ڕێگە چارەیەکی سەرەتایی کە دەتوانرێت لەکاتی ڕوودانی برین وسحجات و شکان وسووتان دا پەنایبۆببرێت.

- برین: چەقۆو شوشەی شکاوو شفرەی سەرتاشین هەندێك جار دەبنە هۆی بریندار کردنی مرۆڤ لەبرینە سوکەکاندا دەمارەکانی ژێر پێست دەبڕێن و دەبێتە هۆی خوێن بەربوون. بەڵام مایەی دڵگرانی نیە. ئەم برینە سوکانە بەشاش دەپێچرێن و برین پێچچ دەکرێن بۆئەوەی دەم بنێتەیەك و دوای یەك ڕۆژ دەشێت بەشاشێکی پاك بگۆڕدرێت.
- *ڕووەکان: کەوتنە سەر هەردوو ئەژنۆو هەردوو دەست بەسەر بانێکی زبردا. دەبێتە هۆی ڕووکانی (ڕووشانی) چینی سەرەوەی پێست، لەم دۆخەدا برینەکەبە سەروی ئۆکسیدی هێدرۆجین پاك دەکرێتەوە. پارچەیەك لۆکە یان بەدیتۆڵ. دوای پاکردنەوەی ڕوشانەکەدا نابەبسرێت ئەگەر خوێنی لەنەدەچیوو. بەڵام ئەگەر برینەکەی زۆربوو ماوەی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دەپێچرێت.

- كوتران(رچوچ): بريتى يه لەبرينێك لەڕيشاڵەكان خراپ دەكات بەڵام پێست هيچى لىَ نايەت بۆيە پێويستى بەهيچ چارە سەرێك نيە.
- سوتان: سوتانى سوك تەنها سورى لەپێست دروست دەكات. بەڵام سوتانى زياتر برين دروست دەكات. وە سوتانە زۆر قوڵەكانيش بەتەواوى ڕيشاڵەكان لەناودەبات ئەگەر سوتان تەنها پێستەكە سوربكاتەوە پێويستى بەچارەسەرناكات. بەڵام لەكاتى سوتاندا دەبێت دەرمان بەكاربهێنرێت بپێچرێت و دواى حەفتەيەك لەژێرەوە پێستێكى تازە دەهێنێتەوە.
- دەست ترەكين: هەنديك جار كەش وهەواى ساردو ووشك دەبێتە هۆى ئەوەى پێستمان دەستمان بتەرەكێت. دەشێت چارەسەرى ئەمە بەئاسانى بكرێت، بەچەوركردنى بەتوزێك زنك وهەتوانى گەرچەك هەموو شەوێك پێش خەوتن. ئەگەرگەيشتە زامبوون كەڕووشان ئەوادەبێت توشبوو دەرزى دژى تيتانوس(كزاز) بەكاربهێنرێت لەبەر ئەوەى بەكترياى ئەم نەخۆشيە دەلكێتە مەوادە وشكەكانە لەشوێنى كەوتنەو دەبێتە هۆى مەترسى.

**المطاط**

مگاگ لەسروشتدا هەر زۆر كۆنە. چەندين پاشماوەى ڕوەكەكان دۆزراونەتەوە كەمگاگيان بەرهەم هێناوە. كەدەگەڕێتەوە بۆنزيكەى پێش سێ مليۆن ساڵ. لەنێو پاشماوەى شارستانيەتەكانى مايانى و ئينكانىَ دالە ئەمريكاى ناوەند و باشووريدا تۆپى پلاستيكى دۆزراونەتەوە كە دەگەڕێتەوە بۆزياتر لە٩٠٠ ساڵ.
كاتێك كريستۆڤر كۆلۆمبس گەشتى دووەمى كرد بۆ(( دونياى نوىَ)) سەيرى كرد خەڵكە ئەسڵيەكەى هايتى بەتۆپێك يارى دەكەن كەلە(( كەتيرەى دار)) دروست كراوە. تەنانەت پێش ئەوەش خەڵكى باشوورى ڕۆژهەڵاتى ئاسيا مگاگيان ناسيوەو جۆرێك جەويدارييان بەكارهێناوە لەبەرگ گرتنى سەبەتەو گۆزەدا تا ئاو نەدەڵێنێت مگاگ زياتر لە ٤٠٠ جۆر دار داهەيە. بەڵام ڕێژەكەى لەدرايكەوە بەشێوەيەكى زۆر بۆدارێكى تر جياوازە. دەرهێنانى مگاگ لەدارێكى وەكو (

گرخشقون)(كاسنی) وگقلاب (حشیشه‌اللبن) ومریمیه قازانجێكی وای نیه.
مگاگ ماده‌یه‌كی نه‌رم و لاصقه، كه‌شله‌یه‌كی شیری وه‌رده‌گرێت كه‌به ((اللبی)) ده‌ناسرێت. (شیری دار یان گوشراوه‌كه‌یه‌تی) جیاوازی هه‌یه له‌گه‌ڵ ((نسغ))دا ئه‌و شله‌یه‌ی كه‌به‌ناو ڕه‌گی ڕووه‌كه‌كاندا ده‌ڕوات وئاو وخۆراك) هه‌ڵده‌گرێت.
((اللبی)) له‌به‌رگی دارو ڕیشه‌كه‌یدا هه‌یه له‌گه‌ڵ لق وگه‌ڵاكان وتۆوه‌كه‌یدا. به‌ڵام زۆرتری له‌به‌رگی ناوه‌وه‌ی لقه‌كان وقه‌ده‌كه‌یدا هه‌یه.
((لبی)) له‌گه‌ردیله‌ی بچووك پێك دێت له‌ماده‌ی شل یان ڕه‌قه‌یان نیوه شل كه‌وه‌كو تێكه‌ڵه‌یه‌كی ئاوی دیار ده‌دات. مگاگ ته‌نها ٣٣٪ لبی پێك دێنێت له‌كاتێكدا باقیه‌كه‌ی تری ئاوه. گه‌ردیله‌كانی مگاگ له ((لبی)) وه‌رده‌گیرێت و تۆپێكی مگاگی پیك ده‌هێنێت.
مگاگ له‌ناوچه ئستیوائیه‌كاندا ده‌ڕوێت. ئه‌و ناوچه‌یه‌ی كه ٧٠٠ میل درێژه‌و له باكوروباشووری هێڵی ئیستیواوه كه‌به (( پشتێنه‌ی مگاگی )) ده‌ناسرێت. هۆیه‌كه‌ی ئه‌وه‌یه‌كه داری مگاگ پێویستی به‌كه‌ش و هه‌وایه‌كی گه‌رم وشێدار و به‌پیت وقوڵ هه‌یه. زۆربه‌ی مگاگ وباشترینی له‌دارێكه‌وه دێت كه‌ناوی ((هیفیا براز یلینسیس))ه سروشتی جیهان له‌م داره‌وه وه‌رده‌گیرێت. به‌ڵام ئه‌مداره ئێستا له‌زۆر ناوچه‌ی جیهاندا له‌چوار چێوه‌ی پێشتری مگاگی گشت ده‌كرێت. ده‌شێت یه‌كه‌م كه‌س مه‌وادی مگاگی دروست كردبێت فه‌ره‌نسیه‌كان بوبن (مغاگ) ی گۆره‌وی وقایشی پانتۆڵیان پێش ساڵی ١٨٠٠ له‌مگاگ وا دروست كردووه.

## خوێن چۆن له‌لاشه‌ماندا ده‌سوڕێته‌وه؟

خوێن به‌ئاسانی به‌ناو ده‌ماره‌كانی له‌شماندا ده‌سوڕێته‌وه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی دڵ ده‌بینرێت وشاده‌مارو ووردە ده‌ماره‌كانیش ده‌گوێزنه‌وه بۆ سه‌رانسه‌ری له‌ش خوێن به‌له‌شماندا ده‌سوڕێته‌وه بۆگواستنه‌وه‌ی خۆراك له‌كۆئه‌ندامی هه‌رس و ئۆكسجین له‌سیه‌كانه‌وه بۆسه‌رانسه‌ری لاشه وبۆ پاككردنه‌ی ڕیشاڵه‌كان له‌پاشماوه‌كانیان.
شاخوێنێنه‌رو شاخوێنبه‌ر له‌(بۆری) ده‌چن وئه‌م بۆریانه‌ش دوجۆرن جۆرێكی گه‌وره‌و جۆرێكی بچوك. هه‌ردوو جۆره‌كه‌شی په‌یوه‌سته به‌دڵه‌وه. به‌ڵام په‌یوه‌ندیان

بەیەکەوەنیە.

سیستەمی بچوك لەدەمارە خوێنییەکان لەدڵەوە درێژ دەبێتەوە بۆسیەکان وبەپێچەوانەوە. سیستەمە گەورەکەش درێژ دەبێتەوە لەدڵوە بۆهەمووو ئەندامەکانی تری لەش. ئەم بۆریانەش پێیان دەوترێت. شاخوێن بەرو شاخوێن هێنەر.بەڵام وردە دەمارەکان زۆر وردن وخوێن لە شراینەکانەوە دەبات بۆئوردەکان. بائێستا بچینە سەردڵ،ماڵێکی دوو نهۆم دەچێت، هەریەکەو ژوورێکی سەرەوەیی هەیە، بەیەکێکیان دەوترێت (( گوێچکەلەی ڕاست))و بەویتریان دەوترێت ((گوێچکەلەی چەپ)). بەڵام دوو ژوورەکەی خوارەوە بەیەکێکیان دەورتێت ((سکوڵەی ڕاست)) وبەوی تریشیان دەوترێت((سکوڵەی چەپ)). وەئەگەر ویستمان سەیری دلۆپێك خوێن بکەین لەکاتی ڕێکردنیدا بەناولەشدا بەمجۆرە دەبێت:

دلۆپە خوێنەکە کە ئۆکسجینی هەڵگرتووە لەسیەکانەوە دەچێت بۆ گوێچکەلەی چەپ. دوای ئەوە بۆسکوڵەی چەپ. لەوێشەوە بۆ(( شریان الاورگی)) کەلەگەڵ دەمارە بڵاوەبوەکاندا خوێن دەگوێزێتەوە بۆهەموو ئەندامەکانی لەش. وەلە مادەی وردە دەمارەکانەوە ئەو دلۆپە خوێنەلە دەمارەکانەوە دەچێت بۆ ناو الاوردە الاصغر لەوێشەوە دەچێت بۆ الاوردە الاکبر تادەگاتە گوێچکەلەی ڕاستی دڵ، لەوێشەوە بۆ سکوڵەی ڕاست ولەوێشەوە دەچێت بۆناو الشرایین کەدەیباتە ناو سیەکانەوە. بەو جۆرەش دلۆپە خوێنەکە لەدووەم ئۆکسیدی کاربۆن وهەندێك ئاو ڕزگاری دەبێت و ئۆکسجینەکە وەردەگرێت بۆئەوەی ئامادەبێت بۆگەڕانەوە بۆگوێچکەلەی چەپی دڵ، لەگەڵ سکوڵەی چەپدا بۆئەوەی خولی دووەمی خۆی دەست پێ بکاتەوە!

دڵ ڕۆژانە نزیکەی ١٠٠ هەزار جار لێیدەدات و خاودەبێتەوە، وەنزیکەی ١٣٣٦٠ لیتر خوێن لەماوەی (٢٤) کاتژمێرێکدا هەڵ دەدات لەکەسێکی نێری پێگەیشتودا.

## کەروو.

هەندێك جار سرووشت بەربەرەکانێی مرۆڤ دەکات. زۆر بە زەحمەت دەتوانێت لە

ژیاندا بمێنێتەوە. وەکو ئەوەی دوونیای مێرووەکان و کەڕووەکان هەوڵ دەدەن زاڵ ببنە سەر مرۆڤەکاندا. ئەگەر مرۆڤ لە شوێنی خۆیدا هیچ نەکات ئەوا هەموو جۆرە گیاندارەکان هێرش دەکەنە سەری یان سەر مەملەکەتەکەی. لە نێوان ئەو دووژمنانەدا لە کەمیندایە بۆمان و چاوەڕێ دەکات هەلێك ی دەست کەوێت بۆئەوەی زیانێکمان لێبدات (( کەڕوو)) ە ئەگەر هەندێك شتی پێستەیی یان خواردنی کولاّوو یان میوە بەسەر دانە پۆشراوی لە شوێنێکدا دابنرێت ستردوو ووشك نەبێت ئەوا کەڕوو لێ ی دەدات. دەشێت لە نانێکدا سەیرت کردبێت ئەگەر لە شوێنێکی شێداری گەرمدا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك دابنرێت دەبینین بە توێژێك لە دەزوولەی سپی دادەپۆشرێت، کەلە مالّی جالّجالّۆکە دەچێت وا دیار دەدات کە بە توێزی ڕەش ئاوڕشێن کراوە. ئەگەر بەوردبین سەیری بکەین دەبنین کە تۆڕە، پێکهاتووە لە زۆرێك لە دەزوی درێژی بێ ڕەنگ. کە دوو جۆر لقی هەیە. یەکێکیان شتێکی خڕی بچووکی ڕەش لە سەرە کە میکرۆبی تێدایە. بەلاّم جۆرەکەی تر. کورترەو دەچێتە ناو نانەوە و وەکو ڕەگ و مژەری ئاو کاردەکات. ئەوەی کەلە و حالّەتەدا دەبینین (( کەڕوو )) ە. کەڕوو لە هەوایەکی شێداری گەرمدا گەشە دەکات. بە تایبەت ئەکەر خواردنەکە زۆر بێت. کەڕوو دەکرێتە دوو بەشەوە : جۆری گەردیلەیی کە وەکو گەردیلە وایە. لەسەر گولاّو لق و بەروو گولّەکان دروست دەبێت. بەلاّم جۆری ( لوس )لەڕووەکەکاندا دروست دەبێنت و زیانێکی گەورە بۆ ڕووەکەکانی وەکو پەتاتەو داری ڕەز درەست دەکات وڕەز ئاستەمە لە ناو ببرێت.

## دار چۆن گەشە دەکات.

وەکو هەموو زیندەوەرانی تر، دارانیش پێویستیان بە خواردن هەیە تابتوانن گەشە بکەن.

لەکوێوە دار خواردنی دەست دەکەوێت ؟

دار لە خوّلەوە ئاوو مەوادی کانزایی وەردەگرێت، هەروەها دووەم ئۆکسدی کاربۆنیش لە هەوا. گەلاّی دار سوود لە وزری تیشکی خۆر وەردەگرێت لە دروست کردنی نەشەویات و شەکەریات و سلیلۆز. بەوەش دار هەڵ دەستێت بەکردارێکی

كمياوى تا بتوانێت بژیت و گەشە بكات. لە نێوان دارى دارێك و توێكڵەكەیدا، خانە گەلێك هەن پێیان دەوترى(( كروٚك )) كەئیشى دروست كردنى خانەى تازەیە. ئەوەى كە لەتەنیشتى دارەكەوە لە (( كروٚكە)) كە چەكەرە دەكات دەبێتە دار. بەلاٚم ئەوەى لە دیووى دەرەوەیەوە دروست دەبێت دەگیرسێت بوٚئەوەى ببێتە توێكلْ بەم ڕێگەیە، هەرچەند دارەكە تەمەن زیاتربكات تەنگە ئەستوور تر دەبێت. تیرەى دارەكە هەتا بێت گەوترە دەبێت بەلاٚم ئەمە لە توێلْكە كەیدا ڕوونادات، لەبەر ئەوەى توێكلْى دەرەوە دەڕزێت و دەمرێت و دەكەوێت. دارەكان گەشەدەكەن لە گەورەبوون و بەرز بووندا. لەسەرى هەلقێك یان چلێكدا. كوٚمەلێك خانەى زیندوو هەیە. لە كاتى گەشەكردنى چالاكدا، ئەو خانانە كەرت دەبن و خانەى تازە تر بەرهەم دەهێنێن. ئەو خانانە گەورە دەبن گەلاٚى تازە دروست دەكەن. سەرەڕاى دروست كردنى لق و پوٚپى تازە. بەم جوٚرەش درێژى لقەكان زیاتر دەبێت. دواى ماوەیەك ئەو خانانە لەسەرپەڕى لقەكەوە،

چالاكیەكانى كەم دەبێتەوە درێژ بوونیش لە لقەكاندا خاو دەبێتەوە !

بوٚیە ئەو خانانە تازانە وەكو توێكلْەكە ڕەق دەبن وشكوٚفەیەك دەهێنن، كە دەتوانین لە زستاندا ئەو شكوٚفانە بە سەردارانەوە ببینین. لە بەهاردا توێكلْى شكوٚفەكە دەڕزێت یان دەكەوێت لقەكەشى درێژ دەبێت بەو جوٚرە دەبینین بەهوٚى چینى كروٚكەوە لە دارەكەداو بەیارمەتى خانە چالاكەكان لەسەرى لقەكاندا. دارەكان بە درێژى وپانى گەشەدەكەن سالْ لەدواى سالْ. ئەگەر پارچەیەكى پان لەدار وەرگرین سەیر دەكەین گورزەیەك كالْو توٚخى تێدایە. جیاوازى ڕەنگە كانیش دەگەرێتەوە بوٚ جیاوازى قەبارەى ئەو خانانەى كە دارەكەیان درووست كردووە. گورزە كالْەكان كە كەخانەكانیان گەورە ترە لەوەرزى بەهار و سەرەتاى هاویندا دروست بوون. بەو جوٚرە ڕێژەى دروست بوونى دارەكە لەو سالْەدا دەزانین بە ئامار كردنى دەتوانین تەمەنى دارەكە بزانین !!.

## گەوهەرەكان (الجوهرە).

گەوهەرەكان لاى مروٚڤ جازبیەتێكى تایبەتى هەیە. خەلْكى بوٚیە ئەو گەوهەرانەیان لەمل كردوە بوٚ ئەوەى لە نەخوٚشى و چاوى پیس بە دووربن. باوەڕیشیان وابوە

هەندێك لە گەرهەرەكان هێزێكی تێدایە ئەوانەی بە خۆیانیدا دەكەن دەتوانن داهاتوو بخوێننەوە، وای بۆ دەچوون هەندێك لە گەوهەرەكانی تر دەتوانین كەسێكی تاوان باروو یان بێ تاوان بدۆزێتەوە. لە كۆندا خەڵكی بەهۆی ڕەنگەكانەوە گەوهەرەكانیان لێك جودا كردەوە. بەهەموو جۆرە بەنرخەكانیان (( یاقووت )) و بەهەموو بەردە سەوزەكانیشیان دەووت (( زمرد )) بەهەموو بەردەشینەكانیشیان دەون (( یاقووتی شین )). بەلاّم دوای ئەوە مرۆڤ دۆزییەوە كە هەندێك لەگەوهەرەكان لەهەندێكی تریان ڕەقترن و زیاتریش تەمەن دەكەن. لە بەر ئەوە نرخ و بەهای زێر پشتی نە دەبەست بە ڕەنگ و درەوشانەوەی و دەگمەنیەكەی بەڵكو بەڕەقیەكەشی. ئەمڕۆ ئەڵماس بە گرانترین گەوهەر دادەنرێت، سەرە ڕای جوانیەكەی بەلاّم ووشەی (( بەنرخ )) تەنها لەگەڵ چوار لە بەردەكاندا بەكار دهێنرێت ئەوانیش (ئەڵماس، یاقوت، زومرد، صفیران ) بەلاّم بەردەكانی تر نیمچە بەنرخن (( وەكو ئۆباڵی، صمیشت، توباز )) ئەڵماس گرانترین و سادەترین گەوهەرە.كەلەیەك توخم پێك دێت ئەویش كاریۆنی خاڵیسە. بەلاّم یاقووت و صفیر لەمادەیەكن پێی دەوترێت( كورندم )(( ئۆكسیدی ئەلەمنیۆم )) یاقووت بۆیە ڕەنگی سووری وەرگرتووە، بە هۆی بونی ڕێژەیەكی كەم لەئاسن لە كۆرۆندۆمەوە هەروەها بوونی جۆرەها ئۆكسیدی جیاواز وادەكات ڕەنگی صفیرە كەشینێكی درەوشاوە یان شینێكی مەخمەڵی بێت. زۆرێك لە حوانترین گەوهەرەكان لە مادەیەك دروست دەكرێن پێ ی دەوترێت ((سلیكات )) تۆباز و ترمالین لە گروپی سبیكاتن. هەروەها عەقیزی سوریش لە سلیكاتە. هەندێك لەو گەوهەرانەی سەر بە خێزانی كوارتزن لەوانە حمیشت. بەلاّم ئۆباڵ سلیكاتەكە بە ڕێژەی ئاو تیایدا لە ٥ بۆ ١٠ لە سەدە. بەو بۆنەیەوە ئۆباڵ یەكێكە لە بەردە بەنرخە كەمانەی كەخەڵكی باوەڕیان وایە شەڕ بۆ خاوەنەكانیان دەهێنێت. زۆرێك لە خەڵكی تا ئەم ڕۆژكارەش بەهۆی ئەو خوارافاتەوە ئۆباڵ لە مل ناكەن. ئەمڕۆ بوشێوەی دەستكرد زۆر لەو بەردانە لە كارگەكاندا دروست دەكرێت.

## كانزاكان

كانزا هەرچی माددەیەكە لە توێكڵی زەویدا هەبێن و لە شتێكی زیندەوە نەیەت.

هەندێك جار بە پترۆڵ و خەڵوز و بەردی قسڵی (الجیر ) دەوترێت ((کانزاکان )) لەبەر ئەوەی لە ئەورووەك وئاچەلانە پێك دێت کەپێش هەزارەها ساڵە لەسەر زەویدا ژیاون و کانزاش نەبوونە. کانزاکان دەکرێنە دووبەشەوە : کانزاییەکان و نا کانزاییەکان. لە کانزا کانزاییەکان ( ئاسن، مس، ئەلەمنیۆم ). لەکانز ناکاتزاییەکان وەکو کوارتز ( مرۆ) و ئەسبستۆس ( ئاوریشمی بەردین، کانزایەکە کە ناسوتێت و گەرما ناگەیەنێت، لە شێوەی دەزودایە و قوماش و (پارچە) و کەرەستەی تری نەسوزی لێ دروست دەکرێت. لەگەڵ کالیست دا ( کاربۆناتی کالسیۆمی کریستاڵ بوو ) کانزا هەیە لە شێوەیەك پێی دەوترێت ((کریستاڵی )) یان ((بلور)). زۆر ئاسانە جیاوازی نەکەین لە نێوان بەردەکان و کانزاکاندا. بەڵام جیاوازیش هەیە لە نێوانیاندا. کانزا پێکهاتەی تایبەتی خوی هەیە. پێکهاتەی کمییای کانزاکان هەرچیەك بێ هەر ئەوەیە. لە بەر ئەوەیە ئەو کانزایەی لە هەر شوێنێکی دوونیا دا بدۆزرێتەوە هەمان بریقەو رەقی و تایبەتمەندی هەیە. بەڵام بەردەکان لە تێکەڵەیەك لە چەند کانزایەك پێك دێت. بۆ نموونە گرانیت لە کانزاکانی وەکو کوارتو و گلسیار ( سلیکاتی ئەلەمنیۆم ) و میکە ( مادەبەکە لە شوشە دەچێت ) و مەوادی ترپێك دێت. دەشێت پارچەیەك گرانێت لە شوێنێکدا لە شوێنێکدا یەکێك لەوادانەی زیاتر تێدابێت وەك گرانێتێك لە شوێنێکی تر لە جیهاندا. کانزاکان لە زۆر شوێندا هەن. لە ناو بەرد دا لەلمدا لە بەردی بچووکدا بە شێوازێ زۆر و جیاواز. زۆر لە کانزاکان پێش چەندین ساڵە کریستاڵ و رشەق بوونە. لەبەردە زۆر گەرمەکاندا تواونەتەوە. ئەڵماس و میکە و فلوسبار نموونەی ئەو کانزایانەن کە بەو شێوەیە دروست بوونە. زۆربەی کانزاکان بەهۆی دەگمەنی و جوانینیانەوە زۆر بەنرخن. ئەو بەردانە پێیان دەورێت (( گەوهەر )) لەوانە ئەڵماس ئەقیقەی سوور تۆباز، زەرگۆن. لە لایەکی ترەوە کانزای وا هەیە دەشێت لە هەموو شوێنێك دەستی بکەوێت. بەربلاو ترینیان کانزای کوارتزە کە دووسەد جۆری هەیە و دەشێت لە هەموو شوێنێکدا دەست بکەوێت.

## ماسی کارەبایی.

لە دەریاکاندا چەندین جۆری ماسی هەن کە کارەبا بەرهەم دەهێنێنن !! ئەو

ووزەیە بۆ پاراستنی خۆیان و دەست خستنی خۆراکیان بەکاردەهێنن. بەلأم زانایان تا ئێستا نازانن ئەو ماسیانە چۆن ئەو کارەبایە بەرهەم دەهێنن. پر مەترسی ترین ئەو ماسیانە ماسی (( ئەنقلیسی کارەباییە )) کە لە زۆنگاوەکانی ئەمازۆن و ڕووبارەکانی ئەمریکایی باشووریدا هەیە. هەندێك پێ ی دەڵێن ((انقلیسی کارەبایی بەرازیلی )) ڕەنگەکەی ڕەشێکی تێرە. درێژیەکەی دەگاتە ١,٨ مەتر ئەمدامە کارەباییەکانی دەکەونە ژێری کلکیەوە. دەتوانێت گیاندارێك بە گەورەیی ئەسپێك بکوژێت. بەهۆی شرۆڤەی کارەباییەوە. ئەم ماسیە دەتوانێت کارەبایەك بەرهەم بهێنێت بەهێزی (٤٠٠ ) ڤۆڵت. لەگەڵ ئەوەدا ماسی وایان هەیە دەتوانێت (٦٥٠) ڤۆڵت کارەبا بەرهەم بێنێت. ماسی( سەلور) جۆرێکی تری ماسیەکە کارەبا بەرهەم دێنێت. لە ڕووبارە کانی ئەمریکادا هەیە و درێژیەکەی دەکانە ١,٢ م.

جۆری سێیەم ماسی (( تریشقەدار )) ە tor pedo. کە تەوژمی کارەبا بەرهەم دێنێت و لە ئاوە گەرمەکاندا دەژی و درێژیەکەی دەگاتە ١,٥ مەتر و کێشی دەگاتە ٩٠ کیلۆگرام. ڕەنگی لاشەی لە سەرەوە ڕەشە و لە ژێرەوە ڕەنگاو ڕەنگە و ئەو ئەندامانەی کارەبا بەرهەم دەهێنن دەکەونە نێوان سەر و لوتیەوە. تاقیکردنەوە زانستیەکان گەیشتۆتە ئەو ڕاستیە کە ماسولکەکانی ئەم جۆرە ماسیانە خانەی کارەباییان تێدایە، بەلأم بەبەکارهێنانی کارەبا کە توشی بەتاڵ بوونەوە دەبێت و دەبێت خواردنێکی باش و پشویەکی باش بدات، تا کارەباکە جارێکی تر پڕببێتەوە. گۆشتیشیان دەخورێت.

## چۆن تەنێك لە ئاسمان دەکەوێتە خوارەوە ؟

ڕاکێشان ئەو هێزەیەکە هەموو شتەکان لە گەردوون دا ڕادەکێشێت بەرەو هەموو شتەکانی تر. هەمان شت ئەو هێزەیە کەوا دەکات تەنەکان لە فەزاوە بکەونە خوارەوە بۆ سەرزەوی. پێش لە گالیلۆ (١٥٦٤ _ ١٦٤٢ ) هیچ کەس پێوانەی کاریگەری ڕاکێشانی نەکرد بوو خەڵکی وایان بڕوا دەکرد، خێرایی هەرشتێك بکەوێتە خوارەوە بۆسەرزەوی لەهەر بەرزیەکەوە لەسەر قورسیەکەی دەوەستێت.

گالیلۆ لەسەر قوللەی بینراوە ولە بەرزایی جیاجیاوە چەند شتێکی خستە خوارەوە سەیری کرد شتە قورسەکان شت و سووکە کان بەیەك کات دەگەنە زەوی!

گالیلۆ هەروەها لە بەرزاییەکەوە تۆپێکی خل کردەوە زۆربە شێنەیی. بۆ ئەوەی لە کاتێکی دیاری کراو دا شوێنەکەی بپێورێت. دەرکەوت کە زیادی خێرایی تۆپەکە دەگونجێت لەگەڵ ئەو کاتەی کە تیایدا خلۆر دەبێتەوە دەکات. ئەمەش مانای وایە لە کۆتایی دوو چرکەدا، بەخێرایی دوو ئەوەندەی خێرایی کۆتایی دوو چرکەی یەکەم گلۆر دەبێتەوە. هەروەها لە کۆتایی سێ چرکەدا بەخێرایی سێ بەرامبەر کلۆر دەبێتەوە و بەو جۆرە. هەروەها بۆی دەوکەت ئەو ماوەیەی کە دەیبڕێت دەگونجێت لەگەڵ دووجای کاتەکەیدا کە پێویستی بۆ خلۆر بوونەوە. لەبەر ئەوە لە کۆتایی دوو چرکەی دووەمدا، ماوەکە چوار جار ئەوەندەی ماوەکە بوو لەکۆتایی چرکەی یەکەمدا و لە کۆتایی سێ چرکە کەدا ماوەکە نۆ ئەوەندە بوو بەو جۆرە اسحق نیوتن دۆزینەوەی زۆر مەزنن لەسەر ڕاکێشان بەدەستی هێنا. نیوتن وای گریمان دەکرد ئەو هێزەی کەتەن ڕادەکێشێت بەرەو زەوی، دەبێت لەگەڵ درێژی ماوەکە داکەم بکات. لە ماوەی لێکۆڵینەوەکانی و بینیننەکانی ترەوە یاسای نیوتن بۆ ڕاکێشان هاتەکایەوە. بیرۆکەی بنەڕەتی ئەم یاسایە ئەوەیەکە دەڵێت : ئەگەر بارستایی هەرشتێکی یەك ڕاکێش دوو ئەوەندە بووەو. ئەو ڕاکێشانەکەش دوو ئەوەندە دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر نێوانیان دوو ئەوەندە بوەوە ئەوا هێزەکە دەبێتە ١/٤. البێرت ئەنیشتاین هەوڵی دا وەڵامی پرسیاری (( ڕکێشان چی یە ؟ )) بداتەوە کەوتی : دەکەڕێتەو بۆ ماوەیەکی _ کاتێکی چوار

لادار ئەم بیردۆزەکەی ئەنیشتاین (( ماوە بواری )) ی ڕکێشان پەیوەست کرابە، بوارەکانی کارەبا موگناتیسی و ئەلکترۆ موگناتیسیەوە بەلاّم ئێمە دەتوانین بلێین هیچ کەس نەیتوانیوە بە جۆرێك تەفسیری ڕاکێشان بکات کە هەموولا ڕازی بکات. ئێمە دەزانین ئەو خێراییەی کە ڕاکێشان دروستی دەکات ( ١٠) مەترە لەچرکە یەکدا. لە هەرچرکەیەکدا. ئەمەش مانای وایە. خێرایی تەنە بەربووەوەکە لەهەر چرکەیەکدا کەلێی دەکەوێتە خوارەوە (١٠) مەتر زیاد دەکات. لە کۆتایی چرکەی یەکەمدا بەخێرایی (١٠) م دەکەوێتە خوارەوە. هەروەها.لە کۆتایی دوو چرکەی یەکەمدا شتەکە بە خێرایی (٢٠) م و لە کۆتایی دوو چرکەکەدا بە خێرایی (٢٠) م کەوتەخوارەوە و لە کۆتایی سێ چرکەکەدا بە خێرایی (٤٥) مەتر.

## تیشکی ئێکس.

تیشکی X لە ساڵی ١٨٩٥ دا لە سەردەستی و لهلهم ڕونیتنگ لە ئەڵمانیا دا دۆزرایەوە، لە بەر ئەوە هەندێك جار بە تیشکی ڕۆنیتنگ یش ناو دەبرێت.

ئەم تیشکە وەکو تیشکی ڕووناکی وایەو دەتوانێت شتەکان ببڕێت، بەلاّم لە ڕووی درێژی و شەپۆلەکان و زەویدا جیاوازە لە تیشکی X دەشێت یەك لە (١٥) هەزار بۆیەك لە ملیۆنی درێژی شەپۆلی تیشکی X دەشێت یەك لە ملیۆنی درێژی شەپۆلی تیشکی سەوز بێت.

تیشکی X دەتوانین ئەو موادانە ببڕێت کە ڕووناکی ناتوانێت بیبڕێت. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کورتی شەپۆلەکانی. هەرچەندە شەپۆلەکە کورتی شەپۆلەکانی. هەرچەندە شەپۆلەکە کورت تربێت ئەوەندە توانای بڕینی زیاتر دەبێت. تیشکی X لە بواری تیشکی Xدا بەرهەم دەهێنرێت، هەوای ناو بۆریەکە دەردەهێنرێت بە جۆرێك کەمترلە یەك لەسەد ملیۆنی ڕێژە ئەسڵیەکەی زیاتر تێدا نامێنێتەوە لەو شوشەیەدا دوو جەمسەری کارەبایی هەیە کە یەکێکیان کاپودە _ جەمسەری سالب _ کە خولاّوێکی لەسیمی تەنەکستن ی تێدایە و کە توخمێکی فلزی یە لە دروست کردنی سلیکات دا بەکاردە هێنرێت لە گلۆپی کارەباییدا کە دەشێت بەڕەوتێکی کارەبایی گەرم بکرێت بۆئەوەی ئەلکترۆنات دەربکات. بەلاّم جەمسەر دووەم ((ئانۆد))ە واتە جەمسەری موجەب. ئەلکترۆنات لە کاپودە وە دەچێت بۆ

جەمسەری مووجەب بەخێراییەکی زۆر بەرز بەهۆی جیاوازی نێوان کاپود و ئانۆد. ئەلکترۆناتەکە بە خێرایی (٦٠) هەزار میل بۆ (١٧٥) هەزار میل لە چرکەیەکدا لە جەمسەری سالبەوە دەچن بۆ جەمسەری مووجەب. کاپود دەبێتە قاڵبێك کە تنکسنت یان ڕەوڕەوەیەکی تنگساتی و لە پردێکدا ئەلکترۆناتەکان دەوەستن و زۆربەی وزەی ئەلکترۆناتەکان دەگۆڕێن بۆ گەرما. بەڵام هەندێکی دەبێتە تیشکی X و لە پەنجەرەی ژێرەوە لە شێوەی تیشکی X دا دەردەچێت.

ئایا ڕۆژێك لە ڕۆژان پرسیارت کردوە چۆن تیشکی X وێنەی ئێسقان دەگرێت لە لەشدا ؟

((وێنەی )) تیشکی X وێنەیەکی تیشکی یان سێبەری یان پێچەوانەیە. تیشکی X بەو بەشەی لاشەدا ڕەد دەکرێت کە وێنە دەگرێت بەتیشکی X و سێبەر دروست دەکات لەسەر فلْچەکە. ئەو فلیمەش لە هەردوو دیەوە بە چینێکی زۆر هەستیار دا پۆشراوە. و وەکو هەر فلیمێکی تر دەشۆراوە.

ئەو ئێسقان و تەنانەی کە تیشکی X بەئاسانی لێوەی ڕەد نابێت، سێبەری زیاتر دروست دەکات لەبەر ئەوە وەکو خاڵی سپی لەسەر فلیمەکە بەدەردەکەوێت لە ئەمڕۆدا تیشکی X ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە بوارییەکانی پزیشکی و زانستی و پیشەسازیدا. یەکێکە لە کەرەستە هەرە بەسودەکان بۆ مرۆڤ.

## احافیرومستحاثات چی یە ؟ علم الاصائة - بیلۆنتۆلۆجیا .

لێکۆڵینەوەی لەسەر ( احافیرو مستحاپات ) زۆر گرنگە لە یارمەتی دانی مرۆڤدا بۆ زانینی ڕابردووی ئەو گیاندارانەی کە پێش لە ملیۆنەها ساڵە ژیاون. کە گوڕا بۆ زانستێکی جیاوازی پیٚ ی دەوترێت (( بیلۆ نتولوجیا )) یان زانستی (( احاپە )) کەلێکۆڵین دەکات لەسەر شێوەکانی ژیان لە سەردەمی جیۆلۆجی ڕابردوو دا. (( مستحاپات )) پاشماوەی ئەو شانە نین کە پێش چەندین هەزار ساڵ چوونەتە ژێر خۆڵەوە. وەکو هەندێك کەس وای بۆ دەچن.بەڵکو لە ڕاستیدا چەندین جۆری جیا وازن لە (( مستحاپات )) یەکەمیشی بەشێکە لە لاشەیەکی ڕاستی گیاندارەکە. کە لە ڕزین ڕزگاری بووە. وەکو خۆی ماوەتەوە. دەشێت ((مستحاپە ))قاڵبی شێوەکە بێت. ئەو قاڵبەی کە دوای فەوتانی لاشەی ڕوەکە کەیان ئاژەکە دەنێنێتەوە.

دەشێت(( مستحاپات )) تەنها شوێن پەنجەیان پاشماوەیەکی هێلی بێت کە لەسەر شوێنێکی ڕاستەقینە یە لە خودی گیاندارەکە. بەمانا بەشێکی ڕەقی لیَ بەجێماوە وەکو کەللەسەرو ئێسکە پەیکەرە بەلاَم بەشە نەرمەکانی دەڕزێن و لە ناودەچن. بەلاَم لەهەندێك حالەتدا، گیانداری وامان هەیە لاشەی نەرمە وەکو ماسی چرای دەریا کە ٩٩٪ ی ئاوە. ومستحاپاتی ساغی لەسەر بەردەکان بەجیَ هێشتوە، هەندیَ لەو مستحاپا تانەش کە لەناو بەفرەکاندادۆزراونەتەوە هەموو شتێکی خۆیانیان پاراستبوو. ئێسکە پەیکەر و ئەو ئێسقانەی کە بەگۆشت و پێست داپۆشرابوو. مستحاپەکان هیچ پەیوەندیەکیان بە قەبارەوە نیە. دەشێت مستحاپاتی مێرووڵەی هێندە بچووك بدۆزنەوە کە پێش لە ملیۆنەها ساڵە ژیابێت. هەلی مانەوەی ئاژەڵەکان وەکو مستحاپات، لەسەر ئەو شوێنە دەوەستێت کە تیایدا دەژی. زۆرترین جۆری مستحاپان لە ڕووی ژمارەوە گیاندارە ئاویەکانن لەبەر ئەوەی کاتێك دەمرن قوڕدای دەپۆشێت بەلاَم گیاندار و ڕووەکە ووشکانیەکان توشی خراپ بوون دەبن بەهۆی کەش و هەواوە. بە هۆی لێکۆلینەوە لەسەر مستحاپەکان دەزانین ئەو کیاندارانە چی بوون کەپێش لەسەدان ملێۆن ساڵە ژیاوون. بۆ نموونە ئەو مستحاپانەی کە لە پوکاوە دیاری کراوەکانە وەری دەگرێت، پێمان دەڵێت کەپێش لەملیۆنەها ساڵ سەردەمی خشۆکەکان بووە کە ئاژەڵ گەلێکی گەورە بوون بەدرێژی ٢٤ مەتر و بەکێشی ٣٦ تەن. و پیان ووتراوە (( داینە صوورەکان )) زانیاریشمان سەربارەت بەباڵندەیەك کە پێی ووتراوە باڵندەی یەکەم پشت بە مستحاپەیەك دەبەستێت کە تازە دۆزراوەتەوە.

## جۆرەها هەوری جیاواز !

کاتێك هەوای گەرمی شێدار بەرز دەبێتەوەتا بەرزیەکی دیاری کراو هەور دروستی دەکات. هەوا گەرمەکە سارد دەبێتەوە. لە پلەی گەرمای زۆر سارددا، ناتوانێت ئەو هەموو شێیە لە شێوەی هەلَمی ئاودا هەلَبگرێت. لەبەر ئەوە شیَ زیادەکە دەگۆڕێت بۆ دلۆپەی ئاو یان بەفر. ئەمەش هەورێك دەهێنێت. هیچ هەورێك نیە لە هەورێکیی تربچێت، هەروەها بەردەوام شێوەی خۆیان دەگۆڕن هۆی دروست

بوونی جۆرەها هەور ئەوەیە کە هەورەکان لەبەرزی جیاوازداو لە ژێر پلەی گەرمای جیاوازدا دروستی دەبن هەورەکان گەردیلۆکەی جیاواز دروست دەبن بەپێی بەرزی و پلەی گەرمیان. بەرزترین هەور بەرزیەکەی دەکاتە ۳۰ بۆ ٥٠ میل و پێ ی دەوترێت هەورە گەشەکان هەورێکی تر هەیە پێی دەوترێت (( تەولیە )) ((لالیئ )) کە بەرزیەکەی لە نێوان (۱۲)بۆ (۱۸) میلدایە و هەورێکی زۆر ناسکە و چەندین ڕەنگی جوانی لە خۆ گرتوە و لە تۆزو دلۆپی ئاو پێکهاتووە لە دوای خۆرئاوا بوون یان بە شەوان یان پێش خۆرهەلاتن نەبێت تا بینرێت. هەورێکی تر هەیە لەوان نزمترە و بەرزیەکەی لە نێوان (٥) بۆ (۷) میلدایە پێی دەوترێت ((گخرور )) کەشێوەی لە پەڕو دەزوو دەچێت. هەموو هەورەکات لە پارچەی بچووکی بەفر پێك دێن. بەلام هەورە خاوەکان لە دلۆپەی ئاو پێك دێن. لەسەروی ئەوانیشەوە هەوری ترساندن هەیە کە (۲) میلەوە بۆ (٤) میل لە زەویەوە بەرزترە.کە لە قەبارەی خڕ پێك دێت و لە هەوری پلنبگ گەورە ترە. لەهەمان ئاستدا هەوری (گخرو ) هەیە کە بە گشتی ڕەنگێگی خۆلەمێشی دەداتە ئاسمان ومانگ و خۆر تیایدا وەکو خالێك لە تیشکی ( الباهت )دیارن. لە بەرزی نزیکەی یە لە زەویەوە هەوری ( القرد ) هەیە، کە بریتی یە لە گۆڕانێکی ڕەش گەورە لەسەر بنکەیەکی ئاسۆیی بەریان. لە هەمان ئاستدا هەوری ( المگارە )هەیە کە پێشی دەوترێت (الخسیف ) زۆر ئەستورە و ڕەشە و شێوەی نیە لە بەرزی کەمتر لەوە نزیکەی (٦١٠ ) مەتر بەرز لە زەویەوە. هەوری ( الرهج )هەیە کە بریی یە لە تەم. دوو جۆری تر کە بریتین لە ( الفزع، الرکام ) ئەو دوو هەورە زۆر گەورەو ئەستورن و هەورە تریشقە یان لەگەلدا یە.........

## ماوەی نێوان زەوی و خۆر بەتەواوی چەندە ؟

ئایا دەزانن بۆ چی دوونیا لە هاویندا گەرمە و لە زستاندا ساردە ؟

هۆیەکەی ئەوەیە شوێنی میحوەری زەوی بەنسبەتی خۆرەوە دەگۆڕێت لە کاتی سوڕانی زەوی بە دەوری خۆردا. ئەو گۆڕانە زۆر کەمە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەلْ ئەو نێوانە زۆرەی نێوان خۆر و زەوی بەسە بۆ گەرم کردنی کەش لە هاویندا و سارد کردنی لە وەرزی زستاندا. دەتوانن تەسەروری کەن ژیان چۆن

دەبوو ئەگەر ماوەی نێوان خۆر و زەوی زۆە خێرابگۆریایە ؟ ئەگەر زیاد لە پێویست لە خۆر دووربکەوینەوە دونیا زۆر سارد دەبێت و ژیان لەسەری موستەحیل دەبێت. ئەگەر زیاد لە پێویستیش لێی نزیك بکەوینەوە ئەو گەرماکەی دەمان سوتێنێت. لەبەر ئەوە ماوەی نێوان زەوی و خۆر تا ئەندازەیەکی زۆر عەینی ماوەیە کە بەژمارە دەکاتە ٩٦ ملێون میل. بەلأم مەداری هەسارەکانی دەوری خۆر بەتەواوی بازنەیی نیە. هەروەها ماوەی نێوان خۆر و زۆر لە هەسارەکانی تر لەماوەی ساڵە کەدا گۆڕانی بەسەردا دێت. بۆ نموونە مەداری پلۆتۆ بە دەوری خۆردا لە نێوان هەموو هەسارەکانی تردا کەمتر سوڕاوەترە. ماوەی نێوان ڤینۆس و خۆر لە نێوان ٦٧و٦٨ ملیۆن میلدایە. بەلأم مەریخ گەشتەکەی بەدەوری خۆردا ٦٨٧ ڕۆژ دەخایەنێت. لە ماوەی ئەو گەشتەدا ماوەی نێوانی و نیوانی خۆر دەگۆڕێت. بەلأم بەمام ناوەندی دەگاتە نزیکەی ( ٠٠٠, ٧٠٠, ١٤١ ) میل موشتەری نموونەی ئەو هەسارانەیە کە نیوانی لەکەڵ خۆردا زۆر دەگۆڕێت............

## کێ تەلەفزیۆنی داهێنا ؟

تلفویۆن کردارێکی ئالۆزە، لە دروست کردن پێش خستنیدا خەڵکێکی زۆر بەشداری یان کردووە. لەبەر ئەوە کەسێك بەتەنیا تەلەفزیۆنی دەستپێکرد لە ساڵی ١٨١٧ دا بوو. کاتێك کمییاگەری سویدی (( جونس برزلیوس )) ی توخمی کمیایی ( سلنیوم ) ی دۆزیەوە. کە توخمێکی ناکانزاییەو هێماکەی ( سل )ە. دوای ئەوە دەرکەوت ئەوە دەرکەوت ئەو بڕە تەزوە کارەباییە کە سلنێۆم دەیگوزێتەوە پشت بەو بڕە تیشکە دەبەستێت کەدەکەوێتە سەری. ئەم تایبەتمەندیەش پێ ی دەوترێت تایبەتمەندی کارەبای تیشکی. ئەو دۆزینەوەیە لە ساڵی ١٨٧٥ دا ڕابەراتی داهێنەری ( ئەمریکی جی ار. کاری )) کرد بۆ دروست کردنی سیستەمێکی تەلەفزیۆنی سەرەتایی بەبەکارهێنانی خانەی کارۆتیشکی. هەر خانەیەك لەو خانانە تەحەکومی بەبڕی ئەو کارەبایەوە دەکرد کە دەنێررا بۆ بوسەیلە تیشکیەکە لە ئەنجامی ئەوەشدا هێڵە گشتیە سەرەتاییەکان بۆ وێنەکان دەرکەوتن لەسەر کۆمەڵە خانە کارۆ تیشکیەکان بەتیشك خستنە سەر بوسەیلە تیشیکیەکان.

داهێنانی ( پەپکەی سڕینەوە ) لە ساڵی ١٨٤ دا لەسەردەستی پۆڵ بیبکاو پێشکەوتنێکی تر بوو. ئەم پەپکە کونی تێدا بووبە بەردەم خانە کارۆتیشکیەکاندا دەسوڕایەوە سەرەڕای پەپکەیەکی تر بەبەردەم دیمەنەکاندا دەسوڕایەوە. بەلاّم مەبدەئی ئەم داهێنانە هەمان مەبدە بوو کە دۆزینووەکەی کاری کردی. لە ساڵی ١٩٢٣ دا یەکەم پەخشی کرداری بۆ وێنەکان کرا لە ڕێگەی نەلەوە. ئەمەش هەردوو (( بیرد )) ی ئینگلیزی و ((جنگنیز )) ی ئەنریکی کردیان. دوای ئەوە چاکسازی گەورەتر کرا لە پێشخستنی ئامێرەکانی وێنەگرتنی سینەمایدا. هەر یەك لە فلادیمیر زۆریکین و فیلو فارسوورت هەستان بە پێشخستنی دوو جۆر لەکامێراکە یەکێکان بە ((ئینۆنۆسکوب )) ودووەمیان بە (( شیکەرەوەی وێنەکان )) ناسراو بوون. بەداهاتنی ساڵی ١٩٤٥، بوریەوەر گرەکان لە هەردوو ئەو دوو ئامیرایەدا گەوڕان بۆ (صمامات ) تلفزیۆنی وێنەوەرگر. لە ئێستادا ئامێری تلفزیۆنی نۆی یوریەدابۆ وێنە بەکار دەهێنێت کەبە (( بۆری تیشکی ماپود )) ناسراوە. لەم بۆریەدا دەمانچەیەکی کارەبایی هەیە، کەشاشەکە ڕێگە دەدات وەکو ئەوەی، چەپکە تیشکەکە دەیکات لە یۆری کامێرا دا. بۆ ئەوەی بتوانێت وێنەکە ببینێت. بەلاّم ئێستا تلفزیۆن لەوپەڕی پێشکەوتندایە بەتایبەت دوای ئەوەی تلفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ دا هێنراو بەتایبەت تر دوای داهێنانی ئامێری کۆنترۆڵ لەساڵی ١٩٨٦ دا.

## گۆرانی فۆلکلۆری چیە ؟

لەسەرەتای مرۆڤایەتیەوە. خەڵکی گۆرانی فۆلکلۆریان وتووە. چەندین جۆر لە گۆرانی فۆلکلۆری هەیە کە زەحمەتە وەکو گۆرانی فۆلکلۆری بناسرێت بەلاّم بنەمای گۆرانی فۆلکلۆری باسی ئەوە دەکات خەڵکی لەبەرامبەر ژیاندا چۆن هەست بکەن. چون ژیان لەشتی زۆر پێك دێت، بۆیەبابەتی گۆرانی فۆلکلۆری زۆر لە بابەتەکان چارەسەرەکات. یەکێك لەوانە گۆرانی کارە , کاتێك کرێکاران یان جوتیاران کاری خۆیان دەکەن ئەو گۆرانیە دەلێنەوە هەروەها گۆرانی پیشەش هەیە کە لەهەرکاتێکدا دەشێت بووترێت. هەروەها گۆرانی شوان و پێلاّوچی و دارتاش و ئاسن گەر و بەرگدروش هەیە.

جۆرێکی ترلە گۆرانی فۆلکلۆری هەیە کە پەیوەندی بە خۆشەویستی و زەواجەوە هەیە، یان دەشێت یاری مندالاّن گۆرانی فۆلکلۆری خۆی هەبێت. هەندێك لە

گۆرانیە فۆلکلۆریەکان ڕاستی لەگەڵ خەیاڵدا تێکەڵ دەکات، ئەو گۆرانیانە بەمەبەستی سەر گەرمی یان حیکایەتێکی درێژە یان هیچ مانایەکی نیە. گۆرانی فۆلکلۆری هەیە پەیوەندی بەگیاندارانەوە هەیە. هەروەها گۆرانی فۆلکلۆری ئاینی یش هەیە. لەگەڵ بونی گۆرانی فۆلکلۆری کەپەیوەندیان بەوەرزو مەوسمەوە هەیە. دەبێت بزانین چەندین جۆری تری گۆرانی فۆلکلۆری هەیە کەپەیوەندی بەشایی و گۆڤەندو خەواندنی منداڵ و جەنگ وژیانی سەربازیەوە هەیە. بەوجۆرە دەبینین گۆرانی فۆلکلۆری دەشێت هەرشتێك لەژیادا باس بکات.

## ئۆزۆن چییە؟

ئۆزۆن شێوەیەکە لەشێوەکانی، ئۆکسجین توخمێکی کمیاویە، توخمێکە زۆرترین بوونی هەیە لەسەر زەویدا. کەنزیکەی ١/٥ هەواپێك دەهێنێت. نیترۆجینیش زۆربەی باقیەکەی هەاوپێك دەهێنێت.

ئۆکسجینی سادە لەشێوەی گەردیلۆکدا هەیە پێ ی دەوترێت((ئۆزۆن)) کە لەسێ گەردیلەی ئۆکسجین پێك دێت. زۆربەی ئۆزۆن لەچینی سەرەوەی جەودا دروست دەبێت لەسەر دەستی تیشکەکاتی سەرو وەنەوشەیی. ئەوتیشکانەش گەردیلۆگەکانی ئۆکسجین شیتەڵ دەکەن یوگەردیلەی ئۆکسجینی سەربەخۆ. کاتێك هەندێکی ئەوگەردیلانە دەگەنە گەردیلۆکەکانی ئۆکسجینی تر ئۆزۆن دروست دەبێت. ئۆزون لەچینێکدا کۆدەبێنەوە بەرزیەکەی لەنێوان ١٩_٣٥ کیلۆمەتر لەسەرڕوی زەویەوە بەرزە. ئەم چینەش پێی دەوترێت چینی ئۆزۆن. کەژیان لەسەر زەویدا دەپارێزێت بەپاڵفتەکردنی هەندێك لەتیشکە بەهێزەکانی خۆر. لەسەردەستی ئامێری تیشکیX و ئامێرەکانی تری کارەبایی هەورەتریشقەدا لەنزیك زەویەوە ئۆزۆن دروست دەبێت. دەشێت لەکاتی بڕینەوەی پارچە ئاسنێکدا بەئۆکسجین تیشکێکی شینت چاوپێ کەوتبێت. ئەوتیشکە هێمایەکە بۆئەوەی ئۆزۆن دروست دەبێت. ئۆزۆن بەشێوەیەکی خێراتر لەئۆکسجین لەگەڵ مەوادەکانی تردا یەکدەگرێت. ئۆزۆن بەخێراییەکی زیاتر میکرۆبەکان دەکوژێت لەبەرئەوە لەپاککردنەوەی ئاوو شوێنەگشتیەکاندا بەکاردەهێنرێت. هەروەها لەسپی کردنەوەی زۆرلەکەوادە یەکارهاتووەکاتی وەکو مۆم و قوماش و ئارددا بەکاردەهێنرێت، ئۆزۆن بۆنێکی(کارەبایی) بەهێزی هەیە ئەگەر زۆری لێ هەڵبمژرێت عەزیەتی سنگ دەدات.

## ئايا مێرووله هەستی بۆنكردنی هەیه؟

مێرووله زیندەوەرێكی هێندە سەرسوڕهێنەرە لێرەدا بوارنیە بەتەواوی باسی لێوەبكرێت. لەبەرئەوە هەندێك ڕاستی لەسەری دەخەینە ڕوو لەئێستادا. یەكەم لەهەموو شوێنێكدا مێرووله هەیه، لەلمی بیابانەكاندا، لەمێرگەكاندا، كەناری دەریاكان، بناری چیاكان، لەدارستانەكاندا، بەكورتی لەهەموو شوێنێكی دونیادا، جگەلە لوتكەی چیا زۆربەرزەكان ! بەواتا مێرووله لەگەڵ هەموو جۆرە كەش وهەوایەكدا هەڵ دەكات. هەزاران جۆری جیاواز لەمێرووله هەیه. بەڵام هەموویان پەیوەندیان بەهەنگ وزەردەواڵەوە هەیه. بەواتا سەربەهەمان گروپن لەمێرووەكاندا. هەمووجۆرەكانی مێرووله كۆمەڵایەتین. بەواتا بەكۆمەڵ لەشارێكدا دەژین. هەرشارێكیشیان سێ جۆر مێرووله لەخۆدەگرێت. نێرومێ پادشاكان كرێكارەكان، نێرومێی زۆربەی جۆرەكانی مێرووله باڵیان هەیه، بەڵام كرێكارەكان بەبێ باڵن، شاش دوای فڕین وگەشتەكەی بۆ(جوت بون) لەبەڵەكانی ڕزگاری دەبێت. شارە ‹مێرووله‌كان لەقەبارەیاندا جیاوازیەكی زۆریان هەیه. هەندێكیان چەندسەد مێروولەیەك تیایدا دەژێت و هەندێكی چەند سەدان هەزار مێرووله لەخۆدەگرێت!

هەرچەندە مێرووله‌كان لەلاشەدا جیاوازیان بەڵام هەموویان بچمیان وەكویەك وایە. هەریەكەو جووتێك (مجە) ی درێژیان لەسەردا هەیەو بەبەردەوامی هەردووكیان دەسوڕێنەوە تەنها بۆ (جس) ی بەكار ناهێنرێت بەڵكو وەكو دووئەندام بۆبۆنكردنیش بەكاری دەهێنێت. هەروەها ئەو دوومجە لەسەردا بەیارمەتی مێروولەكە دەدات بۆناسینی مێرووله‌كانی ترو پەیوەندی كردن پێیانەوە. مێشكی مێرووله لەناو سەریدایە لەگەڵ جوتێك چاودا لەگەڵ دوو(كەلاوە)ی بەهێزی دەمیدا سەرەڕای ئەودووچاوە، مێرووله ئەندامی تریشی هەیە بۆبینین. سوڕی ژیانی مێرووله زۆر سەرسوڕهێنەرە. مێینەكە دەفڕێنە ئاسمان و نێرینەكە پێی دەگات ئەمەش فڕینی زەواجە، دوای ئەوە یەكسەر مردنی نێرینەكەی بەدواوەدێت. مێینەكەیان دەمێنێتەوە بەتەنیا بۆئەوەی شارێكی نوێ دروست بكات.

بۆیەدەست دەكات بەهەڵكەندنی لانەكەی وهێلكەكانی تیادا دادەنێت دوای ئەوەهێلكەكە دەتروكێت (كرمۆكە)بچووكەكان بەبێ قاچ دەردەچن و دایكیان یارمەتی هەریەكەیان دەدات بۆ چنینی (شرنقە) یەك بۆیان. كاتێك یرقانەكە

گەشەدەکات دایکەکە(شرنقە) کە دەشێکێنێت و مێروولە بچووکەکەی تێدا دەردەکات. لەگەڵ دەرچوونی مێروولەکە دەست بەئیش کردن دەکات لەشارە تازەکەیدا.

## دۆلفین چۆن دەتوانێت قسەبکات ؟

لەم ساڵانەی دوایدا میدیاکان زۆریان لەسەر ئەو تاقیکردنەوانە باسکرد سەبارەت بەزیرەکی دۆلفینەکان و پەیوەندی کردن پێیانەوە!

ئایا دەزانن دۆلفین چیە؟

دۆلفین ماسی نیە، بەڵکو ئاژەڵێکی شیردەرە و سەربەگروپی نەهەنگەکانە. وەکو شیردەرەکانی تر شیردەدات بەبێچوەکانی. وەکو نەهەنگ دۆلفینیش لەڕێگەی((کونەکانی فوەوە)) هەناسە دەدات، کەبریتی یە لەکونێك لەلوتیدا دەکەوێتە سەری سەریەوە. کاتێك دێتە سەرئاوەکەوە لوتی دەکاتەوە بۆئەوەی هەوالێیەوە هەڵمژێت.

لەشتە سەیرەکانی دۆلفینکلکی بەئاسۆیی دەوەستێت. نەك بەئاسۆیی لەگەڵ لاشەدا وەکو کلکی ماسیەکان. کەیارمەتی دۆلفین دەدات بۆچوونە ژێرئاوو بۆچونەژێر ئاو بەخێرایی و هێزەوە. کەمرۆڤ سەیری دۆلفین دەکات لەکاتی مەلەوانی کردندا لەزەتی لێوەردەگرێت. دۆلفین بەزنجیرەیەکی درێژ لەپێچاوپێچ مەلەوانی دەکات تابیوانێت بێتە دەرەوەو تاکونی لوتەوانەکەی بکاتەوەو ئینجا بچێتە قولاییەوە.

ئایا دۆلفین قسە دەکات؟

کاتێك بیرلە قسەکردنی گیاندارێك یان باڵندەیەك دەکەینەوە مەبەستمان ئەوەیە ئایا دەنگ دەردەکات وەکو مرۆڤ.

لەبەرئەوەی وەکو دەزانین زۆربەی گیاندارانە جۆرە ڕێگەیەکیان هەیە بۆپەیوەندی کردن بەیەکەوە. هەندێك جار ئەو ڕێگەیە زەۆر سادەیەو لەهەندێك جاری تردا زۆر ئاڵۆزە وەکو لە نەهەنگدا هەیە ئەوەی لەسەر دۆلفین زانراوە ئەوەیە دەتوانێت لاسایی قسەی مرۆڤ بکاتەوە!

هەر لەخۆشیەوە ئەوەدەکات. بۆنموونە جارێکیان لەستۆدیۆ دەریاییەکانی ئەمریکادا لەویلایەتی فلۆریدا. دۆلفینێك لاسایی دەنگی پیاوێکی کردەوە. بەشێوەیەکی زۆرجوان کاتێك ژنی پیاوەکە گوێ لێ بوو دەستیکردبە پێکەنین

هەمدیسانەوە دۆلفینەکە لاسایی پێکەنینی ژنەکەشی کردەوە !
لەژێ دەنگیەکانی دۆلفیندا شتێك هەیە کەدەتوانێت وەکو دەنگی مرۆڤ دەنگ دەرکات. بەلاّم سەرەڕای ئەوانەش بڕوا وایە کەدۆلفین زیرەکترینی ئاژەلّەکانە. بەجۆرێکی سەیر هاوکاری لەگەلّ مرۆڤیشدا دەکات.
بەلاّم دەبێت دۆلفینەکان فێربکرێن بۆگواستنەوەی واتاکان پێش ئەوەی بلّێین دەتوانێت ((قسەبکات)) تا ئێستا نازانین ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان ئەوە ڕوبدات.

## جالّجالّۆکە تۆڕی خۆی لەچی دروست دەکات ؟

ئەوەی کەزۆر سەرنجمان ڕادەکێشێت تۆڕی جالّجالّۆکەیە. بەلاّم خودی جالّجالّۆکە لەزۆر ڕووەوە لەگیاندارێکی سەیرە، فەرموو لەگەلّ چەند ڕاستیەکدا لەسەرجالّجالّۆکە:_
جالّجالّۆکە لەهەموو جۆرە کەش و هەوایەکدا دەژێت. لەهەوا لەسەر ئاو لەووشکانی لەژێرئاو. لاشەی جالّجالّۆکە جیاوازن لە ((۸)) سامتینمەترەوە تا ئەندازەیەك کە بەچاو نابینرێن. جالّجالّۆکەی گورگی دەتوانێت تەیرو چۆلەکە بخوات و دەشێت تا ((۱٥)) سالّ تەمەن بکات. بەلاّم زۆربەی جالّجالّۆکەکان لەیەکسالّ زیاتر تەمەن ناکەن!
لەڕاستیەکانی ترلەسەر جالّجالّۆکە ئەوەکە مێروونین سەربەگروپەێکن پێیاندەوترێت (( جالّجالّۆکەییەکان)) کەهەریەك لەجالّجالّۆکەکان و دووپشك و ئەسپێ دەگرێتەوە. جیاوازیەکی تری لەمێروەکان ئەوەیە هەشت قاچی هەیە و هەروەها هەشت چاوو، بالّیان نیە لاشەی تەنها لەدوو بەش پێك دێت. جالّجالّۆکەکان ئەو ئاوریشمەی کەتۆڕەکەی لێ دروست دەکات لەناو لویەکی تایبەت دروست دەکات لەناوسکیایە فشاری دەخاتە سەرو لەڕێگەی کونێکی زۆربچووکەوە دێتەدەرەوە کەلای سکیەوەیەتی و بەشێوەی شلیەك و لەگەلّ هەوالیّ داووشك دەبێتەوە.
ئاورشمی جالّجالّۆکەکان جۆراوجۆرن هەیانە لینجە کەبۆ ڕاوکردنی خۆراکی بەکاری دەهێنێت.
هەشیانە ڕەق و لینج نیە کەبۆ محوەری تۆڕەکەی بەکاری دەهێنێت. هەیانە بەجۆرێك دروستی دەکات هێلکەکەی تێدەخات. هەندێك لە ئاوریشمی جالّجالّۆکەکان نەرمەو لەگەنەموو دەچێت هەندێکیشیان ڕەقن لەلیمف دەچن.

جاڵجاڵۆکەکان هەموو شێوە تۆڕێك دروست دەکەن. هەیانە خڕەوەکو تایە. کەتەنها بۆ ڕاوکردن بەکاری دەهێنێت. بەچوارچێوەیەکی زۆربەهێز دروستی دەکات. بەشێوەیەکی ناڕێك ئینجا تۆڕێکی بازنەیی تێدا دروست دەکات. دوای ئەوە سێ چوار (سعالات لولبیە) ی تێدا دادەنێ جۆرێکی تر تۆڕهەیە کە جاڵجاڵۆکەکە لەشێوەی گومیە دروستی دەکات لەئاوریشم و خۆی لەسوچێکیدا دەژێت.

هەروەها جاڵجاڵۆکە تۆڕێك دروست دەکات لەپشتی دەرگاکانەوە وەکوداو وایە لەشێوەی شوشەداو دەیکاتە شوێنێی خۆی ولەلای سەرەوەی کونێکی تێدایە پیسی تێدەکات. جاڵجاڵۆکە گورگیەکانیش چاڵێك لەژێر زەویدا هەڵ دەکەنن و سەرەکەی بەئاوریشم دەتەنن. بەڵام جاڵجاڵۆکەی ئاوی ئەورووپی ماڵەکەی بەتەواوی لەژێی ئاودا دروست دەکات. ئەم جاڵجاڵۆکەیە تۆڕەکەی پڕ لەهەوا دەکات کەلەسەر ئاوەکەوە دەیگوێزێتەوە. بەناو ئەو موانەی لەسکیدایە. لەم ماڵەدا مێینە ئورووپیەکان هێلکەی خۆیان دادەنێن و بێچووەکانیان بەخێودەکەن تائەوەندە ئەو بێچوانەدەتوانن ماڵی خۆیان دروست بکەن. هەموو جاڵجاڵۆکەکان تۆڕ دروست ناکەن. هەندێکیان تەنها ژورێك بۆخویان دروست دەکەن لەناوگەڵا یان تۆڵێکی دارێکدا.

## بۆچی جاڵجاڵۆکەناکەویتە داوی خۆیەوە؟

جاڵجاڵۆکە زۆر زیرەك و فێڵ بازەو، دەزانێت چۆن ڕاوی مێروان دەکات.

بەڵام ئەگەر تۆڕیجاڵجاڵۆکە لینجەو دەنوسێتە مێروەوە، ئەی بۆچی خودی جاڵجاڵۆکە ناگرێت؟

ڕەنگە لەوەڵامی ئەم پرسیارە سەرەتان سوڕبمێنێت. تۆڕی جاڵجاڵۆکە بەخۆشیەوە دەنوسێت !

دەشێت تۆڕی جاڵجاڵۆکە بەدوای خۆی، ئەوەیەکە ماڵەکەی لەناو تۆڕەکەیدایەو. دەزانێت ئەوڕێگا کامەیەکە دەیگەیەنێتە ماڵەکەی. کاتێك لەسەرەتاوە جاڵجاڵۆکە تۆڕەکەی دروست دەکات، هێڵی بێوەی بۆ خۆیدەکێشێت کەبۆ هاتووچۆکردن بەکاری دەهێنێت. جاڵجاڵۆکە چەندین جۆر لەئاوریشم دروست دەکات. جۆرەلینجەکەی بۆڕاوکردنی. نێچیرەکانی بەکار دەهێنێت بەڵام چەندجۆرێکی نالینجیش دروست دەکات و بۆپشتیوانی بەهێزی تۆڕەکەی بەکاری دەهێنیت.

ئینجا جاڵجاڵۆکه ئەو تۆڕە لینج و نالینجانه باش لەیەك دەکاتەوەو بەئاسانی خۆی لەجۆرە لینجەکە لادەدات ! جاڵجاڵۆکه لەبەرئەوەی هەستی دەست لێدانی زۆر بەهێزە بۆیەدەتوانێت بەئاسانی لەیەکیان جیابکاتەوە.

## ئایا تیمساح هێرش دەکاتەسەر مرۆڤ؟

جگەلەماری کوبرا، دەشێت تیمساح لەهەموو گیاندارانی تر، مرۆڤ زیاتر بکوژێت. چەند جۆرێکی دیار له تیمساحەکان وەکو تیمساحی ئەفریقی وتیمساح ئاوەسوێرەکان بەڕاستی مرۆڤ خۆرن. ئەو خەڵکانەی لەنزیك ئەوشوێنانەن کەتیمساحی تێدایە، لەهەمووگیانداران زیاتر لەتیمساح ئەترسن، هەندێك لەوتیمساحانه نەتەنها ئەگەر لێی نزیك بینەوە هێرش دەکاتەسەرت، بەڵکو لەئاوەکە دێتەدەرەوە بۆئەوەی نێچیرەکەی بگرێت. ڕایکێشێتە ناوئاوەکەوەو بیخنکێنێت. قاتور(تیمساحی ئەمریکی Alligator ). پەیوەندیەکی زۆربەهێزی هەیە لەگەڵ هەندێك جۆری دایناصوری لەناوچوودا.، گیاندارێکی زۆرگەورە بووەو لەمارمێلکە چووەو درێژیەگەی نزیکەی (٢٤)مەتر بووەو پێش سەدەگەلێگی زۆر بەسەرزەویدا گەڕاوە. تائەم سەردەمەش تیمساحەکان گەورەترین خشۆکی سەرزەوین. هەندێکیان هێندە گەورە دەبن تادەگەنە درێژی (٧) مەتر.
مێینەی تیمساح(٢٠)تا(٩٠) هێلکە لەسەر دادەنێت. لەناو لانەیەکدا کەبە پوش وپەلاش دروستی دەکات و لیَ دەگەڕێت تالەگەرمای خۆردا هەڵدێت. دایکانەکەش لەنزیکییەوە دەوەستێت وسەیری دەکات تاکاتێك هەڵدێن یارمەتی بێچوەکانی بدات، زۆربەی خشۆکەکان ناتوانن دەنگ دەرکەن. بەلاَم تیمساح وقاتور دەتوانن دەنگێگی بەرز لەشێوەی قوڕەدا دەرکەن. قاتور تەنها لەئاوە گەرمەکاندا دەژێت لەئەمریکاو چین دا. بەلاَم دەتوانین لەولاَتەکانی ئەفریقا و ئاسیاو ئوسترالیا وئەمریکاشدا تیمساح بینین. پێش سەدساڵ مرۆڤ دۆزییەوە کەپێستی قاتور زۆر بەسوودە لەپیشەسازی بەرهەمە چەرمیەکاندا وەکو پێلاَو وجنتای دەست وقامیشی پشت. لەئەنجامی ئەوەدا لەئێستادا قاتور بووە بەگیاندارێکی دەگمەن.

## دایناصورەکان چۆن دروست بوون؟

زانایان بڕوایان وایە دایناصورەکان پێشی(١٨٠) ملێون ساڵە هاتوونەتە بوونەوەو پێش لە(٦٠) هەزار ساڵەلەناوچوونه. دەبێت دایناصورەکان لەخشۆکەکانەوە پەرەیان سەندبێت.لەبەرئەوەی لەوانن. بەوبۆنەیەوە خشۆکەکان گرووپێکی

تایبەتین لەگیانداران کەئەم تایبەتمەندیانەیان هەیە:خوێنیان ساردە، دەتوانن لەووشکانیدا بژین، دڵیان لەجۆرەێکی تایبەتیە، زۆربەیان پولەکەیان پێوەیە. خشۆکەکان بەماوەیەکی زۆربەر لەدایناصورەکان پەیدابوونە. لەووشکاوی چوونە(ئەوانەی دەتوانن لەناو ئاوو لەووشکانیدا بژین) بەلاّم هێلکەکەیان لەسەر ووشکانی هەڵهێناوە. بێچووەکانیشیان قاچ و سییان هەبووەو توانیویانە هەناسەبدەن. دەشێت جروجانەریشیان خواردبێت. ئینجا خشۆکەکان زیاترگەورەو بەهێزبوون. تاوایان لێهات هەندێکیان لەمارمێلکەی گەورە دەچوون و هەندێکی تریان لەکیسەڵ، کلکیان کورت بوو، ئیسقانەکانیان ئەستور وسەریان گەورەو ڕوەکیان خواردوە. دایناصورەکان لەسەر شێوەی خشۆکەکانی باپیریان پەرەیان سەند. کەلەقومقومە چونە وتوانیویانە لەسەر قاچەدوانیەکانیان بڕۆن بەڕێوە. دایناصورە سەرەتاییەکان زۆرلاواز بونەو هەریەکەیان بەئەندازەی کەڵەشێرێك بووە ولەسەر قاچە دوانیەکانی ڕێی کردووە. هەندێکیان هەربە بچووکی مانەوە بەلاّم هەندێکی تریان گەورەبوون وکێش هێزیان زیادی کرد لەگەڵ کاتدا تاهەندێکیان گەیشتنە درێژی ٢,٥ مەتر، بەڵکو گەیشتنە شەش مەترو کێشیشیان گەشتیتە کێشی فیلێك. سەریان بچوك وکورت بوو. دوانەکانیشیان کول بوون وتەنها بۆخواردنی ڕووەکان بەکاردەهاتن. ولە شوێنە نەویەکاندا دەژیان لەناو زۆنکاوەکان دا. دوای ئەوە چەرخی دوەم هات لە((سەردەمی خشۆکەکان)) هەندێك لەدایناصورەکان توانیان ڕوەکی گەورە تر بخۆن. تا ئەندازەیەك قاچەکانیان نەیان دەتوانی لەسەر زەویدا لاشەیان هەڵ بگرێت، بۆیە ناچاربوون زۆربەی کاتیان لەڕووبارو زۆنگاوەکاندا بەسەربەرن. لەو دایناصۆرانە جۆرێکیانکەزانایان ناوی ((برونتۆساورس)) یان لێ ناوەو درێژیەکەی لەنیوان( ٢٠و٢٤) مەتردایە وکێشیشی نزیکەی (٣٤)تەنە! لەهەمان کاتدا، هەندێك جۆری تر لەدایناصور هەبووە توانیویانە بەسەر ووشکانیدا ڕێ بکەن کەناوی ((ئولوسادروس)) بووەو درێژیەکەی ١٠ مەتر بووە چڕنووکی هەبووەو دانەکانی تیژبووە. لەسەر دایناصورە ڕووەك خۆرەکانی وەکو (( پرونتوسادرۆس)) ژیاوە!

ئەودایناصورانە قۆناغێك بوونە لەپێشکەوتنی خشۆکەکان. کەدەشێت بەهۆی ڕوودانی گۆڕانکاری کەش و هەواوە لەسەر ڕووی زەویدا لەناوچووبێت. کەلەئەنجامی ئەو گۆڕانکاریەوە نەیتوانیبێت خۆراکی خۆی پەیدابکات.

## بۆچی کەدەچینە شوێنێکی تاریکەوە چاومان بەباشی نابینێت؟

ئاشکرایە کاتێ لەشوێنی ڕووناکەوە دەچینە شوێنێکی تاریك چاومان بەڕوونی نابینێت یەکەمجار. سەرەتا بەشڵەژاوی دەبینین پاشان وردەوردە، بەرچاومان ڕوون دەبێتەوە. ئایا هۆی ئەوە دەزان؟

لەڕووی بایەلۆجیەوە مرۆڤ دەتوانێت شتەکان لەڕووناکی وتاریکی دا ببینێت، گلێنەی چاو قەبارەی خۆی لەگەڵ پلەی درەوشاوەییەکەدا دەگونجێت. کاتێك ڕووناکیەکە کەمە گلێنەکە گەورەدەبێتەوە بۆئەوەی ڕێگەبدات زۆرترین تیشك بچێتە ناوچاووەوە. کاتێکیش تیشکەکە درەوشاوەیە گلێنەکە دەچێتەیەك وبچووك دەبێتەوە. بەڵام کاتێك لەشوێنێکی ڕووناکەوە دەچینە ناو ژوورێکی تاریکەوە گلێنە هەندێك کاتی دەوێت تاگەورە دەبێتەوە. بەوەش ئێمە پێویستمان بەهەندێك کات هەیە بۆئەوەی شتەکان بەڕووناکی ببینین. هەروەها خاڵێکی تری گرنگ هەیە. قوڵترین چین لەناو چاودا ناوی ((شەبەکەیە))یە. وێنەی شتەکان لەسەر ئەو شەبەکەیە دروست دەبێت. شەبەکە لەخانە گەلێکی زۆرپێك دێت هەندێکی درێژۆکەو هەندێکی شێوە قوچەکیە. خانە درێژکۆلەکان ماددەی ئەرخەوانیان تێدایە پێ دەوترێت((ڕۆدروۆبسین)) هەرکاتێك لەهەر تەنێکەوە بکەوێتە سەرشبەکە ئەوا ڕۆدوۆبسینش هێمایەکی کارەبایی بەرهەم دەهێنێت کەدەچێت بۆمێشك وشتەکان دەبینێت. ئەگەر ڕۆدوۆبسین بەردەوام بوو لەدابەش بووندا لەبەر بەردەوام چوونەژورەوەی تیشك بۆناو چاومان ئەوا کاتێك دێت لەناو هەردوو چاودا ڕۆدوۆبسین تەواو دەبێت لەوحاڵەتەدا ئەوکەسە توشی کوێری دەبێت. بەڵام هەرگیز ئەوە ڕوونادات لەبەر ئەوەی ڕۆدوۆبسین لەیەك کاتدا لەناو دەچێت و دروست دەبێتەوە. لەبەر ئەوە شەبەکە هەرگیز کێشەی لەدەست دانی ئەم ماددەی نیە بەتەواوی. لەتیشکی زۆر بەهێزو درەوشاوەدا چاومان هەست دەکات بەماندووبون وهیلاکی بەڵام هەرگیز توشی کوێری نابێت. ڕێژەیەکی زۆر لەڕۆدوۆبسین لەتیشکێکی درەوشاوەدا دابەش دەبێت. ئەگەر لەناکاو چوشینە شوێنێکی تاریکەوە، ناتوانین شتەکان بەباشی ببینین لەبەرئەوەی ڕێژەی ڕۆدوۆبسین کەم دەبێتەوە.جارێکی تر ڕۆدوۆبسین پێویستی بەهەندێك کات هەیە تابتوانێت شتەکان بەڕوونی ببینێت. لەبەرامبەردا، کاتێك لەشوێنێکی تاریك دێینە دەرەوە بۆڕووناکی چاومان لەئەنجامی تیژی تیشکەکەدا توشی

ابنهاردەبێت. هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ماددەی ڕۆدۆبسین بەڕێژەیەکی زۆرکەم شیتەڵ دەبێت لەشوێنە تاریکەکاندا. بەڵام بەڕێژەیەکی زۆردابەش دەبێت کاتێك لەناکاو بکەوێتە بەرتیشکێکی بەهێز. بەوەش ئاماژە کارەباییە پەیوەستەکان بۆمێشك زیاد دەکات وچاومان ئەبلەق دەبێت. دەبێت ڤیتامین A هەبێت لە لەشدا بۆئەوەی مادەی ڕۆدۆبسین بەرهەم بێت، کەمی لەڤیتامینA دا دەبێتەهۆی ئەوکوێری. ئەم ڤیتامینەش لەسەوزە وگێزەرو هێلکەو شیردا هەیە.

## پەیوەندکردنی داران....

زۆرێك لەدارەکان دەتوانن بەڕێگەی پەیوەندکردن چەندین جۆری تر میوەبەرهەم بێنن، ئەم کردارە پشت بەپەیوەست کردنی بەشێك لەچڵێك لەدارێك بەچڵێك لەدارێکی ترەوە دەبێت بۆنموونە ئەگەر لقۆکەیەك لەداری هەڵو جۆشدرا بەقەدی دارێکی بەیەوە ئەوا لقی دارەبەهێکە سەوز دەبێت و بەوجۆرە دووجۆربەر دەدات. بەهەمان شێوە دەتوانرێت وابکرێت دار بادەمێك قۆخ وچەقالە وبادەم بەرهەم بێنێت ئەم شێوازە زۆرگرنگە لەکشتوکاڵدا، باشترین سوودی ئەوەیە دەتوانێت بەکاربهێنرێت بۆبەرهەم هێنانی باشترین جۆری میوە. زۆرشێوازهەیە لەپەیوەندکردنی داراندا بەڵام دەبێت لەهەموویاندا ڕەچاوی ئەمدوو ڕێسایە بکرێت.

ڕێسای یەکەم: دەبێت پەیوەندکردن لەنێوان ئەو دارانەدا بکرێت کە لەیەکەوە نزیکن واتە سەربە خێزانێکن ئەمەش مانای وایە دەتوانرێت دارسێوێك لەگەڵ دار قۆخ وهەرمێ دا پەیوەندبکرێت ودەتوانرێت دارەقۆغیەکان لەگەڵ دارقەیسی وبادەم دا پەیوەندبکرێت بەڵام ناتوانرێت دارسێوێك لەکەڵ دار قۆخێك یان چەقالەیەکدا پەیوەند بکرێت.

ڕێسای دووەم: ئەوەیەکە چینی ناوکرۆکی دارەکە لەگەڵ ئاوکی دارەکە ( ئاوێکە لەدار دێتەدەرەوە لەکاتی بریندا) بدرێت لەئاوگی کرۆکەکەی تر. شایانی باسە ئەم ڕێکەی پەیوەندی کردنە لەئاژەلانیشدا دەکرێت بەوەرگرتنی ئێسکێك لەپەراسوی ئاژەڵێك پەیوەست کردنی لەگەڵ ئێسقانی لوتی ئاژەڵێکی تردا بۆ دروست کردنی لوتێکی تازە، هەندێك تاقیکردنەوەش کراوە بەدانانی پێستی ساغی مرۆڤێك لەسەر پێستس سووتاوی کەسێکی تر.

## ئاوسانی جومگەکان.

ئاوسانی جومگەکان ناوێکە بەکۆمەڵێك نەخۆشی دەوترێت کەدەبنە هۆی ئازار لەجومگەکانی لەشدا. لەئەنجامی ئاوسانی ڕیشاڵە پەیوەستەکانی نێوان جومگەکاندا. لەهەندێك حاڵەتدا ئاوسانی جومگەکان دەبێتە هۆی توشی بوون بەنەخۆشی ئێسکەنەرمە. ئاوسانی جومگەکان زیاتر لەناو بەساڵاچواندا باوە، بەلاّم دەشێت توشی هەرکەسێك لەهەر تەمەنێکدا بێت. بەپێی ئەوئامارانەی لەبەر دەستدایە ژمارەی ژنانی توشبو بەنەخۆشی ئاوسانی جومگەکان دووئەوەندەی ژمارەی پیاوانی توشبووە. ئەم نەخۆشیە تەنها توشی مرۆڤنایەت بەڵکوتوشی ئاژەڵاّنیش دەبێت. ئەمرۆ زانایان بەڵگەی تەواویان لەبەردەستدایە دەیسەلمێنێت کەدایناصورە لەناوچووەکان بەدەستی ئاوسانی جومگەکانەوە ناڵاّندویانە. ئاوسانی جومگەکان چەندین جۆری جیاوازی هەیە، بەلاّم هۆی زۆربەی زۆری تائێستا بەوردی نەزانراوە. هەندێکیان هۆیەکەی برینە یان بوونی ڕێژەیەکی بەرزن لەهەندێك کمیاوی تایبەتی لەلەشدا. یان داڕوخانی کرتێنەکەکان بەهۆی گەورەیی تەمەنەوە. یان بەهۆی حەساسیەتی زۆرەوە لەڕیشاڵە پەیوەستەکانی نێوان جومگەکاندا. لەم دواییەدا شێوەیەکی تازە لەئاوسانی جومگەکان دۆزراوەتەوە هۆیەکەی ڤایرۆسێکە کەلە ئەنجامی گازگرتنی گەنەوە دروست دەبێت. ئەم نەخۆشیە دەبێتە هۆی ئاوسان و خوارکردنی جومگەکان و نەخۆش هەست بەئازارێکی زۆردەکات و بەزەحمەت دەتوانێت ئەندامی توشبوو بجوڵێنێتەوە. بەگشتی ئاوسانی جومگەکان بەدەرمانی جۆری اسپرین چارەسەردەکرێت بۆکەم کردنەوەی ئازارو ئاوسانەکە، هەروەها چارەسەری سروشتی یارمەتی زۆری چارەسەریی ئەم نەخۆشیەدەدات. مساج و لێدانی شەپۆلە دەنگیەکان لەلەشدا زۆربەسوودن بۆچارەسەرکردنی ئەم نەخۆشیە.

## هۆشیاری چیە؟

ووشەی هۆشیاری یان (بێداری) زاراوەیەکە لەدەروونزانیدا ئاماژە بۆحاڵەتی بەئاگاهتن دەکات لەگیاندارانیدا، بەلاّم حاڵەتی ناهۆشیاری ئاماژە بۆخەوتن دەکات. لەهەردوو حاڵەتەکەدا هۆشیاری جیاواز دەبن. لەحاڵەتی هۆشیاری تەواودا ئاستی ئاگابون زۆربەرزە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك مومارەسەی یاری سەرمێز بکات وبیەوێت بیباتەوە هەوڵ دەدات لەحاڵەتی ئاگاهی زۆربەرزدا بمێنێتەوە. یان

ئەوانەی وەرزشی جومباز دەکەن لەیاریەکانی سێرك دا نموونەیەکی ترە دەبێت لەحاڵەتی ئاگاهی زۆر بەرزدابن لەکاتی جێ بەجێ کردنی یاریەکاندا. ئەگەر کەسێك توشی سەرگێژەبوو پێ دەڵێن لەحاڵەتی کەمترین ئاستی هۆشیاریدایە. بەلام بەحاڵەتی ناهۆشیاری دانانرێت تاخەونەبیاتەوە. لەژیانی ئاسایی رۆژانەماندا حالاتی هۆشیاری جیاواز هەیە. بەلام هەروەها دەتوانین بگەینە حاڵەتی ناهۆشیاری یان حاڵەتی ژێری هۆشیاری بەهۆکاری دەستکرد.

هەروەها دەتوانین حاڵەتی هۆشیاری زۆربەرزمان دەست بکەوێت بەهۆی هەندێك دەرمانەوە کەکار لەکۆئەندامی عصبی مەرکەزی دەکات دەبێتەهۆی حاڵەتی نائاسایی. مادەی کافیننی وریاکەرەوە لەقاوەو چادا دەتوانرێت وەك وریاکەرەوەیەك بەهێز بۆهەندێك کەس بەکار بهێنرێت. بەلام زۆرخواردنی مادده کحولیەکان دەبێتە هۆی سەرەگێژەو لەکۆتایدا ناهۆشیاری. هەندێك نەخۆشی کاریگەری بەرچاوی هەیە لەسەر ئاستی هۆشیاری، هەندێك نەخۆشی عەقلی لەئاستی هۆشیاری مرۆڤ دادەبەزێنێت. هەروەها پەرۆشە عاگفیەکان

کاریگەری لەسەر حاڵەتی ئاگاهی مرۆڤ دروست دەکەن، زۆرجار مرۆڤە زۆر عاگفیەکان توشی غەمۆکی دەبن. لەئێستادا زانایان چەندین جۆر دەرمانیان دروست کردوەکە دەتوانێت تەحەکوم بە ئاستەکانی هۆشیاری مرۆڤەوە بکات. کەزیاتر لەچارەسەرکردنی ئەوکەسانەدا بەکار دەهێنرێت ئاستی هۆسیارییان کەمە. بەلام ئەو دەرمانانە دەبێت بەپێ ئامۆژگاری پزیشك بەکاربهێنرێت.

## تۆمارکار(موسەجەل) چۆن ئیش دەکات؟

تۆمارکەر ئامێرێکە دەتوانێت لەسەر کاسێتێکی نەرم دەنگ تۆمار بکات و. دەتوانێت ئەو دەنگە دووبارە لێی بدرێتەوە. تۆمارکەر ئامێرێکی زۆربەسودە و. بەشێوەیەکەی فراوان بۆمەبەستی سەرگەرمی و بازرگانی سوودی لێ وەردەگیرێت.

ئایا دەزانین تۆمارکەر چۆن دەنگ تۆمار دەکات و دووبارە بلأوی دەکاتەوە؟

ئەو کەسەی دەیەوێت دەنگی تۆمار بکرێت لەبەردەم مایکرۆفۆنێکدا قسەدەکات و دەنگەکە دەگۆرێت بۆ تەزووی کارەبایی و بەمکبەرەش دەنگەکە گەورە دەکرێتەوە چون دەنگی ئەو کەسە زۆربێهێزە. ئەمجا تەزووە کارەباییەکە بەناو سەری سەرێکی (مدبب)دا دەنێرێت لەئامێرەکەدا. سەری تۆمارکەرەکەش سیمێکی

پێوەپێچراوە بەدەوری پارچەیەك ئاسندا. ئەو تەزووەی بەناو لەفەسیمەكەدا دەڕوات. بوارێكی موگنا تیسی بەرهەم دەهێنێت. لەبەرئەوەی تەزوەكە بەسروشتی خۆی پچڕپچڕ دروست دەكات. لەكاتی تۆماركردندا شریتەكە بە هۆی بزوێنەرێكەوە بەناوسەری تۆماركەرەكەدا دەچێت. شریتە نەرمەكەش بەمادەیەكی مەگناتیسی داپۆشراوە وەكو ئۆكسیدی ئاسن. بۆیە پێی دەڵێن شریتەكە بەموگناتیس كراوە. بوارە موگناتیسییە پچڕ پچڕەكە لەسەری تۆماركەرەكەدا، بەگوێرەی لەرینەوەی دەنگەكەیە.

دەتوانین چەندجارێك كاسێتەكە دووبارە بكەینەوە. بۆدووبارە كردنەوەی دووبارە دەبێت سەری تۆماركەرەكە لێی بدات. ئەوەی كە وەكو سەرێك ئیش دەكات بۆدووبارەكردنەوەی بلاْوكردنەوەی دەنگەكەیە. كاتێك شریتەكە دەجوڵێتەوە هێلێكی موگناتیسی دروست دەكات. كەتەزوویەكی لەسەرە. بەناو لەفەسیمەكە دەڕوات لەسەرە مدییەكەوە. تەزوو لەفەسیمەكەدا بەگوێرەی بواری موگناتیسی شریتەكە دەگۆڕێت. ئەمجا بەهۆی سوچێكەوە تەزووەكە گەورە دەكرێتەوە، تەزووەكەش دەگۆڕێت بۆدەنگ بەوجۆرە گوێمان لەدەنگی تۆماركەر دەبێت.

## ترشی گۆگردیك(( تێزاب))چۆن دروست دەكرێت؟

ترشی گۆگردیك. ماددەیەكی كمیاوی پیشەسازیی زۆرگرنگە وپێی دەوترێت((شای ترشەكان)) لەپیشەسازی پەیینی كمیاوی وبۆیاخ و دەرمانە پزیشكییەكان وتەقاندنەوەكان وریشاڵە كمیاویەكان و مەوادە پاكژكەرەوەكاندا بەكار دەهێنرێت، وەكو چۆن لەترشیەكانی تری وەكو هێدرۆلیك وترشی نتریك(ئاوی ئاگر) دا.

چەندین جۆر لەكانزاكان بەترشی گۆگردیك پاك دەكرێتەوە. وەكو چۆن ئەم ترشیە لەپاڵفتە كردنی شەكرو پترۆڵ و بەرهەم هێنانی زنجیرەیەكی بەرفراوانی و كمیاویەكاندا بەرهەم دەهێنرێت.

ئایا دەزانن چۆن ترشی گۆگردیك دروست دەكرێت؟

دوو ڕێگەهەیە لە دروست كردنی ((شایای ترشیەكاندا)) یەكێكیان بەڕێگەی تیعانی قورقوشمی كەنزیكەی ٢٠٠ ساڵە ئیشی پێ دەكرێت، ڕێگەی دووەمیش بە ڕێگەی ((تلامس)) دەناسرێت ڕێگەی یەكەم كەمتر بەتوانایە لەڕێگەی دووەم. بەلاْم هێشتا نرخی گەورەی بازرگانی خۆی هەیە. ((ڕێگەی قیعانی قورقوشمی)) زۆر

ئالۆزە کەبە سوتاندنی گۆگرد یان برژاندنی بیریت، دووەم ئۆکسیدی نایترۆجین بۆ سێیەم ئۆکسیدی گۆگرد. کە کارلێك دەکات لەگەڵ هەڵمدا، بۆبەرهەم هێنانی ترشی گۆگردیك. کەوەکو مادەیەکی کمییاوی بەکاردێت لەپیشەسازیدا. لەکرداری ((جۆری تلامس)) دا دووەم ئۆکسیدی گۆگرد لەگەڵ هەوادا تێکەڵ دەکرێت. ئەمجا بەیارمەتی مادەیەکی یارمەتی دەر گەرم دەکرێت، یان کانزای پلاتینە یان تێکەڵەیەکی کمیاویە پێی دەوترێت پێنجەم ئۆکسیدی فانادیۆم. (محفن) ەکە یارمەتی کرداری زوکارلێك دەدات و دووەم ئۆکسیدی گۆگردیك لەگەڵ ئۆکسجینەکەدا تێکەڵ دەبێت لەهەوا بۆئەوەی تێکەڵەی سێیەم گوگردیك پێك بێنێت، کاتێکیش سێیەم ئۆکسیدی گۆگردیکەکە لەئاودا دەتوێتەوە ترشی گۆگردیك دروست دەکات.

((شای ترشیان)) بەپاکی شلەیەکی ڕونی ئاوی بێ ڕەنگە. زۆر چالاکەو، هێرش دەکاتە سەر زوربەی کانزاکان بۆئەوەی خوێیەك پێك بهێنێت کەپێ دەوترێت سلفات یان گۆگردات زۆربەخێرایی ئاو دەمژێت وبەزۆری لەوشك کردنەوەدا بەکاردەهێنرێت. لەکاتی چاکردنی ترشی گۆگردیکدا، دەبێت زیادی کەیت بۆئاو. ئەو ئاوەی زیادەکرێت بۆناوی ترشەکە گەرمیەکەی دلۆپەی ئاوەکە دەکوڵێنێت، کەوا دەکات ترشیە گەرمیەکە بەشێوەیەکی مەترسیدار پێماندا هەڵ پرژێت.

## ئەو ڕیشکە دارانەی کەدەخوێن!

هەندێك لەڕشیکی ڕوەکەکان هوڵدەتۆقێن. بەو خۆراکەی تیایاندایە. دوای ئەوە دەشێت وەکو سەوزە بخورێن ئەو ڕوەکانەی ڕشیك گەلێکی لەوجۆرەبەرهەم دەهێنین پێیان دەوترێت((ڕشیك دارەکان)).

ڕوەکە ڕشیکیەکان، لەدێرزەمانەوە وەکو سەرچاوەیەکی خۆراکی گشت دەکرێت. لەبەر ئەوەی مەوادی کمییاوی جۆربەجۆر لەزەویەوە وەردەگرێت. پێچەوانەی ڕووەکە دانەوێڵەییەکان. سەلمێنراوە کە زۆربەسودە بۆسیستەمی خولی کشتوکاڵی. تۆوی چەنەوەر، بەکوڵاوی دەخورێت. وەکو چۆن هاڕاوەی چەنەوەر وەکو مادەیەك بۆسورکردنی تەماتە بەکاردەهێنرێت. گێزەری پرتەقاڵی یان زەرد ڕێژەیەکی لەکارۆتینی تێدایە. گێزەربەکاڵی وبەکوڵاویش دەخورێت.هەندێك جاریش وشك دەکرێتەوە. فجل تور، بۆنەکەی زۆر تیژە. سپی هەیەوسوری هەیە وەکو دڵکەرەوەیەك دەخورێت ولە زەڵاتەشدا بەکاردێت.

ڕەتباگا( جۆرە ڕووەكێكە ڕەگەكەی وەك تور وایە) شێلم زۆر لەیەك دەچن وتێكەڵ دەكلاێن. بەڵام ڕەتباگ زیاتر درێژوخڕترە لەشێلم، هەردووكیشیان ڕەنگیان زەردە.

پەتاتەی شیرین، كەناوكێكی پرتەقاڵی هەیە. لەبەرشیرینەكەی خەڵكی دەیخوات وبەكوڵاویش دەخورێت. زۆرجار وشك دەكرێتەوە بەقاژقاژ. هەندێك جۆرلە ڕشیكەكان هەیە پێی دەوترێت ((گرێ گرێكان)). وەكو سەوزە بەكاردەهێنرێت كەگرنكتریان چاوبازەو پەتتەو سێوی بن ئەرز هەمووی بەكوڵاوی یان وشكەوە كراوی دەخورێت. هەندێك لەپازیەكان وەكو خۆراك دەخورێت بۆنموونە سیر، پیاز،كەوەر. سیر دەكرێتەناو شۆرباو تەماتەو زەڵاتەوە بۆئەوەی تامەكەی خۆش بكات.

## بۆچی گەڵای دارەكان گەرم نابن؟

ئەگەر لەوەرزی هاویندا پارچە گەڵایەك یان هەرمادەیەكی تربخەینە بەرخۆر دەبینین نەختێك گەرم دەبێت. بەڵام ئەگەر پارچە ئاسنێك بخەینە بەر خۆر دەبینین زۆر گەرم دەبێت بەجۆرێك خەریكبێت دەستمان بسوتێنێت. لەلایەكی ترەوە، گەڵای دارەكان و ڕووەكەكان، كەبەدرێژایی ڕۆژ خۆرلێیان دەدات سەیردەكەین ساردوتەڕن، وەكو خۆرهەڵیی نەدابێت.

ئایا دەزانیت گەڵای دار كاتێك خۆریش لێی دەدات بۆهەرگەرم نابێت؟

گەڵای ڕوەك لەچەند چینێك خانەپێكهاتوە. پێستی یەكەم سەر ڕووی سەرەوەی گەڵا دادەپۆشێت. پێستی خوارەوەش ژێری سەر ڕووی سەرەوەی. لەپێستی ژێرەوەدا كونی زۆرهەیە پێی دەوترێت((دەلاقە)) كەوەكو ((دەم قاپ)) ئیش دەكات ئاڵوگۆڕی نێوان گەڵاكەو هەوا ڕێك دەخات. كاتێك كراوەیە ڕێگە دەدات دووەم ئۆكسیدی كاربۆن بچێتە ناوگەڵاكەوە. وەكو چۆن دەیەڵێت ئۆكسیجین وهەڵمی ئاولە گەڵاكەوە دەربچێت. بەڵام كاتێك دەلاقەكە داخراوە، چونەناوو دەرچوونی هەوا ڕوونادات. هەر دەلاقەیەك بەدو خانە دەورە دراوە بۆپاسەوانی لەشێوەی پەنجەی حوشتر مورغدایە. كەزاڵ دەبن بەسەر قەبارەی كونەكاندا، دەلاقەكەش لەڕۆژدا دەكرێتەوە ولەشەودا دادەخرێت. هەڵمی ئاو لەڕێگەی دەلاقەكەوە دێتەدەرەوە لەڕێگەی ڕشیكەوە ئاو دەچێتە جێگەكەی ئەم كردارە پێی دەوترێت((عارەق كردنەوە))ئەم كرداری عارەق كردنەوە وادەكات لەڕووەكەكە،

لەژێر تیشکی خۆردا بەساردی بمێنێتەوە. ئێمە دەزانین سارد بونەوە لەڕێگەی بەهەڵم بونەوە دەبێت، لەبەرئەوە هەڵم بوون بەردەوامە لەڕێگەی عارەق کردنی گەڵاکانەوە، کەواتە گەڵاکان بەردەوام ساردن!

## ئاژەڵان چۆن لەئاوە بەستوەکاندا دەژین؟

کاتێك لەووڵاتاندا پلەی گەرما دادەبەزێت بۆژێر سفر، هەرچی دەریاو دەریاچە هەیە هەمووی دەیبەستێت، لێرەدا پرسیارێك دێتەکایەوە. چۆن گیانداران لەو ئاوە بەستوانەدا دەتوانن بژین ونەمرن؟

لەڕاستیدا ئاوی دەریاو دەرچەکان تەنها چینی سەرەوەی دەیبەستێت وئاوی ژێرەوە بەشلی خۆی دەمێنێتەوەو نایبەستێت، لەبەرئەوە گیاندارە ئاویەکان دەتوانن بەبێ دەنگ لەدەریاو دەریاچە بەستوەکاندا بژین. زۆربەی شلەکان بەشێوەیەکی گشتی، بەگەرم کردن دەکشێت، بەلاّم ئاو لەپلەی سفری سەدیدا(استیپنایی)، کەلە پلەی سفری سەدیدا گەرم کرا. وردە وردە قەبارەی بچووك دەبێتەوە لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمادا. ئەم کردارە بەردەوام دەبێت تاگەرماکە دەگاتە پێنج پلەی سەدی. دوای ئەو پلە گەرمایە ئاوەکە دەست بەکشان دەکات لەگەڵ پلەی گەرماکەدا کشانی بەردەوام دەبێت. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەقەبارەی ئاو لەچوار پلەی سەدیدا زۆر نزمە. بەشێوەیەکی تر چڕی ئاو لەچوار پلەی سەدیدا لەئەوپەڕیدایە. ئەوکشانە نائاساییە لەئاودا بەکشانی شاز دەناسرێت، ئەو کشانە شازەی ئاو ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لەسروشتدا، کەچینی سەرەوە دەبەستێت لەدەریاو دەریاچەکانی ناوچەساردەکاندا وچینەکانی ژێرەوە بەشلی دەمێنێتەوە. بەوجۆرە گیاندارە ئاویەکان دەتوانن لەژیاندا بمێننەوە. لەووڵاتەساردەکاندا ولە وەرزی زستاندا کاتێك پلەی گەرما زۆر دادەبەزێت. چینی سەرەوەی ئاوی دەریاودەریاچەکان دەست بەساردبوون دەکەن. کاتێك پلەی گەرمای چینەکانی سەرەوە دادەبەزێت بۆ٤ پلەی سەدی. ئاوەکە ئەو پەڕی چڕی خۆی وەردەگرێت ودادەبەزێت بۆژێرەوەو چینی ژێرەوەش بەرز دەبێتەوەبۆ سەرەوە. ئەوئاوەی بەرز دەبێتەوە سارد دەبێت بۆ٤پلەی سەدی. ئەمجا دادەبەزێت ئەم کردارە بەردەوام دەبێت تاهەموو ئاوەکە دەگاتە٤پلەی سەدی.

کاتێك پلەی گەرما دەگاتە ژێر چوارپلەی سەدی چڕی ئاوەکە کەم دەبێتەوەو دانابەزێت بۆژێرەوە. تالە کۆتایدا سەری ئاوەکە دەیبەستێت بەلاّم بەشی ژێرەوەی

لەچوار پلەی سەدیدا دەمێنێتەوە. لەبەر ئەوەی بەفر گەیەنەرێکی خراپە بۆگەرما بۆیەکرداری بەستن لەژێرەوە زۆر خاو دەبێت. بەوەش ماسی وگیاندارە ئاویەکانی ترو. ڕووکەکان لەژێر چینی بەستودا لەژیاندا دەمێننەوەو نامرن. ئەگەر کشانی ئاو ڕێکوپێك بوایە. ئەوا دەریاو دەریاچەکان بەتەواروی دەیبەست ولەگەڵیشیدا هەرچی ڕوەکو گیانداری ئاوی هەیە دەیبەست.

## ڕەنگی سەوزی گەڵا!

ئەو گەڵایانەی تازە چرۆدەکەن ودەردەچن ڕەنگێکی مێخەکییان هەیە. بەڵام دوای ماوەیەك دەگۆڕێن بۆڕەنگی سەوز.

ئایا دەزانی هۆی چیە؟

ئێمەدەزانین ڕەنگی هەرمادەیەك لەسەر توانای مژین یان پێچەوانەکردنەوەی ڕەنگی تیشکە جۆراوجۆرەکان دەوەستێت. ڕەنگی گەڵاکە کەچەند جۆرێك ماوادی تێدابوو ڕەنگاوڕەنگ دەبێت. بەڵام بوونی کارۆتین(جزرین) ڕەنگی زەرد دەکات. ئەو گەڵایانەی کلۆرۆفیل وکاروتینیان تێدایە ڕەنگیان سەوزێکی بەرەو زردە. هەندێك جار گەڵای تازە کەلەدار دەڕوێت مادەیەکی زەردی تێدایە پێی دەوترێت ((ئەنیۆسیانین)) کەڕەنکی سوریان زەهری دەداتە گەڵاناسکەکان. بەتێپەڕبوونی کات کلۆرۆفیل وکاتین لەگەڵاکەدا دروست دەبن وڕەنگی گەڵاکە دەگۆڕێن بۆسەوز. کاتێك تیشکی ڕۆژ کەلە (٧) ڕەنگ پێکهاتوە، دەکەوێتە سەری ڕەنگە سەوزەکە پێچەوانە دەکاتەوەو ڕەنگەکانی تر دەمرێت. ئەو ڕەنگە سەوزە کەگەڵاکان پێچەوانەی دەکەنەوە دەگاتە چاومان و دیمەنی ڕەنگی سەوز دەدات بەگەڵاکان. ڕووەکەکان خواردنی خۆیان بەیارمەتی کلۆرۆفیل وتیشکی خۆر دەست دەخەن وئەو کردارەش پێی دەوترێت ((ڕۆشنەپێکهاتن)). ئەو ڕوەکانەی مادەی کلۆرۆفیلیان تێدانیە وەکو قارچك کەڕوو. ناتوانێت خۆراکی خۆی دروست بکات لەسەر گیانداری تر دەژین. ئەو ڕوەکانە پێیان دەوترێت ((کەڕوییەکان)). بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە کلۆرۆفیل مادەیەکی زۆر گرنگە بۆڕوەکەکان.

## بۆچی مرۆڤ لەشێوەی دایك وباوکی دەچێت؟

پشیلە پشیلەی دەبێت، مشکیش مشك. داری توش تو دەگرێت، بەوجۆرەش مرۆڤ لەدایك وباوکی دەچێت، ئەوە ڕاستیەکی سەلمێنراوە. هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆجینات یان زانستی پشتاوپشت، کەهەموو ئەو هۆکارانەباس دەکات کەبەرپرسە

له لێكچونی زۆری نێوان مرۆڤ وباوك ودایكدا. هەروەها بەهاوكاری جینەكان دەتوانین ئەو(مزایا) نەبزانین كە منداڵداهەیە ولەدایك وباوكیدانیە. پشتاوپشت ناوێكی گواستنەوەی ترە بۆكرداری مزایا یان سیفەتەكان لەباوك ودایكەوە بۆمنداڵەكانیان، ئەمەش بەگواستنەوەی لەخانەگەلێكەوە گەردیلەی زۆربچووك دەگۆزنێتەوە لەباوەنەوەو پێی دەوترێت ((جینات)) هەرجینێك بەشێكەلە خانەیەك. لەناوكی هەرخانەیەكدا نزیكەی ٢٠هەزار جین هەیە. لەو جینانەش نزیكەی ١٠هەزار لەدایكەكەوەو ١٠هەزار لەباوكەكەوە دەگوێزرێتەوە. هەموو ئەو جینانەلە ٤٦ كرۆمۆسۆمدان. كەتیرەكەی ٠١.٪ لەملیمەترە. لەكاتی ئاوسیدا ٢٣ كرۆمۆسۆم لەدایك و٢٣ كرۆمۆسۆم لەباوكەوە دێت. بەوەش هەرخانەیەك لە (٤٦) كرۆمۆسۆم پێكدێت. جین یەكەی پشتاوپشتە. لەهەندێك لەڕووەك وئاژەڵاندا هەندێك لەجینەكان لەتێرو هەندێكیان لەمێوەدێن. گریگۆرماندلی نەمساوی بەباوكی جینات ناودەبرێت. تاقیكردنەوەی زۆری لەسەر پاقلەكردو ڕێسایەكی دیاری كراوی لەسەر پشتاوپشت دانا. كەبەیاسایی مەندل ناسراوە. دەری خست لەڕێگەی تاقیكردنەوە كانیەوە كەجیناتی دایك وباوك هەروەها تەحەكوم بەمزایای منداڵەكانیانەوە دەكەن. ئەگەر چاوی یەكێك لەباوكەكان ڕەش بوو چاوی ئەوی تریان شین بوو ئەوا هەردوو چاوی منداڵەكەیان ڕەش دەبێت لەبەر ئەوەی ڕەنگی ڕەش زاڵە بەسەر ڕەنگی شین دا. ئەگەر چاوی هەردوو دایك وباوكەكە شینبوو، ئەوا چاوی منداڵەكەشیان شین دەبێت.

هەروەها دایك وباوكی بالاّ بەرز منداڵی بالاّ بەرزو دایك وباوكی بالاّ كورت منداڵی بالاّكورتیان دەبێت. ئەگەر ڕەك یان ئاژەڵ لەدوو ڕەگەزی جیاواز لێك بدەین ئەوا شێوازی سێیەمان دەست دەكەوێت. بۆنموونە مانگایەكی سوورو گایەكی سپی نەگولكێكی سپیان دەبێت نەسوور بەڵكو لەنێوان هەردوو ڕەنگەكەدا دەبێت.

بەگوێرەی زانیاریان لەجیناتدا، زانایان سەركەوتن لەپەرەپێدانی وەكو ئاژەڵ گەلێكدا كەزیاتر لەگەڵ پێویستیەكاندا بگونجێت. گەنمی دووڕەگ بەم ڕێگەیە بەرهەم هێنراوە. هەندێك جار ڕووەك و ئاژەلاّن توشی هەندێك گۆڕان دەبن ئەم گۆڕانە لەئەنجامی ژینگە یان جیناتەوە ڕوودەدات. لەگەڵ ئەوەدا هێشتا شتی شاراوە زۆرماوە لەسەری پشتاوپشت بیزانین.

**میوەو سەوزە.**

خواردنە ناوک دارەکان کەبەکاری خواردن بێن پێیان دەوترێت میوە. بەلاّم قەدو گەلاّو گوڵی ڕووەکە گیاییەکان کەوەکو خواردن بەکاردەهێنرێن پێیان دەوترێت سەوزە.

زانایان میوەیان دابەش کردووە بۆ سێ گروپ:

١_ میوە ناوک وتۆوودارکان وەکو سێو، پرتەقاڵ، کاڵەك وهتد.

٢_ میوە یەك ناوکی هەیە وەکو خورما، قۆخ، گێلاس، وهتد.

٣_ میوە ڕەقەکان وەکو گوێز وبادەم وهتد.

ڕەنگە توشی سەرسوڕمان بیت کاتێك بزانیت زانایان فاصوّلیا وبازلاییان لەگەڵ میوەدا داناوە. وخەیار وکۆساش میوەن نەکوَ vegetabll maveo جۆرێکە لەکولەکە بەرەکەی سەوزە و درێژە لەخەیار دەچێت، بەلاّم کەلەرم وشەلەم وتوورو قەرنابیت سەوزەن. هەروەها پیازو پەتاتەش. زانایان تەماتە بەمیوە دادەنێن بەلاّم خەڵکی ئاسایی بەسەوزە بەشێوەیەکی گشتی پێناسە زانستیەکان لەگەڵ ناوە بازاڕیەکانی سەوزە ومیوەدا یەکناگرنەوە.

## بەرزترین بینا لەجیهاندا.

لەساڵی ١٩٣١ وە بینای (( امیاپرستیت)) لەنیوێوِرك بەوە جیادەکرایەوەکە لە( ١٠٢) نهۆم پێك هاتووەو بەرزیەکەی (٤٨١) مەترەو بەرزترین بینایە لەجیهاندا. بەلاّم لەساڵی (١٩٧٢) دا، مەڵبەندی بازرگانی جیهانی لەنیوێوِرك کەلە (١١) سێبتەمبەری (٢٠٠١) دا تەقێنرایەوە. بەبەرزی(٨) نهۆم بەسەریدا سەرکەوت. کە بەرزیەکەی (٤١١) مەتربوو. لە(٦) ئایاری ساڵی (١٩٧٣) دا بورجی ((سیرزتاور)) لە شیکاگۆ لەوویلایەتی ئەلنیۆی امریکا بوو بەبەرزترین بینا لەجیهاندا کە بەرزیەکەی دەگەیشتە (٤٤٣) مەتر وپێکهاتبوو لە(١١٠) نهۆم.

بورجی ((یابرن)) لەئابی (١٩٧٠) دەستکرا بەدروست کنی و لە (٤) ئایاری (١٩٧٣) دا تەواوکرا لەنهۆمی(١٠٤) یدا لە مەڵبەندی بازرگانی جیهانی بەرزتربوو. دوای ئەوە شەش نهۆمی تر خرایە سەری لە ناو ئەو بورجەدا (١٦٧٠٠) کەس زیندەگی دەکرن (١٦٠٠٠) پەنجەرەیی تێدایە لەگەڵ (١٠٣) بڵندەکرا. ئەم بورجە خێراترین بڵندەکی جیهانی لەخۆدەگرێت کە خێراییەکەی (٣٢١) کیلۆمەترە لەکاتژمێرێکدا. ئەم بڵندەکە لەماوەی (٤٥)خولەکدا لەزەویەوە نەفەرەکان دەگەیەنێتە نهۆمی (١٠٣). بڕی تێچوونی ئەو بورجە لەوکاتەدا (٢٠٠) ملێۆن

دۆلار بووه. واچاوەڕوان دەكرێت لەسەرەتای سەدەی بیست ویەكەمدا بینای وا دروست بكێت بەرزیەكەی بگاتە (٦١٠) مەتر.

## بەرزترین بینای نوسینگە لەجیهاندا

هونەری بیناسازی نویّ هەنگاوی زۆر مەونی ناوە بۆ پێشەوە. ئەمڕۆ لەجیهاندا زۆر بینا هەن لە(١٠٠) نهۆم زیاترن.

ئایا دەزانن گەورەترین بینای نوسینگە لەجیهاندا كامەیە؟

پەنتاگۆن گەورەترین بینای نوسینگەكانە لەجیهاندا. دەكەوێتە دیوی ڕۆژئاوای ڕووباری بۆتوماكەوە، لە ئارلینگتۆنی وویلایەتی فێرجینیای ئەمریكا. پەنتاگۆن بۆئەوە دروست كراتا ببێتە بارەگای وەزارەتی بەرگری ئەمریكا. بیناكە پێنج لای هەیەو هەر بینایەكیشی لەپێنج نهۆم پێكهاتوە. بینایەكی پێنج گۆشەیی و پێنج نهۆمیە لەبەر ئەوە ناویان لێنا پەنتاگۆن واتە پێنج گۆشە. لە(١٥) كانونی دووەمی سالّی (١٩٤٣) دابیناكە تەواو كراوئەو سەردەمە بڕی (٨٣) ملیۆن دۆلاری تێچوە. پەنتاگۆن پێنج لای هەیە كەپەیوەندستن بەیەكەوە ودرێژی هەرلایەكی لەدەرەوە (٢٨١)مەترە. چێوەی بیناكەش (١٣٧٠) مەترە, هەرپێنج بیناكە و گۆڕەپانەكەیان (٦٤) هەزار كیلۆمەتری دووجایە واتە (٦٥٠٠) هەزار پێی دووجا. لەپەنتاگۆندا (٢٩)هەزار كارمەند ئیش دەكات وگەورەترین سیستەمی تەلەفۆناتی تێدایەكە (٤٥) هەزار تەلەفۆن لەخۆدەگرێت. ڕۆژانە نزیكەی (٢٨٠) هەزار پەیوەندی تەلەفۆنی تێدادەكرێت، لەپەنتاگۆندا چێشتخانەو گەراج وباخچەو چەندین بەشی تری خزموت گوزاری هەیە. پیاو ئەگەر بیەوێت لە نهۆمی پێنجەمەوە بۆنهۆمی یەكەم هەموو ڕێەوەكانی ببڕێت دەبێت (٢٧) كیلۆمەتر ببڕێت،ژمارەی پەنجەرەكانی پەنتاگۆن (٧٧٤٨) پەنجەرەیە.

## ئەو كونانەی لەسەر جل وبەرگ دروست دەبن

زۆربەی خەڵك باوەڕیاوایە، هەندێك لەجۆرەكانی مۆرانە بەرپرسیارە لە كونكردنی جل وبەرگەكانمان و فەڕش وپەردەكانمان، بەلاّم ئەمە شتێكی ڕاست نیە. مۆرانە جل وبەرگ ناخوات. بەلاّم هەندێك پرگە هەن لەمۆرانەیەكی دیاری كراودا، لەسەر خوری ودەزوەكانی تر دەنیشێتەوەو خراپی دەكات.

ئایا دەزانیت ئەوە چۆن ڕوودەدات؟

سوڕی ژیانی مۆرانە بەچوار قۆناغدا تێدەپەڕێت. هێلکە، پرگە، خادیرە، کامڵ، مێینەکە زیاتر لە (١٠٠٠) هێلکە لەسەر خوری وفەرش وجل وبەرگەکان دادەنێت لەماوەی یەك حەفتەدا هێلکەکە دەبێتە پرکە لەو قۆناغەدا، کاری سەرەکی پرگەکە ئەوەیە بخوات بۆئەوەی گەشە بکات. ئەو پرگانە دەم وکەلاوەیەکی زۆر بەهێزیان هەیەکە دەتوانێت پارچە و خوریەکە بهاڕێت. دەشێت جلەکانمان لەمۆرانە بپارێزین دڵنیابوون لەوەی کەمورانەکە هێلکەی لەسەر دانەناوە. پێش هەڵگرتنی جلوبەرگەکان لەوەرزی هاویندا دەشێت گەرم بکرێت وبەفلچە پاك بکرێتەوە تا هیچ هێلکەو مۆرانەیەکی لەسەر نەمێنێت. باشتروایە جلوبەرگەکان بەکاغەزێکی ئەستور بپێچرێنەوە، چوونکە مۆرانە ناتوانێت کاغەز بکرتێنێت ولێیەوە بچێتە ژوورەوە.

## ئایا مێرووەکان خوێنیان هەیە؟

جگەلە دەریا قوڵەکان لەهەموو وشوێنێکی دوونیادا مێرووو هەیە. پاشماوەکان ئاماژە بەوەدەکەن پێش زیاترلە (٤٠٠) ملیۆن ساڵە مێرووەکان لەسەر زەویدا ژیاون لەوکاتەوەی توانیویان بەخێرایی خۆیان بگونجێنن لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی ژینگە وکەش وهەوادا. ئەگەر سەیری مێروەکان بکەین، سەرمان سوڕ دەمێنێت، چۆن دەبێت ئەم زیندەوەرە بچووك وناسکە خوێن وسوڕی خوێن لەلاشەیدا هەبێت، بەڵام ئەوەی گرنگە دەبێت ئاماژەی پێ بکرێت ئەوەیەکە مێروەکانیش خوێن ودڵ وئەندامی تریان هەیە. لاشەی هەرمێروویەك دەکرێتە سێ بەشەوە. سەرو سنگ وسك. لەسەریدا جوتێك شاخ هەیە کەبۆ گواستنەوەی هەستەکانی دەستلێدان وچێژ وبۆنکردن بەکاری دەهێنێت. هەردوو چاویشی بۆبینین. هەروەها دوویانسێ چاوی تری هەیە ڕووناکی وتاریکی لێك جیادەکاتەوە. لەدەمیدا دووکەلاوە کرتێنەر یان جوێنەر هەیە. لەسەریدا مێشك هەیە کەپەیوەستە بەژێ (عصبیە) وە لەگەڵ هەموو لاشەیدا.

سینگی یان بەشی ناوەڕاستی لاشەی لەسێ جوت قاچی پەیوەست پێکهاتووە. قاچەکانی شێوە توکێکی لینج یان پنگێکی لەسەروە پێوەیە. لەگەڵ ئەوەی هەندێم لەمێروەکان دووباڵیان هەیە. بەڵام هەندێکی تریان یەك جوتیان هەیە یان هەرنییانە. سك یان بەشی خوارەوە لەلاشە بریتی یە لەئەندامەکانی هەرس کردن. لەگەڵ دەردان وهەناسەدان وزاوزێ کردندا. بەدرێژایی سکی کەنی بچوك هەیە

پێی دەوترێت ((کونی هەناسەدان)).
ئەو کونانە بەڕووی بۆریەکی هەوایی دا دەکرێنەوە، کەمێروەکە لێیەوە هەناسە دەدات. ئۆکسجینەکە لەبۆری هەواوەو بەڕێژەیەکی خاو لەخوێندا بلاّو دەبێتەوە ڕەنگە ئەمە هۆکاری سەرەکی بێت بۆمانەوەی مێرووە بچوکەکان بەدرێژایی کاتی دروست بوون وگەوورەبووندا.
لەسوڕی خوێندا بەهۆی کونێکەوە کەدەم قاپێکی هەیە خوێن دەچێت بۆدڵ کاتێك دڵ دێتەوەیەك، کونەکان دادەخرێن وخوێن لەدەمارەکانەوە دەچێت. بەلاّم مێرووەکان مولولەی ووردیان نیە. لەسکیدا بۆری ملبیجی هەیە، ئەو بۆریانە هەرچی پیسی لەخوێندا هەیە لای دەبەن وزۆربەی ئاوەکە دەگەڕێننەوە بۆلاشە.
لەبەر ئەوە مێروەکان دەتوانن بۆماوەیەکی درێژ بەبێ ئاو بژین.
مێییەکانیان بۆریەکیان هەیە بۆدانانی هێلکە پێی دەوترێت ((هێلکە هەلگر))، لاشەی مێرووله بەچینێکی زۆر ڕەق داپۆشراوەکە دەیپارێزێت و تەحەکوم بە لەدەست دانی شێوەدەکات. لەبەرئەوەی زۆربەی لاشەی بەتوێکلّکی ڕەق وزبر داپۆشراوەو ئەو توکانەش پەیوەستن بەدەمارە زۆرهەستیارەکانەوە، لەبەر ئەو هۆیە مێروو دەتوانێت هەست بەبچوکترین جوولەیان کەمترین فولیّ کردن بکات.

## ڕووباری غانج

((گانج)) لە بەناوبانگترین ڕووبارە لەهنداد!. لەهەموو زمانەکانی هندادا پێی دەوترێت ((غانجا)) درێژیەکەی (٢٥٠٦) کیلۆمەترە. بەدرێژی (١٥)یەمین ڕووباری ئاسیاو (٣٩)یەمین ڕووباری جیهان. لەشاخی هیمالایاوە سەرچاوە دەگرێت و لەکۆتایدا دەرژێتە کەنداوی بەنخالەوە. بەسەر زەویەکانی ڕیشکییش و دەشتاییەکانی هاردواردا دەڕوات وهندۆسەکانیش بەپیرۆزی دەزانن. لەکاتێکی زۆرکۆنەوە هندۆسەکان غانج بەپیرۆزترین ڕووبار دەزانن.گرنگیە ئایینیەکەی لەهەر ڕووبارێکی تری جیهان گرنگترە. لەلێوارەکانیدا شوێنی زۆرهەیە بۆئەوکەسانەی حەجی بۆدەکەن. کەگرنگترین شوێنەکانی هاردوار واللەئایادو فاراناسی یە. لەبەر دووهۆ غانج پیرۆزە:
یەکەمیان : ئەفسانەییە.
دووەمیان : لەبەر تایبەتمەندی سروشتی ئاوەکەیەتی.
دەتوانرێت بۆماوەیەکی درێژ ئاوەکەی هەلّ بگیرێت. لەبەر بوونی کانزاتیایدا

خراپ نابێت.
لەیەکێك لەئەفسانەکاندا هاتووە: ڕووباری غانج لەبەهەشتدا ڕێی دەکرد بهاجیرات هێنایە سەرزەوی بۆپاککردنەوەی خۆڵەمێشی (٦٠) هەزار منداڵەکانی شاساجار لەوکاتەوە خەڵکی دەستیان کرد بەپەرستنی.
سالآنە ملیۆنەها حاجی دەچن بۆسەر ڕووباری غانج بۆشۆردنەوەی گوناهەکانیان لەئاوەکەی براهمە وپادشایان بێزراوان وسواڵکەران بەکورتی هەموو تیرەو تایەفەیەك. لەمەزهەبی هندۆسی دەچن لەئاوەکەیدا خۆیان دەشۆن لەپێناو پاك کردنەوەی ڕۆحیاندا. هندۆسەکان ئاوات دەخوازن لەکەناری ئەم ڕووبارەدا بمرن وخۆڵەمێشی لاشەکانیان فڕێ بدرێتە ئاوەکەوە. لەسەرە مەرگیشدا لەئاوەکەی دەخۆنەوە. کەناڵی زۆر لەئاوەکەیەوە ڕاکێشراوە بۆمەبەستی ئاودانی کشتوکاڵی. دەلتا غانج زۆر بەناوبانگە.

## بورج چیە؟

ئایا شەوێك لەشەوان سەیری ئاسمانت کردوە وردبینەوە لەوهەمو چوارگۆشە وپیت وشێوانەی تر؟
خەڵکی لەدێر زەمانەوە، ئەوەیان کردوە، هەرگروپێك لەو ئەستێرانەی کەچاودێریان کردوە ناوێکیان بۆداناوە و بەوگروپەش وتراوە ((بورج)).
ئەو بورجانەی لەئەمڕۆدا بەکاردەهێنرێت، دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی ڕۆمانیەکان تەنانەت بۆسەردەمی یۆنانیەکانیش، ئەوەی کەیۆنانیەکان دەیانزانی زۆربەی لەبابلیەکانەوە فێری بوبون.
بابلیەکان، ناوی ئاژەڵانیان دەنایە لەهەندێك لەشێوازەکانی ئەستێرەوە وهەندێکی تریشیان ناوی پادشاو شابانوو پاڵەوانی ئەفسانەکانیان. یۆنانیەکانیش گۆڕانکاری زۆریان کردلە ناوە بابلیەکانداو ناوی پاڵەوانەکانی وەکو(( هیدوکلیس ((هرقل))و ئەوریون((الجوزائ)) وفرساوس((الجبار)) یان نایە بورجەکانیانەوە. ڕۆمانیەکان هەروانەوەستان وئەوانیش گەلێك گۆڕانکاری تریان تێداکرد.
لەگەڵ ئەوەی ناوە کۆنەکان هێشتا بەکار دەهێنرێن بەلآم هەمیشە ئاسان نیە، ئەو شێوانە بناسرێن کەلە ئاسمان دەردەکەون. بۆنمونە ((الععاب)) وسەگی گەورە وسەگی بچوك وتەرازو بەلآم بورجەکان لەسەر ئەوشێوەیە بەدیار ناکەون.

لەدەوروبەری ساڵی ١٥٠ زاینی دا، زانای گەردون ناسی بەناوبانگ بکلیموس لیستێکی بە ٤٨ بورج کەدەیزانی دانا. بەڵام هێشتا ناتەواو بو. لەبەر ئەوە زانایانی دوای ئەو بەهۆی پێشکەوتنی کەرەستەی زانستیەوە وەکو (الە الدس)کوکبە(الدس)وقیبلەنماو دوربینەوە ناوی تریان بۆ لیستەکەی بکلیموس زیاد کرد. ئەمڕۆ گەردون ناسان ٨٨ بورج دەناسن. بورج بریتی یە لەناوچەیەك لەئاسماندا. ئەمەش مانای وایە هەر ئەستێرەیەك دەکەوێتە بورجێکی دیاری کراوەوە. وەکو چۆن شارێك دەکەوێتە ولاتێکەوە. بەڵام سنوری بورجەکان ناڕێکە زۆرێکیان بەهێڵی لاردا دەڕۆیشتن بەڵام گەردون ناسان لەساڵی ١٩٢٨دا توانیان ئەو هێڵانە ڕاستکەنەوەو هەموو بورجەکان بکەونە ناوبازنەی هێڵی ڕاستەکانەوە.

# پێڕست



## وەرگێڕ لەچەند دێڕێكدا

**مستەفا سەعید عەلی**

ساڵی ١٩٦٦ لەگوندی محمود قەجەر ی شاری خانەقین لەدایك بووە.

دەرچووی خانەی مامۆستایانی سلێمانیه ساڵی ١٩٨٤-١٩٨٥

لەساڵی١٩٨٧وەدەستی داوەتە وەرگێران.

گەلێك بابەتی وەرگێراوەتە سەر زمانی كوردی.

گەلێك بابەتی لە ڕۆژنامە و بڵاوكراوەكاندا بڵاوكردۆتەوە.

ئێستا نیشتەجێی شاری كەلارە.



لە بڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و بڵاو كردنەوەی چوارچرا